منتدى إقرأ الثقافي

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

www.iqra.ahlamontada.com

## کولتوور و شارستانییەت لە دەڤەری کەرکوک

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی شەشم

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

## بەرگی شەشەم

# کلتوور و شارستانییەت لە دەڤەری کەرکوك

سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

٢٠٢٣

بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
**زنجیرە: (١٤٣)**

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک- بەرگی شەشەم: کەلتوور و شارستانییەت لە دەڤەری کەرکوك**
**بەشداران: کۆمەڵێك نووسەر**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: زەینەب حەمید**
**وێنەگر: سەروەر عەبدوڵڵا**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی**
**(٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی شەشەم

# کلتوور و شارستانییەت لە دەڤەری کەرکوک

### بەشداران

د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
د.ئیبراهیم خەلیل سەعید
عەلی حوسێن ساڵح
هەردەوێڵ کاکەیی
سمکۆ بەهرۆز
هاشم کاکەیی
سەروەر ساڵەیی
عەبدولستار جەباری
شەرەفەددین جەباری
سەباح ئیسماعیل
مەلا شاخەوان
موعتەسەم ساڵەیی
ئەحمەد تاقانە
سیروان سەرگەڵوویی
عەبیر عەدنان یوسف
سامان ئەحمەد
محەمەد سەردار
د. کەیوان ئازاد
د. سانیحە ئەمین زەکی
د. کازم حەبیب
د. خەیریە قاسمیە
د. ڕافیدە عەبدوڵڵا قەرەداغی
د. زرار سدیق
د. بەختیار سەعید
فەرهاد عەبدولعەزیز
فەلەکەدین کاکەیی
سەمیرە ئەحمەد
حەمە سەعید زەنگەنە
عیماد جەباری
سەربەست کەرکوکی
سەباح بازرگان
د. شاکر سابیر زابت
ئەحمەد مەجید ئەلحەسەن

٢٠٢٣

# مێژووی گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و کەلتورییەکانی ناوچەی کەرکوك

* چاخە بەردینەکاندا:

ژیانی مرۆڤایەتی و هەڵکەوتەی دروست بوونی مرۆڤ، خاسیەتێکی وای هەیە کە زیندەوەرێکی خوو هەڵگری کۆمەڵایەتییەو لەسەر بنەماکانی هۆگری ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانە ژیانی خۆی دارشتووەو هەر لەسەر ئەو بنەمایانە ڕێچکەی خۆی دۆزیوەتەوە، کە قۆناغ بە قۆناغ ژیانی خۆی پێ چاککردووەو بەرەو زیاتر هەنگاوی ناوە.

گۆران و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ئەو ماوانەی ژیانی مرۆڤن کە لەگەڵیدا هەنگاوەکانی ژیان دروستی کردووەو ڕێساو یاسای تایبەتی خۆی بۆ دارشتووە، تا بتوانێت ڕێڕەوەکانی ژیانی خۆی ئاسان بکاتو بنەماکانی هۆگری ژیانی لەسەر دابرێژێت، لەگەڵێك کاتدا هەردوولا هۆگرییەکتری بوون بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان.

* مێژووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی پێش مێژوو لەناوچەی کەرکوکدا:

زانیاریمان دەربارەی باری ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی (بەردەبەڵکە)و (کەریم شایەر)و (پاڵە گەورە)و (چەرموو)و (مەتارە) زۆر کەمەو تەنها بریتیە لە هێڵێکی باریکی زانیاری بۆ بەدەستهێنانی باسەکەمان، چونکە ئەو شارستانیاتانە ژیانایان بریتی بووە لە کۆچەرایەتی و ژیانی ڕاوو گەران بە دوای خۆراکدا.. زیاتر ژیانی تاکرەوێتی باو بووە لەو ناوچانەدا.

(لە ناوچەی (بەردەبەڵکە)دا مرۆڤی (نیاندەرتاڵ) ژیاوە، گوزەرانی لەسەر ئەوە بووە کە ڕاوی کردووە یان کۆیکردووتەوە، لە خواردن لەدوای خۆی ئەو کەرەستانەی بە جێهێشتووە کە بەکاری هێناوە لە بەرگری لەخۆی لەکاتی هێرش یان ڕاوکردندا، کە پێك هاتووە لە (نێرك)ی بەردە ئەستێی پتەو نەبوو، زۆری لەسەر شێوەی ئارێك کە سەردەمەکەی دەگەرێتەوە، سەردەمی بەردینی کۆن بەو شێوەیە کە بەناوبانگ بووە بە (ئەشولی) مێژووەکەی دادەنرێت بەزیاتر لە سەد هەزار ساڵ، توانای لەشی دیاری کراو بووە، ژینگەکەی زۆر ناخۆش بووە، کە یارمەتی داوە بۆ گەشە بوونی تواناو پیشە هونەرییەکانی بۆ دروست کردنی ئەو کەرەستە بەردینانەی کە بتوانێت بە هۆی ئەوەوە خواردنەکەی بەدەست بهێنێتو زۆری کاتی بەم کارانە بباتە سەرو ئابوورییەکی هەڵەشەیی هەبووە، کەسەکانی ئەو سەردەمە لەسەری ژیاون ڕۆژ بەڕۆژ.. کە مرۆڤ ژیاوە لە بەربەرکانی بۆمانەوە تا ماوەیەکی زۆر بەتایبەتی لەگەڵ (فیل)و (کەرکەدەن) لەبەردەبەڵکەدا.

بە هۆی گۆڕانی کەشەکانەوە نەیانتوانیوە ماوەیەك لە شوێنێکدا بمێنێتەوە، بۆیە هەموو کات لە کۆچ کردندا بووە، شتێکی نەزانیوە کە ناوی (نیشتیمان) بێت، لەگەڵ پێکەوە بەستنی نێوان کەسەکانی خێزانەکانیان، چونکە هەرکەسێك هەوڵدەدا کە بەشی خۆی بەدەست بهێنێت بێ گوێدانە کەسانی تر، لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵگا نییە بەشێوەیەکی ڕاست، بەڵکو بریتیە لە جۆرێك کۆمەڵ بوون (التجمع) لەنێوان ئاوو هەوایەکی وا کە وەسف دەکرێت بەنیوە گەرمیو شێداری، بە شێوەیەك کە بتوانێت سەرچاوەی خواردنەکەی بە دەست بهێنێت، پەیوەندی نێوان نێرو مێ باوبووە (المشاعة الجنسية)و لەوەدا بەدەردەکەوێت کە خێزان نەبووە مرۆڤ خۆی بەتاکێتی ژیاوە سۆزی دایکایەتی بەس بووە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ[1].

ئاوو هەوا گۆڕانی بەسەردا هات بەرەو باشترو ئارام گرتنی ئاووهەواکەی، کە بوو بە هۆی گۆڕان لە ژیانی ڕووەك، ئاژەڵداریدا کە بەهۆی گۆڕانی ئەو ژینگەیەوە بوو، بەهۆی پێشکەوتنی شارستانییەتییەکە، مرۆڤ لەم سەردەمەدا هەوڵی هونەرکاریو تێرامانی دەداو، بەبەکارهێنانی کەرەستەی قەبارە بچووك لە کارەکانیدا.. هەروەها ئەم شارستانییە بە ناوبانگ بوو بە هەمە جۆریو تایبەتمەندیەتی. تاك دەورێکی دیاری هەبوو لەو کارانەی کە ڕۆژانە کەوتووەتە سەری لە چوارچێوەی خێزاندا.

لەگەڵ گەشە کردنی چینێکی ڕووەکی بەهۆی کۆتایی هاتنی چاخی سەهۆڵبەندان، بوو بەهۆی گۆڕانی خواردنی مرۆڤ، کە ئەمیش گۆڕانێکی گرنگ بوو، کە بایەخی دەدا بە دوو جۆرە خواردن، کە ئەویش ڕووەکیو ئاژەڵی بوو، بەهۆی بڵاوبوونەوەی چینێکی ڕووەکی گەورە لە ناوچەکەدا[2].

لەبەر ئەوە بە مۆڵگەیەکی نیمچە کۆچەری دادەنرێتو قۆناغێکی زۆر زووی پێشکەوتنو گۆڕانی ژیانی نیشتەجێیی و ئارام گرتنی ئەو سەردەمە بووە[3].

گواستنەوەی شێوەی ژیان لە (میزولیشەوە) بۆ (نیولیپ) لە (کەریم شایەر)دا بە پەیدابوونی پیشەسازی گلێنەیی هەستی پێ دەکرێت، کەلە چیا بەرزەکانی ئەم مەڵبەندەدا

ئەو پیشەسازییە لەگەڵ کەلتووری گڵێنەی (چەرموو)دا لای (چەمچەماڵ) یەك شێوەن و بەنێوەی گڵێنەی (شۆرشی نیولیپ) ناسراوە[٤].

بۆیە (کەریم شایەر) هەنگاوێکە بۆ گۆرینی باشتری ژیانی کۆمەڵایەتی بەرەو شارستانییەتی (چەرموو) کە لەگەڵ خۆیدا شۆرشێکی کۆمەڵایەتی گەورەی پێك هێنا.

بەرهەم هێنانی بژێوی بە کشتوکاڵ و حاڵی ئاژەڵیش هۆی لەرادەبەدەری پر بایەخ بوون لەلایەن ئادەمیزادەوە کە توانی لە ژیانی کێویایەتی و چۆڵپەرستی چاخەکانی بەردینی کۆن بۆ ژیانێکی پێشکەوتوو بگوازرێتەوە، راستیش نەوەکانی ئاخورو ئۆخری چاخی بەردینی ناوەراست زەمینەی ئەو شۆرشە ئابوورییەیان خۆش کرد[٥].

بەهۆی گۆرانی ژیانی ئابوورییان، مەودایەکی فراوان و نوێ رووی دا لەبەردەمی گۆرانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە سەرتاپای جیهاندا.

(نیشتەجێبوون و پێشکەوتنی ژیانی ئابووری، پەیدابوونی خاوەنێتی زەوی و کەرەستەی بەرهەم هێنان و ماڵداری، زۆربوونی ئیش و پەیدابوونی چینی کۆمەڵایەتی و دەستپێکردنی چەوسانەوە و دەست بەسەراگرتن، زۆربوونی خێزان و بەرە، بووە هۆی ناکۆکی و هەراو بەگژیەکداچوون، بەشێوەیەکی سەرەتایی و ساکار شەرو شۆر دەستی پێکرد، بەتایبەتی لەگەڵ ئەوکۆمەڵانەی هێشتا هەر راوکەر بوون و فێری کشتوکاڵ نەببوون)[٦].

لە سەردەمی بەردینی نوێ فێری بیری پێوانەیی رۆژگارو رۆژانە بوون، بەتایبەتی رۆژژمێری (خۆری)، کە مرۆڤی فێرکرد ماوەی کشتوکاڵی بزانێت، بتوانێت پێوانەی درێژایی ساڵی خۆری بکات لەکاتی تۆوە بۆ کاتی تۆو یان لە دوورووێنەوە بۆ دوورووێنە.. لەگەڵ سەرهەڵدانی بیروباوەری ئایینی[٧].

سەرهەڵدانی گەلێك پیشەی دەستی کۆمەڵایەتی و دروست کردنی لەکاری مرۆڤ وەکو تەون و تەونکاری[٨]، دۆزینەوەی کەرەستەکانی تەونکاری و چنین، جۆریکن لە گۆرانە کۆمەڵایەتییەکان[٩].

کۆمەڵگای چەرمو: لەبەر ئەوەی کشتوکاڵی بووە، بۆیە گەوهەری ژیانیان بەند بووە بە کشتوکاڵی گوند نشینی، بنەماکەشی لەسەر دروست بوونی گوندەکەو کارکردن بووە تیایدا دانیشتووانەکەشی کە پێك هاتووە لە چەند خێزانێك، چاودێری کشتوکاڵەکەیان کردووە لە هەمان کاتیشدا هانی داون بۆ مانەوەیان هەر ئەوەش کاری کردووەتە سەر تێروانینی جوتیارەکان بۆ هێنانە بەرهەم بە جۆرێك کە رێگا ئاسانەکەی بۆ بگرن و پارێزگاری لێ بکەن. ئەمەش تێروانینێکی لەسەرخۆی شێوەکانی ژیانەو خۆشیان هێناویانەتە پێشێ، وشکە بێ گیانەکەش لەسەر جۆرەکانی هونەر رەنگی داوەتەوەو شێوە چاولێکەرییە ئاسانەکەی بێ گۆران وەرگرتوە[١٠].

رەگو ریشەی گوندەکەی چەرموش لەو پەیوەندییە بە هێزەی نێوان لەدایکبوون و شوێنەکەوە سەرچاوەی گرتووە. لەوەش دەچێت هەموو ئەندامێکیش لەو کۆمەڵگایەدا مروێەك بوو بێت، ئەو کارانەی سەرشانی کە پێی سپێردراوە لە قۆناغەکانی ژیانیدا واتە لەدایکبوونییەوە تاکو مردنی جێبەجێی کردووە. بۆ ئەنجامدانی هەموو کات پەنای بردووەتە بەر هێزەکانی سروشت و ملکەچیان بووە[١١].

لەوانەشە لەو سەردەمە زووەیدا کۆمەڵگای چەرموو جۆرە دیموکراسەتێکی سەرەتای تێدا هەبوبێت. بە جۆرێك یەکێتییە کۆمەڵایەتییەکە کە پێوەی پەیوەست بووە یەکێتییەکی وا بوبێت لەسەر پەیوەندییەکانی خزمایەتی هاتبێتە کایەوە کە لە شێوەی خێزانی باوکایەتی گەورەدا رێکیان خستبێت بە پێوانەی بەڵگەی رەگەزناسیش هەموو کەسێك لەناو کۆمەڵدا لەو سەردەمە زووەدا بۆی هەبوو موڵکی تایبەتی خۆی هەبووبێت بە مانا پارچەیەك زەوی بۆ خۆی دا بربکات، چونکە زەوی زۆر بووەو بەر هەموو کەسێك کەوتووە، جگە لە کەرەسەی شەخسی دیکەش وەکو جلوبەرگ و بابەتی ئارایشتی ئافرەت.

چاوگێرانێك بە پاشماوە دێرینەکانی شوێنەوارەکەدا ئەوە دەرئەخات کە لە (چەرمو)دا ئەو جۆرە کەرەسانەی چەشنی ملوانکەو مووری لەبەردو قور دروست کراو بازنی مەرمەرو موستیلەو ئامێری هارینی رەنگەکان و ئامادەکردنیان لە پاشماوەی چینەکاندا دۆزراونەتەوە، جگە لە دۆزینەوەی ئامێری کشتوکاڵ و قاپ و قاچاخی ناوماڵ. ئەمانە بەڵگەی پێشکەوتنی پیشەسازی گوندەکەن کە لەنێوانیاندا کەوچك و دەرزی لە ئێسقان دروست کراوو سەرەتەشی لەبەرد دروست کراو دێن کە باوەر وایە دانیشتووانەکەی چەرموو چنین و رستنی خوریان زانیبێت[١٢].

هەر ئەوەش لەوانەیە وای کردبێت کات و بە گوێرەی رەگەزو تەمەن و شارەزایی دابەش کرابێت بەمانا پیاو کارەگرنگەکانی بەرکەوتووەو ئاسانەکانیشی کە پشوو ئارامی ویستووە بۆ ئافرەت ماوەتەوە دووریش نییە ئەو هێڵانەی کە لە سەر سواڵەتەکانی چەرموو هەڵکەندراون شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتییەکەی دەرخستبێت. بەمانا ئەو دوو هێڵە ئەندازیارییانە لەناو خۆیاندا گۆرانێکیان بۆ شێوەی ژیانەکە هێناوەتە گۆرێ هەروەکو چۆن راوچی لە بۆسەو چاودێری ئاژەڵە کێوییەکەیدایە بۆ راوکردنی، ئاواش جووتیار بە شێوەیەکی بەرفراوانتر لەسەر باوەرو داب و نەریتێکی تر بیری لێ کردووەتەوە. سەرەتا بە نیوە کۆچەری دەستی پێکردووەو دواییش شوێنەکەی بەرەو بچووك بوونەوە رۆیشتووە لەسەر ئەو پارچە زەوییەی کە بۆخۆی داناوە ماوەتەوەو بووەتە موڵکی تایبەتی، لەسەریشی پێویست بووە زەوییەکەی رێك بخات. لە ژیانی گوندە کشتوکاڵییەکەی (چەرموو)دا رووە ئاینییەکە رۆڵێکی گەورەو گرنگی گێراوەو چووەتە قووڵایی باوەرە کۆمەڵایەتییە ئابوورییەکەوە، کە بە هەموویان گوزارشت لە نیزامە کۆمەڵایەتییەکەو کەسانی ناو کۆمەڵ و باوەریان دەکەن. ئەمانەش لەو پاشماوانەدا دەخوێندرێتەوە کە مرۆڤی (چەرموو) بۆی بەجێ هێشتووین و وێنەیەکی ئاشکراو روونمان لە بارەی بیرە سروشتییەکەو رووە ئاینییەکەوە دەداتێ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە مرۆڤ لەو چاخەدا تەنگ و چەڵەمەی گەورەی ئەوتۆی نەبووە بەهۆی بارودۆخە سروشتییەکە، کە هەموو لایەکی لێ بگرێت.

بۆیە هەموو ئەوانە بە باشی لەبارە دەروونییەکەیدا رەنگی داوەتەوەو دڵنیاش بووە لە ژیانی. شتێکی سروشتییە لە ئەنجامی هەموو ئەزموونێکی تازەدا، مرۆڤەکە بە هۆی مامەڵەو ململانێ لەگەڵ شوێنەکەی و هێزە جیاجیاکانی تردا کە دەستی کەوتوون و زانیاری تازەی لە باوکو باپیرەوە لە بارەیانەوە وەرگرتووە، وای لێکردووە خۆی ئامادە بکاتو بگاتە ئەنجامدانی هەندێك لەو شتانەی کە پەیوەندی بە ژیانی ئامانجەکانی دیکەیەوە هەیە، بۆ ئەوەی ئێستای بە داهاتویەوە پەیوەست بکات[١٣].

لەبەر ئەوەی کشتوکاڵی بووە، بۆیە بۆ بەرهەمهێنانی بەرووبووم بە گشتی پەنایان بردووەتە بەر باران و بارانەکەش ئەوەندە بووە، کە کشتوکاڵەکان پێ بگەیەنێت کە لەوە زیاتر پێویستیان بە هیچ شتێك نەبووە جگە لە پیتو فەڕی زەوییەکە. بوونی بە پیتو فەڕی زەوییەکەش بەرووبوومەکەی زیاتر کردووەو بووەتە هۆیەکی کاریگەر بۆ مانەوەی مرۆڤەکە لە شوێنەکەیدا. دەرخستنی ئەمانەش بە هۆی ئەو شتانەوە بووە کە لە پاشماوەی چینەکانی سەرەوەی شوێنەوارەکەدا لە ئەنجامی کنەو پشکنیندا دۆزراونەتەوە، بەمەش بیری بە پیتی و بەرەکەتیان پەرستووە. هەموو شتێکیش هەر لەوەوە لەدایکبووە کە هێمای بەشێکیان بووکەشوشەی قوڕینەو لە شێوەی ئافرەتێکی سك پڕدا وێنە کراوە. لە ڕوخساریدا بەپێی باوەڕیان هێمای تازەبوونەوەی ژیان و زۆربوونی بەرووبووم[١٤] دێت. کە لەناو ڕەگەزی مرۆڤدا بە شێوەیەکی بەردەوام دەربڕین لە دیاردەی دایكو بە پیتو فەڕی زەوی و هێنانە بەرهەمی بەرووبووم دەکات کە بە خوا دایکە ناسراوە. بەرامبەر بەوە کە ئەندامەکانی لەدایکبوونی تێدا گەورە کراوە لە سروشتدا ڕەگەزی نێرینە دێ. ئەمەش لەو ئاژەڵە شاخدارانەدا دەخوێندرێتەوە کە لە قوڕ دروست کراون و لەگەڵ بووکەشووشە قوڕینەی خوا دایکەدا دۆزراوتەوە بوونەتە هێمای زۆربوون و زاوزێ[١٥]، بۆیە دەتوانین ئەوە لەبەر چاو بگرین کە دانیشتووانی چەرمو بایەخێکی تەواویان بەو ئاژەڵە نێرینانە داوە بەتایبەتی لەو ژمارە زۆرانەدا دەرئەکەون کە لەکنەو پشکنیندا دۆزراونەتەوە کە بە جوانی دروستکراون... چونکە لە هەردو شێوەکەدا هێمای بە پیتو بەرەکەتی و زۆر بوونن. لە لایەك هێمای وزەو جووڵەن و لە لایەکی تر لە کانیاوی بە پیتو بەرەکەتی هەڵچێنراون کە بۆ کشتوکاڵ باشن بەوەی گەورەی ئاژەڵن و دەبنە هۆی دروست بوون و لەدایکبوونی کۆرپەلەی تازە. بۆیە لە پەرستنی خوا دایکەوە ئاژەڵ لەو بیرە سەرەتاییە گرنگانەیە کە لە ژیانی کۆمەڵگای (چەرموو)دا ناوبانگی دەرکردووە. بەڵگە دەرکەوتووەکانی کنەو پشکنین لە قەڵای چەرموودا نیشانی دەدات کە دانیشتووانەکەی بە شێوەیەکی گشتیی لەژێر خانووی زیندووەکاندا مردووەکانیان ناشتووە[١٦].

ئەم جۆرە ناشتنەش لەوە ناچێت دابو نەریتێك بووبێت پەیوەست بێت بەو چاخەوە بەڵکو ڕەنگدانەوەی درێژبوونەوەیەکە بۆ چاخە کۆنەکان دەگەڕێتەوە کە مرۆڤ بەم شێوە خۆرسکییە مامەڵە لەگەڵ مردووکەیا کردووە وا تێنەگەیشتووە کە مردن کۆتایی بە مرۆڤەکە دێنێ بەڵکو وای بۆ چووە کە بەردەوامی بە ژیانی دەدا بەو شێوەیەی کە ئەندامانی خێزانەکەی ناتوانن لێی دوور بکەونەوە هەتا دوای مردنیشی. ئەم شێوە ناشتنەش لە خانووی زیندووەکاندا لەوە زیاتر نەبووە کە سۆزی کەسایەتیی جوڵاندوونی نەك لە باوەڕێکی دیاریکروەوە هاتبێت کە هەڵیان گواستبێت[١٧].

سەرئەنجام لەم دیاردەیە وا تێدەگەین کە مردن بە باوەڕی دانیشتووانی چەرموو خەونێکی کاتی بووە ئەمەش لە شێوەی دانانی مردووەکە لەناو گۆڕەکەدا دەرئەکەوێت بەم شێوەیە یەکەم ئامانجی کۆمەڵگای ئاینی (چەرموو) دابینکردنی بارە ئابوورییەکەوە نزیك بوونەوە بووە لە هێزەکانی بە پیتو بەرەکەتی و زیاتر کردنی بەرووبوومەکە. بەمەش مرۆڤی گوندەکە هەستی بەوە کردووەو بە پێویستی زانیوە کە دڵنەوایی ئەو هێزە سروشتیانە بکات کە بە فەرمانیان بەرووبوومی کشتوکاڵی زیاتر بووە.

بەڵام لە سەردەمەکانی بەردینی کانزاییدا گۆڕانێکی گەورەتری کۆمەڵایەتی ڕوویدا، کە لەگەڵ گۆڕانی سەردەمی (چەرموو)دا وردە جیاوازییەکی هەبوو، چ لە ڕووی ڕێکوپێکی و تەبابی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە لەگەڵ خۆیدا هانگاوبوو بۆ سەردەمە مێژووییەکان.

ئەوەی لە سەردەمەکانی پێش مێژوودا بەرچاو دەکەوێت لە ناوچەی کەرکوکدا ئەوەیە کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هاوپەیوەستە بە چەند خاڵێکی دیاری کراو:

١. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا خولی خواردووەو لەسەر ئاستێکی بێ هێزدابووە، کە چوارچێوەی ئەو پەیوەندییانە لەگەڵ چالاکییەکانی مرۆڤدا گەشەی کردوە.

٢. کاریگەری ژینگەو ئاوو هەوا یەکێك بووە لە هۆکارەکانی ئەوەی کە مرۆڤی قاڵ کردووە بەوەی کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی زۆر بەسستی گەشە بکاتو بکەوێتە ژێر کاریگەری ئاوو هەواو بارین و ڕێژەی باران و بەفرو لافاو باو ڕزگار کردن لە هۆکارەکانی ژینگەو پەیوەست بوون بە ئەشکەوت و مۆڵگەکانی دەوروبەری وەکو مرۆڤی ئەو سەردەمانە لە ئەشکەوتی (پالە گەورە)دا حەساوەتەوە.

٣. پاراستنی خواوەندی (دایك) لە چەرموودا، وەرچەخان بووە لە ژیان لەو دەڤەرەدا، کە توانی بیروباوەرەکانی پیرۆزی ئافرەت هەنگاوێك بێت بۆ پیرۆزی پێگەی مرۆڤ لە کۆمەڵگەداو چەکەرەکردنی چواندنی زاووزێو زۆری منداڵو گەشەکردنی مرۆڤ لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا.

٤. گۆڕانەکانی ئاوو هەوا بووە باشتر کردنی جۆرەکانی خۆراكو بایەخ دان بە کشتوکاڵی، کە لەگەڵ خۆیدا بووە، گەڕان بەدوای کەرەستەی زیاترو پێوستی ئەو کەرەستانە بۆ کارڕایی کردنی کاروبارەکانی ڕۆژانەیان.

٥. بایەخدان بە هونەری گۆزەکاری و دەفری ڕەنگ لە هونەردا، جۆرێکە لە بایەخدانی مرۆڤ لەچاخی بەردینی نوێ بە پێوستییە کۆمەڵایەتییەکان و جێبەجێ کردنی کاروباری ڕۆژانە.

٦. دروست کردنی خانووەکانی (چەرموو)و هونەری بیناکاری ئەو سەردەمە هەرچەندە سادە بووبێت بەڵام

توانراوە سەقامگیری لە شوێنێکدا دروست بکات.

*** پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمە مێژووییەکان:**

سەردەمە مێژووییەکان زیاتر ئەو ماوە مێژووییانە دەگرێتەوە کە قۆناغی مرۆڤ لە سەردەمی چاخە بەردینەکانەوە گۆڕانی بەسەرداهات و ژیانی مرۆڤایەتی گەلێك لایەنی جۆربە جۆری گرتەوە کە لەگەڵ سەردەمەکانی پێشووی جیاوازی هەبووە، لەرووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و زمانەوانی، کە هەریەکە لەم بوارانە هەنگاوی گەورەیان نا بۆ چاکترکردنی ژیانی مرۆڤایەتی.

سەردەمە مێژووییەکان هەروا گۆڕانی لە خۆنەبوو، بەڵکو خەباتی ناخۆشی ژیانی مرۆڤایەتی بوو لە سەردەمی چاخەبەردینەکان کە توانی لایەنەکانی شارستانی لەسەر رۆبنێت.

بۆیە سەردەمە مێژووییەکانیش بە سەردەمێکی جیابوو لەوەی تر لەرووی تایبەتی هەموو بوارەکاندا.

رووداوەکانی سەردەمەکانی مێژووی ناوچەی کەرکوك بەشێکی نەپچڕاو بووە لە رووداوە مێژووییەکانی دەورووبەریدا چ لە ئاستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان یان لەسەر ئاستی رووداوە کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکانی دەورووبەری کەرکوك و جیهاندا.

سەردەمە مێژووییەکانی: سۆمەری، گۆتی، لۆلۆیی، (هوری- میتانی)، ئاشووری، میدی، ساسانی، پرسی، ئەسکەندەر، هەریەکە رەنگدانەوەیەکی بەرچاوی بینیوە لەسەر ئاستی ناوچەکە و کەرکوکیش شوێنێکی بەرچاوی ئەو رەنگدانەوەیە بووە.

دەتوانین هۆکارەکانی گۆڕان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکە لە سەردەمە مێژووییەکان بگەڕێنینەوە بۆ چەند هۆکارێك:

**١. گۆڕانی ئاو و هەوای ناوچەکە:**

گۆڕانەکانی ئاو و هەوای ناوچەی کەرکوك لە هەموو شوێنەکانی تر زیاترلەبارتر بوو بۆ گەشەکردن و بوژاندنەوەی شارستانی سەردەمە مێژووییەکان، ئەو راستییەش بەروونی دەردەکەوت لە شارستانی ناوچەکانی (قادیش) و (مەتارە) و (ئەراپخا) و (ماحوز) و (کوروخانی) و (نوزی) و (ئال- ئیلانی- قەڵا) و (گاسوور)، هەندێك لەم شوێنانە بەردەوامی سەردەمەکانی پێش مێژووە، ئەمیش بەڵگەی لەباربوونی ئاووهەوای ناوچەکەبووە بۆ بەردەوامی سەردەمە مێژووییەکان.

لەباربوونی ئاو و هەوا رێگەی بە مرۆڤدا لە ئەشکەوت بێتە دەرەوە و هەوڵی گەران بدات لە دەورووبەریدا، ئەمیش وای لێکرد ئارەزووی بەرەو هۆگری و دوورکەوتنەوە لە تاکرەوی بڕوات و هەوڵی دروستکردنی کۆمەڵ و کۆمەڵگە بدات.

بەهۆی باران و بەفرو لافاو وای لێهاتبوو خۆی لە شوێنێکی دیاریکراو بشارێتەوە و ماوەیەکی دوورو درێژ خۆی لە ئەشکەوت مۆڵ بدات، ئەویش رێگربوو لەبەردەمیدا بۆ ئەوەی بتوانێت پەلوپۆ بەچوار دەورا بهاوێژێت.

گۆڕانی ئاو و هەوا هۆیەك بوو لەو هۆیانەی فێری خۆراگری و دروستبوونی خێزانی کردوو بیری لە ماڵیکردنی ئاژەڵ کردەوە، کە پێشتر تەنها سەرقاڵی راوکردنی بوو، چونکە ماڵیکردنی هەوڵێك بوو بۆ هۆگرکردنی ئەمەش زۆر بەروونی لە سەردەمی چاخی بەردینی نوێ لە (چەرموو) دەرکەوت کە مەیلی بەلای بەخێوکردنی ئاژەڵدا چوو کە لەوەو پێش بیری لێ نەدەکردەوە.

گۆڕانی ئاو و هەوا مرۆڤی فێری شینایی و سەوزایی و کشتوکاڵ کردنی کرد کە لەوەو پێش، بەهۆی سەختی باران و بەفر گەلێك بەرهەمی کشتوکاڵی لەو ژینگەیەدا شین نەدەبوو یان بەرهەم نەدەهات.

**٢. سەرهەڵدانی نووسینی مێخی:**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی سەردەمە مێژووییەکان لە ناوچەکە و جیهاندا سەرهەڵدانی نووسینی مێخی بوو، کە لەگەڵ خۆیدا بووە وەرچەخانێکی گەورە لە نوسینەوەی رووداوە مێژووییەکان، لەهەمان کاتدا بووە فراوانکردنی ئارەزووی مرۆڤ بۆ بیرکردنەوە و تێفکرینی بۆ ئەو رووداوانەی کە خۆی تێیدا بەشداری کردووە، ئەویش بە بەرچاوگرتنی لایەنە چاك و خراپەکانی ژیانی لە رێکخستنی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری.

(بەکارهێنانی خەتی مێخی لە (٣) هەزار ساڵ پێش بڵاوبوونەوەی مەسیح، بەردەوام بوو تا سەردەمەکانی لەدایکبوونی مەسیح کە (٣) هەزار ساڵی خایاند، دوا رەقیمی قورین کە پێمان گەیشتووە دەگەڕێتەوە سەردەمی (٥٠)ی زایینی.

ئەوەی کە پێوستە ئاماژەی پێبکەین بە بڵاوبوونەوە و سەرهەڵدانی خەتی ئارامی لە نیوەییەکەمی پێش زایین و بڵاوبوونەوەی خەتی ئەغریقی لە سەردەمی هیلنستی، دەورێکی گەورەیان بینی لە کەمکردنەوەی نرخی خەتی مێخی، ئەمەش وایکرد بەکارهێنانی چرببێتەوە لەلایەن ئەستێرە ناسانی بابلییەکان بۆ نووسینەوەی سەرنجەکانیان لە زانستی ئەستێرەوانی)[١٨].

ئەوەی کە جێگەی سەرنجە قور یەکێك بووە لەو کەرەستانەی کە نووسینی مێخی لەسەر نوسراوە بە پێی سەردەمە مێژووییەکان، بەڵام زۆر کەم و دەگمەن ئەم نووسینانە بەکارهاتووە لەسەر بەرد و کانزاکان، لەبەر ئەوەی ئەم کەرەستانە رەقن و گونجاونیە بۆ ئەوەی نووسینی لەسەر بکرێت، چونکە قورەکە زیاتر لەبارو نەرمە بۆ نووسینی مێخی و دێتە دەست لە نووسینەوەی رووداوەکاندا.

ئەوەی لەناوچەکانی کەرکوکدا بەرچاومان دەکەوێت گەلێك رقیمی مێخیمان بۆ بەجێماوە لە نوزی و (قەڵا- ئال ئیلانی و کوروخانی)، هەریەکە بەڵگەیەکی مێژوویی گرنگن دەرباری مێژووی ئەم شارە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەم، رقیمە قورییەکانی (نوزی) و (کوروخانی)یە کە گەلێك لایەنی یاسایی و قانوونی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانی لە خۆگرتووە لە بنیاتنانی

خێزان و گرێدانی یاسایی ئەو پەیوەندییانەو چۆنیەتی هەلوەشانەوەی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان کە هیچی لەیاساکانی (حەمورابی) کەمتر نییە.

٣. فراوانبوونی بیروباوەڕ ئایینییەکان لە قۆناغی سەردەمە مێژووییەکان:

ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە فراوانبوونی ژیانی مرۆڤایەتی و بلاوبوونەوەی لە پانتاییەکی گەورە کە زۆر لەوەی لەسەردەمەکانی پێش خۆی گەورەترو ئاپۆرەتر بووە، ئەمیش لەگەڵ خۆیدا بووە هۆی بەرفراوانکردنی کشوکالیکردن، وا لە مرۆڤدا دەکات بیرکردنەوە لە بیروباوەڕە ئایینییەکان فراوانتر بێت، باوەڕەکانی لەپەرستنی کۆتەلی دایکەوە پەرەی سەند بۆ خواوەند (با)و خواوەندی (باران) و خواوەندی (زەوی)و خواوەندی (جوانی) گەلێکی تر کە هەر هەمووی دۆزینەوە بوون بۆجێبەجێکردنی خواستەکانی مرۆڤ تا بەوەی دوعاو پاڕانەوەکانی ئامانجەکانیان بەجێ بهێنێت.

ناوچە دەشتییەکانی کەرکوکیش بەپیتی زەوییەکەی گونجاو بوو لەگەڵ فراوانبوونی خواستەکانی بیروباوەڕەی ئایینی تا بەوەی ئامانجەکانیان جێبەجێ بێت، ئەمیش بەڕوونی لەسەردەمی میتانی و گۆتییەکان لەناوچەکانی کەرکوکدا دەردەکەوێت.

گۆڕان یان فرانبوونی ئایینی، هۆیەکی گرنگە لە گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان، چونکە ئایین و خواوەندەکان بوونە هەلگری دارشتنەوەی چین و توێژەکانی کۆمەل و کۆمەلگەیان دابەشکردە سەرکۆیلەو ئازادو سەرئایین پەرستو پیاوانی ئایین و پاشاو دامودەزگاکانی پاشاو کۆشکی پاشایەتی، کە گەلێك جار ئایین و پیاوانی ئایین دەوریان بینیوە لە دارشتنەوەی چارەنووسی ولات و سەرکەوتن و داروخانی لەدەستی ئەواندابووە.

سەرهەلدانی پەرستگاو ئاتەشگەو کلێسەو زەقوورە، هەریەکەی قۆناغێکی فراوانی ژیانی مرۆڤایەتییە لەڕووی ئایینەوە کە ڕاکردن لێیان و خۆگێلکردن زۆر مەحال بوو لێی.

ئایین و باوەڕەکانی بوونە کەرەستەیەکی بەهێز بۆئەوەی کە بتوانێت ببێتە دەستگایەکی سەربەخۆ لەڕووی کارگێری و بەڕێوەبەری و بیناسازی و نەخش و نیگاری بیناکارییەوە کە هەموو پێوستییەکی لەلایەن کۆشك و پاشاوە بۆ جێبەجێ دەکرا تاکو بەوەی خواستەکانی پاشا جێبەجێ بکات یان دەولەت و ئیمپراتۆرییەتەکە لەسەری کۆك بێت.

٤. تۆکمەکردنی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان:

لەچوارچێوەی چڕکردنەوەی خێزان و مندال و پەیوەندییەکانی دەوروبەری مرۆڤەکان لە دارشتنەوە یان پۆلێنکردنی ژیانی ڕۆژانەوەو کارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی.

جاران لە (چەرموو) پەیوەندییەکان خۆی دەبینییەوە لە ناوچەیەکی (٢٠- ٣٠) مالی، بەلام سەردەمە مێژووییەکان فراوانی پویوەندییە کۆمەلایەتییەکان خۆی دەبینییەوە لە شارو ناوچەیەکی فراوانی وەك (نوزی)و (ئەراپخا)و (کوروخانی).

پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان لە هەریەکە لە (کوروخانی) و (نوزی)دا بووە پێکەوە بەستنی پیرۆی مولکدارێتی زەوی و مامەلەکردنی زەوی و مافی مرۆڤ لەو مولکدارێتییەدا، ئەویش بە دارشتنەوەی یاساکانی ژیانی مرۆڤی سادەو کۆیلەو خاوەن دەسەلاتی ناوچە فەرمانڕەواکەدا، بە ڕێنوومایی ڕێکخستنەوەی یاساکانی ژیانی مرۆڤایەتی و زیاتر تۆکمەکردنی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان بووە سەرهەلدان و فراوانبوونی کارگەو پیشە دەستییەکان کە سەردەمی چاخە بەردینەکان زۆربە سنووورداری گەشەی کردوو جیاوازبوو، بۆ نموونە هونەری گۆزەکاری قالبێکی فراوانی بەخۆیەوە دیت و لە شێوەو قەبارەو ڕەنگ و جۆری گۆزەو دەفری جیاوازی و هەمەچەشنی دروست بوو کە توانا و بیرکردنەوەو ئاوەزی مرۆڤەکانی دەخستەڕوو.

بایەخدان بە جلوبەرگ و پۆشاك و جۆرو ڕەنگی پۆشاکەکە خالێکی گرنگ بوو، کە سەردەمەکانی لەوەو پێش بەو شێوە فراوانە بیری لێ نەکردووەتەوە کە تەنها پێستی ئاژەلەکە یان خوورییەکەی خۆی پێ دادەپۆشی.

٥. بایەخدان بە کشتوکال:

مرۆڤ لەسەردەمە مێژووییەکان بایەخی زیاتری دا بەکشتووکال و گەڕان بەدوای کشتوکالی بە پیت و بەرەکەت لەناوچەی تەختایی، هەروەها بایەخ بە ئاودێری و هەلگرتنی ئاو بۆ سەر زەوییەکەی و چاککردنی زەوییە کشتوکالییەکانی کە لەگەل خواستی ژیانی مرۆڤایەتیدا بگونجێت.

بەکارهێنانی گەنم و جۆو سوود وەرگرتنی لەجۆری چاك و بەرهەم هێن کە بەرهەمی زیاتر بۆ مرۆڤ بەدەست بهێنێت.

٦. بایەخدان بە یەکە کارگێرییەکان و بەڕێوەبەرییەکان:

لەوەو پێش ژیان لە گوندێك یان ناوچەیەکی دیاریکراو گەشەی کرد، بەلام لەسەردەمە مێژووییەکاندا، ژیان زۆر فراوان بوو، لەپال گوند چەند گوندو شارو دەڤەرو ئاقاری جۆر بەجۆر گەشەیان کرد، لەپال ئەمانەدا فراوانبوونی ژیان پێوستی بە ڕێکخستن و دارشتنەوە هەبوو تابەوەی بتوانێت لەگەل خواستەکانی ژیانی کۆمەلایەتیدا بگونجێت، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینییەوە کە دەولەت یەکە کارگێرییەکانی دابەشکرد بەسەر چەند حاکم و فەرمانڕەوایەکدا بۆ ڕێکخستنی بەڕێوەبردنی هەموو لایەنەکانی ژیانی لەڕووی ئابووری و کۆمەلایەتی و ئایین و ڕۆشنبیری و بیناکاری.

٧. کۆچڕەوی نەتەوەو هێزەکان بۆ ناوچەی کەرکوك:

بە حوکمی ئەوەی ناوچەی کەرکوك لەسەردەمە مێژووییەکاندا شوێنێکی گرنگی هەبووە و ناوچەیەکی سەرەڕێی کاروان و کۆچی هۆزەکان بووە، بۆیە هەردەم ڕووداوە مێژووییەکانی بەردەوام بووەو گەلێك شارستانی تێدا سەریهەلداوە لە ڕەگوریشەی ئەو شارستانییە گەلێك پاشماوەی بەجێماوەو جێگەو ڕێگەی بەرچاوی خۆی هەبووەو پاشماوەکانی بەلگەی ڕاستی ئەو قسەیەن و

دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییەی بتوانین بە لێکۆڵینەوەی بە پێزی لەسەر بکەین کە بناغەیەکی پتەوی شارستانی ئەو سەردەمە دەخاتەڕوو.

لەبەر ئەوە گەلێك هۆزو نەتەوەی وەکو (گۆتی)و (لۆلۆیی) و (هوری- میتانی)و (ئاشووری)و (کاشی)و (میدی- مادی) و (ئەخمینی)و (پرسی)و (ساسانی) بەڵگەی ئەو ڕاستییەن کەتا ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانەیان دەکردووو ئاسەواریان بەجێماوە.

گۆتییەکان یەکێکن لەو نەتەوانەی لەسەردەمانێکی زۆر زوو هاتوونەتە ناوچەی کەرکوك، یان (ئەراپخا)یان کردووەتە پایتەختی خۆیان، گەلێك لە بەڵگەکان ئەوە دەخەنەڕوو قەڵای کەرکوك لەسەرەتادا لەلایەن گۆتییەکانەوە بنیاتنراوەو لەسەردەمەکانی لەوەودوا لەلایەن هۆزو نەتەوەکانی تر دووبارە دروستکراوەتەوە.

گۆتییەکان ماوەیەکی زۆر قەڵەمرەوی ناوچەی کەرکوك‌و وڵاتی ئەکەدو سۆمەرییان کردووەو بەشێکی زۆر فراوان لەژێر ڕکێفیاندا بووەو فەرمانڕەوایی ناوچەکە بوون.

(گۆتییەکان لەسەردەمی بیست‌و سێی پێش زایینی، لەسەردەمی سەڵتەنەتی (نارام- سوئن) پادشای ئەکەد، کە لەو ڕۆژگارەدا سەرانسەری میزۆپۆتامیای تا کێوەکانی زاگرۆس‌و ئەرمەنستان‌و کێوەکانی (تاورووس) لە ئاسیای بچووك لەژێر دەسەڵاتیابووە، لاپەڕەکانی مێژوودا هاتووە، عێلام‌و ڕەنگ بێت بەشێك لە سوریاش دیسان سەر بەو قەڵەمرەوە بووبێت)[١٩].

گەلێك لە مێژوونووسان باسی ئەو ماوەیەی گۆتییەکانیان کردووەو زۆر زۆر ناحەقانە باسیان لە ڕاستییە مێژووییەکان کردووەو لەڕاستی ڕووداوەکان لایانداوە.

ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە نامەسئوولی ئەو نووسەرانە بەرامبەر بە مێژوو کە بۆ مەرامێکی دیاریکراو گوزەریان کردووە.

هەندێك لەو نووسەرانە گۆتێکانیان بە داگیرکەرو شەرکەرو بەدوفەرو تاڵانکەرو خێڵەکی ناوبردووە، بەڵام لێردا پرسیارێك دێتە ئارا: ئەویش ئەوەیە ئەگەر (گۆتییەکان) هەر خەریکی شەڕو شۆڕو تاڵابووبێتن، چۆن توانیان فەرمانڕوایی خوارووی میزۆپۆتامیا بکەن بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەسەڵاتیان بەسەریاندا بروات.

ئەوی لێرەدا گرنگە ئێمە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە گۆڕان‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەو سەردەمانەدا چۆن بووبێت و توانای فەرمانڕوایی گۆتییەکان چۆن بەڕێوەچووە.

زانیاریەکانمان زۆر کەمە دەربارەی گۆتییەکان لێکدانەوەکان تێکەڵاوی‌و دژە بیر و باوەڕ هەیە، کە گەیشتن بە بۆچوونی پێویست زۆر زەحمەتە بۆ ڕاستی مێژووەکە.

*** گۆتییەکان لەنەتەوەو هۆزەکانی کوردستانن:**

ئەوەی نکۆڵی لێناکرێت گۆتییەکان پارچەیەکی دانەبڕاوی هۆزە نەتەوەکانی کوردستانن، لەسەردەمی چاخە بەردینەکان لە دوایدا لە ناوچەیەکی دیاریکرا کۆچیان کردووەو لە مێژووی سەردەمە مێژووییەکان لە ناوچەیەکی کەرکوك‌و خوارووو ناوڕاست گیرسانەتەوە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە گۆتییەکان هەڵگری دابونەرێتی کۆمەڵایەتی شارستانی پێش نەتەوەکانی خۆیان‌و هەر لە شارستانییەکانی دەورووبەریانەوە سوودیان وەرگرتووەو گەشەیان کردووە، گەلێك لەو سیماو ئاکارانە بە مێژوویانەوە دیارە، کە هەڵگری ئەو قۆناغانەی پێش خۆیانن، ئەوەیش زۆر بەڕوونی بەدەردەکەوێت لە ڕووخساری دەموچاو و جلوبەرگ‌و پاشماوەکانیان کە هەڵگری دابونەریتی پێش خۆیانن، بەڵگەیەکی تر فراوانی قەڵەمرەوەکەیان لە کوردستان، بەڵگەیەکی ڕاستە بەوەی کە لەنێو کوردستاندا گەشەیان کردووەو لەو نێوەوە سەرچاوەی گرتووە.

(بوونی گۆتییەکان لە پێش سۆمەرییەکاندا لە ناوچەی دەشتی لیتەییدا پەیوەندی کوردستان‌و سۆمەر بەیەکەوە گرێدەدات، خۆ ئەگەر سۆمەرییەکان ئەوەی ئەو گۆتیانە نەبووبێتن ئەوا پەیوەندییەکی زۆر بە هێز لەنێوانیاندا هەبووە، پەیوەندی هاونیشتەنی یاخود هاو زاگرۆس‌و هاو کوردستانی لە پێشەوەی ئەو پەیوەندییانەیە)[٢٠].

*** هاوشێوەیی‌و هاوشارستانی نەتەوەکانی زاگرۆس:**

بەهۆی ئەو تێکەڵاوییەوە لەنێو ئەو نەتەوانەی کە ژیاون لە ناوچەیەی زاگرۆسدا، بووەتە هۆی ئەوەی هەموو شارستانییەکان لە یەکترییەوە نزیك بن‌و هەریەکەیان هەڵگری کۆمەڵێك دابوونەریتی کۆمەڵایەتی ئەویتربن، بۆیە دۆزینەوەی پاشماوەکانی گۆتییەکان زۆر زەحمەتە، بەڵام دەتوانین بڵێین گۆتییەکانیش بەشێکن لە هەڵگری هەمان سیفەت‌و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەکانی زاگرۆس‌و دەتوانین بڵێن تێکەڵاویان لەگەڵ ئەو نەتەوانەو ژیانیان لەو ژینگەیە بێ هۆ نەبووە لە دابراندنیان لە هەڵگری هەریەکە لە دابوونەریتییەکتری، ئەمیش زیاتر ئەوە پشتراست دەکات، کە ماوەیەکی دوورو درێژ لەیەك شوێندا ژیابێتن‌و تێکەڵاوی سەردەمەکانییەکتری بووبێتن بۆیە زۆر بە زەحمەت جیاوازی لەنێوانیان دەکرێتەوە، لە جلوبەرگ‌و بیناسازی‌و نەخش‌و نیگارو دروستکردنی کوتەڵەو گۆزەو دەفری هونەری ناو ماڵدا.

(سۆمەری‌و ئاکادییەکان زۆر بە نارەحەت فێری زمانی گۆتییەکان دەبوون، لەبەر ئەمە ئەو نوسراوانەی کەبە زمانی گۆتی نوسراوەتەنەوە بە زۆر شێوە جۆرلێك دراونەتەوەو نووسراونەتەوە، ئەمە جیایی شێوەی ئەو زمانانە دەسەلمێنێت.

بەڵام زمانی گۆتی زمانێکی سەربەخۆیەو خاوەن ڕێزمان بووە، هەروەکو وتمان لەوە دەچێت تارادەیەك لەگەڵ زمانەکانی کۆمەڵە عیلامییەکان (عیلامی‌و کاسی‌و لۆلۆیی‌و ڕەنگ بێ کاسپییەکانیش)دا پەیوەندی بووبێت، لەلایەکی ترەوە شێوەی بەکارهێنانی زمانی (گۆتی) بێت لەگەڵ زمانەکانی ترا)[٢١].

ئەمە یەکێکە لەو بەڵگە گرنگانەی کە گۆتییەکان هەڵگری کەلەپووری ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی نەتەوەکانی زاگرۆس‌ن‌و

هەر لەوێوە ناوی شارستانییەتەیان خواردووەتەوە.

لێکگەیشتنی زمانی گۆتییەکان لەگەڵ نەتەوەکانی زاگرۆس و جیاوازییان لەگەڵ زمانی نەتەوەکانی ئەکادو سۆمەرییەکان بەڵگەییەکپارچەیی نەتەوەکانی زاگرۆسە.

هەر لەسەرەتاوە کە گوتییەکان خواروو ناوەراستیان داگیرکرد، سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکان دژایەتیان کردن و گەلێك لەو مێژوونووسانە بەو چاوەوە سەیری گێرانەوەی رووداوەکان دەکەن، بەڵام هەندێك لەو نووسەرانە هۆی ئەم بەربەرەکانییە دەگێرنەوە بۆ ئەوەی:

(گۆتییەکان هەوڵیانداوە رژێمی کۆمەڵایەتی سۆمەرییەکان بگۆڕن کە رژێمێکی (کۆیلایەتی) بووە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی گۆتییەکاندا.

گۆتییەکان کە سەرەتایی و ژیانی دەستوورانە بووە، بۆیە لەوانەیە گۆتییەکان هەوڵی ئەوەیانداوە ویستوویانە ئەو کۆیلانە لە دیلێتی رزگار بکەن کە زۆربەیان کۆیلەی ناوچەکانی کوردستان بوون، بۆیە زۆر لە راستییەوە نزیکە کە گۆڕینی رژێم و پێڕۆی باری کۆمەڵایەتی زۆر پێشکەوتوو بووە لەلایەن گۆتییەکانەوە تووشی هێرش هوبێت)[٢٢].

چونکە جیاوازی رژێمەکان و جیاوازی دابونەرێتەکان و جیاوازی هەردوو ژینگەکان، ژینگەی سۆمەری و ژینگەی گۆتییەکان یەکێك بووە لەو هۆیانەی کە رۆڵیان بینیوە و تێکەڵکردنی زۆر مەحاڵە بووە و هەردوو لای تووشی کاولکاری کردووە.

هەروەها لەماوەکانی دواییدا یەکێك لە پادشاکان تەنها چل رۆژ فەرمانڕوایی کردووە، بەڵگەی کورتی فەرمانڕوایی پادشا گۆتییەکان، دەتوانین ئەو راستییە بپێکین کە رژێمی فەرمانڕوای خێڵەکی بووە، واتە یەکگرتنێکی خێڵەکی هەبووە، لەنێوانیاندا کە جۆرێك بووە لە دیموکراتی سەرەتایی[٢٣].

(زۆر لەوەدەچێ بەمجبۆرە خەڵکی ستەم دیدەی کیشوەری ئاکاد سوودیان لەپەلاماری گۆتییەکان وەرگرتبێت و هەوڵیان بۆ ئازادی خۆیان دابێت.

بەمجۆرە لەوە دەچێت سەرکەوتنی گۆتییەکان لەپلەییەکەمدا ئازادی بەخشیبوو، بەڵام لە کۆمەڵایەتییەکی تایبەتیدا دەژیان)[٢٤].

دەربارەی بیرو باوەری ئایینی لای گۆتییەکان و چۆنێتی بیرو باوەریان وسرووتە ئایینییەکانیان، زانیاریمان زۆر کەم بووە یان ئەو زانیارییانەی کە هەمانە پچڕ.پچڕبووە، یان تاکو ئێستا چاوەڕێی بەرهەم و لێکۆڵینەوەی زیاترین.

(سەربارەت بە زاراوەی گۆتی وەك سەرچاوەکانی مێژووی کۆن باسی دەکەن، بۆچوونی جیا.. جیا هەیە بەمانای جیاوازی شیکراوەتەوە، بەڵام راستییەکە جێگای گومان نییە کە زاراوەی گۆتی لای ئەکەدییەکان بەمانای (بەرز) هاتووە، بەڵام هەندێك پسپۆری زمانەوانی مێژووی کۆن پێیان وایە زاراوەی گۆتی لە زاراوەی (uru- ئور) هاتووە کە بەزمانی سۆمەری بەمانای (شار) بەخشیوە، پاشان پێشگری (k- ك)ی خراوەتە سەرو بووەتە (کور- kuru)وە بەو پێیە ئەکەدییەکان پیتەکانی (ر- د- r- لە)ی سۆمەرییان کردووە

بە (تی- t)سەرجەم وشەکە بووەتە (کوت- kut) یان (کوتی- kuti) سەرئەنجام زاراوەی (گۆتی) کەوتووەتە نێو فەرهەنگی زمانەوانی ئەکەدییە.

بەپێی ئەو راستیانەی سەرەوە زاراوەی (گۆتی) لە زاراوەی (ئور)ی سۆمەری واتا (شار) یان لەزاراوەی (کردا)ی سۆمەری بەواتای (بەرز) هاتووە و هەردووکیان ئەو راستییە دەسەلمێنن کە مەبەست لەخودی زاراوەکە شاری (ئەراپخا) و بەرزایی (قەڵای ئەراپخا) بووە)[25].

(ئەراپخا) ناوی ئەو خواوەندە بووە کە دانشتوانی شاری کەرکوکی کۆن پەرستویانەو باوەریان بە یەکتاپەرستی (ئەراپخا) بووەو خواکەیان لە شێوەی (کۆتەل)دا دروست کردووەو لەسەر دەروازەی شارەکە دایانناوەو تەنانەت وەك رێزێك بۆ ئەو خوایە لەسەرجەم شارۆچکەو گوندەکانی سنووری دەسەڵاتیان وێنەی خواکەیان لە شێوەی (بت) دروستکردووەو لەسەرجەم ماڵ و شوێنە گشتییەکاندا بە بەرزاییەوە دەیانناوە[26].

باوەریان بەرۆژی دوایی هەبووەو مردووەکانیان بە مەراسیمی تایبەت بە خاك سپاردووە لای (ئەراپخا) داوای لێخۆشبوونیان بۆ کردووە[27].

*** کەلتوور و شارستانی هوری-میتانییەکان:**

یەکێك لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی (هوری- میتانی) ئایینی بووە، کە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەکەدا گەشەی کردووەو هەڵقوڵاوی کۆمەڵگەی هوری و نەتەوەی میتانییەکان بوو، پێویست بەوە دەکات لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت و چۆنیەتی دیاردەی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگەیە شی بکرێتەوە تاکو ببێتە بنەمایەك بۆ دیاردەی دەرەنجامەکانی هاوپەیوەستی ئایینی و پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان.

لەبەر ئەوە کاتێك شرۆڤەی ئایین بکەین لە دەوڵەتی هوری- میتانیدا دەبێت هاوسەنگییەکی بەرچاو لەگەڵ بنەماکانی دروستبوون و گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بدەین بۆ بەرچاو بەراوردکردنی لەگەڵ ئاییندا.

خورییەکان باوەریان بەگیان و مردن زیندووبونەوە بووەو قۆناغ بەقۆناغ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئایینیان وەرگرتووەو لەو دیاردەیەدا قۆناغی خۆی بریووە.

"بەڵگەشمان دەربارەی خورییەکان ئەوەیە ئەو درەختەیە کە کەوتووەتە نێوان دوو گیانداری ماڵییەوەو ئەو درەختەش درەختی ژیان بووەو پەیوەندی بە گۆی خۆری باڵدارەوە هەبووە، خێڵە هیندو ئەوروپیەکانیش لەم بیرو باوەرە ئایینییەوە بێ بەش نەبوون، بەڵکو ئەوانیش چەند خواوەندێکی تایبەتی خۆیان هەبووەو پەرستوویانە، ناوی ئەو خواوەندانەش لەو پەیماننامەیەدا هاتووە کە پاشاکانیان بەسووتیانن لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکانیاندا، هەروەها ناویان لە پەرستگا هیندیە کۆنەکاندا هاتووە کە دیارترین ئەو خواوەندەشیان (میترا، قارونا، ئەندار)ن"[٢٨].

میتانییەکان جگە لەو خواوەندانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن، ئاشنایەتییان لەگەڵ چەند خواوەندێکی تر

هەبووە، وەك خواوەندی (تیشوو. حیبا)ی ژنی کە خواوەندی خورییەکان بوون. ئەم خواوەندانە خۆیان خستووەتە ناو بیرو باوەری ئایینی دانشتوانی باکووری سوریا کە حەیسییەکان بوون، دانشتوانی باشووری کوردستان هەروەك میتانەکانیش ئەو باوەرەیان لادروست بووە کە هێزێکی خوایی هەیە دەست دەخاتە چارەنووسی مرۆڤەوە دەیمرێنێت و زیندووشی دەکاتەوە، بێگومان ئەم بیرو باوەرانەش لە کاریگەری ئایینی میزۆپۆتامیا بەدەرنەبوون. بەڵکو بیروباوەری (ئەکەدی و سۆمەری و بابل)یەکان رۆڵی خۆیان هەبووە لە دروستکردنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لای میتانی و خۆرییەکان.

کەلچەری میتانی لەبنەچەی کەلچەری سۆمەرییەوە هەلقولاوە، پەرستگای میتانییان ژمارەیەکی زۆر خواوەندی تێدا کۆبووەتەوە، کە لە ئەنجامی داگیرکردنی ئەو شوێنانەی کە دەکەوتنە ژێردەستیان زۆر دەبوون و خواوەندی ئەو شوێنەیان دەست لێ نەدەدا، بەڵکو پارێزگاریان دەکردن و رێزیان لێ دەنان و لەسەر خوو رەوشتی خۆیانیان دەهێشتەوە، لەترسی سەرهەڵدانی بێزاریی، نێوەی ئەو خواوەندانەش لەکۆتایی پەیمانە دووقۆڵییەکانی (حەیسی) و (میتانی) هاتووەو ژمارەی ئەو خواوەندانە هەموو رەگەزەکانی نێومیرنیشینی میتانیان گرتووەتەوەو لەپاڵ (تیشوب و خیبا)ی هاوڕێی، هەروەها خواوەندانی وڵاتی دراوسێ و کێوانی زاگرۆس و رووباری دیجلەو فورات و ئاسمان و زەوی و باوو هەور، هەروەك ئەم هەڵسوکەوتە لە دەوڵەتی حیسییەکاندا پەیرەوی دەکرا[٢٩].

ئەم بیرو باوەرانەش کە هاتوونەتە ناو ئایین و کەلچەری خوری و میتانییەوە مەرج نییە کت و مت رەنگی دابێتەوە لەناو ئایینی میتانییەکاندا، بەڵکو دەکرێت گۆرانکارییەکی باشیان بەسەردا هێنابێت و لەگەڵ کەلچەری خۆیاندا گونجاندبێتیان، لێرەدا دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١. ئایین لە کۆمەڵگەی (هوری- میتانیدا) تێکهەڵکێشی شارستانییەکانی لەوەو پێشەوەی خۆی بووەو لەبەر ئەوەی ئەو نەتەوانە لە چوارچێوەیەکی راست و دروستی کۆمەڵایەتیدا گەشەیان کردووە بۆیە وەرگرتنی ئەو ئایینانەش زۆر ساناو سادەبووە بۆ هەڵسووکەوتکردن لەگەڵیدا.

٢. هەمە جۆری پەرستنی خواوەند لە دەوڵەتی میتانیدا بەڵگەی پێشوازیکردن بووە لەبەردەم وەرگرتنی سرووتە ئایینییەکاندا و هەمەچەشنی بیروباوەرەکان.

٣. داب و نەریتە ئایینییەکان ناموی کۆمەڵگەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان نەبووە، بەڵکو هاوپەیوەستییەکتری بوونە.

٤. بەرزی خواوەندەکان لە رێکەوتنە دووقۆڵییەکاندا.

کەواتە هۆزی هیندو ئەوروپی کە بەرەو خاکی میتانیان هاتن ئەو جۆرە بیروباوەرو میتۆلۆژیانەیان لەگەڵ خۆیاندا هێناو بیرو هۆشی هوریان پێ زاخدا لەنێو دەوڵەتی میتانیدا لە هەزارەی دووی پێش زایینیدا، ئەمەش بەلایەنی بنچینەیی بناغەی کەلەپووری هۆش و بیری گەلی کورد دەژمێدرێت.

٥. ئەگەر سەیری کەلەپوورێکی تری ئەو سەردەمە بکەین شێوەی جلوبەرگی هوری- میتانەکانی ئەو سەردەمەیە، بەتایبەتی ئەو پاشماوانەی کە بەجێماوە بۆمان لەهەریەکە لە (نوزی) و (کوربوخانی) و (ئەراپخا).

ئەگەر بەراوردێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی شێوە جلوبەرگیان بکەین دەگەینە ئەو راستییە کە تێکهەڵکێشێکی ئەو جلوبەرگە لەو روانگەیەوە سەرچاوەی گرتوە کە پاشماوەی نەتەوەکانی ئەو سەردەمەی پێوەدیارە لەهەریەکە لە هۆزو ئەو نەتەوانەی لەو ناوچانەدا شارستانیان هەبووە، لەگەڵ تێکهەڵچوونی باری ئایینی ئەو نەتەوانەو وەرگرتنی روخسارەکانی خواوەندەکانی و رەنگدانەوەیان لەسەر بنەماکانی جلوبەرگ ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە جۆری نەخش و جۆری درێژی و کورتی جلوبەرگەکە.

٦. (هوریەکان لەوباوەرەدابوون، کە لەدوای مردن ژیانەوە هەیە، بەڵگەش ئەو درەختەیە، کە کەوتووەتە نێوان دووگیانداری ماڵی، ئەمە چەقی ئەو بابەتانەن، کە مۆرەکانی هووری نواندویانەو ئەو درەختەش، درەختی ژیان بووەو پێوەندی بەکۆی خۆری باڵدارەوە هەبووە، لەپاڵ ئەو نیشانانەشدا مۆرەکان لە نواندنی وێنەی زۆرانێتی نێوان شێر و گا و هەندێك گیاندارانی خوراڤ دی و نیگاری ئاهەنگی خواوەندانی پیرۆز بێ بەش نییە)[٣٠].

٧. (خوورییەکان، شێوەیەکی فراوان لەچەندین ناوچەی جیاوازی جوگراڤ و شارستانییەتدا بڵاوبووەتەوە، ئەویش بووەتە هۆییەکانگیری نەبوون و نەگونجا و بوونی بیروباوەرو رێو شوێنی ئایینی خووری لە چەندین خوداوەند کە خوورییەکان دەیان پەرست ژمارەیەکیان لەو ناوچە تازانەدا وەریاندەگرت کە لێی بڵاوبونەتەوە، دواتر لەگەڵ کۆمەڵە خواوەندانی خۆیاندا دەیانگونجاندن)[٣١].

هەر لەم تەوەرەدا بووە سازاندنی پەرستنی جۆربەجۆر تایبەتمەندی خواوەندی نوێی لێکەوتەوە کە بیرو باوەری تازەی تێدا گەشەی کرد کەلەوەدواوە ئەو دیاردەیە لە سرووتە ئایینییەکان و ئایینە نوێیەکاندا بەزەقی بەدەرکەوت.

٨. هەروەها خواوەندەکانی هوری- میتایان دەرهاویشتەی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی میتانی بووەو پلەو پایەی لەدابەشکردنی چینە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆی بینیوەتەوە.

(کۆمەڵەی خواوەندانی خووری چەندین خواوەندی لەخۆگرتبوو، خواوەندی (تیشوب) پاشان خواوەندان بووە، کە بەخواوەندی (کەش) ناسرا ناوەندی سەرەکی پەرستنی لە شاری (کومی- kumme) بووە، بۆیە نازناو پاشای (کومبیای) لێنرابوو، لە (ئەراپخا) و (نوزیدا) گرنگی زۆر هەبووە، برگەی دووەمی ناوی هەموو پاشایانی (ئەراپخا) ی پێکێنابوو وەك: (کیپی) تیشوب (موشتیا)، پایەی لەدەوڵەتی میتانیدا زۆر بەرزبووە (توشراتا) و سەروەری وڵات و بەهاوتای (ئامون) خواوندی (میسری) ناوبردووە.

خواوەندی (خیبات- heoat) خێزانی (تیشوب) خواوەندێکی تری گرنگی (خوری) بووە.

ئەم خواوەندانە زیاتر لە ناوچەکانی باکووری

سوریا پەرستراوە، چونكە پاشماوەی پەرستگاكانی لەم ناوچانەدا كەلە خۆرئاوای (دیجلە)دان، لەگەڵ ئەوەشدا لەناو كەسییەكانی نوزیدا هەن وەكو (شوەر- خیپات)و ( شەنتور- خیپات) كە خزمی میرێكی (نوزی) بوون.

ناوی دوو كچە شازادەی میتانیان (كیلو- خیپات)و (تارو- خیپات) بوون كەلە كومەڵگەی خورید! بوون.

خواوەند (شەوشكا- عەشتار) خوری پلەیەكی باڵای لە كۆمەڵگەی خواوەندەكاندا هەبووە، خوشكی (تیشۆب) بووە، لەچاخی ئوری سێیەمەوە ناوی براوەو زۆر جار بەعەشتار لكێنراوە، بەتایبەت لە نەینەواو لە خۆرهەڵاتی دیجلەدا، لەدەوڵەتی میتانیدا پایەیەكی بەرزی هەبووە، ئەم خواوەندە بەوە ناسرابوو كە توانایەكی بەهێزی لەچاكبوونەوەی نەخۆشیدا هەبووە، لەنوزیدا پەرستگایەكی گەورەی هەبووە ساڵانەش بەبۆنەی نۆژەنكردنەوەی ئاهەنگیان گێراوە، پێدەچێت خواوەندی تیشۆبیش لەهەمان پەرستگادا پەرسترابێت، هەروەها لە (ئەزوخینا)و (كوروخانیدا) پەرستراوە)[٣٢].

٩. بوونی پەرستگای هەریەكە لە (نوزی)و (كوروخانی) بایەخدانی لە كەركوكدا لەدەوڵەتی میتانیدا ئەوە دەگەیەنێت كە ئاین پێگەیەكی تایبەتی هەبووە لە كۆمەڵگەو پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكاندا.

### * كۆمەڵگەو چۆنیەتی رێكخستنی چینە كۆمەڵایەتییەكانی كۆمەڵگەی هوری- میتانی لە كەركوكدا:

هەر دەوڵەتو هێزو ئیمپراتۆریەتێك كۆمەڵێك بنەماو رێسای یاسایی دەوری گەورە دەبینێت لە دروستكردنو پێكەولكاندن، كۆمەڵو مرۆڤ لە چوارچێوەی ئەو یاسایانەدا گەشەی كردووەو ژیانی تێدا بزاوتنی كردووە كە هاوپەیوەستی پەیوەندیە كۆمەڵایەتیو ئابوورییەكانی تێدا گرێداوە.

كۆمەڵگەی هوری- میتانی تایبەتمەندی خۆیو رێگاكانی سەرهەڵدانی دەوڵەتو دروست بوونی هەمان ئەو پەیرەوانە بوونە كە لە سەرمانێكدا كۆمەڵێك هۆكار دەوریان هەبوو لە دروستبوونی، كە چینەكانی كۆمەڵی لەسەر دارێژاوە بۆ ئەوەی بنەمای سێ ئاقاری گەورەی لەسەر رۆبنرێ.

(باری كۆمەڵایەتیو ئابووری پێكهاتەی كۆمەڵایەتی میتانی لە دوو چینی سەركی پێكهاتووە ئەوانیش (میتانی) كەوەك چینێكی ئەرستۆكرات بەسەر چینی دووەم (خوری) یە نیشتەجێكانی بنەرەتی ناوچەكە بەدەركەوتن، بوونەتە چینی دەسەڵاتدار، بەسەریانەوە پێشەوایەتیان دەكردن، ئەم پێشەوایەتیەش مایەوە تاكو لە ئەنجامدا تێكەڵ بەیەك بوون، هەروەكو (هرتسفیلد) دەڵێت:

"خوورییەكان تێكەڵ بوون لەگەڵ میتانییەكانو یەكیان گرتو یەككرتنەكەشیان سیاسی بوو"، بێگومان ئەویش سەرەتایەك بوو بۆ پێكهانی كۆمەڵگەیەكی تازە، دواتر توانییان مومارەسەی لایەنە جیاوازەكانی ژیانی خۆیان بكەن، بۆ نموونە: لەلایەنی سیاسیەوە، وەك پەیرەوكردنی سیستمێكی فەرمانرەوایی كە شێوەیەكی هەبووە لە شێوەی چەند هەرێمێكییەككرتوودا، وەك شاری (نوزی) كە كۆشكو پەرستگای تایبەتی خۆی هەبووە، دەوری شاری بە بورجو قەڵا دەورە دراوەو پاشای تایبەتی خۆی هەبووە، كە لە دەقە بزمارییەكاندا وەك سەرۆكی قازییەكانو سەركردەی سوپا باسیان دەكەن، جگە لەوە هەبوونی شاژن بەتەواوەتی پشتگیری ئەو رایەمان بۆ دەكات كە ئەو شارانە خاوەنی بەرێوبەرێكی تایبەتی خۆیان بوونەو لەلایەنی كەسێكەوە بەرێوەبراون هەروەك یەكێك لەو كەسانە كە سەرۆكی قەڵای (نوزی) بووە ناوی (تیخب تیللا) بووە كە ناوی لە تۆمارەكانی شاری (نوزی)دا هاتووە.

هەبوونی چینێكی تایبەت لەناو كۆمەڵگەی میتانیدا بەناوی (الماریانی) كە خەریكی بەخێوكردنی ئەسپو بەكارهێنانی بۆ جەنگو راكێشانی ئامێرەكانو بەكارهێنانی كەشتی جەنگ وایكرد لەوڵاتی میتانی ببێتە ویلایەتێكی سەربازی كە مەترسییەكی گەورەی هەبووە بۆ وڵاتی دەوروبەری، هەر وەك لەسەرەتادا توانییان بەشێكی زۆری وڵاتی (حەیسی)و (ئاشوورییەكان) داگیربكەنو رێگە بگرن لەو قەتارە بازرگانییانەی كە لە ئاشورەوە بەسەر رووباری فوراتدا تێدەپەرینو دەچوون بەرەو رۆژئاوا، دەبێتە بەڵگەیەكی دیار بۆ هەبوونی سوپایەكی بەهێز كە وەك چینێك لەناو كۆمەڵگای میتانیدا.

پێدەچێت ئەم میتانیانە پاش ئەوەی بوونە رێگر لەبەردەم كاروانە بازرگانییەكانی ئاشووری بەرەو رۆژئاوا، خۆیان درێژەیان بەم بازرگانییە دابێت چونكە لەو تابلۆ بازرگانییانەی كە لە (نوزی) دۆزراوەتەوە، ناوی چەند خێزانێكی هێناوە كە خەریكی بازرگانی بوون (گیبل، شارو یوهیشیتی سینای، ئینكیا، ولو، موكری، ئیشۆب ئاكواتێل، یوقیای هاشیب، تیللا پیاتشێنیی، تیشانای)، هەوەها سەرچاوەیەكی تری ئابووری ئەم كۆمەڵگایە لەسەر كشتوكاڵو پیشەسازی بووە)[٣٣].

### * خێزان لە ئەرابخا:

ژیانی خێزانداری لە ئەراپخا هیچ جیاوازێكی ئەوتۆی نەبوو لە هەموو ناوچەكانی میزۆپۆتامیا، تا سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زاینی، بەڵام كاتێك هۆزەكانی هورییەكان ئەم شارەیان خستە ژێر دەسەڵاتیانەوە، هەستان بە داهێنانی جۆرێكی تر لە هەڵگرتنەوە بە ناوی (هەڵگرتنی درۆ)، گەلێك یاسای میراتیان داهێنا، هەروەها (ژن هێنانی كرینیان) بە كارهێنا.

بەڵام رژێمی خێزان رژێمێكی باوك سالاری، چونكە پیاو دەسەڵاتێكی گەورەی هەبوو لە بەرامبەر خێزانە كەیان، تا دەگەیشتە ئەوەی كە بپەرستایە ئەگەر خێزانكەی پێویستی بوایە[٣٤]، دەربارەی ژن هێنان لە ئەراپخا بە شێوەی، ئەوتۆیە كە هەریەك لەو پیاوە یان ئەندامێكی خێزانەكە، هەڵدەستێت بە دیاری كردنییەكێك بۆ خۆی، داواكاری پێش كەش بە ماڵی كچەكە دەكات. لە دوای رێكەوتنی هەردوولا، ئافرەتەكە حەقی رەزامەندی یان رازی نەبوونی هەیە، هەروەها ئافرەت

کاتێك پیاوەکەی مرد. حەقی ئەوەی هەیە جارێکی تر شووبکاتەوە[٣٥]. لە پاڵ بەم ژن هێنانە ژن هێنانێکی تر لە ناوچەکەدا سەری هەڵداوبوو ئەویش (ژنهێنانی کڕینی) بوو، ئافرەت دەفرۆشرا وەکو هەر کەلوپەلێکی تری ماڵەکە، بەپێی هیچ ڕێکەوتنێك، خاوەنی ئافرەتەکە، مارەیان دەکرد لە هەر پیاوێك، لە زۆربارداا لە پیاوی بەندیو لە هەندێك باری کەمدا لە پیاوێکی سەربەخۆ، مەرجی شووکردنی لەو کاتەدایە کە مێردییەکەمو دووەمی مردبێت، هەر بەو جۆرە، ئامانج لێی بۆ پارێزگاری کچەکەیان لە ژیان بوو[٣٦]. ئەم جۆرە ژنهێنانە زۆر بڵاوبووەتەوە لە هەزارەی دووەمی پێش زاینی لە ولایەتەکانی ڕۆژهەڵات لە ئەراپخا، هۆکاری سەرەکی بە هۆی فەقیری خێزانەکانە بۆ فرۆشتنی کچەکانیان ئافرەت لە ئەراپخادا حەقی موڵکداریو کڕینو فرۆشتنو ئاڵوگۆڕیو گەلێك کاروباری تری هەبوو[٣٧]. هەروەها لە هەزارەی دووەمی پێش زاینی وبەتایبەتی لەنێو چینە بۆرژوازییەکان، گەلێك شازادەی ئافرەت کە خێزانو خوشکی پاشاکان بوونە فەرمانڕەواییان کردووە، گەلێك شارولادێ بە ناوی پاشاوە ناوی وەکو شازادی ئەمینایا بووکە خێزانی پاشا (ئەتخی - تشیوٚپ) پاشای ئەراپخا بووە، کە فەرمانڕەوایی زەوی زارێکی زۆری دەکرد لەژێر ناوی پاشا ( شاوشتار) پاشای (خانیکالبات)، ئەم ئافرەتە شوێنێکی بەر چاوی هەبوو لە بەرئەوەی ئافرەتێکی دەوڵەمەندبووە، پاشا (شاوشتار) گەلێك گوندی خستبووە ژێر دەستیەوە، بەڵام کاتێك ویستییەکێك لەو گوندانە لێ وەربگرێت هەستا بە بەخشینی بە گوندی تر بۆ شازادە (ئەمنیایا)[٣٨].

لێرەدا دەگەینە ئەم ڕاستییانەی خوارەوە:

١. کۆمەڵگەی هوری- میتانی، کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بووە، دارشتنی ژیانی لەسەر بنەڕەتی چینی دەسەڵاتدارو چینی گشتی، چینی زۆری کۆمەڵانی خەڵك، چینێك کە هەموو دەسەڵاتێکی لەژێر دەستدایەو چینێك بێ دەسەڵاتە کە لەلایەن چینی دەسەڵاتدارەوە چەوسانەتەوە، هەروەها چینی دەربەگو چینی کۆیلەو دەسەڵاتدار، کۆمەڵی هوری- میتانی تێدا ڕۆنرابوو.

٢. هوری- میتانییەکان کۆمەڵگەیەکی چالاك بووەو تواناکانی لە بوارەکانی کشتوکاڵو پیشەسازیو بازرگانیدا بەدەرکەوتووەو هەموو دەم لەگەڵ ناوچەکانی تردا لە جموجۆڵو بزاوتندا بووە.

٣. هوری- میتانییەکان کۆمەڵێك ڕێساو هاوپەیوەستی کۆمەلایەتی لێکیانی بەستبووو بنەماکانی ژیانی پەیوەندییەکانی تێدا گەشەی کردووەو ئەو پەیوەندییانە هاوپەیوەست بووە، کۆمەڵێك یاسای زەوی کە گرێدراوییەکتری بوونە لەنێو یەکتردا.

٤. لە تۆمارە تایبەتییەکانی (نوزی)دا دوو جۆر دەسنووسی هەیە دەربارەی زەوییە کشتوکاڵییەکانو بەخێوکردن هەیە جۆرییەکەمی بریتییە لە دەسنووسی قەرزی (تدنۆتۆ):

کە درێژخایەن دەبێت، دەتوانرێت بەدەستبهێنرێت لەلایەن کەسێکی بارمتەکەرو باوەڕپێکراو، قەرزدار دەتوانێت کار بکات بۆ ئەوەی ئەو سوودە بەدەستبهێنێت هەتا بەوەی کۆی ئەو قەرزە بنەڕەتە بداتەوە، دەتوانێت قەرزدەر سوود لەو موڵکەی قەرزدار وەربگرێت هەتا ئەو کاتەی قەرزەکەی دەداتەوە، بۆیە تا ئەو لەژێر کاری قەرزدەردا دەبێتو دەتوانێت کاری پێبکات.

جۆری دووەم: بریتیە لە دەسنووسی قەرزی شێوە (مۆرۆتۆ) کە ئەم وشەیە گۆڕاوە بۆ (ئەحۆتۆ) کەمانای گۆڕینی بۆ سامانە نەگۆڕەکانی بەڕێگای بەخێوکردن (موڵکداری تازە) وەکو کوڕو برا، بەڵام لە (ئەراپخا)دا زۆر شتی پارچە کشتوکاڵییەکان لەسەر ئەم شێوەیە ڕووی نەداوە، چونکە هەر زەوییەك لە (ئەراپخا)دا موڵکدارییەکەی دەبەستییەوە (الالتزام) بە (تاجەوە)، وە قەدەغەیە فرۆشتنی[٣٩].

هەموو دۆسییەکانی پارچە کشتوکاڵییەکان لە جۆری دووەم پێکهاتووە لەسەر بنەڕەتو بەکارهێنانی بەخێوکردنی بەڕاست کە هەر هاووڵاتییەکی سەربەست ماف بەدەستهێنانی یارمەتی هەیە لەماڵەکەیدا، کە ئەمەش بەڕێگای بەخێوکردنی کەسێك کە دەبێتە میراتگری ڕەوای (شەرعی)[٤٠] ئەو لەحاڵەتەکانی بەخێوکردنی بەڕاست دەبێتە هۆی دیاری کردنی قەباری زەوی کشتوکاڵیو شوێنەکەیو هەر موڵکدارییەکەی تری بەخێوکراو کە باسی لێنەکراوە،لەسەر بەخێوکەر ئەوەیە کە گوێڕایەڵی بەخێوکراو بێتو خواردنی بداتێو جلوبەرگی بۆ بکڕێتو (پۆشتەی بکات) بەدوایدا بگەڕێت ئەگەر ڕفێنرا، کاتێکیش دەمرێت بۆی بگیرێتو بینێژێت. لەکاتی گۆڕینی (موڵکداریەتی ڕاست) بۆ بەخێوکراو دەبێتە ئەوەی کە ڕزگاری بێت لەهەموو دەربەستییەکی (پابەندی) هەبووە لەوەپێش لە (ئەراپخا)دا زەوی موڵکی (تاجە)وە بەپێی یاسا ڕێگای ئەو کەسانە دەدات کە تەنها هەڵسن بۆ گۆڕینی پارچەکانیان (لەگەڵ وێنەی خزمەتی بەراوردکردنی دابو نەریتی باری وڵاتەکانی دراوسێی نوزی) دەردەکەوێت هەر یەکە لە خزمو دراوسێ دادەنرێت بە هەڵبژێرەرییەکەم بۆ کڕینی زەویو زار ئەگەر بفرۆشێت.

بەڵام ئەو ڕێرەوەی کە وڵاتی (نوزی) گرتوویەتی لە گۆڕینی موڵکداریەتی، دەتوانین بڵێین بەڵگەیە بۆ بوونی کۆمەڵگایەکی خێزانی فراوان بۆ موڵکداری ڕەوایی (شەرعی) زەوی، بەڵام (کۆشکیر) لەو باوەڕەدایە کە بەخێوکردنی هەر کەسێك وەکو کوڕ یان برا کارڕایکردنێکی شێوە درۆیی تەواوە، چونکە ناتوانین ئەوە بکەینەوە بۆ بوونی دووبابەتی پەیوەندی خزمایەتی بەناو دروستکراو یان درۆ.

٥. بوونی دادگاو دادوەرو لێپرسینەوە دەربارەی تاوانو کارو کردەوەی فرمانڕەواکانی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی هوری- میتانییەکان، دەورێکی باڵایان هەبووە، لە لێپێچینەوەی کاروبارەکانی ڕۆژانەی وڵاتەکە لەناوچەکانی (نوزی)و (کوروخانی)و (ئەراپخا)دا.

بۆ نموونە یەکێك لەو دادگایانەی کەلە (نوزی) بۆمان بەجێماوە دەربارەی دادگاییکردنی فەرمانڕەوا (کوشی) یە دەربارەی ئەو تاوانەی کە بەرەوڕووی کراوەتەوە لە دادگایەکی ڕاستدا تاوانەکان یەکلاکراوەتەوە.

ئەو تاوانەی کەبەرەو روویکراوە بریتییە لە بەرتیل‌و فێڵ‌و دەستدرێژی‌و گەندەڵی فەرمانڕەوایەکەی.

هەروەها لە دادگایەکانی نوزیدا بەردەکەوێت کە دادوەرو نووسەری دادوەر جێبەجێکەری کاروباری دادوەرو سەربازی جێبەجێکردنی سزای تاوانەکان زۆر بە ڕێکوپێکی لەکاروباری ڕۆژانەی کاروباری دادگاکانیاندا نیشان دراوە.

٦. لەبەر دابەشکردنی کۆمەڵگەی (هوری- میتانی) بۆ کۆمەڵگەی چینایەتی، ڕەنگدانەوەی تەواوی هەبووە بەسەر شێوەی جلوبەرگ‌و بەکارهێنانی جلوبەرگەکانیان لەسەر شێوازی دارشتنی چینایەتی.

"خورییەکان میللەتێکی شەرانگێز نەبوونە لە بواری شارستانیدا، کاریگەرییان بەسەر کۆمەڵگاکانی دەوروبەریان بەجێهێشتووە و کەوتوونەتە ژێر کارگەرییانەوە، گەلێك جێ پەنجەیان لە ڕۆژئاوای ئاسیا بەجێهێشتووە، هەروەکو ئەوەی کە جرنۆت فیلهلم دەڵێت:- خورییەکان لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاین لە ناوچە شاخاوییەکانی سەرووی ڕۆژهەڵاتی ولاتی نێوان دوو ڕووبارەوە هاتوون و لە گواستنەوەی شارستانی بۆ سوریا و ئاسیای بچووك"(٤١).

*** هاوسەردەمی هاتنی ئاشوورییەکان:**

ئاشوورییەکان قوناغێکی تر بوون، کە دوای بەربەرکانی دوورو درێژ لەگەڵ (هوری- میتانییەکان)دا توانیان لە سەردەمی ئاشووری ناوەراست کۆتایی بە ئاقاری ڕۆژهەڵاتی (هوری-میتانییەکان) کە لە نوزیدا بوو بێنن‌و بەرە بەرە ئیمپراتۆرییەتەکەیان لەناوچوو.

ئاشوورییەکان جیاوازییەکی گەورەیان هەبوو لەگەڵ هوری- میتانییەکانداو گەلێك جیاوازی‌و شارستانی‌و کەلەپوری خۆیان هەبوو، هەڵگری تایبەتی‌و خاسیەتی خۆیان بوون.

ئاشوورییەکان لە ڕووی زمانەوە، زمانێکی جیاوازیان هەبوو لەگەڵ زمانی هوری- میتانییەکانداو شارستانی زمانەکەیان هەڵگری ناوچەیەکی جیاواز بوو لەگەڵ ئەوەی تایبەتی ئەوەی پێوەبوو کە بێتە قۆناغێکی جیاوازو کاریگەری زمانەوانی لەوەو دوا، بە دەربکەوێت لە پاشماوەی ڕەقیمە قورییەکانی (نوزی)و (کوروخانی).

ئەگەر بەراوردێکی زمانەوانی ئەو ماوەیەی هوری- میتانی لەگەڵ لەوەو دوای هوری- میتانییەکان کە ماوەی هاتنی ئاشوورییەکانە، دەبینین جیاوازی لە ڕووی بەرکارهێنانی وشەو ڕستەو موتروبەکردنی لەنێوان هەردوولادا، کە لە سەردەمەکانی پێشوودا زۆر جیاوازی هەبوو. زمانی ئاشووری هەڵگری ناوچەیەکی جیاوازی هورییەکان بوون کە لە دەرەوەی کوردستان‌و لە ناوچە بیابانەکانەوە کۆچیان کردوو لە سەرەتادا لە ناوچەکانی دەوروبەری (ئاشوور- نەینەوا) نیشتەجێ بوون‌و بێ هێزی دەوڵەتەکانی چوار دەوریان، هەنگاو بوون بۆ ئەوەی کە ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان دابمەزرێنن کە کەرکوك‌و دەوروبەری بەشێکی گرنگی ئاقاری ئەو دەوڵەتە بوو.

سیاسەتی توندوتیژی بەرامبەر خەڵکی کەرکوك‌و دەوروبەری دەورێکی کاریگەری بینیووە لە کارتێکردنی زمانی ئاشووری بەسەر ناوچەکانداو دەورێکی بەرچاوی بینیووە لە فەوتاندنی بەشێکی زۆری ڕەقیمی قوری سەردەمی هوری- میتانییەکان کە گرنگیەکی بەرچاوی هەبوو بۆ کاری بەراوردکاری لەگەڵ سەردەمی ئاشوورییەکاندا.

ئاشوورییەکان سیاسەتێکی توندوتیژی وایان هەبوو کە هەوڵیان دەدا بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی‌و کۆچی زۆرەملێ‌و کوشتارو ڕاگواستن.

ئەوەی لە هێرشی ئاشورییەکان بەرچاومان دەکەوێت لە ناوچەکاندا پەیرەوکردنی سیاسەتی ڕاگواستنی زۆرەملێ بوو لەو ناوچانەی کە داگیریان کردووە، ئەویش بە کۆچپێکردنیان لە ناوچەو شوێنەکانی دووره دەست تا بەوەی بە ئاسانی نەتوانن بگەڕێنەوە سەر زێدی بنەرەتی خۆیان، بۆ نموونە لە سەردەمی ئەواندا کۆچی جولەکەکان دەستی پێکرد لە (ئۆرشەلیم) بەرەو ئاقارو ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان، ئەمیش ڕەنگدانەوەو کاریگەری کۆمەڵایەتی‌و دەروونی‌و ئابووری گەورەی لەو ناوچانەدا دروست دەکرد، هەروەها کۆچی (بابل)یەکان‌و تالان‌و سوتاندنی ناوچەکانیان هەر لە سیاسەتی سەردەمی ئەواندا بووە.

بۆیە هیچ کاتێك جێگایەکی سەرسوورمان نەبووە کە (نوزی)و (کورو خانی)و (ئاراپخا) بەشێکی گرنگی ئەو تالانکرییە بووە، چونکە هەر لە دوای ڕووخاندنی هوری- میتانییەکانەوە ئەم ناوچانەش کەوتونەتە بەر هێرشی سەربازی فراوان‌و هەموو دەم سەرەرێی هێرشە سەربازییەکان بووە.

سەردەمی ئاشوورییەکان ڕەنگدانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکان زۆر دژوار بووەو لە چوارچێوەی دەسەلاتێکی مەرکەزی توندو تۆڵدا خۆی دەبینییەوە، کە هاوپەیوەست بووە بە دەرئەنجامەکانی ئەو سیاسەتە لە مەرکەزی ئیمپراتۆرییەتەکە، هەر کاردانەوەیەکی دەوڵەتەکەو ناوچەکانی کاردانەوەی هەبووە بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکان، لە ناوچەکانی تردا.

هەر لەو ڕوانگەیەوە کاریگەری جلوبەرگ‌و ڕەنگ‌و جۆری بازرگانی قوماش‌و کارتێکردنی ئایینی بەسەر ئەو شارستانییەدا دەوری بینیوە لە هەڵسەنگاندنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

(ئەوەی کوری کۆیلە بووبێت، بە کۆیلەیی ناودەبرێت، کە ئەمیش هۆکار گەلێکی گرنگ بووە بۆ زیادکردنی کۆیلایەتی لە دەوڵەتی ئاشووریدا.

یەکێك لە هۆکارەکان لە ئیمپراتۆریەتی ئاشووریدا شەر بووە کە دەورێکی گەورەی بینیوە لە زیادکردنی کۆیلە، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەو هێرشە سەربازیانەی کە ئاشورییەکان دەیانکرد بۆ تالانکردنی ناوچەکان، کاریگەری لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە دەبووە هێزێکی گەورە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە گەورەکانیان.

دەبینین لەو کۆتەڵانەی کە لە ئاشوورییەکان بۆمان بەجێماوە گەلێك وێنەی ئەو بەندییانە بەرچاو دەکەوێت، کە سوپایەکی سەرکەوتووە بەرەو پایتەخت پەڵکێشان

دەکەن کە بە قۆلبەستراوی لەوێنەکاندا دەبینرێت، ئافرەتی بەندییش لەدوایانەوە بە دیار دەکەوێت.

گەلێك لەوانەی بەتالان بردراون کراونەتە کۆیلە، بەکارهێنراون وەکو کرێکاری خانوبەرە، پاککردنەوەی جۆگەکان، خزمەتکاری پەرستگاکان، بەشێکیان وەکو کۆیلە لە بازار دەفرۆشران.

دەبینی لە دەوڵەتی ئاشووریدا گەلێك جار خاوەن ماڵ کاتێك نەیتوانیوە کە قەرزەکانی بداتەوە، هەستاوە بە فرۆشتنی منداڵو ژنەکانی تاکو بەوەی رێکەوتنەکانی جێبەجێی بکات[٤٢].

ئەم دیاردەیە هەر چەندە رەنگدانەوەی گەورەی نەبووە لە ناوچەکامی کەرکوک، بەڵام کاری دابەشکردنی چینەکانی کۆمەڵو مەسەلەی کۆیلەبەندی جۆرێکی تر بووە، کە جیاوازی بووە لە سەردەمی ئاشوورییەکان، کە زیاتر رەنگدانەوەی سەردەمەکانی پێش ئاشوورییەکانی پێوەدیار بووە، هی سەردەمەکانی هوری-میتانی بووە.

ئەو دیاردانەی لەسەرەوە باسمان کرد هاوپەیوەستبووە بە گەلێك یاسا کە لەو سەردەمەدا دەرچووە هی ناوچەکانی (ئەراپخا)و (نوزی) بووە، تێکهەڵکێشی کۆمەڵێك یاسای کرینو فرۆشتن جێبەجێ کراوە.

(لە ئیمپراتۆریەتی ئاشووریدا پاشاو جێگیری پاشاو شاژن، سەر گەورەی کۆمەڵن، هەر یەکێك لەمانە خانوو ماڵی تایبەتیان هەیە، هەر پاشایەکی سەرجۆنی دەوردراوە بە کۆمەڵێك سوپاو کرێکارو پیاوی کارگێڕیو بەرێوەبەریی، لەگەڵ هەڵگری مۆری پاشا، سەرۆکی پێشوازیو سەرۆکی تەشریفاتی پاشایەتیو سەرۆکی دکتۆرانو دکتۆری تایبەتی پاشا، نووسەری کۆشكو سەرنووسەری ژووری حەریمو سەرنووسەری نامەهەڵگری زمانی ئارامی، بەرپرسی مەڕو ماڵات، بەرپرسی ئاڵتونو سەرۆکی گۆرانیبێژانو سەرۆکی جلوبەرگو سەرۆکی ئێشکگری دەرگاییەکەمی کۆشكو گەلێك پیشەی کۆشکی پاشایەتی)[٤٣].

کۆمەڵ لە رووی چینایەتییەوە کراوەتە دوو بەش، بەشێکی سەربەخۆیەو بەشێکی کۆیلەیە، ئەم دوو بەشەش دابەشبوونە سەر چەند بەشێکی ترەوە خێزانو کۆمەڵگەی خێزان، هاوپەیوەست بووە بە کۆمەڵێك یاسا کە ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر دارێژرا بوو لە ئیمپراتۆریەتی ئاشووریدا.

(ئافرەتو کچ) لەژێر دەسەڵاتی باوکی دایە، ناتوانێت شوو بکات بەبێ رەزامەندی باوکی، هەر چەندە کە بارمتەش بێت لەلایەن یەکێکەوە، لەلایەن قەرزەوە ئەگەر باوکی مرد خوشکەکانی هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی مارەییەکەی، ئەگەر لە ماوەیەکی دیاریکراودا جێبەجێیان نەکرد ئەوا حەقی خوشکیان بەسەرییەوە نامێنێت.

ئەو کاتە قەرزدەر دەتوانێت سەربەخۆی بکاتو بیداتە شوو بە هەر کەسێك بیەوێت، باوك دەسەڵاتی لە هێزەوە بووە، ئەگەر پیاوێك دەستدرێژی کردبێتە سەری دەتوانێت لێی مارە بکاتو وەکو ئەوەی کە دەیەوێت)[٤٤].

*** هاوسەردەمی میدییەکان (مادەکان):**

هاتنی میدییەکان قۆناغێکی جیابوو، کە گەلێك جیاوازی هەبوو لە هەموو روویەکی شارستانییەکەیان بە بەراوورد بە شارستانییەتی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوورییەکان.

میدییەکان هەنگاوی کۆچکردنی نەتەوەکانی هیندو ئەورووپییەکان بوو، کە دیاردەی بەیەکگرتنی ئەم نەتەوانەو گەشە کردنیان بەرەو یەکبوونێکی گەورە، کە رێگابوو بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی گەورە تا بەوەی بەرەنگاری هێرشی ئاشوورییەکان بووە.

جیاوازی ئاشووریو میدییەکان لەوەدا خۆی بینیووە، کە ناوچەکانی دەوروبەری ئاشوورییەکان هەردەم لەبەرەکانیدا بوون لەگەڵ دەوڵەتی ئاشووری بەشێکی زۆری ناوچەکانی سەر بە ئاقارەکانیان تووشی کاولکاریو کۆچێکردنو وێران کردنبوون.

"وەك لەلایەن زانایانو نووسەرانی مێژووی کۆنەوە بە تایبەتی (هیرۆدۆتس) روونکراوەتەوە یەکەمین ئیمپراتۆریەت کە لە نەژادی ئارییەکان بوون، بەهۆی ئەوەوە کە هاوسێ ئاشوورییەکان، ئامورییەکان بوونو زۆر شارستانیتر بوون لە گەلانی ئەو کاتانە چاویان کراوەتەوە.

جگە لەوەش بەهۆی ئەو رێگا سروشتییانەوە کە لە خۆرئاوای ئێراندا هەبوون بە تایبەتی ئەو رێگایەی کە لە مێزپۆتامیاو رووەوبانی (ئێران) بە نێوان کەژو کێوەکانی زاگرۆسدا کە نیشتەجێی (گۆتییەکان)و (لولۆپییەکان) بووە تێپەڕیووە"[٤٥].

بە گوێرەی باسەکانی (هیرۆدۆتس)، مادەکان بەشێوەیەکی پەرتو بڵاو لە چەند کۆمەڵگەیەکی تیرەییدا دەژیانو بەهۆی چەند یاسایەکی پڕ لە زەبرو زەنگەوە کە سەپێنرابوو بەسەر زەوییەکەیاندا لە رەنجو ناخۆشیدا بوون، ئەم گرفتە بۆ تەنها یەك تیرە نەبوون، بەڵکو هەموو تیرەکان لەم بارە ناخۆشەدا دەژیان[٤٦].

هۆزەکانی میدیایی هەمیشە دژییەکتر لە کوشتنو برینو ململانێدا بوون لە ماوەی چەند ساڵێکدا توانیان یەکبگرنو هێزێکی بە تواناو نەبەز بۆ رزگاری خۆیان پێکبهێنن، میدیاییەکان لەنێوان خۆیاندا بە یەکگرتنی شەش هۆز یەکیان گرت کە بریتی بووە لە (بۆسی)، (پارتاکنی)، (ئانسترۆخانی)، (ئاریزانتی)، (بۆدی)، (موغ).

ئەمانە بە سەرۆکایەتییەکێك لە هۆزەکانیان سوپایەکی نەبەزیان پێکهێناوەو لە سەرەتادا ناوچەکانی هەمەدان (ئەکباتان)یان کردە پایتەختیان[٤٧].

بەرەبەرە ناوچەکانی دەوڵەتەکەیان فراوان بووەو هەموو ئاقاری پێشووی ئاشوورییەکانیان داگیر کردووەو کەرکوك یەکێك بووە لەو شارانەی کە کەوتە ژێر دەسەڵاتی فەرمانرەوایی مادەکان.

"بە گوێرەی مێژووی (ایران قدیم، مشیر الدولە)، قەومی ماد، لە بنەرەتدا لە ئازەربایجانو کوردستانو عێراقی عەجەم دابووە، لە دواییدا فراوانی کردووەتەوە، ئەڵقەی دەسەڵاتی فەرمانرەواییەکەی لە (هالیاس- قزیل ئیرمات)ەوە تا وڵاتی

(باختر)، یەعنی (ئەفغانستانی ئەمرۆ)، لە دەریای خەزەرەوە تا پارس‌و خوزستان بووە.

لە دوایدا زانایانی جوگرافیای دەوری کۆن، گووتوویانە کە ماد عیبارەت بووە لە دووبەش: مادی گەورە لە (عێراقی عەجەم)داو مادی بچووك لە (ئازەربایجان)[٤٨]دا.

هاتنی میدییەکان بۆ ئەم ناوچەیە پێگەی هێنانی گەلێك دابونەریت‌و شارستانی تازە بوو کە لە حکومەتەکانی لەوەو پێش جیاوازی هەبوو. چونکە دابوونەریتی هۆزەکانی هیندو ئەوروپی هەلگری ژینگەیەکی تری پارچەکانی تری کوردستان بوون کە زۆر جیاوازی ئەوەی هەبوو لەوەی سەردەمەکانی لەوەو پێشەوە. جیاکارییەکانیش لە رووی ئاین‌و باوەرە ئاینییەکان‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان‌و باری ئابووری رووە دیارەکانی، دابەشکردنی چینەکانی کۆمەڵگە.

لەو ماوەیەدا بیروباوەرە ئایینەکان‌و خواوەندەکان تێکەڵ بە بیروباوەرەکانی لەوەو پێشی خۆیان بوون، بووە سەر هەڵدانی بیروبۆچونی تری باوەرەکانی گۆرانێکی گەورە روویدا لە رێو رەسمی سرووتی ناشتنی مرۆڤو جۆری گۆرو سەر هەڵدانی بیروباوەری تازە بابەت کە جیاوازی هەبوو لەوانەی لەوەو پێش. گۆرانە ئابوورییەکان هەنگاوێکی گەورەی دروستکرد لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان‌و دروست بوونی پەیوەندی مرۆڤ لە ناوچەکانداو هەڵسەگاندنی ژیانی خۆی‌و دارشتنی ژیانی لەو دیاردەیەوە.

*** هاتنی ئەسکەندەرو سلۆقییەکان:**

دەتوانین بە یەکێك لە قۆناغە گرنگەکانی مێژووی سەردەمە مێژووییەکانی دابنێن، چونکە گۆرانێکی گەورە بووە، کەتێدا وەرچەرخاندنی رووداوەکانی گۆری کە ئەویش لەم خاڵانەی خوارەوە خۆی دەبینێتەوە:

١. سەردەمی (ماد)و (ئەخمینییەکان)، ماوەیەکی مێژوویی بوو، کە تێیدا قەڵەمرەوی دەوڵەتەکەیان زۆر فراوان بوو، لە سەردەمەکەیاندا دەسەڵاتیان گەیشتە یۆنانی‌و رۆمانەکان‌و هەموو دەم توانیوویانە کە لە بەربەرەکانیدا بن بۆ ئەوەی فراوانی دەسەڵاتیان پاستووە.

بۆیە هەموو دەم دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتانە باڵادەست بوونە بەسەر یۆنانی‌و رۆمانییەکاندا.

٢. شەری گاوگامیلا قۆناغێکی دیاری کراو بوو بۆ ئەوەی کە دەسەڵاتی یۆنانی‌و رۆمانەکان بەسەر ناوچەکاندا فراوان بوو، کە تا ماوەیەکی دوورو درێژ دەسەڵاتیان نەگەیشتبووە ئەم ئاستە.

٣. ئەوەی لەم ماوەیەدا گرنگە ئەوەیە کە تێکەڵ بوونی دوو شارستانییەت بوو، شارستانییەتێکی رۆژهەڵاتی‌و شارستانییەتێکی رۆژئاوایی، چونکە ئەوەی بەرچاو دەکەوێت بوونی جیاوازی نێوان هەردوو شارستانییەتەکە لەنێوان دوو ئاستدا، پێگەیەکی بەرچاو بوو بۆ هەڵگیرساندنی شۆرشێکی گەورە لە هەموو ئاستەکاندا.

٤. هاتنی ئاین‌و بیرو باوەرە ئاینییەکانی یۆنانی‌و رۆمانەکان‌و تێکەڵکردنێکی گەورەی دروستکردوە لەگەڵ ئاین‌و باوەرە ئاینییەکانی رۆژهەڵات‌و بووە هۆی دروست بوونی بیروباوەری ئاینی تازە بابەت کە لەگەڵ کۆمەڵگای سەردەمە تازەکەدا بگونجێت.

٥. هاتنی یۆنانی‌و رۆمانەکانی کاریگەرییەکی گەورەی دروستکرد لە هەڵتەکاندنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەویش لەو چوارچێوەیە داخۆی دەبینێتەوە کە کۆمەڵگە لە رۆژهەڵات‌و رۆژئاوادا جیاوازی هەیە، بۆیە بەپێی پێویست ژیانی مرۆڤایەتی گۆرانی دروستکرد لەنێو کۆمەڵگە، لە هەڵسووکەوت‌و جلوبەرگ‌و کەرەستەو ئامرازەکانی نێو ماڵ.

٦. "لە راستیدا (هیللینی) لە یۆناندا بوو بە شێوازێکی دیارو تایبەت لە شێوازەکانی ژیان، لە سەرەتادا خۆی لەنێو یاسایەکی سەرەکیدا دەنواند، کە ئەویش (دەوڵەتی شار) بوو، هەموو کەسێکیش، کە لەنێو شاردا پێرەو دەکرا، بە هیللینی دەژمێردرا یا وەکو جیاوازی لە بنچینەو پەروەردە کردنیدا هەبووبێ ئەو شتەی کە ئەو کەلچەرە بە دیاردەخات سوود وەرگرتنی بوو لەو یاسایە، کە کرد بووە هۆیەکی کاریگەر بۆ دەربرینی تێروانینێکی تایبەتی بۆ (هەبوون-وجود)و کە ئادەمیزاد پێوانەی هەموو شتێکەو گەورەی هەبوونە. بۆیە دەتوانرێت بگوترێت کەلچەری هیللینییەکەمن کە لچەرە کە باوەری ئاینێرا (مذهب)ی بڕواهێنانی بە شێوەیەکی ئاشکرای دیار بە ئادەمیزاد هێناوە.

کە (فیلیپی مەکەدۆنی) هەوڵیدا یەکخستن‌و یەکگرتنێك هۆکاریی بە یەکگەیشتنی هللینی پێك بهێنێت بۆ ئەوەی بە هۆیەوە دەسەڵاتدارێتی بەسەر هەموو شارەکانی یۆنانیدا هەبێت هەر ئەو سابوو ئەم دەسەڵات دارێتیەی بەرەو رۆژهەڵات بە هۆی ئەسکەندەری کوریەوە دەستی پێکرد[٤٩].

هەر لەبەر ئەمە بوو دیاردەی (هیللینی) دیاردەیەکی دیاری ئەو کاتەی فەرمانرەوایی ئەسکەندەرو سلۆقس بوو بۆ تێکەڵ کردنی شارستانی رۆژهەڵاتی‌و رۆژئاوایی.

٧. دیاردەیەکی تری ئەو ماوەیە گۆرانی هونەری بیناکاری بوو کە زۆر جیاوازی هەبوو لەو ماوەیە کەوتە ژێر کاریگەری هونەری تەلارسازی یۆنانی‌و رۆمانی، بۆ نموونە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك لەو کاریگەریەدا خۆی بینیەوە، کە تێدا گۆرانکاری کرا بەسەر بورج‌و دەرگاو شێوازی تەلار سازی قەڵا.

٨. "هەروەها ئەسکەندەر لە ماوەی دەسەڵاتیدا بایەخێکی گرنگی دا بە پرۆژەی ئاودێری‌و چاککردنی زەوی کشتوکاڵی‌و دروستکردنی بەربەست‌و راکێشانی جۆگە بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکان لەگەڵ چاککردنی جۆگەو بەربەستە کۆنەکان[٥٠].

"... هەر چۆنێك بوو ئەسکەندەر لە ماوەی شەش ساڵدا کە شای ئێران بوو، تێکۆشا کە فەرهەنگ‌و شارستانییەتی یۆنان لە خۆرهەڵاتدا بڵاوبکاتەوە[٥١].

لە سەردەمی سلوکییەکادا هەندێك لە پارێزگارەکان دەیانتوانی سکە لێبدەن‌و دراوەکانیان لە زیو دروستبکەن، جێگەدارەکانی ئەسکەندەر دەیانویست بە سەر ناوچەیەکی گەورەی رۆژهەڵاتدا دەسەڵات پەیدا بکەن. بۆ ئەم کارەش

ئامادەبوون کە شێوەی ژیان و داب و نەریتی یۆنانیان بەسەر ناوچە داگیرکراوەکاندا بسەپێنن بە تایبەتی شێوەی بەرهەمهێنان لە ئاسیا زیاتر بڵاوبکەنەوە، ئەو شێوەیەش کۆیلەداریبوو[٥٢].

فراوانکردنی شارەکانیش بە بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە بەرهەمهێنانە یارمەتی ئەوەی دەدا لەناو شارەکاندا کارە پیشەییەکان و بازرگانی و کاروباری بەڕێوەبردن ئەنجام بدەن، لە دراوسێیەتی دێهاتەکانیشەوە گەلێك زەوی و زاری فراوان بۆ بەرهەم هێنانی کشتوکاڵ بە یۆنانییەکان درابوو، ئەم کارەش بووە هۆی ئەوە کە ژمارەی کۆچکردووەکان زیاتر بن.

کۆچکردووەکان لە کشتیاران و پیشەگەران و زاناکانی یۆنانی و دیکە پێکهاتبوون، جگە لەمانەش سەربازان و ئەندامانی سوپاش لە زەوی و زاری پاشایەتیدا کاریان دەکرد.

پەرستگاکانیش خاوەنی زەوی و زاری (وەقف)کراو بوون، کە ژمارەیەکی زۆری جوتیاران بۆ دابینکردنی بژێوی و خزمەتگوزارانی پەرستگا بە کشتوکاڵەوە خەریکبوون، پەرستگا سامانێکی زۆری هەبوو لە کاتی خواستەکانی پاشا، بە تایبەتی لە کاتی جەنگدا سوودیان لێوەردەگیرا[٥٣].

".. بەم شێوەیە جۆرێك پێکەوە ژیانی یۆنانی و ئێرانیان هاتبووە کایەوە کە بووە هۆی ئەوە زمانی ئێرانی جێگای خۆی وورە وورده بۆ خەت و زمانی یۆنانی بە جێبهێڵێت[٥٤].

یۆنانییەکان هەر چەندە لە ڕووی کاریگەری زمانەوە زاڵبوون بەڵام بەکردەوە لەژێر کاریگەری شێوەی ژیان و ئایینی ئێرانیاندا نەبوون[٥٥].

*** کەلەپوورو شارستانییەتی ساسانییەکان:**

"ئامین مارسلین ئاخورین مێژوونووسی سەدەی چوارەمی زایینی، سنووری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانی و فراوانبوونیان بەمجۆرە دەنووسێت:

ئاشوور، خوزستان، نێوان دووڕووبار، مادیان ئازەرپادگان، فارس، پارت، یان تەبەرستان، کرمان، گورگان، مەرو، بەلخ، سغد، سکستان، سکای ئانوی ئامو، ئاریا (هەرات) پاریانیرادیان زابلستان، زرنگ ئەراخوزی، یان کابل، گدروشیە یا بلوجستان. بە کورتی ئەوەیە کە خەتێك لە قەندەهارەوە بکێشە بۆ (باختەر) و سغد و خوارزم و هەرات و مەرو لە خۆرهەڵات و گەیلان و مازەندەران و ئازەربادگان بەشێکی قەفقاز لە باکووری فارس، کرمان بلوجستان و خوزستان لە باشوور، ئەرمەنستان و کوردستان و موسڵ و عێراق لە خۆرئاواوە بە خاکی ئێران ژمێردراون.

مێژوونووسانی دیکەش زۆر کەم بەسوودوەرگرتن لە نووسینەکانی ئەم مێژوونووسەو یان نووسراوەکانی سەرەتای هاتنی ئیسلام وەکو مێژووی تەبەری و مەسعودی و سەعالیبی و ئیبن قوتەیبە و کتێبی شارەکانی ئێران سوودیان وەرگرتووە کە هەروەکو ئەوان تا نزیکەی پەنجا ساڵ بەر لەم نووسینانە بە ناونیشانی تەنها بەڵگەیەك و هەوڵێك بوون"[٥٦].

".. ئەشراف و دەسەڵاتداران و سەرمایەدارانی گەورە بە تایبەتی دەرباریان توانیویانە کە هونەرمەند و شوێنەواری هونەری و فەرهەنگی بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ئاشکرایە لە کۆمەڵگایەکی ئاوەهادا هەرگیز هونەری کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و مرۆڤایەتی کە بەرهەمی زەوق و سەلیقەی کۆمەڵگا بێت نایەتە بەرهەم.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕاستیدا فەرهەنگ و شارستانییەتی ساسانیان لە سەرەتای کارەوە لەژێر کاریگەری پێشینیان بوو کە دەبا وورده وورده بە هەنگاو ئەو قۆناغانە ببڕێت، هونەری ئێرانی کە سەبکێکی پێکهێنا بوو لە بووەتەی نەتەوەی ئێرانیدا جێگەی خۆی گرتبوو، هونەرمەندەکان تێدەکۆشان کە داهێنانی شوێنەوارو بەرهەمەکانیان سەر بە هونەری هەخامنشییەکان بێت"[٥٧].

".. وا دێتە بەرچاو کە ئەیالەتی پارس لە سەردەمی (ملوك الطوائف) پاتەکاندا لە شێوەی نیمچە سەربەخۆییدا بوون، لەژێر چاودێریکردنی پاشاکانی خودی ئەشکانییەکاندا بوون کە لەوێدا داب و نەریتەکانی دێرین و ڕێورەسمی هەخامەنیشییەکانیش هەروەکو جاران درێژەی هەبوو، لە کاتێکدا کە ساسانییەکان دەسەڵاتیان پەیدا کرد میراتگری وڵاتبوون، پایە و بناغەی دەسەڵاتی خۆیان لەسەر بناغەییەکێتی ئایینی و ستایشی ئاهورافردا دارشتبوو"[٥٨].

"سنووری دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانییەکان لە فوراتەوە بۆ جەیحون درێژ بووەتەوە و لە ماوەی زیاد لە چوار سەدە (٤٠٠ ساڵ) بە هۆی جەنگ و نەبەردەکانی ناوخۆ ڕامیاری لەنێوان ئێران و ڕۆم لە خۆرئاوا.. لە لایەکی دیکەشەوە گوێنەدای فەرمانداڕانی دەوڵەت بە کاروباری ئایینی و کۆمەڵایەتی، چینەکانی گەلیش لەم ماوە دوورو درێژەدا گۆڕانیان بەسەردا هات.

لە نووسینی مێژوونووسەکاندا نەك بە تەنها لەگەڵ گۆڕانکاری دامودەزگاکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتداری ساسانییەکاندا بەرەو ڕوودەبنەوە بەڵکو سیما و شوێنەواری گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگا بە تایبەتی لە ڕووی فەرهەنگییەوە لە سەردەمە جیاجیاکانی پاشاکانی ساسانیدا وا بەرچاو دەکەوێت کە بە زۆری ئەم گۆڕانکارییانە لە میانەی ئایینی و ڕامیاری و دەوڵەتداری فەرمانڕەواکانی ساسانیدا بووە"[٥٩].

* سەرچاوەو پەراوێزوکان:


١. گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٣.
٢. گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٦، کانوونی دووەم، سالی دووەم، ١٩٨٣، لاپەرە (١٤٥، ١٤٦، ١٤٧).
٣. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٤ حوزەیران، ١٩٨٧، لاپەرە ٨٨.
٤. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١١، سالی ١٩٩٦ لاپەرە ٦١.
٥. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٣٧، سالی ١٩٩٦ لاپەرە ٦٣.
٦. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (٥٥، ٥٦)، لاپەرە ٣٦.
٧. مقدم في تأريخ حضارات القديمة، طه ، باقر، الجزء الاول عدد الصفحة ١٩٨- ١٩٩.
٨. گۆڤاری رەنگین، ژمارە ٥٠ سالی ١٩٩٢، لاپەرە ٧.
٩. گۆڤاری کاروان، ژمارە ٧٠، سالی ١٩٨٨ لاپەرە ١٤١ – ١٤٢.
١٠. ئارنود هاوز، الفن والمجتمع عبر التأريخ، بەرگی یەکەم، سالی ١٩٦٧ و: فوئاد زەکریا، لاپەرە ٢٩.
١١. لویس همفۆرد، المدينه على مر العصور، بەرگی یەکەم، و: د.ئیبراهیم وەزحی، سالی ١٩٦٤، لاپەرە ٢٥.
١٢. د. شاکر مستەفا سەلیم، المدخل الى الانثروبولوجيا، بەغداد، سالی ١٩٧٥، لاپەرە٦٥.
١٣. حضارة العراق، بەرگییەکەم، لاپەرە١٣٣.
١٤. قەلای چەرموو، شوێنەوارێکە دەکەوێتە خۆرهەلاتی قەزای چەمچەمال، لە سالی ١٩٤٨، نێردراوێکی زانستگای خۆرهەلاتی سەر بە دانیشتگەی شیکاگۆ بۆ کاروباری خۆرهەلات ناسین بە سەرۆکایەتی رۆبرت. ج. برەیدوود، دەستی کرد بە کنە و پشکنین تێدا تا سالی ١٩٥٥ بەردەوام بوو، کۆنترین گوندی کشتوکالی چاخی بەردینی دۆزییەوە کە سەردەمەکەی بۆ هەزارەی حەوتەمی پێش زایین دەگەرێتەوە.
١٥. ئەکرەم محەمەد عەبد کەسار، قراءة في نتاجات الانسان الفنية الاولى، گۆڤاری سۆمەر، بەرگی ١و٢ موجەلەدی ٣٩، سالی ١٩٨٣، لاپەرە٣٥.
١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٥.
هەروەها بروانە: د. شەمسەدین فارس، د. سەلمان عیسا ئەلخەتات، تأريخ الفن القديم، وەزارەتی خوێندنی بالا و لێکۆلینەوەی زانستی، سال ١٩٨٠، لاپەرە٢٩.
١٧. تەها باقر، مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة الوجيز في تأريخ حضارة وادي الرافدين، بەرگییەکەم، بەغداد، سالی ١٩٨٦، لاپەرە١٩٧.
١٨. نائیل حەنوون، عقائد مابعد الموت في حضارة بلاد الرافدين القديمة، سالی ١٩٨٦، لاپەرە ٢٢٧.
١٩. قواعد اللغة السومرية، فوزي رشيد، ١٩٧٢، ص١٧-١٩.
٢٠. میدیا، ئی. م. دیاکۆنۆڤ، وەرگێرانی بورهان قانع، چاپییەکەم سالی ١٩٧٨- لاپەرە ١٦٢.
٢١. پاشا گۆتییەکانو نووسراوەکانیان، فازل قەرەداخی، گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە ٢١، لاپەرە (٤٤).
٢٢. میدیا، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٦٨.
٢٣. گۆڤاری شانەدەر، ژمارە ٦، حوزەیرانی ١٩٩٨ لێکۆلینەوەیەکە بە ناونیشانی (الاقوام الكردية القديمة) لە نووسینی (محەمەد سالح زێباری) لاپەرە ٨٤.
٢٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو- لاپەرە ٨٣.
٢٥. میدیا، هەمان سەرچاوەی پێشووی پەراوێزی (١) لاپەرە ١٧٠.
٢٦. گۆڤاری کرکوك ژمارە (٢-٣)ی سالییەکەم، لێکۆلینەوەیەك بە ناونیشانی (کەرکوك لەمێژووی کۆندا- کەیوان ئازاد ئەنوەر) لاپەرە ٦٩.
٢٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٧٣.
٢٨. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٧٤.
٢٩. گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە (٢٢)، سالی شەشەم، ٢٠٠٢، لێکۆلنەوەیەکە بەناونیشانی: (میتانییەکان، خوبویب نادر) لاپەرە (٣٤)
٣٠. لێکۆلینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی ولاتی کوردەواری، د. جەمال رەشید، ١٩٨٨، لاپەرە (٢٩٣)"
٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ، لاپەرە (٢٢٨).
٣٢. گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە (٢٥)، سالی حەوتەم ٢٠٠٤، لێکۆلنەوەیەکە بە ناونیشانی (نوزی لەهەزارەی دووەمی پێش زایندا) بەشییەکەم، کامەران کوێخا جەلال) لاپەرە (٣١).
٣٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٠- ٣٢).
٣٤. گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە (٢٢)، سالی شەشەم، ٢٠٠٢، لێکۆلینەوەیەکە بەناونیشانی میتانییەکان، خوبەیب نادر، لاپەرە (٣٨- ٤٠).
٣٥. (نظام العائلة في العهد البابلي القديم)، رضا جواد الهاشمي، بغداد، ١٩٧٠، الصفحة ٣٦.
٣٦. بروانە:
- هەمان سەرچاوەی پێشووە لاپەرە ٣٨ – ٥٦.
- (عظمة بابل)، هاری ساكز، ترجمە عامر سليمان، موسل، ١٩٧٩، الصفحة ١٩٥ – ١٩٦.
٣٧. (الصيد في العراق القديم)، صالح حسيني الرويح، بغداد، ١٩٧٩ الصفحة ٢٦.
٣٨. گۆڤاری (سومر)، بەشی ١- ٢، جلدی ٢٥، بەغدا، ٢٠٠٣ – ٢٠٠٤، لاپەرە ٤٥٧، لێکۆلینەوەیەکە بە ناونیشانی: (تأثير القوانين البابلية في النصوص القضائية في نوزي وتل الفخار)، نووسینی: مونزر عەلی عەبدوللا ئەلمونزری.
٣٩. بروانە:

– (دور الملكات والاميرات في الحياه العامه في العراق القديم)، ئەمەل عەبدوڵلا محەمەد. نامەی ماستەر، کۆلێژی
شوێنەوار، زانکۆی موسڵ. ۲۰۰۹، لاپەرە ۱۲۲– ۱۲۳.
– (المراة دورها ومكانتها في حضارة وادي الرافدين)، ثلما ستيان عقراوي، بغداد، ۱۹۷۸، الصفحة ۱٤۳.
٤۰. العراق القديم، دراسه تحليليه للاحوال الاقتصاديه و الاجتماعيه، ص ۳٦٥.
٤۱. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٤۲. الحياة اليومية في بلاد بابلو ئاشور، جۆرج كونتينو، وەرگێرانی سەليم طه التكريتي، برهان عبد التكريتي، لاپەرە (٤۰).
٤۳. بلاد ما بين النهرين، حضارة بابل واشور، ل. دولابورت، وەرگێرانی مارون الخوری، لاپەرە (۲۸۸).
٤٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکان (۲۹۹)و (۳٦٥-۳٦٦).
٤٥. مێژووی کوردو هاوسێکانی، جەلالی ئەمین بەگ، بەرگییەکەم، سلێمانی، ۲۰۰۳، لاپەرە (۱۲۲– ۱۲۳).
٤٦. ئارییەکان و مادەکان، د. ئەردەشیر خودادادیان، وەرگێرانی. عەلاو نوری بابە عەلی، سلێمانی، ۲۰۰۳، لاپەرە(۱٥٥)
٤۷. مێژووی کوردو هاوسێکانی هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (۱۲۲).
٤۸. خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، بەشی ۱–۲، چاپی ۲۰۰٤، هەولێر، کتێبخانە سۆران، لاپەرە(۱٦).
٤۹. لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، د. جەمال ڕەشید، لاپەرە (٤۰۲، ٤۰۳).
٥۰. تاريخ حضارة وادي الرافدين، في ضوء مشاريع الري الزراعة والمكتشفات الاثارية والمصادر التاريخية، الجزء الثاني، احمد سوسة، صفحة (۱۷۱).
٥۱. دێرینەناسی و هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانی، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وەرگێرانی وریا قانیع، ۲۰۱۳، لاپەرە (۳۷۳).
٥۲. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (۳۸۲).
٥۳. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (۳۸۲-۳۸۳).
٥٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (۳۸۳).
٥٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (۳۸۳).
٥٦. (دێرینەناسی و هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنیشی و ئەشکانی و ساسانی)، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وەرگێرانی: وریا قانیع، لاپەرە (٥۱۷).
٥۷. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٥۱۳– ٥۱٤).
٥۸. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٥۱٥– ٥۱٦).
٥۹. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥۱٦).

*** بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و ڕێچکەی گۆڕانەکان:**

لە دوای ڕووخاندنی دەوڵەتی ساسانییەکان و کۆتایی فەرمانرەوایی هۆزو تیرە ئێرانییەکان و هاتن و بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام دەورێکی گەورەی بینی لە داگیرکردنی هەموو ناوچەکان لەژێر رکێفی ئیسلام و دەوڵەتە ئیسلامییەکانەوە، کە قۆناغی دەوڵەتە ئیسلامییەکانیش هەریەکە پێگەو شێوەیەکی جیای هەبوو لەوەی ترو هەریەکە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی بەرەو دنیایەکی جیاوازو شارستانییەتێکی جودا لە سەردەمەکانی تر پەلەکێشکرد.

ئاینی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی ئەم ئاینە جیاوازییەکی گەورەی هەبوو لەگەڵ ئاینەکانی لەوەو پێشەوە وەکو ئایینی جوولەکەو مەسیحی و زەردەشتی.

پێش هاتنی ئاینی ئیسلام، ئاینی مەسیحی لە زۆر ناوچەدا بڵاوبوو بۆوەو هەردەم لەبەر بەرەکانیدا بووە لەگەڵ ئاینی فەرمی دەوڵەتی ساسانییەکان، هەمیشە بەربەرەکانییەکان ڕێچکەی خۆی دەبەست بەرامبەر کەلەپووری هەریەکەیان و هەریەکەی دەوری خۆیان لە هەڵبەزو دابەزدا بوو بەرامبەر سیاسەتەکانی ساسانییەکان لەگەڵ یۆنانی و ڕۆمانییەکاندا.

لەگەڵ هاتنی ئاینی ئیسلام بەربەرەکانییەکی گەورەی دروست کرد بۆ فەوتاندنی هەموو ئاینەکانی ترو سووتاندنی هەموو کەلەپوورێکی ئاینی زەردەشتی کە بە تایبەتی لەسەردەمی خەلیفە عومەر کوڕی خەتاب، کە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك یەکێك بوو لەوشارانەی کەوتە بەر تاڵانکردن و سووتاندن.

بەشێکی ئەو کەلەپوورە ئاینیانە تاکو ئێستاکە لە ژیان و سرووتە ئاینییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کەرکوك بەجێ ماوەو تێکەڵ بە شارستانی و کەلەپووری ئاینی ئیسلام بووەو بووەتە بەشێك لە کەلەپووری ئەو ئاینە.

ئێستاکە گەلێك ڕەنگی وەکو شین و سەوز پاشماوەی ئاینی زەردەشتیەو ئێستا لە ناو کورددا تێکەڵ بە ئاینی ئیسلام بووەو لە مەزارگاو مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی پێوە دەرازێتەوە هەر لەم ڕوانگەیەوە دیاردەی پیرۆزی زەوی و پاککردنی زەوی کشتوکاڵی لە پاشماوەی زیانەخش و چاککردنی پردو پیرۆزی جوتیار لەلای ئاینی زەردەشتی، پاشماوەی کەلەپورێکی زۆر گەورەیە کە تاکو ئێستاکە لە نێو شارستانی کەلەپووری کوردا لە ناوچەکەدا ماوەتەوە. دیاردەیەکی تری ئەو سەردەمە بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی و کەلەپووری ئاینی ئیسلامە، کە زمانی عەرەبی زمانێکی جیاوازبووە لە زمانی حکومەت و دەوڵەتەکانی لەوەو پێش.

زمانی عەرەبی بووە کەلەپووری ئاینی ئیسلام و ئەو نەتەوانەی کەوتنە ژێر رکێفی ئاینی ئیسلام، کەوتنە ژێر کارتێکردنی ئەو زمانەو، تێکەڵ بە کەلەپووری کوردو فارس و تورك بوون و گەلێك زاناو مێژوونووس لەم زانایانە هەڵکەوتن بۆ نووسین و راڤەکردنی ئاینی ئیسلام.

بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و زمانەکەی بووە گۆڕین و هەڵتەکاندنی گەلێك ووشەی باوی ئەو ئاینە کە لەوەو پێش لە ئاینەکانی تردا باو نەبووە، یان گەلێك ووشەی تێکەڵ بە ئاینەکە بوو کەبووە کەلەپووری ئەو ئاینە کە ئاوێتەی هەموو نەتەوەکان بوو.

یەکێك لەو دابوونەرێتە کۆمەڵایەتییانەی کە لەو سەردەمەدا سەری هەڵدا، بڵاوبوونەوەی کۆمەڵێك ڕێنمایی ئاینی کە تەنانەت نیمچە دوورگەی عەرەبیش لە وەرگرتنیدا نامۆ بووەو، پێویستی بە ڕۆژگار هەبوو تاکو بەوەی خەڵکی بێتە ژێر رکێفی ئاینەکە ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە کۆمەڵگەو ئافرەت و تاوان و سزاو شین و شایی و خۆشی و ڕێنماییەکانی ڕێکخستنەوەی کۆمەڵ.

یەکێك لەو دیاردانەی کە کارتێکردنی خۆی بەجێهێشت و کۆمەڵگە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا، پابەندی بوو، ئەویش ئەوەی کە لەو پێش هەبوو زۆر جیاوازی هەبوو.

لە کاتی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام بایەخ درا بە جلوو بەرگی پان و درێژو سەر پۆش و سەرتاپۆش. کە لەوە پێش ئەو بایەخەی پێ نەدراوە.

بە هۆی بوونی کۆمەڵگەی نیمچە دوورگەی عەرەبی کە لەسەر باوەری بت پەرستی بوو، بۆیە کە ئیسلام لە دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبی بڵاوبووە کەوتە فەوتاندنی هەموو ئەو کۆتەڵ و هونەری بیناکارییانەی کە لە ناوچەکانی تر هەبوو، هەوڵیانداوە بە ڕووخاندنی گەلێك لەو هونەری بیناکاری و کۆتەڵانە کە لەگەڵ ڕێبازی ئاینەکەدا بگونجێت.

"لەگەڵ گرتنی جەلەولا، موسڵمانەکان درێژەیاندا بە لەشکرکێشی، سەرکردە (جەریر کوڕی عەبدوڵڵا ئەلبەجلی) کە بۆ بەرگەگرتن لە دژە هێرش بە دوو هەزار کەسەوە لەجەلەولا مابۆوەو پاشان نزیکەی سێ هەزار شەرکەری دی بۆ نێردراو، چووە سەر حلوان وخانەقین و شەڕی پاشماوەی سوپای ساسانی کردو ژمارەیەکی لێکوشتن و لە ناویاندا مەهرانی رازی، بە دواییدا شارەکانی مەندەلی و قەسر شرین و گشت ناوچەکە داگیرکران، بە فەرمانی خەلیفە عومەر هێزێکی تر شاڵاوی بردە سەر ناوچەی سیروان و بە شەر (ماسبزان) ناوەندی سیردانییان گرت و خەڵکەکە بەرەو ناوچە شاخاوییەکان هەڵهاتن"[١].

هەر چەندە سەرچاوە عەرەبی و ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی دیار باسی داگیرکردنی کەرکوك ناکەن لەو سەردەمەدا بەڵام ئابلوقەدانی چوار دەوری کەرکوك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەری کەوتنە ئاقاری هێرشەکانی ئیسلامەوە، بۆیە ناوچەکانی گەرمیان و داقوق و خورماتوو بەشێکی دانەبڕاوییەکە کارگێڕییەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان بووە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەین لە پرۆسەی ئەو داگیرکارییانەدا ئەوەیە کە کەلتوورو شارستانییەتی سەردەمەکانی پێش بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەگەڵ ئەو سەردەمەدا بوو بە دەرهاویشتەی کۆمەڵێك دەرئەنجامی کۆمەڵایەتی و ئابووری جۆراوجۆر کە خۆی دەبینییەوە لە گۆڕانکاری لە هەموو بوارەکاندا، بە تایبەتی لە بواری پیشەوەری و دانیشتووان و داب و نەریت و زمان و فلکلۆرو

کەلەپوورو شارستانییەت، کە هەموو ئەمانە کەوتنە بەر شالاّوی گۆرانکارییەکان.

"یەکێك لە دەرهاویشتەو ئەنجامەکانی پرۆسەی فەتحی هەرێمەکانی کوردستان‌و هەموو هەرێمەکانی رۆژهەلاّت‌و رۆژئاوا ئەوە بوو کە خەلّکێکی زۆر لە خێل‌و تیرەو بنەماڵە عەرەبەکان بە تاك‌و بە کۆمەل، ئەخاسمە لەوانەی بە شەرکەرو جەنگاوەر دادەنران بە شارو بازێرو گوندو چیاو دەشت‌و کەژی کوردستاندا بلاّوبوونەوەو هێدی هێدی ئاکەنجی بوون، هۆکارو پاساوی ئەم دیاردەیە بەر لە هەموو شتێك ئەوە بوو کە ئەوان شوێنە فەتحراوەکانیان بە موڵکی شەرعی خۆیان دەزانی‌و دەخرانە ریزی دەسکەوتەکانی جەنگەوە بە تایبەتی ئەو شارو دەڤەرانەی بە شەرو بە نووکی رم داگیر دەکران‌و خەلّکە بەرگریکارەکە لە کوشتن‌و دیلکردن دەرباز دەبوون شاربەدەر دەکران.

ئەو زەوی‌و زارانەی وا زەوت دەکران، پتر خاکی بە پیت‌و بەراو بوون لە رەزو باخ‌و بێستان پێك دەهاتن، عەرەبەکان دانیشتووانە رەسەکانیان بە سەپان دەگرت‌و بە سوخرە کاریان پێدەکرن‌و موچەیانیش نان‌و زگ بوو، فەقیەو شەرعزانەکان ئەحکام‌و یاساو رێسای بە گەرخستنی ئەم موڵك‌و زەوی‌و زارانەیان داناوەو بە دەستکەوتێکی حەلاّل‌و رەوایان ژماردووە"[٢].

لە دەرئەنجامی ئەو ماوەیەدا دەگەینە ئەو راستییە کە خۆی تاوتوێ دەکات لەم خالاّنەی خوارەوە:

١. قەبارەی گۆرانکارییە کۆمەلاّیەتی‌و شارستانییەکان زۆر فراوان بوو کە خۆی دەبینییەوە لە ئاستێکی ئەوتۆدا کە هەردەم لە ململانێ بوو لە بەردەم گۆرانکارییە تازەکەدا، ئەویش لە هەڵس‌و کەوتی بەکارهێنانی: بیروباوەری ئایینیەکە، سیماکانی جلوبەرگ، چۆنێتی هەلسوکەوت کردنی خاوەن زەوی کۆن لەگەل زەوییە تازەکە، بیرکردنەوەی ئەوانەی زەوییەکانیان داگیر دەکرا چۆنێتی بەکارهێنانی بەخشینی باجەکانیان لە هەموو سالێکدا، یان لێکدانەوەی ئەو بیروباوەرەی کە قەبارەی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکانی دیاری دەکرد.

٢. بەهۆی روودانی شەرو ململانییەکی زۆر لە ناوچەکە، بەشێکی زۆری خەلّکە رەسەنەکە ناوچەکەیان چۆل کردو زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییە بە پیتەکان کەوتنە بەر فەوتاندن‌و لەناودان، کە ئەو شەرو ململانێیە خۆی بینییە لە دەستدانی بەشێکی زۆری کەلتوورو شارستانییەتییە کۆنەکە.

٣. زۆر جار کاریگەی ململانێیەکان لە پانتاییەکی سیاسی‌و سەربازی گەورەدا خۆی دەبینییەوە، کە دەبووە هەلتەکاندن‌و داروخانی بەشێکی گەورەی ئابووری‌و کۆمەلاّیەتی ژێرخانی ئەو کۆمەلگەیە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لێکدانەوەو چارەسەر کردن بۆی زۆر مەحاڵ دەبوو.

٤. لە پاڵ بلاّوبوونەوەی بیروباوەرە ئایینییەکە، سەرهەلّدانی ئاینزا جۆر بەجۆرەکانیش دەوری دەبینی لە هەرەسهێنانی کەلتوورو شارستانییەتی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان، بە تایبەتی لەو کاتانەی ناوچەیەکی وەکو داقوق دەکەوتە بەر شالاّو هێرشی زۆری خەواریجەکان.

٥. ئەم ناوچەیە بەناوبانگ بوو بە کۆمەلێك پیشەی جۆر بە جۆر لە بواری ئاژەلّی کشتوکاڵی‌و کانزاییدا، بەلاّم کاریگەرییەکانی شەر وای دەکرد کە وردە وردە ئەو پیشانە لە ناوچەکەدا بپووکێنەوە، لە هەندێك باردا جۆرەها پیشە دەبووە قوربانی باری سیاسی‌و سەربازی ناوچەکە.

٦. بە هۆی کێشە سیاسی‌و سەربازییەکان هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ لەدەستدانی بەشێکی زۆری ئەو بزاوتە بازرگانییەی کە ناوچەکە لە سەردەمی ساسانییەکاندا پێی بە ناوبانگ بوو.

٧. گۆرانکاری لە زمانی سرووتە ئایینییەکان دەوری بینی لە تێگەیشتن لە بەکارهێنانی جلوبەرگ‌و پێداویستییە شارستانییەکان.

"لەو پیشانەی کە لە شارۆچکەیەکی وەکو داقوقدا بەناوبانگ بووە، پیشەسازی دەرهێنانی رۆنی زەیتون بوو، کە لە بوونی رێژەیەکی زۆر لە داری زەیتون لەو ناوچەیەدا، بۆیە لە یەکێك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژە بەوە دەکات کە بازرگانێکی گەورەی بەغدا هەستاوە بە کرینی هەموو رۆنی زەیتونی هەر یەکە لە شارۆچکەی (داقوق)و (دێر ئەلعاقول) کە رێژەیەکی زۆر لە داری زەیتونیان هەیە.

پیشەیەکی تریش کە لە داقوقە ئەویش پیشەی چنین‌و رستنە، هەروەکو ئەوەی کە (ئەلسەفدی) دەیگێرێتەوە کە کەسێك بە ناوی (موسا کوری عەلی کوری بەندەر) لە داقوق لەلایەن یەکێکی مەسیحییەوە فێری پیشەی چنین‌و رستن بووە.

هەروەها پیشەسازی گۆزەکارییەکێك بووە لەپیشە گرنگەکانی داقوق، چونکە هاوپەیوەستییەکەی راستەوخۆی هەیە لەگەل چالاکی‌و پێویستییەکانی رۆژانەی دانیشتووان، بۆیە دەبینین لە کاتی کنەو پشکنیندا بەشێکی زۆر لەو گۆزانە دۆزراوەتەوە کە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی ئیسلامی.

هەروەها پیشەیەکی تر کە لە شارۆچکەی داقوقدا بوونی هەبووەو پەیوەندی بە رۆژانەی ژیانەوە هەبووە ئەویش بریتییە بووە لە پیشە کانزاییەکان، هەر وەکو ئەوەی (ئیبن ئەلفووتی) دەیگێرێتەوە لە باسی (ئەبو محەمەد یەحیا کوری ئەحمەد ئەلداقوقی) کە یەکێك بووە لە بنەرەتی خەلّکی داقوق، ئەوە پشتراست دەکاتەوە کە ئاسنگەر بووە، ئەمیش ئەوە دەخاتە روو کە پیشەی ئاسنگەرییەکێك بووە لە پیشە بەناوبانگەکانی ئەو کاتە، وەکو دروستکردنی ئامرازەکانی شەر، وەکو: شیرو تیرو کەوان‌و رم‌و زرێپۆش، لەگەل پیشەی دروستکردنی سەتل‌و چەقۆو زنجیرو بزمار.

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بە هۆی بوونی بەشێك لە چاڵە نەوتەکان لە داقوق، نەوت لە هەندێك پیشەسازی‌و پیشەکاندا بە کار هاتووە، وەکو پیشەسازییە کانزاییەکانی توانەوەی ئاسن‌و دروستکردنی پێویستییە کانزاییەکان‌و پیشەسازی گۆزەکاری، بەکار هاتووە بۆ رووناککردنەوەو گەلێك پێویستی ناو ماڵ"[٣].

"لە سەرچاوە مێژووییەکان‌و گەرۆکەکاندا هیچ

ئاماژەیەکی درێژ نییە دەربارەی پەیوەندی بازرگانی داقوق یان کەرکوك‌و دەوروبەری لە سەرەتاکانی سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، هەروەها ئەو ڕێگایانەی کە ئەم ناوچەیە بە شوێنەکانی دەوروبەریدا ببستێتەوە"[٤].

بۆیە ڕێی پێدەچێت کاریگەرییە سەربازییەکانی ئەو کاتە دەوری هەبووبێت لە داڕووخانی پەیوەندییە بازرگاییەکان لەو ناوچانە لەگەڵ کەرکوك‌و دەوروبەری، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بتوانبێت پەیوەندییە بازرگانییەکانی ڕچاو بکات، ڕێگا بازرگانییەکانی (بەغدا-داقوق)، (تکریت-داقوق)، (داقوق-شارەزوور) ئەمانە ئەو ڕێگایانە بوون لە سەردەمە سەرەتاییەکانی ئیسلامدا جێپەنجەیان دیار بووە بۆ هاتووچۆ بازرگانییەکان.

دەڤەری کەرکوك بە شێوەیەکی گشتی زەوی بە پیتی هەبووە بۆ کشتوکاڵ‌و ئاژەڵداری، بۆیە بنەمای پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کاتەی خۆی دەبینییەوە لە گەلێك پیشەی کشتوکاڵی‌و ئاژەڵداریدا، هەر ئەمەش وای دەکرد کە زۆری ئەو پیشانە لەو ڕووانگانەوە خۆی ببینێتەوە.

"داقوق بنکەیەکی گرنگ بووە لە بنکەکانی زانست‌و ئەدەب لە دەوڵەتە ئیسلامییەکان، گەلێك زانای ئەم شارۆچکەیە بە ناوبانگ بوونە لە جیهانی ئیسلامیداو دەوریان بینیوە لە ژیانی زانستی داقوق‌و دەرەوەی داقوق، بە تایبەتی لە بواری زانستی (ئەلفقە، ئەلحەدیس، ئەلقیرائات)، بۆیە لەم بوارەدا گەلێك زانای بەناوبانگی وەکو:

١. (عەبدوڵڵا کوڕی ئەلحوسێن کوڕی دەلال کوڕی دەلهەم ئەبو ئەلحەسەن ئەلفەقیە).
٢. (ئەبو ئەلفەرەج ئەلبەجلی ئەلبەوازیجی).
٣. (ئەحمەد کوڕی سەلامە کوڕی موخەلەد کوڕی ئیبراهیم ئەلبەجیلی).
٤. (سالم کوڕی عەبدولسەلام کوڕی عەلون کوڕی عەبدون).
٥. (شێخ شەهاب ئەحمەد کوڕی ئەلنەزیر ئەلدەقوق).
٦. (سەعید کوڕی مەودود کوڕی سەعید کوڕی ئەلسوبح کوڕی ئەلموبارك).
٧. (ئەبو ئەلقاسم مەنسوور کوڕی عومەری ئەلکەرخی).
٨. (محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی ئەلحەسەن کوڕی عەزە کوڕی ئەلموغیرە).
٩. (محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی سەمعون).
١٠. (محەمەد کوڕی عەبدولباقی کوڕی ئەحمەد).
١١. (ئەحمەد کوڕی عەبدولباقی کوڕی ئەبو بەکر کوڕی ئەلبەتی).
١٢. (ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی ئەلفەزل کوڕی بەختیار ئەلیەعقوبی).
١٣. (عەبولمونعم کوڕی محەمەد کوڕی ئەبی ئەلمەزا ئەلدەقوق).
١٤. (ئەبو محەمەد موهەزەبەدین عەبدولڕەزاق کوڕی ئەبی ئەلغەنائم).
١٥. (ئیبن خرستە ئەلبەوازیجی).
١٦. (ئەبو محەمەد مەهەزەبەدین عەبدولڕەزاق).
١٧. (عەلی کوڕی عەممار کوڕی جومەییل کوڕی ساڵح).
١٨. (ئیبراهیم کوڕی عومەر سەعد کوڕی محەمەد).
١٩. (یەعقوب کوڕی عەبدولموحسن).
٢٠. (عەلی کوڕی مەککی کوڕی ئەبی ئەلمەعالی).
٢١. (ئەلشەرەف عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی حەسەن)"[٥].

ئەگەر لە سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا لەم دەڤەرە بڕوانین دەبینین خاوەن پێکهاتەیەکی گرنگی کۆمەڵایەتی بووە لە ڕووی پێکهاتە نەتەوایەتی‌و پێکهاتە ئایینییەکانی ئەم شارەدا، ئەویش خۆی دەبینییەوە لە ڕێژەیەکی زۆر لە بوونی کورد وەکو پێکهاتەیەکی باڵا لە پاڵ بوونی جوولەکە‌و مەسیحی‌و گەلێك پێکهاتەی ئایینی جۆراوجۆر کە دەوریان بینی لە هاوپەیوەستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام هاتنی لێشاوی زۆری عەرەب بۆ ئەم ناوچەیە وای کرد کە هاوسەنگی پێکهاتەکان بەرەو تێکچوون بڕوات‌و ململانێیەکی توندی ئایینی‌و ئابووری لەنێوان عەرەب‌و نەتەوەکانی تر لەم شارەدا ڕوو بدات، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە دەرئەنجامی ڕووخانی شارەکەی لێ کەوتەوە لە گەلێك بواری جیا جیا، هەر ئەمەش وای کرد کە ناوهێنانی کەرکوك‌و بەشێکی گرنگی دەوروبەری لەمێژوودا بەهای خۆی لە دەست بدات.

گۆڕانکاری لە پێکهاتە نەتەوەیی‌و ئایینییەکانی ئەم شارە دەرهاویشتەی لێکترازانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی‌و شارستانییەتییەکانی لێ کەوتەوە بە بارێکی ئەوتۆدا کە دەرباز بوون یان پاراستن لەو شارستانییەتییانە مەحاڵ بێت.

ئەگەر لە ڕوانگەی سەرچاوە مێژووییەکانەوە سەیری بکەین، یان ئەو شەڕو ئاژاوانەی لەم دەڤەرەو بە تایبەتی لە داقوقدا ڕووی داوە ئەوە دەخاتە ڕوو کە تا چەندێك ئەم شارە تووشی کاولکاری‌و ڕاگواستنی زۆرەملێ بووە لە سەردەمە جیاوازو جۆربەجۆرەکاندا، کە تا سەردەمی کۆتایی هاتنی عوسمانییەکان هەر بەردەوام بووە.

ئەگەر هاریکاریی گروپەکانی (ئەلخەواریج)یشیان کردبێت ئەوا هۆکارو پاڵنەرەکەی ئابووری بوون نەك ئایینی‌و مەزهەبی، لێرەدا مەبەست لە هۆکاری ئابووری خۆ دەربازکردنە لە دانی موڵکانەو سەرانە بە دەوڵەتی ئومەوی کە بە هۆی شەڕو کوشتارە ناوخۆییەکانەوە هەردەم پێویستی بە دابینکردنی پارە هەبووە، موڵکانەو سەرانەش چاووگی بنەرەتی داهاتی دەوڵەت بوون[٦].

بۆ نموونە:

"(ساڵح کوڕی مەسرەح ئەلتەمیمی) پیاوێکی خواپەرست‌و ئیماندار بوو، خەڵکی کۆ دەکردەوەو قورئانی بۆ دەخوێندن، لە ئاکامی ستەمکاریی ئومەوییەکان داوای لەلایەنگرانی کرد بێنە دەنگ‌و لە ساڵی (٦٩٥)ی زایینی بە سەدو بیست کەسێکەوە لە خاکی موسڵ‌و داراو جەزیرە دەرکەوت‌و خەڵکانێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە، تا بووە یەکێك لە بزاڤە بەهێزەکانی (ئەلخەواریج) لە جەزیرەو شارەزوور، دوای کوژرانی (ساڵح) لە شەڕێکدا لەگەڵ سوپای ئومەوی لە هەمان ساڵدا (شەبیب کوڕی یەزید ئەلخارجی) جێگەی گرتەوە، ئەمیش گوندو چیاو دەشتەکانی جەزیرەو

شارەزووررو داقوق و خانەقین و ئازەربایجانی کردە گۆڕەپانی چالاکیەکانی"[٧].

کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستانداو بە موسڵمانبوونی کورد بە خاڵێکی وەرچەرخانی هەمە لایەن و هەرە مەزن دادەنرێت لە دیرۆکی کورداو لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئایینی و سیاسی و ڕۆشنبیریی چڤاکی کوردەواریدا ڕەنگیدایەوە، دەسەڵات و فەرمانڕەوایی لە فارسە ساسانییەکان و ڕۆمە بیزەنتییەکانەوە گوێزرایەوە بۆ دەستی عەرەبە موسڵمانەکان، مزگەوت و حوجرەکان جێگەی ئاگرخانەو پەرستگاکانیان گرتەوە لە ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییەکان و ڕێورەسمەکانیدا لە جیاتی پیرو موغ و قەشە، لە سەرەتادا مەلاو فەقێ و درەنگتریش شێخ و سۆفی ڕێبەری خەڵکیان دەکردو ڕێگای ڕاستی خوداناسینیان نیشاندەدان، بەڵام ئەم وەرچەرخانە کتوپڕ بەرپانەبوو لە شەو و ڕۆژێکدا ڕوویندەدا، بەڵکو سەدان ساڵی خایاند تا زۆربەی هەرە زۆری کورد ببنە موسڵمان.

گومانی تێدا نییەو تۆپۆگرافیاو هەڵکەوتەی جوگرافیی کوردستان هەر لە دێر زەمانەوە گەلێك جاران ڕۆڵی سەرەکی و یەکلاکەرەوەی گێڕاوە لە چێکردن و ئاراستەکردنی مێژووی کورددا، هەڵەت و زەنویرو چیا سەخت و بڵندەکانی کوردستان هەردەم پارێزەرو نیگەهانی خۆرسکی زمان و کەلەپوورو داب و نەریت و جلوبەرگی کوردەواری بوون و لەمپەرو بەربەستی بەردەم تەوژم و کاریگەرییە هەمە چەشنە بیانییەکان بوون و کارێکی وایانکرد میللەتی کورد پێگیرو گوێڕایەڵی بیروباوەڕی دێرینی خۆیان بن، مۆرك و تایبەتمەندی خۆیان تا ڕادەیەکی زۆر بپارێزن.

بەڵگەو ئامارە مێژوویەکان و لێدوانی گەڕۆکەکان دەیسەلمێنن ڕێژەیەك لە کوردو خەڵکی کوردستان بە لای کەم تا سەدەی سێی کۆچی لەسەر ئایینی زەردەشتی مابوونەوە[٨].

ئەگەر سەیری ئەو ماوەیە بکەین لە کاتی بڵاوبوونەوەی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسییەکان، کەرکوك وەکو بەشێکی گرنگی گۆڕەپانی ڕووداوەکان کاریگەری زیاتر بەدەر دەکەوت لە ڕووداوەکانی کێشەو ئاژاوەی (خەواریج) کە ناوچەیەکی وەکو داقوق و خورماتوو بەشێکی گرنگی ئەو ئاژەوەو کێشانە بووەو هەردەم ئەو دەوڵەتانە لە هێنانی لەشکر بوونە بۆ سەر ئەم ناوچەیە.

لە دەرهاویشتەی ئەو گۆڕانکارییانەی ئەو ماوەیە، دەورێکی گرنگی بینی لە کاریگەرییەکانی بەسەر ناوچەی کەرکوك و دەوروبەری لە بوارە جیاجیاکانداو هەر یەکەی کاریگەری خۆی بەجێهێشتووە بەسەریدا بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئەو گۆڕانکارییانە.

ئەگەر سەیری هەڵسوکەوت و گۆڕانکاری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بکەین لەو ماوەیەدا دەبینین گەلێك داب و نەریت و کەلتوورو شارستانی جۆراوجۆر هاتنە نێو دەوڵەتە ئیسلامییەکەوە بە تایبەتی لە سەردەمی عەباسییەکاندا.

عەباسییەکان بایەخێکی زۆریان دەدا بە جلوبەرگ و خواردن و ڕازاندنەوەی کۆشك و دروستبوونی کەشێکی لەبار بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە گەلێك لە نەتەوەکانی نێو دەوڵەتەکە کاریگەری خۆیان بەجێهێشت لەسەر ناوچە جۆربەجۆرەکان بە تایبەتی ئەو ناوچانەی هاتنە ژێر ڕکێفی ئایینی ئیسلامەوەو بووە هۆی تێکەڵبوونی هەموو کەلتوورو شارستانییە جۆربەجۆرەکان، بەڵام هەر ناوچەیەك لەگەڵ ناوچەیەکی تردا جیاوازی هەبوو لەگەڵ کاریگەری ئەو کەلتوورو شارستانییەتیانە، بۆ نموونە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك و دەوروبەری بە هۆی ئەو شەڕو پێکدادانانەی ئەو ماوەیە ئەو کاریگەرییانە بە شێوەیەکی بەرفراوان دەوری خۆیان نەبینی، لەبەر ئەوەی ئاسوودە نەبوونی ناوچەکە لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە بوو بە هۆکاری دواکەوتنی ئەو پەیوەندییانەو تێکەڵبوونی کەلتوورو شارستانییەکان زۆر بە سستی هەنگاویان دەبڕی.

لە پێش سەردەمی عەباسییەکان تا کۆتایی عەباسییەکان بوو بە هۆکارێکی گرنگ بۆ لەدەستدانی گەلێك پیشەو کەلەپوورو شارستانی ناوچەکە، تەنانەت گەلێك لە شوێنەوارەکانیش لەو ماوەیە کەوتنە بەر شاڵاوی ئەو هێرشانەو تاڵانکردن، چونکە قەبارەی ئاژاوەکان لەو ماوەیەدا زۆر گەورە بووەو ماوە لە دوای ماوە گەمارۆ خراوەتە سەر شوورەکانی داقوق و وای لێ کردووە بەشێکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکە ڕەو بکەن و خۆیان دوور بگرن لەو شەڕو ئاژاوانە، بەڵام لەگەڵ خۆیدا بوو بە فەوتاندنی بەشێکی زۆر لە پیشەو کەلتوورو لە ناوچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، هەر ئەمەش وای کرد بەشێکی زۆر لە شوێنەواری کۆشکی داقوق و شوورەو مزگەوتی داقوق پاشماوەکانیان تووشی دزین و تاڵانکردن بێن، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە دەنگ و ڕەنگی تا ماوەیەکی زۆر بزر بوو.

لەماوەی کۆتایی دەوڵەتی عەباسی تا هاتنی عوسمانییەکان گەلێك نەتەوەو هێزی جۆراوجۆر فەرمانڕەوایی ناوچەکەیان کردووە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ بەشێکیان لە ناوچەکانی ئاسیاو ناوەڕاست و ئاسیای سەرووەوە هاتوون و گەلێك شوێنیان تووشی کاولکاری کردووەو جێپەنجەیان لە هەموو بوارەکاندا بە زەقی بەدەرکەوتووەو بەشێك لەو ناوچانەی کە کەوتووەتە بەر شاڵاوەکانیان زۆر بە فراوانی تەخت و خاپوور بووە، بە تایبەتی لە دوا دواییەکانی دەوڵەتی عەباسیدا کە گەلێك خەلیفەی بێ هێز هاتن توانای دەسەڵات و هێزی سەربازییان نەبوو، بۆیە بەشێکیان هەر بەناو خەلیفە بوون بەڵام دەسەڵات و ناوچەکەیان دابەشکرابووە سەر گەلێك هێزی سەربازی و سیاسی.

ئەوەی جێگەی سەیرو سەرنجە لەو ماوەیەدا کە کەرکوك و دەوروبەری لە ڕووی شارستانییەوە تووشی هەرەسهێنانێکی گەورە بووەو سەرچاوەکان زۆر بە دەگمەن باس لەو ماوەیە دەکەن، چونکە بەشێکی زۆری ناوچەکانی کەرکوك و دەوروبەری تووشی خاپوور بوون و کاولکاری بوونە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە هەندێك لە شوێنەکانی بیابانێکی بێ کەس بووەو زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بۆ ماوەیەکی زۆر بە جێهێڵدراوە، تا کار گەیشتووەتە ئەوەی ئاوەدانکردنەوەی

ماوەیەکی زۆری ویستووەو گەلێك لە بنەما مێژوویی‌و کەلەپووری‌و شارستانییەکانی لەدەست داوە یان کەوتووەتە بەر تالآنکردن.

سەرچاوەکانمان لەو ماوەیە زۆر کەم‌و دەگمەنن‌و زیاتر لەو چوارچێوەیەدا خۆی بینیوەتەوە کە باس لە رووداوە سیاسی‌و سەربازییەکانی کراوە بێ ئەوەی ئاماژەیەکی بەرچاو هەبێت لە پێناو باسکردنی ژیانی رۆژانەو پیشەو داب‌و نەریت‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی‌و ئابوورییەکان.

".. بەشێك لە مێژوونووسە عەرەبی ئیسلامییەکان باسی ئەو ناوچەیان کردووە بەڵام پێ داگرییان کردووە لەسەر لایەنی سیاسی‌و سەربازی، بەڵام لە نێو ئەم باسانەدا بەشێك لە زانیارییە گرنگەکانیان لایەنی ئابووری‌و تەلارسازی ناوچەکانی باس کردووە لە کاتی گێرانەوەی رووداوە مێژووییەکان، بۆ نموونە یەکێکی وەکو (ئیبن ئەلئەسیر) لەم جۆرە باسانەی هەیە بەڵامو بە شێوەیەکی پچرپچر. "(٩).

بۆ نموونە گەلێك کتێب‌و نووسەری جۆراوجۆر بابەتەکانیان لەو چوارچێوەیەدا باسەکانیان لایەنی کەلتووری‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان باس کردووە، وەکو:

١. (الكامل في التأريخ)، ئیبن ئەلئەسیر.
٢. (تأريخ الإسلام)، ئەلزەهەبی.
٣. (الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة)، ئیبن ئەلفوتی.
٤. (تأريخ الامم والملوك)، ئەلتەبەری.
٥. (الجامع المختصر في عيون التواريخ والسير)، ئیبن ئەلساعی.
٦. (تأريخ ابن خلدون)، ئیبن خەلدون.
٧. (تقويم البلدان)، ئیبن ئەلفیدا.
٨. (نزهة القلوب في المسالك والممالك)، حەمەدوڵڵا ئەلمستەوفی.
٩. (تكملة اكمال الاكمال)، ئیبن ئەلسابوونی. و گەلێکی تر.

"ئومەوییەکان هەوڵیان دەدا کە درزێکی گەورە بخەنە بەینی عەرەب‌و عەجەمەکان‌و داهێنانی ئەوەی کە عەرەبیان بە هاووڵاتی پلە یەك دادەنا‌و عەجەمەکانیشیان بە هاووڵاتی پلە دوو هەژمار دەکرد، ئەمیش لەگەڵ بنەماکانی ئاینی ئیسلامدا نەدەگونجا..، لە پاڵ ئەمەشدا ئومەوییەکان هەوڵیان دەدا بە چەوساندنەوەی ئابووری ئەویش لە رێگای کۆکردنەوەی ماڵ‌و موڵکێکی زۆر بەناوی سەرانەوە"(١٠).

بۆیە ئەگەر بەراوردێکی ئەو سەردەمە بکەین لەنێوان ئومەوییەکان‌و عەباسییەکاندا دەگەینە ئەو راستییە کە پەیوەندی چینە کۆمەڵایەتییەکان لەو کاتەدا جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا هەبووەو راستی ئەم قسەیەش لەوەدا سەرچاوە دەگرێت کە گەلێك شەڕو ئاژاوەو راپەرین لە ناوچەکانی داقوق کەرکوکدا سەریان هەڵدا بە تایبەتی لە سەردەمی ئومەوی‌و عەباسییەکاندا.

هەر لەو ماوەیەشدا گەشەنەسەندنی بارە ئابوورییەکە هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ لە دەستدانی یان نەبووژانەوەی باری کۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆیدا بوو بە هۆی هەرەس هێنانی بەشێکی گەورە لەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی‌و سەرچاوە ئابوورییانە، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی بەشێکی زۆری زەوییە کشتوکاڵییەکان بە بەیار مایەوەو خەڵکەکە چۆڵی کرد یان کەوتنە بەر شاڵاوی هێرش‌و راپەرینەکان.

لە ماوەی فەرمانرەوایی ئومەوی‌و عەباسییەکاندا چ کوردستان‌و لەگەڵشیدا کەرکوك کەوتنە نێو بۆشاییەکی گەورە کە هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتەوە بە تایبەتیش لە بواری کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و کەلتورو شارستانییەتییەکان بە شێوەیەکی ئەوتۆ نەتوانرا بەشێکی زۆری ئەو کەلەپورو شارستانییەتییانەی لەوە پێش بپارێزرێت، یان بتوانرێت بە شێوەیەکی ئەوتۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت کە لەگەڵ بنەماکانی ئەو سەردەمانەدا بگونجێت.

دەوڵەتی عوسمانی لە ماوەی دروستبوونی تاوەکو کۆتایی دەوڵەتەکە بە گەلێك قۆناغی مێژوویی گرنگدا رۆیی کە دەورێکی باڵای بینی لە گۆرانکارییەکانی ئەو ویلایەتانەی لە نێو ئاقاری ئەو دەوڵەتەدا بوون کەوتنە ژێر کاریگەری جۆرەها گۆرانی هەمەجۆر لە هەموو بوارەکاندا بە تایبەتی لە بواری سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سەربازی‌و بازرگانی‌و کەلتورو شارستانییەت‌و هونەری تەلارسازی.

بەشێکی زۆری ویلایەتەکانی ئەم دەوڵەتە هەر یەکەی لە ماوەیەکی دیاریکراوی مێژووییدا عوسمانییەکان فەرمانرەواییان کردووە، کەرکوکیش یەکێك بووە لەو ناوچانەی تا ماوەیەکی زۆر کەوتە ژێر رکێفی عوسمانییەکانەوە، بەشێکی زۆری ئەو ململانێ‌و بەربەرەکانییەی نێوان عوسمانی‌و سەفەوییەکان کاولکاری‌و شەڕو ئاژاوە بەر ئەم شارەش کەوتووە.

لە ماوەی نێوان شەری (چالدێران) تا هاتنی ئینگلیزەکان‌و داگیرکردنی عێراق کەرکوك بوو بە گۆرەپانێکی گرنگی رووداوە مێژووییەکان‌و گەلێك کاریگەری ئەو دەوڵەتە بەسەر بوارە جۆربەجۆرەکاندا بە جێما خۆی بینییەوە لە کارتێکردنی دەوڵەتەکە بەسەر ویلایەتەکانداو کاریگەری هەر یەکێکیان دەوری بینی لە گۆرانکاری رووداوەکان‌و کەلتوورو شارستانییەتی ناوچەکان.

ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین دەبینین گەلێك پاشماوەی کۆمەڵایەتی‌و شارستانی ئەو سەردەمانەمان بۆ بەجێماوە کە دەوری بینیوە لە گۆرانکاری لەنێوان هەموو پێکهاتەکانی ئەو شارەدا ئەویش لەسەر بنەمای پێکدادان‌و هەڵسوکەوتی هەر یەکە لەو نەتەوەو پێکهاتە ئاینییانە لە پێناو گۆرانکاری ژیانی رۆژانەیاندا.

بە حوکمی ئەوەی کە کەرکوك بەشێکی گرنگ بووە لە رووداوەکانی ئەو کاتەی کوردستاندا، لە پاڵ کاریگەری ئیمارەتە کوردییەکانی ناوچەکە دەوری خۆیان بینییوە لە پاراستنی بەشێکی زۆر لە کەلتوورو شارستانییەتی کوردستان لەو شارەداو پاراستنی لە چوارچێوەی دەوڵەتەکە.

"وێناکردنی رەوشی ژیان لە کۆمەڵگەی کوردی سەردەمانی رابردوودا، کارێکی فرە گرنگە بۆ تێگەیشتن لە سروشتی کۆمەڵگەی کوردی ئەمرۆ، بێگومان ئەمەش زۆر پێویستە بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا. لەم

چوارچێوەیەشدا ئاوڕدانەوە لە سەردەمی عوسمانی گرنگی خۆی هەیە. لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی کوردی هاوچەرخ زادەی کۆمەڵگەی سەردەمی عوسمانییەو ئەوەکانی ئەمڕۆی کوردستان تەنیا چەند پشتێك لەم سەردەمەوە دوورن"[١١].

ئەوەی لێرەدا گرنگە بیڵێم هەوڵدان بۆ تاوتوێکردنی شارێکی وەکو کەرکوك لەو سەردەمەدا بە تایبەتی لە بواری کۆمەڵایەتیو پەیوەندییەکانی ئەو کەلتوورو شارستانییەتییەی کە سەردەمانێك لەو شارەدا گوزەری کردووە کە خۆی دەبینێتەوە لە باروودۆخی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی هۆزایەتیو شێوازی ژیانو پێکهاتەی گوزەرانو ئاستی بژێوی لە پاڵ پێکهاتەکانی دانیشتووانو ئاکارو دابو نەریتی لەگەڵ گرنگی یاریو ڕابواردنو جەژنو بۆنەکاندا.

ئەوەی کەرکوك جیا دەکاتەوە لەگەڵ ویلایەتەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی ئەوەیە کە تایبەتمەندی خۆی هەیە لە ڕووی پێکهاتەی دانیشتووانو نەتەوەو یەکە ئاینییەکان لەگەڵ گرنگی کەلتوورو شارستانییەتی هەر یەکەیان لە بواری ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو ئاینییو زمانو جلوبەرگو دابو نەریتە جۆراوجۆرەکان.

"ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا بە درێژایی سەردەمی عوسمانی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بناغەی هۆزایەتی دامەزرابوو. بە جۆرێك زۆربەی دانیشتووانی کوردستان ژیانو کەسایەتی خۆیان لە نێو قەوارەی هۆزەکاندا دەبینییەوە، بۆیە گەریدەیەکی بیانی تەنانەت لە کۆتایی سەردەمی عوسمانیدا، کوردستان بە (وولاتی خێڵەکان) وەسف دەکات"[١٢].

لە پاڵ ئەم کاریگەرییە هۆزایەتییەی ئەم ناوچەیە، دەوری گرنگی خۆی بینییوە لە پاراستنی بەشێکی زۆری ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو کەلتوورو شارستانییەتانەی لەو کاتەدا باو بووە کە لە ئێستادا مانەوەی دەورێکی گرنگی بینییوە بۆ پاراستنی ئەو کەلەپوورو پەیوەندییە کۆمەڵاتییانە کە بەشێکی تاکو ئێستاکەش دەوری خۆی هەیە لە بەکارهێنانەکانی ژیان لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا.

گەلێك لەو هۆزانەی وەکو (جاف، بەیات، تاڵەبان، زەنگەنە، جەباری، شوان، هەمەوەند، داودە، کاکەیی، بەرزنجی، ڕۆژبەیانی) هەر یەکەو لە ناوچەیەکی دیاریکراودا یان لە هەندێ کاتی تردا بەشێکیان لە چوارچێوەی ئیمارەتە کوردییەکاندا دەوریان بینییوە لە پێگەیاندنی بارە سیاسیو سەربازییەکەدا، بە تایبەتی لە کاتی ڕووداوە مێژووییەکاندا، بە حوکمی ئەوەی بەشێکی زۆری دەوروبەری کەرکوك تێکهەڵکێشی ژیانی لادێییو گوند بووە بۆیە گەشەکردنی باری هۆزایەتی دەوری خۆی بینییوە لە پێگەیاندنی بەشێکی زۆری کەلتوورو شارستانییەتیانە.

"کۆمەڵگەی کوردی لە دەرەوەی شارەکان لە بنەڕەتەوە کۆمەڵگەیەکی هۆزایەتییە"[١٣].

"لە بەرانبەر ئەمەدا ڕژێمی هۆزایەتی لە شارو شارۆچکە کوردییەکاندا زۆر کاریگەر نەبوو، لەبەر ئەوەی شارستانەکان کە زۆربەیان لە بنەڕەتدا خەڵکی سەر بە هۆزو تیرەی جیاجیا بوون، بە هۆی ڕەهەندی شوێنو گۆڕانی شێوازی ژیانیان، بەرەبەرە پەیوەندییەکانیان بە هۆزو خێڵەکانیان لاواز بووە یان پچڕابوو. سەبارەت بەو مەسەلەیە، لە ساڵنامەی ساڵی (١٣٣٠)ی کۆچیی ویلایەتی موسڵدا هاتووە کە نەریتی ئەو کوردانەی لە شارو شارۆچکەکاندا. نیشتەجێن وەك شارنشینەکانی لێهاتووە. بەڵام ئەوانی تر هەلومەرجی هۆزایەتیو ناوی هۆزەکانیان پاراستووە"[١٤].

هۆکاری ئەم گۆڕانکارییە لە شارێکی وەکو کەرکوکدا لەوەدا خۆی دەبینییەوە کە دەوڵەتی عوسمانی لە ڕووی کارگێڕییەوە هەوڵی دەدا بە شێوازێکی ئەوتۆ مامەڵە لەگەڵ پێکهاتەکانی ئەو شارەدا بکات کە خۆی دەبینییەوە لەو هێڵە درێژە سەربازییەی کە بەکاری دەهێنا بۆ بەرژەوەندی خۆی لە پێناو پاراستنی بارە سیاسییەکە، بۆیە هەوڵی ئەوەی دەدا ئەوانەی لە یەکە کارگێڕییەکانی دەوڵەتدا کاریان دەکرد یان لە پلەی بەرزدا بوون پێکهاتەیەکی بەسەر پێکهاتەیەکی تردا بە گرنگ دەزانی لەبەر ئەوەی خزمەتی بەرژەوەندییە سەربازییەکەی دەکرد، هەر ئەمەش وای کردبوو گەلێك لەو کەسانەی کە لەو بوارەدا کاریان دەکرد وازیان لە گەلێك لە ژیانی هۆزایەتیو نەتەوەییو پێکهاتەیی خۆیان دەهێنا لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بگونجێت لەو ئاستەی کە هەم دەوڵەت لێی ڕازی بێتو بەرژەوەندی خۆیشی تێدا بێت.

دەرهاویشتەی ئەم کاریگەرییانە وای دەکرد هەردەم پێکهاتە هۆزایەتییەکان هەر یەکەی بە پێی پێویستی بەرژەوەندی دەوڵەت حیسابی بۆ دەکراو لە دابەشکردنی زەوییو نەوتو کەرەستە ئابوورییەکانی تردا حیسابی هەر یەکێکی لە بەرژەوەندی خۆیدا دەبینییەوە.

"ئەرکەکانی سەرۆك هۆز بە شێوەیەکی گشتی بریتی بووە لە بەڕێوەبردنی کاروباری هۆزەکەو یەکلاییکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان بە شێوازێکی دادپەروەرانەو پاراستنی هۆزەکەی لە دەستدرێژی هۆزەکانی دەوروبەریو دەسەڵاتدارانی دەوڵەت. هەروەها بە جێگەیاندنی ئەرکەکانی هۆزەکەی بەرانبەر بە دەوڵەت یان میرنشینەکان، بە تایبەتی کۆکردنەوەی باجو ئامادەکردنی هێزی سەربازی لە کاتی پێویست. بێگومان داڵدەدانی پەنابەرانو ناندانی میوانانیش لە ئەستۆی ئەودابوو"[١٥].

ژیانی هۆزایەتی لە لادێکانی دەوروبەری کەرکوکدا زۆر سادەو ساکار بووەو خەڵکی لەسەر بەخێوکردنی ئاژەڵو کشتوکاڵ بوونە، زۆربەی خەڵکەکەش لە خانووی دروستکراو بوو لە قوڕو خشت، ژیانی نانخواردنیش لە پێویستییەکانی ئەو کاتەی گوندەکەدا بووە وەکو شیرو ماستو پەنیرو خورماو ڕۆنی ئاژەڵی، بەکارهێنانی گۆشتی ئاژەڵ زۆر کەم بووە بە تایبەتی لە ڕۆژەکانی جەژندا یان لە هاتنی میوانێکی گەورەدا خوراوە، بەڵام ژیانی ڕۆژانی تریان زۆر بە ئاسایی بردووەتە سەر.

بە هۆی دەوڵەمەندی ناوچەیەکی وەکو کەرکوك لە ڕووی پیتی زەوییەکەیو گرنگی شوێنەکەی بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵو کشتوکاڵ دەوری بینییوە لە پێگەیاندنی پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییە جۆربەجۆرەکان لە نێو کۆمەڵگەی هۆزایەتیدا بۆ ئەوەی بنەماکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان پتەو بێت، ئەویش لە چوارچێوەی یارمەتیدانییەکتری بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵ و دروێنە.

"کۆمەڵگەی کوردی لەو سەردەمە لە ڕووی شێوازی ژیان و گوزەراندا بۆ سێ جۆر دابەش دەبوو: ئەوانیش کۆچەرو نیمچە کۆچەرو نیشتەجێ بووەکان بوون، کۆچەرەکان یان ڕەوەندەکان ئەوانە بوون کە بە درێژایی ساڵ ژیانیان لە چادرو ڕەشماڵاندا بەسەر دەبرو بە پێی وەرزەکان بە خۆیان و مەڕ ماڵاتیان لە نێو ناوچە شاخاوییەکان و دەشتەکاندا هاموشۆیان دەکرد"(١٦).

ئەگەر سەیری ناوچەی کەرکوک و دەوروبەری بکەین لەو کاتەدا دەبینین تا ڕادەیەک ئەو جووڵانەوەیە لەو ناوچانەدا بە تایبەتی لە بوونی هۆزە جۆراوجۆرەکانی کۆچەری و نیشتەجێبووەکان هەردەم ئەو ناوچەیەش دەکەوتە بەر گۆڕانکارییەکانی وەرزو ئاو و هەوا، بۆ نموونە هۆزێکی وەکو (جاف) کە هەردەم لە کۆچرەویدا بوون بۆیە بەشێکیان لە ناوچەکانی (کەلار) و (کفری) دەچوونە شوێنەکانی سنووری کوردستان و ئێران و لە وەرزەکانی تردا دەهاتنەوە شوێنەکانی خۆیان.

ئەم کاریگەرییەی کۆچرەویی هۆزەکان لەم ناوچەیەدا دەوری گرنگی هەبوو لە پێگەیاندنی ئیمارەتەکان و باڵادەست نەبوونی عوسمانییەکان بە سەریاندا.

بۆ نموونە ئەگەر سەیری هۆزی (زەنگەنە) بکەین لە سەردەمی ئیمارەتی زەنگەنەدا دەبینین کاتێک ئیمارەتەکەیان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لەگەڵ سەفەوییەکاندا تووشی کێشە بوون و ئاوارەی کوردستانی باشوور بوون، بەردەوامییان بە ژیان داو سنووری ئیمارەتەکەو ئاڵایان تا ئاقاری حەمرین درێژەی کێشا.

گرنگی هۆزەکان لەو کاتەدا بە کۆچەرەوو نیشتەجێکان لەوەدا بوو لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوک کە خۆی دەبینییەوە لە پاراستنی داب و نەریت و کەلەپورو شارستانی و جلوبەرگ و گۆرانی و مۆسیقا، تایبەتمەندی ئەو ناوچەیەش لەوەدا بوو کە شوێنێکی بە پیت و تەختایی و بەرفراوان بوو لە پاراستنی ئەو شارستانییەتیانەدا، لە پاڵ گرنگی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کاتە ئەوەندەی تر گرنگی شوێنەکان دەوری دەبینی لە پتەوکردنی پەیوەندی هۆزایەتی.

تەنانەت لە هەندێ شوێندا تایبەتمەندی هەر هۆزێک لە ناوچەیەکی دیاریکراو لە کەرکوک ڕەنگدانەوەی ئەو شارستانییەتیە لە نزیکی لەگەڵ هۆزێکی تردا تێکەڵاوی لە گەلێک لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان یەکی دەگرتەوە لەسەر بنەمای ئەوەی ژن و ژنخوازی و ژیانی ڕۆژانەیان تێکەڵییەکتری دەبوو، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە هەندێک جار تایبەتمەندییەکانی هەر هۆزێکی نەدەناسرایەوە، بەڵام ئەمە زیاتر لە هۆزە نیشتەجێکاندا ڕەنگی دەدایەوە وەکو ئەوەی لە هۆزە کۆچەرییەکان، چونکە هۆزە کۆچەرییەکان هەندێ جار سنوورەکانیان دەبڕی کە دەبوو بە هۆکاری گرنگ لە گواستنەوەی کۆمەڵێک بنەمای شارستانی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە دەرەوەی سنوور.

ئەم کاریگەرییانە هەندێ جار دەکەوتنە بەر ململانێی دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانی و ڕەنگدانەوەی بە زیان بەسەر هۆزەکاندا دەکەوتەوە، بەو شێوەیەی دەبووە لەدەستدانی بەشێکی زۆری ئەو کەلەپوورو شارستانییەتیانە، یان هەندێ جار دەوریان دەبینی لە خولقاندنی ئاژاوە لەنێوان هۆزەکان لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییە سیاسی و سەربازییەکانی خۆیان لە سنوورەکان.

لە هەندێ باری تردا هۆزەکانیش ململانێ و بەربەرەکانی خۆیان دەکرد لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، بۆیە لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا بەرژەوەندییەکانیان چڕ دەکردەوە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە هەردوو دەوڵەتەکە پلەو پایەی تایبەتییان بدەنێ تا بەرژەوەندییە سەربازییەکانی خۆیان بپارێزن.

ئەگەر بێت و سەیری شێوازی ژیان و گوزەرانی ئەو کاتە بکەین لە کەرکوک دەتوانین کۆمەڵگە بکەینە سێ بەشەوە: بەشی کۆچەر، نیمچە کۆچەر، نیشتەجێبووەکان.

کۆچەرەکان (ڕەوەندەکان) بەو کەسانەیان دەوت کە هەردەم ژیانیان لە کۆچرەوویدا بووەو لە ڕەشماڵ چادردا گوزەرانیان کردووەو ژیانی ڕۆژانەیان لە بەخێوکردنی ئاژەڵ و کاروبارەکانیان هەردەم لە توانایەکی بەردەوام بوونە بۆ هاتووچۆکردن لە شوێنە جیاجیاکانی کوردستاندا بە شێوەیەکی ئەوتۆ تاکو بگونجێت لەگەڵ بەرژەوەندی گوزەرانیان.

هاتووچۆکردنی گەرمیان و کوێستان دەوری سەرەکی بینیبوە لە پێشکەوتنی ژیانیان، "(جافەکان هەموویان لە ڕەشماڵدا دەژیان و بە درێژایی سەردەمی عوسمانی هاوینان لە شاخە بەرزەکانی سەر سنووری ئێران هەڵیاندەداو بە ناوچەی شارەزوور بڵاودەبوونەوە، بەزستانیش بۆ ناوچە گەرمێنەکانی باشوور کۆچیان دەکردو تا قزلرەبات و خانەقین دەهاتن و لە هەردوولای زێی سیروان هەڵیان دەدا"(١٧).

هەروەها هەموو ئەو هۆزە کۆچەرییانە هەر یەکە شوێنێکی دیاریکراویان هەبوو لەنێوان گەرمیان و کوێستاندا، بەشێکیان وەکو هێڵێکی دیارکراو هەموو ساڵێک لە پێدەشتی شوێنەکانی خۆیاندا سنوورو ئاقاری خۆیان دیاری بووە.

بەڵام نیمچە کۆچەرییەکان بەو شێوازە ژیانەیان دەوت کە لەنێوان کۆچەری و نیشتەجێبووندا بوو بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لە هەندێ لە کاتەکان لە شوێنێکی دیاریکراودا کاری دروێنەو توێکردنیان دەکرد، لە هەندێ باری تردا کاری شوانکارییەکان دەکرد، بۆیە لەسەر شێوازێکی ژیانی دیاریکراو نەچەسپابوون.

بەڵام نیشتەجێبووەکان ئەوانە بوون کە لە شارو شارۆچکەکانی کەرکوک دادەنیشتن، هەروەها ئەوانەیش دەگرتەوە کە بە هەمیشەیی لە گوندەکاندا نیشتەجێ بوونە.

دانیشتووانی نیشتەجێ بووی نێو شاری کەرکوک بریتی بوون لە چینی نیوە ئەرستۆقراتی و ناوەندو هەژارو کەمدەرامەت:

خێزانە ئەرستۆقراتییەکان پەیوەندی لەنێوانیاندا پەیوەندییەکی نیوە دەرەبەگایەتی بوو کە لە ژیانێکی ئاسوودەدا دەژیان‌و زەوی‌و زارێکی زۆری دەوروبەری کەرکوک بە ناویانەوە بوو. وەکو خێزانی: (نەوتچییەکان، تاڵەبانی، سەیید ئەحمەد خانەقا، قازی، قیردار، نەقیب، یەعقوبی، ئاوچی، زەنگەنە، بەرزنجی).

بەشێك لەم خێزانانە بازرگان بوون یان پیشەکار بوون، بەشێکی تریشیان دەرەبەگی زەویزارێکی زۆر بوون، بەڵام ئەو خێزانانەی کە لە بواری بازرگانییە کاریان دەکرد بە تایبەتی لە بواری کڕین‌و فرۆشتنی پێویستییەکانی ڕۆژانە وەکو قوماش‌و خواردن‌و کەلوپەل‌و کەرەستەی ئامادەکراو.

"هەر لە سەردەمانێکی زووەوە پیشەی بازرگانی برەوی خۆی هەبوو بە تایبەتی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، بەڵام کاتێك هێڵێ شەمەندەفەر لەنێوان بەغداو کەرکوك بەسترایەوە بوو بە ڕێگایەکی ئاسانکراو بۆ گواستنەوەی پێویستییەکان لەنێوان کەرکوك‌و شارەکانی دەوروبەری بە تایبەتی لە بواری پیشەسازی ڕستن‌و چنین‌و فەخوری‌و پێستەخۆشکردن‌و نەوتدا"[١٨].

بەشێکی زۆری ئەم خێزانانە داهاتیان لەسەر ئەو زەویوزارە فراوانانە بوو کە بە ناویانەوە بوو کە هەمووساڵێك بژێوویان لەسەر داهاتەکانیان بوو بەو پارەیە گەلێك پرۆژەو کاریان لە نێو شارەکاندا دەکردو هەردەم داهاتەکانیان لە زیاد بووندا بوو بە ڕێژەیەکی ئەوتۆ کە حیسابی ووردیان بۆ دەکرا لەلایەن حکومەتەوەو پێگەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتییان هەبووە.

جۆری ژیان لە شاری کەرکوك، زۆری خانووەکانی شارەکە بنیات نرابوو لە بەردی سپی‌و بەشێکی لە خشتی سوورەوەکراو، دەروازەی چوونە ناوەوەی خانووەکان لە شێوەی مۆڵگەیەکی گەورەو تۆکمەدا بوو، شارەکە پێکهاتبوو لە بازارو گەرەکی تایبەت کە دەناسرایەوە بە تەسکی کۆڵان‌و شەقامەکانی، زۆری ڕێگاکانی قیرڕێژ نەکرابوو لە زستادا یەك پارچە دەبوو بە قوڕاو.

بەڵام چۆنێکی گەیشتنی ئاو بۆ ماڵەکان بە شێوەی باوی ئەو کاتە بووە لە ڕێگای بیری ئیرتیوازی، کارێز، یان لە ڕێگای وەرگرتنی ئاو لە ڕێگا لە جۆگا سەرەکییەکانی کە بەنێو شاردا دەڕۆیی، پاسەوانی تایبەتی بۆ دانرابوو بۆ پاراستنی لە پاك‌و پوختی ئاوەکان، بۆیە هەندێ لە خەڵکی نێو شارەکە ئیشیان ئاودێری یان سەقایە بوو بە گواستنەوەی ئاو بە پارە بۆ ماڵەکان، بەڵام لە دوای بیستەکانی سەدەی ڕابردوو شارەوانی کەرکوك لە هەوڵداندا بوو بۆ چارەسەرکردنی گواستنەوەی ئاو بۆ ماڵەکان تا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی پوخت‌و پێویست بگاتە دەستیان.

بەڵام چینی هەژارو نەدار بریتی بوون لەوانەی لە شارەکەدا لە ئیشی کارگوزاری‌و کرێکاری‌و شوانکاری‌و کۆڵبەرو کۆڵهەڵگر کاریان دەکرد، ئەوەی بە ڕۆژ دەستیان دەکەوت بەشی ڕۆژێك یان بەشی چەند ڕۆژێکیانی دەکرد بۆیە ژیانیان کولەمەرگی بوو کە بە ژیانێکی مەمرەومەژی دەژیان‌و لە هەموو پێویستییەکانی ژیانیان بێ بەش بوون یان نەیاندەتوانی بە پێی پێویستییەکانی ئارەززوی خۆیان کار بکەن.

بەڵام چینێکی تریش هەبوو کە وەك دەمراستی چینە باڵاکە کاروبارەکانی ڕۆژانەیان دەبرد سەرو ئەوان سەرووبەری زەوی‌وزارو کڕین‌و فرۆشتنیان بۆیان دەکرد پەیوەندییان زۆر باش بووە لەگەڵ چینی دەوڵەمەندو هەژاردا، چونکە هاوپەیوەستی کاروبارەکانی ڕۆژانەیان بوون، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بتوانن لە بەرژەوەندی خۆیان کار بکەن.

خواردن‌و پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان لەسەر نان‌و برنج بوو دەتوانین بڵێن بە پێویستی سەرەکی ڕۆژانەیان دادەنرا، هەروەها گۆشت‌و بەروبوومەکانی گەنم‌وەکو ساوەرو قەرەخەرمان خواردنی سەرەکی خێزانە دەستڕۆشتووەکان بوو، بەکارهێنانی سەوزەواتیش لە هاویندا دەوری سەرەکی خۆی هەبوو وەك ئەوەی لە زستاندا.

دەربارەی خواردنەوەو شەربەتەکانی میوە کە باوو بووە لە کەرکوکدا لەو کاتە بریتی بووە لە شەربەتی مێوژو پرتەقاڵ‌و هەنار، بەڵام خواردنەوەی چای لە سەرەتای سەدەی ڕابردوودا هاتووەتە شارەکەوە، بە تایبەتی لە کاتی هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق، لەبەر بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە سەرچاوەکانی داری میوە لە نێو شارەکەو لە لادێکانی دەوروبەری سەرچاوەیەکی گرنگ بوو بۆ بەکارهێنانی جۆرەها خواردنەوەو شەربەت یان لە ڕێگای ووشککردنەوە بۆ زستان بۆ خواردنەوە، یان بەکارهێنانی لە بواری بازرگانیداو گواستنەوەی بۆ دەرەوەی شارەکانی کەرکوك.

دەربارەی یاری‌و ڕابواردن‌و جەژن‌و بۆنەکان لە ماوەی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا لە کەرکوك، خەڵکەکە بایەخیان بە پاراستنی کەلەپوورو داب‌و نەریتەکانیان دەداو لە هەوڵدا بوون بۆ بەکات بەسەربردن لە دەشت‌و دەر یا خۆ خەریك کردن بە یاری‌و گەشت لە بەهاراندا. هەر یەکە لە چینەکانی کۆمەڵگەش جیاوازییان هەبوو لە چۆنێتی مامەڵکردن لەگەڵ یاری‌و ڕابواردن‌و گەشتکردندا، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە ڕەنگدانەوەی سیماکانی چینایەتی پێوە دیار بووە، چونکە چۆنێتی لەبەرکردنی جلوبەرگ، شێوازی بەکارهێنانی جۆری قوماش، ڕەنگی قوماش، جۆری خورییەکەی، ئەمانە هەموو دەوریان هەبوو لە دروستکردن‌و بەکارهێنانی لە ژیانی ڕۆژانەدا.

ژن هێنان‌و ئاهەنگ سازکردن بۆی یان لە سرووتی گواستنەوەو چۆنێتی ئامادەکردنی هەردوو لا لەو سەردەمەدا دەوری خۆی هەبووە لە پێگەیاندن یان پاراستنی داب‌و نەریت‌و کەلەپوورو هۆزایەتی‌و ژیانی نەتەوەیی‌و ئایینی.

ئەگەر سەیری ڕابواردن‌و ئەو یارییانە بکەین کە لەو سەردەمەدا باوو بووە منداڵان جۆری یاری خۆیان هەبووە، هەروەها جیاوازی کورو کچ لەگەڵ جۆری یارییەکان جیاوازی هەبووە، یاری گەورانیش پێدەی خۆی هەبووە لە کات بردنەسەرو ڕابواردندا.

*** "یارییەکانی منداڵان تایبەت بە کوران:**

ئەستێرە پەنگەستێرە، ئەستی لە باخەڵ، پشییلە سورە، پەلیکانی، پیسکە، تاژتولە، تەقڵە لێدان، تیرو کەوان، جگانی، چاڵەوانانی، چاو بەستنەوە، چاوشارکێ (فەشیرکانی)، چرە باپیرە، چوزەرەکە، چەرمەسەرانی، چەق چەقوکەی بن گونان، حەلاّلیشك، حەمبەلە تفقانی، خیتی ژنان خیتی مێردان، داك داكانی، دزیی بێستان‌و ڕەزو نیسك‌و نۆك، دەمانچۆکە، زیچانی، ساپ ساپێن، سنجوقێن (ڕەگ ڕەگانی)، سونە سونانی، سەری بە بن کلاّو کەوتیە، سێ ڕیزکانی، شەپلە قونانی، شەرە بەرد، شەرە بەفر، شەوتا، شەوی شەو بەراتی، قورت قورتانی (چاڵێن)، قومەت قومەتانی، کلاّو پشت قونانی، کلاّو قشپلانی، کەری بەقاڵان (دێوەرە)، کەری پشت درێژ، کێشمانە کێش، گلۆلە موو، گوریس کێشانی، گی فررکانی، مێش گرە، ویلی ویلی، هۆپ هۆپ قەرە تۆپ.

*** یارییەکانی منداڵان تایبەت بە کچان:**

بووکەکە، بەنتك، پێنجوکانی، تیتلی سماق، چولی چولیانی، حووحایی، حەممەشکی، حیلانی، خانی چولکە، دوونگە مەرانی، سابونە رەقە، سووتام برژام، موری خولکانی، مەگری، مەگری مەگری، هەلور بەلور (زایی مایی)، هەلیسکۆ، هەی مشك، مشك مشك.

*** یارییەکانی منداڵان تایبەت بە کوڕو کچ:**

بابی بابی، بچین بچین، بووکە بە بارانە، پررنا پۆش، تاقمانە جووت، تەرو ووشکانی، حندر حوپ، حەکایەتی مێشە، دەچێە بەر مەری، سوێندە گورگانە، فری فری قەل فری، قجیلك، بابەجیلك، کەرەکەم بار کردییە، گەشت‌و سەیران، ماڵ ماڵانی، مەیل مەیلانی،

*** یارییەکانی تایبەت بە گەوران:**

ئەزە لەزە (ئەشکە لەشکە)، بارە خیبانی، بەللوری‌و وەیاروك، تەرکی بن بەری، تەلەو ڕێویانی، تەندوورە سوورکە، جفزێ، خەجە ڕوو (خواجە ڕوو)، دار کێشکانی، دروێنەی بەکرەیی، دزینی هەش، دەستار، دەمە تەقێ، دیزەو گوزە، راوە بەراز، راوە ژیشك، ساوار کوتان (حەللاو)، سەر لێ شێواندن‌و زمان تەتەلە پێ کردن، شەرە قور، شەرە کوفتە، قاشویانی (حەچان)، قاو قاوانی، قسەی ئەستەق، کلاّو دڕکانی، کەرو ئاشەوان، کەری کەر هاژو، کەلە مستانی، کەلەك دابرین، کێلە بەردانی، گورز گورزانی، گوریسی بن سنگی، گەنم گەنمانی، مەتەڵ، میری گزیرانی، نان نانانی، هوو لە ملانی، هەدار هەدارانی، هەلگرتنی شاهی ئەجندان، هەیاران (کۆسە بە با)، هەی کەر هەی کەر"[19].

ڕوویەکی تری ئەو کاتەی کەلتوورو شارستانییەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان لە کەرکوك بایەخیان بە دەرمانسازی‌و گرتنەوەی دەرمان دەدا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان یان بەکارهێنانی ئەو گژو گیایانە لە هەندێك سرووتی ئایینیدا کە خەڵك لەو سەردەمەد باوەڕیان پێی بوو ئەویش خۆی دەبینییەوە لە جۆری بەکارهێنانی گژو گیاکان‌و ڕێگاکانی ئامادەکردنی بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بگونجێت لەگەڵ پێویستییەکانی ژیاندا.

بە حوکمی ئەوەی کەرکوك لەو سەردەمانەدا شوێنێکی بەرفراوان بووە لە ڕواندنی جۆرەها گژو گیا کە لە بواری دەرمانسازیدا گرنگی خۆی هەبووە، بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە گوندەکانی دەوروبەری مۆڵگەیەکی بەرچاو بووە لە پێناو پێگەیاندنی ئەو جۆرە گژو گیایانەدا، بە تایبەتی وەرزی بەهاران شوێنێکی بەرچاوی هەبووە بۆ کۆکردنەوەی ئەو جۆرە گیایانەو سوود وەرگرتنی لە وەرزەکانی دیدا بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا، لە هەندێ شوێن بەفرو بارانێکی زۆر دەباری.

ڕووەك‌و گژو گیایەکان جۆراوجۆر هەمە چەشن بوونە کە بەشێکی بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەکاردەهێنرا، بەشێکی تریشی لە شێوەی هاراو یان کوڵان یان برشاندن بەکاردەهێنرا، کە نموونەمان بریتییە لە:

"ئەرقیتۆن، ئەسپەندەر، ئیبراهیم گەنی، بناو، بنێشتە تاڵ، بولاغ ئووتی، بەرکەمەر، بەرزەلنگ، بەروو، بەرەزا، بەلاّلووك، مێکووك، بیشەکرە، بیبەر، بێژان، پرچی پیرێژن، پەلپینە، پەیکوڵ، پیزل، تالگە، ترشۆکە، هەنگیر، تووی سوور، توورگ، ترپۆکە، تۆڵەگە، جاترە، جۆ داس، جەرجیر، جەوت، چاوی ووشتر، چۆغان، مازوو، حەندەقوق، حەوینجە، خاکشیر، خرنووك، خمی سوور، خوشیلك، خەربەن، خەرتەلە، خەنە، دارچین، دارلوو، دارەبەند، درکە، درکەزێ، رازیانە، سیاولە، رەشەدار، رەیحانە، زەردەچۆ، زەردە درك، زەعفەران، زەنجەبیل، زەنگۆلە، ژارماسی، زیرە، ژالە، سمل، سنامەکی، سنەوبەر، سیر، سیرموك، شاپانەسەرە، شملی، شاتەرە، شویت، شەرواڵە مۆرد، شەکرۆك، شەلەمە، گیا بەن، شیلان، عەرعەر، غار، غافت، خەردالە، فاتوبۆرە، پووپل، قارچك، زەل، قوتب، دووپەلە، قورادە، کاخیلی، قولنجانە، قەیسوم، قەورزە، کاردی، کاسنی، کاوزان، کزن، کلکە ڕێوی، کوزەلە، کنێر، کولەزوانە، کونجی، کەتان، کەندر، کاژ، گزگل، گوڵنار، گوڵ ئاگرین، ئەسپەلك، گوڵەباخ گوڵەبەرۆژە، بەیبوون، گوڵە پژمین، گوڵە خاتوونە، گوڵە خەپەلە، گوڵە رۆنە، گوڵە زەرد، شلێر، گوڵە فەقێ، ڕەبەنۆك، نێرگز، بنەوژە، هێرۆ، گولاّلە، گەرچك، گەزنە، گەنمەشامی، گیا برین، گیا بۆگەنە، گیا چاوانە، گیا پیسکە، گیا پیرۆز، گیا سەوزە، گیا سپی، گیا مەنۆلە، گیا دارۆك، لاولاو، مارگیرە، مازوو، مۆرد، مەحەلەب، مەعدەنۆس، مەرمەکی، مەریەمییە، ملاّت، مێخەك، میرمێ، نارنج، نانە شوانە، نەفەل، وشترخۆرە، هەسپك، هەرێس، هێل، یاوشان"[20].

کەرکوك وەکو ناوچەیەکی فرەنەتەوەو فرەئایین بۆیە لە ڕووی لەبەرکردنی جلوبەرگیشەوە جۆراوجۆرو هەمەچەشن بووە کە بە پێی نەتەوەو پێکهاتەو ئایینەکان گۆڕانکاری بەسەر هاتووە، لە هەمان کاتدا بایەخی بەکارهێنان‌و لەبەرکردنیشی لە ڕووی چینایەتییەوە جیاوازی خۆی هەبووە، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینییەوە کە هەر چینێك بایەخی خۆی داوە بە لەبەرکردنی جلوبەرگ بە پێی جۆری

قوماشەکەو رەنگ و بەهای هەرزانی و گرانی قوماشەکە.

بە شێوەیەکی گشتی کورد نێو شارەکە لەبەرکردنی کەواو سەلتە یان بەکارهێنانی مشکی یان مێزەر باوو بووەو لە پێ کردنی کڵاش و کەوشیش دەوری خۆی هەبووەو هەر لە سەردەمانێکی زووەوە بەکارهێندراوە، تورکمانی نێو شارەکەش بەشێکیان لە لەبەرکردنی کەواو چاکەت یان کەواو سەلتەی کوردەواری باوو بووە، بەڵام چینە ئایینییەکانی نێو شارەکە هەر یەکە بە پێی ئایینەکەی خۆی و ئاستی پلەی ئایینی جلوبەرگەکانی گۆرانی بەسەردا هاتووە، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینییەوە لە لەبەرکردنی جوبەو مێزەری ئایینی بەکارهێنراوە، لە پاڵ بەکارهێنانی رەنگەکان لەدیاریکردنی پلە ئایینییەکانیان، ئەویش بە شێوەی بەکارهێنانی هەر رەنگێك کە ئاست و توانای خوێندنی ئەو کەسە دیاری دەکات.

بەڵام چینە بۆرژواکانی نێو شارەکە یان ئەوانەی لە دەزگا کارگێری و بەرێوەبەرییەکانی دەوڵەتدا کاریان دەکرد، هەڵدەستان بە لەبەرکردنی جلوبەرگی ئەوروپایی باوی ئەو کاتە وەکو پانتۆڵ و چاکەت و تەربووش تا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاستی پلەی چینایەتییدا بگونجێت کە هەندێ جار لەگەڵ هێشتنەوەی سمێڵ و رازاندنەوەی بە پێی پێویست بەکارهێنراوە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (کوردو کوردستان لە رۆژگاری خیلافەتی ئیسلامدا)، د. زرار سەدیق تۆفیق، ٢٠١٣، لاپەرە (١٣).

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٢٧-٢٨).

٣. (داقوق، دراسة في تأريخها السياسي والحضاري ١٦-٦٥٦ هـ/٧٣٨-١٢٥٨م)، نامەی ماستەر، ئاریان جەماڵ ئیسماعیل هەرزانی، ٢٠٠٩، لاپەرەکانی (٨٢-٨٣).

٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨٥).

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٨٥-٩١).

٦. (کوردو کوردستان لە رۆژگاری خیلافەتی ئیسلامدا)، د.زرار سەدیق تۆفیق، ٢٠١٣، لاپەرە (٥٩).

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦١).

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٧٥-٧٦).

٩. (داقوق، دراسة في تأريخها السياسي والحضاري ١٦-٦٥٦ هـ/٧٣٨-١٢٥٨م)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤).

١٠. (تأريخ الكرد في الحضارة الإسلامية)، د. ئەحمەد ئەلخەلیل، (دار هيرو)، لوبنان، ٢٠٠٧، لاپەرە (١٩٥).

١١. (چەند لایەنێکی مێژووی رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانییدا)، د. سەعدی عوسمان هەروتی، چاپخانەی (حاجی هاشم)، هەولێر، ٢٠١٣، لاپەرە (٨٩).

١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩١).

١٣. (كرد وترك وعرب)، سی. جی. ئەدمۆنس، وەرگێرانی: جەرجیس فەتحوڵڵا، بەغدا، ١٩٧١، لاپەرە (١٦).

١٤. (چەند لایەنێکی مێژووی رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانییدا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٣).

١٥. (مع الاكراد)، تۆمابوا، وەرگێرانی: ئاواز زەنگەنە، بەغدا، ١٩٧٥، لاپەرە (٤٢).

١٦. (چەند لایەنێکی مێژووی رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانییدا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٩).

١٧. بروانە:

- (رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان)، مێجەرسۆن، وەرگێرانی: فوئاد جەمیل، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٧١، لاپەرە (١٦١).

- (گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠)، کلۆدیۆس جەیمس ریچ، وەرگێرانی: محەمەد حەمە باقی، چاپییەکەم، تەورێز، ١٩٩٢، لاپەرە (٣٠٩ - ٣١٠).

١٨. (تأريخ السكك الحديدية في العراق ١٩١٤ - ١٩٤٥)، عەلی ناسر جوسێن، چاپخانەی (السكك)، بەغدا، ١٩٨٦، لاپەرە (٦٦).

١٩. (فۆلکلۆری یارییەکانی کوردەواری، بریتییە لە ١٢٠ یاری فولکلوری)، محەمەد کەریم شەریف، چاپخانەی (الشمال)، کەرکوك، ١٩٧١، لاپەرە جۆراوجۆر.

٢٠. (دەرمانسازیی فۆلکلۆریی لە دەڤەری کەرکوکدا)، هەردەوێل کاکەیی، هەولێر، ٢٠٠٩، لاپەرەی جۆراوجۆر. *

*** پێکهاتەی چینایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان:**

د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان

*** تەوەری یەکەم:**

**چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان**

کۆمەڵگەی کەرکوکی وەك سەرلەبەری کۆمەڵگەکانی ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی، لە ئاکامی سەروەربوونی سیستەمە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە دواکەوتووەکانی عوسمانی، لە قۆناغی مێژووی نوێیدا، پەرەسەندن و پێشکەوتنێکی گرنگی ئەوتۆی لێ نەهاتە کایە. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو بارە نالەبارەی چین و توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکان تێی کەوتبوون، ساڵ دوای ساڵ لە نەهامەتییەکانیانی زیاتر دەکرد. حکومەت جگە لە دەستگرتن بەسەر زێدەبووی ئابووریی لە ڕێگەی کۆکردنەوەی باج و سەرانە، بایەخی بە ناوچەکان نەدەدا. بۆیە ئەمە تەنانەت کۆمەڵگە شارییەکانیشی بەرەو پێری سەروەربوونی ڕۆحییەتی خێڵایەتی و دەستپێوەگرتنی بەها خێڵەکییەکان برد[1]. ئەوەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر واقیعی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و دواکەوتنی مۆرکە ئابوورییەکانی هەبوو.

کۆمەڵگەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بە شێوەیەکی گشتی، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە لە ئاکامی چەند هەنگاوێکی حکومەتەوە، لەوانە دەرکردنی قانوونی زەوی‌وزار لە ساڵی (١٨٥٨)دا، گۆڕانکاری و پەرەسەندنێکی چڵۆنایەتیان بەخۆوە گرت[2]. یەکێك لە ڕەنگدانەوەکانی ئەو قانوونە بریتیبوو لە گەورەبوونەوەی بۆشایی نێوان چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە[3].

سترۆکتۆری قووچەکی کۆمەڵایەتیی نێو شارەکانی عێراق، لە ڕۆژگاری کۆتایی عوسمانیدا، لە چەند ئاستێك پێکدەهات، کە بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی (والی و فەرمانبەرە کارگێڕییە گەورەکان)، ئەفسەرە گەورەکانی سوپا و پۆلیس ئەوانەی تورکن یان بە تورکبوونە لە لوتکەکەی دەهات، ئینجا دواتر توێژاڵە کۆمەڵایەتییە خۆجێییەکان دەهاتن لە: ئەشراف، بنەماڵە خانەدانە کۆنەکان، گەورە بازرگان و مۆڵکدارەکان، پیاوە ئایینییە گەورەکان. بەڵام بنکەی قووچەکی کۆمەڵایەتی، کە بەشی هەرە زۆری دانیشتووان بوون، توێژی هەژارو نەدارو ڕەنجکێش بوون. لەنێوان ئەم دوو بەشەشدا، چەند توێژێکی ناوەڕاست دەهات، کە بریتیبوون لە: ئەفسەرە بچووکەکان و وردە بازرگان و پیشەگەرو..هتد[4].

پێویستە بوترێت، دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ڕێگەی خاوەندارێتی زەوییە کشتوکاڵییە بەرفراوانەکان توانیان لە شاری کەرکوکدا چینی ئەریستۆکراتی لە تورکمان و تورکمانبووەکان بهێنێتە کایەوە، ئەو بنەماڵە ئەریستۆکراتانەی خاوەن دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیریی گەورەبوون لە ناوچەکەدا[5].

بە نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی ئەم بنکە کۆمەڵایەتییە لە سەروەختی داگیرکاری و سەردەمەکانی دواتردا گۆڕانی بەسەردا هات. ئەو گۆڕانەش کاریگەری دیاری هەبوو بەسەر پێگەی کۆمەڵایەتی و سەرچاوەی داهاتی بنەماڵە تەقلیدییەکان و سەرۆك خێڵ و خاوەن موڵکە گەورەکان. لە سەرووی هەموو ئەوانەوە پشتگیرییکردنی دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە سەرۆك خێڵەکانی تازە دانیشتووی شارو موڵکدارە گەورەکان بۆ پتەوکردنی شوێن پێی خۆیان لە ناوچەکە دەهات.

بەریتانیا بۆ ئەوەی بنکەیەکی کۆمەڵایەتیی خۆماڵی دروست بکات و پشتگیریی سایەو دەسەڵاتی بکات بەسەر ناوچەکە، توێژێکی حوکمرانی خوڵقاند. بۆ جڵەوکردنی ئەو توێژەش دەستگای حوکمرانی و موڵکایەتی زەوییە کشتوکاڵییەکان و بازرگانیی دەرەکی کردە ئامانج، بە هۆیەوە توێژو چینە دەسترۆیشتووەکانی کۆمەڵگە (بنەماڵە ئەریستۆکراتەکان و بازرگانان) بۆ خۆی کێش بکات[6]. دواتر بۆ تێکهەڵکێشکردن و لێکتر گرێدانی بەرژەوەندییەکانی نێوان پیاوانی حوکمران و زەنگینەکانی شار، هانی ئەمانەی دواییدا بۆ ئەوەی ببنە خاوەنی زەوییە کشتوکاڵییەکان و ماتۆری کشتوکاڵی بەکار بخەن[7].

بەدەر لەوانەی سەرەوە باسکران، ئەو قانوون و ڕێسایانەی دەسەڵاتدارانی ئینتیدابی بەریتانی و دواتریش حکومەتەکانی عێراقی دەریانکرد، بە ئاشکرا ڕۆڵیان هەبوو لە بەهێزکردنی پێگەی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەستە و تاقمێکی کەمی دانیشتووان، کە بریتیبوون لە چینی زەنگینەکان، بە تایبەت لە پاڵپشتیکردنی گەورە موڵکدارەکانی زەوی لە ڕێگەی دەرکردنی قانوونی بەلاداخستنی مافەکانی زەوییەکان (تسوية حقوق الاراضي)[8] ژمارە (٥٠)ی ساڵی (١٩٣٢)و ژمارە (٢٩)ی ساڵی (١٩٣٨).قانوونی ژمارە (٥٠)، ساڵی (١٩٣٣) کەوتە بواری جێبەجێکردنەوەو لەو پێناوەدا چەندان لێژنەی بەلاداخستن لە لیواکان پێکهێنران. کارەکانی ئەم لێژنانە، تا کۆتاییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتی درێژەیان هەبوو[9].

ئەوەی جێی باسە، ئەم قانوونە بە هۆی باری سیاسی و کۆمەڵایەتیی عێراق، لە بنەڕەتدا، لە بەرژەوەندی چینە باڵا دەستەکانی کۆمەڵگە (سەرۆك خێڵ و شێخ و موڵکدارەکان)و دژی چینی جووتیارو خەڵکە کەمدەرامەتەکە بەکارهێنرا[10]. ئەوەش وایکرد بەشێکی گەورەی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە خانەی دەسەڵاتی ئەو سەرۆك خێڵ و شێخ و موڵکدارانەدا کۆبێتەوەو پاوان بکرێت[11].

بە گوێرەی کۆمەڵە ئاماری گشتیی ساڵانە بۆ ساڵی (١٩٥٤)، ژمارەی موڵکە کشتوکاڵییەکانی لیوای کەرکوك بریتیبووە لە (٧٤٠٩) موڵك، کە تێکرای ڕووپێوی هەر موڵکێکیان، لە (١١٦) هیکتار[12] پێکهاتووە[13]. ئەمەش یەك مانا دەداتە دەست ئەویش باڵادەستیی زێتری ئەو چینە باڵادەستەیە لە بەرانبەر چینەکانی دیکەی کۆمەڵگە.

پتەوکردنی دەسەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتیی سەرۆك خێڵ و شێخ و موڵکدارەکان هەر بە تەنها بە هۆی قانوونی

بەلاداخستنی مافەکانی زەوییەکان نەهاتە گۆڕێ، بەڵکو دەسەڵاتدارانی سیاسیی عیراق، ئینگلیزو عیراقییەکان، لە ڕێگەی چەند سیستەمو قانوونێکی دیکەوە دەسەڵاتی رەهایان پێبەخشین. وەك: سیستەمی دەعوای عەشائیریی مەدەنیی و سزاییەکانی (نظام دعاوي العشائر المدنية والجزائية) ساڵی (١٩١٨)و قانوونی مافەکانو ئەرکەکانی جووتیاران (حقوق وواجبات الزراع) ژمارە (٢٨) بۆ ساڵی (١٩٣٣)[١٤]. بە تایبەت قانوونی مافەکانو ئەرکەکانی جووتیاران جەختی لەسەر جیاکاری چینایەتی لەنێوان موڵکدارەکانی زەویو جووتیاران دەکردەوە، جووتیاری کردبووە کۆیلەی زەویو بەبێ ڕەزامەندی موڵکدارەکە نەیدەتوانی زەوییەکە جێ بهێڵێت[١٥]. بەو ئاکامەش بنکە سەرەکییەکانی گەشەی ئابووریی موڵکدارەکان بە هۆی بەخشینو بەکرێدان، تەنانەت بەناوکردنی زەویی بەرفراوانی کشتوکاڵی لە ڕێگەی دەست بەسەر داگرتنو بەرتیلەوە، تووندوتۆڵ کرد. هەر زەوییەك لەو زەوییانە لە باریاندا هەبوو بژێوی چەند هۆزێك فەراهەم بکات، کە ژمارەیەك (٥-٥٠) گوندی لەخۆ دەگرت.

مایەی سەرنجدانە، فاکتەرەکانی بەشبەشبوونی کۆمەڵایەتی لە شاری کەرکوكو تەواوی عیراقیشدا، تا کۆتایهاتنی سەردەمی پاشایەتیش هەمەجۆر بوون، لەوانە گەورەترینیان ئەمانە بوون: (ئایین) لەنێوان موسڵمانەکانو گرووپە ئایینییەکانی مەسیحیو جوولەکە.

(زمان)، بە تایبەت لەنێوان کوردو تورکمانو عەرەب، کە ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر لێکتر دوورکەوتنەوەی دابو نەریتە مێژوویی و ڕۆشنبیرییەکانی شارەکە.

وەزیفەی ئابووریو عورفی کۆمەڵایەتیو فێرکردن. هەموو ئەمانە ئەگەرچی لە هەندێك باردا تێکهەڵکێش بوون، بەڵام زۆرجاریش دەبووە مایەی پێکهێنانی کۆمەڵی بچووك بچووك[١٦]. هەر ئەم فاکتەرەشە وایکردووە کۆمەڵگەی کەرکوکی گیانی وابەستەبوونیان لە نێودا کزو لاواز بێت.

ئەگەر لە سەردەمی حوکمرانیی دەوڵەتی عوسمانییدا، ئایین- تایفەو پەیوەستەگی خوێن، دوو هۆیە سەرەکییەکانی هەمەئاهەنگی کۆمەڵایەتی بوو بێتن، ئەوا لە سەردەمی پاشایەتی گۆڕانی بەسەردا هات. لەم سەردەمەدا بەرژەوەندییە ئابووریو کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان شوێنیان بەو هۆیانەی سەرەوە لەق کرد. وەك نموونەیەك بۆ ئەم باسە دەکارێ پەیوەندییەکانی نێوان بەرزنجەییەکانو تاڵەبانییەکان لە شاری کەرکوك بکرێتە بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ئەم فاکتەرە. ئەم دوو لایەنە پێشتر پەیوەندییەکی گرژو ناحەزانەیان لەنێواندا هەبوو[١٧]، بەڵام بە داهاتنی سەردەمی پاشایەتیو گۆڕانە سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکە، پەیوەندییەکانی ئەمانیش پێی نایە قۆناغێکی جیددیترەوە، (سەیید ئەحمەدی خانەقا)[١٨](١٨٦٨-١٩٥٢)، کە خاوەنی زەوییەکی بەربڵاو بوو لە ناوچەکانی کەرکوكو دەوروبەریو هۆزەکەی لە ململانێی دەسەڵاتو ناوچەی نفووزدا بوو بەرانبەر بە تاڵەبانییەکان، ناوبراو لە سەرەتای ساڵانی دامەزرانی دەوڵەتی عێراق ڕازیبوو چەند گوندێکی ژێر دەستی بە تاڵەبانییەکان، ناحەزەکانی بنەماڵەکەی، بفرۆشێتو مافی ئەوەو قسەی خزمە نزیکەکانیش فەرامۆش بکات[١٩]. لە کاتێکدا ئەمە لە سەردەمی حوکمرانیی عوسمانیدا کارێك بوو لە خانەی مەحاڵدا.

لە لایەکی دیکە، دینامیکی کۆمەڵایەتی (الحراك الاجتماعي) لە چینو توێژێکەوە بۆ یەکێکی دیکەی بەرزتر هەر چەندە لە زۆر شوێندا ئەستەمەو تا ڕادەیەکی زۆر جێگیرە، کەچی لە سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی بۆ هەندێك کەسانی پشت ئەستوور بە دەسەڵاتی ئینتیداب، لە شاری کەرکوك کارێکی سانا بووە. ئەوەش ڕاشکاوانە لە دووتوێی ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی بەریتانییەکان ئاماژەی پێدراوە. بە گوێرەی یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی فرۆکەوانیی بەریتانی بە مێژووی (٢٢ی ئەیلوولی ١٩٢٧)دا هاتووە: (کۆمەڵە کەسێك دوای ئەوەی هەژارو نەدار بوونەو لە ماوەیەکی کەمدا بوونەتە ساماندارێکی گەورەو تەماشاکاران بەرانبەر بە کۆشكو تەلارو باغو باغاتیان ئەبڵەق دەبن). ڕاپۆرتنووسەکە لەم ڕووەوە موتەسەریفی پێشووی کەرکوك (مەجید یاقووبیزادە) (١٨٨٣-١٩٦٢)ی کردووە بە نموونەو دەربارەی شێوازی گۆڕانی باری ئابووریی و پێگەی کۆمەڵایەتی زانیاری تۆمار کردووە[٢٠].

تا سەربەخۆبوونی عێراقو کۆتایهاتنی سەردەمی ئینتیداب (٣ی تەشرینی یەکەمی ١٩٣٢)، گۆڕانێکی زۆر بەسەر کۆمەڵگەی شاریدا نەهاتبوو. لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتی کۆمەڵگەی عێراقی، لە چوارچێوەیەکی گشتییدا، لە ئاکامی گەرانەوەی داهاتی گەورەی پیترۆڵ بۆ دەوڵەتی عێراقی، ڕوو لە گۆڕانو پەرەسەندن بوو. بەڵام ئەو گۆڕانە کەوتە دوای داکەوتنی ڕژێمی کۆماری.

دەتوانرێت لەسەر بنەما کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی پاشایەتی (١٩٢١-١٩٥٨)، دانیشتووانی شاری کەرکوك بۆ سەر چوار چینو کۆمەڵی جیا دابەش بکرێت:

أ- چینی سەروو (زەنگینەکان):

ئەمانە ئەو کەسو بنەماڵانە بوون کە بە گەورە موڵکداری زەویو گەورە بازرگانو گەورە کەسایەتی ئایینیو سەرمایەدار ناسراو بوون، دیوەخانو کۆشكو تەلارو خانەقاو تەکیە گەورەکانیان هەمیشە ئاوەدانو جمەی هاتووە. شوێنی نیشتەجێبوونی بەشێك لەمانە سەرەتا سەر قەڵابووەو دواتریش لە ئاکامی گەشەو گەورەبوونو پێشکەوتنی مەدەنییەتەکان بەرەو بەشی قۆریە گواستویانەتەوە، لە گەرەکەکانی: (ساری کەهیە، بەگلەرو شاترلو) دەستیان بە ژیانی نوێ کردووە، باڵەخانەی گەورە گەورەیان دروستکردووە. وەك زۆربەی شارەکانی دیکەی عێراقیش، زۆرینەی چینی سەرووی کۆمەڵگەی کەرکوکی لەو ڕۆژگارەدا بریتیبوونە لە خاوەن موڵکە گەورەکان، ئەوانەی لە ڕۆژگاری عوسمانی مافی خاوەنداریتی زەوییە بەرفراوانەکانیان چنگ کەوتبوو، لە سەردەمی داگیرکاریو ئینتیدابو سەربەخۆییشدا دەسەڵاتیان لە ڕێگەی قانوونەوە پشت ئەستوور کرابوو[٢١].

دەشێ سەرۆك خێڵەکانو زەنگینەکانی شاری کەرکوك

لە سەردەمی پاشایەتی لە چەند ڕوویەکەوە پۆلێن بکرێن:

لە پایەو پلەی یەکەمدا ئەوانە دەهاتن کە سەرۆکایەتیکردنەکەیان مانایەکی ئایینی- ڕێبازگەریی و تایفەگەرییان هەبوو. ئەمەش تەنها لە نێو پێکهاتە کوردییەکەی شارەکە بەرچاو دەکەوێت. هەر یەکە لە ڕابەرانی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی و کۆمەڵی کاکەیی لە نموونەی ئەم چەشنە بوون. وەك: (شێخەکانی تاڵەبانی و سەیید ئەحمەدی خانەقا و سەیید ڕۆستەم سەیید محەمەدی کاکەیی و سەییدەکانی جەباری)[٢٣]. ئەمانە سەرباری ئەوەی خاوەن نفووزی ئایینی کاریگەرو، گەورە موڵکداری شارەکە بوون، دەسەڵاتێکی بەرچاویشیان بەسەر چەند هۆزێکی دیاریکراوی لیواکەوە هەبوو. هەرچی ئەو سەرۆك خێڵانەی تەنها بە هۆی پایە خێڵەکییەکەیان و موڵکدارێتی زەوییە بەرفراوانە کشتوکاڵییەکان، دەسەڵاتدار بوون و ڕێزی تایبەتییان لێدەگیرا. بریتیبوون لە: (بەگەکانی زەنگەنە و داوودە و جاف).

لە پایەی دووەمدا، سەرۆك خێڵەکانی کەرکوك و موڵکدارەکانی بە پێوەرێکی دیکە پۆلێن دەکرێن، ئەویش بریتییە لە چەشنی خاوەندارێتی زەوییەکان.

پایەی سێیەمیش گوزارشتە لە قەبارەی خاوەندارێتی زەوییە کشتوکاڵییەکان.

بەم پێودانەش گەورەترین موڵکداری شارەکە بریتیبوون لە: ( سەیید ڕۆستەمی کاکەیی و تاڵەبانییەکان و بابانەکان و سەیید ئەحمەدی خانەقا)، بەو چەشنەی لە خشتەی ژمارە (١)دا هاتووە.

موڵکەکانی هەر یەك لەو گەورە موڵکدارانە کەوتبوونە دەرەوەی شارو بەم جۆرە بوو: (سەیید ڕۆستەمی کاکەیی) لە قەزای خورماتوو، تاڵەبانییەکان لە قەزای کفری و شوێنی دیکە، بابانەکان لە قەزای کفری، (سەیید ئەحمەدی خانەقا) لە قەزای ناوەندیی کەرکوك (مەلحە و شوێنی دیکە)[٢٤].

سەرباری ئەو موڵکدارە گەورانەی باسکران، لە شاری کەرکوك موڵکدارو دەوڵەمەندی دیکەش هەبوو، بەڵام لە ڕووی خاوەندارێتی زەوییە کشتوکاڵییەکانەوە نەدەگەیشتنە ئەوانەی لە پێشەوە ئاماژەیان پێدرا، وەك: (حوسێن بەگی ئەوتچی)، (حاجی حوسێنی ئاوچی)، (عەبدولرەحمان ناجی)[٢٥]. هەروەها کەمایەتیە ئایینییەکانیش موڵکداری گەورەیان تێدا هەڵکەوتبوو، کە بەکاری بازرگانیکردنەوە خەریکبوون. لە نێو ئەوانە ناوەکانی: (میناس غەریب)، (قوستەنتین فەتوحی)، (تۆما هیندی)[٢٦]و (نیعمەتوڵڵا هیندی) لەم ڕووەوە شۆرەتیان زۆرە.

دەربارەی ئەم چینە توێژەری گورجیی (ئەلبێرت م. مێنتێشاشڤیلی) نووسیویەتی: "زۆر لە خاوەن موڵکە گەورەکان لە شاردا ئەژیان. سەرچاوەی بنەڕەتیی داهاتیان ئەو دەغڵ و دانە بوو کە لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیشدا گەلێکی پێ دەوڵەمەند بوو... ئەو خاوەن موڵکانەی لە شار ئەژیان حەزیان بە ڕێز لێگرتن ئەکرد و ناوی ئەفەندییان[٢٧] لە خۆیان ئەنا"[٢٨]. چاکترین دەستکەوتی سیاسیی ئەم چینە لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا، هەڵبژاردنی بەردەوامیان بوو وەك ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق. خشتەی ژمارە (٢) لەم ڕووەوە ئەرکی ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی

**خشتەی ژمارە (١)**

**گەورە بنەماڵە موڵکدارەکانی شاری کەرکوك ساڵی (١٩٥٨)(٣٢).**

| بنەماڵە | چین و توێژ، پیشە | خێڵ | پانتایی موڵکەدارێتی زەوییەکان بە دۆنم |
|---|---|---|---|
| سەیید ڕۆستەمی کاکەیی | ساداتی کۆمەڵی ئایینیی کاکەیی | ... | ١٩١٠٣٩ |
| تاڵەبانییەکان | شێخانی تەریقەتی قادری، نوێنەران | تاڵەبانی، نزیکایەتی لەگەڵ زەنگەنە | ١٣٧١٦٣ |
| بابانەکان | نوێنەران | ... | ٨١٣٥٣ |
| سەیید ئەحمەدی خانەقا | شێخی تەریقەتی نەقشبەندی، نوێنەران | بەرزنجە | ٤٢٣٥١ |
| تێکڕای خاوەندارێتی زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بە دۆنم | | | ٤٥١٩٠٦ |

نوێنەرانی کەرکوك لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی گرتووەتەخۆ.

خشتەی ژمارە (٢)
پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی نوێنەرانی کەرکوك
لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی (١٩٢٥-١٩٥٨)[٢٩].

| توێژو چین، پیشە | ژ. نوێنەر | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سەرۆك خێڵ | ١١ | ٪٢٣,٩ |
| مەلاك و بازرگان | ١٠ | ٪٢١,٧ |
| کادری ئیداری | ٧ | ٪١٥,٢ |
| ئەفسەری سوپا | ٤ | ٪٨,٦ |
| پارێزەر | ٤ | ٪٨,٦ |
| زانایانی ئایینی | ٢ | ٪٤,٣ |
| مەسیحی | ٢ | ٪٤,٣ |
| وەزیر | ٢ | ٪٤,٣ |
| مامۆستا | ١ | ٪٢,١ |
| ئەندازیار | ١ | ٪٢,١ |
| پزیشك | ١ | ٪٢,١ |
| فەرمانبەر | ١ | ٪٢,١ |
| تێکرا | ٤٦ | ٪١٠٠ |

هەندێك لە نوێنەرانی کەرکوك مافی ئەندامێتییان بە هۆی پشت ئەستووریيان بە پایەی بنەماڵەیی بەدەستهێناوەو بە درێژایی هەر شانزە خوولەکەی ئەنجوومەنی نوێنەران ئەندام بوونە. وەك ئەندامانی بنەماڵەی نەوتچی و قیردارەکان[٣٠]. لەمەوە روون دەبێتەوە سترۆکتۆری کۆمەڵایەتی رۆڵی کاریگەری بینیووە بۆ بوونە ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق.

**ب- چینی ناوەراست:**

مولکدارە بچووکەکانی زەوی و بازرگانەکانی بازاڕو فەرمانبەرانی میری و ئەفسەرە بچووکەکانی سوپا و پیاوانی ئایینی و ئەوانەی لە بواری (مەعاریف و پەروەردەو فێرکردن) کاریان دەکرد لەگەڵ خاوەن قەڵەمەکان دەکەونە خانەی ئەم چینەوە. ئەم چینە لە رووی پلەی کۆمەڵایەتییەوە، چ بە ژمارە چ بە سامان، بە دووەم بەشی دانیشتووان دەژمێردرێن. سەرەتاکانی دەرکەوتنی دەگەرێتەوە بۆ کۆتاییەکانی رۆژگاری حوکمرانیی عوسمانی، بەڵام تا ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی بە شێوەیەکی تەمومژاوی مایەوە. لە ئاکامی گەشەو نەشونماکردنی ژێرخانی ئابووریی عێراق لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردوو، ئەم چینەش لەو سوورەدا بووژانەوەی بەخۆوە بینی. دیارترین توێژەکانی ئەم چینە بریتی بوون لە: (توێژی ئینتلیگنیسیا) و (توێژی بۆرجوازیی بازرگانی) یان بچووك[٣١].

لە چوارچێوەیەکی گشتییدا، لە ئەنجامی بەرفراوانبوونی چالاکییە پیشەسازی و بازرگانییەکاندا، لە ماوەی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم، هێزی کۆمەڵایەتی نوێ هاتە ئارا. ئەویش بۆرجوازییەتی بازرگانیی نێوخۆیی بوو. ئەمانە بە توندی وابەستەی سەرمایەی بیانی و مولکدارەکانی زەوی بوون[٣٢].

وەك باسکرا شاری کەرکوك مەڵبەندێکی بازرگانی گرنگ بوو، بۆیە بۆرجوازییەکانی شار خاوەن دەسەڵات و نفووزێکی زۆر بوون لەم بوارەدا. نوێنەری ئەم توێژەش، لە بنەرەتدا، بریتیبوون لە کلدان و جووەکانی شار[٣٣]. ئەم توێژە، بەبێ جووەکان، لە پەنجاکاندا رۆڵ و پێگەیان رووتر دەرکەوت و بوونە خاوەن قورساییەکی گونجاو، بۆیە لە هەوڵی ئەوەدا بوون خۆیان لە چوارچێوەی رێکخستنێکی تایبەت رێکبخەن، کە بە هۆیەوە داکۆکی لە مافی ئەندامەکانی بکات. ئەوەبوو لە کۆتاییەکانی رۆژگاری پاشایەتیدا (١٩٥٧) بۆرجوازییەکان توانییان (ژووری بازرگانی) لە شاری کەرکوك دابمەزرێنن[٣٤].

لە لایەکی دیکە لەگەڵ جێگیربوونی دامودەزگاکانی دەوڵەت و بەرەوپێشچوونی باری ئابووریی دانیشتووان، لەنێو کۆمەڵگەی کەرکوکیشدا وردە وردە هەل لەبەردەم تاکەکانی کۆمەڵ فەراهام دەبوو بۆ تەواوکردنی خوێندن، بۆیە توێژی قەڵەم بەدەستیش، چ دەرچووانی قوتابخانەکان چ پێگەیشتووانی مەدرەسە ئایینییەکان، بە تێپەرینی کات لە نشونماکردندا بوو. بەڵگەی ئەمە بە روونی لە داتاو سەرژمێرییە فەرمییەکانی ساڵانی (١٩٤٧) و (١٩٥٧) بە روونی درکی پێدەکرێت.

سەبارەت بە ئاستەکانی گوزەرانی چینی ناوەراستی کۆمەڵگاوە، لە ئاستێکی مامناوەندا بوو تا پەنجاکانی سەدەی بیستەم، بەڵام لەوە بەدوا ئاستی گوزەرانیان بە هۆی ئەو گەشەو گەورەبوونەی داهاتی عێراق لە سەرچاوەی هەناردەکردنی نەوتەوە، بنەماڵە و خێزانەکانیش لە توانیاندا هەبوو ئەو ئاستە نزمە کۆنەی خۆیان ببەزێنن و سەرووتر هەڵکشێن. بۆیە ئەم بارە شایەتحاڵێکی هێناوەتە ئەو باوەری بنووسێت: "ژیانی چینی ناوەراست وەك چینی سەرووی لێهات، دیاردەکە لە کەلوپەلی ناوماڵ.. کاروباری تەندروستی و پۆشاکیان دەرکەوت"[٣٥].

**ج- چینی خواروو (هەژارەکان):**

مەبەست لە (چینی خواروو) لێرە ئەو توێژانەن کە لە خوارەوەی پەیژەی کۆمەڵایەتی و ئابووریین لە کۆمەڵگەدا. واتە ئەم چینە تایبەتە بەو کۆو تاکانەی سەرچاوەی داهاتیان نزمە، وەك دەستگێرەکانی بازاڕو پیشەگەرە بچووکەکان و کرێکارو جووتیارو دوکاندارو ئەوانەی سەرچاوەیەکی

**خشتەی ژمارە (٣)**

**ڕەوتی کۆچ لە لادێوە بۆ شاری کەرکوك بە هەزارە لە ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا[٤٣].**

| سەرژمێریی ١٩٤٧ | | | | سەرژمێریی ١٩٥٧ | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دانیشتووان | لەدایکبووانی | کۆچکردووانی | ڕێژەی کۆچ | دانیشتووان | لەدایکبووانی | کۆچکردووانی - | ڕێژەی کۆچ |
| ٢٨٥ | ٢٦٣ | ٣٣ | ٪٨,١ | ٣٨٩ | ٣٧٧ | ١٣ | ٪٣,٠ |

داهات شك نابەن. ئەم چینە لە زۆربەی شوێن و کاتدا زۆرینەی کۆمەڵگە پێکدەهێنن، بە گوزارشتی دیکە (ڕەشۆکی خەڵك) یان پێدەوترێت. مێژووی ئەم چینە دێرینە. لە ڕۆژگاری حوکمرانیی عوسمانیدا چینی هەژارەکان بەشێکی گەورەی کۆمەڵگەیان پێکدەهێنا. ئەم چینە، بە تایبەت پیشەگەرەکان، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە لەژێر بارێکی قورسادابوون. بەستنەوەی بازارە جیهانییەکان بە بازارە ناوخۆییەکانەوە کاریگەری گەورەی لەسەر باری گوزەرانی ئەم چینە هەبوو. بەوەی کاڵا و شتومەکە بازرگانییەکانی ئەوروپی لە بەرانبەر بەرهەمە ناوخۆییەکان بەردەوام خواستی لە هەڵکشاندا بوو[٣٦]. ئەمەش پالپەستۆی زۆری لەسەر پیشەگەری و کاری دەستیی نێوخۆیی دروست کردبوو[٣٧]. بێ هۆ نەبووە لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەم دیاردەی سواڵکردن و کاری دەستگێری و بۆیەچییەکان و سۆزانییەکان و.. هتد بە شەقامەکاندا بڵاوبوونەتەوە[٣٨].

سەبارەت بە شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا، لە دەستپێکی ئەو سەردەمەدا چینی خوارووی کۆمەڵگەی کەرکوکی، تارادەیەك، توانیبووی هاوسەنگی خۆی بپارێزێت بەرانبەر بە چینەکانی دیکە. بەڵام لە ئاکامی کۆمەڵێك هۆ، لەوانە: بەکارکەوتنی کۆمپانیای نەوت و بەرەوپێشچوون و گەشەکردنی ئابووریی شاری کەرکوك، بە تایبەت لایەنی پیشەسازی، بووە مایەی زۆرتربوونی هەلی کار لەنێو شاردا[٣٩].

لە ئەنجامی هەڵکشانی چەوسانەوەی جووتیاران لەلایەن سەرۆك خێڵ و شێخ و ئاغا و موڵکدارەکانی زەوی لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە وشکەساڵی و کەمبوونەوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، زۆرێك لە دانیشتووانی لادێیەکانی کەرکوك بەرەو نێوشار کۆچیان کرد[٤٠]، بەوەش ڕێژەی چینی خواروو لە شاری کەرکوکدا بەرزبۆوە. بە گوێرەی سەرژمێرییە مەزەندەکارییەکان شاڵاوی کۆچی دانیشتووانی گوند بۆ نێو شاری کەرکوك و شارەکانی دیکەی کوردستانی عێراق جار دوای جار لە بەهێزبووندا بووە[٤١].

تەوژمی کۆچکردن لە لادێوە بۆ نێو شاری کەرکوك، لە چلەکان و پەنجاکاندا تووندتر بوو. بەپێی زانیاری سەرچاوەیەکی تایبەت، (٣٥) هەزار کەس لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧) لە لیوای کەرکوك هاتوونەتە نێو شار[٤٢]. لەو ئاکامەدا ژمارەیەکی گەورەی دەستی کاری کرێگرتە: (حەمباڵ، فرۆشیار، پاسەوان، شوفێر) و..تادوایی، لەنێو شاردا گەشەی کرد. لەم ڕووەوە، سەرژمێرییەکانی ساڵانی (١٩٤٧) و (١٩٥٧) زانیاریی تارادەیەك شیاویان داوەتە دەست.

شیاوی باسە، دەرهاویشتەی بەرزبوونەوەی ڕێژەی چینی خواروو بەرانبەر بە چینەکانی دیکەی کۆمەڵگەی کەرکوکی، بریتیبوو لە بە گوڕتر داکەوتنی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، بە تایبەت لە نێوەندە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەکانی شارەکە، ئەویش ململانێی چینایەتی (الصراع الطبقي) بوو.

لە دوای بەکارکەوتنی کۆمپانیای نەوت، لە سەرەتای سییەکان بەدواوە، چینی کرێکاری بە شێوەیەکی لاواز لەنێو هەناوی کۆمەڵگەی کەرکوك چەکەرەی کرد. هەرچەندە پێشتر ئەم چینە لە شاری کەرکوکدا بوونی هەبوو، بەڵام زۆر کزو بێ دەرەتان بوو. شاری کەرکوك لە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی پیشەسازی لە شێوەی مانیفاکتۆر (ورشة) بەخۆوە گرت، کە لە هەر یەکێك لەوانە (١-٥) کرێکار کاریان تێدا دەکرد[٤٤].

سەرهەڵدانی پیشەسازی نەوت، وەك چۆن لەلایەنی پیشەسازییەوە ڕەخسانی هەلێکی لەبار بوو بۆ پێشخستنی عێراق[٤٥]، بە هەمان ئاست هەلێکی لەبارو زێڕینیش بوو بۆ خستنە سەر پێی کەرکوك لەو لایەنەوە، ئەمەش لە ڕێگەی بەکارهێنانی کارگەرانی ناوچەکە لە بواری پیشەسازی نەوت و مەشق پێکردنیاندا. ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیای نەوت ساڵی (١٩٣٠)، تەنیا (٢٤٠٠) کرێکار بوو[٤٦]، کەچی بە تێپەڕینی ماوەیەکی کورت ژمارەیان هەڵکشانێکی گەورەی بەخۆوە بینی.

بە گوێرەی ڕێبەری فەرمیی عێراق بۆ ساڵی (١٩٣٦)، ژمارەی ئەو کرێکارانەی تەنیا ساڵی (١٩٣٣)، لە چوارچێوەی کۆمپانیای نەوتی عێراق کاریان کردووە، بریتی بووە لە (٦٠٥٩) کرێکار، کە (٥٦٢٢) کرێکاریان هەڵگری ڕەگەزنامەی عێراقی بوونە[٤٧]. ئەوەش وەرچەرخانێکی چۆنایەتی لە مێژووی چینی کرێکاری لە ناوچەکەدا پێکدەهێنێت.

هەرچەندە لەگەڵ دەستپێکردنی ڕەوتی پیشەسازی نوێی نەوت، چینی پرۆلیتاری وردە وردەو ساڵ دوای ساڵ لە گەشەکردن و بەهێزبووندا بوون. کەچی تاوەکو دوای جەنگی دووەمی جیهانی نەیانتوانی دەزگا و ڕێکخستنێکی تایبەتیان هەبێت پارێزگاری لە مافەکانیان بکات. پاش

ڕووداوە خوێناوییەکەی (گاورباغی) (حوزەیران و تەمووزی ١٩٤٦)، توانییان ڕیزەکانیان لە شێوەی ڕێکخستنی سەندیکایی ڕێکبخەن[٤٨].

*** بنەماڵە ناودارەکان:**

لە زۆربەی شارەکانی کوردستان و عێراقدا کۆمەڵێك بنەماڵە و خێزانی دیار هەبوون، کە پێگەی کۆمەڵایەتییان لە ناوبانگی بنەماڵە و کەسایەتییە ئاینی و مێژووییەکان بەدەستهێنابوو، یان بەهۆی گەورە موڵکەکانی زەوی و سامانەکانیان، یان لە ڕێگەی بازرگانییەوە توانیبوویان پێگەی کۆمەڵایەتی بۆخۆیان مسۆگەر بکەن[٤٩]. لەم بوارەدا و لەنێو کۆمەڵگەی کەرکوکی و لە سەردەمی پاشایەتیدا، کۆمەڵێك بنەماڵەی ئەریستۆکراتی ناودار هەبوون، کە تاوەکو ئێستاش زۆریان بە ناو هەر ماون.

لە وردبوونەوەی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کەرکوك ئەم بنەماڵە ناودارانە وەك کۆڵەگەی شار و نوێنەری سەرەکی دانیشتووان خۆیان دەناسێنن. لە دیارترینیان، بنەماڵە ئەریستۆکرات و بازرگانەکانی کەرکوك: (نەوتچی، قیردار، ئاوچی، یاقووبی) و لە بنەماڵە ئایینییەکانیش: (تاڵەبانی، خانەقا، خادم سوججادە) بوون. سەرباری ئەم بنەماڵانە، بنەماڵەی دیکەش هەبوون، بەڵام لە پلەیەکی نزمتردا، وەك: (ساری کەهیە، جەباری، بەرزنجی، ئەرسەلان، گدگ، شوانی، کەمالی، سیلاو، قازی، موفتی، ساڵەیی، نعێمی) و... زۆری دیکە.

**١- نەوتچی:**

بنەچەی بنەماڵەی نەوتچییەکان لەنێو مێژوونووس و توێژەران جێی بگرە و بەردەیەکی زۆرە، مێژوونووس و نووسەرە کوردەکان پێداگیری دەکەن لەسەر کوردبوونی ڕەچەڵەکی نەوتچییەکان، گوایە ئەوان سەر بە هۆزی زەنگەنەن و لەبەر بەرژەوەندیی ئابووری، (جیاووکی دەرهێنانی نەوت لە چاڵە نەوتییەکانی بابەگوڕگوڕ)، لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانی خۆیانکردووە بە تورکمان[٥٠]. هەشە پێی وایە سەر بە هۆزی گەورەی جافن[٥١]. بەڵام نەوتچییەکان خۆیان نکوڵی لەو مێژووە دەکەن و بەرپەرچی دەدەنەوە بە بنەچەی ڕەسەنی تورکمانبوونیان. هەرچۆنێك بێت، بنەماڵەی نەوتچی بنەماڵەیەکی گەورە و بەناوبانگی شاری کەرکوکن و دەسەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی زۆریان لە شارەکەدا هەبووە. بنەڕەتی ناوی بنەماڵەکەیان بۆ پیشە کۆنەکەیان دەگەڕێتەوە، کە کاری دەرهێنانی نەوت و فرۆشتنیان کردووە و ئەو جیاووکەیان بەپێی فەرمانێکی عوسمانی لە ساڵی (١٨٨٩)دا وەرگرتووە[٥٢].

لە نێو بنەماڵەکە گەلێك کەسایەتی گەورە هەڵکەوتووە: (سالح بەگی نەوتچی، نازم بەگی نەوتچی، حوسێن بەگی نەوتچی، پارێزەر ئیبراهیم حوسێن بەگی نەوتچی)[٥٣]. بەڵگەنامە بەریتانییەکان لە ساڵانی ئینتیداب بەردەوام زانیاری دەربارەیان تۆمارکردووە[٥٤]. لە ئاکامی لێسەندنەوەی مافی دەرهێنانی نەوت و هۆی دیکەی سیاسی، ئەم بنەماڵەیە پێگەیان لە کەرکوك بەرە بچووکبوونەوە هەنگاوی هەڵنا.

**٢- قیردار:**

لە بنەماڵە کۆن و ناسراوەکانی شاری کەرکوکن. بنەچەیان ناڕوونە، لە شێوەی بنەماڵەی نەوتچین، هەندێك داکۆکی لەسەر کوردبوونیان دەکەن[٥٥]، بەڵام خۆیان ئەمە ڕەت دەکەنەوە. بە کاری بازرگانی و موڵکدارییەوە خەریك بوون. پێگەیەکی شیاوی کۆمەڵایەتیان لەنێو شاری کەرکوکدا هەبوو، لەو ئاکامەش چەندین جار ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقیان لێ هەڵبژێردرا.

لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانیان: (حاجی جەمیل ئەفەندیی قیردار، پارێزەر ئەمین جەمیل قیردار، محەمەد عەلیی قیردار) بوون[٥٦].

**٣- ئاوچی:**

ئەم بنەماڵەیە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی لەبەر کەمی ئاوی خواردنەوە لە نێو شار و سەرقەڵا، ئاویان لە تەپەی مەلا عەبدوڵڵاوە بۆ نێو شار دەگواستەوە، بۆیە ئەو ناویان بەسەردا برا[٥٧]. سەبارەت بە بنەچەیان وەك زۆربەی بنەماڵە ئەریستۆکراتەکانی کەرکوك خودان مێژوویەکی ناڕوونە، بۆیە بیروبۆچوونی جیاواز دەربارەیان پەیدا بووە[٥٨]. ئەم بنەماڵەیە پێگەی کۆمەڵایەتی بەهێزیان لە شاردا هەبوو، هەروەها گەڕەکێکیش بە ناوی بنەماڵەکەیانەوە لە شاری کەرکوکدا هەبوو. کەسایەتی سیاسی و بازرگانی چاکیان لێهەڵکەوت، لەوانە: (حاجی حەسەن ئەفەندیی ئاوچی، عەبدوڵڵا حەسەن ئاوچی)[٥٩].

**٤- یاقووبی-یەعقوبی:**

بنەماڵەیەکی دیاری شاری کەرکوکن، پێگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵی سیاسییان لە سەدەی بیستەم دەرکەوت، بە تایبەت دوای جەنگی یەکەمی جیهانی. سەبارەت بە ڕەچەڵەکیان ڕاپۆرتە بەریتانییەکان جەخت لەسەر کوردبوونیان دەکەنەوە[٦٠]، بەڵام بنەماڵەکە ئەمە ڕەت دەکەنەوە.

بنەماڵەی یاقووبی زێتر بەکاری بازرگانی و موڵکدارییەوە خەریك بوون. خاوەنی سامانێکی بەرچاو بوون، خۆشیان کەسایەتی سیاسییان هەبوو، بۆیە لە سەردەمی پاشایەتیدا، بە بەراورد بە پێگەی کۆمەڵایەتییان، پۆستی گرنگیان پێدرا. لە کەسایەتییە دیارەکانی بنەماڵەکە: (عەبدوڵڵا سافی بەگ، مەجید یاقووبی، جەماڵ یاقووبی، ئەحمەد مەجید یاقووبی، کامل مستەفا یاقووبی، نەجیب مەجید یاقووبی) بوون[٦١].

**٥- تاڵەبانی:**

مێژووی تاڵەبانییەکان لە شاری کەرکوك، وەك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە زۆر کۆن نییە، بەڵام لە ئاکامی ئەو ڕۆڵە کاریگەر و پێگە گرنگە کۆمەڵایەتییەی لە شاردا هەیانبوو بە یەکێك لە گەورە بنەماڵەکانی شار هەژمار دەکران. بەپێی سەرچاوەیەك، تاڵەبانییەکان پێش زیاتر

لە سێ سەدو پەنجا ساڵ سەرۆکی گەورەیان (یووسف) لە ئێرانەوە هاتووەتە ناوچەی (قەرەداغ). دواتر نەوەکانی گواستوویانەتەوە ناوچەی (چەمچەماڵ)و گوندی (تاڵەبان) یان کردە مەڵبەندی نیشتەجێبوونیان، کە ناوەکەشیان هەر لە ناوی ئەم گوندەوە هاتووە. دواتر بە ناوچەی دیکەی لیواکەدا بڵاوبوونەتەوە[٦٢].

بنەماڵەی تاڵەبانی گەلێك زانای ئایینیو شێخیان تێدا هەڵکەوتووەو ئیرشادی تەریقەتی قادریان گرتووەتە ئەستۆ، سەرباری ئەوانەش شاعیری مەزنیان لێ پەیدابووە، ناودێرترینیان (شێخ رەزای تاڵەبانی)یە. تاڵەبانییەکان لەگەڵ هۆزی زەنگەنە نزیکایەتیو خزمایەتیان لەنێواندا هەیە[٦٣]. بەو بەڵگەیەی هەموو تاڵەبانییەکان نەوەی (شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی کوڕی مەلا مەحموودی زەنگەنە)ن[٦٤].

بنەماڵەی تاڵەبانی لە نێو شاری کەرکوکدا خاوەنی تەکیەیەکی بەناوبانگی مێژوویین لە پەرگەی شارو لە گەڕەکی (بولاق-بەرتەکیە) بەناوی تەکیەی گەورە یا (تەکیەی شێخ جەمیل) ناوی دەرکردووە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هاتنی بنەماڵەکە بۆ نێو شار[٦٥]. ئەو شوێنەی تەکیەکەی تێدا دامەزراوە بە (بەرتەکیە) ناوی دەرکردووە. تەکیەی تاڵەبانی لە ئەنجامی گەلێك هۆی سیاسیو کۆمەڵایەتیو زانستی پێگەی تاڵەبانییەکانی لەنێو شاری کەرکوكو دەوروبەریدا بەهێز کردووە. چونکە تەکیەی تاڵەبانی سەرەرای ئەوەی مەڵبەندێکی گرنگی پەخشی زانستو زانیاریو پێگەیاندنی زانایانی ئایینی بووە، شوێنێکی گەورەی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانیش بووە[٦٦].

بنەماڵەکە رۆڵێکی سەرەکییان لە پۆستە باڵاکانی حکومەتدا بینیوە، بۆیە کەسایەتی سیاسیو کارگێڕییان تێدا هەڵکەوتووە. دیارترین کەسایەتییەکانی نێو بنەماڵەکە: (شێخ حەبیب تاڵەبانی، شێخ حەسیب تاڵەبانی، شێخ جەمیل تاڵەبانی، حەسەن تاڵەبانی، شێخ وەهاب تاڵەبانی) بوون[٦٧].

**٦- خانەقا:**

بنەماڵەیەکی ئایینیو موڵکدارێکی گەورەی زەوی بوون لە ناوچەی کەرکوکدا. بە بنەچە ساداتی بەرزنجەنو مێژووی نیشتەجێبوونیان لەنێو شاری کەرکوکدا دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم. ساڵی (١٨٦٠) خانەقای بەناوبانگ بە فەرمانی سوڵتان عەبدولمەجیدییەکەم (١٨٣٩-١٨٦١) بۆ (شێخ قادر نەوەی سەیید ئەحمەدی سەردار) لە گەڕەکی شاترلو بنیاتنراوە[٦٨]. بەو هۆیە نازناوی (خانەقا) بەسەر بنەماڵەکە دا برا.

رابەرو مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندین لە شاری کەرکوك، لەبەر ئەم هۆیەش دەسەڵاتێکی رۆحیو رێزێکی زۆرو پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێزیان هەبوو لەنێو دانیشتووانی کەرکوكو سلێمانیدا[٦٩]. خاوەنی (٢٥) گوند بوونە لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك[٧٠].

لە پاڵ خانەقادا مزگەوتو خانوو بۆ خزمانو میوانان هەبوو، خانەقا شوێنێکی گرنگی کۆمەڵایەتی بوو لەنێو شاردا. دەسەڵاتدارانی عوسمانی کاتی خۆی ئەو خانەقاو خانوویان بۆ (شێخ قادر) لەگەڵ چەند موڵکێکی دیکە، کردووەتە وەقف[٧١].

بە هۆی پێگەی کاریگەری کۆمەڵایەتیو سیاسییان چەند جارێك ئەندامانی بنەماڵەکە بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران هەڵبژێردراون. کەسایەتی هەرە دیاری ئەم بنەماڵەیە (سەیید ئەحمەدی خانەقا) بوو[٧٢]. لە کەسایەتییە بەرچاوەکانی دیکەی بنەماڵەکە: (کاکە حەمەی خانەقا، حوسێن خانەقا، عەبدولعەزیز خانەقا، سەمەد خانەقا) بوون[٧٣].

**٧- خادم سوجادە:**

بنەماڵەیەکی نێوداری کەرکوکن، ناویان لە خاوەندارێتیو خزمەتکاریی بەرماڵی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ)، هاتووە[٧٤]. ئەو بەرماڵە لەلایەن بنەماڵەکەوە وەقف کرا بوو[٧٥]، خەڵکێکی زۆر دەچوون بۆ تەماشاکردنی.

بنەچەی بنەماڵەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی کۆیەو دەوروبەری. لە شاری کەرکوكو لە گەڕەکی بولاق مزگەوتو مەقامێکی (تەکیە) بەناوبانگیان هەبوو[٧٦]. بنەماڵەکە خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتیو ئایینیو سیاسی بوون، کەسایەتی دیاریان تێدا هەڵکەوت، لەوانە: (رەفیق ئەمین خادم سوجادە، عەلی رەفیق خادم سوجادە)[٧٧].

*** تەوەری دووەم:**

**پیشەو پیشەکاران:**

پیشەگەری[٧٨] بە تایبەت لایەنێکی دیاری ژیانی کۆمەڵایەتی شارە، بۆیە شاری کەرکوکیش لەم رووەوە پشکێکی چاکی بەرکەوتووەو هەر لە کۆنەوە مەڵبەندێکی گرنگی کاری دەستیو پیشەگەری بووە لە ناوچەکەدا. وەك چۆنیش پیشەوەرەکان توێژێکی کۆمەڵایەتیی دیاریان لە کۆمەڵگەی کەرکوکی پێکهێناوە، بە هەمان ئاست بەرهەمە پیشەوەرییەکانیشیان جێی خواستی زۆری خەڵکی شارو دەوروبەری بووە.

جێی سەرنجە ئەم بارە بە یەك ئاستو تاسەر لە گەشانەوەی بەردەوامدا نەبووە، بەڵکو ژیانی پیشەوەری گۆڕانو پەرەسەندنی زۆری، بە هۆی جیاجیاوە، تێدا هاتووەتە ئارا. لە خوارەوەدا هەوڵدەدەین لایەنەکانی ژیانی پیشەوەریو پیشەیی شاری کەرکوك بابەتیانە بخەینە بەر باس:

**أ. پیشەکانو دابەشبوونی پیشەیی دانیشتووان:**

لە راستییدا ئەو پیشەگەرییانەی لە شاری کەرکوکدا بوونیان هەبووە، مێژوویەکی کۆنیان هەبووە. زۆربەی زۆری چەشنەکانی ئەو پیشەگەرییە مێژوویان بۆ سەردەمی عوسمانییەکان دەگەڕایەوە، وەك پیشەگەرییەکانی: (رستنو چنین، خومچی (بۆیەسازی)، دەبباغی (پیشەگەریی کەوڵ)، دارتاشی، ئاسنگەری، رەژووچی، قەیومچی (زیوگەری)، یەمەنچی (پیشەگەریی دروستکردنی کەوش)).

وەك دابێکیش لەو رۆژگارەدا، هەر شارێك گرنگیو

بایەخی تایبەتی داوە بە چەند جۆرە پیشەوەرییەكو ناوی پێی دەرکردووە، بۆیە ژیانی پیشەگەریی کەرکوك بە چەند جۆرە پیشەگەرییەك دەناسرێتەوەو پێی نێودێر بوون، لەوانە: (کاری دەبباغی و چەقماقچی و قەیومچی و سەعاتچی و دارتاشیی و ئاسنگەریی و هەللاجی)[79]. بە تایبەت کاری ڕستن و چنین و دروستکردنی قوماش و بازرگانی ئاوریشمیان دەنگۆی مەزنی هەبووە.

(ئیلی بانستەر سۆن) (١٨٨١-١٩٢٣)، کە لە کۆتای دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا سەردانی کەرکوکی کردووەو تیایدا ماوەتەوە، لەم بارەوە نووسیویەتی: "لە کەرکوکدا، وەك لە هەموو کوردستاندا، پیشەوەریی سەرەکی دانیشتووان بریتییە لە پیشەسازی چنین و بازرگانی ئاوریشم. بازرگانی کوتاڵە پەموورییەکان و لە چاپدانیشی تەنیا لە دەستی ئەواندایە.."[80].

ئەم پیشەوەرییانە لە سەردەمەکانی دواتریشدا، داگیرکاری (١٩١٨-١٩٢٠) و ئینتیداب (١٩٢٠-١٩٣٢) و سەربەخۆیی (١٩٣٢-١٩٥٨) زۆریان هەر مابوون. لەو ڕۆژگارانەدا ئەم پیشەگەرییانە زۆریان بازاری تایبەتیان هەبوو پێی دەناسرانەوە، وەك بازارەکانی: (قزانچیلەر (سوق الصفارین)، خەنچەرچیلەر، دامرچلەر (ئاسنگەری)، اسکی ئالتونچلەر (بازاری کۆنی ئالتون)، بالغچلەر (بازاری ماسی)، پالانچیلەر (بازاری کورتان)، دنگچیلەر، زورناچیلەر، عربانچیلەر، بامبوغچیلەر (بازاری پەمووچییەکان)).

سەرەرای بوونی ئەو بازارە تایبەتانەی کە بە فرۆشتنی کالاو کەلوپەلێکی تایبەتەوە ناویان دەرکردبوو، لەنێو گەرەکەکانیشدا دوکان و موخازەی تایبەتی هەبوون بۆ فرۆشتنی کالای بازرگانی و وردەواڵە پێویستییەکانی ژیانی دانیشتووان. بە تایبەت ئەو دوکان و شوێنانەی لەم بابەت بوون لەنێو خودی ماڵاکاندا بوونیان هەبووە[80]. زۆرێکیش لەو پیشەگەرانەی ماوەیەکی زۆر لەسەر پیشەگەرییەکی دیاریکراو کاریان دەکرد نازناوی پیشەوەرییەکەیان پێ دەبەخشراو پێی دەناسرانەوە، هەر لەم ڕۆچنەیەشەوە گەلێك نازناوی پیشەگەری بەسەر تاك و خێزان و بنەماڵەکاندا برانەوەو بووە شۆرەتیان، وەك: دەبباغ، قەساب، نەجار، عەتتار، خەییات، بەزاز، گۆزەچی، کورەچی، دامیرچی، ئالتونچی و زۆری دیکە[82].

کارە گرنگ و دیارەکانی پیشەورەیی کەرکوکییەکان لە ماوەی لێکۆڵینەوەدا، بریتیبوونە لەمانە: (ئاسنگەری، دارتاشی، بەرگدرووی، پێڵاوسازی، پینەدۆزی، مسگەری، قازانچی، سبیلچی، سابونچی، بەننایی[83]، نەقاشی، قایەچی، سەراجی، ناڵبەندی، گۆزەچی، خومچی، سەعاتچی، بۆیاغچی، سەرتاشی (بەربەر)، پالانچی (کورتاندرووی))[84] و... زۆری دیکە.

شیاوی باسە، لە زۆربەی ئەو پیشەگەرییانەی ئاماژەیان بۆ کرا، لایەنی تەمەن بەربەست و ڕێگر نەبووە، بۆیە دەبینرێت ڕێژەیەکی بەرچاو لە مندالانی خوار تەمەن دە ساڵی لەو پیشەگەرییانە کاریان کردووە، باوانیان بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا کورەکانیان وەستای کارامەیان لێ دەرچێت، هانیان داون کار بکەن، ئەوەش بووەتە خوویەکی کۆمەڵگەی کەرکوکی. هیچ مایەی سەرسورمان نییە کاتێك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) دا هاتووە، ئەو کەسانەی تەمەنیان لە خوار دە ساڵییەوەیەو خەریکی کاری پیشەوەرین بریتیبووە لە (٩٩٨) کەس، لەو ژمارەیەشدا (٩) کەسیان لە ڕەگەزی مێ بوونە[85].

لەبەر چەند هۆیەکی زاندراو، لە چوارچێوەیەکی گشتیدا بازرگانی و زێرینگەری و دروستکردنی خواردنەوە کحولییەکان و چەند پیشەو پیشەگەرییەکی دیکە، زۆرتر، لە دەستی کەمە ئایینییەکاندا بوو. بۆ نموونە کاری زێرینگەری تایبەت بوو بە جووەکان و بازرگانییش هەر لە دەستی ئەواندا بوو. بازرگانی گەورەو نێوداری جووەکانی شاری کەرکوك بریتیبوون لە: (رابی) و (ئیسحاق ئەفرایم). (عەزیز ئەفەندی) یش هەرە دەسترەنگینی جوو بووە[86].

هەرچی کلدانییەکانی شار بوو، هاوشانی موسڵمانان هەموو کارێکیان دەکرد، بەڵام لە بازرگانیدا ناسراوتر بوون. ئەرمەنەکان زۆرتر بەکاری وردو هونەرییەوە خەریکبوون، لەوانە پیشەی فۆتۆگرافی. هەروەها کاری ساغکردنەوەی زیو (زیوگەری) تایبەت بووە بە (سابیئە)کانی شار. لە پاڵ ئەوانیشدا خەڵکی دیکەی مەسیحی و موسلمان خەریکی کاری بازرگانیی نێوخۆیی بوون. ئەم چەشنە دابەشبوونەی پیشەیی دانیشتووان، لە زۆربەی شارەکانی عێراق لەم شێوەیە نزیکبووە[87]. بۆیە دوای ئەوەی جووەکان کۆچیان کرد بۆ ئیسرائیل کاری بازرگانی و زێرینگەری لە شاری کەرکوك و شارانی دیکە دووچاری ئاست نزمی هات. لەبەر پێویستی و خواستی زۆر بەو پیشەگەرییە، دوو خێزانی (سابیئە) کاری زێرینگەری و ساغکردنەوەیان (الصیاغة) لە شاری کەرکوك گرتە ئەستۆ[88].

بەپێی سەرژمێریی فەرمیی (١٩٤٧)، بەر لە کۆچی جووەکان ئەوانەی لە شاری کەرکوك کاری پیشەسازیی کانزا گرانبەهاکان و زێرینگەری و سەعاتچێتییان کردووە بریتیبوونە لە (٧٢) کەس، کەچی لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) دا لە ئەنجامی کۆچی جووەکان و کزبوونی پیشەگەرییەکە، ئەو کارە لە خانەی تایبەتدا دانەنراوەو لە خانەی پیشەسازی دیکە جێ کراوەتەوە[89]. هەرچی عەرەبەکانی دانیشتووی نێو شاری کەرکوك بوون، بە کاری قەسابی و جامبازییەوە خەریك بوون، واتە کڕین و فرۆشتنی مەڕوماڵات (جەڵەب)، کە ژمارەیان نزیکەی (٣٠) خێزانێك دەبوو[90].

جێی ئاماژە پێدانە، یەکلابوونەوەی پیشەگەرییەکی تایبەت بە نەتەوەیەك هۆیەکی یارمەتیدەری گەورەی یەکپارچەنەبوونی شارو پەیدابوونی گەرەکی لێکجیاو دابراوی کۆمەڵایەتییە. لە شاری کەرکوکدا ئەم مەسەلەیە بە ڕوونی بەرچاو دەکەوێت، کاتێك دەبینی جووەکان لە گەرەکێکی تایبەت و کلدان و ئەرمەنەکان لە گەرەکێکی تایبەت و تورکمانەکان بە زۆری لە سەرقەڵاو بەشی قۆریەو کوردەکانیش بە چڕی لە بەشی بەرقەڵادا نیشتەجێبوونە. ئەم بارە کۆمەڵایەتییە شارەکانی دیکەی عێراق، بە تایبەت شارە کوردییەکان، لێی بەدەر نەبوونە[91].

هەرچی سەبارەت بە واقیعی دابەشبوونی پیشەیی

**خشتەی ژمارە (٤)**
**دابەشبوونی پیشەیی دانیشتووانی شاری کەرکوك**
**بەپێی کەرتە ئابوورییەکان لە ساڵی (١٩٤٧)دا[٩٢].**

| رەگەز | کەرتەکان | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کشتوکاڵ و بەرهەمی ئاژەڵی | | پیشەسازی | | بازرگانی و خزمەتگوزاری | | تێکڕا | |
| نێر | ٨٩٠ | ٩٨,٢ ٪ | ٢١٣٤ | ٩٦,٥ ٪ | ٩٠٤٠ | ٩٤,٨ ٪ | ١٢٠٦٤ | ٩٥,٣ ٪ |
| مێ | ١٦ | ١,٨ ٪ | ٧٧ | ٣,٥ ٪ | ٥٠٢ | ٥,٢ ٪ | ٥٩٥ | ٤,٧ ٪ |
| کۆی گشتی | ٩٠٦ | ١٠٠ ٪ | ٢٢١١ | ١٠٠ ٪ | ٩٥٤٢ | ١٠٠ ٪ | ١٢٦٥٩ | ١٠٠ ٪ |

دانیشتووانی نێوشاری کەرکوك بێت بەپێی کەرتە ئابوورییەکان، ئەوا بە گوێرەی سەرژمێریی فەرمیی ساڵی (١٩٤٧) ڕوون دەبێتەوە کە کەرتی کشتوکاڵ دوای تێپەڕینی ماوەیەکی کەم بەسەر گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی پیشەسازییە نوێیەکان لە پلەی یەکەمدا نەماوەو لە ڕیزبەندیی ژمارەی ئەو کارگەرانەی تیایدا کاردەکەن کەوتووەتە دوا کەرت. کەچی لە بەرانبەردا کەرتی بازرگانی و خزمەتگوزارییەکان بە جیاوازییەکی گەورە پێش کەرتەکانی دیکە کەوتووە. نزیکەی سێ یەکی پیشەگەرانی ئەم کەرتە بریتین لە بازرگانەکان. لە پلەی دووەمدا کەرتی پیشەسازی دێت، بڕوانە خشتەی ژمارە (٤) دابەشبوونی پیشەیی دانیشتووانی قەزای ناوەندیی کەرکوك بەپێی کەرتە ئابوورییەکان لە ساڵی (١٩٤٧)دا دەخاتەڕوو.

لە خشتەی ژمارە (٤)دا ڕاشکاوانە ڕوون دەبێتەوە ژمارەیەکی بەرچاوی کارگەرانی شاری کەرکوك (٩٥٤٢) کەس، لە کەرتی بازرگانی و خزمەتگوزارییەکاندا کار دەکەن. بە گوزارشتێکی وردتر ڕێژەی کارگەرانی بواری بازرگانی و خزمەتگوزارییەکان لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا بریتیبووە لە (٧٥,٣٪) لە تێکڕای کارگەرانی شاری کەرکوك. ئەمەش ڕێژەی هەرە بەرزی کارگەران پێکدەهێنێت. هەر بەپێی سەرژمێریی ناوبراوی سەرەوە بە تەنها ئەو کارگەرانەی لە بواری بازرگانیدا (واتە لە بواری کڕین و فرۆشتن) بە گشتی کار دەکەن بریتیبووە لە (٣٣٣٣) کەس، کە لەنێویاندا (٣٥) کەس لە ڕەگەزی مێ بووە[٩٣].

دیارە بەرزیی ژمارەی کارگەرانی بواری بازرگانی و خزمەتگوزارییەکانی شاری کەرکوك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دامەزراوەکانی حکومەت لە ناوچەکەدا ڕۆڵی پۆزەتیڤانەی بینیوەو شوێنپەنجەی حکومەت لە دابینبوونی سەقامگیری و بڵاوکردنەوەی دامەزراوە خزمەتگوزارییەکان بەرچاوە. لە لایەکی دیکەش، بوونی قازانجی خێراو سەرمایە کاریگەرییان هەبووە لەم ڕووەوە، کە بەشێکی بەرچاوی دانیشتووان لەو سەردەمەدا بە کڕین و فرۆشتنەوە خەریك بوونە.

سەبارەت بە زۆریی کارگەرانی کەرتی پیشەسازیش لەچاو کەرتی کشتوکاڵ، بۆ ئەو قەڵەمبازە دەگەڕێتەوە کە ناوچەکە لە ئاکامی سەرهەڵدانی پیشەسازیی نەوت و ئەو پیشەسازییانەی بە نەوتەوە بەندن لە سییەکانی سەدەی ڕابردوو بەخۆیەوە بینی. ئەم بارە سەبارەت بەناوچەکە جێی هەڵوەستە لەسەرکردنە، چونکە ناوچەی کەرکوك بەوە ناسراوە کە لە ڕووی کشتوکاڵکردنەوە خاوەن زەوی و بەراوێکی دەوڵەمەند و بەربڵاوە (٨٥٦٢) کیلۆمەتری چوارگۆشە، واتە زیاتر لە (٤٢٪)ی لە کۆی گشتیی ڕووپێوی لیوای داگیر کردووە.

بەپێی زانیارییەکانی نێو ئامارە گشتییەکانی فەرمانگەی سەرەکیی سەرژمێرییەکان لە وەزارەتی ئابووریی عێراق ساڵی (١٩٥٤)، ئەو ڕاستییە بەرجەستانە دەردەکەوێت، کە لیوای کەرکوك لە ڕووی بەرفراوانی ڕووپێوی زەوییە کشتوکاڵییەکانییەوە، لەسەر ئاستی چواردە لیواکەی عێراقی ئەو سەردەم[٩٤]، پاش لیوای مووسڵ بە پلەی دووەم دەهات[٩٥].

هەمان ئاماری سەرەوە، ئەوەشمان بۆ دەردەخات کە ڕووپێوی زەوییە کشتوکاڵییەکانی لیوای کەرکوك نزیکەی دوو ئەوەندەی ڕووپێوی زەوییە کشتوکاڵییەکانی لیوای هەولێر بووە[٩٦]، کە لیوای ناوبراو بە دەشتە پان و بەرین و بە پیتەکانی قەراج و کەندێناوەو..تاد بە ناووبانگە[٩٧]. بە هەمان شێوە زەوییە کشتوکاڵییەکانی نێوشارو دەوروبەریشی بەرفراوان و بەپیت و بەرەکەت بووە.

هەرچەندە لێکدانەوە سەبارەت بە دەستنیشانکردنی هۆیەکانی ئەم بابەتە ئەستەمە، بەڵام پێدەچێت ئەم بارودۆخە سەرەتایەکی بەهێزی پەرەگرتنی بواری پیشەسازی بێت لە شارەکەدا. یان بۆ خۆدزینەوەی کەسەکان بگەڕێتەوە لە دەوڵەت، چونکە لە ترسی پەیدابوونی مەترسی لەسەر بەرژەوەندییەکانیان پیشەی ڕاستەقینەی خۆیان ئاشکرا نەکردبێت. بۆیە دەبینین ژمارەکە نزمە.

بە گوێرەی سەرژمێرییەکە ئەو کەسانەی لە نێو شاردا نیشتەجێبوون و بۆ بژێو پەیداکردن بەکاری کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون، ژمارەیان بریتیبووە لە تەنها (٩٠٦) کەس، کە لەوان (٨٩٠)یان لە ڕەگەزی نێرو تەنهاش (١٦) کەس لە ڕەگەزی بەرانبەر بووە[٩٨].

هەر بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، زیاتر لە (٦٦٢١) پیشەگەری بێ ناونیشانی پیشەیی و پیشەگەری هەمەچەشنە بوونیان هەبووە[٩٩].

**خشتەی ژمارە (٥)**
**دابەشبوونی پیشەیی دانیشتووانی شاری کەرکوك**
**بەپێی کەرتە ئابوورییەکان لە ساڵی (١٩٥٧)دا[100].**

| ڕەگەز | کەرتەکان | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کشتوکاڵو بەرهەمی ئاژەڵی | | پیشەسازی | | بازرگانیو خزمەتگوزاری | | تێکڕا | |
| نێر | ٢٤٥٢ | ٪ ٩٦,٤ | ١٥٦٩٢ | ٪ ٩٤,٩ | ٣٦٨٥٧ | ٪ ٩٦,٦ | ٥٥٠٠١ | ٪ ٩٦,١ |
| مێ | ٩٠ | ٪ ٣,٥ | ٨٣٢ | ٪ ٥,٠ | ١٢٧٩ | ٪ ٣,٣ | ٢٢٠١ | ٪ ٣,٨ |
| کۆی گشتی | ٢٥٤٢ | ٪ ١٠٠ | ١٦٥٢٤ | ٪ ١٠٠ | ٣٨١٣٦ | ٪ ١٠٠ | ٥٧٢٠٢[101] | ٪ ١٠٠ |

ئەم واقیعی دابەشبوونەی پیشەیی دانیشتووانی شاری کەرکوک، بە تێپەڕینی (١٠) ساڵ بەسەر ئاکامی سەرژمێریی (١٩٤٧)، گۆڕانو پەرەسەندنێکی ئەوتۆی لە کارگەرانی کەرتی کشتوکاڵیو بەرهەمهێنانی ئاژەڵی لێ نەکەوتووەتەوە.

بەگوێرەی دووەم سەرژمێریی (١٩٥٧)، ئەو کەسانەی لە نێو شاردا بژێویان لەسەر کاری کشتوکاڵیو بەخێوکردنی ئاژەڵو بەرهەمەکانی وەستا بوو، بریتیبووە لە (١٢٨٦) کەس، کە تەنیا (٩٠) کەسیان لە ڕەگەزی مێ بووەو (٢٤٥٢) کەسیش لە ڕەگەزی بەرانبەر بووە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٥)، دابەشبوونی پیشەیی دانیشتووانی قەزای ناوەندیی کەرکوک بەپێی کەرتە ئابوورییەکان لە ساڵی (١٩٥٧)دا.

بچووکترین کەرت بە گوێرەی زانیارییە بەدەست هێنراوەکانی نێو سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، وەك لە خشتەی ژمارە (٥)دا خراوەتڕوو، بریتیبووە لە کەرتی کشتوکاڵو ئاژەڵداری. پشکی کارگەرانی بواری کشتوکاڵیو ئاژەڵداری تەنیا (٢٥٤٢) کەس، (٤,٤٪) لە ڕێژەی تێکڕای کارگەرانی شاری کەرکوك پێکهێناوە.

گەورەترین کەرتیش، وەك لە خشتەکەدا دەردەکەوێت، کەرتی بازرگانیو خزمەتگوزارییەکانە. پشکی کەرتی بازرگانیو خزموتگوزارییەکان لە کارگەرانی شاری کەرکوك بریتیبووە لە (٥٧٢٠٢) کەسو ڕێژەی (٦٦,٦٪) لە تێکڕای کارگەرانی کەرکوکی بۆ خۆی بڕیوە. ئەوەش بەرزترین ئاستە لە واقیعی دابەشبوونی پیشەیی دانیشتووانی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٥٧).

لە سەرنجدانێکی ڕێژەی کارگەرانی کەرتی بازرگانیو خزمەتگوزارییەکان لەنێوان هەردوو سەرژمێرییەکەدا دەبینین ئەم کەرتە لە پاشەکشێدا بەرانبەر بە کەرتی پیشەسازی. چونکە کارگەرانی کەرتی بازرگانیو خزمەتگوزارییەکان لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا بە ڕێژەی (٧٥,٣٪) پشکداری هەبووە. بەپێی سەرژمێریی (١٩٥٧)، بە تەنها ئەو کارگەرانەی لە بواری بازرگانیدا (واتە لە بواری کڕینو فرۆشتن) بە گشتی کار دەکەن بریتیبووە لە (٧٤٩٤) کەس، کە لەنێویاندا (٦٩) کەس لە ڕەگەزی مێ بووە[102].

هەرچی کارگەرانی بواری پیشەسازییە ژمارەیان، بە بەراورد بە دوو کەرتەکەی دیکەی ئابووریی ناوچەکە، بریتییە لە مامناوەندیی ئاست، بە واتایەکی دیکە کارگەرانی کەرتی پیشەسازیی شاری کەرکوك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)دا، گەیشتووەتە (١٦٥٢٤) کەسو بە ڕێژەی (٢٨,٨٪) پشکداری کردووە. لە هەمان کاتدا وەك لە سەرەوەدا ئاماژەی پێدرا ئەم کەرتە چەند هەنگاوێك لە ڕووی ژمارەوە بەرەوپێش چووە. لەم کەرتەدا پیشەگەرانی بواری نەوتو پیشەسازییە پەیوەستەکانی نەوتو پیشەسازییەکانی کەلوپەلی خۆراکیو خواردنەوەکانو تووتنو چنینو کەوڵو دارو پەڕاو سێیەکی لە پیشەگەرانی کەرتی پیشەسازی بەرکەوتووە. پیشەگەرەکانی دیکەش دابەشبوونەتە سەر پیشەسازییەکانی بەرژەوەندییە گشتییەکان (وەك: پرۆژەکانی ئاوو کارەباو.. تا دوایی)و کارگەرانی بیناسازیو کانزاکاری، پێڵاوسازیو پیشەسازییەکانی دیکە.

شیاوی باسە، بە گوێرە زانیارییەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، ژمارەی ئەو پیشەگەرانەی لە هیچ یەکێك لە پیشەگەرییەکان حسێب نەکراون یان نەزانراون بریتیبوونە لە (١٠١٥٥٢) کەس. لەو ژمارەیە (٧٤٤٠٦) کەسیان لە ڕەگەزی مێ بوونە[103].

**ب- پەرەسەندنەکانی بواری پیشەیی:**

پێویستە بوترێت، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، کارە دەستییە نێوخۆییەکان (دەبباغی، ڕستنو چنین، هەللاجی، خومچی، دارتاشی، ئاسنگەری، پێڵاوسازی بە هەموو جۆرەکانییەوە) زۆربەی پێداویستییەکانی بازاڕی کەرکوکی دابینکردبوو[104]. هەرچەندەش هەندێك کاڵای بیانی (ئەورووپاییو هیندی) لە بازاڕەکانی دەرەوەدا هاوردە دەکران، وەك: (شەکر، قاوەو کاڵای دیکە)، بەڵام بەرهەمەکانی ئەمانیش هەناردەی بازاڕەکانی دەورووبەرو ئەورووپا دەکران، وەك: (خاوی ئاوریشم، نیل[105]و کەلوپەلی دیکەی بازرگانی)[106].

لە چوارچێوەیەکی گشتیو لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدە بیستەمدا، لە ئاکامی تێکەڵبوونی بازاڕە ناوخۆییەکان بە بازاڕە جیهانییەکانو کاریگەرییەکانی کردنەوەی کەناڵی سوێس (١٨٦٩)و بە لێشاو هاتنی کاڵاو شتومەکی بازرگانیی بیانی بۆ عێراقو ناوچەکە، هەروەها

کردنەوەی لقی (بانکی ڕۆژهەڵاتیی بەریتانی) لە شاری کەرکوك بەر لە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی[107]، کۆمەڵێك ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە ناوچەکەدا هاتنە ئارا.

بڵاوبوونەوەی بەکارکەوتنی (دراو) وەك بنەرەتێکی مامەڵەو ئاڵوگۆڕکێ و نەمانی شێوازی بەرهەمهێنانی خۆژیاندن و پەیدابوونی بەرهەمی کاڵایی، لە سەردەمێکی دواتردا، پێشکەوتنی ئامرازەکانی گواستنەوە بوونە هۆی بەرفراوانبوونی پانتایی بازاڕە ناوخۆییەکان و جۆربەجۆری پیشەگەرییە خۆماڵییەکان[108]. کەچی لە لایەکی دیکە، سەرهەڵدانی کێبڕکێی کاڵاو شتومەکە بیانییەکان لەگەڵ بەرهەمی پیشەگەرییە خۆماڵییەکان، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوەوە، مایەپووچی دەیان پیشەگەری لەگەڵ خۆیدا هێنا. چونکە پیشەگەرییەکانی ناوخۆ لە توانایاندا نەبوو بەرانبەر بە هەرزانیی نرخ و کوالێتی بەرزو هەمەچەشنیی کاڵا بیانییەکان خۆ ڕابگرن و خواستیان لەسەر بمێنێتەوە، لەبەر ئەوە بە دەیان مانیفاکتۆرو پیشەگەریی خۆماڵی هەرەسیان هێنا[109]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەرکەوتنی کاڵای بیانی کاریگەرییەکی پۆزەتیڤانەی لەسەر کارە دەستی و پیشەگەرییە خۆماڵییە لەناو نەچووەکان هەبوو، بەوەی سوودیان لە شێوازی نوێی بەرهەمهێنان، لە ڕووی ئامرازو پەیوەندییەکانەوە، وەرگرت و بە بەراورد بە سەردەمەکانی ڕابردوو پێیان نایە قۆناغێکی سەرووتر[110].

جێی سەرنجدانە، لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری عوسمانی و سەرەتای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ شاری کەرکوك (١٩١٨)، ناوچەکە بەرەوپیری پیشەسازی چوو. لە چوارچێوەی ئەو هەنگاوانە دەکرێت ئاماژە بە دامەزراندنی قوتابخانەی کارسازی (مدرسە صنائع) لە شاری کەرکوك بدرێت لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا[111]. هەر لەم ڕووەوە لە سەردەمەکانی دواتردا، (قوتابخانەیەکی تەکنیکی) لە ساڵی (١٩٢٠) هاوشێوەی قوتابخانە تەکنیکییەکانی بەغداو بەسرەو مووسڵ لە شاری کەرکوك کرایەوە، هەندێك لە دەرچووانی ئەم قوتابخانەیە بە مووچەیەکی باش لە کۆمپانیای نەوت کەوتنە کار[112].

لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان کۆمەڵێك پیشەگەری و پیشەی نوێ لەنێو شاری کەرکوك پەیدابوون، لەوانە: بۆ یەکەمجار لە شاری کەرکوك کارگەیەکی سەهۆڵ لە (تەمموزی ١٩٢٢) دا بەرهەمی کەوتە بازارەوە[113]، کە لەو ڕووەوە یەکەم شاری کوردیی کوردستانی عێراق بوو کارگەی وای لێ دابمەزرێت. گەیاندنی تەزووی کارەبایش ساڵی (١٩٢٧)[114]، بۆ ماڵ و دوکان و دەزگاکان لایەنێکی دیاری ئەو ڕەوتە نوێگەرییە بوو، کە لە سەرەتادا تەنها ڕووناك کردنەوەی شوێنە گشتییەکانی شاری گرتەوە[115].

بەر لەوەی سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی کۆتایی پێ بێت (١٩٣٢)، حکومەت چەند هەنگاوێکی لە پێناو گەشەپێدانی بواری پیشەسازی هاویشت، بۆ نموونە قانوونی ڕێکخستنی باجە گومرگییەکانی (تعريفة الرسوم الكمركية) ژمارە (٣٠)ی ساڵی (١٩٢٧)، قانوونی هاندانی کارسازییەکانی (تشجيع الصنائع) ساڵی (١٩٢٧)[116]، قانوونی هاندانی کارسازییە نشتمانییەکان (تشجيع الصنائع الوطنية) ژمارە (١٤)ی ساڵی (١٩٢٩)، بەڵام ئاکامێکی گرنگی ئەوتۆیان نەبوو[117]. بۆیە سەرەرای ئەمەش لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك وردە پیشەسازیی نوێ[118]، ئەگەر بچووك و کەم سەرمایەش بوو بن، لە زۆربەی شارەکانی عێراقدا هاتنە دامەزراندن، وەك: کارگەی دروستکردنی سەهۆڵ، ئاوی گازی و پەموو لە چیکەنەدان (حلج)[119].

پیشەسازیی پەموو لە چیکەنەدان هەرچەندە مێژوویەکی دووروودرێژی هەبوو، بەڵام لەم ماوە مێژووییەدا، ڕێگەی نوێی تیایدا بەکارهێنراو یەکەم کارگەیەکی خۆماڵی لەو بابەتەش، ساڵی (١٩٣٠) لە بەغدا دامەزرا، کە بە تێپەڕینی کات ژمارەیان لە هەموو عێراقدا گەیشتە هەشت کارگە، پێنجیان لە لیوای بەغداو دووانیان لە لیوای مووسڵ و دانەیەکیشیان لە شاری کەرکوك بوو[120].

لە سەردەمی سەربەخۆیی عێراقیشدا (١٩٣٢-١٩٥٨)، بە سەدان پیشەو پیشەگەریی دیکە لە شاری کەرکوك دەرکەوتن. بێ سوود نابێت لەم بارەوە چەند ئاماژەیەك تۆمار بکەین. لەنێو ئەو پیشەگەری و پیشەسازییە بەرچاوانەی لە شاری کەرکوکدا هاتنە کایە پیشەسازی نەوت و هەموو ئەو بەرهەمانەی بە نەوتەوە پەیوەست بوون لە سییەکان. ئەو پیشەسازییانەی لە بەرهەمهێناندا پشت بە گازی سروشتی دەبەستن: (کبریت، پەیین، کاربۆنی پاکژ، چیمەنتۆ..هتد) [121]. هەروا بنیاتنانی (کارگەی کاشی ڕەشید) لە پەنجاکاندا چەند نموونەیەکی دیارن[122]. سەرباری ئەوانەش بڕیار بوو کۆمپانیای (شمیت)ی دانیمارکی کارگەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی چیمەنتۆ بە گوژمی بەرهەمهێنانی (٣٥٠) تۆنی لە ڕۆژێکدا لە شاری کەرکوك دروست بکات، بەڵام پاش تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر بەسەریدا، ئەنجوومەنی ئاوەدانکاریی عێراق بڕیاریدا ئەو کارگەیە بگوێزرێتەوە شاری سلێمانی[123]. ئەوە بوو دواتر لە سلێمانی (سەرچنار) بنیاتنرا.

نوێنەرانی کەرکوك لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی، گرنگی و بایەخی تایبەتییان بە هاندان و پاڵپشتییەکانی حکومەت داوە بۆ کردنەوەی خوێندنی پیشەسازی و بەرەوپێشبردنی، هەرچەندە ئەم چەشنە خوێندنە لە پێشتردا لە شارەکەدا هەبوو، بەڵام لەلایەن حکومەتەکانی عێراقەوە تەواو پشتگوێ خرابوو[124]. بۆیە نوێنەرانی کەرکوك، بە تایبەت: (سلێمان فەتاح)، (سەعیدی حاجی حەسەن)، (محەمەد ڕەفیق خادم سوججادە) و (نەشئەت ئیبراهیم)، بەو هۆیەی کردنەوەی ئەم چەشنە نووسینگە و قوتابخانەیە دەبێتە مایەی پێشکەوتنی شارەکە و وڵاتی عێراق، پەیتا پەیتا داوای کردنەوەو هاندان و گەشەپێدانی ئەم چەشنە خوێندنەیان لە شاری کەرکوکدا کردووە[125]. بەڵام بەدیهاتنی ئەم نیازە لە شاری کەرکوکدا زۆری خایاند، حکومەت ساڵی (١٩٤٥/١٩٤٦) قوتابخانەیەکی فەرمی، کە لە ئاستی دواناوەندیدا بوو، بۆ خوێندنی پیشەسازی کردەوە[126].

پێویستە بوترێت، پیشەی فەرمی (حکومی) لە

کۆتاییەکانی ڕۆژگاری عوسمانییەوە لەنێو ڕەعییەتەکانی عوسمانی ڕۆژ دوای ڕۆژ لە برەوسەندندا بوو، ئەوەش لە ئاکامی بەرەوپێشچوونی ڕەوشی فێرکردنی عوسمانی و کردنەوەی قوتابخانەکان و ڕەخساندنی هەل لەبەردەم هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا بۆ ئەوەی ببن بە کاربەدەستی دەوڵەت. لەو ئاکامەدا خەڵکێکی زۆر کورەکانیان ناردە بەرخوێندن و بەشێکی بەرچاویشیان بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوویان لە بەغداو ئەستەمبووڵ کردو کاربەدەستی دیاریان لێ دەرچوو. ئەمانە دواتر بە (ئەفەندی) ناویان دەرکردو شاری کەرکوکیش پشکێکی گەورەی لەم ڕووەوە بەرکەوت[١٢٧].

بە هاتنی ئینگلیزەکان و داکەوتنی سەردەمی پاشایەتی ئەم بارە نەك درێژەی هەبوو، بەڵکو ڕێژەی ئەوانەی مەبەستیان بوو ببنە کاربەدەستی دەوڵەت زۆر زیاتر بوو. بەڵام ئەوەی تێبینی گرنگ هەڵدەگرێت گۆڕانێکی چۆنێتی و چەندێتی زۆرە لە بارەی بوارو پسپۆڕییەکانی ئەم سەردەمە. ئەگەر لە سەردەمی عوسمانی پیشەی سەربازی (ئەفسەری) خواستێکی زۆری کۆمەڵانی خەڵکی لەسەر بوو بێت، ئەوا لەم سەردەمەدا پیشەی دیکە ترۆپکی خواستی خەڵکی داگیرکردووە، وەك: (پارێزەری، پزیشکی، ئەندازیاری، مامۆستایەتی و.. هی دیکە). لە هەمان کاتیشدا پیشەی سەربازی هەر خواستی لەسەر ماوەتەوە.

لە دەرەوەی پیشە فەرمییەکان، دوو پیشەی بازرگانی و بیناسازی (لە سییەکانی سەدەی بیستەم بە دواوە) ڕەواجێکی زۆری لە نێو دانیشتووانی شار بە گشتی و دانیشتووانی شاری کەرکوك بە تایبەتی پەیداکردووە. ئەوەش بێگومان بۆ چەند هۆیەکی زاندراو دەگەڕایەوە، کە لە سەرووی هەمووانەوە دابینبوونی سەقامگیریی سیاسی و ڕەگداکوتانی دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراقی بوو لە ناوچەکەدا. هەروەها هۆیەکی کاریگەری دیکە بوونی سوودێکی زۆر بوو لەو دوو پیشەیە، بە تایبەتی بازرگانی کە بە شێوەیەکی خێرا پارەیەکی زۆری تێدا قازانج دەکرا. نوێنەرانی کەرکوکیش لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، گرنگییان بە کەرتی پیشەسازی داوەو لە هەوڵی بەرەوپێشبردنی ڕەوشی بازرگانی و بازرگاناندا بوونە[١٢٨].

هەرچی پیشەی بیناسازی بوو، لە ئەنجامی پێشکەوتنە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە، پەرەسەندنێکی زۆری بەخۆوە بینی دوای ئەوەی ڕێژەو پلەی شارنشینی (نسبة ودرجة التحضر) لە ناوچەکە زیادی کردو خەڵکانی پارەدار، چیدیکە ڕازینەبوون لە خانووە کۆنەکانیاندا ژیان بگوزەرێنن و خانووی نوێیان بنیاتنا. ئەمە لە ڕاستییدا، بریتیبوو لە قەڵەمبازێکی گەورە سەبارەت بە پیشەی بیناسازی لەو ڕۆژگارەدا.

جێی سەرنجدانە، شاڵاوی کۆچی دانیشتووانی لادێ بۆ شار، شوێنپەنجەی دیاری بەسەر پەرەسەندنی چۆنێتی و چەندێتی پیشەیی دانیشتووانی شاری کەرکوکەوە نەخشاند. لە ئاکامی بەردەوامیی ئەو کۆچەی لادێکان بۆ چەقی شارەکان، دەستی کار برەوی سەندو کاریگەریشی خستە سەر کرێی کارو ململانێی هێنایە کایە لەنێوان کرێکارانی شارو کرێکارە کۆچەرەکان، بەوەی کرێکارە کۆچەرەکان ئامادەبوون لەژێر هەر بارو نرخێکدا کار بکەن، ئەمەش کاریکردە سەر کرێی کاری کرێکارەکانی شار[١٢٩].

لە لایەکی دیکە دەرکردنی یەکەم قانوونی تایبەت بە کرێکاران لە عێراقدا، قانوونی کرێکاران (العمال) ژمارە (٧٢)ی ساڵی (١٩٣٦)، ڕۆڵی لە پەرەسەندنی چۆنیەتی ژیانی پیشەیی دانیشتووان بینی، کە قانوونەکە جەختی لەسەر ڕەوایی مافی کرێکاران دەکردەوە بۆ هێنانە کایەی ڕێکخستنی سەندیکایی بە گوێرەی ئەو پیشەسازییانەی تیایدا کار دەکەن، وەك: هێڵی ئاسنی و نەوت و پیشەگەرییەکانی بازرگانی و میکانیك و.. تادوایی. پاش هەوڵ و تەقەلالایەکی زۆرو خوێناوی ساڵی (١٩٤٦) کرێکارانی نەوتی کەرکوك توانییان بزاڤی سەندیکایی بە فەرمی بهێننە کایەوە[١٣٠].

*** تەوەری سێیەم:**

**پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووان:**

گرنگی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی خاسیەتی دیاری مرۆڤەکانە. بۆیەش پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان وا پێناسە دەکرێت: (وابەستەو شوێنەواری ئاڵوگۆڕکێی نێوان تاکەکان و کۆمەڵگەیە، کە لە سروشتی کۆبوونەوەو ئاڵوگۆڕی هەستەکان و لێکخشان و کارلێکیان لە بووەتەی کۆمەڵگە دروست دەبێت). لەوەتەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دروستبووە پەیوەندیی کۆمەڵایەتییش پەیدابووە. ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەش وابەستەی کۆمەڵێك یاساو ڕێسای کۆمەڵایەتی و ژینگەیی و ئابووریی و فەرهەنگی دەبێت، کە بە گوێرەی هەنگاوگەلی پێشکەوتنی شارستانییەتەکان ئەمانیش پێ بەپێ گۆڕان و پەرەسەندن و پێشکەوتنیان بەسەردا دێت. بۆیە لە ئەنجامی پێشکەوتن یا دواکەوتنی هەر کایەیەك پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە گۆڕان و پەرەسەندن بەخۆوە دەگرێت[١٣١].

لە زانستی کۆمەڵناسییدا، بۆچوونی جیاواز بە شێوەیەکی گشتی دەربارەی سروشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شار هەیە. هەیە پێی وایە مۆرکی ململانێ و چەوسانەوە بەسەر مۆرکی هاوکاریی کۆمەڵایەتیدا زاڵە ئەگەر بێت و پێکهاتەی دانیشتووانی شارەکەش، لە ڕووی بنەچەو زمان و ئایین و ئایینزاوە یەکپارچەبن. سەرباری هەمەچەشنیی پیشەیی و جیاوازیی چینایەتی و مەیل و ئاراستە جۆربەجۆرەکانیان، کە ئەم فاکتەرانە کۆمەڵی دانیشتووان بەرەو تاکرەوی و بەرژەوەندخوازی دەبات[١٣٢].

بۆچوونی دیکەش هەیە پێداگیری لەسەر ئەوە دەکات، کە هاوکاری و هەمەچەشنی لە بنەڕەتدا لە ناخی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکاندا هەیەو، هاوکارییش جیاوازی و هەمەچەشنی ڕەتناکاتەوەو ئەمانیش هاوکاریی کۆمەڵایەتی ڕەتناکەنەوە. چونکە لە هەندێك باردا هەمەچەشنیی دانیشتووان دەبێتە ئامرازی بەهێزبوون لە پرۆسەی هاوکاریی کۆمەڵایەتیداو لە هەندێك جاریشدا هۆی بێ هێزیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. لە چوارچێوەیەکی گشتییشدا، کۆمەڵێك ئاماژەو هێمای زانستی ڕەچاو دەکرێت

بۆ پاساودانی بوونی ململانێ یا هاوکاریی کۆمەڵایەتیی دانیشتووان لە هەر شارو ناوچەیەکی دیاریکراودا، لەوانە: (ڕێکەوتن لەگەڵ یەکتر، هاوکاری لەنێوانیان، بەرژەوەندیی و ئامانجی هاوبەش، سۆزو هەستی وەك یەك، بەشداربوون لە خۆشیی و ناخۆشییەکان، ڕێزگرتنی وەك یەك، بایەخی هاوبەش)[١٣٣]. بە ڕەچاوکردنی ئەو هێماو ئاماژانە، دەتوانرێت سروشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی هەر شارو ناوچەیەك تا ئەندازەیەکی چاك شی بکرێتەوە.

لە پێناو دروست پێکان و ڕوونکردنەوەی وردی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکوك لە ماوەی سەردەمی پاشایەتیدا، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووان لەسەر دوو ئاست و دوو بنەما پۆلێن دەکەین و لەو ڕوانگانەوە دەربارەیان دەدوێین:

أ. **پەیوەندییە نێوخۆییەکانی شار:**

١. **پەیوەندییە ئیتنیکی- ئایینییەکانی دانیشتووانی شار:**

دەتوانرێت بوترێت، شاری کەرکوك لە ڕووی ئیتنیی و ئایینییەوە یەکێك لە شارە ئاڵۆزکاوە بەرچاوەکانی کوردستان و عێراقە، کە شوێنی بە بایەخی نیشتەجێبوون و بڵاوبوونەوەی چەند نەتەوەو ئایین و ئایینزاو گرووپێکە. لەم شارەدا، وەك ئێستاش، شانبەشانی یەکتر کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتووان پێکەوە ژیانیان گوزەراندووە. لە هەندێك ناوچەو بارو کاتدا، ئەو کۆمەڵە جیاوازانەی دانیشتووان بە شێوەیەکی توند تێکەڵ بە یەکتر بوونە و ئەستەمە شوێنی نیشتەجێبوونیان یان بنەچەو ئایین و بیروباوەڕەکانیان بە وردیی و دروستی دەستنیشان بکرێت[١٣٤].

ئەم پێکەوە ژیانە کۆمەڵایەتییە لە ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراوی وەك شاری کەرکوك، لەلایەن کۆمەڵ و توێژی هەمەچەشنی ئیتنیی و ئایینییەوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژی مێژوویی، جەخت لەسەر پێکەوەلکانی کۆمەڵایەتی دەکات، یا لانیکەم نەبوونی دژایەتیی و دوژمنایەتییە لەنێوانیان.

بێ سوود نابێت ئاماژە بەوە بکرێت، کە زمانی ئاخاوتنی شارەکە لەنێوان کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتووان، لە پلەی یەکەمدا تا کۆتایی ڕۆژگاری پاشایەتی زمانی تورکمانی بوو[١٣٥]. کوردو عەرەب و کلدان و ئەرمەن و جووەکان زۆرتر بە زمانی تورکمانی لەگەڵ یەکتر دواون، کە ئەم زمانە هاوبەشە بە تەنیشت زمانی کوردییەوە زمانی سەوداو مامەڵەی بازاڕ بووەو زۆر ئاماژەی مێژوویی و بەڵگەش لەم بارەوە تۆمار کراوە[١٣٦].

سەروەربوونی ئەم چەشنە مۆرك و پێکەوە ژیانە کۆمەڵایەتییە، زۆرجار سەرلێشواندنی بۆ لایەنی بەرانبەر دروستکردووە. بۆیە دەبینرێت لەلایەن هەندێك کەس و لایەنەوە بەشێك لە کوردو عەرەب و مەسیحییەکان بە تورکمان دراونەتە قەڵەم. ئەمەش بەڵگەو نیشانەیەکی بەهێزی پێکەوەلکانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی کەرکوکی دەسەلمێنێت.

کۆمەڵگەی کەرکوکی لە ئاکامی فرە چەشنیی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەیەوە خاوەن پەیوەندییەکی فرەڕەنگ و هەمەچەشن بووە. ئەم فرەچەشنییە هەرچەندە بە ڕواڵەت دەبوو هۆو ئامرازێك بێت بۆ داکەوتنی جیاوازیی قوڵی نەتەوەیی و ئایینی لە شارەکەدا، بەڵام لە ڕۆژگاری عوسمانی و دواتریش جیاوازییەکی لەو شێوەیە لە شارەکەدا بەدی نەکراوە[١٣٧]، یا لانیکەم سەرچاوە مێژووییەکان لێی بێ ئاگا بوون.

لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری حوکمڕانیی عوسمانیدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی شاری کەرکوك بەو شێوەیە وەسف کراوە، کە پەیوەندییەکی تۆکمەو توندوتۆڵە.

(سۆن)، گەڕیدەو سیخوڕی بەناوبانگی بەریتانی، کە بۆ ماوەی (١٦) ڕۆژ لە سەرەتای سەدەی بیستەم (١٩٠٧) لە چەقی شاری کەرکوکدا ماوەتەوە، جەخت لەسەر سەروەربوونی گیانی لێبوردەیی و بە تەنگەوە هاتن و دەست گیرۆیی کردن و میوان نەوازیی و ئانبدەیی و ڕێزگرتنی دانیشتووانی فرەچەشنی شاری کەرکوك دەکاتەوەو بە سەرنجەوە دەربارەی دەدوێت[١٣٨].

پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتییانەی کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتووانی کەرکوك، لە ڕۆژگاری پاشایەتیشدا، بەردەوام بووەو لەم ڕووەوە ڕۆژنامەنووسی هۆڵەندی (مالیبارد)، کە لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا سەردانی عێراقی کردووە سەرنجی ئەم بارەی داوەو نووسیویەتی: "لێرەدا (مەبەستی هەموو لیوای کەرکوکە/ توێژەر)... عەرەب و کوردەکان بە ئاشتەوایی و ئارامی شانبەشانی یەکتر پێکەوە ژیان دەگوزەرێنن"[١٣٩].

بە هەمان شێوە ئەم بارە بەسەر پەیوەندییەکانی کوردو تورکمانیشدا پیادە دەبێت، بەڵام بە ئاستێکی جیاوازترو توندو تۆڵتر. لەم بارەوە مێژوونووس (کەمال مەزهەر) نووسیویەتی: "پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، کە باشترین پەیوەندییەکان کوردی بە تورکمانەکان وابەستە کردبوو، چ لە کەرکوك و دەوروبەری، چ لە ناوچەکانی دیکەدا"[١٤٠]. نموونەو بەڵگەی پێکەوەژیانی کۆمەڵە ئیتنی-ئایینییە جیاوازەکانی نێوان کوردو تورکمانەکان لە مێژووی هاوچەرخدا، سەنگی مەحەکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بەرچاوەکانی دانیشتووانی شاری کەرکوکە[١٤١].

پەیوەندیی نێوان کوردو تورکمانەکان بە تایبەت پەیوەندییەکی دۆستانە بووە، چ لە سەردەمی عوسمانی و چ لەسەردەمی پاشایەتی[١٤٢]. (نووری تاڵەبانی)یش پێی وایە، ئەو دووبەرەکی و ناتەباییە نەتەوەییەی لەنێوان کوردو تورکمانەکانی شاردا کەوتووەتەوە، لە دوای ساڵی (١٩٥٨) پەرەی سەندووە[١٤٣].

هەرچی پەیوەندیی نێوان کەمە ئایینەکانی شاری کەرکوك و موسڵمانەکانە (لە چەند ساڵ و ماوەیەکی کەمدا نەبێت) پەیوەندییەکی تەبا و ئاسایی بووە. ئەو ناتەبایی و گرژییەی لە پەیوەندییەکانی نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکانی شاریش لە سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی

لە ساڵی (١٩٢٤)دا هاتە ئارا، دەستی دەرەکی و مەبەستی سیاسی لەپشتەوە بوو[144]. لەم بارەوە، (ماتڤییڤ) (مارمەتی)، پێی وایە، ئەم ڕووداوە بۆ تێکدانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی شارەکە بووە، بۆیە دەنووسێت: "دەسەڵاتدارانی عێراق... بەردەوام لە هەوڵی ئانەوەی ئاگری ئاشووب بوون لەنێوان نەتەوەکاندا"[145].

مەسیحییەکانی شار بە درێژایی ماوەی حوکمڕانیی عوسمانی، بە تایبەت لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە، بەردەوام پەیوەندییەکی چاکیان لەگەڵ پێکهاتە فرە ئیتنی و ئایینییەکانی کەرکوکدا هەبووە، لانیکەم لە چوارچێوەی پێکەوەژیانی ئاشتییانە نەهاتوونەتە دەرێ، بە بەڵگەی ئەوەی تا ئێستا ئاماژەیەکی مێژوویی پێچەوانە بەرچاو نەکەوتووە[146]. مەسیحییەکان لە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمە ئایینییەکانیان سەربەستیی تەواویان هەبووە. بەڵام ئەم لێبوردەیی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە نەگەیشتووەتە ڕادەی تێکەڵاوبوون و هاوسەرگیری، بێگومان ئەوەش بە هۆی ئەو سنوورە سوورە ئایینییە بووە کە بۆ موسڵمانان دیاریکراوە. دەبێت ئەوەش بگوترێت پێگەی کرستیانەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا لاواز و مرۆڤی پلە دوو بووە.

لە سەردەمی پاشایەتییدا، لە ئەنجامی زاڵیی دەسەڵاتی بەریتانییەکان لە ناوچەکە، گۆڕانێکی ڕووکەشانە بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مەسیحییەکان و موسڵمانانی کەرکوکدا هات. چونکە مەسیحییەکان هەستێکی جیاوازیان بەرانبەر بە دەسەڵاتی بەریتانییەکان هەبوو، ئەوان وەك زۆربەی موسڵمانەکانی شار ناحەزیان بەرانبەر بە ئینگلیزەکان نەبوو. بەڵکو بە پێچەوانەوە، داخ لە دڵ بوون بەرانبەر بە ڕەفتارو دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان و ئەوانەشی عەوداڵی گێڕانەوەو هاتنەوەی دەسەڵاتیان بوون بۆ شاری کەرکوك[147]، کە خەڵکێکی زۆری کەرکوکی دەکەوتە ئەو چوارچێوەیە. چونکە عوسمانییەکان لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا شوێنی پیرۆزو دێرینی مەسیحییەکان، (بەیعەتی شەهیدان) (ئەوەی بە کڵێسای سوور ناسراوە)، کردبووە کۆگای چەك و تەقەمەنیی سوپای مۆڵدراوی ناوچەکەو لە سەرەوەختی پاشەکشێدا ساڵی (١٩١٨) تەقاندبوویانەوە. ئەمەش گرژی لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ موسڵمانەکان هێنایە کایە. بە تایبەت کاتێك لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٢٣)دا، هێزی لیڤیی ئاسووریی هاوئایینی کلدانی لە نزیك شار نیشتەجێکران بارودۆخەکە گرژتربوو[148].

بە گوتەی نووسەری کتێبی (تراجیدیای ئاسوورییەکان)، ئەوەی هەستی دوژمنانەی ئاسوورییەکان بەرانبەر بە جەماوەری کەرکوکی زۆرتر کرد ئەوەبوو، کە ئاسوورییەکان ڕوانگەیەکی نێگەتیڤانەیان بەرانبەر بە دانیشتووانی کەرکوك هەبوو، گوایە زۆربەی خەڵکی کەرکوك بنەچەیان دەگەڕێتەوە سەر تورکەکان[149]، بۆیە ئەمە زەمینەسازی کرد بۆ بەرپابوونی ڕووداوێکی خوێناوی لە شارەکەدا.

ڕووداوە خوێناوییەکە کە لە (٤ی مایسی ساڵی ١٩٢٤)دا بەرپابوو[150]، بووە هۆی ئاڵۆزتربوونی پەیوەندییە ئیتنی-ئایینییەکانی موسڵمانان بە مەسیحییەکانی شارەوە[151]، چونکە هێزەکانی لیڤیی ئاسووری ماڵی (میناس غەریب ئەفەندی) کەسایەتی ناسراوی کلدانییان لە گەرەکی (حەمام مەسیحی) و ماڵی دیکەی مەسیحییان لەو گەرەکە بەکارهێنا بۆ گورز وەشاندن لە خەڵکی شار[152]. سەرەڕای ئەوەی دوکان و ماڵە موسڵمانەکانیان تاڵانکردبوو، هەر کەسێکیان بەرچاو بکەوتایە تەقەیان لێ دەکرد[153].

ڕۆژی دوای ڕووداوەکە بەشێك لە دانیشتووانی خرۆشاوی کەرکوك، بە کردار هەڵوێستێکی توند و دوژمنانەیان بەرانبەر بە مەسیحییەکانی شار نواند، هەندێك لە ماڵە مەسیحییەکان کەوتنە بەر شاڵاوی تاڵانکردنیان و چەندیشیان لێکوشتن[154]. بەڵام بە تێپەڕینی ماوەیەکی کورت بەسەر ڕووداوەکە، گیانی تەبایی و هاوکاریی کۆمەڵایەتیی نێوانیان وەك سەردەمی پێشووی لێهاتەوە[155].

ڕۆڵی کاریگەری زانا ئایینی و پیاوماقوڵانی شار لە سەرەوەربوونی گیانی لێبوردەیی بە زەقی لەم ڕووەوە دیار بوو[156]. ڕێزگرتن لە بیروباوەڕە ئایینییەکانی یەکترو بەشداریی بۆنەو هاوبەشیی لە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان[157]، چەند هێماو نیشانەیەکی گرنگن بۆ سەلماندنی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتییانەی پێکهاتە ئیتنی و ئایینییەکانی شارەکە.

لە بەرانبەردا، ڕووداوی (٤ی مایسی ساڵی ١٩٢٤) تەکانێك بوو بۆ بەهێزبوونی پەیوەندییە ئیتنی-ئایینییەکانی کورد و تورکمانەکان و ڕاشکاوانە ڕووی بەهێزی دەمارگیریی ئایینی زەق دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی کوردەکانی ناو شارو خێڵانی دەوروبەری شار لەو ئاشووبەدا پشتیوانییان لە تورکمانەکان کرد[158].

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مەسیحییەکانی شار لەگەڵ موسڵمانەکان بە تێپەڕینی کات لە سەردەمی کۆتایی پاشایەتی بەش بەشبوونی بەخۆوە گرت، ئەوانەی لەسەر قەڵادا مابوونەوە بە هۆی بەهێزیی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دانیشتووان جیا نەدەکرانەوە. کەچی ئەو بەشەیان کە لە بەشی قۆریە لە گەرەکی (کەرکوکی نوێ-عەرەفە) و گەرەکە نزیکەکانی عەرەفە نیشتەجێبوون پەیوەندییەکی لاوازی کۆمەڵایەتییان هەبوو بە دانیشتووانی کەرکوکەوە. ئەم بەشەیان لەنێو شاردا کۆمەڵێکی جیاوازو گۆشەگیری کۆمەڵایەتییان پێکهێناوە. چونکە ئەمانە لە بنەڕەتدا زۆریان لە دەرەوەی کەرکوکەوە ڕوویان کردبووە ئەم شارە و زۆربەیان بۆ کارکردن لە لای ئینگلیزەکان و لە دواییدا لە کۆمپانیای نەوت دەست بەکاربوون[159].

هەرچی پەیوەندیی جوولەکانە بە دانیشتووانی کەرکوکەوە، ئەوا پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی ئاسایی بووە لە چەشنی زۆربەی هەرە زۆری ئەو پەیوەندییانەی لە شارەکانی دیکەی عێراقدا بوونیان هەبووە. جوولەکانی کەرکوك پەیوەندییەکانیان زیاتر بە کورد و تورکمانەکانەوە بەهێزتربووە بە هۆی بازارو گۆشەگیرنەبوونیان لە کۆمەڵگەی زۆرینەی موسڵمانی کەرکوکی. لە ڕۆژگاری پێشووتریش هەر بەو شێوەیە بووە، پەیوەندییەکی گرژو

نالەباری کۆمەڵایەتیی ئەوتۆ لە سەرچاوە مێژووییەکاندا تۆمار نەکراوە[١٦٠]. بەڵکو تێبینی ئەوە کراوە جووەکان زۆر سەربەستو بێ پەروایانە توانیویانە لە هەر گەڕەكو شوێنێکی شاردا بیانەوێت بژین ڕێگەیان پێدراوە، بەڵام بۆ خۆیان مەیلی گەورەی ئەوەیان هەبووە لە شەقامو گەڕەکی تایبەتدا، لە پاڵ یەکدی کۆببنەوە[١٦١]. هۆی گەورەی ئەمەش بە بۆچوونی ئێمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جووەکان لە هەموو شوێنێکی کوردستانو عێراقو جیهانی ئیسلامی هەمیشە بە چاوێکی بێڕێزی سەیر کراونو مایەی گاڵتەپێکردنو چەوسانەوە بوونە.

لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا، جووەکان دوو هەڵوێستی جیاوازیان هەبووە، هەڵوێستێکیان بریتیبووە لە بەهێزکردنی گیانی ئیتنی-ئایینیی جووەکانو یەکخستنی مەیلی سیاسییان بۆ کۆکردنەوەی کۆمەكو پیتاكو کۆچکردن بۆ ئیسرائیل[١٦٢]، هەڵوێستێکی دیکەشیان جەختکردنەوە بووە لەسەر درێژەدانو تووندو تۆڵکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بە دانیشتووانی شارەوە[١٦٣].

پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی جووەکان بە کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتووانەوە تاسەر هەر ئاسایيو لەبار نەبووە. بەڵکو بە هۆی سیاسیو دەمارگیریی ئیتنی-ئایینییەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە[١٦٤]. بە تایبەت لە سەروبەندی دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیلو دواتردا ئەم پەیوەندییە ئاڵۆز بووە. موسڵمانەکان هەڵوێستی نەشیاوی کۆمەڵایەتییان بەرانبەر بە جووەکانی شار نواندووە[١٦٥].

سەبارەت بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی گرووپی کاکەیی بە دانیشتووانی کەرکوکەوە، پەیوەندییەکی بەهێزی کۆمەڵایەتی نەبووە، چونکە سروشتی بیروباوەرە ئایینییەکەیان وای خواستووە، کە بە شێوەیەکی پەراوێزی ژیان بگوزەرێننو تێکەڵاویو هاوسەرگیری نەك هەر لەگەڵ پێکهاتە ئیتنیو ئایینییەکانی دیکەی شاردا نەکەن، بەڵکو تەنانەت لەنێو خودی گرووپەکەی خۆشیاندا نەیانتوانیوە لەگەڵ هەموو خێزانێکدا تێکەڵاوی بهێننە کایە. بەڵام لەناوخۆدا خاوەن پەیوەندییەکی تۆکمە بوونەو گردبوونەوەی بەردەوامیان لە تەکیەو لە کاتی بۆنەو پرسەکانی یەکتردا هەبووە[١٦٦].

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان کوردو تورکمانەکانیش لە چوارچێوەی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتیدا بووە. لە کاتێکدا وەك دەزانرێت، چەمکی (پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتییانە) لە هەندێك باردا، ململانێیەکی ژێربەژێرو دوژمنایەتییەکی شاراوە لەخۆوە دەگرێت. بەڵام ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە پۆزەتیڤەی کوردەکانی وابەستەی تورکمانەکان کردبوو، زۆر بەهێزتر بوو لە چاو ئەو ململانێیە شاراوەی هەبووە. بەڵگەی پتەوی ئەم ڕاستییەش نەبوونی کەرتێکی نیشتەجێبوونی هەڵشاخاوی تایبەت بە کورد یا تورکمانەکانو تێکەڵاوبوونو بوونی پرۆسەی هاوسەرگیریی کۆمەڵایەتییە لەنێوان کوردو تورکمانەکانو بەشداریی بۆنەو پرسەکانی یەکترو هاوبەشییە لە دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا.

**٢. پەیوەندییە ئایینی- چینایەتییەکانی دانیشتووانی شار:**

جێی سەرنجە، وابەستە ڕۆشنبیری-نەتەوەییەکانی چینە دەوڵەمەندەکەی دانیشتووانی کەرکوك زاڵتربوو بەسەر وابەستە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکاندا. بەو پێودانەی دەستڕۆیشتووەکانی بنەماڵەی نەوتچيو بنەماڵە تورکمانەکانی دی هەمیشە وا خۆیان دەبینی کە ئەمان نزیکترن بۆ تورکیا لە بنەماڵە کوردەکاني شاري کەرکوك، بە تایبەت تاڵەبانییەکان. هەرچەندە بنەماڵەی تاڵەبانی وەك ئەوان لە دەستڕۆیشتووەکانی شارو لە ڕووی ئابوورییشەوە لە هەمان ئاستی ئەواندا بوون.

تاڵەبانییەکان وەك نەوتچییەکان بۆیان لوا بوو سوود لە بیرە نەوتەکانی گۆل (گێل) وەرگرنو هەمان جیاوکی دەرهێنانی نەوتیان هەبێت، کە نەوتچییەکان لە بیرە نەوتەکانی باباگوڕگوڕدا هەیانبوو[١٦٧]. ئەم بابەتە، بە هۆی بەرژەوەندیی ئابووریی هاوبەش، دەبوو ئامرازو هۆیەك بێت بۆ لێك نزیکبوونەوەی ئەم دوو بنەماڵەیە، کەچی لە واقیعی حاڵدا شتی لەو چەشنە نەهاتە ئارا.

وەك نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی سروشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە باوەکانی کۆمەڵگەی کەرکوکی لە سەردەمی پاشایەتی، جارێکی دیکەش پێویست دەکات بۆ هەڵوێستی تاڵەبانییەکان بگەڕێینەوە. بەپێی زانیاریو بۆچوونی (لیورا لوکیتن) لە میانەی تێزی دکتۆراکەی لە (زانکۆی هارڤارد)دا، بنەماڵەی تاڵەبانی خوازیاربوون پارێزگاری لە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە بەریتانییەکانەوە بکەن، چونکە بەریتانییەکان سەرچاوەی جیاووگو شکۆمەندی ئەوان بوو[١٦٨]. بۆیە ڕەتیان دەکردەوە بکەونە ژێر سایەو نفووزی تورکمانەکان، کە تورکمانەکان ئاراستەکانیان ڕووەو تورکیا بوو[١٦٩].

بە هەمان شێوەش تاڵەبانییەکان قبووڵیان نەبوو بچنە ژێر دەسەڵاتی بەرزنجەییەکان[١٧٠]. ئەم دوو بنەماڵەیە لە ململانێیەکی مێژووییدا بوون[١٧١].

ئەم جیاوازیو ململانێیانە لە کۆتاییدا کاریگەریی دوو لایەنەی هەبوو، حکومەتەکانی عێراقی (لە سەرەتادا بە پاڵپشتیی بەریتانیا) هەمیشە ئاگاداری سروشتی ئاڵۆزکاوی ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی نێو شاری کەرکوك بوون، بۆیە لەپێناو دروست نەبوونی یەکێتییەکی جوگرافی لە ناوچەکەدا، کەوتنە نانەوەی دووبەرەکیو گەورەکردنی دەللاقەکانی جیاوازیی ئیتنی-ئایینی لەنێوان کوردەکانو تورکمانەکان لە لایەكو، لە لایەکی دیکەش لەنێوان کوردەکان خۆیاندا[١٧٢].

لە زۆربەی شارەکاندا، گەڕەك بنەرەتێکی پتەوی پەیوەندییە ڕاستەوخۆکانی نێوان تاکەکانە. هەندێکجاریش لە دروستبوونی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی کۆمەڵایەتی، هاوپیشەگەریو هاوپیشەیی ڕۆڵی کەمتر لە گەڕەکەکان نابینێت[١٧٣]. هەمیشە بازاری گەورەو بازاری قەیسەريو بازارە تایبەتمەندەکانی شار، بە جیاوازیی فرە چەشنیی ئایینيو ئایینزاییەوە، هۆیەکی گەورەی لێك نزیکبوونەوەو

پەیدابوونی پەیوەندییە چینایەتییەکانی شار بووە. بە هۆی یەك جۆری کارو هاوپیشەییان، پیشەگەرەکان پەیوەندیی چینایەتی بەهێزیان دامەزراندووە. ئەم پەیوەندییە بەهێزە لە سییەکانەوە بەرەو یەکخستنی هەوڵی هێنانە کایەی رێکخراوی سەندیکایی دەچێت تا لە ساڵی (١٩٤٦) بەدواوە، مەبەستەکەیان دێتە دی.

لە ڕاستییدا ئەم چەشنە پەیوەندییانە ڕێگر نەبووە لەبەردەم دروستبوونی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای خێڵەکی لەنێوان تاکەکاندا[١٧٤]. بەڵام بە هۆی کلتووری شارەوە ئەو پەیوەندییە خێڵەکییانە جیاوازە لەو پەیوەندییانەی لە گوندەکاندا هەیە. ئەم چەشنەیان کەمترین چەشنی ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییە باوەکانی شار بووەو، زۆرتریش، لە قەراخ شاردا بەرچاو دەکەوێت، بە تایبەت لە گەڕەکی (شۆریجە)[١٧٥]. ڕەنگە نیشانەو گەواهی ئەم ڕاستییە لەوەدا چاکتر بخوێنرێتەوە، کە گەنجو هەرزەو منداڵانی گەڕەکەکان بۆ سەرخستنی شکۆو ڕاگرتنی ئابڕووی گەڕەکەکەیان، بە توندی لە بەرانبەر گەنجو هەرزەو منداڵانی گەڕەکەکەی دی زوو زوو شەڕە گەڕەکیان بەرپاکردووە[١٧٦]. بڵاوبوونەوەو باوبوونی ئەم بەها کۆمەڵایەتییە نامۆیە بە ژیانی شارستانییەت، زادەی زاڵبوونی بەشێك لە دابو عورفی خێڵەکیو پەیوەندییە خێڵەکییەکانو دەمارگیریی ئیتنی لە گەڕەکەکانی قەراخ شار نەبێت مانای دیکەشی نابێت.

پێویستە بوترێت، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تورکمانەکانی سوننەو شیعە مەزهەبدا، لە چوارچێوەی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتییانە نەترازاوەو لێبوردەییو دەمارگیرییەکی توندی ئەوتۆ لە شاری کەرکوك بەرانبەر بە یەکتر نەبینراوە[١٧٧]. بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەر لە کۆنەوە سەرباری بوونی فرەچەشنیی ئایینزاییو مەزهەبگەرایی وەك: حەنەفیو قزلباشیو بەکتاشیو.. هتد، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەنێو شاردا سەروەر بووەو جیاوازییەکی ئەوتۆ بەدی نەکراوە. هەموویان ڕێزو خۆشەویستییان بۆ یەکترو لە بۆنەو پرسەکانی یەکتردا بەشدار بوونە[١٧٨]. کەچی نووسەرێك پێی وایە ئەم پەیوەندییەی نێوانیان کزو لاواز بووە، بە بەڵگەی ئەوەی نەگەیشتووەتە ڕادەی تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی. ئەو نووسەرە دەڵێت: "پێوەندی نێوان تورکمانی سوننیو شیعە تێکرا تا نزیکەی دوا ساڵەکانی پەنجا ساردو سڕ بووە، ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر کام لەم دوو تایەفەیە دابونەریتی تایبەتی خۆی هەیەو دیالێکتی تورکمانیی هەر کامیان لە هیی ئەوەیان جیایە، بەڵام هۆی سەرەکیی ئەم لێك دوورییە.. هەر ئەوەیە کە مەزەبیان لێك جیایەو، هەر ئەمەیشە ڕێی نەداوە ژنو ژنخواز لەنێوانیاندا پەیدا ببێ"[١٧٩].

چینایەتی هۆیەکی بەرچاوە لە ناسینەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتییدا (١٩٢١-١٩٥٨). بە گوێرەی ئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شار زۆرتر لەسەر بنەمای تایبەت بە خێزانو ئایینو گرووپو بنەمای ژینگەیی بە گشتی ساغ دەبێتەوەو کارلێکی کۆمەڵایەتی دروست دەکاتو شاریش لە بووەتەی کلتوورە جیاکەرەوەکەی خۆیدا دەیتوێنێتەوە، پەیوەندییەکی چینایەتی چۆنیەتی لە شارەکاندا دێتە ئارا. بەپێی بۆچوونی نووسەرێکی کورد، ئەو ململانێ شاراوەی نێوان کوردو تورکمان، کە لە لایەرەکانی پێشەوەدا ئاماژەمان پێدا، دەچێتە خانەی ململانێی چینایەتییەوە. بە گوتەی ئەو نووسەرە ".. تورکمان، زیاتر، گوزارشتی لە چینی ئۆرستوکراتی تورکیو دەستڕۆی سیاسیو، خاوەن کۆشكو تەلارو زەویو زارو سەرمایە کردووە، کوردیش ڕەشو ڕووتو ڕەنجدەرو جووتیارو کرێکاری نێو شار بووە"[١٨٠]. ئەم پێودانە بە هەمان شێوەو ئەندازەش بەسەر عەرەبو پێکهاتەکانی دیکەی دانیشتووانی نێو شاری کەرکوکدا پیادە دەبێتو ئەوانیش لەم بارە بەدەر نین.

ئەوەی سەبارەت بە پەیوەندییە چینایەتییەکانی کەرکوك بێت لەو ماوە مێژووییدا، ئەوەیە کە پەیوەندییەکە خاوەنی دوو ڕەهەندی جیای چینایەتییە: یەکەمیان تایبەتە بەو پەیوەندییانەی لەنێوان چینی سەروو (دەوڵەمەندەکان)دا هەبووەو فاکتەرەکانی بەرژەوەندیی ئابووریی هاوبەشو ڕەچاوکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی لە هەڵسوکەوتو دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان، دوو فاکتەری بەهێزی پەیدابوونو بەردەوامبوونی ئەو چەشنە پەیوەندییانە بووە لەو ڕۆژگارەدا. بۆ ئەو مەبەستەش تێکەڵاویی کۆمەڵایەتی، بە شێوەی ژنو ژنخوازیو بە ڕێگەی دیکە، لەنێوان چینی سەروو (دەوڵەمەندەکانی شار)دا دروست بووە. بۆ نموونە بنەماڵەی (قیردار) ژنیان لە بنەماڵەی (نەوتچییەکان) خواستووەو ئەمانیش ژنیان لەوانو بنەماڵەکانی دیکە هێناوە. (تاڵەبانییەکان) لەگەڵ بەگەکانی (زەنگەنە) و بنەماڵەی (خانەقا)ش لەگەڵ بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی عەرەبو تورکمانەکانی شار لەو چەشنە پەیوەندییە بەشدار بوونە[١٨١].

هەرچی ڕەهەندی دووەمی پەیوەندییە چینایەتییەکانی دانیشتووانی کەرکوکە لە سەردەمی پاشایەتی، بریتییە لەو پەیوەندییانەی لەنێوان چینو توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکانی شاردا هەبووە. ڕایەڵی ئەو پەیوەندییەی توێژو ئەندامانی چینی سەروو بە توێژو ئەندامانی چینی ناوەڕاستو خوارەوەی کۆمەڵگەی کەرکوکی دەبەستەوە، زۆرتر، لەسەر بنەمای قازانجو سوودی هاوبەش وەستا بوو. کەسایەتیو بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی شار، بە گرێدانو هێنانە کایەی پەیوەندییەکانیان بە وردە بازرگانانی نێوخۆو کرێکارو جووتیارانی نێوشار، هەم کاری خۆیان ڕایی دەکرد، هەم سوودیان بەوان دەگەیاند، لە ڕێگەی فرۆشتنی کاڵا بازرگانییەکان بە بازرگانانی نێوخۆو لەکارنانی زەویو زارە کشتوکاڵییەکانیان لە قەراخ شاردا لەلایەن کرێکارو جووتیارانی نێو شار[١٨٢].

**ب. پەیوەندییە دەرەکییەکانی شار:**

**١. پەیوەندییەکانی شاری کەرکوك لەگەڵ دەوروبەریدا:**

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی کەرکوك لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا، لە زۆربەردا، پەیوەندییەك بووە لەسەر بنەمای جیاوازیی چینایەتی دامەزراوە. بە تایبەت لەو ناوچانەی کە لە رووی ئایینیو ئیتنییەوە فرەچەشن بوونە. بۆیە دەبینین بەشێکی زۆری زەوییەکانی ناوچەی مەلحە (حەویجە)و بەشی رۆژئاوایی شاری کەرکوك شوێنی نیشتەجێبوونو نیشتەجێکردنی عەرەبە بەدوەکان بوو، لە کاتێکدا زەوییەکانی ئەو دەڤەرە زۆربەی هەرە زۆری موڵکی دەوڵەمەندەکانی کوردو تورکمانە سوننەکانی شاری کەرکوك بوو. بەڵام لە راستییدا عەرەبە هەژارەکانی ناوچەکە سەرپەرشتیی زەویو زارو مەرومالاتەکانی دەوڵەمەندەکانی شاریان گرتبووە ئەستۆ(١٨٣).

لەنێو موڵکدارە گەورەکانی ناوچەی مەلحە، دەکرێ لەپای روونکردنەوەی زیاتر ئاماژە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کوردی ناودار (سەیید ئەحمەدی خانەقا) بدرێت، کە گەورە موڵکداری ناوچەکانی مەلحە بوو لەو رۆژگارەدا. (سەیید ئەحمەدی خانەقا) لە رۆژگاری عوسمانییەوە ئەو زەویو زارانەی لەسەر تاپۆ کرابوو، کە بریتیبوو لە ژمارەیەك گوندو زەوی کشتوکاڵیی بەراو. ئەو رۆژگارە زۆرجار زەوییەکانی (سەیید)و دەوڵەمەندەکانی شاری کەرکوك لەلایەن هۆزە کۆچەرییەکانی کوردو چێنەرانی کوردی لادێنشینی دەوروبەرەوە بێ گرێو گۆڵ لە وەرزی بەهاردا بەکاردەهێنران(١٨٤).

لە رۆژگاری دواتریشدا لە ئاکامی گۆرانو پەرەسەندنە گەورەکانی دیمۆگرافیای عێراقو ناوچەکە، هۆزە کۆچەرییەکانی کورد زۆر کەمتر روویان لەناوچەکانی مەلحە کرد، بۆیە بە مەبەستی نیشتەجێکردنی هۆزەکان داواکرا هۆزە کوردە کۆچەرییەکان لەو ناوچانە نیشتەجێ بکرێن، بەڵام هۆزەکان رازی نەبوون لەسەر ئەم بابەتە(١٨٥).

لە سەردەمی وەزارەتی دووەمی (یاسین پاشای هاشمی)، بریاردرا هۆزە عەرەبە بەدوەکانی لیوای مووسڵو دیالە (واتە هۆزگەلی عوبێدو جبوورو ئەلبووحەمدانو..تاد) لەو ناوچانە ناچار بە نیشتەجێبوون بکرێن، بۆ بەدیهاتنی مەبەستەکەشیان پرۆژەی ئاودێرییان بۆ ساز کردن لە ساڵی (١٩٣٦) بە ناوی (پرۆژەی ئاودێریی حەویجە).

پرۆژەی حەویجە بریتیبوو لە هەڵکەندنی کەناڵێکی گەورە بە درێژایی (٥٥) کم، لە زێی بچووکەوە بۆ ناوچەی حەویجە، بە مەبەستی ئاودێریی ئەو دەشتانەی لە حەویجەو دەوروبەردان(١٨٦). ئیتر لەو ساڵە بەدواوە عەرەبە بەدوەکانی مووسڵو دیالە لە ناوچەکە نیشتەجێبوونو پەیوەندییەکی نوێی کۆمەڵایەتییش لەنێوان موڵکدارەکانی شارو عەرەبە نیشتەجێبووەکانی ناوچەکە هاتە ئارا. لەسەر زۆربەی هەرە زۆری موڵکەکانی (سەیید ئەحمەدی خانەقا) عەرەبەکان بژێویان وەستا بوو. لەو ئاکامەشدا پەیوەندییەکی چاکی کۆمەڵایەتی لەنێوان (سەیید ئەحمەدی خانەقا)و (شێخ نازم عاسی)و (موزهر عاسی) دەسەڵاتدارە بەناوبانگەکانی ناوچەی مەلحە دامەزرابوو(١٨٧).

بە هەمان شێوە، دەستڕۆیشتووەکانی بنەماڵەی تاڵەبانیو کاکەییو بەرزنجیو جەباریو قیردارو گەلێکی دی، خاوەن موڵکی گەورە بوون لە دەوروبەری شاردا، ئەمانە بۆ زامبوونی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان پەیوەندیی کۆمەڵایەتییان بە دانیشتووانی ناوچەکانی دەوروبەری زەویو زارو گوندەکانیانەوە گرێدا بوو.

بەڵام دەبێت ئەو راستییەش لەبەرچاو بگیرێت، کە کوردە شارییەکان پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بەهێزتریان هەبوو بە دانیشتووانی دەوروبەری شارەوە بە بەراورد بە پێکهاتە جیاوازەکانی دیکەی شار، چونکە زۆربەی هەرە زۆری ئاواییەکانی دەوروبەری شار، بە تایبەت ئەوانەی کەوتبوونە ناوچەکانی باکوورو رۆژهەڵاتی شاری کەرکوك، شوێنی نیشتەجێبوونی هۆزە کوردەکان بوو. بۆیە سروشتی بوو زۆرتر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی شار بە دەوروبەرەوە لەنێوان کوردە شارییو گوندنشینەکان بێتە کایەوە.

لە لایەکی دیکە، فاکتەری (بازار) هۆیەکی بەهێزی دیکەی دروستبوونی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی دوو لایەنەی شارو ئاوەدانییەکانی دەوروبەری بوو. گوندو ئاوەدانییەکانی دەوروبەری شار پێویستیی زۆریان بە ساغکردنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵی (گەنم، جۆ، میوەجاتو..تادوایی) و ئاژەڵییەکانیان (گۆشت، شیر، ماست، پەنیر، کەرەو.. تادوایی) هەبوو. لە بەرانبەردا بازرگانەکانی بازاڕی شاری کەرکوك لە پێناو قازانجو دەستکەوتی ئابووری پەیوەندیی کۆمەڵایەتییان بە دەوروبەری شارەوە گرێدابوو. بەڵام ئەم پەیوەندییە لە زۆرباردا پەیوەندییەکی تۆکمە نەبوو. چونکە نیشتەجێبوونی زۆرێك لە هەژارانی لادێکانی دەوروپشتی شار، بە هۆی جیاواز، لە قەراخی شاردا بەبێ خزمەتو پڕکردنەوەی پێویستییان، هەستی جیاوازیی چینایەتییان (دەوڵەمەندیو هەژاری)و نایەکسانیی کۆمەڵایەتییان لە لایان گەڵاڵە کرد بوو(١٨٨). خەڵکی ئاواییەکانی دەوروبەری شار هەمیشە قەرزاری بازرگانو دوکاندارەکانی شار بوون، بۆیە ئەمە جۆرە رقو کینەیەکی دروستکرد بوو(١٨٩).

چەقبوونی شار لە ژیانی پیشەگەرایەتی، فاکتەرێکی دیکەی دروستبوونی پەیوەندییەکانی نێوان پیشەگەرانی شارو جووتیارو گوندنشینەکانی دەوروبەری شار بووە. پیشەگەرەکانی شار هۆی دابینبوونی پێداویستییە کشتوکاڵیو کەلوپەلەکانی ژیانی جووتیارو گوندنشینەکان بوونە، وەك: پێداویستییەکانی کردەی کێڵانو دروێنەو کوتینو.. هتد. پەیوەندیی نێوان پیشەگەرەکانی شارو گوندنشینەکانی دەوروبەر بەهێزتر دەردەکەوێت، کاتێك جووتیارو چێنەرەکانی دەوروبەر مەبەستییانە بەرهەمهاتووەکانیان لە شار ساغ بکەنەوەو عەللافو دوکاندارەکانی دیکەی شار بە مەبەستی دەستکەوتو قازانجی پتر لە هەوڵی گرێدانی پەیوەندییەکانیان دادەبن بەوانەوە(١٩٠).

نموونەیەکی دروستی دیکەی لاوازیو ناحەزایەتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی کەرکوك بە هۆزو ئاواییەکانی دەوروبەرەوە، پەیوەندییەکانی تورکمانە دەوڵەمەندەکانی شار بێت بە هۆزی (ئەلبووحەمدان)ی عەرەبی نیشتەجێبوو لە رۆژئاوای کەرکوك. بەپێی چەند زانیارییەکی تایبەت، پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو لایەنە، تورکمانە دەوڵەمەندەکانی شارو هۆزی ئەلبووحەمدان، لە هەڵبەزو دابەزدا بووەو سەقامگیری بەخۆوە نەدیوە. چونکە هەر کاتێك قاتو قڕیو بێ بارانیو وشکە ساڵی بهاتایە، ئەندامانی ئەم هۆزە رێگرییان لە کاروانە بازرگانییەکانی تورکمانەکان دەکردو کاڵاو شتومەکەکانیان بۆ خۆیان بە تاڵان دەبرد[١٩١].

**٢. پەیوەندییەکانی شاری کەرکوك لەگەڵ شارەکانی دیکەدا:**

دەکارێت فاکتەرە کاریگەرەکانی دروستبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکوك بە شارەکانی دیکەوە، چڕ بکرێنەوە لە: کۆمپانیای نەوتو هەلی کار، تیپی دووەمی سوپای عێراق، بازاڕو بازرگانی، قوتابخانەی ئامادەیی، هاوئایینو ئایینزایی.

بوونی کۆمپانیای نەوتو دروستبوونی هەلی کار، زۆرێك لە کرێکارانی شارەکانی دیکەی بۆ خۆی پەلکێشکرد. بە تایبەت کاتێك دەسەڵاتدارانی کۆمپانیای نەوت گرنگیو بایەخێکی تایبەتیان بە کرێکارانی مەسیحیو عەرەب دابوو بۆ کارکردن لە پرۆژەکانی کۆمپانیاو کوردو تورکمانەکان بە پلەیەکی کەمتر کاریان پێدەدرا[١٩٢]. ئەمەش وای لە ژمارەیەکی زۆری کرێکاری ناوچەکانی مووسڵو بەغداو دیالەو شارەکانی ناوەڕاستو خوارووی عێراق کرد کە بە ماڵو خێزانەوە بۆ شارەکە بگوازنەوەو بە تێپەڕینی کات ببنە فاکتەرێك بۆ دروستبوونی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەنێوان دانیشتووانی شاری کەرکوكو زێدی رەسەنی خۆیان.

بەهەمان شێوەی رۆڵی کۆمپانیای نەوت، بەڵام لە ئاستێکی نزمتر، دەستنیشانکردنو دیاریکردنی شاری کەرکوك بە مەڵبەندی تیپی دووەمی سوپای عێراقی لە (ناوەڕاستی ساڵی ١٩٣٦)ەوە[١٩٣]، رۆڵی لە هێنانە کایەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکوكو شارەکانی دیکەدا گێڕا[١٩٤].

فاکتەری بازاڕو بازرگانی، هۆیەکی گرنگی هاتنە کایەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی کەرکوك بووە بە شارەکانی دیکەی کوردستانو عێراق. بە تایبەت مووسڵ، بەغدا، سلێمانی. لەبەر ئەوەی شاری کەرکوك مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانیو لە رووی هەڵکەوتەی جوگرافییەوە کەوتبووە سەرەڕێی بازرگانی، بۆیە پەیوەندییەکی تۆکمەی کۆمەڵایەتیی بازرگانانی کەرکوك بە بازرگانانی سلێمانیو مووسڵو بەغداو شارانی دییەوە دروستببوو. ئەم پەیوەندییە بەو رادەیە گەیشت تێکەڵاوی کۆمەڵایەتیو هاوسەرگیری لەنێوان شاری کەرکوكو شارانی دی بێتە ئارا[١٩٥].

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان شاری کەرکوكو هەولێریش، پەیوەندییەکی تۆکمەو جێگیر بووە، چونکە ئەم دوو شارە گەلێك بەرژەوەندیی هاوبەش پێکەوەیان دەبەستەوە[١٩٦].

ناوەندبوونی بازاڕی کەرکوك سەبارەت بە ناوچە کوردییەکانو بوونی هەلی کاری زۆر لە شاری کەرکوك، لە ئەنجامی پێشکەوتنە ئابوورییەکان، ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتووانی شارەکانی سلێمانیو هەولێری بە تایبەت، بەخۆوە گرێدابوو. ئەم فاکتەرە ئابوورییە رۆڵی لە هێنانە کایەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی توێژی بازاڕ (بازرگانو ئەوانی دی)دا هەبوو لەنێوان دانیشتووانی کەرکوكو ئەو شارانەدا[١٩٧]. زۆرجار بە خزمایەتیو ژنو ژنخواستن بەهێزتر کراوە. بەڵام ئەم بوارە زیاتر لەنێوان کوردە دانیشتووەکەی کەرکوكو لە پلەیەکی زۆر دووڕتردا تورکمانەکانی کەرکوکی گر تووەتەوە.

تەنانەت تورکمانەکان هەرچەندە پێشتر پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی بەهێزیی هەرێمی (ویلایەتی)یان هەبوو بە شارەکانەوە[١٩٨]، کەچی لە ئەنجامی بەردەوامیی دوورەپەرێزبوونی سیاسییان، لە دواتردا، گۆڕانێکی چۆنییەتی لە بونیەی نەتەوەییان پەیدا بوو. بەو رادەیەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بە ناوچەکانی دیکەوە، تەللەعفەر، هەولێر، خورماتوو و خانەقین رووەو کزی چوو. بەڵگەی ئەم راستییەش، وەك نووسەرێکی تورکمانی پاساوی داوە، نەبوونی یا دەگمەنبوونی دیاردەی هاوسەرگیریی ناوچە جیاوازەکانی نیشتەجێبوونی تورکمانە لەگەڵ یەکتردا[١٩٩].

رایەڵی تووندی پەیوەندییەکانی شاری کەرکوك بە شارەکانی دیکەی کوردستانەوە، لە راستییدا بریتیبوو لە بوونی قوتابخانەی دواناوەندی (ئامادەیی) بە تەنها لەنێو شاری کەرکوك. بە هۆی بوونی دواناوەندی لە شاری کەرکوكو نەبوونی لە شارەکانی دەوروبەر، قوتابیانی شارەکانی هەولێرو کۆیەو کفریو سلێمانی روویان لە شاری کەرکوك دەکرد بۆ تەواوکردنی خوێندن. ئەوەش لە زۆر کاتدا دەبووە مایەی توندوتۆڵ بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووانی شاری کەرکوك بە بنەماڵەی ئەو قوتابیانەوە.

هەرچی سەبارەت بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تورکمانە شیعەکان بێت بە سەرچاوە ئایینییەکانی نەجەفەوە، ئەوە تا دوا ساڵەکانی رۆژگاری پاشایەتی دوورەپەرێزی کزو لاواز بووە. بەڵام لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی چەند ئاخووندێکی شیعەی خوارووی عێراق (نەجەف) پەیوەندییان لەگەڵ دروست کردوونو بەسەریان کردوونەتەوە[٢٠٠]، لێرەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم تایفەیە بە سەرچاوە ئایینییەکانی شیعەی نەجەفو کەربەلاوە پەیدا بووە[٢٠١].

*** رووخسارە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکوک:**

*** تەوەری یەکەم:**

**خێزان:**

خێزان بنکەیەکی گرنگ پێکدەهێنێت لە بینای هەر کۆمەڵگەیەکدا، چونکە خێزان بە بچووکترین یەکەی کۆمەڵگە دادەنرێت و شانۆی کارلێک و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، لێرەوە تاک پەروەردە دەکرێ تا دەبێتە ئەندامێکی سەربەخۆ لە کۆمەڵگە. لەو ئاکامەشدا چەند رۆڵێك بۆ ئەو تاکە لە ناوەوەو دەرەوەی خێزان دێتە کایەو پێگەو پلەی کۆمەڵایەتی لەناو کۆمەڵگە دیاری دەکات. گەشەکردن و پەرەسەندنی خێزان لە ئەنجامی وەڵامدانەوەی پێداویستییە بنەرەتییەکانەوە هاتووەتە ئارا، هیچ تاکێك ناتوانێت بە تەنها لە دەرەوەی رێکخستنەکانی خێزاندا بژیت. بۆیە رێکخستنی خێزان بە کۆنترین رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان لە قەڵەم دەدرێت[٢٠٢].

لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا (١٩٢١–١٩٥٨)، کۆمەڵگەی عێراقی لە چوارچێوەیەکی گشتییدا لەسەر بنەرەتی خێزان پێکهاتووە. خێزانە عێراقییەکانیش هەرگیز پابەندنەبوون بە یەك چەشنە یاسا، چونکە ئەو یاسایانەی خێزانە عێراقییەکان پێوەی پابەندبوون، کە بە (یاسای باری کەسایەتی) (قانون الاحوال الشخصية) ناسراوە، بە جیاوازی ئایینی خێزانەکان گۆڕانی بەسەردا دەهات. بۆیە خێزانە موسڵمانەکان پابەندبوون بە حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی و خێزانە مەسیحییەکانیش پابەندبوون بە حوکمەکانی شەریعەتی مەسیحی و جووەکانیش پابەندبوون بە حکومەکانی شەریعەتی تایبەتی خۆیان[٢٠٣].

خێزانەکان لە سەردەمی پاشایەتیدا بە کۆمەڵێك تایبەتمەندی دەناسرانەوە. گرنگترین لایەنی باری کۆمەڵایەتیی خێزانە کەرکوکییەکانی ئەو رۆژگارە بریتیبوون لەم لایەنانە: قەبارەو رۆڵی خێزانەکان لەنێو کۆمەڵدا، پێگەی ئافرەت لە کۆمەڵگەو روانگەی خێزانەکان بۆ مافەکانی مێینەو تادوایی. بۆیە هەوڵدەدەین بە پوختی باس لە رەهەندی ئەم لایەنانە بکەین.

**أ. قەبارەو رۆڵی خێزان لە کۆمەڵگادا:**

چەمکی ماڵ (العائلة) جیاوازە لە چەمکی خێزان (الاسرة)، کە ئەمەی دواییان زۆرتر لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی و ئامارییەکاندا بەکاردەبرێت[٢٠٤]. زانا ئەنترۆپۆلۆجییەکان، سەبارەت بە پێناسی چەمکی خێزان، روانگەی جیاوازیان هەیە. بەڵام شیاوترینیان سەبارەت بە کۆمەڵگەی شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتی رەنگە ئەم پێناسەیە بێت: "کۆمەڵە کەسێك لە رێگەی هاوسەرگیرییەوە یا پەیوەندی خوێنەوە.. یەك دەگرن و بە شێوەیەکی سەربەخۆ نیشتەجێ دەبن و لەنێوانیان کارلێکی بەردەوام لە ئارادایەو رۆڵی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی خۆیان، وەك: ژن و مێرد، باوك و دایك، کوڕ و کچ، خوشك و برا دەگێڕن، هەروا شارستانییەتییەکی هاوبەشیان لە لا گەڵاڵە دەبێت"[٢٠٥].

ئەم پێناسەو روانگەیە بۆ خێزان بە رادەیەکی زۆر بەسەر خێزانەکانی شاری کەرکوك پیادە دەبێت، چونکە کۆمەڵگەی کەرکوکی لە ماوەی سەردەمی پاشایەتی، بە گوێرەی داب و نەریتە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان (تقليد) لە (خێزانی فراوان) (الاسرة المركبة) پێکهاتووە، کە باوك و دایك و کوڕ و کچ و نەوەکانیان و زۆرجاریش باپیرو داپیرو لە هەندێك باریشدا مام و پلك (خوشکی باوك یا دایك)ی گرتووەتەخۆ.

**خشتەی ژمارە (٦)**

**بەراوردی تایبەتمەندی و رۆڵ و ئەرکەکان لە خێزانی فراوان و ناوکیدا[٢٠٦].**

| پێوەر | خێزانی فراوان | خێزانی ناوکی |
|---|---|---|
| ژمارەی منداڵ | زۆر | کەم |
| رەهەندی خێزان (الابعاد) | گەورە | بچووک |
| بەرپرسی ئاگاداری بەساڵاچووان | خێزان | خانەی بەساڵاچووان |
| تۆڕی پەیوەندی هاوسێیەتی | بەهێز | لاواز |
| یەکسانی ژن و پیاو | پیاو لەپێشترە | یەکسانن |
| هەڵبژاردنی هاوسەر | لە ئەستۆی خێزاندایە | لە ئەستۆی کچ و کوڕدایە |
| وابەستەیی تاك بە خێزانەوە | زۆر | کەم |
| بەرپرسی پەروەردەی ئایینی | خێزان | قوتابخانە |
| رادەی جێگیری | زۆر | کەم |

سەرچاوەکانی بەر دەست، بە تایبەت ئامارە فەرمییەکان، بە روونی ئاماژە بە بوونی (خێزانی فراوان) دەدەن لە شاری کەرکوک لەو رۆژگارەدا[٢٠٦].

هۆی سەرەکیی و دیاری ئەم بابەتەش بۆ رێنماییەکانی ئایینی ئیسلام دەگەڕێتەوە، کە هانی خستنەوەی وەچە دەدات و رێگەی بە فرەژنی داوە. پێکهاتەی ئایینی موسڵمانانی شاری کەرکوک لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، بریتیبووە لە نزیکەی (٩٠٪) لە کۆی گشتیی دانیشتووان. بۆیە شتێکی ئاساییە و لەگەڵ لۆژیکی مێژوویی گونجاوە کاتێک شێوەی (خێزانی فراوان) لە شاری کەرکوک باو بووبێت.

هەرچی جۆری خێزانی ناوەکییە (الاسرة النواة)، لە رۆشنایی سەرچاوەکانی ژێر دەست، لە شاری کەرکوک بە شێوەیەکی زۆر کەمتر بەدی کراوە[٢٠٧]. ئەم جۆرە خێزانە لە ژن و مێرد و منداڵەکانیان پێکهاتووە و تا رادەیەکی تەواو لە خزمانی دیکە جیا بوونەتەوە. "خانەی سەرەکی خێزان لە ژن و مێرد پێکدێت کە زۆربەی کات لە ئەنجامی پەیوەندی بە یەکترەوە پێکگەیشتوون، و لەوانەیە پێکگەیشتنیان تەنانەت بە نارەزایی کەسانی دیکە و هەندێک جار دوای ماوەیەکی کورتی یەکتر ناسین بوو بێت. لەم خێزانەدا پێش هەر شتێک رەزامەندی و خۆشبەختی تاک گرنگە و چاودێری کردنی بەرژەوەندییە گشتییەکان گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە"[٢٠٨]. هۆی پەیدابوونی ئەم چەشنە خێزانەش، بە ئەندازەیەکی بەرچاو، بۆ بزاوتنی شوێنگەی کارو گۆڕانی شوێنی نیشتەجێبوون و بەهێزبوونی ناوەندی شاری کەرکوک لە ئەنجامی پیشەسازی نەوتەوە بووە. ئەم دوو چەشنەی خێزان هەر یەکەیان خاوەن تایبەتمەندی و رۆڵ و ئەرکی جیاوازن لە یەکتر. لە بەراوردکردنی تایبەتمەندییەکانی هەردوو چەشنە خێزان و دیاریکردنی رۆڵ و ئەرکیاندا بە روونی جیاوازیی گەورەی نێوانیان دەردەکەوێت. بروانە خشتەی ژمارە(٦).

لە خشتەی ژمارە (٦)دا راشکاوانە ئەوە روون دەبێتەوە کە کۆمەڵگەی کەرکوک کۆمەڵگەیەکی بەهێزی رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان بووە و دەچێتە خانەی جۆرە رێکخستنە کۆمەڵایەتییە نەریتییەکانەوە. ئەوەش لە ئاکامی زاڵبوونی چەشنی (خێزانی فراوان) لەنێو کۆمەڵگەدا لەو ماوە مێژووییە دیاریکراوەدا.

فاکتەری سەرەکی لە پێکەوەنانی خێزانی فراوان لایەنی هاوکاری و هەرەوەزی بوو. چونکە بە مەبەستی گەیشتن بە دابینبوونی ژیانێکی خۆشگوزەران، تەنها لە چوارچێوەی کارو کۆششەکانی سەرۆکی خێزان (باوک) نەدەهاتە دی. بە تایبەتی ئەوانەی بە کاری کشتوکاڵی و پیشەسازییە وابەستەکانی و بەخێوکردنی ئاژەڵەوە خەریکبوون پێویستییان بە کۆشش و هاوکاریی هەموو ئەندامانی خێزان دەبوو. وێڕای ئەوەش کوردەکان بەوە ناسراون کە ئارەزوویان لە خستنەوەی منداڵی زۆرە[٢١٠]. هۆی ئەمەش بۆ دوو فاکتەر دەگەڕێتەوە: یەکەمیان، دیاردەی فرەژنیی و کەوتنەوەی وەچەی زۆر. دووەمیان، ئارەزووکردنی پیاوی کورد بە منداڵی زۆر و شانازیکردنی پێوەی کە هێما و پێوەرە بۆ هێزی خێزانەکەی، بە تایبەت زۆریی ژمارەی کورەکانی[٢١١].

هەرچی بنەماڵە ناودارو دەوڵەمەندەکانی شار بوو، بەهۆی لەدەستنەدانی پێگەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابوورییان، پێویستییان بە دروستکردنی (خێزانی فراوان) هەبوو. نموونەی ئەم راستییە دەکرێت لە بنەماڵەی تاڵەبانی ببینرێت. بنەماڵەی بەناوبانگی تاڵەبانی، بەوە ناسراون کە خاوەن خێزانی فراوان و گەورەن. بنەماڵەی خانەقاش لەم چوارچێوەیە بەدەر نییە و خاوەن خێزانی فراوان بوو، بەڵام دوای (سەیید ئەحمەدی خانەقا) و لە سەردەمەکانی دواتردا، بەهۆی جیاجیاوە، خێزانەکەیان بەرەو بچووکبوونەوە هەنگاوی هەڵگرت[٢١٢].

زۆربەی بنەماڵە گەورەو ناودارەکانی کوردی شاری کەرکوک رایەڵی پەیوەندییەکی خێڵەکییان مابوو، بە ژیانی گوندو خێڵەوە گرێی دەدان. بۆیە جێی هەڵوەستەو سەرسوورمان نییە کاتێک ئەو بنەماڵە کوردانەی شاری کەرکوک خاوەن خێزانی فراوان بووبن. بنەماڵە تورکمانە شیعەکانیش بە هەمان شێوەی بنەماڵە کوردەکانی شار، لە خستنەوەی وەچەی زۆر بەشداربوون و مۆرکە بنەماڵەیی و خێڵەکییەکەیان هێشتا هەر بەهێز بوو. خشتەی ژمارە (٧)، روونکردنەوەی زێتر سەبارەت بە باری خێزانداری لە شاری کەرکوک گرتووەتە ئەستۆ.

خێزانە مەسیحیی و جووەکان پێچەوانەی خێزانە موسڵمانەکانی شار لە دروستکردن و پێکەوەنانی خێزانی فراواندا هاوشان نەبوون. ئەوەش وەک لە پێشەوەدا ئاماژەی پێدرا بۆ رێنماییە ئایینییەکانیان دەگەڕایەوە، هەرچەندە خێزانە جووەکان بە ژمارەی ئەندامانی خێزان لە خێزانە مەسیحییەکان گەورەتربوون، بەڵام هاوشانی خێزانە موسڵمانەکان نەبوون. خێزانە مەسیحییەکان، بە

خشتەی ژمارە (٧)

پۆلێنکردنی دانیشتووانی شاری کەرکوک بە گوێرەی باری هاوسەرگیری لەنێوان ساڵانی(١٩٤٧–١٩٥٧)دا[٢١٤].

| ساڵ | کۆی گشتیی دانیشتووان | باری خێزانداری (ئەوانەی تەمەنیان لە پانزە ساڵ و بەسەرەوەیە) | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | یەک ژن | دوو ژن | سێ ژن | چوار ژن |
| ١٩٤٧ | ٧٠٨٠٦(*) | ٢٥٩١٦ | ٥٨٠ | ٥١ | ١٤ |
| ١٩٥٧ | ١٢٠٤٠٢ | ٤٢٩٢٥ | ١٠٣٥ | ١٥١ | ٥٤ |

تایبەت کلدانییەکان کە لەسەر ئایینزای کاتۆلیکی بوون، خاوەن خێزانی بچووك بوون. چونکە ئایینزاکەیان ڕێگەی بە هاوسەرگرتنی زۆر نەدەدا، بەڵکو بە درێژایی تەمەنیان دەبوو یەك هاوسەریان هەبێت. هەروەها لە خستنەوەی وەچەشدا ئەوان زۆر بە پەرۆش نەبوون وەك خێزانە موسڵمانەکان، بۆیە لە کۆنەوە خێزانە کلدانییەکانی کەرکوك خستنەوەی وەچەیان سنووردار کردبوو. هەر ئەم بابەتەش هۆیەکی دیاری گەشەنەکردنی ژمارەی کۆمەڵە دانیشتووانی کەمە ئایینییەکانی شاری کەرکوك بوو لە ماوەی دیاریکراوی لێکۆڵینەوەکەدا[٢١٣].

لە خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت باری خێزانداری لە ئاستێکی بەرزدایەو پرۆسەی هاوسەرگیری لە نێو کۆمەڵگەی کەرکوکدا بە شێوەیەکی دیار لە ئارادا بووە، هەروەها ئەوەش روون بووەتەوە دیاردەی فرەژنی لە کۆمەڵگەی کەرکوکیدا لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا هەبووەو ئەم دیاردەیەش بە تێپەڕینی کاتو باشتربوونی باری گوزەرانی دانیشتووانو گەشەکردنی ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوك، بە تایبەت خزینی گوندنشینەکان بۆ نێو شار، پەرەی سەندووە. لە کاتێکدا دەبوو ئەم ڕێژەیە بەرەو کەمبوونەوە هەنگاو هەڵگرێت، چونکە بە گوێرەی لۆژیکی مێژوویی و ڕێساکانی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان، هاوشانی گەشەکردنی پرۆسەی بەشاربوونو لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاستو پلەی شارنشینی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان هەڵدەوەشێتەوەو دابونەریتەکان گۆڕان بەخۆوە دەگرن، لەو چوارچێوەیەشدا دیاردەی فرەژنی (چەند ژنی) بەرەو کزبوون دەچێت.

دەبێت ئاماژە بەوەش بدرێت کە دیاردەی فرەژنی لە شاری کەرکوك، بەپێی ئامارە فەرمییەکانی عێراق، بە شێوەیەکی بەرچاو بە بەراورد بە زۆربەی شارەکانی دیکەی عێراق باو نەبووە لە سەردەمی پاشایەتیدا[٢١٥].

خێزان ڕۆڵێکی بنچینەیی لە گیانی تەبایی و پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتیو دروستکردنی هۆشیاریی تاکەکانی کۆمەڵگەی کەرکوکی دەگێڕا. دەکارێت ئەم ڕۆڵە لە دوو ڕوانگەوە ڕەچاو بکرێت: یەکەمیان پەروەردەکردنی منداڵ، دووەمیان پەیوەندییە خێزانییەکان.

**١. پەروەردەکردنی منداڵ:**

خێزان لە پێکهێنانی هۆشیاریی تاکدا ڕۆڵێکی بنەڕەتی دەگێڕێت، دابو نەریتو ئاکارو ڕەفتاری خێزانەکانو حوکمو بنەما ئایینییەکانیش کاریگەریان بەسەر ڕێچکەگرتنو دروستبوونی هۆشیاریی تاکەکانەوە هەبووە. گۆشکردنی منداڵان، لە کۆمەڵگەی کەرکوکدا وەك کۆمەڵگەکانی دیکەی عێراقو ناوچەکە، لە سەرووی ئەرکەکانی خێزانەوە بوو، منداڵان لە ڕۆژی لەدایکبوونییەوە گوێی بە بانگو گۆرانیو گێڕانەوەی چیرۆك ڕادەهێنراو لەسەر پارێزگاریکردن لە کلتووری بابو باپیرانو خۆشویستنیان گۆشدەکرا[٢١٦].

سەبارەت بە ناولێنانی منداڵ لە کۆمەڵگەی فرەچەشنی کەرکوکدا، لە زۆر باردا، هاوشێوەو هاوچەشنە. هۆی دیاری ئەم هاوشێوەیە لە ناولێنانی منداڵان بۆ کاریگەرییە ئایینییەکانی ناوچەکە دەگەڕێتەوە. بۆیە لەنێو نەتەوەو ڕەگەزە جیاوازەکانی پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك تێبینی ئەوە دەکرێت زۆرێك لە منداڵان ناوی وەك: (محەمەد، ئەحمەد، مەحموود، سادق، مستەفا، ئەمین، عەبدوڵڵا، عومەر، مەهدی، عوسمان، عەلی، حەسەن، حوسێن، خالد، عەبدولرەحمان، نەجمەددین، محێیەددین، لوتفوڵڵا، نوعمان، عەبباس[٢١٧]، ڕەسووڵ، عەبدولعەزیز، فەخروددین، عەتاڵڵا، فاتیمە، عائیشە، ئەسما، خەدیجەو.. تادوایی)ی لێنراوەو جیاوازییەکی گەورە لە ناولێنانی منداڵان لەنێو پێکهاتە جیاوازەکانی دانیشتووانی شاری کەرکوك بەرچاو ناکەوێت.

سەرباری ئەم چەشنە ناوە هاوشێوە ئیسلامییانە، هەر نەتەوەیەك لە نەتەوە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی کەرکوکی منداڵەکانیان بە ناوی تایبەتو مانادارەوە ناولێدەنا، کە گوزارشت بوو لە هێماو کولتووری تایبەت بەو نەتەوەو کۆمەڵە دانیشتووانە. بۆ نموونە ناوی منداڵە تورکمانەکان بەم شێوەیە بوو: (نشأت، گولر، زینل، قنبر، ئایدن، گولسەر، سێلدا، شنگول، نورجان، بیلجان)[٢١٨]. هەرچی ناوی منداڵە کوردەکان بوو، بە تایبەت ئەوانەی تازە هاتبوونە شارو لە نێو گەڕەکە کوردنشینە چڕەکانو لە پەرگەی شاردا گیرسابوونەوە، بەم جۆرە بوو: (دارا، پەروین، گەلاوێژ، فەرهاد، سێوە، شاسوار، نەریمان، نەوزاد، ئاسکە)[٢١٩].

ئەوەی جیاواز بوو لە ناولێنانی منداڵانی کۆمەڵگەی کەرکوکی، کەمە ئایینییەکانی شار بوون: (کلدان، جوو، ئەرمەن، ئاشووری). ئەمانە لە ئاکامی جیاوازیی ئایینییان لەگەڵ زۆرینەی دانیشتووانی شاری کەرکوك، لە زۆر باردا، ناوی منداڵانیان هاوچەشن نەبوو. بە زۆری خێزانە مەسیحیی و جووەکان کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەکانی کلتووری ڕۆژئاواوە، بۆیە ناوی منداڵەکانیشیان زۆرتر هاوشێوەی کۆمەڵگە مەسیحیو جووەکان بوو. نموونەی ناوی منداڵانی کەمە ئایینییەکانی کەرکوك لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بەم چەشنە بووە: (ناحوم، بطرس، حسقیل، میخائیل، قسطنطین، گورگیس، ئەندریە[٢٢٠]، حنا، فرانسیس، ماریا). بەڵام وێڕای ئەوەش، لە هەندێك باردا، ناوی منداڵانی مەسیحیو جووەکان هاوشێوە بوو لەگەڵ ناوی منداڵە موسڵمانەکان. لە نموونەی ئەو چەشنە ناوانەش: (سالح، موسی، عیسی، سلێمان، سلوی، میکائیل، یعقوب)[٢٢١].

یەکێك لە بنەڕەتەکانی پەروەردەکردنی منداڵ لە کۆمەڵگەی کەرکوکی بریتیبووە لە بەکارهێنانی بێشکە (مهد)و باو بووە. بۆیە زۆرینەی هەرە زۆری خێزانەکانی شاری کەرکوك لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا، منداڵەکانیان لە بێشکە ناوەو پێیان وابووە ئەو منداڵانەی لە لانك دەنرێن ئارامگرتنو ئۆقرەییان زیاد دەکاتو جەستەی منداڵ بەهێز دەکات. لەو ئاکامەشدا دروستکردنی لانك لە شاری کەرکوك لەلایەن دارتاشەکانەوە بەناوبانگ بووەو پیشەیەکی بە ڕەواج بووە[٢٢٢].

خێزانە کەرکوکییەکان هەر لە تەمەنێکی بچووکەوە

منداڵەکانیان لەسەر کۆمەڵێك خوو رەوشتی بەرزو لەبارو دروست رادەهێنا بۆ ئەوەی لە دواتردا تاکێکی سەرکەوتوویان لە کۆمەڵگە لێ دەرچێت. لە نموونەی ئەو کۆمەڵە خوو رەوشتە بەرزو دروستانە، وەك لە کتێبی (کرکوکدە اجتماعی حیات)دا هاتووە، رێزگرتن لە (زاد)و پەروەردەکردنی جوان بوو[٢٢٣].

٢. پەیوەندییە خێزانییەکان:

سەبارەت بە پەیوەندییە خێزانییەکانی شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا، لە ئەنجامی سەروەربوونی چەشنی (خێزانی فراوان) بەسەر کۆمەڵگەوە، پەیوەندییە خێزانییەکان لە ئاستێکی تووندوتۆڵدا بوو. خێزانی کەرکوکی، وەك خێزانێکی تەقلیدی، لە بنەرەتدا خێزانێکی باوکسالاری بوو، سەرۆکی خێزان (باوك) بەپێی نەریتە کۆمەڵایەتییە کۆنەکانی شار، خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان بوو لەنێو خێزاندا. تێکرای ئەندامانی خێزانیش ملکەچی فەرمانو فەرمایشتەکانی سەرۆکی خێزان بوون. ئەم پێودانە تەواو بەسەر پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کەرکوکدا پیادە دەبوو، بۆ نموونە کۆمەڵی جووەکان بە هەمان شێوە لەسەر بنەماو بنەرەتی سیستەمی خێزان دامەزرابوو، دەسەڵاتی رەهای خێزان لە دەست سەرۆکی خێزاندا بوو، خێزانیش لەسەر بنەمای هاوسەرگیری بوو، بۆیە ئەرکی پیرۆزی سەرشانی هەموو گەنجێکی جوو بوو خێزان پێکەوە بنێت[٢٢٤].

بەپێی سەرچاوەیەکی مێژوویی هاوسەردەم، دابونەریتو ئادابە خێزانییە کۆنە بەرێزەکان لەلایەن زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتووانی کەرکوکەوە لەبەرچاو گیراوەو بەم پێودانەش جیاوازی لەنێوان خێزانە دەوڵەمەندو مامناوەندو هەژارەکاندا نەبووە[٢٢٥]. ئەم سەرچاوەیە لەسەر باسی پەیوەندییە خێزانییەکانی کەرکوك بەردەوام دەبێتو دەنووسێت: "سەرۆکی خێزان گەورەی رەهایەو گشت ئەندامانی خێزان رێزی لێ دەنێن.. پەیوەندی خۆشەویستیو رێز لەیەك گرتن لە نێو گشت ئەندامانی خێزان باوە، ماڵ لە روانگەیانەوە نیشتمانێکی بچووکەو خێزانیش ئەو یەکەیەیە کە هەموان لەخۆ دەگرێتو دەیانپارێزێتو دەستی هاوکاریان بۆ درێژ دەکاتو لە کاتی پێویستیشدا پشتیان پێ دەبەستێت"[٢٢٦].

پەیوەندییە هاوسەرایەتییەکان لەنێو خێزانە کەرکوکییەکاندا بە رادەیەکی چاك لەسەر بنەرەتی تووندوتۆڵ دامەزراوە، مێرد باوەڕێکی پتەوی بە ژنەکەی هەبووەو رێزی دیاری بۆ داناوە. بۆیە لێك تێکەیشتنو گونجانێکی بە ئەندازەیەکی بەرز لەنێو خێزانە کەرکوکییەکاندا لە ئارادا بووە. رەنگە هێماو بەڵگەیەك بۆ دروستیی ئەم بۆچوونە ئاست نزمیی رێژەی تەڵاقو لێکجیابوونەوە بێت لەنێو خێزانە کەرکوکییەکان لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، وەك لە خشتەی ژمارە (٨)دا خراوەتەڕوو.

خشتەی ژمارە (٨)
پۆلێنکردنی دانیشتووانی
شاری کەرکوك بە گوێرەی
باری خێزانداری لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)[٢٢٧].

| ساڵ | بێ ژن | تەڵاقدراو | لێکجابوەوە |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ٢٠٣٧٦ | ١٧١ | ١ |
| ١٩٥٧ | ١٨٨٠١ | ٤٣٢ | ٦ |

بە گوێرەی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) کۆی خێزانداراەکانی کەرکوك بریتیبوو لە (٢٦٥٦١) خێزاندار، لەم ژمارەیە تەنها (١٧١) حاڵەتی تەڵاقو یەك تاکە حاڵەتی لێکجیابوونەوە هەبووە. ئەمەش رێژەیەکی نزم پێکدەهێنێت ئەگەر لە رووی ژمارەوە تەماشا بکرێت. هەرچی ئاستی تەڵاقو لێکجیابوونەوەی خێزانەکانی شاری کەرکوکە لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)دا، لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان (١٢٠٤٠٢)کەسو بەرزبوونەوەی رێژەی خێزانەکان (٤٤١٦٥) خێزاندارو جەنجاڵبوونی شارو پەیدابوونو بڵاوبوونەوەی کێشەی کۆمەڵایەتیی نوێی شار، ژمارەی ئەو خێزانانەی ئاکامی هاوسەرایەتییان بە تەڵاق گەیشتووە، وەك لە خشتەی سەرەوەدا پۆلێنکراوە، بریتیبووە لە (٤٣٢) و ئەوانەی لێکجیابوونەتەوە (٦) خێزان بووە. یەکێك لە هۆیە کاریگەرو بنەرەتییەکانی کەمیی تەڵاقو لێکجیابوونەوە لە شارەکەدا، پیروبۆچوونی ئایینیو دابونەریتی کۆمەڵایەتییە کە ناشیرین دەروانێتە دیاردەی تەڵاقو لێکجیابوونەوەو بە (ابغض الحلال) ناونراوە.

ب. پایەی ئافرەت لە کۆمەڵگادا:

ئافرەت لە کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتیداو لە سەردەمە مێژووییەکانی پێشوودا، جگە لە ئەنجامدانی کاری ناو ماڵ، خاوەن ئازادیو مافێکی دیاری ئەوتۆ نەبوو. ئیدی لە ئاکامی ئەو بارودۆخە تایبەتەی لەلایەن کۆمەڵگەوە رەگەزی مێینەی بە شێوەیەکی گشتی پێ دەوره درابوو، مافەکانی بە ئەندازەیەکی بەرچاو پشتگوێ خرابوو[٢٢٨].

کۆمەڵێك بەهای کۆمەڵایەتیو بیروبۆچوونی پێشینە، ژیانی ئافرەتیان وەك پەرژینێکی قایم دەور دابوو، بە تایبەت کاریگەرییەکانی رێنماییە ئایینییەکانو بەها کۆمەڵایەتییەکانی هۆزو بنەماڵەکان رۆڵی سەرەکی لە مانەوەی ئافرەت لە ماڵو دەرنەچوونیان، تەنها بۆ کاری زۆر پێویست نەبێت، هەبوو. ئافرەت قەڵایەکی گەورە بوو پێویستی دەکرد پارێزگاری لێ بکرێت تا ئابرووی خێزانو بنەماڵەکان پارێزراو بێت[٢٢٩].

سەرباری رۆڵی گرنگی ئافرەت لە ژیانی خێزانیو ئەرکە جۆراوجۆرەکانی کە خرابووە سەرشانی، لە چوارچێوەیەکی

گشتیدا، هەرگیز لەگەڵ بارو پێگەیدا هاوشان و گونجاو نەبوو. بۆیە بەشێکی زۆری کۆمەڵ مافی خوێندنیان بەرانبەر ئافرەت بە رەوا نەدەبینی[230]. هەر لەبەر ئەمەش خوێندنی کچان تا رۆژگارێکی نزیك بوونی نەبوو. کاتێکیش خوێندنی کچان هاتە ئارا، بەدەنگەوەهاتن و پێشوازیکردن لەو چەشنە خوێندنە رەزامەندییەکی تەواوی لەسەر نەبوو، بەڵکو لە چوارچێوەیەکی بچووکدا گیری خوارد.

لە شاری کەرکوکدا، گۆرانی رژێمی سیاسی و پێشهاتە کۆمەڵایەتییەکانی دوای نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی و پەیدابوونی دەسەڵاتی ئینتیدابی بەریتانی، خوێندنی کچانی بەدواوە هات. بەڵام ئەم خوێندنە تا کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتیش بە دواکەوتوویی و لە بازنەیەکی بچووکدا مایەوە، هەرگیز نەیتوانی نەك هاوشانی خوێندنی کوران بێت، بەڵکو بگاتە نیوەی هێزو برستی خوێندنی رەگەزی بەرانبەر. ئەوەی گەواهی ئەم راستییە دەداتە دەست ئامارە فەرمییەکانە، بەپێی کۆمەڵە ئاماری ساڵانەی وەزارەتی ئابووریی عێراق، ساڵی خوێندنی (١٩٥٦-١٩٥٧) ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی کچانی کەرکوك تەنها بریتیبووە لە (٩) قوتابخانە، لە کاتێکدا قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوران لەو ساڵەدا گەیشتووەتە (٥٤) قوتابخانە[231].

هەرچەندە بارودۆخی ئافرەتانی کۆمەڵگەی شاری بە بەراورد بە بارودۆخی ئافرەتانی لادێنشینەکان لەبارترو شیاوتر بوو، بەڵام بارودۆخی ئافرەتانی شاریش بە کۆمەڵێك بیروباوەڕی دواکەوتوو تەندرابوو. ئافرەت زۆرجار دەبوو باجی هەڵەی باوك و براو ئامۆزاو خزمە نزیکەکانی بدات و لە بری خوێن و لە کردەی سولح و مەسرەفتی، وەك کاڵاو هۆیەکی پێویستی دامرکاندنەوەی ئاشووب و ململانێیە کۆمەڵایەتییەکان بەکار دەهێنرا[232].

لە کۆتاییەکانی رۆژگاری حوکمرانیی عوسمانییەوە، بارودۆخی ئافرەت و پایەی لە کۆمەڵگەدا گۆرانێکی رێژەیی بەخۆوە گرت، داکەوتنی دەسەڵاتی بەریتانی لە عێراق پرۆسەی گۆرانە کۆمەڵایەتییەکەی خێراتر کرد، بۆیە سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی برێك گۆرانی رێژەیی بەسەر بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتیی ئافرەتدا هێنا. رەنگە بەرچاوترین ئەو گۆرانە رێژەییانە لە پەیدابوونی ململانێی نێوان داکۆکیکارانی ئازادی ئافرەتان و نەهێشتنی پەچەو عەبا (سفور) و پشتوانانی دانانی پەچەو عەبای ئافرەتان (حیجاب) بخوێندرێتەوە. ئەوەی بە راشکاوی لەسەر رووپەری رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمی عێراق رەنگدانەوەی گەورەی هەبوو[233].

ئەوەی پێویستە دەربارەی پایەی ئافرەتانی شاری کەرکوك و روانگەی خەڵکی کەرکوك بەرانبەر بە ماف و جلوبەرگی ئافرەتەوە ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە ئافرەتانی شاری کەرکوك جیاواز لە ئافرەتانی زۆربەی شارەکانی دیکەی عێراق، سەربەست و ئازادتر بوون و لەم رووەوە چەند هەنگاوێك کەوتبوونە پێش ئافرەتانی شارەکانی دیکە. هۆیەکانی ئەم پێشکەوتنەی باری ئافرەتانی کەرکوکیش رەنگە بۆ چەند فاکتەرێکی سەرەکی بگەڕێتەوە، لەوانە:

**یەکەم:**

بوونی کۆمپانیای نەوتی عێراق و رۆڵی لە پەرەگرتنی لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی شارەکە کاریگەری هەبوو. بوونی ژمارەیەك ئافرەتانی ئینگلیزی و بیانی و تێکەڵبوونیان بە خەڵکی شار لە بازاڕدا بە شێوە جلوبەرگی ئەورووپیی سەردەمیانە. شتێکی سروشتی بوو خەڵکی ئەم دەستوورە پۆشاکە بە شێوەیەك لە شێوەکانی پێشکەوتن تێبگات[234].

**دووەم:**

پێکهاتەی فرەچەشنی کەرکوك و بوونی کۆمەڵە دانیشتووانی جوو، کلدانی و ئەرمەنی و ئاشووری و کاریگەربوونیان بە کولتووری ئەورووپی و لاساییکردنەوەی دەستووری شێوە پۆشاکی ئەورووپی، بە تایبەت لەلایەن گەنجەکانیانەوە، تا رادەیەکی بەرچاو ئەم جیاوازییە کۆمەڵایەتییەی لەنێو شاری کەرکوك لە پایەی ئافرەت و روانگەی کۆمەڵ هێنابووە کایە.

(کاکە مەم بۆتانی) کە لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم ساڵانێك ژیانی لە شاری کەرکوك بردووەتەسەر، دەربارەی ئەم باسە لە بیرەوەرییەکانیدا لە چەند شوێنێك ئاماژەی پێداوە. ناوبراو دەربارەی کۆمەڵە دانیشتووانی مەسیحیی کەرکوك نووسیویەتی: "دیانەکانی عەرەفە، سەربەست و ئازاد بوون، ئافرەتەکانیان بێ عەباو پەچە بوون، ئێواران میکیاجیان دەکردو لەناو باغچەی بێ دیواری ماڵەکانیان دادەنیشتن و گۆرانیان لێدەدا، کورو کچیان بە شەقامەکانی گەرەکی عەرەفەدا پیاسەیان دەکرد.." [235].

**سێیەم:**

وەك (فازڵ عەزاوی) بۆی چووە، رەنگە کاریگەرییە عیلمانییەکانی تورکیا کە لەلایەن (مستەفا کەمال ئەتاتورك) ەوە (١٨٨٣-١٩٣٨) هەڵنرا، فاکتەرێك بێت لە جیاوازیی روانگەی خەڵکی کەرکوك و رێزگرتن لە رووخسارە سەردەمییەکان و رەچاوکردنی هەموو ئەو شتانەی گوزارشت لە نوێگەری و شارستانێتی و شارنشینی دەکەن. بەو پێودانەی بەشێك لە دانیشتووانی شاری کەرکوك تورکمانن و ئەو هەنگاوانەی تورکیاش کاریگەری و شوێن پەنجەی دیاری بەسەر رۆشنبیرانی تورکمانی عێراقەوە نواندووە[236]. شایەنحاڵێکی دیکەش لەم بارەوە نووسیویەتی: ".. کچی مامۆستا و فەرمانبەرە سەربەستەکان، بێ پەچە، عەبایان دەپۆشی.." [237].

*** تەوەری دووەم:**

**دابونەریتو بیروباوەڕە كۆمەڵایەتییەكان:**

دابونەریت وەك پێناسە كراوە بریتییە لە "بەرجەستەبوونی كرداریی ڕەفتاریی گشتیی كۆمەڵ". واتە بەو مانایەی دابونەریتە كۆمەڵایەتییەكان گوزارشتە لە پێوەرە كۆمەڵایەتییەكان كە بەشێكی سەرەكیین لە پێكهاتەكانی ڕۆشنبیریی كۆمەڵگە(٢٣٨).

كۆمەڵگە مرۆییەكان لە ڕەوتی مێژووییەنەی خۆیاندا بەهاو شێوە ڕەفتارێكی دیاریكراو بەدەست دەهێنن، كە كۆمەڵێك فاكتەری مێژوویی، ئابووریو سیاسی، لەسەر ئاستەكانی ناوخۆو دەرەكیدا پشكداری لە دروستبوونیاندا دەكەنو نەوە دوای نەوە بە یەكی دەسپێرنو بە (دابونەریتی كۆمەڵایەتی) ناوزەدیان كردووە(٢٣٩).

**أ. دابونەریتە كۆمەڵایەتییەكان:**

سەبارەت بە دابونەریتەكانی نێو كۆمەڵگەی كەركوكی لە سەردەمی پاشایەتی جیاوازییەكی ئەوتۆ لەگەڵ سەردەمی پێشوو بەدی ناكرێت، چونكە دابونەریت وەك لە سەرەوەدا ئاماژەی پێدرا بە كۆتایی قۆناغێكو دەستپێكردنی قۆناغێكی دیكە لە هزرو زەینی ڕەمەكی خەڵك كاڵ نابێتەوە، بۆیە زۆرێك لەو دابونەریتانەی لە شاری كەركوك لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢١-١٩٥٨)دا لە ئارادا بوون، دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی عوسمانیو هەندێكیان زۆر لەوەش كۆنتر بوون(٢٤٠)، وەك لەمەودوا باس لە هەندێكیان دەكەین.

یەكێك لە دابونەریتە دیارەكانی كۆمەڵگەی كەركوك بریتیبوو لە سەروەربوونی گیانی لێبوردەییو ڕێزگرتن لە خەڵكی لایەدەو نانبدەییو دەستگیرۆیكردنو میوان نەوازی. لەم بارەوە (سۆن) پەنجەی سەرنجی بۆ درێژ كردووەو ئەم دابونەریتانەش گوزارشت بووە لە دابونەریتە كۆنو بەرچاوەكانی دانیشتووانی كەركوك(٢٤١).

سەردانیكردنی مەزارو گۆڕی پیاوچاكانو زانایانو كەسایەتییە ئایینییە بەناوبانگەكان لە پێناو دوعاو پیرۆزی، یەكێك لە دابونەریتە باوەكانی خەڵكانی شاری كەركوكە.

هۆیەكانی سەردانیكردنی ئەو مەزارو گۆڕانە بە مەبەستی بەدیهاتنی ئاواتو ڕازەكانیان، بە تایبەت لە كاتی تەنگیدا. ئەم لایەنە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، كە دانیشتووانی كەركوك لەو سەردەمەدا باوەڕێكی بەهێزو توندوتۆڵیان، بە هۆی كاریگەریی ئایینی، بە پیاوچاكانو شێخو پیاوانی ئایینی هەبوو(٢٤٢).

لە ئەنجامی دێرینیو بوونی مەزارو گۆڕی زۆرێك لە پیاوچاكانو كەسایەتییە ئایینییەكان لە شاری كەركوكدا، دابونەریتی سەردانیكردنی ئەو مەزارو گۆڕانە لەنێو دانیشتووانی شاردا بە شێوەیەكی بەربڵاو تەشەنەی كردبوو. تەنانەت لە ئاكامی هێزی كاریگەرییە ئایینییەكان، زۆرێك لە دەستوورو ڕێورەسمە ئایینییە جیاوازەكان، بە تێپەڕینی كات شێوەی گشتگیریان وەرگرتبوو. بۆ نموونە بەشێكی بەرچاوی موسڵمانەكان هاوشانی جووەكان ڕۆژانی شەممە، بۆ دوعاو پیرۆزیو بە مەبەستی بەدیهاتنی ڕازو نیازیان، سەردانی مەزارو گۆڕەكانیان دەكرد، لەنێو ئەو شوێنو گۆڕانەش گۆڕی (دانیاڵ) پێغەمبەرو گۆڕی هاوڕێكانی لەو شوێنو مەزارە گرنگانە بوون. بە هەمان دەستوور موسڵمانەكانی كەركوك ڕۆژانی چوارشەمموانیش، بە شێوەیەكی باو، سەردانی مەزارو گۆڕی پیاوچاكەكانیان كردووە(٢٤٣).

باوبوونی سەردانیكردنی گۆڕی شێخو پیاوچاكانو مەزاری پێغەمبەران لەنێو دانیشتووانی شاری كەركوكدا لە ماوەی دیاریكراوی لێكۆڵینەوەكەدا، زۆرێك ڕێورەسمی پێوەنووساوەو خەڵكی بۆ بەدیهاتنی مەبەستو ڕازونیازیانو پیرۆز وەرگرتن چوكلێتو نوقڵو خواردنو خواردنەوەیان لەسەر مەزارو گۆڕەكان دەبەخشییەوە. ئەم دابونەریتە ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت لە شاری كەركوك بەرچاو دەكەوێتو بەردەوامێتی هەیە.

كاریگەرییە ئایینییەكان لە شاری كەركوكدا هەر لە چوارچێوەی سەردانیكردنو نزاو پاڕانەوەی دانیشتووان نەبووە بۆ حاسڵبوونی مرازیان، بەڵكو لایەنی دیكەشی بەخۆوە گرتووە، لەوانە پەنابردن بۆ شێخو مەلاو پیاوچاكان، چ زیندوو بن چ مردوو، لە پێناو چارەسەركردنی هەندێك نەخۆشیی تایبەت، وەك: نەخۆشییە دەروونییەكان، نەخۆشییەكانی پێست، نەخۆشی نەزۆكیو مندالبوون (بە تایبەت بەسك كەوتنی كور لەلایەن ئافرەتانەوە)و.. هتد(٢٤٤). هەندێك لە خێزانەكانی شاری كەركوك بۆ ئەوەی منداڵەكانیان لە ئیرەیی بەدوور بێت سەردانییەكێك لە گۆڕەكانی (سوڵتان مەوجوود)و (ئیمام ئەحمەد)و (ئیمام محەمەد)یان دەكردو میروویەك یان خەناوكەیەكیان بە ملی منداڵەكە دەكرد. ئەگەر بیانویستایە ترس لە منداڵەكانیان دەركەن، قورقۆشمیان دەتاواندەوەو لەسەر سەریدا لەناو جامێك ئاودا ساردیان دەكردەوە وێنەو شێوەی چی دەرچوایە دەیانوت لەوە ترساوە(٢٤٥).

هەر سەبارەت بە دابونەریتە كۆنەكانی دانیشتووانی كەركوك نووسەرێكی هاوسەردەم لەم بارەوە نووسیویەتی: "نووشتەی: چاوەزار، خۆشەویستی، ڕەشكردن، بەستنی ژنو مێرد.. لەناو ژنانی كوردو توركمان دەوری دەدی. هاواری (یاقریب الفرج) لە سەربانی مزگەوتەكان دەبیسرا. شێخی نووشتەكەر، نانی كەوتبووە ڕۆنەوە. هەفتەی ڕۆژێ دەچوونە سەر گۆڕی شێخو مشایەخ، قوفڵی ئیمام قاسمو ئاخۆر حوسێن ڕادەوەشێنرا. كتێب گرتنەوە. دەست خوێندنەوە بەخت گرتنەوە لەناو ژنە موسڵمانەكانا زۆر باو بوو. دووشەموانو پێنج شەموان، گۆڕستانەكان ڕەش دەچۆوە. پاش گریانو لاواندنەوە.. دەبووە یانەو دیوەخانی ژنانو قسەو قسەڵۆك"(٢٤٦).

دابونەریتێكی بەرچاوی دیكەی دانیشتووانی شاری كەركوك لە سەردەمی پاشایەتیدا بریتیبوو لە نەزركردن، واتە پەیمانو بەڵێندانی چاكەیەك ئەگەر هاتوو ڕازەكەی هاتەدی. لە نموونەی نەزرەكانی دانیشتووانی شاری كەركوك: نەزریان دەكرد (ئەگەر كوڕیان ببێت ئەوا لە حەوت دەرگا سواڵ دەكەن)، یان لە كاتی نیشانی كچان دەیانوت: (مارەییم

ناوێت چونکە نەزرم کردووە بە جگەرەیەك دەیدەم). هەروەها شەوانی هەینی مۆمیان لە (ئیمام عەبباس)و (قەرەقاج)و (سەیید خالید)و (موسەللا)و (مەیدان)و گەرەکەکانی دیکە دادەگیرساند گوایە نەزریان کردووەو زۆر بابەتی سەیرو سەمەرەی دیکە[٢٤٧].

هەرچی دابونەریتی کەمە ئایینییەکانی شار بوو، جیاوازییەکی گەورەی ئەوتۆیان لەگەڵ زۆرینەی دانیشتووانی موسڵمانی شاری کەرکوکدا نەبوو، جگە لە هەندێك ڕێورەسمی ئایینی تایبەتو ڕێنمایی ئایینی نەبێت. بۆ نموونە ئاو بە نێوچەوان داکردن (تعمید) لە لای کۆمەڵە دانیشتووانی کلدانیو ئەرمەنەکانو ئاشوورییەکان (مەسیحییەکان) کە تایبەتە بە منداڵی تازە لەدایکبوو، لە دوای یەك دوو مانگ لە کڵێسادا ڕێورەسمی ئایینیی تایبەتی لەو بارەوە بۆ ساز دەکرێت[٢٤٨].

کۆمەڵە دانیشتووانی جوو لە ئاکامی کۆمەڵێك دابونەریتو ئاساو پڕوپووچی وابەستە بە ژیانی کۆمەڵایەتییانەوە، هۆیەکی دیاری گۆشەگیربوونیان بووە لە کۆمەڵە دانیشتووانەکانی دیکە. ئەمەش زۆرینەیان پەیوەندی بە حاخامەکانو پیاوانی ئایینییان هەبووە، کە داکۆکیکردنو جەختکردنەوە لەسەر ڕێنماییە ئایینییەکان لە ڕادەی دەسەڵاتی ئەوانی زۆر کردووە[٢٤٩].

**ب. بیروباوەڕە میللییەکان:**

لەنێو کۆمەڵگەی کەرکوکی لە ماوەی پاشایەتیدا کۆمەڵێك بیروباوەڕی میللی بەنێو دانیشتووان بڵاوبووە کە شوێن پەنجەیان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی دانیشتووانی شاری کەرکوك داناوە. یەکێك لەو بیروباوەڕانە بریتیبوو لە باوەڕبوون بە فاڵو کتێب گرتنەوەو سیحرو جادوو. ئەمانە لەنێو دانیشتووانی کەرکوکدا بە شێوەیەکی باو بڵاو بووەتەوە. بە تایبەتی مەبەست لەو کارەیان بۆ نەخۆشیو منداڵو پێداویستی دیکە بووە[٢٥٠]. هۆی باوبوونی باوەڕبوونی بەشی زۆری دانیشتووانی شاری کەرکوك بە فاڵو کتێب گرتنەوەو تەلیسم بۆ چەند فاکتەرێك دەگەڕایەوە، لەوانە: بەهێزیی پڕوپووچە ئایینییەکانو کاریگەرییان بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی دانیشتووانەوە ئەوەش لە ئاکامی زۆری ڕێبازە ئایینییەکانو بوونی دەیان تەکیەو خانەقای هەمەچەشن. هەروەها کاریگەری بیروباوەڕی کەمە ئایینەکانی شاری کەرکوك بەسەر زۆرینەی دانیشتووانی کەرکوکەوە، بە تایبەت باوەڕی بەهێزی جووەکان بە سیحرو فاڵو کتێب گرتنەوە[٢٥١] شوێن پەنجەی لەسەر کۆمەڵگەی کەرکوکی داناوە.

پێویستە ئەوە بوترێت کە فاکتەری ئایینیو مێژووی هاوبەشو کۆمەڵێك بەرژەوەندی هاوبەش لەنێو پێکهاتە جیاوازەکانی دانیشتووانی شاردا وایکردبوو کولتوورێکی هاوشێوەو نزیك لە یەکتر لە شاری کەرکوکدا دروست بێت. بۆیە زۆرێك لە بیروباوەڕە میللییەکانی شارەکە لەلایەن پێکهاتە جیاجیاکانی دانیشتووانەوە بە هەند وەرگیراوەو جەختیان لەسەر کراوەتەوە. نموونەو گەواهی دروستیی ئەم باسە ڕەنگە لە حیکایەت فۆلکلۆرییەکانو گۆرانیو پەندە میللییەکانو ئەفسانەکانو بڕێك پڕوپووچدا لە شاری کەرکوکدا ببینرێت[٢٥٢].

لە نموونەی ئەو پڕوپووچانەی بە نێو دانیشتووانی شاری کەرکوکدا بڵاو ببۆوە فیکەلێدان لە ئێواران دەبێتە هۆی بانگکردنی شەیتان یان باوەڕیان وابوو کە شەیتانو جنۆکەکان لەناو کۆسپەی دەرگاکانن (عتبات المنازل)، بۆیە دەترسان بەسەریدا بڕۆن. هەر چەندە ئەم پڕوپووچانە تایبەت بوون بە کۆمەڵە دانیشتووانی جوو[٢٥٣]، کەچی بەنێو پێکهاتە جیاوازەکانی دانیشتووانی کەرکوکدا بڵاو ببۆوە[٢٥٤].

هەندێك لە بیروباوەڕە میللییە باوەکانی دانیشتووانی شاری کەرکوك لە ڕۆژگاری پاشایەتی: گیرانی ڕۆژو مانگ بە مانای داکەوتنی کارەساتە. لە زستانو هاوین مانگ بگیرێت ئەوا باوەڕیان وایە دێو گرتوویەتی، بۆیە هەندێکیان بە تفەنگو هەندێکیان بە تەنەکە دەیانکردە هەرا بۆ ڕاکردنی دێوەکە. ئەگەر مانگ ڕەنگی سوور بوو لە ئەنجامی گیرانییەوە بە مانای بەرپابوونی جەنگو ڕژانی خوێنە. ئەگەر ئاوێنە بشکێت بەڵایەك بەسەر ئەو ماڵە دێت. پرچی ژن چەند جارێك هاتە سەر دەمو چاوی واتە میوانی دێت. ڕشتنی ئاو لە دوای ڕۆیشتنی خۆشەویستان تاکو بە بێ بەڵا بگەڕێتەوە. شەرکردنی چۆلەکە بە مانای هاتنی میوانە. خوێندنی قەلەڕەش بە مانای کاری خێری بەدواوە نییە. ئەگەر سەگ لە شەودا لوراندی بەڵگەی شوومەو خەڵکەکە دەبێت بڵێن: (اعوذ بالله)[٢٥٥].

هەروەها لە بیروباوەڕە میللییەکانی دیکەی دانیشتووانی شاری کەرکوك، ڕاژەندنی لانکی بەتاڵ دەبێتە مایەی سك ئێشەی منداڵ. نەشوشتنی منداڵی تازە لەدایکبوو تا چلەی دەچێت، گسك لێدانی ماڵ بە شەو دەبێتە مایەی دەربەدەربوونی خاوەن ماڵ. بەردگرتن لە دوای میوانی نەخوازراو تاوەکو جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە. بەسەرداکردنی چل جام ئاو بەسەر ئەو کەسەی تاوانی کردووە وەك بەڵگەی ڕاگەیاندنی تەوبەکردن[٢٥٦].

هەرچی بیروباوەڕە میللییەکانی شاری کەرکوك بوو سەبارەت بە باران بارین، چەند شێوەو ڕێگەو باوەڕێك بوو، لەوانە: کاتێك ساڵێك بێ باران بوو بێتو باران لە وادەی خۆی نەباری بێت خەڵکەکە دوعاو نزایان کردووەو خەڵکی بە کۆمەڵ بەشدارییان کردووەو سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبوونو دوا ڕۆژیش دوکانو بازارەکان دەپێچرانەوەو دادەخرانو دەچوونە دەرەوەی شارو قوربانییان دەکرد، مەنجەڵی گەورە گەورەیان لەگەڵ خۆ دەبردو چێشتی بارانیان ساز دەکردو ئینجا نوێژە بارانەیان دەکردو ئیمام جوبەی بەری بە وەرگێڕدراوی لەبەر دەکردو خەڵکەکەش جەمەدانیو کڵاویان لەسەر نەدەکردو دوعایان دەکردو پاشان ڕۆژووەکەیان دەشکاند، هەر کەسێك سەد وردە بەردی کۆ دەکردەوەو لەسەر هەر بەردێك دوعایان دەخوێند[٢٥٧]، لەوانە خوێندنی ئایەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِنْ بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنْشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ﴾[٢٥٨].

شێوەی دووەم بۆ داوای باران بارین بریتیبوو لە بووکە بە بارانێ (کۆسە بەبا)، کە ئەمەش لە بنەڕەتدا بیروباوەڕێکی کۆنی گەلانی ئێران بووەو خەڵکانی دیکە پێی کاریگەر بوونە[259]. ئەم شێوە ڕێگەیە لە زۆرێك لە ناوچەکان باو بووەو گۆرانیی تایبەتی هەبووە:

هەیاران و مەیاران — یاخوا بباریێ باران
بۆ فەقیرو هەژاران — گەنم شین بێ لە چاران[260].

بە تورکمانی دەیانوت:
الله بر یاغیش ایلە — دام دیواری یاش ایلە
پاشا اوغلی گیچندە — قوندرەسن یاش ایلە
آچن عانبار آغزینی — ویرن یاغش پایینی
ویرانی خاتون اولسون — ویرمیان قاطر اولسون[261].

واتە بە کوردییەکەی:
خودایە بارانێ دابکەی — ماڵ و دیوار تەڕ بکەی
ئەگەر کوڕی پاشا تێپەڕی — پێڵاوەکەی تەڕ بکەی
دەمی عەمبار بکەنەوە — بەشی باران ببەخشن
ئەوەی دەیدا ببێ بە خاتوون ئەوەی نایدا ببێ بە هێستر

شێوەی ڕێگەی سێیەم، کۆمەڵە منداڵێك کە تەمەنیان لەنێوان (٧-١٠) ساڵیدایە لە شەو یان ڕۆژدا دوو داریان وەکو خاچێك لێك دەبەست و قوماشێکیان لەسەر دادەنا لە شێوەی جلوبەرگ، ئەو منداڵەی دارەکەی هەڵگرتووە بە تەنی دەموچاوی ڕەش دەکرد، خەڵکی بە گوێرەی توانا پارە یان ئارد یان خورما یان شتی دیکەیان پێدەدان و جام و سەتڵێ ئاوشیان بەسەر ئەو منداڵەی دارەکەی هەڵگرتبوو دا دەکرد. منداڵەکان بە دەم پێکەنین و دوعاوە ماڵەکانی گەڕەك بەسەر دەکەنەوەو گۆرانی دەڵێن. ڕۆژی دواتر، پارەو شتە کۆکراوەکان لە ناو گەڕەك چێشتی باران ساز دەکەن و بەسەر خەڵکی دابەشی دەکەن[262].

*** تەوەری سێیەم:**
**پۆشاك و جەژن و بۆنەکان:**

پۆشاك و جەژن و بۆنەکان هێما و لایەنێکی پڕ بایەخی ژیانی کۆمەڵایەتی هەر نەتەوەو کۆمەڵگایەکە، کە لە ڕۆچنەیەوە خەڵکی دەتوانن ئاشنایەتی لەگەڵ کولتووری نەتەوەیی و ئایینی ئەو نەتەوەیە پەیدا بکەن و پەردە لەسەر لایەنێکی گرنگی بیروباوەڕو کولتوورەکەی هەڵمباڵن.

**أ. پۆشاك:**

پۆشاك ڕوویەکی دیارو بایەخداری جڤاکیەو دەکرێت لە ڕێگەی شارەزابوون لە جلوبەرگی دانیشتووانەوە گەلێك لایەنی کۆمەڵایەتی ناوچەی کەرکوك ڕوون بکرێتەوە، وێڕای ئاشنابوون بە یەکێك لە ناسنامە سەرەکییەکانی نەتەوە جیاجیاکانی شاری کەرکوك.

**١. پۆشاکی پیاوان:**

لە ئاکامی جیاوازیی پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك کۆمەڵە دەستوورێکی جلوبەرگ لە ئارادا بوو، بێگومان جیاوازیی چینایەتیش ڕۆڵی لە زێتر فرەڕەنگبوونی دەستوورەکانی پۆشاك پۆشیندا هەبووە. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی جلوبەرگی پیاوانی شاری کەرکوك لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا (١٩٢١-١٩٥٨)، بەمشێوەیە بووە: "جلوبەرگی بازرگانەکان، شێخ و سەید، دەوڵەمەندەکان.. کەوا و سەڵتە بوو، سەوزەفرۆش بە گشتی کورتەك و شەرواڵ بوو. ئەفەندییەکان قات بوو، هەندێکیان سیدارەیان لەسەر دەکرد"[263].

شێوە پۆشاکی شاری کەرکوك بە تێپەڕینی کات و قۆناغە مێژووییەکان گۆڕانی بەخۆوە گرتووەو خەڵکی ڕۆژ دوای ڕۆژ، بە تایبەت لەلایەن ئەوانەی لە دام‌ودەزگاکانی میری و کۆمپانیای نەوتدا کەوتنەکار، مەیلیان بە لای شێوە دەستووری بەرگی ئەوروپیدا بووە (قات، چاکەت و پانتۆڵ و هەندێکجار سیدارە)، چونکە وەك داب و عورفێکی فەرمی دەبوو ئەوانەی لەو چەشنە شوێنانە کار دەکەن و خاوەن وەزیفەن ئەو پۆشاکە بپۆشن، بۆیە ئەمە کاریگەری لەسەر کاڵبوونەوەی شێوە جلوبەرگی ترادیسیۆنی (یان میللی) پیاوانی شاری کەرکوك هەبووە، بە تایبەتیش لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا و خەڵکی ڕوویان لە بەرگی فەرمی (ئەوروپی) کردووە[264].

لەنێو ئەوانەی کاریگەری گەورەی لەسەر گۆڕانی پۆشاکیان هەبوو، شێوە جلوبەرگی کۆمەڵە دانیشتووانی کلدان و ئەرمەن و جووەکان بوو[265]. شیاوی باسە ئەم هاوشێوەبوونەی دەستووری جلوبەرگە لەگەڵ دەستووری پۆشاکی ئەوروپی لەلایەن کەمە ئایینییەکانەوە مایەی تورەیی پیاوانی ئایینی ئەوانە بووە، بە تایبەتی حاخامەکانی جوو، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەستیپێکردبوو[266].

جلوبەرگی پیاوانی کورد بریتیبوو لە "کەواو سەڵتەی فەقیانەدار، دەرپێی درێژی خام، مشکی و جامانی و کڵاو و پشتێن. هەروەها ڕانك و چۆخە بە دوو شێوەکەی بادینی و سۆرانی: کڵاو جەمەدانی، یان مشکی، پشتێن، زۆرجار فەرەنجی، یا پەستەك لەسەر چۆخەوە لەبەر دەکرێ، ئەم جلوبەرگە ڕەسەنانە، کورد بە جوانی و شانازییەوە لەبەری دەکەن و پێی دەردەکەون"[٢٦٧]. میللەتی کورد هەر لە کۆنەوە بۆ خۆپاراستن لە گەرمای هاوین یان سەرماو بەستەڵەکی زستان چەند کەلوپەلێکی بەکارهێناوە بۆ داپۆشینی سەری، لە هەندێ حاڵەتی تردا سەرپێچ (مێزەر) وەك کەلەپوورێکی نەتەوایەتی پارێزراوەو لەسەر نراوە، ڕاستییەکی بەڵگەنەویستیشە کە هەر میللەتێك لە ڕێگەی سەرپێچ و چۆنیەتی لەسەرنانی و ئەو نیشانانەی کەوا پێیانەوەیە لە میللەتانی تر جودا کراوەتەوە، بە گوزاشتێکی دیکە هێمای نەتەوایەتی و ناسینەوەی میللەتێك گەلێك جار دەکرێت لە ڕێگەی سەرپێچەوە (مێزەر) هەست پێبکرێت[٢٦٨].

پۆشاکی پیاوانی کورد لە شاری کەرکوکدا، لە بنەڕەتدا لە جەمەدانی و ڕانك و چۆخە، کورتەك و شەرواڵ پێکدێت، کە زێتر لە ناوچەی کەرکوك بە شەرواڵ و مرادخانی ناودەبردرێت. شەرواڵ و مرادخانی دەتوانرێت لە زستان و هاویندا پێچەوانەی ڕانك و چۆخەی ناوچەی سلێمانی لەبەر بکرێت و شێوەی دروونی بە گوێرەی چینە کۆمەڵایەتییەکان و ناوچەی جوگرافی جیاوازی هەیە[٢٦٩].

لە چوارچێوەیەکی گشتییدا، پێکهاتەکانی جلوبەرگ و پۆشاکی پیاوانی کورد لە شاری کەرکوك بریتیبووە لەمانە:

١. **کەوا:**

بریتییە لە پۆشاکێکی درێژ تا سەر پاژنەی پێ و بێ یەخەیەو دەبێتە دوو بەش، لە ناوەڕاستەوە کراوەیە تا خوارەوە، کە بریتییە لە سێ پارچە، دواوەی پارچەیەکەو ئەملاو ئەولای هەر یەکەی پارچەیەکە. قۆڵی کەوا درێژە تا سەر دەستەو سەرقۆڵەکانی کراوەیە، لە چەند شوێنێکدا قۆپچەی هەیە بەکار دەهێنرێت بۆ بەستنەوەو لێك گرێدان، بە تایبەت لە پێشەوە نزیك بە ناوك قۆپچەیەك هەیە بۆ ئەوەی هەردوو لای کەواکە بێتەوە یەك بۆ بەستنی پشتێن کە لەملاو ئەولای کەواکە کراوەیە[٢٧٠].

٢. **سەڵتە:**

چاکەتێکی ئاخنراو بە لۆکەیەکی تەنك و لە ناوەوە بەرگی بۆ کراوە، زۆر کات بەرگەکەی لە خام دروستکراوەو درێژی سەڵتە زۆر نییە تا سەر پشتێنی دەگاتەوەو دوو قۆڵی درێژی هەیە، بەڵام فراوان نییە. سەڵتە لە ناوچەی کەرکوك لەسەر کەواوە لەبەر دەکرێت.

٣. **کورتەك:**

بەرگێکی سەرەوەیەو لە زوودا بەلۆکە ناوئاخن دەکرا، کورتەك قۆڵەکانی درێژەو بە جەستەوە نووساوە.

٤. **مورداخانی و ستارخانی:**

ئەمە بەرگێکی نوێیە سەبارەت بە ناوچەی کەرکوك، زیاتر لە سییەکانی سەدەی بیستەمەوە دەرکەوتووە.

٥. **شەرواڵ:**

بریتییە لە بەرگێکی کراوە لە بەشی سەرەوە هەتا بەرەو خوار بچێت تەسك دەبێتەوەو لە بەشی لای سەرەوە بە (دۆخین) دەبەسترێت. شەرواڵ زێتر لەگەڵ بەشی سەرەوەی پۆشاکدا یەك ڕەنگ دەبن[٢٧١].

٦. **دەرپێ:**

لەژێر کەواوە لەبەر دەکرێت و ڕەنگی سپییەو لە خام یا کودەری دروست دەکرێت و لە شێوەی شەرواڵ دایە، زۆرجار لە کاتی سەرماو سۆڵە لەژێر شەرواڵیش لەبەر دەکرێت.

٧. **کراس:**

بە هەمان شێوە ڕەنگی سپییەو پشت ملی کورتەو دوو قۆڵی هەیەو فەقیانەدارە.

٨. **فەقیانە:**

پارچە بەرگێکی کوردانەی ڕەسەنە، فەقیانە هەندێکجار سەربەخۆو زۆرجاریش بە کراسەوە دەلکێنرێت. پەڕۆیەکی ڕەنگی سپیی دەقکراوەو لەسەرەوەی باسکی خۆیان دەیپێچن. فەقێیانە لە ئارمووش یان لە (نایلۆن) دروست دەکرێت.

٩. **پشتێن:**

پارچە قوماشێکی تایبەتە، لە بەشی پشت لەسەر پۆشاك دەبەسترێت و ڕەنگیشی بەپێی زەوق و ئارەزوو دەگۆڕێت. درێژی نزیکەی سێ مەتر دەبێت. شێوەی بەستن و دانانی لە هۆزێکەوە بۆ یەکێکی دی و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی جیاوازە.

١٠. **کڵاو:**

لە دەزووی لۆکە دەچنرێت کە زۆرتر ڕەنگی ڕەشەو خاڵ خاڵ سپی تێدایەو هەندێکجاریش ڕەنگی تری تێدا بەکار دەهێنرێت. کڵاو لە شێوەی نیوەی سەرووی کەللەی سەر بە شێوەیەکی خڕ دروست دەکرێت و دەخرێتە ژێر مشکی یا جەمەدانی.

١١. **مشکی و جەمەدانی:**

جەمەدانی قوماشێکی ڕەش و سپییەو مشکیش ڕەش و بۆری کاڵە، هەردووکیان ڕێشوویان پێوەیەو بە هەردوو لادا شۆڕبوونەتەوە. شێوازەکانی بەستن و بادانی جەمەدانی و میشکی جۆراوجۆرن و هەر ناوچەو هۆزێك بە شێوازێکی تایبەت دەیبەستن. (ئیدمۆندز) گوتەنی کەسی شارەزا لە ڕێگەی بەستنی مشکی و جەمەدانی سەری پیاوانەوە دەتوانێت ناوچەو هۆزی ئەو کەسە بناسێتەوە کە جەمەدانی لەسەرناوە[٢٧٢].

١٢. **عەبا:**

لەسەر جلوبەرگەوە لەبەر دەکرێت و زیاتر لەلایەن خانەدانەکان و دەوڵەمەندەکانەوە بەکار دەهێنرا.

١٣. **کەوش- کڵاش:**

جۆری بەکارهێنانی کڵاش لە دەزووی سپی یان ڕەش دەچنرێت و بنەکەی لە پەڕۆیەکی قایم دروست دەکرێت، کە زۆرتر لە هاوین و بەهاراندا بەکار دەهێنرێت. هەرچی کەوشە ئەویش لە پێستەی قایم دروست دەکرێت و زۆر لە کڵاش قایمترەو بەرگەی سەرماو تەڕبوون دەگرێت و شێوەکانی جۆراوجۆرە، هەندێکیان لە پێشەوە یا لە دواوە خاوەن

نووکی تیژو درێژن[٢٧٣].

هەرچی شێوە جلوبەرگی پیاوانی تورکمانە، لە ڕاستیدا لە ڕووکەشدا جیاوازییەکی گەورەی ئەوتۆ لێی بەدی ناکرێت لەگەڵ دەستووری پۆشاکی بەشێکی کوردان، وەك ئەوان کەواو سەڵتە دەپۆشن و جەمەدانی لەسەر دەنێن[٢٧٤]. بەڵام جلوبەرگی ترادیسیۆنی تورکمانەکانی شاری کەرکوك لە زۆر باردا بریتیبوو لە دیشداشە (جلباب)و زەبوون(*) و لە وەرزی زستانیشدا لەگەڵ ئەم پۆشاکە چاکێت لەبەر دەکرێت و زەبوون و چاکێتەکەش لە هەمان ڕەنگ و جۆری قوماش دەبێت[٢٧٥].

شێوە دەستووری پۆشاکی ترادیسیۆنی پیاوانەی عەرەبەکانی شاری کەرکوك لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بریتیبوو لە پۆشاکی کۆن و ناسراوی عەرەبی[٢٧٦]، کە بریتییە لە دیشداشەو عەگاڵ و کۆفی[٢٧٧]. هەرچی شێوە جلوبەرگی کلدانەکان بوو ئەوا تێکەڵەیەك بوو لە دەستوورەکانی پۆشاکی کوردی و تورکمانی و عەرەبی و دانیشتووانی عێراق[٢٧٨].

٢؛ پۆشاکی ئافرەتان:

پۆشاکی ترادیسیۆنی زێتر لەنێو ئافرەتان باو بوو ئەوەش لە ئاکامی کەمتر تێکەڵبوونیان بە ژیانی فەرمی و بەریەککەوتنیان لەگەڵ ڕووخسارە نوێیەکانی ژیانی بەناو پێشکەوتووی ئەورووپییەوە، بۆیە ئافرەتان پێکهاتە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی کەرکوکی مۆرکی جلوبەرگی باب و باپیرانی خۆیان پاراستبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وردە وردە لەنێو کیژان و ئافرەتە گەنجەکاندا مۆدیلی ئەورووپی لە کۆمەڵگەی کەرکوکی لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتیدا بەرچاو دەکەوت و کەوتوونەتە بەر تیرو توانجی ئافرەتە بە تەمەنەکان[٢٧٩].

پۆشاکی ئافرەتانی کورد بریتیبوو لە (ئاوەڵکراس، ژێرکراس، کراس، سوخمە، سەڵتە یا کوڵەنجە، کەوا، کڵاو، دەسماڵ و کەوش) [٢٨٠]. هەرچی ئافرەتانی تورکمان بوون ئەوا لە شێوەی کراسی ئافرەتی کورد، بەڵام کورتتر، لەبەریان دەکرد[٢٨١]. پێکهاتەکانی پۆشاکی ئافرەتانی تورکمان بریتیبوون لە: (کراس، سوخمە، پشتێن، کڵاو (هەبری)، کەوش)[٢٨٢]. ئەو پۆشاکە بە شێوەیەك دروست دەکرا کە لەگەڵ کەش وهەواو داب ونەریتی ناوچەکە بگونجێت[٢٨٣]. ئافرەتانی عەرەبیش زێتر دیشداشەو زەبوون و (مەلفەع) پۆشاکیان بوو[٢٨٤].

سەبارەت بە پۆشاکی ئافرەتانی کەمە ئایینییەکانی شاری کەرکوك بێت لە ڕۆژگاری پاشایەتی، ئەوا لە ڕووی پۆشاکی سەردەمەوە جیاوازییەکی گەورەیان لەگەڵ پۆشاکی ئافرەتانی دیکەی پێکهاتەکانی دیکەی دانیشتووانی کەرکوکدا نەبوو. بە تایبەت لە نێو چینی ناوەڕاست و سەرووی کۆمەڵگەوە پۆشاکی نوێی ئەورووپی ڕەواجی زۆری لەنێو ئافرەتەکانی کەرکوك پەیدا کردووە[٢٨٥].

ب. جەژن و بۆنەکان:

جەژن و بۆنە ئایینی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکانی هەر ناوچەو شارێك لایەنێکی گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێت و لە ڕۆشنایی ئەو جەژن و بۆنانەوە ئاشنایەتی لەگەڵ کولتووری نەتەوەیی و ئایینی پەیدا دەبێت.

١. جەژن و بۆنە ئایینییەکان:

کۆمەڵگەی کەرکوکی لەبەر ئەوەی پێکهاتەی ئایینی و نەتەوەیی جۆراوجۆر بوو، بۆیە کۆمەڵێك جەژن و بۆنەی ئایینی جیاجیا هەر لە کۆنەوە تیایدا لە ئارادا بوو، گرنگترین ئەو جەژن و بۆنە ئایینییانەش ئەمانە بوون:

یەکەم: جەژنی ڕۆژنامەو قوربان:

جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان لە سەرووی جەژنە ئایینییەکانی شاری کەرکوکەوە دەهات و دانیشتووانی موسڵمان بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە پێشوازییان لەو جەژنە ئایینییانە دەکردو کوچەو کۆڵان و شوێنە گشتییەکانی شار دەرازانەوەو خەڵکی خۆیان بۆ بەرێکردنی ئەو جەژنانە ئامادە دەکرد. ڕۆژی بەر لە جەژن دەکرایە پشوو، بە تایبەت ئێوارەی عەرەفات خەڵك دەچوونە سەر قەبران و شەوی جەژنیش ژنان چێشتیان ئامادە دەکرد. بەیانیانی جەژن پیاوەکان دەچوون بۆ بەجێگەیاندنی نوێژی جەژن، بچووك دەستی گەورەکانیان ماچ دەکردو گەورەکانیش چاویان ماچ دەکردو جێژنانەیان پێدەدان. وەك پیشە یەکەم ڕۆژی جەژن لە بەشی قەڵاو بەرقەڵاوە دەچوونە بەشی قۆریە، کە دامەزراوەکانی حکومەتی لێیە بۆ پیرۆزبایی جەژن. لە ڕۆژی دووەمیشدا، بۆ ئەو مەبەستە بەشی قۆریە دەچوونە بەشی قەڵاو بەرقەڵا[٢٨٦]. لەو پێناوەشدا موتەسەریفیەتی کەرکوك، بۆ ڕێکخستنی کارەکان و بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمی پیرۆزبایی خشتەیەکی بۆ پێشوازیکردنی میوانان ڕادەگەیاند[٢٨٧].

جگە لە جەژنە پیرۆزەو دابەشینەوەی چوکلێت و شەربەت، ئەو جەژنانە کۆمەڵێك ڕێوڕەسمی دیکەی بەخۆوە گرتبوو، کە زۆرتر تایبەت بوون بە منداڵان و گەنجانە، لەوانە: جۆلانێ و هەندێك یاری دیکەو سواربوونی ئەسپ و گوێدرێژو خواردن و خواردنەوە[٢٨٨].

دووەم: یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر:

یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر (دوانزەی ڕەبیعولئەوەل) بە گەرموگوڕییەکی زۆرەوە لە شاری کەرکوك پێشوازی دەکرا، بۆ بەرز ڕاگرتنی ئەو یادە لە شاری کەرکوك هاوشێوەی شاری هەولێر مەولوود دەخوێنرایەوەو کۆڕی ستایش ڕێکدەخرا. دەسەڵاتدارانی شارەوانی چەند ڕۆژێك پێشتر شەقامەکانی شاریان دەرازاندەوە. تەنانەت یەکێك لە چالاکی قوتابخانەکانی کەرکوك لەو ماوەیەدا بریتیبووە لە یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر بە سازکردنی ئاهەنگ و بانگهێشتکردنی بەرپرسانی مەعاریف و وتار خوێندنەوە[٢٨٩].

هەروەها بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی کەرکوك پێشوازییەکی گەرمی لەو یادو جەژنە ئایینییە دەکردو بە هاوکاری دەستەی شارەوانییەکانی شاری کەرکوك شاریان بە گڵۆپ و

ئالای عێراقی دەرازاندەوەو کۆرو کۆبوونەوەی خوێندنەوەی ژیننامەی پێغەمبەرو میعراج و مەدح و ستایشی پێغەمبەر لە مزگەوتێکی دیاریکراودا ساز دەدا. لە سالیادی ئەو جەژنەدا بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی کەرکوك لە (دوانزەی ڕەبیعولئەوەلی سالی ١٣٧٤ کۆچی، بەرانبەر بە نۆی تشرینی دووەمی ١٩٥٤) لە مزگەوتی حاجی عەبدولرەزاق نەوتچی مەنقبەیەکیان ڕێکخستووەو خەلکێکی زۆر ئامادەی بوون[٢٩٠].

سەبارەت بە خوێندنەوەی مەولوودنامە لەلایەن کەرکوکییەکانەوە شێوازێکی تایبەتی وەرگرتووەو خەلکانی کەرکوکی پێ ناسراوە، بە تایبەت خۆشخوێنە تورکمانەکان بەوە دەناسرێنەوە کە تام و بۆیەکی تورکی پێوەیەو خەلکانی دیکەش پێی کاریگەر بوون لە ناوچەکانی دیکەی عێراق[٢٩١]. هەرچی جەژن و بۆنە ئایینییەکانی مەسیحی و جوولەکان بوو، لە ڕاستییدا هەمان ئەو جەژن و بۆنانە بوون کە لە ناوچەکانی جیهاندا هەبوو. گرنگترین جەژنە ئایینییەکانی مەسیحییەکان بریتیبوو لە جەژنی لەدایکبوونی حەزرەتی مەسیح و سەری سالی زایینی[٢٩٢]. بەلام لەبەر ئەوەی مەسیحییەکان لە شاری کەرکوکدا کەمینە بوون و ژمارەیان زۆر نەبوو، بۆیە ئەو جەژنە لەلایەن زۆرینەی دانیشتووانەوە پێشوازی لێ نەدەکراو سالانە ئاهەنگ و شەقامەکانی بۆ نەدەرازێندرایەوە[٢٩٣]. هەرچی جەژن و بۆنە ئایینییەکانی جوو بوو، وەك: جەژنی بەناوبانگی (الفصح)[*]Passoverواتە جەژنی گەورەی جوولەکان، لە شارەکانی عێراق، بە تایبەت بەغدادی پایتەخت بە پۆشاکی سپییەوە دەچوونە دەرەوەو کۆمەلێك ڕێورەسمی تایبەتییان هەبوو[٢٩٤].

**٢. جەژن و بۆنە نەتەوەیی و کۆمەلایەتییەکان:**

**یەکەم: جەژنی نەورۆز:**

جەژنی نەتەوەیی نەورۆز (بیست و یەکی ئادار)، کە تایبەت بوو بە کوردەکان و سەری سالی کوردییە، سالانە لە شاری کەرکوك لەلایەن کوردەکانەوە بە خۆشییەوە ساز دەکرا. نووسەرێکی کورد پێی وایە "هەر لەو ماوە مێژوویییەشدا بوو کە نەورۆز لە یادو بۆنەیەکی سروشتی و ئاساییەوە دەبێتە سیمبول و هێما بۆ نەتەوەو وەك جەژنێکی نەتەوەیی دەناسرێت. لەوانەیە هۆنراوەکەی عەبدولخالق ئەسیری کە لە.. گۆڤاری (زار کرمانجی)دا بلاویکردووەتەوە سەرەتایەکی گرنگی ئاساندنی نەورۆز بێت وەك جەژنێکی نەتەوەیی"[٢٩٥]..

هەرچەندە لەو ڕۆژگارە یادکردنەوەو بەرزراگرتنی ئەو ڕۆژە لەلایەن دەسەلاتدارانی پاشایەتی قەدەغە کرابوو، کوردەکان ئازادانە نەیاندەتوانی بەشداری لە ڕێورەسمی ئەو جەژنەدا بکەن، بەلام کوردەکانی کەرکوك جۆش و خرۆشێکی زۆریان بۆ ئەو جەژنە نەتەوەییە هەبووە. لەم بارەوە (کاکە مەم بۆتانی) کە بۆ خۆی یەکێك لەو کەسانە بووە بەشداریان لە جەژنی نەورۆزی کەرکوکدا کردووە، بەمشێوەیە باری ئەو جەژنە لە شاری کەرکوك و یادکردنەوەیدا تۆمار کردووە: ".. داگیرکەرانی بەریتانی و کۆمپانیای نەوتی، شاگردە عەرەبەکانیان، بە هەموو توانایی هەولیان داوە ئاگری پیرۆزی نەورۆز، گڕی نەمری باباگورگور لە ئامێز نەگرێ. هەر جارە بە بیانوێ، هەر سالە لەبەر شتێ.. ئاوی قینیان بە ئاگریا کردووە. ئەگەر لە شارەکانی تری کوردستانی باشوورا، لەسەر چالاکی نەورۆز یەکێك هەفتەیەك بەند بکرێ یان دەست بەسەر بێ.. لە کەرکوك (حسنی سلوك) یان لێدەسەندەوەو چەند مانگێکیش دەیان هێناو دەیان برد.. بۆیە، ئەم جەژنە لای کەرکوکیان تاموچێژێکی تری هەبوو"[٢٩٦].

کوردەکانی کەرکوك، هەندێکجار خەلکانی دیکەش لەگەلیان، لە ڕۆژی نەورۆزدا، هەر لە بەیانییەوە دەچوونە دەرەوەی شار. هەندێك بە ڕێگای سلێمانی بلاودەبوونەوە تا قەرەهەنجیر، هەندێکی دیکەیان ڕوویان لە ڕێگای هەولێرو کۆیەو دارەمان دەکرد. هەندێکی دیکەش بەرەو ڕێگای حەویجەو بەغداد دەچوون. هەرچەند خێزانێك لەسەر گردێك یان دەشتێك یان لە بن دارێك دادەنیشتن. چێشتیان ئامادە دەکردو شایی و گۆرانی و هەلپەرکێ ساز دەکرا. زۆربەی دوکاندارو بازرگانەکان دوکانیان دادەخست. فەرمانبەران هەولیان دەدا پشوو وەربگرن[٢٩٧].

**دووەم: ئاهەنگەکانی چواردەی ئەیلوول:**

لە شاری کەرکوك لە ڕۆژگاری پاشایەتی هەموو سالێك شەوی چواردەی ئەیلوول ئاهەنگ ساز دەکراو پێشوازی لە گۆرانی وەرزی سال دەکرا. لە دوای ئەو شەوە خەلك لە سەربان دەهاتنە خوارێ و کوللەو پەردەکانی سەربانیان دەپێچایەوە. گۆزەو شەربەکانیان دەشکاند. بنەچەی ئەم بۆنەیەش بریتییە لە پڕوپووچێکی ناوچەکە، گوایە لە دابێکی کۆنی مەسیحییەکانەوە وەرگیراوەو خەلکانی کەرکوك لاساییان کردوونەتەوە. بەو پێودانەی ئەو ڕێکەوتە جەژنی سەرهەلدانی خاچە (قیام صلیب)، دایکی (قوستەنتین)، کە ناوی (هیلانی)یە هێندێك پیاوی ناردووە گۆڕی حەزرەتی عیسا بدۆزنەوە، لە ڕێگای خۆیاندا ئەو پیاوانە لەسەر هەر گردێك ئاگریان کردووەتەوە. بەو بۆنەیەش خەلکان هەموو سالێك یادی ئەو بەسەرهاتە دەکەنەوەو خەلکانی کەرکوکیش لەگەل ئەواندا ئەو یادە دەکەنەوە[٢٩٨].

**سێیەم: هاوسەرگیری:**

پرۆسەی هاوسەرگیری لە کۆمەلگەی کەرکوکیدا، وەك زۆربەی کۆمەلگە ئیسلامییەکان، بنەرەتی پێکەوەنانی خێزان و یەکەم و کۆنترین ڕێکخستنی کۆمەلایەتییە، کە لە ئاکامیدا کۆمەلگە مرۆڤایەتییەکانی لێ پەیدا بووە[٢٩٩]. ئەم بۆنەیە لەنێو چینە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەلگەدا، جگە لە دیاردەی زێدەڕۆیی لە بەڕێوەبردنی بۆنەکەدا لەلایەن دەولەمەندەکان و دەست بلاوی و درێژکردنەوەی ماوەی بۆنەکە بۆ حەوت شەو و حەوت ڕۆژ، جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو[٣٠٠].

سەبارەت بە جۆرو شێوەکانی هاوسەرگیری لە کۆمەلگەی کەرکوکیدا، بە هەمان شێوەی کۆمەلگەکانی ناوچەکانی دەوروبەری چەند شێوەیەکی هاوسەرگیری تێدا

باو بوو، بە تایبەت لەنێو کوردەکان، لەوانە: هاوسەرگیریی لەنێوان خزمە نزیکەکان نەخوازە لەنێوان ئامۆزاکاندا، کە دابێکی هۆزەکی بوو بۆ ئەوەی ئافرەتەکە نەچێتە دەرەوەی هۆزەکە، هەروەها هاوسەرگیریی ژن بە ژنی، لە ئەنجامی هۆیە ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەکانەوە ئەم جۆرەیان لە ئارادا بوو، چونکە ئەم چەشنە هاوسەرگیرییە شیربایی‌و خەرجییەکی زۆری تێناچێت. شێوازێکی دیکەی هاوسەرگیریی لە شاری کەرکوکدا بریتیبوو لە هاوسەرگیریی لەنێوان بێگانەکان، ئەم شێوازەیان بە رێژە کەمتر بوو، یەکێك لە هۆیەکانی کەمی ئەم چەشنە هاوسەرگیرییە بریتیبوو لەوەی شیربایی‌و خەرجییەکی زۆری تێدەچێت[٣٠١]. تاك‌و تەراش هاوسەرگیری ئاشتەوایی‌و لە بری خوێن هەبوو[٣٠٢].

رێورەسمی هاوسەرگیریی لە شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتی رێورەسمێکی تایبەتی هەبوو. لە زۆربەی کاتدا، رێورەسمی بە مێردانی کچ لە تەمەنێکی زوودا دەست پێدەکات، بە تایبەتیش لەنێو کۆمەڵە دانیشتووانی کوردو جووەکانی کەرکوك[٣٠٣]. هەڵبژاردنی ئافرەتیش رێوشوێنێکی بنەرەتی‌و گرنگە لە پرۆسەی هاوسەرگیری. زۆرجار زاواو بووکە بەچاوی خۆیان یەکدییان نەبینیوە، لە بری ئەوان دایك‌و خوشك‌و پوورەکانیان ئەو کارەیان ئەنجامداوە. پاش دەستنیشانکردنی ئافرەتەکە دەست بە پرسین‌و سۆراغکردنی رەچەڵەك‌و ئایین‌و پێگەی کۆمەڵایەتی خێزانی کچە دەکرێت. تورکمانەکان ئەوەیان بەلاوە گرنگ بوو کە کچەکە بەرچاوو ئامووسدارو لە بنەماڵەی دیار بێت[٣٠٤]. پاش لێبوونەوە لەو کارە لەگەڵ دایکی کچە رێکدەکەون کچە ببینن‌و لە کەموکورییەکانی ئاگادار بن. بۆیە پێناوەکان بە بیانووی ئاوخواردنەوە سەیری کچەکەیان دەکردو لە دەسترەنگینی‌و کابانی کچەیان (بەرگدرووی‌و چێشت لێنان) دەپرسی. هەندێکجار، بە تایبەت کۆمەڵە دانیشتووانی تورکمان، بۆ ئەو مەبەستە داوا دەکەن کچە لە گەرماو ببینن تاوەکو لە ساغی جەستەی دڵنیا بن. هەندێکجاریش پرۆسەی دۆزینەوەو خوازبێنی کچان لە گەرماو دەست پێدەکات. دایك‌و پوورەکان بۆ ناساندنی کچەکانیان کۆمەڵێك دەربرینیان هەبوو، وەك: (باڵا بەرز، لوت فستق، چاوی جوان، برۆ کەوان، دەم بچووك، گەردەن شووشە، وەکو مانگە، هەتا مانگیش چاوی ئەو کچەی نەدیوە)[٣٠٥].

دوای یەکلاییبوونەوەی دەستنیشانکردنی کچە، ژنانی هەردوو خێزان پێکەوە دادەنیشن‌و لەسەر شیربای‌و کارەکانی دیکە رێك دەکەون. پاش رێکەوتن ئینجا شەوی نیشان دێت، لەو شەوەدا پاش مارەکردنی کچە لە کورە لەلایەن مەلای گەرەکەوە، شەکراو بەسەر ئامادەبوواندا دابەش دەکرێت. لە رۆژی دیاریکراودا (دووشەممە یان پێنج شەممە) ئاهەنگی گواستنەوە ساز دەکرێت‌و بووکە بەدەم ئاهەنگەوە بۆ گەرماو دەبردرێت‌و پاش ئامادەبوونی بووکە زاوا بووکە دەبات[٣٠٦].

رێورەسمی هاوسەرگیری بە گواستنەوەی بووکە بۆ ماڵی زاوا کۆتایی نایەت، بەڵکو پاش تێپەرینی هەفتەیەك هەفتانەی بۆ ئەنجام دەدرێت، خزم‌و کەسەکانی بووك‌و زاوا دیاریان بۆ دەبەن‌و ئەوانیش میوانداریییەکی چاکیان دەکەن. داب‌ونەریتیش وا باو بوو بووکە دوای ساڵێك دەگەڕایەوە ماڵە باوانی بە مەبەستی سەردانی[٣٠٧].

بە هەمان شێوەی موسڵمانەکان مەسیحی‌و جووەکانیش ئاهەنگی بووك گواستنەوەیان هەبوو، بەڵام جیاوازییە گەورەکەی نێوانیان بریتیبوو لە بینینی کچەکە لەلایەن کورەکەوە بەر لە قۆناغی مارەبڕین. تەنانەت بەپێی رێنماییە ئایینییەکانی جوو دەبوو کورەکە بەر لە رێورەسمی نیشان ببینێت[٣٠٨]. هەروەها مەسیحییەکان لە رۆژانی یەکشەمموان ئاهەنگی بووك گواستنەوەیان ئەنجام دەدا[٣٠٩]. هەرچی رۆژی بووك گواستنەوەی جووەکان بوو، ئەگەر بووکە کچ بوایە رۆژی چوارشەممە دەبووە رۆژی گواستنەوە، ئەگەریش ئاهەنگی دووەمی گواستنەوەی بوایە (واتە بێوەژن بوایە) ئەوا رۆژی سێشەممە دەبووە رۆژی ئاهەنگی گواستنەوە[٣١٠]. جووەکانیش وەك کوردەکان شیربایییان (مهر) وەردەگرت[٣١١].

**چوارەم: پرسە:**

وەك چۆن لە بۆنە خۆشەکان رێورەسمی تایبەتیان هەبوو لە شاری کەرکوك بۆنە ناخۆشەکانیش رێورەسمی تایبەتیان هەبوو. هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەش، جگە لە مەسیحییەکان، چ بۆنە خۆشەکان چ ناخۆشەکان سەداو دەنگەدەنگێکی زۆری بەدواوە دەهات. ئەگەر کەسێکیان لێ بمردایە ئەوا هاوارو شینێکی زۆری بۆ دەکرا. دراوسێکان لە ماڵی خۆی مردووەکەیان ئەگەر موسڵمان بوایە بەپێی شەریعەتی ئایینی ئیسلام دەشوشت‌و قورئانیان لەسەر دەخوێند. لە کاتێکدا لە شەودا کەسەکە کۆچی دوایی بکردایە هەتا رۆژدەبۆوە قورئانیان لەسەر دەخوێندو ئینجا دەیانبردە مزگەوت‌و نوێژیان لەسەر دەکرد. سێ رۆژ لە مزگەوت پرسەی بۆ دادەنرا. لە رۆژانی تازیەدا ماڵە دراوسێکانی مردووەکە هاوکارییەکی چاکی ماڵی مردووەکەیان دەکردو زۆرجار هەموو خەرجییەکی پرسەیان لە ئەستۆ دەگرت[٣١٢]و خواردنیان بۆیان دەبرد.

لە کاتی پرسەدا، قاوەی تاڵ‌و جگەرە دەبەخشرایەوە. ئەو کەسانەی لە پرسەکەدا بەشدارییان دەکرد دوای خوێندنی سورەتی فاتیحەو تاوێك دانیشتن لە کاتی رۆیشتندا دوعایان بۆ کەسە مردووەکە دەکردو داوای سەبووریيان بۆ کەس‌وکاری مردووەکە دەکرد. لە رۆژی حەوتەمدا، بۆ خێری مردووەکە حەلوا دەبەخشرایەوە، پاش تێپەرینی چل رۆژ بەسەر بۆنەکەدا گۆڕەکەیان بۆ هەڵدەگرتەوە. دوای ساڵێکیش خێراتی بۆ دەکرا (اسقاط)[٣١٣].

پرسەی مەسیحی‌و جووەکانیش لە کڵێسا و کەنیشتەکان بەڕێوە دەچوو. بەڵام ماوەی پرسەی جووەکان حەوت رۆژ بوو. لە ماوەی پرسەدا دراوسێکان هێلکەیان بۆ ئامادە دەکردن بۆ خواردن‌و خواردنی گۆشتیشیان لێ قەدەغە دەبوو[٣١٤]. هەرچی پرسەی مەسیحییەکان بوو لە رووی رێورەسمی پرسەوە هاوشێوەیەکی زۆری لەگەڵ پرسەی موسڵمانان لەنێواندا هەبوو. خەڵکی گەرەك بە کۆمەڵ لەسەر قەبران ئامادە دەبوون بۆ ناشتنی مردووەکەو دواتر لە هۆڵێکی تایبەتی کڵێسا پرسەکە بەڕێوە دەبردرا[٣١٥].

*** ئەو هۆیانەی کە دەوریان بینیوە لە گۆڕانی شێوە جلوبەرگی ناوچەی کەرکوکدا:**

*** گۆڕینی ئاوو هەوا:**
گۆڕینی باری ئاوو هەوا لە سەردەمە جیاجیاکاندا وایکردووە کە بتوانێت گۆڕین لە جلوبەرگدا دروست بکات، چونکە ساردیو گەرمی هۆیەکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بیربکاتەوە چۆن هەوڵبدات خۆی لە سەرما و گەرما بپارێزێت، کە ئەمیش ڕەنگ دەداتەوە لە بەکارهێنانی جۆری ڕەنگو شێوەی ئەو قوماشەی کە بەکاری دەهێنێت.
وەکو بەکارهێنانی جلوبەرگی کراوە لە شوێنە گەرمەکان (گەرمیان)و لە شوێنە ساردەکاندا جلوبەرگی داخراو بەکارهاتووە، هەروەها گەرمیانو کوێستان دەوری بینیوە لە بەکارهێنانی جۆرو قەبارەی قوماشەکەدا، چونکە بە جوانی دەردەکەوێت لە بەکارهێنانی (سەڵتە) لە ناوچەی کەرکوکدا لە سەردەمە زووەکانو ئێستادا، یان لە جۆری (کەوای) ئافرەتانی جاران کە زستانان بە لۆکە ناوئاخن کراوە، بەڵام ئێستا (کەوا) بەبێ لۆکە لەبەردەکرێت. هەروەها کاریگەری ڕەنگەکەش ڕۆڵی خۆی دیوە لە خۆپاراستن لە سەرما و گەرمای ناوچەکە، وەکو بەکارهێنانی ڕەنگی ڕەشو بۆرو خۆڵەمێشی لە وەرزی زستاندا.

*** کاریگەری باری سیاسی ناوچەکە و دەوروبەری:**
(بەهۆی ئەو بەربەرەکانیو ئاژاوانەی لە عێراقدا ڕوویداوە، وایکردووە گەلێك هۆی دەروونیو مێژوویيو سیاسی کارتێکردنیان هەبێت لەسەر جلوبەرگو پۆشاك، ئەم کاریگەرییە ڕۆڵی هەبووە لە دژواری (تعقیدات) نێو جلوبەرگەکان. بەڵام لە هەمان کاتدا هیچ چینێکی کۆمەڵایەتی دەستبەرداری ئەو کەلتوورە نەبوون[1].
کاریگەرییە سیاسییەکان هەمیشە ڕۆڵیان هەبووە لە دروستکردنی ترسو لەرزی ژێردەستەکان لە بەرامبەر دوژمندا، مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە هەوڵی خۆشاردنەوەو خەفەکردنی جلوبەرگەکەی بدات، نموونەمان زۆرە لەم ناوچەیەدا، بۆیە لە گەلێك کاتدا شەرواڵەکەی لێ بووەتە شاخێكو هەردەم لەلایەن دوژمنەوە بە چاوی سووك سەیرکراوەو هەوڵیانداوە سەرکۆنەی بکەن، ئەگەر جلووبەرگەکەی لەبەردابووبێت سووکایەتی پێکراوە. نموونەیەکی زیندوو لە ساڵانی (١٩٥٩)دا کە شۆڤینییە تۆرانچییەکان لە شاری کەرکوکدا هەوڵی تێکدانی نێوان برا تورکمانەکانو کوردەکانیان دەدا، هەڵدەستان بە هەڵواسینی جلوبەرگی ئافرەتی کوردو شەرواڵەکەیان پڕ دەکرد لە (کا)و هەڵیان دەواسی بە دیواری دوکانەکاندا، بۆ ئەوەی ڕوویەکی دەمارگیری نەتەوەیی دروست بکەن بۆ تێکدانی هەردوولا، کە خۆی لە خۆیدا گاڵتە پێکردن بوو بە میللەتێك، چونکە هەوڵی سڕینەوەی نەتەوەیەکیان دەدا لەلایەن فەرمانڕەوایی دەسەڵاتدارەوە.
دەبینین لە گەلێك شوێندا کارتێکردنی دوژمنەکە لەسەردەمێکی دیاریکراودا بەزەقی بەدەرکەوتووە، بەڵام هەر کاتێك سەردەمە زۆردارەکە ڕەویوەتەوە، مۆرکە کوردەوارییەکە خۆی باڵا دەست کردووەتەوە بەسەریدا.

*** جوانکاری ئاوەزی مرۆڤی کورد:**
کوردیش خاوەنی ئاوەزێکی گرنگە، کە توانای جوانکاری هەیە بۆ ئەوەی بەپێی سەردەمە مێژووییەکان بتوانێت توانای خۆی بخاتە کار لە دروستکردنی جلوبەرگی خۆیدا، هەوڵی ئەوەی داوە ئەو کەرەستانەی لەژێر دەستیدا هەیە بتوانێت خۆی قوماشەکەی بچنێتو جوانکاری لە شێوەی چنینو نەخشەکەشیدا بەکاربهێنێت، نموونەمان زۆرە لە هونەری نەخشو نیگارو ڕەنگو جۆلایی لە لادێکانی ناوچەی کەرکوکدا، کە توانای مۆرکە کوردەوارییەکەی بەدەرخستووە.

*** گۆڕانە مێژووییەکانی ئایین:**
سەردەمە جیاجیاکانی مێژوو، قۆناغی جودای ئایینی خستووەتەوە لە ڕووی پەرستنو چوونە ناو ژیانی ئایینی، بڵاوبوونەوەی ئایینە کۆنەکانی ناوچەی کەرکوك وەکو زەردەشتو پەرستنی بابەگوڕگوڕ، پیرۆزی ئاگرەکەيو جۆری جلوبەرگەکانی (موغە) زەردەشتییەکانو بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیو شێوەی پەرستنو بەکارهێنانی جلوبەرگە ئایینییەکانیان، بڵاوبوونەوەی ئیسلامو شاردنەوەی لەشی مرۆڤ، وایکردوە کە بارێکی تر لە جلوبەرگو پۆشاك دروست ببێت، زیاتر مرۆڤ بەرەو خۆشاردنەوەی لەش ڕۆیشتووە، بەشێوەیەکی گشتی ئایینەکانی ناوچەی کەرکوك پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە جلوبەرگەکان داپۆشراو (محتشم) بێت.
لەبەر ئەوە سەیردەکەین لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا، باری ئایینی دەوری خۆی بینیووە لە درێژی کراس تا خوار چۆكو بەکارهێنانی ڕەنگی وا کە لەشی مرۆڤەکە بە دیار نەبێت، یان لەبەرکردنی شەرواڵو سەڵتە بۆ خۆشاردنەوەی زیاتر، بەتایبەتی ئەمە لە شاردنەوەی لەشی ئافرەتدا بەدیاردەکەوێت، یان لە پێچانەوەی سەری ئافرەت بە سەرپۆشو سەربەستو لەچك، بۆ ئەوەی بیروباوەرە ئاینییەکە جێبەجێ بکەن. یان لەوانەیە (فەقیانە) داهێنانێکی ئیسلامی بێت، بۆ ئەوەی زیاتر قۆڵی هەڵنەکێشێتە بانو لەشی بەدیارنەکەوێت، ئەمەش لە ئافرەتە بەساڵاچووەکاندا ڕەنگی داوەتە کە فەقیانە بە بەشێکی گرنگی جلوبەرگەکەیان دەزانن.

*** پلەی چینایەتیو کۆمەڵایەتی:**
هەر لە بەرەبەیانی سەردەمە مێژووییەکاندا ژیانی مرۆڤایەتی لە بارێکی چینایەتی خوڵقاوە، مرۆڤێکی سەربەست لەگەڵ ژێر دەستە، پاشا، کۆمەڵانی خەڵك، پیاوە ئاینییەکاندا جیاوازی هەبووە، کە هەریەکەی بەچینێکی کۆمەڵایەتی حیسابی بۆ کراوە. سەیر نییە لە جۆری جلوبەرگەکەش وایکردبێ کە ڕەنگ بداتەوە لە بارە چینایەتیيو کۆمەڵایەتییەکاندا، هەریەکەی جلوبەرگێکی تایبەتو جیاوازی هەبێت لەوەی تر،

تەنانەت لە رووی نەخشو نیگارو بەکارهێنانی رەنگیشدا. گەلێك بریارو یاسای کۆمەڵایەتی لەو کاتەدا هەبووە کە دەبێت مرۆڤێکی سەربەست لەگەڵ مرۆڤێکی کۆیلەدا جیاوازی هەبێت لە جۆری لەبەرکردنی جلوبەرگەکەیدا، ئەو کەسەی جێبەجێی نەکات تووشی سزای یاسایی دەبێت، بۆیە دەبینین مرۆڤ پابەندی یاساکان بووە بۆ لە دوورگرتنی سزا، کە نموونەمان لەمجۆرە سزایە زۆرە لە سەردەمی سۆمەریو میتانییەکانی ناوچەی کەرکوکدا.

دەبینین جلوبەرگی ئافرەت یان پیاوێکی خودا پێداو لە ناوچەکەدا جیاوازی هەیە، چونکە دەوڵەمەندەکان هەوڵدەدەن بە جوانترینو بەهاترین شێوە جلوبەرگەکانیان برازێننەوەو باشترین کارامەیی نەخشکارەکەی تێدا بخرێتەروو، لەبەر ئەوە بەرگدروو سەڵتەی ئافرەتێکی دەوڵەمەند بە هەموو جۆرە نەخشێك دەرازێنێتەوە، جیاواز لە سادەیی سەڵتەی ئافرەتێکی هەژار، چونکە ئەو دراوەی لە نەخشی سەڵتەیەك یان کراسێکدا خەرجی دەکات، بەپێی جۆری قوماشو دوورینەکە دەگۆڕێت لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر.

*** پەیوەندییەکانی دەرەوەو بازرگانی:**

دەتوانین بە هۆکارێکی گرنگی دابنێین لە هونەری جوانکاری جلوبەرگدا، چونکە پەیوەندییە ناوخۆییە مرۆڤایەتییەکان تەنیا نابێتە هۆی جوانکاری ئەگەر پەیوەندییە دەرەکییە مرۆڤایەتییەکانی لەگەڵدا نەبێت، ژیانی مرۆڤایەتی لە قاوغێکی دیاریکراودا نییە هەتا دەستەوەستانی یەك سەردەمی ناوخۆیی بێت، هەر لەبەرئەوە پەیوەندییەکانی دەرەوەو بازرگانی بارێکی تری خوڵقاندووە، کە وایکردووە جوانکاری لە هەموو رووەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا دروست بکات. هەروەك پەیوەندییە دەرەکییەکانی سەردەمی میتانییەکانی ناوچەی کەرکوك نموونەی ئەم کارتێکردنە دەرەکییەن، چونکە پەیوەندییە دەرەکییەکانی میتانیو پەیوەستە بازرگانییەکانیان بووە بە هۆی گەشەکردنی هەندێ لایەنی ئایینیو شارستانیو زمانەوانیو کۆمەڵایەتی گرنگ، یان دەتوانین راستر بڵێین پەیوەندییە دەرەکیو بازرگانییەکان خۆی لە خۆیدا بە کەلەپوری نەتەوەکانی تر ئاشنات دەکات فێری جوانکاریت دەکات لە جلووبەرگەکەی خۆتتدا. ئەویش بە وەرگرتنی جوانکاری نەتەوەیەکی تر.

*** جلوبەرگی سەردەمەکانی پێش مێژووی ناوچەی کەرکوك:**

ئەگەر سەیری سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤایەتی بکەین، جلوبەرگەکەی لە سەرەتادا پێکهاتبوو لە دروستکراوی ئەو گژوگیایانەی کە لە دەورووبەریدا هەبووەو کۆی کردووەتەوە لە شێوەیەکی رێکوپێکدا نەخشاندویەتی، بۆ ئەوەی بەشێکی لەشی پێ داپۆشێت، چونکە مرۆڤی زوو زیاتر لەشی تووك داپۆشیبوو، کە لەگەڵ مرۆڤی ئەم سەردەمەدا جیاوازی هەبووە. هەروەها هەوڵیداوە لە کاتی راوکردندا، کاتێك بەسەر ئاژەڵێکدا زاڵ بووە، پێستەکەی وەکو پۆشاکێکی سادە بەکاربهێنێت بۆ داپۆشینی بەشێکی لەشی.

مرۆڤ لە سەرەتاکانی ژیاندا زۆر سادە بووە، تەنیا بیری لەوە کردووەتەوە کە چۆن خواردن پەیدا بکاتو بەسەر دوژمنەکەی کە ئاژەڵ بووە زاڵ بێت، تاکو بیر لە جلوبەرگ بکاتەوە.

لە سەردەمی (بەردەبەڵکە)دا، مرۆڤ شوێنی حەوانەوەی نەبووە بۆیە هەوڵی ئەوەی داوە کوخێکی کاتی دروستبکات بۆ هاتووچۆکردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر[٢]، لەبەر ئەوە ژیانی ئارامی نەگرتووەو هەوڵی ئەوەی داوە بە دوای (چنینەوەی خۆراك)[٣] رابکات.

سەیر دەکەین، کە مرۆڤ لەو سەرزەمەدا تەنیا بیری لە حەوانەوەی شەوێکی یان رۆژێکی خۆی کردووەتەوە، زیاتر وەکو ئەوەی کە جێگیری پێوە دیار بێت لە ژیانیدا، لەبەر ئەوە زیاتر بیری بە دوای چنینەوەی خواردن کردووەتەوە، وەکو ئەوەی بیر لە جلوبەرگو پۆشاکی خۆی بکاتەوە، کە لە زۆر کاتدا کوخەکەی بە پێستی ئەو ئاژەڵانە داپۆشیوە کە کوشتوویەتی.

بەڵام لە سەردەمی (کەریم شایەر)دا کە سەردەمێکی گۆڕینە لە (پاڵەگەورە)وە بۆ (کەریم شایەر)، چونکە (پاڵە گەورە) سەردەمی کۆتایی کۆکردنەوەی خۆراکە، بەڵام سەردەمی (کەریم شایەر) سەرەتای بەرهەمهێنانی خۆراکە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. (.. بۆیە مرۆڤی سەردەمی (کەریم شایەر) پەنای بردووەتە بەر ئەوەی کە رووی جوان بکات، بەجۆرێکی دیاریکراوی رۆنی رەنگاورەنگ، یان بە نەخشی شێوە برژانگی، کە ئەمە زیاتر بۆ ئەوە بووەو ئارەزووی ئەوەی کردووە کە جوان دەرچێت، وەکو باڵندە رەنگاورەنگەکانی دەورووبەری کە لەژیانی رۆژانەیدا چاوی پێکەوتووە)[٤].

سەردەمی (چەرمو)، دادەنرێت بەسەردەمێکی پێشکەوتوو لە ژیانی (کۆمەڵگای کشتوکاڵی)دا، بۆیە دەتوانین بەسەردەمێکی پێشکەوتووتر لە سەردەمەکانی تری دابنێین.

(بەهۆی ئەو دۆزراوانەی کە لە (چەرمو)دا دۆزراونەتەوە لە کەرەستەی ماڵی، بەڵگەیە بۆ پێشکەوتنی سەردەمەکانی پێش خۆی)[٥] و زۆربەی ئامرازەکانیان وەك: تەور، دۆڵ، تەشوێ، دەسکەدۆڵ، راماڵە، گڵ، مێکووت، بووە[٦]. ئەگەر سەرنج بدەین نیشی دەستکردو وردەکاری وەهاشیان هەبووە، کە زۆربەی لە تەڵەزمی تیژی بەرد دایان تاشیوەو بە شێوازێکی تایبەت دروستیان کردووە، کە بۆ کارو فەرمانی پێویستی رۆژانە بەکاریان هێناوە[٧].

جلوبەرگیان بە دەرزی درووستکراو لە ئێسك دووریوەو نیشی رستنیشیان پێکردووەو هەندێك لە ئامرازەکانیان لە بەردی چەم تاشیوە[٨]، هەروەها (پەپکە- قرص) چنینیان بەکارهێناوە، کە ئەوە دەسەلمێنێ کە رستنیشیان زانیوە[٩]، ئێسکیان بەکار هێناوە لە دروستکردنی دەرزیو کونکەرەو کەوچكو میروودا[١٠].

ناوچەکانی (قادیشی گەورەو قادیشی بچووكو مەتارە)، شارستانی دوای چەرموە لە گۆرانکاری ژیانی مرۆڤایەتیو پێشکەوتنی مرۆڤایەتی لە شێوەی بەکارهێنانی جلوبەرگو کەرەستە بەکارهێنراوەکانی هونەری نەخشو نیگاری جلوبەرگ.

هەروەها لە رووی جوانکارییەوە ئافرەتی چەرموو بایەخی

شێوە جلوبەرگی چاخە بەردینەکان

کەرەستە جۆراوجۆرەکانی تەونکاری

شێوە جلوبەرگی چاخە بەردینەکان

بە بەکارهێنانی مولوانکەی جۆربەجۆر داوە کە لە گوێچکە ماسیو بەردو بەردەئەستێ، قەبارەو شێوەی جۆربەجۆری بەکارهێناوە لە نەخشاندنی خۆیدا لە جۆری لوولەکیو کوپەییو خڕو شێوە نارێك.

*** جلوبەرگی سەردەمە مێژووییەکانی ناوچەی کەرکوك:**

سەردەمە مێژووییەکان قۆناغێکی تری شارسستانییەتی جلوبەرگی هێنایە گۆڕێ، کە هاوسەنگ بوو لەگەڵ لایەنەکانی زمانو ژیانی کۆمەڵایەتیو ئایینیو ئابووریو بیناکاریو نەخشو نیگار.

ئەگەر چاوێك بە مێژووی ڕووداوەکانی ناوچەی کەرکوکدا بخشێنین، دەتوانین لە بووەتەی ئەو هۆزانەی لە مێژووی کەرکوکدا دەوریان بینیوە، شێوەی جلوبەرگی ناوچەی کەرکوك شی بکەینەوە بۆ سەردەمەکانی ئێستامان.

مانەوەی هۆزێك یان هێزێکی سیاسی بۆ کاتێکی زۆر لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا، بمانەوێتو نەمانەوێت لەگەڵ خۆیدا گەلێك مۆرکی ئەو سەردەمانەمان بۆ هەڵدەگرێت، کە دەبێتە دروستبووی بناغەیەکی خۆماڵی نەتەوەیی ئەو ناوچەیە، ئەمە زیاتر دەیسەلمێنێت کە ئەو هۆزە لە ڕووی زمانەوە هاوڕەگەزی ناوچەکەی دەبێت، کە وادەکات مۆرکە شارستانییەتەکەی بسەپێنێتو ببێتە بناغەیەکی پتەو، ئەگەر لە بووەتەیەکی زۆردارەکیدا خۆی گیرنەخوات.

لێرەوە هەوڵدەدەم ڕەگەزی ئەو هۆزانە شی بکەمەوە کە هاوزمانن لەگەڵماندا، بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕادەیەك شارستانییەتی جلوبەرگەکەیان هەمان بووەتەی ئەو شارستانییەتەیە کە لەو سەردەمانەدا باو بووە؟

گۆتی، لۆلۆپی، سۆمەری، کاشی، (هوری- میتانی)، هەریەکەیان خاوەنی کۆمەڵێك بنەمای شارستانی خۆیانن کە وایان کردووە لەسەردەمە جیاجیا مێژووییەکاندا، گەلێك ڕێرەوی ناوچەکە بگۆڕنو تەرازووی سەردەمەکەیان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، هەموویان کاریگەریان دیارە بەسەر هونەری جلوبەرگو نەخشو نیگاری پۆشاکی ناوچەی کەرکوکدا، چونکە ئەمانە بەپێی زانیاری نوێی سەردەمەکانی ئێستامان، تاڕادەیەکی زۆر هاوڕەگەزو هاوزمانی کوردن.

ئەوەی جێگای سەرەنجە لە سەردەمە مێژووییەکاندا گرنگیو بایەخدان بە ژیانی مرۆڤایەتیو هەوڵی گۆڕین لە ژیانی سەردەمەکانی پێش مێژووو دووربینیو سازدانی جلوبەرگو خۆسازدانی ئەو جلوبەرگە لەگەڵ گۆڕانی ژینگە تازەکەدا، جێگەی هەڵوێستە کە لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا بڵاوبونەوەی کۆچڕەوی ژمارەیەکی زۆری هۆزەکان بەرەو ناوچەکانی تر، وایکردووە کە بەشێکیان جێگربوون لەو ناوچانەدا، کە کاریگەری هەبووە بۆ گۆڕانی بەپەلەو هەمەچەشن لە هونەری جلوبەرگو نەخشو نیگاری پۆشاکی ناوچەی کەرکوکدا.

لە هەمان کاتدا، هەمەڕەنگی لە جۆری نەخشو بەکارهێنانی قوماشدا لەگەڵ سەرهەڵدانی سەردەمە مێژووییەکانو کاریگەری بیرباوەڕو ئاینەکان، بووە هۆی سەرهەڵدانی بیرو ئاوەزی تازە خولقاو بۆ ڕێکخستنی جلوبەرگ، تا هاوگونجاو بێت لەگەڵ ئاینەکەدا، ئەمیش لە ڕووی لاسایکردنەوەی جۆری ڕێنومایی بیرو باوەڕە ئاینییەکاندا، کە بووە بە هۆی سەرهەڵدانی جلوبەرگی تازە بابەت.

کەرکوك ناوچەیەکی گرنگی بەربەرەکانی (سۆمەری)و (ئەکەدی)یەکان بووە، لەگەڵ (گۆتی)و (لۆلۆپی)یەکاندا، کە تا ماوەیەکی دووروودرێژی سەردەمی ئاشوورییەکانیشی خایاندووە، تاکو بە تەواوەتی (گۆتی)و (لۆلۆپی)یەکان هەرەسیان هێناوە لە ناوچەکەدا.

(گاسووری)، لای کەرکوك ناوچەکەی ئاوەدانی سەردەمی سۆمەرییەکان بووە، هەروەها ناوچەکانی حەویجەو خورماتووو داقوقو کفری، شێوەی شارستانییەتی ئەم هۆزانە بوون، کە تێیدا گەلێك مۆرکی خۆیان بۆ بەجێهێشتووین. هەر یەکە لە (گۆتیو لۆلۆپی)یەکان، تا ماوەیەکی چاك حکومەتی جوداجودایان دروستکردووە لە ناوچەی کەرکوکدا، لەژێر کارگێڕی ئەو فەرمانڕەوایيانەدا بووە.

(سۆمەرییەکان یەکێکن لەو هۆزانەی لە کوردستانەوە کۆچیان کردووە بەرەو ناوچەکانی خواروی عێراقو بەڵگەی نوێ بەدەستەوەیە کە گوایە لە لایەکی ترەوە نەهاتوونەتە عێراق بەڵکو هەر لە ناوچەکانی باکوورەوە هاتوونەتە ئەو ناوچانە)[11]، هەر لەبەر ئەوە ئەو شێوە جلوبەرگانەی سۆمەرییەکان، هەر هەمان شێوە جلوبەرگی ئەو ناوچانە بووە کە لە دواییدا گۆڕانی بەسەردا هاتووەو تا ڕادەیەك گۆڕان لە سازدانی جلوبەرگەکەدا ڕوویداوە، بەڵام توانای هونەری بنەڕەتی جلوبەرگە خۆماڵیەکەی هەر

تێدا ماوە.

(لەسەرەتادا جلوبەرگی سۆمەرییەکان بریتی بووە لە شێوە پشتێنێك کە تارادەیەك ناوەراستی لەشییانی داگرتووەو

ئەو شوێنانەی داپۆشیوە کە لەشی پیاوەتی لێوە دیارە، بەڵام لە دواییدا ئەو پشتێنە بووەتە هۆیەك بۆ هەڵواسینی کەرەستەو پێویستییەکانی نیشکردن و بەرەبەکانی شەر، دوای ماوەیەك بەشێوەی تەنوورەیەك یا پارچەیەکی گرێدراوی لەش، کە تا سەر سنگیانی داپۆشیوە)[١٢].

بەڵام لە دواییدا سۆمەرییەکان جلەکانیان لە پێستی مەڕ یان بزن دروستکردووە، بە چینێکی سفت کە تەنیا سەر سمتیانی داپۆشیوەو بەشەکانی تری لە شیان ڕووت بووە، ئافرەتەکانیان لەسەر شانیانەوە تا سەر چۆکیانی داپۆشیوە، کە سەر شانیان ڕووت بووە، ئافرەتە خواپێداوەکانیان پێڵاوی وەکو (نعل)ی لە پێست دروستکراویان لە پێکردووە، کە شێوەیەکی نەرم و بازنەیەکی تەنکی هەبووە، خۆیان ڕازاندووەتەوە بە موولوانکەو مووروو ئەنگوستیلەو خشڵی ڕەنگاو ڕەنگی جۆر بەجۆر[١٣].

هەر لەبەرئەمە جلوبەرگی سۆمەرییەکان هەر شێوەی جلوبەرگی گۆتی و لۆلۆپی بووە، تەنیا وردە گۆڕانکارییەکی تێدا بووە کە ئەم کاریگەرییە لە ناوچەی کەرکوکدا زۆر کەم بوو، چونکە کاریگەری شارستانێتییەکەیان و بەرەبەرەکانیان لە ماوەیەکی زۆردا، جۆرە تێکەڵاوییەکی جلوبەرگی دروستکردبوو، کە هەر زیاتر لێکچوون هەبوو لەنێوانیاندا، بەڵام لە دوای کۆچکردنی سۆمەرییەکان بەرەو خواروو، کاریگەرییەی جلوبەرگەکەیان زۆر کەمی کردەوەو شێوە جلوبەرگەکەیان کەمتر بەرچاو دەکەوت، کە کەوتە بەر کاریگەری ئاوو هەوای خوارووی عێراق و لەگەڵ خۆیدا جلوبەرگەکەی گۆڕانی بەسەرداهات.

*** شێوە جلوبەرگی گۆتی و لۆلۆپییەکان:**

هەریەکە لەم دوو هۆزە، تا ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایی ناوچەی کەرکوکیان کردووەو هەریەکەیان ئاقارێکی فراوانی ناوچەکەیان بەڕێوەبردووەو کاریگەرییان لە گەلێك

شێوەی جلوبەرگی لۆلۆپییەکان

جلوبەرگی لۆلۆییەکان

ڕووەوە بەدەرکەوتووە.
لە سەردەمی (گۆتی)و (لۆلۆپی)یەکاندا، چەند نموونەیەکی وێنەییمان بۆ ماوەتەوە کە دەتوانین شێوە جلوبەرگیان تا ڕادەیەکی سەرەتایی دیاری بکەین، کە بریتییە لە تابلۆکانی (هۆرین و شێخان)و (دەربەند گاور)، کە کۆتەڵی سەری پاشایەکی گۆتی و هەڵکۆڵینی تری جیاجیای پاشای (لۆلۆپی)یەکان و وێنەی کەسی لۆلۆییەکانە.
(لۆلۆییەکان بەرگی سووك و دامێن پۆشیان لەبەر بووەو پارچە پشتێنێکیشیان لەسەر شان ناوە...)[14]. لە نەخشە هەڵکەندراوەکەی (ئانۆبانني) ئەو پاشایەی بە جلوبەرگی (ئاکادی)یەوە نیشان دراوە کڵاوی لبادی ریشوەدار لەگەڵ پشتێنی کەمەر بەستەو کەوشی سەندەڵ لە پێدایە، دیلەکانیش کڵاویان لەسەردایە لە نۆ وێنەی دیلەکان هەشتیان کڵاوی (سۆمەری)و (ئەکادی)یان لەسەرە، نۆیەمیان کە لە ڕیزی پێشەوەیە کڵاو یان (تاج)ی لەسەردایە، کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین، بە تایبەتی هی ماددەکانی ڕۆژهەڵات بوو[15].
تابلۆیەکی تر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئەکادی) لە (۲۲۰۰)ی پێش زایین، کە پاشای لۆلۆییەکان وەستاوە بەرامبەر خواوەندی (عەشتار)، کە بە دەستی چەپی تیرێکی گرتووە، بەڵام دەستی ڕاستی گرتووە بە کووتەکێکەوە کە بەڵگە لە بەهێزی دەکات و پاشاکە ریشێکی درێژی هەیەو ملوانکەیەکی لە مل دایەو کڵاوێکی لبادی پانی لە سەردایە، جلێکی کورت و سووك و پێچراوی پێدا هاتووە[16].
لە تابلۆیەکی تردا کە لە نەخشی (ئانوبانینی) وەرگیراوە، وێنەی کابرایەکی لۆلۆییە کە کراسێکی درێژی تا خوار چۆکیی لەبەردایەو دواوەی درێژترە لە پێشەوەی، دواییەکەی نەخشێنراوەو ریشی هەیەو کڵاوێکی درێژی شێوە باریکی لە سەردایە.
(ئەو جلوبەرگەی لۆلۆییەکان کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین لەبەریان کردووە، بەمجۆرە بووە: نیوەی ڕووی داپۆشیوە، ئەیانکرد بە ژێر پشتێنەوە، دەولەمەندەکان پێستی پڵنگیان لەبەردەکردو دەست کورتەکانیشیان پێستی مەریان لەبەرکردووە.
لە نەخشەکەی (هۆرین شێخان)دا، وێنەی پیاوێکی لەسەر هەڵکەندراوە کە لەسەر لا وەستاوەو کەوانێکی بە دەستی چەپییەوە هەڵگرتووەو ئامێرێکی تیژیشی بە دەستی ڕاستییەوە گرتووە، تیرو کەوانێکی لە پشتدایە پڕییەتی لە تیر، پۆشاکێکی لە بەردایەو ناوەراستی جلەکەی بەری نیوەی لەشی داپۆشیوە، بە دوو هێڵ لێوارەکانی بە نەخش و نیگاری شێوە هێلکەیی جوانکراوەو پشتێنێکی لەسەر بەستووە کە تەورێکی پێدا ڕاگرتووە. ملوانکەیەکی لە ملدایە لە بەردی بەنرخ دروستکراوەو لە ناوەراستیدا دروشمێکی بازنەیی کوونکراوی پێدا هەڵواسراوەو زەلامەکەی گوارەی لە گوێدایە، بەڵام مێزەرەکەی سەری لە کڵاوێکی لبادی لێوار بچووك پێکهاتووە کە لە کڵاوی (بابلی)یەکان دەچێت، کابرا قاچی ڕووتەو ریشی نییە[17].
بەڵام نەخشەکەی (دەربەند گاور)، بریتییە لە جەنگاوەرێکی ریشدارو کڵاوێکی پانی لە سەردایە، بە دەستی چەپی کەوانێکی هەڵگرتووەو بە دەستی ڕاستی تەورێکی هەڵگرتووە، قاچی خستووەتە سەر لاشەی دوو کوژراو، جلەکەی بەری تا سەر چۆکی هاتووەو پشتێنێکی لە

جلوبەرگی لۆلۆییەکان

کەللەسەری پاشایەکی گۆتی

کەمەریدایە، ملی بە ملوانکەیەك رازاندووەتەوە[18].
هەروەها لە کەللەسەری پاشایەکی گۆتیدا دەردەکەوێت کە مێزەرێکی پانی لێوار باریکی لە سەرە کە هاولێکچووە لەگەڵ وێنەی نەخشەکانی تر، هەروەها رِیشێکی درێژی داداوە[19].

* سەرنجەکان دەربارەی شێوە جلوبەرگی ئەم ماوەیە:

١. سادەیی لە سەرەتادا، کە برتییە لە پۆشاکێکی یەك پارچەیی، کە لە پێستی خوری یان پڵنگ دروستکراوە.

شێوە جلوبەرگی سوبارییەکان

٢. بەکارهێنانی کڵاوی لبادی پانی لێوار باریك، بەشێوەیەکی گشتی.
٣. سەرهەڵدانی نەخش‌و نیگارو رازاندنەوەی جلوبەرگەکانیان لە سەردەمەکانی پێشوو.
٤. بەکارهێنانی ملوانکەو خشڵ لەبەرکردن.
٥. هێشتنەوەی ردێن دانان.
٦. بەکارهێنانی پشتێنی یەك پارچەیی‌و چەند قەفی لەسەر جلوبەرگ.
٧. سەرهەڵدانی کڵاوی سەر باریك لە سەردەمی لۆلۆییەکاندا.
٨. بەکارهێنانی کەوشی دەم باریك‌و شێوە سۆل، کە بە شریت بە پێیەوە بەستراوە. کە ئەمە لە سەردەمی سۆمەرییەکانیشدا باو بووەو لە پێست دروستکراوە[20].
٩. ئەگەر سەیری گۆتییەکان بکەین، دەبینین کەرکوك بنکەیەکی گرنگی فەرمانرەواییان بووەو بەشێکی شاری کەرکوك‌و دەروروبەری لە ئاقاری هێزی ئەواندا ماوەتەوە، بۆیە کاریگەری شێوەی جلوبەرگیان لەو ناوچانەدا هەیە، بەڵام دەربارەی قەڵەمرەوی لۆلۆییەکان ئەو شوێنانە بووە کە هاو سنوور بوون لەگەڵ پارێزگای سلێمانی‌و کاریگەری شێوە جلوبەرگیان لەو ناوچەنەدا بووە کە بەم جۆرەیە:
(لە رۆژئاوادا: بەشی دەربەندی بازیان‌و شاری چەمچەماڵ ولاتی پوختیان بووە، تا بەرەو رۆژئاواش برۆین تێکەڵ بوونیان لەگەڵ گەلانی تر دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەش مانەوەی رەگەزی خوورییەك تا ئەو کاتەجێگەی گومانە، بەڵام وا دادەنێین کە نەوەکانیان پێکەوە لەگەڵ لۆلۆدا دەژیان، پێشتریش تێکەڵ بوونی لۆلۆ لەگەڵ خورییەکان گەیشتبووەتە ناوچەی (تاووق- داقووق)[21].
بۆیە کاریگەرییەکان زیاتر لە ناوچەکانی خورماتوو و کفری‌و داقوق دا بەدەرکەوتووە، بەڵام ناوچەکانی تر زیاتر لەژێر کاریگەری جلوبەرگی گۆتییەکانی ناوچەی کەرکوکدا ماوەتەوە.

* شێوەی جلوبەرگی (هوری- میتانی) ناوچەی کەرکوك بەراووردی لەگەڵ ئاشووری‌و کاشییەکاندا:

(هوری – میتانی)یەکان یەکێکن لەو نەتەوانەی رۆڵێکی کاریگەریان دیوە لە رۆژهەڵات بە گشتی‌و لە ناوچەی کەرکوك بەتایبەتی، یەکێك بوون لەو هێزانەی کە لە گەلێك بواردا شانی خۆیان داوە لە هێزی ئاشوورییەکان‌و میسرییەکان‌و توانایەکی هەمەلایەنەیان هەبووە.
ناوچەیەکی وەکو کەرکوك شوێنێکی گرنگی هوری-میتانییەکان بووەو خاوەنی شارستانی (نوزی‌و کورروخانی‌و ئەراپخا) بووە، گەلێك لایەن‌و رووی ئەم شارستانییە دەنگی داوەتەوە لە ناوچەکەداو کاریگەری ئەوەندە بەهێز بووە ئاشوورییەکان تەنیا بە ناو قەڵەمرەویان لەو ناوچەیەدا هەبووە. بەتایبەتی لە سەردەمی ئاشووری ناوەراستدا.
دەگەینە ئەو راستییە کە شێوە جلوبەرگی (هوری-میتانی) یەکان زیاتر کاریگەری خۆی هەبووە وەکو ئاشووری یان

کاشی.

(لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا، هونەرو پیشەی جۆربەجۆر گەشەی کرد، پشەسازی جلوبەرگو خۆرازاندنەوەو نەخش، شوێنێکی دیاریکراوی داگیرکرد، کە پەیوەندی بە دەوڵەمەندی ئاشوورییەکانەوە هەبوو، ئەویش لە فراوانی ئیمپراتۆریەتەکەیان بووەو رۆڵی بینیوە لە شێوە جلوبەرگەکانیان)[٢٢].

ئاشوورییەکان رەنگی سپیو سووریان بەکارهێناوە لە پۆشاکەکانیاندا، باوەڕیان وابووە کە رەنگی سوور رووحی پیاوی خراپ دەرئەکات، هەروەها باوەڕیان وا بووە گیروگرفتەکانیان کەم دەکاتەوەو منداڵان لە نەخۆشی سوورێژە دەپارێزێت[٢٣]، بەڵام رەنگی سپی بەکارهێنراوە لە جلوبەرگی پاشاکانو پیاوی ئایینیو بەڵگەی پاك وخاوێنی بووە، جلوبەرگەکانیان لە کەتانو لۆکەو پێستە دروستکراوە[٢٤].

ئاشوورییەکان گەلێك نەخشی جۆربەجۆریان داهێناوە بە ناو هونەری جلوبەرگدا، وەکو شێوەی مرۆڤ، ئاژەڵ، بازنەیی، گوڵ، درەخت، چوارگۆشەیی، لاکێشەیی، هێڵی راستو چەپو پێچاو پێچ، ئەستێرەیی، تیشكو رۆژو هێڵی پانو درێژی لێکدراوی جۆربەجۆر. هەروەها جۆرێکی تریان داهێنا ئەویش دووبارە کردنەوەی نەخشەکان لە شێوەی چوارگۆشە یان لەبزینەییو بازنەییو لاکێشەیی، کە جۆرێکی تر جوانکاری دەدات بەجلوبەرگەکانیان.

خوداوەندی تیشۆپ

بێجگە لە رەنگی سوورو سپی، رەنگی سەوزو بنەوشەییو شینو ئەرخەوانیان بەکارهێناوە. هەروەها بەکارهێنانی شریتی سوور باوبووە، کە رەنگی شین لایان هەوای گەیاندووەو رەنگی ئەرخەوانی مانای دەریای گەیاندووە[٢٥].

ئاشورریەکان هەوڵیان دەدا کە دیاریی خودی مرۆڤ بکەنەوە لە رێگای جلوبەرگەکانیان، چەند سیفاتێکی بنەڕەتی هەیە لە جلوبەرگەکانیانو جیاوازی نێوان خواوەندو پاشاو وەزیرو پیاوە سەربازییەکانو پیاوی ئایینیو خزمەتکار، بەندی بەدەردەخات، کە هێما دەورێکی دیاری هەیە بۆ ناساندنی پلەی کۆمەڵایەتی هەر کەسێك[٢٦].

(ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لە عێراقی کۆندا گەلێك ناوچە هەبووە کە ناوبانگی دەرکردووە بە بارزگانی جۆراوجۆری کوتاڵ، هەروەکو ئەوەی لە کوتاڵی (نوزی) کە بەناوبانگ بووە لە جۆری رەنگو شێوەی نەخشەکەییو جۆری چنینەکەیدا[٢٧]، هەروەها (نوزی)یەکان رۆڵیان هەبوو لە نەخشی جلوبەرگەکانیانداو رازاندنەوەی بە نەخشی جوانو جۆربەجۆر، هەروەکو ئەوەی سەرچاوەمان لە بەردەستدایە کە ناوچەی (کوروخانی)یش ناوبانگی خۆ رازاندنەوەی جلوبەرگیان هەبووە.

ئەو سەرچاوانەی کە لە بەردەستدایە دەربارەی شێوەی جلوبەرگی (هوری- میتانی)یەکانی ناوچەی کەرکوك، دەتوانین ئەوە روون بکەینەوە، کە شێوەی جلوبەرگی ئافرەتانو پیاوانی چۆن بووە:

پەیکەرێکی گڵینی دۆزراوەتەوەو وێنەی عوودژەنێکی میتانییە، کە لە(نوزی)ی لای کەرکوك دۆزراوەتەوەو مێژووەکەی ئەگەرێتەوە بۆ (١٥٠٠) ساڵ پێش زایین[٢٨].

وێنەکە بریتییە لە جلوبەرگێکی پانو پۆر، کە تا خوار چۆك هاتووەو وەکو (کەوای) ئێستا دەچێت لە ناوەڕاستەوە کراوە بێتو لێوارەکانی بە نەخشی جۆر بەجۆر رازابێتەوە، لە وێنەکەدا دیارە کڵاوێکی وەکو مێزەری لەسەردایەو پێڵاوێکی وەکو کەوشی لەپێدایە، کە نووکەکەی لە پێشەوە تیژەو تا رادەیەکی زۆر وەکو ئێوە پێڵاوێك دەبینرێت.

لە مۆرێکی تر کە لە ناوچەی نوزی دۆزراوەتەوە، بریتییە لە مرۆڤێك کە لە سەر کورسییەك دانیشتووە لەگەڵ ژمارەیەك لە ئاژەڵان، مرۆڤەکە جلوبەرگێکی درێژی لەبەردایە، هەروەکو لە وێنەکەدا دیارە تا خوارەوەیەو بەجۆرەها نەخش رازوەتەوەو پێڵاوێکی وەکو کەوشی پاژنەدارو نووك تیژی لە پێدایەو سەرەکەی هەڵساوەتەوەو کڵاوێکی لە سەردایە کە تا خوار گوێی هاتووە.

خوداوەندی تیشۆپ

هەروەها یەکێك لەو کۆتەڵانەی لە نوزی دۆزراوەتەوە هی خواوەند (عەشتارە)، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پازنزەیەمی پێش زایین، کڵاوێکی شێوە درێژی لە سەردایەو پشتێنێکی قەفداری لە پشت کردووەو جلوبەرگێکی وەکو جلوبەرگی پیاوانی ئێستای کوردی لەبەردایە.

یەکێك لەو تابلۆ دەگمەنانەی کە لە گۆڤاری (العربي الكويتي) بڵاوکراوەتەوە، گەلێك لایەنی جلوبەرگی (هوری–میتانی) یەکانی ناوچەی کەرکوك دەخاتەڕوو کە بەم جۆرەیە:

(هیچ بەسەرسوڕمانی مەزانە کە فەرمانڕەوا یان لێپرسراوێکی شارەوانی وەستا بێت و دەستی بەرزکردبێتەوە دەربارەی ئەو تاوانانەی کە دراوەتە پاڵی لە ناوچەی (نوزی)داو لەلایەن دادوەرانەوە سزای پێویستی خۆی وەربگرێت، دەربارەی تاوانی بەرتیل خواردن و فێڵ و دەست درێژی کردنە سەر ئافرەت و بەکارهێنانی کاری نا شەرعی، کە ئەو فەرمانڕەوایەش ناوی (کۆشی)یە.

بەڵام وەك لە وێنەکەدا دیارە بەرگری لە خۆی دەکات و هەوڵدەدا خۆی نەدات بە دەستەوە، هەر چەندە هەندێك لە تاوانەکان هەڵبەستراوە دژی، و تاوانبار کراوە بە ڕۆیشتنی لەگەڵ ئافرەتێکداو دەستدرێژی کردنە سەری، ئافرەتەکە وەکو شایەت لە وێنەکەدا دیارە. هەروەها لە وێنەکەدا دیارە کە دوو سەرباز چاوەڕوانی بڕیاری دادوەرەکان دەکەن دەربارەی (کۆشی)، تا ئەرکی خۆیان بەجێبهێنن)[٢٩].

*** دەربارەی شێوە جلوبەرگی فەرمانڕەوا (کۆشی):**

بریتییە لە کراسێکی فراوان و تا خوار چۆك، کە بە جۆرەها نەخشی هەمەڕەنگ ڕازاوەتەوەو سەڵتەیەکی قۆڵ کورتی

دادگایکردنێکی کۆشکی نوزی
لە سەردەمی هوری – میتانییەکان

لەسەر کراسەکەوە داداوە، کڵاوێکی ڕەشی لەسەر ناوەو کەوشێکی دەم باریکی لە پێدایەو سەڵتەکەشی بە هەمان نەخشی کراسەکەی ڕازاوەتەوە. سەرۆکی دادوەران جلوبەرگێکی پان و پۆڕی سپی لە بەردایەو لایەکی شانی بە دەرەوەیەو لە ناوەڕاستەوە بەپشتێنێك بەستراوە. پێڵاوێکی وەکو کەوشی لە پێدایە، بەڵام دوو سەربازەکە جلوبەرگێکی سپییان لە بەردایەو تەنورەیەکی ڕەنگاوڕەنگیان داوە بەسەریداو کڵاوێکی ئاسنیان لەسەرە، هەر یەکەیان ڕمێکیان بەدەستەوەیە.

دەربارەی جلوبەرگی ئافرەتەکە بریتییە لە دوو پارچەی پان و پۆڕ، ئەوەی ژێرەوە بریتییە لە کراسێکی سپی پان و پۆڕ لە ناوەڕاستەوە بەپشتێنێك بەستراوە، لەسەر ئەم کراسەوە ڕۆبێکی یەخە کراوەی داداوە بەسەریداو قۆڵەکانی درێژەو بێ نەخش و نیگارەو سەری بە شریتێکی باریك لە ناوچەوانەوە بەستراوە.

بەڵام دەربارەی ئەو سێ دادوەرەی کە لە دواوەی وێنەکەدا دیارە، گوێبیستی قسەی تاوانبارو سەرۆکی دادوەرانن، کە هەریەکەیان جلوبەرگێکی سپی و کڵاوێکی ڕەش و مۆرێکی لوولەکیان لە مل ناوە. ئەو خزمەتکارەی لە وێنەکەدا دیارە تا نیوەی لەشی ڕووتەو جلوبەرگێکی شێوە تەنوورەیی لەبەردایەو سەری ڕووتە.

*** دۆزینەوەی ملوانکەیەکی ئافرەتانی سەردەمی (هوری–میتانی) لە ناوچەی کەرکوکدا:**

لە (کووڕوخانی) کە ئێستا پێی دەڵێن (تل الفخار) و دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای شاری کەرکوك، بە دووری (٤٥) کیلۆمەترو (٣٥) کیلۆمەتر لە باشووری خۆرئاوای (نوزی) یە. لەم شوێنەدا کەرەستەی چنین و ڕستن و خشڵی ئافرەتان دۆزراوەتەوە، بەڵگەیە بۆ بەکارهێنانی بایەخ بە جلووبەرگ و خۆڕازندنەوی جلوبەرگەکانیان (مووروی ملوانکەکانیان بریتییە لە بەردی پیرۆزو فریتی سپی و شین و زەردو ئاڵتونی و زیویی دروستکراو، سێ پەپکە ئاڵتونی لەسەر شێوەی (هیلال) و میرووە، زیوەکانیش لەسەر شێوەی سێگۆشەو بازنەیی بووە، هەروەها نموونەی ئەم جۆرە مووروانە لە (نوزی)یشدا دۆزراوەتەوە، کە تا ڕادەیەك هاوشێوەی ئەو مووروانەن کە لە (کوڕووخانی) دۆزراونەتەوە[٣٠].

*** سەرنجەکانی جلوبەرگی ئەم سەردەمانە:**

١. بەکاهێنانی جلووبەرگی پان و پۆڕو کراوە، لە پێشەوە بەشێوەیەکی فراوان کە هەر لە کەواو سەڵتەی ئەم سەردەمانەی ئێستامان دەکات، ئەمە لە هەر یەکە لە جلوبەرگی هوری– میتانی و کاشی و ئاشووریدا بەرچاو دەکەوێت، کە تەنها جیاوازی لە چەند لایەکی کەمەوە بەرچاو دەکەوێت، ئەویش لە جۆری نەخش و ڕستنەکەدا.

٢. داهێنانی شەرواڵ لە سەردمی میتانییەکاندا بەشێوەیەکی فراوان لەبەرکردنی لەگەڵ کراسدا.

٣. بەکارهێنانی نەخش و نیگار بە شێوەیەکی زۆر فراوان، کە تێیدا توانای هونەرییان بەدەردەخات، بۆ نموونە

ملوانکەیەکی کوپرو خانی

جلوبەرگەکانی هوری-میتانییەکانی ناوچەی کەرکوك باڵا دەستن لەجۆری نەخشاندندا.

٤. بەکارهێنانی کڵاو لەسەرکردن و ڕازاندنەوەو نەخشاندنی بەچنراوی جۆربەجۆر، کە زیاتر کڵاوەکانی (هوری- میتانی) یەکان لە کڵاوی ئێستای ناوچەی کەرکوکەوە نزیکترەو زیاتر هاوشێوەیی پێوە دیارە، هەروەکو لە کڵاوی خواوەند (تیشۆپ)دا دەبینین کە خواوەندێکی میتانییەکانە.

٥. بەکارهێنانی پێڵاوی شێوە کەوشی وەکو لە وێنەکاندا دەردەکەوێت لە پێستە دروستکراوەو نووکەکەی تیژەو بەرەو سەرەوە هەڵساوەتەوە.

٦. بەکارهێنانی پشتێنی چەند قەفی یان سادە لەسەر کراسەوە.

٧. بەناوبانگ بوونی ناوچەکە بە هونەری چنین و بازرگانیکردن بە قوماشەوە.

٨. بەکارهێنانی ڕەنگی ئاڵووااڵی جۆربەجۆر لە جلوبەرگدا، کە هەر یەکەی پێوانەی پلەکانی کۆمەڵایەتی و چینایەتی بۆ کراوە.

شێوە جلوبەرگی کاشییەکان

٩. لە کۆتایی فەرمانڕەوایی ئاشووری - میتانییەکاندا (بەکارهێنانی شەرواڵ سەری هەڵدا لە ناوچەی عێراقدا لە کاتی بڵاوبوونەوەی میدییەکان لە وڵاتی ئاشووردا، دەست بەسەراگرتنیان بە سەر شاری نەینەوادا، لەبەرئەوەی شەرواڵ جلوبەرگێکی میدییەکان بووە هەر لەسەردەمانێکی زووەوە)[٣١].

شێوە جلوبەرگی کاشییەکان

*** جلوبەرگی مادەکان:**

"..جلوبەرگی مادی لە ڕەنگی جۆراوجۆر یانی ئەرخەوانی و ڕەش و سووری تۆخی بەسەردارەکانی بەخشی، کۆرش چاوی لە جلوبەرگی مادەکان کردبوو، کەسە نزیکەکانی خۆی هاندا کە ئەو جۆرە جلوبەرگە لەبەر بکەن.

*** مادەکان پێنج جۆر کڵاویان لەبەر کردووە:**

یەکەم:

کڵاوێکی گردو سادەی نەوگینە کە لە پێشەوە تۆزێك بەرەو پێشەوە هاتووە، لە پشتەوە پارچەیەك بەسەر لیوارەکەیەوە دادراوە.

دووەم:

کڵاوێکی گردو نەوگینە زیاد لەو پارچەیە کە لە پشتەوە هەیانبوو گوێچکە پۆشیشی هەبوو هەر کاتێك پێویستیان بە گوێچکە پۆشەکە نەبوایە بەرەو ژووریان دەکردەوە لەگەڵ پارچەکەی پشتە سەریاندا پێکەوە گرێیان دەدا.

سێیەم:

کڵاوێکی گردو نەوگینە لە پشتەوە لە باتی پارچە درێژەکە پارچەیەك کورتی ڕێکوپێکی پێوە بوو، کە یەکسەرە لەگەڵ کڵاوەکەدا دروستکرابوو، یان پێیانەوە دووریبوو.

چوارەم:

کڵاوێکی نەوگینی بێ پشتەسەر بووە، دوو گوێچکەی پۆستی هەبوو کە نووکیان تیژو درێژ بوو لەژێر چەناگەوە پێکەوە گرێدەدران.

پێنجەم:

کڵاوێکی قوچی نوکتیژە، نوکە تیژەکەی بۆ پشتەوە چەمابووە.

مادەکان بەرگی چەرمیان لەبەردا بووە، جلوبەرگەکانیان بەوە دەناسرێتەوە کە لە چەرم دروستکراون، جگە لە سادەیی و تەنگ و تەسکی شێوەکانیان.

کراس یان کەوای مادەکان تا سەر ئەژنۆیان درێژە، قۆڵەکانیشیان لە شانەوە تا سەر مەچەکیان درێژە، بە لوولەیی و گرد بەرچاو دەکەون، یەخەی کراسەکان بە سێ جۆر بەرچاو دەکەون (بە نیوەگردو، نیوە بازنەیی لەبار،

ئاسۆیی).
قۆڵی کراسەکان دۆخێکی سادەیان هەبوو، کە لەسەر شانەوە دووراوە، هیچ نەخشێکی کراسی مادەکان گۆشەو پارچەی زیادەی وەکو لەچکیان نییە، لەبەر ئەوە لەوە دەچێت لە بن هەنگڵەوە پارچەیەکی سێگۆشەیان بۆ کردبێت، درێژی قۆڵەکان تاکو سەردەست و مەچەك درێژن.
مادەکان شەرواڵێکی گردەو دوو دەرەلنگیان بۆ دروستکردوون کە داوێنی کراسەکانیان لای ژووروی شەرواڵەکانی داپۆشیووە، ئەوەی کە بەرچاو دەکەوێت بە شێوەیەکی ساف و فوودارو بە بێ چرچ و لۆچ تا ئەندازەیەکیش درێژ بەرچاو دەکەون لە هەندێکی دیکەیاندا شەرواڵەکان فراوانترن، دەرەلنگەکان دەکەوتنە سەر پیلاوەکانیان.
پشتوێنی مادەکان پارچە چەرمێکی درێژی هەبووە بە ئەندازەی دووجار هاتنەوە بە پشتی خاوەنەکەیدا، لە کاتی هاتنەوەییەکەمجاردا بە دەوری خاوەنەکەیدا دەست بە تەسکبوونەوە دەکات و پانییەکەی کەمتر دەبێتەوە، لە دوای کۆتایی هاتنی خولی دووهەمدا سەرەکانی پێکەوە گرێدەدرێت لە دوای ئەوەش شێوەی پشتوێنەکە دەگۆڕێت، هەر دوو سەرەکەی کە بە تەواوی باریك بوونەتەوە بە شێوەیەکی لە یەکتر هەڵدەپێکرێن لە کۆتاییدا دۆخی بازنەیی نیشان دەدات.
زیاد لەم پشتوێنە دوو جۆر پشتوێنی دیکەیان هەبووە، کە یەکێکیان بۆ ئەوە بوو کەوانەکانیان پێوە بەند کردووەو ئەوی دیکەشیان قەمەیان پیا هەڵواسیوە.

سێ جۆرە پێلاوی مادەکانمان بەرچاو دەکەوێت:
پێلاوێك کە لە چەرمێکییەك پارچەیە، هەر وەکو گۆرەوی دەکرێتە پێ، پاژنەی زیادی نییە، چەکمە یان جزمەی چەرمینی ساقێکی درێژی هەبووە، پێلاوی ساق درێژ، کە نووکی سەر پەنجەکانی بەرەو ژوور وەرگەڕابووە، لە پێشەوە بە بەن دەبەستران.
لە تایبەتمەندییە ووردەکانی پۆشاکی ئافرەتان، کراسێکی تەسکیان لەبەردایە کە تا سەرپێیان هاتووەتە خوارەوەو قۆڵەکانیان کوورتن، وا دیارە لە بواری چالاکی ئابووریدا شانبەشانی پیاوان بەشداربوون.

هەروەها چینەکانی کۆمەڵگەش بەم شێوەیە جلوبەرگەکانیان دابەش بوو بوو:

١. جلوبەرگی تایبەتی شوانکارەیی و ئاژەڵداری.
٢. جلوبەرگی تایبەتی تیرەو تایەفەو ڕەوەندەکان.
٣. جلوبەرگی تایبەتی موغەکان.
٤. جلوبەرگی ساماندراو دەست ڕۆیشتوو.
٥. جلوبەرگی کۆیلەدارەکان[٣٢].

*** شێوە جلوبەرگی سەردەمی ساسانییەکان:**

داڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان و بەهێزبوونی قەڵەمڕەوی نەتەوەکانی ئێران لە ناوچەی کوردستان و

شێوە جلوبەرگی سکاییەکان

عێراقدا، وایکرد ناوچەکە تا ماوەیەکی زۆر ببێتە گۆرەپانی هەخامەنشی و سلوقی و یۆنانی و ڕۆمانی و ئەشکانی و ساسانی. هەروەها بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی و پاشان ئایینی مەسیحی لە ناوچەکەدا، بوونە هۆی لە بووەتەدانی شارستانییەکی قەبارە فراوان و هەمەچەشن کە هەموو ئەمانە ڕۆڵیان بینی لە بڵاوبوونەوەی شارستانی ئەو نەتەوانەو توێژە ئاینییەکەیان.
دوای ئەوەی ئاشوورییەکان دەوڵەتی میتانییان لە ناوبرد، هێزەکانیان بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ماددەکان تاودا، لە دواییدا بەربەرەکانی (بابلی) و (ماددەکان) دژی ئاشوورییەکان و ڕووخاندنی قەڵەمڕەوەکەیان بووە پێکەوە لکاندنی شارستانییەتەکان و سەرهەڵدانی شێوەی جلوبەرگی نەتەوەکانی ئێران لە ناوچەکەدا.
باوەڕهێنان بە بیروباوەڕی زەردەشتی و بڵاوبوونەوەی خێزانی موغەکان لە ناوچەی کەرکوك و (حدیاب) لای هەولێر، کە وایکرد ببێتە هەڵگری شێوەیەکی نوێی جلوبەرگ و شارستانییەتەکەی، چونکە باوەڕهێنان بە ئایینەکە لە هەمان کاتدا باوەڕهێنانە بە شارستانییەتی ئەو ئایینەو ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانی ئەو ئایینە.
ئەوەی لە شێوەی جلوبەرگی ئەو سەردەمانە گەیشتووەتە دەستمان، کە باو بوو لە ناوچەی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی سەردەمی ساسانییەکان بەم شێوەیە بووە: (شێوەی باوی جلوبەرگی پیاوان بریتی بووە لە کراسێکی تا سەرچۆك درێژو شەرواڵێکی پان و پۆڕ، کە لە سەردا لەبەرکراوەو لە شەرواڵی ئێستا پان و پۆڕ تر بووەو بە نەخش و نیگار ڕازاوەتەوە، هەروەها باری چینایەتی و کۆمەڵایەتی ڕۆڵی بینیوە لە شێوەی دروستکردنی جلوبەرگەکەدا. شەرواڵەکە گەلێك جار نەخشکراوەو لێوارەکانی بە شریتی ڕەنگاوڕەنگ چەسپکراوە، پشتێنی یەکداچووی لەسەر جلەکانەوە لەبەرکراوە[٣٣]، بەڵام جلوبەرگی ژنان بریتیی بووە: لە کراسێکی پان و پۆڕو درێژ، کە لە زۆر کاتدا بریتی بووە لە شێوەیەکی بەیەك پارچەیی، لەبەرکارهێنانی ڕەنگدا ڕەنگی جۆراوجۆریان بەکارهێناوەو دەسکی قۆڵەکانی کراسەکەیان درێژ بووە، لەسەریەوە کراسێکی نیوە قۆڵیان لە بەرکردووە

کە کوورت بووە.
هەروەها ئافرەت سەری ڕووت نەبووە کڵاوی جۆر بەجۆری لەبەرکردووە، کە وەکو ئەوەی باو بووە لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا، لە شێوەی (تەربوش)و (سدارە)و (کڵاو) یان شێوە قووچەکی کە لە قوماشێکی سفتی ئەستوور دروستکراوەو ڕازاوەتەوە بەنەخش و نیگارو بەردی بە نرخی جۆربەجۆرو کەرەستەی ئاسنی هەمەڕەنگ، کە باو بووە لەو سەردەمەدا لەگەڵ بەکارهێنانی خشڵی جۆربەجۆر[٣٤].

*** بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و کاریگەری لەسەر شێوەی جلوبەرگی ناوچەی کەرکوك:**

بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، هەرەسهێنان بوو بە گەلێك شارستانی میللەتەکانی ترو تواندنەوەی هەموو ئەو ئەفراندنە لە بووەتەی ئیسلام و لەدواییدا لە قاوغی تەسکی دەمارگیری عەرەبیدا.
ئەوەی لە ئیسلامدا بەرچاودەکەوت و زۆر گرنگ بوو بە دەستکەوتنی مسۆگەرە ئابوورییەکە بوو، لەبەرئەوە هەموو شارستانییەتییەکانی ژیان لەو ڕوانگە ئابوورییەوە خوولی خواردووەو لە ئارامگەی ئەودا کڕنووشی بردووە ...، بۆیە دژی هەموو شتێك بوون کە بۆنی ئەم لایەنەی لێ نەهاتبێت، کە شێوە جلوبەرگی نەتەوەکانی تر نموونەیەکی باڵای ئەو ڕاستییەیە کە بە هەموو جۆرێك دەیانەویست بەسووك سەیری بکەن و بیکەنە دەستەمۆی بە ئیسلامی بوون.
(... دەبینین لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتیدا، موسڵمانەکان بایەخێکی وایان نەدا بە ژیان و خواردن و جلوبەرگی سادەیان دەپۆشی، بۆیە خەلیفەیەکی ڕاشیدی کە لە بازاردا دەڕۆیشت، کراسێك هەڵکراو تا نیوەی قاچی لەبەربووە، نەعلێکی لە لیفە دروستکراوی لەپێدا بوو، هەڵگری چەکەکەی لە لیفە دروستکرابوو ...)[٣٥].
بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی و زیادبوونی باری ئابووری وڵاتانی ئیسلام وایکرد بایەخ بە ژیان بدەن و دەستبکەن بەوەی کە هەوڵی وەرگرتنی شارستانییەتی میللەتەکانی تر بدەن کە لەوەوپێش شتێکی نامۆ بوو لە ژیانیاندا.
(....موسڵمانەکان هەوڵیاندا سوود لە هەموو چینەکانی میللەتانی تر وەربگرێت، بایەخ بە بەکارهێنانی جلوبەرگیان بدات و سەرنج بدات لەگەڵ بەکارهێنانی جلووبەرگی عەرەبییدا.
دەبینین موسڵمانەکان لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا بەچنین پارەیەکی زۆریان خەرج دەکرد بۆ ئەوەی هەوڵبدەن جوانترین جلوبەرگی چنراو بەرهەم بهێنن ...، کە ئەمە وایکرد ئەمەوییەکان بکەنەوە ژێر کاریگەری جلووبەرگی فارسەکانەوە)[٣٦].
بایەخدانی ئیسلامەتی بە کراسی پان و پۆری شۆڕو پێچراو، جۆرێکی تر بوو کە وابکەن بایەخ بە جلوبەرگی کوردی و ئێرانی بدەن و لەو شێوەی ئەم جلوبەرگە بخوازنەوە، چونکە بە لایەنی پیاوو ژن جلێك بوو هاوگونجاو بوو لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا.
هەر ئەمەیش بوو وایکرد کە جلوبەرگی ئاشووری و میدی و ساسانییەکانی پێش بڵاوبوونەوەی ئیسلام بایەخی پێدراو زیاتر دڵگیرتر بوو بۆ لەبەرکردن و ڕازاندنەوەی لە چوارچێوەی بیروباوەڕی ئیسلامدا.
هەر چەندە کە موسڵمانەکان کەوتە وەرگرتنی جلوبەرگی نەتەوەکانی تر، بەڵام هەوڵیدا بکەوێتە ژێر کاریگەری ڕێنماییەکانی پێڕەوەکانی ئیسلام، بۆیە هەستان بە بەکارهێنانی چەند گۆڕینێك چ لە ڕووی قوماش چ لە ڕووی بەکارهێنانی ڕەنگدا. ئەوەی لە ڕێنماییەکانی ئیسلامدا سەریهەڵدا شاردنەوەی لەشی مرۆڤ بوو، کە بەکارهێنانی جلوبەرگی درێژو فراوان و سەرپۆش بۆ خۆشاردنەوەی دەم و چاوو دیار نەبوونی لەشی ئافرەت و خۆ دوورخستنەوە لە جلوبەرگی تەنك.
بەکارهێنانی ڕەنگ ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە چەسپاندنی ئامۆژگارییەکانی ئیسلام، ئەویش خۆی بینیوە لەبەکارهێنانی ڕەنگی تاریکی وەکو ڕەش و شین و خۆڵەمێشی و ڕەنگی تر، بۆ ئەوەی ڕەنگەکانی تر ئاڵاو واڵا نەبێت، تا زیاتر لەشەکە لە دیتن و دەرکەوتن بەدوور بخاتەوە، ئەم کاریگەرە زۆر بە زەقی دیارە لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بۆ جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی ئیسلام.
سەرهەڵدانی فەقیانەو عەباو کڵاو، یەکێکن لەو کاریگەرە ئیسلامییانە کە زۆرتر لەژێر ئامۆژگارییە ئیسلامییەکەدا خۆی چەسپاندووە. لە دوای هەرەسهێنانی عەباسی و سەرهەڵدانی هێزە سەربازییەکانی سەلجوقی و هۆلاکۆو تەیموری، کە کاریگەرییەکی گەورەی بیروباوەڕو ئایینییەکانی لەگەڵ خۆیدا هێناو سەرهەڵدانی جۆرەها جلوبەرگی ئیسلامی و توندانەوەی لە ناو شارستانییەتی نەتەوەکانی تردا جێبەجێکرد.
عوسمانییەکان هەستان بە بەربەستکردنی هەموو ڕێگاکان لە پێناوی ئیسلام بۆ بەجێبەجێکردنی مەرامەکانیان، بۆیە کەوتنە تواندنەوەی نەتەوەکان لەو سیاسەتە چەوتەیان، کە ئەمیش بووە داهێنانی جلوبەرگی سەیرو سەمەرە بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانیان وەکو عەبای ئافرەت، کە باشترین نموونەی ئەو داهێنانە کوێرانە دەمارگیرییە بیر تەسکەیە بۆ شاردنەوەی هەموو جلوبەرگی نەتەوەکان و بایەخدان بەجلوبەرگی تووركی، تا نەتەوەکانی تری تێدا بتوێنەوەو ئەو شێوە جلوبەرگەیان ببێتە دەستەمۆی جلوبەرگی عوسمانییەکان.

*** دۆزینەوەی چەند خشڵێکی ئافرەتانی ناوچەی داقوق:**

لە کاتی گەڕان بەدوای پاشماوەکانی هەر سێ مزگەوتەکەی (داقوق)دا، کۆمەڵێك موورووو ملوانکەی ئافرەتان دۆزرایەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەتابەگییەکان و کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانییەکان.
دۆزینەوەی کووژەکێکی ئاڵتونی شێوەخڕ، کە لەسەر ڕووەکەی نووسینێکی عەرەبی بە خەتی کوفی نووسراوە، لە ناوەڕاستییەوە چوار گۆشەیەك هەیە نووسینێکی کوفی تێدا نووسراوە، لەگەڵ (بسم الله الرحمن الرحيم، لا اله الا الله، محەمەد رسول الله) لە هەردوو ڕووەکەی نووسراوە،

هەروەها ناو چوارگۆشەکەی نووسینی تر هەیە، کونێکی لێکراوە بۆ هەڵواسین، تیرەی کووژەکە کە (٣سم)ە.
دۆزینەوەی ملوانکەیەکی ئاڵتونی کە پێکهاتووە لە پەنجا مووروو، کە بیست لەم مووروانە شێوەیەکی بازنەیی بچووکی هەیەو دەورە دراوە بە پێنج دەنکۆڵەی بچووك و دیار وەکو ئەستێرەیەکی پێنج روویی دیارە لە ناوەراستدا کونێکی تێدایە، بیستو چوارەکەی تر شێوەی هێلکەیی هەیە کە ناوەراستی کوونەو قەبارەی هەر یەکێکی بە قەبارەی دەنکی تەزبێحێکی ئاسایی دەبێت.
دۆزینەوەی ملوانکەیەکی زیوی، کە پێکهاتوە لە بیست دەنکۆڵەی شێوە بازنەیی کە لە ناوەراستەوە گەورەیەو لە لایەکی نەخشکراوەو بریتییە لە شریتێکی نووسراوی عەرەبی بەخەتی (نوسخ) کە بریتییە لە (محەمەد، علی، الحسن، جعفر الصادق..)، لەژێر ئەم شریتەوە شریتێکی تر هەیە بریتییە لە نەخشی هێڵ شکاوە، ئینجا لە دوایەوە نەخشی رووەکی دێت کە بریتییە لە گوڵێکی هەشت گەڵایی، دەسکێکی هەیە بۆ هەڵواسین و هەڵگرتن، بەڵام خشڵەکانی تر بچووکە، ئەم نووسیانەی لەسەر نووسراوە: (محەمەد، علی، جعفر الصادق، موسی الکاظم)، هەروەها دەسکێکی هەیە بۆ هەڵواسین، قەبارەی خشڵە گەورەکان (٤ سم)و قەبارەی هەریەکە لە بچووکەکان (٩) ملیمەترە[٣٧].

*** بەشەکانی شێوەی جلوبەرگی پیاوانی ناوچەی کەرکوك:**

هونەری کەواو سەڵتە

*** کەوا:**

بریتیە لە پۆشاکێکی درێژ تا سەر پاژنەی پێ و بێ یەخەیەو دەبێتە دوو بەشەوە، لە ناوەراستەوە کراوەیە تا خوارەوە، کە بریتییە لە سێ پارچە، دواوەی پارچەیەکەو ئەولاو لای هەریەکەی پارچەیەکە، لە پێشەوەی سنگدا دێتە خوارەوە، دوو پارچەکەو قوڵی کەوا درێژە تا سەر لەپی دەستەو سەرقۆڵەکانی کراوەیە، لە گەڵێك شوێندا قۆپچەیەك بەکاردەهێنرێت بۆ گرێدانی، لەسەر ناوکیدا قۆپچەیەکی هەیە بۆ ئەوەی هەردوو لای کەواکە بێتەوە یەك بۆ بەستنی پشتێن. لەملاو ئەولای کەوای پیاواندا کراوەیە، کە لە شێوەی گیرفان دروستکراوەو ناوەوە شێوەیەکی لاری هەیە، لە سەرەوەی کەوادا لە دیوی ناوەوەی سەر سینگی گیرفانی هەیە، لە هەندێ کاتدا بێ گیرفانە.
بەڵام دەربارەی کەوا رابردووی مێژوویەکی دوور درێژی هەیە، هەر لە سەردەمەکانی پێش ئیسلامەوە بەکارهاتووەو جلێکی سەرەکی پیاوان بووە، بەتایبەتی لە سەردەمی ئاشوورییەکان و (هوری- میتانی)یەکاندا، هەرلەوانەیە مانەوەی ئەم پاشماوەیە بگەرێتەوە بۆ ئەو ماوە مێژووییە. کەوای جاران رازاوەبووە بە جۆرەها نەخشی هەمەرەنگ کە نموونەی ئەم راستییە کەوای (هوری- میتانی)یەکانی ناوچەی (نوزی) لای کەرکوکە.

*** سەڵتە:**

بریتییە لە چاکەتێکی ئاخنراو بەلۆکەو بە توێژێکی تەنك و لە ناوەوە بەرگی بۆ کراوە، کە زۆربەی کات بەرگەکەی لە خام درووست دەکرێ، درێژی سەڵتە زۆر نییە تا سەر پشتێنی دەگاتەوەو دوو قۆڵی درێژی هەیەو بەڵام فراوان نییە، سەڵتە لە ناوچەی کەرکوکدا لەسەر کەواوە لەبەری دەکەن، لە ناوەوەی سەڵتە دوو گیرفانی گەورەی بۆ دروستکراوە لە پێشەوە کراوەیەو هیچ شتێکی نییە، ئەگەر سەیری سەرچاوە مێژووییەکان بکەین دەبینین کە نموونەی ئەم جۆرە سەڵتانە لە هونەری جلوبەرگی (هوری- میتانی)و ئاشوورییەکاندا زۆر بەچاو دەکەوێت.

*** فەرەنجی:**

جۆرە بەرگێکە زیاتر شوان لەبەری دەکات، کە تاسەر ئەژنۆ دێت و هەلاج دروستی دەکات[٣٨]، ئەمە جۆری درێژیشی هەیە بەڵام بەشێوەیەکی دیاریکراو بەکار دەهێنرێت، فەرەنجی هەر لبادەو هەمووی یەك پارچەیە[٣٩].

*** کوڵەباڵ:**

دیسان لە بەرگن دروست دەکرێت و ئەمیش بابەتی فەرەنجییە، بەڵام تا پشتێنی دێت و زیاتر لەبەردا چەسپ دەبێت، قۆڵی نییە لەسەر هەردوو شانییەوە دوو گوێچکەی قووتی بۆ دەکەن، ئەمیش هەر هەلاج دەیکات[٤٠].

*** کەچە گەرمك:**

ئەمیشیان بابەتی فەرەنجییە، بەڵام ئاودامانەو قۆڵی نییەو

زیاتر شوان بۆ شەوانی سەرماو بارانی (شەوکەژ–شەو بە کێو ) بەکاری دەهێنێت، ئەو دەمە لەسەر (کوڵەباڵ) یان (فەرەنجییەوە) لەبەری دەکات، زۆر گەرمو گورەو هیچ سەرماو باران کاری تێ ناکات، ئەمەیش هەر لە بەرگنەو هەلاج دروستی دەکات[٤١].

* پەستەك:

جۆرێکی بێ باڵە بەڵام لە (بەن) دەچنرێتو دروست دەکرێت، (پەستەك) چۆخیشی پێ دەڵێن، مەرەزی لەگەڵ دایەو پارچە پارچەیەو هەموو پارچەکانی لێك توند دەکرێن[٤٢].

* کورتەك:

بریتییە لە جلێکی سەرەوەی پیاوانەی ناوچەی کەرکوك، ئەمیش لە زوودا ناو ئاخن دەکرا بە لۆکەو بە هەر دوو بەرگەکەی بە دەزوو چەسپ دەکرا، بەهاتنەسەری کورتەکەکە بەدەزووی وردو سفتو قۆڵەکانی درێژەو بەلەشەوە نووساوە، لەسەر شەرواڵەوە لەبەر دەکرێت، بەڵام لە هەموو شوێنەکانی کوردستان زیاتر لە کەرکوکدا بەکارهێنراوە. (کورتەك هەرچەندە والَیە بەڵام لە هەر لایەکەوە ریزێ کونو ریزێ قۆپچەی هەیە، کورتەك لەملاو ئەولاوە گیرفانی هەیەو هەر گیرفانێکیان سەر بەکێشی هەیە[٤٣].

*** مورادخانی و ستارخانی:**

ئەمە بەرگێکی نوێیە لە ناوچەی کەرکوکدا، کە لەناوچەی (سلێمانی)یەوە لە دوای سییەکانەوە خوازراوە، مامۆستا نەریمان لە یاداشتەکانیدا وا باسی دەکات: (ئەڵێن دوو برا لە کوردستانی ئێران (مورادو ستار)، ئەم مورادخانی و ستارخانییەیان داهێناوە و لەوێشەوە گەیشتووەتە سلێمانی، وەکو مۆدەیەك کوردستانی گرتەوە:

(بۆ یەکەم جارساڵی (١٩٣٧) کە چوومەتە سلێمانی بەدەگمەن مورادخانی بەرچاودەکەوت، هەموویان کەواو سەڵتە، یان کەواو چاکەتیان لەبەرکردبوو)[٤٤]. (یەکەم کەس لەو ناوچەیە مورادخانی لەبەرکرد (حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف) بوو، لە ناو شاریشدا (فەقێ محەمەدی سەعاتچی تەرخانی) بوو[٤٥].

*** شەرواڵ (رانك و چۆغە):**

ئەمەش بەشی دووەمی سەرەکی پیاوانە، کە بریتیە لە جلێکی کراوە لەسەرەوە هەتا بەرەو خوار دێت تەسك دەبێتەوە، سەرێکی بەنەخوێنی تێهەڵدەکێشرێت بۆ بەستاندن، لەسەر جلی سەرەوەی پیاوان ئینجا یان کراس یان موراد خانی دەکرێتە ناوییەوە پشتێنی لەسەر دەبەسترێت. کەوا رێدەکەوێت رەنگی شەرواڵی پیاوان لەگەڵ بەشەکەی سەرەوەی یەك رەنگ دەبێت، شەرواڵ لەملاو ئەولاوە کراوەیە و گیرفانی تێدا دەکرێت بۆ شت هەڵگرتن، بەڵام ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لە شەرواڵی ناوچەی کەرکوك ئەوەیە کە زۆر فراوان نییە، وەك ناوچەی هەولێر کە زیاتر رێکوپێکی پێوە دیارە لە ناوچەکانی تر، ناوەراستی شەرواڵی ناوچەی کەرکوك لەگەڵ لەشەکەیدا هاوجووت هاتووەتە خوارەوە، نابەجێی و نارێکی پێوە دیارنییە. هەروەها بەکارهێنانی شەرواڵی رەنگی سپی باو بووەو لەبەرکراوەو زۆربەی ئەمە لە ناوچەی (شوان) بەرچاو دەکەوێت.

*** دەرپێ:**

ئەمەش زیاتر لەژێر کەواوە لەبەر دەکرێت، ئەوانەی کەواو سەڵتە لەبەر دەکەن، لەخامی سپی دروست دەکرێت، وەکو شەرواڵ وایەو گیرفانی نییەو یەك پارچە هاتووەتە خوارەوە، لە هەندێ کاتدا لەژێر شەرواڵیش لە زستانان بەکار دەهێنرێت، بە تایبەتی لەو شوێنانەی ئاووهەوایان ساردە.

*** کراس:**

لە قوماشی سپی سادە دروست دەکرێ، لە بارەی هەڵبرینەوە پانی (٠,٨٦) سمو درێژی (٠,٩٦) سم بەرینە، پشت ملی کورتە، کراس لەسەر شانەکانەوە (٠,٦٧) سم پانە، دوو قۆڵی هەیە، هەریەکەی (٠,٣٨) سم درێژەو (٠,٢٤) سم بەرینەو بەگۆشەی تیژ بە قاڵبەکەیەوە لکاوە ئەم کراسانە فەقیانەیان پێوەیە، کراس لە تەنیشتەکانەوە تیرێژی تێ دەبردرێتەوە.

*** فەقیانە-ئەنگوچك-لەوەندی:**

پارچە بەرگێکی کوردانەی زۆر رەسەنە، وا دەبێ فەقیانە جوداو سەربەخۆ دەبێت یان گەڵێك جار بەکراسەوە دەلکێنرێت، فەقیانە (٠,٣٤) لەقوڵ درێژ دەبێتەوە ئەم فەقیانە لەژێر بەرگی سەرەوە دێننە دەرەوەو وەکو تیلمە پەرۆیەکی سپی و دەق کراو لەسەرەوە لەباسکی خۆیان دەپێچن و فەقیانە لە ئاموورش یان لە (نایلۆن) دروستی دەکەن.

*** پشتێن:**

پشتێن مێژوویەکی کۆنی هەیە، هەر لەسەردەمە مێژووییە کۆنەکانی کەرکوکدا بەکارهاتووە، بەتایبەتی لە سەردەمی (گۆتی)و (لۆلۆیی)و (هۆری- میتانی)و (ساسانی). (...لەسەرەمی ئیسلامدا پشتێن بایەخی خۆی پێدراوە تارادەیەکی زۆر هونەرکاری تێدا بەکارهاتووە، لەبەر ئەوە سەیر دەکەین کە جۆری شێوەی پێچانی پشتێن لەگەڵ درێژییەکەی جیاوازی هەیە بەپێی گۆرانکاری ناوچەو عەشرەت و باری کۆمەڵایەتی و ئایینی[٤٦].

(.. درێژی پشتێن لە ناوچەی کەرکوك و هەولێردا نزیکەی سێ مەتر دەبێت و شێوەی لوولە لەقەدی دەپێچرێت[٤٧]. لەبەر ئەوە پشتێن بەشێوەیەکی گشتی لەسەر کەواو یان شەرواڵەوە دەبەسترێت، هەروەها رۆڵێکی گرنگی هەیە لە جوانکردنی جلوبەرگ و خۆرازاندنەوە، چونکە جۆری رەنگەکەو قوماشەکەی باڵا دەستە لەو جوانکارییەدا.

کاریگەری ئایینی زەردەشتی لەناو کوردا، تاکو ئێستا ماوە بەکار هێنانی قەفەکانی بەستنی پشتێن لەژێر ئەو کاریگەییە ئاینییەوە سەرچاوەی گرتووە، بەتایبەتی لە بەکارهێنانی سێ قەف لە بەستی پشتێندا هێمایە بۆ رێنماییەکانی ئایینی زەردەشتی.

*** کڵاو:**

لە دەزووی لۆکە دەچنرێت کە زۆری رەنگی رەش و سپی بەکار دەهێنرێت و لە هەندێك کاتدا رەنگی تریش بەکار دەهێنرێت، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسەی کە بەکاریدەهێنێت گەنج بێت یان بەساڵا چوو نەبێت.

جۆری نەخشەکانی کڵاو یان لەبزینەیی یان چوار گۆشەو سێگۆشەیی و هێڵی راست و چەماوەییە، لەگەڵێك شوێندا کڵاو سەرەکەی پانەو لە هەندێك شوێنی تردا سەری کڵاوەکەی قووتە وەکو کڵاوی دێی (کەڵاو قوتی) ناوچەی (شوان).

*** جەمەدانی (مشکی):**

ئەمەش قوماشێکی رەش و سپییە کە جەمەدانی پێ دەڵێن، کە (١,٣٥×١,٣٥م) درێژی دەبێت، یان رەش و بۆری کاڵە مشکی پێ دەڵێن کە (١,٢٠×١,٦٤) درێژەو رێشووی (٠,٧) درێژەو بەهەردوولادا شۆربووەتەوە، هەر بەو جۆرەش جەمەدانی لە هەر چوارلاوە رێشوی هەیە[٤٨].

بەڵام ئەوەی سەرەنج رادەکێشێت کە کەرکوییەکان بەشێوەی باریك بای دەدەن، لەلاوە کلکێکی دەردەکەنە دەرەوە[٤٩]..، بەڵام ئەمە زیاتر لە ناو شاری کەرکوك بەرچاو دەکەوێت نەك دەورووبەری شارەکە.

* عەبا:
ئەمەش زیاتر لە سەر جلووبەرگەوە لەبەر دەكرێت، بریتیە لە جلێكی فراوانی كراوە لەسەرەوەو خوارەوە كە لە قوماشێكی تەنك دروست دەكرێت، ئەمە زیاتر پیاوە بەساڵاچووەكان یان دەوڵەمەندەكان بەكاری دەهێنن، ئەمەیش بایەخدان پێی لە یەكێكەوە بۆ یەكێكی تر دەگوێزرێت و هەر یەكەی بەپێی بایەخی كۆمەڵایەتی گرنگی پێدەدات.

* كڵاش-كەوش:
جۆری بەكار هێنانی كڵاش لە دەزووی سپی یان رەش دەچنرێت و بنەكەی لەپێستەیەكی قایم دروست دەكرێت، كە ئەمیش بە زۆری لە هاوین و بەهاراندا بەكاردەهێنرێت، بەڵام كەوش لە پێستە دروست دەكرێت و زۆر لە كڵاش قایمترەو بەرگەی سەرمای زستان دەگرێت، جۆرەكانی زۆرەو هەندێكی لە پێشەوەو دواوە نووكی بۆ دەهێنێنەوە، كە زۆر لە كەوشی (هوری- میتانی)ییەكان دەكات.

* پویزەوانە:
لە بەنی خوری مەر سادە سپی یا قاوەیی دەچنن، دوو گوولەنگەشی بۆ دەكەن، پیاوان لەسەر شەرواڵەوە لە پێی دەكەن، لە خوار ئەژنۆوە بۆ سەر پێی دەپۆشن.

* گۆرەوەی:
ژنان لە خوری مەڕ لە بەنی ڕەنگامە یا سادە دەیچنن، بە زستان لەبەر سەرماو سۆڵە لە پێیان دەكرد.

* دەسكێش:
ژنان لە بەنی رەنگاورەنگ و سادە دەیچنن، بەتایبەتی لە زستانان لەبەر دەكرێت.

* چەورە:
جۆرە دستەسرێكی جوانە بە رەنگی سوور رازاوەتەوە، پیاوان بۆ جوانی لە باخەڵیان دادەنا و چمكێكی بە دەرەوە بوو.

* دەسماڵ-دەستەر:
جۆرە دەستەسرێكی گەورەیە بۆ دەست سرین بەكار دێت لە قوماش ئامادە دەكرێت.

* زرێ-قەڵخان:
لە ئاسن دەچنرا، زووتر جەنگاوەرەكان لە كاتی جەنگدا لەبەریان دەكرد.

* كڵاوخود:
كلاوێكی ئاسن بوو جەنگاوەرەكان لە كاتی جەنگدا لەبەریان دەكرد.

* شوێنی بەكارهێنانی بەشەكانی جلوبەرگی پیاوانی ناوچەی كەركوك:
١. بەكارهێنانی جلوبەرگی (كەواو سەڵتە) لە ناوچەكانی جەباری و تاڵەبان و لەیلان و كاكەیی، بەشێوەیەكی فراوان بڵاوبووەتەوە.
٢. بەكارهێنانی كڵاوی مەیلەو پان لە ناوچەكانی جەباری و تاڵەبان و كفری دا باوبووە، بەكارهێنانی رەنگی رەش و سپی زیاتر باو بووە لە چنینەكەدا، بەڵام لە ناوچەی (شوان) زیاتر كڵاوی قووت و سەرباریك بەكارهاتووە، بەكارهێنانی رەنگی سپی سادەش لە كڵاودا لە ناو شارو دەوروبەری زیاتر باو بووە، زیاتر رەنگی سپی لەلایەن پیاوە بەساڵاچووەكانەوە بەكارهاتووە.
٣. بەكارهێنانی جەمەدانی زیاتر لە ناو شارو دەوربەری (شوان )دا بەكارهاتووە، چونكە ناوچەكەی نزیكترە لە ناوچەكانی (هەولێر)، بەڵام بەكارهێنانی (مشكی) لە ناوچەی تاڵەبان و قەرەحەسەن و لەیلان و كفری زیاتر بەكارهاتووە، هەروەها تێكەڵاو لە (مشكی)و (جەمەدانی)یش بەكارهاتووە.
٤. بەكارهێنانی (كورتەك و شەرواڵ) یان (موراد خانی) لەناوچەی شوان و پردێ و ناو شاری كەركوكدا بەكارهاتووە.
٥. هەروەها بەكارهێنانی كەواو چاكەتیش لە ناوچەی (جەباری)و (لەیلان)دا باو بووە، لەم ساڵانەی دوایدا چاكەت وەكو باوێكی ئەورووپایی هاتە ناو كوردستانەوە لە جیاتی (سەڵتە)ی كوردەواری بەكار دەهات.
٦. لە جیاتی بەكارهێنانی پشتێنی قوماش لەسەر كەواوە پشتێنی پێست باوی بووە، لە ناوچە جۆربەجۆرەكانی كەركوكدا.

مشکی و جەمەدانی ناوچەی کەرکوک

٧. بەکارهێنانی جەمەدانی خانە شاشیش باوی بووە، وەکو سەردەمێك لە ناو شاری کەرکوکدا.

٨. بەکارهێنانی خەنجەرو چەقۆو دەمانچەو تەزبیح، بەبەرپشتێندا شتێکی باوی پیاوە ناودارەکانی ناو شاری کەرکوك ودەوروبەرەکەی بووە، هەروەکو بەکارهێنانی کیسەی توتن و دارە جگەرەش لە لادێکانی دەوروبەریدا باو بووەو شتێکی ئاسایی بووە.

٩. بەکارهێنانی (عەبا) بەسەر کەواو سەڵتەدا، بەتایبەتی لە لای پیاوە بەساڵاچووەکان و دەست ڕۆیشتووەکان.

١٠. بەکارهێنانی (کڵاش) لە ناوچەکانی نزیك شارو ناوچە تەختاییەکان زیاتر بەکارهاتووە، بەڵام (کەوش) زیاتر لە ناوچە لادێییەکانی شاری کەرکوکدا بەکارهاتووە، هەروەها بەکارهێنانی خوریی سپی لە چنینی کڵاشدا باو بووە لەگەڵ ڕەنگی ڕەشدا.

*** بەشەکانی شێوە جلووبەرگی ژنانی ناوچەی کەرکوك:**

*** دەرپێ:**

نزیکەی (١,١٠م) درێژەو نزیکەی (١,٥٠م) بەرینە لەلای سەرەوە تیفۆی هەیە دەکەوێتە سەر نێکان و لینگەکانیش تیفۆی هەیە بە داوێك خڕ دەبێتەوە سەر قوولەیی. دەرپێی ژنان دوو بەشە، کە بەشی سەرەوەی تۆڵە یان خامی سپییە، بەشی خوارەوەی قووماشێکی ڕەنگاورەنگە وەکو خامەك، کوودەری، جورجێت، یان ئێستا زۆر باوە کە یەك ڕەنگ بەکار دەهێنرێت لە سەرەوەو خوارەوە کە لەگەڵ ڕەنگی کراسەکەدا دەیگونجێنن.

*** ژێر کراس (ناوەڵکراس):**

لە ناوچەی کەرکوکدا نزیکەی (١,٢٠م) درێژەو کونی جێ قۆڵەکان و جێ ملی خڕو گەورەیە، لە پێشەوەو دواوە وەکو یەك وایە، لەلای سەرەوەی (١,٢٠م) بەرینەو لەلای خوارەوە (١,٧٠م) بەرینە، جا کە ئافرەت بە چوار مشقی دادەنیشێت ژێر کراسەکەی لە بەری تەنگ نییەو لەشی ناگوشێت، ژێر کراس تا خوار چۆك دادەکشێ و بەشی سەرەوەی ناوەڵکراس دادەپۆشێت کە قۆڵەیەو زیاتر قووماشی ژێر کراس سپییە یان ڕێدەکەوێت ڕەنگاوڕەنگی کراسەکە، بەڵام ئەمە زۆر کەم و دەگمەنە.

*** کراس:**

نزیکەی (١,٣٠- ١,٣٥م) درێژەو لە زەوی دەخشێ و لە بارەی هەڵبرینەوە، جێ ملی خڕو بچووك و کوورتە، قۆڵی (٤٠ سم)، بەرینەو بە ڕاست و ڕاستر لە قاڵبەکەی دووراوە، ئەنگوچکێکی درێژی پێوەیە، کە لە وەرزی زستاندا ئافرەت ئەم ئەنگوچکە لەسەر کوورتەك یان کەوا یان لەسەر هەردووکیان لە باسکی دەپێچێت، لە وەرزی گەرمیشدا کوورتەك لەبەر ناکات، سەری ئەنگوچکەکان لێك گرێدەداو بەسەر سەرییەوە ئاوای پشتەوەی دەکات و بەمەیش سەرقۆڵی واڵا دەبێتەوە، تا نیوەی هەڵدەکرێت.

*** سوخمە:**

سوخمە نزیکەی (٤٠-٤٥ سم) درێژە، لە پێشەوە دوو پارچەیە، لە پشتەوە یەکپارچەیە، لەسەر شانەکانی بەرێزە دوورمانی لارو، لە تەنیشتەکانی بەرێزە دوورمانی ڕاست بەیەکەوە دووراون، جێ قۆڵەکانی گەورەو فراوانن، قوماشەکەی یان جورجێتە یان کودەری بەسیمەو تێر ڕەنگە، هەروەها بەرەکەی خامە.

*** سەڵتە (کورتەك- کوڵە نجە):**

نەختێ لە سوخمە درێژترە- قۆڵەکانیش درێژو تەسکن لە بارەی هەڵبرینەوە، قوماشەکەی سیمدارەو ڕەنگاورەنگە بەری قۆڵەیە بەینی بەرو پشتی بەناواخنە، زیاتر ناوئاخنەکەی بەلۆکە، لەملاو ئەولاوە بەشێوەیەکی جوان دووراوە، کە تا ڕادەیەك شێوەیەکی سفت و گەرم و گوڕ وەردەگرێت، هەروەها لە ناوچەی کەرکوکدا پێشی دەڵێن (دیزلغ) کە هەر هەمان شێوەی سەڵتەیە.

*** کەوا:**

(١,٤٠- ١,٤٥م) درێژەو (١,٦٠م) بەرینە، لە بارەی هەڵبرینەوە پانە، لەلا تەنیشتەکانییەوە تیرێژی تێدا دەبردرێتەوە، قۆڵی تەسکەو بە قاڵبی وا دەدورێتە خوارەوە، لە سەرەوە تا خوارەوە واڵایە، لە ملاو ئەولاوە دوو پارچەی تێ دەبردرێتەوە کە لە بەریدەکەن ئەم دوو پارچەیە دەکەنە سەرییەك، گیرفانی تێدا دەکەن لەلا تەنیشتەکانی، قوماشەکەی خامەکەو بەری قۆڵەیەو نێوان بەرەو پشت

بەناواخنە. لە ناوچەی کەرکوکدا دوو جۆر کەوا هەیە کە جۆرێکی بێ ناواناخنەو جۆرێکی ئاخنراوە بەلۆکە، کە ئەمە زیاتر لە زستاندا لەبەردەکرێت.

* کڵاو:-
لە لبادی رەشەو تەنیشتەکانی نەختێ هاتوونەتە خوارێ بە دەزووی رەش بەریز تەقەڵی لێدراوەو لێواریشی بە شیرازەیەو ئەویش هەر رەشە، جاران دراوێکی زیویان لێی قایم دەکرد لەسەر ترۆپکەوە کە بەدەزوو دەیدوورن، هەروەها وا رێدەکەوێت کە لبادەکە بەمووروو یان زەنگیانە دەرازێنەوەو دەنەخشێنرێت.

* دەسماڵ:
شێوەیەکی سێگۆشەیەو لە ناوەراستی لای درێژی بە ئەڵقەیەك لەدراوی سەر ترۆپکی کڵاو قایم دەکرێت و مل دادەپۆشێت، سەری دەسماڵەکە بەسەر پشتدا شۆردەبێتەوەو دوو سەرە باریك و درێژەکانی لەلای پشتەوە لێك تێدەپەرن و بەسەر شاندا دەرۆن و لەسەر مل لێك گرێ دەدرێن، قوماشەکەی ئاوریشمی رەنگاورەنگە، یان سادەی سپی و رەشە.

* کۆڵوانە:
شێوەیەکی لاکێشەیی هەیەو بەرامبەر یەك هەر یەکە بەریز (٢٧) گوڵنگی پێوەیە بەکۆڵیدا دەدەنە خوارێ، دوو لیچکی سەرەوە بەدەرزی لە بن چەناگە لێك قایم دەکەن.

* سەربەست:
(١,٥٠م) درێژە، دوو پارچە چیتی تەسکە بەلا تەریکی دەبرن و دەیدوورن، سەرێکی راست براوەو سەرەکەی تری بەشێوەی نیوە بازنەیی قۆڵ براوە، لا راستەکەی (٢٢) گوڵنگی لێ دێ. سەربەست دوو دار بە لای درێژیدا دەپێچرێت و گوڵنگەکانی دەکەونە دەرەوە، پاشان وەکو تیلمێکی پان بەدوو پێچ لە کڵاو دەئاڵێنرێ، ناوەندی سەربەستەکە دەخرێتە سەر مل و بەسەر برۆدا دەرواو دەسورێتەوە لەسەر مل لێك دەبەسترێ و سەرە بەگوڵنگەکانی لەژێر دەسماڵ بەسەر پشتدا شۆر دەبنەوە، قوماشەکەی چیتەو بەلاری لەسەر دەنرێت.

* هەنیە پێچ- ناوچەوان:
لەسەر دادەنرێت لە ئارمووشی تەنکی رەشەو گوڵی سپی و قاوەیی تێدایە، دەستووری رەنگەکەکانی تەواو لە رەنگی پارچە جلەکانی تر جوودایە، کە رەنگیان بە زۆری ئەرخەوانی و مۆری پیرۆزەیە، لەسەر تیرەی رەق دەکرێ و بەپێچەوانەی سەربەست لەسەر برۆوە سەر هەوراز لێدەنرێ و لەسەر مل گرێ دەدرێ و سەرەکانی لە بن مێزەر رادەکرێ لە ناوەندەی سەری پیرۆزەوە دراوی ئێرانی لێ قایم دەکرێ.

* سەرپۆش:
(١,٦٠-٢م) درێژە (٧٢- ٨٤سم) بەرینە، قوماشێکی تەنکە زۆر جار رەنگاورەنگە و زۆر جاریش سپییە و دووروومانی پێوە نییە، بەسەر سکیدا شۆر دەبێتەوە، ژنی بە مێرد لەسەر سەربەست لەسەری دەنێن، کچێ مێردی نەکردبێ یەکسەر لەسەر سەری رووت لە سەری دەنێ.

* کەوش-جاش کەوش:
ئەو پێڵاوەی زیاتر ئافرەت لە پێی دەکات بریتییە لە (کەوش)، کە لە پێستە دروستکراوە و سەرێکی باریکەو هەڵساوەتەوە، بێجگە لە کەوش.

* کلاش:
کلاشیش بەکاردەهێنن کە ئەمە زیاتر لە خووری دەچنرێت.

* سۆڵ:
جۆرێکە لە کەوش لە چەرمی رختە ئامادە دەکرا، ئێستا باوی نەماوە.

* چەکمە:
جۆرە پێڵاوێکە لە چەرم ئامادە دەکرێت، نووکەکەی بەرەو سەرەوە چەماوەتەوە، لە پۆتین دەچێت، ژنان و پیاوان بەکاریان دەهێنا.

* قاپقاپ:
پیشەی دارتاشەکانە، لە داری رختەو قاییم دروست دەکرێت، بانەکەشی لە چەرمێکی جوان و قاییم بە شێوازی ئەڵقە بۆی ئامادە کراوە، زووتر ژنان لە پێیان دەکرد، لە گەرماویشدا بەکار دەهێنرا.

* بەروانك-وەرزەنك-بەروان-سینگپۆش:
پارچە قوماشێکی سپییە ژنان لە جێشتخانە لە وەختی کاردا بەرسینگیان پێ دەپۆشن یان لە وەختی نانخواردنی منداڵاندا بە سینگییەوە بەند دەکرێ.

* تارا-تورمە:
جۆرە سەرپۆشێکی رەنگاورەنگی سادەی ئاوریشمە بە زۆری دەدرێ بەسەر بووکدا، سەرچۆپیش بۆ زەوق و جۆش و خرۆشی شاییەکە دەیگرێ بەدەستەوە جارو باریش رایدەوەشێنێت.

* کوڵە نجە-کلجە:
جۆرە سوخمەیەکی قۆڵداری ژنانە، لە کوتاڵی رەنگاورەنگی سادەی قەشەنگ ئامادە دەکرێت.

* چارۆکە:
لە بەنی رەنگامە جۆلاکان ئامادەی دەکەن، ژنان لە کۆڵی دەکەن، هەیشە لە کوتاڵ دروست دەکرێت.

* چەفییەی ژنان:
ئەم بەرهەمە زووتر ژنان وەکو پۆشین لەسەریان دەکرد،

لە قوماشێك دروست دەکراو ریزە گوڵەنگێکی رەشی بچکۆڵانەی جوانیشیان بۆ دەکرد بە شیرازە، هەر چمکێکی چەند گوڵەنگێکی گەورەی بۆ دەکرا.

* دەستارزە:
لە پارچە کوتاڵو شۆرتکی گوڵەنگدار ئامادە دەکرێت بۆ پێچانەوەی منالی ساوا لە بێشکەدا.

* پێشتەماڵ- پشتەماڵ:
لە کالای ئاوریشم بە رەنگی سوور ئاماڵ قاوەیی خەت خەت لە شێوەی چارۆکە ئامادە کراوە، ژنان بۆ میوانی و لە بۆنەکاندا لە کۆڵییان دەکەن، جۆرێکە لە کۆڵوانە لە ئێستادا باوی نەماوە.

* پاپۆش:
جۆرە شەرواڵێکی ژنانەی شۆرە تا سەر پێ، لە قوماشی سادەی رەنگاورەك ئامادە دەکرێت، لەژێر کراس و بەسەر دەرپێدا دەپۆشرێت، شەرواڵێکی پان و پۆرە.

* گوڵوەنی-سرکەیی:
جۆرە کوتاڵێکی تەنکی نەرم و شلی ئاوریشمە، رەنگەکەی سپی و ئاماڵ رەشە، ژنان وەکو لەچك و چارۆکەش بە کاری دێنن.

* بۆیەمە-شەدە:
جۆرە سەرپۆشێکی ژنانەی رەنگ رەشی رێشوەدارە، بەسەرەوە دەبەسترێت، لەگەڵ پۆشاکی کوردی بەکار دێت، هەیشە لەجیاتی رێشوەکانی وردە گوڵەنگەکەی بۆ سازدەدەن.

* پشتێن:
لە قوماشی سادەی سورمەداری جوان دروست دەکرێت، پەراوێزەکەشی بە کوڵەنگی سانتیمی رەش تەنراوە، لە هەردوو سەریشییەوە دوو گوڵەنگی گەورەی بۆ کراوە، ئافرەتان لەسەر کراسەوە لە پشتیانی دەبەستن، بە زۆری لە شایی و بۆنەکاندا دەیپۆشن.

* شوێنی لەبەرکردنی جۆرەکانی جلوبەرگی ئافرەتانی ناوچەی کەرکوك:
١. لەبەرکردنی سەڵتە یان کۆڵنجەی ئافرەتان زیاتر لە ناوچە لادێکانی دەوروبەری کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت، بە تایبەتی لە لادێکانی تاڵەبان و لەیلان و جەباری و کفری.
٢. هەروەها کەوای ناوئاخن زیاتر باوێکی دێرینی لادێکانەو بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا.
٣. لەبەرکردنی سوخمەو کراس لە لادێکانی شوان و چەمچەماڵ و ئاغجەلەر زیاتر بەکاردەهێنرێت و ناو شاری کەرکوکیش بەکاری دەهێنن.
٤. سەرپۆش شتێکی باوی هەموو ناوچەکانی کەرکوکە کە هەریەکەو بەشێوەیەکی جیاواز دەیدەن بەسەریاندا، بەڵام لە سەردەمی بزووتنەوەی (هەقە)دا لە ناوچەی شوان و ئاغجەلەر، وای لێهات کە ئافرەتی ئەو ناوچانە سەرپۆش شتێکی باو نەبوو تیایاندا کە ئەمیش لەژێر کاریگەری بزووتنەوەکەدا بوو.
٥. بەکارهێنانی رەنگیش دەوری خۆی بینیوە لەنێوان گەنج و

ئافرەتە بەساڵا چووەکاندا، چونکە بەساڵاچووەکان زیاتر ڕەنگی تۆخ یان ڕەشیان بەکارهێناوە هەروەها بەکارهێنانی ڕەنگ لە وەرزی زستان لەگەڵ وەرزی هاویندا جیاوازی هەیە.

*** ئەو خشڵانەی بەکار هاتوون لەلایەن ئافرەتانی ناوچەی کەرکوکەوە:**

**- ژێر چەنە:**
ئەمە بریتییە لە زریزەیەکی باریك لە زیوو یان ئاڵتون لەژێر چەناگە دەبەسترێت.
**- کرمەك-کرمکە-کرمك-کرمۆڵە:**
لە زێر یا لە زیوو دروست دەکرێت.
**- گۆبەرۆك:**
لە لێواری سوخمە دەیدورن کە بریتییە لە زریزەیەکی درێژی (٠،٩٥) سم، بریتییە لە ڕیزە دوگمەی زێر یا زیوو کە لە بەرۆك دەدرێت.
**- گوڵ:**
**- گەردانە:**
کە ئەمەش گەردانە جەوهەرداری هەیە، لەگەڵ گەردانەی زیوو، بەڵام جەوهەردار بۆ چاوەزار بەکاری ئەهێنن.
**- قاپ قورعان:**
بریتییە لە قوتویەکی شێوە قورئان بە زنجیرەوە شۆڕبووەتەوە، لە ئاڵتون دروستی دەکەن و بە زنجیرێکی ئاڵتون دەکرێت بە ملەوە.
**- لوولە و زنجیر-لوولە و دۆڵاش-سیلاح لغ:**
بریتییە لە لوولەیەکی زیووی یان ئاڵتون، زریزەی پێوەیە لەمل دەکرێت و دێتە سەر سنگ.
**- لاگیرە-لاسەرە-بان زوڵفە-زوڵفەوانە:**

خلخالی ئافرەتان لە کاتی لە پێکردندا

زنجیرە قاشێکە لەسەربەست قایم دەکرێت، ئەم بەرهەمە لە زیوو یا زێر یا ورشەو دروست دەکرێت، ژنان دەیانکرد بە قەدی پووشێن یا بۆیمەدا بۆ خۆی ڕازاندنەوە یا جوانکردن.

**بازن:**
وادەبێت زیوو بێت، یان شووشەیی و پیرۆزی بێت کە شووشەییەکەی زیاتر لە شووشەی شین دروست دەکرێت، هەروەها بازنی (مفتاح) هەیە، وە بازنی (مەزرنیگی) هەیە لە زیوو دروست دەکرێ کە پانەو نەخشی لێدەکرێ و دەکرێتەوە.
**بەربازن:**
لەگەڵ بازن بەکاری دەهێنن کە کۆمەڵە موورویەکی دەنك گەورەیە بە داوێکییەوە دەکەن وەکو بازن لە زەندەی دەکەن، بۆ ئەوەی بازنەکان بیگرێتەوە نەیەتە سەر دەستی.
**-خلخاڵ و حجل- پاوانە:**
لە زیو و زێر یا وەرشەو دروست دەکرێت، ژنان بۆ جوانی لە پێی دەکەن.
**- دوگمە و دۆڵاب:**
زریزەیەکی پان و پەرە پەرە لەسەر کەمەر دەبەسترێت.
**- گەردەنە-گەردن مل-گەردانە:**
ئەمە زیاتر لەمل دەبەسترێت و پانە، جۆری زۆرە، لە زێر یا لە زیوو یان لە مووروی قەشەگ دروست دەکرێت.
**- گوارە-گۆشوارە:**
جۆری ئاڵتونی زۆرەو شێوەشی زۆرە، لە گوێ بەند دەکرێت.

خشڵی ڕازانەوەی سەری ئافرەتان

کڵاوی ئافرەتانی کەرکوک

- پشتەسەر:

ئەمەیش زیاتر لە زیووەو لەسەر کڵاو دەبەسترێت.

- پشتەسەری سلسلەدار:

ئەمیش جۆرێکە لە زیوو یا لە زێڕ دروست دەکرێت، کە بە سلسلەیی هاتووەتە خوارەوە.

- پشتەکۆڵە- محەمەدییە:

لە زێڕ یا زەردك دروست دەکرێت، بیست و پێنج جار ناوی پێغەمبەر (محەمەد) دروودی خوای لەسەر بێت، لەسەری نووسراوە، دەیکەن بە ملی منداڵی مێینەی ساواوە، بۆ چاوەزار بەکار دێت.

- ئەنگوستیلە-ئەمگوستیلە-کلکەوانە:

جۆری هەیە، لە زیوو یا ئاڵتون و شێوەی جۆراو جۆر هەیەو لە پەنجە دەکرێت.

- مووروو:

جۆرەها ڕەنگ کە زیاتر ڕەنگی شین و سەوزە.

- گوڵە:

- ساج لغ:

- دەرزیلە کوێرکە:

کە ئەمە گەورە و بچووکی هەیە، ژنان لە بەرۆکی بەند دەکەن.

- پاوانە:

هەیە لە زیوو هەیە لە ئاڵتون پوولەگەو زریزەی پێوەیە.

- قەنەفل بەند:

- سنجاق-دەرزی بەرباخە-فلکەتە:

جۆرە دەرزییەکە ژنان بۆ بەندکردنی بەرباخەو سوخمە بەکاری دێنن، ژنە دەوڵەمەندەکانیش لە زێڕ دروستی دەکەن.

- بەرچاوگە-بەرجێنك:

خشڵێکی زێڕی ژنانە کە بەسەر توێڵدا دێت بە پلپلەو مووررووی شیلانە و پیرۆزە ڕازاوەتەوە.

- شیلانە:

- گوڵەمەلیك:

- تەزبیح-تەسبیح:

بریتییە لە مولوانکەیەکی زیووی یان ئاڵتونی، شۆڕە بە قوبیە لە شێوەی فیشەك ڕازاوەتەوە، پێچەکەشی بۆ ئامادە کراوە، ژنان لە ملی دەکەن.

- بوراق:

- دەست گۆ:

- ئاشقبەند-عەشقبەند:

لەسەر سنگی ئافرەت دەبەسترێت، جۆرێکە لە خشڵی ژنان، لە زێڕ یا لە زیوو یا ورشەو یا لە زەردك ئامادە دەکرێت..

- هەیاسە:

خرە وەکو کڵاو بەڵام ئەمیان بچووك ترە، لە زێڕ یا لە زیوو یا لە وەرشەو دروست دەکرێت، لەسەر کەمەرە ئامادە دەکرێت.

- کەمەر:

پشتێنە زیووی یان ئاڵتونی لەسەر کەمەر دەبەسترێت.

- بازنگی سەعاتی:

ئەمە جۆری پانە.

- بازنگی زنجیرەیی :

ئەمە جۆری زریزەییە.

- بازوو بەنگ :

کە ئەمە لەسەر سەڵتەوە بەکار دەهێنرێت.

- گوێ لاسك :

- تاج کڵاوە :

لەسەر کڵاوەو ناوەڕاستی کڵاوەکەی قووت کردووە.

-لاگیرەی حەسیری :

لاگیرەی پان و پووشینی.

-تاس کڵاو :

- سەربسکە :

- لووتەوانە-خزێم-خزمە :

هەیە لە زیوو یان ئاڵتون کە هەندێکی پەرەی بچووك بچووکی هەیە، ئەڵقەی نێوان کونە لووتە بۆ جوانی.

- کەمەرە-کەمبەر :

پشتێنی ژنان لە زیوو یا زێڕ یا ورشەو، لە بان کراسی کوردییەوە دەبەسترێت.

- لوولەبەند :

جۆرە خشڵێکی لوولەلییە دوعای تێدەکەن، لە زێڕ یا لە زیوو یا وەرشەو دروست دەکرێت.

- گێلگێلە :

جۆرە خشڵێکی خڕە بە پلپڵە ڕازاوەتەوە، لە زیوو یا لە زێڕ ئامادە دەکرێت.

- سەرپەرچەم :

جۆرێکە لە خشڵی ژنان، بە سەرپێچەوە بەندی دەکەن، بریتییە لە ڕیزە پلپلەیەك لە زێڕ یا لە زیوو دروست دەکرێت.

- ئەلقە :

لە زێڕ لە زیوو ئامادە دەکرێت، بووك و زاوا لە کاتی ئاهەنگی شیرینی خواردنەوە لە دەستی دەکەن.

- حەتووەتە :

لە قوماشی ڕەنگامە لە شێوەی ملوانکە ئامادەی دەکەن، پارچە پەڕۆکان بۆ بۆن خۆشی پڕی لە حەوینج و مێخەك و سۆتکەو گوڵەباخ دەکەن، دەکرێت بە ملی مێینەو نێرینەوە.

- پاچکە مێخەك :

جۆرێکە لە خشڵ زێرنگەرەکان لە زێڕ یا ورشەو ئامادەی دەکەن، نەقیمەکەشی لە عەقیق یا مووروویەکەی جوان بۆ دادەنێن.

- قۆزاخە :

زێرنگەرەکان لە زێڕ یا لە زیوو یا ورشەو ئامادەی دەکەن، ژنان لە گوندو لادێکاندا دەیبەستن بەقەد پۆشین و سوخمەو چمکی چەفییەو مشکی و سەرپۆشە.

- تۆقە :

جۆرو شێوەی زۆرە، هەیە لە زێڕ دروست کراوە، هەیشە لە کانزا یا پلاستیك، ژنان لە قژیانی بەند دەکەن.

- مێخەك بەند :

ژنان برێك مێخەك لەگەڵ کووژەکەیەك یا مووروویەکی شیندا دەکەن بە دەزوویەکەوە بۆ بۆن خۆشی بە هۆی دەرزیلەوە لەژێر سوخمە، یان کەواوە دەیکەن بە قەدی خۆیاندا، کووژەکەکە یا مووروووە شینەکە بۆ چاوەزارە.

- ملوانکەی شووشەی زومرود :

- شان پەسەند.

شێوەی جلوبەرگی جارانی ناوچەی شوان

- مووروەبا:
- ئاقیق و یەشمی مۆر:
- سکەی کۆن:
- لاژەمرد:
- مولوانکەی تێکەلاو:
- شەوە:
- جۆرەکانی یەشم:
- بەرچاوە- پرچەکە:
- زەنگیانەی ئالتونی:
- چاوەزار:
- لوولە دوعا:
- لاچاو:
- سینە پۆش:
- لاسەرەی قرانی قاجاری:
- بازی بەند:
- گوار چناخ:
- مولوانکەی شیلان لە لوولەی دووعا:
- نۆخاڵ:
- پاموورە:
- سینەرێز:
- لاسەرەو پشتەسەر:
- ملوانکەی نەخشی مانگ و خۆر:
- کەمەربەند:

*** تایبەتمەندی شێوە جلوبەرگی هۆزەکانی ناوچەی کەرکوك:**

لە ناو کۆمەڵگا رۆژهەڵاتییەکاندا، دەستەو تاقمی جیاواز دەبنە بنچینەی پێکهێنان و دامەزراندنی وەك: بنەماڵەو هۆزو عەشرەت و ئێل، بێگومان گەلی کوردیش هەر هەمان پێکهاتەی دانیشتووانی هەیە، بەڵام ناوچەی کەرکوك جگە لەو جیاوازییە کۆمەڵایەتییانە، چەند جیاوازییەکی نەتەوایەتی و ئایینی تێدایەو بە هەموویان ناوچەیەکی هەمەچەشنەی دانیشتووانیان پێکهێناوە، هەروەك: کوردو تورکمان و کاکەیی و مەسیحی و جوولەکەو ...تاد، هەروەها هەر پێکهاتەیەکی دانیشتووان خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکە، کە جیاوازە لە کۆمەڵێکی تر، چونکە هەرەیەکەیان هەڵگری ئەو ژینگەیە کە گەشەی تێداکردووە.

یەکێك لەو دیاردانەی کە دەستەو تاقمەکان جیادەکاتەوە لە یەکتری شێوەی جلوبەرگە، کە هەریەکەیان هەڵگری چەند خاسیەتێکی کۆمەڵایەتین و لەگەڵیدا گەشە دەکەن، لە شێوەی دوورینی جلوبەرگ و جۆری قوماش و ڕەنگ و نەخش و نیگارەکان.

لێرەدا هەوڵدەدەین کە چەند پێکهاتەیەکیان بخەینەبەر باسەکەمان و کەمێك زانیارییان لەسەر ڕوونبکەینەوە.

*** شێوەی جلوبەرگی هۆزی داوودە:**

دەتوانین جلوبەرگی هۆزی داوودە دابەش بکەین بۆ سێ قۆناغ:

لە قوناغی یەکەمدا، جۆرە جلوبەرگێکی کوردی تایبەتییان لەبەر دەکرد کە پێك هاتبوو لەدوو بەش، بەشی یەکەم، بریتی بوو لە (سەڵتە) کە تەسك و کورت بووەو نەئەگەیشتە کۆتایی بڕبڕەی پشت و زیاتر لە قوماشێکی کە بەلای قاوەییەوە دەیڕوانی بۆ سوور دروستدەکرا، بەڵام پارچەی دووەمی وەکو ئەوە وابوو کە لە سلێمانی لەبەر دەکرێت، هەروەکو پانتۆڵ، بەڵام لەسەرەوە پان و لە خوارەوە تەسك بوو.

هەروەها کراسێکی کورتیان لەبەرکردووە، کە کۆتایی قۆڵەکانی بە دوو پارچە قوماش بووەو بە شێوەیەکی کەوانەیی بەسەر پشتیاندا هەڵیان داوەتەوە، جۆرە پێڵاوێکیان لەپێ کردووە کە لە جۆرە قوماشێکی کۆنە دروستکراوەو بە دەزووی سپی چنراوە، قوماشێکی ڕەشی وەکو (کوفیە) کە وەکو جەمەدانی وایەو سەری پێ دەپێچرێت.

بەڵام جلوبەرگی ئافرەتیان بریتیە لە جلوبەرگێکی سادەو درێژی ئاودامان پۆشە کە زیاتر ڕەنگی کراسەکانیان سوور یان ڕەشە.

جلوبەرگی داوودییەکان لە قۆناغی دووەمدا هەر هەمان جلوبەرگی قۆناغی یەکەمە، بەڵام لەم ماوەیەدا قوماشی لۆکەیی، بەکاردەهێنرا لە جیاتی قوماشی زبر، ئەو قوماشەی سەریان بە قوماشێکی حەریر گۆڕیوە کە لە ئێرانەوە هێنراوە، لە جیاتی کڵاشیش پێڵاوەکانیان لە پێستە دروستکراوەو بە ڕەنگی زەرد ڕەنگکراوە. دەربارەی جلوبەرگی ئافرەتانیش هەر هەمان جلوبەرگە، بەڵام قوماشی لۆکەیان بەکارهێناوە لە جیاتی قوماشی زبر.

بەڵام لە قۆناغی سێیەمدا (عەگال)و (کوفیە)یان فرێداوەو جەمەدانیان لە سەر کردووە، پێڵاوەکانیان لەسەر شێوازی نوێ دروستکراوە. بەڵام پیاوەکانیان لەجیاتی (سەڵتە)و (مواردخانی)و (چاکەت)و (ساقۆ)یان لەبەرکردووەو هەروەها لەکاتی بۆنەو ئاهەنگەکاندا دەستەسرێکی سووریان بە ملیانەوە کردووە[٥٠].

شێوە جلوبەرگی کاکەییەکانی ناوچەی کەرکوك

*** شێوەی جلوبەرگی هۆزی کاکەیی:**

کاکەییەکان هەڵگری پاشماوەی ئایینێکی کۆنن لە کوردستاندا، لە ڕووی هێمایی ئایینیو ڕێبازە چڕو شاراوەکەیان خاوەنی کۆمەڵێك بیروباوەڕو دابونەریتی جیاوازن لە ئایینەکانی تر، ئەگەر چی تاکو ئێستا چەند لێکۆڵینەوەیەکیان لەسەر کراوە، بەڵام مەرج نییە بگەینە ڕاستییەکی ئاشکرا لەسەر هەموو بەشەکانی ئەو ئایینە.

کاکەییەکان هەر لە دێرزەمانەوە هاتوونەتە ناوچەی کەرکوك و لە ناوچەکانی خورماتوو و داقوقدا نیشتەجێن، تارادەیەك شارستانییەتێکی گرنگیان دروستکردووە لە ناوچەکەدا، کە ڕەنگە بەشێك بێت لە پاشماوەی شارستانییەتی کۆنی کوردستان. چونکە توانیویانە تا ئێستا تاوی بیروباوەڕو ئایینییەکەیان بدەن لە بازنەیەکی داخراودا، هەروەها گەلێك لایەنی شارستانی ئەم میللەتەیان گرێداوە بە خۆیانەوەو پاراستوویانە، لە ڕووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو شێوە جلوبەرگو دابونەریتە کۆنەکانی کوردستان.

ئەوەی لێرەدا گرنگە شێوەی جلوبەرگەکەیانە، کە تاکو ئێستا خاوەنی خاسیەتی تایبەتی رابردووی خۆیەتی لە ڕووی بەکارهێنانی شێوە جلوبەرگی کۆنییەکانی کوردستان کە دەستی چەپەڵی لەناودان نەگەیشتووە پێی.

بەکارهێنانی پارچە جلوبەرگەکانی وەکو کەواو سەڵتەو مشکیو جەمەدانی، جۆرێکن لەو تایبەتمەندییەی کە هەیانە لە بەکارهێنان تاکو ئێستا بەکارهێنانی کەواو سەڵتە شتێکی زۆر باوە لەلادێکانی برا کاکەییەکانداو خاسیەتی مانەوەیانە لەناوچەکەدا. هەرچەندە لەگەڵ ئەوەشدا چاکەتو کەواویش بەکاردەهێنرێت، بەڵام زیاتر کاریگەری (سەڵتە)کە ماوە.

ئەگەر سەیری بەکارهێنانی (جەمەدانی) یان (مشکی) بکەین، دەبینین کە جۆرە بەستنێکیان هەیە جیاوازە لە ناوچەکانی تر، کە تایبەتمەندی خۆی هەیەو زیاتر بەشێوەیەکی فراوان لەسەردا ڕایدەوستێنن، یان هەڵدەستن بەهێشتنەوەی

جلوبەرگی جارانی حەویجە

شێوە جلوبەرگی کاکەییەکانی ناوچەی کەرکوك

شێوە جلوبەرگی کاکەییەکانی ناوچەی کەرکوك

بەشێکی زۆری جەمەدانییەکەو ڕاگرتنی لەسەر سینگ، کە لەمەدا دوو جەمەدانی یان مشکی و جەمەدانی بەکاردەهێنن، ئەویش زیاتر پیاوە بەساڵاچووەکان بەکاریدەهێنن، هەروەها بەکارهێنانی جەمەدانی وەکو شێوەی (عەگال) دەبەستنەوە بەسەر جەمەدانییەکەی تردا.

تایبەتمەندییەکی تری جلوبەرگی کاکەییەکان لەوەدایە کە جیاوازی نێوان چینە ئاینییەکان وەکو (سەید)و (مام) و (عام) لە شێوەی بەکارهێنانی ڕەنگەکاندا ناناسرێتەوە چونکە لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ڕەنگ وەکو موسڵمانەکان کاریگەری خۆی نییە؟، بۆ نموونە لە بەکارهێنانی پشتێنی سەوز، کە سەیدێکی موسڵمان لە پشتی دەکاتو لەواندا ئەو دیاردەیە هیچ گرنگییەکی نییە بۆ بەکارهێنان. وەکو ئەوەی لە جۆری بەکارهێنانی ڕدێنو سمێڵدا دەوری هەیە کە کەسێکی سەید لەگەڵ (مام)ی پێ دەناسرێتەوە هەروەها لە جۆری بەکارهێنانی کڵاودا بایەخ دەدەن بە کڵاوی ڕەنگاو ڕەنگو بەساڵاچووەکان ڕەنگی ڕەشو سپی بەکار دێنن، پیاوە گەورەکانیش عەبای ڕەش یان قاوەییان بەکارهێناوە.

*** شێوەی جلوبەرگی خەڵکی حەویجە:**

ناوچەی حەویجە بەوەی کە کەوتووەتە شوێنێکی گرنگی پارێزگاکەو لەسەر ڕێگایەکی سەرەرێیە بۆ ناوچەکانی تر، دەبینین کە هەمەرەنگیو هاوشێوەیی جۆربەجۆر هەیە لە جلوبەرگەکانیاندا. ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە پەیوەست نییە بەیەك شێوە جلوبەرگەوە. لە کۆندا لە ناوچەکەدا کەواو سەڵتەو ڕانكو چۆغە لەبەرکراوەو بەکارهێنانی مشکی بەستنەوەی مشکیو مێزەر باو بووە، بەڵام لەم سەردەمەی ئێستاماندا کەواو چاکەتو بەستنەوەی مێزەر باوەو مشکییەکە دەوری نەماوە.

*** مێژووی شێوە جلوبەرگی نەتەوەکانی کەرکوك:**

ئەوەی لێرەدا گرنگە کە ئاماژەی پێ بکەینو لەبەرچاومانە کە نەتەوەکانی کەرکوك لە کوردو تورکمانو عەرەبو کلدوئاشوری، هەریەکەیان خاوەنو هەڵگری چەند تایبەتمەندییەکی خۆیانن لە جلووبەرگو دابونەرێتو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، کە هەریەکەی دەگەڕێتەوە مێژوویەکی دیارو سەردەمێکی دیاریکراو لە گەشەکردنی مێژووی کەلەپوری خۆی، هەندێکی ڕەگێکی قووڵی هەیە لە مووتروبەکردنی نەتەوەکانی ترو جێ پەنجەی دیارە لە تایبەتمەندی ئەو میللەتە لە کەلەپورو مێژوو، تارادەیەکی زۆر تێکەڵاویو هەمئاهەنگی دەبینرێت لە تایبەتمەندی کەلەپوری هەریەکەیان، کە ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ هاوسێیەتیو تێکەڵاوی هەریەك لەم نەتەوانە لەگەڵ یەکتری.

مێژووی هەرمیللەتێك بریتییە لە کەلەپورو داب ونەرێتو ڕووداوە مێژووییەکان، بۆیە کاتێك مێژووی هەر میللەتێك دەنووسرێتەوە پێویستە ڕچاوی شێوە جلووبەرگو خواردنو داب ونەرێتو زمانو مۆسیقاو پیشەی دەستیو داب ونەرێتە کۆمەڵایەتییەکان بکرێت، کەهەریەکەی کاریگەری بەسەر ئەوی ترەوە هەیە لەپێگەیاندنی نووسینەوەی مێژووی ئەو میللەتە بۆیە کاری بەراووردکاری نێو نەتەوەکانی کەرکوك دەبێت لەو ڕوانگەیەوە بۆی بچینو ڕۆشنایی بخەینە سەر مێژووی هەریەکە لەونەتەوانەی کەرکوك.

*** شێوە جلووبەرگی جوولەکەکان:**

لە ساڵی (٦٠٤)ی پێش زانین کاتێك (نەبوخەزنەسەر) هاتە سەر حوکمو ڕێکەوتنێکی لەگەڵ پاشای جولەکەکان بەست کەناوی (یۆیاقیم کوری بۆناش) بوو لە (ئۆر شەلیم)، بەڵام لە دواییدا (یۆیاقیم) پەیمانەکەی شکاندو جێبەجێی نەکرد، لەسەر ئەمە پاشای (کلدانی) هەڵیکوتایە سەریانو ژنو پیاویانی بەتاڵان برد بۆ (بابل)و دابەشیانی کردە سەر وڵاتی (بابل) و(ئاشوور)و (وڵاتی ماد).

بەڵام لەدوای مردنی (نەبوخەز نەسەر)لە ساڵی (٥٦١)ی پێش زایین کە حوکمرانی بڵاوی لێ کردو ساڵی (٥٣٩)ی پێش زایین کە (کۆرش) هاتە سەرحوکم، ڕێگەی دایەوە بە (جوولەکە) بگەڕێنەوە بۆ (قودس)، کەژمارەیەکی کەمی گەڕانەوە.

لەبەر ئەوە ئەوانەی لە عێراقدان دەگەڕێنەوە سەردەمی (سبي البابلي)، لە پیشەی کشتوکاڵیو پیشەسازی دا بەناوبانگنو دەسەڵاتیان دەروات بەسەر پیشەی بازرگانیو زەرەنگەرىو ئاڵوگۆڕکردنی پارەو فرۆشتنی (مەی)، گەلێك کاری ترسناك دەکەن بۆ کاری بازرگانیو خۆیان لەگەلێك گیرو گرفت دەدەن[51].

دەبینین لە شارێکی وەکو کەرکوکدا، حکومەتی بەریتانیا ڕێژەی جوولەکەی لە ساڵی ١٩٢٠ بە ١٤٠٠ کەس داناوە بەڵام لەسەرژمێری ساڵی ١٩٤٧و ئەوەی کە حکومەتی عێراق

شێوە جلوبەرگی ئافرەتێکی جوولەکە

شێوە جلوبەرگی ئافرەتێکی جوولەکە

بەچەند ساڵ پێش کۆچکردنی یەکجارەکیان بە (٤٠٤٢) کەس خەملاندووە، سەرەڕای ئەوەی ئەمانەش وەك شوێن‌و شارو ناوچەکانی تر پەرستگەی تایبەت بەخۆیان‌و قوتابخانەی خۆشیان بۆ خوێندن هەبووە جگەلەوە چەندین ڕێکخراوەی جوولەکەیش لە شارەکەدا هەبووە بۆیە دەبینین لەم شارەدا مەسیحییەکان‌و جوولەکان هەمیشە هاوسێ‌و هاوماڵی کوردان بوون، هەردوو ئایینەکە لەهەندێ شوێنی دیکەدا لەگەڵ کوردە موسڵمانەکان دا تێکەڵ بوون کەبەچەندین کاری هونەری‌و پیشەگەری وردو جوانەوە خەریك بوون.
جولەکانیش وەکو هەموو ئەو نەتەوانەی تری ناوچەکە خاوەنی کەلەپوورێکی گرنگی ئەو شارستانییەتەن کە لە ناوچەکەدا گەشەی کردووە، پاشماوەکانیان لە هونەری بنیاسازی‌و تەرزی بنیاکاری ونەخش‌و نیگارو جلووبەرگ‌و داب‌و نەرێتەکانیان شایەدی ئەو ڕاستییەن‌و گەوایی فراوانی جیهانی جولەکەکانی کەرکوك دەدەن ئەو گۆڕانە مێژووییەی کە بەسەر ژیانیاندا هاتووە لەناوچەکەو ئەو ماوە درێژەی ژیانی دەسبەسەرییان، تا بەتەواوی کۆچکردنیان لە ساڵی (١٩٥٠) بەرەو فەلەستین، توانیویەتی خاسیەتێکی تایبەتی دروست بکات کەبێتە هۆی ڕەنگدانەوەی لە جوانکاری باری گشتی ژیانی جوولەکەکان.
ئەو پاشماوە مێژووییەی کە بەدەستمان گەیشتووە، ئەو دەردەخەن کەتواناى گۆڕانە مێژووییەکەیان تایبەت مەندییەکی بەربلاوی دروست کردووە کەلەگەڵ خۆیدا هەڵگری سەردەمەکانی پێوە دیارە، جیاوازی جیهانەکەیان وای کردووە ببێتە هەڵگری سیفاتێکی تایبەت بەوانەوە، ئەویش لەو دیاردەیەوە خۆی دەبینێتەوە کە پێویستە بکەوینە شی کردنەوەی قۆناغە مێژووییەکانی بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە.
چونکە گەشەی ژیانیان زۆر جیاوازە لەگەشەی نەتەوەکانی تر، ئەویش لەوەی هەڵگری سیفەتە ئایینیەکەیان وای کردووە خۆیان لە قۆناغێکی ئایینی گرێدراو بە قۆناغە سیاسی و مێژووییەکەیان ببینێتەوە.
هێنانی جولەکەکان وەکو بەندکراویی جەنگ هەر لەسەرەتاوە و چەوساندنەوەی بەردەوامیان وای کردووە کە بۆ خۆیان جیهانێکی تایبەت دروست بکەن‌و جوانکارییەکانیان لەو جیهانەوە خول بخواتەوە، بۆیە ئەگەر بمانەوێت ئەو جوانکارییە بزانین دەبێت هەموو لایەنەکانی ئەو جیهانە شی بکەین‌و تایبەت مەندییەکانی تاوتوێ بکەین، تا بگەینە ڕاستییەکان، جیهانەکەیان کە گرێ دراوە بەکۆمەڵێ کاری چەوساندنەوە لەلایەن دەسەڵاتەکانی ناوچەکەوە کەوای کردووە خۆی لوول بدات لە خولگەیەکی نهێنی هەڵگری هێما (رمز)ە ئاینییەکان‌و تاودانی ئەو نهێنییانەو ڕەنگدانەوەیان لەژیانی ڕۆژانەیاندا.
بۆیە جۆری پەرستنیان بەستراوەتەوە بەترس‌و خۆشاردنەوەو خۆپارستن کەلەگەڵ خۆیدا ئەم نووچ دانەکاری کردووەتە سەر بیرکردنەوەی ئارەزووی ئەم مرۆڤە جولەکەیە بۆ شتەکان‌و ئەفراندنی دروستکردنی شتەکان، هەوڵی داوە ئەوە بەدەست بهێنێت لە چوار چێوەی هێماکاندا خۆی ببینێتەوە، ئەوەی کەپێویستە سەرنج بدەین دەربارەی شێوەی جلووبەرگی جوولەکەکان لەکەرکوکدا دەگەینە ئەم خاڵانی خوارەوە:
١. ئەوەی کە بەرچاو دەکەوێت‌و ڕووداوە مێژووییەکان ئاماژەی بۆ دەکەن ئەوەیە کە جوولەکانی کوردستان ماوەیەکی دوورو درێژو مێژوویەکی فراوانە لەم خاکەدا دەژین‌و تارادەیەکی چاك‌و هەمەلایەنی تێکەڵاوی باری ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیریی لەگەڵ کوردەکاندا تێکەڵاوییان هەیەو تارادەیەکی چاك تێکەڵاوی‌و هاوشێوەی جلوبەرگی لەنێوانیاندا هەیە کەلەگەڵێك شوێن دەگەینە ئەوەی کەتەنها بەزمان‌و ڕێوڕەسمی ئاینییەکانیان لێك جوێ دەکرێتەوە ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کەتێکەڵاوی جوولەکەکان لەکەرکوکدا هەڵگری چەند خاسیەتێکی نەتەوەکانی ئەو شارەن‌و تێکەڵاوی شێوە جلوبەرگیان هەڵگری ئەو ماوە مێژووییە.
٢. ئەو جیهانە تایبەتییەی کەجوولەکە هەیان بووە لەسەر ڕێوڕەسمی جێبەجێ کردنی ئایینەکەیان لە شارەکەداو سنووری پەیوەندییان بەنەتەوەکانی شارەکەوە وای کردووە، کە کاریگەری ئەو جیهانە ئایینیە ڕەنگ بداتەوە، لە شێوەی جلووبەرگ وتەنانەت لەجۆری ڕەنگ‌و جۆری قوماش‌و جۆری

هێڵەدیارەکانی کاریگەرییە ئاینییەکان.

٣. (ئەوەی لە واقعیدا روونەو بەدیارە جوولەکەکانی کوردستان شێوە جلووبەرگێکی هاوشێوەیان نییە کە جیایان بکاتەوە، شێوە جلووبەرگیان هاو ئاهەنگە بەشێوەیەکی تەواو لەگەڵ جلووبەرگی دراوسێکانیان، کەتەنها جیاوازی لەشێوە جلووبەرگی ئاینییان هەیە، بۆیە جیاوازی نییە لەگەڵ جلووبەرگی کوردەکانو مەسیحیو جوولەکەکان...). کەئەمەیش دەگەڕێنەوە سەر گرێدراوی مێژووی هەریەك لەو نەتەوانە لەگەڵ یەکتری.

(جولەکەکانی کوردستان هەمان جلیان لەبەر دەکردو هەمان عادەتی جلیان وەك تەواوی دانیشتووان پێشان دەدا. تەلبەندیو قەدەخەکردنی جلوبەرگو سەپاندنی شت بەسەر جولەکەکاندا لە کوردستان باو نەبوو وەك ئەوەی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا هەبوو، هەر جیاوازییەك، کە هەبوو، ئاکامی ڕەوشی ئابووریی جوان بوو، ئەوان ڕەوشی ئابورییان باشتر بوو لە چاو دراوسێکانیان، هەر ئەمەش بوو ڕەنگی دابووە لە شێوازی جلپۆشینیان، واتە پۆشتەترو کەیفو سەفایان پێوە دیار بووە)[٥٢].

٤. بەکار هێنانی سیمای جێبەجێ کردنی ئایینی لەنێوانیاندا بووەتە خوڵقاندنی شێوە جلووبەرگێکی جیاواز، ئەویش لە جۆری ڕەنگو کاتی لەبەرکردنی بەتایبەتی لەبۆنە تایبەتییەکاندا.

٥. بەکارهێنانی جلووبەرگی درێژو داپۆشراوو بەتایبەتی جلووبەرگی ئافرەتانیان، بەڵام پیاوانیان حەز لە جلووبەرگی سووكو هاوگونجاو لەگەڵ ئیشەکانیان دەکەن.

(جلی پیاوان لە سووف دروستکراوی خوری مەڕ یان مەرەزەی بزن دەچنران. سووف بەکار دەهێنران بۆ دوورینی جلی ڕۆژانەو مەرەزەی بزنیش بۆ جلی گرانبەهاو کەشخەیی. جلە باشەکان زیاتر بۆ کاتی بووك گواستنەوە یان بۆنە تایبەتەکان دەدروان، کەزۆرجار بە نەخش دەڕازێنرانەوە بۆ چەندان ساڵ لەبەر دەکران.

کووتاڵی گرانبەها بۆ دوورینی جلی ئافرەتانو منداڵان لە قۆزاخەی ئاوریشم کۆدەکرانەوە لە دار بەڕووی ناو دارستانەکان. جلی ڕۆژانە لە پەمۆ دروست دەکرا کە هەرزانتر بوو. دوای شەڕی جیهانییەکەم، کارگەی کووتاڵ دزەی کردە هەرێمەکە، ئاوریشمو دیزاینی جاکواردو برۆکەیدو پەمۆو سەتانو حەریر پەیدا بوون، هەموویان دەستی چنیانیان رازاوەتر کرد)[٥٣].

٦. لەبەرکردنی پێڵاوی کەوشو کلاش، ئەویش دروستکراو لە بەن یان لەچەرم بەتایبەتی بەکارهێنانی کەوش لە زستاندا.

٧. لە ڕۆژانی شەممە دووکان وکاسبییان نەکردووەو زیارەتی تەوراتگەی خۆیان کردووە جلوبەرگی تایبەتی خۆیان ڕازاندووەتەوە. کەدەلالەت لە ڕێوەڕەسمە ئاینییەکەیان دەکات.

٨. بەکار هێنانی کلاوی چنراو لە خوری زیاتر ڕەنگی ڕەش بەکارهێنن بە تایبەتی پیاوانی جولەکە.

٩. هێشتنەوەی ڕدێن بەتایبەتی لەلایەن پیاوانی بەساڵاچووەوە.

١٠. پیاوانیان سەڵتەی درێژیان لەبەر کردووە لەسەر جلووبەرگەکانیانەوە.

١١. ژنانیان جلووبەرگی درێژ وپان پۆڕیان لەبەر کردووە.

١٢. (ڕەنگی سەرەکیی جلی پیاوانو ئافرەتان مۆر بوو لەگەڵ ڕەنگی سەوز، لەناو موسڵمانەکاندا سەوز زۆر باو بوو بەتایبەتی لە جلی بۆنەکاندا، جلی ئافرەتان ڕەنگی مۆری زۆر تێدا بوو، بەڵام بۆ پیاوان ڕەنگەکە کەمتر دەبینرا. ڕەنگی مۆر ئەوەندە باو بوو، بووبوو بە نەریت، ئەو ڕەنگە لەوانەیە لە رووەکە لۆکاڵە سەرەتاییەکانەوە هاتبێ، لەوانەیە سیمبولی شتێك بووبێت کە تا ئێستە پەی پێ نەبراوە،

کۆمەڵێك جلوبەرگی جوولەکەکان

سوورو پرتەقاڵیش بەکار دەهاتن، بەڵام کەمتر سوور رەنگی شەفافیەت بوو کەوا رووی بووکێنی پێ دادەپۆشرا. جلی بووکێنی سوور یان مۆر بوو، دوای ئاهەنگەکەش بۆ بۆنەکان لەبەر دەکرا، ئەو جلەی لە شەوی بووکێنیدا لەبەر دەکرا سپی بوو.

جلی رەش زیاتر لەبەر ئافرەتە پیرەکاندا دەبینرا، رەنگی سروشتیی مووی بزن زیاتر لە قاتی پیاواندا دەبینرا، پیاوە پیرەکان رەنگی تۆخیان دەپۆشی، گەنجەکانیش رەنگی کاڵ‌و سروشتی، جیاوازییەك هەبوو لەنێوان جلی شارو جلی گوندی، جلی شار لە دوو رەنگ پێك دەهات، بەڵام هی گوند لە چەندان رەنگ پێك هاتبوو)[٥٤].

١٣. هەروەها ئافرەتانی جوولەکە هەر یەکە لە کڵاو، چەفییە، کاروك، شەرواڵ، سودرە، هیلەك، کورتەك، فیستان، پشدێن، سوخمە)یان لەبەر دەکرد.

١٤. بەڵام پیاوان (کڵاو، کراس، هێلەك، چاکەی کورت، پانتۆڵ، پشدێن، شاڵ)یان لەبەر دەکرد.

*** شێوە جلووبەرگی میللی مەسیحییەکان:**

(جلوبەرگی میللی مەسیحییەکانی کوردستان هەمان جلوبەرگی میللی کوردییە وەك: کورتەك‌و شەرواڵ، شاڵ‌و شەپك، جەمەدانی لە سەرنان، ئێلەگ‌و پشتێن‌و کڵاش، کڵاو کەلەنگوچك، نەخش‌و نیگاری سەر شاڵ‌و شەپك‌و پەشمەو بەرگوز، بەڵام دوای جەنگی جیهانی یەکەم بەمەبەستی جیاکردنەوی مەسیحیەکان‌و دابرینیان لەنەتەوەی کورد هەر بۆ پروپاگەندە لە ئاهەنگەکانیان خاولییەکی درێژ لەمل دەکەن‌و کڵاوێکی قیت لەسەر دەکەن‌و چەند پەرە مووچەیەکی لێ دەبەستن، ئەگەر هەموو کوردستان بگەرێی مەسیحییەك نابینی لەم جۆرە جلەی لەبەربێ، کاتی خۆی هەموو هۆزانی مەسیحی‌و موسڵمانی کوردستان کڵاوی لبادی قیتیان لەسەری ناوەو میرەکانیش پەرەمووچیان لێ بەستووە. زاراوەی جلوبەرگەکانیشیان هەمان زاراوەی جلی کوردییە تەنها هەندێك لەم زاراوانە گۆرانی بەسەردا هاتووە:

**شەرواڵ:** شەرواڵ.

**جەمەدان:** جەمەدانی، جامانە.

**کالکەی، کالکە، کالك:** کڵاش.

**جاروخ:** جۆرە کەوشێکە لە پێستی سەری (گا) دروست دەکرێت، بەبەنێکەوە لەپێیەکان دەبەسترێت، ئەم جۆرە (کەوشە)ش لە رۆژی قورو باران‌و کاری کێڵگە لە پێدەکرێت.

**سول:** سۆلە، جۆرە کەوشێکی سوور یا رەش بووە لە شێوەی نەعل، لە شاری موسل دروستدەکرا تا بەم دواییەش دانیشتووی گوندان لەمەسیحی‌و ئیسلام لە پێیان دەکرد.

**گروب (جۆرەب):** گۆریە، جۆرە گۆرەوییەکی ئەستورە لە خوری دروست دەکرێت بەهۆی بەنێکەوە لەقاپ یالەلاق دەبەسترێت، ئەم جۆرە گۆرەوییەش تەنها لە زستانان لە پێ دەکرێت، زیاتریش لەگەڵ جاورخ لە پێ دەکرا.

شێوە جلوبەرگی ئافرەتی مەسیحی

**شباقا:** شباقا جۆرە پێتێن-ێکی نەخشێنراوە تاکو ئەمڕۆ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی تورکیا لەم جۆرە پشتێنە لە پشتێ دەکەن.

**گەردەنە:** گەردەنە، بریتییە لە زنجیرێکی زیو یان زێر بەنەخشی جۆراو جۆر دەنەخشێنرێت ولە گەردەن دەکرێت.

**کلوتا:** جۆرە کلاوێکە لە شێوەی کلێتە ئافرەتان لەسەری دەکەن، ژێرەکەی قوماشێکی سپی لەلۆکە دروستکراوە بانەکەشی قوماشی رەنگاورەنگ ونەخشێنراوە.

**کەفیە:** چەفیە، جۆرە چەفیەیەکە ئافرەتان لە سەر کلاو لەسەری دەبەستن زۆر جۆری هەیە لەوانەیش رەنگ واتە (پێنج رەنگ)و (شەش رەنگ).

**زمتا:** خەریم، بریتیە لەپارچە زێرێکی تەنکی خڕلەلایەکی لووت دەبەسترێت.

**خلخال:** خلخال، خرخاڵ، ئافرەتان لە پێیان دەکەن و لە زیو دروستکراوە.

**کەمەر:** کەمەربەند، جۆرە قایشێکە جاران لە زیو دروست دەکرا، ئافرەتان لە پشتیان دەبەست.

کەمەر ئاسووریان دوو جۆرە: ( کەمەر عادی، کەمەر شاتری).

**کلوتا دزوز:** دەسرۆك، هیزار، جۆرە هیزارێکە بانەکەی بە پارەی عوسمانی بە شێوەی بازنە نەخشێنراوە هەروەکو هیزاری موسلمانانە.

**مێزەر:** مێزەر، تیلاك، هیزار، دەسرۆك، مێزەر بریتیە لە قوماشێکی خوری نەرم کە خۆیان دروستی دەکەن، تایبەتە بە ئافرەتان و لفکەکەشی بەلاملیان دا شۆڕ دەکەنەوە.

**برەلا:** بەرامپێل، بریتییە لە قوماشێکی ئەستور، راست و چەپ لە ملیان دەکەن و تا سەرچۆك دادەپۆشێت، کاتێك ئافرەت بۆکار دەردەچێت لەبەری دەکات، جیاوازی بەرامپێلی مەسیحیەکان ئەوەیە کە بەرامپیلەکەیان، دەنەخشێنن، بەلام ژنانی ئیسلام ناینەخشێنن.

**کلوپا:** کلێتە،جۆرە کلاوێکی پیاوانەیە، لە خوری دروست دەکرێت و، دوو کەژی هەیە بۆ بەستانی لەمل و گوڵنگێکی گەورەی بەسەریەوە دەکەن، ئەم کلاوەش تەنها لە رۆژی سارد لەسەر دەکرێت)).

بەلام ئەوەی سەرنج دەدرێت لە شێوە جلووبەرگی مەسیحییەکانی ناوچەی کەرکوك کەتارادەیەکی وەکو بزر وایەو زیاتر جلووبەرگی باو لەبەر دەکەن و ئەوەی کەزیاتر شێوە جلووبەرگەکانیانە جلووبەرگی ئاسوورییەکانەو کلدانییەکانی کەرکوك هەرهەمان جلووبەرگی ژیانی کارگێڕی رۆژانە لەبەردەکەن.

ژنەبەساڵاچووەکانی مەسیحییەکانی کەرکوك ئەوانەی لەناوچەکانی شەقلاوە عەنکاوەوە هاتوونەتە کەرکوك جلووبەرگی سەریان جەمەدانی پیاوانە ئینجا بەشێوەی پێچانەوە یان وەکو لەچك لوولی دەدەن لەسەریان، ژنانیان جۆرە چاکەتێك لەبەر دەکەن وەکو سەڵتەی جارانی ئافرەت وایە.

جلووبەرگی پیاوانی ئایینی جیاوازی هەیەو زیاتر کراسێکی پان و پۆڕی رەش لەگەڵ سەڵتەیەکی درێژ تا خوار چۆك لەبەردەکەن(٥٥).

*** شێوە جلووبەرگی میللی تورکمانەکانی کەرکوك:**

شێوە جلووبەرگی تورکمانەکانی زیاتر کاریگەری خوازراوی دەرەکی پێوەدیارە لە شێوەی لاسایی کردنەوەو بەکارهێناندا کەهەڵقولاوی ناخی ئەوژینگەیە نییە کەتێدا میللەتەکە گەشەی کردووە، ئەویش زیاتر ئەوە بەدەردەکەوێت کە گۆڕانەکانی ڕۆژلە دوای ڕۆژ لەسەر شێوازێکەو هەڵگری سیفاتێکی دیاری کراونییە.

١. جلووبەرگی پیاوانیان بریتییە لە کەواو چاکەت و پشتێن و جەمەدانی و پێڵاوی چەرم.

کەواکەی هەمان کەوای جلووبەرگە کوردییەکەیە، بەڵام لە جیاتی سەڵتە لەسەریەوە چاکەتی ئەوروپی لەبەر دەکەن، لەژێر کەواکەوە کراسی سپی یەخەدار لەبەردەکەن و لێواری کەواکە بەنەخشی قووماش دەرازێننەوە لەتەنیشتەوە بە قۆپچەیەك بەسەر یەکەدا دەدەن و کەواکەیان وەکو کەوای لە پێشەوە والآیەو لەم لاو لەولاوە گیرفانی بۆ دادەنێنن یان بێ گیرفان دەیدوورن لەسەردەمانێکی زۆر زوو لەسەر کەواکەوە سەڵتەی کوردییان لەبەر کردووە، بەڵام بەداهێنانی چاکەت وازیان لە سەڵتە هێناوە.

٢. پیاوانیان مێزەری ڕەش و سپی لەسەردەکەن بەڵام قەبارەی خانەکانی شاشەو وەکو هی جەمەدانەی کوردی چڕو پڕ نییە.

٣. زیاتر پیاوانیان کڵاوی سپی لەسەردەکەن ونەخشەکەش بە دەزووی سپی ڕازاوەتەوە.

٤. لەبەر کردنی پشتێنی قایش زۆر باوە لایان لەسەر کەواوەو بەدەگمەن پشتێنی کوردی لەسەرکەوا دەبەستن.

٥. جلووبەرگی ئافرەتانیان بریتییە لە کڵاوو ئەتەگ و دەرپێ و سەرپۆش و کراسی سەر دەرپێ.

٦. ئەو کڵاوەی ئافرەتان لە سەری دەکەن لە شێوەی (طربوشي) پیاوانەو زیاتر سەرەکەی تەختەو ڕەنگەکەی زیاتر سوورەو بە پوولەکی جۆراوجۆرەوە نەخش دەکرێت.

٧. دەرپێی جلووبەرگی ئافرەتانی توورکمان وەکو هی ئافرەتی کورد فراوان نییە.

٨. سەرپۆشی سپی بەسەر کڵاودا دادەدەن.

٩. بەکارهێنانی هێلەگ لەسەر کراسەوە بەڵام لە هێلەگی کوردی فراوانترە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (الملابس الشعبية في العراق)، د. وليد الجادر، رسم ضياء العزاوي، بغداد، ١٩٧٦.

٢. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣)، ساڵی ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (من المواقع الاثرية في كردستان، بەردەبەلکە)، کەمال نوری مەعروف، لاپەرە ١٣٤.

٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦)، ساڵی ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (من المواقع الاثرية في كردستان، کەریم شایەر)، لاپەرە ١٤٧.

٥. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧٠)، ساڵی ١٩٨٨، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (كردستان مهد حضارة العصر الحجري الحديث)، فوئاد حەمە خورشید، لاپەرەکانی، ١٤١-١٤٢.

٦. گۆڤاری (رۆشنبیری)، ژمارە (١١٤)، ساڵی ١٩٨٧، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (کوردستان لەدوای چاخی سەهۆلبەندانەکەدا)، فوئاد حەمە خورشید، مەریەم عەزیز فەتاح، لاپەرە ٨٦.

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٨٧.

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٨٦.

٩. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧٠)، ساڵی ١٩٨٨، لاپەرەکانی ١٤١-١٤٢.

١٠. رۆژنامەی (العراق)، ژمارەکەی دیار نییە، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (قرية جرمو)، ١٩٨٣، لاپەرە ٤.

١١. گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٦٤٣)، رۆژی (٢٢)ی ئازاری ساڵی (٢٠٠٠)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (اكتشافات اثرية جديدة)، مونا سەعید، لاپەرە ٣.

١٢. (حضارة العراق)، کۆمەڵێك مێژوونووس، بەرگی چوارەم.

١٣. (تاريخ الفن والفن العراقي القديم، سومرو بابل و اشور)، د. سەروەت عوکاشە، بەرگی چوارەم.

١٤. (میدیا)، دیاکۆنۆف، وەرگێرانی (بورهان قانع)، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، لاپەرە ١٦٠.

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٦١.

١٦. رۆژنامەی (العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٧. گۆڤاری (کاروان)، ژمارەکەی دیار نییە، کە هی ساڵانی هەشتاکانە.

١٨. (المرشد الى موطن الاثار والحضارة، الرحلة الرابعة)، فوئاد سەفەر، تاها باقر، لاپەرە ٢٤.

١٩. (میدیا)، دیاکۆنۆف، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٠. گۆڤاری (سومر)، جلدی بیست و حەوتەم، بەشی یەکەم و دووەم، ساڵی ١٩٧١، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (صناعة الجلود في وادي الرافدين)، د. وەلید ئەلجادر.

٢١. (مێژووی گەلی لۆلۆ، دانیشتووانی کۆنی ناوچەی ئەمرۆی سلێمانی)، فازڵ قەرەداغی، ١٩٨٨، لاپەرەکانی ١٠-١١).

٢٢. (تاريخ الفن والفن العراقي القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٩.

٢٣. (الملابس الشعبية في العراق)، لاپەرە ٣٨.

٢٤. (حضارة العراق)، بەرگی چوارەم.

٢٥. گۆڤاری (افاق عربية)، ژمارە ٩، ئەیلول ١٩٨٨، (تحليل تصاميم الاقمشة الاشورية)، مونا عاید ئەلعەوادی.

٢٦. (المثقف الاثوري)، ١٩٧٤ تەمموز لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (اهمية الازياء في حياة الاشوريين القدماء)، یوسف تۆما هورمز، زانکۆی سلێمانی، لاپەرە ٤.

٢٧. (الملابس الشعبية في العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٥.

٢٨. (مێژووی مۆسیقای کوردی)، محەمەد حەمە باقی، ١٩٩٦، چاپی یەکەم، شهر کرد، لاپەرە ٨٦.

٢٩. گۆڤاری (العربي)، ژمارە ٩٢، تەمموز، ١٩٦٦، لاپەرە ٩٧.

٣٠. گۆڤاری (سومر)، بەشییەکەم و دووەم، بەرگی ٢٦، ١٩٧٠، لاپەرە ٧١.

٣١. (الحضر مدينة الشمس)، فوئاد سەفەر، محەمەد عەلی مستەفا، لاپەرە ٥٦.

٣٢. (دێرینەناسی و هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنیشی و ئەشکانی و ساسانی)، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وەرگێرانی: وریا قانیع، لاپەرەکانی (١٧٤-١٨٥).

٣٣. (حضارة العراق) بەرگی چوارەم، لاپەرەکانی ٣٧٤-٣٧٥.

٣٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٧٩.

٣٥. (الملابس العربية وتطورها في العهود الإسلامية)، سەبیحە رەشید رەشیدی، چاپی یەکەم، ساڵی ١٩٨٠، چاپخانەی (العلاء).

٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٧. گۆڤاری (سومر)، بەشییەکەم و دووەم، جلدی دوانزەهەم، ١٩٥٦، لاپەرە ٦٣.

٣٨. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٠٧) ئەیلول ١٩٨٥، (داب ونەریتی دێرینی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ لە دەشتی گەرمیان) لێکۆڵینەوەیەکی کەلەپوورییە، لاپەرەکانی ٣٠٥-٣٠٦.

٣٩. (ژیانی ئافرەتی کورد)، لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لەباری کۆمەڵی ئیسلامی عێراقەوە، هینی هارۆڵد هانسن، وەرگێرانی لەعەرەبییەوە عەزیز گەردی، ١٩٨٣.

٤٠. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٠٧)، هەمان سەرچاوەیس پێشوو، لاپەرەکانی ٣٠٥-٣٠٦.

٤١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٠٦.

٤٢. (ژیانی ئافرەتی کورد)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٤. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، ١٩٩٤، بەغدا، لاپەرە ٤٥.

٤٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٠.

٤٦. (الازياء الشعبية في العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی ٤٢-٤٨.

٤٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٩.

٤٨. (ژیانی ئافرەتی کورد)، لاپەرە ٢٠٧.
٤٩. (الازیاء الشعبیة في العراق)، لاپەرە ٩٧.
٥٠. (الداودیة ماضیها وحاضرها)، غالب عەلی داوودی، چاپخانەی (الحیدریة) لە نەجەف، ١٩٥١، لاپەرەکانی ٩١-٩٣.
٥١. (العراق قدیماً حدیثاً)، عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، چاپی حەوتەم سالی ١٩٨٢.
٥٢. (جوولەکەکانی کوردستان)، ئەحمەد باوەر.
٥٣. (جوولەکانی کوردستان، ژیانی ڕۆژانە، داوونەریت، هونەرو پیشە)، ئۆرا شۆرتس بێری، وەرگێڕیانی گۆران سەباح، ٢٠١٣، لاپەرە ٦٨.
٥٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٧٠.
٥٥. گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە ٣ سالی ٢٠٠٠، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (کەلتوری مەسیحییەکانی کوردستان، عەباس سلێمان سمایل).

*** نەریتی مردنو پرسە گرتنەوە لە دەڤەری کەرکوكو گەرمیاندا:**

**هەردەوێل کاکەیی**

لەسەرە مەرگی هەر کەسێکی موسوڵماندا چ لە گوندو چ لە شار مەلا دەهێننەماڵەوەو لە ژوور سەری نەخۆشەکە دادەنشێتو دەست دەکاتە قورئان خوێندنو سوورەتی یاسینی بەسەردا دەخوێنێ.

ئەمە لەبەر ئەوە دەکرێ تا نەخۆشەکە پێش مردنی ناوی خواو پێغەمبەرو شایەتمانیانو قورئانی لەیاد نەچێتەوەو خوای مەزن بەزەیی بەحاڵیدا بێتو بەئاسانی ڕۆحی بکێشێ و لەو دونیاش لەبەر خاتری ئەو قورئانە ڕەحمی پێدا بکاتو لە گوناهی خۆش بێت.

خزمو کەسو کارشی لەدەوری کۆدەبنەوە، بەو دیدەنییەی کەلەسەرە مەرگی نەخۆشدا ئەنجام دەدرێ پێ دەڵێن: (دیدار قیامەت) واتە ئیتر تا ڕۆژی قیامەت چاویان پێ ناکەوێ.

لەپاش مردنی کەسو کارەکەی دەگرینو بە دەنگێکی بەرز هاوارو فیغانو باوکەڕۆو شەپۆرو شینێ گەرمی بۆ دەگێڕنو مەلوولو خەمگین دەبن.

گەلێ جار لە نزیك دەرگای حەوشەدا هەندێ قوڕ دەگرنەوەو لەپیاوو ژن سەرو شانیان لە قوڕ دەگرن، هەر کەسێکیش لە خزمی نزیکی ئەو مردووە لە دەرەوە بێت ئەوە ئەویش سەرو شانی خۆی لەو قوڕە دەگرێو دەست دەکاتە باوکە ڕۆو دایکە ڕۆو برا ڕۆ.. پیاوەکان تا چل ڕۆژی ڕەبەق سەرو ڕیشیان ناتاشن.

لە پاش چلەی واتە تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بەسەر مردووەکەدا خاتردارێك یا ڕیش سپییەك دەڕواتە لایانو بەچەند وشەیەك دڵیان دەداتەوەو سەرو ڕدێنیان پێ دەتاشێ، ماوەی ساڵێکیش جلوبەرگی ڕەشی بۆ لەبەر دەکەن، ئافرەتاکانیان ژنو کچ تەنانەت سەرێشیان بەسەرپۆشی ڕەش دەپۆشنو کلیش لەچاو ناکەنو ناچنە سەر شاییو ئاهەنگ، خزمو دۆستو دراوسێکانیشیان لەبەرخاتری خزمایەتیو ئەرکی دراوسێتیو ڕێزگرتن لە خاوەن مردووەکە تاماوەیەك لە پێشیاندا خۆیان بە خەفەتبارو غەمگین دەزانن و ئاهەنگو شایی ناگێڕنو رادیۆو تەلەفزیۆنو ئامێری تۆمار (موسەجەل) بەکارناهێنن، ئەگەر هاتوو بەکاریان هێنا ئەوە بەجۆرێکی وا بەکاری دێنن کە خاوەن مردووەکە پێی هەست نەکات نەك دڵ تەنگو خەفەتبار بێ.

ئەگەر لەماوەی ساڵێکدا کەسێك لە ئاواییەکە بیویستایە ژنی بهێنایە یا خەتەنە سوورانەو شاییان بگێڕایە ئەوە ئەو دەهۆڵو زورنایەی کە هێناویانە بۆ شاییو زەماوەند گێڕان دەیانبردە پێش دەرگای ئەو ماڵە کەوا هێشتا ساڵێك بەسەر پرسەکەیاندا تێ نەپەڕیوە، چاوەشەکان بۆ چارەکە سەعاتێك یان زیاتر لەبەر دەرگایان نەزمی چەمەری لێ دەدەن، ئەم چەمەرییە بریتییە لە ئاوازێکی کلاسیکی حەزین هەر وەکو ئاوازی لاواندنەوە وایە بەڵام دەهۆڵژەن بە پێچەوانەوە بە دەستی چەپ دەهۆڵەکەی دەکوتێ، خاوەن مردووەکە سەر لەنوێ برینیان تازە دەبووەوەو دەستیان دەکردە گریان، لە پاشاندا مۆڵەتی خاوەن شاییان دەدا بۆ دەهۆڵ لێدانو شایی گێڕان، خۆ ئەگەر مردووەکە گەنج یا هەرزەکار بووایە ئەوە شینەکەیان زیاتر جۆش دەدا، ئەم چەمەری لێدانە بۆ ئەوە ئەنجام دەدرا تا خاوەن مردووەکە دڵ تەنگو خەفەتبار نەبنو لەخاوەن شاییەکەش زوویر نەبن.

پۆشاكو دەمژمێرو ئەنگوستیلەو تەزبیحو پێڵاوو مشکی مردووەکەیان دەدایە مەلا یا ئەو کەسەی دەیشوشت یا هەر کەسێکی هەژار کەوا خێری پێ ڕەوابێت.

چەند لاوێکی گورجو گۆڵ کەرەسەی گۆڕ هەڵکەندن هەڵدەگرن وەکو: (بێل، خاکەناز، پاچ، خانووبڕ)[1]دواتر بەرەو گۆڕستان دەڕۆنو لەوێ لەتەنیشت گۆڕی کەسو کاری مردووەکە پیاو بێ مەلا و ژنیش بێ ئافرەتێکی شارەزا دێننو ئاوی بۆ گەرم دەکەنو تەتەشۆرو[2] دارە تەرم (تابووت) دێننو دەیشۆنو کفنی دەکەن، زووتر کفن لە جاو ئامادە دەکرا، بەڵام ئێستا لە قوماشی بلووری سپی یا خامی سپی بەکار دێنن، ئەو جاوە جۆرە کوتاڵێکی چنراوی کۆنە زووتر هەژارانو دەروێشانو سۆفییەکان لەبەریان دەکرد، ئێستا باوی نەماوەو بەتەواوی لە ناوچووە.

هەر کەسێك لەو خەڵکە چاکیو پیاوەتی خۆی بەجێ دەهێنا واتە کەس کرێی وەرنەدەگرت، بەڵام ئێستا لە زۆر شوێنو ناوچەدا بەتایبەتی لە شارەکاندا بە پارە مردوو دەشۆنو گۆڕ هەڵدەکەننو قورئان دەخوێنن تەنانەت قاوەچیش پارە وەر دەگرێت.

مردوو شۆر مەرج نییە هەر مەلا بێ بەڵکو هەر موسوڵمانێ بۆی هەیە مردوو بشواو کفنی بکات، لەپاش شۆرینی مردووەکەو کفن کردنی دەیخەنە ناو دارە تەرمەکەوە، بەکۆمەڵ نوێژی تەرم (جەنازە)ی بۆ دەکەن ئەگەر گۆڕستانەکە نزیك بوایە ئەوە بە چواردەستە دارە تەرمەکەیان هەڵدەگرتو دەیانخستە سەرشانو بە (لا اله الا الله، محەمەد رسول الله) دەیانبردە سەر قەبران خۆ ئەگەر دووریش بوایە ئەوە بە ولاخ دەیانبرد، خەڵکی زۆریش بە دوای تەرمەکەوە دەڕۆیشتن، لە ڕێگادا تاو تاو یارمەتییەکیان دەدا بۆ ئەوەی هەموویان بە هەرەوەزی بەشداری لە هەڵگرتنی تەرمەکە بکەنو کەسیش هەست بە ماندوو بوونو شەکەتی نەکات، ئێستا بە ئۆتۆمبیل دەیبن.

هەندێ کەس چ پیاو چ ژن کە تەرمەکە گەیشتنە سەر قەبران لەسەر باوکە ڕۆو دایکە ڕۆو هاوارو فیغان دەکەنو خاكو خۆڵی گۆڕەکەشی بەسەر خۆدا دەکەن، دەستەی ژنان کۆری شیوەن بە هەی وەی شێرەو واوەیلێ لەوێ ساز دەدەن لەپاشاندا ئەگەر بۆیان ڕەخسا هەندێکیش دەلاوێننەوە.

لەپاش ئەوەی تەرمەکە بەخاك دەسپێرن مەلا تەلقینی بۆ دەخوێنێ، ئینجا هەموویان پێکەوە فاتیحەی لەسەر دەخوێنن.

جاران کاکەییەکان شتو مەکی ئەو مردووە لەگەڵ تەرمەکەدا بە خاکیان دەسپارد وەکو جلوبەرگ، ئامێری مۆسیقا، تەزبیح، دارجگەرە، کەشکۆڵ، دارعەسا، یا هەر

کەرەستەیەکی ئیش کردن، زۆرجاریش لەگەڵ ئافرەت دا دەستە بوخچەو خشڵو زێرو ملوانکەیان دەناشت، خەڵکی ئەم نەریتانەیان بۆیە ئەنجام داوە گوایە بەرایی چاویان نەهاتووە ئەو میراتییانە لەپێش چاویاندا بمێنی یا بیفرۆشن یا بیدەنە کەسێك، بێگومان ئەمە پاشماوەی پێش ئیسلامە.

بۆ گۆر بە دوو جۆر (لەحد) دروست دەکرێ، یەکەمیان لەلاوە بنکەنی بۆ دەکەن پێی دەڵێن (گۆریشکە) ئەوی دیکەشیان شامیانەی پێ دەوترێ، ئەمیان لەناوەراستی گۆرەکەوە لەحدەکەی بۆ هەڵدەکەنن و مردووکەی تێدەکەن و رووشی لە قیبلە دەکەن و بە تاوێر (تەختە بەرد) یا خشت سەری ئەلحەدەکە دەگرن و بە قوریش دەورو بەری سواخ دەدەن.

سێ تا حەوت رۆژ پرسە دەگێرن، سێ رۆژەکە زیاتر پەیوەندی بە شارستانییەتەوە هەیەو حەوت رۆژەکەش بۆ گوند نیشین، چونکە خەڵکی شار بە پێچەوانەی دانشتوانی ئاوایی کەمتر ماوەی دانشتن و شوێن و جێگای دانشتنیان هەیە، خێرو خێراتی شەوشام و سێ رۆژەو هەفتانەو چلانەو ساڵانەشی بۆ دەکەن، شەوشام ئەو خێرەیە کەوا لەیەکەم رۆژدا سەر لە ئێوارە دەکرێ ئەویش بریتییە لە سەربرینی ئاژەڵێك یا گوێرەکەیەك یا گایەك یا زیاتر ئەمە بەپێ دەست رۆینە واتە دەوڵەمەند زیاتر دەکا و هەژاریش کەمتر.

سێ رۆژەو هەفتانەکەش هەر بەو جۆرەیە لەم دوو موناسەبەیەدا حەلواو چێشتیان دروست دەکردو دابەشیان دەکردە سەر دراوسێکان و هەژارەکاندا هەندێ حەلواشیان دەبردە سەرقەبران و لەوێ دابەشیان دەکردە سەر ئەو ئافرەتانەی کەوا چوونەتە سەرقەبران، لە رۆژی سەرچلەو ساڵانەکەیدا خاوەن مردووەکە کە زۆربەی خزم و کەس و کارو دۆست و برادەرو دراوسێکانی ئاگادار دەکاتەوەو بانگهێشتیان دەکات، چەند ئاژەڵێکیش بە ناوی خێرەوە بۆ ئەو خەڵکە سەردەبرن، مەولوودیش دەکەن، هەر پیاوێك یا ژنێکی مردوو لە کاتی چلەو سەر ساڵیدا بەگوێرەی ژمارەی منداڵەکانی رۆژی لێ کەم دەکاتەوە واتە ئەگەر دوو منداڵی هەبوو ئەوە لە رۆژی (٣٨)دا چلەی بۆ دەکەن ئەگەر خاوەنی سێ منداڵ بوو ئەوە لە رۆژی (٣٧) موناسەبەکە ئەنجام دەدرێ.. هتد.

زۆر کەس لە هەفتەکەیشیدا مەولوودی بۆ دەکەن، دەف و دایەرەی شێخ و دەروێشیش دێنن و لەو مەولوودەدا کۆری زیکریش دەبەستن.

دەنگ کردنی خزم و کەس و کار لەو موناسەبانەدا نەریتێکی زۆر تازەیە لە ناوچەی گەرمیان و شوێنی تریشدا پەیدا بووەو بووەتە نەریت و چاولێکردن، بەزۆری لە ناو کاکەییەکاندا دەبینرێ و بەرێکوپێکی لەناو خۆیاندا ئەنجامی دەدەن، هەر چەندە زانا ئاینییەکان بە توندی دژی ئەم نەریتە نوێیە راوەستاون و بەکارێکی پووچ و بێ مانایی دەزانن بەڵام ئەو رۆژ لە دوای رۆژ لەپەرەسەندایەو لای خەڵکیش رەواجی پێ دراوە.

هەر کەسێك بڕواتە پرسەوە لە پاش خوێندنی سوورەتی (فاتیحە) کە یەکەم سوورەتی قورئانی پیرۆزە قاوەیەك و جگەرەیەك و چاییەکی پێ دەدەن و بەخێرهاتنی دەکەن بەڵام ئێستا لە زۆر شوێندا تەنیا قاوەو جگەرەو ئاو دەگێرن، یان هەر قاوەو ئاو، ئەو میوانانەی بۆ نیوەرۆ یا ئێوارە لەوێ دەمێننەوە یا ئەوانەی لە پرسەکەدا خزمەت دەکەن هەمدیسان لەوێ نان دەخۆن، لەهەندێ شوێنیش دا تا پرسەکە تەواو دەبێ دراوسێکان ئەرکی خواردن لێنان دەگرنە ئەستۆی خۆیان و پێشکەش بەمیوانی دەکەن، بە هیچ جۆرێك ناهێڵن خاوەن مردوو خواردن دروست بکات، ئەوانەی هاتوونەتە پرسەوە سەرخۆشی لە کەس و کاری خاوەن مردووەکە دەکەن و دەڵێن: (خۆتان خۆش، یا سەری ئێوە خۆش بێت، فەرمان خوایە، مردن هەقەو بۆ هەمووانە، چەند پێغەمبەرو پاشاو پیاوچاکان و ناوداران هاتووەتە دونیاوەو هەموویان لە ناوچوون)، بەم شێوەیە سەبووری بەدڵ باوك و براو کەس و کاری مردووکە دەدەن و زووتر هەر کەسێك بە پێی توانا یارمەتی خاوەن پرسەکەی دەدا چ پارە بێ چ ئازوقە وەکو: رۆن، برنج، ئاژەل، شەکر، چایی، جگەرە.. هتد.

بەمەش دەڵێن (پرسانە) ئەم دیاردەیە لەمرۆدا کەم بووەتەوە، ئەگەر کەسێکیش لە شارێك یا لە جێگایەکی دوور بێ و پێی نەکرا بچێتە پرسەوە ئەوە بەهۆی نامە یا بروسکەوە سەرخۆشی لە خاوەن مردووەکە دەکات بەو نامەیە دەڵێن (پرسەنامە).

ماوەی سێ رۆژیش[٣] مەلا دێنن بۆ قورئان خوێندن، لەکاتی قورئان خوێندندا هەر کەسێك بێت بۆی نییە سڵاو لە دانشتوان بکات یا (فاتیحە) بخوێنێ، دانشتوان و خاوەن پرسەکەش بەخێرهاتنی ناکەن تا مەلاکە لە قورئانەکەی دەبێتەوە.

خەڵکی گوند مەردانە لە ئیش و خزمەت کردن و بەرێکردنی میوانەکان یارمەتی خاوەن پرسەکە دەدەن مردووەکەش بەهی خۆیانی دەزانن، بەراستی ئەم جۆرە کارانە یارمەتییەکی زۆر چاکە بۆ خاوەن مردووەکە هەروەها لە ناو ئافرەتانشدا ژنێك قورئانیان بۆ دەخوێنی یا بەدەنگێکی بەرزو حەزین سەر شیوەن و شەپۆریان بۆ دادەنێ، ژنانیش بە شێوەکی بانە رادەوەستن و سەری خۆیان پەتی دەکەن و بەکوڵ دەگرین.

وەکو لە پێشدا ئاماژەم پێکرد هەندێکیشیان سەروشانیان لە قوردایە، روومەتی خۆیان بە نینۆك بریندار دەکەن و بەدەنگی باوکە رۆو دایکە رۆو برا رۆیان هەتا بتوانن بەرز دەبێتەوە، جار بەجاریش هەڵهەڵە لێ دەدەن و تارای زەردو سوور دەگرن بەدەستەوەو سەما دەکەن و گۆرانی بووکانە بووکێش بە شیوەنەوە دەڵێن، ئەم هەڵهەڵەو سەما کردن و گۆرانی بووکانەیە هەرچەندە بۆ خۆشی و شایی و زەماوەند دەوترێ بەڵام گەلێ جاریش لە شیوەنیشدا دەوترێتەوە بەتایبەتی بۆ مردنی پیاوی ئازا، ناودار، ژنی شۆخ و شەنگ، کور یا کچی لاو، زاوا، بووك، هەندێ جار ئەگەر تازە زاوا بمرێ بووکەکەی خشڵ و بەرگی بووکێنییەکەشی لەبەر دەکا و ژنانیش بە دەوریدا هەڵهەڵەی بۆ لێ دەدەن و گۆرانی بووکانە بووکێ دەڵێن و سەمایش دەکەن و لەگەڵیشی دا هەیوەی شێرە دەکەن و شیوەن جۆش دەدەن، بەراستی

دەبێتە ڕووداوێکی سەیرو دڵتەزێن، ئەوەی ئەم نەریتە ببینێت ئەگەر دڵی بەردیش بێ نەرم دەبێ و بەزەیی و ڕەحمی بەو کەسانەدا دێت و خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ و ناچار وەکو ئەوان دەست بەگریان دەکات.

ژنان هەر هەستیان بە مانووبوون کرد ئەوە دادەنیشن و ژنێکی قەیرە یا پرچ سپی دەلاوێنێتەوەو ژنانیش دەست دەکەنە نووکە نووك و دەگرین، ئەم نەریتە بە پێی ئاین نارەوایە.

جاران بۆ پیاوی ئازاو کەڵەمێرد و سوارچاك یا بۆ لاوەکان (کۆتەڵ) یان دەبەست، کۆتەڵ پەیکەرێکی کەسێکی شارەزا یا دارتاش بەدار لە شێوەیەکی سەرەتایی ئەندامی مرۆڤی دروست دەکرد، ئینجا پۆشاکی ئەو مردووەیان دەکردە بەرو مشکی و فەقیانەکەشیان بۆ دەبەست و دەیانخستە سەر ماین ئەگەر خاوەن چەك بوایە وەکو تفەنگ، تیرکەوان، شمشێر، ئەوە لە پێشیدا ئەو چەکەیان بۆ دەبەست و خەنجەرەکەشیان دەکرد بە قەد پشتێنەکەیدا یەکێکیش جڵەوی ماینەکەی دەگرت بەدەستەوەو بەناو ئاواییدا دەیان سوڕاند و ژنانی خزم و کەس و کاری مردووەکەش بەشوێنیدا بە هاوارو فیغان و شیوەن و ویقە کردن و چاو بەگریانەوە دەکەوتنە شوێنی و پێیان دەوت (کۆتەڵ) یا (کۆتەڵکۆ) بە دەهۆڵ و زورنایشەوە ئاوازی چەمەرییان بۆ لێ دەداو ژنانیش بە تایبەتی ژنە شایەرەکان شیعرو گۆرانی فۆلکلۆری دەوڵەمەندو بە پێزیان بۆ ئەم موناسەبەیە لەبەر کردووەو بۆ ئەو خەڵکەیان وتوەتەوە، هەندێ جار تا پرسەکە تەواو دەبوو ئەو کۆتەڵەیان لە نێو حەوشەدا دانا‌وە بۆ ئەوەی هەر کەسێ بیبینێ دڵی جۆش بێنێ و بگری.

ئەگەر مردووەکە کچێکی جوان و لاو یا تازە بووك یا دەزگیراندار بوایە ئەوە دەست و پێیان لە خەنە دەگرت و جلێکی ئاڵاو واڵایان لەبەر دەرکرد، چەشنی بووك دەیانرازاندەوەو هەر بەو بەرگەشەوە بە خاکیان دەسپارد.

لەسەر بانیش (کۆتەڵ) یان دروست دەکردو بەرگی ئەو کچە نەشمیلانەیان دەکردە بەرو تارای بووکیشیان دەدا بەسەردا یا ئاڵاو واڵاکەیان لەحەوشەدا دەدا بەسەر تەنافدا (پەت) تا پرسەکە کۆتایی پێ دەهات واتە حەوت ڕۆژو حەوت شەو.

جاری واش بووە دایکی کچە مردووەکە لە تاوانا هەردوو پەلکەکانی خۆی بە قاچی (مقەس) دەبڕی و دەیکردە پەلك بۆ کۆتەڵەکە.

کورد دەربارەی ئەم کۆتەڵە وتویەتی (ئەڵێی دار کۆتەڵکۆیە)، ئەمە بۆ یەکێ دەوترێ زۆر لاوازو کەم هێزبێ.

ئەمەش چوار پارچە شیعرە لە نموونەی ئەو جۆرە شیعرانە کەوا لە شین و لاواندنەوەدا دەوترێتەوە لەگەڵ چەند دێرێك لە چۆنێتی ئەنجام دانیان:

١. **شیوەن:**

ئەو ژنەی سەر شیوەن دادەهێنێ هەرجارێك ناوی کەسێك لە مردووەکانی ئەو ژنە دێنێ و باسی ئازایی و جوامێری و شۆڕە سواری و جوانی مردووەکە دەکا بۆ ئەوەی زیاتر جۆش بدا بەشیوەنەکەو ژنانیش زیاتر بگرین لەهەر نیوە خشت دا ژنانی دەورو بەری وەکو کۆرس رستەی (هەیوەی شێرە)یان (وای وای واوەیلێ) دەڵێنەوە تا شینەکە تەواو دەبێ، هەر ژنێکیش لەو کاتەدا لە دەرەوە بێت سەری خۆی ڕووت دەکات و دەست دەکاتە هاوارو ویقە کردن و بەهەردوو دەستیشی لە تەپڵی سەری خۆی دەدا جار بە جاریش پرچ خۆی ڕادەکێشێ، چەند ژنێکیش لە کەس و کاری مردووەکە بە ویقە ویق کردن و هاوارکردن دەچنە پیرییەوەو پێشوازی لێ دەکەن و ناوی مردووەکانیش دەهێنن.

*** شیوەن بۆ دراوسێ:**

هەی لاو، هەی لاو
کورە زەردە لاو
گریان لەچاو
بردیان وەتاو

نایان لە شاڵ
نایان لە چاڵ
هاوسێی خاسم
بۆت خەلاسم

*** شیوەن بۆ سوار چاك:**

سوار هەی سوار هەی وە نۆشم ڕۆ
لە ئۆردی برای تورمە پۆشم ڕۆ
سوار هەی سوار هەی وەنۆشم ڕۆ
لە ئۆردی برای خەڵات پۆشم ڕۆ
سوار بووە لە زین چوین هەردە جاران
شان ئەدا لە شان شۆڕە سواران

*** شیوەن و واوەیلا بۆ پیاوی ئازاو جوامێر:**

وای لەم شێرە، شێرێ قەوی
دای لە زەوی نرکەی نەوی
* * *
چەو دەشت سەحرا تۆزی وریزا
وای ئەو شێرە کەفت ورنێزا
* * *
خۆمیش وەقوربانی ماڵ سەرپەرت بام
وە حیلەی ماین، قارەی مەرت بام
* * *
پڵنگ پۆس وەبان زین تەلاوە
خزمەتچی بردی وەخزمەت شاوە
* * *
شێرو بەچکە شێر کەفتییەوە بێشە
ئێش بەچکە شێر ئای چەن وەئێشە

*** شیوەن بۆ پیاوی ئازاو کەڵەمێرد:**

چاوم کوێرە بۆ ئەو شێرە
دەمم فێرە دییەم کوێرە
سووتیام برژام بۆ ئەو شێرە
لەنگەر لەرزین میر داوەزین

لەدەشت و چۆڵ نریا لە خۆڵ
دییەم کوێرە بۆ ئەو شێرە

وەکو لە پێشدا باسم کردن هەر چەند گۆرانی بووکانە بووکانە بووکێ هینی شاییو بووك هێنانە بەڵام زۆر جار لەلایەن شیوەن داهێنەراوە لە شیوەنیشدا دەوترێتەوە جا لەپاش خوێندنی هەر نیوە خەت (بەیت) لە هۆنراوەکە ژنەکانی دی شێوەی کۆرس رستەی (هەیوەی شێرە) دەڵێنەوەو جار بەجاریش هەڵهەڵە لێ دەدەنو هەندێکیشیان سەمادەکەن بەتایبەتی ئەوانەی خزمی نزیکی مردووەکەن.

٢. **لاواندنەوە:**

ژنان لە پاش ئەوەی تاوێ چاك شیوەن دەکەنو هەست بەماندوو بوون دەکەن ئینجا لە شیوەن دەبنەوەو هەموویان بەشێوەیەکی بازنە بە کۆمەڵ دادەنیشن، ئافرەتێکی دەنگ خۆش بە ئاوازێکی خۆشو حەزین دەلاوێنێتەوەو ئەم جۆرە شیعرانەش لەبەر بۆیان دەخوێنێتەوە، ژنانی دەورو بەریش لەگەڵیدا دەست دەکەن بە نووکە نووكو دەگرین، ئەم شینو شەپۆرو لاواندنەوەیە مەرج نییە هەر لەناو پرسەدا بووترێ بەڵکو فرەجار لەسێ رۆژەو هەفتەو چلەو سەر ساڵی مردووەکەشدا لەسەر قەبران ساز دەدرێ، جاری وایش هەیە رۆژانی هەینیو جەژنەکانیش لەسەر گۆر بەرپا دەبێ، بەڵام لاواندنەوەکە بە تەنیا کەسێکیش دەکرێ، زۆر جار ئافرەتێك لە ماڵی خۆیاندا بۆ مردوویەکی دڵ تەنگو خومبار دەبێ، جا لە مەراقدا خۆی دەداتە بەر گریانو لاواندنەوە، بۆ ئەوەی لەم رێگایەوە بتوانێت هەندێ لەخەمو پەژارە لەدڵو دەروونی خۆیدا داماڵێ بەڵام شیوەن بەتەنیا کەسێك ناکرێ چونکە ئەمیان وەکو ئەو گۆرانیانە وایە کە بۆ خۆشیو شایی لەگەڵ کۆرس دا دەوترێت.

ئەوجا دەرئەچێ خەم لە خەیاڵم
دەنگ دایە وتنت بایە لەماڵم
* * *
بڵێنە دایکم خۆی بگرێ لە نەفت
لاشەی رۆڵەکەی لەو مەیدانە کەفت
* * *
بەبەم بەو مەچۆ رۆڵەم بەو مەچۆ
دییەت وە دییەی بەبەم بەو مەچۆ
* * *
بەنان بەنانەن بازار گشت بەنەن
ئیزرائیل وە زۆر کۆرپەم لێم سەندن
* * *
تۆ ئاگر وەدەس من پۆیش بەیار
خۆ منت سووتان خۆت داوە کەنار
* * *
فیشەگلغەکەت تون بوەست وەپشت
وە کوری نامەرد خۆت مەیە وەکەشت
* * *
دەلاڵ بانگ ئەکا وە دەنگێ زوڵاڵ
کەنیشك بێ برا بکەن زندە چاڵ

سەرەرای ئەمانەی کەوا باسم کردن چەند خاڵێکی تریش دەربارەی ئەو نەریتە هەن، دەمەوێ لێردا بۆتان بخەمەروو:

١. مردوو بە ساوینێکی رەقی دەیشۆن کە هیچ بەکار نەهێنرابێ، واتە نوێ بێ، گوایە ئەم کارە بۆ حورمەتو رێزگرتنە لە مردووەکە، چونکە بۆ میوانیش ساوینی نوێ دادەنێن، بەڵام ئەو ساوینەی مردووی پێ بشۆرن ئیتر بەکاری ناهێنن، زۆر جار ساوینەکە ورد دەکەنو دەیخەنە ناو دەسکێشەی کە لە کفنەکەدا دروست دەکرێو مردوو شۆرەکە لەدەستی هەڵدەکێشێو مردووەکەی پێ دەشوات.

٢. ئەو کەسەی کەوا مردووەکە دەشوات (مردووشۆر) بە گەیشتنی بەماڵ دەبێ خۆی بشوات تا قورسایی مردووەکەی لەکۆڵ بێتەوە، بێگومان ئەم بەڵگەیە بەڵگەیەکی لاوازو ساکارە چونکە مردوو هیچ گرانییەك ناخاتە سەر زیندوو، بەڵام لە راستیدا بە پێی ئایینی موسڵمان سوننەتەو ئەنجام دانی تەنیا لەبەر پاکیو خاوێنیە.

٣. دەڵێن: دەبێ هەر کەسێك پیاوو ژن لە ژیاندا حەوت مردوو بشوات، بەرای من ئەمە لەبەر ئەوە وتراوە تا هەر کەسێك بە ئارەزووی خۆی برواتە پێشەوەو مردوو بشواتو کەسیش خۆی لێ دوور نەگرێو هەموویانیش فێری ئەم نەریتە بین، ئەگینا لە هیچ سەرچاوەیەکی ئاینیدا ئەم بریارە نەهاتووە، هەروەها دەڵێن: دەبێ هەر ژنێك بە درێژایی ژیانی ناوکی حەوت منداڵ ببرێ یا هەر کەسێك حەوت جار لە کاتی خۆیدا بانگ بدات، ئەم نەریتانەش هەر وەکو شووشتنی مردووەکە وایە.

٤. پێش ئەوەی مردووەکە لەماڵ دەربکرێ سێ جار تەرمەکە بە تابووتەکەوە هەڵدەگرنو دایدەنێنو لەگەڵیدا دەڵێن: (لا اله الا الله، الله اکبر) گوایە ئەمە خودا حافیزییە لە مردووەکەو ئەجریشە بۆ دراوسێکان، ئەجری هێندە گەورەیەو ئەو ئەزیەتەی دەدەن بەرامبەر بەوە نەکوو دڵی دراوسێکانی لێ شکابێ.

جاری وایش هەیە ئاژەڵێکی لە پێشدا سەر دەبرنو کەسیش خۆی بە خاوەنی ئەو ئاژەڵە ناکات، لەپاشدا نوێژی تەرم (جەنازە)ی بۆ دەکەن.

کاکەییەکان سەرەرای ئەمانەش سێ نانی بتوون یەك لەدوایەك بەریزەوە لە پێش تەرمەکە رووەوپشت دادەنێن بۆ ئەوەی مردووەکە کە چاوی بە خێری بەدوای خێزانەکەیەوە بێتو نەبێتە هۆی نان براوییان، هەندێکیش دەڵێن: گوایە لەو کاتەی مردووەکە لەماڵ دەردەکرێ سێ سەگی هەوشاری رەش لە غەیبەوە دێن بۆ ئەوەی هەڵمەتی تەرمەکە بدەنو مردووەکە بخۆن، بێ ئەوەی کەسیش بیانبینێت، جا ئەو نانانە لە پێش تەرمەکە دادەنێن بۆ ئەوەی سەگەکان هەر یەکەو نانێکی بەرن تا ئەوان خەریکی خواردن دەبن مردووەکە لەماڵ دەردەکرێ تەرمەکە هەر لەماڵ دەرچوو ئیتر ئەو سەگانە ماڤ خواردنیان نامێنیو بەهیچ جۆرێکیش توخنی ناکەون، سەرەرای ئەمەش دەبنە ئاشنای خاوەن ماڵەکە چونکە نانو نمەکی ئەو ماڵەیان کرد کەوا مردووەکەی لێ مردووە، لای نەتەوەی کوردو گەلانی تریش سەگ بەوەفاییو ئەمەکداری ناسراوە بۆیە پێشینان وتویانە (نان بدە بەسەگ مەیدە

بەسفلە)، بێگومان ئەم نەریتە ساکارەو ناراستە.

٥. لەو جێگایەی مردووەکەی تێدا دەشۆن چرایەك هەڵدەکەن و هەندێ خوێ و برنج یا ساوار یا لەتێ نان لەتەنیشت چراکەوە دادەنێن، بۆ ماوەی سێ یا حەوت شەو شوێنەکەی بە رووناکی دەهێڵێتەوە تا جێگاکەی لە پڕێکدا بە تاریکی نەمێنێتەوەو چاوی لەنان و ئازوقەی ماڵ و منداڵەکەی یا خێزانەکەی نەبێت و لەگەڵ خۆیدا نەیبات.

گوایە لەماوەی پرسەکەیدا رۆحی ئەو مردووە دێتەوە ماڵەکەی جا ئەگەر شوێنەکەی تاریکی ببینێ گەلێ خەمبارو زویر دەبێ گوایە وا دەزانێ وەجاخی کوێرەوە بووە.

ئینجا دەڵێ: ئاخ چیم بەخۆم کرد تا مابووم لەبەر خاتری ماڵ و منداڵ لە دڵم نەدەهات خێرو خێرات بکەم و یارمەتی هەتیوو هەژاران بدەم ئەمەش حاڵی ئەوانە.

هەندێکیش لایان وایە رووناکی ئەم چرایە بۆ مردووەکە خێرەو لەو دونیایش دەبێتە رۆشنایی بۆ مردووەکە واتە رێگای بەهەشتی بۆ رووناك دەکاتەوە، هەندێکیش هەن جگە لەو شتانە خشتێك سوژنێك یا بسمارێك (مێخ) لەتەنیشت چراکەوە دادەنێن بۆ ئەوەی جنۆکەی شەریان لێ بەدوور بێ، لە سییەکانی سەدەی رابردووەوە بەرەو خوار لەجیاتی ئەو چرایە بۆ هەمان مەبەست لەکاتی خۆرەزەردەدا (زەردەپەر) لە شوێنی مردووەکەدا ئاگریان دەکردەوە، ئەمیش لەگەڵ زانستی ئەمرۆدا ناگونجێت.

٦. لەسێیەم رۆژو هەفتەکەیدا حەلوایان دەبردە سەر قەبران، بە زۆریش خۆیان ئەو حەلوایەیان لە خورماو ئاردو رۆن دروست دەکرد، زووتر لەیەکەم رۆژدا پێش ئەوەی تەرمەکەی بەرن ئەو حەلوایەیان ئامادە دەکردو دەیانبردە سەر قەبران و لەوێ بەسەر ئەو خەڵکەی ئەوێدا دابەشیان دەکردو دەیان خوارد یا لەجیاتی حەلوا نانە چەورەیان ئامادە دەکرد، بەم نەریتەو ئەو ئاژەڵەی لەپێش تەرمەکەدا سەردەبرێ دەوترا (خێرات پێش تەرم) یا (گەرمە گۆر) یا (پێش بەر قیامەت).

زۆربەی کاکەییەکان ئەمرۆ بەتایبەتی دەستەی ئاینییەکان لەسەرەتای هەفتاکانی ئەم سەدەیەوە کەوتوونەتە خۆیان و خواردنی پرسەو خێراتی پێش تەرم حەڵاڵ و رەوا نازانن، هەشە لێیان چایی و قاوەی پرسەش ناخواتەوەو جگەرەش ناکێشێ، زۆربەریان تەنیا قاوەیەك دەخواتەوەو ئیتر هیچ، هەشە تەنیا خێراتی پێش تەرمەکە بە حەرام دەزانێ بەتایبەتی بە ساڵاچووەکان، ئەم نەخواردنەش لەبەر ئەوە بریار دراوە تا ئەرکێکی زیاتر نەکەوێتە سەرخاوەن مردووەکە.

٧. هەر کەسێك بەشەو بمرێ ئەگەر ئەو شەوە بۆیان نەکراوە فریا نەکەوتن بە خاکی بسپێرن ئەوە تا رۆژ دەبێتەوە بە دیاریەوە دادەنیشن و قورئانی لەسەر دەخوێنن و چەقۆیەکی بچووکیش لەسەر سینگی دادەنێن، گوایە کێردەکە لەبەر ئەوەیە تا تەرمەکە بۆنی لێ نەیەو جنۆکەی شەرخوازیش لێ بەدوور بێ نەك تووشی (گۆرنەسار)ی بێنن واتە گۆرگووشین، یا میزی بەسەردا بکەن، گوایە جنۆکە لە شتی نووك تیژی وەك چەقۆو دەرزی دیلوان و سووژن و بسمار.. هتد دەترسێت و تخوونی ناکەوێت.

٨. ئەگەر تەرمێکیان بە گەرەکێکدا تێپەر کرد ئەوە لەیەکەم ماڵەوە تا حەوتەمین ماڵ ئاوی کوویەکەیان دەرێژن، گوایە حەزرەتی ئیزرائیل کە فریشتەی رۆح کێشانە بەو کێردەی کە مردووەکەی پێ کوشتووە لەو کووپانەدا دەیشوات تالە خوێنی مردووەکە پاکی کەنەوە، بێگومان ئەم نەریتە ئەفسانەیەو لە راستییەوە دوورە.

٩. زۆربەی خەڵکی گۆر هەڵەگرن و زۆر کەسیش ناوو مێژووی مردنی مردووەکەش لە رووی کێلەکەی تۆمار دەکەن و لە پاڵ گۆرەکەش دارێك دەنێژن و هەموو رۆژێك یا هیچ نەبێ لە هەفتەی دووجار یا جارێك ئاوی دەدەن بۆ ماوەی حەوت هەشت ساڵێك دواتر بەرە بەرە کەمی دەکەنەوەو وازی لێ دێنن، دارەکەش گەورە دەبێ و رەگو ریشەی دەچێتە ناخی زەویدا، ئیتر دەبێتە دێمی و هێندە پێوستی بە ئاو نامێنێ، ئەویش لەبەر ئەوەی نەکو خۆیشیان نەمێنێ و کەس نەبێ چاودێری بکات و ئاوی بدات، ئەم دار ناشتنە بەپێی ئاین سوننەتە، گوایە دارەکە ناوی خوا دێنێ و زیکر دەکا، وا دەزانن لەبەر خاتر زیکرو ویردی ئەو دارە خوای مەزن لە گوناهی مردووەکە خۆش دەبێت.

١٠. ئەگەر هەر کەسێك لەخەودا بینی ئاشنایەکی یا خزمێکی یا کەسێکی ناسراو بمرێ وا دەزانن کەسە مردووەکە تەمەنی درێژ دەبێ یا تەمەنی چەند بێ ئەوەندی دیکەی بۆ دەنووسرێت.

١١. جاران لەپاش سێ رۆژە جلوبەرگی مردووەکەیان لە کاتی زەردە پەردا دەشوشت و لەسەر پەت هەڵیاندەواسی بۆ سبەی زوویش پێش رۆژ دەچوون هەڵیان دەگرت و دەیانوت نابێ تیشکی خۆر لێ بدات چونکە مردووەکە لەژێر گڵدایەو ئیتر بۆ هەتا هەتایە بێ بەشە لە تیشکی خۆر.

١٢. ئەو جامەی مردووی پێ دەشۆن بە هیچ جۆرێك لەسەر زەوی دانانرێ تالە شووشتنی مردووەکە دەبنەوە ئەمە لەبەر پاکییە.

١٣. گۆری مێینە لە هێنی نێرینە زیاتر قووڵ دەکرێ، لەبەر ئەوەی ئافرەت زەعیفەیە تا زیاتر نامووس و شەرەفی داپۆشرێ، هەشە دەڵێ ئافرەت ترسنۆکترە لە پیاو بۆیە گۆرەکەی قووڵ تر دەکرێت.

١٤. دەڵێن: دایك بۆ مردنی جگەر گۆشەکەی زۆر بگری گۆری کۆرپەکەی پر لە ئاو دەبێ گوایە ئەو فرمێسکانەی کەلە چاوانی دێتە خوارەوە هەر دڵۆپێکی دەبێتە مەنجەڵە ئاوێك و دەچێتە ناو گۆری منداڵەکەیەوە، بەرای من ئەم نەریتە لەبەر ئەوە هاتووەتە گۆرێ تا دایك بۆ جگەر گۆشەکەی زۆر نەگریت.

١٥. جاران خاوەن پرسە پارچە قوماشێکی دەبەست بە قەد دارێکەوەو دەیکردە پەرچەم و لەسەربانەکەیان دەیچەقاند تا پرسەکە کۆتایی پێدەهات، بۆ ئەوەی کەسێکی ناشارەزا لە دوورەوە بهاتایە بەبێ پرس کردن بزانێ ئەو ماڵەی ئاڵاکەی بەسەرەوەیە خاوەنی پرسەکەیە، ئیتر یەکسەر بەرەو ئەوێ دەچوو، یا خاوەن مردووەکە چەند کوری هەبوایە بە گوێرەی ژمارەی کورەکانی ئاڵای دەچەقاند، ئێستا لە جیاتی تەتەشۆر لەبەر دەرگا دادەنرێت.

١٦. هەر کفنێك بە دەزووی خۆی واتە لە خامەکە دەزوو

دەردێنن‌و بە دیلوانیش دەیدوورن، قایچی‌و دەرزی‌و دەزووی ئاسایی بەهیچ جۆرێك بەكار ناهێنرێ‌و بە گوناهی دەزانن، دەڵێن: ئەو شتانە بۆ زیندوو بەكار دەهێنرێ نەك بۆ مردوو، هەر پیاوێك چەند ژنی هێنابێ ئەوەندی ژمارەی ژنەكانی كفنی بۆ دەكەن بۆ ژنیش بە گوێرەی ژمارەی شووكردنەكەیەتی، كفن هینی پیاوو ژن كورو كچ لەم شتانە پێك هاتووە: (ئاوەڵ كراس یا كراسی قیامەت)، ئەم كراسە لە پشتێنەوە تا سەر ئەژنۆی مردووەكە دێت، بەرماڵ ئەمیان دەبەسترێتە كۆڵیەوە، كڵاو (قۆچكە)شی پێدەڵێن، سەرپۆش، بە دەوری كڵاوەكەدا دەبەسترێ، كفن یا (كراس) ئەمیان وەكو كیسە وایە مردووەكەی تێ دەكرێ‌و سەر كفنەكەو پێ‌و پشتی مردووەكە لە سەر كفنەكەوە دەبەستن بەڵام لە كاتی ناشتندا دەكرێتەوە، بۆ مێینە پەرۆی بێ نوێژیشی بۆ دادەنرێ، ئەمە بۆ پاكی كفنەكەیە، زووتر بە (هەوری)ش چاویان دەبەست لەبەر ئەوەی نەترسێت.

١٧. زۆرجار بە شەوی هەینی مۆم یا چرا لەسەرگۆڕی مردوو بەتایبەتی گۆڕی پیاو چاكان دادەگیرسێنن، ئەم نەریتە بەخێر دەزانن، ئەمەش بەپێی زانین ناراستە.

١٨. ئەوەی نچێتە زیارەتی گۆڕی پیاوچاكێ یا بچێتە سەر گۆڕستان سوورەتی (فاتیحە)ی لەسەر دەخوێنێ، بەپێی ئاین ئەمە ئەجرە بۆ زیندووەكەو خێریشە بۆ مردووەكە.

١٩. هەر كەسێك بچێتە پرسەوە، نابێ لەوێوە بچێتە دیدەنی نەخۆش یا هەر كەسێك، خەڵكی وا دەزانن قورسایی ئەو پرسەیە دەكەوێتە سەر لەشی نەخۆشەكەو دەردەكەی گران تر دەبێ یا كەسە لەش ساغەكە تووشی دەردو نەخۆشی دێ، ئەم نەریتەش پڕو پووچەو لە ڕاستییەوە دوورە.

٢٠. ئەگەر ژنێكی دووگیان (سك پڕ) بە منداڵەكەیەوە بمرێ دەڵێن: ساواكەی سكی دەبێتە (گۆڕكەنك-گۆڕهەڵكەن)، ئەم زیندەوەرە لە گۆڕستان دەژی، گۆشتی مردووەكان دەخوات، ڕەنگی بۆرو لە پشیلە دەچێ بەڵام ئەم لەپشیلەی ئاسایی بچووكترو باریك ترە، ئەم نەریتە ئەفسانەیە.

٢١. هەندێ لەزانا ئاینییەكان خێرو خێرات كردن بۆ مردوو بەلایەنەوە پەسەن نییە، ئەوە بەڕاست دەزانن هەر كەسێك لەژیاندا خۆی خێرو چاكەو حەسەنات بكات ئەگینا چاكەییەكێكی دی لەو دونیادا بۆ تۆ چ دەگەیەنێ، بەپێی ئاین خێرو كردەوەی چاك لەو دونیادا دەبێتە چراو ڕێگەی تاریك‌و نووتكت بۆ ڕووناك دەكاتەوە.

٢٢. ئەگەر كەسێك لە ژیاندا حەجی نەكردبێ هەندێ جار لە پاش مردنییەكێك لە خێزانەكەی لە جیاتی ئەو حەجی بۆ دەكات‌و گەردنیشی خۆش‌و ئازاد دەكات، بەزۆری ئەمە مردووەكە خۆی لەكاتی نەخۆشی یا سەرەمەرگ دا ڕادەسپارێ (وەسیەت) دەكات‌و لەسەر ئەركی ئەویش دەچێتە زیارەت‌و تەواف دەكات.

٢٣. ئەگەر دوو كەسی دووانە لە سكماكەوە بەرەو پشت بەیەكەوە نووسابن واتە هەر یەكەیان بە پێچەوانەی ئەوەی دیكەوە ڕووی لە شوێنێكی دیكە بوو، ئەگەر هات‌و مردن ئەو كاتەی بە خاكیان بسپێرن یەكێكیان ڕوو لە قیبلە دەكەن‌و بۆ ئەوەی دیكەشیان ئاوێنەیەك ڕووەو قیبلە لە پێشاندا دادەنێن، واتە ئاوێنەكە دەم‌و چاوی مردووەكە بەرەو قیبلە پیشان دەدا، بەم كارەیان دڵنیا دەبن كەوا هەردووكیان ڕوو لە قیبلە بەخاك سپارد.

٢٤. دەڵێن گوایە لەپاش ناشتنی هەر مردوویەك لەو كاتەی خەڵكی گۆڕ بەجێ دەهێڵن، مردووەكە سەر بڵند دەكاتەوە تا لەگەڵیاندا بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە لەو سەر بەرز كردنەوەدا لووتی لە بەردی ئەلهەدەكە دەداو دەڵێ: ئاخ ئەمە شوێن‌و ئارامگای هەقیقەت‌و ڕاستەقینەمە، بۆ كورد وتویەتی:(ئا ئەو ڕۆژەی لووتی لە بەردی ئەلهەد دەدا)، ئەمە بۆ كارێ وتراوە ئەنجام دانی مەحاڵ بێ، هەندێ كەس دەڵێن ئا ئەو ئان‌و كاتەی سەری مردوو لە ئەلهەد دەدا خێرو حەسەناتی پێ ڕەوایەو خوایش بۆی دەنووسێ، (خێراتی پێش تەرم) یان (گەرمە گۆڕ) هاتووەتە گۆڕێ، بێگومان ئەم نەریتەش پووچەڵەو بە گوێرەی ئاین نییە.

٢٥. هەر مردوویەك یەكەم جەژنە بەسەریدا تێپەڕ بێ كەس‌و كارەكەی لەماڵەوە دادەنیشن‌و خزم‌و دۆست‌و دراوسێكانیان دێن بۆ لایان‌و(فاتیحە) دەخوێنن‌و سەرخۆشیان لێ دەكەن، ئەوانیش قاوەو چایی‌و جگەرەیان پێشكەش دەكەن، بەم نەریتە دەڵێن: نۆجەژنان.

٢٦. دەڵێن هەر كەسێك لە ڕۆژانی جەژنە یا هەینیدا بمرێ ئەوە بەختی یاوەرو بەبێ هەق‌و حەسارو دەچێتە بەهەشت، بۆیە زۆر كەس خۆزگە دەخوازێ لەو ڕۆژانەدا كۆچی دوایی بكات بەتایبەتی بە ساڵاچووەكان.

٢٧. هەر كەسێك لە ئاودا بخنكێ‌و بكەوێتە بن ئاوەكەوەو نەیدۆزنەوە، چاوەش دەهێننە سەر ئەو ئاوە، دەریابێ یا ڕووبار یا هەر ئاوێكی قووڵ، چاوەش دەست بە دەهۆڵ كوتان دەكات، گوایە بە دەنگی دەهۆڵەكە ئاوەكە دەجووڵێتەوەو مردووەكەش دێتە سەرەوە.

٢٨. ڕۆژگاری پێشوو زۆر كەس ڕێگەی نەدەدا وێنەی بگیرێ وایان دەزانی لە پاشی مردنیان خوا لەو دونیا بۆ وێنەكانیان ڕۆحی لێیان دەوێ، ئەم نەریتە ئێستا نەماوە.

٢٩- جاران كەسێك (نێرە موك) بمردایە دەبوایە بەنە(عەبد) بشوردایە، بەنەیان بە نیوە مرۆڤ دەزانی.

٣٠- هەر مردوویەك هەڵبگری دەبێ هەردوو دەستت بخەیتە ژێری تەرمەكە، بەڵام بۆ زیندوو دەستێكت لە ژێری‌و ئەوەی دیكەیان لەسەرەوە.

*** پەراوێزەكان:**

١. خانووبڕ: شووشێكی دەم تیژە، بۆ دیوار كون كردن‌و گۆڕەكەمدن بەكار دێت.

٢. تەتەشۆر: بریتیە لە مێزێكی گەورە تایبەتە بۆ شۆشتنی مردوو، لە هەندێ شوێن دا پێ دەڵێن(تاتەشۆر).

٣. لەم ڕۆژگارەدا پرسە بووەتە دوو ڕۆژ.

*** نەریتی زماوەندو بووك گواستنەوەی دەڤەری کەرکوكو گەرمیان[١]:**
**هەردەوێڵ کاکەیی**

نەریتی شایی‌و بووك گواستنەوەی جاران لەدەڤەری گەرمیاندا بابەتێکی گرنگ‌و گەنجینەیەکی بەنرخ‌و پیرۆزی کەلەپووری خۆماڵی ڕەسەنە، لەگەڵ نەریت‌و ڕێو ڕەسمی نەتەوەکانی دیکەدا زۆری جیاوازەو بەشێوەیەکی تایبەت پەیڕەوی کراوەو بووەتە سیمایەکی کۆمەڵگای کوردەواری کە خۆی لەخۆیدا چیرۆکێکی درامەیی فۆلکلۆرییە، چونکە ئەکتەرەکانی بریتین لە سەدان کەس، ئەم نەریتە بابەتێکی قووڵ‌و دوورو درێژە، گەلێ لك‌و پۆپی لێ دەبێتەوە کە زۆربەی هەرە زۆری نەوەی ئەمڕۆمان لەکوڕو کچ ئاشناییان لێی نییە، چونکە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە لە پاشی پەرەسەندنی شارستانییەت‌و پەیدا بوونی ئامێری جۆراوجۆر وەکو ئۆتۆمبیل کۆمپیوتەر، تەلەفیزۆن، ئەنتەرنێت، رادیۆ بەدەیان کەرەستەی دیکەی نوێ‌و پێشکەوتنی زانیاری تەکنەلۆژیا لەهەموو بوارەکانی ژیاندا قۆناغ بە قۆناغ گۆڕانی بەسەردا هاتووە وەکو: نەریتی دلداری، خوازبێنی، خەنەبەندان، شیرینی خواردن، نان خواردنی شایی، شیربایی، ژن بە ژن، گەورە بە بچووك، بچووك بە بچووك، گوێزانەوەی بووك بە نهێنی(پەلکێش)، هەڵگرت، ناوك بڕ، زەماوەند.. هتد.

ئەمانە هەر هەموویان وەکو ئاماژەمان بۆ کرد لق‌و پۆپی بابەتەکانمانن کە توانیویانە لەدەڤەری کەرکوکدا مۆرکی کوردانەی خۆیان بەچاکی بپارێزن.

شایی‌و بووك گواستنەوەی کۆنی ناوچەی گەرمیان بە تایبەتی هی کەرکوك‌و دەورو بەری کە تا هەنووکە بەشێوەیەکی پوخت‌و زانیاری کۆنەکراوەتەوەو تۆژینەوەی پوختی لەسەر نەکراوەو بڵاونەکراوەتەوە. لە دەڤەری کەرکوك‌و تێکرای گەرمیاندا بە زۆری لە وەرزی بەهارو پایزاندا شایی سازدەکەن بەتایبەتی ئاوایی نشینەکان چونکە بە هاوینان خەریکی دروونەو گێرەوکێشەو کۆکردنەوەی بەروبوومی خەڵەو دەغڵ‌و باخ‌و ڕەزو بێستانن، بە زستانیش لەبەربێ جێگایی‌و سەرماو سۆڵەو تەڕو تووشی خۆیان دەپارێزن‌و ناتوانن شایی بگێڕن، بەزۆریش ڕۆژانی هەینی یا دووشەممە بووکیان دەگوێزایەوە چونکە زۆربەی هەرە زۆری کورد موسڵمانەو ئەو دوو ڕۆژەیان بەلاوە پیرۆزە، بۆیە لەم پەندەدا وتراوە: شەممە بکە کارو شەممە بکە بار، شەممە بووکی لێمەکەسوار[٢]جاران ئەگەر کوڕێك خوشکی عازەبی نەبوایە نەیدەتوانی بە ئاسانی ببێ بەخاوەنی ژن، چونکە خاوەن کچەکەش داوای ژنی لێدەکرد، بۆیە زۆر کەس تامردووە بە ڕەبەنی[٣] ماوەتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە دەستکورت‌و نەداربوون.

ئەگەر کوڕێکی لاوی گەرمیانی بیوستایە هاوسەرو هاوژیانێ بۆ خۆی دەستنیشان بکاو بیخوازێ لە پێشدا بەخزمێکی نزیکی خۆی دەگوت تامەسەلەکە بە باوك‌و دایکی

بگەیەنێ و داخوازی ئەو کچەی بۆ بکەن، چونکە خۆی شەرمی دەکردو لە ڕووی نەدەهات بە باوك و دایکی خۆی بڵێت، ئەگەر ئەوانیش کچەکەو خێزانی کچەکەیان بەدڵ بوایە ئەوە ڕایان بۆ لەسەر دەداو کەسێکی بڕوا پێکراویان لە دۆست و یارانی خۆیان بۆ لای باوك یا دایکی ئەو کچە دەنارد و پێیانی دەوت: لەلایەن فلان کەسەوە هاتووم دەیانەوێ خوازبێنی کچەکەتان بۆ کوڕەکەیان بکەن و خزمایەتیتان لەگەڵدا بەتین و هێزتر بکەن ئایا سەردەگرێ یا نا؟ لەولاشەوە کوڕەکەو براو خوشکەکانی نزاو دوعای خێریان دەکرد بۆ ئەوەی ڕازی بن و کاری خێریان سەربگرێ، جا ئەو کارە بە شیربایی بوایە یان ژن بە ژن.

کابرای ناردراو باسی چاکی و ئازایی و جوامێری کوڕەکەی بۆ دەکرد، ئەوانیش پێیان دەگوت: چەند ڕۆژێك مۆڵەتمان بدەیتێ تا پرسێ بە خزم و کەس و کارمان بکەین، جا ئەگەر ئەوان ڕازی نەبوایەن دەیانوت، هەر یەکەمان لەماڵی خۆی، کارەکە سەرناگرێ، ئەگەر ڕازیش بوونایە دەیانوت ئێمە لاریمان نییە با بێنە پێشەوە، ئەوانیش دڵخۆش دەبوون و بۆ خوازبێنی گورج چەند پیاوو ژنێکی خاتوداریان دەبردو دەچوونە ماڵیان و داوای کچەکەیان دەکرد، زۆرجار هەر لەو دانیشتنەدا شیربایی و نیشانەو بەرگ و پۆشاکەکەشیان دەبریەوەو پیرۆزباییان لێ دەکردن و سەلاواتیان بۆ هەڵداوە فاتیحەشیان دەخوێند و شیرینیشیان دەخواردەوە کە بەزۆری بریتی بوو لە شەکراو[٤]، یان مێوژ، یا شەکرۆکە..هتد.

بەڵام ئێستا نەریتی شیرینی خواردن بریتییە لە شەربەت و کێك و چوکلێت، بەزۆریش نانی ژەمی نیوەڕۆیش لە ماڵی بووك دەخورێ کە لە سەر ئەرکی ماڵی زاوایە.

ئینجا لە پاش یەك دوو ڕۆژ نیشانەکەیان بۆ بووك دەبرد، نیشانەکە بریتی بوو لە شتێکی گرانبەها وەك یەکێ لەم خشڵانە: (ملوانکە، گۆبەرۆك، بازن، کرمەك، پەروانەو زێرچەنە، هەیاسە، خەزێم، خرخاڵ لەگەڵ ئەم شتانە: مێخەکبەند، کل وکلدان، ئاوێنە، شانە، ملوانکەو متومورو، بۆیە گۆیندە وتویەتی نیشانەت سەد نشانە، کل و ئاوێنەو شانەو مێخەکبەن و مەرجانە)[٥] لەگەڵ ئەڵقەی بووکێنیدا.

هەروەها دەمژمێریشیان دەبرد ئەمەیان بە زۆری لە شارۆچکەکاندا بوو، کرینی نیشانەکە بەپێی باری ئابووری ئەو خێزانە دەگۆڕدرا.

ئێستا لەم ڕۆژگارەدا ئەو دیاریە گۆڕاوەو بووەتە چەند بازنیگێکی زێڕو گوارەو پۆشاك و گوڵاوو مۆبایل لەگەڵ ئەڵقەی بووکێنیدا.

لە دوای چەند ڕۆژێکی دیکە پێنچ شەش پیاوو ئافرەت مەلای گوندیان دەبردو دەڕۆیشتنە ماڵی دەزگیرانی کوڕەکەو مارەیان بۆ دەبری و شیربایشیان دەدا (پێش مارەیی) کە بریتی بوو لەیەکێ یا زیاتر لەم شتانەی: (پارە، زێر، تفەنگ، ئەسپ، ماین، مانگا، هێستر، ئاژەڵ)..هتد.

جاری وایش بووە لەبەر خاتری ئامادەبوان هەندێ لە ژمارەی ئاژەڵەکان یا پارەی شیربابییەکەیان کەم کردووەتەوە.

بەڵام زۆر باوك و دایك هەبوون بێ بەزەییانە کچەکەیان لەو مارەییە بێبەش دەکردو وەکو شیری بەر مەمکی دایکیان بۆ خۆیانیان دەخوارد، وایان دەزانی ئەو شیربابییە هەقی شیرو بەخێو کردنەکەیەتی.

زۆرجار وشەی (شیربایی) یان بەهەڵە بەم جۆرە لێکداوەتەوە: شیر+ بەها = بەهای شیر(نرخی شیر)، بۆیە بەرەوایان زانیوەو بێ پەروا خواردوویانە، یا بیانوویان ئەوە بووە گوایە کوریان هەیەو ئەو شیربابییەی بۆ دەپارێزن و لەکاتی خۆیدا بۆی دەدەن بە ژن، لەجیاتی ئەوەی یارمەتیان بدایەو بیریان لە ژیانی دوا ڕۆژیان بکردایەوە، کەچی ئەوان هاتوون ئەو کچەیان وەکو نامۆو بێگانە بینیوەو لەماڵی باوانیدا ڕەنج بێوەرو بێبەشیان کردووە.

دەستووری ڕێبازی مارەبڕینەکەش لەلایەن مەلاوە بەم جۆرە بووە، لەبەر ئەوەی نەدەبوو کچەکە ئامادەبێ، جا مەلاکە باوکی دەکرد بە وەکیلی، ئنجا مەلا ڕووی دەمی دەکردە کوڕەکە پێی دەوت:

* کوڕم تۆ فڵانە کچی فڵانت قبووڵە بەژنی خۆت؟[٦]
– ئەویش دەیوت: بەڵێ.
* ئایا بە کوێری و بەشەلی دەتەوێ؟
– بەڵێ بەهەموو ناتەواوییەك دەمەوێ.
* ئایا ئامادەی ژیانێکی بەختەوەرو پارێزگاری شەرەف بکەی؟
– بەڵێ ئامادەم.

لەپاشاندا مەلا ڕوو دەکاتە باوکی کچەکەو لێی دەپرسێ:
* ئایا تۆ فلانی کوری فلانت قبووڵە بە زاوی خۆت؟
– بەڵێ قبووڵمە.

ئنجا سوورەتی فاتیحەی دەخوێندو بە زاوایشی دەوت: کوڕم هەستە دەستی مامت ماچ کە، ئامادە بوانیش پیرۆزباییان لێدەکردن و ئەملاوئەولاییەکتریشیان ماچ دەکرد لەدواییدا تاوێ هەڵپەرکێی گەرمیان سازدەداو نانیشان لەوێ دەخوارد.

بەڵام لەم ڕۆژگارەدا ئەو نەریتە گۆڕاوەو لە دادگا لەلای قازی مارە دەبڕن و بەزۆریش شیربابییەکەی بۆ بووك خەرج دەکرێت.

هەندێ جار خۆشبەختانە بە ڕەزامەندی کوڕەکەو کچەکە خوازبێنی دەکرا، ئەویش لە ڕێگای ئەویندارییەوە پەیمانیان گرێ دەدا بۆ یەك گەیشتن و پێك هێنانی خێزانێکی بەختەوەر.

جا لەنێوانی ئەو دوو ئەویندارەدا دیاری جۆراو جۆر پێشکەش بەیەك دی دەکراو زۆریش بەو دیارییە دڵخۆش و بەختەوەر دەبوون و لەلای خۆیانیش بە چاکی دەیانپارێزا.. ئەو دیاریانە بەزۆری بریتی بوون لەم شتە سادانە: (دەستەسر، تەزبیح، ئاوێنەی گیرفان، شانە، خەنە، کل و کلدان، گوڵاو، ملوانکە، مێخەکبەند، نارنج بە مێخەك)..هتد.

وەکو لەم شیعرە فۆلکلۆریانەدا هاتووە:

کچ وتویەتی:
(دەسرەکەی دەست ئەدەم لە ئوتوو[٧]
بۆ ئارق سرین ڕێگەی خورماتوو[٨]).
کوریش وتویەتی:
(ناردمە بۆی بێت دوو چەفیەی[٩]ماوی[١٠]
خەنە بۆ زولفی سورمە[١١] بۆچاوی).

یا:
(دەستەسرەکەت، سێ گوڵ حەبیبی،[١٢-١٣]
بۆمی بنێرە هام لە غەریبی).

بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا دیارییەکە بووەتە ئەم شتانەی خوارەوە:

(مۆبایل، گوڵاو، پۆشاك، كتێب، قەڵەم، جانتا، یا پارچە زێڕێك وەك: بازنگ، ئەنگوستیلە، زنجیرودل) یا هەر شتێكی بە نرخ.

فرە جاریش دایكو باوك خوازبێنی كچەكەیان بۆ كورەكەیان كردووە بێ ئەوەی پرسی پێ بكەنو رای وەربگرنو یەكتربببن، جا ئەو كچە كوێر بوایە یا شەل دەبوایە كورەكە بیوستایەو بێ دەنگ بوایە، هەروەها لەكاتی بە شوودانی كچیشدا رای وەرنەدەگیرا، كەسیش بایەخی بێ نەداوە پرسیشی پێ نەدەكرا، بۆیە هەندێ جار كورو كچێك یەكیان خۆشویستبێو ئەویندارییەك بووبێتو كچەكەیان بەكورەكە نەدابووبێ ناچار بوون بە دزییەوە هەڵبێنو بچن خۆیان بخەنە بەختی پیاوێكی گەورەو بە نهێنی شایی بكەن، ئەم نەریتە لە كوردەواریدا پێی دەڵێن (هەڵگرتن) یا (بەشوێن كەوتن) یا (رەدووكەوتن)، لەنێو خەڵكی گەرمیاندا ئەم نەریتە بە دەگمەنەو بەشێوەیەكی گشتی بە شوورەیی و نەنگ دەزانرێو بەلایانەوە رووخسارێكی ناشرینی هەیەو سزاكەشی توندو تیژە، زۆرجار ئەو ئافرەتەی كە هەڵگیراوە هەرچەندەش بە رەزامەندی خۆی و ئەویندارەكەی بووە لەلایەن باوكو براو ئامۆزاكانییەوە كوژراوە، یا بەزوویی چەند ریش سپییەكو چەند خاتردارێكیان بردووەتە ماڵی باوكی كچەكەو خۆیان خستووەتە بەختیانەوە، ئەوانیش بە پارە یا بە ماڵێكی زۆر لەگەڵیاندا پێك هاتوون یان داوای كچێكیان كردووەو مارەیان بڕیوەو هێناویانە بۆ برای كچەكە یا بۆ خزمێكی نزیكی لە پشتەوە وەكو: مام، ئامۆزا، برازا.. هتد.

بەم جۆرە ئاشت دەبوونەوەو كوروكچەكەش بێ پەروا دەگەڕانەوە ئاواییەكەی خۆیان، ئەوەشمان لە بیر نەچێ لە هەندێ شوێندا چ لە كوردستانی باشوور چ لە كوردستانی رۆژهەڵات دایكو باوكی كچەكە بەم هەڵگرتنە شانازییان كردووە وایان زانیوە كچەكەیان خوو و رەوشتی فرە بەرزە بۆیە كورەكە رفاندویەتی جا لەو شوێنانەدا كە دوو ژن بچوونایە بە گژ یەكدا یەكێكیان بەوەی دیكەی دەوت: (هەرو ئەگەر چا بای رەدوو دەكەوتیت)، بەڵام ئێستا بە دەگمەن شتی وا روو دەدا چونكە كچیش لەكاتی هەڵبژاردنی هاوژیانیدا تا رادەیەك مافی ئەوەی پێدراوە پرسی پێ بكرێ.

لەم شیعرە فۆلكلۆرییەدا گۆیندە[١٤] داوا لە ئازیزەكەی دەكا بكەوێتە دوویو بڕۆن بۆ جێگایەكی نادیاری دوورە وڵاتو بەنهێنی زەماوەند بگێڕن:

(هەستە باگرین رێی هاتو نەهات[١٥]
هەردوو پێكەوە بۆ دوورە وڵات).

بە راو بۆچوونی ئێمە سووچو تاوانی ئەو پرس بە كچ نەكردنەی جاران تەنیا لە ئەستۆی كەسو كاری كچەكەدا نەبووە بەڵكو تاوانباری سەرەكی مەلاو زانا ئایینییەكانی ئەو رۆژگارەمان بووە، چونكە گەلی كورد نەتەوەیەكە زۆر بە پەیرەوی ئاین دەكا، جا ئەوان زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی وەها نەبێت.

بەشێوەیەكی گشتی پاش مارەبڕین بە هەفتەیەك یا زیاتر پێش گواستنەوەی بووك رۆژێكیان دیاری كردووە بۆ كڕینی كەلوپەلو پێداویستییەكانی بووك، دایك زاواو بووك پێكەوە لەتەك پیاوێكدا دەچوونە كەركوك و بازاڕدا ئەو شتانەیان دەكڕی كەبە زۆری لەم شتانە پێك دێت: دەستێ یا زیاتر پۆشاك وەكو: كراس، كەوا، سوخمە، پاپۆش، دەستماڵ، پێڵاو، سەنوقی ئاگربارانە (سەنوقی بوراقدار)، ئاوێنە، باوڵی ئاسن، سەرپۆش، لەگەڵ هەندێ قاپو قاچاخدا هەروەها زۆرجار كچەكە لەپارەی شیربایییەكە سەرو كراسی بۆ خوشكو برای خۆی دەكڕیو بەدیاری پێشكەشی دەكردن، زاوایش بەو جۆرە دیاری بۆ خوشكو برای خۆی دەكڕی، ئەمەیش بە پێی باری ئابووری ئەو خێزانانە بوو، ئەگەر خواپێداوو دەشترۆ بوایەن دیارییان بۆ خوشكو براییەكتریش دەكڕی.

لە ئەمڕۆدا پێداویستییەكانی بووك زۆرترو بەنرختڕو قورسترە بەزۆری لەم شتو مەكو كەرەستانە پێك هاتووە: (٤-٦) بازنگی زێڕ، كلكەوانە، كلوانكەی زێڕ، مۆبایل، چەند دەستێ پۆشاك، پێڵاو، چەند دانەیە لە سەرینو بەتانی، لێفە، گۆرەوی، چەرچەف، سیسەم، كەنتۆر، خاولی، جانتا) كڕینی ئەم شتانەش بەپێی دارایی ماڵی زاوایە، هەندێ بووكیش هەن داوای ئۆتۆمبیلو خانوویش دەكەن، بەشێ لەمانە لە شیربایییەكە دابین دەكرێت.

*** شاییو بووك گواستنەوە:**

شاییو بووك گواستنەوە بەو نەریتو رێورەسمانە دەوترێ كەلە ئاهەنگی زەماوەندو رۆژی گوێزانەوەی بووك لە ماڵی باوكییەوە بۆ ماڵی زاوا.

ئەم رێورەسمە لە دەڤەری گەرمیاندا تا رادەیەكی زۆر لەگەڵ رێورەسمی شاییەكانی دەڤەرەكانی دیكەی كوردستاندا یەك دەگرێتەوە گەرچی هەندێ سیمای تایبەتیو مۆركی ناوچەكەشی پێوە دیارە كە دەتوانرێ وەكو خەسڵەتێكی كوردی ناوچەكە باسی بكرێ بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنای ئەم راستیانە بین كە پێویستە باسی جۆرەكانی ژن گواستنەوە لە دەڤەرەكەدا بكەین بۆ ئەوەی هەموو لایەنە ئاشكراو نا ئاشكراكانی بخەینە بەرچاو.

پێش بووك هێنان بە چەند رۆژێك ماڵی زاوا بانگهێشتی دراوسێو خزمو كەسوكارو دانیشتووانی ئاواییەكەیانو ئەو گوندانەی كە نزیك دێكەیانەوەیە دەكرد، بۆ ئەم مەبەستە چەند كەسێكیان تەرخان كردووە، ئەوانیش دەچوون ماڵ بەماڵ پێیان دەوتن.

ئاشناو دۆستو برادەری گیانی بەگیانی هەموو داوەت كراونەتە سەرشایی، هەر هەموو ئامادە بووان پۆشاكی خاوێنو نوێی كوردییان پۆشیوەو بەرەو سەرشاییەكە دەچوون، خاوەن شاییش بە هاتنی ئەو خەڵكە سەر بەرزو خۆی بە بەختیار زانیوەو بە گەرمییەوە پێشوازی لێ كردوون، شوێنو جێگای بۆ دانشتنو هەڵپەركێو نان

خواردن ئامادەکراوە، یا رەشماڵیان هەڵداوە.

پێش ئەوەی دەست بە هەڵپەرکێ بکرێ دەهۆڵ و زورناکەیان بردووەتە بەر دەرگای ئەو ماڵەی کە مردوویان مردووە و ساڵێکی بەسەردا تێپەڕ نەبووە، لەوێ بە دەهۆڵ و زورناوە تاوێ ئاوازی (چەمەری)یان پێشکەش دەکردن، کە ئاوازێکی کوردی حەزینە و خەمبارییە، خاوەن مردووەکەش مۆڵەتی دەدانێ تا شایی بگێڕن.

ئەمە بۆ رێزلێنان بوو لە مردووەکە و کەس و کاری، لەولاشەوە بۆ نان خواردنی ئەو خەڵکە چەند سەرە ئاژەڵێکیان سەربڕیوە، پیاو بەجیا نانی دەخوارد ژنیش بەجیا.

خزم و کەس و کاری و خاوەن زەماوەند و خەڵکی ئاواییەکە پیاو و ژن بۆ ئیشکردن دەست و بازوویان لێ هەڵکردووە و مەردانە یارمەتی خاوەن شاییان داوە، دڵسۆزانە خزمەتی ئەو میوانانەیان کردووە، تەنانەت کاو ئالیکیشیان بۆ وڵاخی میوانەکان دابین کردووە، بەڵام لە ئەمڕۆدا ئەرکی کەمترە و شاییش لە یانەکان بە تیپی مۆسیقاوە دەگێڕن و ماوەیەکەشی تەنیا لە چەند ساتێك زیاتر تێناپەڕێ، خواردنیشیان پارچە کێك، یا بریتییە لە سەموونێك و چەند لەتە گۆشت و پەتاتە و تەماتەی تێدایە کە پێی دەڵێن (لەفە) لەگەڵ ساردەمەنییەکدا.

هەروەها لە ناوەڕاستی ئەو شوێنەی کە بۆ هەڵپەرکێ تەرخان کرابوو کوورەیەکی[16] بەرزیان بە ئەندازەی باڵا زەلامێك لە قوڕ و خشتی کاڵ دروست کردووە کەلە هەندێك شوێندا پێی دەڵێن (فەنەر)، بەشەوان تێدا ئاگریان کردووەتەوە تاڕووناکی ببەخشێ بەوانەی هەڵپەڕیون، چونکە جاران تا ساڵەکانی پەنجای سەدەی رابردوو لە هەموو ئاوایی و لادێکاندا کارەبا نەبووە، بەڵام لە پاشاندا ئەو فەنەرە باوی نەماوە (لۆکس)[17] جێگای گرتەوە.

ئەوانەی لەو زەماوەندەدا خزمەتیان دەکرد هەرکە پیاوەتی و چاکەی خۆی هێناوەتەجێ، جاری وا بووە ماڵە دەوڵەمەند و خواپێداوەکانی سێ رۆژ و سێ شەو یا حەوت رۆژ و حەوت شەو پێش بووك گواستنەوە زەماوەندیان بەدەهۆڵ و زورناوە گێڕاوە، پیاو و ژن، کوڕ و کچ پێکەوە دەستیان گرتووە، خۆشترین هەڵپەرکێی جۆراوجۆریان سازکردووە وەکو: (هەی بەلارەوە، چۆپی، رۆینە، سنجانە سنجانە، هۆهۆلەیلی، کەمەرەلەقێ، سێ پێی، ئامێنێ و دایکێ، شێخانی، ئایشۆکی، کەمەرە لەرزین، بارەکا بارەکا، هۆ مینا خانم مینا)، جار بەجاریش پیاوان بەجیا و ئافرەتانیش بەجیا هەڵپەڕیون، جاریش بووە هەر هەموویان دەستیان گرتووە و کردویانە بە رەشبەڵەك، هەر جۆرە هەڵپەرکێیەك ئاوازی خۆی هەیە.. جاری واش بووە بە دووزەلە یا شمشاڵ یا بە گۆرانی شاییان گێڕاوە، دوو کەس بە دووقۆڵی لەزەماوەندەکەدا گۆرانییان وتووە و ئامادەبوانیش شاییان گێڕاوە، پیاوان هەرکە بە چەکی خۆیانەوە بە دەمانچە و تفەنگ نیشانیان پێکاوە، تەقە کردن بەسەر یەکتردا قەدەغە بووە، یەکێکی شارەزایش دەستەسرێکی گرتووە بە دەستەوە و سەرچۆپی گێڕاوە، جار و بارنەو دەستەسرەی بۆ خۆشی راوەشاندووە بۆ ئەوەی زیاتر جۆش و شەوق بدا بەوانەی هەڵپەڕیون، هەندێ جاریش لە پێشاندا بە زەوقەوە هەڵدەپەڕێ و دێ و دەڕوا و سەمایش دەکا، سەرچۆپیکێش بەو کەسە دەوترێ کەوا یەکەم کەسە لەو تاقمەی کە هەڵدەپەڕن، ئەو کەسەش کەلە کۆتایی ریزەکەوە یە پێی دەڵێن (بنە) یا (گاوانی)، زۆر گەنج هەن بیرای بڕ نابن بە بنە لەبەر ئەوەی بە شوورەیی دەزانن، بۆیە هەندێ جارسەرچۆپی کێش بەتەسەوە بە دەنگێکی بەرز بە گاوانی وتووە: گاوانییەکە یا بنەکە بەر نەدەی ساڵەکەی گرانی و قاتییە نانەکە کۆکەرەوە.

بە زۆریش ئەو کەسانە دەبنە گاوان کەوا لە هەڵپەرکێدا شارەزاییان نییەو دیانەوێ فێربن ئەمە لەدێر زەمانەوە هەر وابووە، هەندێ جار ئافرەتیش سەرچۆپی کێشاوە بەتایبەتی ئەوانەی کە خزمی زاواکە بوون، بۆیە گۆیندە لەم فۆلکلۆریانەدا داوا لە ئەویندارەکەی دەکا برواتە شاییەوە ببێ بە سەرچۆپیکێش:

(ئەر هەی باڵا بەرز تۆ پرچی دەڕوێش[18]
تەشییەکەت دانێ چۆپییەکەت بکێش)

(لەگەڵ تۆمە سەر چۆپی کێش[19]
وردە وردە قاچ بێنە پێش)

شایەرێکی کچیش دەڵێت:

(کتکی سەرچۆپی بەرکە بەملاوە[20]
زانیم عاشقی رەنگت گۆڕاوە)

یان:

(هەڵپەرکێ چۆپی ئەدا لەدەماخ [21]
دەرنەکا لە دل ئێش و ئاخ و داخ)

هەندێ جار زورنا ژەن، یا دووزەلە ژەن، یا شمشاڵژەن، دەچووە پێش گورانیبێژێکی میللی کە لە ریزی شاییەکەدا بووە و داوای گۆرانی لێکردووە، ئەویش لەسەر نەزمی شاییەکە دەستی پێدەکرد، ژەنیارەکەش هەندێ دەنگی ئامێرەکەی هێوردەکردەوە.

ئەمەش نموونەیەکە لەو گۆرانیانە:

(هەی بەلارو بەلارو بەلارەوە، توسەری باوکت وەرەماڵەوە[22]
تازە داهاتووە هەی بەلارەوە خاڵ بەزنجەوە هەی بەلارەوە
دەڵێی مێخەکە هەی بەلارەوە بە ترونجەوە هەی بەلارەوە[23]
مانگە شەو خۆشە هەی بەلارەوە گا بەبارەوە هەی بەلارەوە
یەقەی کیژ بەدەست هەی بەلارەوە هەرزەکارەوە هەی بەلارەوە
هەی بەلارو بەلارو بەلارەوە، توسەری باوکت وەرە ماڵەوە
خۆزگەم بەو رۆژەی هەی بەلارەوە وازیمان ئەکرد هەی بەلارەوە
تۆ دەمت هێنا هەی بەلارەوە من ماچم ئەکرد هەی بەلارەوە
لە دوورەوە تیچ هەی بەلارەوە شیربەشانەوە هەی بەلارەوە
گۆنای هابە تۆز هەی بەلارەوە بە چارانەوە هەی بەلارەوە)

ئافرەتانیش بۆ زەوق و خۆشکردن و گەرمکردنی ئەو شاییە بە دەنگێکی بەرز و زەلاڵ هەلهەلەیان لێداوە، ئەو دەنگە خۆشەیان وەکو زەنگ زراوەتەوە، ئەو هەموو دەنگخۆشانە ئامێتەییەکتردەبوون و ئاسکترین ئاوازی لێ پەیدا دەبوو، مرۆڤی سەرخۆش و حەیران کردووە، پیاوان

پارەیان داوەتە چاوەش بۆ شاباشکردنی بووك‌و زاوا، یا شاباش کردنی ئامادەبوان‌و دۆست‌و یاوەرو بنەماڵەو تیرەوە هۆزەکانیان، زاوایش یا یەکێ لە خێزانی خاوەن شاییەکە بە شاباشەوە وەڵامیانی داوەتەوە، زۆر کەس لەو ئاهەنگەدا چاوی بە دۆست‌و ئازیزو دڵداری خۆی کەوتووەو چاوو دڵیان بەیەك ڕووناك‌و گەش بووتەوە، هەندێ جاریش دەرفەتیان بۆ هەڵکەوتووە لە شاییەکەدا پێکەوە هەڵپەڕیون، یا بووەتە هۆی چاوبڕکێ‌و خۆشەویستی لەنێوان کوڕو کچێکدا، ئەوانەش کە دەهاتن لە هەڵپەڕکێدا بەشدار دەبوون، ژن لە دواوە دەڕۆشتە ڕیزەوەو دەستی دەگرت، پیاوانیش لە پێشەوە.

منداڵانیش لە دەورو بەری زەماوەندەکەدا کۆدەبوونەوەو دەستیان بە گەمە کردن دەکردو ئەو شایی‌و بەزمەیان بەلاوە زۆر خۆش بوو، مێرد منداڵانیش هەر بۆ خۆشی بە نهێنی چمکی کەوای ژنەکانیان لەپشتەوە گرێ دەدا بەتایبەتی بە شەوان، جا هەرکام لەو ژنانە دەستی بەربدایە کەوای ئەوەی دیکەی ڕادەکێشا و ناچار ئەویش لەڕیز دەردەچوو، هەندێ جار خاوەنی شایی لەو منداڵانە تووڕە دەبوون‌و ناچار دووریان دەخستنەوە.

* خەنەبەندان:

خێزانی بووکەکە ڕۆژێ بەرلە گوێزانەوەی بووك نەریتی خەنەبەندانیان سازداوە، دایکی بووك خۆی داوە لەتەل‌و جوانترین پۆشاکی پۆشیوە، ماڵ بەماڵ بەسەر دراوسێکاندا دەسووڕێ ژن‌و دەستە خوشکانی خۆی‌و بووکەکە بۆ خەنەبەندانەکە داوەت دەکات، شمشاڵژەن یا گۆرانیبێژێکی دەنگخۆشیش دێنن تا لەو ئاهەنگە بە گۆرانی‌و ئاواز بەشدارییان لەگەڵدا بکات، لەم نەریتی خەنەبەندانە تەنیا ئافرەت تیایدا بەشداری دەکات، ژنانی شۆخ‌و شەنگ جوانترین بەرگی ڕەنگامەیان لەبەر کردووەو خشڵ‌و متومورووو وگەردەنەی زێڕو مێخەکبەندیان لەمل‌و گەردەن کردووە، قۆڵی زیوینی پڕ گۆشتنیشیان دەدرەوشێتەوە، پەنجەی شمشاڵینیشیان پڕلە ئەنگوستیلەی جۆراوجۆری نرخدار کردووە، خانمی کورد خۆی بە سروشت جوان‌و خان‌و مانە، سەرەڕای ئەمەش لەگەڵ سروشتی ڕەنگاو ڕەنگی کوردستانی ئازیزدا پێشبڕکێ دەکا، دەیەوێ هەر وەکو دایکە دڵسۆزەکەی بە هەموو شێوەیەك خۆی بڕازێنێتەوە بۆیە حەزی لە جوانی‌و تەڕپۆشی‌و خان‌و مانییە، لەکاتێ لەدەوری بووك کۆدەبنەوە دەست بە چەپڵەڕێزان هەڵهەڵەو شایی‌و سەماکردن دەکەن، شمشاڵژەن گەرمی دەکا، گۆرانیبێژ کوڕبێ یا ئافرەت بە دەنگی بەرز دەچڕکێنێ، بە هەقیقەت هەڵپەڕکێ‌و شاییەکەشیان پڕ لە زەردەخەنەو خۆشەویستی دەبێ، بە هەڵپەڕکێی جۆراوجۆری کوردی نەریتەکە دەڕازێتەوە.

سەرتان نەهێنمەئێش ئەو ڕۆژە لە ماڵی بووکدا دەبێ بەشایی‌و لۆغانێکی فرەخۆش، سەرچۆپیکێش گەرمی دەکا، گورانیبێژەکەش لەسەر نەزم‌و ئاوازی شاییەکە گۆرانییەکی خۆش دەچڕێ، بەزۆریش ئەو ئاوازو گۆرانییە دەڵێنەوە کە تایبەتە بەم نەریتەوە، زۆرجاریش بەیت‌و بالۆرەش دەڵێن، جا سۆزی شمشاڵ‌و خشەی کەواو ورشەی کراسی شەدەلاران‌و زرەی خشڵ‌و ترپەی پێڵاوی لەنجەلاران تێکەڵ بەیەکتردەبن‌و خۆشترین ئاوازی سروشتی کەللەتەزێن پێك دێنن، بەڕاستی ئەوەی ئەو دیمەنە دڵرفێنەی ببینێ کۆسکەوتوویش بێخەمی دەڕوێتەوەو خۆشی‌و ئاسوودەیی دەبێ بە میوانی، لە پاشاندا دەست بەر دەدەن‌و بەخۆشی‌و شادی بە دەم ڕازو نیازەوە کولیچەو شەکراو نۆش دەکەن، جارو باریش بووکەکە هەر بۆ خۆشی قورنجکێ لە کچەکانی دەورو بەری دەگرێ یا مشتۆکە لە پشتیان دەدا یان بەلەپ دەدا بەتەوقی سەریاندا، ئەمە بە نییەتی ئەوەی بەختیان هەستێ‌و بە زوویی شووبکەن‌و بگەن بە مرازو ئاواتی خۆیان، لە دواییدا ژنێکی گورج‌و گۆڵی ئێسك سووك ئەو قاپە خەنەیە کە پێش ئەوسا گیراوەتەوە بەرەو لای بووکەکەیی دەبا، ژنەکان کە چاویان بە خەنە دەکەوێ دەست بە چەپڵەڕێزان‌و هەڵهەلە لێدان دەکەن، دەنگی پیرۆزت بێ، پیرۆزت بێ لە هەموو لایەکەوە بەرز دەبێتەوە، پێشەکی دەست‌و پێی بووکەکە بە جوانی لەخەنە دەگرێ، بەدەم ئیشەکەشیەوە پیرۆزبایشی لێ دەکات‌و چەند قسەیە خۆشیشی بەچپە بۆ دەکات، ئینجا بە نۆرە بە لای دەستی چەپدا دەسووڕێ و یەکە یەکە دەستی ئافرەتەکانیش لەخەنە دەگرێ، بەکچە ناسکۆڵەکان‌و جوانە بێوەژنەکانیش دەڵێ: لەخوام دەوێت نوخشەی لە ئێوەش بکەوێ، هەندێ جار کۆڕپە کچەکان خۆیان بەو مرازەوە پەنجەی تیتەیان دەکەن بە قاپی خەنەکەدا، ئەگەر کوڕی لاویش لەم دەورووبەرە نزیك بووبێ ئەوانیش دەهاتنە پێشەوەو بەو نیەتەی دڵدارەکانیان ببێ بە نسیب پەنجەیان لەو خەنەیەدا وەردەدا.

دایکی بووکیش لەژێر پیاڵەدا خەنە دەبا بۆ ئەو ماڵانەی کە پێیان نەکراوە لەو خەنەبەندانەدا بەشداربن.

ئینجا ژنگەل بەدەم پیرۆزباییەوە خواحافیزی لە بووك‌و دایکی‌و خوشکەکانی دەکەن‌و هەرکە بۆ ماڵی خۆی دەڕوات، لەهەندێ شوێندا خەنەیان بۆ ماڵی زاوایش دەبرد تا زاوا بۆ پیرۆزی پەنجەی تیتەی دەستی ڕاستی خۆی بەو خەنەیە ڕەگ بکات.

لەدەڤەری کرماشان‌و ئیلام لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، زاواو بووك خەنە دەگێڕن‌و بووکەکە دەستی ژنان لەخەنە دەگرێ، خانمێکیش لە دەفرێکدا هەندێ ڕووەکی ئەسپەندەری ئاگرداوەو بۆ چاوەزارو ئێرەیی دووکەڵەکەی دەکا بەسەرو چاوی بووك‌و زاوادا.

بە هەقیقەت ئەم جۆرە نەریتانە زۆر جوان‌و دڵگیرن خۆزگە تا دنیا دنیایە لەنێو میللەتەکەماندا بە گەشاوەیی هەر دەمانەوە.

ئەوەیشمان لە یاد نەچێ ئەم نەریتی خەنەبەندانە لە شیعرو گۆرانی فۆلکلۆریدا زۆر ناوی هاتووە لەوانە:

کچێکی دڵتەڕ بە شێوازی (گۆران) وتویەتی:

(چەنی کناچەی ئاواییەکسەر[٢٤]
خنە بگێرۆن نەدەست‌و نەسەر)

واتە: با پێکەوە لەگەڵ هەموو کیژۆڵەکانی ئاواییدا خەنە لە

دەست و سەرمان بگرین.
گۆیندەش وتویەتی:
هەکزە لەباوانت کەویێ یار خەنەبەندانییەتی[٢٥]
ماچێك بۆ دەرمانم ئەویێ یار خەنەبەندانییەتی
لێکیان کردین کۆستیان کەویێ یار خەنەبەندانییەتی
یار خەنەبەندان، شەدە لە ملان یار خەنەبەندانییەتی
دە تەماشای قەدو بالأی کەن یار خەنەبەندانییەتی

ئەم نەریتی خەنەبەندانە لە هەندێ شوێندا لە ماڵی زاوایش کراوەو دەستی زاوایشیان لە خەنەگرتووە، ئەم نەریتە لە هەفتاکانی سەدەی پێشووەوە لە دەڤەری گەرمیان و کەرکوکدا بەرە بەرە کەم بووەوەو بۆ یەکجاری نەماوە.

ڕۆژی پێش گوێزانەوەی بووك ماڵی زاوا ژنێکی قەیرەی قسەزان و ئاقڵی باوەڕپێکراوی شارەزایان ناردووەتە ماڵی بووك، بۆ ئەوەی ئەو بووکە بە جوانترین شێوە بۆ زاوای برازێنێتەوە، دایکی بووکیش ژنێك وەکو ئەو ژنەی ئەوان کە ژیرو خاوەن ئەزموون بووبێ هەڵبژاردووەو پێیان وتووە(پێخەسوو) یا (پاخەسوو) کەلە هەندێ شوێندا پێ دەوترێ (بەربووك)، ئەمیان لەگەڵ بووکدا ناردووەتە ماڵی زاوا شەوێکیش لەوێ ماوەتەوە، لەپاش خەڵات وەرگرتن (پەرۆی کچێنی) بووکەکەی هێناوەتەوە بۆ دایکی بووك و گەڕاوەتەوە ماڵی خۆی.

جا لەسەر ئەم بەربووکە گۆیندە وتویەتی:
(هە جوانترە، هە جوانترە[٢٦]
بەربووك بە بووك زۆر جوانترە)

یا:
(نیسك و نۆك و جاترە[٢٧]
بەربووك لەبووك چاترە)

لە دوا ڕۆژی شاییەکەدا لەکاتی نان خواردنی ژەمی نیوەڕۆدا سفرەیەکی زۆریان ڕاخستووەو لەسەر سینی و تەبەق پەیتا پەیتا گۆشت و برنجیان هێناوەو دەستە دەستە نانیان بەو هەموو خەڵکە داوەو چایشیان نۆش کردووە.

لەپاش نان خواردن بۆ بووك گواستنەوە خۆیان ئامادە کردووە، جا ئەگەر بووکەکە لە ئاواییەکی دیکە بوایە هەندێ دەست و بردیان کردووەو ماینێکی چاك و ئەمینیان بۆ بووك ڕازاندووەتەوە، جاری وایش بووە، لەسەر پشتی ماینەکە (کەژاوە)[٢٨] یان بۆ ئامادەکردووە، خەڵکی بە خۆشی و زەوقەوە بە سواری ئەسپ و ماین و هێسترو باگیر دەرۆیشتن بۆ بووك هێنان، لە ڕێگا سوارەکان ڕەمبازی و سوارسوارانێ و بە تفەنگ و دەمانچە تەقەیان کردووەو نیشانیشان پێکاوە، کە دەگەیشتنە بەر ماڵی بووك لەوێ دەیانکرد بە هەرا، بەگۆرانی و چەپڵەڕێزان ئەو ناوەیان دەرازاندەوە، گۆرانییەکەشیان بەزۆری بەسەر بووکدا هەڵیانداوە وەکو:

هاتینەوە، هاتینەوە ..هەتا نەیبەین ناچینەوە[٢٩].

یان:
بوکمان هاورد هاتینەوە..هەتا نەیبەین ناچینەوە.
هاتینەوە، هاتینەوە، بووکمان هێنا هاتینەوە[٣٠]
ئەمان کورتێ کورتە باڵا، قەد شەل و مل چاو وەك پیاڵە بمکوژە خوێنم خەڵاتە، بووکمان هێنا هاتینەوە..هتد.

ئەگەر بووکەکە هەندێ لەدەرچوون دوا بکەوتایە بە زوویی دەرنەچووبایە ئەوا گۆرانیبێژان وەکو گلەیی دەیانوت:
هە دەرنایە، هە دەرنایە، قاچمان تەزی بووك دەرنایە[٣١]
هە دەرنایە، هە دەرنایە، ڕێگا دوورە بووك دەرنایە

جا گۆرانیبێژێکی دیکەیش کوڕ بوایە یا کچ وەڵامی ئەوی دەدایەوەو دەیگوت:
بووکێ ئێژێ نابم سوار، هەتا زاوا نەبێ دیار.

یەکێکی دیش لەو لاوە دەیوت:
هە دەرنایە هە دەرنایە، زاوا حازر بووك دەرنایە[٣١]
سەد ماشەڵڵا لەم گەرمایە، زاوا حازر بووك دەرنایە

هەندێ جاریش ئەگەر ئامادەبوان و کەس و کاری بووك و زاواکە خۆیی بوایەن بۆ گەپ و پێکەنین دەیانگوت.
بووکمان هاورد لە (خورخورە[٣٢])[٣٣]
لە ماڵ باوکی سکی پڕە

یان:
بووکێ هاورد لەوەشتەوە
دوورگانی هاوە دەشتەوە.

هەندێ جار ئاغای گوند نەیهێشتووە ئەو بووکە لە گوندەکەیدا بە ئاسانی دەربکرێ تا بەناوی سووارانەوە لەبەری زاوا خەڵاتی وەربگرتبێ کە بەزۆری پارە بووە.

کە بووك دەردەهات بەچەپڵەڕێزان و گۆرانییەوە دەیانگوت:
(هاتینەوە، هاتینەوە.. بووکمان هاورد بابچینەوە)،[٣٤]

دایکی و خوشکەکانیشی بە شوێنیدا دەستیان بە نووکە نووك و گریان دەکردو دوعای خێریان بۆ دەکردو جامێ ئاوی ڕوونیشیان بە شوێنییدا دەرژاند بۆ ئەوەی بەبێ وەی بگاتەجێ، بووکەکەش کە ئەوانی بە چاوی فرمێسکاوییەوە دەبینی ئەویش هەر وەکو ئەوان دەگریا، ئەمە تەنیا لەبەر ئەوە بووە چونکە ئەو بووکە بە درێژایی تەمەنی لەگەڵ ئەو خێزانەدا ژیاوەو ئیتر بۆ یەکجاری لێیان جودا دەبێتەوە، ئافرەتێك یا مێرد منداڵێك لە خزم و کەس و کاری بووك بەردەرگای لێگرتوون و نەیهێشتووە بووك بەبێ خەڵات دەربکرێ، یا لە ڕێگەی ماڵی زاوا ئەو ڕێگریەی لێکراوە، دەستکەوتەکەشی هەر بۆ خۆی بووە، بەزۆریش ئەو کەسانە بەم نەریتە هەستاون کە هەژارو نەدار بوون، جا بەم نەریتە دەوترا (دەرپەردانە).

زۆرجار لەو کاتەی بووك دەردەکرا باوك و براکانی لە ماڵ نەدەمانەوە تا ئەو کەسانە هاتوون بۆ بووك بە ئارەزووی خۆیان هەڵس و کەوت بکەن و نەکەونە شەرمەوە، هەروەها پێشیان ستەم بووە ئەو کچە لە پێش چاویاندا لەماڵ دەربکرێ و ببەن، تەنیا برا بچووکەکانی لە ماڵ دەمانەوە.

بووك کەلە حەوشە دەردەکرا مێرد منداڵان دەیانگوت:
(هەلچە، لچە.. بووکێ بەشم کولیچە)،[٣٥] بووکیان سواری ئەو ماینە دەکرد کە بۆی تەرخان کراوە، ئنجا دەکەوێتە ڕێ، سوارچاکەکان لە ڕێگادا بە ئەسپ و ماین لەپێش بووکدا مەشق و سوارسوارانێ و ڕەمبازی و جۆرەها یارییان کردووەو بە چەکیش نیشانیان پێکاوە، دوزەلەژەن یا شمشاڵژەن لەو کاتەدا مەقام و ئاوازی سوارانەیان بۆ ژەنیون،

لە هەندێ شوێندا بەم ئاوازە دەڵێن (ئەسپشا)، خۆشی و پێکەنین و زەردەخەنە وەکو شەکر کلۆ کلۆ لەسەر لێوو زاریان باریوەو نەیانزانیوە خەمو پەژارە چییە تا بووکیان هێناوەتە بەردەرگای ماڵی زاوا، لە ڕێگایشدا بەتەنیشت هەر ئاواییەکدا تێپەڕ بوایەن دانشتوانی ئەو گوندەیش هەر بۆ خۆشی چەند تەقەیەکیان دەکرد، ئەمانیش بە تەقەکردن وەڵامیانیان دەدایەوە، ئەگەر منداڵانیش بهاتنایەتە سەر ڕێگایان نقوڵ و شەکرۆکەیان پێشکەش دەکردن.

بەڵام ئەگەر هاتوو ماڵی بووکەکە لە هەمان ئاواییدا بوایە ئەوە بەدەیان کەس لەپیاوو ژن، کچ و کوڕو مێردمنداڵ بە چەپڵەڕێزان و دەهۆڵ و زوڕنا، یا دووزەلە، یا شمشاڵ بەدەم گۆرانی و هەلهەلەو سەماکردن و گۆرانی (بووکانە، بووکانە بووکێ)وە ڕۆشتوون بۆ بووک، لەبەر دەرگای ماڵی بووکدا ئەو خەڵکە جەم دەبوون و چاوەڕوانی دەرکردنی بووکیان دەکرد، ئەو دیمەنە دەبووە ڕەنگینترین تابلۆی فۆلکلۆری، لەپڕ بەربووک و چەند ژنێکی قەیرە بووکیان لەماڵ دەردەهێنا، بووک بە جوانترین خاڵ و پۆشاکی ئاڵاو واڵای خۆماڵییەوە ڕازێنراوەتەوە، چاویان بە چاکترین کل و دەرمان ڕەشتووە، جۆرەها ملوانکەو گەردەنەو خشڵ و مێخەک و مورووی بە نرخ و مەرجانە سوورەی بووکێنیان کردووەتە گەردن و ملەوەو لەسەر تەختەی سینگی مەرمەڕینی بەند کراوە، باسکە سپییەکانی پڕ بوون لە بازنگی جۆراوجۆر، پەنجە ناسکەکانیشی پڕ لە ئەنگوستیلەی نایاب و گرانبەها، پەلکی پێنج پێنج و ڕەشی بە وێنەی دوو ڕەشماری بێ ' ئیجازە شۆڕبووی سەر جووتە مەمکۆڵانی، زوڵف و ئەگیرجەی خاوی پیاوی ژیرو وریای دەبری دەکرد، بۆنخۆشترین عەترو گوڵاوی نایابی فەرەنگییان لێداوە، ڕۆژی خەنەبەندانیش دەست و پێیان نەخشاندووە، بووک لە خۆشیدا هەر بزەی لێوی هاتووەو گۆنا خڕو پڕەکانی جوانتر لە سێوەی لاسوورەو دەنووکی کەو ئاڵ و سوورهەڵگەراو بوون، دوو تورمەی[٣٦] بووکێنی زەردو سووریشیان داوە بەسەردا، بەژن و باڵای بەو بەزمو ڕەزمەوە ئەوەندەی تر شیرینترو ڕێکوپێک تر بووە، برایە لە برا بچووکەکانی لەژێر کەواکەیەوە پشتی بە پارچە واڵایەکی ڕەنگامە بەستووەو پێیان گوتووە: یاخوا ئەمە لە نیەتی ئەوەی کە ببێتە خاوەنی ماڵ و دایکی حەوت کوڕ، ئەم پشتێنە شەو زاوا کردویەتیەوە، لە هەندێ شوێندا یەکێ لەدەستەخوشکانی کچەکە یا دایکی ئەم پشتێنەی بۆ بەستووە بە نیازی ئەوەی ژنەکە بە درێژایی ژیانی زاڵ بێ بەسەر مێردەکەیدا، ژنان بۆ ئەم مەبەستە ئامۆژگاریشیان کردووە، بارگەی کەلوپەل و شت و مەکی و ناومال و مێوژە سوورەو شەکرۆکەو بژی[٣٧] یا کولیچە پێچراوەتەوەو لە سەرپشتی ولاخێکی ئەمین و خۆشرەوت بەستراوە، ولاخەکە بە ڕەشمەی گوڵەنگدارو زینی ڕازاوەی بە نەقش و نیگارو هەگبەی ڕێکوپێک بۆ بووک ڕازێنراوەتەوە، بەڵام بە زۆری لەچەند پێخەفێك (نوێن) بەلاوە هیچ شتێکی دیکەیان بەو بووک و نەداوە، لەلایەن یەکێ لە ئافرەتان لە خزمی زاوا هەندێ پارەی کردووەتە نێو گۆرەوی بووکەکەوە ئەمە پێش ئەوەی لەماڵی باوکیدا دەربکرێ ئەنجامی داوە، ئەو پارەیە بۆ ئەو ئافرەتەیە کەوا لەماڵی زاوادا گۆرەوی بووکەکەی داکەنیوەو شوشتویەتی.

ئەگەر بە ماین بگوێزایەوە ماڵی زاوا سێ پیاو لە کەس و کاری خۆیانیان تەرخان کردووە، یەکێکیان جڵەوی ماینەکەی دەگرت، دووەم ئاوزەنگی ماینەکە تا بووکەکە نەکەوێ، سێیەمیشیان کلکی ماینەکەی بەدەستەوە بووە نەك کەسێکی ناحەز تەڵێ لە کلکی ئەو ماینە هەڵکێشێ و گرێی بداو ببێ بە هۆی بەستنی زاوا لەشەوی پەردەدا.

ئەگەر بووك بەپێ بچوایە نەدەبوو هەنگاوی گەورە بنێ، دەبوو وردە وردە بە ڕێگادا بەرەو ماڵی زاوا بڕوات، خۆیشی وا نەنوێنێ گوایە ئارەزووی لە شووکردنە، لەو کاتەدا کە بووك دەردەکرا هەندێ کەس یا بەربووك بەو نیازەوە ماڵی زاوا پڕ لە خێرو بەرەکەت بێ شتێکیان لە ماڵی بووکەکەدا دزیوە وەك: (کەوچك، پیاڵە، ژێر پیاڵە، قاپ و قاچاخ، ئاوێنە، قۆری، سەرین، پەرداخ) یان هەر شتێکی دیکە کەلەو ئانەدا دەستیان بکەوتایە، لە ئەنجامدا دراوەتە بووك، ئەویش بۆ بیرەوەری لای خۆی دەیپارێز، هەروەها بووکیان بە گۆرانی و سەماکردن و چەپڵەڕێزان گەیاندووەتە بەر ماڵی زاوا، هەندێ جار بووك ڕازی نەبووە لە ماینەکە دابەزێ تاماڵی زاوا خەڵاتیان کردووە، ئەوانەی سەمایان دەکرد ئاوێنەی گەورەو تارای ڕەنگامەو کەوچکی دارینی گورە (ئەسکۆ) یان بەدەستەوە بووەو ڕووەو پشت لە پشتی بووکەوە ڕۆیشتوون، بۆ ئەوەی بووکەکە خۆی لە ئاوێنەکەدا ببینێ، زاوایش لەسەر بانەوە لەگەڵ برازاواو[٣٨] چەند یاوەرێکیدا راوەستاوەو تەڵە قامیشێکی لەلەکراوی درێژیان داوەتە دەست، لەهەندێ شوێندا دەستە گوڵ بەسەر قامیشەکەوە بەستن، ئەمە هەر بۆ خۆشی و زەوق ئەنجام دەدرا، چونکە گوڵ نیشانەی ئاشتی و خۆشەویستییە، برازاوایش لەدەستەسرێکدا نوقڵ و چکلێت و شەکرۆکەو مێوژو گوێزو هەندێ پارەو پوولی وردەی ئامادەکردووە، چاوەڕوانی هاتنی بووك بوون، کاتێ بووك لەماڵی زاوا نزیك بووەتەوە برازاوا ئەو پارەو نوقڵانەی فڕێداوەتە سەر بووکەکەدا، منداڵ و توال بۆ خۆیانیان کۆ کردووەتەوەو لە بووکیش دوور کەوتوونەتەوە، بەگەیشتنی بووك بۆ بەر دەرگای ژووری بووك و زاوا کاکی زاوا تەڵەقامیشەکەی داوە بەسەر بووکە نەشمیلانەکەیدا و دەستبەجێ بووە بە دوو کەرتەوە چونکە لەوەو پێش بەکێرد لەیەك دوو لاوە لەلەکراوە، لەهەندێ ناوچەدا زاوا لەجیاتی قامیشەکە بە وردە بەرد لە بووکەکەی داوە، دەڵێن ئەمە بۆ ئەوە ئەنجام دراوە تا ئەو ئافرەتە چاوترس بێ لە مێردەکەی، لەهەندێ شوێنی دیکەی کوردەواریدا بە گەیشتنی بووك بۆ بەر دەرگای ژووری زاوایی نانێکی بتوونی بەسەردا لەت کراوەو دابەشیان کردووە بەسەر خەڵکیدا، یا برنج یا گەنمیان بەسەردا ڕژاندووە بۆ ئەوەی سەر بەخێربێ و ببی بە خاوەنی ماڵ و منداڵ کە بووك دادەنیشێت بە خێرایی منداڵێکی کوڕپەیان لە باوەشیدا دادەنا بەو هیوایەی نۆبەرەکەی کوڕبێ، زاوا لەپاش خۆرئاوا کە دەچووە ژوورەوە دەبوو لە بووکەکە بخورێ و پێیشی بنێتە سەر پێیدا بۆ ئەوەی هەر لەیەکەم ڕۆژەوە زاڵ بێ

بەسەرباو بەچاکی خزمەتی بکات، بووکیش بەش بەحاڵی خۆی هەوڵی داوە لە پێشی زاوادا بەو نیازە ئەو کارە بکات.

ئەو کەسەی کە وەکو پێشەنگ جڵەوی ماینەکەی ها بەدەستەوە، لەدوای دابەزینی بووك سواری ئەو ماینە بووەو تاوێ چاك لەپێش جەماوەرەکەدا رەمبازیو غارغارێنێ کردووە، ئینجا ئەو ماینەیان بردووە لە ژوورێکی تایبەتیدا بەستووەتەوە بۆ ئەوەی کەس دەستی پێ نەگات تا کاکی زاوا بووکەکەی دەکا بە ژن.

بووکیش لەدوای ئەوەی هەندێ پشوو دەدا تاوێ لەدەستی زاوادا هەڵدەپەڕێ، بۆ ئەوەی خەڵکەکە ببینێو بزانن جوانە یا نا، لەپاش ئەوەی بووك دەگەیشتەجێ ئیتر بەرە بەرە خەڵکی لەپاش پیرۆزباییو خواحافیزی کردن شاییەکە چۆڵ دەکەنو هەرەیەکە بۆ ماڵی خۆی رێ دەگرێتە بەر.

سەر لە ئێوارە لەپاش بە زاوا بوونی زاوا چەند تەقەیەکیان کردووە، یا زاوا خۆی لە پێشی ئەواندا ئەو تەقەیەی کردووە، بۆ ئەوەی بە خەڵکی بگەیەنن کەوا زاوا بە زاوا بووەو بووکەکەش رووسوورە، واتە داوێن پیسی نەکردووە، زاوا کە دەچووە دەرەوە یەکسەر دەچوو دەستی دایكو باوکی یا براگەورە، دایکیشی دەستی کردووەتە ملو ئەملاو ئەولای ماچ کردووە.

زاوا هەرچەندە زووتر بووبێ بە زاوا پتر بۆی ئازاییو کەڵەمێردی بووە، لەپاش دەرچوونی زاوا پێخەسوو دەستەجێ چووەتە ژوورەوەو هەڵهەڵەی لێداوەو نێو تەوێڵی کچەکەی ماچ کردووە، ئنجا دایكو خوشكو پووررو خزمانی زاواو ئەو ئافرەتانەی لەوێ مابوونەوە رۆیشتوون بووکەکەیان ماچ کردووەو پیرۆزباییشیان لێ کردووە، لەدواییدا ئەو دەستەسرەی لەژێر بووکدا دانراوە بۆ ئەوەی خوێنەکەی برژێتەسەری پێخەسوور بردوێتی بۆ ماڵی باوکی بووکەکەو داویە بە دایکی بە نیشانەی ئەوەی کچەکەی رووسووربووە، واتە: کچ بووە، ئەمەش سەربەرزییەکی گەورە بووە بۆ ئەو کچەو کەسو کارەکەی، دایکی لە پێشیاندا داناوەو پیشانیانی داوە ئەوانیش بەپێی توانا پارەیان خستووەتە سەر، ئەو پارەیە دراوەتە پێخەسوورەکە کەلە تەکیاندا ئامادەیە بەرامبەر بە هەقی ئەركو ماندووبوونەکەی.

ئەوانەی بانگهێشت کراونەتە سەرشایی هەر کەسە بەش بەحاڵی خۆی لە ئاژەڵو برنجو کەلە شەکرو رۆنو جگەرەو پارە یارمەتی خاوەن شاییان داوە واتە کەس بە دەست بەتاڵی نەچووەتە سەر شایی، خاوەن شاییش لە دەستەسرێکدا هەندێ نوقوڵو شەکرۆکەو مێوژی داونەتێ.

بەراستی ئەم نەیتە یارمەتییەکی چاك بووە بۆ خاوەنی شایی هەندێ جار بەر لە گواستنەوەی بووك ئەو دەستەسرو شەکرۆکەیە بەشراوەتەوە، هەروەها ئەوە بەڵگەیەکە بۆ هەرەوەزیو یەك گرتنو خۆشەویستی کۆمەڵانی نەتەوەکەمان.

جاران ئافرەتان لەیەکەم رۆژدا لە پاشی بەزاوا بوون کۆمەڵ کۆمەڵ بەدەستە دیارییو سۆغەوە رۆیشتوونەتە لای بووكو دیدەنیان کردووە، بەو دیارییە وتراوە: (سەرلەچەکانە).

هەروەها خواردنیشیان دروست کردووەو لەسەر سینی بۆ زاواو بووکیان بردووەو پێیان وتووە: (کاسەو سفرە)، ماڵی زاوایش لە جیاتی ئەو رێزەو ماندوو بوونە چکلێتو کولیچە یا میوەیان خستووەتە سەر سینییەکەوە بۆیان ناردوونەتەوە، یا پارچە قوماشێکیان بۆ ناردوون، دیارییەکان دراونەتە (پێخەسوو)ە کە بەڵام ئێستا لە رۆژی هەفتەیدا ئەنجام دەدرێو پێی دەڵێن: (هەفتانە) هەمووێشی بۆ بووکە، پێخەسوو هەر هەمان رۆژ بەدەستبەتاڵی دەگەرێتەوە ماڵی خۆیو چاویشی لە دەستی کەس نییە، نەریت وەها بووە هەر پیاوێکیش لەماوەی هەفتەیەکدا دیدەنی بووکی بکردایە دەبوو خەڵاتی بکردایە کە پێیان دەگوت: (شەرمەشکانە)، لەدوای هەفتەیەك دایکی بووك دیاریی کریوەو لەگەڵ دووسێ ژنی دیکەدا چوونەتە ماڵی زاوا نانی نیوەرۆیان لەوێ خواردووە، لە پاشی چایی خواردنەوە بووکەکەیان بردووەتەوەو گەراونەتەوە ماڵی خۆیانو پێ دەکەنەوە، بەم رۆیشتنەوەی بووکەکە دەڵێن: (باوەنخوونی) یا: (باوەخوون) هەندێ جار دایکی بووك نەچووە بەڵکو ماڵی زاوا بە زاواو هەندێ لە کەسە نزیکەکانی بووکەکەیان باوەنخوونی کردووەتەوە، لەوێ پێنج شەش رۆژێك ماونەتەوە ئنجا مێردەکەی چووتە شوێنیو هێناویەتیەوە، زۆرجار لەو دیدەنیەدا یا لەپاش مانگێك ماڵی باوکی خەڵاتی کچەکەیان کردووە، دیارییەکەش بریتی بووە لە گوێرەکەیەکی مێ یا مەرێك یا زیاتر، بووکەکە بەم دیارییە زۆر دڵخۆشو بەختەوەر دەبوو، لە ماڵی غەزووریشیدا شانازی پێوە دەکرد، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا ئەو ژنە خۆی بەخاوەنی ماڵ بزانێو سوودیش لە بەرو بوومی ئەو ئاژەڵانە ببینێت.

هەروەها خزمو دۆستو یارانی زاواو بووك تا ماوەیەك هەردووکیانیان داوەت کردووە.

ئەمەش پارچە شیعرێکی فۆلکلۆرییە کەوا بۆ شاییو بەسەر بووکدا وتراوە:

(بووکانە، بووکانە بووکێ[39]
بووك ئێمە چەند جوانە بووکێ)
(بووك ئێمە بووك نییە بووکێ
سەرتاپێ قوتنییە[40] بووکێ)
(بووکمان هاورد لە دوورەوە
وەتورمەی زەردو سوورەوە)
(مینێ بێنن ناڵکەن بووکێ
بووکێ بێنن سوارکەن بووکێ)
(بووکێ ئێژێ نابم سوار
هەتا زاوا نەبێ دیار)
(ئەو جێ بووك لێی شیشتن بووکێ
ساوین بەجێ هێشتن بووکێ)
(دایك بووك خۆی کوشتبو بووکێ
بووکانە، بووکانە بووکێ)
(هە دەرنایە، هە دەرنایە
هەر چەند ئەکەم بووك دەرنایە)
(بەسەرو ماڵ بۆم دورنایە
بووکانە، بووکانە بووکێ)

**بووك ئێمە چەند جوانە بووکێ**

وەکو دەزانین نەریتی بووك گواستنەوە لە ئەمرۆدا نەك تەنیا لە دەڤەری گەرمیاندا بەڵکو لە سەرتاسەری کوردستاندا بە ئۆتۆمبیل ئەنجام دەدرێ‌و بەنێو بازاڕیشدا تاوێ دەیسووڕێنن، لەپاشدا دەیبەن بۆ ستۆدیۆو زاواو بووك بۆ دیاری پێکەوە وێنەی فۆتۆ دەگرن، لەدواییدا دەچنە ماڵ هەندێ زاواو بووکیش دەستییەك دەگرن‌و بە جووتە دەچن بۆ مانگی هەنگوین‌و پاش چەند ڕۆژێك دەگەڕێنەوە ماڵ.

*** ژن بە ژن:**

نەریتی ژن بەژن لە نێوکۆمەڵگای کوردەواریدا بە شێوەیەکی گشتی باو بووە، بۆ نموونە یەکێ خوشکەکەی دەدا بەشوو، خوشکی ئەو کەسەی دەهێنا کەوا خوشکەکەی خۆی لێ مارە کردووە، یا باوك کچەکەی خۆی داوە بەشوو کچی ئەو ماڵەشی بۆ خۆی خواستووە، یا کەسێك کچی خۆی داوە بەکەسێك‌و خوشکی یا کچی ئەو کابرایەشی بۆ براکەی مارە کردووە، جاری وایش بووە کچییەکێکیان کوڕەکەی نەویستووە بەڵام گوێیان پێ نەداون‌و بە هێزی خەنجەرو تێهەڵدان داویانە بە شوو، واتە خۆشی بوایە ترشی بوایە دەبوو بە ئارەزووی ئەوان نەك هی کچەکە بدرایە بە شوو، بۆیە هەندێ جار کچەکە لە قاراندا خۆی دەکوشت یا: خۆی دەسووتاند جاری وا بووە یەکێکیان یەك دوو ڕۆژ یازیاتر پێش ئەوەی دیکە شایی دەکردو ژنی خۆی دەگواستەوە، بەڵام بە زۆری لە یەك ئان‌و کاتدا شاییان کردووە بووکی خۆیان گوێزاوەتەوەو لە ناوەڕاستی ڕێگەش لە شوێنێکی دیاری کراودا هەردوو بووکەکە یەکیان دەگرتەوە، ئەگەر هاتوو یەکێکیان پێش ئەوەی دیکەیان بگەیشتایە ئەو جێگایەی دیاری کراوە ئەوە لەوێدا بووك ڕادەگیراو لە شکری بووکیش لەو دەشت‌و چۆڵەدا دەستیان کردووە بەهەڵپەڕکێ‌و شایی تاوەکو بووك‌و بارو باخانەی ئەوەی دیکە گەیشتووەتە ئەوێ، لە شکری هەردوو بووك یەکیان دەگرتەوە، هەردوو بووکەکەیان دادەبەزاندو لەگەڵ یەك دوو ئافرەتدا هەندێ لەو خەڵکە دوور دەکەوتنەوە، ئافرەتەکان جاجمێك(مەوج)، یا پۆپەژمێنێکیان دەگرتەوە هەردوو بووکەکە دەچوونە ژێریەوەو یەکتریان ماچ دەکردو دەرزی یا (دەرزی بەریاقە)کانی خۆیانیان دەگۆڕیەوەو دەهاتنەوە بۆ لای جەماوەرەکەو هەمیسان سواری ماینیان دەکردنەوە، ئنجا هەریەکە بەخێرایی بووکی خۆی وەردەگرت‌و بەرەو شوێنی خۆیان دەچوون.

هەندێ جار لەسەر دوا کەوتنی بووکێکیان بۆ شوێنی دیارکراو کێشەیەك یا کۆبەندێك ڕووی دەداو دەبوو بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ژن بەژنەکە، گوایە ئەوان خۆیان لەمان بە پیاوتر زانیوە.

خاوەن شاییەکە هەرکە لای خۆیەوە مەسرەفی شایی خۆی دەگرتە ئەستۆ، جاری وایش بووە ژن بەژنەکە گەورە بە بچووك یا بچووك بەبچووك لەسەر مەلۆتکە پێك هاتووەو مارەیان کردوون، کاتێ گەورە بوون جارێکی دیکە خوازبێنیان کراوەتەوەو زەماوەندیان بۆ گێڕاون، ئەم نەریتە کۆن‌و ساکارە هەرچەندە لە ڕاستیدا پەسەندو دروست نییە، بەڵام بەرای ئێمە هۆکاری پەیدا بوون‌و سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە سەر دوو هۆکاری سەرەکی:

١. لەبەر هەژاری‌و دەست نەڕۆیی خەڵکی پێشوو نەیانتوانیوە بە ئاسانی ژن بۆ کوڕەکانیان بهێنن، بۆیە پەنایان بردووەتە بەر ئەم نەریتەو توانیویانە لەم ڕێگایەوە بۆ کوڕەلاوەکانیان ژن بهێنن‌و کیژەکانیشیان بەمێرد بدەن یا ئەو پیاوانەی کە بەتەمەن بوون نەیانتوانیوە ژن بهێنن ئەگەر ئەم ڕێگایە نەبوایە بەڵام گەلێ جار ئەم ژن بەژنە هەردوو خێزانەکەی تووشی کۆسپ‌و تەگەرە کردووە تەنانەت گەیشتووەتە جودا بوونەوەی هەردوو ژنەکە لە پیاوەکانیان، سەیر لەوێ بووە هەرچەندە ژنێکیان مێردو ماڵی خۆی ویستبایەو ئارەزووی لەو بەزمو ڕەزمە نەبووبێ بەڵام باوك‌و براو کەس‌و کارەکەی گوێیان نەداوەتێ‌و بە زۆرە ملێ ڕایان کێشاوەو براوەتەوە لای خۆیان‌و بەتەڵاقیانداوە بۆیە پێشینان وتویانە (ژن بەژنی قوڕ بەسەری)،[41] ئەگەر بووکێکیان ماڵی غەزووری‌و مێردەکەی بۆی خراپ بووبێتن، بووکەکە دەیوت: (ئەڵێی لە خوێندا دراوم) چونکە زووتر کە دوو بنەماڵە یاهۆز دوژمنایەتی و پیاوکوشتن لەنێوانیاندا ڕووی بدایە، بۆ بنبڕکردنی کێشەکە ژنیان بەیەکتر دەداو ئاشت دەبوونەوە.

٢. زۆر جار ئەم ژن بەژنەیان ئەنجام داوە لەبەر نەهێشتنی ناکۆکی‌و بەتین کردن‌و بەهێزکردنی دۆستایەتی نێوان دوو بەرەباب یا بنەماڵە یا دووخێڵ تالە یەك نزیك ببنەوەو نەوەکانیشیان ببنە خاڵۆو خاڵۆزاو پوورزا، وەکو لەم پەندانەدا دەردەکەوێ:

* خزمت کێیە؟

* هێشتا ژنم نەهێناوە[42]

* خزمی ژنانبەر بەرە بەرە خزمی پیاوان دەربەدەرە[43]

ئەگەر کچێکی مارەبراو یا لەپاش شووکردنی لە ڕۆژێکەوە تا چەند مانگێك مێردەکەی بمرێ ئەوە دەڵێن: ئەو کچە سەرەخۆرە، بۆیە زۆر کەس ئیتر ناوێرێ بۆ خواستنی توخنی بکەوێ‌وا دەزانن هەر کەسێ بیخوازێ ئەویش وەکو مێردەکەی پێشووی دەمرێ بەڵام ئەگەر هاتوو کچەکە یا ژنەکە بمردایە ئەوە کوڕەکەیان بە شووم نەدەزانی ئەگەر بۆ چەند جارێکیش بووبێت.

ئەگەر لە ڕۆژانی شاییدا بباریایە دەیانوت: ئەو بووکە سەر بەخێرە، ئەگەر کەسێك لە خزمی بووك یا زاوا یا دراوسێیەکیان بمردایە یا تووشی چورتمێك ببوایە دەیانوت: بووکەکە پێ‌و قەدەمی شووم بوو.

*** بێوەژن:**

ئەو ژنەیە کەوا مێردەکەی مردووبێ یا لێ جودا بووبێتەوە واتە: بێ مێرد مابێتەوە، زۆربێوەژنی منداڵدار هەن هەتا دوا ژیانیان شوویان نەکردووەو بە دیار جگەر گۆشەکانیانەوە دانیشتوون‌و بە بێوەژن کۆشی بە سەر بەرزی‌و ڕوو سووری منداڵەکانیان بەخێوکردوون.

بەشێكیشیان شوویان كردووەتەوە، بەزۆری ئەو پیاوانە خواستوویانن كەوا ژنەكانیان مردوون، هەیش بووە شووبراكەی مارەی كردووە بۆ ئەوەی خۆیو منداڵەكانی بپارێزێو پەرتەوازە نەبن، هەندێ ژنیش هەن لەئاستی منداڵانی پیاوەكانیان كە لەژنی پێشوون دڵرەقو خراپ دەبن بۆیە پێشینان وتویانە: (یاخوا دوژمنت باوەژندار نەبێ)،[44] یا (ژن باوكە، كافرباوكە)[45]، یا: (دایك بوو بە باوەژن، باوكیش ئەبێ بە باوە پیاو)[46]، گەلێكیشیان هەن ژنی ئاقڵو ژیرو وریاو لە خواترسو بەبەزەیین، ئەو منداڵانە لەگەڵ جگەرگۆشەكانی خۆیاندا جودا ناكەنەوە، جاری وا بووە كورێكی لاو كەوتووەتە داوی ئەوینی ژنێكی بێوەژنو لەگەڵیدا دڵداری كردووەو دەرەنجام خواستوویەتیو زەماوەندی بۆ گێڕاوەو ژیانی ژنو مێردیشیان خۆشو بەختەوەر بووە، پێشینان ئەم پەندەیان لەسەر بێوەژن وتووەو رێی بۆ خۆش كردوون تا مێرد بكەن: (پیاو بەبێ ژن هەژار دەبێ، ژن بەبێ پیاو هار دەبێ)،[47] زۆرتر وایە بێوەژنی شووكردوو بەشەو گوێزاوەتەوە بۆ ماڵی مێردو ئاهەنگو شایی بۆ نەگێردراوە.

*** گواستنەوەی بووك بە نهێنی ( پەلكێش ):**

مەبەست لەم نەریتە ئەوەیە كە بووك بەشێوەیەكی ئاساییو ئاشكرا نەگوێزراوەتەوە بۆ ماڵی زاوا، بەزۆری لەپاش رۆژئاوا بەنهێنی پەلكێش كراوە بۆ ئەوەی كەس ئەو بووك گواستنەوە نەبینێ، هۆكارەكەشی لەچەند خاڵێكدا دەستنیشان دەكرێ:

١. مردنی كەسێكی خاتردار یا خزمێكی نزیك بە زاوا یا: بووك كە ساڵێكی بەسەردا تێنەپەڕیبێ، ئەمەلە كوردەواریدا نەریت وابووە وەكو رێزلێنان لە مردووەكەو كەسو كاری.

٢. جاران بۆ زۆربەی هەرە زۆری بێوەژنەكان شاییان نەگێڕاوەو بە نهێنی لەژێر پەردەی تاریكی شەودا گواستویانەتەوە، چونكە لە كچێنیدا رێزیان لێ گرتوونو شایییان بۆ گێڕاون، بۆیە ئیتر دووبارەی ناكەنەوە، هەیش بووە شایی بۆ گێڕاوە بەتایبەتی ئەگەر كوڕەكە گەنج بوایەو بووكەكەش جوانە بێوەژن بووبێت.

بەڵام ئەگەر بووكێك كچ بوایە پەلكێش كرابێ، تاڵە ژیاندا مابێ لە یادی نەدەچوو، هەمیشە خۆی بە خەمبارو ماف خوراو دەزانی، جاربەجاریش بۆ دەستە خوشكەكانی گلەیی دەكردو دەیوت: (بەختە رەشەكەی من وابوو پەلكێش كرام).

*** بەسرانی زاوا:**

فەرە جار زاوا بۆ چەند رۆژێك یا هەفتەیەك بە (زاوا) نەبووە، واتە: بووكەكەی نەكردووە بە ژن، دەڵێن گوایە زاوا بەستراوە، دەیانگوت ئەمە بە هۆی ئەوەوە بووە ناحەزێك، زاواكە یا بووكەكە بە نیازی بەستنی زاواكە نوشتەی بۆ سازكردووە یا لەكاتی مارە بڕیندا بە نهێنی قفڵێكی كلیل داوە، یا پەتێك، دەزوویەك، پارچە پەڕۆیەك یا چەند تەڵە موویەكی گرێ داوەو لە ژێرخاك یالە پاڵ گۆڕێك لە گۆڕستاندا لە ژێرگڵ هەشاریان داوە، یا خستویەتی نێو دەریا، یا رووبار، یا جۆگەی ئاوەوە، یا: بۆ هەمان مەبەست لەكاتی دەركردنی بووك لەماڵی باوكیدا هەندێ (كل) یان خستووەتە ژێرپێیەوە، یا ئەو كلەیان خستووەتە نێو هەگبەو بارو باخانەی بووكەوە، جا كەسو كاری زاواكە لە ترسی ئەم نەریتە لەكاتی مارە بڕیندا تەنیا خزمو كەسانێكی باوەڕ پێكراوی ئامادە كردووە، هەروەها لەكاتی دەركردنی بووكیشدا ئەوەیان پێرەو كردووەو ئاگایان لە بووكەكە بووە نەك ناحەزێك زاواكە ببەستێت.

بۆ چارەسەركردنی ئەم كێشەیە زاوا، یا: بووكەكە لەگەڵ چەندژنێكی قەیرەدا دەرۆیشتنە لای مەلایەك یا نوشتەنووسێك، ئەویش بە پارە نوشتەیەكی بۆ ئامادە دەكردنو لەپاش قەنج كردنی دەیدا بە دەستیانەوە، یا هەندێ دوعاو سوورەتی فاتیحەی بەسەردا دەخوێندو پێی دەوت: برۆ ئەوە نوشتەی پێشووم پووچەڵ كردەوە، ئەویش بەمە دڵنیادەبوو، لەئەنجامدا زاوا دەبوو، لە راستیدا ئەم زاوا نەبوونە وانییە بەڵكو بە زۆری پەیوەندی بە باری دەروونی زاواكەوە هەیە.

*** پەراوێزەکان:**

١. داب نەریتی کوردەواری ناوچەی گەرمیان، هەردەوێڵ کاکەیی، بە یارمەتی ئەمینداریتی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٩، لاپەرە ١١٨.

* لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە٣٣، ساڵی ٢٠٠٨)دا بڵاوکراوەتەوە.

* رۆژی ٢٠٠٧/٨/٢٢ لە ئێوارە کۆڕێکی کەلەپووریدا لەژێر ناونیشانی ژن هێنانو زەماوەند لەدەڤەری گەرمیاندا، ئەم بابەتە لەلایەن نووسەرەوە پێشکەش بە ئامادەبوان کراوەو گفتوگۆی لەسەر کراوە.

* رۆژی ٢٠٠٩/٦/١٣ لە ئێوارە کۆڕێکدا کە سەنتەری رۆنیا لە ئاوایی حەسار پێی هەستا، لەلایەن نووسەرەوە خوێنراوەتەوەو لەلایەن ئامادە بوانەوە وتووێژێکی گەرمی لەسەر ساز کراوە.

* رۆژی ٢٠١١/١١/٣١ لە ئێوارە کۆڕێکدا بەشێك لەم بابەتە لەلایەن نووسەرەوە پێشکەش بە ئامادەبووان کرد، کۆمەڵەی روناکبیریو کۆمەڵایەتی کەرکوك پێی هەستا.

٢. پەندی پێشینانو قسەی نەستەق لەناوچەی کەرکوکدا، هەروەوێڵ کاکەیی، ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەرە ١١٢.

٣. رەبەن، سەڵت، بێ ژن.

٤. شەکراو: لەدەڤەرێکدا ئاوی خاوێنیان دەهێناو شەکریان تێدەکرد، لەجیاتی شەربەتی ئەم سەردەمە نۆشیان دەکرد.

٥. هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی دووەم، هەردەوێڵ کاکەییو لەتیف گلی، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٩٥، لاپەرە ٦٣.

٦. گۆڤاری بەیان، ژمارە (٥٨)، کانوونییەکەم، ١٩٧٩، فەخرەدین نەسرەدین.

٧. هەمان سەرچاوە، هەردەوێڵ کاکەیی و لەتیف گلی، لاپەرە ٢٤.

٨. خورماتوو: شارۆچکەیەکە دەکەوێتە سەر رێگەی گشتی نێوان کەرکوكو بەغدا بە (٩٥) کیلۆمەتر، لەبناغەدا سەر بەشاری کەرکوکە، رژێمی بەعسی لێی دابریوەو خستووینە سەر پارێزگای تکریت، زۆربەی دانشتوانی کوردن.

٩. چەفیە: سەرپۆش.

١٠. هەمان سەرچاوە هەردەوێڵ کاکەیی و لەتیف گلی، لاپەرە ٥٢.

١١. سورمە: کل، ژنان چاویان پێ دەرێژن.

١٢. حەبیبی، خۆشەویستەکەم.

١٣. هەمان سەرچاوە، هەردەوێڵ کاکەییو لەتیف گلی، لاپەرە ٧٥.

١٤. گۆیندە: شایەر، قسەکەر.

١٥. مەقامزان شەوکەت خورشید حوسێن، کەرکوك، داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.

١٦. هەمان سەرچاوە فەخرەدین نەسرەدین، لاپەرە ٦٩.

١٧. لۆکس: چرایەکی تۆرداری گەورەیە، بەنەوت کار دەکات.

١٨. هەمان سەرچاوە شەوکەت خورشید حوسێن.

١٩. چەند مەلۆیەك لە شاری فۆلکلۆری کوردی، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٦، لاپەرە ١٩٣.

٢٠. هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی سێیەم، ئیبراهیم باجەلانو هەردەوێڵ کاکەیی، ئینستیتیۆتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەرە ٩١.

٢١. هونەرمەندی میللی مستەفا نانەوا، خورماتوو.

٢٢. هەمان سەرچاوە، مستەفا نانەوا.

٢٣. هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگییەکەم، هەردەوێڵ کاکەیی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٥، لاپەرە ٤٥.

٢٤. هەمان سەرچاوە، مستەفا نانەوا.

٢٥. تورنج، نارنج، زووتر فەریکە نارنجیان مێخەکرێژ دەکردو لەبەر سێبەر وشکیان دەکردەوە، بۆ بۆنخۆشی لە گیرفان یا بوخچە دادەنرا، زۆرجار کوڕ یا کچ: بەدیاری پێشکەش بە ئەویندارەکەی دەکرد.

لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا لە جیاتی ئەم تورنج بەمێخەك، سێو بەمێخەکیان هەیە هەر بۆ هەمان مەبەست بەکاری دێنن.

٢٦، ٢٧. هونەرمەندی مەقامبێژ شوکر محەمەد قادر، کەرکوك، بەشوکر خەیات ناسراوە.

٢٨. کەژاوە: جۆرە سەنووقێکی دارینە لەسەر پشتی ماین بەند دەکرێ، بۆ گوێزانەوەی بووك بەکاردێ، هەروەها کۆچەرییەکان لەکاتی کۆچو باردا بۆ ئافرەتو منداڵو دیدە سالە یەك کەوتەوکان بەکاری دێنن.

٢٩، ٣٠. هەمان سەرچاوە فەخرەدین نەسرەدین.

٣١. گۆڤاری کاروان ژمارە (١٥٤)، ساڵی ٢٠٠١، مستەفا محەمەد زەنگەنە، عەبدولحەمید سەعید بەرزنجی.

٣٢. خورخورە: چەمێکە دەکەوێتە خوارووی ئاوایی قەڵخانوی بچووك، سەر بە شارۆچکەی خورماتوو.

٣٣، ٣٤. مینا وارانی بابا، داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.

٣٥. ئایشێ رەحمان جەباری، کەرکوك، گەرەکی مەولەوی.

٣٦. تورمە: تارا، جۆرە سەرپۆشێکی جوانو تەنكو نەرمە، دەدرێ بەسەر بووکدا، رەنگی زۆرە: زەرد، سوور، سەوز، مۆر.

٣٧. بڕێ: جۆرە کولیچەیەکی جارانە بە تایبەتی بۆ بووك ئامادە دەکرا.

٣٨. برازاوا: کەسێکی بە ئەزموونی ژندارە، بەزۆری دۆست، یا خزمی زاواکەیە، ئامۆژگاری زاوا دەکا لەهەموو بارەیەکەوە.

٣٩. خاتۆ وازیح رەحیم خانە، کەرکوك.

٤٠. قوتنی: پارچەیەکی جوانی رێ رێیە، بە زۆری بۆ کەوای ژنان بەکاردێت.

٤١. سەعدیە عەلی وەلا وەهاب (١٩٣٥– ٢٠١١)ی ز، کەرکوك.

٤٢. نەشمیە غەیبوڵڵا سەلیم (١٩٣٩- ٢٠١٢/٢/١) داقوق، تۆپزاوە.
٤٣. پەندی پێشینان چاپی دووەم، شێخ محەمەد خال، چاپخانەی كامەرانی، سلێمانی، ١٩٧١، لاپەرە ١٨٧.
٤٤، ٤٥. هەمان سەرچاوە، مینا وارانی بابا.
٤٦. پەندی پێشینانی كورد، بەرگییەكەم، عەلی مەعرووف شارەزووری، ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨١، لاپەرە ٥٣.
٤٧. رەحیم فەرەج دەروێش (١٩٢٧- ٢٠١٢/٢/٢٦) كەركوك.

* چاوپێكەوتنەكان:
١. نەجمەدین فەرەج دەروێش (١٩١٢- ٢٠٠٠/١٠/١)ی ز، داقوق- ئاوایی تۆپزاوە.
٢. مینا وارانی بابا (١٩٢٢ی ز- ) داقوق- ئاوایی تۆپزاوە.
٣. ئەحمەد رەزا عەزیز (١٩١٧- ٢٠٠٢/١٢/١٩)ی ز، داقوق- ئاوایی تۆپزاوە.
٤. میرزا وەلی نازە (١٩١٤- ٢٠٠٢ی ز) داقوق- تۆپزاوە.
٥. مەقامزان سەیید عەزیز عەباس (١٩١٨- ١٩٩٢)ی ز، كەركوك داقوق.
٦. سەیید نەجمەدین بەرزنجی (١٩١٨ی ز- ) كەركوك- گەرەكی چای.
٧. شوكر رەزا عەزیز (١٩٢٤- ٢٠٠٤)ی ز، داقوق- خۆرز.
٨. ئایشێ رەحمان جەباری (١٩٢٥ی ز- ) كەركوك- گەرەكی مەولەوی.
٩. مەقامزان شوكر رەشید نادر (١٩٣٩ی ز- ٢٠٠٨) داقوق- ئاوایی (شوكر جەیران).
١٠. فەتاح مستەفا داودی (١٩٣٣ی ز- ) خورماتوو.
١١. مەقامزان شوكر محەمەد قادر (١٩٤٠ی ز- ) كەركوك، ناسراوە بە شوكر خەیات.
١٢. گۆرانیبێژی میللی عەلی مەجید نادر زەنگەنە (١٩٣٥ی ز- ) كەركوك- شۆریجە.
١٣. مەقامبێژ سەلاح محەمەد خدر (١٩٣٥ی ز- ٢٠٠٩/٥/٨) بە سەلاح داودە ناسراوە- كەركوك- شۆریجە.
١٤. مەقامزان شەوكەت خورشید حوسێن (١٩٣٦ی ز- ) بە مام شەوكەت كاكەیی ناسراوە- داقوق- تۆپزاوە.
١٥. عوزێر مام ئەحمەد (١٩٣٨ی ز- )كەركوك.
١٦. نەشمیە غەیبوڵڵا سەلیم (١٩٣٩- ٢٠١٢)ی ز، داقوق- تۆپزاوە.
١٧. خاتو وازیح رەحیم خانە (١٩٤٤ی ز- ) كەركوك.
١٨. عەلی مەحموود داودی (١٩٣٧ی ز- ) كەركوك.
١٩. مەهدی مەلا مەحموود ئەمین شێخانی (١٩٤٠ی ز- ٢٠٠٨/٦/٢) قادركەرەم.
٢٠. عاسی عەبدولكەریم رەشید ئاغای زەنگەنە (١٩٥٤ی ز- ) كەركوك.
٢١. سەعدیە عەلی مەلا وەهاب (١٩٣٥- ٢٠١١ی ز) كەركوك.

*** پەندی پێشینان:**

**هەردەوێڵ کاکەیی**

**(ئـ)**

**١. ئاخوڕ عومرو ئەوەڵ دڵداری.**
**٢. ئاسیاو ئەکاکاری خۆی، چەقەنە ئەدا لەزاری خۆی.**
**٣. ئاسیاو بەنۆبەت.**
**٤. ئاشتی پشیلەو مشك لەزەرەری عەتاردایە.**
**٥. ئاشەوان کەری خۆی باش ئەناسێ.**
**٦. ئاشی بێ ئاشەوان، ماڵی فرەکابان، ماڵ وێرانی لەدوایە.**
**٧. ئاشی نەزان خوا ئەیگێڕێ.**
**٨. ئاغاژن هەرچی بکا، خزمەتکار هەقی نییە بپرسێت.**
**٩. ئاگاداری ماڵی خۆت بەو دراوسێ بەدز مەکە.**
**١٠. ئاگرو دۆ باشترە لە شوو.**
**١١. ئاو خۆی ئەندازیارە.**
**١٢. ئاو لەگۆمدا زۆرمایەوە ئەگەنێ.**
**١٣. ئاوی کەللەوپێت ئەنێمەدار.**
**١٤. ئای لەدڵەکەم چەندێ بێ عارە، دایم وەتەمای ژنی شوودارە.**
**١٥. ئۆخەی ئۆخەی بەسمانە، کوڕە کەچەڵ کەسمانە.**
**١٦. ئۆخەی ئۆخەی، هەر کەس بۆ خۆی.**
**١٧. ئۆمەرمەندان بەگیسکێ ڕازی نەبێ، خاڵخاڵان بەنیسکی ڕازی ئەبێ.**
**١٨. ئەجەل ئەواتی بۆ لێو ئاوان، بەنە لەبەنە ئاگرێ تاوان.**
**١٩. ئەچمە ئاسمان با ئەمبا، دێمە ئەرز ئاو ئەمبا.**
**٢٠. ئەڕۆی بۆ قاوەڵتی، نەك دایکوتی.**
**٢١. ئەرێ پایزە برا، چۆنی؟**
**٢٢. ئەرێ چیتان لێم ئەوێ، بڕۆم لەناو قەبرەکەم دانیشم؟**
**٢٣. ئەسپی نییەو ئاخوڕ ئەکات.**
**٢٤. ئەستەری لە ڕووی گرانترە.**
**٢٥. ئەقڵ لەدایكو باوك چاکترە.**
**٢٦. ئەقڵی سووكو باری گران.**
**٢٧. ئەگەر ئەزانم زەحمەتە گیانم، ئەگەر نازانم ڕەحمەتە گیانم.**
**٢٨. ئەگەر ئەمزانی چ ئان ئەمردم، دەرمان دەردی خۆم زوو ئەکردم.**
**٢٩. ئەگەر ببی بە پۆڵا، دنیا بدەی بە کۆڵا، هەر دەڕزێی لەبن خۆڵا.**
**٣٠. ئەگەر بەد نەبینی، بەدخانە لەیاد ناکەی.**
**٣١. ئەگەر بەلای ئێوەوە ڕوو ڕەشم، خۆ بەلای خواوە ڕوو گەشم.**
**٣٢. ئەگەر پیاو نەبیت بەبزن ئەڵێ بەڕیشی مەردانەت قەسەم.**
**٣٣. ئەگەر (تا)ت بۆم بێ، ئەلەرزم بۆت، ئەگەر بلەرزی بۆم ئەمرم بۆت.**
**٣٤. ئەگەر تۆ دەوڕی من دوڕناسم، ئەگەر تۆ تیغی من ئەڵماسم.**
**٣٥. ئەگەر تۆ یەك مەنی، من دوو مەنم، جگە لەکێش و تەنەنم.**
**٣٦. ئەگەر حەز ئەکەی لەگۆزەی پڕم، خۆت بۆخۆم، کچەکەت بۆ کوڕم.**
**٣٧. ئەگەر حەمرین لەپشتم بێ، ئەگژ ئاسمانا ئەچم.**
**٣٨. ئەگەر خوا بیدا، لەخەتێ ئەیدا.**
**٣٩. ئەگەر خەوت بێ، ناپرسی تۆ کوڕی کێی؟**
**٤٠. ئەگەر خەوت بێ، سەرینت ناوێ، ئەگەر برسیت بێ، پێخۆرت ناوێ.**
**٤١. ئەگەر خەو دەبوو بومایە، کەروێشك دەبوو بەگایە.**
**٤٢. ئەگەر دەنگ بکەم بەد ناوم، ئەگەر دەنگ نەکەم تەنگاوم.**
**٤٣. ئەگەر ژنە، عومری منە، وەرە سەر ملی منە.**
**٤٤. ئەگەر دوژمن خۆیشی بکات بە ئامۆزات، هەر دوژمنە.**
**٤٥. ئەگەر شەرمنی بێژنگێ بگرە بە ڕووتەوە.**
**٤٦. ئەگەر کڕیار هات دوکان واڵاکە.**
**٤٧. ئەگەر کەڵ کوژی والە هەردە، ئەکەر ژن خوازی دەس لەماڵ بەردە.**
**٤٨. ئەگەر لاو بی و ڕووت بی، لەناو گەلا نابووتی.**
**٤٩. ئەگەر نابی بەهەنگوین بەگوژاڵکیش مەبە.**
**٥٠. ئەگەر نازانی بکرە جوانی.**
**٥١. ئەلحەمدو لیللا ئاواتەکەم هاتە دی، کەرەشینم بە بارەوە دی.**
**٥٢. ئەڵێ ڕاوچییەو تانجییەکەی مردووە.**
**٥٣. ئەڵێ سەگی دەرزی خواردووە.**
**٥٤. ئەڵێ عەلەشیشە هەر شتێکی سوور ببینێ ئەکەوێتە دوای.**
**٥٥. ئەڵێ مارە بەدەم مارخۆرەوە زیرەی دێ.**
**٥٦. ئەمانە خۆشن: شیری مەڕی گێژ، دروونەی لالێژ، گانی ژنی درێژ.**
**٥٧. ئەو ئەسپەی بە سەرسم فێربێ، پێی ئەڵێن یاخوا ناڵبەنەکەی کوێر بێ.**
**٥٨. ئەو خوانەی دوعای ئەدەی، بەردی تێ مەخە.**
**٥٩. ئەو قسانەی تۆ ئەیکەی، لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نییە.**
**٦٠. ئەو کەسەی ماڵی لە شووشە بێ، نابێ بەرد بگرێتە ماڵی خەڵکی.**
**٦١. ئەوەندە لەم کەلەوە هاتی و، لەو کەلەوە ئاوا بووی، زانیم ڕۆژێ دەست ئەنێنە ناقرگەت.**
**٦٢. ئەوەندە وشك مەبە بشکێی.**
**٦٣. ئەوەندە بە ئێوە ناشێ، بیدەنە فاتە ڕەشێ.**
**٦٤. ئەوەندە بەرز بفرێ، نزم ئەنیشێتەوە.**
**٦٥. ئەوەی پشتی ناهەق ئەگرێ نۆکەری زاڵمە.**
**٦٦. ئەوەی خاوەن ماڵ ئەیزانێ، دز پێی بزانێ بە ڕۆژی نیوەڕۆ تاڵانی ئەکا.**
**٦٧. ئەوەی خەڵك ڕاونێ ناحەسێتەوە.**
**٦٨. ئەوەی درك بڵاو بکاتەوە، وەبێ خۆی بەسەریا بڕوا.**
**٦٩. ئەوەی سێنگ بخوا..ئەبێ سینگ بکوتێ.**
**٧٠. ئەوەی لە دز مایەوە، بەر فاڵچی کەوت.**
**٧١. ئەوەی مردنی دیبێ.. بەگرانەتا ڕازییە.**

٧٢. ئەوەی نەبینێ ماڵم، نازانێ لە حاڵم.
٧٣. ئەوەی نەگری پێ ناکەنێت.
٧٤. ئەوەی هیچی نەبێ لە هیچ ناترسێ.
٧٥. ئیتر بەسمانە، کورەکە کەچەڵ بەسمانە.
٧٦. ئیشکەرم بمرێ، تەگبیرکەرم نەمرێ.
٧٧. ئیشی دایك و باوکداری ئەوێ.
٧٨. ئیقباڵ یار بێ..با دوژمن هەزار بێ.

(ب)

٧٩. با بێ، یا باران، هەر لەبەفر کەم دەبێتەوە.
٨٠. بارانی بەهار هیچ بە من ناکا، تاوێ ئەبارێ، تاوێ خۆش ئەکا.
٨١. باز نەماوە، بۆیە کوندەبوو بووەتە شای مەلان.
٨٢. باوکمان برایە، بەڵام من لەتۆ بەگزادەترم.
٨٣. باوکم کوژرا چ بە شیر چ بە تیر.
٨٤. بروا بە تۆرانی ژنی منداڵدار مەکە.
٨٥. بڕۆرە شارێ کەس نەتناسێ، خۆت هەڵبکێشە پڕ بە کراسێ.
٨٦. بزنێ ئەقارێنێ کە دۆی بخورێ.
٨٧. بمکەرە سەر بەگوێزێ با ناوەکەشی پووك نەبێ.
٨٨. بۆ بۆرە پیاو خۆت بەکوشت بدەی، دەڵێ بە ئەمری خوا مرد.
٨٩. بوو بە ڕیشەوە مەوشەوە.
٩٠. بوخرەو مەورە.
٩١. بۆ دەستماڵێك قەیسەرییەك ئاگر ئەدا.
٩٢. بۆ قژبەسەر براوە؟
٩٣. بۆ کەس شین نابێ داری بریایە
مردن زۆر هەقە پیری نەبوایە.
٩٤. بۆ مەلا مزگەوت زۆرە.
٩٥. بوو، بوو نەبوو کەرەپوو.
٩٦. بوونەتە قیر کەوای سپی.
٩٧. بۆی لێدەن دەهۆڵی دراوە.
٩٨. بۆیە سەیرە، چونکە بەزەبرە.
٩٩. بە ئاگری خەڵکی خۆت مەسووتێنە.
١٠٠. بە ئاوی حەمام پیاوەتی ناکرێ.
١٠١. بەبۆنی شیری مانگابازەوە لە دۆی ماڵانیش بووین.
١٠٢. بەبێ پەردە قسەی کرد.
١٠٣. بە بەردێك دوو چۆلەکە ئەکوژێت.
١٠٤. بە پنەو تیرۆکی خۆمانەوە هاتووین.
١٠٥. بە خەڵکی سەگ ئەوەرێ بە ئێمە چەقەڵ.
١٠٦. بەراز هێلکە ناکات، کە کردی ئەڵێ چی؟!
١٠٧. بەرد فڕێمەدە بەرەو تاریکی.
١٠٨. بەردی زل لەنزیکەوە دێ.
١٠٩. بەرگ وتویەتی: ئەگەر نەتکەم بە دوان، ئەتکەم بە یەکێ لە ژوور هەموان.
١١٠. بەرو پشتی بۆ نییە.
١١١. بەری ئاسمان بەچاتۆڵ نەگیراوە.
١١٢. بەری درەختی بەڕوو هەر بەڕووە.
١١٣. بەریش بوایە بزن ئەبووە قازی.
١١٤. بە زۆرە وتن ڕاستی بزر ئەبێ.
١١٥. بەفر خر ئەبێتەوە.. بە فوویەك ئەتوێتەوە.
١١٦. بە گورگیان وت: ئەوە دونگی مەرە، دەستی کرد بەگریان، وتیان ئەوە بۆ ئەگرییت؟ وتی: ئەترسم درۆبێت.
١١٧. بەگوڵێکی گەش بەهار نایەت.
١١٨. بەمشتێ ئاو، ئەکەوێتە مەلەکردن.
١١٩. بەمنی ڕێساو بەمنیشی بادا، کردیە جاجم بە خۆیدا دا.
١٢٠. بەنانێ نە، بەئاوێ سکمان بوو بە جەڕاوێ.
١٢١. بیخەرە سەر چاوی کوێر چاکی ئەکاتەوە.
١٢٢. بێخی ددانی خۆت بەهەموو کەسێ پیشان مەدە.
١٢٣. بێ دەنگی جوانترین خشڵە بۆ ژن.
١٢٤. بیر وەکو لەش پێویستی بە خواردن هەیە.
١٢٥. بێگانە خوتەخوتکەرە، ئامۆزا فەرزە دەست لەمل کەرە.
١٢٦. بێڵ و گاوەسنی پێ نەشکاوە.
١٢٧. بێناوی لە بەدناوی چاکترە.
١٢٨. بێوەژن خواخوای بوو شووبکا، کەشووی کرد داوای هەشت و یەکی ئەکرد.

(پ)

١٢٩. پاروو هەتا نەیجووی، قووت نادرێ.
١٣٠. پارەدار کەباب ئەخواو بێ پارەیش هەڵمەکەی.
١٣١. پاش باران کەپەنەك بێ سوودە.
١٣٢. پاشگەز بوونەوە لە هەڵە چاکەیە.
١٣٣. پرست پێ ئەکەم، بەقسەت ناکەم.
١٣٤. پرماڵیان لە ڕازیانە بوو، بە دڵنێشە مرد.
١٣٥. پشت سەریشم چاوە.
١٣٦. پشیلە لەدوای کەیوانۆی پیسکن ئەگەڕێ.
١٣٧. پشیلەی مۆن دونگی زل ئەبا.
١٣٨. پووریێ سەمەنە.. بۆم بێنە جامێ خەنە.
١٣٩. پووش لە چاوی خەڵکی ئەبینێ کەچی شووژن لەچاوی خۆیا نابینێ.
١٤٠. پۆی دەوار، بە بەردەزبر سپی نابێتەوە.
١٤١. پەتی درۆ کورتە.
١٤٢. پەرێزی پاك نییە.
١٤٣. پەسدار پەسی دەمرێ، کەسدار کەسی دەمرێ.
١٤٤. پەنجەکانی دەست هەموویان وەکو یەك نین.
١٤٥. پیاوی ئازا جارێك ئەمرێ، ترسنۆك هەزار جار.
١٤٦. پیاو ئەو پیاوەیە پیاوەتی لەبیر نەچێ.
١٤٧. پیاو ئەو پیاوەیە شیرین بخواو تاڵیش بخوا.
١٤٨. پیاو ئەو پیاوەیە بەرگەی سەرماو گەرما بگرێ.
١٤٩. پیاو بە ئیش، نەك بە ڕیش.
١٥٠. پیاو بە سمێڵەوە جوانە، ژن بە پرچەوە.
١٥١. پیاو چاوی دەرچێ.. ناوی دەرنەچێ.
١٥٢. پیاو لغاو بۆ ئەسپ دا ئەهێنێ و ژنیش بۆ پیاو.
١٥٣. پیاو ناچار بوو سەر بەماڵی دوژمنا ئەکا.
١٥٤. پیاوی بەد ڕەوشت ژن سووك ئەکا.

١٥٥. پیاوی بێ ئەقڵ، بە دۆستی کەس نابێ.
١٥٦. پیاوی جوامێر چ لە گەرمیان چ لە کوێستان.
١٥٧. پیاوی خوێری بە خاڵۆی خۆی ئەوێرێ.
١٥٨. پیاوی خوێری دەست ئەداتە بەردی زل.
١٥٩. پیاوی دووژن، رەفیقی ئاوارەیە.
١٦٠. پیاوی زۆر وێژ، خراپیش ئەڵێ و چاکیش ئەڵێ.
١٦١. پیاوی قەرزدار، لەبازار تیژ ئەروا.
١٦٢. پیاوێك لە ژنەکەی ترسا، داخوازی کچەکەی لەدایکی ئەکرێ.
١٦٣. پیاوی گەورە، بۆ کەفالەت، پیاوی بێ کار، بۆ شەهادەت.
١٦٤. پیاوی مەرد، دوو جار دەست بەکونێکا ناکا.
١٦٥. پیاوی نەگبەت، سەگیشی ناوەرێ.
١٦٦. پیاوی هەژار لە ئاردەوادا ددانی ئەشکێ.
١٦٧. پێڵاوەکانم درا، هیچم پێ نەبرا.
١٦٨. پێم هیلاك بێ نەك دەمم.
١٦٩. پێی پەتی خۆشترە، لە پێڵاوی تەنگ.
١٧٠. ماڵی چۆڵ خۆشترە، لەماڵی پڕ دەنگ.
١٧١. پێیانبکێشەو بڵێ: نەمزانی.
١٧٢. پێی کەڵەشێرەکەت ببەستەوەو بارۆکەی ماڵە دراوسێ بە حیز مەزانە.

(ت)

١٧٣. تا بەرز بی کەوتنت بەئازارترە.
١٧٤. تا چل هاوە مل، گەیشتە پەنجا رەنجا، گەیشتە شەست شکەست، گەیشتە هەفتا کەفتا، گەیشتە هەشتا رۆحی لەمشتا.
١٧٥. تاریکە شەو قەڵای مێردە.
١٧٦. تا زۆر بمێنی زۆر ئەبیستی.
١٧٧. تاعوون هات بەگرانەتا شوکر.
١٧٨. تاڵح بیکا، بەخت نەبرێ، بەرە لەلای تەنکییەوە ئەدرێ.
١٧٩. تانەی بەنە لەعەزاب قەبر ناخۆشترە.
١٨٠. ترسنۆك لە سێبەری خۆی ئەترسێ.
١٨١. تفوو لەپیاوی بەدخوو، ئەوەی کچی هەیەو نایدا بەشوو.
١٨٢. تفەنگ بۆ نیشان، ئەسپیش بۆ مەیدان.
١٨٣. تفی بەرەو با ریشی خۆت ئەگرێتەوە.
١٨٤. تنۆکە تنۆکەی باران، یەك بگرێ ئەبێ بە تۆفان.
١٨٥. تۆبەی گورگ هەر ئەوەندەیە هەتا مەر ئەبینێ.
١٨٦. توورەکەی بەتاڵ، نۆمای هەج ناگێرێتەوە.
١٨٧. تۆ مەشکەی ماڵی میر بژەنە، من هی تۆ ئەژەنم، کۆنە کراسەکەیشمان بە نیوەیی.
١٨٨. تەکبیرکەرەمان شوان بێ، باوەڕی بەکلکی بزنان بێ، ئەبێ حاڵمان چۆنان بێ.
١٨٩. تەکیە خواردنی هەیە، بەخشینی نییە.
١٩٠. تەماشام بکە ئەوەندەی تەپڵۆسکێ، تا تەماشات بکەم ئەوەندەی کێوێ.
١٩١. تەمەنی پیاوی خائین کورتە.
١٩٢. تیشکی خۆر بە بێژەنگ ناگیرێ.

(ج)

١٩٣. جنێو، چەکی پیاوی بێدەستەڵاتە.
١٩٤. جوانی هەتا بتوانی.
١٩٥. جوتیار ئەڵێ: تا هەنار گوڵ نەکا گەنمی پار نافرۆشم.
١٩٦. جۆگەیێ ئاو پییا بروات بۆگەن نابێ.
١٩٧. جۆلا لەسەر مەکۆ هەر باراز لێبدا.
١٩٨. جێی خەنجەر چاك ئەبێ، جێی قسە چاك نابێ.

(چ)

١٩٩. چارەی قەرز دانەوەیە.
٢٠٠. چاکە بکەو بیدە بەدەم ئاوەوە، کەس پێ نەزانێ لای خوا نووسراوە.
٢٠١. چ چاکەکەیان سوژنە، ئەویش کونێکی لەبنە.
٢٠٢. چاوت دەرچێ ناوت دەرنەچێ.
٢٠٣. چاو لەدەرە، قور بەسەرە.
٢٠٤. چاوەش چۆن دەهۆڵ لێبدات، دەبێ وەهاش شایی بکەی.
٢٠٥. چرا تا نەسووتێ شەوقی نابێ.
٢٠٦. چرایە بۆ ماڵ پێوست بێ، بۆ مزگەوت ناشێ.
٢٠٧. چ مێوژێ، چ کەویژێ.
٢٠٨. چەکی دەست براتە، پارەی باخەڵت ماڵتە.
٢٠٩. چەندێ ئەتوانی چاکە بچێنە، پیاوی بەدڕەوشت هەرگیز مەدوێنە.
٢١٠. چۆلەکە نابێتە کەفیلی رەشۆڵە.
٢١١. چوونە ناو شایی عەیبێك، دەرچوونی دووعەیب.

(ح)

٢١٢. حوشترو کورتانیان نەوتووە.
٢١٣. حوشترێك ئەکا بەقوربان جگەرێك.
٢١٤. حەز ئەکا ماڵەکەی بکا بە هێلکەیەك و پێشکەش بە میوانی بکا.
٢١٥. حەسەن کولێنانێ، مۆرت دانێ، جووتت کوانێ.
٢١٦. حیساب بۆ ساڵی سەخت، شایەت بۆ پیاوی چەوت.

(خ)

٢١٧. خاڵۆو خوارزایی مەکە.
٢١٨. خزمەت بەگوێرەی قودرەت.
٢١٩. خوا شاخ بە بەرانی بێ شاخ نەدا.
٢٢٠. خوا بیبا مەرگم..زاوا نەکا بەرگم.
٢٢١. خوابیدا ماڵی خۆم، حەزکەم ئەخۆم، حەزکەم ناخۆم.
٢٢٢. خوا دارخورمای بەرز کردووەتەوە تا دەمی حوشتر نەیگاتێ.
٢٢٣. خوا دەلیلی داماوە.
٢٢٤. خوا راستەو راستی ئەوێ.
٢٢٥. خوار دانیشەو راست بڵێ، یا: چەوت دانیشەو راست بڵێ.

٢٢٦. خواردن ماڵە، مەنە میراتە، پاشماوەکەی خێرو خێراتە.
٢٢٧. خواردنی شەو بێ هۆشییە، ئەنجامەکەی نەخۆشییە.
٢٢٨. خواسەر بدات، رزقیش ئەدات.
٢٢٩. خوا کردی بەشەو..ئێمەش بچین بۆ خەو.
٢٣٠. خواو بەنە، وەبەرتیل بەنە.
٢٣١. خوا هەقی بزنی بێ شاخ، لەبزنی شاخدار ئەکاتەوە.
٢٣٢. خوایە ئەمە نانە داوتە بەبەنە، وە زۆر قولیو وە زۆر چەنە.
٢٣٣. خوایەكو دەرگا هەزار.
٢٣٤. خوایەكو شوویەك.
٢٣٥. خۆت هیچ، خوا ئەقڵ بە کورت بدا.
٢٣٦. خودای بانی سەر، لەسەر داخوری، نازەو ناخوینی لەیەك دابری.
٢٣٧. خۆشەویستی مەشخەڵە، دەروونی مەردم پاك ئەکاتەوە.
٢٣٨. خۆشی هەموو ماڵێکی پۆشی.
٢٣٩. خوو لەژێر گیانە..هەتا گیان دەرنەچێ خوو دەرناچێ.
٢٤٠. خۆ لە سێبەری ئەشکەوتا نیمان.
٢٤١. خۆمو کورەکەم سەییدین، بەقنگ باوکی ئەو دوایی هۆزی (حەمك)ەوە.
٢٤٢. خۆی زۆرجوان بوو ئاوڵەشی دەرکرد.
٢٤٣. خوێن بەئاو ئەشۆردرێ نەك بەخوێن.
٢٤٤. خوێنی خۆی کردووەتە کاسەو ئەیەوێ لەبەر دەرگای کەسێکدا بیرێژێ.
٢٤٥. خەسووی چاك جووتە گایە، خەسووی خراپ لنگەکایە.
٢٤٦. خەڵات هەرچی دەرهات.
٢٤٧. خەنجەرە لەپەنجەرە دەرنەچێ باشە.
٢٤٨. خەنە شەوێ، وەسمە تەوێ.
٢٤٩. خێرەبەرەی شەرهاورەی.
٢٥٠. خێل لەبارە..عەلکە لەسەر دیوارە.
٢٥١. خێل لەشاری کوێرانا باشە.

(د)

٢٥٢. داخ بۆ ئەو کچەی خۆی نەدۆرێنێ، ئافەرین لەوەی خۆی نەخەلەتێنێ.
٢٥٣. دار لەجێی کەلەوە ئەبرێتەوە.
٢٥٤. داری بەردار برینی نارەوایە.
٢٥٥. داری بەردار پەلی تێئەگرن.
٢٥٦. داری بەروو، بەیەکەم تەور ناکەوێتە زەوی.
٢٥٧. داری بێ گەڵا سێبەری نییە، خوشکی بێ برا قەدری نییە.
٢٥٨. داری خۆزگە، بەرناگرێ.
٢٥٩. دانی خوا لە بارانی ئادار باشترە، غەزەبی لەتیغ ئەلماس تیژترە.
٢٦٠. داوای چەقۆی تیژم لێ ئەکا.
٢٦١. داوای شتێ بکە لەئامۆژنت بۆ گلەیی بانەرۆژ.
٢٦٢. ددان ئێشە چاری کێشە.
٢٦٣. دراوسێت مزگەوت بێ.. کوێر لەبەر دەرگات دادەنیشێ.
٢٦٤. درۆزن تەنیا روو رەشی بۆ دەمێنێتەوە.
٢٦٥. درۆیە بکە لەپاشە رۆژدا بۆت پینە بکرێت.
٢٦٦. درەخت بە بەرەکەیەوە ئەناسرێ.
٢٦٧. درهەمی ئەمرۆ لە دیناری سبەینێ باشترە.
٢٦٨. دز بازاری شێواوی پێ خۆشە.
٢٦٩. دز مەیلی لە دزی بێ، تاریکە شەو زۆرە.
٢٧٠. دز لەفیکەی خۆی تێئەگا.
٢٧١. دگانی شاشە..بەختی باشە.
٢٧٢. دڵداری کەس ناشرین نییە.
٢٧٣. دڵ لە گوڵ ناسکترە.
٢٧٤. دڵمان خۆشە نۆکەر بەگین، وەسك برسی وەحاڵ سەگین.
٢٧٥. دڵێ بۆ دۆستێ نەکزێتەوە، زامێ دەربکا هەر بکولێتەوە.
٢٧٦. دنیا ئەوەی پێ ناوێ، هەژار بخەیتە داوێ.
٢٧٧. دنیا داری گارەش، کەر ئەیخوا.
٢٧٨. دنیا لەهەی هەی، کۆسە لە ئیش خۆی.
٢٧٩. دنیای لێ بووەتە کونە دەرزییەك.
٢٨٠. دووپشکە بکەرە کونەوە، دووپشکە دەرئەکا.
٢٨١. دوو دڵی مایەی سەرگەردانییە.
٢٨٢. دوور برۆ، دروست وەرە.
٢٨٣. دوژمن بە مردوویش لای نەبی چاکە.
٢٨٤. دوژمنت ئاقڵ بێت هەر باشە.
٢٨٥. دوژمنت کە شکا زۆر کەس ئازایە.
٢٨٦. دوژمنی زانا قستەسەری گیانت بێ، هەزار دۆستی نەزان بەقوربانی بێ.
٢٨٧. دوژمنی ناوخۆ رەگ دەرئەهێنێ.
٢٨٨. دوو ژن لەحەوشێ، وەك مانگو خۆر ئەدرەوشێ.
٢٨٩. دوو ژن، یەکیان لەوی پرسی: ئەرێ پیاوەکەت کاری چییە؟ ئەویش وتی: لە فرنە. ئەوەی دی وتی: دەس کاری شەوی ترنە، ئەوجا ئەم لێی پرسی: ئەی ئەوەی تۆ کاری چییە؟ دەڵێ: حەماڵە. ئەویش دەڵێ: بەس نییە شەو لەماڵە.
٢٩٠. دۆستت هەزار بێ کەمە..دوژمنت یەك بێ هەر خەمە.
٢٩١. دوو سەرە بەران لەناو مەنجەڵێکدا ناکولێ.
٢٩٢. دۆمو شەرمیان نەوتووە.
٢٩٣. دەرگای بەخوویی گێژەنەی شلە، هەرکە پاڵت پێوەنا زوو دەکەوێتە سەرپشت.
٢٩٤. دەروێشی بەدڵخۆشی.
٢٩٥. دەرەوەی رۆشن ژوورەوەی تاریك.
٢٩٦. دەریا، بەدڵۆپێك کەم ناکات.
٢٩٧. دەریا، لەتنۆکەی باران پەیا ئەبێ.
٢٩٨. دەست لەدەست قووەت لەخوا.
٢٩٩. دەستێ بۆنی کرد بۆ برین باشە.
٣٠٠. دەستی خەڵك ماری پێبگرە.
٣٠١. دەستی شکاو چەلی ملە.
٣٠٢. دەستێ کرد بە زاخا.
٣٠٣. دەستێ کە شکا خراپ دەگیرسێتەوە.
٣٠٤. دەس دەس ئەشوا، پەنجە پەنجە ئەشوا.

٣٠٥. دس لە نێدانی زێرە.
٣٠٦. دەسنەڕۆیی، لەبرامردوو خراپترە.
٣٠٧. دەس وە کەلەپچە پاوەن وەپاوە، دوژمن وەبێ خەوف ئەدا وەلاوە.
٣٠٨. دەلیل هاوەردم ڕازان بکۆ ڕازا، دەلیل هاتەچێ فیتنەو حیلەباز.
٣٠٩. دەمت بەحورمەت، سەرت سەلامەت.
٣١٠. دەمێکە قەبرم بۆ خۆم هەڵکەندووە.
٣١١. دەنگ ئەکەم دەنگم ئەچێ، دەنگ ناکەم ڕەنگم ئەچێ.
٣١٢. دەنگ نەبێ هاکەم، پانەبێ ڕاکەم، قوڕ کوێ بەسەراکەم.
٣١٣. دەنگی لە ئاوەدانییەوە دێ.
٣١٤. دەوار لەلای تەنکییەوە ئەدڕێ.
٣١٥. دەوران دەوڵەت لەدەس ئەسێنێ، بەڵام ناوی چاکە هەر ئەمێنێ.
٣١٦. دەوڵەمەند لەهەموو شوێنێ یارە، بێ ماڵ لەهەموو شوێنێ هەژارە.
٣١٧. دەوڵەمەن نۆشی گیانت بێ، هەژار چاکت کرد.
٣١٨. دەوڵەمەندیی و هەژاری بەدەستی خوایە.
٣١٩. دەهۆڵژەن بێ و شایی کوڕی خۆی بێ.
٣٢٠. دەهۆڵکوت دە دانەو شاییەکە دووانە.
٣٢١. دەهۆڵم مەکوتە.. دەهۆڵت ئەکوتم.
٣٢٢. دێ ئەو دێ، دوکەڵی دەربێ.
٣٢٣. دیتنی چاوان، کارێزی دڵان.
٣٢٤. دیدار دۆست چ ساڵێ چ سەعاتێ.
٣٢٥. دیوار ڕما تۆزی هەڵسا.

(ر)
٣٢٦. ڕازی نەوی وەگۆڕی گۆڕخانە، تاخۆی ناوە تەڕی تەرخانە.
٣٢٧. ڕاستی زۆر خۆشە گەر ڕاستت ئەوێ، گەر دیوار رووخا بانیشی ئەکەوێ.
٣٢٨. ڕاوچێتی نائومێدییە.
٣٢٩. ڕاوی شێریان ئەکرد، ڕێوی خۆی ئەشاردەوە.
٣٣٠. ڕبە کە پڕبوو، شەرم لەکەس ناکا.
٣٣١. ڕزق یەکەو نابێ بە دوو.
٣٣٢. ڕۆح لەجێی سەختەو دەرناچێ.
٣٣٣. ڕۆژ کەهەڵات ئاوا ئەبێ.
٣٣٤. ڕۆژ کەهەڵات کونەبوو کوێر ئەبێ.
٣٣٥. ڕۆژێکم مابێ لەکارا.. کلکت ئەکەم بەدارا.
٣٣٦. ڕۆژێ هەزار دەمرێ و هەزارو یەک دێتە دنیاوە.
٣٣٧. ڕوو لەئاسن نییە، لەگۆشتە.
٣٣٨. ڕووی ڕەش و سپی هەر دەرئەکەوێ.
٣٣٩. ڕووی گەشە، دڵی ڕەشە.
٣٤٠. ڕۆیی وەگورە گوڕ، چەقی لەقوڕ.
٣٤١. ڕەحمەت لە شێرت.
٣٤٢. ڕەشە مانگ، ژن بەتەڵاق ئەدا، ئادار مارەی ئەکاتەوە.
٣٤٣. ڕەفیقی ناحاڵ دۆست بێ مەینەت، ڕفیقی مەکە ئەوێ وەمینەت.
٣٤٤. ڕەمەزان ئەخواو شەشەڵان ئەگرێ.
٣٤٥. ڕەنجی بوو بەرەنجی کابرای پیاز فرۆش.
٣٤٦. ڕەنگ ناگۆڕێ.
٣٤٧. ڕیشت دانا، ئەبێ شانەی بۆ هەڵگری.
٣٤٨. ڕیشت مەدە بەدەست منال و تواڵەوە.
٣٤٩. ڕێگای دوور چاری ڕۆیشتنە.
٣٥٠. ڕێوی بخەوێ، خەو بەکولانەی مریشکەوە ئەبینێ.
٣٥١. ڕێوی لەلای شێرەوە خەوت، کە هەڵسا هەر ڕێوی بوو.
٣٥٢. ڕێوی بێدار لەشێری خەوتوو باشترە.
٣٥٣. ڕێوییەو لەپشتی شێردایە.

(ز)
٣٥٤. زانا قسە زۆر ئەکرێ و کەم ئەفرۆشێ.
٣٥٥. زاوا بۆ ڕۆژێ داوا.
٣٥٦. زستانان پینەو پەڕۆ، هاوینان قنج قنج برۆ.
٣٥٧. زستان بەسەرماوە جوانە، هاوینیش بەگەرماوە.
٣٥٨. زستان هات کەرەستەی فەقیر پێچرایەوە.
٣٥٩. زستان هەر ئەڕوا رووی خەلوز ڕەش ئەبێ.
٣٦٠. زوانت بگرە، سەرت سەلامەت.
٣٦١. زۆردار بۆ دۆزینەوەی بیانوو پەکی ناکەوێ.
٣٦٢. زۆردار کەروێشك بە عەرەبانە ئەگرێ.
٣٦٣. زوڵم و زۆر هەتا سەر نییە.
٣٦٤. زەبوون ئازاردان مایەی نامەرییە.
٣٦٥. زەرەرو زیانی بۆ کەس نییە.
٣٦٦. زێر قابیل زێرینگەرە.
٣٦٧. زێر هەر زێرە هەرچەندە بچووکە.
٣٦٨. زێری چاك ژەنگ هەڵناهێنێ.

(ژ)
٣٦٩. ژن بخوازە لەماڵان، تا کورت بچێتە سەرخاڵان.
٣٧٠. ژن بدە بە گەورە کوڕ یان ژن مردوو.
٣٧١. ژن بهێنم یان نەهێنم هەر پەشیمانم.
٣٧٢. ژن داوێنی خۆی دوژمنیەتی.
٣٧٣. ژن ڕەوشت شیرین بێ، با ناشرین بێ.
٣٧٤. ژن ژنی بەسەرهات شەرتی هەڵە.
٣٧٥. ژن هەیە شارێك دێنێ، ژنیش هەیە شانەیەك دێنێ.
٣٧٦. ژن هەیە جنۆکەش هەیە.
٣٧٧. ژنی باش هەسانی پیاوە.
٣٧٨. ژنی جوان ئەوەیە کەلەگەڵ مێردەکەیدا کۆك بێت.
٣٧٩. ژنی خراپ پیاو لە پیاوەتی ئەخا.
٣٨٠. ژنی داوێن پیس، رووی ڕەشکە بە هیس.
٣٨١. ژنێك ئەکەم بۆ باوکم، دارێك ئەکەم بۆ دایکم.
٣٨٢. ژنێکم ئەوێ ژنانە، پێستەی بزن بکا بە هەمانە.
٣٨٣. ژوژوو فەقیرە، مار ئەخاوت.
٣٨٤. ژیانی بێ ئەرك و ئازار سوودی نییە.
٣٨٥. ژیانی کردم بە بەهەشتی سۆز، تەمەنی کردم بەمناڵی پیرۆز.

(س)

٣٨٦. ساڵ وەی وەیە.. هەرکە بۆ خۆیە.
٣٨٧. سامان تاسەر هاوڕێ نییە.
٣٨٨. سامی گۆڕکەن لە سامی مردوو گرانترە.
٣٨٩. ساوەر لەئاوکە.. ماین لغاوکە.
٣٩٠. سربێ لە داوان حور بێ.
٣٩١. سرکە تا ترش بێ زیان بەخۆی ئەگەیەنێ.
٣٩٢. سك تاوان ئەکاو سەر تاوانبارە.
٣٩٣. سکم ئێشێ و پشتم تیمار ئەکەن.
٣٩٤. سمۆرە لەراست عەیبی خۆی کوێرە.
٣٩٥. سنعاتەو سەبەتە، خۆمسگەر نییە قنگ بادان بێ.
٣٩٦. سۆتکە رەشە.. بۆنی خۆشە.
٣٩٧. سوێند بخۆ بەخاك نەك بەناپاك.
٣٩٨. سەدکە درازە، گۆر وە ئەنازە.
٣٩٩. سەربارەکەی ماوە بیهارێ.
٤٠٠. سەربانی خۆمان دلۆپە ئەکات، سەربانی خەلکی ئەگێرێ.
٤٠١. سەر بێ سەرئێشە نابێ.
٤٠٢. سەری بێ خەتا، ناچێتە پەتەوە.
٤٠٣. سەری ساغەو پەرۆی پێوە ئەپێچێ.
٤٠٤. سەعاتێ بێل، سەد دینارە.
٤٠٥. سەفەرو مامەلە، سەنگی مەحەکە.
٤٠٦. سەگ بابشوەرێ.. کاروان ناوەستێ.
٤٠٧. سەگ لە قەسابخانە گۆشت برفێنی، قاچی خۆی ئەدۆرێنێ.
٤٠٨. سەگ وەری شەوە دزە، بەگ بەریشەوە کزە.
٤٠٩. سەگی خۆمانەو باسی بێگانە ئەکا.
٤١٠. سەگی سەرملە بە دوولا ئەوەرێ.
٤١١. سەگی هەلەوەر، کەم ئەگەزێ.
٤١٢. سەما ها بەلای چاو خومارەوە.
٤١٣. سەییدی سەرسەوز کۆنە رافزی، عاسا هەلگرێ ئەچێ بۆ دزی.
٤١٤. سیر خۆیەتی و ئەیدا لە سمێلی خۆی.

(ش)

٤١٥. شایەر بێ و شایی خۆی بێ.
٤١٦. شای مەلان نەماوە، بۆیە شەمشەمە کوێرە بووەتە شا.
٤١٧. شایی بۆ دووانە گر لە هەمووانە.
٤١٨. شایی شادییە، مردن دۆزەخە، لە هیچ کامێکیان خۆت زۆر دەرمەخە.
٤١٩. شتێ لەخوا نەشاردرێتەوە، بۆ لەبەنەی بشارمەوە.
٤٢٠. شمشێر زۆر ئەکوژێ، شەراب زیاتر.
٤٢١. شوان بێ یا گاوان.. یەکێکە لە باوان.
٤٢٢. شوانێکم ئەوێ بە بەلاش، نەکە پەنەکی بوێ نەکەلاش.
٤٢٣. شووشە لەبەردەوە بەرد ئەیشکێنێ.
٤٢٤. شوول، بەشوولی دەچەمێتەوە.
٤٢٥. شەرو نیوە شەر هەر یەکە.
٤٢٦. شەڕەو یەقەت ئەگرێ، ئەگەر نەیکەی خوا ئەتگرێ.
٤٢٧. شەلبە لەگەل گەلیە.
٤٢٨. شەممە بکە کار، شەممە بکە بار، شەممە بووکی لێمەکە سوار.
٤٢٩. شەوی تاریك، رۆژی رووناکی لە دوایە.
٤٣٠. شێر کەلە پێشەوە نەما، گورگ و رێوی ئەکەن سەما.
٤٣١. شێرو بەچکە شێر پاوەن لە پایە، دوژمن وەبێ خەوف گشت دای وەلایە.
٤٣٢. شێر هەیەو بەوریش هەیە.
٤٣٣. شێری بێدەسەلات چەقەل ئەیخوا.
٤٣٤. شین لەگەل هاومال شاییە.
٤٣٥. شیوەن بۆ ئەو کەسەی کە فیرعەون پێی بلێ کافرە.

(ع)

٤٣٦. عەیبێ بپۆشە..جەننەت پێوستە.
٤٣٧. عیسا نەوێ، مووسا نەوێ، خوا خواداری خۆی هەرئەکا.

(غ)

٤٣٨. غەریبی شاران وەگۆش ژنەفتم، قسمەت کارێ کرد شەو تیایدا خەفتم.

(ف)

٤٣٩. فرمێسکی چاویش بەقەرزە.
٤٤٠. فەقیر، بەشی خوراوە.
٤٤١. فەقیری دەستەوەستان، چ لەگەرمیان بێ چ لە کوێستان.
٤٤٢. فیتنە هەوێنی نۆ قازان شیرە.
٤٤٣. فێرکەران فێریان مەکە، فێریان ئەکەی لە بیریان مەکە.
٤٤٤. فیکە بەبرای بێ لێو ئەکات.

(ق)

٤٤٥. قاپی ئاسن، ئیشی بە قاپی دار ئەکەوێ.
٤٤٦. قال دوای گورگە.
٤٤٧. قرە قر یا لەمال ئەکەوێ یا لە گیان.
٤٤٨. قسەکردن وەکو بلقی سەر ئاوە.
٤٤٩. قسە لەدەم دەرچێ، بەر گوێ ئەکەوێ، ئەگەر لەدل دەرچێ، ئەچێتە دلەوە.
٤٥٠. قسە لەم سەر خۆشە نەك لەوسەر.
٤٥١. قسە نایاتە گۆرەوە.
٤٥٢. قسەی دوو زەردێنە ئەکا.
٤٥٣. قسەی سەرخوانچە بە تالە.
٤٥٤. قسەی وائەکا، بکرێتە بان نان و فرێ بدرێتە بەر سەگ، بۆنی پێوە ناکات.
٤٥٥. قنگلاشکە لەخۆی بەشکە.
٤٥٦. قنگم بووەتە ئاش.. سەرم بووەتە ماش.
٤٥٧. قوز ئەیاتە پیری کێرەوە.
٤٥٨. قوز بەرکانی قەدری نییە.
٤٥٩. قوز بە قەلماسنگ پاس ناکرێ.
٤٦٠. قوزە باوانت شێوێ.. لەناکاو بریشکەی دەوێ.

٤٦١. قەحپە لە کێری قەوی بترسایە گانی نەئەدا.
٤٦٢. قەدری بێ قەدران بگری حەساوە، قەدر قەدرداران بە خۆی گیراوە.
٤٦٣. قەرز ئەکا، زەکات ئەدا.
٤٦٤. قەرزدانەوە نیشانەی سەر راستییە.
٤٦٥. قەرز نەخۆش ئەکەوێ، بەڵام نامرێ.
٤٦٦. قەرەقاچ درۆزن، بەڵلوك عەییار، رەشەدار پشکیا، بەهار هەی بەهار.
٤٦٧. قەزای دێزە کەوت لە دیزە.
٤٦٨. قەل بەقەل ئەڵێ رووت رەش بێ.
٤٦٩. قەلەرەشی پیر بەهەلە ناقیرنێ.
٤٧٠. قەڵەم بەدەست ناحەزەوە بێ، چۆن بنووسێ ئەنووسێ.
٤٧١. قەولم دا بەتۆ وامزانی گولی، پەشیمان وەخۆم تومەز پەیکولی.
٤٧٢. قەولی و لەولییە.
٤٧٣. قیبلەی ژنان، ماڵی باوانە.

(ك)

٤٧٤. کات وەك شمشێر وایە، ئەگەر نەیبری ئەتبرێ.
٤٧٥. کار بەکردارە، نەك بەقسە.
٤٧٦. کاروانی مانگا پێشەنگی بێ، ئاو ئەیبا.
٤٧٧. کارێ مەکە تەرو وشك پێکەوە بسووتێ.
٤٧٨. کاسبی و ماندوێتی چیی پێمان هێشت.
٤٧٩. کاك بلەی ئێرەو کاك خلەی ئەوێ، هەر وەکو یەکن.
٤٨٠. کاکە فلووس و مامە عانە، هەزار خزم ئەکاتە بێگانە.
٤٨١. کاکەم مەنع من ئەکا..خۆی وشکەڕن ئەکا.
٤٨٢. کاڵا وەقەد باڵا.
٤٨٣. کاڵەگی گەییو نەیبری، بڵ ئەبێ.
٤٨٤. کانی لەبنەوانەوە ئاوی لێ نەبڕی، وشك ناکات.
٤٨٥. کچ، تەشیی دایکی ئەرێسێ.
٤٨٦. کچە قەرەج و خاتوونیان نەوتووە.
٤٨٧. کچی حەسەنی بوو بە مەدەنی.
٤٨٨. کچی شێخی ئەوێ و شیروانی تەنیا کاوڕێکە.
٤٨٩. کراس نەبێ لەبەرم.. هەوێ نەیەتە سەرم.
٤٩٠. کردو کۆشە، بۆ پیاوی تەمبەڵ چەند ناخۆشە، ئەوەندەش بۆ پیاوی ئازاو چست و چالاك، خۆشە.
٤٩١. کزکز نیشتووم لەسای دیواران، خوردێ بەسەرما جۆراوەی باران.
٤٩٢. کزەی تۆ، بزەی منی بریوە.
٤٩٣. کفن دز ئەڵێ کفن بۆ من، بامردوو گۆڕ بەگۆڕ براوا.
٤٩٤. کڵاو تۆ قازی.
٤٩٥. کلکی سەگ چەوتە، ڕاستەوە نابێت.
٤٩٦. کوتەك لەبن عەبایە.
٤٩٧. کۆتەڵکۆیە هەر ئەمرۆیە.
٤٩٨. کەوچك بەربەڵایە.
٤٩٩. کورت دەم چەوت بێ، زاوات دەم ڕاست بێ.
٥٠٠. کورد لە وەڵامدا دانامێنێت.
٥٠١. کوری پینە دۆز بێ پێڵاوو کوری خەیات بێ بەرگە.
٥٠٢. کوری خۆی سوونەت ئەکاو بەسەر خەڵکیدا منەت ئەکا.
٥٠٣. کوڕێکم ئەوێ گوێ لەمەیدان بەرێ.
٥٠٤. کوندە لەرێی سەراو ئەدرێ.
٥٠٥. کۆنە جووڵەکە، لەرۆژی شەمواندا خەمبار ئەبێ.
٥٠٦. کوێر بێ و ئەسپێی دەستکەوێ.
٥٠٧. کوێر دەستت راکێشێ، ئەتخاتە چاڵەوە.
٥٠٨. کوێر نابێ لەرەنگ بدوێ.
٥٠٩. کە تیرت وەشاند، قەڵغانت پێ بێ.
٥١٠. کە چوویتە ئاوایییەك سوێند بەسەری خەڵکەکەی بخۆ.
٥١١. کەچەڵ بەکەوتنیشەوە جوانە.
٥١٢. کە حێلەیان ناڵ ئەکرد، پیرە بارگیریش پای هەڵئەبرێ.
٥١٣. کەر ئەڵێ بارمەکەن لەمس نەك لەکوس.
٥١٤. کەر ئێش بگاتە گیانی ئەوەندەی بارگیرێ را ئەکا.
٥١٥. کەر بچێتە بەغدا نابێتە هێستر.
٥١٦. کەر بەکاروانێ تێر ناخوا.
٥١٧. کەر بەکورتانی تازە نابێتە شێر.
٥١٨. کەر بێ و گا بێ.. پێی عەلی لە حەوا بێ.
٥١٩. کەر پێنج هەڵگرێ، شەشیش هەڵئەگرێ.
٥٢٠. کەر چست و چالاك هەرچی بوابار، ژنێك وەناموس هەرچی بکا کار.
٥٢١. کردە پەشیمانییە، نەك نەکردە پەشیمان.
٥٢٢. کەر کەوتە قوراوەوە.. خاوەنی لەگشت کەسێ ئازاترە.
٥٢٣. کەر لە ماڵیا بکەوێ، دگانی ئەشکێ.
٥٢٤. کەر مەلە ناکات.
٥٢٥. کەر بۆ خۆی را ئەکاو تانجی بۆ خاوەنەکەی.
٥٢٦. کەروێشك کە بخەوێ، سەر بەرەوژوورەیەك ئەداتە بەرچاو.
٥٢٧. کەرەکە مەمرە بەهارە، قنگرو درك سوارە.
٥٢٨. کەرەمەکەی کەرەم خانە.
٥٢٩. کەری دێزە بۆ خاوەنەکەی بەڵایە.
٥٣٠. کەرێکم دایە کەرێ، سنان لەچاوی دەرێ.
٥٣١. کەری نەبوو، ئاخوری بۆ هەڵئەبەست.
٥٣٢. کەری لە گایەلا نییە، نۆبە گا ئەکا.
٥٣٣. کەس دۆی خۆی نەرژاندووە، تامن ماستی خۆم برژێنم.
٥٣٤. کەس ناوی نەئەهێنا، ئەچوو لەسەرە رێگە گووی ئەکرد.
٥٣٥. کەس نەبێ، رەجەب سەرپاڵایە.
٥٣٦. کەس لەئاغا باشتر خزمەتکاری خۆی ناناسێ.
٥٣٧. کەس و کار لەپیاو جیا نابێتەوە.
٥٣٨. کەسێك نەمرێ، دەوەنیش بەدار ئەبێ.
٥٣٩. کەڵەشێر بقوقێنێ یا نەقوقێنێ رۆژ ئەبێتەوە.
٥٤٠. کەللە هەیە گەوهەری تیایە، کەللەش هەیە کەمەری تیایە.
٥٤١. کەللەی زلە، زەینی کەلە.
٥٤٢. کەم بدوێی، کەم ئەژنەوی.
٥٤٣. کەمتیار گۆشتی بۆگەن ئەخوا.

٥٤٤. کەم زانی زۆر برێسە.
٥٤٥. کەوتووەتە دوای کڵاوی رابردوو.
٥٤٦. کەوتووەتە سەر ساجی عەلی.
٥٤٧. کەی کەردم خەتا، کەی کەردم گۆنا، کەی ئاورم بەرد کەی کابەم سوچنا.
٥٤٨. کێری خۆیو گەزەر لێك ناکاتەوە.

(گ)

٥٤٩. گا ئەیکاو کەر ئەیخوا.
٥٥٠. گام لە گایەلا نییەو پام بەفر بردوویەتی.
٥٥١. گان بە کەرە پیر پیشان ئەدا.
٥٥٢. گاوان بەگاوانی شەرمی نەدەهات، بەنان چنینەوەکەی شەرمی دەهات.
٥٥٣. گاوەسنمان زۆر لەم ئەرزە داوە.
٥٥٤. گرێی دڵی خۆت بۆ دیواریش مەکەرەوە، چونکە دەڵێن دیواریش کونی هەیە، کونیش مشکی هەیە.
٥٥٥. گودیلە خل بێتەوە، سەرقەباخی خۆی ئەدۆزێتەوە.
٥٥٦. گورگ بەخێوکەی، خوای مەر ئەتکوژێ.
٥٥٧. گورگ بێو بکرێتە شوانی مەر.
٥٥٨. گوریس کە پچرا چوار سەری لێئەبێتەوە.
٥٥٩. گۆری هێنایەوە گۆرخانە.
٥٦٠. گۆزە لە رێی ئاوا ئەشکێ.
٥٦١. گوژالك نابێ بەشووتی.
٥٦٢. گۆشت لەمنو ئەقاش لەتۆ.
٥٦٣. گۆشتی رانی خۆت بخۆ لەمنەتی قەساب باشترە.
٥٦٤. گوڵە گاگرۆ بەهاری هێنا بەدرۆ.
٥٦٥. گوێرەکەی باری هەر بەمناڵی دیارە.
٥٦٦. گوێرەکەی ماڵە فەقیر خورا، دەوڵەمەن هێن خۆی بەستەوە.
٥٦٧. گوێز لە هەورامان زۆرە.
٥٦٨. گوێلکی نیە هەوسار ئەکا.
٥٦٩. گەری شۆرش ناکرێ بەتەشی رستن.
٥٧٠. گەر دۆستت وەفادار بێ، ناحەزت داوت بۆ ئەنێتەوە.
٥٧١. گەوهەری خۆت مەدە لەسەنگە.
٥٧٢. گەرێ سوالکەر خۆی چی بێو شاییەکەی چی بێ.
٥٧٣. گێرە بنەی مانگابێ تێك ئەچێ.

(ل)

٥٧٤. لاکەی سەری دێ.
٥٧٥. لایە لایە ئەزانی بۆ ناخەوی.
٥٧٦. لچی زەوی ئەماڵێ.
٥٧٧. لە ئاخور پیری ئاردی جۆیان پێکرد بە تیری.
٥٧٨. لە پەر ئەخوات و لەناوەراست ئەخەوێ.
٥٧٩. لەپەنای سێبەری شێرا بخەوە با بشتخوا.
٥٨٠. لەچاو چەپەوە ئەیدا لەراستەوە ئەیسێنێ.
٥٨١. لە چۆڵ بۆ ئاوەدانی، لەئاوەدانی بۆ کوێ.
٥٨٢. لە خزمو دۆست گلەیی دەکرێ.
٥٨٣. لە دارستانێکا دارێکی چەوت هەر ئەبێ.
٥٨٤. لەدوای بۆرە، وەجاخ کوێرە.
٥٨٥. لە دوژمنی مەرد مەترسە، لەدۆستی نامەرد بترسە.
٥٨٦. لەدەرگا وەرە دەرەوە.. چاوم ها بە سەرەوە.
٥٨٧. لەدەرەوە شیرین، لەژوورەوە تاڵ.
٥٨٨. لەدەمی ئەچۆرێ دۆشاو، لەدڵی ئەچۆرێ خوێناو.
یان: لەدەمی ئەبارێ شەکراو، لەدڵی ئەباری ژەهراو.
٥٨٩. لەرێوە یا لەدێوە.
٥٩٠. لە رێویان پرسی: کێ شایەتتە؟ وتی کلکم.
٥٩١. لە سوێند زیاتر، بروا بەرەوشت بکە.
٥٩٢. لەسەر دوو گوریس یاری مەکە.
٥٩٣. لەسەر رێگە لابدەی درك ئەچەقێ بە پێتا.
٥٩٤. لەسەگیان پرسی: ئەوە بۆچی کلك بۆ هەموو کەسێ دەلەقێنی؟ وتی لاسایی مرۆڤ دەکەمەوە.
٥٩٥. لە کانییەك ئاوت خواردەوە، بەردێکی لێ دەرکە، نەك بەردێکی تێ بخەی.
٥٩٦. لە کراسی خۆتەوە سەیری خەڵك مەکە.
٥٩٧. لەکەر بکەوێ، لەکورتان نەکەوێ.
٥٩٨. لەگەڵ سەگا زۆر بدوێی، پێت ئەوەرێ.
٥٩٩. لەگەڵ کچم بۆ کوێ بچم، لەگەڵ کورم کێو ئەبرم.
٦٠٠. لەماڵی زاوا تلیلییە، لەماڵی بووکیش هیچ باسێ نییە.
٦٠١. لە ناوشانی ئەبرێ ئەیدا لە پاڵدمی.
٦٠٢. لەو شوێنەی ئاو هەیە بێڵ نییە، لەو شوێنەی بێڵ هەیە ئاو نییە.
٦٠٣. لە هەردوو ئاخور ئەلەوەرێ.
٦٠٤. لیرەش بچووکە.
٦٠٥. لێمان بوو بە(جوکڵ) هەمەوەند.

(م)

٦٠٦. ماچی تۆم ناوێ، چڵمانیشت لاوە.
٦٠٧. مارانگەستە لە گوریسی بازك ئەترسێ.
٦٠٨. مار ئەڵێ لەمن گاز، مشك ئەڵێ لەمن باز.
٦٠٩. مار بەقسەی خۆش لەکون دێتەدەر.
٦١٠. مار بەو گەورەییەوە، لە کۆلاژدم ئەترسێ.
٦١١. مار پێی هەبوایە جیهانی هەراسان ئەکرد.
٦١٢. مار حەزی لە پونگە نەئەکرد، پونگەش ئەچوو لەبەر کونەکەیا سەوز ئەبوو.
٦١٣. ماری فیشکەفیشکەر بەدوای مارمێلکەدا دەگەرێ.
٦١٤. ماست تا نەیژەنی، نابێ بەکەرە.
٦١٥. ماڵ بەبێ ژن قەفەسێکە بەبێ باڵندە.
٦١٦. ماڵ یابۆ سوێند خۆرە، یابۆ زۆردارە.
٦١٧. ماڵ نەخۆرم، بۆ بخۆرم.
٦١٨. ماڵی بێ پیاو، وەك خانووی بێ پەرژینە.
٦١٩. ماڵی بێ ژن وەك کەلاوەی رووخاوە.
٦٢٠. ماڵی بێ منال وەك ئاسیاوی بێ ئاوە.
٦٢١. ماڵی بی مندال وەك مەزار وایە.
٦٢٢. ماڵی فرەژنان ئاو نییە لە کوڵەنان.
٦٢٣. مامر چەند قەڵەو بێ، قنگی تەسك نەبێتەوەو هێلکە ناکات.

٦٢٤. مامرو هێلکە لەیەکن.
٦٢٥. مامرە قونەی چوکڵ وەقوینە، ئەمە ئەوەڵتە ئاخورت چوینە.
٦٢٦. مانگ قەدری نییە تاشەو نەبێ.
٦٢٧. ماین لەمەیدان، تفەنگ لەشان.
٦٢٨. مردن برا گەورەیە.
٦٢٩. مردن چاکترە لە ئیختیاری بێ ژن.
٦٣٠. مردوو بێ کفن نانێژرێ.
٦٣١. مریشك سەری بگاتە پاشی هەر چاوی لە زبڵدانە.
٦٣٢. من چی بکەم خەجێ خان بۆ قاوەچی ئەوەستێ.
٦٣٣. من عەرەب، تۆ عەجەم.
٦٣٤. من قاچاغی ناکەم، ئەگەر کردم بمبەن بۆ شێتخانە.
٦٣٥. مەدحی ڕوو بە ڕوو پیاو ئەدا بەشوو، دۆستی سەر زبان بەدوژمن دەرچوو.
٦٣٦. مەردمی سووتاو لە ئاگر ئەترسێ.
٦٣٧. مەرگ بە نۆبەیە.
٦٣٨. مەرگ لەگەڵ هاومال شاییە.
٦٣٩. مەرگ وەك کەری بەقاڵ، گر ئەخوا ماڵ وەماڵ.
٦٤٠. مەرگی بێ قەزاو بەلا شوکری خوای ئەوێ.
٦٤١. مەرمان نەدیبێ لە پەرێزێ، قشپلمان دیوە لە هەرێزێ.
٦٤٢. مەری بێ شوان گورگ ئەیخوا.
٦٤٣. مەشکەی خۆمان ناژەنم، مەشکەی ئاغا ئەژەنم، شڵقەی زلە.
٦٤٤. مەلا هەیەو مەلا بەزێنیش هەیە.
٦٤٥. مێر لەمەیدان، یان شێر لەمەیدان؟
٦٤٦. میز بە جەوەنەی ئیمام حوسێندا ناکا.
٦٤٧. میوان درەنگ وەخت، بەبرسێتی ئەنوێ.

(ن)

٦٤٨. نازم هەیە، زۆرم نییە.
٦٤٩. ناشارەزا وەکو کوێر وایە.
٦٥٠. نان خۆری سفرە دڕ.
٦٥١. نان مەدە بەتێر، بەرگ مەدە بە کوێر.
٦٥٢. نانی بەیانی سیحەتە، نانی نیوەڕۆ عادەتە، نانی ئێوارە قەباحەتە.
٦٥٣. نانی جۆ ئەخوا دەستی بە ساوین ئەشوا.
٦٥٤. نانێ کەمتر بخۆ، خزمەتکارێ زیاتر بگرە.
٦٥٥. نانی مادە بەگەرمی تیکەی لێ بادە.
٦٥٦. ناوبانگ عەیب پۆشە.
٦٥٧. نوێ هات..کۆن هەلات.
٦٥٨. مە ئەقڵ بەساڵە، نەیش تەبیعەت بەماڵە.
٦٥٩. نەبارە بەرت جاش بێ..نە منداڵت وێڵداش بێ.
٦٦٠. نە باوەڕ بە شەری ژنو مێرد بکە، نەیش باوەڕ بە شەری بووكو خەسوو بکە.
٦٦١. نەبرا بچووك بی، نەخەرمانت لەخوار خەرمانی خەڵکییەوە بێ، نەماڵت لەخوار ماڵانەوە بێ.
٦٦٢. نەبرسی بنێرە بۆنان، نە ئەختیار بنێرە بۆ کەر کڕین، نەیش جایەل بنێرە بۆ خواستن.
٦٦٣. نەبوونی سەر بەماڵی دوژمنا ئەکا.
٦٦٤. نەخوێن ئەبێ بەناو، نەناو ئەبێ بەخوێن.
٦٦٥. نەخوێندەوار وەکو کوێرە.
٦٦٦. نەخێری دی، نەخۆشی، دایم ئەسووڕێ وەك تەشی.
٦٦٧. نە دزبەو نە حیز بە، لەدەرگای خوا مەکە تۆبە.
٦٦٨. نە دەوەن بێ دەغەڵ ئەبێ، نە چەمیش بێ چەقەڵ ئەبێ.
٦٦٩. نەزان چوزانێ بزانچی ئەزانێ.
٦٧٠. نە قەدرزان هەیە، نە خریدار.
٦٧١. نەمام نەیبەستی چەوتو چێل ئەبێ.
٦٧٢. نەمدیایە دایکی، ئەمردم لەحەسرەت باوکی.
٦٧٣. نەمەنەن حێلم نەمەنەن تاوم، مەگەز سەرکردەن چە هەردۆ چاوم.
٦٧٤. نەهارم نە هۆرم..شیوەن لەدەور گۆرم.
٦٧٥. نیشانەی هەڵامەت پژمینە، ئەوەی تووشی بێ، خەمگینە.
٦٧٦. نیشتمانی ژن مێردەکەیەتی.
٦٧٧. نیوەتێر لەباوك مردوو خراپترە.
٦٧٨. نییە لەماڵ شام شەوێ، کیژە گەورە ماڵ سەرچۆپی ئەوێ.

(و)

٦٧٩. واز نەهێنی، شاییەکەتان بێ دەهۆڵ دەکەم.
٦٨٠. وتم: هۆ ژاڵە بۆ تامت تاڵە؟ وتی: براکەم ڕفاندی مردن، وتم: ئەی بۆ گوڵت گەشو ئاڵە؟ وتی: لەبەر دڵی دۆستانو لەداخی دوژمن.
٦٨١. وتیان بە فەقیر وا سەرما و سۆڵەهات، وتی خۆم ئامادە کردووە بۆ لەرزین.
٦٨٢. وتیان بەگورگ بۆ بەڕۆژ دەرناکەوی وتی: لەبەر کردەوە جوانەکانی شەوم.
٦٨٣. وتیان پشیلە گووت بەدەرمان، ئەویش ئەچوو لەکادان ئەیشاردەوە.
٦٨٤. وتیان حوشتر بەچکەت بوو، وتی: جابەمن چی؟ وا کۆڵی خۆم ها بە کۆڵمەوەو ناهێڵێ تێر حوشترەلۆکیش بخۆم.
٦٨٥. وتیان دزی شەو ئازایە یا هین ڕۆژ؟ وتی: ئەوەی بەدەست خاڵی ناگەڕێتەوە.
٦٨٦. وتی: ئەگەر دوو ئەستێرەی ترمان هەبوایە ئەم ترە ترەی مانگمان نەئەکێشا.
٦٨٧. وتی: گەواد ڕیشت بگرم دنیات پێ گێرە ئەکەم، وتی ڕازیم چونکە تۆیش لەگەڵمای.
٦٨٨. ورد برۆ، دوور بروانە.
٦٨٩. وریابە لەمانە خۆت لادە، گەنجی ناو شایی، سەگی دەڵەوبا، مانگای بە کەڵ.
٦٩٠. وشکە وەردم کرد، تەرەکاڵ سەوز بوو.
٦٩١. وە ڕۆژە ڕۆژە ساڵمان بردەسەر، ئەوا بەهارهات لەشمان کەوتە دەر.
٦٩٢. وەرە مەمرە لەداخا، گەوجە ئەڵێ جێ ڕاخە.
٦٩٣. وەسەر کۆنەیا نادرێ.

٦٩٤. وەسەرەرا کەوتم، وەجلەگا خەوتم.
٦٩٥. وەك پشیلە تێر ئەخواو چاو ئەنوقێنێت.
٦٩٦. وەك پیرە ژنی دۆ رژاو ئەبۆلێنێ.
٦٩٧. وەك تاسی حەمامە، هەر رۆژێ بەدەست یەکێکەوەیە.
٦٩٨. وەك دەمانچە دایم لەسەر پێیە.
٦٩٩. وەك کولاژدم هەمیشە کلکی ها بەسەر شانەوە.
٧٠٠. وەك کولەکەی تەرە گڕ ناگرێ.
٧٠١. وەك کلکی سەگ چل رۆژ لەناو قامیشدا بێ هەر چەفتە.
٧٠٢. وەکو تەماتەیە بە هەموو شتێکەوە دەخورێ.
٧٠٣. وە کوسی کچێنی میز ئەکا.
٧٠٤. وەکو گا هەر مل ئەنێت.
٧٠٥. وەکو مار وایە، پێی لە سگیدایە.
٧٠٦. وە نوێژو رۆژوو نییە.
٧٠٧. وەی بن مالی قورپی نییە.
٧٠٨. وەی وەبال هەفت کورم، وەی وە وەجاخ کۆرم.
٧٠٩. ویرە ویر ئەکەم، ئاو لە شیر ئەکەم.

(ھ)

٧١٠. هات وە گونمەوە، نەهات وە کێرمەوە.
٧١١. هاوردمان بزنی گەر، بردمان سەولێ تەر.
٧١٢. هاورێی ئەم زەمانە، هی سەر خوانە.
٧١٣. هەتا تۆ ئەو کارە ئەکەی کلکی حوشتر ئەگاتە زەوی.
٧١٤. هەتا چاوت بە مالی دنیاوە بێ، ئاگات لە مردنی خۆت نییە.
٧١٥. هەتا خوا هەق ئەکا، دڵ تەق ئەکا.
٧١٦. هەتا لەسەر دەسمان نەرۆین، قەدری لاقمان نازانین.
٧١٧. هەتا نەیخوارد مەترەق، نەیوت ئەڵلاهو سەدەق.
٧١٨. هەتا هەمبو چشت و مشت، من بووم برای پشتاوپشت ئێستا شك نابەم چشت و مشت، منم دوژمن برا کوشت.
٧١٩. هەتا هەوراز نەکەوێتە پێشت، قەدری نشێو نازانی.
٧٢٠. هەر ئیمانسزێ، دینسزێکی هەیە.
٧٢١. هەر بلێ ئەم نانە بەو رۆنە.
٧٢٢. هەر چاومان عەیبی هەیە، ئەویش بەکل چاك ئەبێ.
٧٢٣. هەر چۆنێك ئەیخەی وەك پشیلە بە قاچ ئەنشێ.
٧٢٤. هەر چەند کولە فێنك دلە.
٧٢٥. هەر چەند لەرم، بەلام وەجەرم.
٧٢٦. هەر خەتێ چەوت بێ، خەتای گارەشە.
٧٢٧. هەر دێی لە قەلا، ناوت لێدەکەم بە بەلا.
٧٢٨. هەر کاکەو ئەیەوێ خەلك بەزورنای ئەو هەلپەرێ.
٧٢٩. هەر کاکەو بەسەر یاری خۆیا گۆرانی ئەلێ.
٧٣٠. هەر کەرەکەی جارانە، کورتانەکەی گۆراوە.
٧٣١. هەر کەس ئەلێ وای ئەفسم.
٧٣٢. هەر کەسێ پەری تاوسی ئەوێ، ئەبێ زەحمەتی رێگای هیندستان بکێشێ.
٧٣٣. هەر کەسێ دایکم بخوازێ، پێی ئێژم مامە.
٧٣٤. هەر کەسێ دەردی لە دلی خۆیدایە.
٧٣٥. هەر کەللەیەك ئاوازێکی تیایە.
٧٣٦. هەرگیز مەبە بەدەمتەری سیا دڵ.

٧٣٧. هەر مال مالم بوو، مال بەمال نەبوو، ئەم مالەی من قەت ئاوا نەبوو.
٧٣٨. هەر نایەی نایەی سالی جارێ دێی، یا بۆ گلەیی یا بۆ کارێ دێی.
٧٣٩. هەر هەموویان گوێلك مانگایەکن.
٧٤٠. هەزار ئەکەم، حەلال ئەکەم.
٧٤١. هەزار بەرتیل، قەرزێك ئەدا ناکا.
٧٤٢. هەزار درك بەبۆنەی گولێکەوە ئاو ئەخوا.
٧٤٣. هەزار دوژمنی مەردت هەبێ، بەلام دۆستێکی نامەردت نەبێ.
٧٤٤. هەزار رەحمەت لە کفن دز.
٧٤٥. هەزار سال بکەی بێگانە پەرستی، ئاخوری هەر دێنی نوشوستی.
٧٤٦. هەزار سوژن گاسنێکی تێدا نابێ.
٧٤٧. هەزار کورتان بباری پالدوویەك ناچێتە ملتەوە.
٧٤٨. هەزاری بۆ بلێ لەهەزار وێنە، لەبیری ئەکا ئاشی ترخێنە.
٧٤٩. هەژدەی نیسان تایە لەزەوی، کوللە لە ئاسمان.
٧٥٠. هەق بەهەق دەست بە ئاردەوە.
٧٥١. هەق بەهەق، مامە لەقلەق.
٧٥٢. هەق کۆن ئەبێ، بەلام لەبیر ناچێتەوە.
٧٥٣. هەلاوێ لە پلاوێ خۆشترە.
٧٥٤. هەلۆ وتویەتی: ئەگەر هاورێم حەرامخۆر نەبوایە کەرم بە کورتانەوە هەلدەگرت.
٧٥٥. هەلهەلە زاوا کۆرو بووك کەچەلە.
٧٥٦. هەلە هەل ئەکەم، چاوی دوژمن کوێر ئەکەم.
٧٥٧. هەلیسەنگێنە..کۆلت رەنگینە.
٧٥٨. هەموو بریقەیەك زێر نییە.
٧٥٩. هەموو بۆنێك هۆیەکی هەیە.
٧٦٠. هەموو جانەوەرێ گۆشت خۆرە.. هەر گورگ ناوی بەد ناوە.
٧٦١. هەموو جوانێك عەیبێکی هەر هەیە.
٧٦٢. هەموو خشەیەك مار نییە.
٧٦٣. هەموو دنیا بگری لەکۆل، بیگێری ئەرزو چۆل ئەبێ هەر بیێ بەخۆل.
٧٦٤. هەموو عالەم تف بکا تۆفان هەلناسێ.
٧٦٥. هەموو کەسێ نانی خۆشی ئەوێ، گاوان ئەینا بە سینگییەوە.
٧٦٦. هەندێ باوەژن خوا ناناسێ.
٧٦٧. هەندێ جار راکردن لەشەرا نیوەی کەلەمێردییە.
٧٦٨. هەنگاوی چەواشە بەلات بۆ ئەهێنێ.
٧٦٩. هەنگوینەو لە پێستی سەگدایە.
٧٧٠. هەنەرو مەنەر، ئەم لە ئەو بەتەر.
٧٧١. هەوال قنگلاشکە با ئەیزانێ.
٧٧٢. هەورە بۆرەکە فێر بووە پێمان، گشت ئێوارانێ سەر ئەدا لێمان.
٧٧٣. هێز لە یەکێتیدایە.
٧٧٤. هێستر بەر لەقەی هێستر دەگرێ.

٧٧٥. هێشتا بە کڵاشەوە لە ئاوت نەداوە.
٧٧٦. هێشتا ژنەکەی کفنەکەی زەرد نەکردووە، داوای ژن ئەکا.
٧٧٧. هێشتا شەقەی قەلماسنگی نەبیستووە.

(ی)
٧٧٨. یا باوکت کێری هەڵساوە..یا دایکت ساوەری نەماوە.
٧٧٩. یاپراغ ئەگەر باش بوایە، خۆی نەئەپێچایەوە.
٧٨٠. یاخوا دەنگ هاوکەر لەماڵی کەس نەورێ، بۆی پوریزیش لەپشت کەس نەورێ.
٧٨١. یاخوا هیچ دایكو باوکێك بێ منداڵ نەبن.
٧٨٢. یارێ مەگۆڕەوە بە هەزار نەیار.
٧٨٣. یان ئەدەی بەرتیل کێرم، یا باوکت لە قەور دەردێنم.
٧٨٤. یەك دەمو هەزار زوانی هەیە.

*** مەتەڵی فۆلکلۆری:**

**هەردەوێڵ کاکەیی**

- یەکە بە دوو نابێ: (خوا).
- نەمارە، نەدارە، کاکی دارە، سەری مارە: (قەمچی).
- نە پا دارە، نەباڵدارە، لەزەوی ئەروا هارە: (مار).
- نەخەوی هەیە نەخۆراك، لەدۆستو دوژمن بێباك: (ئاو).
- سینگی بۆ هەموو کەسێ ئەکاتەوە: (کتێب).
- مەجلیسی هەیە (٣٢)کەس، نەگیانیان هەیە نە نەفەس: (ددان).
- نەسەرە شەکرۆکە، نەجرجۆکە: (ژوژوو).
- لەسەرەوە یەکە، لەخوارەوە دووە، بەباو باپیرتا چووە: (شەرواڵ).
- شەش کەس هەن خوێنیان هەیەو بێ گیانن، یەکێکیان زوانی هەیەو پێنجیان بێ زوانن: (قەڵەمو پەنجەی دەس لەکاتی نووسین)دا.
- کارە کۆرپەی مەلایە، بەرم دایە چیایە، نەیهێشت یەك قلە گیایە: (مەکینەی سەرتاشین).
- گردە گەورە تۆز ئەکا: (سەرەن لەکاتی ئیش کردن)دا.
- قەڵایەکم هەیە گەچ گەچینە، نەپای هەیە نە پاچێنە: (هێلکە).
- خرە وەك تۆپی مناڵ، هەزار کۆرپەی لەناو ماڵ: (هەنار).
- ئەو جامە چەوتە چییە هەنگوینی تێدایە؟: (گوێ).
- برایەکم هەیە شمشاڵ لە کۆڵە، بزانە چییە بە ڕۆژ لە چۆڵە: (شوان).
- درێژ، درێژ وەك قامیش، لە ملوێن هاتە لامان، ئەوەندە بە جەخت هەڵپەرین، لەشیان ڕزا لە پێشمان: (باران).
- تەنك، تەنك چەرمی ڕەنگ، لە کەواندن نابێ لەنگ، لەگەڵ ئاوو ئاگردا لەترسا هەرگیز ناکا جەنگ: (کاغەز).
- بە زەوق‌و بە هەوەستە، خۆی بە خۆی لە قەفەستە بێ بەرو بێ سێبەرە، خۆی بە خۆی لە هەوەستە: (دۆمەڵان).
- سەری هەیە، سکی نییە، قاچی هەیە دەستی نییە: (پیاز).
- حەکیم نییە دەرزی دارە، دەرزی ئەدا ژەهری مارە: (دووپشك).
- نایان پێتەوە، لێت نابێتەوە: (ناو).
- قژی درێژە دەروێش نییە، سەری سپیە حاجی نییە، قاچی سەوزە قامیش نییە: (تەرە پیاز).
- هەر دەرۆی لێت نابێتەوە: (سێبەر).
- بیگری پڕ مشتێکە، بەریدەی پڕ بە دەشتێکە: (نەوس).
- وردەن چەبن کەمەرەن، دڵش چەرمە بەرگش سەوزەن: (یاپراخ).
- ئەسپەو ئەسپ نییە، دوو پێی هەیە سمی نییە، وەك ئەسپ دەروا گیانی نییە: (ئەسپە چۆینە، پاسکیل).
- قەڵای گەچین بێ گەچ‌و بەردن، دوو ڕەنگ ئاوش هەن چەرمەو زەردین: (هێلکە).
- نە گیاندارن، نە خوێندارن، بێ دەست‌و پا شەبقەدارەن: (قارچك).
- لە بەیانییەوە تا ئێوارە خۆڵ ئەکا بەسەر خۆیا، ئێوارەش وەك بووك ئەچێتەوە ژوور ماڵ: (گاسن).
- نە دەستی هەیە نە قاچ، بەبێ شەرم‌و بێ حیجاب سیو دوو بووك ئەکا ماچ: (زمان‌و ددان).
- چەسك دایە بەرمەشۆ، پەی پشت باوەش مەخرۆشۆ، چەنی ئاور مەجۆشۆ: (شقارتە).
- سەدو یەك برا بەموو بەستراون، لەگەڵ باوکیاندا دەستگیر کراون: (تەسبیح).
- لە ئاو ئەدا تەڕ نابێ: (سێبەر).
- ئەوەی ئەیخۆی لە کوێ دەردێ؟: (لە ئەرز).
- تەختێکەو تەختانێکە، چوار شەك‌و بەرانێکە: (پێنج پەنجەی دەست).
- تەڵێ ئاورێشم، دنیای پێ ئەکێشم: (ڕێگە).
- بانی تەسکە، بنی بڵاوە، ئەگەر ژێر بی ئەڵێی کڵاوە: (کڵاو).
- مەرێکمان سەر بری سیو دوو گورچیلەی هەبوو، واتە: (سییەك‌و دوو گورچیلە).
- چارۆکەیەکم هەیە چوار گۆشە، پڕ لەکار بزنی پۆشە: (ئاسمان‌و ئەستێرە).
- هەندووکە مەندووکە، لەناو ماڵ ئەڵێ بووکە: (چرا).
- شۆرە، شۆرە، شۆرە بییە، ئەگەر دانای بزانە چییە: (دەرختی بی).
- خرە وەك زرکی تاڵە، ناوی بۆشیو بەتاڵە، دایم لەدەست مناڵە: (تۆپ).
- ئاخۆ چییە باسمان؟
فرمێسك ئەرژێتە ئاسمان
ڕەشە بە وێنەی قەتران
خاتوونی گوندو شاران
ئەوسا بمرێ ماڵ وێران
سوورە وەك گوڵ هەناران
تەرمی نابەن بۆ قەبران
ئەبێتە گەردی شاران: (خەڵوز).
- بە کۆرپەی چوار پێی هەیە کە گەورە بوو دوو پێی هەیە، کە پیر بوو سێ پێی هەیە: (مرۆڤ).
- سینییە گەورەکەی دەور زەمانە، لە بووك جوانتر خۆی لە ئاسمانە: (خۆر. ڕۆژ).
- سەگی هار لەبان دار، کلۆ کلۆ بەفر ئەخاتە خوار: (تیغی سەرتاشین).
- تەپە خرەڵەی گیا وردەڵە: (سەر).
- دوو تاڵ هەورێشم، هەتا بەسرە ڕایئەکێشم: (هێڵی شەمەندەفەر).
- ئەم بەری خرە، ئەو بەری خرە، ناو ڕاستەکەی عالەم چرە: (دەم‌و ددان‌و زمان).
- شویشەو شویشە بەنە، هەموو دونیای تێدا بەلە: (تەلەفیزۆن).
- دەنگی هەیە زوانی نییە، دڵی هەیە گیانی نییە: (رادیۆ).
- نە گیاندارە، نەباڵدارە، قسە ئەبا بە هەزارە: (تەلەفۆن).

- وە تەری ئەیکەی پێیا وە وشکی دەرینەکەی: (کەوچك).
- ئەگەر ئاقڵی ئەقڵت لە بیرە، لە مەلەکان کامیان وەشیرە: (شەمشەمە کوێرە).
- دەرخۆنە، کلکی رۆنە: (دونگی مەر).
- سەری بادەی فرمێسك ئەرێژێ: (زەمبەلەی ئاو).
- دوو برا یەك پشتێنیان هەیە: (گسکی کوردی).
- سەری ئاسنە کلکی دارە: (چەکوش).
- هەتا بکولێ دەمەیێ: (هێلکە).
- هەر ئەڕۆی لێت ئەکەوێتەوە: (شوێن پێ).
- ئەروا شوێن پێی ناکەوێ: (سێبەر).
- ئەملای کەلەك، ئەولای کەلەك، ناوڕاستەکەی چەرخ و فەلەك: (دەم).
- ژێری بەرخە، بانی کارە، کلکی قاچی، سەری مارە: (پەرەسێلکە).
- شڵە، کوڵە، بێ مووە: (بۆق).
- شەش پێ و دوو سەرم: (تەرازوو).
- مەلێ هات وە هۆهۆ، نەتانی هەیە نە پۆ: (فەرەنجی).
- تازە، تازە، تازەیە، بە کۆنە و تازە تازەیە: (شارۆچکەی تازە).
- سێ سەرباز کڵاوێکیان هەیە: (بنە، دەرخۆنە).
- ڕەشە وەك قیر، سپییە وەك شیر، تیژە وەك تیر: (چاو).
- ئەمە چییە لێ ببەی گەورە ئەبێتەوە، بیخەیتە سەری بچووك ئەبێتەوە: (چاڵ).
- ئەکەوێتە ئەرز ناوی خۆی ئەڵێتەوە: (توور).
- هی خۆتە و خەڵك بە کاری دێنێ: (ناو).
- هەموو شتێ ئەچێتە ناویەوە: (گوێ).
- لەدار سەوزە، لەبازار ڕەشە: (چایی).
- ئەمە چییە مووسێ: (کریاری موو).
- سەنوق پاتشا، تورك تەماشا: (گەنمە شامی).
- ئەملای پەرژین، ئەولای پەرژین، تیایەتی کوترێ نەخشین: (چاو).
- چل ناڵە، چل بزمارە، چلچلۆکەی چل هەزارە: (کرمەك).
- هۆ هۆ خرە وەك گۆ، نە نارنجە نەلیمۆ: (مەمك).
- تەپ لەسەر تەپی، دەستت لە ڕەپی: (دەستار).
- دادایەکم هەیە لە دەشتە، کوتە شمشێرێکی لە پشتە: (دوو پشك).
- کڵاوی هەمزە پاڵەوان، نەتەقەڵی هەیە نە دروومان: (جام).
- لە ئاسمان تەبەق تەبەق، دێتە خوارێ ڕەق و تەق مانوو نەبی عمبا بەلەك: (تەرزە).
- نە بایە نە بارانە، چك چکە لە دارانە: (دڵۆپەی کووپی ئاو لە کوندەڵان).
- کەری شین، کەربەندی شین، بەستراوەتەوە بە گوریسی نەخشین: (شووتی).
- بنوێ گایە، هەڵسێ چیایە: (ڕەشماڵ).
- بە دەوری پێغەمبەری، کلك لە تەوقی سەری: (کوولەکە).
- سێ سەرە، سێ سەرە، ئەحمەد پاتشای لەسەرە، کلك درێژی نۆکەرە: (سێ کوچکە و مەنجەڵ و کەوچك).
- هەندووکە بەندووکە، لە پێش حاکم ئەڵێ بووکە: (چرا).
- ئەوەندەی هەنارێکە پڕ ژوورێکە: (چرا).
- سایەقەی سامال هەوری فەرەنگی، دوو ئاو لە جامێ هەریەك لە ڕەنگی: (هێلکە).
- زەردی زەردی لە بنی بەردی، حوکمی ڕۆژی، زراوی بردی: (مار).
- حوشتر حایە، لە حەوایە، دایم لەدەشتە، کون لە پشتە: (ڕەشماڵ).
- سەوزە وەك خەیار، دەرئەچێ لە بەهار، مزرە وەك هەنار: (ڕێوارس).
- ئەڵدەم و بڵدم، شەش پێ و دوو سم: (ترازوو).
- هاشان و ماشان، جێی میرو پاشان: (لانك).
- دارێکم هەیە بەر ئەگرێ، ئەوەی بیخوا پێی دەمرێ: (قورئان).
- ماینێ سپی چەپەخان، خۆش خۆش دێتە بەر مەیدان: (پارە).
- لەکل وردترە، لە حوشترە بڵندترە: (دووکەڵ).
- دوو کۆتر هات بەهانە هان، شاپەڕ سپی، مل بە کەوان: (خۆر و مانگ).
- چوومە ئاواییەك شارنەبوو، دووکاورم خوارد ئێسقانی نەبوو، سواری کەرێك بووم گیانی نەبوو: (منداڵ، مەمك، بێشکە).
- سەری هەستانە، بنی قورئانە: (قارچك).
- جۆ خۆرە کەر نییە، هێلکە کەرە، مامر نییە، دەچێتەکون ما نییە: (کیسەڵ).
- سەد دەرزی، باقەد دەرزی، لەبەر یەك سوار ئەلەرزی: (تەون).
- گای ڕەش لە پێشەوە، گای سوور لە پشتەوە: (دوو کەڵ و ئاگر).
- شەو باریکە، ڕم باریکە، ئەمن ناوێرم، ئەتۆ ئەنێرم: (تفەنگ).
- دوو کونە ڕێوی، دوو ئەستێرەی گەش، بانی بەپووش، ئەشکەفتی ڕەش: (سەرو دەم و چاو).
- تا پەنجە بە قنگیا نەکەی ناروا: (قەیچی).
- کومەزی سپی بێ دەرگا: (هێلکە).
- سەر لووسی بن پەراسوو: (قارچك، کوارك).
- لە حوشتر بڵند ترە، لە شەکر شیرین ترە، لە هەرزن وردترە: (هەنجیر).
- ئاسمان چەرخی گەرە، باران دایکی مەرە، واتە: (ئاسمان دەگەرێ و دایکی بەرانیش مەرە).
- خرە، خرە، خرە هەر چەند درێژە خرە (خر، چەم).
- ئێژم ئێژم تەور ئێژم، ناوی ئەوەم پێت ناوێژم: (تەور).
- چشتێکم هەیە چشتانە، نیام لە بوچخەی سوڵتانە، لەبۆ ڕۆژی تەنگانە: (پارە و پوول).
- بە پێنج بۆ ئەڕۆی، بەسێ ئەیگری: (دەست و قەڵەم).
- چل تاق، چل نیو تاق، چل ئەستێرەی چاو زاق: (ڕەشکە).
- سێ سوار هاتنە شارێك، هەر ماڵێك سێ سواری لێ مێوان بوو: (مانگی ڕەمەزان).
- سەری بەتۆ، بنی بە دایکت: (مەمك).

- سویرە وەکو خوێن، ڕەشە وەکو هیس، سپییە وەکو بەفر: (پەرە سێلکە).
- ئەر ئەقڵداری ئەقڵت بە وێشە، شەست پەرەی دوو شاخ ئامەلە چێشە؟ (کوندەبوو).
- ئاسمانێکی نزمۆکە، لێی ئەبارێ بەفرۆکە: (هێلەك).
- سەری بەردەو بەرد نییە، ژێری بەردەو بەرد نییە، هێلکە کەرەو مر نیی، کەما خۆرەو کەر نییە: (کیسەڵ).
- گەرمیشەو نەرمیشە، بەنە خوێنەکەی بکەوەو تێی نیشە: (گیپە).
- سێی لە سێبەرە، دووی لە هەتاوە، هەرکەس بیزانێ ئەقڵی تەواوە: (پێنج فەرزەی نوێژ).
- داری بێ گوڵ، خواردنی بێ دڵ، میوەی بێ توێکڵ: (هەنجیر، ماسی، هەلوژە).
- دەستی بۆ ئەبەی هەر کفرە، بەلایدا ئەچی هەر کفرە، تەماشای ئەکەی هەر کفرە: (داری کفر).
- چوار دەوری بەحرە، ناوراستەکەی ئاگرە، ئەگەر نایزانی بلێ سەماوەرە: (سەماوەر).
- ڕەق بە ڕەق ئەکەوێ، سوورە بە نەرم ئەکەوێ: (ئەستێو بەردە ئەستێو قاو).
- زەردە زەرنیق نییە، سپییە پەنیر نییە، بۆشە قەبە نییە: (نێرگس).
- سێ جەوەڵ ئەو بەر ئەو بەرە، دێوی ڕەشی لەسەرە: (سێری نان کردن).
- سێ گرد بەرامبەرە، دێوی ڕەشی لەسەرە، کلك درێژی نۆکەرە: (سێ کوچکەو مەنجەڵو کەوچك).
- شتێکی سووری قرمزی، کونی نییە ئاو دەدزی: (تەماتە).
- لە ئاگری ئەدەم ناسووتێ، لە ئاوی ئەدەم تەڕ نابێ: (سێبەر).
- نە نێرە، نە مێ.. کاریشی بە جێیە: (نێرە مۆك).
- هەپلە مچە، هەپلە مچە، هەزار مێرد ئەکا هەر کچە: (پارە).
- هەلۆترو مەلۆتر، سەری قازی مل کۆتر: (داس).
- دوانزە شامییەکێکی حەرامە: (ساڵو مانگی ڕەمەزان).
- سێ لنگ لە ئەرزە، چوار لنگ لە حەوا: (مەشکەو سێپا).
- سەری سپییە حاجی نییە، پشتی سەوزەو سەیید نییە: (تەرە پیاز).
- ژێری ئاگرە، سەری ئاوە: (سەماوەر).
- سەگی ڕەش، نان لە سەگی سپی ئەسێنێ: (سێرو فەرشە).
- قەڵای سپی ڕێ لە کاروان ئەگرێ: (بەفر).
- بی تەڕشینە: (دەرختی بی).
- کێر قیتی قنگ فش: (مەسینە).
- منارە لەسەر منارە، سەری ئاگرە بنی ئاوە: (قلیان ئاوی).
- ماینی شێنە لە حەوشێیە، ئەحیلکێنێ، خوێن ئەڕژێنێ: (هەور).
- هەموو گردێ ئەبینێ، تەنیا گردێك نابینێ: (چاو سەری کەسەکە نابینێ).
- هەتا مانگای سویرمان دۆشی، مانگای ڕەش چووە سەریان: (ئاگرو دووکەڵ).
- سواری ئەسپێ بووم، بێ گیان بوو، دوو مەڕیشم خوارد، بێ ئێسقان بوو: (بێشکەو مەمکی دایك).
- دەنوکی قەڵەم، سلکی مارە، ژێر سکی بەرخە، بان پشتی کارە: (حاجی لەقلەق).
- نە گەڵی هەیە نە گوان، شیر ئەدا بە هەمزەی شوان: (هەنگ).
- ئەمە چییە، چی پێ ئەڵێن، پەیکە بە کونجی پێ ئەڵێن عەبای نارنجی پێ ئەڵێن: (تەماتە).
- کلیلو قفلدارە، لەهەموو شارێ خەبەردارە: (مانگی ڕەمەزان).
- مەلێك هات بە سیسی، عیسا لە مووسای پرسی ئەو مەلە بۆچ ڕۆیی بە برسی: (مانگی ڕەمەزان).
- خانوویەکم هەیە تەنگو تاریك، پڕێتی لە حوشتری مل باریك: (مێرووله).
- لە پڕ نیوە.. لەنیوە پڕە: (مانگ).
- هەراو هەراو قنگ لە قوراو، کەپنەك لەشان نوقڵە لەناو: (چەڵتوك).
- سەری تەسکەو بنی بڵاوە، کەرە کڵاوە، کەرە کڵاوە: (کڵاو).
- بە باڵ مەلو بەشاخ گایە، ماسی پشتەو هەرە پایە: (کوللە).
- مەلێکمان هەی مەلە خاتۆرە، قاچو قوڵ باریك سەر باڵی بۆرە: (کوللە).
- چاڵێکی چل گەزی، فاتمە خانی تێبەزی، سەری پڕە لە دەرزی: (کنگر).
- تەڕی ئەکەی، بەلی ئەکەی، بە خۆتیا ئەکەی: (کەوچك).
- بە ڕەق وەك دارە، لووتی زۆر خوارە: (نۆك).
- هەر لێرە هەتا دەرگەزێن، هەمووی سۆڤ سەر لەرزێن: (شەکرۆك).
- سێ بەی، سێ زەردە بەی، سێ هەنار، سێ ژەهری مار: (چوار وەرزی ساڵ).
- سوارێك هات بە هۆهۆ، نەسەری هەبوو نە راپۆ: (هەور).
- چاڵێ قەوی، دوو کونە ڕێوی، دوو چرای گەش، دوو ماری ڕەش: (دەمو لووتو چاوو برۆ).
- بە سێ زیندوو مردوویەکیان هەڵگرتووە، زیندووەکان بێ زوانن، مردووەکە زمانی هەیە، (قەڵەمو پەنجە).
- لە قەرنێك دا یەکجار دەرئەکەوێ، لە دەقیقەیەك دا دوو جار: (پیتی:ق).
- سەری لە ئەستێرەکان بەرز ترە: (ئەفسەر).
- پاپۆرێکم هەیە سەوزە، ناوی سوورە، کەشتیوانەکانی ڕەشن: (شووتی).
- هەموو شتی ئەخوا، ئاو بخوا ئەمرێ: (ئاگر).
- سیو دوو بووكو یەك زاوا: (ددانو زمان).
- ببیینی لەبەری ناکەی، لەبەری کەی نائیبینی: (کفن).
- سێ کەس دایان لە ئاوێ، یەکێکیان دای لە ئاوەکەو چووە ئەو بەرو پای تەڕ بوو، ئەوەی تریان ئاوەکەی بینیو پێی تەڕ نەبوو، سێیەمیان نە ئاوەکەی بینیو نەش پێی تەڕ بوو: (ژنێکی دووگیان منداڵێکی لە ئامێزدایە).
- دەرزی هەیە، دکتۆر نییە، تەزبیحی هەیە، دەروێش نییە: (دووپشك).
- لە کەرکوك هەیە لە بەغدا نییە، لەکەلار هەیە لە بەسرە

نییە: (پییتی:ك).
– ئاواییەك سێ ئاغای هەیە: (دەمرژمێر).
– شەوو ڕۆژ ترپە ترپ ئەکا: (دڵ، دەمرژمێر).
– خەرمان گوڵەکەم هاوە بەر باوە، شەنکەر یەکێکە دوو شەن وەلاوە: (دوو پەلکی یار).
– بتگرێ خاو ئەبیتەوە، بەرتدا گورج ئەبیتەوە: (خەو).
– برۆکی لەبان نەرۆکی دیمان، نە سەوزێ لەبان نەزۆکی دیمان: (هێستر بەبارە خوێوە بەسەر پردێکەوە دەڕوا).
– بۆ گشت کەسێ خۆی لا ئەدا: (دەرگا).
– لە فاتمەو زەهرا هەیە لە(عالەم)دا نییە: (نوختە).
– لە سك دایك دەرئەچێ سەوزە، پیر ئەبێ زەردە: (گەنم).
– وەستا خۆش وەستا، وەستا زەنوورە، چوار دەوری ئاوە، دەڵێ تەنوورە: (سەماوەر).
– پشتی لە خوارو دەستی لە حەوا، بزن هەی بزن، باری تەعالا: (مەشکە).
– لووتەی لەماڵ تۆراو: (مێخی دەوار).
– دەنگی هەیەو ڕەنگی نییە، بە مقاش بیگری گۆشتی نییە: (ڕەشەبا).
– ڕەقی ڕەقایی، دام لە نەرمایی گەیشتە گەرمایی: (ئەستێو بەردە ئەستێو قاو).
– توولی تەڕ، توولبەندی تەڕ، ناڵەی گەوهەر، شمشاڵی کەڕ: (هەورە بروسکە).
– مریشکێکم هەیە زەنگی زەنگی، هێلکە ئەکا پڕ بە چنگی: (مەشکە).
– بنی نییە، سەری شاخە، ناوی ئاسنی پڕ لە زاخە: (خەنجەر).
– ئەفرێ باڵی نییە، سەری ئەبرێ خوێنی نییە: (گەڵای درەخت).
– شتێك هەیە بوزرگی، سوری زلتر لە ورگی: (مێروولە).
– وردە وەك هەرزن، بەرزە وەك حوشتر، شیرینە وەك شەکر: (داری توو).
– ئەگەر ئاقڵی ئەقڵت تەواوە، چی گۆشتی لەدەر، پێستی لە ناوە: (سیقەتۆرە).
– ئەگرمێنێ وەك هەور، فرێ ئەدا سڵی چەور: (مەشکە).
– گا ڕەشی مام وەسمان، دەنگی ئەگاتە ئاسمان: (تفەنگ).
– چەوتو چێڵو چەمییە، وشكو ڕەقو بێ دییە: (گۆچان).
– زەردی زەعفەران، نام لە ئێستران، بردم بۆ شاری کافران: (توووتن).
– کونە گردەڵەی نۆمەن باریەتی، ڕوحدارنییەو ڕوحدار سواریەتی: (ناڵ).
– لە دار ئەکرێ، لە بەرد ئەکرێ، وەکو ئەسپ زین ئەکرێ: (پرد).
– لە دوور دێ، لە نوور دێ، قەڵەمو کاغەزی سوور دێ: (هەورە بروسکە).
– قۆزەلەیەکم هەیە قرمزی، کونی نەبوو ئاوی دزی: (شووتی).
– ژنی سك پڕ، سێبەری نییە: (مانگ).
– لە دوورەوە دێ دەمی بۆ ئەکەیتەوە: (خواردن).
– ئەسپی تۆپیو جۆ ئەخوا: (ئاش).
– کێشی سووك، نرخی گران: (زێڕ).
– مارێك لەناو حەوزێکایە، گوڵێکی بەدەمەوەیە، مارەکە ئاوەکە ئەخوا، گوڵەکەش مارەکە ئەخوا: (فانۆس).
– قازیلەییەك چاو: (سوژن).
– نە شیرە نە شەکرە، بەبێ هەوێن دەمەیێت: (سەهۆڵ).
– زەوی سپیو تۆوی ڕەش: (کاغەزو نووسین).
– هەر جێیە گا سووری لێ بنوێ، گیای لێ سەوز نابێ: (ئاگر).
– لە پێناو خەڵکی خۆی ئەسووتێنێ: (مۆم).
– ئەیدەم بەدارا نادرێ، ئەیدەم بە بەردا نادرێ، ئەیدەم بە ئاوا ئەدرێ: (کاغەز).
– تانجی زەردی زنجیرە لە گوێ، سەیران ئەکا لە دەوری دێ: (زەردەواڵە).
– تەڵەم ئاوە، زیتەم چێوە، نێچیر ڕای کرد، سەگ بووە پێوە: (مووساو فیرعەون).
– تێڵای تاشراو، وەستا نەدیو، کەوای دووراو خەیات نەدیو: (مارو کاژی مار).
– چوومە سەر هەردێ، روانیمە زەردێ، دارێ بە چەپۆك بەربووەتە بەردێ: (ئاش).
– حەوت باڵو سەرێ دایم بەدەوە
دورو جەواهێر مەکانی ئەوە
زەردی خۆرئاوا لێی بەئەندێشە
حەکاك ئەو کەسە ئەزانی چێشە: (ماسی).

*** یارییە کوردەوارییەکان:**

**هەردەوێل کاکەیی**

*** شەقان (شەقێن):**

ئەم یارییە بەدارو گۆ مێردمندالآن و لاوان لەئاواییەکاندا سازی دەدەن، لەچەشنی گۆڵ دوو بەردی زل یان هەرشتێکی دیکە بەرامبەر یەك دادەنێن و پێی دەڵێن (حاڕ)، یاریزانەکان دەبنە دوو بەشەوە، دەبێ ژمارەیان یەکسان بێ، ئینجا دەست بە یاری کردن دەکەن، هەرکە لەلای خۆیەوە دەیەوێ بە دار دەستەکەی خۆیەوە (حاڕ) بکات، واتە گۆکە لەئارای (حاڕ) ەکەوە تێپەڕ بکات، دەقاو دەق لەشێوەی یاریی تۆپی پێدایە، بەلآم ئەمیان بە کاشۆو[1] گۆیە[2]، هەر یاریزانێکیش لەحەوا لەگۆکەیداو بیگەڕێنێتەوە، دەڵێ لەحەوا قۆزتمەوە، جا زۆر کەس لەم یاریدا تووشی ئێش و ئازار دەبێت، تەنانەت سەرو دەست و پێیشی تێدا شکاوە، ئەوەی ڕاستی بێ لەم یارییەدا بە مندالی گۆ لەنێو تێوڵی دامو بریندارى کردم و یەك هەفتە لەبن جێگا کەوتم و هەرگیز ئازارەکەیم لەیاد ناچێت.

*** فری فری پارستاری فری:**

ئەم یارییە لەنێوانی (٤-١٤) مندال و مێردمندالدا ساز دەکرێت، یەکێکیان دەبێتە سەردا، ئەوانی دیکەیش هەر هەموویان بەرامبەر بە یەك دادەنیشن، دەستی ڕاستەیان دەقورچێنن و پەنجەی دۆشاو مژەیان دەنێنە سەر ئەرزو بە ووریاییەوە خۆیان ئامادە دەکەن، سەردارەکەیان هەرجارە بە فری فری بە پەلە ناوی باڵندەیەك دێنێ و ئەوانیش گورج دەست بەرز دەکەنەوە، بۆ نموونە: (فری فری پاستاری فری، فری فری قەل فری، فری فری کۆتر فری)، لەپڕ ناوی شتێك دێنێ کە باڵندە نەبێ و نەفری بێ وەکو (فری فری شووتی فری) جا هەر مندالێ دەستی بەرز کردەوە ئەوانی دیکە لێی دەکەن بە هەراو گەمەی پێدەکەن و لەیارییەکەیشدا دەریدەکەن. هەندێ جار سەردارەکە بۆ سەر لێ شێواندنی یاریزانەکان ناوی باڵندەیەك و شتێك دێنێ کە ناویان لەیەکەوە نزیك بێت وەکو: (فری فری کەو فری، فری فری کەر فری، فری فری کۆتر فری، فری فری کوتەرە فری، فری فری لەقلەق فری، فری فری تەقتەق فری، فری فری باڵدار فری، فری فری مار فری، فری فری کەڵەشێر فری، فری فری شێر فری) لەئەنجامدا هەر هەموویان لەیارییەکە دەردەچن و دووبارەو سێ بارەو چوار بارەی دەکەنەوە..هتد. دواتر بەوجۆرە یاری دەکەن تا ئارەزوویان لێ بێت.

*** نانەرەقە، پشتەتەقە:**

ئەم یارییە بەزۆری هی مندالآنە بە تایبەتیش هی (کچ)، دوو مندال پشتی خۆیان بەیەکەوە دەنووسێنن و قۆڵیشیان لەقۆڵییەکتری هەڵدەکێشن بە نۆرە یەکتری بە کۆڵ بەرز دەکەنەوەو یەکێکیان دەڵێ نانە ڕەقە، ئەوی دیکەیشیان دەڵێ پشتە تەقە، یارییەکە بەو جۆرە بەردەوام دەبێت تا وەرس و ماندوو دەبن. ئەم یارییە لەهەندێ ناوچەدا پێی دەڵێن: (سابوونە ڕەقە).

*** قەرە قەرە (قەرە قەرێ):**

قەرە قەرە یارییەکی فۆلکلۆرییە لەناوچەی کەرکوك و تێکرای گەرمیاندا باوەو بەم جۆرەش ساز دەدرا:

ئەم یارییە بەزۆری لەبەر تریفەی شەوانی مانگە شەوی هاوینان ئەنجام دەدرێت، کۆمەڵێ لاو (٢٠-٤٠) کەس کۆدەبنەوەو دەبنە دوو بەشەوە، بە مەرجێ وەکو یەك بن و لایەکیان لەوی دیکە نەزیادو نەیش کەم بێت، واتە یەکسان بن، لەپێشا بڕیار دەدەن یارییەکەیان لەسەر چی ساز بدەن؟

وەکو: گوێز، هەنجیرە وشکە، مێوژ، نوقل، چوکلێت، یان هەر شتێکی دیکە، خۆیان لەسەری بڕیار دەدەن، ئەمە تەنیا لەبەر ئەوەیە تا یاریزانەکان لەیارییەکەدا کەم تەرخەم نەبن و بە جۆش و خرۆشەوە یاری بکەن. دواتر تەرو وشك دەکەن (تیرو پشك)، ئینجا بەشێکیان لەنێو ئاواییدا خۆیان لەپەنایەکدا حەشار دەدەن، یەکێ لەو تیپەکەی دیکە بە ناوی (قەرە) وە دار دەستێکی ها بە دەستەوەو کۆلآن بە کۆلآن بە دوایاندا دەگەڕێت و سەر بە هەموو کون و کەلەبەرێکدا دەکات یەکێکیش لەو گرووپەی کە خۆیان شاردووەتەوە بە گارامێکەوە لەتەکیدایەو بگاتە هەر شوێنێك وەکو بانگەواز هاوار دەکاو دەڵێ: (قەرە هات، قەرە وا لەفلآنە شوێندایە)، بۆ ئەوەی یاوەرەکانی فریای خۆیان بکەون و خۆیان لەپێش چاوی قەرەدا ون بکەن، هەر کاتێکیش ئەوانی دۆزییەوە، ئەوانە بە دۆڕاو دەژمێردرێن و بۆ گرووپی قەرەیش خاڵێك تۆمار دەکرێت، جا زۆرجار بۆ ماوەی دەمژمێرێك یان زیاتر قەرە ئەو تیپە نادۆزێتەوەو هەر بە دوایاندا دەگەڕێت، واز ناهێنێ تا دەیاندۆزێتەوە. ئینجا دووبارە هەر هەموویان یەك دەگرنەوەو ئەو گرووپەکەی دیکە خۆیان دەکەن بە نێوی ئاواییداو ئەمان ئەمان یەکێ وریای گورج و گۆڵ بە ناوی (قەرە) تەرخان دەکەن و بە دوایاندا دەگەڕێت و بەو جۆرە یارییەکە دەست پێدەکاتەوە، لەئەنجامدا لایەنە دۆڕاوەکە ئەو شتە دەکڕن کە لەپێشا بڕیاریان لەسەر داوەو پێکەوە دەیخۆن.

*** قولان:**

یارییەکی فۆلکلۆری کوردییە، تایبەتمەندە بە مێردمندال و لاوان و پیاوان، بەزۆری بە هاوینان و پایزان و بەهاران ساز دەدرێت پێشەکی کۆمەڵێ کۆدەبنەوەو دەبنە دوو بەشەوە، بە مەرجێ هاوتەمەنییەك بن، خۆیان ڕووت دەکەنەوە تەنیا دەرپێیەکی کورت دەپۆشن، ئینجا لەدوو لاوە (حاڕ)[3] دادەنێن، یەکێ دەبێتە زاوا، یەکێکی دیکەیش دەبێتە برا زاوا، زاواکە شەڕ ناکات هەوڵ دەدا لەئارای حاڕەکەوە تێپەڕ بێت و ببێ بە زاوا، برا زاوایش هەمیشە پاسی حاڕەکە دەکا بۆ ئەوەی نەهێڵێ زاوا ببێ بە زاوا، ئینجا یاریزانەکان پێی چەپیان لەدواوە بەرز دەکەنەوەو بە دەستی ڕاستیشیان پەنجە کەلەی ئەو پێیەیان دەگرن و بە هەنگڵە شەلە ڕوو بەڕوویەکتر دەبنەوەو هەرکە لای خۆیەوە دەیەوێ

بە دەستی چەپو بەشان یەکێ لەوانەی دیکە برمێنێ یان دەستی لەپەنجەی بەرداو پێی چەپی بکەوێتە زەوی، چونکە رێبازی یارییەکە بەو جۆرەیە، ئەوانی دیکە دەست لەیاری هەڵناگرن تا لایەکیان ئەو لاکەی دیکە ببەزێنێتو دەرفەت بۆ زاوا هەڵکەوێ لەئارای حارەکەوە تێپەربێو ببێت بە زاوا، لەم حاڵەتەدا خاڵێك بۆ دەستەی براوەکە دەنووسرێتو هەمیسان یارییەکە دووبارە دەکەنەوە، ئیتر بەو جۆرە یاری دەکەن تا شەکەتو ماندوو دەبن.

*** مەلا گون تەقێنە:**

به زۆری بە شەوانی هاوینو پایزدا سازدەدرێت، ژمارەی یاریزانەکان لە (١٢-٢٠) کەس تێناپەرێت، هەر هەموویان بە چوارمشقی لەشێوازی پاڵەپەستۆ بە تەنیشت یەکەوە دادەنیشن، هەر هەموویان دەستیان لەژێر رانیان یان لەنێو داوانیان دادەنێن، یەکێ لەیاریزانەکان بەردی بچکۆلە بە نهێنی دەدات بە دەستی یاریزانێکەوەو یەکێك هەڵدەبژێرن هەڵسێت تابەردەکان بدۆزێتەوە، بۆ نموونە دەڵێ لای سێیەم کەسە کەچی لای ئەو نییەو بەردەکان لاییەکێکی دیکەوە لێك دەدرێنو دەنگیان دێت، جا یەکسەر دوای ئەوەی بەردەکانی لەیەکدا بە نهێنی گورج دەیدات بە یاریزانێکی دیکە، بۆ جارێکی دیکە یاریزانە راوەستاوەکە بۆ نموونە دەڵێت لای دەیەمیانە. بەڵام هەمیسان لەشوێنێکی دیکەوە بەردەکان تەقەقەیان لێوە دێت بەم جۆرە بەردەکان لەیاریزانێکەوە دەگۆردرێن بۆ یاریزانێکی دیکەو یارییەکە بەردەوام دەبێت تا بەردەکان دەدۆزێتەوە. ئەگەر لای هەرکامیان دۆزرایەوە دەبێت ئەو کەسە هەستێتو بەردەکان بدۆزێتەوە، جا ئەوەی درەنگ بەردەکان بدۆزێتەوە بە هەموویانەوە گەمەی پێدەکەنو لێیشی دەدەن.

*** مشتو کوشت:**

ئەم یارییە فۆلکلۆرییە لەوەرزی بەهاراندا لەنێو سەوزاییو جێگای نەرماییدا ساز دەدرێت، تایبەتە بە نێرینەوە، مێرد منداڵو لاوان پێی هەڵدەستن.

بۆ نموونە ئەگەر یاریزانەکان ژمارەیان (١٠) بوو دەبنە دوو گروپەوە، لەپاش ئەنجامدانی تەرو وشك، یان (هەرێ بە هەرێ) ئەنجامدەدەن کە سەرۆکی تیپەکان یەکێکیان دەڵێ: من مانگم دەوێ ئەوی دیکە دەڵێ منیش خۆر، ئینجا دەڵێن: کێ خۆری دەوێو کێ مانگ، هەر یەکە لەمانگو رۆژ جەماعەتی خۆی جودا دەکاتەوە. دواتر یارییەکە بەم جۆرە ئەنجام دەدەن: گروپێکیان دادەنیشنو بە گامۆلکێ بەرگری لەخۆیان دەکەن، گروپی دووەم بە پێوە دەوەستنو بە دەوری ئەواندا دەخولێنەوەو بە مستەکۆلە لەپشتی ئەوان دەدەن، ئەوانیش هەولدەدەن بە قاچیان لەیەکێ لەوانە بدەن بە مەرجێ نابێ دەستییان لەزەویدا هەڵگرن، لەهەر یەکێ لەو یاریزانانە بدەن یەکسەر ئەوان دێنە جێگای ئەمانو ئینجا ئەوان هەولدەدەن بەمشت لەتریقەی پشت یان ناوشانی ئەمان بدەن، ئیتر بەو جۆرە یارییەکە سەر لەنوێ دەست پێدەکاتەوەو لەسەری بەردەوام دەبن تا ئارەزوویان لێ بێت.

*** مزراحێن:**

بە زۆری لەنێوان دووکەسدا لەهەر دەمێکدا ئەنجام دەدرێت، لەپێشا هەر یەکە مزراحەکەی خۆی کە پەتێکی بچووکی پێوە پێچراوە فرێدەداتە سەر زەوی، هینی هەرکامیان لەوی دیکە زیاتر سووری خواردو درەنگ تر کەوت ئەو کەسە براوەیە، ئەوی دیکەیان مزراحەکەی خۆی دەدەنێو ئەم بە مزراحەکەی لێی دەدا، ئەگەر هاتو بەری نەکەوت یان لەدەستی کەوت بە خرچاو دەژمێردرێت، دەبێ ئینجا ئەم مزراحەکەی دابنێو ئەویان لێی بدات ئیتر بەو جۆرە یاری دەکەن.

*** گولان (هەڵماتێن):**

ئەم یارییە لەوەرزی بەهارانو پایزاندا لەنێوانی (٢-٧) یاریزان بە هەڵماتێن ساز دەدرێت، ئەگەر یاریزانەکان دوان بوون لەپێشا دوو چاڵی بچووك دەکەنو پێی دەڵێن (تککە)، ئینجا بە ئەندازەی دوو مەترێك هێڵێك دەکێشن بۆ ئەوەی بۆیان ببێ بە نیشانە تا لەوێوە بەرەو چاڵەکان یاری بکەن، هەر یەکەیان تککەی خۆی هەیە. دواتر دەست بە یاری کردن دەکەن، یەکەمیان بە هەڵماتێن چاڵی خۆی دەخوا، واتا هەڵماتێنەکەی بەرەو چاڵەکەی خۆی دەهاوێ، دواتر لەهەڵماتێنی بەرامبەرەکەی دەدا، ئیتر بەو جۆرە لەیارییەکە بەردەوام دەبن تا خۆیان ئارەزوویان لێ بێت.

*** قوتەران:**

ئەم یارییە دوو یاریزان کور بن یان کچ بە شەوانی زستانو پایزاندا پێی هەڵدەستن، یارییەکە بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێت:

١. نۆیی:

یاریزانەکان هەریەکەیان نۆ بەردی بچووکی هەیە، لەپێشا لەجیاتی خەتو شێر قاچەکان هەڵدەدەنە سەر پشتی دەستیان، ئینجا دەبێ هەڵیدەنو بیانگرنەوە هەر کامیان بەردی زۆرتر گرتەوە ئەوە بە براوە دەژمێردرێت دەست بە یاری کردن دەکات، دواتر بەردەکانی خۆی هینەکان ئەو تێکەڵاو دەکاتو لەنێو مشتێکیدا دایدەنێو گشتی هەڵدەداو بە پشت دەست دەیانگرێتەوە، ئینجا بەردەکان هەر جارەی سێ دانەیان فرێدەداتە نێو دەستی چەپی. بەماڵی خۆی حسێب دەکرێت، لەپاشاندا یەك بەردێکی لەدەستیدا دەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بەردەکانی سەر زەوی پێ هەڵبگرێت، بەم جۆرە هەڵیاندەگرێت: بەردەکەی نێو دەستی بەرەو ئاسمان هەڵدەداو بە زووییەکێ لەبەردەکانی سەر زەوی هەڵدەگرێو دەبێ لەهەمان کاتدا هەڵدراوەکەش بگرێتەوە، بەو جۆرە دەبێ هەموو بەردەکان هەڵگرێ بە بێ ئەوەی دەستی بەر ئەو بەردەکانی دیکە بکەوێت، ئەگەر دەستییەکێ لەو بەردانەی سەر زەوی کەوت یان ئەوەی حەوای نەگرتەوە بە دۆراو دەژمێردرێت، ئینجا ئەوەی دیکە یاری دەکات.

٢. پێنجی:

ئەمەیان لە (٥) بەرد پێك هاتووە، لەنێوانی (٢-٤) كەس ئەنجام دەدرێت.

پێشەكی یاریزانەكە بەردێك هەڵدەگرێو (٤)دانەشە. لەزەویدا بڵاودەكاتەوە، یەكەمجار بەردەكەی پێشووی هەڵدەداو یەك دانە هەڵدەگرێو هەڵدراوەكەیش دەگرێتەوە، ئەو بەردەی لەزەوی هەڵدەگرێ لەنێو دەستی چەپی دەیپارێزێ، بەو شێوازە یەكە بە یەكەی بەردەكان هەڵدەگرێ، دواتر هەر هەموو بەردەكان لەزەویدا بڵاودەكاتەوەو یەكێكیان هەڵدەگرێ، دەبێ ئەمجارەیان بەردەكان بە دوو دوو هەڵبگرێت، پێنجەمیان پێی دەڵێن (دیزە) هەمیسان وەكو جاریەكەم لەئەرز بڵاویان دەكاتەوە، دەبێ ئەمجارەیان یەك یەك هەر پێنجیان هەڵگرێ، بە مەرجێ دەبێ هەر هەمووشیان لەنێو دەستی راستیدا بمێنێتەوە، دواتر (خالۆ) دەست پێدەكات، یاریزانەكە دەستی چەپی بە شێوەی قولانج دادەنێو هەر هەموو بەردەكان فرێدەداتە پێش قولانجەكە، بە بەرامبەرەكەی دەڵێ كام لەم بەردانە دەكەی بە (خالۆت)؟، ئەویش یەكێكیان هەڵدەبژێرێت، یاریزانەكە یەكێ لەبەردەكان هەڵدەگرێو هەمیسان هەڵیدەداو یەك بە یەك ئەو بەردانە لەقولانجەكەوە تێپەر دەكات بەبێ ئەوەی دەستی بەر خالۆو ئەو بەردەكانی دیكە بكەوێت، دواتریش خالۆیش دەرباز دەكات، لەئەنجامیشدا ئەو بەردەی كە هەمیشە هەڵیدەدا ئەویش دەرباز دەكاو بە دەستی راستیشی بۆ خۆشی لە قولانجەكە دەداو دەست بەرز دەكاتەوە، بەم جۆرە یارییەكە كۆتایی پێدێت.

*** كەڵەكە برێ (قوتكە برێ):**

ئەم یارییە مێردمنداڵانو لاوان پێی هەڵدەستن، بە شەوانی مانگە شەوو بەرۆژ ئەنجام دەدرێت، لەدوو گروپ پێك دێت، شوێنێكی نەرمو پاكو خاوێن بۆ یاری كردن هەڵدەبژێرن، چەند بەردێكی گەورە بە سەریەكدا لەجێگا نەرمەكە دادەنێنو دەیكەن بە (قوتكە). ئینجا یاریزانەكانی هەردوو گروپەكە (تەرو وشك) دەكەن، لەئەنجامدا لایەكیان لەنزیك قوتكەكە رادەوەستنو یەكێكیشیان پارێزگاری لێ دەكات، ئەوانی دیكەش هەوڵ دەدەن دەستیان بەر ئەو قوتكەیە بكەوێو بیروخێنن، جا ئەگەر ئەو یاریزانەی كە پارێزەری قوتكەكەیە دەستی بەر لەشی هەر یاریزانێكی گروپەكەی دیكە كەوت، یەكسەر ئەمان بەردەكان بەجێ دێڵنو ئەوانی دیكە دێنە جێگایانو یارییەكە هەر بەو جۆرە بەردەوام دەبێت تا خۆیان ئارەزوویان لێ بێت، بەڵام ئەگەر هاتو یاریزانێك بەردە كەڵەكە كراوەكەی رووخاندو ئەوەی پارێزگاری دەكات دەستی بەری نەكەوت ئەوە بە خاڵ بۆیان حسێب دەكرێت.

*** كڵاوێن:**

كڵاوێن، یارییەكی فۆلكلۆری دێر زەمانی رەسەنە، ئەم یارییە لەنێوانی (٦-٢٠) مێرد منداڵ یان گەورە دەكرێ، بە زۆری بە شەوانی رەمەزانو زستانو پاییزاندا لەدیوەخانو ماڵەكاندا كۆڕی شەونشینی پێ گەرم دەكەن، یاریزانەكان دەبنە دوو تاقمەوە، نۆ كڵاو دەمەو خوار لەپێشی خۆیاندا دادەنێن، هەر تاقمێكیان یەكێكیان دەبێتە سەرداریان لەپێشدا بریار دەدەن لەسەر چی یاری بكەن، وەكو گوێز، یان هەر میوەیەك یان خواردەمەنییەك، دواتر بەم شێوازە دەست بە یاری كردن دەكەن: سەرەتا دوو كڵاو دادەنێن، سەرداری تاقمێكیان ئەنگوستیلەیەك لەژێر یەكێ لەو دوو كڵاوە دەشارێتەوە، یەكێكیان گوڵەو ئەوی دیكەیان فت، ئەو تاقمەكەی دیكە هەر كڵاوێكیان هەڵبگرن بە ناوی (گوڵ)ەوە تێیدا بوو، ئەو كاتە ئەنگوستیلەكە دەكەوێتە دەستیانو ئەمان لەژێر ئەو نۆ كڵاوەدا دەیشارنەوە، بە پێچەوانەیشەوە ئەنگەستیلەكە دەكەوێتە دەستی تیپی بەرامبەرەكەیان. كەیاری دەستی پێكردو ئەنگوستیلەكە هەشاردرا، لەو نۆ كڵاوە دوانیان گوڵەو حەوتیان فت، واتە دەبێ بە وریایی و زیرەكی و مەزەندەی ئەو سەردارەو بە هاریكاری یاوەرەكانی تەنیا لەژێر دوو كڵاویان بیدۆزێتەوە، ئەگینا دۆراندویەتی، ئەگەر هاتوو كڵاوێكی هەڵگرتو وتی (فت)و ئەنگوستیلەكە لەژێریدا دەرچوو بە دۆراو دەژمێردرێنو بە گوێرەی ئەو كڵاوانەی لەزەویدا ماون خاڵ بۆ گروپی بەرامبەریان تۆمار دەكرێت، هەمیسان سەر لەنوێ یارییەكە دووبارە دەكەنەوەو بەو جۆرە لەسەری بەردەوام دەبن تالایەكیان دەدۆرێت، هەندێ جاریش یاریزانەكانی هەردوو گروپەكە لەیارییەكەدا زۆر شارەزان بۆیە كەسیان نادۆرێت، یارییەكان دەهێڵنەوە بۆ رۆژی داهاتوو.

*** كاڵە مشتێ (كاڵە مستێ):**

ئەم یارییە تایبەتە بە نێرینە، لاوانو پیاوان بە شەوانی زستانو پاییزو رەمەزاندا ساز دەدرێت، یاریزانەكان دەبنە دوو بەشەوە دەبێ ژمارەی گروپەكان لەئاستییەكدا بن، هەردوو لایان بەرامبەر یەكتر دادەنیشن، لەپێشدا (تەرو وشك) دەكەن، یەكێ لەگروپە براوەكە ئەموستیلەیەك دێنێو بە نهێنی لەنێو دەستییەكێ لەگروپەكەی خۆیدا دەشارێتەوە، ئەوانیش توند دەستیان دەنوقێننو لەپێشی خۆیان رایدەگرن، ئەو گروپەكەی دیش یاریزانێكی شارەزا هەڵدەبژێرن تابتوانێ ئەموستیلەكەیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەویش هەڵدەستێ بە چرچاوودەستیاندا دەروانێو مەزەندەی لێدەدات، هەنێ جار پرس بە هاورێكانیشی دەكات جا ئەگەر وتی گوڵو تیایدا بوو بە براوە دەژمێردرێتو ئەموستیلەكە دەكەوێتە دەستی خۆیان، یان وتی (فت) و ئەموستیلەكەی تێدابوو بە دۆراو دەژمێردرێتو بە گوێرەی دەستە نووقاوەكان خاڵیان لەسەر دەنووسرێت، ئەگەر وتیشی فتو لەدەستیدا نەبوو ئیتر ئەو كەسە دەستی دەكاتەوە، ئەم یارییە زۆر لەیاری كڵاوێن دەچێت.

*** گیز گیز باریكان:**

ئەم یارییە فۆلكلۆرییە بەم جۆرە ئەنجام دەدرێت: برێ منداڵ لەكچو كور كۆدەبنەوە، دوانیان بە پێوە رادەوەستنو ئەوانی دیكە بە چوار مشقی دادەنیشنو هەردوو

پەنجەکەڵەی قاچی خۆیان دەگرن، ئەوانە کە وەستاون گۆرانییەکە دەڵێن، دانیشتووان لەگەڵ گۆرانییەکە لەشیان بادەدەن، لەو لاشەوە کۆمەڵێ بەردو کەستەك دادەمێنن و ناوی دەنێن خواردەمەنی وەکو: پلاو، شلە، فروجاو، یاپراخ، خورما بە رۆن..هتد، ئینجا یەکێ لەوانەی راوەستاون دێت یەك یەك بە مشت لەپشتی هەموویان دەدا، ئەگەر هی هەر کەسێکیان زیاتر دەنگی لێوە هات دەڵێت ئەمیان ترشاوە، جا لەگەڵ هاوەڵەکەیدا بە دوو قۆڵی هەڵیدەگرن و دەیبەنە لای کۆمەڵە بەردەکان، بە مەرجێ دەبێ پەرێ کراسەکەی بە ددانەوە بگرێت و دەستیشی لەپەنجەکانی بەرنەدات ئەگینا بەنەخۆینی دایك و باوکی دەبچرێت، ئەو لەوێ بەجێ دێلن و دووبارە هەردووکیان دەگەرێنەوە لای منالەکان و دەست بە وتنی گۆرانییەکە دەکەن و هەمیسان یەك یەك بە مشت لەپشتیان دەدەن تا هەموویان بەو جۆرەی پێشوو دەبەنە لای بەردو کەستەگەکان و دەڵێن: کولیامە، برشیامە لەناو خواغ برشیامە دواتر هەر بەردێك تفێکی بە سەردا دەکەن و ناوی چێشتێکی لێ دەنێن و پێشکەش ئەو کەسەی دەکەن وا ئارەزووی لەخواردنی ئەو جۆرە چێشتەیە، لەپاشاندا پێکەوە بەبێ هیچ نان دەخۆن، ئەمەش دەقی گۆرانییەکەیە:

گیز گیز باریکان،
شەواڵەکەی ئالیخان
ئالیخان ئەڵێ من موشم

*** گورز بن مێخکێ[٤]:**

ئەم یارییە کوردییە بە زۆری لەوەرزی بەهاردا لەشوێنێکی سەوزایی یان نەرمایی شێداردا ئەنجام دەدرێت، پێشەکی مێخێك لەزەویدا دادەکوتن و گوریسێکی پێوە دەبەستن، یەکێك سەری گوریسەکە دەگرێ و بە درێژایی گوریسەکە ناوی لێدەنێن شار، ئەوانی دیکە هەر یەکەیان گورزێکی[٥] ها بە دەستەوەو بە دەوریدا دەخولێتەوەو بە گورزەکانیان بەردەبن لێی و لەپشتی دەدەن، ئەویش بە وریایی و هەموو توانایەکییەوە بەرگری لەخۆی دەکاو هەوڵدەدا پێی بەر یەکێکیان بکەوێ تا خۆی لەئازاری گورز رزگار بکات، بە مەرجێ نابێ بە هیچ جۆرێك شارەکە ببەزێنێت کە بە ئەندازەی درێژی گوریسەکەیە، پێی بەر هەر کەسێك بکەوێت ئەو کەسە گورج بەبێ دەنگ جێگای دەگرێتەوەو یاریزانەکانیش بە گورزەکانیانەوە هەر وەکو جاری پێشوو بەدەوریدا دەسوورێن و هەرکە لەئاستی خۆیەوە هەوڵ دەدا گورزی قورسی خۆی بوەستێنێت، بە تایبەتی ئەوەی لەپێشی ئەمدا لەنێوی شارەکەدا بووە، دەیەوێ تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە، جا ئەگەر ئەوەی لەنێوی شارەکە دایە نا شارەزاو فەقیرۆکەو لەش خاوو سست بوایە یاریزانەکان بە دەرفەتیان دەزانی و بە خەستی بەر دەبوون لێی و زۆریان دەکوتا، تا خۆی رزگار دەکرد گورزی چاکی دەخوارد.

*** ئاشە تەنوورە (تەنویرە قۆیمە):**

ئەم یارییە هەر لەدێر زەمانەوە لەنێو کوردا باو بووە، تایبەتە بە لاوانی نێرینە، لەشەوانی مانگەشەودا ساز دەدرێت، لەدوو بر یان تیپ پێك دێت و ژمارەی هەردوو لایان نزیکەی (١٦-٢٠) کەسە، بە مەرجێ دەبێ یاریزانەکانی هەر دوو تیپەکە یەکسان بێت، ئینجا دێن تەرو وشك دەکەن (تیرو پشك) بۆ ئەوەی لایەکیان بچنە نێو شار، هەر لایەکیان چووە نێو شار یەکێکی گورج و گۆڵ و وریاو خێرا هەڵدەبژێرن و دەیکەن بە باوکی خۆیان تا پارێزگارییان بکات لەتیپەکەی دەرەوەی شارەکە، یاریزانەکانی دەرەوەی شارەکەش لەهەموو لایەکەوە گەمارۆی ئەوانەی نێوشارەکە دەدەن و بە هەموو توانایەکەوە هەوڵ دەدەن سواری پشتیان بن و لێیان بدەن، جا ئەگەر لەهەر کاتێکدا ئەو یاریزانەی لەنێو شارەکەدا کراوەتە باوك دەستی گەیشتە هەر یاریزانێکی دەرەوەی نێو شارەکە، دەستبەجێ ئەمان لەشار دەردەچن و ئەو گروپەکەی دیکە دێنە جێگایان، دواتر بەو جۆرە یارییەکە سەر لەنوێ دەست پێدەکاتەوە تا ماندوو دەبن.

*** قاپان[٦]:**

ئەم یارییە زووتر لەنێوانی دوو یاریزان ئەنجام دەدرا، لەپێشا یەکەمیان دەڵێ: (وا من قاپەکە[٧]هەڵدەدەم، بووك یان جك؟)[٨] ئەویش بە ئارەزووی خۆییەکێکیان هەڵدەبژێرێت، جا ئەگەر هاتوو بەو جۆرە کەوت کە ئەو وتی ئەوە قاپێك دەباتەوە، بە پێچەوانەوە قاپێك دەدۆرێت، یان ئەوەی قاپەکە بە پەلە پیتکە هەڵدەدا دەبێ هەمیشە لەسەر ئەو لایەدا بکەوێ کە پێی دەڵێن (کەر)[٩] ئەگەر بەو شێوازە بوو ئەوا قاپێ لەبەرامبەرەکەی دەباتەوە، بە پێچەوانەوە لەسەر لای (شەك)[١٠]دا وەستا ئەوە قاپێك دەدۆرێت. جا هەنێ یاریزان هەبوون قاپێکیان لەلا کەرەکەوە بە جوانی لووس دەکردو پێیان دەوت (تویش)[١١] بۆ ئەوەی بەزوویی بەو لایەدا بوەستێت، بۆیە کورد وتویەتی: (بییەنە قاپ تویش)[١٢]. جا یاریزانی وا هەبووە بە دەیان قاپی هەبووەو لەتوورەکەیەکدا پاراستویەتی، هەیش بووە قاپەکانی هەر بۆ زەوق و جوانی رەنگ کردووە.

*** کڵاو رفێنە:**

ئەم یارییە، یارییەکی فۆلکلۆری زۆر کۆنی کوردییە، تایبەتە بە مێردمنداڵان و لاوانی نێرینە، لەنێوانی (٦-٢٠) کەس لەبەهاران و زستان و پایزاندا ساز دەدرێت، یاریزانەکان دەبنە دوو بەشەوە، بەشێکیان لەسەر زەوی بە چنجك دادەنیشن و هەر یەکەیان کڵاوێکی لەسەردایە، ئەو تاقمەکەی دیکەش بەپێوە دەوەستن و بە دەوری ئەواندا دەسورێن، بە نیازی ئەوەی بتوانن زەفەریان پێ بەرن و کڵاوێکیان لێ برفێنن، ئەوانیش هەر هەموویان پشتیان لەیەکتر کردووەو هەر یەکەیان بە پێی خۆی و یاوەرانی دەکات، بۆ ئەوەی نەتوانن کڵاویان لێ بفرێنن، جا پێی هەر یەکێ لەمانەی کە دانیشتوون بەر هەر یەك لەوانەی بە پێوەن بکەوێت، دانیشتووان هەڵدەستن و ئەوانی دیکە دێن لەشوێنی ئەماندا دادەنیشن و کڵاوەکانیشیان لەسەر دەنێن، ئەگەر هاتوو یەکێ کڵاو یەکێ لەو یاریزانانەی رفاند یەکسەر بەرەو ئەو شوێنە بەغار دەیبا کە لەپێشدا دەستنیشانیان

كردووەو نزیكەی سێسەد مەترێك لەشوێنی یارییەكەوە دوورە، بە زۆری نیشانەكەیان دیوارێكەو پێی دەوترێ (حەج)، جا خاوەن كڵاوو تاقمەكەی بە دوایدا رادەكەن بۆ ئەوەی بیگرن و كڵاوەكەی لێ بسێننەوە پێش ئەوەی بگا بە (حەج)، ئەگەر لێیان سەندەوە، ئەوە هەمیسان دێن یارییەكە دووبارە دەكەنەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە گەیاندیە حەج بە براوە دەژمێردرێن و دەبێ تاقمی دۆراو ئەوان بنێتە سەر تلیقانەو حەجەكەوە بیانهێنن بۆ جێگای یارییەكان، لێرەدا دەبێتە قاقای پێكەنین و هەراو هوریا، یارییەكە بۆ چەندین جار دووبارە دەبێتەوە.

*** كۆتری نامەبەر (زاجل):**

مرۆڤ هەر لەدێر زەمانەوە باڵندەو پەلەوەری بە خێو كردووەو لەگەڵیدا هۆگرو ئاشنا بووەو سوودی لەگۆشت و پەرەكانی بینیوە، یان خەڵكی لەكڕین و فرۆشتنەوەدا لەرووی ئابووری و گوزەرانەوە كەڵكیان لێ وەرگرتوون، یان لەبەر دەنگە خۆش و كاریگەرەكانیان پەروەردەیان كردوون وەكو دەروانین ئێستاش مەردم لەسەر ئەو نەریتە بەردەوامە.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان تەنیا كۆتری نامە بەرە كە لەبەر زیرەكی و وریایی سەرنجی زانایان و پسپۆڕان و خەڵكانی دنیایی ڕاكێشاوە.

كۆتر بازەكان بەتایبەتی هەوادارانی ئەم ڕەگەزە بۆ جوانی و یاری كردن پەروەردەی دەكەن و گرەوی لەسەر دەكەن و لەشوێن و جێگای دوورەوە بەرەڵڵای دەكەن و بە دووری سەدان كیلۆ مەترە دەگەڕێنەوە شوێن و كۆڵانەكەی خۆیان، ئەمە نەریت و یارییەكی فۆلكلۆری زۆر كۆنە لەنێو كوردو هەموو گەلانی دیكەدا بڵاوە. جاران پاشاو پیاوە گەورەكانی جیهان ئەم جۆرە كۆترە ڕەسەنەیان لەجیاتی پۆستەچی بۆ گواستنەوەی نامە بە هەوادا بەكارهێناوە بە تایبەتی نامەو بروسكەی تایبەت و نهێنی كە پەیوەندییان بە جەنگەوە بووە، هەروەها ئەمریكاو فەرەنساو ئەڵمانیا لەكاتی جەنگدا بە كاریان هێناوە بۆیە لەسەردەمی بەعسدا لەساڵی (١٩٩١)ی ز بە دواوە ئەم جۆرە كۆترانە قەدەغە كران لەشوێنە دابراوەكانی كوردستانەوە بگوێزرێنەوە بۆ شارەكانی هەولێرو سلێمانی و دهۆك، وا دیار بوون دەترسان لەوەی نەك بۆ گوێزانەوەی نامەو كاری تایبەت لەلایەن پێشمەرگەو پارتە كوردییەكانەوە بەكاربهێنرێن. بەهەرحاڵ زۆر كەس بیر لەوە دەكاتەوەو لەناخەوە دەپرسێ و دەڵێ: ئاخۆ لەمێشكی ئەم باڵندە نیشتیمان پەروەرەدا چ نهێنییەك یارادارێك هەیە وا لەچەند دەژمێرێكدا بە سەدان كیلۆمەترە دەبڕێت و دێتەوە هێلانە بچووكەكەی خۆی كە لەچەند تەڵە پووشێك پێكی هێناوەو دلسۆزانە كردویە بە نیشتیمانی خۆی؟

زانایان و پسپۆڕانی جیهانی باڵندەكان لەسەر ئەم رایە كۆكن و دەڵێن: (ئەم كۆترە بە ئەمەك و ئێسك سووكە بە زۆری تیشكی خۆر دەكا بە قیبلەنماو بە كاری دێنێ و دەیكا بە رابەرو دێتەوە جێگاكەی)، بۆیە یاریزانە شارەزاكان تەنیا لەو ڕۆژانەدا لەدوورەوە بەرەڵڵایان دەكەن كە ئاسمان سامال بێ و باراناوی و تەپو تۆز نەبێت.

ئەم جۆرە كۆترانە لەسەر دەندوكیان هەندێ گۆشت هەیە لەباڵووكە دەچێت و پێیشیان بێ پەرە، ئەم كۆترانەیش ڕەسەن و نارەسەنیان هەیە، خراپەكانیان زۆرینەیان زین، بێچووی ئەوانەن كە دایكیان یان باوكیان نامە بەرو جووتەكەی كۆتری دیكەیە، بێچووی چلەی هاوین و زستانیش بە ڕەسەن نازانن و بە خێویشیان ناكەن، وا دەزانن سەرماو سۆڵەو گەرمای ئەو كاتانە كار لەمێشكیان دەكاو لەدوا ڕۆژدا لەگرەو دەرناچن و خاوەنەكانیان شەرمەزار دەكەن، هەر كۆترێكی نامە بەر پەل لەڕووی قاچەكانی ڕوابێت بە ڕەسەنی نازانن و بەدوو ڕەگ (زڕ) لەقەڵەمی دەدەن، خاوەنی ئەم كۆترانە جگە لەكۆتری نامەبەر ناهێڵن كۆترەكانیان تێكەڵاوی جۆری دیكە بێت بۆ ئەوەی ڕەسەنایەتییان بپارێزن.

كۆتری نامە بەر لەكوردستان و سەرجەم عێراقدا زیاتر لەجۆرێكی هەیە لەوانە: (ئینگلیزی، ئەڵمانی، میسری، حیبللاوی، هۆڵەندی، بەلجیكی) واتا لەهەر وڵات و شارێكدا ناوێكی تایبەتیان بۆ داناون، وەكو كۆتر بازەكان دەگێڕنەوە چاكترینیان حیبللاوی و ئینگلیزی و ئەلمانییەكەیەتی، ڕەنگیشی زۆرە: (سپی، سوور، زەرد، شین[13] سێتاو[14]، ڕەش، ئاسنینی، بەڵەك)، ئەم ڕەنگانە هەر هەموویان بەلای كۆتر بازەكانەوە باون و پەسەندن، تەنیا بەڵەكەكەیان نەبێت كە لەشاری كەركوكدا زۆر پەسەند نەكراوە چونكە زۆرجار لەتاقیكردنەوەدا دەرنەچوون، هەندێ لەكۆتر بازەكان وای بۆ دەچن گوایە ڕەسەن نین و دایك یان باوكیان لەگەڵ كۆتری دیكەدا جووتكراوە كە لەرەگەزی خۆی نەبووە، یانی دوورەگە بەڵام لەئەوروپادا ئەم ڕەنگەیان هەر وەكو ئەوانی دیكە پەسەندەو لەگرەوی (رایسن) یشدا دەرچوون.

*** مەشق كردن بە كۆتری نامەبەر:**

كۆتربازەكان پێش ئەوەی لەگرەودا بەشداری بكەن لەمانگی تشرینییەكەمەوە تامانگی ئایار لەو ماوەیەدا بۆ ماوەی مانگێك مەشق بە كۆترەكانیان دەكەن بە مەرجێ تەمەنیان لەساڵێك كەمتر نەبێت بۆ ئەوەی لەفڕیندا بەهێزبن و باشتر ئاشنای شوێن و كۆڵانەكەی خۆیان بن، بۆ نموونە ئەگەر هاتو كۆتربازێكی كەركوكی بیەوێ لەتاقیكردنەوەدا كۆترەكەی لە بەغداوە بەرەڵڵا بكات یەكەمجار دەیبات (١٠-١٥كم) دوور كەركوك ڕەهای دەكات، ئینجا ڕۆژی نا ڕۆژێ هەر جارەی (١٥كم)ە تا دەبێتە (١٥٠كم)ە، دواتر هەر جارەی (٥٠) كیلۆمەترێك دووری دەخاتەوە تا دەگاتە شاری بەغدا، لەوێشەوە دەبێ (٢-٣) جاری دیكە ڕەها بكرێت بۆ ئەوەی بە تەواوی ئاشنای ڕێگاو بان بێ و لەهاتنەوەدا دوانەكەوێت، ئینجا ئەو كۆترە ئامادە دەبێت بۆ گرەو بە مەرجێ ئەو كۆترەی مەشقی پێدەكرێت كۆتری ماڵی خاوەنەكەی بێت، چونكە بە بێچوویی فێری هەر شوێنێك بێت ئیتر لەوەو پاش هەر بۆ ئەو جێگایە دەگەڕێتەوە، هەرگیزاو هەرگیز بە گەورەیی ماڵی نابێت، كۆتری نامە بەر خوو ڕەوشتیان هەر وەكو كۆتری كێوی وایەو تەقڵەبازیش نین، بە زۆری سبەینان و عەسران بۆ دان و چوینە كردن دەدەن لەشققەی باڵ و ڕوو لەدەشت و چۆڵەوانی دەكەن، لەگەڕانەوەیشدا لەسەر ماڵ و خانووی دراوسێكاندا ئانشنەوە، یەكسەر دێن و لەجێگاكەی

خۆیان دادەبەزن، ئەگەر هەر کۆترێکیش بەردەوام لەسەر دیوارو خانووی ماڵان بنیشێتەوە، بەخێوی ناکەن‌و لەنێوی دەبەن،هەر لەبەر ئەمەیە منداڵ‌و تواڵ حەزی لێ ناکەن‌و بە خێویشی ناکەن، لەهەموو جیهاندا ئەم جۆرە کۆترە بە کۆتری گەورە پیاوان ناسراوە، هەر ئەوانیش بە خێوی دەکەن‌و رێزی لێدەگرن. کۆتربازەکان دەگێڕنەوە کاتێ بەریتانیا لەساڵی (١٩١٥)ی زایینیدا ئێراقی داگیر کرد لەهەندێ شوێندا سەر بازخانەی ئامادە کرد، جا لەسەر بازخانەی شاری حیللە لەخوارووی ئێراق ئەفسەرێکی بەریتانی چەند کۆترێکی نامەبەری جۆری حیللاوی پەروەردە کرد، لەپاش ماوەیەك هێلکەو بێچوویان کردو زۆرەوە بوون، کە بەمۆڵەت لەرێگەی زەریاوە گەڕایەوە بۆ بەریتانیا لەقەفەزێکدا چەند دانەیەکی لەتەك خۆیدا برد، لەرێگە لەشارۆچکەی (فاو) قەفەزەکە لەدەستی بەربووەوەو کۆترەکان فرین، دواتر کە گەڕایەوە روانی هەر هەموویان گەڕاونەتەوە، بەمە بۆی دەرکەوت ئەم جۆرە کۆترانە رەسەنن، جا ئینگلیزەکان ئەو جۆرەیان کە بەحیللاوی یان بابلی ناسراون بە پارەیەکی زۆر کڕی‌و بۆ وڵاتەکەی خۆیان بردیان، بۆیە دەبینین لەم رۆژگارەدا ئەو جۆرەی بە ئینگلیزی ناسراون ناوبانگیان بە چاکی هەیەو بەلای خەڵکییەوە پەسەندن.

خواردنی ئەم کۆترانە جیاوازن لەگەڵ هی دیکە، دەبێ هەمیشە گەنم‌و هەرزن‌و.. دانی چاکیان بدرێتێ، تەنیا لەو رۆژانەدا خواردنیان کەم دەکرێتەوە کە مەشقیان پێدەکرێت، تەمەنیشیان نزیکەی (١٥) ساڵێك دەژین.

ئەمەش ناوی هەندێ لەو کۆتر بازانەی شاری کەرکوکە کەوا کۆتری نامەبەر بەخێو دەکەن‌و لەچەندین تاقیکردنەوەیشدا بەشدارییان کردووە.

١. نەوزاد کەریم محەمەد (١٩٦٥- ) کەرکوك، بە (نەوزاد مەرمەر) ناسراوە، لەساڵی (١٩٩٥ی ز) یەوە ئەم جۆرە کۆترانە بە خێو دەکات‌و (٤) جاریش لەیاری پێشبڕکێ بەشداری کردووە، لەشارەکانی عیمارەو بەسراو قورنەو فاوەوە بەریداوە، لەوەی عیمارەو فاو لەسەر شاری کەرکوك یەکەم دەرچوو.

٢. عەلی عومەر ئەمین (١٩٤٢- ) کەرکوك، بە عەلی جەنگیز ناسراوە، لەساڵی (١٩٩٤ی ز) یەوە کۆتر رادەگرێت.

٣. ئایدن عەلی (١٩٥٥- ) کەرکوك، داقوق.

٤. سامی تەها ناسر (١٩٥٨- ) کەرکوك.

٥. ئەحمەد محەمەد مستەفا (١٩٧٦- ) کەرکوك.

٦. نازم فازڵ سەعید (١٩٧٢- ) کەرکوك.

هەروەها ئەمانەش کۆترباز‌و تەنیا زاجل بەخێو دەکەن: (عامر تەنەکەچی، نوورەدین محێدین، نوورەدین ئەسوەد، نافع سەیید ناسح، عەلی مەردان، ناسح کەریم، جەلیل.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. کاشۆ: داری شەقێن، دارێکی سەر چەماوەیە، بۆ لێدانی گۆ بەکاردێت.

٢. گۆ: تۆپی دارینی کاشۆ، پارچە دارێکی خڕی پتەوە، بەزۆری لەداری قایم‌و ساغ ئامادەی دەکەن وەکو داری بەروو، گوێز، توو.

٣. حاڕ: بریتییە لەدوو بەردی زل یان هەر شتێکی دیکە بەرامبەر بە یەك دانراوە، ئارایان نزیکەی مەترێك دەبێت بۆ زاوا بە ئارایاندا تێپەڕ بێت‌و ببێ بە زاوا.

٤. گورز بن مێخکێ: لەهەندێ ناوچەدا پێی دەڵێن: (گوردانێ) یان: (گورزان) یان: (گورزێن)

٥. گورز: بریتییە لەپەتێکی درێژ کۆمەڵە پەڕۆیەکیان بە خڕی بەستووە بە سەری پەتێکەوە، بۆ گەمەکردن.

٦. قاپان: لەتەواوی شێوەزارەکانی کوردیدا، ئەم ناوانەی دیکەیشی هەیە: (جگێن، میچێن، جگانێ، قاپانە، میچ میچێن).

٧. قاپ: میچ، جگ، جك، چو، میچی ئاژەڵ، زووتر بەزۆری مێردمنداڵان‌و لاوان یارییان پێدەکرد.

٨. بووك: مەبەست لەپشتی قاپەکەیە، جك: مەبەست لەڕووی دووەمی میچەکەیە.

٩. کەر: مەبەست لەلاراست‌و لووسی قاپەکەیە.

١٠. شەك: مەبەست لەلا چاڵەکەی قاپەکەیە.

١١. تویش: لووس، ساف

١٢. پەندەکە بە شێوازی گۆران (ماچۆ) وتراوە، واتە: "بووەتە قاپی تویش (لووس)-"، ئەمە بە یەکێکی بێ شەرم دەوترێت، پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ، هەردەوێڵ کاکەیی، ئینستیتیوتی کەلەپووری کوردستان، چاپخانەی کشتوکاڵ، هەولێر، ٢٠٠٦، لاپەرە ٦٣.

١٣. شین: ئەمیان رەنگی دەقاو دەق لەکۆتری کێوی دەچێت، دوو هێڵ ها بە سەر باڵەکانیانەوە، زۆر کەس لەکۆتر بازەکان ئەم رەنگەیان بەلاوە پەسەندە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە تا خەڵکی یان دراوسێکان بە کێوی بزانن.

١٤. سێتاو: رەنگی بۆر ئاماڵ رەشە.

*** چاوەزارو ئێرەیی[1]:**

**هەردەوێڵ کاکەیی**

**چاوت ئەستێرەی ڕۆژێ وەك مانگ گۆشەی کێشاوا**
**لە چاوی پیس بە دوور بێ، شلکە ڕێحانەی ساوا[2]**

لە ناو کوردەوارییدا، لە گوندو لادێکاندا، بگرە شارو شارۆچکەکانیشدا، گەلێ نەریتی جۆراوجۆی باوی سەیر هەن کە تا ئەمرۆیش خەلکی باوەریان پێیان هەیەو پێرەوییان لێ دەکەن. یەکێ لەو بیروباوەرە دێرینانەی باوو باپیران داوودایپیرانمان نەریتی چاوەزارو ئێرەییە، ئەمەش چەند نموونەیەکە لەو نەریتانە کە نموونەی خەروارێکن:

*** شین:**
لە بیروباوەری کوردییدا ڕەنگی شین دژ بە چاوەزارو ئێرەیی (حەسودی) بەکاردێنن، وەکو ژێر پیالەی شینو کووژەکەی حەوت چاوی ڕەنگی شینی گەورە، لە شوێنێکی بەرزو بەرچاودا هەلدەواسن، گوایە ئەهریمەن (شەیتان)و جنۆکە شەرانییەکانیش ڕەنگو بەرگیان شینە، جا بە بینینی ئەو ڕەنگە لەو مالو خانووە دوور دەکەونەوە، بۆیە دەلێن (شەیتان شینە)، یان ژنان بۆ هەمان مەبەست، مورووی شین دەبەستن بە قژی منداله کۆرپەکانیانەوە، یان دەیخەنە نێو ملوانکەو گەردانە، بە تایبەتی ژنە جوانو قەشەنگە تەرپۆشەکان، یان هەندێ کەس ئەنگوستیلەی نەقیمی شین لە ئەنگوست دەکات یان متومورووی شین لە شێوەی بازنو خرخال دەهۆننەوەو دەیکەنە دەستو پێی منداله ساواکانیانەوە.

*** قورقۆشم:**
سەر لە ئێواران دژ بە چاوەزارو ئێرەیی، لە دەفرێکدا قورقۆشم دەتوێننەوەو گەورەو بچووك بۆ چەند جارێك بە سەریدا باز دەدەن.

*** گورگ:**
چاوی ڕاستی گورگ وشك دەکەنەوەو لە نێو تووڕەکەیەکی بچووکدا دژ بە چاوەزار لە مالا هەلیدەواسن، گوایە ئیتر چاوی پیس لە خۆیانو مالو مندالیان کار ناکاتو ئەهریمەنو جنۆکە چەپەلەکان زەفەریان پێ نابەنو توخنیان ناکەون، گوایە گورگ چاوی تیژەو دەیانبینێو ڕاویان دەکان بۆیە جنۆکەکان لەو چاوە وشك کراوەیە دەترسنو لەو دەوروبەرە دوور دەکەونەوەو دەتارێن.

*** خوێ:**
خوێی درشت دەخەنە نێو ئاگرەوەو دەیسوتێنن دژ بەوانەی کەوا چاویان پیسە، جا ئەگەر خوێیەکە لە کاتی سووتاندندا قرچەی لێوە هات، وا دەزانن ئەو دەنگە دەنگی تەقینەوەی چاوی چاوپیسانەو ئیتر چاویان لە مالو حالیان کار ناکات.

*** مار:**
بربرەی پشتی مارێك (١٠- ٢٠) دانە ئێسکی تێدایە، بە زنجیرە پەیوەندن بە یەکەوە، بە گوێرەی تەمەنو گەورەو بچووکی مارەکەیە، ئەمە بۆ ژاوەزارو ئێرەیی وەکو تەزبیح بە پەتێك دەیهۆننەوەو لە مالەوە هەلیدەواسن، گوایە مرۆڤ لە مار دەترسێت، باوەریان وایە بەم کارەیان ئیتر چاوی حەسوودو چاو پیسان کاریان تێ ناکات. بربرەی پشتی مار لە چەشنی مورووی بچووکی کونداره، بەلام ئەمەیان وەکو بەری پەیکولە وایە. لە پاش کوشتنی مارەکە دەهێنن لە قاپێکدا بربرەی پشتی دەردەهێنن، پاشماوەی ئێسقانو گۆشتو ئاوەکەی دەکەنە نێو چالێکەوەو دیپۆشن بۆ ئەوەی زەرەرو زیان بە خۆیانو ئاژەلو پەلەوەرەکانیان نەبەخشێت. یان بۆ ماوەی شەش مانگێك یان زیاتر ئەو مارە لە شوێنێکی دیاریکراوا لەژێر گل دادەنێن، کاتێ دەریدەهێنن، تەنها ئێسکەکانی ماوەتەوە.
ئەگەر یەکێ چاوی بە کەسێکی چاو پیس بکەوێ، پێی دەلێ: مارێ ڕەش ها لەودیوتەوە، گوایە بەمە زیانی پێ ناگەیەنێت.

*** دەست:**
وێنەی دەست لە سیرامیك یان زەردە (زەردك) دروست کراوە، بۆ چاوەزار لە مالا لە شوێنێکی دیاریکراوی بەرزدا هەلیدەواسن.

*** مامز (ئاسك):**
کەللەی مامز بە شاخەکانییەوە بۆ جوانییو چاوەزار لە جێگای بەرزی بینراودا، لەسەر دەرگا هەلدەواسن. ئەمە گوایە لەبەر ئەوەیە دەلێن: لەکاتی محەمەد پێغەمبەر (د . خ) لە دەوروبەری شاری (مەدینە)دا ڕاوچییەك ڕاوی ئاسکێك دەکات، ئاسکەکە بە ئەمری خودا دێتە زمانو پێی دەلێت: بۆ منت ڕاو کرد؟
ڕاوچیش دەلێت: بۆ کەیفو سەیرانی خۆم، لە ئەنجامیشدا سەرت دەبڕمو گۆشتەکەیشت نۆش دەکەم.
ئاسکەکە دەلێت: من محەمەدیمو موسلمانم با بچینە لای پێغەمبەر تا ئەو شەرعمان بکات، چونکە منیش وەکو تۆ جگەرگۆشەم هەیەو بەم کارەت هەتیویان دەکەیت. کە دەچنە لای پێغەمبەرو ئامادە دەبن، پێغەمبەر فەرمانی ئازادی بۆ دەداتو بەرەللای دەکەن. جا ئەم کەللە مامزە کە هەلیدەواسن بۆ ئەوەیە تا خواو پێغەمبەر لەبەر خاتری ئەو ئاسکەیە ئەو خانووبەرەو خێزانەکەیان لە چاو پیسەکان بپارێزن.

*** نووسین لەسەر دار:**
یان لە سەر دار یان بەرد، بە خەتێکی خۆش بە عەرەبی دەنووسن (الحسود لا یسود)، حەسوود ناگا بە ئاواتو ئامانجی خۆی.

* شەمشەمە کوێرە:
شەمشەمە کوێرەیەك وشك دەکەنەوەو لە شوێنێکی بەرزاییدا هەڵیدەواسن، گوایە بەمە خۆیان و ماڵەکەیان لە دەردو بەڵای چاو پیسان دەپارێزێت.

* بەنەبازەڵە:
بۆ هەمان مەبەست بەنی سپی و رەش پێکەوە بادەدەن و وەکو بازن دەکرێ بە دەست و قەدی بێشکەی منداڵدا.

* سنگی سووچەر:
بە جوانی دەهۆننەوەو لە شوێنێکی بەرزی بەر چاویدا بۆ هەمان مەبەست هەڵدەواسن.

* خوێندنی قورئان:
ئەو دوو سوورەتەی قورئانە دەخوێچنن بۆ چاوەزارو ئێرەیی:
١- قل اعوذ برب الفلق.
٢- قل اعوذ برب الناس.

* پە پولە سلێمانی:
لە کورەدەوارییدا مۆمیا دەکرێ و بۆ چاوەزارو ئێرەیی لەبەر دەرگای ماڵان هەڵیدەواسن.

* مازوو:
دژ بە چاوەزار، دەکرێ بە قەد سەری منداڵ و بێشکەو ملی ئاژەڵ و قەدی ئاوێنەی ئۆتۆمبێلدا.

* خوێ و بەرد:
ئەگەر یەکێك بییەوێ جارێکی دیکە کەسێکی چاو پیس نەبینێ، پێش ئەوەی کابرا لەلای هەستێ و بروات، بە نهێنی هەندێ خوێ دەکەن بەنێو تاکێ لە پێڵاوەکانییەوە، کە رۆیشت حەوت دانە بەردی بچووکیش بەدوایدا فڕێ دەدەن.

* لەم پەندەدا ناوی حەسوود هاتووە (حەسوود ناگات بە مەقسوود)[3].
واتە: کەسی حەسوود ناگات بە مەبەستی خۆی.

* لەم دێرە شیعرەیشدا نێوی چاوەزار هاتووە[4]:
مشکیەکەی سەرت تاڵ تاڵی خاوە
لەبەر چاوەزار بۆم با نەدراوە[5].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:
١. (چاو بەست، چاو نەفەس، چەم نەفەس، چاو پیس و نەزەر بەستیشی پێ دەڵێن.
٢. (گەنجینەی گۆرانی کوردی)، لاپەرە ٢٧٢.
٣. (پەندی پێشینانی کورد)، بەرگی دووەم، لاپەرە ٧٢.
٤. دەستنووسێکی هەردەوێڵ کاکەیی.
٥. بۆ زانیاری زیاتر، بروانە (داب و نەریتی کوردەواری ناوچەی گەرمیان، هەردەوێڵ کاکەیی، بە یارمەتی ئەمینداریێتی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٩، لاپەرە ٦٥).

*** چەند نەریتێکی باوی کوردەواری[1]:**

هەردەوێل کاکەیی

*** ئاو:**

هەموو منداڵێك لە ترسا رابچەڵەکێ دەستبەجێ هەندێ ئاوی دەدەنێ تا تووشی نەخۆشی دەروونی نەبێت.

لە کاتی کوڵاندنی ئاو لە قۆری و کتریدا کە دەستی کرد بە گیزە گیز وا دەزانن پێیان دەڵێت: بەسە بەسە ئازارم مەدەن ئەگینا ئێوەش لەو دونیا (رۆژی دوایی) وەکو من بە ئاگر ئازار دەدرێن و تۆڵەمتان لێ دەسێننەوە.

*** باداری:**

زووتر ئەوەی تووشی نەخۆشی باداری ببوایە دەچووە سەر گۆڕی پیاو چاکێك و بەڵێنی دانوولەی پێ دەداو بە هیوای ئەوەی چاك ببێتەوە، بەسەر دراوسێکانیدا دەیبەخشییەوە.

*** بۆن:**

ئەو منداڵەی تووشی نەخۆشی بۆن بووبێ وا دەزانن بە هۆی بۆنێکی تیژەوە تووش بووە جا ئەو بۆنە خۆش بووبێ یان ناخۆش، بۆیە ئەو ناوەیان لێناوە، جا بەهەر شێوازێك بووبێ هەولدەدەن ئەو شتە یان ئەو بۆنە پەیدا بکەن و لە شوێنێکدا دایدەنێن، ئینجا خواردنێك بە شیرمەنی وەکو (نوقل، شەکرۆکە، خورما، مێوژ) یان هەر خواردنێکی دیکە لەو جۆرە خواردنانە بۆ ماوەی نیو ساتێك لە نزیکییەوە دایدەنێن بۆ ئەوەی بۆنەکەی وەرگرێ، لە ئەنجامدا ئەو خواردنە دەرخواردی تووشبووەکەی دەدەن، باوەڕیان وایە بەمە چاك دەبێتەوە.

*** پەپووسلێمانە:**

(پەپووسلێمانی)و (پەپووسێمانە)و (پەپووسلێمانکە) یشی پێدەڵێن، پەلەوەرێکی جوانی رەنگامەی ئێسك سووکە، هەندێ پەلی درێژەها بە تەوقی سەریەوەو بووەتە کڵاو بۆی، لە قورئاندا ناوی هاتووە، خەڵکی وا دەزانن هی سلێمان پێغەمبەرە، بۆیە کوشتنی بە گوناه دەزانن، چونکە لە کاتی خۆیدا نامەی بردووەو هێناوە لەنێوانی سلێمان پێغەمبەرو پاشاکانی ئەو سەردەمەدا، دەڵێن گوایە لە رۆژگاری دێرینەدا بووکێك دەچێتە ناو مێگەل بە نیازی پەس دۆشین لە گەرانەوەدا خەسووەکەی لێی توورە دەبێ و دەڵێ بۆ شیرەکەت لە رۆژانی پێشوو کەمترە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ رۆژانی رابردوو شیرەکە هەر کەف بوو؟ چونکە بە زوویی دەگەرامەوە، بەڵام ئەمرۆ پەچەیشم مالی بۆیە لە هاتنەوەدا دوا کەوتم جا کەفی شیرەکە دامرکایەوە، خەسوویشی دەڵێ: من بەم قسەیەت هیچ بروام نییە وا دیارە پەسەکانت بە چاکی نەدۆشیوە... دەك داوەشێی لە خوام دەویست بتکا بە پەپوویەك و بە درێژایی ژیانت هەر بڵێی (پەپوو.. کەف و.. کەم...) لە ئەنجامدا بینایی چاوان دوعای ئەو ژنەی قبووڵ کردووەو ئەو بووکە نەشمیلانە هەژارەی کردووە بە (پەپوو سلێمانە)، بۆیە کورد بەزەیی پێدا دێ و نایکوژێ.

*** پیاز:**

زووتر پیازیان دەکردە ملی جاشولکەی تازە زاوە، بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشی بۆن نەبێت.

*** پێڵاو:**

ئەگەر لە کاتی داکەندنیدا سەرو خوار بێ خاوەنەکەی پێی ناخۆشەو بە زوویی چاکی دەکاتەوە، ئەمە بۆ رێز لێنانە لە یەزدان و فریشتەکانی ئاسمان و ئەو کەسانەی کە لەو دەوروبەرەدان.

*** تیراوێ:**

بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی تیراوێ، باڵندەی سەرگەریان دەسووتاندو خۆڵەمێشەکەیان دەساویە برینەکانیدا.

*** جنۆکە:**

خەڵکی کۆن وا دەگێرنەوە گوایە لە پاش ئەوەی خوای مەزن باوە ئادەم و دایە حەوای لە بەهەشت دەرهێنا، حەوا دەستی کرد بە زگوزا هەر جارەیش کۆمەڵێك منداڵی لە کورو کچ دەبوو، جوانەکانی لای خۆی دەهێشتەوەو ناشرینەکانیش بە دزی باوە ئادەمەوە دەشاردەوە تا پێیان نەزانێ، رۆژێکیان حەزرەتی ئادەم لێی دەپرسێت: ئێمە ساڵی ئەوەندە منداڵمان دەبێ و هەست دەکەم بە بەر چاومەوە کەم دیارن؟

ئەویش راستییەکەی پێ ناڵێ و هاشاری دەداو دەڵێ ئەوەندە منداڵمان هەیە کەوا دەیانبینی. باوە ئادەم وەڵامەکەی دایە حەوای بە ئەقڵەوە ناچێ بۆیە وتوویەتی: لە خوام دەوێ ئەوانەی کەوا نادیارن هەرگیز بە دیار نەکەون و لە ناخی زەویدا بژین، گوایە ئەو منداڵانە بەم دوعایە خودای پەروەردگار کردویانییە بە جنۆکە.

*** جووتکردن:**

دەڵێن گوایە حەسەن گادارو حەزرەتی ئیزرائیل وا رێك دەکەون هەردووکیان پێکەوە هەر هەموو سەر گۆی زەوی بکێڵن و بیکەن بە دەغڵ و دان و مەزرا، دواتر وەك برا بەش زەوی دنیایان بەش کردو لە نێوراستەوە چەند بەردێکیان بۆ نیشانە کەڵەك کرد، حەسەن گادار زۆر بە تەماح بووە، بۆیە کە دانیشتون بۆ پشوودان، بە نهێنی بێ ئەوەی ئیزرائیل بزانێ بە لای پاڵەوە بە پێی پاڵ بە کەڵەکە بەردەکەوە دەنێ بۆ ئەوەی چەند سانتیمەترێ لەوەی ئەو زیاتر بەرکەوێت.

جا خەڵکی وا دەزانن تەماحی مرۆڤ لە حەسەنی گەدارەوە بۆ ئادەمیزاد ماوەتەوەو بە هیچ شتێك تێر نابێ مەگەر بە خاك. لە پەندێکی کوردیدا نێوی جووت هاتووەو دەڵێ:

حەسەن کولێنانێ مۆرت دانێ، جووتت کوانێ[2]

*** خواردن:**

هەر کەسێك لە کاتی خوارندا قرقێنە بدات ئەوانەی لە تەکیدان پێی دەڵێن (نۆش)، واتە: هەر چیت خواردووە نۆشی گیانت بێت، ئەم نەریتە بە زۆری بۆ منداڵان بەکاردێت، ئیتر لە خواردن رایدەگرن؟ چونکە وا دەزانن ئەمە نیشانەی تێر بوونە.

*** خەنە:**

ئەگەر خەنە لە نزیکی منداڵی تازە لەدایکبوو بگرێتەوە، وا دەزانن ئەو منداڵە تووشی رەنگ زەردیو لاوازی دەبێتو لە ئەنجامیشدا تووشی زەردوویی دەبێت.

*** ددان:**

ئەگەر منداڵێکی نێرینە ددانی بکەوتایە ژنێك یان دایکی منداڵەکە ئەو ددانەی دەخستە نێو پارچە پەڕۆیەکی بچووکەوەو بە نهێنی دەیخستە نێو سەنوق یا هەگبەی عەتار یان دێوەرەوە، وایان دەزانی بەم کارەیان ئەو کورە چاو نەترسو ئازاو ژیرو وریاو قسەزان دەبێت، چونکە عەتارو دیوەرە زۆر دەگەڕێن هەڵبەتە زۆریش دەزانن، بەڵام بۆ کچ ددانەکەیان دەگرێت بە دەستەوەو سێجار دەیانوت: پیسکە برۆ پاکەکە وەرە، ئینجا فڕێیان دەدایە سەربان، هەندێ جار بۆ کوڕیش وایان دەکرد.

*** دۆمەڵان:**

ئەگەر یەکێك دۆمەڵانێکی بدۆزایەوە منەی هاورێکەی دەکردو لە بەر خۆیەوە دەیوت (دۆزە، دۆزە، دۆمەڵانێکم بۆ بدۆزە) یان (دۆزە، دۆزە، دۆمەڵانێکم بۆ هەڵدۆزە).

*** دەیدەنێ:**

ئەگەر کەسێك بۆ دیەنی دەرەنگ بڕۆیشتایەتە ماڵی خزم یان ئاشنایەکی خاوەن ماڵ بە بزەوە پێشوازی لێدەکردو بە تەوسەوە دیوەت: (ئەرێ هۆ منالەکان گاسنێك یان گۆزەیەك نییو فڕییدەنە بەر پێی)؟، ئەمە لە رێگای خۆشەویستییەوە پێیان دەوت، واتە: بۆ درەنگ دیدەنێمان دەکەی؟

جا ئەمە لەو بیرو بۆ چوونەوە بۆی دەڕۆن گوایە گاسن نیشانەی کشتوکاڵیو خێرو بەرەکەتە، گۆزەش نیشانەی ئاوو رۆشناییە، چونکە زووتر جوتیارەکان بە هۆی گاسنو هەوجارەوە ئەرزیان دەکێڵاو ئاویان دەدا کە بژێوی مرۆڤی لەسەرە.

*** زرت، جرت:**

دەڵێن ئەوەی زرت بکێشێ تا چل رۆژ دەمی پاك نابێتەوە. هەروەها زرت کێشان لە نێو کۆمەڵگای کوردەوارییدا شوورەییە.

*** زمان:**

ئەگەر زمانی خورا، وا دەزانێ بە دیداری دۆستییێکی دوورو وڵاتی دەبێتو وتووێژێکی خۆشی لەگەڵدا ساز دەکات.

*** زەنبوور:**

چەند چاڵە نەوتێکی لە دەڤەری کەرکوك، جەمبووریشی پێدەڵێن گوندێکیش لە نزیکیانەوە بەم ناوەوە هەیە، بە عسییەکان وێرانیان کرد. بە زمانی عەرەبی زەنبوور زەردەواڵە دەگەیەنێ، سەر گوزەشتەیەکی ئەفسانە دەربارەی ناوی ئەم گوندە هەیە، دەڵێن گوایە شێخێکی ئاینی لەوێدا هەبوو هەردوو گوێی بووەتە شارە زەردەواڵە..!! بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە.

*** ژاڵە:**

بۆ چارەسەرکردنی کۆخە رەشەی منداڵان بە کاری دێنن، پارچەیە بچووك لە دارەکەی بە جوانی ئامادە دەکەنو دەیکەن بە ملی تووشبووەکەوە، گوایە بەمە چاك دەبێتەوە.

*** ژن:**

ئەگەر ژنێك لە ماڵەوە شتێك بزر بکات وا دەزانێ ئەهریمەن (شەیتان) لێی شاردووەتەوە، جا بۆ دۆزینەوەی بەردێك دەهێنێو تفی بەسەردا دەکاتو هەر لە ماڵەوە لە شوێنێکدا دایدەنێو بەردێکی دیکەیش رووەو تفەکە دەخاتە سەری، گوایە بەمە چاوی ئەهریمەنی بەست، لە پاش دۆزینەوەی شتەکە ئینجا بەردەکان فڕێ دەدات.

هەندێ ژنان لە کاتی تووڕەبوونی هاوسەرەکەی وا دەزانێ سیحری لێکراوە، بۆ پووچەڵکردنەوەی سەلکە پیازێ دەسووتێنێ.

هەندێ ژنی منداڵدار لێرەو لەوێ (مێرووی شیر)[٣] لە مل دەکەن بەو نیازەوە شیری زۆر بێت، بە تایبەتی ئەو ژنەی شیری کەم بێت.

ژنی دووگیان (ئاوست) بۆ تاقیکردنەوەی سکەکەی تا بزانێ کورە یا کچ دەچوو رووەکی پیشۆکی لە رەگەوە هەڵدەکێشا، ئەگەر بە تەواوی هەڵبکێشرایە وای دەزانی کۆرپەکەی کورە، بە پێچەوانەوە گوایە کچە.

ژنی دووگیان، هەندێ جۆو گەنم دەهێنێ لە شوێنێکی شێداردا بە جیا تۆویان دەکات، ئەگەر جۆیەکە زووتر شین بوو وا دەزانێ منداڵەکەی سکی کورە، ئەگەر بە پێچەوانەوە گەنمەکە لە پێشدا شین بوو وا دەزانێ کۆرپەکەی کچە، یان بە نهێنی هەندێ خوێ دەخەنە تەوقی سەری ئەو ژنەی دووگیان بێت، ئەگەر ژنەکە لە پێشدا دەستی بۆ لووتی برد ئەوە کۆرپەکەی کورە، ئەگەر هاتوو دەستی بۆ سەری برد بە پێچەوانەوە وا دەزانن کچە.

*** ژووژوو:**

دەڵێن گوایە کونی بێچوەکانی بە قوڕ داخەی، دەڕوا پارچە چیلکەیەك دەهێنێو لە بەر کونەکەی دایدەنێو دەستبەجێ دەمی کونەکە واڵا دەبێت.

جا دەڵێن هەر کەسێك ئەو لەتە چوکڵەی لە لا بێ بۆ هەر ئیشوکارێك بڕوات دەرگای خێری لێ دەکرێتەوەو بە ئاواتی خۆی دەگات.

*** سەگ:**
دەڵێن کاتی نووح پێغەمبەر لە هەر زیندەوەرێکدا جووتێ نێرو مێی خستووەتە نێو کەشتییەکەیەوە، سەگەکان لە نێو پاپۆڕەکەدا جووت بوون، نووح پێغەمبەر کە بەمەی زانیوە نەفرەتیانی کردووە، ئەوانیش دەستبەجێ بەیەکەوە نووساون، دەڵێن بۆیە ئێستاش سەگ لە کاتی جووت بوونیاندا بەیەکەوە دەلکێن.

*** شان:**
دەڵێن ئەوەی شانی بلەرزێ، پۆشاکی نوێ دەکرێت.

*** شکارتە:**
خدری ئەلیاس یەکێکە لە پێغەمبەران، لە نێو کوردەوارییدا بە خدر ئەلیاسو خدری زەندە ناسراوە، زووتر جوتیارەکان شکارتەیان بۆ دەکردو لە کاتی خەلەو خەرمان هەڵگرتندا ئەو شکارتەیە کە بە زۆری گەنم بوو بە سەر هەژاراندا دەیانبەخشییەوە، ئەم نەریتە بۆ ئەوە ئەنجام دەدرا تا خوا لەبەر خاتری خدری زەندە بەزەیی بەو خەڵکەدا بێتو باران ببارێنێو ساڵەکەی هات بێت.

*** شەروال:**
ئەگەر کەسێك لە پڕ شەرواڵەکەی ڕێك خست وا دەزانن ئەمە نیشانەی ئۆغرە.

*** فریشتە:**
جاران خەڵکی وایان دەزانی هەر ماڵێك فریشتەیەکی هەیە، بۆیە هەندێ کەس قەستەمی پێ دەخواردو دەیوت (بە فریشتەی ئەم ماڵە)، جا ئەوەی لە شوێنێکەوە بۆ جێگایەکی دیکە کۆچی بکردایە، ژنی خاوەن ماڵ شەو مەنجەڵێکی خاوێنی بە بەتاڵی لە نێو ماڵ یا ڕەشماڵەکەدا دادەناوە دەیوت (فریشتەی وەخێر، ئێمە سبەی کۆچ دەکەین، ئەگەر بە ئێمە ڕازیت فەرموو وەرە با بڕۆین، ئەگەر هاتی بە خێروخۆشی بێ، ئەگەریش ڕازی نیتو نایەی، کارت ڕاست بێو خودا حافیز).

*** قاتر (هێستر):**
دەگێڕنەوە گوایە حەزرەتی (عەلی) کوڕی ئەبی تالیب (س) لە کاروانێکدا کە هەموو ولاخەکانیان قاتر بووە گەیشتوونەتە دەریایەك، حەزرەتی عەلی دەستی خۆی کردووە بە پردو هەر هەموو کاروانەکە بە سەریدا تێپەڕ بوون، ئینجا حەزرەت وتویەتی "لە خوام دەوێ بێ نەوەو بێ بەرەکەت بن"، گوایە لەمەوەیە ئیتر هێستر زاوزێ ناکات.

*** قازی قولەنگ:**
قازێکی کێوییە، هەندەی قەزی ماڵی دەبێ، گۆشتی بە تامو چێژە بە مەرجێ ژنێکی دەست ڕەنگینی کورد لێی بنێ، ئەم پەلەوەرانە لە ئاسماندا بە گەلو بە ڕیز بەشێوەیەکی زۆر جوانو ڕێکوپێك دەفڕنو ڕژێمی تایبەتیان هەیە، دووانیان دەبنە پێشەنگو لە پێشی ئەوانی دیکەوە بە جووتە دەڕۆن، لە کوردەوارییدا وا دەزانن ئەو دوو پێشەنگە زاوا و بووکن، ئەوانی دیکەیش کە بە دوایانەوە دەڕۆن ئاهەنگی خۆشیو زەماوەندیان بۆ دەگێڕن.

*** قاویت:**
قاویت (قاویت)، ئاردی دانەوێڵەی برژاو، جاران لە نێو کوردا نەریت وا بوو بۆ مرازو گەیشتن بە ئاوات، قاویتیان دەکردو بە ناوی (قاویتی خدر ئەلیاس، یان خدر زەندەوە) بەسەر دۆستو دراوسێدا دەیانبەخشییەوە، خدر ئەلیاس یەکێکە لە پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا نێوی هاتووە.

*** قورئان:**
زووتر ئەوانەی نیازیان وابوایە قورئان یا شیعرێ زوو لەبەر بکەن، ئەم کارانەیان دەکرد:
کەسەکە بە گوێزان سەری پاك دەتاشی بۆ ئەوەی ئیتر شەرم بکاو نەتوانێت دەرچێتە دەرەوە، تا ئەو بەرهەمانەی دەیەوێ لەبەریان بکات.
بە شەوان لە نێو ماڵ گوریسێکی دەهێناو دەیبەست بە مێخێکی بەرزەوە، ئەو سەرەکەشی دەبەستە مەچەکیەوە، ئینجا بە نێو ژوورەکەدا دەهاتوو دەچوو بۆ ئەوەی لە کاتی خەوە کورتێکدا یان بە دەم هامشۆوە خەوی لێ بکەوێ نەکەوێتە سەر ئەرز، یان گوریسەکەی رووەو پشت دەبەستە گەردنیەوە تا لە دانیشتندا بە دەمدا نەکەوێت.
لە زستاندا چەند جارێك مەلەوانی دەکرد، لەم ئاخورو ئۆخرەشدا قاوەو چایشیان زۆر دەخواردەوە.

*** کاروان:**
زووتر لە نێو خەڵکی گوندنشینە کوردەکاندا باو بووە ئەگەر کەسێك بە کاروانی بڕۆیشتایەتە جێگایەکی دوور لە لە کاتی دیاریکراودا نەگەڕایەتەوەو هەواڵیشیان نەزانیبا، فکریان لا دەماو بۆی دەشڵەژان. جا ڕۆژی هەینی لە پاش خۆرئاوا بە دەمژمێرێك بە نهێنییەکێکیان دەچووە پشت خانووی ماڵێکی دراوسێو لەبەر خۆیەوە دەیوت (شەو شەممە لالێ، بدە بە دەستم خۆش هەواڵێ)، ئینجا گوێی لە خێزانی ئەو ماڵە دەگرت، ئەگەر بە ڕێکەوت باسێکی خۆشیان بکردایە، ئەوە وایان دەزانی ڕێبوارەکەیان بەبێ گیروگرفت بە ساغو سەلامەتی دەگەڕێنەوە ماڵ، ئیتر دڵنیا دەبوونو فکریان لە لا نەدەما، بە پێچەوانەوە باسەکەیان خراپ بوایە، ئەو کاتە مەترسیان لێ دەبوو، بۆیە بە پەلە یەکێکیان بە دوایا دەناردو بە پەرۆشەوە سۆراغیان دەکرد.

*** کاور:**
ئەگەر بەرخ یا کاری مێینەییەك ساڵە بزێ کورد بە شوومی لە قەڵەم دەدا، وا دەزانن گرانییو نەهاتی ها بە دواوە، بە زۆری ئەو ئاژەڵانە سەر دەبڕنو گۆشتەکەی بە خێر دەبەخشنەوە.

*** کووپ:**

لە گوندو لادێ نشینە کوردەکاندا بە شەوان ناهێڵن کووپی ئاو، یان (کوندە) بێ جام بێ، وا دەزانن بە شەوان جنۆکەکان دێن ئاویان لێدەخۆنەوە، جا ئەگەر بێتو بێ جام بن، ئەو کاتە فریشتەکان دوعای شەرو نەفرەتیان لێ دەکەن‌و دەبنە هۆی بێ بەرەکەتی ماڵیان‌و خۆیشیان تووشی دەردو زەرەرو زیان دەبن.

*** کەر:**

کورد کەری دێزەی بە لاوە شوومەو بەدە، دەڵێن گوایە کەری دێزە تاقی بەیانیان حەزی لە زەرەر خاوەنیەتی‌و ئێوارانیش لە تۆپینی خۆی!

بۆیە لەم پەندەدا وتراوە (کەری دێزە حەز لە تۆپینی خۆی‌و زەرەری خاوەنی ئەکات)[٤].

دەڵێن گوایە نێرەکەر ئەهریمەن‌و جنۆکە شەڕ خوازەکان دەبینێ بۆیە دەزەڕێنێت.

*** کەروێشك:**

زووتر ئەوەی ناوکی بکەوتایە گورچیلەی کەروێشکیان دەدایێ، گوایە بەمە ناوکی دەهاتەوە جێ.

*** کەڵە شێر:**

ئەگەر دوو کەلەشێر (کەڵەباب) سەریان لە یەك نزیك کردەوەو کڤو ماتو مەلوول بوون، خاوەنەکانیان وا دەزانن میوانیان دێ، ئەمانیش لە ترسی کێردو گیانی خۆیاندا خەمبارن.

*** کەمتیار:**

دەڵێن خواردنی گۆشتی کەمتیار حەرام دەکوژێت، واتە: ئەو کەسەی حەرامی زۆر خواردووبێ، ئەگەر گۆشتی کەمتیار بخوات، گوناهی دەڕژێت.

*** کیسەڵ:**

دەڵێن ئەگەر کیسەڵیان بدیایە لە گۆمە ئاوەکاندا پۆل پۆل دەردەچن‌و بەرەو وشکایی‌و بەرزاییەکان دەڕۆن، یان کرمی (تەتلەمیران)[٥] یان بدیایە بەرەو سەر درەختەکان دەکشێن وایان دەزانی بارانێ زۆر دەبارێت.

*** گوڵ:**

هەیە بە گوڵ بەختی خۆی تاقی دەکاتەوە، کەسەکە گوڵێك دەگرێ بە دەستەوەو یەك بە یەك پەرەکانی دەبڕێ‌و لەگەڵ راکێشانیدا دەڵێ: سپی، ڕەش، سپی، ڕەش... لە ئەنجامدا دوا گەڵای گوڵەکە لەگەڵ هەر وشەیەکدا لەو دوو وشەیەدا (ڕەش، سپی) دەرچوو ئەوە ئەنجاکی بەختەکە بەو جۆرە دەبێت ڕەش یان سپی.

*** گوڵیلکە نیسان:**

گوڵە نیسان‌و گوڵاڵە سوورەشی پێدەڵێن، گوڵێکی سووری بەهارەیە، بە زۆری لە مانگی نیساندا بە دیار دەکەوێ بۆیە ئەم ناوەیان لێ ناوە، منداڵانی گوندو لادێکان گوڵەکەی دەهێنن‌و دەیکوتن، ئینجا دەیخەنە سەر مەچەکیان بۆ ماوەی دەمژمێرێك یان زیاتر دەیهێڵنەوە لە ئەنجامدا شوێنەکەی دەسووتێ‌و فیلکە دەکات، وا دەزانن بەم کارەیان مەچەك‌و بازوویان بە هێزو توندو تۆڵ دەبێت، تەنانەت لاوەکان بۆ هەمان مەبەست پارچە پەڕۆیەکی خاوێنی شین لوول دەکەن‌و ئاوری تێ بەردەدەن‌و سەر مەچەکیانی پێ دەسووتێنن.

*** گونە شەیتان:**

بەردێکی خەیاڵییە دەڵێن گوایە مس‌و زیو دەکا بە زێڕ.

*** مار:**

دەڵێن گوایە ئەو کاتەی تۆفان لە سەردەمی پێغەمبەر نووح هەستا، نووح پێغەمبەر لە هەر گیانداریك نێرو مێیەکی لە کەشتییەکەیدا هەلگرتووە، لە پڕ کەشتییەکە کون دەبێ، لە کونەکەوە ئاو دەڕواتە ژوورەوە، حەزرەتی نووح بە هەموو گیانلەبەرەکانی وت: کێتان دەتوانێ ئەم کونە بگرێ، یا چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە ئەگینا هەموومان پێکەوە دەخنکێین؟!

گیانەوەرەکان بێدەنگ بوون تەنها مار نەبێ دێتە وەڵام‌و دەڵێ: من دەتوانم بەڵام بە مەرجێ لە ئەنجامدا کام خواردن خۆش‌و بەلەززەتە ئەوەم بۆ دابین بکەن، ئەویش دەفەرمێ: ئەی بەسەر چاوان، مار بە هێمنی لە کەشتییەکەدا دەردێ‌و خۆی دەخاتە ناو ئاوەکەوەو دەچێتە ژێر پاپۆڕەکەوەو سەر لە کونەکەوە تا ناو قەدی دەردەکا، بەم شێوازە کونەکە دەگرێ‌و هەر هەموویان لە مەرگ رزگار دەکا، لە دواییدا کە تۆفانەکە کۆتایی پێدێ، مارەکە داوای خواردنەکەی لێ دەکا، نووح پێغەمبەریش پەلەوەری کلاو کورە رادەسپێرێ‌و پێی دەڵێ: برۆ هەر هەموو دنیا تەی بکەو بزانە چ جۆرە خواردنێ خۆش‌و بە چێژەو شایانی (مار)ە تا لە پاداشتی ئەو کردەوە چاکەیدا بۆی ئامادە بکەم، کلاو کورە خوا حافیزی دەکاو دەدا لە شەققەی باڵ‌و دەڕوا لە پاش چەند ڕۆژێك دەگەڕێتەوەو دەڵێ: گەورەم چی بێ لە ئێوە نهێنی بێ، ئەوەی من بیزانم لە خواردنەوەی خوێنی مرۆڤ خۆشتر بۆ (مار) بە دی ناکەم، دەڵێن گوایە لەو ڕۆژەوە مار کەوتووەتە تەقەللاو کۆشش بۆ پێوەدان بە ئادەمیزادەوە.

دەگێرنەوە گوایە ڕۆژێك لە وەرزی هاویندا حەزرەتی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چوارەم خەلیفەی ئیسلام لە بیاباندا لە وەرزی هاویندا خەوی لێ دەکەوێ، لە پاش دەمژمێرێك کە خەبەر دەبێتەوە، دەڕوانێ مارێك بۆی بووەتە پاسەوان‌و داڵێکیش بە دیار سەریەوە راوەستاوەو هەر دوو باڵی فش کردووەتەوەو سێبەری بۆ کردووە، جا بەم جۆرە دوعای خێریان بۆ دەکات‌و دەفەرمێ (هەتا نەتکوژن ئەمری ئەی مار، داڵیش تەمەنت بگا بە هەزار) واتە: داڵ‌و مار تەمەنیان درێژە.

*** مانگ:**

کورد خەرمانەی مانگی بە لاوە جوانو بە نیشانەی باران بارینی دەزانێت. گۆینده دەربارەی خەرمانەی مانگ دەڵێ:

قەستەم بەو مانگەی خەرمانەی دراوە[6]
هێشتا مەیلی تۆم بە کەس نەداوە.

*** مرۆڤ:**

دەڵێن گوایە سێ جۆرە مرۆڤ هەن، یەکەمیان لەژێر ئەرزن، دووەمیان ئێمەین کە لەسەر زەوی دەژێین، سێیەمیشیان لە ئاسمانن، جا وا دەزانن ئەوانەی ژێر زەمین لە سەر بەنەخوێنەوە پشت دەبەستن، ئێمەی سەر ئەرز لە نێوەراستەوە ئاسمانییەکانیش لەسەر پشتیان دەبەستن.

*** مریشك، مامر:**

ئەگەر مریشك بە لادا بخەوێ وا دەزانن میوانیان دێت بۆیە پێشینان وتوویانە (مریشك باری خست، نیشانەی میوان هاتنە)[7]

دەڵێن گوایە گۆشتی مریشکی مۆدە یان هەر پەلەوەرێکی مۆدە لە هی ئاسایی بە چێژترە بۆیە هەندی کەس حەز لە خواردنی گۆشتەکەی دەکات.

ئەو مریشکەی هێلکە نەکات، ژنان توێکڵی هێلکەی دەدەنێ، گوایە بەمە دێتە هێلکە، توێکڵە هێلکە بەو مریشکانەش دەدەن کە ولۆلە فرێ دەدەن.

*** منداڵ:**

هەر منداڵێکی تازە لەدایکبوو، دایکی ئەمری خوا بکات پێی دەڵێن (سەرە خۆر)، ئەمە بەو بووکەش دەوترێ کە لە پاش گوێزانەوەی دەزگیرانەکەی یا کەسێکی نزیك لە خێزانی غەزووری بمرێ، هەروەها بۆ گەمە بەو پیاوو ژنانەش دەڵێن کە هاوسەرەکانیان مردوون.

منداڵی ساوا لە پاش ئەوەی پێدەگرێ، ئەگەر بە گامۆڵکی بڕوات وا دەزانن میوانیان دێت.

ئەو منداڵەی کە تەمەنی لەنێوانی (١ - ١٠) ساڵیدایەو تووشی نەخۆشی بەرهەنگ (تەنگە نەفەسی) بێ وا دەزانن ئەو منداڵە لە خەو ڕاچەڵەکاوەو ترساوە، جا بۆ چارەسەر کردنی دەیبەنە لای ژنێك کە بە مۆی بروسکەو هەورە تریشقەوە جگەرگۆشەیەکی مردوو بێ، ئەویش کێردێك دێنێ بێ ئەوەی ئازار بە منداڵەکە بگەیەنێ بۆ ماوەی چەند خولەکێك دەیساوێ بە ملیا، ئیتر وا دەزانن بەمە چاك دەبێتەوە.

ئەگەر هاتوو منداڵێك دوو ددانی سەرەوەی بە پێش ددانەکانی خوارەوەی دەرچوو وا دەزانن خۆی یان باوك یان دایکی ئەو کۆرپەیە تووشی دەردوبەڵا دێ بە تایبەتی منداڵەکە، جا بۆ بەرگریکردن لەو بەڵاو مسیبەتە دێن ئەو منداڵە لە بەرزییەکەوە فرێدەدەنە نێو جاجمێك (مەوج) یان چارۆکەیەکەوە، دوانیش قایم ئەملاو ئەو لای جاجمەکە دەگرن، تا منداڵەکە نەکەوێتە سەر ئەرز، بەمە دڵنیا دەبنو ئیتر دەیدەنە دەستی خواو ناترسن.

ئەگەر زمانی منداڵێك شەقار شەقار بوو، دەڵێن تووشی نەخۆشی (بۆقژە) بووە، ئەم دەردە تووشی زاری منداڵانی ساوا دەبێ، جا دایکی کۆرپەکە هەڵدەستێ لە (٧) ماڵی دراوسێ ئارد کۆ دەکاتەوەو دەیکا بە هەویر، ئینجا منداڵەکە لە ئامێزی ژنێك دادەنێ کە لە پاش مردنی مێردەکەی شووی بە شووبرای خۆی کردبێ لە پاشاندا هەویرەکە دەدا بە قەدی دیوارێکدا، دەڵێن کەی ئەو گونکە هەویرە وشك بووەوە تووشبووەکەش چاك دەبێتەوە.

ئەگەر منداڵی کۆرپە لە ماڵەوە بە زۆری نێرینەی بانگ کرد، جا هەر ژنێك دووگیان لەو ماڵەدا هەبێ وا دەزانن سکەکەی کوڕە، ئەگەر مێینەشی بانگ کرد ئەوە بە کچی دەزانن.

هەر منداڵێکی ساوا لە تەمەنی حەوت ڕۆژیدا شیرینی بۆ دەبەخشنەوەو پێی دەڵێن گوێزەبانە یان گۆزەبانە یان تفریك بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لە بیستنو وتندا بێ بەشی نەکات.

*** مەر:**

ئەگەر مەرێك گورگ برینداری کرد، بۆ چارەسەرکردنی قوری سوور بە ئەندازەی برینەکەی لوول دەکەنو لە نێو ئاگردا سووری دەکەنەوە، ئینجا نێو برینەکانی پێ داغ دەکەن، بەمە سارێژ دەبێتەوە.

*** مەل:**

جاران وایان دەزانی کاتێ مەل بە حەواوەیە سێبەرەکەی بەسەر هەر کەسێکدا تێپەڕبێ، ئەو کەسە تووشی نەخۆشی دەبێت.

*** مەیموون:**

دەڵێن ژنێکی نەفامی ناڵەبار خەریکی نان کردن دەبێ، لەو کاتەدا منداڵە کۆرپەکەی خۆی پیس دەکا، ژنەکە لە جیاتی پارچە قوماش بە نانێك خاوێنی دەکاتەوە، لە ئەنجامی ئەم کردەوە نادروستەی بینایی چاوان دەیکا بە مەیموونو ڕوو لە دەشت دەکا، گوایە لەم ڕووداوەوە مەیموون هاتووەتە کایەوە.

*** مێگەل:**

شوانەکان لە سەرەتای بەهاردا مێگەلەکانیان دەبەنە لای ئارامگای پیاو چاکێكو بە دەوریدا دەیانسوڕێننو بە تفەنگ و دەمانچە چەند تەقەیەکیش دەکەن بە سەریاندا، ئیتر خۆیان بە غار کردن بە دەوری گومەزەکەدا دەخولێنەوە، تا یەکێ لە ئاژەڵەکان ماندوو دەبێو دەوەستێ، ئەو ئاژەڵە لەوێ سەر دەبڕنو دەیکەن بە خێر تا خودای پەروەردگار لەبەر خاتری ئەو پیاو چاکەو ئەو مەرشەی سەریان بڕیوە ئاگاداری سەرو ماڵیان بێت.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

**١. لە گۆڤاری کەلەپووری کورد، ژمارە ١٨، ساڵی (٢٠٠٤)دا بڵاوکراوەتەوە.**

**٢. (پەندی پێشینانو قسەی نەستەق لە ناوچەی کەرکوکدا)، هەردەوێل کاکەیی، ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چابخانەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٨٣.**

**٣. مێرووی شیر: جۆرە مێروویەکی بە ئرخە ڕەنگی لە شیر دەچێت.**

**٤. پەندی پێشینان، لاپەڕە ٣٤٤.**

**٥. تەتلەمیران: کرمێکی ئەستوور، دوو ڕیز پێی هەیە، ڕەشو سپییە.**

**٦. بۆنی هەڵاڵان دێ، لاپەڕە ٦١.**

**٧. سەرچاوەی پێشوو، شێخ محەممەدی خاڵ، لاپەڕە ٤٢٠.**

*** پیشە و کارە دەستییەکان لە کەرکوك و ناوچەی گەرمیان:-**

*** ژنی کورد لە بواری ڕستندا لە دەڤەری گەرمیان:**
ژنی کورد لە گوندو لادێکاندا جگە لە بەخێو کردن و پەروەردە کردنی منداڵ ڕۆژانە ئیش و کاری ناو ماڵیش ڕادەپەڕێنێ وەکو: گسکدانی نێو ماڵ، جل و پۆشاك شۆشتن، نان کردن، چێشتلێنان، مەشکە ژەنین، درووماان، پیشەی تەونکاری، پیشەی ڕستن و چنینی شتی جۆراو جۆری بەنرخ و سوود بەخش، دەستار کردن، پیشەی گۆزە و گلێنەکاری.
هەروەها لە بواری قورکاری و بیناسازی و کشتوکاڵیشدا هەمیشە ژن لە هاوشانی پیاودا بە درێژایی ڕۆژگار کار دەکا و هەرگیز هەست بە ماندوێتی و بێزار بوون ناکات[١].

ئێمە لێرەدا دەمانەوێ تەنها دەربارەی ڕستن و ئامرازەکانی بدوێین و شییان بکەینەوە. ئەو ژنەی (خووری) یا (موو) بە تەشی دەڕێسێ و دەیکا بە (بەن) پێی دەوترێ (تەشیرێس)، دوو جۆر بەن دەڕێسرێت (باریکان) و (قەویان)، باریکانەکەیان سێ جۆری هەیە:
* بۆ چنینی چۆخەو شاڵ.
* لفکەو پۆپەژمێن.
* بۆ چارۆکە، دۆخێن (شەروالبێن)، کلێتە، فانیلە، گۆرەوی، پویزەوانە، بەرماڵ، مەوج (جاجم) خوری خوێدان و کەوچکدان و بەرهەمی تریش بەکاردێت.
قەویانەکەشیان بۆ چینی بەرەو قالی (مافوور) و سفرەو گوریس (ڕەسنە) و کەژوو (کشی) و خرار (تێر) و جەواڵ و هۆرو چیخ و ڕەشماڵ و هەگبەو ڕەشکەو بەدەقانی (قۆچەکانی) و ئەو جۆرە شتانە بەکار دێ، جا ژنی بە زەوق و دەسترەنگین هەمیشە بەنەکەی باریك و جوان و پوختەیەو گاڵتەی پێ ناکرێ، هی تەمەڵ و بێ زەوقیش ناپوختەو نارێك و بێ کەڵکە.
تەشیرێس لە پێشا خوریەکەی پاك دەشواتەوەو لە بەر ڕۆژ هەڵی دەخا، لە پاش وشکەوە بوونی بەدەست یان بەهۆی ئامرازی (شانە)ی خوری شیکردنەوە بە جوانی شی دەکاتەوە، یان دەیباتە لای پیشەوەرێکی هەللاجی بە ئامرازی (کەوان) بۆی شیدەکاتەوە، ئنجا بە درێژی لوولی دەکا، بەمە ئامادە دەبێ بۆ ڕستن، دواتر تەشییەکەی دەگرێ بە دەستەوەو ناوی خواو پێغەمبەری لێ دەهێنێ و دەست بە ڕستن دەکات، لەپاش تەواو بوونی ڕستن بە خاوی دەیکا بە (گلۆلە)، ئنجا بە ئامرازی (تەشینۆك) بەنەکە بە دوو لۆیی با دەدا، جا ژنەکە بە زۆری تەشینۆکەکە دەهێنێ بەسەر ڕانیا، هۆکاری بادانەکەش لەبەر ئەوەیە تا کرژی کاتەوەو بەنەکە خاو نەبێتەوە بۆ ئەوەی قایم و پوختە بێ، لە پاشاندا لەسەر ئامرازی (کلاَفە) هەڵیدەکات و دەیژەنێ بە ئاوی ساردا بۆ ئەوەی زیاتر یەك بگرێ و خاو نەبێتەوە، بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك لەسەر ئەو کلاَفەیە دەمێنێتەوە، ئنجا تەشی ڕێسەکە بە چوار مشقی قنج قنجێ دادەنیشێ و ئەو بەنەیەی کە لەسەر کلاَفەکەیە بە دەور هەردوو ڕانیا بە ئەندازەی چوار پەنجە لە ژوور ئەژنۆیەوە هەڵیان دەکات و لە شوێنێکدا دەیانکا بە دارا، لەپاش تەواو بوونی ڕستن و بادانی، ئنجا بەنەکان دەبەنە لای (خومچی) بۆ ڕەنگ کردنیان، لە دوای هێنانەوەیان هەمیسان دەیانکەن بە گلۆلەو دەیبەن بۆ جۆلا، یان بۆ تەونکاری تا بیکەن بە بەرە و مەوج و قالی و بەرماڵ و چارۆکە و ئەو شتانە، ژنی وایش هەیە خۆی بۆیە دەکڕێ و لە ماڵەوە بەنەکان ڕەنگ دەکات.
ئەمەیش نێوی ئەو ئامرازانەیە کەوا لە بواری ڕستندا بەکاری دێنن، هەر هەمووشیان دەچنە خانەی فۆلکلۆریەوەو پیشەی برا هەورامانیی و دۆم و خەرات و قەرەجەکانە، لە داری بتەو بە جوانی بە شێوەیەکی لووسوپووس دروستی دەکەن (تەشی، تەشینۆك، تەشی هەڵکەر، شانە).
* یەکەم: تەشی (تەشو) و (دویك) و (لەتەرە) و (نەتەرە)یشی پێ ئێژن:
بریتییە لە دوو پارچە، لە بنەوە سەلکەکەی کە (سەلکە تەشی) پێدەلێن لە دوو پارچە داری ئەستووری تاشراوی بتەوی کونکراو، یا لە تاکە دارێك پێك هاتووە، درێژییەکەی (١١ سم)ە، دەستکەکەشی پارچە دارێکی باریکی لووس کراوە لە نووکەوە لە لاوە لەلەی بۆ کراوە تا لە کاتی ڕستندا تەشیرێسەکە بەنەکەی پێ ڕاگیر بکات، درێژییەکەی (٣٠، ٣٢ سم) دەبێ جا ئەو دوو پارچە دارە کونکراوەکان چەپ و ڕاست لەسەر یەك دادەڕێن و لەگەڵ دەستکەکەیدا تێهەڵکێش دەکرێن و پێ دەلێن (تەشی)، بە هۆی سەلکە تەشییەکەوە دەخولێتەوە، هەندێ تەشیش هەن سەلکەکانی هەر لە دار بە شێوەیەکی خڕ وەکو سەلکە تەشینۆك دروست دەکرێت، دەستکی تەشی هی ڕستنی بەنی قەویان ئەستوور ترە لە هی ڕستنی بەنی باریکان، جا لەلەکەی سەرەوەی ئەندازەکەی بە گوێرەی ئەستووری بەنەکە دەکرێ، واتە: هی باریکان شەقەکەی باریکترە لە هی بەنی قەویان.
* دووەم: تەشینۆك (دیکنێك):
بریتییە لە سەلکێ خڕی کونکراو لەگەڵ دەسکەکەیدا تێهەڵکێش دەکرێ، لەژێر سەلکەکەیدا پارچە بسمارێك، یان تەلێك لە دەستکەکەی کوتراوە و سەرەکەیان وەکو قولاو چەماندووەتەوە، ئەم ئامرازە بە زۆری بۆ بادانی (بەن) بەکاردێت، ئەگەر ژنان تەشییان دەست نەکەوێ ناچار بەمەیان بەن دەڕێسن، درێژییەکەی نزیکەی (٤٥ سم)ە دەبێت.
* سێیەم: تەشیهەڵکەر (کلاَفە) و (خەرەك)یشی پێدەلێن:
لە دار یان ئاسن بە شێوەیەکی بازنەیی دروست دەکرێت بە ئەندازەی (٤٥ سم)ە، ئەم ئامرازە بەنی لەسەر هەڵدەکەن، ئامرازێکی دیکەیش هەیە بە ناوی (خەرەك) ئەوە بۆ ڕستنی لۆکە (پەموو) بەکار دێ، هەیشە جۆلاکان بەنی لەسەر هەڵدەکەن، هەیشە لە جیاتی ئەم (تەشیهەڵکەر)ە کەمەی هێلەگ، یان سینی چای بەکار دێنێ و بەنی لەسەر هەڵدەکات.
* چوارەم: شانە:
بریتییە لە پارچە دارێکی بتەو لە نووکەوە بە پانی دوو ڕیز بسماری نووك تیژی پۆلایان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لێ بەند کردووەو لە چەشنی شانە ڕیز کراون و بە (سیرم)

توند پێکەوە بەستراون، بۆیە ئەم ناوەیان بۆ هەڵبژاردووە، درێژی بسمارەکان کە لە شێوەی (سوژن)دان نزیکەی (٢٠ سم)ە دەبێ دارەکەشی بە ئەندازەی (٤٠ × ٢٠سم)ە، ژنانی تەشیرێس بە سانایی خوری پێ شی دەکەنەوە.
ئەمەش چەند دێرە شیعرێکی فۆلکلۆرییە کە ناوی خوریی و بەن و تەشییان تێدا بەرچاو دەکەوێت:

تەشییەکەت دانێ بەنەکەت هەڵکە[٢]
بە چیە بدوێ بەردەمت خەڵکە
* * *

تەشی باریکان خوری مێ تاڵە[٣]
هەر خۆم بە سەرگەرد ئەو وردە خاڵە
* * *

ئەرێ هەی باڵا بەرز، تۆ پرچی دەروێش[٤]
تەشییەکەت دانێ چۆپییەکەت بکێش
* * *

راوەستاوە لەو بانە، دەستی لە کەمەردانە[٥]
تەشی ئەرێسێ بە ران باریکەو نەشمیلانە
* * *

ئەو باڵا بەرزە تەشی ئەدا پل[٦]
نێچیری خۆمە زەنگیانە لە مل
* * *

تەشییە باریکە، خوری مێ تاڵە[٧]
کێ پەسەندت کا، لەو برکە ماڵە
* * *

بسكو پەرچەم تێکەر بوو لەسەر سینگو مەمکانی[٨]
بای لە بسکان دەبزێوی تەشی دەرێست بە رانی
* * *

نەشمیل نەشمیل نەشمیلانێ دەرێی سێوی سەر دوکانێ[٩]
تەشی دەرێسێ لە هەیوانێ کارو بەرخی لە کوێستانێ
* * *

شیرین تەشی دەرێسێ[١٠]
خاوکانە یا دوو لایە
ناوێرم دەستی بەرمێ
ئەزیرنێ وەی وەی دایە
* * *

لە پەندو رەوانبێژیو مەتەڵی فۆلکلۆریشدا ناوی ئەو ئامرازە سادانە هاتووە لەوانە:
* پەند:
تەشی لەبەر ئەرێسێ[١١]
واتە: مەرایی دەکات.
رێسی باریكو نانی تەنك بە پیتن[١٢]
واتە: هەردووکیان زۆر پەسەندنو دەوام دەکەن.
بە شێوەزاری گۆرانیش واراوە:
تەشییە موی وادە، وێت چە بێ حەیا لادە[١٣]

واتە: بێ حەیا، بێ ئابڕووە لە هیچ شەرم ناکات بۆیە دەبێ مرۆڤ خۆی لێ لادات.

کچ، تەشی دایکی ئەرێسێ[١٤]
واتە: دایك چۆن بێ، کچەکەشی وەکو خۆی دەبێت.
* رەوانبێژی:
سەری کلافەی ون کردووە[١٥]
واتە: سەری لێ شێواوە.
کلافەی شین کەوتووەتە بەینیانەوە[١٦]
واتە: لێك زویربوون.
* مەتەڵ:
هەڵنەپەڕێو دائەپەڕێ پڵنگی، تاڵە موویەك لە لنگی، مەبەست لە تەشییە[١٧]

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:
١. لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە ٣٥، ساڵی ٢٠٠٨ دا بڵاو کراوەتەوە.
٢. چەند مەلۆیەك لە شاری فۆلکلۆری کوردی، ل ٨٩.
٣. هەمان سەرچاوە ل ٨٩.
٤. لە مەقامزان (مام شەوکەت خورشید کاکەیی) وەرگیراوە.
٥. لە هونەرمەندی شادرەوان (سەلاح داودە ١٩٣٥، ٢٠٠٩/٥/٨) وەرگیراوە.
٦. لە گۆرانیبێژی میللی (مستەفا ئەحمەد مستەفا) وەرگیراوە.
٧. چەپکێ لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور، ل ٧٩.
٨. سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، ل ٣٥.
٩. هەمان سەرچاوە، ل ٤٨.
١٠. چەند مەلۆیەك لە شاری فۆلکلۆری کوردی، ل ٢٣٧.
١١. پەندی پێشینان، ل ١٦٠.
١٢. پەندی پێشینانی کورد، بەرگی دووەم، ل ١٠٤.
١٣. پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ، هەردەوێل کاکەیی، ئینستیوتی کەلەپووری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٨٥.
١٤. پەندی پێشینانو قسەی نەستەق لە ناوچەی کەرکوکدا، ل ١٣٤.
١٥. ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، جەلال مەحموود عەلی، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (حسام)، بەغدا ١٩٨٢، ل ١٣١.
١٦. هەمان سەرچاوە، ل ٣٧٥.
١٧. دەستنووسێکی هەردەوێل کاکەیی.

*** كوندەو مەشكە چۆن و بۆ دروست دەكرێن؟[١]**

لە سەرانسەری كوردستاندا ژنانی گورج و گۆڵی دەس ڕەنگین لە پێستەی ئاژاڵ گەلێ بەرهەم دروست دەكەن و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا كەڵكیان لێ وەردەگرن وەك: (مەشكە، هنیرە، كوندە، جەوەندە، هەنبانە، دۆدانە، شیرمەشك، كەرەچن، مەشكۆڵە–مەشكاڵە).

هەروەها بە مووەكەیشیەوە خۆشە دەكرێ و لە جیاتی رایەخ بەكاری دێنن، خەراتەكانیش بێژەنگ و سەرەن و ئەو جۆرە شتانەی لێ دروست دەكەن.

پیشەسازەكانی خۆمانیش لە پێستە كەڵك دەبینن و گەلێ بەرهەمی لێ دروست دەكەن وەكو: (فیشەگلغ، پێڵاو، زین، كیفی شیرو خەنجەر، جەلەی نیلە، دەهۆڵ، دەف، تەپڵ)و هی دیكەیش.

لە كۆمپانیاو كارگەكانیشدا لە پێستە سوود دەبینن و لەپاش (دەباغ)و خۆشەكردنی گەلێ شتی جۆراو جۆری هەمەرەنگی بە سوودی لێ ئامادە دەكەن و لە رووی ئابوورییەوە كەڵكی لێ دەبینرێت وەكو: (بەرگ، كڵاو، پێڵاو، پشتێن)... هتد.

ئێمە لێرەدا دەمانەوێ تەنیا لەسەر ئەو بەرهەمانە بدوێین كە ژنانی كورد دروستیان كردوون و لە كوردەواریدا بەكاریان هێناون، بۆ ئەوەی بزانن چۆن وە بۆ ئەم بەرهەمانەیان هێناوەتە كایەوە؟

*** مەشكە:**

مەشكە (مەشك و هەلیزو هەلیزە)یشی پێ دەوترێ.

لە كەوڵی مەڕو بەران و كاوڕو گوێرەكەو مانگاو گا دروست دەكرێت، بە هی مانگاو گا كە گەورەیە پێی ئێژن (گاوس) ئەوەی پەس و مانگای زۆر بێ گاوس بەكار دەهێنێ ئەوانەی كەمتریان هەبێ لە مەشكە ئاساییدا ماستەكانیان دەژەنن، لە كوردەواریدا مەشكە ژەنین ئیشی ژنانە، ژنی چابك و وریا بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستێ و هەموو ئیشەكانی ناو ماڵ ڕادەپەڕێنێ، ئینجا سێپایەی مەشكەكەی دەهێنێتە پێشەوەو مەشكەی خۆی ئامادە دەكات و ماستەكەی دەكا بەناوو هەندێ ئاوی گەرمی شینەتێنشی تێ دەكات و بە گوریس هەڵیدەواسێ و دەیژەنێت، بە دەم مەشكە ڕاژەندنەوە برێ گۆرانی تایبەت بە مەشكەوە دەڵێت بۆ ئەوەی هەست بە ماندوێتی و دڵتەنگی نەكات، ماوەیەك دەیژەنێ تا كەرەیەكەی پێ دەگات، ئینجا مەنجەڵ دەهێنێتە پێشەوەو كەرەو دۆیەكەی دەردێنێ.

شایەر لەسەر مەشكەو سێپایەو كەرەو دۆو گوریس وتویەتی:

(سێپا سەنەلچۆ،[٢] گوریس خەیاتە[٣]
كەرەیەكەت نوقوڵ، دۆیەكەت نەباتە[٤] )[٥]

ئەوەشمان لەبیر نەچێ كەیبانۆ دۆیەكەی لە (دۆدانە) دا دەپارێزێ، بۆ خواردنەوە كە شل و دۆینەو گەلێ شتی دیكەیش بەكاری دێنن، كەرەیەكەیشی لە (كەرەچن)، یان: لە دەفرێكدا كۆ دەكاتەوە، لەپاش هەفتەیەك سەرجەم ئەو كەرەیە لە مەنجەڵێكدا دەتاوێنێتەوە، ئینجا لەسەر ئاگر دایدەگرێ و هەندێ لێی دەگەڕێ تابن دەنێتەوە هەرچییە (سەردۆو بن دۆ)ی هەیە، واتە گەردو سپیایی ماستەكە دەكەوێتە بن مەنجەڵەكە، ئینجا بەهێڵەك دەیپاڵێوێ و لێی دەگەڕێ تا بە تەواوی سارد دەبێتەوە، لەپاشاندا دەیكاتە نێو (هیزە)وەو لە (هیزەدان)دا دەیپارێزێ و بەرە بەرەش لێی بەكار دێنن، ئەوەیشی لەخۆیان بە زیادە بوو بەپارە دەیگۆڕنەوە.

* چۆن مەشكە دروست دەكرێ؟

ئەو ئاژەڵەی كە سەری دەبڕن، دەبێ بەجوانی لە دەمەوە كەوڵ بكرێت بێ ئەوەی هیچ كونێكی تێدا بكەوێت، ئەم كارەش قەسابی شارەزای لێهاتووی دەوێت.

ژنانی گورج و گۆڵی كوردەواری خۆمان ئەو پێستەیە بەم شێوازە خۆشەو ئامادە دەكەن:

لە مەنجەڵێك دا هەندێ (لۆرك)[٦] دروست دەكەن، ئینجا پێستەكە دەخەنە نێوە لۆركەكەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژو سێ شەو تیایدا دەمێنێتەوە، ئینجا بە (كێردێك) پەیتا پەیتا مووەكانی دەڕنن، ئەمە بە تەنیا جارێك پاك نابێتەوە بەڵكو یەك دوو جاری دیكەیشی دەوێ بخرێتە نێو ئەو لۆركەوە هەر جارەیش دەبێ سێ ڕۆژ بمێنێتەوەو بە پوختەیی گەنە گۆشت و مووەكانی برنرێت تا بە تەواوی پاك و خاوێنی دەكەنەوە، زۆر جار ژنان دەچنە ڕۆخی زێ و جۆگاو سەر كانییەكان و لەوێ بەم كارە هەڵدەستن، بۆیە شایەر لەم بارەیەوە وتویەتی:

(ئەو كچە، ئەچێ بۆ كانی
پێستەی مەشكە ئەشۆرێ)[٧].

ئینجا توێكڵە هەنارو جەوت و سیچكە[٨] دێنن و لە دنگ و میل دا دەیكوتن، بە وشكی دەیكەن بە مەشكەكەوەو لە پاشاندا سێ ڕۆژ بەو جەوت و توێكڵە هەنارو سیچكەوە لە ئاویان دەنا، بەمەیان دەوت: (تاڵ كردنی مەشكە)، ئەوەتا شایەر وتویەتی:

(بۆ كوێ ڕۆییە كەیوانۆێ ئەم ماڵە؟[٩]
(كوننە)ی لە جەفتە، (مەشكە)ی لەتاڵە)[١٠].

لەپاشاندا مەشكەكە دەردێنن و پڕی لە لم، یان: (خۆڵ) دەكەن بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك بەو لمەوە دەمێنێتەوە تا ئەو پێستەیی وشك دەبێتەوەو قەد دەگرێت، ئینجا بۆ ماوەی مانگێك یان زیاتر لە ئاگردان، یان تەندووریاندا هەڵیاندەواسی و (قانگ) یان دەدا بۆ ئەوەی بەو دووكەڵە ئەو مەشكەیە تون و سفت بێ بەمە دەڵێن (قاڵ كردن) واتە: خۆشە كردن، لە پاشاندا دایدەگرن و لە ئاوی دەنێن تا بەچاكی دەفیسێ، ئینجا دەری دێنن و هەر هەنگلێكی (بەردە هەنگلێكی)[١١] تێدەكەن و بە (بەنی هەنگڵ)[١٢] دەیبەسن بە لۆلەپەكانەوە.[١٣] ئینجا بە (گوریس)[١٤] بەهۆری ئەو لۆلەپنەوە ناونێركە كە[١٥] دەبەسترێت بە سێپایەكەوە كاتی[١٦] مەشكە پڕ لە ماست كرا بە (دەرگاوێن)[١٧] دەمەكەی دەبەستن، ژن لە كاتی ژەنیندا دەستی بەملاو بەولای لۆلەپی پێشەوەی دەگرێت و بەدەم سۆزو گۆرانییەوە دەیژەنێت.

دەبێ هەر (١٠– ١٥) ڕۆژ جارێك ئەو مەشكە بەتاڵ بكرێت بۆ ئەوەی سفت و قایم بێت.

ئەگەر هات و ئەو مەشكەیە كونێكی بچووكی لێ بوو (پڕك) ی[١٨] تێدەخەن بۆ ئەوەی لە كاتی ژەنیندا دۆیەكەی نەڕوات.

لەم خشتە شیعرەدا ناوی پڕك هاتووە:

(زوڵفت گرێ وەك قوڵفی ڕەشکە، دگان شاش‌و واش وەك پشکی مەشکە[١٩]

*** کەرەچن:**

خێوڵکەو کەردان‌و مەشکۆڵەیشی پێدەڵێن:

جۆر مەشکەیەکی بچووکە، دەمەکەی لەو گەورەترە، شێوەی دروست کردنی دەقاو دەق وەکو مەشکەیە، کابانی ماڵ هەموو ڕۆژێ بەرە مەشکەکەی خوێی پێوە دەکات‌و لەم کەرەچنە دەیپارێزێت، لەدوای هەفتەیەك (زوڵاڵ)، یان: (قاڵ) ی دەکات‌و لەم (هیزە)ی دەنێت.

*** مشکالە:**

جۆرە مەشکەیەکە لەجیاتی دەفر بۆ میوەو گەزو هەڵگرتن بەکاری دێنن.

*** دۆدانە (درووله):**

بریتییە لە مەشکۆڵەیەکی بچووك، دۆی تێدا دەپارێزن بۆ خواردنەوە، لە کەوڵی بەرخ دروست دەکرێت، شێوەی دروست کردنی هەروەکو مەشکەو کەرەچنە.

لەسەر ئەم دۆدانەیە ئەم شیعرە فۆلکلۆرییە وتراوە:

کورێك بۆ گاڵتەو گەپ بە دەزگیرانەکەی وتووە:

(سینگت ساجەکەی جۆتیا برژاگە[٢٠]

مەمکت (دۆدانە)ی دۆ تیا ترشاگە)[٢١]

*** شیرمەشك:**

گۆرە ماست‌و جەوەنەی گۆرە ماستیشی پێ دەڵێن:

بریتییە لە مەشکەیەکی بچووك لە کەوڵی بەرخ دروست دەکرێت، شوانەکان لە دەشت‌و دەرمەری تێ دەدۆشن، ئینجا وەکو هەوێن هەندێ ماستی تێ دەکەن‌و لە هەگبەی دەنێن‌و لەسەر وڵاخی دادەنێن هەر کاتی پێویستیان پێ بوو نۆشی دەکەن، شێوەی دروست کردنی ئەم شیرمەشکەیە هەر وەکو مەشکە وایە.

لەسەر ئەم شیرمەشکەیەیش شیعری فۆلکلۆری هەیە لەوانە:

هەی بێریلێ،[٢٢] بێریلێ مەلەکان[٢٣]

(شیرمەشکی) گرانە هەلکە[٢٤] بەلەکان[٢٥]

* * *

واهاتە خوارۆ (مەشکە شیر) لەشانی

نیشتووە لە گۆنای تۆزی ڕێگەی ڕان[٢٦]

لەسەر مەشکە گەلێ شیعرو بەرهەمی جۆراوجۆری فۆلکلۆری هەن لەوانە:

شیعر:

(مەشکەم خۆشەی دەباغە[٢٧]

ماستی بێ خەوش‌و ساغە)

(قیبلەم ماڵیان لە دێیە

ساحێب تەکیەو وەجاخە)

* * *

(مەشکە ژەنم سەنگینە[٢٨]

دەس‌و پەنجەی ڕەنگینە

قەدو باڵای شیرینە)

* * *

دایم مەشکەم وە دارە

سێپاکەی دار هەنارە[٢٩]

کەف‌و کەرەی وەبارە)

* * *

بژەن بژەن مەشکۆڵە[٣٠]

دێشێ ئەم شان‌و قۆڵە

کوڕیەم زۆر نەرم‌و نۆڵە

وا خەوتووە لەو چۆڵە

(وا هاتە خوار، مەشکە شیر لەشان[٣١]

نیشتووە لە گۆنای، تۆزی ڕێگە ڕان)

* * *

مەشکەم مەشکەی مانگایە[٣٢]

(لۆلەپ) لە دار خورمایە

* * *

*** کەندە:**

کوننەو کونرك‌و کونگەیشی پێ دەڵێن:

ئەم بەرهەمە لە پێستەی بزن‌و سابرێن دروست دەکرێت، کەوڵی بزنە کێوی‌و ئاسکیش دەبێت ئەگەر بە دەست بکەوێت، لەکاتی کەوڵ کردنیدا نابێ کونی تێ بکەوێت، لە پێشا (بەن) وردە گۆشتەکانی ڕووی ناوەوەی بە چەقۆیەکی تیژ دەیکرێنن‌و پاك‌و خاوێنی دەکەنەوە، ئینجا توێکڵە هەنارو جەوت پێکەوە دەکوتن، هەندێ ژن مازوویشی تێ دەکات، مەنجەڵە ئاوێك دێنن ئەو هەنارو جەوتەی تێدەکەن‌و دەیکوڵێنن، لەپاشاندا دایدەگرن‌و ساردی دەکەنەوەو دەیکەنە نێو پێستەکەوەو بە خوڵەمێش دایدەپۆشن، بۆئەوەی نەرم‌و نیان بێت.. ئەمە دوو جار وادەکەن هەر جارەی بۆ ماوەی (٧) ڕۆژ ئەو ئاوی جەوت‌و توێکڵە هەنارە لەو پێستەدا دەمێنێتەوە، لەپاش ئەمەیش دەستێکی دیکەیش وا دەکەن‌و هەڵیدە شەڵەقێنن‌و بەتاڵی دەکەنەوە، لێرەدا بوو بە (کوندە)، لە ئەنجامدا بە ئاو پاك دەیشۆن‌و لەجیاتی کووپەو جەرەو شەربە بۆ ئاو کێشان‌و خواردنەوە بەکاری دێنن، ئاوی کوندە ساردەو تامیشی خۆشە ئەو تامە دەگەڕێتەوە بۆ تامی جەوت‌و توێکڵە هەنارەکە، وەکو کووپی ئاو لە کوڵەناندا لەسەر پارچەیە چیخ دایدەنێن، یان: بۆ ئەم مەبەستە دارو قامیشی بۆ ڕێك دەخەن‌و لەسەری دایدەنێن، ژنانیش لە کۆڵی دەبەستن‌و لەکانی ئاوی پێ دێنن، بۆیە شایەر وتویەتی:

خۆزگەم بە (کوننە) پێستەی بزنە[٣٣]

بە شەوو بە ڕۆژ ئەو هاوڕێی ژنە.

– لەم پەندانەشدا ناوی کوننە هاتووە:

* کەر لەکوێ کوتووەو (کوندە) لەکوێ دراوە[٣٤]

– ئەم پەندە بە دوو قسە دەوترێ کە پەیوەندیان بەیەکەوە نەبێ.

* (کوننە) لەڕێی سەراو ئەدرێ[٣٥]

– واتە: مرۆڤ هەموو کات قازانج ناکات لە کارو پیشەو مامەڵەدا بەڵکو هەندێ جار زەرەریش دەکات.

*** کنۆڵك:**

ئەگەر جەوەندە، یان: کوندەی گەروە لەسەرەوە یان لەبنەوە هەندێکی لێ بدڕیایە ژنان بچووکیان دەکردەوەو بەدیلوان و دەزوو دەیاندوورییەوەو پێیان دەوت: (کنۆڵك)، کیژۆڵە تازە پێ گەیشتووەکان لەکانی و جۆگادا ئاویان پێ دەهێنا، یان: شوانەکان لەجیاتی جەوەندە بەکاریان دەهێنا.

شایەنی وتنە لەسەر ئەم کوندەیە گەلێ هەڵبەستی هەمەرەنگی فۆلکلۆری دڵگیر وتراوە، ئەمەش چەند نموونەیەکە لە خەرواریك.

(خۆزگە من بوایم لە جیاتی ئەو (کوننە)
بروایەم وەکۆڵ ئەو شۆڕە ژنە).[٣٦]
* * *

(ئەچی بۆ کانی چاوت لەبەر بێ[٣٧]
(کوننە)کەت شەمسی[٣٨] ئاوت شەکر بێ)
* * *

(یەك نەو جوان دیم ئاڵ والاّ در[٣٩]
وە پەنجەی شمشاڵ (کونە)شێ مەکەرد پڕ)
* * *

(خۆزگەم بە (کوننە) دایم سوارە[٤٠]
سمت و کللەکەی لێوە دیارە)
* * *

تورمە[٤١] بەتورمە، تورمە جارانە[٤٢]
دەچییە سەر ئاوێ بەفرو بارانە
شەقاوان ماوێ (کوندە)ت گرانە
ئاوران مەدەوە عالەم دوو زمانە.
* * *

مەچۆ سەراوێ (کوندە)ت گرانە[٤٣]
خۆت بلەقێنە لەسەر نێکانە
ئەی ماخۆ[٤٤] مرد (کوندە)ت نێریانە
هەر بخلسێی مارم وێرانە[٤٥]
* * *

(کوننە)ش پر مەکەرد چە دەریای بێ پەی[٤٦]
پەنجە چون شمشاڵ قامەت وێنەی نەی[٤٧]
* * *

خۆزگەم بە (کوننە) رەفیقی ژنە[٤٨]
ئەچێ بۆ کانی، سەرشانی ژنە
* * *

دوورین خەمە[٤٩] لیت وە تەعجیل و تاو[٥٠]
(کوننە)کەت هەڵگر بەو[٥١] ئەرای[٥٢] سەراو
* * *

دۆێتەیل[٥٣] بانەوە سەرکانی چۆڵە
زرەی بان پشتوین (کوننە) وەکۆڵە[٥٦]
* * *

*** جەوەندە (جەوەنە):**

ئەم جەوەندەیە هەر وەکو (کوندە) وایە، لە پێستی (کار) هەر لە چەشنی کوندە ئامادە دەکرێت، بەلاّم ئەمەیان تەنیا شوان و ڕێبوارو کاروانچییەکان بۆ ئاو خواردنەوە بەکاریان دەهێنا، لەژێر سکی گوێدرێژدا دەیانبەست، یان: لە نێو هەگبە دایاندنا بۆ ئەوەی ڕۆژ لێی نەدات. لە شیعری فۆلکلۆریدا نێوی هاتووە لەوانە:

(بەسەر گەردت بم (جەوەنە) بەدەس[٥٧]
تەمێی دایکتە ماچ نادەی بەکەس).
* * *

(هۆ شوانە، شوانە فەرەنجی لەبەر[٥٨]
ئاوی (جەوەندە)ت خۆشە وەك شەککەر).
* * *

(ئەو شوانە وێڵە خەیاڵی خاوە[٥٩]
(جەوەندە)ی ئاوی پێستەکەی خاوە).
* * *

(سوار هۆ سوار، سەرت لەوەر بوت[٦٠]
(جەوەنە)ت بولغار ئاوت شەککەر بوت).[٦١]

*** هەنبانە:**

هەمانەو (هەمان)یشی پێ ئێژن:

ئەم بەرهەمە لە پێستەی مەرو کاورو بەران دروست دەکرێت، پێستەکانیان ئەستوورە، ئەگەر بووبێتیش ماندوو بوونێکی زۆری دەوێ و بەئاسانی نایەت بەدەستەوە بۆیە پێشینان وتویانە: (ژنێکم دەوێ ژنانە.. پێستەی بزن بکا بە هەمانە) [٦٢] لەم پەندە وا دەردەکەوێت پێستەی بزن کەم ژن دەتوانێت بیکا بە هەمانە، ئەو ئاژەڵەی کە سەری دەبڕن و پێستەکەی بۆ هەمانە بشێ قەسابەکە لە (دەم)یەوە دەیکەنێت و ناهێڵێ ئەو پێستەیە بریندار بێت، لەپاش ئەوەی وەکو مەشکە بەهۆی (کێرد)و (ئاردەوا)وە لە موو پاك و خاوێن دەکرێتەوە، ئینجا لەبەر ڕۆژ هەڵیدەخەن تا برێ گرژ دەبێتەوە، ئینجا سنگی دارین (میخ) لەناو حەوشە یان لەدەرەوە دادەکوتن، ئەم سنگە نوکەکەی تیژەو کلکەکەی ئەستوورە کەیبانۆی هەمانە دروست کەر بەخێرایی پێستەکە دەهێنێ و دەبا بەسەر کلکی ئەو میخەدا تا بەجوانی سپی دەبێتەوە لە پاشاندا ئەو کەوڵە لە سەر پارچە قوماشێك دادەنێ و بە گەلاّکووت (گەلاّ کوتك، دۆ گەج) دەیکوتێ، ئینجا هەڵدەخرێ و وشك دەکرێتەوە، لێرەدا بوو بە هەمانەیەکی پاك و جوانی نەرم و شل.

ئەم هەمانەیە لە کوردەواریدا بۆ دەف و تەپڵ و دەهۆڵ و پەمپی ئاسنگەری و پاراستنی جلوبەرگ و شت و مەك و ئازووقە بەکار دەهێنرا، یان بۆ بووك کەلوپەل، یان: کولیچەیان تێ دەکرد.، لەشیعری فۆلکلۆری و پەندی پێشیناندا ناوی هاتووە لەوانە:

شیعر:

قاپ و قاچاخ و هیربار[٦٣] لە وێندە ریز کرایە[٦٤]
برۆش لەناو (هەمبانە)ی ساوەر لە کەندوودایە.
* * *

پەندی پێشینان:

– باری خۆم دیوە بە دەهۆڵەوە[٦٥]
نایەم بە هاوار (هەمانە) بە کۆڵەوە.

- واتە: لەبەر بەرژەوەندی خۆی بە تەنگی کەسەوە نایەت.
* * *

- من ئەوەی بنی ( هەمانە)کە کوشتوومی.(٦٦)

- دەگێرنەوە کابرایەکی زۆرداری ناڵەبار بە دزییەوە بەردێك دەخاتە نێو هەنبانەکەیەوەو زرمو کوت بەر دەبێ لە هەژارێك، کابرای هەژار هاوارو فیغانی لێ هەڵدەستێ، کابرای زاڵم بە ئامادە بوان دەڵێ: بروانن ئەم کابرایە چەندێ فێڵبازە بە لێدانی هەبنانە بەتاڵەکە هاواری لێ بەرز بووەوە، هەژارەکەش لە وەڵامدا دەڵێ: (من ئەوەی بنی هەمبانەکە کوشتوومی).،

ئەمە یەکێك دەیڵێ کە بەنهێنی زوڵمێکی زۆری لێ کرابێ و نەوێری بیدرکێنێ و باسی لێوە بکات.

- دەستی لە بنی (هەمانە)وە دەرچووە.(٦٧)

- ئەمە بە یەکێکی زۆر نەزان و ناشارەزا دەوترێ، هەروەها بۆ هەژاری دەست کورت و نەداریش دەوترێت.

* هیزە:

(خیگە)و (خیگ)و (خیبە)و (خیزە)یشی پێ ئەوترێت:

ئەم بەرهەمە لە پێستی مەڕو بەران و بەرخ ژنان لە ماڵەوە بەم شێوەیە دروستی دەکەن:

لە پاش سەر برینی ئاژەڵەکە ئەو پێستەیە بۆ ماوەی (سێ) ڕۆژ لەبن پەڕۆو پاتاڵ یان: جێگایەکی گەرمدا دەیپارێزن، ئینجا بە ئاسانی خورییەکەی لێ دەکەنەوە، تەنیا پێستە رووتەکە دەمێنێتەوە، ئینجا خوێ و ئاردو هەویر ترشی پێوە دەکەن کە پێی دەڵێن (ئارداو)، بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ لە شوێنێکدا دەیپێچێتەوە، ئینجا بۆ ماوەی (١) ڕۆژ لەبەر خۆر هەڵیدەخەن تا کزر دەبێتەوە، لەپاشاندا هەرچی وردە گۆشت و بەز بەقەدی پێستەکەوەیە بە چەقۆیەکی دەم تیژ بەچاکی پاکی دەکەنەوە تا وەکو هەمانەی لێدێت، ئینجا نزیکەی (٥) کیلۆ جۆ لە ساجێکدا دەسووتێنن و لە (دنگ) و (میل)دا دەیکوتن و بە وشکی دەیکەن بە هیزەکەوە، ئینجا هیزەیەکی کۆنی بێ کەڵك دێنن و لە مەنجەڵێکدا ئاوی دەکەن بەسەرداو دەیکوڵێنن، لەپاشاندا ئاوو دۆشاوەکەی دەکەنە نێو پێستەکەوەو بۆ ماوەی (٥) ڕۆژ دەیهێڵنەوە بەمە دەڵێن (هیزە کوڵێن)، هیزە نوێیەکە هەموو ئەو ئاوو دۆشاوە هەڵدەمژێ، ئینجا نزیکەی (٢- ٣) کیلۆ دۆشاوی تووی تێدەکەن، ئەم دۆشاوە لەپاش سێ ڕۆژ دەریدێنن و فرێی دەدەن، ئینجا فووی پێدا دەکەن و پری لە (با) دەکەن و تووند دەمی دەبەستن، ماوەی دوو ڕۆژ بەو بایەوە دەیهێڵنەوە، لێرەدا هیزەکە ئامادەیە بۆ ئەوەی ڕۆنی تێبکرێت و لە (هیزەدان)دا بپارێزرێت، کە ڕۆنیان تێکردو بەکاریان هێناوە، لەپاش ماوەیەك بەتاڵ بووەوە ئینجا دۆشاوی تووی تێدەکەن و بەرە بەرە لێی دەردەکەن و بەنانی کولێرەی گەرمەوە دەیخۆن، بە هەقیقەت خواردنی خۆشە، ئەم کارە بۆ ئەوە ئەنجام دەدرا تا ئەو هیزەیە نەرمو شل و شاوو پوختە بێ و ڕەنگیشی جوان و سوور هەڵگەڕێ لە بەکار هێنانیشدا تامو بۆنی ئەو ڕۆنە خاوێن و بۆن خۆشە تێك ناچێت، ئەمە لە ساڵێکدا دوو جار ئەنجام دەدرێت و پێی دەڵێن: (هاڵوێن کردنی هیزە)، یەکەمیان لە سەرەتای وەرزی بەهاردا کە ڕۆنی نوێ پەیدا دەبێ، دووەمیشیان لە کۆتایی پاییزدا کە ماڵات وشك دەکات و ڕۆن نامێنێ، بۆیە لەم پەندەدا وتراوە: (هیزە ساڵی دووجار هاڵوێن ئەکرێ)(٦٨).

هەروەها (هیزە) لە زستاندا بۆ پاراستنی (قاورمە)ش بەکار هێنراوە.

لەبەرهەمی فۆلکلۆریدا گەلێ ناوی هاتووە لەوانە:

شیعر:

ئاوی سارده شەربەتە(٦٩)

ڕۆنی مەرە لە (هیزە)یە.

مەتەڵ:

- تانجی زەردوو، لە کونامردوو- مەبەست لە (هیزە)یە.(٧٠)

- ڕەشکەی بنەباتێ، خۆش خۆش دەچێتە لای کایانێ- مەبەست لە (هیزە)یە.(٧١)

پەندی پێشینان:

- نەکار هەیەو نە پیشە (هیزە) ڕۆنەکە بکێشە.(٧٢)

- ئەمە بە یەکێك دەوترێ کە خۆی بە ئیشێکی پڕو پووچەوە خەریك کردبێ.

- ڕۆن بۆ (هیزە) گۆشت بۆ دیزە.(٧٣)

- واتە: هەر ئامرازێ بۆ شتێ بەکار دێت.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- لە گۆڤاری (کەلەپووری کورد)، ژمارە (١٨)، پاییزی (٢٠٠٣)دا بڵاوکراوەتەوە.

٢- سەنەلچۆ: سەندەل، جۆرە دارێکی بۆن خۆشە.

٣- خەیاتە: بەنی بادراو. (زوڵفت خەیاتەی خاوە).

٤- نەبات: جۆرە شەکرێکی مینایی ڕەنگە.

٥- سەعدیە عەلی وەهاب (١٩٣٥- ) کەرکوك.

٦- لۆرك: (شیرەوا)و (ئاردەوا)شی پێ ئێژن، لەم شتانە پێك هاتووە: (دۆ، خوێ، هەویر ترش).

٧- مینا وارانی بابا (١٩٢٢- ) داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.

٨- سیچکە: سیچك، جۆرێکە لە بەردی دارمازوو.

٩- کەیوانۆ: کەیبانۆ، کابانی ماڵ.

١٠- نەشمیە غەیبوڵڵا سەلیم (١٩٣٩- )کەرکوك، داقوق ئاوایی تۆپزاوە.

١١- بەردی هەنگڵ: بەردێکی بچووکە دەخرێتە نێو هەنگڵی مەشکەوە بۆ ئەوەی مەشکەکە بەچاکی ببەسترێت بە دەسە خوردەکانەوە (لۆلەپ).

١٢- بەنی هەنگڵ: چوار پارچە بەنن هۆنراونەتەوەو بوونە بە (خرێنە)، بەهۆی ئەم پەتانەوە مەشکەکە دەبەستن بە دەسەخوردەکانەوە.

١٣- لۆلەپ: (دەسەخورد)و (دەسەخورت)و (لۆرەلەپ)یشی پێ دەڵێن، بریتییە لە دارێکی لوولەیی تاشراو بە ئەندازەی پانی مەشکەکە لە هەردوو سەرەوە باریك کراوەتەوەو هەر یەکە دوو گوێشی بۆ کراوەو لە ناوەڕاستیشەوە کونێکی درێژیشیان بۆ ئامادە کردووە، بۆ ئەوەی (ناوتێرك)ە کەی

تێهەڵکێش بکرێت.
١٤- گوریس: (گوروێس)، پەتێکی درێژە جوتیارەکان خۆیان لەبەنی مووی بزن دەیهۆننەوەو ئامادەی دەکەن.
١٥- ناونێرك: (ناودۆك)و (دۆ وژەنگ)و (لویلەچۆ)و (لویلە ژەن)یشی پێدەڵێن، بریتییە لە دارێکی لووس بە ئەندازەی مەشکەکە درێژە، هەردوو سەرەکەی بە پانی تاشراوە، لە سەرەوەی مەشکەکە دەکرێ بەکونی هەردوو لوولەپەکانەوە (دەسەخورد).
١٦- سێپا: بریتییە لە سێ داری درێژ لە سەرەوە کون کراون، بە هۆی ئەو کونانەوە بە گوریس بەیەکەوە دەبەسترێن، مەشکەکەی پێوە هەڵدەواسن و دەیژەنن، شایەر لەسەر سێپاو گوریس وتوویەتی: سێپا سەنەلچۆ گوریس خەیاتە، کەرێکەت نوقڵ، دۆکەت نەواتە، بروانە لاپەرە ١٠٨، (چەپکێ لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور)، عەلی شارەزووری، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨٢.
١٧ دەرگاوێن: (بەنی دەمگر)و خرێنەی دەم بەست)و (دەمبین)یشی پێدەڵێن، پەتێکی باریکەو کراوە بە خرێنە، دەمی مەشکەو کوندەو هەمبانەی پێدەبەستن، بۆ چاوەزار مورووی شینی پێوە بەند دەکەن.
١٨- پژك: (پشك)، بریتییە لە چۆکڵێکی بچووك دەخرێتە کونی مەشکەکەوە بۆ ئەوەی دۆی لێ نەروات، بە مورووی شین یا بە دوگمە بە پارچە کوولەکەی وشکەوە کراو یا بەپارچە مەشکەی کۆن ئەو جۆرە کونانە پینە دەکرێن.
١٩- چەند مولۆیەك لە شارای فۆلکلۆری کوردی، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٦، لاپەرە ٢٦١.
٢٠- هەمان سەرچاوە، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، لاپەرە ٢٦١.
٢١- ترشاگە، تورشیاگە، ترشاوە.
٢٢- بێریلێ: بێری، خانمی مەر دۆش.
٢٣- فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، محەمەد کەریم شەریف، چاپی دووەم، لە چاپ دانەوەو زیاد کردنی سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٦، لاپەرە ١٧٢.
٢٤- هەلك: قسەخۆش.
٢٥- بەلەك: گۆشتی پوین، واتە: پویزت جوان و ناسکە.
٢٦- هەمان سەرچاوە، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، لاپەرە ٢١٦.
٢٧- هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگییەکەم، هەردەوێل کاکەیی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٥، لاپەرە ٣٣.
٢٨، ٢٩- هەمان سەرچاوە سەعدیە مەلا وەهاب.
٣٠- هەمان سەرچاوە، هەردەوێل کاکەیی، لاپەرە ٣٢.
٣١- پورێ ئایشێ رەحمان جەباری (١٩٢٥ی ز- )کەرکوك، گرەکی مەولەوی.
٣٢- هەمان سەرچاوە هەردەوێل کاکەیی، لاپەرە ٣٨.
٣٣- هەمان سەرچاوە پورێ مینا وارانی بابا.
٣٤- پەندی پێشینان، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧١، لاپەرە ٣٤١.
٣٥- پەندی پێشینان و قسەی نەستەق، لەناوچەی کەرکوکدا، هەردەوێل کاکەیی، ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل، ١٣٨.
٣٦- مەقامزان شوکر محەمەد قادر (١٩٤٠- )، بە شوکر خەیات ناسراوە، زووتر لە ئاوایی قەڵخانلوی مەرکەز لەناوچەی (خورماتوو) دادەنیشت، ئێستا نیشتەجێ کەرکوکە.
٣٧- هونەرمەندی میللی مستەفا ئەحمەد مستەفا (١٩٤٧- )، بە مستەفا نانەوا ناسراوە، خورماتوو.
٣٨- شەمسی: شەمز، ژاکاوی، سیسی.
٣٩- هونەرمەندی ناسراو سەلاح داودە (١٩٣٥- ٢٠٠٩/٥/١٨) کەرکوك شۆریجە.
٤٠- مەقامزان ئەحمەد فەرەج میلناسری (١٩٥٥- ) خورماتوو، ئاوایی میلناسر.
٤١- تورمە، تارا، جۆرە کوتاڵێکی جوان و تەنکە، لە کوردەواریدا دەدرێ بەسەرو شان و مل بووکدا، ژنانیش لە پێش بووکدا سەمای پێوە دەکەن.
٤٢- سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٩٠، لاپەرە ٤٠.
٤٣- هەمان سەرچاوە، سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی، لاپەرە ٩٨.
٤٤- ماخۆ: خاوەن، خێو، ساحێب.
٤٥- هەمان سەرچاوە، هەردەوێل کاکەیی، ب/١، لاپەرە ٤٨.
٤٦- بێ پەی: زۆر قوول، بێ بن.
٤٧- نەی: قامیش، نەیچە.
٤٨- بۆنی هەڵاڵان دێ، مەحموود زامدار، بەرێوبەریەتی گشتی رۆشنبیری کوردی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا ١٩٧٥، لاپەرە ٦٦.
٤٩- خەمە، دەخەم.
٥٠- هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی سێیەم، ئیبراهیم باجەڵان و هەردەوێل کاکەیی، ئینستیتوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەرە ٦٣.
٥١- بەو: وەرە، بێ.
٥٢- ئەرا: بۆ.
٥٣- دوێت: کچ، کیژ، دوێتەیل، کۆی دوێت، واتە: کچەکان.
٥٤- بانەوە: وەرنەوە.
٥٥- پشتوین: جۆرە سەربەستێکی رەشی رێشوەدارە، ژنان دەیبەستن بە سەریانەوە.
٥٦- هەمان سەرچاوە، ئیبراهیم باجەڵان و هەردەوێل کاکەیی، لاپەرە ٦٣.
٥٧- هەمان سەرچاوە، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، لاپەرە ٦٣.
٥٨، ٥٩- پورێ مینا وارانی بابا (١٩٢٢- ) داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.
٦٠- بوت: ببێ.

٦١- سەعدیە عەلی مەلا وەهاب (١٩٣٥- ) کەرکوک.
٦٢- هەمان سەرچاوە، پەندی پێشینان و قسەی نەستەق..، هەردەوێڵ کاکەیی، لاپەڕە ١١٤.
٦٣- هیربار: دەفری گڵێنی سوورەوە کراو.
٦٤- هەمان سەرچاوە، سەعدوڵڵا شێخانی، لاپەڕە ٢٦.
٦٥- پەندی پێشینان کورد، عەلی مەعرووف شارەزووری، بەرگی دووەم، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨٧، لاپەڕە ٣٦.
٦٦- ئەحمەد ڕەزا عەزیز (١٩١٧- ٢٠٠٢/١٢/٩ی ز)، داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.
٦٧- سەرچاوەی پێشوو، شێخ محەمەدی خاڵ، لاپەڕە ٢٣٧.
٦٨- هەمان سەرچاوە، عەلی مەعرووف شارەزووری، ب/٢، لاپەڕە ٢٢١.
٦٩- دەستنووس، هەردەوێڵ کاکەیی.
٧٠- دەستنووس، هەردەوێڵ کاکەیی.
٧١- دەستنووس، هەردەوێڵ کاکەیی.
٧٢- پەندی پێشینانی کورد، بەرگییەکەم، عەلی مەعرووف شارەزووری، ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، ناوچەی ئۆتۆنۆمی، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨١، لاپەڕە ١٠٣.
٧٣- هەمان سەرچاوە، عەلی مەعرووف شارەزووری، بەرگی/٢، لاپەڕە ٢٣٦.

*** سەبەتە چنین[1]:**
لە کوردەوارییدا دانشتوانی گوندو لادێکان بە زۆری بە کاری کشتوکاڵییەوە خەریکن‌و خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵەکانیان لە سەری گوزەران دەکەن، جا جوتیارەکان هەر لە دێر زەمانەوە بیریان لەوە کردووەتەوە رێگایەك بدۆزنەوە بۆ گوێزانەوەی بەروبوومی کشتوکاڵییەکانیان لەسەر کێڵگەو مەزراکانیانەوە بۆ شار یان ماڵەوە هەندێ بەرهەم هەن دەشێ بە جەواڵ‌و هەگبەو خەرار بگوێزرێتەوە وەکو (دانەوێڵە، گوێز، بەروو، مازوو، تووتن، هەرمێ، مێوژ، هەنار، سێو)، یان سەوزە (شینایی، تەرە) وەکو (کەوەر، کەرەوز، پیاز، شووتی، کاڵەك، خەیار، ترۆزی، توور، شێلم).
هەیشە دەبێ بە قەرتاڵە بگوێزرێتەوە وەکو (هەنجیر، ترێ، تەماتە، تووی تەر)، بۆ ئەوەی بەسەر یەکدا نەتەپێن‌و بۆگەن‌و خەسار نەبن‌و رەنجەکەشیان بە فیڕۆ نەروا، چونکە سەبەتە، یان قەرتاڵە لە هەموو لایەکەوە (با) دەکێشێ‌و بەرهەمەکەش لە ناویدا بە فێنکی‌و خاوێنی بەبێ زەرەرو زیان دەمێنێتەوە.
بەرهەمی چنینی سەبەتە جۆرو شێوەی زۆرە، هەمووشیان جوتیارەکان خۆیان لە توولی تەر (شورك) دەیچنن‌و دروستیان دەکەن وەکو توولی ئەم درەختانە (هەنار، بایەف، کفر، بی، ئەرخەوان، قەرەقاج، توو، پەڵك) بۆیە بەم پیشەیە دەڵێن (توولین) واتە ئەو بەرهەمە دەستکردانەی کە لە توول (شوول سەوە) ئامادە دەکرێن، ئەمەش هەندێ لەو بەرهەمانەیە:

*** قەرتاڵە[2]:**
ئەم بەرهەمە قەوارەکەی بە ئەندازەی مەترێك یا زیاتر درێژیەتی‌و پانییەکەشی نیو مەترە دەبێت، لە بنەوە تەسکەو لە سەریشەوە بڵاوە، هەندێ جار لەمەش گەورەتر، یان بچووکتر دەچنرێت، هی باری هێستر لە هی گوێدرێژ گەورەترە ئەمە بۆ گوێزانەوەی ترێ‌و هەنجیرو تەماتەو تووی تەر لەسەر کێڵگەوە بۆ ئاوایی یان بۆ شار لەوێ لە بازار دەیفرۆشن‌و بە پارەکەی شمەك‌و پێویستی خۆیانی پێدابین دەکەن، سەبەتەکان بە پری بە گوریس بە رێکوپێکی توند دەبەستن، ئینجا دەیخەنە سەر پشتی وڵاخ‌و پێ دەوترێ (بار)، بارە ترێ، یان بارە هەنجیر، بارە توو... و.
پێشینان وتویانە (ترێ بە دارەوە، هەنجیر بە بارەوە)[3] واتە ترێ لە دارەکەی بکرێتەوەو بیخۆیت زۆر خۆشە، هەنجیریش بە پێچەوانەوە شەوێك لە سەبەتەدا
بێ‌و شیرەکەی بمرێ ئینجا نۆشی کەیت گەلێ خۆشو بەتامە. ئێستا لەم سەردەمەدا لە شارەکاندا بۆ تەماتەو ترێ‌و هەنجیرو تووی تەر سەنوقی پلاستیك بەکار دێنن.

*** پەرچنە[4]:**
ئەمیشیان هەر لە چەشنی ئەوەییەکەم (قەرتاڵە) دەچینرێت، بەڵام ئەمیان بچووکترە نزیکەی (٥، ١٠) کیلۆگرام دەگرێت، هەندێ جار لەوەش فرەتر. خاوەن بێستان یان رەز بە زۆری بۆ بەرچنینی ترێ‌و هەنجیرو تەماتەو توو بە کاری دەهێنن، هەر ئەم جۆرە سەبەتانەیە جوتیارەکان یان بەقاڵەکان پری لە ترێ یان هەنجیر دەکەن‌و لەسەر بارەکەیانەوە دایدەنێن‌و پێ دەڵێن (سەربار)، ئەمە خۆیان لە رێگاوبان لێی دەخۆن‌و پیاوەتیشی پێوە دەکەن یان بە دیاری پێشکەش بە خانە خوێیەکانی دەکەن، جا ئەوە خانە خوێیەی لە شار بوایە یان ئاوایی، دەوڵەمەند بوایە یان هەژار، چونکە زۆر جار جوتیارەکە بەرهەمەکەی دەبردە گوندێك کە دانشتوانەکەی لەو جۆرە میوەیەیان نەبووبێ، بە پارە یان بە دانەوێڵە دەیگۆڕییەوە، جا ئەم جوتیارە، یان بەقاڵکە لە ماڵێکی ئاشنای یان لە هەر ماڵێك رێگەیان پێدا بێ بارەکەی دەخست‌و ئەو بەرچینەیەی بە دیاری دەدایێ ئەوانیش ئەو دیارییەیان لێ قبووڵ دەکردوو بە روویەکی گەشبینەوە پێشوازییان لێ دەکردو هەتا لەوێ دەمایەوە رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر رێزیان لێ دەناو خزمەتیان دەکردو خواردن‌و نوستنیشی هەر لەوێ بوو، شەو لە پاش نوێژی عیشا کۆمەڵێ پیاو دەهاتنە خزمەتی زۆر جار خاوەن ماڵ (شەوچەرە)[5] لەو دیارییە پێشکەش بەو میوانانەی دەکرد.
لە یادمە لە ساڵەکانی پەنجای سەدەی پێشوو کە ئەو سەردەمە منداڵ بووم هەندێ کەس لەو جوتیارانە بە بارە ترێ‌و هەنجیرەوە دەهاتنە ئاواییەکەمان

(تۆپزاوە)[6] لەسەر ئارەزووی خۆیان نە دەچوونە ماڵی کەس لە سێبەری پەنا دیوار یا خانوویەکدا بارەکانیان دەخست، ئینجا یەکێکیان بە دەنگێکی بەرز هاواری دەکرد دەیوت: های ترێ.. های هەنجیر.. یەك بەیەك[7] یان دوو بە دوو یەك بەسێ یان لەسەر، بە گەنم یان جۆ.
شتێکی سەیرم هاتەوە یاد هەندێ لە مێردمنداڵە لاسارەکانی ئاوایی تەڵە قامیشێك یان شوولێکی درێژیان دەهێناو نووکیان تیژ دەکرد، ئنجا یەکێکیان بە دزییەوە بە ماتە مات دەچووە سەر بان‌و ئەو تەڵە قامیشەی شۆر دەکردەوە بۆ ناو قەرتاڵە هەنجیرەکەو بە توندی بە بێ بەزەییانە دەستی لێ دادەگرت‌و رای دەکێشایە سەرەوە هەر جارەی (١٠، ١٥) هەنجیری دەفڕاند، لەولاشەوە یەکێك دەیدی‌و لێ دەخوری ئەویش رایدەکردو خۆی دەگەیاندە هاوەڵەکانی‌و بە دەم پێکەنینەوە دەیوت: کورشە خۆتان پەنهان کەن وا هات.. ەم نەریتە بە لای مێرد منداڵانەوە هەر وەك جۆرە گەمەیەك یان یارییەك وابوو ئەگینا لە برسێتی‌و تامەزرۆیی نەبوو.

*** زەنبیل[8]:**
شێوەی ئەم بەرهەمە خــرو قووڵە، دەسکێ جوانیشی بۆ کراوە، لە شێوەی سـەتڵێکی بچووکدایە، لە کوردەوارییدا ژنان هێلکەی تێدا دەپارێزن، هەروەها هێلکە فرۆشەکانیش بۆ هەمان بەکاری دێنن، هێلکە بە (کا) دادەپۆشن بۆ ئەوەی لە گەرما و شکاندن بیانپارێزێ، ئێستا لەم سەردەمەدا جگە لە ژنان‌و هێلکە فرۆشەکان لە شارەکاندا وەکو گوڵدان بۆ گوڵی دەستکرد بە کاری دێنن‌و لە هەیواندا هەڵیدەواسن، ئەمەیان تەنها بۆ جوانییەو لە توول یان قامیش یان پووش ئامادە دەکرێت، هەندێ زەمبیلەی دەستکرداری بچووکیش

هەن زۆر بە جوانیو ناسکی دەیچنن و پێی دەڵێن (گەورە چۆڵ).

*** سەبەتەی پیاڵە:**
ئەم بەرهەمە لە شێوەی قاپێکی قووڵ دەچنرێ لە جیاتی قاپ بۆ پاراستنی پیاڵەو ژێر پیاڵە بەکار دەهێنرێت.

*** سەبەتە:**
ئەم سەبەتەیە هەندێ قووڵ و گەورەیە، جۆرە دەفرێکە لە توول چنراوە، بە زۆری شتومەکی منداڵی کۆرپەی تێدا دەپارێزن، لە چەشنی ئەمە لە نەیجووریش[٩] ئامادەی دەکەن و بە بەن یان پەڕۆی ڕەنگامە دەیپێچن.

*** چنگڵە (تاسەوە، مەکوب، سافۆر):**
جۆرە سەبەتەیەکی گەورەیەو پانو پۆرە، لە توول ئامادە دەکرێ، لە کوردەواریدا بۆ پاراستنی قەڵ و بەرخ و کارژێلەو گوێرەکەی ساوا بەکار دێ..
لەسەر ئەم سەبەتەیە وتراوە (بەرخ لەژێر سەبەتەدا نامێنێتەوە)[١٠] پەند.

*** نانەشان[١١]:**
ئەم نانە شانە خرو پانە چەشنی سینی وایە، نانی کورداواری لەسەر دەدەنێن جگە لەوەی شوول دەچنرێ لە سکی گەنمیش ئامادە دەکرێو بە بەنی ڕەنگامە یان پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگی لێ دەگرن و دەیرازێننەوە، ئەمە بۆ ئەوەیە تا جوانو ڕەنگین بێ و تەمەنیشی درێژ تر دەبێت.

*** پڵاو پاڵێو:**
ئەمەیان لە بنەوە تەسکەو لە سەریشەوە بڵاوە، ژنی کورد لە چێشتخانەی ماڵەوە برنجی پێدەپاڵێوێ، جا ژنی شۆخ و شەنگی کورد بێ و لە پڵاو پاڵێوی خۆماڵی برنجی کوردەواری بپاڵێوێو بە داری بەڕوو کوانو دەمبداو پڵاو لێ بنێت ئاخۆ خواردنی چەند بەتامو چێژو بۆنی چەند خۆش بێت؟
وا بزانم پیاوی وریای دڵتەر پەنجەکانیشی لەگەڵدا دەکرۆژێت.

*** قووڵینە[١٢]:**
ئەم بەرهەمە قەرتاڵەیەکی چکۆلەیە، هەر لە جامی مەرو مانگا دۆشین دەچێ، بۆ میوە شۆرینەوە بە کار دێ، زۆر جار لەم قووڵینەیەدا ترێ یان هەنجیر پێشکەش بە میوان دەکرێ، یان خاوەن ماڵ خۆیان لە جیاتی قاپوقاچاخ بەکاری دێنن و ئەو جۆرە میوانەی تێدا نۆش دەکەن، لە هەندێ شوێندا بەمەش دەڵێن (قەرتاڵە)، لە چەشنی ئەم قووڵینەیەش گەورەتر دەچنرێت بۆ شۆرینەوەی گەنم بەکار دێ، هەروەها ساوەری کوڵاو لە لە مەنجەڵدا کە دەکرێت لە پێشا دەکرێتە ناو ئەم قووڵینەیەوە بۆ ئەوەی ئاوەکەی بچکێو سارد بێتەوە، بەهاران لە دوای کوڵاندنی قنگر لەمەدا دەیپاڵێون.

*** سەبەتەی مێشهەنگ:**
ئەمەیان بە شێوەیەکی درێژو باریك ئامادە دەکرێت، لە سەرەوە تەسکەو بنەوەشی پانو هەراوە، بە ئەندازەی مەترێك درێژ دەبێ، لە کوردەوارییدا مێشهەنگی تێدا بەخێو دەکەن.

*** ماشە:**
جۆرە سەبەتەیەکی نوولینی دەم تەنگو بن هەراوە، ڕاوچییەکان بۆ ڕاوە ماسی بەکاری دێنن.

*** سەبەتەی بەقاڵ:**
ئەم بەرهەمە خرو گەورەیە زووتر قەسابەکان لە شارەکاندا گۆشتیان لەسەر دادەناو دەیانفرۆشت، یان یەکێك سەبەتە گۆشتەکەی دەخستە سەر سەریو بە کۆڵانەکاندا دەسوڕا تا هەموو گۆشتەکەی دەفرۆشت.

*** سەبەتەی کرێکار:**
جۆرە سەبەتەیەکە لە شوولی ئەستوور ئامادە دەکرێ، لە شێوەی دەفر دایە زووتر کرێکارەکان لە شارەکاندا خۆڵیان پێ ڕادەکێشا.

*** سەوەشێر، (سەبەتە شیر):**
جۆرە سەبەتەیەکی گەورەیە، لە توول یان قامیش دەچنرێت، لە کوردەوارییدا ژنان دەیدەن بەسەر شیرو ماستو پەنیرو لۆردا، یان دەیدەن بەسەر پەلەوەردا، یان مێرد منداڵانو کورە لاوەکانو ڕاوچییەکان لە جیاتی داو بۆ باڵندە کێوییەکانی پێ ڕاو دەکەن. وەکو لەم پەندەدا وتراوە (جووچکەی بن سەبەتێ، دەمرێ بەو خەفەتێ)[١٣] واتە: مرۆڤی بێ دەسەڵات هەر خولیاو ئارەزوویەکی هەبێ تا مردن بۆی نایەتە دیو بەو خەفەتەوە سەر دەنێتەوە.

*** سەوەریخ:**
جۆرە سەبەتەیەکی توولینە لە شێوەی دەفر دەچنرێت، بۆ سنێر (ڕیخ) گوێزانەوە بە کاردێت.

*** نەیجەن:**
ئەو کۆمەڵە بەرهەمە دەستکردە فۆلکلۆرییانەیە کەوا لە قامیش، یان زەل دەچنرێت، ئەم ناوەیش لە (نەیجوور)ەوە هاتووە کە ناوی جۆرە قامیشێکی باریکە، بە زۆری ئەم بەرهەمانە لە کاتی چنیندا بەن یان قوماشێکی ڕەنگامەی لێ دەپێچن، ئەو پیشەوەرەی ئەم جۆرە بەرهەمانە دەچنێ ژن بێ یان پیاو پێی دەڵێن: سەبەتەچن.
لە شیعرو پەندی پێشینانو ڕەوانبێژیو قسەی نەستەقدا ناوی سەبەتە زۆر هاتووە لەوانە:

*** پەندەکان:**
ئاو ئەکاتە سەبەتە[١٤]
بە یەکێك دەوترێ ڕەنجی بێ سوود بدا.

ئەمە سنعەتەو سەبەتە، مسگەری نییەو قنگ هەڵسوڕان[15]
ئەمە سەبەتەچنەکان بە تەوسەوە بەمسگەرەکانی دەڵێن، واتە پیشەکەی خۆیان لە مسگەری بە چاکتر دەزانن.
١- پەندی پێشینانی کورد، بەرگی دووەم، ل ٦٥.
٢- پەندی پێشینان، ل ٢٠.
٣- هەمان سەرچاوە، ل ٥٥.
بە سەبەتەکەش ناگوێزرێتەوە.[16]
بە یەکێك دەوترێ کە زۆر پەرپووت و پەك کەوتوو بێت.
وەك سەبەتەی بەن بچڕاوە.[17]
واتە: بێ دەسەڵاتەو هیچی بە دەست نییە.

*** شیعری فۆلکلۆری:**

مەمکی شەمامەی خەتخەتی[18]
توولان ئەکا لەتلەتی
بۆ زەمبیلەو سەبەتی.
* * *
مەمك سێوی لاسوورە دامنا لە سەبەتێ[19]
لە موسلێم قفڵ دابوو، لێرانە بۆنخۆشی دەنێ.
* * *

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. لە گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە ١٣٩، ئابی ٢٠٠٠دا بڵاوکراوەتەوە. هەروەها لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە ٣٩ی ساڵی ٢٠٠٨دا بڵاوکراوەتەوە.
٢. قەرتاڵە: ئەو ناوانەشی هەیە: تاسەوی، قووفك، لاگیرە، سەبەتەی ترێ.
٣. پەندی پێشینان، ل ١٥٣.
٤. بەرچنە: لە کوردەوارییدا ئەو ناوانەشی هەیە: بەرچینە، سەبەتولکە، سەبەتەی بچووك قەرتاڵەی بچووك.
٥. شەوچەرە: ئەو خواردنەیە کە خانەخوێ بە شەوان پێشکەش بە میوان یا دانیشتووانی دەکات زۆری بریتییە لە میوە.
٦. تۆپزاوە: دەکەوێتە ڕۆژئاوای شارۆچکەی داقوقەوە بە (٧) کیلۆ مەترێك، دانیشتوانی کاکەیین، لە ساڵی ١٩٠٣ بینا کراوە.
٧. یەك بە یەك: واتە گەنمەکەی دەکردە ناو تایە تەرازووەکەی و بە گوێرەی کێشی ئەو گەنمە یان جۆیە ترێ یان هەنجیری دەدایێ، بۆیە کورد وتویەتی (سەر بە سەر، بێ دەردە سەر) پەندی پێشینان، ل ٢٧٧، یان دوویش تایە گەنم بەرامبەر بە دوو تایە ترێ یان هەنجیر، یان بە پێچەوانەوە..
٨. زەنبیل: ئەم ناوانەشی هەیە: زەمبیل زەمبیلە، قفك، گۆشەر، تلۆخ، لەرتەلە.
٩. نەیجوور: نەیجە، قامیشێکی باریکە چیخی لێ دروست دەکرێت.
١٠. پەندی پێشینان، ل ١٠٩.
١١. نانەشان (ناندێن و تەوەق و گەش)یشی پێ دەڵێن.
١٢. قووڵینە: ئەم ناوانەشی هەیە: تریان، دەرچین، دەسە چینە، تریانە، توولینە، تلیان.
١٣. پەندێ پێشینانی کورد، بەرگی دووەم، لاپەرە ٦٥.
١٤. پەندی پێشینیان، لاپەرە ٢٠.
١٥. هەمان سەرچاوەی، لاپەرە ٥٥.
١٦. پەندی پێشینان، ل ١١٦
١٧. ئێدیۆم لە زمانی کوردیدا، جەلال مەحموود عەلی، دەزگای ڕۆشنبیری بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (حسام)، بەغدا ١٩٨٢، ل ٤٧٦.
١٨. لە (ئەحمەد سابیر عەلی کەلوری ١٩٥٥، ) ناسراوە بە (حاجی ئەحمەد سەعاتچی)ی دانیشتووی کەرکوك، ڕەحیمئاوا وەرگیراوە.
١٩. هەمان سەرچاوە.

*** پیشەی گۆزەسازی:**

گۆزە سازی پیشەیەکی دەستکردی فۆلکلۆری زۆر کۆنەو هەموو گەلانی ئەم سەر زەمینە پێی راهاتوون و ئاشنای بوون و بە کاریان هێناوە، نەتەوەی ئێمەی کوردیش هەر لەدێر زەمانەوە لەم پیشە بەسوودو بەنرخەدا شارەزایی بەدەست هێناوەو گەلێ پیشەوەری دەسترەنگین لەژن و پیاو هونەرمەندانە لەم بوارەدا ئەسپی خۆیان تاوداوەو جوامێرانە کاریان کردووەو بەرهەمی پوختەو نایابی هەمەرەنگیان پێشکەش بە نەتەوەکەیان کردووە. جا ئەم پیشەیە دەبێتە دوو بەشەوە:

١. بەشی یەکەمیان، ژنانی دەسترەنگین و کارامە لەگڵێنە خۆیان پێی هەڵدەستن و لەکورەی تایبەتدا سووری دەکەنەوە.

٢. بەشی دووەمیان، پیاوە گۆزە سازە لێهاتووەکان هونەرمەندانە بەرهەمی جوان و دانسقە دروست دەکەن و لەکڵدا (کوورە) سووری دەکەنەوە.

لەنێوانی شێوە دروست بوونی هەردوو کوورەکەدا جیاوازییەکی بەرچاو هەیە، هەر یەکە لەشوێن و جێگای خۆیدا باسی لێوە دەکەین.

*** بەشی یەکەم:** ئەو بەرهەمانەی ژنان ئامادەی دەکەن[1] ژنان بە هاوینان گڵە سوور (خۆڵە سوورە)، (خۆڵی حور) دەهێنن و (کا)ی گەنمە قەناری یان کای نیسك بە هێڵەك دەبێژن و دەیگرنەوە بە قور یان لەجیاتی کایەکە (موو)ی بزن یان (کەرە پوو)ی[2] تێدەکەن، ئەو قورە بۆ (٢-٣) رۆژ دەمێنێتەوە ئینجا بە دەست یان بە (گەلا کوت) دەیشێلن تا وەکو مەعجوونی لێ دێت، ئینجا ناوی خوای لێ دێنن و دەست بە کارکردن دەکەن، ئەو شتانەی ژنان لەقور دروستی دەکەن بەشێوەیەکی گشتی دەبنە دوو بەشەوە بەشێکیان (لەکڵدا سوور دەکرێنەوە)، ئەوی دیکەیشیان (بەکاڵی دەمێنێتەوە).

*** ئەوانەی لەکڵدا سوور دەکرێنەوە ئەمانەن:**

پێش ئەوەی باسی بەرهەمەکان بکەین با بزانین ژنان چۆن کڵ دروست دەکەن و ئاگری دەدەن.

ژنانی ئاوایی لەپێشدا دێن بە هەرەوەزی هەموو بەرهەمەکانیان لەدەفرو گۆزەو کووپەو دیزەو قاپ و قاچاخ (هیربار) لەپاش وشکەوە بوونی لەسێبەردا لەشوێنێکی پاك و پرچدا لەرۆخی ئاوایی کۆدەکەنەوەو بە (تەپاڵە)و (قشپل)و (سرە)[3] بەرێکوپێکی لەشێوەی گومەز دایدەپۆشن، ئینجا ئاور لەکڵەکە بەردەدەن بۆ ماوەی چەند رۆژێك دەسووتێ، لەو ماوەیەدا جار بەجار تەپاڵەو قشپلی دەکەن بە سەردا، لەپاش ئەوەی دادەمرکێتەوەو ژیلەمۆکەیش دەبێتە خۆڵەمێش، ژنەکان دێن بەرهەمەکانیان لەخۆڵەمێشەکە دەردێنن و هەر یەکە هی خۆی دەباتەوە ماڵی خۆیان کە بریتین لەم قاپ و قاچاخانە:

*** کووپی ئاو:**

دەفرێکی خڕی گەورەی دەم والایە نزیکەی (٣-٤) تەنەکە ئاو دەگرێت، هەمیشە لەمەیان بچووك تر، یان گەورە ترە، بۆ ئاو خواردنەوە بە کاری دێنن، گۆزەکارەکانیش دروستی دەکەن بەڵام ئەوەی ئەمان واتە هی گۆزەکارەکان بە زۆری درێژە، ئەگینا جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نییە، کووپی ئاو بەزۆری لەژێر سێبەری (کولە نان)دا[4] دادەنرێت، لەژێر کووپەکەیشدا دەفرێك، یان: شەربەیەك دادەنرێت، بۆ ئەوەی ئەو دڵۆپە ئاوانەی کە لەکووپەکەوە دەردێت بتکێتە ناویەوە، جا ئەو ئاوەیان بۆ خواردنەوە لەهی کووپەکە ساردو سازگارتر دەبێت، هەیشە لەم کووپانە بچووك ترە نزیکەی (٧-٨) دۆلکە ئاو دەگرێ، ئەمەیان بە هاوینان لەسەربان دادەنرێ، هەیشە (جەرە)، یان (شەربە)، یان: (کوندە) دەباتە سەربان.

*** خەلوەتە:**

جۆرە کووپێکی بچووکی قووڵ و درێژە، بۆ سارد کردنەوەی (دۆ) یان ئاو بەکاردێت.

*** دیزە:**

ئەم بەرهەمە بە شێوەیەکی خڕو قووڵ دەم والا دروست دەکرێت، لەهەردوو لای سەرەوە دوو قولفی وەك دەسك بۆ ئامادە کراوە، وەکو (مەنجەڵ) بۆ کوڵاندنی کەللەو پێ و هەریسەو پاقلەو نۆك و گەنمە کوتاوو بادام و ناوکە قەیسی بەکاردێت لەتەندووری گەرم لەناو ژیلەمۆکە دادەنرێ، ئینجا سەر تەندوورەکە بەجوانی دادەپۆشرێت، ئەگەر کاتی چێشتەنگاو خرایە تەندوورەوە، ئەوە تا ئێوارە دەمێنێتەوە، ئەگەر ئێوارەش دابنرێ ئەوە تا بەیانی لەتەندووردا دەبێت.

گۆزەکارەکانی خۆمانیش لەچەشنی ئەم دیزەیە دروست دەکەن و هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا بەدی ناکرێت، ئێستا لەم سەردەمە مەنجەڵی (هەڵم پەست) جێگای گرتووەتەوە.

لەم پەندەدا ناوی هاتووە:

ژێر بەندە زوبان، ژێر (دیزە) ئاگر.[5]

واتە: چۆن ئاگر دیزە دەهێنێتە کوڵ. زوبانیش مرۆڤ جۆش و خرۆش دەکات.

*** سوێنە: (ننجانە)و (شونك)یشی پێ دەڵێن:**

جۆرە بەرهەمێکی خڕو گەورەیە، لەشێوەی (تەشت)ی کەلوپەل ششتندایە، لەلاوە کونێکی بچووکیان بۆ ئامادە کردووە، زووتر منداڵ و پۆشاك و پەڕۆو پیتاڵیان تێدا دەششت، لەبەر ئەوەی قورسەو بۆ ژنان بە زەحمەت لار دەکرێتەوە جا

لەرێگەی کەنەکەیەوە ئاوە پیسەکەیان دەرشت، کە تەشتو ئامێری جل ششتن هاتە گۆڕێ ئەم (ئنجانە)یە بەرە، بەرە نەماو خۆی لێ شاردینەوە، گۆزەکارەکانیش دەقاو دەق وەکو ئەمەیان ئامادە دەکرد، شێوەی ئەم تەشتی جل شۆرینەیەی کە ئەمرۆ لەبازاردا هەیە دەقاو دەق لەو سۆینەوە وەرگیراوە.

* چاڵەوێنك (چاڵوێنەك):

جۆرە دەفرێکی دەم کراوەیە، لەشێوەیەی دەورییەکی قووڵدایە، بۆ ئاو خواردنەوەی سەگو پشیلەو مریشكو جووجەڵە بەکاردێت، لەگوندو لادێکاندا بە زۆری لەژێر کووپی ئاودا دادەنرێت، گۆزەکارەکانیش هەروەکو ئەم دروستی دەکەن.

* گودیلە:

بەرهەمێکی خڕو گەورەیە، زووتر بۆ پاراستنی خوێو ئازووقە بەکار دەهێنرا، دەمەکەی بەربڵاوە، دەمقەباخیشی بۆ دەکرا، هەمیشە لەچەشنی ئەمەیان لەکڵ دا سوور نەدەکرایەوە بەڵام زۆر پەسەند نەبوو، هەمیشە دەمەکەیان لەسەرەوە لەلاوە بۆ کردووە.

لەم پەندەدا ناوی هاتووە:

(گودیلە) خل بێتەوە.. سەر قەباخی خۆی ئەدۆزێتەوە.(٦)

– بەیەکێکی کەم نموودی هیچو پووچ دەوترێت کە هاوسەرێك یا هاورێیەکی وەکو خۆی دۆزیبێتەوە.

* کۆلی رەیحانە:

ئەمەیان بریتی بوو لەکۆڵێکی وردەلە، لەسەربان بە هاوینان بۆ جوانیو بۆن خۆشی رەیحانەیان تێدا دەچاند.

هەروەها قاپو قاچاخی تریشیان دروست دەکرد وەکو: جام، قاپ (لەگەن)، کاسە، کووچەڵە... هتد

شایەر لەسەر ئەم بەرهەمانە وتویەتی:

(نەختینەی ماڵم هەر یەسە(٧)

کاسەو کووچەڵەو چەمچەسە).

* بەشی دووەم: ئەو بەرهەمانەی کە سوور ناکرێنەوە ئەمانەن:

* کەندوو- (کەنوی)و (کوار)یشی پێدەڵێن:

ئەم بەرهەمە دەفرێکی گەورەیە درێژییەکەی باڵا زەلامێك دەبێت و پانییەکەیشی (٧٠-٨٠سم) دەبێ، سەر قەباخیشیان بۆ کردووە، بۆ پاراستنی ئاردو ساوەر بەکاردێت، ئەمیش گەورەو بچووکیان هەیە لەخواریشەوە کونێکیان بۆ کردووە بۆ ئەوەی ئاردەکە، یان: ساوەرەکەی لێوە دەربکرێت، بە پەڕۆیەك دەیگرن، دوو پێچکەیشیان بۆ کردووە تا مشك زەفەری پێ نەبات و کونی نەکات.

لەبەرهەمی سەرزاری فۆلکلۆری دا ناوی هاتووە:

* پەندی پێشینان:

– پیاوی نەزان وەك کەنووی بۆشە.(٨)

– واتە: نەزان وەك داری بێ بەر وایە.

– سەپانی کردم پاڵە وەدەردم، خەمی چاڵو کەندوو کەوتووەتە بەرم (٩)

– واتە ئەوانەی جاران پاڵیان بۆ دەدامەوە لە کوڕو کچو ژنو بووك، سەپانییان بۆ دەکردمو دەسکەوتم باش بوو، ئێستا کەوتوومەتە خەمی چاڵ هەڵکەندنو کەندو پەیدا کردن بۆ ئەوەی دەغلی تێ بکەم.

* شیعر:

(قاپو قاچاخو هیربار لەوێندە ریز کرایە (١٠)

برۆش لەناو هەمبانە ساوەر لەکەندوو دایە).

* مەتەڵ:

رەپ، رەپ وەستاوە، پەرۆی تیا گیرماوە- (کەندوو).(١١)

* (جـاڤت) - سێڵی قورنیشی پێ دەڵێن:

بریتییە لەساجێکی خڕو گەورەی قورین، لەلاوە دەمێکیان بۆ هێشتووەتەوە، بۆ برژاندنی هەرشتە بەکاری دێنن، ئەم سێڵە لەسەر ئاگرەکە بە هۆی سێ کوچکانی دادەنرێت داناگیرێ تا لەهەرشتە برژاندن دەبنەوە، ئەوەی تیایدا دەبرژێ بە پارچە

قوماشێکی پاك لەدەمەکەیەوە دەری دەکەن و هەمیسان هەڕشتەی کالی تێدەکەن، بەم چەشنە تا هەموو هەڕشتەکە دەبرژێنن.

* هێزەدان:

ئەم بەرهەمە درێژییەکەی نزیکەی مەترو چارەکێك و پانییەکەیشی (٦٠-٧٠سم) دەبێت، بۆ پاراستنی هێزەی رۆن بەکاردێ، دووپێی بۆ کراوە تا ژێرەکەی رووناك بێ و مشك و جرجە کوێرە توخنی نەکەون، سەر قەپاخێکی قوڕینی مەحکەمشی بۆ کراوە.

* کولانە:

بە شێوەیەکی گومەزی دروستی دەکەن، سەرەوەی کونێکی خڕی هەیەو دەورو بەریشی بەکونی بچووك، بچووك تەنراوە، ئەمە بۆ هەناسەو فێنکی وایان کردووە، بۆ پاراستنی جووجەڵەو مریشك، تا بە ئەمڕۆیش لەئاواییەکاندا بەکاردێت.

* کووره - (مقاله)یشی پێدەڵێن:

ئەم بەرهەمە قوڕینەیە ئاگری تێ دەکرێتەوە بۆ چایی و چێشت لێنان و خۆگەرم کردنەوە، زیاتر لەجۆرێکی هەیە، چەشنێکیان درێژەو لەنووکەوە کوورەیەکی خڕی کون کونیان بۆ کردووە ئەمە بۆ ئاو گەرم کردن و چێشت و چایی لێنان کە ئاگرەکە بوو بە سکڵ (ئەسکل) بە کوانووکێش لێی رادەکێشنە پێشەوەی، ئینجا خواردنەکە، یان: قۆرییە چاییەکەی لەسەر دادەنێن بۆ ئەوەی لەسەر خۆی دەم بسێنێت، هەمیشە درێژەو سەرەوەی والایە، بەشێوەیەکی خڕو بەرز دروست کراوە.. هتد.

* تەندوور - تەنوور وتەنویرشی پێدەڵێن:

ئەم بەرهەمە بەشێوەیەکی قووڵی سکن ئامادەی دەکەن و لەپاش وشکەوە بوونی بە تەواوی لەجێگایەکدا دایدەمەزرێنن و سووری دەکەنەوەو نانی پێدەکەن، لەئاواییەکاندا (تەنوور بان)شی[١٣] بۆ دروست دەکەن.

لەشیعری فۆلکلۆریدا ناوی تەندوور دەبینرێت لەوانە:

رەنگم زەرد بییە دەمگم گیریایە[١٣].

دڵم چوین تەنویر دەمەو ترپایە

* رەفت - رەف و رفیشی پێدەڵێن:

ئەمە زووتر بەقوڕی کاڵ لەقەد دیواردا یان بەشێوەیەکی درێژ، ئامادەیان دەکرد، پانییەکەی بستێك دەبوو، قاپ و

قاچاخی بچووکیان لەسەر ریز دەکرد.

* شوقەلەت (تەرواله):

ژنان لەخشتی کاڵ و قوڕ لەژوورێکدا ئامادەیان دەکرد، لەجیاتی سەنوق و بۆفیە پێخەفیان لەسەر ریز دەکرد.

* بەشی سێیەم: کوورەو گۆزە سازی پیاوان:

لەشارۆچکەی خورماتوو خێزانێکی[١٤] رەسەنی کوردی کاکەیی هەن هەر هەموویان لەم پیشەیەدا دەستێکی باڵایان هەیە بۆیە لەنێو خەڵکیدا ناسراون بە گۆزەچییەکان، ئەم پیشەیە لەباوو باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە. کەرەستەکانیان ئەمانەن: (خاکی سوور، کەرەپوو، لم، خوێ، چەرخ، کوورە)، پێشەکی قوڕێکی زۆر لەخۆڵی سوور دەگرنەوەو کەرەپوو خوێ و لمشی تێدەکەن، قوڕەکە دەبێ بۆ ماوەی (٢-٣) رۆژ بمێنێتەوە، تا بەجوانی خۆشە دەبێت، دواتر پێش ئەوەی دەست بەکارین بۆ ماوەی دەمژمێرێك یان زیاتر ئەو قوڕە بەپێ دەشێلن، تا قوڕەکە رایی بێت، چونکە قوڕەکە هەرچەندە زیاتر خۆشە بکرێت بەرهەمەکانی چاکترو پوختە تر دەبێت، لەپاش ئەوەی بەرهەمەکان لەلایەن پیشەوەرەکەوە ئامادە کران و لەپاش وشك بوونەوە هەر هەموو دەفرەکان دەخەنە کوورەوە، دەبێ لە کوورەدا بۆ ماوەی (١٠-١٢) دەمژمێر بمێننەوە، بە گوێرەی گڕی ئاگرەکەیە هەرچەند گڕ تر بێت گۆزەکان زووتر سوور دەبنەوەو پێدەگەن، لەپاش خامۆش کردنی کوورە بە (٢٤) دەمژمێر ئینجا بەرهەمەکان دەردێنن و دەخرێنە نێو ئاوەوە بۆ ئەوەی قایم و تەمەن درێژ بن، بە پێچەوانەوە تەمەنیان لەچەند مانگێك بەولاوە تێناپەڕێت، بەڵام ئەو بەرهەمانەی کە خوێیان تێدایە دوای دەرکردنی

لەکوورەدا ناخرێنە نێو ئاوەوە چونکە کەرخ دەبێت.

* **کەرەستەکان:**

– چەرخ: پیشەوەرەکە بەهۆی ئەم ئامرازەوە بەرهەمەکانی لووس و ڕێکوپێك و جوان دەکات.

– خاکی سوور: لەبەر ئەم هۆیانە بەکاری دێنن:

– پاك و خاوێن.

– بەهێزترە لەخاکی سەر زەوی بەتایبەتی لەبواری گۆزەکاریدا.

– ڕەنگی بەرهەمەکان بە پێچەوانەی ڕەنگی خاکەکەوە سپی دەردەچێت.

* **کەرەپوو:** دەکرێتە نێو قوڕەکەوە بۆ بەهێز کردن و درز نەبردنی بەرهەمان، لەکاتی سوورەوە کردنی کووپەو شەربەو جەرەکان کەرەپووەکە دەسووتێ و شوێنەکانی بە بەتالی دەمێنێتەوە، دواتر بەجوانی ئاو دەپالێوێ و ئاوەکەیشی سارد دەبێت، بەلام بۆ کووپەی ئاوو جەرەو شەربە جگە لەکەرەپوو وردە کای گەنمە قەناریشی تێدەکەن، لەبەر ئەو هۆکارانەی کە کەرەپووی تێدەکرێت.

* **لم، قوم:** تەنیا دەخرێتە نێو قوڕی ئەو بەرهەمانەی کە بۆ ئاو خواردنەوە بەکاردێن وەکو: (کووپەی ئاو، شەربە، جەرە، کووپەڵە)، لەبەر ئەوەی (لم) ماددەی ئاسنی تێدایەو دەبێتە هۆی بە هێزبوون و درز نەبردنی بەرهەمەکان.

* **خوێ، نمەك، نمێك، خوا:** لەبەرئەوە بەکاری دێنن چونکە خوێ بەسروشت ساردەو دەبێتە هۆکاری سارد بوونی ئاوی ئەو بەرهەمانەی بۆ ئاو خواردنەوە بەکاردێن، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەوە ڕەنگی بەرهەمەکان سپی دەکات، بە پێچەوانەوە ڕەنگیان سوور دەبێت.

* **کوورە، کل:** کوورە لەخشتی سوور (کەرپچ) پێك هاتووە، زووتر بە خەڵوزو هێزم دەمیان دەدا، بەلام لەسالی (١٩٧٦ ی.ز)یەوە بە پەرەمێزی غاز یان نەوتی سپی جۆشی دەدەن، بە زۆری لەشارو شارۆچکەکاندا دەبێت نەك لەگوندو لادێکاندا، ئەمیان گەلێ پێشکەوتوو ترو ڕێکوپێك و پەسەند ترە لەوەی ژنان چونکە دووکەلی زۆر کەمترەو زیانیش بەخۆیان و دەورو بەر ناگەیەنێت، دەتوانین بڵێین ئەمیان نیوچە کارگەیەکە، جگە لەکوورەکە چەند ژوورێکی گەورەشیان هەیە بۆ کارکردن و پاراستنی کەرەستەو بەرهەمەکانیان. سنعەتکارەکان کەپیاون بە درێژایی ڕۆژ لەوێدا ئیش دەکەن و ماڵ و منداڵیان لەسەری گوزەران دەکەن و دەژین بۆیە لەژنە پیشەوەرەکان شارەزاو دەستڕەنگین ترن، ئەمان جگە لەو بەرهەمانەی کە ژن دروستیان دەکات ئەم گۆزانەش ئامادە دەکەن و بە پارە دەیگۆڕنەوە:

* **جەرە:** لەشەربە گەورەترە، نزیکەی تەنەکەیە ئاو دەگرێت، هەیشە زیاتر یان کەمتر، جۆرێکیان هەیە زۆر گەورەیە لەناوچەی کەرکوك پێیان دەوت: (جەرەی لەیلانی)، بۆ ئاو هێنان و ئاو خواردنەوە بەکار دێت، ملی باریك و کورتی هەیە، لەملاو لەولاوە دوو دەسکی هەیە، لەخوارەوە تەسکەو نێو قەدەکەشی گەورەیە، لا بەلا دادەنرێت، ئەمە لەبەر ئەوە بەو جۆرە دروست کراوە تا قایم بێ و تەمەنیشی درێژ بێت، بە هۆی ئەو دوو دەسکانەیەوە هەلدەگیرێ، یان جووتیارەکان دوو جەرەیان بە گوریس پێکەوە دەبەست و دەیانبرد بۆ سەر کێڵگەو جووتکردن، ژنانیش لەکانی و جۆگادا ئاویان پێ دەهێنا، شایەر لەشیعری فۆلکلۆریدا گەلێ ناوی جەرەی هێناوە ئەمەش چەند نموونەیەکە لەو شیعرانە:

خۆزگە بەو (جەرە)ی، ئەینەیتە سەرشان[15]
جارجار ئەیگۆڕێ، لەم شان بۆ ئەو شان
**

کوڕ:
ماری تەنکەی لەقەد گردی[16]
(جەرە)ی پڕ بوو داینا عەردی
داکی گوتی ماچیان کردی
کچ:
(جەرە)م خوار بوو لۆی ڕاست کردم[17]
دەستی ڕاستی لەملی کردم
بە دەستی چەپ مەمکی گرتم
بەزۆرداری ماچی کردم
**

خۆزگەم بە (جەرە) ها لەسەر شانی[18]
جار جار زلق ئەدا بۆ سەر مەمانی
**

ماڵمان ماڵ هاوسێ، ماڵ وەپەڕەوە[19]
ماچ کردن خۆشە شان وە (جەرە)وە
**

شەڵلا من بوایەم (جەرە)ی سەر شانت[20]
جار جار بتکیایەم وەسەر مەمانت

حاجی عومەر مستەفا گۆزەچی

**

خۆزگە من بوایەم، (جەرە)ی سەر کۆڵی[21]
یان جووتە گوارە، یان بازنگ لە قۆڵی

* شەربە: ئەم بەرهەمە لەبنەوە خڕەو ملێکی درێژو باریکی پێوەیە، لەبن ملیەوە دوو قوڵفی بچووکی بۆ کراوە، بە ئەستوونی دادەنرێت، نزیکەی دۆلکەو نیوێ ئاو دەگرێت، بە زۆری بە هاوینان بە کاردێ، ناوی شەربە و کووپەو جەرە سازگارو ساردە، دانیشتووانی گوندو لادێکان لەماڵو سەر کێڵگەو بێستاندا بەکاری دێنن.
– ئەمەش چەند شیعرێکی فۆلکلۆرییە کە ناوی شەربەی تێدا دەبینرێت:

ئاوی ساردە لەشەربەیە[22]
ڕۆنی مەرە لەهیزەیە
**

ئەو جوتیارەکە، جووتەکەی کەرە[23]
(شەربە) کەی زیوە، ئاوی شەککەرە

* مەسینە- (مەسین)و (ئافتاوە)و (لولێنە)یشی پێ دەوترێ:
ئەم مەسینە لوولینەیە دەقاو دەق لەچەشنی ئەو مەسینەیەی کە ئەمڕۆ لەبازارەکاندا بەرچاو دەکەون وایە، شێوەی ئەمیان لەوەوە وەرگیراوە، جیاوازییەکەیشی تەنیا ئەوەیە ئەویان لەگڵێنەیەو ئەمیان لەمسو چینکۆو پلاستیکە، بۆ دەستو دەمو چاو ششتنو دەستنوێژ هەڵگرتن بە کاریان هێناوە.، نموونەی ئەو مەسینە قوڕینە لەلامان پارێزراوە.
* گۆزە- (کووپە):
دەفرێکی قووڵینی درێژە، بە قەوارەی جۆراو جۆر ئامادەکراوە، لەملاو لەولاوە دوو دەسکی بۆ کراوەو دەمەکەیشی بڵاوە، بەزۆری ڕەنگی شینە، بۆ پاراستنی ڕۆنو ترشیو دۆشاوی تەماتەو سرکە بە کارهێنراوە، هەروەها سەرجەم ئەو بەرهەمانەی لەگڵ دروست دەکرێنو سوور دەکرێنەوەو پێی دەڵێن (گۆزە)، ئەو پیشەسازەی لەم پیشەیەدا کار دەکات بە (گۆزەکار)، یان: (گۆزەسان): یان: (گۆزەچی) ناسراوە.

شایانی وتنە جاران کچانی خوێن شیرینی ناسکو خڕین پۆل پۆلو جووت جووتو تاك تاك لەکانی ژنان، یان: کانی بەر ماڵان بە گۆزە ئاویان دەهێنا، بە لەنجەو لار، بە نازو عیشوە وەکو ڕەوتی پۆڕ دەڕۆیشتن، ناوە ناوە لەگۆزەکەوە تك تك ئاو دەچۆڕییە سەر سینگو مەمکۆڵانیان، دەتوت خوناوکەیەو لەسەر پەڕەی گوڵە نێرگزدا سەقام دەگرێ، ئەڵڵا چەند جوان دەڕۆیشتن مێینەیی خۆیانیان بە سەر یارانو کورە لاوەکاندا دەچەسپاند، چەندە جوان بوون بەو گۆزە خۆماڵییەی کە لەسەر شانیان بەند دەبوو.. جا نەك کورە لاوو هەرزەکارە هارو هاجەکان بەڵکو پیری سەدساڵەیش چاوی بەو دیمەنە بکەوتایە سەر گەردانو مەد هۆش دەبوو، جا ناهەقیان نەبووە شایەرو گۆرانی بێژەکانی ئەو ڕۆژگارە بە هەزار شێوەو ڕەنگ شیعرو هەڵبەستیان بە سەردا هەڵداونو خۆیان کردووە بە قوربانی ئەو شۆخانەو گۆزەی سەر شانیان، ئەمەیش چەند نموونەیەکە لەو شیعرانە کەوا دەماو دەم پشتاو پشت بە کەلەپوور بۆمان بەجێماون:

ئەڵڵا چەن جوانە گۆزەی سەر شانی[24]
تك تك ئەتکێ بۆ سەر مەمکانی
**

خۆزگەم بە گۆزە ئەیوا بۆ سەراو[25]
جار جار ئەترازێ بەرەو زوڵفی خاو
**

شەڵڵا من بوایەم گۆزەی سەر شانی[26]
زڵقم بدایە بۆ سەر مەمکانی
**

گۆزەی هەڵگرت بۆ ئاوێ[27]
بۆ سەر کانیو زەلکاوێ
ئەو دایکەی شیری داوە
بە قەد منی خۆش ناوێ

هونەرمەند نەبیل گۆزەچی

* لەپەندی پێشینانیشدا ناوی هاتووە لەوانە:
- گۆزەیش برای دییزەیە[28]: ئەم پەندە بە دوو کەس دەوترێ لەچاکەو خراپەدا هەر وەکو یەك بنو جیاوازییان تێدا نەبێت.
- گۆزە هەموو جارێ بەساغی ناگەرێتەوە لەکانی[29]: واتە: مرۆڤ لەمامەڵەو سەودادا هەمیشە قازانج ناکات بەڵکو ناو بە ناو زەرەریش دەکات.
- گۆزە لەرێی ئاو ئەشکێ[30]: واتە: مرۆڤ لەمامەڵە هەمیشە قازانج ناکات، ماناکەی لەگەڵ پەندی پێشوودا یەك دەگرێتەوە.
- گۆزەی تازە دوو رۆژ ئاوی خۆشە[31]: واتە: هەموو شت کۆن ئەبێ و لەبەرچاو دەکەوێت.
- گۆزەی نوێ ئاوی ساردە[32]: بە پیاوێك دەوترێ تازە ژنی هێنابێت، چونکە ژنی نوێ خۆشەویستە.

هەروەها گۆزەکارەکان جگە لەوانەی باسمان کردن چ لەکۆنو لەپاش سوورەوە کردنیان لەبازاردا دەیفرۆشن:
- دەوریو دەفرو قاپو قاچاغی هەمەرەنگ.
- مەسینە: بۆ دەستو دەمو چاو شۆشتنو دەستنوێژ گرتن بە کارهێنرا.
- پیاڵەو ژێر پیاڵە، بۆ چا کردنەوە.
- گوڵدان (گۆزەی گوڵ): ئەمیان بۆ جوانی گوڵی تێدا دەچێنرێت.
- تەپڵ: تەپڵێکی بچووکە بۆ دەستی مێرد منداڵان.
- دەخیلەی منداڵ: منداڵان پارەی تێدا پاشەکەوت دەکەن.
- قادول: بریتییە لەکووپەیەکی دەم تەنك، جەرەو کووپەی جێ پەنیر.
- دۆلکە: بۆ ئاو خواردنەوە.
- خشتی سوور (کەرپچ): ئەمیان لەبواری بیناسازیدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت.
- ئەم بەرهەمانەش بۆ جوانی ئامادە دەکەن: (پەیکەری مرۆڤ، شێر، پڵنگ، گورگ، فیل، مامز، بەرخ، ماسی، بەران، کەڵەکێوی، حۆری دەریا، ئەسپی دەریا، پەلەوەری جۆراو جۆر وەکو: کۆتر، کەڵەشێر، مریشك، باز، لەقلەق، بوومە (کوندە بوو)، کەو، پەپو سلێمانی، لەقلەق، هەروەها فیقە بۆ دەستی منداڵانو بە دەیان شتی جوانکیلەی دیکەیش ئامادە دەکەن، بە هەقیقەت بەرهەمەکانیان زۆر جوانو پوختەن، دەسترەنگینی ئەو هونەرمەندە پیشەوەرانەی بەجوانی پێوە دیارە.

بەڵام لەم رۆژگارەدا ئەم پیشەیە تا رادەیەکی زۆر کز بووە، چونکە زانیاری تەکنەلۆژیا لەرووی پیشەسازییەوە زۆر پێش کەوتووەو بەرهەمی پوختو جوانتر هاتووەتە گۆرێ وەکو یەخچاڵو قاپو قاچاغی شووشەو ئیستیلو پلاستیکو.. هتد.

بۆیە هەندێ سەنعەتکاری دەسترەنگین لەبەرهەمە فۆلکلۆرییەکان کە خەڵکی هەندە بەکاریان ناهێنن خۆیان دزییەوەو لەبواری سیرامیکدا خۆیان دۆزییەوەو لەو بوارەدا کار دەکەنو بەرهەمی جوانو قەشەنگ بە بەرهەم دێنن.

* وەستاکانی پیشەی گۆزەکاری:

١. (حاجی رەزا عەبدوڵڵا گۆزەچی)، باپیرەی هونەرمەند (عەبدولواحید گۆزەچی).
٢. (حاجی ئەحمەد رەزا گۆزەچی)، باوکی هونەرمەند (عەبدولواحید گۆزەچی).
٣. (حاجی عەلی مەردان رەزا گۆزەچی).
٤. (حاجی عەبدوڵڵا رەزا گۆزەچی).
٥. (حاجی خدر رەزا گۆزەچی).
٦. (حاجی قادر رەزا گۆزەچی).
٧. (مستەفا عومەر گۆزەچی).
٨. (مەحمود بەگ گۆزەچی)، کاری لە فرۆشتنی ئەکرد بەڵام دروستی نەدەکرد.
٩. (نەبیل مستەفا گۆزەچی).
١٠. (نازم گۆزەچی).

* سیرامیك:

١١. (حاجی لەتیف).
١٢. (نورەددین لەتیف).
١٣. (عیزەددین لەتیف).
١٤. (بەهائەددین لەتیف).
١٥. (حاجی محەمەد سلێمان).
١٦. (حاجی مسەفا).
١٧. (وەستا حەمید)[33].

حاجی نورەدین حاجی لەتیف گۆزەچی

حاجی عومەر مستەفا گۆزەچی

حاجی لەتیف عەلی گۆزەچی

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. لە گۆڤاری رەنگین، ژمارە ١٤٩ ساڵی ٢٠٠١دا بڵاوکراوەتەوە.

٢. کەرەپوو، کەرەپۆ (گوێ کەرە)، رووەکێکی خۆرسکییە لەرۆخی رووبارو جۆگاو گۆلە ئاوەکاندا دەروێت، گوڵەکەی وەکو وردە لۆکە وایە.

٣. سرە: پێکهاتووە لەقشپڵو شیاکەی وشکەوەبووی پەس و رەشە وڵاخ لەتەویلەدا کە بەهۆی سمی ئەو ئاژەڵانەوە پەستەکا بێ و لکابێ بە زەوییدا، جا بە بێڵ یان خاکەناز یان پاچ تەختە تەختە هەڵیدەکەنن بۆ کوورە یان لەبواری کشتوکاڵیدا سوودی لێ دەبینن.

٤. کوڵەنان: کەپرۆکەیەکی بچووکە لەخشتی کاڵ یان دارو قامیش بۆ کوندەو کووپە ئاو دروست دەکرێت.

٥. پەندی پێشینان، چاپی دووەم، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپخانەی (کامەرانی)، سلێمانی، ١٩٧١، لاپەڕە ٢٦٦.

٦. پەندی پێشینانو قسەی نەستەق لەناوچەی کەرکوکدا، هەردەوێڵ کاکەیی، ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٨، لاپەڕە ١٤٧.

٧. هەڵبژاردەیەك لەهۆنراوەی فۆلکلۆری کوردیی ناوچەی گەرمیان، بەرگی سێیەم، ئیبراهیم باجەلانو هەردەوێڵ کاکەیی، ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەڕە ١٣٢.

٨. پەندی پێشینانی کورد، بەرگی دووەم، عەلی مەعرووف

شارەزووری، چاپخانەی (الحوادث)، بەغداد، ١٩٨٧، لاپەڕە ٥٦.
٩. پەندی پێشینان لاپەڕە ٢٧٣.
١٠. لە (ئەحمەد سابیر عەلی كەڵوری، بە حاجی ئەحمەد سەعاتچی ناسراوە) وەرگیراوە، كەركوك، ڕەحیماوا.
١١. خەرمانێك لەمەتەڵی فۆلكلۆری كوردی، سەردار فەتاح ئەمین، سلێمانی، ١٩٧٧، لاپەڕە ١٤.
١٢. تەندوور بان: بریتییە كەپرۆكەیەكی قوڕین وەكو چەتر ها بەسەر تەندوورەوە بۆ پاراستنی تەندوورەكەو خانمی نانكەر لەباران و سەرماو سۆڵەی زستان و گەرمای هاوین.
١٣. هەڵبژاردەیەك لەهۆنراوەی فۆلكلۆری كوردیی ناوچەی گەرمیان، بەرگی سێیەم، ئیبراهیم باجەلان و هەردەوێل كاكەیی، ئینستیتیوتی كەلەپووری كورد، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەڕە ١٤٧.
١٤. ئەمەش ناوی سەرجەم ئەو خێزانەیە كە لەم پیشەیەدا كار دەكەن: (مام كەمال زەینەڵعابەدین لەتەك كوڕەكانی عەلی و حەسەن و حەیدەرو تەیموور، مامۆستا هەواس هەیاس عەباس لەتەك نیازو نەوزادی برایدا، جەمال زەینەڵعابەدین، داود سەلمان ئەلیاس)، سەلمان، ڕەحمان، سابیر، عەدنان، كەنعان، ئیەلماز، نیاز، ئەمانە كوڕی ئەلیاس عەباسن، ماوەیەك لەبەغدا كاریان دەكرد، لەپاش پرۆسەی ئازادی گەڕانەوە، عەدنان و داود لەكەركوك نیشتەجێ بوون و بە هەمان كارو پیشەوە خەریكن، حەیدەری مام كەمالیش ئەوە چەند ساڵێكە چووەتە شاری سلێمانی و لەوێ لەبواری سیرامیكدا كار دەكات.
١٥. هەڵبژاردەیەك لەهۆنراوەی فۆلكلۆری كوردیی ناوچەی گەرمیان، بەرگی سێیەم، ئیبراهیم باجەلان و هەردەوێل كاكەیی، ئینستیتیوتی كەلەپووری كورد، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەڕە ٥٩.
١٦. فۆلكلۆری هۆنراوەكانی كوردەواری، چاپی دووەم، محەمەد كەریم شەریف، لەچاپدانەوەو زیادكردنی سەعدوڵڵا شێخانی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغداد، ١٩٨٦، لاپەڕە ٨١.
١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٨١.
١٨. لە (میرزا وەلی نازە) وەرگیراوە، (١٩١٤- ٢٠٠٢) داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.
١٩. لە مەقامزان (خەزعەل مارف فەرەج)، وەرگیراوە، (١٩٣٦- ) داقوق، خۆرز
٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٢. لە خاتوو (نەشمیە عەیبوڵڵا) وەرگیراوە، (١٩٣٩- ٢٠١٢) داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.
٢٣. هەڵبژاردەیە لەهۆنراوەی فۆلكلۆری كوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی دووەم، هەردەوێل كاكەیی، لەتیف گلی، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی، (دار الحریة للطباعة) بەغدا، ١٩٩٥، لاپەڕە ٦٧.
٢٤. لە (شوكر ڕەزا عەزیز) وەرگیراوە، (١٩٢٤- ٢٠٠٤) داقوق، دێی خۆرز.
٢٥. لە (میرزا وەلی نازە) وەرگیراوە، (١٩١٤- ٢٠٠٢) داقوق، ئاوایی تۆپزاوە.
٢٦. لە مەقامزان (مام شەوكەوت خورشید كاكەیی) وەرگیراوە، (١٩٣٦- ) داقوق، تۆپزاوە.
٢٧. چەپكێ لەگوڵاڵە سوورەی شارەزوور، عەلی شارەزووری، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٢، لاپەڕە ١٣٣.
٢٨. پەندی پێشینان، چاپی دووەم، شێخ محەمەدی خاڵ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٦٨.
٢٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٦٨.
٣٠. پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لەناوچەی كەركوكدا، هەردەوێل كاكەیی، لاپەڕە ٣٠.
٣١. پەندی پێشینان، چاپی دووەم، شێخ محەمەدی خاڵ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٦٩.
٣٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٦٩.
٣٣. كركوك، بانوراما التأریخ والانسان، دكتۆر ئیبراهیم خەلیل سەعید، لاپەڕەكانی ٤٢١-٤٢٨.

**سەرچاوەی زانیارییەكان:**

- مام كەمال زەینەڵعابەدین مستەفا (١٩٣١- ) خورماتوو
- مامۆستا هەواس هەیاس عەباس (١٩٥٥- ) خورماتوو
- جەمال زەینەڵعابەدین عەباس (١٩٤٦- ) خورماتوو
- حەیدەر مام كەمال (١٩٦٥- ) سلێمانی، پرۆژەی سیرامیكی كوردستان

*** ڕەشماڵ و چیخ چنین[١]:**

دەڵێن: لە کوردەوارییدا (سیاماڵ)و (دەوار)و (چادر)و (تاول)یشی پێ دەڵێن دوو جۆر ڕەشماڵ هەیە هی زستانە قورسەو سخ تر تەنراوە، هی هاوینەیش سووکەو لە هی زستانە شاش و تەنك ترەو پێی دەڵێن (چاتۆڵە)، هەردوو جۆرەکەشیان لە مووی بزن لە پاش ڕستن و کردنی بە (بەن) بە تان و پۆ ژنانی دەسترەنگین بە هۆی ئامرازی (کەڵکیت) دەیکوتن و دروستی دەکات، چونکە مووی بزن قایم ترو سخ ترە لە هی خوری مەڕو لە کاتی باراندا ئاویش نادا، هەمیشە لە کاڵای ئەستوورو ڕەختە دروست کراوەو پێ ناڵێن (ڕەشماڵ)، تەنها (دەوار)، یان (چادر)ی پێ دەڵێن، بە زۆری ماڵە هەژارەکان و دۆم و خەرات و قەرەجەکان بە کاری دێنن و هەمیشە دەوارەکانیشیان پەرپووت و شرۆڵەیە بۆیە پێشینان وتویانە (کارێکی پێکرد، با بەدەواری دۆمی نەکردبێ)[٢] لەم ڕۆژگارەیشدا جۆرە چادرێکی پان و پۆری کەوانی جوانکیلەی پوختەو نایاب هاتووەتە ناوانەوەو لە شارو شارۆچکەکانی وڵاتدا بە زۆری لە پرسەکاندا بەکاری دێنن.

ڕەشماڵ، تەختە تەختەیە لە (٣، ٢٠) تەختەو ئەستوونی دارینی دەدرێتە ژێر لە (٢، ١١) ئەستوونی هەیە، ئەمە جگە لە (کۆماج)[٣]و (کۆمانج)[٤]، بە پێی دارایی ئەو ماڵەیە وەکو شایەر لەم شیعرە فۆلکلۆرییەدا وتوویەتی:

دەوار (هەفت ئەستوون) ڕەشماڵ هەڵیدا

چیخێل (ئەسمەر پێچ) بە چەپ گرێیدا[٥]

هەر ڕەشماڵێکیش (هەتیوە)[٦]ی هەیە، دەیدوورن بەو شوێنانەوە کە (کۆمانج)یەکانی تیایە، لە هەموو لایەکیشەوە بە هۆی (تەتەڵە)[٧]وە (گوریس)[٨]ی پێوە دەبەستن و سەری گوریسەکان دەبەسترێن بە مێخەوەو[٩] بە (مێکوت)ی دارین دادەکوترێن و (گیرگە)[١٠]یشی دەدرێتە پاڵ و بە چاوار دەوری ڕەشماڵەکەیشدا (پاروێنك)[١١] ئامادە دەکرێ بۆ ئەوەی ئاوی باراناوی نەچێتە نێو، لەکاتی باراندا لە سەرەتاوە ڕەشماڵ هەندێ (ڕنە)[١٢] دەکات لە پاشاندا ڕادەوەستێ، ئەستوون و مێخ و سنگ[١٣]و کۆمانج (پیاوی باوەردار)[١٤] دروستی دەکات، چەند (کۆچیل)[١٥]یشی بۆ دەهێڵنەوە.

کورد هەر لە دێر زەمانەوە ڕەشماڵ هەبووەو بەکاری هێناوە، ڕەشماڵ نیشینەکان و کۆچکەرییە کوردەکان بە درێژایی ساڵ بە هاوینان لە ترسی گەرمای گەرمیان و بۆ دابینکردنی لەوەڕگای ئاژەڵەکانیان بارو بنەو ڕەشماڵی خۆیانیان دەپێچایەوەو لەسەر پشتی گا، یان هێسترو گوێدرێژ دەیانبەست و دەچوونە کوێستان، بە زستانیش لە ترسی بەفرو سەرماو سوڵەو زریانی کوێستان دەچوونە دەشتی کاکی بە کاکەییەکی گەرمیان، بۆیە شایەر وتویەتی:

ئەوا من ئەڕۆم ئەچمە گەرمێنێ[١٦]

ئاخۆ خواکەی من چیت بەسەر بێنێ؟

* * *

بە بەهارانیش لە نێو سەوزەگیاو مێرگ و چیمەندا ڕەشماڵیان هەڵدەدا وەکو شایەر دەفەرمێ:

دەوار هەڵدانە یاران لەو خوارە[١٧]

لەو چایەر چیمەن لەو میرغوزارە

* * *

ڕەشماڵ نیشینە کۆچەرییەکان لە هەوارەگەدا ڕەشماڵیان بە (هۆبە) هەڵدەداو پێکەوە نیشتەجێ دەبوون، وەکو شایەر لە هەڵبەستەکەیدا وتویەتی:

ئەوە مانگ هەڵات داویە لە (هۆبە)[١٨]

خۆ من دەروێش نیم بشکێنم تۆبە

* * *

ژیانی ڕەشماڵ نیشینەکان گەلێ خۆش و سادەو بێ گرێ و قۆرتە، بە تایبەتی لە وەرزی بەهارا، لە لایە قارەی مەڕو باعەی بەرخ و کارژیلەیە، لە لایە دەنگی مەل و قاسپە قاسپی کەوو خورەی ئاوە، لە لایەکی دیکەیشەوە حیلە حیلی ماین و ئەو ئەسپە کوێتە، لەو لایشەوە ترپەی کەوش و زرەی بازنی بێری خان دێ، ئەم بڕە دەنگانەو هی دیکەیش تێکەڵ بە گڤەی باو سۆزی شمشاڵ و نەغمەی حەیران دەبن و ئاوازێکی سازگاری دڵگرو شاکاری سروشتی پێك دێنن کە مرۆڤ گوێی لەو ئاوازە تەلیسماوییانە دڵرفێنانە بێ سەرمەست و مەدهۆش دەبێت زۆر جار لە ناو ڕەشماڵدا کۆری شەونشینیان دەبەستن، تیایدا باسی ئاژەڵ و شوێنی لەوەڕگاو ڕەشماڵ و هەڵس و کەوت و گوزەرانی خۆیانیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، پەندو قسەی نەستەقیان دەوت، شیعریان دەخوێندەوە، حیکایەتخوان سەرگوزەشتەو حیکایەتی بەر ئاگردانی دەگێڕایەوە، (چەوچە)[١٩] یان بۆ یەکتر دەوت و زیرەکی و هۆشیارییەکیان پێ تاقی دەکردەوە، دەنگ خۆشەکان دەستیان دەنایە بنا گوێ و مەقام، یان لاوك یان حەیرانیان دەوت و بەسەر نیشتیمان و سوار چاکان و قارەمانان و دۆست و ئازیزەکانیاندا چریکەی سۆزیان دارو بەردی دەهێنایە سەماو هەڵپەرکێ، تەنانەت مێخ و ئەستوون و قولفەو ڕەشماڵەکەیشی دەهەژاند، هەر یەکە لە لای خۆیەوە دەهاتە جۆش و خرۆش، بۆیە شایەر بە دیالێکتی گۆران وتویەتی:

ناڵەی هەور تار[٢٠] وەر[٢١] چە[٢٢] تاو وەشەن[٢٣][٢٤]

خوناوکەی[٢٥] (دەوار) شیرین خان وەشەن

یان بە دیالێکتی کرمانجی خواروو وتراوە:

بەهاران خۆشە نمنمەی باران[٢٦]

تەماشای سەر چیخ گۆشەی (دەواران)

یان شایەر بە شێوەی کرمانجی خوارووی هەولێری وتوویەتی:

چیخ و (ڕەشمار)[٢٧]و (چادر) هەریاندایە[٢٨] لە بناری[٢٩]

دوو کیژی گوارە زێرین بە جووت حەوشیان دەماری[٣٠]

* * *

هەروەها بۆ (شایی)و (پرسە)یش ڕەشماڵی گەورەیان بۆ میوان لە شوێنێکی خاوێن و ڕاستیدا هەڵدەدا بەتایبەتی ئەو خێزانانەی شوێن و جێگایان تەسك بووە کە تا ئەمڕۆش لە گوندو لادێکانا هەر ماوە تەنانەت لە شارو شارۆچکەکانیشدا

زۆر جار بەکاردێت، میوان و ئامادە بووان لە ژێریدا دادەنیشن و نان نۆش دەکەن و چایی فڕ دەکەن.

*** چیخ[٣١]:**

ڕەشماڵ نشینەکان زۆر پێویستیان بە (چیخ) دەبێ و هەر خۆیانیش ئامادەی دەکەن و بەکاریدەهێنن، پیشەی (چیخ چنین) پیشەی ژنانی گورجوگۆڵە، گەلێ پیشەسازی دەس ڕەنگین لەم پیشە فۆلکلۆرییەدا کاریان کردووەو ناوبانگیان دەرکردوە.

چیخ، زیاتر لە جۆرێکی هەیە لەوانە: (ئەسمەر پێچ، سوامە، کۆچەلە، سادە، چیخۆلکە، چیخی هەللاجی)، هەر هەمووشیان لە (قامیش)و (زەل)[٣٢] بە بەنی خوری مەڕو مووی بزن دەچنرێن و ئامادە دەکرێن، ئەم چیخانە لە کوردەوارییدا هەر یەکەیان بە جۆرێك بەکاردێت.

*** ئەسمەر پێچ:**

ئەم جۆرە چیخە بە بەنی ڕەنگامە بە شێوازێکی نەقشداری فرە جوان دەچنرێت، بە وێنەی گوڵ و ئاسکەو پەلەوەرو درەختی جۆراوجۆر دەیرازێننەوە بە جۆرێك سەرنجی مرۆڤ بە تەواوی رادەکێشێ.

دەس ڕەنگینی و هونەری و کارامەیی پیشەسازەکەی بەجوانی پێوە دیارە، تەڵە قامیشەکان کە لە ناوەراستەوە بە درێژی کراون بە دوو لەتەوە بە ڕێکوپێکی داپۆشراون و نادیارن، دەڵێی پارچە تابلۆیەکە بۆ خۆی ژنێکی کوردی دەس ڕەنگینی کۆچەری بە ناوی (ئەسمەر)ەوە داییهێناوە، بۆیە هەر بەناوی ئەویشەوە ناونراوە (ئەسمەر+ پێچ)= (ئەسمەرپێچ)، تەنها ماڵە دەوڵەمەندەکان و خاوەن دیوەخانەکان هەیان بووە، ڕووی ناوەوەی ڕەشماڵەکانیان وەکو پەرژین پێ دەپۆشن و بە هۆی (تێلا)و (سینگ)ەوە بەندی دەکەن، ئەمە جگە بۆ جوانی و قەشەنگی تەمەنی چیخەکەیش درێژ تر دەکات، بەهەقیقەت نێو ڕەشماڵەکە بە شێوەیەکی نایاب و دڵگیر دەنەخشێنێ..

لەسەرانسەری کوردستانە ئازیزەکانماندا ئەمەیان نایاب ترو جوانترو پەسەند ترە لەوانی دیکە، لە بەر بەرزی نرخەکەی هەموو خێزانێکی کوردی کۆچکەری نەیدەتوانی بەدەستی بێنێ، یان بۆ خۆی بیچنێ و بەکاری بهێنێ، هەندێ جار لە گۆشەی نێو دەوارەکەوە ئەم جۆرە چیخەیان دەگێڕا بۆ نووستنی زاواو بووك، یان بە چیخی (سوامە) ئەوەیان ئاکام دەدا و پێیان دەوت (کولێن)، ئازوقەیان تێدا دەپاراست، بە هاوینانیش گوندنیشینەکان لە جیاتی شوورەی سەربان بە شەوان بە کاریان دەهێناو تیایدا دەنوستن، لە شیعری فۆلکلۆرییدا ناوی (کولێن) هاتووە لەوانە:

دوو ڕەشماری ڕەشکۆکە[٣٣] لە دۆرەك[٣٤] هەریان دابوو[٣٥]
دوو کیژی گوارە زێرین لە دەرکەی ڕاوەستا بوو
یەکێ لەوان جوانتر پاری بە (کولینێ) دابوو
دەستم گەیاندە یەخەی جۆت مەمك بەرەڵڵا بوو

*** سوامە:**

ئەم شێوازە چیخە چەشنی ئەسمەرپێچ وایە بەڵام پێکەکانی بە دەشتەوەیە، واتە وەکو ئەو سخ نەتەنراوە هەمیسان کۆچکەرییەکان لە ڕووی ناوەوەی ڕەشماڵ دایدەنێن و بەهۆی دارچیخ[٣٦]و سینگی نووك باریك لەگەڵیدا بەند دەکرێ و ئەمە بۆ جوانی و ڕازاندنەوەی نێو ڕەشماڵەکەیە لە هەمان کاتیشدا لە تەپوتۆزی هاوین و سەرماوسۆڵەی زستان ژوورەکە دەپارێزێت.

*** کۆچەلە:**

ئەم چیخە بە شێوازی نەقشی چوار گۆشەیی بەرێکوپێکی دەچنرێ، هەمیسان بۆ ڕەشماڵ و هەمان مەبەست بەکاردێت، گوندنشینەکان بە هاوینان لە سەربان دەیانکرد بە پەرژین و تیایدا دەخەوتن، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا لە جیاتی ئەم چیخە بە قوماش پەردە دەگێرن.

*** چیخی سادە:**

ئەمیان هێڵی چنینی بەنەکانی ڕاستە، بۆ دەوری ڕەشماڵ وەکو دیوار بەکاردێت.

*** چیخۆڵکە (چیخۆڵك):**

ئەمیان بچووکە بۆ سەرکوڵەنان و ژێر (کوننە) ئامادە دەکرێ، زۆر جار برنجیشیان پێ دەپاڵێوێ و کەشکیشیان لە سەر هەڵدەخست.

*** چیخی هەللاجی:**

ئەم چیخە لە نەیجە[٣٧] و بەن دەچنرێ نەك لە (زەل)، لە پێشدا قامیشەکان لە ناوەڕاستەوە بە درێژی دەکەن بە دوو لەتەوە بە کێردێکیش توێکڵەکەی لێ دەکەنەوە تا لە کاتی بەکارهێناندا نەشکێ و زیاتر بەرگری بکات چونکە قامیش ناوەکەی بەتاڵە، پیشەسازە هەللاجەکان فەرەنجی و گەرەك و کوڵەباڵ و لبادو سەر کڵاوی لەسەر دروست دەکەن، ئەمەیان بە زۆری هەللاجەکان خۆیان دەیچنن.

شایەنی وتنە ڕەشماڵ و چیخ زۆر سەرەنجی شایەرانی کوردیان ڕاکێشاوە بە تایبەتی لەکاتێ لە گۆشەیەکی ڕەشماڵەکەوە، یان لە چمکێ چیخەکەوە چاویان بە ئازیزە نەشمیلانەکەیان کەوتبێ، ئەمەش چەند نموونەیەکە لەو شیعرە فۆلکلۆریانە:

کچێ هارو هاجی وریاو دڵ تەڕ بە یارە سمێڵ قیتەکەی دەڵێ:

هۆ کورە ڕەش تاڵەی ڕەش مشکی وە سەر[٣٨]
لە ژێر دەوارا سەرێ بێنە دەر

* * *

کور دەڵێ:

مانگە شەو خۆشە لە بەهارەوە[٣٩]
یاری خست[٤٠] بێ لە دەوارەوە

* * *

یان:

ڕەشمارو ڕەشمارە هاوار لە منێ[٤١]
ڕەشمار لە کەندێدا هاوار لە منێ
جووتێ گوار لە گوێدا هاوار لە منێ
سووتام پارم[٤٢] پێدا هاوار لە منێ
ڕەشمارەی لە ڕەشێ هاوار لە منێ
کورتێ لەبەر نەخشێ هاوار لە منێ
خودایە بە منی بەخشێ هاوار لە منێ
ڕەشمارەك وا دیارە هاوار لە منێ
چیخیان بێ دەوارە هاوار لە منێ
کوشتمی گوێ بە گوارە هاوار لە منێ
* * *

کچ دەڵێ:
سەڵتە ڕەش مەرۆ دەسگیرانتم[٤٣]
چیخی (ئەسمەرێنچ) دیوەخانتم.
* * *

یان:
دیوەخان دار گوێزە چیخی (ئەسمەرینخ)[٤٤]
دیوەخان رووخا منال بی سەرپێچ

کور دەڵێ:
ماڵمان ماڵ هاوسێ چیخمان جودایە[٤٥]
حەیفم بۆ باڵات شەو بە تەنیایە
* * *

چەندم پێ خۆشە (چیخ) لە سەربان بێت[٤٦]
کچ لە گوێسوانەو کور لە کۆڵان بێت.
* * *

ماڵمان ماڵەو چیخێکمان بەینە[٤٧]
تازەم زانیوە بەم کەین و بەینە
* * *

خوایە هەڵکەنی ئەو چیخە شرە[٤٨]
بەڵکو دەرکەوێ ئەو مەمك خرە
* * *

ماڵمان ماڵ هاوسێ چیغمان دوو لایی[٤٩]
ماچ کردن خۆشە لە دوور ئاوایی
* * *

جگە لە شیعر لە مەتەڵی فۆلکلۆریشدا ئاماژە بۆ دەوارو چیخ کراوە لەوانە:
- بنوێ گایە، هەڵسێ چیایە- (دەوار)[٥٠]
- گیای دەشتە، مووی بزنە، فێڵی ژنە- (چیخ)[٥١]

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. لە گۆڤاری کەلەپووری کورد ژمارە ١٦، هاوینی ٢٠٠٣دا بلاوکراوەتەوە
٢. پەندی پێشینانی کورد بەرگییەکەم، ل ٧٤
٣. کۆماج: بریتییە لە دەستە دارێکی درێژ وەکو تەختەیەکی ئەستوور وایە لە ناوەراستەوە بە گوێرەی ئەستوونەکان کوون کراوە، ئەستوونەکان دەخرێنە کونی کۆمانجەکان.
٤. کۆمانج: ئەستووندەکی ڕەشماڵ لە دوو ئەستوون پێك هاتووە، تێهەڵکێش دەکرێن، دەدرێتە ژێر دەوار، هەروەها ئەستوونەکان دەدرێن لە ژێری (کۆماج)ەکان.
٥. لە مەقامبێژ (شێخ مەحموود شێخ ئیسماعیل بەرزنجی ١٩٣٤، ٢٠٠٢/٢/١١)ی دانیشتووی قادر کەرەم وەرگیراوە.
٦. هەتیوە: بریتییە لە تەختە دەوارێك هەر وەکو کەژوو وایە، هەندێ جار بە درێژایی دەکرێ بە دوو لەتەوەو دەیدوورن بە پشتی دەوارەکە و بەو شوێنانەوە کە (کۆمانج)ەکانیانی تێدایە.
٧. تەتەڵە (قوڵفە): بریتییە لە تەختە دارێکی ئەستووری ڕێکوپێك کراو نزیکەی (١٨سم)ە درێژ دەبێ، پانییەکەشی (١٢سم)ە ئەمە بە چاکی بەند کراوە بەمسەرو ئەوسەری ڕەشماڵەکەوە، بە درێژی دەوارەکەیش لە هەردوو لاوە بە ئەندازەی هەر (١٨٠سم)ە تەتەڵەیەکی دەوێ ئەمە جگە لەسەرتویلەکان، واتە ئەم سەرو ئەو سەری ڕەشماڵەکە، ئەم قوڵفە بۆ ئەوەیە تا دەوارەکە لە درین بپارێزێت، لە لایەکی دیکەیشەوە ئاسانکارییە بۆ توندکردنەوەو شلکردنەوەی گوریسەکانی ڕەشماڵەکەیە.
٨. گوریس: جۆرە بەتێکی تەنراوە ژنان لە بەن ئامادەی دەکەن، بە زۆری لە مووی بزن، چەشنی پەلکی ژنان دەیهۆننەوە، جوتیارەکان لە بواری کشتوکاڵیدا بە کاری دەهێنن، ڕەشماڵ نشینەکانیش بۆ دەوار.
٩. مێخ: جۆرە میخێکی دارینی ئەستوورو درێژە، بۆ بەند کردن و ڕاگیر کردنی ڕەشماڵ بەکاردێت، سەری گوریسەکانی پێوە دەبەسترێت.
١٠. گیرگە: دارێکی دوو شاخە، یا دوو فاقی ئەستووری زلە وەکو چەڵەمەیەکی بن درێژ، دەدرێتە پاڵ مێخەکان بۆ ئەوەی لە کاتی باو باران و زریاندا مێخەکان هەڵنەکەنرێن و دەوارەکەش نەتەپێت.
١١. پارونێك: بارگێن جۆگایەکی بچووکە بە چوار دەوری ڕەشماڵدا ئامادە دەکرێت بۆ ئەوەی لە کاتی باراندا ئاو نەچێتە نێو ڕەشماڵەکەوە، لەم پەندەدا کە بەشێوەی گۆران دارێژراوە نێوی پارونێك هاتووە: ئاوچە پارونێك ویمەوە لوانە چێرم (ئاو لە پارونێك خۆمەوە چووەتە ژێرم)، بروانە پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ، هەردەوێل کاکەیی، ئینستیوتی کەلەپووری کوردستان، چاپخانەی کشتوکاڵ هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٢٨.
١٢. ڕنە: ئەو وردە بارانەیە کە لە ڕەشماڵ دێتە خوارەوە، کە ڕەشماڵ بە تەواوی تەر بوو ئیتر ڕنە ناکات.
١٣. سنگ: بسماری لە دار دروستکراو.

١٤. پیاوی بارەدار: زووتر ماڵە گەورەکانی کورد پیاوێکیان بە کرێ دەگرت و هەمیشە لەگەڵیاندا بوو، ئەستوون و میخ و کۆماج و قولفەو چڵەو تێلای دروست دەکرد، پێیان دەوت: پیاوی بارەدار.
١٥. کۆچیل: دارێکە لە ترسی زریان و رەشەبا و گەردەلوول جەنرێتە سەر رەشماڵ تا رەشماڵکە قورس بێ و با کاری لێ نەکات و نەیشێوێنێت.
١٦. چەپکێ لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور، عەلی شارەزووری، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٢، ل٣٤.
١٧. هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی دووەم، ل٩١.
١٨. گوڵاڵەسوورەی شارەزوور، ل٣٣.
١٩. چەوچە: مەتەڵ مەتەڵۆك.
٢٠. تار: تاریك، مەبەست لە هەوری رەشتەڵەیە کە تاریکی دادێنێ.
٢١. وەر: پێش.
٢٢. چە: لە (جە).
٢٣. وەش: خۆش، وەشەن، خۆشە.
٢٤. لە مەقامبێژ (ئەحمەد فەرەج حوسێن شێخانی ١٩٥٥، ) ی دانیشتووی خورماتوو، ئاوایی میلناسر وەرگیراوە.
٢٥. خوناوکە: وردە بارانی هێدی و نەرم.
٢٦. بۆنی هەڵاڵان دێ، ل١٣.
٢٧. رەشمار: رەشماڵ سیاماڵ.
٢٨. هەریاندایە: هەڵیانداوە.
٢٩. سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، ل٥٨.
٣٠. دەماری: دەماڵی.
٣١. بۆ نووسینی ئەم بابەتە، لە کتێبی (کوردەواری، مامۆستا عەلادین سیجادی، ١٩٧٤، چاپخانەی نەعارف لە بەغدا، بینراوە.
٣٢. زەل (تەرکە) و (قەرەم)یشی پێدەڵێن، جۆرێکە لە قامیشی ناو بتەو لەسەر لێواری چەم و رووبارو جۆگا شین دەبێ، لە کوردەوارییدا بۆ چیخی سوامە و کۆچەلچە و سادە و چیخۆڵکە بەکاردێت.
٣٣. رەشکۆکە: رەش.
٣٤. دۆرەیەك: دۆڵێك، شیوێك.
٣٥. سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، ل٤٤.
٣٦. دارچیخ: دارێکی ئەستوورە درێژییەکەی نزیکەی مەترێك دەبێ لە پاڵ چیخ دادەکوترێ، (تێلا)یشی پێ دەڵێن.
٣٧. نەیجە: قامیش، جۆرە گیایەکی بەرزە لە رۆخی چەم و رووبارو جۆگە ئاودا دەروێ، چیخی ئەسمەرپێچ و چیخی هەللاجی لێ دروست دەکرێت.
٣٨. چەند ملۆیەك لە شاری فۆلکلۆری کوردی، ل٢١٩.
٣٩. بۆنی هەڵاڵان دێ، ل١٠٠.
٤٠. خاس: چاك، باش.
٤١. سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، ل٣٩.
٤٢. پار: پاڵ پارم پێدا، پاڵم پێوەدا.
٤٣. چەند مۆلۆیەك لە شاری فۆلکلۆری کوردی، ل١٥٢.
٤٤. هەمان سەرچاوە، ل٢٥٢.
٤٥. بۆنی هەڵاڵان دێ، ل٢٤.
٤٦. چەند مۆلۆیەك لە شتری فۆلکلۆری کوردی، ل١٠٤.
٤٧. بۆنی هەڵاڵان دێ، ل٢٦.
٤٨. هەمان سەرچاوە، ل١١٥.
٤٩. مەقام و موزیکی کوردی، سەلاح داودە وەك نموونەیەك، هەردەوێل کاکەیی، یەکێتی نووسەرانی کورد، لقی کەرکوك، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوك، ٢٠٠٦، ل١٤٨.
٥٠. خەرمانێك لە مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی، سەردار فەتاح ئەمین، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی، ١٩٧٧، ل٢٤.
٥١. مینا وارانی بابا.

*** فروە سازی - فەروە سازی[1]:**

یەکێك لەو پیشە کوردییانەی کە لە گەرمیاندا تا ئەم ئاخورو ئۆخرەیشدا بە زەندوێتی مابووەوە پیشەی فروە سازییە، ئەم فروەیە بە زۆری لە ناوچەی گەرمیاندا باو بووەو لە وەرزی زستاندا رۆژانی سەرماو سۆلە بە کاریان هێناوە.

کەرەستەکانی ئەم پیشەیە لەمانە پێك هاتوون (قەیچی، کێرد، دیلوان، دەرزی، دەزوو، پێستەی بەرخ).

فروە بە شێوەیەکی گشتی لە کەوڵی بەرخ دروست دەکرێت، ئەو بەرخە هەرچەندە کۆرپەو ساوا بێت فروەکە پەسەند ترو بە نرخ ترە، بۆ لە بەرکردنیش خۆش و سووکە.

پیشەوەرەکە پێشەکی پێستەکان بە پوختەیی لەبەر رۆژ خۆشە دەکاو بە کێردێ دەم تیژیش رووی چەرمەکان لە وردە گۆشت و بەز خاوێن دەکاتەوە تا وەکو قوماش نەرم دەبێت، دواتر دەیدوورن و فروەی لێ دروست دەکەن.

فروە لە رووی قەوارەوە دوو جۆرە، گەورەو بچووك، هەردووکیشیان لە کەرکوك و سەرجەم دەڤەری گەرمیاندا (فەروە)ی پێدەڵێن، گەورەکەیان وەکو ساقۆ (قاپووت) وایە، ئەوەی دیکەیان لە چەشنی (سوخمە)دایە، خەڵکی شارو لادێ لەژێر چاکەت و قومسەڵەوە دەیپۆشن.

لەبەر ئەوەی قەوارەی پێستەکان وەکە یەك نین جار هەر فروەیەك ژمارەیە کەوڵی بەرخی دەوێت.

پیشەوەرەکان تەنها لە وەرزی هاوینان و پایزاندا کار دەکەن، چونکە چەرمەکان لەبەر رۆژ وشك دەکرێتەوەو پوختە دەکرێن، لەکاتی تەڕو تووشیدا وشك نابنەوەو کار دەوەستێت.

پیشەوەری فروە ساز کەوڵ ناکڕێ بۆ دروست کردنی فروە، بەڵکو بەزۆری ئەوەی پێویستی بە فروە بێ خۆی چەرمەکان دابین دەکاو چۆنی بوێت بەو جۆرە بە شێوەیەکی جوان بۆی دەدوورێ و ئامادە دەکات، کە فروەی پەتۆ (بەتانی) و ساقۆو قەمسەڵەی فروەداری جوان و نایاب کەوتە بازارەوەو بە نرخێکی کەمیش بە ئاسانی دەست دەکەون، بۆیە ئەم پیشەیەیش هەر وەکو گەلێ پیشەی دیکە لەم ئاخورو ئۆخرەدا بەرە بەرە دای لە کزی و بۆ یەکجاری نەما.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. لە (فروەساز سالم ئیبراهیم هورمز ١٩٤٤، ٢٠٠٨) وەرگیراوە.

* جزو بەند سازی:

جزو بەند سازی کارێکی دەستکردی هونەری و فۆلکلۆری بەنرخ و پیرۆزە، راستەوخۆ خزمەتی زانیاری رۆشنبیری دەکات. لەشاری کەرکوکدا گەلێ جزو بەند ساز هەبوون و ئێستاش هەر هەن[1] ساڵەهای ساڵە لەم بوارەدا خزمەت بە کتێب و خوێنەران و رۆشنبیرانی شارەکە دەکەن.

کەرەستەکانی جزو بەند سازی لەم ئامرازە سەرەتاییانە پێك هاتوون: (چرێش، مەنگەنە، دیلوان، دەزوو، مشەمما، کەولی خۆشەکراوی ئاژەڵ، فایل، مەقەبا، کاغەز، راستە، قەیچی، مشار، درەوشە).

ئەگەر هەر کتێب و ناميلکەيەك هەڵوەشابێتەوە و لەيەك ترازابێت بەدیلوان و دەزوو دەیدوورنەوە، دواتر بەرگێکی پوختەی لێدەگرن، ئیتر ئەو کتێبە تەمەنی درێژتر دەبێت و بۆ ساڵەهایەکی دوورو درێژ بەخاوێنی دەمێنێتەوە، خوێنەر یان رۆشنبیری وایش هەیە بە سروشت کتێبی خۆش دەوێت بۆیە لەپاش خوێندنەوەی دەستبەجێ دەیباتە لای جزو بەند سازێك بۆ ئەوەی بەرگی بۆ ئامادە بکات، لەپاشاندا لەماڵەوە لە کتێبخانە تايبەتییەکەيدا دەیپارێزێت، خوێنەری وایش هەیە ژمارەکانی ئەو گۆڤارو رۆژنامانەی کە رۆژانە دەیخوێنێتەوە کۆیان دەکاتەوە و دواتر بۆ جزو بەند کردن دەیباتە لای وەستایە جزو بەند ساز بۆ ئەوەی لە نەمان بیانپارێزێت و لەکاتی پێوستدا زوو دەستی بۆی بەرێ و کەلکی لێ وەربگرێت، تەنانەت قوتابخانەو فەرمانگە فەرمییەکانیش دەفتەری نووسینەکانیان بۆ جزو بەند کردن دەبەنە خزمەتی جزو بەند ساز، مەلاو مامۆستا ئاینییەکانیش قورئان و کتێب و ناميلکە ئاینییەکانیان دەبەنە لای جزو بەند ساز بۆ چاك کردن و بەرگ گرتنیان، بەتايبەتی ئەو کتێبانەی کۆن و شڕۆڵ بوون، لەپاش جزو بەندیان ئەمەندە پۆشتەو جوان دەبنەوە هەندێ جار خاوەنەکانیان نایانناسنەوە، ئێستاش ئەو پیشە هونەرییە خاوێن و پیرۆزە. بە هەقیقەت پیشەی جزو بەند سازی کارو پیشەیەکی هەرە بەنرخ و پیرۆز و سوود بەخشە، خزمەت بە هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ دەگەیەنێت، ئەوەی ئاشنای بێت ئیتر ناتوانێ بە ئاسانی دەستی لێ هەڵگرێت.

* جزوبەندسازەکانی گەرمیان و کەرکوك:

١. (حاجی جەماڵ رەئووف عەلی (١٩٣٩ - ).
٢. سەلاح محەمەد سەعید قەرەداغی (١٩٥٦ - )، ئەمیان لەساڵی (١٩٦٩ ی ز)یەوە کار دەکات و مۆر هەڵکەنیشە.
٣. سڵێوە عەبدولمەسیح مرقس (١٩٤١ - (٢٩)ی ئەیلوولی ساڵی (٢٠٠٧).
٤. حاجی جەودەت عەبدولواحید عەبدولمەجید (١٩٣٤ - ) خۆی و کورکانی ئەحمەدو حامید کار دەکەن.
٥. سوبحی حوسێن عومەر (١٩٣٨ - ) خاوەنی کتێبخانەی فارابی لە تەك ئەحمەدی کوریدا.
٦. محەمەد ئەمین عەسری (١٩٠٠- ١٩٧٤).
٧. حاجی یووسف محەمەد ئەمین عەسری (١٩٦٥- ).

٨. ئەمین عەسری (١٩٣٥- ).
٩. مامۆستا غالیب عەباس.
١٠. حاجی عیزەت عەزیز فەرەج.
١١. حەسەن قادر کەرکوکی.
١٢. هەروەها جزو بەند سازانێکی لە شارۆچکەی کەلاری گەرمیانیشدا هەیە بەناو مەلا لوقمان مەجید قەمەرنازی زەنگەنە (١٩٧٥-).
١٣. سەمیر محەمەد نووری.
١٤. وەلید عەبدولرەحمان.
١٥. ئایدن کەرکوك.
١٦. قاسم سلێمان
١٧. خەلیل محەمەد.

*** تەزبیح[1]:**

هەر لە ڕۆژگاری کۆنەوە لاوو پیری ئێمەی کورد تەزبیحی جۆراو جۆری بەکار هێناوەو ئێستاش بەکاری دێنن، جا هەندێ تەزبیح هەن سنعەتکاری خۆمان دروستی دەکاتو مۆرکی ڕەسەنایەتی پێوە دیارەو دەچنە خانەی فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردەوارییەوە وەکو: (قەزوان، زەیتوون، بەردین، دارین)...هتد.

هەیشە هەر لە دێر زەمانەوە لە هەندەرانەوە بۆمان هاتووەو بەکارمان هێناوە وەکو: (سەدەف، کارەب-کەهرەب، پیرۆزە، کەرمان-کرمان، عەقیق، شیلان-مەرجان، قەڵەم، نەرجیل، یوسر، سەندەلووس، شەوە، سەندەل).

جا سەرجەم ئەم تەزبیحانە بەزۆری بۆ زکرو ویرد بەکار دەهێنرێ، هەیشە هەر بۆ خۆ خلافاندنو کات بەرنەسەر دەیگرن بە دەستەوەو تەزبیحاتی پێ دەکەن، تەنانەت ژنە بەساڵاچووەکانیش هەڵی دەگرن بەتایبەتی ژنە نابینەکان، هەندێ دەروێشو شێتۆکەو دێوانەش هەن چەند تەزبیحییەکی لەوردو درشت بەڕاستو چەپدا دەکەنە ملیانو دڵیشیان پێ خۆشە.

ئینجا بەچاك دەزانین لەسەر هەریەکێ لەو تەزبیحانە بەکورتی بدوێین، بۆ ئەوەی لە ڕەسەنایەتیان تێ بگەینو ئاشنایان ببین.

*** قەزوان (قەزخوان):**

ئەم جۆرە تەزبیحەیان لە بەردی (دارەبەن) دروست دەکرێت، لە کوردستاندا سنعەتکاری کارامەی خۆی هەیە، بە تەری بە دیلوان دەنکە قەزوانەکان یەك لە دواییەك کون دەکات، لەپاشاندا دەیهۆنێتەوەو گوڵەنگی جوانیشی لە ڕەنگی خۆی بۆ ئامادە دەکات، لە چەند دانەیەکیش ئیمامەیەکي بۆ پێك دێنێ، قەزوان دەبێتە چوار بەشەوە:

١- ئەبلەقی بەرزنجی:

ڕەنگێکی بازگی جوانی هەیە، ئەمەیان لەناو کوردەواریدا بە چاكو نایابترین جۆریان ناسراوە، نرخیان لەم ڕۆژگارەدا خۆی لە دوو سەد هەزار دیناری عێراقی دەدات.

٢. لاسوورە.

٣. حەمە سووری.

٤. قەزوانی سادە.

سەرجەم ئەم جۆرە تەزبیحانە جگە لە ئیمامەکەی کە لە چەند دانەیە قەزوانو گوڵەنگێك پێك هاتووە، بە زۆری (٩٩) دانەیە لەگەڵ هەردوو مەمەکانیدا ژمارەیان دەبێتە (١٠١) دەنك، بەزۆری سۆفیو مەلاو دەروێشەکان بۆ زیکرو ویرد هەڵی دەگرنو تەزبیحاتی پێوە دەکەن، چونکە لایان وایە (بیدعە)یە لەبەر ئەوەی ژمارەی ناوەکانی خوا (٩٩) یە. هەمیشە چەند تەزبییەك دەکا بەیەك تەزبیو ژمارەی دەنکەکانی دەگا بە (١٠٠١) دانە، ئەم شێخو دەروێشو پیاوە ئایینییەکان بۆ زیکری (لا اله الا الله) بەکاری دێنن.

هەروەها هەندێ کەس بۆ بەخت گرتنەوەش بەکاری دێنن، ئەوەی تەزبییەکەی بە دەستەوەیەو بەخت دەگرێتەوە برێك لە دەنکەکانی جیا دەکاتەوەو ئینجا دەیانژمێرێت ئەگەر لە ئەنجام دا جووت دەرچوو ئەوە بەختەکەی سپییەو وا دەزانن هەرچی لە دڵدا وەکو مراز گرتوویەتیەوە ئەنجامەکەی خێر دەبێت، ئەگەر هاتوو تاك (تیق) بوو، وا دەزانن بەختی ڕەشەو بەئاوات ناگات.

لاوە خوێن گەرمەکانیش دەیگرن لە خەنەو جوانتری دەکەنەوەو بە ڕۆنیش چەوری دەکەن بۆ ئەوەی بە ڕەونەقو بریقەداربێت، یان بۆ جوانیو شانازی کردن بە خۆوە دەیپێچن بە دەوری مشتووی خەنجەردا، ئەمە لە کوردەواریدا نیشانەی ئاشتییە، واتە: خەنجەرەکەی بۆ شەڕ هەڵنەگرتووە.

*** زەیتوون:**

ئەم تەزبیحەیان لەبەری درەختی زەیتوون دروست دەکرێتو لە (١٠١) دەنگ پێك دێت، بە زۆری لە ناوچەی گەرمیاندا، مەقامزان کاك خەزعەل مارف کاکەیی (١٩٣٦) لە قەزای (داقوق) وەستایەکی کارامەیە لە دروست کردنی ئەم جۆرە تەزبییە.

ئەمە تەنیا پیاوو ژنە ئاینییەکان دەیگرن بە دەستەوەو بۆ خوا پەرستی بەکاری دێنن بەلایانیشەوە پیرۆزە چونکە لە قورئاندا ناوی هاتووە.

*** تەزبی بەردین:[2]**

لە جۆرە بەردێکی نەرم دروست دەکرێت، ئەو بەردانەیە کە بۆ بەردە ئەستێ بەکاری دێنن، شوکور شاخە ڕەنگینەکانی خۆمان لەو جۆرە بەردی زۆر لێیە، شێوەیەکی ئاماڵ قاوەییە، سنعەتکاری خۆی هەیە، ماندوێتییەکی زۆری تێدایە چونکە کەرەستەکانی سادەو ساکارن پێك هاتوون لەمانە: (بەردە زێرە- دیلوان- چەرخ- بەرد).

*** تەزبی دارین:**

دەنکی وردو درشتیان هەیە، دارتاشەکانی خۆمان لە دار بەشێوەیەکی هونەری دروستی دەکەن، دەنك وردەکەی بۆ تەزبیحات بەکار دەهێنرێ، دەنکە درشتەکەشی لەماڵەکانو کۆگاو نوسینگەو دوکانەکاندا بۆ جوانی هەڵدەواسن، گەلێ نموونەیان لە پێشانگاکەماندا پێشانگای کەلەپووری پاریزراوە.

*** تۆیی بەری درەختەکان:**

لە کوردەواریدا گەلێ تەزبی دیکە هەن لەبەری درەختەکان دروستی دەکەن وەکو: بایەف، قۆخ، پێشەی خورماو هی دیکەیش... ئەمانە تەنها بۆ جوانییە، نموونەی گەلێ لەوانە لەماڵان پارێزراوە.

***بەردو شووشەی جۆراوجۆر:**

گەلێ تەزبیحی جۆراو جۆری ڕەنگاو ڕەنگی بەنرخ هەن پیاوی کورد بۆ تەزبیحات دەیگرێ بە دەستەوە کە ئەمڕۆ لەبازاڕدا بە دەگمەن دەستەکەون وەکو: (کارەب، شەوە، سەندەلووس، یوسر، نەرجیل، کریستاڵ، قەڵەم، ددانی فیل،

شیلان- (مەرجان))، عەقیق، کەرمان- (کرمان))، بای زەهر، پیرۆزە، سەدەف)و هی دیکەش.

ئەمانە بەزۆری ژمارەیان جگە لە ئیمامەکەی (٣٣) دەنکە لەگەڵ هەردوو مەمەکانیدا دەبێتە (٣٥) دەنك، ئەمە لەبەر ئەوەی حەزرەتی (عیسا) پێغەمبەر (د.خ) لەتەمەنی (٣٠) سالیدا بووە بە پێغەمبەرو لە تەمەنی (٣٣) سالیشدا بەپێی ئاینی ئەوان بۆ ئاسمان هەلکێشرایەوە، هەیشە ژمارەی دەنکەکانی لەمە زیاترە ئەمانە بەزۆری لە ولاتە ئەوروپییەکاندا دروست کراون ، بەلام خۆیان زۆر بەکاری ناهێنن، دەیفرۆشن بە ولاتە ئیسلامییەکان‌و لەرووی ئابوورییەوە کەلکی لێ وەردەگرن، هەیشە لە عێراق‌و دەولەتە ئیسلامەکاندا لە جۆرە شووشە، یان: پلاستیکی رەنگامەی جوان‌و نایاب لە کۆمپانیادا دروستی دەکەن هەمووشیان دەنکەکانیان لەم ژمارانە پێك هاتوون (٣٥، ٤١، ٥١، ٦٦، ١٠١) ئەم جۆرانەیان بەزۆری لاوەکان بۆ جوانی‌و زەوق‌و شانازی پێوەکردن‌و خۆ بە پیاو زانین بەدەستەوەی دەگرن‌و دەیپێچن بە دەوری مشتکی خەنجەردا.

دەروێشەکان (١٠١) دەنکەکەی بۆ زیکرو ویرد بەکاری دێنن، هەیە تەزبی‌و نیوێك، یان: دوان، یان: زیاتر دەکات بەیەك‌و تەزبیحاتی پێوە دەکات.

شایەر لە شاییدا لەکاتی گۆرانی وتندا تەزبی بەدەستەوەیەو ئەم دەست‌و ئەو دەستی پێوەکات تا ئاوازەکەی رێکوپێك بێت‌و چرقە چرقی تەزبیحەکەشی زەوق‌و شەوق بەو خەلکە بدات.

سەرچۆپی کێش لە شاییدا زۆر جار لە جیاتی دەستەسر تەزبییەك دەگرێ بەدەستەوەو رایدەوەشێنێ بۆ ئەوەی زیاتر جۆش بدات بەوانەی هەلدەپەرن، جاران حیکایەت خوانەکانیشمان لەکاتی لێدواندا بۆ ئەوەی شیرازی بیرو هۆشیان نەترازێ‌و زالتربن بەسەر وتارەکانیاندا بۆیە تەزبیحیان گرتووە بە دەستەوەو جار داریش بە توندی گوشیویانە، هەندێ مەلایش لەکاتی قورئان خوێندندا وا دەکات.

*** تەزبیح لە کوێ‌و لەچی دروست کراون:**

**١. کارەب-کەهرەب:**

ئەم رەنگانەی هەیە (زەرد، سپی کال، حەلوایی، سوور)، جاران لە کوردەواریدا رەنگە زەردەکەیان بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی زەردوویی (زەردەیی) بەکاریان هێناوە، هەمووشیان بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشییەکانی دل بەکارهێنراون، نەخۆش بەزۆری دەیگرت بەدەستەوە، لە ئەوروپادا دروست دەکرێت، نایابترینیان کارەبی بەردینە کە رەنگی زەردی ئامال سپییە.

**٢. شەوە:**

ئەم جۆرەیان لە بەردێکی رەشی قەترانی بەنرخ دروست کراوە، ژنان ئەم جۆرە شەوەیە دەنێنیە ژێر سەری مندالی ساوا‌وە (مەلۆتکە) بۆ ئەوەی فریشتەی (شەوە) نەیکوژێت، گوایە ئەم فریشتەیە شەرخوازەو لەم مووروە دەترسێت‌و ئیتر توخنی ئەو مەلۆتکەیە ناکەوێت، لە ئەوروپادا ئامادە دەکرێت.

**٣. سەندەلووس:**

ئەم جۆرانەی هەیە: (ئەلمانی، تورکی، میسری، نەجەف) نایابترینیان سەندەلووسی ئەلمانییە.

**٤. یوسر:**

دارێکی رەشی جوان‌و بۆن خۆشە، لە فرەیی دەنکە تەزبیحی لێ دروست دەکەن بە زۆری لە ئەوروپا ئامادە دەکرێت.

لە چەشنی ئەم تەزبی یوسرەیە لەشاری (نەجەف)یشدا دروست دەکرێت، رەنگی رەشی هەیە، هەیشە بە زیو یان وەرشە لە دەنکەکانی وەکو مێخ دەکوتن.

**٥. نەرجیل:**

رەنگێکی قاوایی کالی زۆر جوانی هەیە، باشەکەیان کۆنەو هەندێ تۆخترە، لە ئەوروپا دروست دەکرێت، تازەکەیان تورکییە.

**٦. قەلەم:**

لە جۆرە درەختێك لە ولاتی هندستاندا دروست دەکرێت، شێوەی لە نەرجیل دەچێت بۆنێ خۆشی هەیە.

**٧. ددانی فیل:**

دەلێن ئەمە لە ددانی فیل دروست دەکرێت بۆیە ئەم ناوەیان بەبالادا بریوە.

**٨. شیلان-مەرجان:**

رەنگێکی شین، یان: سەوز، یان سووری تۆخی هەیە، جگە لە تەزبیح ژنانی لادێ بۆ جوانی لەگەل مێخەکبەندا تێهەلکێشی دەکەن‌و دیکەن بە ملیان، یان: دەیکەنە نێو گەردانەو ملوانکەوە.

**٩. عەقیق:**

لە جۆرە بەردێکی بەنرخ دروست دەکرێت، هەندێ کەس لە پیاوو ژن بۆ جوانی دەیکەن بە نەقیمی ئەنگوستیلەی زێر، یان: زیو.

**١٠. کەرمان-کرمان:**

لە جۆرە شووشەیەکی زۆر چاك‌و نایاب لە هەندەران دروست دەکرێت‌و بە خەلکی ئێمەی دەفرۆشن.

**١١. بای زەهر:**

لە بەردێکی نایابی بەنرخ لە ئەوروپاو ئێراندا دروست دەکرێت.

**١٢. پیرۆزە:**

رەنگێکی دەنکەکانی شینەو هەندێ خالی رەشی تۆخی تێدایە، لە بەردێکی بەنرخ لە ئەوروپا دروست دەکرێت، ژنان جگە لە تەزبی بۆ ملوانکەو گەردانەش بەکاری دێنن.

**١٣. سەدەف:**

لە بەردێکی بەنرخ لە ئەوروپا ئامادە دەکرێت، رەنگی سپییە، جگە لە تەزبیح ژنان بۆ ملوانکەو گەردانەش بەکاری دێنن.

**١٤. سەندەل:**

دەنکەکانی رەشە، لە هندستان دروست دەکرێت‌و بۆنێکی خۆشی هەیە.

*** لەشیعرو بەرهەمی فۆلکلۆریدا ناوی تەزبیح دەبینیرێت، ئەمەش چەند نموونەیەکە لەو بەرهەمانە:**

شیعر:

(تەزبیحەکم وەردەگرت لەو خزمو برادەرانە[3]
شاییەکمان دادەبەست تۆزەك پێشی نیوەڕوانە)
* * *

(تۆم هەر لە فیکریو لەبەر چاومی[4]
تەزبیحی دەستمیو زیکری خاومی)
* * *

(تەزبیەکەی دەستت عانە باییە[5]
هویجبیکەرەکەت لە خۆراییە)
* * *

(تەزبیحەکم وەرگرت[6]
دەستم کرد بە بەندانە
ئەمن وا بەندی دەرێم
شایەر وا ڕاوەستانە)
* * *

( تەزبیحی دەستەکانم، بەرماڵی نوێژەکانم
ڕۆژێ جارێك نەتبینم غەریبو ماڵ وێرانم[7])
* * *

(قاتەکەی بەرت تازەو نەویە[8]
تەزبیحی دەستت سادە شەوەیە)
* * *

(خەنجەری پشتم تەزبیحی دەسم[9]
دەفرۆشم بۆ تۆ لەجێی گشت کەسم)
***

(تۆی تەزی دەسو تۆی هەناسەکەم
تۆی ڕۆحی ڕەوان دۆسە خاسەکەم)[10]

* مەتەڵ:

لەمەتەڵی فۆلکلۆریشدا دەربارەی تەزبیح وتراوە:

(١٠١) براو باوکێك ڕیخۆڵەیەکیان هەیە، مەبەست تەزبییە[11]

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. لە گۆڤاری (ڕەنگین، ژمارە (١٤٢)، ساڵی (٢٠٠٠)دا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (٣٦)، ساڵی (٢٠٠٨)دا بڵاوکراوەتەوە.

٢. تەزبی بەردین: تەزبیحساز فارس غەفوور ڕەزا گلی (١٩٠٢- ٢٠٠٧/٥/٢٥)، مرۆڤێکی بە ئەمەكو میوان دۆستو کورد پەروەر بوو، دانیشتووی شارۆچکەی (خورماتوو) بوو، شارەزاییەکی چاکی لە پیشەی دروست کردنی تەزبی بەردیندا هەبوو، ڕۆژی ١٩٩٥/١١/٢ تەزبییەکی بەردینی پێشکەش کردین تا ئەمرۆ لەلامان پارێزراوە، دەقاو دەق لە تەزبی قەزوانی ئەبڵەق دەچێت، ئەگەر زۆر بەوردی لێی نەڕوانیت هەستی پێ ناکەیت بەردە.

٣. سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردیی، سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٩٠، ل، ٦١.

٤- گۆرانییەکانم بەرگییەکەم، عەلی مەردان، دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، (دار الحریە للطباعە)، بەغدا، ١٩٨١، ل، ١٠٠.

٥- هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی دووەم، هەردەوێڵ کاکەیی، لەتیف مەجید گلی، دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، (دار الحریە للطباعة)، بەغدا، ١٩٩٥، ل، ٢٥.

٦- فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، محەمەد کەریم شەریف، چاپی دووەم لە چاپدانەوەی زیادکردنی سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨٦، ل، ١٦٤.

٧- حەیرانبێژی میللی ئەحمەد سابیر عەلی (١٩٥٥- ) بە ئەحمەد سەعاتچی ناسراوە، کەرکوك، گەرەگی ڕەحیمئاوا.

٨- گۆرانیبێژی میللی مستەفا ئەحمەد مستەفا (١٩٤٧- ) بە مستەفا نانەوا ناسراوە، خورماتوو.

٩- مەقامزان غوڵام خورشید حوسێن (١٩٠٧- ١٩٩٩/١٢/٢٦) خانەقی، ئاوایی مێخاس، ڕۆژی ١٩٩٥/١١/٣ لێم وەرگرت.

١٠- شێخ مەحموود ئیسماعیل عەبدولکەریم بەرزنجی (١٩٣٤- ٢٠٠٢/٢/١١) ئەم زاتە شارەزاییەکی چاکی هەبوو لە مەقامو ئاوازی کوردی، بە گەرمیانی ناسراوە، خەڵکی شارەدێی قادرکەرەم بوو.

١١- دەسنووس هەردەوێڵ کاکەیی.

* بێجگە لەو سەرچاوانەی سەرەوە سوودی لەم بەرێزانەی خوارەوە وەرگرتووە:

١. تەزبی سازو مەقامزان خەزعەل مارف کاکەیی (١٩٣٦- ) داقوق، خۆرز.

٢. تەزبی فرۆش ئەفەنی کەریم شاسوار جاف (١٩٤١- ) کەرکوك، ئیسکان، لە شەقامی مەجیدیەی کەرکوك لە ڕۆژی (١٩٦٤/١١/١٨ی ن)یەوە دوکانێکی بچکۆلانەی تەزبی فرۆشی هەیەو تیایدا ڕۆژانە کار دەکات.

*** خەنجەری دەبان[١]:**

میللەتی ئێمەی کورد وەکو هەر میللەتێکی رووی ئەم گێتییە هەر لەدێر زەمانەوە بیری کردووەتەوەو بە دوای شتێکا گەڕاوە تا بە هۆیەوە بتوانێت خۆی لەدوژمن و ئاژەڵە کێویە درندەکان بپارێزێت لەپێش هەموو شتێکدا دارو بەردو ئێسقانیان تیژ کردووەو وەکو چەك بەکاریان هێناوەو بەرگریان لەخۆیان کردووە، تا بەرە بەرە خەڵکی هۆشیار بووەنەتەوەو بیریان فراوانتر بووە، ئینجا کێردو خەنجەرو شیرو تیر کەوانیان هێناوەتەوە کایەوە.. لەپاش ئەمانەش باروت هاتە گۆڕێ و دەمانچەو تفەنگو رەشاش پەیدا بوو.. مرۆڤی ئەمڕۆیش بە بۆنەی زانیاری تەکنەلۆژیاوە جۆرە چەکێکی سەر سوڕهاوەری وا دروست دەکات مەردم لەئاستی دۆش دادەمێنێت.

لێرەدا بە کورتی تەنیا باسی (خەنجەر)ی کوردیتان بۆ دەکەین کە جۆرە چەکێکی سادەی دێر زەمانە، بەرهەمێکی دەستکردی فۆلکلۆرییە، پیشەی خەنجەرچییە دەست ڕەنگینەکانە.

خەنجەری کوردی جۆرو شێوەی تایبەتمەندی خۆی هەیەو مۆرکی رەسەنایەتی بە جوانی پێوە دیارە، دەمەکەی لەجۆرە ئاسنێکی زۆر چاكو نایاب دروست دەکەن کە پێی دەڵێن (نەهرز) یان (نیرز)، شێوەی خەنجەری خۆماڵی ئاماڵ کەوانەییە لە نێوە ڕاستیشەوە بە درێژایی دەمە خەنجەرەکە وەکو هێڵ گرێیەکی قوتی بۆ نەخشە دەکێشن، ئەمە بۆ ئەوەیە تا لەکاتی بەکارهێنانیا برینەکە زیاتر کاریگەرو کوشندە بێت، چاکترین جۆریان (دەبان)ە، ئینجا (شینە تیغ) لەدوای ئەمیان (دەمە سان)ە کە لەئاسنێکی نایابی جۆشدراو دروست دەکرێت، (دەبان) چەند جۆرێکی هەیە وا بەپێی نرخیان ناویان ڕیز دەکەین: (کرمان، خوراسان، لابر-لاهور، شیراز، شام، قەزێن) ئەمانەو شینە تیغ لەجۆرە پۆڵایەکی زۆر چاكو نایاب دروست دەکرێت، جۆرەکانی دەبان تەنیا لەجەوهەردا جیاوازییان تێدایە ئەگینا هەر هەموویان پوختەو چاكو نایابن، بەڵام دەبان واتە: (کرمانە)ە کەیان سەروەری هەر هەموو جۆرەکانی خەنجەرە بۆیە لەهەندێ ناوچەدا بە دەبانی جەوهەردار دەڵێن: (نێرگز دەبان).

مشتو، خەنجەر تەنیا لەشاخی گامێش و بزنە کێوی ئامادە دەکرێت چونکە قۆچی ئەم دوو ئاژەڵە بە پێچەوانەی ئاژەڵەکانی دیکەوە نێویان پتەوە، کیلانەکەشی بەدرێژایی دەمە خەنجەرەکە لەدوو تەختە داری تەنك دروست دەکرێت و چەرمێکی ڕەشی خۆشە کراوی جوانیشی تێدەگرن، ئەم کێلانە بۆ ئەوەیە تا خەنجەرەکە بپارێزێ و ئەو کەسەش هەڵیدەگرێت بەبێ مەترسی بیکا بە قەدی خۆیدا، هەر سێ و چوار ساڵ جارێ دەبێ خەنجەر مشت و ماڵ و زاخاو[٢] بدرێت ئەمەش کاری شیرگەرەکانە بۆ ئەوەی خەنجەرەکە لەپیسی و ژەنگ پاك و خاوێن ببێتەوەو بە ڕەونەق و تیژ تربێت.

لەگوندو لادێکانی کوردەواریدا پیاوەکان وەکو چەك هەڵیدەگرن و خۆیانی پێدەپارێزن، دەکرێ بە قەدی پشتێندا لەدیوی ڕاستەوە، زۆر جار کوڕو کاڵ بۆ جوانی و شانازی کردن تەزبیحەکی جوانی دەنك گەورە دەپێچن بە مشتوەکەیەوە، زۆربەی دیدە ساڵەکانیش تەزبی قەزوانی خۆماڵی (١٠١) دانەی دەپێچن بە دەوردا.

خەنجەری بچووکیشیان دروست دەکردو پێیان دەوت: (گرێمی)، ئەمە بۆ جوانی دەیانکرد بە قەدی منداڵ و مێرد منداڵدا. ئەو پیشەوەرەی کە دروستی دەکات پێی دەڵێن: (شیرگەر) یان: (خەنجەرچی). لە شاری کەرکوکدا گەلێ شیرگەر هەبوون لەم پیشەیەدا شارەزاییەکی چاکیان هەبوو لەوانە خوالێخۆشبوان: (نامیق رەزا) کە بەنامیقە بچکۆل ناسرابوو، خالە سابیر خدری سیامەنسووری و حەمدی شوکر عەبدولرەحمان و سابیر حاجی سالح و خالید عەلی وەلی (١٨٨٨- ١٩٥٢) هەروەها بە دەیانی دیکەیش، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا تەنیا دوو خەنجەر ساز لەکەرکوکدا ماون لەو پیشەدا کاردەکەن: عەلی ئیحسان قادر (١٩٣٤- ) و موەفەق تەحسین حوسێن (١٩٥٦- ). لەشارۆچکەی (کۆیە)ش بنەماڵەی (حەمە ئەمین) کە ناسراون بە شێتە ئەوانیش لەم پیشەیەدا ناوبانگیان دەرکردووەو شارەزاییەکی زۆر چاکیان لەدروست کردنی جۆرەکانی خەنجەری کوردەواری هەیە.

* لەپەندو شیعری فۆلکلۆریدا ناوی خەنجەر گەلێ هاتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەوا میللەتی کورد هەر لە ڕۆژگاری زووەوە خەنجەری بەکارهێناوە:

* پەندی پێشینان:

- خەنجەر لەپەنجەرە دەرنەچێ باشە[٣]، واتە: خەنجەر لەکێلانا بێ باشە، کە دەرتکرد دەبێ بیوەشێنیت.

- خەنجەر لەکا ئەدا [٤]، بە یەکێك دەوترێت کە بەبێ پارێز کوێرانە دەست بوەشێنێت.

- خەنجەری دەبان لەکێلانا ناوەستێت [٥]، بە یەکێك دەوترێت کە هونەرێکی بێ و لەپڕ دەربیبڕێت.

- خەنجەرش بەپێچەنە خوێنش بەرنمە شۆ [٦]، یان: خەنجەری لێدەی خوێنی دەر ناچێت، بە یەکێك دەوترێت کە زۆر تووڕە بووبێت و ڕقی هەستا بێت.

* شیعری فۆلکلۆری:

خەنجەری دەبان نەبڕێ حەیاتم[٧]
دایکی حەوت کوڕ بێ هەر بە تەماتم

**

چەنم پێوتی مەچۆ پەنجەرە[٨]
لەسەر سینەکەت شەرە خەنجەرە

**

هەڵکێشە خەنجەر، سەد زامم لێکە[٩]
زام لەسەری زام، دەرمانی لێبکە

**

خەم بوو بە نانم، خەم بوو بە بەرگم[١٠]
خەم بوو بە خەنجەر درا لە جەرگم

**

هەڵکێشە خەنجەر لێمدە چەپ و ڕاست[١١]
با من بکوژرێم لەسەر دۆستی خاس

**

هەڵکێشە خەنجەر بدە لەجەرگم[١٢]
ئەمشەو بخوێنە یاسینی مەرگم
**

وەرن جەرگم هەڵدرن بە دەبان و کوشتەری[١٣]
چەند جێ ژوانم لەگەڵ کرد لەپەنجەرەو دوو دەری
**

دەمەکەت بێنە تێر تێر ماچی کەم[١٤]
لەکێ ئەترسی خەنجەر پاچی کەم
**

هەڵکێشە خەنجەر وە کێلانەوە[١٥]
جەرگم ببڕە، بە ئێسقانەوە
**

هەڵکێشە خەنجەر، خەنجەر کوژمکە[١٦]
دەمخە خوێنەکەم هەنار مژمکە
**

خەنجەری قەزبێن تفەنگی شانم[١٧]
ئەیدەم بە باوکت، تۆم باتێ خانم
**

هەڵکێشە خەنجەر دەبانی دەم ڕەش[١٨]
بیدە لەدڵم بیکە بە سێ بەش
**

یان بەو خەنجەرە خۆم ئەدەم بە کوشت[١٩]
یان ئەچمە باخەڵ هەیاسە[٢٠] لەپشت
**

شەرتە بسێنم خەنجەر شینە تیغ[٢١]
دەرهێنم ڕەگی بەد کاران لەبیخ
**

پشتێنەکەت بێرە بوەستم وەپشت[٢٢]
یان خەنجێرەکەت خۆم ئەیدەم وە کوشت
**

ئەم بەرو ئەو بەرە ناسکە دولبەرە[٢٣]
لەسەر ماچێکت شەڕە خەنجەرە

* **لەنەریتی کوردەواریشدا نێوی خە نجەر هەیە لەوانە :**
– ئەوەی زەردەواڵەو سیرەمۆزە پێوەی بدات خەنجەری دەبان بۆ چارەسەرکردنی دەسوون بە شوێنی پێوە دانەکەدا، گوایە بەمە چاك دەبێتەوە[٢٤].
– خەنجەری دەبان بەلای کوردەوە ئامرازێکی بەنرخ و پیرۆزە بۆیە هەندێ جار لەجیاتی هەوێن دەمەکەی دەخەنە نێو شیرەوەو دەبێت بە ماست[٢٥].

* **پەراوێزو سەرچاوەکان:**
١. لە گۆڤاری (ڕەنگین، ژمارە، ١٤٠ساڵی ٢٠٠٠)دا بڵاوکراوەتەوە
٢. زاخاو: بریتییە لەجۆرە گڵێك لەچیاکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات پەیدا دەبێت.
٣. پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لەناوچەی کەرکوکدا، هەردەوێل کاکەیی، ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٩٠
٤. پەندی پێشینان، چاپی دووەم، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٧١، لاپەڕە ٢٢.
٥. سەرچاوەی پێشو، محەمەدی خاڵ، لاپەڕە ٢٠٢.
٦. پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ، چاپییەکەم، هەردەوێل کاکەیی، ئینستیتیوتی کوردستان، هەولێر چاپخانەی کشتوکاڵ، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٢٨.
٧. هەڵبژاردەیەك لەهۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی/٣، ئیبراهیم باجەلان و هەردەوێل کاکەیی،

ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەرە ٦٠.
٨. بۆنی هەڵاڵان دێ، مەحمود زامدار، بەڕێوبەریەتی گشتی رۆشنبیری کوردی، چاپخانەی (الزمان) بەغدا، ١٩٧٥، لاپەرە ٩١.
٩. سەرچاوەی پێشو، مەحمود زامدار، لاپەرە ١٢٦.
١٠. سەرچاوەی پێشو، مەحمود زامدار، لاپەرە ١٣١.
١١. سەرچاوەی پێشو، مەحمود زامدار، لاپەرە ١٨.
١٢. گەنجینەی گۆرانی کوردی، عوسمان شارباژێری، بەغدا، ١٩٧٥، چاپخانەی (الزمان)، لاپەرە ٢٣١.
١٣. سەرچاوەی پێشو، عوسمان شارباژێری، لاپەرە ٩٧.
١٤. چەپکێ لەگوڵاڵە سوورەی شارەزوور، عەلی شارەزووری، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨٢، لاپەرە ٩٩.
١٥. سەرچاوەی پێشو، عەلی شارەزووری، لاپەرە ١٦٣.
١٦. هەڵبژاردەیەك لەهۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی دووەم، لەتیف گلیو هەردەوێل کاکەیی، (دار الحریە للطباعة) بەغدا، ١٩٩١، لاپەرە ٥٩.
١٧ و ١٨و ١٩. مەقامزان مام شەوکەت خورشید کاکەیی (١٩٣٦- ) ئاوایی تۆپزاوە.
٢٠. هەیاسە: کەمەرەی زێرو زیوی ژنان، جۆرێکە لەخشڵ.
٢١. سەرچاوەی پێشوو مەقامزان مام شەوکەت خورشید کاکەیی
٢٢ و ٢٣. هەمان سەرچاوە، لەتیف گلیو هەردەوێل کاکەیی، لاپەرە ٦٥،٦٦.
٢٤ و ٢٥. مەقامزان خەزعەل مارف (١٩٣٦- )، داقوق.

### * دارتاشی:
ئەم پیشەیە وەكو دەیان پیشەی دیكەی فۆلكلۆری هەر لە رۆژگاری كۆنەوە لە نێو ئێمەی كوردا باو بووەو بە دەیان دارتاشی دەسترەنگین لەم پیشەیەدا كاریان كردووەو گەلێ بەرهەمی چاكو پوختەی نایابیان لە دارو لە دارتاشخانەكانیاندا ئامادە كردووەو ژیاون. كەرەستەكانشیان لەم ئامرازە سادانە پێك هاتووە (چەكوش، هەرە-مشار، گاز، بسمار، دار، فیتە، راستە)، ئەمەش ناوی برێ لە بەرهەمەكانیانە:

### * سەنوق:
ڕووپیەكەمی بە وێنەی گوڵو سێو و نەقش‌و نیگاری جۆراو جۆرو وێنەی بوراق لە شووشەو ئاوێنە ڕازاوەتەوە پێیان دەوت (سەنوقی ئاگر بارانە)، یان لە جیاتی ئەو ئاوێنەو نەقش‌و نیگارە ڕووەكەیان لە تەنەكەی نەقشدار دەگرت، درێژییەكەی بە ئەندازەی (١٠٠، ١٢٠ سم)ەو بەرزییەكەشی (٧٦، ٧٨ سم) بوو، هەیش بووە لەم ئەندازەیە زیاتر یان كەمتر ئامادە دەكرا، ئاگر بارانەكەیان تەنها دەوڵەمەندەكان لەگەڵ جیهازی بوكێنیدا دەیانكڕی‌و خەڵكی سەردەمی كۆن بەلایەنەوە فرە جوان‌و پەسەند بوو، هەژارو نەداران نەیاندەتوانی بیكڕن بۆیە ناچار سەنوقە نەقشدارە سادەكانیان بەهەرزان دەكڕی، لە ئاوایی‌و شارەكاندا پێخەفیان لەسەر دەكرد، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا ئەم بەرهەمە بەكار ناهێنرێ‌و بۆفیەو كەنتۆر جێگەیان گرتەوە.

### * سەنوقچە (ئەشتەرخان):
ئەم سەنوقە بچووكەو زیاتر لە جۆرێكی هەیە، ڕووپیەكەمی بە نەقش‌و نیگار یان ئاوێنە ڕازاوەتەوە هەبوو بۆ پاراستنی كەوچك‌و پیاڵەو ژێر پیاڵەو قۆری ئامادە كراوە، لە نێوەوە خانە خانەیە، هەر خانەیەكی شتێكی تێدا دەپارێزرا، هەیش بوو فەقێ‌و مەلاكان كتێب‌و دەفتەرو حبردان‌و قەڵەمیان تێدا دادەنا، جۆرێكی دیكەشیان هەبوو لەمانە بچووكتر بوو ژنان كل‌و كلتوورو خشڵ‌و خانەو ئاوێنەو وردەواڵەی تایبەتی خۆیانیان تێدا دەپارێزی، هەیش بوو هەندەی جانتایەك بوو ژنان كەلوپەلیان تێدا دەپاراست، ئەم بەرهەمانەش باویان نەماوە بۆ یەكجاری فەرامۆش كران. ناوی ئەم سەنوقچەیە لەم خشتە شیعرەدا هاتووە:

كەڵای خۆش قوماش، ستر كافووری
هان چە سەنوقچەی لەیل دەیجووری[1]

### * ئاوێنە (گوزگی):
ئەو ئاوێنەیە چوار دەوریان بە گوڵ‌و ئاوێنەبەند دەرازاندەوەو بە شێوەیەكی زۆر جوان‌و قەشەنگ دروست دەكراو پێیان دەوت (ئاوێنە ئاگر بارانە)، هەندێ جار ژنان لە پێشی بووكدا سەمایان پێوە دەكرد، لە هەندێ شوێنیشدا پێیان دەوت (مەرمەڕ).

### * ئەسكەمیلی بووك:
جۆرە ئەسكەمیلێكی خڕ بوو، چوار دەورەكەشی بە ئاوێنەو شووشەی گوڵدار بە جوانی ڕازاوەتەوە، زووتر بووكیان لەسەر داناو دەیانرازاندەوە، كە بووكیش تەشریفی خێری بگەیشتایەتە ماڵی زاوا هەمیسان لەسەری دادەنیشت‌و ژنانیش قنج قنجێ لێی دادەنیشتن‌و پیرۆزباییان لێدەكردو تەماشایان دەكرد تا بزانن ئەو بووكە جوانە یان نا، ئەمەیان بە زۆری لە شارەكاندا باوی بوو نەك لە گوندو لادێكاندا، ئەمەش لە ئەمرۆدا مۆدەی نەماوە ماڵئاوایی لێكردوین، چونكە ئەسكەمیل‌و كەرەستەی جۆراو جۆری دیكە جێگایان گرتەوە.

### * رەف (رەفە):
لە دار دروست دەكرا ڕووەكەشی بە شووشەی نەقشدار ئامادە دەكرا، هەیش بوو هەر لە تەختە دەكرا بە بۆیەی ڕۆنی نەقش‌و نیگاریان لەسەر دەنەخشاند، لە ماڵەوە لە ڕووی دیوار بە مێخ بەند دەكرا و قاپوقاچاغیان لەسەر دادەناو ڕیزیان دەكرد.

### * كەوچكدان (قاشوان):
دارتاشە دەسترەنگینەكان لە دار دروستیان دەكرد، جێگای كەوچكەكانیش بە قەید ئامادە دەكرا، لە نێو ماڵ بە قەدی دیوارەوە قایمیان دەكردو كەوچكی چێشتیان پێدا دەكرد، هەیش بوو ژنان لە قووڕ ئامادەیان دەكرد.

*** بێشك (لانك):**
ئەم بەرهەمە نامۆ نییەو زۆربەی زۆریشمان تێدا پەروەردە بووین‌و بە ئاسوودەییش لەنێویدا خەوتوین، درێژییەكەی (٧٠، ٧٥ سم)ە، پانییەكەشی (٣١ سم)ەو بەرزییەكەشی (٧٠، ٧٥ سم)ە، بە زۆری منداڵی ساوا (مەلۆتكە)ی تێدا دەخەوێنن كە تەمەنی (٧) ڕۆژ تا یەك ساڵان، ئەم بێشكەشە تا هەنۆكە بەكار دەهێنرێت. زووتر بێشكەی ئاوێنەداریش هەبوو، چوار دەوری بە ئاوێنە ڕازابووەوە.

*** كەژاوە:**
جۆرە سەنووقێكی زلە، زووتر لە كاتی كۆچ و باردا لەسەر وڵاخ دەبەستراو مرۆڤی تێدادەنرا، بەتایبەتی ژنی پیاوە گەورەكان‌و دیدە ساڵە یەك كەوتووەكان، هەروەها بووكیشیان پێ دەگوێزرایەوە لەسەر ماین، بە زۆری ئەو بووكەی ماڵیان لە ماڵی زاواوە دوور بوایە.
لەم شیعرە فۆلكلۆرییەدا ناوی هاتووە:
بیكە بە خاتری زەردەی خۆرئاوا[٢]
سەرێك بێنە دەر لە تۆی كەژاوا

*** جۆلانە:**
ئەم بەرهەمە درێژییەكەی (٧٧، ٨٠ سم)ە، پانییەكەشی (٤٣ سم)ە، بەرزییەكەی (١ م)ە، بۆ نوستنی منداڵ بەكاردێت، لە تەمەنی (١، ٥) ساڵان، زیاتر لە هاویناندا بەكاردێت، تا ئەم سەردەمەش ماوە.
پێش ئەم جۆلانەیە زووتر لە گوریس‌و لباد و بەرە جۆلانەیەكی سادەیان ئامادە دەكردو بە شەقڵەوە هەڵدەواسراو پێیان دەوت (هەلۆرك) یان هەلۆركە) یان (دەیدیك)، بۆ منالی ساواو نەخۆش ئەنجام دەدرا، بەهۆی دوو (چەمەرە) بەرامبەر بە یەك گوریسەكەیان پێ دەبەستەوە، یان (كەونە)ی شەغیرەیان بەكاردەهێنا.

*** ڕەورەوە:**
ئامرازێكی سادەی پێچكدارە منداڵان پێی فێری ڕۆیشتن دەبن، بۆ ئەو منداڵانەیە كە تازە پێی دەگرن، بەرزییەكەی بە گوێرەی باڵای منداڵی (٨) مانگان تا یەك ساڵانە، لە چەشنی سێ گۆشەیی دروست دەكرێت، بریتییە لە چەند لقە دارێكی

تاشراو، سێ پێچكەو دەسكێكیشی بۆ ئامادەكراوە، منداڵ بە هۆیەوە دەتوانێت لە جیاتی (تاتەو پایە)ی دایك‌و خوشك‌و برا بڕوا بەڕێوەو مەشق لەسەر ڕۆیشتن بكات.

*** بێشك‌و جۆلانەی بچووك:**
ئەمانە بۆ یاریكردن‌و بووكە شووشەی منداڵانە.

*** گرگرۆكە (عەرەبانە):**
بریتییە لە عەرەبانەیەكی بچووك، بۆ دەستی منداڵان ئامادە دەكرێت.

*** عەلبە، كەوینج، كەوج، كەویج، قسناغ:**
جۆرە ئامرازێكی پێوانە بۆ كڕین‌و فرۆشتنی گەنم‌و جۆ بەكار دەهێنرێت، نزیكەی (٢٠ كگم) دەگرێت، هەیشە (١٨ كگم) دەگرێت بە شێوەیەكی بازنەیی دروست كراوە، بەرزییەكەی (١٥ سم)ە.

*** شەقڵ (شقل):**
لە شێوەی مالنج دروست دەكرا، ڕووەكەی بە هەڵكوڵین (الله) یان (الله اكبر) یان (بسم الله الرحمن الرحيم) یان (ماشاء الله) یان تۆمار دەكرد، بۆ مۆر كردنی خەرمانی سوور (جێن) بەكاریان دەهێنا، شەقڵچی (شەعنە) بەكاری دەهێنا، ئەن شەعنەیە وەكو گزیری ئاغا وابوو، بۆ ئەوەی كەس نەتوانێت دەستكاری ئەو جێژە بكات تا فەردەش دەكرێت.

*** شەنەی دار:**
بریتییە لە (٧) لقەداری نیوە چەماوەی نووك تیژ، درێژییەكەیان نزیكەی (٤٢ سم) دەبێت، كۆتایی لقەكانی بەهۆی سیم‌و پێستەی ئاژەڵەوە توند بەند كراون بە دەستكی شەنەكەوە، ئیتر مەحكم بوون‌و بە هیچ جۆرێك ناجولێن.

*** پارۆ، بیرۆك، پەرلۆ:**
لە شێوەی خاكەنازدایە، دەمەكەی لە داری پتەوو لووس‌و پانە، دەسكێكی دارینی هەیەو هەندەی دەسكی شەنی دار دەبێت، بۆ خاوێن كردنەوەی خەرمانی سوور لە كاو كۆزەر.

*** هەزار پیشە:**
جۆرە سەنوقێکی دارینی نەقشداری درێژو گەورەیە، خانە خانە بە شێوەیەکی زۆر جوانو قەشەنگ ئامادە دەکرا بۆ ئەوەی شتومەكو وردەواڵە زۆر بگرێت، زووتر لە شارەکاندا تەنها ماڵە دەوڵەمەندەکان هەیان بوو، ئەمیش وەکو سەدان بەرهەمی دیکە باوی نەماوە بەکار ناهێنرێت، کەنتۆر جێگای گرتەوە.

*** دنگ، سندۆڵ، دۆڵ، دیبەگ:**
دەفرێکی دارین یان بەردینی قووڵی هەڵکۆڵراوە، دارینەکەیان لە داری پتەو دروست دەکرێت، ئەمە بە ئامرازی (مقار) هەڵیدەکۆڵن، بە زۆری کاری دارتاشەکانە، ساوار کوتان بە هۆی میل بەکار دەهێنرێت، دوای ئەوەی ئامێری ساوار کوت هاتە گۆڕێ ئەمیان باوی نەماوە کەوتە خانەی نەمانەوە.

*** کەمانو چەکەی هەلاجی:**
کەمان برییتیە لە دارێکي درێژ لە نێو ڕاستەوە کراوەتە دوو لەتەوە ناوەکەیان هەڵکۆڵیوە، بۆ ئەوەی کێشی سووك بێت، لەم سەرو لەو سەریشەوە بە بسمار تەختەی پێوە بەند کراوە ژێیشی بۆ ئامادە کراوە کە بەند کراوە بەم سەرو ئەو سەری کەوانەکەوە، ئەم ئامرازە شێوەکەی نیمچە کەوانەییە بۆیە ناویان ناوە کەمان، چەکەش لە داری پتەوو مەحکەمە لە چەشنی شەربە دروست کراوە، هەللاجەکان بە هۆی ئەم چەکەو کەمانەوە خوری یان لۆکە شی دەکەنەوە.

*** دەرگا:**
زووتر هەموو دەرگاکان چ هي حەوشە چ هی ژوورەکانی ماڵەوە لە دارو بسماری گوڵمێخ دروست دەکرا، کلیلو کلۆمەکەشی هەر لە دار بوو، تا ئەم ڕۆژگارەش نموونەیان لە شارەکاندا لە هەندێ خانووبەرەی کۆندا هەر ماون کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ (٨٠، ١٠٠) ساڵ پێش ئەمڕۆ.

*** پەنجەرە:**
جاران پەنجەرەی کۆشكو خانووبەرەکان هەر هەموویان لە دار دروست دەکران، هەندێکیشیان بە شیشی تێکەڵکێش

ئامادە دەکرا.

*** گلاکوت، گەلاکوتك، دێرەچ:**
دارێکی خڕی لووسەکراوەی درێژە، لە داری گوێزو بەڕوو دروست دەکرێت، درێژییەکەی نزیکەی مەترێك دەبێت، شوێن دەسەکەشی بە جوانی لووسو پووس کراوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی بەکار بهێنرێت، بۆ کوتانی کوزەرو گەلا بەکاردێت، زووتر ژنان دەچوونە سەر کانیو دەمی چەمو ڕۆخانە بۆ پۆشاك شۆشتن، جا لەوێ لە جیاتی ساوین سەرە چۆغان (ئەسپۆن) یان سەرە (کەپلە) یان دەخستە سەر کەلوپەلەکانو ئاویان دەکرد بەسەراو بە گەلاکوت دەیانکوتا بۆ خاوێن کردنەوەی.

*** مێکوت (کوتك):**
سەرێکی زلو دەسکێکی درێژی هەیە، لە داری بتەوو قایم دروست دەکرێت، وەکو بەڕوو، گوێز، توو، بۆ کاتی ساوار بەکاردێت، هەیشە لە چەشنی ئەمەیە دەستەکەی کورتترە بۆ داکوتانی مێخی دارینی ڕەشماڵو دەوارو شکاندنی سەهۆڵ بەکاردێت.

*** تەختە بەن، کەت، چوارپایە:**
لە تەختەدار ئامادە دەکرێت، بە شێوەیەکی چوار گۆشەو گەورە بۆ لەسەر نوستنی هاوینان، هەیش بوو لە ئاسن دروست دەکراو ئەمیشیان مۆدەی نەماوە قەروێڵەو سیسەم جێگای گرتەوە.

*** دارە تەرم، داربەست، داربازە، سندرویك، سندریك، تابووت:**
ئەم بەرهەمە لە دار دروست دەکرێت، تەنها بۆ گوێزانەوەی مردوو بۆ سەر گۆڕستان بەکار دەهێنرێت.

*** تەتەشۆر (تاتەشۆر):**
بریتییە لە چەند تەختە دارێکی لێك دراوی درێژ، تەنها مردووی لەسەر دەشۆنەوە.
لەم شیعرە فۆلکلۆرییەدا ناوی هاتووە:
باوکە پیرەکەت گیرۆدەی هەق بێ[٣]
لەبان تاتەشۆر وەك شووتی شەق بێ

*** مالێخ:**
دارتاشەکان لە داری مەحکەم دروستی دەکەن و ڕوویەکەی لووسە. لەبواری سپیکاری خانوودا بەکاردێت.

*** مەحمەل:**
دوو جۆرە، دارتاشەکان لە دار دروستی دەکەن، یەکەمیان دوو تایە و بۆ خشت کێشان بەکاردێت، دەنرێتە سەر وڵاخ، دووەمیشیان دوو یان سێ لقانەیە، جەرە یان تەنەکە ئاوی دەکەن بە قەداو بە وڵاخ ئاوی پێدەکێشن.

*** دار بێرە، دار بەرە:**
بریتییە لە دوو پارچە داری دوو لقانە، یەکێکیان لە سەرەوە کون دەکرێت، دواتر تێهەڵکێش دەکرێت و لەکاتی پەزدۆشیندا شوان لە سەری دادەنیشێت و سەری مەڕ بۆ بێری خان دەگرێت تا بیدۆشێت، دەتوانین بڵێین ئەمە کورسی شوانە وێڵەیە.

*** دەسەخورد، داردۆژەنگ:**
داری ئەملاو ئەولای مەشکە، کە بە زمانە دەخرێتە نێو ناونێرەکەوە.

*** ناونێرك، لولەپ:**
بریتییە لە دارێکی لووسی گرۆڤەر بۆ پێش و دواوەی مەشکە کە دەسە خوردی بە زمانە تێخراوە.

*** ئەسپەر، مەترکە، مەتلخە، ئەسپەرە:**
پارچە دارێکی کون کراوە، لە کلکە بێڵی دەگرن، شوێنی پێ لە بێڵی ئاسنی ئەسپەرەداردا، بێڵکار پای پێدا دەداو باشتر لە زەوی دەچەقێت.

*** بەفرماڵ، بەفرماڵك، ومرومرە، شەپالۆخ:**
جۆرە بێڵێکی دارینە، لە کوردستاندا لەکاتی بەفر باریندا بەفری پێدەماڵن.

*** مزراح:**
لەداری ڕەختە بە شێوەیەکی خڕی گومەزی لە دار دروست

دەکرێت، لە بنەوە بەرین و لە نووکیشەوە باریکە، نووکەکەی پارچە ئاسنێکی بچووك وەك نووکی بسماریان تێکوتاوە بە هۆی ئەو بسمارەوە دەخولێتەوە، منداڵان یاری مزراحێنی پێدەکەن.

*** خشت بڕ:**
ئامرازێکی سادەیە بۆ خشت بڕینەوە بەکاردێت.

*** تیرۆك، تیرەچۆ:**
بریتییە لە دارێکی باریکی لووس کراو، درێژییەکەی نزیکەی مەترێك دەبێت، خانمی ناندکەر بۆ پان کردنەوەی گونکە هەویر بەکاری دێنێت.

*** مێخی ڕەشماڵ:**
پارچە دارێکی بتەوی نووك تیژە، درێژییەکەی نزیکەی (٦٠ سم) دەبێت، بۆ دابەستنی ڕەشماڵ و دەوار لە زەوی دادەکوترێت، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا مێخی ئاسنین بەکار دەهێنرێت.

*** مێخی دیوار:**
ئەمەش جۆرە مێخێك بوو بە زۆری لە شارەکاندا لە دیواریان دەکوتا، یان لەکاتی دروست بوونی خانووەکەدا دادەنرا بۆ ئەوەی شت و مەك و پۆشاکی پێدا هەڵواسن.

*** جەنجەر، موشان، موشانە، مۆشەن:**

ئامرازێكی دەستكردی فۆلكلۆری كۆنە، دارتاشە دەسترەنگینەكان لە دارو بزماری گولمێخ ئامادەیان دەكرد، جوتیارەكان بۆ كوتانی قرشە (كلۆش) بەكاریان دەهێنا، بە هۆی دوو هێستر یان گوێدرێژ خەرمانیان پێ گێرە دەكرد، لەكاتی گێرە كردندا جەنجەرەوان سواری جەنجەرەكە دەبوو لە ولاخەكانی دەخوڕی، یەكێكیش شەنێكی ئاسنینی بە دەستەوە دەگرتو پەیتا پەیتا پەرەناو و بن ملی دەكرد كە ئامێری كوتانو پاتۆز هاتە گۆڕێ ئەمیان باوی نەماو بۆ یەكجاری ون بوو. ئەمەش كەرەستەكانی جەنجەرە:

*** حوشترە-حوشترۆكە:**

جەنجەر لە دوو حوشترەی مەحكەم پێك هاتووە كە هەردوو تەنیشتی جەنجەرەكەیە، لە شێوەی سەرو ملی وشترە بۆیە ئەم ناوەیان بۆ هەڵبژاردووە، لە داری رەختەو بزماری گولمێخ ئامادە كراوە، هەموو كەرەستەكانی جەنجەر دەگرێتە نێو خۆیو بە یەكیان دەبەستێتەوە، هەموو كەرەستەكانی ناوەوەی پارچە ئاسنێكی لووسیان بۆ دروست كردووە و پێی دەڵێن كلچێوك.

*** تۆپی جەنجەر:**

بریتییە لە دوو داری بتەوی لوولین لە ملاو لەولاوە هەر یەكەیان دوو كونی بۆ كراوەو پێی دەڵێن (كلدانە)، بە شێوەیەكی رێكوپێكو زۆر جوان لووس كراوە، بە گوێرەی گەورەو بچووكی جەنجەرەكە، درێژییەكەی نزیكەی مەترێك تا مەترێكو بیست سانتیمەتر دەبێت، باڵتەكانی جەنجەری تێدا چەسپێنراوە كە ژمارەیان (٢١، ٢٥) باڵتەیە.

*** باڵتە (پەر):**

لە شێوەی دەمە تەوردایەو زۆریش تیژن، پیشەی ئاسنگەرەكانە، لە تۆپی جەنجەر بەند دەكرێن، بەهۆی ئەم باڵتانەوە قرشەكە دەكوترێت.

*** كلدانە، كلدان:**

بەو دوو كونانە دەوترێت كە ها بە ئەملاو ئەو لای تۆپی جەنجەرەكەوە، لە ئاسن ئامادە كراوە كە هی هەردوو تۆپەكان ژمارەیان دەكا چوار كلدانە، كلچووكەكانی حوشترەكانی دەچێتە نێو، پێش ئەوسا پڕ دەكرێت لە (كەرە) یان بەزو دونگو كارەموو بۆ ئەوەی تۆپەكان بە ئاسانی بسوڕێن پیشەی ئاسنگەرەكانە.

*** تەوقی تۆپ (تۆقی تۆپ):**

بەو ئەڵقە ئاسنە پانو بازنەییە دەڵێن كە دەورەی سەری تۆپی داوەو نایەڵێت بشكێ، یان بقەڵشێت، پانییەكەی بە ئەندازەی دوو پەنجە دەبێت، بە بسمار قایم كراوەو ژمارەشیان چوارن، پیشەی ئاسنگەرەكانە.

*** كلچێوك، كلچووكە، میل، ملچێوك، كلێنچك:**

بریتییە لە چوار ئاسنی لووس و خڕ، پڕ لە كلدانەی جەنجەرەكان، لە حوشترەكان بەند كراون، بە خۆی كلكێكی تیژی باریك و دوو فیلقانە لە لای دەرەوەی حوشترەكە هەر سەرێكی بە لایەكدا پەرچ كراوە، پیشەی ئاسنگەرەكانە.

*** سیرۆكە (یاتاغ):**

بریتییە لە چوار پارچە ئاسنی پان دەخرێتە بن كلچووكەكەو بە بسمار توند كراوە بۆ پاراستنی دارەكەی دەوری كلچووكەكە، كە ڕوو بەرەكەی چوار گۆشەییە، نزیكەی (١٠-١٢سم)ە دەبێت، پیشەی ئاسنگەرەكانە.

*** شیرۆكە:**

ئەو پارچە ئاسنەیە كە بە بن سەرەوەی حوشترەكانەوە بەندە لە نووكەوە تا كۆتایی، سوودەكەشی ئەوەیە چونكە داری بنی حوشترەكان لە ئەنجامی زۆر سووران لە سەر قرشەكە دەپارێزێ بۆ ئەوەی نەخورێ و لە نێو نەچێت و نەڕزێت، پیشەی ئاسنگەرەكانە.

*** داینجاخ، قولاغە، چوار قۆڵی دەفەی جەنجەر، شوانكی حوشترە:**

بریتییە لەو چوار سەرەی كە لە ناوەڕاستی حوشترۆكە قیت و بەرز بووەتەوەو لە چەشنی ئینجانەی پۆشاك شستن بۆ گیرو بەستنەوەی جەنجەر بە كاردێت بە سایەی دوو پردۆكەو دوو دەفەی پاش و پێشی جەنجەر، سەرەكانیان (٤-٥) كونی بە قەدەر دەمی جگەرەی تێدایە (جەنجەرەوان)ی جگەرەكێش جگەرەی پێ دەكوژێنێتەوە، بۆ ئەوەی خەرمانەكە (چۆخین) لە سووتان بپارێزێت.

*** دەلاقەی حوشترە:**

نێوان هەردوو قۆڵی دەفەی جەنجەرەكە دەلاقەیەكی تێدایەو ڕووەكەشی نەخشێنراوەو پێی دەڵێن دەلاقەی حوشترە.

*** دەفە، دەفەی پاش و پێشی جەنجەڕ، دەرگای پێش‌و پاشی جەنجەڕ:**

بریتییە لە دوو تەختەداری بەرین کە لە پێش و پاشی جەنجەڕەوەیە، پێك هاتووە لە لێکدانی چەند پارچەیە (شەبکە)، چوار تیرەی بە پانی لێدراوەو هەر دەفەی چوار زمانەی هەیە کە دەچێتە ناوەڕۆکی پێش‌و پاشی حوشترەکە، دەبێتە پارچەی توند کردن و شاردنەوەی باڵتەکان و لابردنی مەترسی بۆ جەنجەڕەوان لە کاتی سووڕانی جەنجەڕەکەدا.

*** پردۆکەی جەنجەڕ، پردی جەنجەڕ، کۆپری جەنجەڕ:**

بریتییە لەو دوو دارەی کە هەردوو سەرەکانیان بە چوار گۆشەیی یان لاکێشەیی هەڵکۆڵدراوەو دەچێتە سەر سەری داینجاخی حوشترەکە، ئەویش هەر بۆ بەند کردنی جەنجەڕەکەیە.

*** پردی دانیشتن:**

بریتییە لە تەختە دارێك پانییەکەی بە ئەندازەی بستێك یان زیاترە، دەکەوێتە نێوانی پردۆکەی پاش و پێشی جەنجەڕ بۆ دانشتنی جەنجەڕەوان، درێژییەکەشی هەر ئەوەندەی بەرینی جەنجەڕەکەیە.

*** دار کولاژدمە، دار ئەقرەبە:**

دارێکی بە هێزە، هی داری گوێز یان بەڕوو یان توو بە شێوەیەکی لوولەیی ئامادەکراوە، لە هەردوو سەرەوە زمانەی بۆ کراوە دەچێتە نێو هەردوو حوشترەکەوە، کولاژدمەی لە نێو راستدا لێ گیرکراوە بۆ ڕاکێشانی جەنجەڕ بە کاردێت درێژاییەکەشی نزیکەی مەتر و نیوێك دەبێت.

*** کولاژدمە، ئەقرەبە:**

بریتییە لە پارچە شیشێك لە نێوراستی دار کولاژدمە بەند کراوە لە سەریشەوە لە شێوەی کلکی دووپشك خوار کراوە بۆیە ئەم ناوەیان لێناو، ئەم ئامرازە ئەلقەی کولاژدمەی لێ گیر دەکرێت.

*** ئەلقەی کولاژدمە، ئەلقەی ئەقرەبە:**

پارچە ئاسنێکە لە چەشنی لاکێشەدایە بە بازنەی مژانەوە بەندە، بۆ ڕاکێشانی جەنجەڕ بەکاردێت پیشەی ئاسنگەرەکانە.

*** تیرەی حوشترە:**

لە شێوەی دار ئەقرەبەیە، لە دواوە بە زمانە دەچێتە نێو حوشترەکان و پێکەوە توند بەندیان دەکات.

*** بەستەکی جەنجەڕ:**

بەو گوریسە درێژە دەوترێت کە هەر چوار دەوری جەنجەڕی پێ دەبەسترێتەوە، بۆ ئەوەی جەنجەرکە لە کاتی کارکردندا شلوشار نەبێت و لێکهەڵنەوەشێتەوە.

*** پێچەك، دار بەستەك، چەلە:**

بریتییە لەدوو پارچە دار وەکو تیرۆك‌وان بەڵام ئەمان کورتترن، لەنێوانی دوو گوریسی بەستەکیان دەخەن و دەیسوڕێنن و قایم جەریان دەدەن تا گوریسەکە توند دەبێت، یەکێکیان لە پێشەوەو ئەوی دیکەشیان لەدواوەی جەنجەڕ دەخرێت.

*** چانچانۆکە، کوچ کوچە، تولەی دوای جونجەڕ، چان دوای جەنجەڕ:**

بریتییە لە چەند پارچە پەڕۆو گووش پێکەوە دوراونەتەوە بە دوو داو دەیبەستن بە قەدی دار بەستەکی دواوەی جەنجەڕ، ئەمە لە کاتی وردە کوت بەکاردێت بۆ ڕاستو لووسی و ڕێکخستنی پاخواکە، ئەم چانچانۆکەیە لە ڕووەکی سوڕناتك یان مارگیرە یان خەڕنووك و حوشترەلۆکیش ئامادە دەکرێت.

*** شەخرە:**

بریتییە لە ئامرازێکی دارینی سادەی دەستکردی فۆلکلۆری، زووتر جوتیارەکان بە هۆی ئەم شەخرەوە قرشەی گەنمیان لە سەر پەرێزەوە دەگوێزایەوە بۆ سەر خەرمان (جۆخین)، بۆ کێشانی بەلمە برنجیش بەکاردەهێنرا، هەروها لە گوندو لادێکاندا بۆ گوێزانەوەی خشت وبەردیش بە کاریان دەهێنا، ئەم ئامرازە لەم چەند پارچە دارانەی خوارەوە پێك هاتووە.

*** لنگە شەخرە، قاچە شەخرەو پێچکە شەخرەشی پێدەڵێن:**

بریتییە لە چوار تەختە داری مەیلەوە خوار سەرەکانیان بە هۆی دارێکی لوولەیی (بەکرە) بە یەکەوە بەندن.

*** هاپە، ناو تیرەی شەغرە:**

بریتییە لە پارچە تەختەیەك بۆ لێك بەستنەوەی دوو لنگە شەخرە بەکاردێت، بۆ شەخرەی گوێدرێژ (٢) هەپەو بۆ هی هێستر (٣) دانەیە، ئەو بە کون کردنی لنگە شەخرەکان‌و دەهێنانی زمانەی هەپەکانەوە تێهەڵکێش‌و بەند دەکرێن.

*** گرگرە (بەکرە) و (خەرەك) و (گورگورە) شی پێدەڵێن:**

بریتییە لە دارێکی لوولەیی زمانە دەرهێنراو بۆ بەند کردن و تێکهەڵکێشانی لنگە شەخرەکان، درێژییەکەی نزیکەی (٥٠-٦٠سم)ە دەبێت.

*** بەستەکی شەغرە:**

بەو پەتەی دەڵێن کە هەردوو لنگە شەخرەکەی پێ دەبەسترێتەوەو توندو شەتەك دەدرێت بە هۆی دار بەستەکەوە بۆ ئەوی لە گرگرەکە نەترازێت.

*** دار بەستەك (چەلە):**

دارێکی لووس کراوەی لوولەییەو باریکە بە ئەندازەی تیرۆکێك دەبێت و سەرەکانیشی باریکە، درێژییەی بە ئەندازەی بستێك دەبێت.

*** چەلا (گوریسی شەخرە)[٤]:**
جۆرە پەتێکی چنراوە بە زۆری لە بەنی مووی بزن ئامادە دەکرێت، بۆ هەر شەخرەیەك گوریسێکی درێژ یان دوو گورسی مامناوەندی بەکاردێنن و دوو زەنگۆلەی (چەمەرە) پێوە دەبەستن، بە هۆی ئەم گوریسەوە قرشەکە لە سەر شەخرەکە بەند دەکرێت.

*** قادە (کەوەنە)و (قەدە)شی پێدەوترێت:**
بەو دارە خوارو چەماوەی دەڵێن کە لە شێوەی داری دوو فیلقانەی دەم کراوەیە، دوو لقەکەی راست و درێژکراوەتەوە، راستەوخۆ پشتی قرشەکە دەگرێت لە کاتی بەستنی شەخرەدا، نایەڵێ قرشەکە بجووڵێ یان پەرت وبڵاو بێت لە داری گوێز یان بەروو یان توو دروست دەکرێت.

*** بەنقادە[٥] (بەنقەدە)و (بەنکەوەنە)و (بەنزەویلە)شی پێدەڵێن:**
بریتییە لە دوو نیوچە گوریسی درێژ هەر یەکەیان بە ئەندازەی دوو باڵ دەبێت، هەر یەکەیان سەرێکی دەبەستن بە لنگی شەخرەکەوە ئەوی دیکەشیان بەندی دەکەن بە قادەوە دەبێتە بناخەو جێی باوەشی قرشە لە کاتی بەستنی شەخرەدا.

*** چەمەوە (بۆسە)و (وێژانبەر)و (قەشقە) و (زەنگۆڵە)شی پێدەڵێن:**
ئەم ئامرازە لە داری بەروو یان گوێز بە ئەندازەی ئەستووری دار دەستێك بە شێوەیەکی بازنەیی ئامادە دەکرێت، سەرەکانی لە سەر یەك دادەنێن و قایم دەیبەستن.

*** شاگرد ئۆغلان (دوو فیلقانەی شەخرە)شی پێدەڵێن:**
بریتییە لە دارێکی دوو گوێی بە ئەندازەی ئەستووری دار دەستێك دەبێت لە پاش چەسپاندنی پێچەکانی قادەکەی شەخرە لە زەویدا، شاگرد ئۆغلانەکە لە کاتی راست کردنەوەی تایەکی شەخرەکە دەدرێتە بەر پشتە کەوانەی (قادە) تا وڵاخەکە دەهێننە بەر شەغرەکەو بار دەکرێت.

*** تەپان[٦] (ئاغڵ)یشی پێدەڵێن:**
دوو باڵینەیە بە درێژی کورتانی شەخرە، لە کۆنە گووش و لبادو پەڕۆ ئامادە دەکرێت، لە سەر پشتی کورتانەکە دەبەسترێ لای پێشەوەی بلند دەبێت تا شەغرەکە بە لای سەریدا وەرنەگەرێ و نەڕوات، تەپانیش بۆ کەم ژانی و ئەزیەتی پشتی وڵاخ بەکاردێت.

*** ئەمەش ناوی هەندێ لە دارتاشەکانی کەرکوکە:**

١. (دارتاش سەیید محەممەدی دارتاش ١٩٥٢، ).
٢. (دارتاش فەلاح محەممەد عەلی ١٩٦١، ).
٣. (مەجید عەلی ئەمین زەنگەنە).
٤. (حاجی مەجید گلی).
٥. (جەبار بیلال شێخانی).
٦. (عەلی زەینەڵ وەلی کاکەیی ١٩١٢، ١٩٩٨).
٧. (ئیبراهیم عەبدوڵڵا عەبدولقادر ١٩٢٢، ١٩٦٨).
٨. (حاجی نەجمەدین محەممەد عەلی).
٩. (ئەحمەد مستەفا زەینەڵ ١٩٠٢، ١٩٨٩).
١٠. (محەممەد نووری سەمەد ١٩٢٠، ٢٠٠٨).
١١. (فەخرەدین نورەدین عومەر ١٩٢٣، ).
١٢. (حەسەن شوکر شەریف ١٩٦٥، ).
١٣. (عەلی وەحید عەبدوڵڵا ١٩٥١، ٢٠٠٦).
١٤. (ئیبراهیم وەحید عەبدوڵڵا ١٩٧٧، ).
١٥. (مستەفا حوسێن ئەحمەد ١٩٣١، ).
١٦. (بەهائەدین حوسێن ئەحمەد).
١٧. (محەممەد تۆفیق ١٩٢٨، ٢٠١٠).
١٨. (فازل مەردان حەیدەر ١٩١٥، ١٩٩٠).
١٩. (عەبدڵڵا عیسا حەسەن ١٩٤٠، ).
٢٠. (غەریب حەسەن حوسێن ١٩٣٠، ٢٠٠٩).
٢١. (محەممەد فاتیح سەمەد ١٩٢٢، ١٩٩٨).
٢٢. (بەهرام مستەفا حوسێن ١٨٨٨، ١٩٩١).
٢٣. (خورشید زەینەڵ حوسێن).
٢٤. (حاجی نەجمەدین محەممەد عەلی ١٩٤٣، ).
٢٥. (ئەحمەد بەهرام مستەفا ١٩٥١، ).

هەروەها ئەم دارتاشانەش لە بواری مۆبیلیاتدا زۆر ناوبانگیان دەرکردووە: (شوکر نەجار، نامق نەجار، کەمال شەنگویل نەجار، یونس نەجار، فەخرەدین نەجار).

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. دەستنووسێکی هەردەوێڵ کاکەیی.
٢. هەڵبژاردەیەك لە شیعری فۆلکلۆری کوردی لاپەرە ١٩٥.
٣. چەپکێ لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور، لاپەرە ٤٧.
٤. ئەم گوریسە دەچێتە خانەی چنینەوە، ئێمە لێرەدا باسمان کرد لە بەر ئەوەی کەرەستەیەکی شەخرەیە، لە جێگای خۆیدا باس کراوە.
٥. ئەمانەش پیشەی چنیارن، لە بەر ئەوەییەکێکن لە کەرەستەکانی شەغرە بۆیە لێرەدا هاتوون.
٦. ئەمانەش پیشەی چنیارن، لە بەر ئەوەییەکێکن لە کەرەستەکانی شەغرە بۆیە لێرەدا هاتوون.

### * پیشەی دارفرۆش و دارتاشەکان:

ئەم پیشەیە لە کەرکوکدا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە، بوونی هەڵکەوتەی کەرکوك بە تایبەتی لادێکانی دەوروبەری، لە پاڵ نزیکی لە ناوچەکانی کوردستانەوە، بووە بەکانگای بەکارهێنانی دار بە رێژەیەکی زۆر، ئەمەش وایکردووە بەشێکی زۆر لە پیشەی دارفرۆشی و دارتاشیدا کار بکەن، هەروەها بوونی لادێیەکی زۆر لە دەوروبەری کەرکوك بەتایبەتی لە بنیاتنانی خانوودا یان لە دروستکردنی کوڵەکەکاندا بۆ دارڕاکردن پێویستییەکی زۆریان بە دارو حەسیر بووە.

ئەو پێشکەوتنەی کە لە ئەوروپادا سەری هەڵدا کەرکوك پشکێکی بەرچاو بوو لە پێشکەوتنی جۆرەها مۆبیلیاتی دار بەهۆی هاوپەیوەستی کۆمپانیانی نەوتی باکوور لەگەڵ خەڵکی کەرکوك. هەر لەبەر ئەمەش لە سەرتاپای عێراق و کوردستاندا کەرکوك ناوبانگی دەرکرد لە پیشەی دارسازی و دارتاشیدا، بەتایبەتی لەدوای هاتنی ئینگلیزەکان لە کەرکوك.

### * دار فرۆشەکان:

١. (محەمەد شەفیق مەلا عەزین)، لە گەڕەکی (موسەڵڵا) بوو.
٢. (حەسەن حەمەد ئەحمەد)، لە ناو خاسە بوو لە نزیك سینەما (خەیام) بوو.
٣. (حاجی محەمەد ئەحمەد)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو.
٤. (حاجی فەتحوڵڵا بەگتاش)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو.
٥. (بەگتاش نەجار)، لە (گەراجی حەویجە) لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
٦. (حاجی کەریم نەجار)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
٧. (حاجی جومعە) لە نزیك سینەما (خەیام) بوو.
٨. وەستا (ئەکرەم)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو.
٩. (سەعید محەمەد ئەحمەد)، لە بازاڕی (حەسیر) لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) بوو.
١٠. (سەعدوڵڵا بەگتاش)، لە (گەراجی حەویجە) لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
١١. (حاجی جەبار محەمەد)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو.
١٢. (مام عەبدوڵڵا)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو لە دوایی خۆی گواستەوە بۆ گەڕەکی (ڕاپەڕین).
١٣. (مام حەمە ساڵح)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو.
١٤. وەستا (تۆفیق)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
١٥. (حاجی مەحمود)، لە بازاڕی گەورە لە بەرامبەر کازینۆی (ئەسلان یواسی) بوو.
١٦. (حاجی حەمید پاشا)، لە گەڕەکی (موسەڵڵا) بوو.

### * دارتاشەکان- پیشەی دروستکردنی کەرەستە دارییەکانی ناو ماڵ:

ئەم پیشەوەرانە بە ناوبانگ بوونە لە دروستکردنی بێشکەو ڕەوڕەوەو یاری منداڵان و سەندوقی بوراق و پێویستییەکانی هەویرکاری کە لە دار دروست دەکرێت.

١٧. وەستا (فەخرەددین نورەددین)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
١٨. وەستا (حاجی عەلی وەحید)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
١٩. وەستا (شوکور شەریف تاوقلی)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٠. وەستا (مستەفا زینولعابیدین)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢١. وەستا (حاجی خورشید کاکەیی) و کورەکانی (حاجی تۆفیق) و (حاجی کەریم)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٢. وەستا (حاجی حەمید)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٣. وەستا (مستەفا کەمال)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٤. وەستا (نورەددین ئەحمەد) و براکەی (فەخرەددین)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٥. هەردوو برا وەستا (عەباس ئەحمەد) و وەستا (بەهائەددین ئەحمەد)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٦. وەستا (محەمەد بەیرام)، لە گەڕەکی (گەراجی حەویجە) بوو.
٢٧. وەستا (فایق)، لە قەراخی خاسە بوو، سەندوقی (بوراق)ی دروست دەکرد.
٢٨. وەستا (محەمەد عەلی)، لە تەنیشت (کوێر حەمام) بوو.
٢٩. وەستا (مەحمود سوران)، لە تەنیشت (کوێر حەمام) بوو.
٣٠. وەستا (ئەحمەد سوران)، لە تەنیشت (کوێر حەمام) بوو.
٣١. وەستا (محەمەد عەباس)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٣٢. وەستا (ئەحمەد عەباس)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٣٣. وەستا (سەعید).
٣٤. وەستا (حاجی عەبدوڵڵا)، لە نزیك حەمامی (حاجی باقی) بوو.
٣٥. وەستا (سەیید وەلی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٦. وەستا (ستار حاجی عومەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٧. وەستا (حاجی عەلوش)، لە گەڕەکی (جرید مەیدان) بوو.
٣٨. وەستا (نامق نەجار).
٣٩. وەستا (مستەفا عەلوش).
٤٠. وەستا (محەمەد عەلوش)، لە گەڕەکی (جرید مەیدان) بوو.
٤١. وەستا (حەسەن زبە)، لە گەڕەکی (شۆریجە) بوو.
٤٢. وەستا (محەمەد ڕەسوڵ)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٤٣. وەستا (عەلی مەردان).
٤٤. وەستا (عەودل دارتاش).
٤٥. وەستا (حاجی نەجار).
٤٦. وەستا (عەزیز نەجار).

٤٧. وەستا (مەمەد نەجار).
٤٨. وەستا (شەوکەت نەجار).
٤٩. وەستا (مەهدی ئیسماعیل).
٥٠. وەستا (عەبدوڵڵا نەجم).
٥١. وەستا (سەیید بارام کاکەیی دارتاش).
٥٢. وەستا (سەیید محەمەد بارام کاکەیی دارتاش).

* **دارسازی-خراطة الخشب:**

١. وەستا (حەسەن قاقا)، لە (جووت قاوە) لە بازاڕی گەورە بوو.
٢. وەستا (نورەددین ئەحمەد نەجار)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
٣. وەستا (عەبدولڕەحمان نەجار)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
٤. وەستا (ڕەحیم نەجار)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
٥. وەستا (موەفەق نەجار)، لە (خان خورما) لە بازاڕی گەورە بوو.
٦. وەستا (ئیحسان ئیبراهیم ئەمین قایەچی):
لە ساڵی (١٩٤٠) لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە وەستا (غێدان قازی)و وەستا (مەجید)و وەستا (یونس) وەرگرتووە، دوکانەکەی لە بازاڕی گەورە بوو، لە ساڵی (٢٠٠٩) کۆچی دوایی کردووە.
٧. وەستا (عەبدولڕەزاق جەمیل نەجار)، لە بازاڕی گەورە بوو، کاری دروستکردنی (جەنجەڕ)ی ئەکرد.
٨. وەستا (فاتیح جەمیل)و براکەی (ئەنوەر)، لە دروستکردنی سەندوق و کاوەنتەری بووك کاریان دەکرد.
٩. وەستا (خدر نەجار)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
١٠. هەردوو برا وەستا (نەجمەددین محەمەد)و وەستا (فەلاح)، لە (گەراجی حەویجە) چەرخچی دار بوون.
١١. وەستا (سەیید محەمەد تاترەیی)، لە (گەراجی حەویجە) ی کۆن بوو.
١٢. وەستا (ئیسماعیل نەجار)، لە نزیك سینەما (خەیام) بوو.
١٣. وەستا (ئەحمەد حاجی محەمەد نەجار)، لە (جووت قاوە) لە بازاڕی گەورە بوو.
١٤. وەستا (ئیسماعیل دەروێش کەریم نەجار)، لە (جووت قاوە) لە بازاڕی گەورە بوو.
١٥. وەستا (عەبدوڵڵا نەجار)، لە گەڕەکی (بولاق) لە بازاڕی گەورە بوو.
١٦. وەستا (جەعفەر خورشید نەجار)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٧. وەستا (ڕۆستەن نەجار)، لە نزیك مزگەوتی (ئاوچی) بوو.
١٨. وەستا (مستەفا کەماڵ نەجار)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٩. وەستا (هیجران مەلا عەبود)، لە گەڕەکی (چای) لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٠. وەستا (وەهبی نەجار)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٢١. وەستا (نورەددین نەجار)، لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) بوو.
٢٢. وەستا (کامیل نەجار)، لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) بوو.
٢٣. وەستا (مستەفا عەرەب مستەفا نەجار)، لە (گەراج حەویجە)ی کۆن بوو.
٢٤. وەستا (بەگتاش-چراخ)، لە بازاڕی گەورە بوو، (دووزەلە)و (ئامرازەکانی ئیقاع)ی دروست دەکرد.
٢٥. وەستا (ڕەفیق ئەحمەد مەهدی نەجار):
لە گەڕەکی (سەقاخانە) لە کەرکوك لەدایکبووە، ئەم پیشەیە لە باوکییەوە وەستا (ئەحمەد نەجار) بۆ-بەجێماوە لە بەرامبەر گەرماوی (ئەلشیفا)، دەستێکی باڵای هەبووە لە نەخشی داری لەسەر دەرگاو لە دروستکردنی بێشکەی داردا، لە ساڵی (١٩٦١) کۆچی دوایی کردووە.
٢٦. وەستا (حیکمەت شاکر سەمین نەجار):
لە ساڵی (١٩٢٩) لە گەڕەکی (قۆریە) لەدایکبووە، ئەم پیشەیە لە وەستا (ججاوی)یەوە فێر بووە، خاوەنی کارگەی دارتاشی (خەیام) بووە لە شەقامی (بابا گورگور) لە نزیك سینەما (حەمرا)، لە ساڵی (١٩٤١) تا ساڵی (١٩٩٠) لەم پیشەیەدا بەردەوام بووە.
٢٧. وەستا (ئەحمەد سەلمان)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٢٨. وەستا (محەمەد سەلمان)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٢٩. وەستا (حاجی جەرجیس سەلمان)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٣٠. وەستا (عەونی نەجار)، لە شەقامی (بابا گورگور) بوو.
٣١. وەستا (عادل ڕەئووف)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٣٢. وەستا (محەمەد عادل ڕەئووف)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٣٣. وەستا (سەیید ئەحمەد)و (سەیید حەمید ئەحمەد)، لە شەقامی (حەمرا) بوو.
٣٤. وەستا (حاجی ئاغا)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٣٥. وەستا (فازڵ عەنتیکە)، لە شەقامی سینەما (حەمرا) بوو.
٣٦. وەستا (سوبحی نەجار)، لە شەقامی (بابا گورگور) بوو.
٣٧. وەستا (هاشم قادر نەجار)، لە شەقامی (بابا گوڕگوڕ) بوو.
٣٨. وەستا (سەردار سلێمان عەبدوڵڵا)، لە شەقامی (بابا گورگور) بوو.
٣٩. وەستا (واجید حەیدەر عەباس بەیاتی)، لە شەقامی (بابا گورگور) بوو.
٤٠. وەستا (شوکور ساڵح عەبدولڕەحمان نەجار)، لە شەقامی (بابا گورگور) بوو.
٤١. وەستا (عەبدولخالق حەمدی ئەلساڵحی)، چەرخچی بوو لە شەقامی (بابا گورگور).
٤٢. وەستا (عەبدولواحید حەیدەر نەجار-وەحید نەجار):
لە ساڵی (١٩٣٩) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە منداڵییەوە لە تەمەنی دە ساڵییەوە لەم پیشەیە کاری کردووە، ئەم پیشەیە لە وەستا (سدیق نەجار)ەوە فێربووە، دوکانەکەی لە بەرامبەر

سینەما (حەمرا) بوو، بۆ ماوەی شەست ساڵ لەم پیشەیەدا بەردەوام بووە، لە ساڵی (٢٠١٠)دا کۆچی دوایی کردووە.
٤٣. وەستا (حازم نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٤. وەستا (حوسێن محەمەد بەیاتی)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٥. وەستا (فوئاد نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) لە نزیك هەراجخانە بوو.
٤٦. وەستا (ئیسماعیل نەجمەددین نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٧. وەستا (حوسێن مەحمود-باوکی عەلی)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٨. وەستا (حاجی جومعە نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٩. وەستا (محەمەد سوبحی نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥٠. وەستا (عەدنان عەبد عەلی)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥١. وەستا (عەبدولوەهاب نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥٢. وەستا (فارس نەجار)، لە گەڕەکی (ساحەت عومال) بوو.
٥٣. وەستا (شوکور سلێمان نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥٤. وەستا (ئیبراهیم ڕەفیق محەمەد نەجار)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥٥. وەستا (خەلیل حەسەن حنەش نەقاش):
لە ساڵی (١٩٦١) لە گەڕەکی (تسن) لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە وەستا (شوکور نەجار)ەوە فێر بووە، هەروەها فێری هونەری کۆتەڵو نەخش بووە لەسەر دار، لەو کرێکارە میسرییانەی کە لەلای شوکور نەجار کاریان کردووە، بەتایبەتی هەر یەکە (محەمەد خەتیب، عەبدولحەلیم خەتیب، وەستا فەوزی)، دوکانەکەی لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥٦. وەستا (عومەر ڕەفیق نەجار)، لە نزیك هەراجخانە بوو.
٥٧. وەستا (محەمەد ئەلماس)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٥٨. وەستا (غازی عەرەب)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٥٩. وەستا (سامی ئەحمەد مستەفا)، خاوەن مۆبیلیاتی (یەڵدز) بوو لە شەقامی (ئەتڵەس).
٦٠. وەستا (مستەفا شەنگوڵ)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٦١. وەستا (نامیق ڕەفیق نەجار)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٦٢. وەستا (محەمەد عەنتیکە نەجار)، لە پشت سینەما (عەلەمەین)ی کۆن بوو.
٦٣. وەستا (فەوزی خەشاب) لە پشت سینەما (عەلەمەین کۆن بازرگان بوو.
٦٤. وەستا (نازم عەنتیکە)، لە پشت باڵەخانەی دادگا بوو.
٦٥. وەستا (فەخری عەنتیکە)، لە پشت باڵەخانەی دادگا بوو.
٦٦. وەستا (حەسەن عەباس)، باوکی دکتۆر (ستار حەسەن کەرکوکی) بوو، لە شەقامی دادگا بوو.
٦٧. وەستا (ئەحمەد سەعید مەحمود بەیاتی نەجار):
لە ساڵی (١٩٢٨) لە (خورماتوو) لەدایکبووە، هەر لە چلەکانی سەدەی رابردوودا لەم پیشەیەدا کاری کردووە لەژێر دەستی وەستا (شوکور حەسەن)، ماوەیەك دامەزراوە لە کۆمپانیانی نەوتی باکوور بە کرێی ڕۆژانە (٢٦٠) فلس، لە شەستەکانی سەردەی رابردوودا لە کۆمپانیا وازی هێناوەو لە پیشەی دارتاشی کاری کردووە بە تایبەتی لە پیشەی مۆبیلیاتو چاککردنی بەشەکانی ئۆتۆمبیلی دار کە جاران باو بوو لەنێوان هێڵی بەغداو کەرکوك، لە دواییدا دوکانی کردەوە لە پشت سینەما (عەلەمەین)ی کۆن لە شەقامی (بابا گورگور) بۆ هەندێك کەرەستەی داریی لە پیشەی هەویرکاری، لە ساڵی (٢٠١٠) کۆچی دوایی کردووە.
٦٨. وەستا (ئەمین نەجار)، لە پشت سینەما (عەلەمەین)ی کۆن بوو.
٦٩. وەستا (قەرە حەسەن)، لە پشت باڵەخانەی دادگا بوو.
٧٠. وەستا (فاروق نەجار)، لە بەرامبەر باڵەخانەی دادگا بوو.
٧١. وەستا (بەکر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٧٢. وەستا (ئەحمەد بەکر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٧٣. وەستا (فایق ڕەفیق ئەحمەد نەجار):
لە ساڵی (١٩٢١) لە گەڕەکی (سەقاخانە) لە بازاری گەورە لەدایکبووە، هەر لە منداڵییەوە ئەم پیشەیەی لە باوکییەوە فێر بووە لە بەرامبەر گەرماوی (ئەلشیفا) لە بازاری گەورە، تاوەکو ساڵی (١٩٤٧) بەردەوام بووە لێی، لە دواییدا لە کۆمپانیای نەوتی باکوور وەکو وەستای دارتاشی دامەزراوە، لە پاڵ پیشەکەیدا دەستێکی باڵای هەبووە لە خوێندنی قوریات، دوکانەکەی لە پشت سینەما (عەلەمەین)ی کۆن بوو، لە ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.
٧٤. وەستا (حاجی سوبحی)، لە گەڕەکی (ساحەت تەیەران) بوو.
٧٥. وەستا (عەدنان نەجار)ن لە گەڕەکی (ساحەت تەیەران) بوو.
٧٦. وەستا (یاوز نەجار)، لە گەڕەکی (ساحەت تەیەران) بوو.
٧٧. وەستا (نورەددین نەجار)، لە نزیك گۆڕستانی (سەیید عەلاوی) بوو.
٧٨. وەستا (هاشم نەجار)، لە نزیك گۆڕستانی (سەیید عەلاوی) بوو.
٧٩. وەستا (سەلاح نەجار)، لە نزیك گۆڕستانی (سەیید عەلاوی) بوو.
٨٠. وەستا (ئیبراهیم نەجار)، لە گەڕەکی (جرید مەیدان) بوو.
٨١. وەستا (ئیسماعیل نەجار)، لە گەڕەکی (جرید مەیدان) بوو.
٨٢. وەستا (قەرە سدیق)، لە گەڕەکی (گاورباغی) لە (جرید مەیدان) بوو.
٨٣. وەستا (مەجید)و (یونس نەجار) لە گەڕەکی (جرید مەیدان) بوو.
٨٤. وەستا (عەرەب نەجار)، لە نزیك حەمامی (عەلی بەگ) بوو.
٨٥.وەستا(ئەحمەد نەجار)،لەگەڕەکی(حەمام عەلی بەگ)

**بوو.**
**٨٦. وەستا (ئەکرەم نەجار)، لە گەڕەکی (عەلی بەگ) بوو.**
**٨٧. وەستا (عابدین نەجار)، لە گەڕەکی (شاتڕلو) بوو.**
**٨٨. وەستا (ئەنوەر نەجار)، لەگەڕەکی (شاتڕلو) بوو.**
**٨٩. وەستا (عەبدوڵڵا نەجار)، لە گەڕەکی (ئەلماس) بوو.**
**٩٠. وەستا (جومعە نەجار)، لە گەڕەکی (ئەلماس) بوو.**
**٩١. وەستا (شێخ جەرجیس سەباغ)، لە گەڕەکی (ئەلماس) بوو.**
**٩٢. وەستا (حاجی مستەفا سەباغ)، لە گەڕەکی (ئەلماس) بوو.**
**٩٣. وەستا (مەحمود نەجار)، لە شەقامی پەروەردەی کۆن بوو.**
**٩٤. وەستا (ئاموود نەجار)، لە شەقامی پەروەردەی کۆن بوو.**
**٩٥. وەستا (ئەبو حەسەن)، لە شەقامی پەروەردەی کۆن بوو.**
**٩٦. وەستا (ئایدن نەجار)، لە شەقامی پەروەردەی کۆن بوو.**
**٩٧. وەستا (حاجی عیزەت مەردان)، وەستا بوو لە (چراخە)ی داردا.**
**٩٨. وەستا (عەلی ساقی)، وەستا بوو لە (چراخە)ی داردا.**
**٩٩. وەستا (جەلال عەرەب)، لە گەڕەکی (ئەحمەد ئاغا) بوو.**
**١٠٠. وەستا (مستەفا براش)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.**
**١٠١. وەستا (غێدان قازی نەجار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.**
**١٠٢. وەستا (شوکور عەلی نەجار):**
**لە ساڵی (١٩٠٢) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە سەرەتادا گەلێك ئیشی کردووە لە پیشەی جۆراوجۆر، بەڵام لە دوای جێگیر بوونی لە کەرکوكو لە دوای دامەزراندنی لە کۆمپانیای نەوتی باکوور بەتایبەتی لە هۆبەی دارتاشی توانی سوود لە پیشەی ئینگلیزەکان وەربگرێتو لە دوای خانەنیشن بوونی توانی دوکانێکی مۆبیلیاتی گەورە لە بازاڕی (قۆریە) بکاتەوە کە تاکو ئێستاکە بەردەوامەو مۆبیلیاتی (شوکور نەجار) نەك لەسەر ئاستی کەرکوك بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو عێراق بە ناوبانگە، لە ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.**
**١٠٣. وەستا (ئەکرەم نەجار قەلعەلی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.**
**١٠٤. وەستا (جەلال ساڵح محەمەد ڕەجەب نەجار):**
**لە ساڵی (١٩٠٢) لە گەڕەکی (ساری کەهیە) لەدایکبووە، پیشەی دارتاشی لەو کاتەی سەرباز بووە لە سوپای عێراق فێر بووەو تا کۆچی دوایی لەساڵی (١٩٧٣)دا لەم پیشەیەدا بەردەوام بووە، دوکانی هەبووە لە بازاڕی (قۆریە) لە نزیك مزگەوتی (مەلا عەبدوڵڵا لۆبیاچی).**
**١٠٥. وەستا (مەلا عومەر سلێمان یایچی):**
**لە ساڵی (١٩١٢) لە کەرکوك لەدایکبووە، لەژێر دەستی وەستا (حاجی عیزەت مەردان)و (حاجی عەلی ساقی) فێری ئەم پیشەیە بووە، لە ساڵی (١٩٤٤) فەرمانبەر بووە لە کۆمپانیای نەوتی باکوور، دوکانەکەی لە بازاڕی (قۆریە) بوو، لە ساڵی (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە.**
**١٠٦. وەستا (حاجی جەلیل خەلیل نەجەف):**
**لە ساڵی (١٩١٠) لە کەرکوك لەدایکبووە، دەستێکی باڵای هەبووە لە پیشەی کەرەستەکانی نێوماڵو دەرگاو پەنجەرە دروستکردندا، لە ساڵی (١٩٤٠) لە کۆمپانیانی نەوتی باکوور دامەزراوە، دوکانەکەی لە بازاڕی (قۆریە) بوو، لە ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.**
**١٠٧. وەستا (حەسیب قادر جاسم نەجار):**
**لە ساڵی (١٩٢٥) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٤٢) دامەزراوە لە کۆمپانیای نەوتی باکوور، ئەم پیشەیەی لە وەستا (مەلا عەلی سلێمان) وەرگرتووە، دوکانەکەی لە بازاڕی (قۆریە) بوو، لە گەلێك پرۆژەی گەورە وەکو (بەنداوی دوکان) و (پردی خازر)و (پرۆژەی ئەسکی کەلەك) کاری کردووە.**
**١٠٨. وەستا (حاجی سدیق قلنچی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.**
**١٠٩. وەستا (ئەمین خدر قادر)، لە نزیك مزگەوتی (عەبدولرەزاق) بوو.**
**١١٠. وەستا (ڕەحمەتوڵڵا نەجار)، لە بەرامبەر نەخۆشخانەی (کۆماری) بوو.**
**١١١. وەستا (ججاوی نەجار)، لە کۆمپانیانی نەوتی کەرکوك بوو، لە دواییدا خۆی گواستەوە بۆ بەغدا.**

*** کۆگاو مۆبیلیاتەکانی کەرکوك:**

**١. مۆبیلیاتی (ئەلفەرەح)، لە شەقامی (کۆماری) بوو، خاوەنەکەی (شوکور سلێمان نەجار) بوو.**
**٢. مۆبیلیاتی (ئەتڵەس)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو، خاوەنەکەی (محەمەد عەلی شێخلەر زادە) بوو.**
**٣. مۆبیلیاتی (ئەلئەتلال)، لە شەقامی (بابا گوڕگوڕ) بوو، خاوەنەکەی (عەباس مەردان) بوو.**
**٤. کارگەی دارتاشی (سدیق قلنچی)، خاوەنەی (سدیق قلنچی).**
**٥. ؟؟ مۆبیلیاتی (ئەلئیخوان)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو، خاوەنەکەی (ئامیق ڕەفیق نەجار) بوو.**
**٦. ؟؟ مۆبیلیاتی (شەنگوڵ)، لە شەقامی (ئەلئیستیقلال) بوو، خاوەنەکەی (کەماڵ شەنگوڵ).**
**٧. مۆبیلیاتی (ئەلفیردەوس)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو، خاوەنەکەی (یوسف مەحمود نەجار) بوو.**
**٨. کارگەی مۆبیلیاتی (ئەلماس)، لە شەقامی (ئەلئیستیقلال) بوو، خاوەنەکەی (محەمەد مەحمود) بوو.**
**٩. مۆبیلیاتی (سەلاح)، لە (ڕاغیبە خاتوون) بوو، خاوەنەکەی (سەلاح عەلی کەرکوکی) بوو.**
**١٠. مۆبیلیاتی (ئایدن)، لە باڵەخانەی (ئەوقاف)ی تازە لە شەقامی (کۆماری) بوو، خاوەنەکەی (ئایدن ساڵح ئۆتراقچی) بوو.**

ئیسماعیل کەریم مستەفا

ئیبراهیم ڕەفیق محەمەد

ئیسماعیل نەجمەدین محەمەد

ئیحسان ئیبراهیم ئەمین

ئەمین خدر قادر

جەعفەر خورشید

جەلال سالح محەمەد

حاجی ئەحمەد سەعید مەحموود

حوسێن محەمەد ئەحمەد

خەلیل حەسەن حەنەش

خەلیل حەسەن حەنەش

ڕەفیق ئەحمەد مەهدی

فایەق ڕەفیق ئەحمەد

مەلا عومەر سلێمان یاپچی

فەخرەدین نوردەی عومەر سالەیی

محەمەد سەعدوللا عەبدوللا

*** کەرەستەکانی جووتکردن:**[١]

*** دەستەندوو ( دەسەدم )شی پێدەڵێن:**

دارێکی بێ گرێی لووسی تاشراوە، درێژییەکەی نزیکەی مەترێك دەبێت، کوتراوە لەو کونەی کە ها بە سەر کەللە هەوجارەکەوە، بە توندی جێگەی خۆی گرتووەو بە هیچ جۆرێك ناجووڵێت، ئەمە هەمیشە ها بە دەستی جوتیارەوە لە کاتی جووتکردندا بە هۆی ئەمەوە دەتوانێ خەتەکەی راست بێ، یان دەستی زیاتر دابگرێ گاسنەکە زیاتر دەچێتە ناخی زەویدا، هەروها بۆ هۆدانەوەو سوورانەوەش گاسنەکە لەژێر زەوی دێنێتە دەرەوە.

*** دەسك ( مشتك دەسە دوی )و ( دەستە مستە )و دەسکە دەستەندوو و ( دەسگیر )یشی پێدەڵێن:**

پارچە دارێکی بچووکە هەر پڕ بە مشتی پیاوێکە، درێژییەکەی (١٥، ١٧سم)ە لە سەرووەی دەستەندوو بە دیوی جوتیارەکەدا بەند دەکرێت، بە هۆی تێهەڵکیشان لە گەڵ یەکتردا، هەیشە لە داری بەڕوو ئامادە کراوەو لە گەڵ دەستەندووەکدا یەك پارچەیە.

*** هەرجار ( ئاموور )و( هێش )یشی پێدەڵێن:**

بریتییە لە دارێکی دوو لقی ئەستوور لە داری گوێز یان توو ئامادە دەکرێت، لقێکی کورت و خۆشکراوەیە، بەمەیان دەڵێن زمانەی هەوجار(دۆندە)، بە گوێرەی بەرینی کوڵی کووپەی گاسنەکەدەتاشرێ و دەچێتە نێو تەوق وناوەڕۆکی گاسن (گاوەسن)، لقەکەی دیکەی درێژو ڕوو لە هەورازەو پێی دەڵێن (باسکە هەوجار) (قۆڵە هەوجار) کە دوو کونی لە سەرەوە بۆ کراوە بۆ بەندکردنی لەگەڵ مژانەکە ئەویش بە سایەی هەپە (خەپە) لە یەکتر توند دەکرێت و تەلیش توند دەیبەستن، بە شوێن گەیشتنی زمانەو باسکی هەوجارەکەیش دەڵێن (گەر)یان (بوغازە)یان (گرانگ).

*** قرۆمە:**

هەوجار هەیە یەك پارچەیە، هەیشە کەللەو زمانەکەی بە جیایەو بە هۆی دوو پارچە ئاسن لە ملاو لەولاوە بەستراوە بە دارێکەوەو توند بەند کراوە و پێی دەڵێن (قرۆمە).

*** گاسن ( گاوەسن ):**

ئەم بەرهەمە پیشەی ئاسنگەرەکانە، کەرەستەیەکی هەرە گرنگی هەوجارە بۆیە لێرەدا باسی دەکەین: گاسن: بریتییە لە ئاسنێکی نووك تیژ، لە پشتەوەی چەشنی نیو بازنەیی خوار کراوەتەوەو زمانەی هەوجاری تێدا گیر دەکرێت و پێی دەڵێن (کووپەی گاسن)، بە هۆی تەوق یان بازنی گاسن نایەڵێ زمانەی هەوجار بترازێ و لە گاسنەکە جودا بێتەوە، لە نزیکی نووکەکەی دوو شاپەڕی هەیە.

*** مژان ( مژانە ):**

دارێکی درێژی ئەستووری دوڵە، درێژییەکەی نزیکەی دوو مەتر دەبێت، نیوە دیرەکێکە ( کاریتە، ستوون) هەردوو سەرەکانی دوو کونی تێدایە لای هەورازی بۆ نێو بۆسەی نیلە (نیر) دەچێت بە هۆی سەر مژانەکە لە نیلە بەند دەکرێت، سەرەکەی دیکەی لە گەڵ باسکە هەوجار توند دەکرێ بە چەند سنگێ دار یان ئاسن کە پێی دەڵێن هەپە، جاری واش هەیە چەند تەوقێ ئاسنی لێ دەدرێ و توند دەکرێت.

*** شیرە هە پە:**

لە پێش دەسەدوی (دەسەدم) کونێك لە هەوجارەکە دەکەن و دارێکی تێدەکوتن و خوارەوە دەچێت، بەمەیان دەوت شیرە هەپە، بە هۆی دوو کرمە لە خوارو بانەوە دەیانبەست.

*** هە پە ( خە پە ):**

بریتییە لە چەند دارێکی خڕ یان ئاسن لە نێو کەنی مژان و باسکە هەوجار دادەنرێت بۆ بەستنەوەیان لە گەڵ یەکتردا بە زۆریش دوو کون و دوو هەپەیە.

*** کرمە:**

هەر یەکە لە هەپەکان کونێکی لە لاوە هەیە، لە کاتی بەستنی مژان و قۆڵی هەوجار مێخێکی تێهەڵدەکێشن بۆ ڕاگرتنی هەپەکان و پێی دەڵێن (کرمە).

*** دار نیلە ( نیر ):**

بریتییە لە دارێکی ڕاستی لوولەیی درێژییەکەی نزیکەی:

أ. بۆ ئێسترو وڵاخی بەرزە مەترو نیوێك دەبێت.

ب. بۆ گوێدرێژ مەترو چارەکێك دەبێت.

چوار کونی تێدایە دووانیان لە لای ڕاست دوویشی لە لای چەپ پێییان دەڵێن کونی کەڵەمە (دار کراوە)، دوو کورتە داریش لە نێوڕاستا چەسپاوە، نێوانیان نزیکەی (١٢-١٥سم)ە دەبێت، بۆ ڕاگرتنی وێژە (هیرتە) کە پێی دەڵێن: دار وێژە (دوو گوێی نیر).

*** کەڵەمە ( دار کراوە )و ( چەڵەمە )و ( کەڵەوە )شی پێدەڵێن:**

چوار داری دوو گوێیە، یان سەری قاشۆیە، لە داری بەڕوو یان گوێز یان توو دروست دەکرێت، چونکە ئەم دارانە بتەوو قایمن. دەخرێنە نێو چوار کونەکەی نیلەوە (نیر)، دوو لای ڕاست ولای چەپ.

ئەم کەڵەمانە دەکەونە کۆیەران ولای ڕاست وچەپی ملی وڵاخە دابەستراوەکان، لای خوارەوەی دار کراوەکان لە کراون بۆ بەستانی بەنکەڵەمە(بەنکراوە).

*** بەنکەڵەکە، ( بەنکراوە )و ( بەنکەوانە )شی پێدەڵێن:**

لە هەر لای پەرگەی کەڵەمەکان (دار کراوەکان) کشتەکێ هۆنراوە هەیە لە شێوەی نیوە گوریسێکی باریکە بە هۆی لەلەکەی خوارەوە بە کەڵەمەکان بەستراوە بۆ قایم کردن و بەستنەوەی هەردوو کەڵەمەکان بە کاردێت.

*** دار ویژە، دوو گوێی نیلە، دوو گوێی نیر، دار خەزنە، زرە، کەروێشکە کیرۆشکە، قوش:**

بریتییە لە دوو داری تاشراوی بچووک لە ناوەندی نیلە (نیر)، نێوانەکانیان نزیکەی (١٢-١٥سم)ە دەبێت، بۆ ڕاگرتنی ویژە بە کاردێت.

*** ویژە (هرتە)و(هیرتە)و(هیبە)ی پێدەڵێن:**

بریتییە لە پارچە قایشێك لەنێوانی دار ویژەو دار خەزنەدا، زەنگۆڵە (بۆسە) لە گەڵ نیلەدا دەبەستێتەوە، جار بە جاریش ویژە لە گوریس و چەرم دروست دەکرێت، ئەمە لە حاڵەتێکدا قایش دەست نەکەوێت، ویژە سوودێ دیکەشی هەیە کە جاری وا دەبێت لەو دوو وڵاخە دابەستراوانە یەکێکیان لەوی دیکە بە هێز ترە یان بڵند ترە بۆ ئەوەی هێزی ڕاکێشان و گرانی سەر ملیان یەکسان بێت، جوتیارەکە هەڵدەستێ بە وەرگێڕانی چەند قەف لە ویژەکە بە سەر دار خەزنەکە بە لای وڵاخە بەرزەکەدا تا وەکو یەك گرانی نیلەکەیان بێتە سەر مل و هەوجارەکە بە ئاسانی ڕابکێشن.

*** چەمەرە (زەنگۆڵە)،(قەشقە):**

ئامرازێکە لە داری بتەو وەکو بەروو ئامادە دەکرێت، سەری مژانەکەی تێدەخرێ وئینجا گاینجەکە لە مژانەکە تێپەڕ دەکرێت، ئەمیان لەگەڵ کەرەستەکانی شەخرەدا باسمان کردوون.

*** بەرکۆڵە و پاشکۆڵە:**

لە پارچە تەختەیەك ئامادە دەکرێت دەخرێتە نێوانی قوڵی هەوجار و مژانەکەدا، کون کراون و هەپەکان پێیاندا دەچێت، ئەگەر بخرێتە پێشەوە پێی دەڵێن بەرکۆڵە، بخرێتە پاشیشەوە پێی دەڵێن پاشکۆڵە، سوودییەکەمیان خۆڵ کەمتر فرێدەدا، دووەمیان گاسنەکە زیاتر دەچێتە ناخی زەویداو هەڵبەتە خۆڵیش زیاتر فرێدەدا.

*** سەر مژانە (سەرمژانگە)و(گاینجە)و(گاگیرە)ی پێدەڵێن:**

پارچە دارێکی لووسکراوەیە دەخرێتە نێو کونی لای سەرەوەی مژان (مژانە) لە پاش تێپەڕ بوونی سەری مژانەکە بە نێو زەنگۆڵەدا دەبێتە ڕکەی بەری بۆسەکە بۆ ئەوەی سەری مژانەکە نەترازێ و دەرنەچێت لە کاتی ڕاکێشانی هەوجارەکە.

*** بازنەی نیلە، کۆپەلان، کۆپەران، جەلە، بارینە:**

لە لوولکردنی گوش و کۆنە پەروو کۆنە لباد دروست دەکرێت، دەوری بە قایش دەگرن و جەمسەرەکانیان بە سیرمە(سیرم) دەپێچن، دوو پەلە داری تراشاوی بچووکی ناوەند لەلە کراوی لەم سەرو لەو سەری دەبەستن کە پێی دەڵێن فرفرۆك (گورگرە) بۆ گەیاندنی هەر دوو سەری بازنەی نیلەکەیە بە هۆی (بەنکراوە)، دەکەوێتە بەر سینگ و پێش دەستەکانی وڵاخە دابەستراوەکان.

*** بانملە (بن مل)و(سەر ملە)شی پێدەڵێن:**

ئەم بانملەیە ڕووەکەی پارچە جلێکە لە کۆنە لباد بە چەند قەد بە یەکەوە دووراون، ڕووەکەی دیکەی لە قایش ولاستیق ئامادە کراوە، نابێ لە سێ پارچە کەمتر بخرێتە سەر یەك لە بەر مەترسی وبریندار کردنی ملی وڵاخ.

*** بێڵەکان، (لاپووتە)و (مەساسە)و (مساسك)و (مساس)شی پێدەڵێن:**

پارچە ئاسنێکە لە شێوازی لاویتە (پیشەقان) بەڵام دەمەکەی نیو بازنەییە جوتیار بە کاری دەهێنێت بۆ پاکژ کردنەوەی گاسن وهەوجار بە تایبەتی لە کاتی جووتکردنی زستان وبەهاراندا، هەروەها بۆ لێخورینی وڵاخەکانیش بە کاردێت، هەندێ جار لە داری بەڕوویش ئامادە دەکرێت.

*** دار دەست (داردەس)و (گاران)و (گارام)و (دارجووت)و (دار جۆت)یش پێدەڵێن:**

ئەو دارەیە کە جووتیار بە دەستیەوەیە بۆ لێخورینی وڵاخەکان بە کاری دێنێت، سەرێکی بسمارێکی نووك تیژی تێ براوەو پێی دەڵێن نەقیزە، بە بێ نەقیزەش دەبێت.

*** دەسەجلەو (دەسە ڕەشمە)و (کلکە ڕەشمە)و (هەوسار)و (کلکە لغاو)و (کلکەجلەو)شی پێدەڵێن:**

بریتییە لە گوریسێکی درێژ سەرێکی لە لای تەنیشتی ڕاستی وڵاخی ڕاستەیەبە نێو زەناخەو بازنەی قەراسەکە قایم دەکرێ، سەرەکەی دیکەشی بە لای چەپی وڵاخی چەپەیە هەمیسان بە نێو زەناخە و بازنەی قەراسەکە قایم دەکرێت، ناوەندەکەشی دەگەڕێتەوە دەست جوتیار ئەویش لەو پارچە دارەی سەر دەستە مستەی دەستەندوەکە دەئاڵێنێ بۆ ڕاست و چەپەو لێخورینی وڵاخەکان بۆ هۆدانەوش بە دەست ڕایدەکێشێ، یان لە لای ڕاستی ڕەشمەوە وڵاخی ڕاستەوە لە لای چەپی ڕەشمەی وڵاخی چەپەوە قایم دەکرێت.

*** توورەکە:**

خورجێکی تەنراوی شاشی بچووکە، جووتیار ئالیکی تێدەکا بۆ وڵاخەکانی.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. بۆ ناوەکانی کەرەسەی جووت لەم دیدە ساڵانە سوودم بینیوە:-

ا. ئەحمەد زۆراب ئەحمەد باوایی(١٩٢٢، ٢٥/١/٢٠٠٤).

ب. شێخ سەمەد شێخ قادر بەرزنجی (١٩٣٥، ).

پ. حاجی سەعید ڕەزا عەزیز (١٩٤٩، ).

ت. حاجی نووری ستار ئەمین (١٩٣٥، ).

ج. حاجی محەمەد عەبدولوەهاب عەلی (١٩٢٣، ).

چ. مەقامزان خەزعەل مارف عەزیز(١٩٣٦، ).

ح. گوڵمێك لە ڕەوسەی فۆلکلۆری کوردی، داود محەمەد شرۆل، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٧٨.

## * ناوی ئامرازە جوتیارییە ڕەسەنەکانی کۆمەڵگەی کوردی:

عەلی حوسێن سالح

وەك لای زۆرێك لە شارەزایان دیارەو ڕوونە کۆمەڵگە لە گەشەی بەردەوامدایە، سەبارەت بە کۆمەڵگەی کوردی خۆمانیش بەدەر نیە لەو پێشکەوتنانەدا بەلام لەژێر کاریگەری کولتورو زمانی نەتەوە داگیرکەرەکانی کوردستاندا بەردەوام بووە وێرای ئەوەش تاکو ماوەیەکی زۆر توانیوێتی کولتورو زمان و شارستانییەتی خۆیەتی بپارێزێ، هەڵبەتە لەلای شارەزایانی بواری کۆمەلایەتی و زمانەوانی کۆمەڵگەکەمان ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم کۆمەڵگەیە زۆر دەوڵەمەند بووە بە زاراوە ڕەسەنە دێرینەکانی خۆی، بەلام لە پاش ئەو داگیرکردنانەو تێکەڵبوونی بە داگیرکەرانی وردە وردە کەوتووتە ژێر کاریگەری کولتورو زمانی ئەو نەتەوانەوە، بۆیە ئەتوانم بێژم زۆرێك لەدەوڵەمەندی خۆی لەدەستداوە، ئەو دەوڵەمەندییەی گەر بێت و زیندوو بکرێنەوە جگە لەوەی زمانەکەمان سەروەری و دوڵەمەندی خۆی دەسەلمێنێت دەبێتە مایەی سەروەریش بۆ نەوەکانی ئایندەمان.

دیارە لەم قۆناغەدا کە قۆناغی پێشکەوتنی پیشەسازی تەکنەلۆجیایەو خێراییەکی زۆری بە زۆرێك لە بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵگەکان بەخشیوە بە رادەیەك ئەو برە کارانەی ئێستا لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ئەنجام دەدرێت لەو سەردەمانەدا لە ناو چەند مانگێکیشدا ئەنجام نەدراوە، بۆیە ئەو شێوازە لە کاردا بەسەر چووە مەگەر زۆر بە دەگمەن وەك جۆرێك لە عەنتیکەکان تەماشا بکرێت. لەو کارو ئامرازانەش وەك جووتکردن بە هێزی کەرو هێسترو گاو ئەسپ (دیارە لەپاش داهێنانی تراکتەر) ئەو زاراوەو ئامێرانەش وەك عەنتیکەیەك تەماشا دەکرێت،تەنانەت هەشبووە بە دوو خێزان توانیویانە جووتێك پێکبهێنن واتە هەر لایەکیان کەرێکیان هەبووەو بە هاوبەشی جووتی خۆیانیان پێکردوون.

هەڵبەتە جووت یان درەوکردن و ئاژەڵدارێتی پێویستی هەیە بە برێك زاراوەی تایبەت بە ئامرازە پێویستییەکانی گوندنشینەکان، دەریشکەوتوە کۆمەڵگەی کوردی خۆشبەختانە بە تێپەڕبوونی ساڵانێکی زۆرو لەسێبەری کەمی تێکەڵبوونیان بە کۆمەڵگەکانی نەتەوەکانی دیکەدا توانیویانە زاراوە ڕەسەنە تایبەتەکان بە ووشەو زمانی کوردی پەتی بدۆزنەوە کە دەقاودەق مەبەستەکە دەپێکێت و بوونەتە مایەی دەوڵەمەندی زمانەکەمان ئەگەر بتوانین هەندێکیان زیندوو بکەینەوەو بیانپارێزین. ئەوەی مەبەستمە لەم بابەتەی نووسیومە، بە تاوانی دەزانم ئەو زاراوە کوردییە پەتی و ڕەسەنانەی کۆمەڵگەکەمان لەفەوتان نەپارێزین کە دەبینم وردە وردە لە تیاچووندان، هۆکارەکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ دەزگا ڕۆشنبیرەکان و خودی ڕۆشنبیران کە دەبینین پەنا بۆ وشەی بیانی وەك ئینگلیزی و لاتینی دەبەن و لایەك بۆ زاراوە کوردییە جوانەکانی خۆماندا ناکەنەوە کە لە پاش ماوەیەکی تر هەناسەی پەشیمانی بۆ هەڵدەکێشن، ئەستۆی ئەم تاوانەش دڵنیام بەبێ مەبەستیشە، دەگەڕێنمەوە بۆ مەڵبەندە ڕۆشنبیرو فێرگەکان بە تایبەتی دەزگاو کۆلێژە پەیوەندارەکان.

ئەگەر بەراوردێکی کەرکوك و گەرمیان بکەین لەگەڵ کوردستاندا دەبینین هاوبەشییەکی بەرچاو هەیە لەنێوان ئامرازە جوتیارییەکان لە ڕووی زمان و شێوازو جۆری بەکارهێنان.

### * ئامرازە جووتیارییەکان:

**١. گاوەسن:**

پارچە ئاسنێکی تایبەتە بە هەڵکۆڵین و هەڵگەڕانەوەی زەوی کشتوکاڵی کە زمانەکەی درێژو تیژ دەکرێت بۆ نزیکەی ١٠-١٥ سم بۆ ئەوەی بە ئاسانی زەوێکە هەڵبوەشێنێتەوەو لە کاتی جووتکردندا هەڵیگەڕێنێتەوە، لاکەی تریشی لە شێوەی کیف دروستکراوە دەخرێتە زوانی هەوجار یان قورەمەوەو بە بسمارێکی ئەستوور چ ئاسن بێت یان دار دەیچەسپێنن بەیەکەوە.

**٢. هەوجار:**

بریتیە لە ئامرازێکی دارینی تایبەت بە جووتکردن، لایەکی بۆ نزیکەی مەترونیوێك درێژ دەبێت و بە شێوەیەك ڕێکیانخستوە بە ئاسانی بەبەسرێتە ناوەڕاستی نیلەوە، ئەو لاکەشی کەڵلەکەیەتی کە بە شێوەیەکە زمانێکی لێتاشراوە دەخرێتە ناو کیفی گاوەسنەکە و کونێکی لەسەرە چوکوڵێکی ئەستوور یان بزمارێکی تێدەخەن بەمەبەستی چەسپاندنیان بەیەکەوە.

**٣. قورەمە:**

ئەم ئامرازە لە هەمان شێوەی هەوجارە بەلام ئەوەی لێی جیادەکاتەوە کەڵلەسەرەکەیەتی کە لەهەمان دار نیە وەکو هەوجار بەڵکو بەشێکی جیاوازە بە مێخێکی ئاسنینی ئەستوور لەگەڵ زوانەیکەدا دەیچەسپێنن.

**٤. نیلە:**

بریتیە لە جووتێك ملپێچی نیوە بازنەیی تایبەتی ڕاکێشراو کە لە پووش دروست کراوەو بە توندی بەقایش داپۆشراوە کە هەر تایەکیان دەخرێتە ملی تاکێك لەو جووتە گوێدرێژ یان گا یان هێسترانە لە سەرەوەشیانەوە دارێکی لوولەکی ئەستووری جوان تاشراو بەیەکەوەیان دەبەسێتەوە، لە ناوەڕاستی ئەو دارەشەوە کونێکیان کردوە بۆ بەستنەوەی بە مژانی چەسپاو بە هەوجار یان قورەمەوە، بەم شێوەیەش قورساییەکەی بە هاوکێشەیی بەسەر هەردوو ولاغەکەدا دابەش دەبێت.

**٥. مژان:**

پارچە دارێکی ئەستووری تایبەتە درێژێکەی بە مەترو نیوێك دەخەملێنرێت سەرێکی بە باسکەی قورەمە یان هەوجارەوە دەبەسرێت لە ڕێگای (هەپەوە) کە پارچە دارێکی تایبەتی ئامادەکراوە بۆ ئەم مەبەستەو دەخرێتە هەردوو کونی مژان و قەرەمە یان هەوجارەوە لە پاش ئەوەی لە سەر یەك برێکی دادەنرێن و کونەکان لە ئاست یەك دەبن.

٦. **هەپە:**

پارچە دارێكی تاشراوی بچووك وتەنكە كە بەچەند دانەیەكیان مژان دەبەسترێت بە قۆڵی قورەمە یان هەوجارەوە، ئەستوورییەكەشی بە گوێرەی پێویست ئامادە دەكرێت.

٧. **فرێنك:**

ئەو پارچە دارە تایبەتەیە كە هەردوو بازنەی نیلە ملی جووتە وڵاخەكان بە یەكەوە دەبەسێت و لە ناوەراستییەوە كونی گونجاوو تایبەت كراوە بۆ پێوە چەسپاندنی مژان.

٨. **وێژە:**

دارێكی چەماوەی بەهێزەو بە زۆرینە لە داری بەروو یان توو دروست دەكرێت، لەناوەراسییەوە بەتەری، دەیچەمێننەوەو هەردوو سەرەكەی بەیەكەوە گرێدەدەن و دەیخەنە سەر كەوانەی نیلە بۆ بەهێزكردنی .

٩. **بانە:**

بەو پارچە زەوییە دەوترێت كە جووتیار بۆ جووتكردنی ئەو رۆژەی دیاری دەكات، ئەویش بە یەك هێڵی جووت بە دەوریداو پاشان تۆم كردنی و دواتر دەستكردن بە جووتكردنی، بەڵام گەر بۆ وەردبرینی بێت ئەوە تۆوی ناكات و سنووردارکردنیشی گرنگ نیە.

١٠. **هۆ:**

بە چوون و گەرانەوەی جووتیار لە كاتی جووتكردندا دەوترێت هۆ، واتە هەر چوون و گەرانەوەیەك هۆیەكە.

١١. **دەسك:**

بەو پارچە داردەستە دەوترێت كە سەرێكی دەخرێتە ناو ئەو كونەی لەسەر قورەمە یا هەوجار ئامادە كراوە لە سەرەوەی دارەكەش دەسكێكی بۆ دروست كراوە بە مەبەستی گرتنی لەلایەن جووتیارەوە بۆ كۆنترۆڵكرنی كرداری جووتكردنەكە.

١٢. **كەڵەمە:**

شوولێكی دارینی تایبەت ئامادە كراوە بۆ پاڵپشت لە نیلەی مل وڵاخ و بە هێزكردنی.

١٣. **نەقیزە:**

كورتە داردەستێكە لە سەرێكییەوە بزمارێكی تێكوتراوە بەمەبەستی چەقاندنی ئەو بزمارە بە پشت ملی ئەو وڵاخە بۆ خێراكردنەوەی لە رۆیشتندا.

١٤. **داس:**

ئامرازێكی ئاسنینی نیوە چەماوەیە تاكو ئەمرۆش ناسراوەو بەكاردەهێنرێت بۆ درەو كردنی دەستی یان بەجەركردنی دارو درەخت، دەسكێكی دارینی بۆ كراوە، تاكو ماوەیەكی نزیك لە درەوكردندا بە كار دەهێنراو ئێستاش لە شوێنە سەختەكاندا بە كاری دەهێنن.

١٥. **خەڵە:**

بە كۆكردنەوەی گەنم و جۆ دەوترێت خەڵە.

١٧. **هەسان:**

بەو پارچە بەردە تایبە بە تیژكردنی داس یان چەقۆو مەقەس و تەور وپاچ دەوترێت هەسان كە بە رۆنیش چەوردەكرێت لە كاتی بەكارهێنانیدا.

١٨. **گورزە:**

بەو برە درەختە گیاییە درەوكراوە دەوترێت كە پڕ بە مشتی درەوەنییە.

١٩. **مەڵۆنانەوە:**

بە كرداری كۆكردنەوەی گورزەكان دەوترێت كە پڕ بەباوەشی مەڵۆنێرەكە بێت و بە كۆكراوەكش دەوترێت مەڵۆ.

٢٠. **تایە:**

بەو برە درەختە كۆكراوە لە مەڵۆكان دەوترێت كە لە كاتی كۆكردنەوەیاندا بەرێكی دادەنرێن بە مەرجێك گوڵەكانیان روو لە خوارەوە بن، درێژی هەر تایەیەكێك لە (٥-٦) مەتر دەبێت بەو شێوەیە لە خواردنی لەلایەن پەلەوەرەوە دەیپارێزن تاكو كاتی گواستنەوەیان بۆ شوێنی خەرمان.

٢١. **خەرمان:**

بە كۆكراوەكانی تایەكان لە شوێنێكی تایبەت بە كوتانی درەختی درەوكراو دەوترێت خەرمان، خەرمانیش شوێنی تایبەتی هەیەو هەر گوندو ئاواییەكیش شوێن خەرمانی تایبەتی خۆی هەیە، كەسیش بۆی نیە بۆ مەبەستێكی تر بەكاری بهێنێت. شایەنی وتنە لەكاتی خەرمان كووتاندا هەر كەسێك بە لایدا تێپەرایەت دەیوت (خەرمان بەرەكەت) جووتیارو خاوەنەكەشی دەیانوت (خێرو بەرەكەت).

٢٢. **گێرە:**

بەو كردارە دەوترێت كە بەچەند كەرێك یان بە جەنجەر كە لەم دواییەدا پەیدا بوو بە سەر برێك قرچەدا دەیانخولاندەوەو وردە وردە لەو قرچەیەیان دەخستە بەر پێیان تاكو دەكوترا واتە دانەكان دەردەچوون ئەوجا دەیانخستە دەرەوە لە شێوەی بازنەیی بەدەوری خەرماندا كۆیاندەكردەوەو لەقرچەكەیان دەخستە ژێر پێی وڵاخەكان یان جەنجەرەكە بە مەبەستی كووتانیان تاكو كۆتایی دەهات و ئامادە دەبوو بۆ شەنكردن.

٢٣. **پاخوا:**

بەو بەشەكووتراوەی خەرمان دەوترێت كە دانەوێڵەكانیان لە گوڵەكانیان دەرچووە لە ئەنجامی گێرەداو ئامادەیە بۆ شەنكردن.

٢٤. **شەن:**

ئامرازێكی دارینی جووتیاری كۆنە دەمەكەی بریتیە لە (٥-٦) چڵێكی نیمچە كەوانەی دارین و باسكەكەشی هەر دارە لە شێوەی كلكە بێڵ بۆ دردانی پاخوا یان راكێشانی قرچە بۆ ژێر قاچی وڵاخەكان لە كاتی گێرەدا، هەروەهاش بۆ شەنكردنیش بەكار دێت وەك لە ناوەكەیەوە دیارە، لەم دواییەدا دەمەشەنی ئاسنینیش پەیدا بوو بەڵام بۆ شەنكردن ناشێت.

٢٥. **جێز:**

بەو دانەوێڵەیە دەوترێت چ گەنم بێت یان جۆ كە لەپاش شەنكردنی پاخوا لە كاكەی جیا دەكرێتەوە، شایەنی وتنە جوتیاران زۆر بە رێزەوە تەماشای جێز دەكەن كە بەری رەنجی ساڵانەیانەو سەرچاوەی سەرەكی خۆراك و تۆوی ساڵی ئایندەشیانە. شایەنی وتنە لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا جوتیار بۆی نەبوو لەو جێزە بباتەوە بۆ ماڵەوە هەتاكو

جێگری ئەو دەرەبەگە ئامادە نەبوایەو بەشی دەرەبەگەکەی جیانەکردایەتەوەو پێی نەگوازایەتەوە بۆ شوێنی مەبەست کە بە شێوەی گشتی دەیەك بوو.

**٢٦. کۆزەر:**

بەو بەشە گوڵە گەنم یان جۆیانە دوترێت کە دانەوێڵەکانیان لە بەشەگوڵەکاندا ماونەتەوەو دواتر دەیانکوتنەوەو لە کاکانیان جیادەکەنەوە.

**٢٧. کا:**

رەنگە لەلای خوێنەر ناسراو بێت کە ئەو بەشەیە لە درەختەکە لە پاش جیاکردنەوەی دانەوێڵەکەی، بۆ خۆراکی مەرو بزنو مانگاو کەرو هێسترو ئەسپو هەموو گیا خۆرەکانیان سوودی لێوەردەگرن، دیارە بە رەشکە دەیگوازنەوە بۆ کایەن (شوێنی هەڵگرتنی کا) بۆ وەرزی زستانو کەم لەوەری.

**٢٨. جەنجەر:**

ئەم ئامێرە لە دوای پەنجاکانی سەدەی رابووردوو هاتە ناو ئامێرە کشتوکاڵییەکانەوەو بریتییە لە لوولەکیك بە دەوریدا دەمە جەنجەریا دەکوتا،کە لەشێوەی دەمە پاچەو دەیان دانەیان لەسەری دەچەسپاند، بە هێستر یان گوێدرێژ بەسەر ئەو قرچەیەدا رایان دەکێشا بەو شێوەیە خێراتر دەیانکوتا دیارە ئەم ئامێرانەش لە پێش دەرکەوتنی دروێنەی میکانییەوە پەیدا بوون، کەبۆ ئەو سەردەمە بە پێشکەوتنێکی زۆر باش دادەنرا.

**٢٩. قرچە:**

بە ساقەتو گوڵە گەنمو جۆی درەوکراوی کۆکراوەو گوازراوە بۆ خەرمان لەپاش هەندێ شکاندنەوەیان دەوترێت قرچە.

*** کەرەستە و ئامرازە بەکارهێنراوەکانی گوندنشینەکان:**

ناوو زاراوەی ئەو کەلوپەلە تایبەتانەی، کۆمەڵگەی کوردی بەکاریان دەهێنا بە تایبەتی گوندنشین و کۆچەرییەکان زاراوەی رەسەنی کوردین بە هۆی کەمی تێکەڵبوونیان بە نەتەوەکانی ترەوە، ئەتوانم بڵێم هەندێکی کەمیان تاکو ئێستاش رەسەنایەتی خۆیان پاراستووەو بەکاریان دەهێنن:

**١. کونە:**

دەفرێکە بۆ هەڵگرتنی ئاوی خواردنەوەو ساردکردنیشی بەکاریان دەهێناو لە پێستی بزنی خۆشەکراو ئامادە دەکرێت، شایەنی ووتنە ئەو پێستە بە کەندن لە گۆشتی ئەو بزن یان ساورێنەی جیادەکەنەوە.

**٢. مەشکە:**

ئەم دەفرەش لە پێستی مەرو بەران لە شێوەی کونە خۆشەو ئامادە دەکرێت، بەڵام تایبەتە بە دروستکردنو هەڵگرتنی دۆ چ بۆ خوارنەوەی رۆژانە بێت یا بۆ هەڵگرتنی بۆ ئامادە کردنی دۆینە (ترخێنە)، شایەنی وتنە دۆ بۆ پێوە خواردنی نانیش بەکاردێتو تاکو هەنووکەش پێی دەوترێت (نان ودۆ)و تامو چێژێکی تایبەتی هەیە.

**٣. هیزە:**

ئەم دەفرەش لە پێستی بەرخو کاوڕ ئامادە دەکرێت واتە گیان لەبەرە سپییەکان لە پاش خۆشەکردنی وەك مەشکە، بەڵام کۆمەڵگەی کوردیو تەنانەت عەرەبیش بۆ هەڵگرتنی رۆن بەکاریان دەهێنا، شایەنی وتنە ئەو رۆنە پاشەکەوتکراوەیان بۆ خواردنی خۆیان بەکار دەهێناو زیادەکەشیان بۆ فرۆشتن دەبردە بازارو رەواجێکی باشی هەبوو، مەخابن لەم سەردەمەدا خەڵکی کەمتر بە کاری دێنن بە هۆی دەوڵەمەندییەوە بە کۆڵسترۆڵ.

**٤. هیزەدان:**

ئەمەش لە شێوەی سەندوقێکی بچووکی ٢/١ ×٣/٤ مەترو بەرزییەکەشی بە قولەکانییەوە هەر ٣/٤ مەتر دەبێتو لە ماڵێك بۆ ماڵێکی تر جیاوازی دەبێت بە پێی بەرهەمەکانیانو لە قوڕ دروستیان دەکردو تا بڵێی جوانو خۆشەویست بوو وەك ئاوەرۆکەکەی.

**٥. سێپا:**

پێکهاتووە لە سێ لاقی دارینو لە سەرەوەیدا بە کورتە گوریسێك بە یەکەوەیان دەبەستەوە، پاشان مەشکەیان لە ناوەراستییەوە پێوە هەڵدەواسی بە مەبەستی ژەنینی ماستەکەیان لە پاش ئەوەی برێ ئاویان تێدەکرد بە پێی قەبارەی ماستەکەو دەستیان دەکرد بە ژەنینی (واتە، پاڵنانو راکێشانی دەسەخوردی مەشکەکەو شڵقاندنی ماستاوەکەی ئاوی) تاکو کەرێکەی لە دۆکەی جیا دەبووەوە، دوای ئەوە کەرێ بۆ کەرێدانو دۆش بۆ مەشکە دەگوازرایەوە.

**٦. کونەلان:**

داهێنانێکی کوردی ئاواییو گوند نشینەکانەو بریتیە لە دوو لادیواری بەرانبەر بە یەكو سەربانەکەشی بە دارو قامیش یان قەرەمو گژو گیا دەگرتنو بە قوڕ سواقیان دەدا، ماوەی نێوان ئەو دوو لادیوارە بە مەترو نیوێك بۆ دوو مەتر دەخەملێنمو بەرزییەکەشی دوو مەترێك، لە ناوەراستی هەردوو لادیوارەکەشدا بەدارو دەوەن لە شێوەی سەربانەکەی دروستیان دەکردو قورسایەکەشی دەکەوتە سەر ئەو دوو لادیوارە کە مەشکەو کونەیان لەسەری دادەناو ئاوو دۆکەشی بە جوانی سارد دەبوو.

**٧. کەنوو:**

لە شێوەی دۆڵابییەکچاوی ئاساییە بەڵام لە قوڕ دروستیان دەکردو لەسەر چوار لاقی قورین دەوەستا کە هەر لە قوڕ بوون بۆ ئەوەی لەزەوی دابیرێت، بە خوارەوەی بەردەمییەوە کونێکی بازنەیی جوانیان لێدەکردەوە بە جۆرێك مشتی مرۆڤ بکێشێت بە مەبەستی ئەوەی بە ئاسانی لەو ئاردەی کراوەتە ناوی دەربهێننو ئاردەکەش بە پاکی دەپارێزراو شوێنەکەشی فێنکترە لەوەی لەدەرەوەیدا بێت.

**٨. دێزە:**

ئەمەش دەفرێکی قورینی سوورکراوەیەو لە شێوەی قازانە، بۆ کوڵاندنی پاقلەو نۆكو دانەوێڵە بەکاریان دەهێنا بە تایبەتی لە پاش نانکردن دەخرایە ناو تەنوورەوە بەم کردەوەیەش سوودیان لە پاشماوەی ئاگری سوورکردنەوەی تەنور وەردەگرتو بە فیڕۆیان نەئەدا.

**٩. دەسەخورد:**

بریتیە لە پارچە دارێکی لووسکراو لەنێوان هەردوو

قاچ و هەردوو دەستی مەشکەکەدا دەیانبەستەوەو لە کاتی ژەنینشدا لە لای دەمەکەیەوە دەیانگرت و کرداری ژەنینیان ئەنجامدەدا کە بریتیە لە پاڵنان و راکێشانی مەشکەکە.

١٠. **کوپ:**

دەفرێکی قورینی سوورەوەکراوە، بۆ هەڵگرتن و ساردکردنی ئاوی خواردنەوە بەکاردەهێنرێت و لە سەر ژێرەکوپێکی دارین یان ئاسنین دادەنرێت و لە ئاوەکە تك تك دەدەڵێنێت و دەبێتە هۆی ساردکردنی ئاوی ناو کوپەکە، شایەنی ووتنە تاکو ئێستاش لە هەندێ شوێنی بێ کارەبا بەکاری دەهێنن، بەڵام لە پاش چەند ساڵێك لە ساردکردن دەکەوێت و پێی دەوترێت (کەرخ) بووە واتە ئاو نادەڵێنێ.

١١. **جەرە:**

ئەمیش دەفرێکی قورینی سوورەوەکراوە لە خوارەوەی زۆر تەسککراوەتەوەو لە سەرەوەشیدا ملێکی باریکی لە قور بۆ کراوەو دوو قولفی قورینی پێوە لکێنراوە، سوودیان لێوەردەگیرێ بۆ گواستنەوەی ئاو کە لە چەم یان کانی دەیانهێنا بۆ پێداویستی رۆژانەیان.

١٢. **شەربە:**

ئامرازێکی قورینی سوورەوەکراوە قەبارەکەشی لە جەرە بچووکترەو لە لای ملەکەیەوە قەڵفێکی قورینی پێوە لکاوە زیاتر بۆ ساردکردنی ئاوی خوارنەوە بەکار دەهێنراو شەوانی هاوینیش لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردە سەربانەکان، تەنانەت پەرداخی قورینی سوورەوەکراویش هەبوو شایەنی ووتنە شەربە بە زۆری لە شارەکاندا بەکاردەهێنرا.

١٣. **گۆزە:**

دەفرێکی قورینی سوورەوەکراوە لە شێوەی مەسینە دروست کراوەو قولفێك لەسەر ملەکەی چەسپاوە بۆ بە ئاسانی هەڵگرتن و بەکارهێنانی لەدەست شوشتن و سەرئاو و دەستنوێژ گرتندا، مێژووی ئەم داهێنانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بابلی و میتانی و فیرعەونییەکان، کاتێك هەردوو بابلی و میتانی دەستیان کرد بە کرینی شەربەی کۆنی کەرخ لە وولاتی میسری فیرعەونی بە نرخی نوێ کە ببوە جێی سەرسورمانیان، پاشان دەرکەوت بۆ هەڵگرتنی ئاویان بووە لە کاتی جەنگی نێوان هەردوو لایان و لە بیاباندا پڕیان لە ئاو کردووە بۆ سەربازەکانیان لە کاتی دوور ئاوی لە بیاباندا.

١٤. **جەوەنە:**

دەفرێکە بۆ هەڵگرتنی ئاوی خواردنەوە بەکار دەهات لە پێستی کار دروستیان دەکردو قەبارەکەشی بچووکەو بەکەڵکی رۆژانەی تاکە کەسێك دێت، ئەمیش قولفێکی بۆ دەکرا بە مەبەستی ئاسانکاری لە هەڵگرتنیدا.

١٥. **کوتەك:**

رەنگە زۆر نامۆ نەبێت، ئەمیش داردەستێکی ئاساییە بەڵام سەرێکی خڕەو گەورەترە لە باسکەکەی، زیاتر بۆ خۆپاراستنی مرۆڤ لە گیانلەبەرە دڕندەکان و ناحەزان وەك چەکێك بۆ بەرگریکردن لە خودبەکار دەهێنرا.

١٦. **گەلاکوتکێ:**

بریتییە لە پارچە دارێکی ئاسایی ئەستوور لایەکی پانەو ئەو لاکەشی پڕمشتی مرۆڤە بۆ کوتانی دانەوێڵە وجلوبەرگ شوشتن لەسەرئاوو هەندێ کاری دیکەی تر بەکاریان دەهێنا کە لە باتی سابوون چۆغانیان بەکاردەهینا.

١٧. **سەکۆ:**

ئەو سەردەمە باوبوو لە زۆر شوێن لە ناو حەوشەدا دروست دەکرا بۆ لەسەری نووستن یان دانیشتن کە سوودی پاراستنی هەبوو لە مێرووو خشۆکە زیانبەخشەکان و بەرزییەکەشی بە سێچارەکە مەتر دەخەملێنرێت.

١٨. **گەوڕ:**

شوێنێکی تەرخانکراوی تایبەتە بۆ دابرانی بەرخ و کار لەدایکەکانیان لە کاتی لە ماڵەوە بوونیاندا.

١٩. **ئالك - ئالیك:**

بەو بەشە خۆراکە دانەوێڵەیە دەوترێت بە ئاژەڵان دەدرا بە تایبەتی جۆ، وەك ئەسپ و ماین و هێستر وتاد.

٢٠. **بەلامك:**

بریتیە لە چڵە دارێکی باریکی جوان تاشراو درێژییەکەی شەش حەوت سەنتیمەترێك دەبێت و لە هەردوو لایەوە لەلەیان دەکردو بە بەنێکی نیمچە ئەستوور بە توندی لە پشت سەریەوە دەیانبەست، بۆ ئەوەی لە کاتی تێکەڵکردنی ئەو بەرخ و کارانە لە گەڵ دایکەکانیاندا نەتوانن بیانمژن.

*** ناوی هەندێ زاراوەی هەمەجۆری دیکەی کۆمەڵگەی کوردەواری کە مەترسی فەوتانیان لێدەکرێت:**

١. **گوێزەوانە:**

بەو چاخواردنەوە بە کۆمەڵە دەوترا کە بە بۆنەی تازە لەدایکبوونی منداڵێکی خێزانەوە، هاوسێ و خزم ناسیاوە نزیکەکانی بۆ بانگ دەکرا وەك نیشانەیەکی دەربڕینی خۆشی و پاوپێ بەخێرهاتنی ئەو منداڵە.

٢. **مەتۆلکە:**

بەو منداڵە کۆرپەیە دەوترا کە تەمەنی زۆر کەم بوایەو لە چەند رۆژو مانگێك تێپەڕی نەکردایە.

٣. **کورتان:**

واتە پاڵان کە تایبەت دروست دەکرا بۆ خستنە سەر پشتی گوێدرێژو هێستر بە مەبەستی خۆشکردنی بۆ دانیشتن یان بارکردنی ئەو وڵاخە بە جۆرێك ئازاری پێنەگەیەنێت.

٤. **گوریس:**

ئامرازێکە بۆ بەستن و شەتەکدانی باری سەر وڵاخ بەکاردەهێنرا یان بۆ بەستنەوەیان، گوریس گەلێك شێوەی هەیە جۆرێکیان ئەستوورترەو زیاتر لە بەنی موو یان مووی تێکەڵکراو بە خوری دەیانهۆنییەوە.

٥. **کشوو:**

لە شێوەی گوریس و هەمان کەرەستەکەیەتی بەڵام خڕ نییە وەك گوریس بەڵکو لەسەر پانی پێنج شەش سەنتیمەترێك دەیانچنی و جیاوازییەکەی لە گوریس ئەوەیە زوو ناخزێت و ئازارو پاڵەپەستۆی کەمتر دەبوو، کشووش زیاتر بارهەڵگرەکان (حەماڵەکان) بەکاریان دەهێنا لە پێش دۆزینەوەی عارەبانە.

٦. **هۆر:**

دەفرێکی دووتای چنێنراوە لە بەنی مووی تێکەڵکراو

به خوری، هەر تایەکی لە شێوەی گونیەیەکی ئەم سەردەمە دەچێت و لە پاش پڕکردنی هەردوو تاکەی لە دانەوێڵە هەردوو دەمەکەیان بە جوانی دەدووریيەوەو بە دوو کەس دەیانخستە سەر پشتی گوێدرێژ یان هێسترو هەندێ جاریش گا لە کاتی پێویستداو دەیانگواستەوە بۆ شوێنی مەبەست.

**٧. هەگبە:**

ئەم دەفرەش هەر لە بەن دەچنراو لە شێوەی هۆڕە بەڵام لە هۆڕ بچووکترەو دەمی هەردوو تاکەشی کراوەیەو ڕوو لە سەرەوەیەو پێویست بە دووران ناکات، بۆ هەندێ کاری سووك بە کار دەهێنرێت.

**٨. سروت:**

بە ساقەتی گەنم یان جۆ دەوترێت جگە لە گوڵەکەی واتە ئەو بە بەشەی لە درەختی گەنم و جۆو چەڵتووك کە لەنێوان گوڵ و ڕیشۆکەیدایەو کایشی لێ ئامادە دەکرێت.

*** زەنگ:**[١]

لەم بابەتەدا تەنیا دەربارەی (زەنگ) دەدوێین بۆ ئەوەی بزانین ئەم ئامرازە سادەو ساویلکە بچووکە لە کوردەواریدا چ سوودێکیان لێ بینیوەو بۆچی بەکاریان هێناوە..؟

هەروەها ئەو نەریتانە چین کە لە دەورووبەری زەنگدا دەخولێنەوە.؟

زەنگ[٢] ئامرازێکی دەستکردی فۆلکلۆری دێر زەمانە، لە کانزای زەرد (توج) یا ئاسنی (ئاهین) دروست دەکرێت، دەمی والآیەو پارچە ئاسنێکی بچووکی تێدایە لەکاتی جمو جوولْ و هەژانندا دەنگی لێوە دێت، زەردەکەیان باشترین جۆریەتی و دەنگیشی لەوانی دیکە خۆشترەو چاکتر دەزرنگێتەوە، پیشەوەری تایبەتی خۆی هەیە پێی دەڵێن (تۆکمەچی).

برا کوردە فەیلییەکانمان لەم پیشەیەدا دەستێکی باڵایان هەیە، لە عێراقدا لە شارەکانی بەغداو کەربەلاو مووسەڵدا گەلێ پیشەسازی دەسترەنگین هەن زەنگڵەی جۆراو جۆر دروست دەکەن، لە سەرانسەری کوردستان و عێراقدا بە هۆی پەتێك یان زنجیرێك دەخرێتە ملی ئاژەڵەوە وەکو بەران و مەرو بزن و هێستر گوێدرێژ بەتایبەتی ئەو ئاژەڵەی کە (پێشەنگ)بێ بۆ ئەوەی لە نێو لەوەرگا و رێگا و باندا هەمیشە بزرنگێتەوە، تا مارو جانەوەری دڕندە لە دەنگی بترسن و لێیان دوور بکەونەوە تا زەرەو زیانیان پێ نەگەیەنێت، یان بەشەوان گورگ یان هەر گیاندارێکی دڕندە بەرەو لای پەسەکان بروات خاوەن مێگەلەکە، یان: شوانەکە خەوتبێت بە رەمینەوەی مێگەلەکەو بە دەنگی زەنگۆڵەکان بەئاگا بێت و لەزیان بیانپارێزێت، یان شەوان ئەو ئاژەڵانە لە شوانەکەیان ون بن بەهۆی دەنگی ئەو زەنگانەوە دەیاندۆزێتەوە، هەروەها بۆ جوانیش بە کاری دێنن، دەنگیشی بەلای خەڵکییەوە خۆشە، ئەوەی لە دوورەوە گێی لێ بێ هەست بە ئارامی و ئاسایش و ئاوەدانی دەکات، دەڵێن: پەس زۆر حەزی لە دەنگی موزیکە بۆیە کورد وتویەتی: (مەڕ، چوار چاوی هەبوو، دوانیان بۆ شمشاڵ کوێر بووە)![٣].

جا دەنگی ئەم زەنگڵەیە کە لەملیایە هەمیشە لە گوێیدا وەکو موزیك دەزرنگێتەوە، بەمە ئەو ئاژەڵە و تێکرای مێگەلەکە هێور دەبنەوەو بە ئارەزووی خۆیان دەلەوەڕێن و قەڵەوو شیرشیان زۆر دەبێت، لە کوردەواریدا باوەڕیان وایە مارو مۆری و گورگ کە دوژمنی مرۆڤ و ئاژەڵن لە دەنگی زەنگڵە دەسەڵمێنەوەو نارەحەت دەبن، بۆیە شاعیری نەمر مەلای جەباری وتویەتی:

(چوین شەماڵەی شەم، گرگرانمەن[٤]
چوین پاس ماران (زەنگ) زرانمەن)
(هانامەن یەکێ، مار تۆ گەستەن
تەروالم نەدوور، ئاوایی بەستەن)

جۆرە زەنگێك هەن خرو بچووکن، گەورەکەی ئەوەندەی گوێزێکە، بۆ جوانی و دژی مارو مۆری و جانەوەری دڕندە دەیبەستن بەقەد سەر کەللە و جلەوو رەشمەی ئەسپ و ماین و هێسترو گوێدرێژەوە، یان کاتی کاروان و کۆچ و باردا دەیکەن بە ملیەوە بەتایبەتی وەکو ئاماژەمان پێدا دەکرێ بە ملی (پێشەنگ)ەوە، ئەم پێشەنگە بە زۆری بار ناکرێ، زەنگێکی دیکەیش لەوانە گەورەتر دەکەن بە ملیەوەو پێی دەڵێن: (بۆڵ)، یان: (قرقرە) جا ترپەی سمی وڵاخ و زرەی زەنگڵە و دەنگی خورین و حەچە حەچەی کاروانچی و جریوەو جووك و جاکی پەلەوەرە کێوییەکان تێکەڵ بەیەك دەبن و دەبێتە ئاوازێکی دلگیرو خۆش، ئیتر ئەو کاروانچییە هەست بە ماندوێتی و شەکەتی ناکات و وڵاخەکانیش لەسەر نەغمەی ئەو ئاوازە بەخێرای دەڕۆن تا دەگەنە مەنزل.

جاران زەنگڵەیەکی زلیان (زەنگڵە قۆری) دەبەستەوە ملی ئەو بارگیرەوە کە بە دەوری (ناعوور)ی ئاودا دەسوورا، زۆر جار خاوەنەکەی خەریکی ئاودێری و ئیش و کاری خۆی دەبوو، ئەمە بۆ ئەوە بوو تا لە راوەستانی وڵاخەکە ئاگاداری بکاتەوە، کەزەنگڵەکە بێ دەنگ بوایە هەر لەشوێنی خۆیەوە لە بارگیرەکەی دەخوڕی و ئەویش لە ڕۆشتنی بەردەوام دەبوو.

زووتر تا شەستەکانی سەدەی رابردوو قایچییەکان لەشارەکاندا بەهۆی برێ گوێدرێژی سپییەوە قایەو بەردو گەچیان لە کارگەوە بۆ سەر ئیش دەگوێزایەوە، جا هەر گوێدرێژێك زەنگۆڵەیەکی گەورەیان لەمل دەکرد، ئەم زەنگە (زەنگڵە قۆری)و (گەرنال)و (سنج)یشی پێ دەوترێ، ئەمە جگە لەوەی هەندێ وردە زەنگڵەشیان بەستووە بە سەرکەللەی رەشمەکانیانەوە، بۆ ئەوەی لە رێگاو سەرشەقامەکانی ناو بازاردا خەڵکی بەبیستنی زرەی زەنگڵەکان بەئاگابێن و خۆیان لێ لادەن، واتە بۆ ئاگادار کردنەوە بەکاریان هێناوە، چۆن ئۆتۆمبیل و ماتۆر هۆڕینی هەیە، یان ئەسپە چۆنیە (پاسکیل) زەنگی هەیەو بۆ ئاگادار کردنەوە بەکاردێ، ئەو زەنگلانەش بۆ هەمان مەبەست بووە، جا ئەو کەرانە هەر چەندە بە خێرایی دەڕۆین زەنگڵەکانی ملیان زیاتر دەزرایەوە، ئەم دیمەنە بەزمو رەزمێك بوو بۆ خۆی، کە ئۆتۆمبیل داهات و لە شارەکاندا زۆر بووەوە خەڵکی کەرەستەی بیناسازی بە ئۆتۆمبیل دەگوێزنەوە، ئەو دیمەنەش لە شارەکاندا بن بڕ بوو، کەری سپییاتیش بۆ ئەوە هەڵدەبژێرا تا لەگەڵ رەنگی گەچەکەدا بگونجێ و پێوەی دیار نەبێ.

ئەم کەرانەیش دوو جۆرن (بەغدادی)و (حەسساوی) هەردوو جۆرەکەیان بەرزو کۆکن، بەڵام دووەمیان رەنگی هەندێ بۆرە، لە کەری ئاسایش زیرەك ترو وریاترن.

هەروەها ژنانی کورد لە گوندو لادێکاندا بگرە لە شارەکانیشدا وردە زەنگڵەیان دەکرد بە ملو بە قەد بێشکەو جۆلانەی منداڵەوە، جا لەکاتی ڕاژاندنی لانکەکە منداڵەکە لەسەر ترپە ترپی بێچکەی بێشکەکەو ئەو زەنگلانەو ئاوازی لایە لایە بەسۆزەکەی دایکی بە زوویی خەوی لێ دەکەوێت، ئەگەر بەخەبەریش بوایەوە بۆ خۆی لەگەڵ ئەو زەنگانەدا یاری دەکرد تەنانەت جۆرە بازنۆ خرخاڵ و پاوەنە هەن پڕ قەدیان لە وردە زەنگڵە دەکەن، دەیکەن بە باسك پێی منداڵانی ساواوە، ئەمە هەم بۆ جوانییە هەم بۆ ئەویشە ئەگەر هات و ئەو منداڵە گوندنیشنە ڕۆیشتە دەرەوەو هەر مارو مێروویەك

لە پێشیدا خەوتووبێ لە دەنگی زەنگڵەکان بەخەبەر بێو هەڵبێن، منداڵەکەش لە زیان بە دوور بێ هەروەها جاران باوەڕی کورد وابووە گوایە ئەهریمەنو جنۆکە لە زرەی زەنگ دەترسن، بۆیە بۆ منداڵ بەکاریان هێناوە تا لە شەڕیان بپارێزێن، بە سروشت منداڵ حەزی لە جموجووڵی زۆرە، جا هەر چەندە بجووڵێ ئەو زەنگڵانە دەزەنگێنەوە ئەویش ئەو دەنگەی بە لاوە خۆشەو زیاتر هەستی دەبزوێنێ بۆ جووڵانەوەو ڕۆشتن، وەکو زانراوە منداڵ هەر چەندە بجووڵێو هەڵسو کەوت بکات گورجو گۆڵو تووندو تۆڵ دەبێو لە نەخۆشیش دەپارێزرێو بەزوویش پێ دەگرێت، زووتر خەڵکی زەنگڵەیان دژ بە شەوە (ئەهریمەن) دەبەستە پەتێکەوەو شەو تا بەیانی لە زەنگیان دەداو ئێشکیان بۆ ئەو ژنە دەگرت کە تازە منداڵی بووبێت، بۆ ئەوەی (شەوە) یان: (ئەهریمەن)و جنۆکەی شەڕخواز توخنی ئەو ژنەو منداڵە نەکەون نەك زەفەریان پێ بەرنو منداڵەکە بخنکێنن، دەڵێن: گوایە (شەوە)، لەدەنگی زەنگ دەترسێت.

لە کوردەواریدا لەکاتی ئەنجامدانی نەریتی بووکە بەبارانە کە لە ساڵی کەم بارانیدا دەکرێ، زەنگڵەیەکی گەورە (سنج) یان: (زەنگڵە قۆری) دەکەن بە ملییەکێکەوە، ئەویش لەناو شاراندا کە بە ماڵانا دەگەڕێن هەر هەڵدەبەزێتەوە بۆ ئەوەی زەنگڵەکەی ملی زیاتر بزرێتەوە، تا کۆتایی بە نەریتەکە دێ، ئەمەش هەر بۆ ئاگادار کردنەوەیە تا خەڵکی گوێیان لەو زەنگە بێو بێنە پێشوازی ئەو جەماوەرەی کە لە نەریتەکە بەشدارن.

جاران لە قوتابخانەکاندا پارچە ئاسنێکی گەورەیان هەڵدەواسیو بە پارچە ئاسنێکی بچووکیش لێیان دەدا وەکو زەنگی گەورە دەنگی لێوە دەهات، ئەمە بۆ ئەوە بوو تا قوتابییەکان بۆ خوێندن بچنە ژوورەوەی پۆلا لە کۆتایی وانە وتنەوەشدا بۆ پشوودان هەمیسان لێدەدرا، واتە: بۆ ئاگاداری بەکار هێنراوەو ئێستاش لەم ڕۆژگارەدا زەنگی کارەبایی بۆ هەمان مەبەست بەکار دێنن، لەکەنیسەکانیشدا جمخار (زەنگ)یان داناوە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن: (ناقوس)، لەکاتی نوێژ کردنو خودا پەرستیدا لەجیاتی بانگدان بۆ ئاگادار کرنەوەی خەڵکی لەو زەنگە دەدەن، چونکە زووتر دەمژمێر نەبوو تا خەڵکی وەکو ئەم سەردەمە بە ئاسانی لەکاتی نوێژ بزانن، بۆیە دەوڵەتە پێشکەوتوەکان دەمژمێری زەنگداریان دروست کردووە بەتایبەتی وەکو دەمژمێرەکەی بیگن لە لەندەن.

هەروەها لەم ڕۆژگارەی ئەم سەردەمەدا لە زۆربەی زۆری ماڵانو فەرمانگەکانیشدا زەنگ هەیە وەکو هەموومان دەزانین ئەمەیش هەر بۆ ئاگادار بوونەوەیە، تەنانەت ئامێری تەلەفۆنیش زەنگیان بۆ ئامادە کردووە. هەروەها بە دەیان ئامێری پێشکەوتوو لە زەنگ بێبەش نەکراوە.

لە شیعری فۆلکلۆریو شاعیرانیشدا ناوی زەنگ دەبینرێت لەوانە:

سواران سوار بێ، قەتار شان بەستە[5]
یاوان وە ماوای (وەلی)[6] مار گەستە
(زەنگۆڵە) زریا وە تەرواڵەوە
من ڕۆح سپەردم وەلای پاڵەوە
**
(مەشکەم مەشکا مانگا قوڵە[7]
دەنگی دەڕوا وەك زەنگۆڵە)
**
لەیلم لەو کەیفە بۆ من ئەگەرێ[8]
مێخەکبەنەکەی وەك (زەنگ) ئەزرێ
**
لایە لایەمن، لەئێوارەوە[9]
زرەی (زەنگ) مەیۆ وە گافارەوە[10]
**
(زەنگۆڵە)و مەنگۆڵە دارەکەم[11]
لە سلێمانی بار ئەکەم
ئەچم بۆ لای یارەکەم
**
یارم ماڵ وەماڵ بۆ من ئەگەرێ[12]
کڵاو زەرەکەی وەك (زەنگ) ئەزرێ
**

- لەگۆرانی فۆلکلۆری منداڵانیشدا ناوی هاتووە:

حاجی لەقلەق مار هات[13]
ماری (زەنگۆڵدار) هات
**

- لە مەتەڵی فۆلکلۆریشدا ناوی دەبینرێت:

تانجی زەردە (زەنگڵە) لەگوێ[14]
چەرخە ئەکا لەدەوری دێ. (زەردەواڵە)
**

- گیایەکیش هەیە بەناوی (زەنگۆڵە بنجك)،[15]
- لەهەندێ شوێنو ناوچەدا بە (چەمەر)ی شەخرە دەڵێن: (زەنگۆڵە).
- لەبەرهەمی ڕەوانبێژیشدا ناوی زەنگ هاتووە لەوانە:

زەنگ قۆر:[16] بەدەنگی کۆمەڵە زەنگڵەیەکی بەرز دەوترێت بە ئاپۆرە (قەرەباڵغ)یش دەوترێت: (گەلە زەنگ).

بەرهەمی شاعیران:

- مەولەوی نەمر (١٨٠٧- ١٨٨٢ز) دەفەرمێ:

قافڵە کۆچ کەردەن، بەرزەن دەنگ (زەنگ)،[17]
وران حوجرەی خان وجوود سەنگ بەسەنگ
**
یان: چون شەماڵەی نوور گرگرانمە[18]
پەی پاس ماران (زەنگ) زرانمە.
**
یان: سیلسیلەی پێچ پێچ زوڵف نازاران[19]
(زەنگڵە) بەستەوە چە دانەی زاران
**

- شاعیر مەلای جەباری (١٨٠٦- ١٨٧٦ی ز) ناوی زەنگڵەی هێناوەو دەڵێ:

وەی زروی گەوهەر شیرین گوارەوە[20]
وەی (زەنگۆڵە)ی زەڕ پای قەتارەوە
**

- شاعیر شێخ نەجمەدین سابیری (١٨٨١- ١٩٤٤ی ز) وتویەتی:

نەگییە دامەنی حوسنی هەناسەی (سابری) یاران[٢١]
لە دنیادا بەد ناوی کە من (زەنگ)م زڕا چیبکەم
**

- شاعیر خەلیل منەووەری کاکەییش (١٨٧٨- ١٩٢٣ی ز) فەرموویەتی:

زڕەی (زەنگ) زەرد بارخانەی ئەرزاق[٢٢]
مەیاوا بە گۆشی بێستوون ڕواق[٢٣]
**

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- لە گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە (١٥٣)، لە ساڵی (٢٠٠١)دا بڵاوکراوەتەوە.
هەورەها لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە (١٨)ی ساڵی (٢٠٠٦) بڵاوبووەتەوە.
٢- زەنگ: زەنگۆڵەو زەنگوڵ و بوڵ و زریلەو سنج و زیلیشی پێدەوترێت.
٣- پەندی پێشینانی کورد، عەلی مەعرووف شارەزووری، بەرگییەکەم، ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری لاوان، ناوچەی ئۆتۆنۆمی، چابخانەی (الحوادث)، بەغدا، (١٩٨١)، لاپەڕە ٩٦.
٤- دیوانی مەلا فەتاحی جەباری، هەردەوێڵ کاکەیی، چاپخانەی شیڤان، سلێمانی، (٢٠٠٥)، لاپەڕە ٢٩.
٥- هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگییەکەم، هەردەوێڵ کاکەیی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، (١٩٨٥)، لاپەڕە ١٠٨.
٦- وەلی: کوڕی یوسف سلێمان کاکەییە، بە وەلی مارانگاز ناسراوە، لەسەدەی حەڤدەهەمی زاینی ژیاوە، برایەکیشی هەبووە بە ناوی عەلی.
٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەردەوێڵ کاکەیی، لاپەڕە ٤٠.
٨- چەند مەلۆیەك لە شارای فۆلکلۆری کوردی، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، (١٩٨٦)، لاپەڕە ١٩٣.
٩- پوریّ سەعدیە عەلی مەلا وەهاب کاکەیی (١٩٣٥- ٢٠١١) کەرکوك.
١٠- گافارە: بیشکە، جۆلانە.
١١- هەمان سەرچاوە، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، لاپەڕە ١٤٤.
١٢- مەقامزان خەزعەل مارف کاکەیی (١٩٣٦- ) داقوق، خۆرز.
١٣- دەستنووسی هەردەوێڵ کاکەیی.
١٤. دەستنووسی هەردەوێڵ کاکەیی.
١٥- زەنگۆڵە بنجك: ڕووەکێکی بەهارەی خۆرسکیە، لە ڕووەکی یاوشان دەچێت، ڕەنگی گەڵاکەی سپی ئاماڵ شەکەرییە.
١٦- ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، جەلال مەحموود عەلی ، دەزگای ڕۆشنبیرو بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی حوسام، بەغدا، (١٩٨٢)، لاپەڕە ٢٩٣.
١٧- دیوانی مەولەوی، چاپی سێیەم، بڵاوکەرەوەی کوردستان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، سنە، (٢٠٠٥)، لاپەڕە ٣٠٥.
١٨- هەمان سەرچاوە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لاپەڕە ٢٠٣.
١٩- هەمان سەرچاوە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لاپەڕە ١٨٢.
٢٠- هەمان سەرچاوە، مەلا فەتاحی جەباری، لاپەڕە ٤٩.
٢١- دیوانی سابیری، شێخ عەبدولڕەحمان شێخ نەجمەدین سابیری، چاپخانەی شارەوانی کەرکوك، (١٩٦٩)، لاپەڕە ١٢٩.
٢٢- دیوانی خەلیل منەوەری کاکەیی، هەردەوێڵ کاکەیی، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، (٢٠٠٦)، لاپەڕە ٣٧١.
٢٣- ڕواق: کینایەیە بۆ ئاسمان.

*** زین دروو:**

**زین دروو بە پیشەیەکی فۆلکلۆری دێر زەمان دەژمێردرێت، تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر، کەم کەس هەیە لە کەرکوكو دەوروبەریدا گوێی لە ناوی شادڕەوان حەسیب قادری زین دروو (سەڕاج) نەبووبێت کە دوکانەکەی لە بازاڕی جووت قاوەدا بوو، کارو بەرهەمەکانی ئەو پیشەوەرە ئەمەندە پاكو ڕختە بوون، بۆیە نەك لە کەرکوكو دەوروبەریدا، بەڵکو لە شارەکانی دیکەی ئێراقەوە روویان تێدەکردو شتیان لێدەکڕی بە تایبەتی لە سلێمانیو هەولێرەوە، ئامرازو کەرەستەکانی زین دروو ئەمانەن: (چەرمی گاو مانگاو گوێرەکەو مەڕو بزن، مەکینەی دروومان، چرێشی ئارد، دەزووی نایلۆن، قۆپچەو دوگمەی جۆراو جۆر، مێن) پیشەوەرەکە بە زۆری بە پێوە لەسەر مێزەکە کار دەکات بۆ ئەوەی باشتر قۆڵایی بێو بەسەر کارەکەیدا زاڵ بێت.**
**ئەو بەرهەمانەی ئەم پیشەوەرە ئامادەی دەکات ئەمانەن: (زین، سینە بەندی ئەسپ، کەرەستەی جلەو، کیفی دەمانچە، فیشەکدان-ڕخت، قەمچی، جەلە-کۆپەڵان، جانتای جۆراوجۆر)، جا زینو سینەبەندەکەیان بەشێوەیەکی زۆر جوانو قەشەنگ دەڕازاندەوە، زووتر تا ئاخوڕو ئۆخری پەنجاکانی سەدەی پێشوو زین دوورەکان بە هاوینان کەرەستەکانیان دەپێچایەوەو بۆ ماوەی دوو مانگی ڕەبەق بە گوندو لادێکاندا دەسووڕانەوە، جا هەر کەسێك شتی خراپی هەبووبێ کە لە بناخەدا پیشەی ئەوان بووبێ بۆیان چاك دەکەنەوە.**
**ئەم پیشەیەیش وەکو دەیان پیشەی دیکەی باوو باپیرانمان بەرەبەرە وا خەریکە بەرەو نەمان دەچێت، پیشەوەرەکان لەم ڕۆژگارەدا بەرهەمە کۆنەکان دروست ناکەن، چونکە لە بازاڕدا ڕەواجیان نەماو کەوتنە خانەی نەمانەوە، تەنها ئەو شتانە ئامادە دەکەن کە خەڵکی لەم سەردەمەدا پێوستییان پێی هەیە.**
**جگە لە شادڕەوان (حەسیب قادر) ئەم پیشەوەرانەش خەڵکی کەرکوکن.**
**١. ڕەفیق حسیب قادر (١٩٤١- ).**
**٢. عەبدولناسر حەسیب قادر (١٩٥٨- ).**
**٣. عەبدولخالق حەسیب قادر (١٩٥٣- ).**
**٤. عەبدولغەنی حەسیب قادر (١٩٥٦- ).**
**٥. حاجی ئەحمەد حوسێن مەجید (١٩٣٢- ).**
**٦. عەبدوڵڵا سەمین حوسێن (١٩٢٨- ١٩٧٠) ـە پاش خۆی (نەجم)ی کوڕی بۆ ماوەیەك لەو پیشەیەدا ـاری کرد، دواتر دەستی لێ هەڵگرت.**
**٧. شادڕەوان (وەستا جوێدی سەڕاج).**
**٨. شادڕەوان (وەستا ئەمینی سەڕاج).**
**٩. وەستا ئیسماعیل مەجید و محەمەدی برای.**
**١٠. وەستا نووری عەلیو عەزیزی برای.**

*** شیرو شیربازی:**[١]

شیر، شمشێرو، شوورشی پێدەڵێن، جۆرە تیخێکی فۆلکلۆری زۆر کۆنی درێژە، لە جۆرە ئاسنێکی پۆڵای زۆر چاكو نایاب دروست دەکرێت، پیشەی (شیرگەر) ەکانە[٢]، درێژییەکەی نزیکەی مەترێکە، یان هەندێ زیاتر، مەیلەو کەوانە، مشتوەکەشی لە شاخی گامێشو بزنە کێوی دروست دەکرێت، چونکە شاخی ئەم دوو ئاژەڵە بە پێچەوانەی ئاژەڵەکانی دیکەوە بتەوە، لە هەردوو لای مشتوەکەیشییەوە دوو زمانەی بۆ دەرکراوە کە لە ئاسن ئامادە کراون، کێلانەکەشی لە دوو تەختە داری تەنك پێك هاتووە بە چەرمی خۆشە کراو بە جوانی پێچراوەتەوە، ئەمەش چەشنی خەنجەر جۆریان زۆرە وەکو (دەبان)، (کالمە)، (شینە تیخ)، (دەمەسان)، چاکترینیان دەبانە کە ئەمیش دەبێتە چەند جۆرێکەوە (کرمان، خوراسان، لابر (لاهور)، شیراز، شام، قەزبین)، ئەمانەو شینەتیخ لە جۆرە ئاسنێکی پۆڵای زۆر نایابو بەنرخ دروست دەکرێن، جۆری کرمانیان لە هەموویان چاکترو بەهادار ترە، لە کوردەوارییدا هەر بەمەیانە دەڵێن (دەبان)، ناوە ناوە هەر لەنێوان سێ و چوار ساڵ جارێك هەر وەکو خەنجەر پێوستی بە مشتومالکردن دەبێت، جا بۆ ئەم مەبەستە دەیبەنە لای (شیرگەر)، کاکی پیشەساز بە هۆی زاخاوەوە[٣] بە جوانی لە ژەنگو لەککە پاكو خاوێنی دەکاتەوەو دەمەکەیشی دەمەزەرد دەکات واتە تیژی دەکات، پیشەساز خوالێخۆشبوو شیرگەر سابیر خدر کە دانیشتووی شاری (کەرکوك) بوو، لە پیشەی دروست کردنی شیرو خەنجەردا دەستێکی باڵای هەبوو لەم چەند ساڵەی رابردوودا لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا کۆچی دوای کرد. هەروەها شیرگەر (موفەق تەحسین)یش لەم پیشەیەدا کار دەکاتو تا رادەیەك شارەزایی لێ پەیدا کردووە.

جا ئەم شمشێرە زووتر لە کوردەواری خۆماندا باوو باپیرانمان، شۆرە سوارانی بەجەرگو ئازا، وەکو چەکێکی کوشندە هەڵیان گرتووەو خۆیانو ماڵو منداڵو نیشتمانیان لە دوژمنانو بێگانەو ئاژەڵی درەندە پاراستووە، بەڵام ئێستا لەم رۆژگارەدا تەنها لە پێشانگەو تەکیەی شێخە ئاینییەکانو دەروێشەکاندا ماوەتەوە ئەگینا خەڵکی لێی تۆراوەو بەکاری ناهێنێ، چونکە (باروت) هاتە گۆڕێو چەکی جۆراو جۆری چاکترو کاریگەر تری پێشکەوتو هاتە مەیدانەوە، ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی زانیاری تەکنەلۆژیا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، هەروەها زووتر لە شاییو زەماوەندا سوار چاکەکان بە سواری ئەسپو شیرەوە غار غارێو شیربازیو رەمبازیان دەکرد، هەندێکیش لە پێش بووکدا سەمایان پێوە دەکرد.

لە پەندی پێشینانو قسەی نەستەقو شیعری فۆلکلۆریو شاعیراندا گەلێ ناوی شیر یان شمشێر هاتووە لەوانە:

* پەندی پێشینانو قسەی نەستەق:

– ئەوەی هەڵی گرت شمشێر... ناوێ گوێ بداتە شێر.[٤]

واتە: شمشێر قابیلی پیاوی ئازاو جوامێرە.

– ئەوەی لە شەڕا نەبێ، شیری تیژە.[٥]

واتە: گورەو فیشاڵ ئەکا، گوایە لەوێ بوایە لەشکرێکی قڕ دەکرد.

– شمشێر زۆر کەس دەکوژێ، شەراب زیاتر.[٦]

واتە: شەرابو ئەرەق خواردنەوە زەرەرو زیانی زۆرە، دەبێت مرۆڤ لێی دوور بکەوێتەوە.

شیعرە فۆلکلۆرییەکان:

واتم یە شمشێر، یە تەناف[٧] یەدار[٨]

هەرچی گونامەن وە نەم کەرە بار

**

شمشێر هەڵئەگرم وەك شێری مەیدان[٩]

ئەکوشم لە دوژمن نە یەك، بەسەدان

* * *

خۆم بم بە قوربان هەر چوار کورەکەت[١٠]

شمشێری دەبان کافر برەکەت

**

شمشێر چەکی مێردانە[١١]

کوردیش شێری مەیدانە

**

خان ئەبداڵو[١٢] کاکە خانە[١٣]

حەوت شەوانو حەوت رۆژانە،

شەڕیان دەکرد بە شیرانە

(شیران) نەیاندی کیلانە

**

هەر جارێ شیری دەکێشا[١٤]

هەموو دەهاتە تەماشا

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. لە رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٣٥٧٢، رۆژی (٢٣)ی ئەیلولی سالی (٢٠٠١)دا بلاوکراوەتەوە.

٢. شیرگەر: چەکسازیی و تۆکمەچیی و حەنجەرچی و شمشێرچێشی پێ دەلێن.

٣. زاخاو: لە چەشنە گلێك لە شاخەکانی کوردستانی رۆژهەلات بە دەستی دێنن.

٤. پەندی پێشینان، لاپەرە ٧٠.

٥. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٦٩.

٦. پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لە ناوچەی کەرکوکدا، لاپەرە ١٢٠.

٧. تەناف: پەت، ئاماژەیە بۆ پەتی سێدارە (پەتی قەنارە).

٨. هەلبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگییەکەم، لاپەرە ٦٨.

٩. لە مەقامزان (سەیید عەزیز عەباس ١٩١٨، ١٩٩٢)ی دانیشتووی کەرکوك وەرگیراوە.

١٠. چەند مەلۆیەك لە شاری فۆلکلۆری، لاپەرە ٢٤٤.

١١. لە مەقامزان (شوکر رەشید نادر ١٩٣٠، ٢٠٠٨)ی ناسراو بە (شوکر جەیران)ی دانیشتووی کەرکوك، داقووق، ئاوایی شوکر جەیران وەرگیراوە.

١٢. خانە ئەبدال و کاکە خان، دوو جەنگاوەری ئازاو جوامێرن لە شیعرێکی چیرۆك ئامێزدا هاتوون، جونگێکی خوێناویان دژ بە دوژمنان بەرپا کردووە.

١٣. توحفەی مظفریە: گرداری ئوسکارمان بەرلین، ١٩٠٥، شادرەوان مامۆستا هێمن موکریانی ساخی کردووەتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوە، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٥، لاپەرە ٢١٤.

١٤. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٣٤٣.

## * مس خاوێنكردنەوە:

جاران لە لادێكانی گەرمیان و سەرجەم كوردستاندا ناو بە ناو بەیانیان بەم هاوارە خەبەرمان دەبووەوە، كابرا هاواری دەكرد (ماڵێ حاجەتی مسی هەبێ سپی كاتۆ وەستا هاتووە) واتە وەستای حاجەت سپیكردنەوە كە مسگەریان پێ دەوت هاتووە) واتە وەستای حاجەت سپیكردنەوەمسگەریان پێ دەوت هاتووە، بەڵام لە پاش شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨)ەوە لە گەڵ داهاتنی قاپوقا چاخی شووشەو فافون و ئیستیل و فەخفووریدا ئیتر قاپوقاچاخ حاجەتی مس وردە وردە كەم بووەوەو لە گەڵیدا مسگەری بەرەو ئاوا بوون چووە.

ئەم مسگەرییە لە شارەكاندا پێیان دەڵێن (قازانچی)، لە نێو كوردەواریشدا بە مسگەر ناسراون، پیشەیەكی دەستكردی فۆلكلۆری زۆر كۆنە، لە شاری كەركوكدا لە بن قەڵا بە دیوی ڕۆژئاوادا بەرامبەر بە مریشك و پەلەوەر فرۆشەكان بازاری مسگەری هەبوو پێیان دەوت (بازاری قازانچییەكان)، بە دەیان مسگەر لە كورد و توركمان لەوێدا كاریان دەكرد و چەندین جۆر قازان و قاپوقاچاخی مسیان دروست دەكرد و خاوێنیشیان دەكردەوە، پاشماوەی ئەو پیشەیە لەو بازارەدا تا ئەمرۆش ماوەو سنعەتكارەكان تەنها لە بواری فافۆندا كار دەكەن.

## * كۆنترین مسگەرەكانی كەركوك:

١. مسگەر سەیید لەتیف محەممەد عەبدوڵڵا بەرزنجی (١٩٢١- )، هەرچەندە بە تەمەنە بە درێژایی ڕۆژ لە تەك عەلی كوریدا لە بواری مسسازییدا كار دەكات، دوكانەكەی لە سەرەتای شەقامی سەڵاحەدینە بەرامبەر گەراجی حەویجەی كۆن، تەنها ئەم ماوەتەوە لە بواری مسگەریدا كار دەكات.
٢. سەیید محەممەدعەبدوڵڵا زەینەل (١٩٣١) لە (١)ی كانوونییەكەمی ساڵی (١٩٩٩) كۆچی دوایی كردووە.
٣. حەسەن عەبدوڵڵا (١٩٦٣- ).
٤. ئەنوەر خەلیل ئیبراهیم (١٩٤٤- ).
٥. ئەڵلاوێردی بەهائەدین.
٦. مسگەر ئیسماعیل عەبدولڕەحمان عەبدولڕەزاق.
٧. فازڵ عومەر بەگ عەبدوڵڵا.
٨. عومەر عەبدوڵڵا- عەلی بیغلی.
٩. قادر زەینەڵ ساڵحی.
١٠. سەمین زەینەڵ ساڵحی.
١١. عوسمان بەگ.

## * كەرەستەكانیان لەم ئامرازانە پێك هاتووە:

- دەستگا:

ئەم ئامرازە جۆری زۆرە هەر یەكەیان بۆ دروستكردنی جۆرە شتێك بە كاردێت لە پارچە ئاسنێكی درێژ پێك هاتووە، سنعەتكار لە پێشی خۆیدا دایدەنێت وكاری لە سەر دەكات.

- ئامرازی گازی جۆراو جۆر.

- قەیچی جۆراو جۆر.

زووتر ئەم گازو قەیچییە لە شاری کەرکوکیشدا ئامادە دەکران، بەڵام سنعەتکارەکانیان کۆچیان کردو ئێستا کەس دروستیان ناکات.

- بسمار:

لە فافۆن خۆیان دروستی دەکەن، ئەو بسمارەش لە ئاسن بێت (بسماری پەرچ) لە بەغدا ئامادە دەکرێت.

* بەرهەمەکانیان لە ئەمرۆدا ئەمانەن:

- ئەوانەی لە مس دروست دەکرێن (قازانو مەنجەڵو جامی گەرماو، سینی، قازانی حەلوا، ئەمیان تەنها حەلواچییەکان بە کاری دێنن، جامی مس بۆ زێڕینگەرەکان، قازانی گەورە بۆ سەرو پێ کۆڵاندن، تەرازوو).

- ئەوانەی لە فافۆن دروست دەکرێن (کەفگیر، قوتووی زللابیە، ئەمانە پاقلەوا سازەکان بە کاریان دێنن).

- ئەمانەش لە ئاسن ئامادە دەکرێن (سێڵ- ساج، قازان، تەشت، سەتڵ، بەرمیل)، ئەم بەرمیلە بە زۆری گوند نیشینەکان بۆ ئاو هێنان بە کاری دێنن و پێی دەڵێن (تەنەکە).

- ئەم شتانەش لە چینکۆ دروست دەکرێن (تەنکی ئاو، مەسینە، گەلێ وردە و تشتی دیکەش، هەروەها هەر حاجەتێ لە چینکۆو فافۆن و تەنەکە دروست کرابێ و شکابێ بە ئاسانی دەتوانن چاکی بکەنەوە.

وەکو ئاماژەمان پێکرد زووتر خەڵکی قاپو قاچاخی مسیان بە کار هێناوە، هەرچەندە مس حاجەتێکی ساغە و تەمەنیشی (٣٠٠، ٤٠٠) ساڵە، بەڵام ئێستا لەم رۆژگارەدا بۆ یەکجاری باوی نەما و چووە خانەی نەمانەوە؟ چونکە قاپوقاچاخی سەردەم هاتە گۆڕێ کە لەوانە گەلێ خاوێن و جوانترن.

## * پیشەی مسگەری:

ئەم پیشەیە بە یەکێك لە گرنگییەکانی پێویستی ناو ماڵ دادەنرێت لە سپی کردنەوەی قاپو دەفری مسیو فافۆنو دەللەی قاوەو چراو بخوردان، بۆیە کەسانی شارەزا لەم بوارەدا کاریان دەکرد، بەڵام لە دوای دەرکەوتنی دەفری فافۆن بە رێژەیەکی زۆر ئەم پیشەیە بەرەو پووکانەوە چوو.

* لە بازاڕی (مسگەران)ی کۆن کە لە سەرەتای گەرەکی (ئاوچی) بوو لە پشت مزگەوتی (منارە نەخشینە)، ئەو وەستایانەی لەوێ هەبوون ئەمانن:

١. وەستا (مەجید).
٢. وەستا (بەکر عوسمان بەگ).
٣. وەستا (عومر بال ییمەز).
٤. وەستا (حاجی ئیبراهیم حەمزە ئەمین).
٥. وەستا (حاجی مستەفا)و کوڕەکانی (محەمەد)و (حوسێن)
٦. وەستا (مەحمود ئەحمەد عەلی).
٧. وەستا (عەبدولرەحمان ئیبراهیم)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
٨. وەستا (حاجی عەبدولرەزاق)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
٩. وەستا (قادر زەینەل)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
١٠. وەستا (سەمین زەینەل)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
١١. وەستا (سەیید نەجمەددین فەتحوڵڵا قازانچی)، لە سەرەتا لەم کارە کاری دەکردو بەڵام لە دواییدا وازی هێناو بوو بە بازرگان.
١٢. وەستا (حاجی خەلیل باوکی ستار)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
١٣. وەستا (عومەر بەگ)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە، لە (٢٩)ی ئابی ساڵی (٢٠١١) کۆچی دوایی کردووە.
١٤. وەستا (عومەر محێددین)، ناسراو بە (عومەر خەلو).
١٥. وەستا (سەیید ئیسماعیل فەتحوڵڵا).
١٦. وەستا (محەمەد جومعە).
١٧. وەستا (سەیید عەبدوڵڵا).

* لە ساڵی (١٩٥٠) لە کاتی (سامی یەعقوب) کە سەرۆکی شارەوانی کەرکوك بوو، بازاڕی (مسگەران) گوازرایەوە بۆ شوێنەکەی ئێستا نزیك (قەڵا)و پردی (شەهیدان)، ئەو وەستایانەی کە لەم شوێنە کاریان کردووە ئەمانن:

١. وەستا (سەیید حەسەن)و کوڕەکانی (قادر، حەمید، سائیب).
٢. وەستا (عەلی حاجی ئیبراهیم).
٣. وەستا (سەیید لەتیف محەمەد عەبدوڵڵا)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
٤. وەستا (سدیق)و کوڕەکانی (ئەحمەد، حەمە تۆپاڵ خەلیل، نەجدەت، حوسێن).
٥. وەستا (حوسێن عەلی مەعروف)، ناسراو بە (عەونی).
٦. وەستا (قادر زەینەل)و کوڕەکانی (عەبدولکەریم، عەبدولخالق، عەبدولوەهاب، عەبدشەهاب)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٧. وەستا (عومەر محەمەد جومعە)، لە مسو سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
٨. وەستا (سەیید مستەفا)، ناسراو بە (ئەبو).
٩. وەستا (حەسەن قوە)و (حوسێن)و (مەحمود-پیما).
١٠. وەستا (جەلیل سەمین زیەنەل)و کوڕەکانی (وەلید، خالید، ئومێد).
١١. وەستا (نورەددین بەکر)و کوڕەکانی (جەودەت)و (نەجدەت).
١٢. وەستا (ئەکرەم عەلی حەنان).
١٣. وەستا (شوکور مەحمد ئەحمەد).
١٤. وەستا (ڕەئووف حەسەن)و کوڕەکانی (ئەمجەد)و (جەودەت).
١٥. وەستا (حاجی ئیبراهیم حەمزە ئەمین)و کوڕەکانی (خەلیل، عەبدولڕەحمان، عەلی).

١٦. وەستا (ئیسماعیل فەتحوڵڵا)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
١٧. وەستا (عوسمان محێددین).
١٨. وەستا (خەلیل ئیبراهیم)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
١٩. وەستا (حاجی فایەق)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاری کردووە.
٢٠. وەستا (عەونی سەیید خەلیل).
٢١. وەستا (حاجی عەبدولرەحمان عەبدولرەزاق) و هاوەڵەکەی وەستا (خەلیل محەمەد)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٢٢. وەستا (مەحمود ئەحمەد زەینەل) و کوڕەکانی (شوکور، بورهان، یوسف، قاسم، هیجران).
٢٣. وەستا (عومەر محێددین) و کوڕەکانی (مەحە خلو، عەدنان، محەمەد).
٢٤. وەستا (عەبدوڵڵا حاجی خالید).
٢٥. وەستا (سەیید عەبود محەمەد) و کوڕەکانی (ئەحمەد، حوسێن).
٢٦. وەستا (سەعید محەمەد جومعە).
٢٧. وەستا (مەحمود محەمەد ساقی) و کوڕەکانی (عەباس، شوکور، نەبیل).
٢٨. وەستا (حاجی عیزەددین بەکر) و کوڕەکانی (نورەددین، سەلاحەددین، سەباحەددین، ئەکرەم، ئەحمەد)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٢٩. وەستا (تۆپاڵ ئیسماعیل) و کوڕەکەی (خەلیل)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٣٠. وەستا (سەیید وەهاب)، ئاسنگەر بوو، لە دواییدا دوکانەکەی فرۆشتە وەستا (عەلی ئەسوەد) و کوڕەکانی (ئەیوب، حوسێن، زیاد).
٣١. وەستا (شوکور مەردان) و کوڕەکەی (شاکر)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٣٢. وەستا (عەبدوڵڵا تورکی)، و کوڕەکەی (بورهان).
٣٣. وەستا (خەلیل سەمین) و کوڕەکانی (پاڵچین، عومەر، یوسف)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٣٤. وەستا (سەیید ڕەشید گوڵە)، و کوڕەکانی (شوکور، جومعە).
٣٥. وەستا (نوری گاور) و هاوەڵەکەی (ئەحمەد سدیق).
٣٦. وەستا (ئەڵڵاوێردی بەهائەددین مەحاو).
٣٧. وەستا (ڕەشید) و (خورشید کاکەیی) و (محەمەد) کوڕی.
٣٨. وەستا (حاجی قادر حاجی خالید حەمزە).
٣٩. وەستا (عەبدوڵڵا زینەل) و کوڕەکانی (حەسەن، محەمەد، عەباس)، لە مس و سپی کردنەوەی کەرەستە مسییەکان کاریان کردووە.
٤٠. وەستا (سەیید حەسەن عەبدوڵڵا) و کوڕەکانی (فەلاح، نەجاح، یەشار).
٤١. وەستا (ستار حاجی خەلیل) و هاوەڵەکەی (محەمەد) کە سەرۆکی (مسگەران) جاران بوو.

* ئەمەش ناوی ئەو وەستایانەیە کە لە شوێنەکانی تری کەرکوک دوکانیان هەبووە:
١. وەستا (فەوزی عومەر بەگ)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
٢. وەستا (نورەددین بەکر)، بەرامبەر نەخۆشخانەی (کەرکوك)ی گشتی بوو.
٣. وەستا (یەشار یوسف بەکر)، لە بازاڕی (مسگەران).
٤. وەستا (هیجران مەحمود ئەحمەد)، لە بازاڕی (مسگەران).
٥. وەستا (نەجات ئەسوەد) و کوڕەکانی (ئەرسەلان، محەمەد، عومەر)، لە گەڕەکی (ئاوچی) بوون.
٦. وەستا (جومعە عەبدولرەزاق) و کوڕەکانی (عابدین، عەلی).
٧. وەستا (فەتحوڵڵا عەبدوڵڵا) و کوڕەکانی (عومەر، بورهان، ئیسحان، عیرفان).
٨. وەستا (قاسم) و (نازم داود)، لە بازاڕی (مسگەران) بوون.
٩. وەستا (یەشار حوسێن بەگ) و کوڕەکانی (محەمەد، جەودەت، ئیبراهی).
١٠. وەستا (وەلید) و (نەبیل حەسەن)، لە بازاڕی (مسگەران) بوون.
١١. وەستا (یەشار عەلی) و کوڕەکانی (چەتین، ئیحسان، عەلی).
١٢. وەستا (وەهاب نوری دەدە تحوت)، لە گەڕەکی (ئیسکان) بوو.
١٣. وەستا (سەیید زەینەل سەیید عەباس)، لە بازاڕی (مسگەران) بوو.
١٤. وەستا (سەیید جەبار محەمەد)، لە بازاڕی (مسگەران) بوو، لە مس و سپیکردنەوەی مس کاری کردووە.
١٥. وەستا (حاجی سامی ئەڵڵاوێردی)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
١٦. وەستا (حاجی نەجات حەسەن)، لە شەقامی (سەلاحەددین) بوو.
١٧. وەستا (سەیید جەلیل محەمەد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو، لە مس و سپیکردنەوەی مس کاری

کردووه.
١٨. وەستا (شوکور محەمەد تاها)و کورەکانی (جەلیل)و (جەلال)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوون.
١٩. وەستا (ئیبراهیم)و (زەینەڵ بەکر عوسمان)، لە پیشەکەی وازی هێناو بوو بە بەڵێندەر.
٢٠. وەستا (خەلیل ئیبراهیم حەمزە)، لە بازاڕی (مسگەران) بوو، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٢١. وەستا (نەجەددین ئیبراهیم)و کوڕەکانی (محەمەد)و (عەلی).
٢٢. وەستا (ئەسوەد عوسمان)و کوڕەکانی (فوئاد، عەلی، جیاد، نەجات).
٢٣. وەستا (عەلی ئەسوەد عوسمان)و کوڕەکانی (ئەیوب، حوسێن، زیاد).
٢٤. وەستا (جیهاد ئەسوەد عوسمان)و کوڕەکەی (محەمەد).
٢٥. وەستا (عەبود)و کوڕەکانی (ئەحمەد، حوسێن).
٢٦. براکان (ئەحمەد، جەلیل، حوسێن، وەستا نەجدەت سدیق).
٢٧. وەستا (جەودەت ئەحمەد سدیق).
٢٨. وەستا (عەبدولئیلا ئەحمەد).
٢٩. وەستا (جەمال عومەر بەك).
٣٠. وەستا (سوبحی ئەڵلاوێردی).
٣١. وەستا (شەهاب)و (عەدنان علك).
٣٢. وەستا (عەدنان حەسیب).
٣٣. وەستا (کەمال حوسێن).
٣٤. وەستا (وەلید حەسەن)و (نەبیل حەسەن)،
٣٥. وەستا (عومەر چگول)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٣٦. وەستا (سەیید ئەحمەد عەبدوڵلا)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٣٧. وەستا (سەیید محەمەد عەبدوڵلا)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٣٨. وەستا (بەهائەددین سلێمان عەبدوڵلا)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٣٩. وەستا (سابیر عەلی)و کوڕەکانی (عەلی)و (حوسێن)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٤٠. وەستا (حوسێن محێددین)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٤١. وەستا (عەلی سەیید لەتیف)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٤٢. وەستا (ئەڵلاوێردی حەسەن)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٤٣. وەستا (خالید قازانچی)، لە بازاڕی (قۆریە)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٤٤. وەستا (عەرەب قازانچی)، لە بازاڕی (قۆریە)، لە مس‌و سپیکردنەوەی مس کاری کردووه.
٤٥. وەستا (ئایدن ئیسماعیل فەتحوڵلا).
٤٦. وەستا (حاجی رەئووف قازانچی).
٤٧. وەستا (محەمەد جومعە).
٤٨. وەستا (تۆپاڵ حەمە).
٤٩. وەستا (ئەنوەر خەلیل ئیبراهیم).
٥٠. وەستا (ئەکرەم عەلی محەمەد).
٥١. وەستا (جیهاد)و فوئاد ئەسوەد).
٥٢. وەستا (سەیید جەلیل قازانچی).
٥٣. وەستا (خەلیل ئاغا قازانچی).
٥٤. وەستا (جەلیل ئاغا قازانچی).
٥٥. وەستا (خورشید حەسەن قازانچی).

جەلیل سەمین زەینەڵ

شوکر مەردان محەمەد

عەبدولڕەحمان ئیبراهیم حەمزە

عەبدوڵڵا زەینەڵ

عەلی ئیبراهیم حەمزە ئەمین

## * مۆمیاسازی:

هەر لە دێر زەمانەوە مۆمیا کردنی باڵندەو گیانلەبەران لە نێو گەلانی جیهاندا باو بووەو گەلێ کەس شارەزاییەکی چاکی لێ بە دەستهێناوەو بووەتە هونەرمەندێکی ناسراوی پایە بەرزی ڕۆژگاری خۆی، تەنانەت لە کاتی فیرعەونییەکاندا لەشی مرۆڤیشیان مۆمیا کردووەو بۆ سەدان ساڵ بە ڕێکوپێکی پاراستویانە بە تایبەتی پیاوە گەورەکان و ناودارنی ئەو ڕۆژگار. جا ئەم مۆمیاسازییە وەکو هونەرێکی کۆنی فۆلکلۆری لە نێو نەتەوەی ئێمەی کوردیشدا هەر لە مێژا هەبووەو پێی هەستاون، بۆ نموونە ئەگەر لە گوندو لادێیەکدا مانگایەك گوێرەکەکەی بە کۆرپەیی مردارەوە بێ بەم شێوازە مۆمیای دەکەن: گوێرەکەکە بە چاکی کەوڵ دەکەنو هەموو گۆشتو ئێسكو پروسکی لە چەرمەکەی دەردێننو پڕی لە کا دەکەنو دەیدوورنەوە، هەر کاتێ بیانەوێ مانگاکە بدۆشن گوێرەکە مۆمیا کراوەکەی لە پێشدا دادەنێن، ئەویش دەست دەکا بە لیستنەوە و لاواندنەوەی، دواتر بە ئاسانی شیرەکەی دەدا بە دەستەوە. هەروها لە کوردستاندا بە دەیان کەس هەن ئارەزوویان لە مۆمیاکردنی ئاژەڵ و پەلەوەردا هەیە و شارەزاییەکی چاکیشیان لەو بوارەدا بە دەست هێناوەو ناوبانگیشیان دەکردوو بە تایبەتی لە مۆمیا کردنی باڵندەو ئاژەڵە کێوییەکان وەکو (ئاسك، کەروێشك، ڕێوی، چاڵەکە، شێر، پڵنگ، گورگ، پشیلە)، لە باڵندەو پەلەوەرەکانیش (کەو، سۆسك، باز، دال، قەتێ، قالاو، بولبول، خەنجەربالا)، هەروەها قەلەموونو کەڵەشێرو جووجەڵەو هەر باڵندەو پەلەوەرێکی دیکەی جوان.

هەیە ئەم کارە تەنها وەکو ئارەزوویەك بۆ ڕازاندوەی ماڵ یان

ژوورە تایبەتییەکەی ئەنجامی دەدات، هەیشە بە چاوێکی ڕێزەوە لێی دەڕوانێ و بە هونەری دەزانێت، هەیشە کردوویە بە پیشە و بەردەوام کار دەکا ولە بازاڕدا بەرهەمەکانی بە نرخێکی چاك بە پارە دەگۆڕێتەوە.

مۆمیا سازەکان بەم جۆرە مۆمیای باڵندەو ئاژەڵ دەکەن:

ئەگەر باڵندەکە زیندوو بوو بە دەست مرداری دەکەنەوە، یان بە چەکوش لە تەوقی سەری دەدەن و دەیکوژن، یان دەرزی

(فۆرمایل) لەژێر سکی دەدەن کە ماددەیەکی ژەهراوییە، بەمە دەستبەجێ بێ گیان دەبێت، ئەمە بۆ ئەو باڵندانەی کە گۆشتیان ناخورێت، ئەوانەش کە گۆشتیان دەخورێت لە پێشدا سەری دەبڕن‌و سەری لە لەشی جودا ناکەنەوە تا سوود لەگۆشتەکەی ببینن، ئینجا بە کێردێکی زۆر تیژ ژێر سکی شەق دەکەن بە درێژایی بە ئەندازەی (١٠، ١٥ سم)ە یان زیاتر بە گوێرەی قەوارەی باڵندەکە بە مەرجێ کار نەکاتە سەر پەڕەکانی، دواتر وردە وردە گۆشت و ئێسقانەکانی دەردێنن رووتی دەکەنەوە، واتە کەوڵی دەکەن بەڵام بە شێوازێك نابێت کەوڵەکەی لە هیچ شوێنێکەوە کون بکرێت، ئینجا لە دیوی ناوەوە بە ئیسپرتۆ تەعقیمی دەکەن، دواتر پۆدرە و خوێی لێدەدەن تا بۆن نەکات، لە پاشاندا بە تەلی رەق لە نێوەوە راست‌و چەپ بە شێوەی تێهەڵکێش دەیبەستن بە باڵ‌و قاچەکانییەوە، تەلێکیش بە سەرو کلکیەوە بەند دەکەن دەرەنجام بە لۆکە یان خوری کەوڵەکە پڕ دەکەنەوە و بە دیلوان و دەزوویش دەیدوورنەوە، بە هەقیقەت کارەکە هونەرمەندانە ئەنجام دەدەن، تا هەست نەکرێت.

ئەو باڵندەیە یان ئەو ئاژەڵە مۆمیا کراوە، لە جیاتی چاوەکانیشی هەڵمات یان مورووی یان داری بۆ دادەنێن، بە مەرجێ لە گەڵ رەنگ و قەوارەی چاوی ئەو گیاندارەدا بگونجێت.

مۆمیا سازەکان هەندە خۆیان لە باڵندەی پەل سپی نادەن بۆ مۆمیاکردنی لە بەر ئەوەی کە بووە خوێنەوە رەنگ دەگرێ و لێی نابێتەوە.

لە کەرکوودا لە شەقامی مەجیدیە شادرەوان مۆمیاساز عومەر غەریب شەریف (١٩٢٧)، لە (١١)ی تەموزی ساڵی (١٩٨٩)کۆچی دوایی کردووە، دوکانێکی گەورەی هەبوو پڕ بوو لە ئاژەڵ و پەلەوەرو باڵندەی هەمەرەنگی مۆمیا کراو، ببووە پێشانگایەکی جوان و قەشەنگ، لە پاش خۆیشی کورەکانی عوسمان (١٩٦٥- )، فاروق (١٩٦١- )[1] ئاسۆ (١٩٦٧- ) لە سەر کاری مۆمیاسازی بەردەوام بوون، ئێستا تەنها ئاسۆیان لە ماڵەوە کار دەکات، ئەوانی دیکە بۆ یەکجاری دەستیان لێ کێشایەوە و دوکانەکەشیان نەماوە، هەروەها غالیب نەجمەدین فەرەج[2] لە بواری مۆمیاسازیدا مامۆستایەکی دەسترەنگینە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. کاتی خۆی لە گەڵ مۆمیاساز فاروق عومەر دیدارێکم سازداو لە رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٢٥١٠) لە رۆژی (٢٦)ی ئابی ساڵی (١٩٩٦)دا بڵاوکراوەتەوە.

٢. (غالیب نەجمەدین فەرەج ١٩٥١، )دا دانیشتووی شاری کەرکوکە ولە شەستەکانی سەدەی رابردوو بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە کەرکوکدا لە ماڵەوە لەم بوارەدا بە بەردەوامی کاری دەکرد، بە دەیان ئاژەڵ و باڵندە و پەلەوەری مۆمیاکردو ژوورێکی بۆ ئەو بەرهەمانە تەرخان کردبوو بووبووە پیشانگایەکی جوان‌و خنجیلانە، دواتر لە سەرەتای هەفتاکانی سەدەی پێشوو لە سەر کوردایەتی بەعس راوی ناو بەرەو بەغدا هەڵات، لەوێیش دەستیان لە بەرۆکی نەبووەوەو گرتیان‌و بۆ ماوەیەك لە گرتوخانەدا مایەوە، لەوە بە دواوە بۆ یەکجاری دەستی لە مۆمیاسازی هەڵگرت پێشانگاکەشی تەفرووتونا بوو.

*** ناڵبەندیی[1]:**

وەکو دەزانین زووتر دانیشتووانی ئاوایی و لادێکانی کوردەواری بە کاری کشتوکاڵیی و بە خێوکردنی مەروماڵاتەوە خەریك بوون ولە سەری گوزەرانیان دەکرد، جا هەر ماڵێك چەند وەڵاخێکی هەبوو وەکو (ئەسپ، ماین، بارگیر، هێستر، گوێدرێژ)، ئەمانە لە بواری ئیش وکاری رۆژانەیاندا بە کاریانیان دەهێنا، وەکو جووتکردن، کێشەو خەرمان کوتاندن، یان بۆ کاروان و رۆیشتن لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دیکە یان بۆ گوێزانەوەی بەروبوومی بێستان و رەزا لە سەر کێڵگەو مەزراوە بۆ ئاوایی، یان بۆ شار، هەروەها دێوەرەو عەتارو بەقاڵو کوتاڵفرۆشی گەڕیدەش بەکاریان دەهێنا.

جا خاوەن وڵاخ دەبوایە لە ساڵێکدا دوو سێ جار وڵاخەکەی لە لای وەستای ناڵبەند ناڵ بکردایە، چونکە ئەو جۆرە ئاژەڵانە ئەگەر بێت و ناڵ نەکرێن سمیان درێژدەبێ ولە پاش رۆینی زۆر دەسوێن و تەنك دەبنەوەو ئێش و ئازاریان پێ دەگات لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی پەك کەوتنیان بە تایبەتی وڵاخی باری.

جا لە رۆژگاری کۆندا لە شارو شارۆچکەوگەورە دێکاندا (ناڵبەند) هەبوو، ئەم ناڵبەندە ژوورێك، یان دوکانێکی دەم کراوەی پان و پۆری هەبوو وڵاخی تێدا ناڵ دەکرد، لە پێشی دوکانەکەیدا(سەکۆ)یەکی مامناوەندی هەبوو پارچە بەرەیەك، یان لباددێکی لە سەر رادەخست و قنج قنجێ لە سەری دادەنشت وکاری دەکرد، شاگردێك یان دووان لە گەڵیدا بوو هەمیشە بەردەستییان بۆ دەکرد ئامرازو کەرەستەکانی ناڵبەندەکە بریتی بوون لەم شتانە:

*** ناڵ:**

دوو جۆری هەیە، یەکێکیان خڕە، ئەوی تریان لە شێوەی مانگییەك شەوەیە، ئاسنگەرەکان لە ئاسن دروستیان دەکرد، هی گوێ درێژ چوار کونی هەیە.

لە هەر لایەکەوە دوو کون، هی هێسترو ئەسپ و ماین شەش کونی هەیە لە هەر لایەکەوە سێ کون، چونکە هی ئەمانە لە گوێدرێژ گەورەترن بۆیە کونەکانی لەو زیاترن، جا بە هۆی بسمارو لە رێگای ئەو کونانەوە ناڵەکە لە سمی وڵاخەکە بەند دەکرێت، ئەمە لە چەشنی پێڵاوە بۆ ئەو وڵاخە.

*** بسمار (مێخ):**

ئەم بسمارە جۆرێکی تایبەتییە، وەکو هەر بسمارێکی دیکە نییە، لەسەرەوە خڕەو لە بنەوە ئەستوورە تا دێتە خوارەوە بەرە بەرە بارێك دەبێتەوە تا دەگاتە نووکەکەی، تەنها لە بواری ناڵبەندیدا بەکاردێت.

*** سمبڕ:**

ئامرازێکی سمتاشین، هەمیسان پیشەی ئاسنگەرەکانە، ناڵبەند بۆ تاشین و رێك خستنی سمی وڵاخ بەکاری دێنێت.

*** بڕبەند (بڕبەن):**

پارچە ئاسنێکی پانی گرنج گرنجە، درێژییەکەی بە ئەندازەی (٣٢ سم)ە، لە پاش ناڵکردنی وڵاخ سمی پێ لووس و رێکوپێك دەکرێت.

*** لۆچکە (لەواشە) و (قافانچەلە)یشی پێ ئێژن:**

بریتییە لە پارچە دارێك درێژییەکەی بە ئەندازەی (٢٥، ٣٠ سم)ە، بە پەتێکی ئەستووری درێژ هەردوو سەرەکەیان بەستووە بە سەرێکی ئەو دارەوە، ئەگەر وڵاخێك چەمووش و توور بوایە، یان زۆر نارەحەتی و جم و جووڵی بکردایە بە تایبەتی هێستر ئەو لۆچکەیەیان دەهێناو پەتەکەیان دەکرد بە قوڵف، ئنجا لێوی سەرووی وڵاخەکەی تێ دەخراو پەتەکە پێچ دەدرا، بەمە لێوی حەیوانەکەی بە توندی جەڕ دەدراو یەکێك ئەو لۆچکەیەی دەگرت، ئیتر وڵاخەکە بۆ خۆی وشك رادەوەستاو نەدەجووڵایەوە تا ناڵبەندەکە لەسەر خۆی هەر چوارپەلی ناڵ دەکرد، ئنجا ئەو ئامرازەیان لێ دەکردەووە.

*** چەکوش:**

سەرێکی بچووکی ئاسنین و کلکێ دارینی بارێکی هەیە، بسماری پێ دادەکوترێت.

*** گاز:**

زووتر ئاسنگەرەکان ئەو ئامرازەیان لە ئاسنی جۆشدراو دروست دەکرد، بەڵام لە پەنجاکانی سەدەی رابردووەوە لە کۆمپانیاکاندا بە شێوەیەکی چاکتر ئامادە دەکرێت.

*** تۆپ:**

پارچە دارێکی خڕی بتەوە، لە داری گوێز، یان توو، یان بەروو، یان هەر دارێکی چاك و رەختە ئامادە دەکرا، بەرزییەکەی بە ئەندازەی بستێك دەبێت، وەستای ناڵبەند لە کاتی ئیشکردندا سمی وڵاخەکەی لەسەر دادەنێ و بزمارەکان پەرچ دەکاتە سەر سمی وەڵاخەکەدا.

جا کاروانچی و جوتیارەکان لە هەموو لایەکەوە وڵاخەکانیان دەبردە لای وەستای ناڵبەند، ئەویش بەنۆرە بۆیانی ناڵ دەکرد، هەقی ناڵبەندەکە چەند بوایە ئەوە خاوەن وەڵاخەکان پێی دەداو دەرۆیشت.

هەندێ جار ناڵبەندەکە چی کەرەستەو شت و مەکی هەبوو دەیخستە نێو هەگبەیەکەوەو بە سواری وڵاخێك بە ئاواییەکاندا دەسوورا، لە هەر ئاواییەکدا چەند رۆژێك دەمایەوە، هەر کەسێك لە دانشتوانی ئاوایی وڵاخی بۆ ناڵ کردن هەبوایە دەیانهێنایە لای و بۆی ناڵ دەکرد، ئەو کارەیش دەچێتە خانەی فۆلکلۆری باوو باپیرانی دێر زەمانەوە، کە ئێستەش لەم رۆژگارەدا هەر ماوە، بەڵام تا رادەیەك کز بووە لە بەر ئەوەی زانیاری تەکنەلۆژیا لە هەموو بوارێکی ژیاندا هاتە گۆڕێ و ئۆتۆمبیل و پاتۆزو (دەراسە) کاکوت و هۆی هاتووچۆ ئاسان تر بووەتەوە و خەڵکی ئەوەندە پێوستی بەو جۆرە وڵاخانە نەماوە، بۆیە وەستایانی ناڵبەندیش کەمتر بوونەتەوە. ئەمەش پارچە شیعرێکی فۆلکلۆرییە کە زیاتر لە چەند جارێك ناوی (ناڵبەند) تێدا دەبینرێت، شیعرەکە هی ناوچەی دەزەییەکانە:

هەی نار بەندە[2]

ئەو ناربەندەم هی کورە جووە[3]

ناران[4] لێدەن زوو بە زووە

لەشکر رۆیی سوار لە دووە

* * *

ئەو نار بەندەی لە قەراتێ[5]
ناران لێدەن ڕۆژهەڕاتێ[6]
سوار ڕۆیی بووك نایگاتێ
**

ئەو ناربەندەی هی كورە كۆیی[7]
ناران لێدەن هەشت و نۆیی
بووكیان هێنا سووار ڕۆیی
**

ئەو نار بەندەم كورە كوردە[8]
ناران لێدەن هوردە هوردە
سوار هاتن لەشكر گردە
هەی ناربەندە، هەی ناربەندە
**

چیدی ناكەم ناربەندانێ[9]
دەچمە سەرخەمی ڕەشوانێ
لێدەن جلكی بووكە جوانێ
هەی ناربەندە، هەی ناربەندە
**

هەستە لێرە برۆ بە غار[10]
نالبەند بێنە لە شار بۆلغار
مەیتەر[11] ئەسپیان دەرهێنایە[12]
زینیان دە پشتی دەكوتانە
تەدارەك و نالبەندانە
**

لەم پەندانەشدا نێوی ناڵ نالبەندی هاتووە:
* نالبەند كەری پێ ناڵ ناكرێ، ئەڵێ سمی درێژە[13]
واتە نالبەندێكی ناشارەزایە.
* یا خوا نالبەنەكەت كوێر بێ[14]
بە ولاخێكی سواری دەوترێ كە بەسەر سم فێر بووبێت.
* لە ناڵیش ئەداو لە بسماریش ئەدا[15]
بە یەكێكی درۆزنی دوو ڕوو و دوو زمان دەوترێت، واتە بەرو پشتی بۆ نییە.
ئەو كورتە چیرۆكەش[16] دەربارەی نالبەندی لە كەركوك و دەوروبەریدا بلاوە: دەگێڕنەوە سوارێك بۆ نالكردنی ئەسپەكەی دەچێتە لای نالبەندێك و پێی دەڵێ ئەسپەكەم بۆ ناڵ بكە، بەلام بە مەرجێ نالەكان زۆر قایم و باش بن، ئەویش ناڵێك دەدا بە دەستیەوەو دەڵێ ئەمەیان باشە، كە لێی وەردەگرێت سوارەكە دەستبەجێ دەیكا بە دوو لەتەوەو دەڵێ كەی چاكە، یەكێ باشترو ئەستوورترى بۆ دێنێ،ئەویشیانی بەو جۆرە دەكا بە دوو كەرتەوە، نالی سێیەم دێنێ، سوارەكە بەوە ڕازی دەبێ و نالبەنەكە هەر چوار پەلی ئەسپەكەی بۆ ناڵ دەكات، سوارەكە دراوێكی بۆ دەردێنێ و پێی دەڵێ فەرموو بگرە ئەوە هەقەكەت، ئەویش لێی وەردەگرێ و قایم دوو پەنجەی پێدا دەساوێ و وێنەو نووسراوی سەر دراوەكە بە تەواوی دەسرێتەوەو بۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پارەكەت قەلبە خەت و وێنەی بەسەرەوە نییە، سوارەكە بۆ جاری دووەم و سێیەمیش پارەی دەداتی نالبەنەكە هەمیسان وەكو جاری پێشوو ئاسەواری وێنەو خەتی بەسەردا ناهێڵێتەوە، بۆ جاری چوارەم سوارەكە دەڵێ بەسە پوولت بە دەستمەوە نەهێشت، بەڵێ جەنابتان لە من بەتواناو بەهێز ترن، دواتر بوونە دۆست و هاوڕێی گیانی بە گیانی.

* سەرچاوەو پەراوێزەكان:
١. لە گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە ١٤٦، سالی (٢٠٠١)دا، دیدارێك لەگەڵ شادرەوان (نالبەند سەعدوللا ئیسماعیل محێدین ١٩٣٨، ٢٠٠٣/٢/٤).
بۆ نووسینی ئەم بابەتە كەلك لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
* شادرەوان (نالبەند سەعدوللا ئیسماعیل محێدین ١٩٣٨، ٢٠٠٣/٢/٤)ی ناسراو بە (دەروێش عەبدوللا)ی دانیشتووی كەركوك، شۆریجە.
* (نالبەند عەزیز مستافا ئەمین گۆمەیی ١٩٥٤،)ی دانیشتووی كەركوك كە خاوەنی چەند ئەسپێكی جوانە و دوكانەكەشی لە تەنیشت تەویلەی ئەسپەكانیدایە.
٢. ناربەند: نالبەند، نەعلبەند.
٣. فۆلكلۆری كوردی ناوچەی دزەییاندا، ئاوازی ئەحمەد حەمەدەمینی دزەیی، ئەمیندارێتی ڕۆشنبیریو لاوان، ناوچەی ئۆتۆنۆمی (شركة مطبعة الادیب البغدادیة المحدودة)، بەغدا، ١٩٨٢، ل ٦٢.
٤. ناران، كۆی نار: ناڵ.
٥. فۆلكلۆری كوردی ناوچەی دزەییاندا، ل ٦٢.
٦. ڕۆژهەڕاتێ: ڕۆژهەلات، خۆرهەلات.
٧. فۆلكلۆری كوردی ناوچەی دزەییاندا، ل ٦٢.
٨. هەمان سەرچاوە.
٩. هەمان سەرچاوە.
١٠. فۆلكلۆری هۆنراوەكانی كوردەواری، ل ١١٩.
١١. مەیتەر، جلەودار، خزمەتكاری ئەسپ.
١٢. تحفەی مظفریە، ل ٢٠٤.
١٣. لە (ڕەحیم فەرەج دەروێش ١٩٢٧،   )ی دانیشتووی داقوق، ئاوایی عەرەبكۆیی وەرگیراوە.
١٤. لە (ئەحمەد ڕەزا عەزیز ١٩١٧، ٢٠٠٢/٢/٩)ی دانیشتووی داقوق، تۆپزاوە وەرگیراوە.
١٥. پەندی پێشینان، ل ٤٠٥.
١٦. ڕۆژی ٢٠١٠/٣/٢٣ لە مسگەر (ئەنوەر خەلیل ئیبراهیم ١٩٤٤،   ) وەرگیراوە.

* هەللاجی:

هەر لە سەرەتای دەست پێکرنی ژیانی ئادەمیزادەوە مرۆڤ بیری لە هەموو لایەنێکی ژیان کردووەتەوە تا بتوانێ بەرگری لە مانەوەی خۆی بکاو ژیانێکی بە ئاسوودەییو بەختەوەر تر بۆ خۆیو کۆمەڵگاکەی دابین بکات، یەکێ لەو لایەنانە پیشەسازی میللییە کە بە شێوەیەکی فۆلکلۆری دەژمێردرێت، نەتەوەی ئێمەی کوردیش وەکو گەلانی دیکە لەم لایەنەوە بێ بەش نییەو گەلێ پیشەی دەستکردی خۆی هەیەو مۆرکو رەسەنایەتی کوردی پێوە دیارە، یەکێ لەوانە پیشەی هەللاجییە (فەرەنجی لباد) ئامادە کردن.
تا ئەمرۆ لە دەڤەری گەرمیانو تێکرای کوردستاندا کەم ماڵ هەیە لبادی جۆراوجۆری تێدا نەبێ بە تایبەتی لە ئاواییەکاندا، یان هەر شوانێك دەبینی فەرەنجی یان پەستەکێکی جوانی پۆشیوە، لە شاری کەرکوکدا گەلێ پیشەوەری هەللاج[1] هەبوونو بە پیشەکەیان دەوترا (کارگەچی) کەرەستەو ئامرازەکانیان ئەمانەن:

* کەوان:
لە دارو ژێ لە چەشنی کەوانە ئامادە کراوە، بۆ شیکردنەوەی خوریو بەرەگن[2] بەکاری دێنن، لێفە دوورەکانیش بۆ شیکردنەوەی لۆکە بەکاری دێنن، ئێستا بە زۆری لە جیاتی ئەم ئامیرازە ئامێر بەکاردێنن.

* چەك:
بریتییە لە کورتە دارێکی سەر زل مشتوەکەشی هەر لە خۆیەتی لە تەك کەوانەکەدا بەرەگنی پێ شی دەکەنەوە.

* چیخ:
لە تەرکە[3] دروست دەکرێت.

* شەن:
شەنێکی دارینی کلك کورتە، لەسەر چیخ بەرەگنی پێ رادەخەن.

* بەرهەمی پیشەوەرەکە ئەمانەن:
(لباد، فەرەنجی، سوخمە، بەستەك، گەرەك، کڵاو، سەرکڵاو، کڵاوی بیر هەڵکەن، قاولغی تفەنگ) کە هەر هەموویان لە بەرگن بەم شێوازە ئامادە دەکرێن:

* لباد:
نماوەیشی پێدەڵێن، بەرگنەکە بە کەوان شیدەکەنەوەو بە درێژایی ئەو لبادەی دەیانەوێ دروستی بکەن لەسەر چیخەکە بە شەن رایدەخەنو ئاوی بە سەردا دەپرژێنن، دواتر بە چیخەکەوە لوولی دەکەنو یەکێ لە کرێکارەکان پێی دەڵێن (بگیر) بۆ نێو دەمژمێرێك بە پێ دەیکوتێ، ئینجا لە چیخەکە دەری دێننو وەستاکە رێکی دەخا، دووبارە بۆ ماوەی نیو کاتژمێرێ بە چیخەکەوە لوولی دەدەنو کاکی بگریش بە پێ دەیکوتێ، لە ئاکامدا بۆ یەکجاری لە چیخەکە دەری دەهێننو بگیرەکە بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لە دەستی لوولی دەدا تا دروست دەبێت، رووەکەشی بە نەقشو نیگار بە بەرگنی رەش دەرازێننەوە، خەڵکی لە ماڵەوە لە جیاتی رایەخ بە کاری دێنن، هەندێ لە راننەدەکان بۆ داپۆشینی کوشنی ئۆتۆمبیلیش بەکاری دێنن.

ئەوەشمان لەبیر نەچێت پیشەوەری هەللاجی تا ئاخورو ئۆخری ساڵەكانی نەوەتی سەدەی پێشوو لە كەركوك‌و گەرمیاندا مابوون‌و كاریان دەكرد، ئەوە چەند ساڵێكە هەر هەموویان وردەواڵەو كەرەستەكانیان پێچایەوەو كارگەكانیان داخست، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە لایەكەوە مەڕو ماڵات بەخێوكردن لە دەوروبەری كەركوك‌و گەرمیاندا بە دەگمەنەو پۆشاك‌و رایەخی رەنگامەی هەمە جۆری جوان‌و چاك هاتە گۆڕێ‌و بە نرخێكی هەرزانیش دەست دەكەوێت.

* فەرەنجی (فەرنجی):
لە چەشنی ساقۆیە، شوان‌و گاوان‌و جوتیارو ئاودێرەكان بە هاوین‌و زستانان لەبەری دەكەن‌و بە كاری دێنن، ئەمەش هەر وەكو لباد دروست دەكرێت.
* سوخمە:
خەڵكی لە گوندو لادێكاندا بە زستانان لەژێر چاكەتەوە لەبەری دەكەن، یان بە بێ چاكەت دەیپۆشن، ئەمەش هەر لە چەشنی لباد ئامادە دەكرێت.
* پەستەك (كوڵەباڵ):
جۆرە فەرەنجییەكی بێ قۆڵی كورت‌و جوانە، كوران لەگەڵ پۆشاكی كوردیدا لە بەری دەكەن، هەمیسان شێوەی دروستكردنی وەكو لبادە.
* گەرەك (كەپەنك):
ئەم بەرهەمە هەر وەكو قاپووتە (ساقۆ) بەڵام ئەمەیان بێ قۆڵە، شوان‌و جوتیارو ئاودێرەكان بە شەوانی زستان‌و سەرما و سۆڵە لە دەشت‌و دەرو پێی دەنوێن.
* كڵاو (قوچ):
كڵاوێكی قووڵە، لە شێوەی گومەزدایە هەر وەكو لباد ئامادە دەكرێت، بە زۆری دەروێش‌و سۆفییەكانی كاكەیی‌و ئێزیدیی‌و بەكتاشی بەكاریان دەهێنا، ئێستا لە گەرمیاندا هەندە باوی نەماوە.
* سەركڵاو (كڵاو قۆر):
لە شێوەی شەپخەدایە، شوان‌و گاوان‌و جوتیارو ئاودێرەكان بە هاوینان لەبەر گەرمای تیشكی رۆژ بەكاری دێنن، سێبەری بۆ سەرو مل‌و ناو شانی مرۆڤ دەبەخشێ‌و گەلێ سوودمەندە.
* كڵاوی بیر:
كڵاوێكی قووڵ‌و درێژۆكەیە، بە شێوەی گومەز هەر وەكو لباد دێتە بەرهەم، بیركەنەكان لە كاتی كاردا لە سەریان دەكەن بۆ ئەوەی لە بەردو خاك‌و خۆڵ سەرو چاویان بپارێزێت.
* قاولغی تفەنگ:
جۆرە قاولغێكی قووڵە لە چەشنی لباد ئامادە دەكرێت، بۆ پاراستنی تفەنگ لە تەڕو تووشێ ژەنگ.
هەللاجەكان لە وەرزی زستاندا بۆ ماوەی سێ مانگ كار ناكەن؟ چونكە لە كاتی تەڕو تووشیدا بەرگنەكە شێ وەردەگرێت‌و یەك ناگرێت.

* سەرچاوەو پەراوێزەكان:
١. ئەمەش ناوی هەللاجەكانی كەركوكە: پیشەوەر شادرەوان (یاسین عەبدوڵڵا فەتاح ١٩٣٣، ٢٠٠٩)، (شادرەوان حاجی عەلی شێرە شاكر ١٩٢٧، ٢٠٠٥)، (حوسێن شاكر ١٩٥٥، )، (جەبار شاكر ١٩٣٢، ).
٢. بەرەگن (بەرگن): خوری بەرخی تەمەن یەك ساڵ.
٣. تەركە: رووەكێكی خورسكییە وەكو ژاژ وایە، بەڵام ئەمەیان نیوەكەی بتەو، لەسەر رۆخی رۆخانەو چەم‌و جۆگا ئاوەكاندا دەڕوێت.

* کڵاوی کوردەواری:

مێژووی پیشەی فۆلکلۆری دەستی تا ئەمڕۆ لە هیچ سەرچاوەیەکدا باسی لێوە نەکراوە بۆیە دەتوانین بڵێین مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر، نەتەوەی ئێمەی کوردیش وەکو هەر هەموو نەتەوەکانی دەوروو بەرو تێکراش جیهان پیشەی دەستکردی تایبەتمەندی خۆمان هەیەو سوودمان لێ وەرگرتوون، جا ئەو پیشانە بە زۆری لە ماڵاندا ئامادە دەکرێن و تایبەتمەندن بە ئافرەتانەوە لەوانە (تەون، چنینی کڵاو، گۆرەوی، دەستکێش، بلووز، گەردەنپێچ، پوپزەوانە، لفکە، شۆرتك، گوریس، کەژوو، دەوار، دوورمان، دروستکردنی گوڵ، ڕیشەو گوڵەنگەکەی مشکی و بۆیەمەو سەرپۆش، هەندی جار کڵاشیش دەچنن)...تاد.

جا لە کوردەوارییدا ژنی دەسترەنگینی وامان هەبوو لە پیشەکەیدا ناوبانگی دەرکردووەو بەرهەمەکەی بە لای خەڵکییەوە ڕەواجی هەبووەو سوودیان لێ بینیوە.

لێرەدا دەمانەوێ بە کورتی دەربارەی چنینی کڵاوو جۆرەکانی بدوێین لە دەڤەری گەرمیاندا چونکە هەر ناوچەو شارێك جۆری کڵاوی تایبەتمەندی بە خۆیانەوە هەیە بە تایبەتی لە ڕەنگ و ڕازاندنەوەیدا.

کڵاو دەبێتە دوو بەشی سەرەکییەوە: کڵاوی پیاوان و کڵاوی ژنان کە هەر یەکەیان زیاتر لە جۆرێکی هەیە:

* کڵاوی پیاوان:

- کڵاوی نەقشدار:

ئەمیان بۆ جوانی بەتەنها لەسەری دەکەن و لەگەڵ سەرپێچیشدا بەکاری دێنن، لە سانتیمی ڕەنگامەو قوماش و دەزوو ژنان لە ماڵەوە بە نەقش و نیگار ئامادەی دەکەن و دەیرازێننەوە، ئەمەیان بە زۆری مێرد منداڵان و لاوەکان و پیاوە دڵتەڕەکان بۆ جوانی لە سەری دەکەن، ئێستا ئەمیان باوی نەماوە، لە کەرکوك و دەورو بەری و شارۆچکەی خورماتوودا تەنها چاوەشەکان بە بێ سەرپێچ بۆ جوانی لەسەری دەکەن.

- کڵاوی دەزوو:

تەنها لە دەزوو دەیچنن، جا هەیە سادە ڕەشەو هەیشە بەڵەکە یان قاوەیی یان هەر ڕەنگێکی دیکە، ئەمەیان بە زۆری پیاوەکان لە وەرزی زستاندا دەیپۆشن لەبەر سەرماو سۆڵەو تەرو تووشی.

- کڵاوی خامەك[1]:

ئەمیا لە کاڵای خامەك و دەزووی ڕەنگامە بە شێوەیەکی جوان و گوڵدار دەیچنن، نەقش و گوڵەکانی تەنها لە سەرەوەی کڵاوەکەیە، پیاوە بە زەوق و دڵتەڕەکان لەگەڵ سەرپێچدا وەکو مشکی یان جەمانە دەیپۆشن.

- کڵاوی بلوورین[2]:

ئەمیان لە قوماشی بلووری و دەزووی سپی ئامادەی دەکەن، بە زۆری دیدەساڵەکان و حاجیەکان و ئەوانەی نوێژ دەکەن سەریانی پێ دەپۆشن.

- کڵاوی زنگیانەدار:

لە قوماش و زەنگیانەو دەزوو ئامادە دەکرێت، ئەمیان تەنها مێرد منداڵان و لاوەکان بۆ جوانی بە بێ سەرپێچ لە سەری دەکەن، هەندێ جار لاوەکان خەنجەریش دەکەن بە قەدی پشتێنەکەیانداو تەزبییەکی جوانیش دەپێچن بە قەدی مشتوەکەیدا لە پێش ئازیزو ئەویندارەکانیان سینگ ڕادەپەڕێنن و شانازی پێوە دەکەن و کڵاوەکانیشیان لار دادەنێن.

- کڵاوی دەزووی ڕەنگاوڕەنگ:

زووتر جۆرێکی دیکە هەبوو لە دەزووی ڕەنگاوڕەنگ بە شێوەیەکی جوان ئامادە دەکراو دوو گوڵەنەگەی ڕەنگاو ڕەنگی جوانیشیان لە سەرەوەی بۆ دروست دەکردو بەسەر کڵاوەکەدا شۆڕ دەبووەوەو پێیان دەوت کڵاوی گوڵەنگدار، لاوەکان بێ سەرپێچ لەسەریان دەکرد، بەڵام ئەمەیان لەم ڕۆژگارەدا باوی نەماوە بۆ یەکجاری لە نێو چوو.

- کلێتە:

جۆرە کڵاوێکە لە بەنی قاوەیی بە شێوازێکی جوان دەیچنن، دوو گوڵەنگی درێژیشی لەملاولاوە بۆ ئامادە دەکەن، لە سەریشەوە گوڵەنگێ قوتی بۆ ساز دەکەن، لەگەڵ پوپزەوانەو پۆشاکی کوردیدا بەکاردێت، بە زۆری مێرد منداڵان و لاوەکان بۆ جوانی دەیپۆشن، بە هیچ شێوازێك لەگەڵ سەرپێچدا نابەسترێت، پێشمەرگە لاوەکان لە شۆڕشەکانی کوردا بە زۆری لە سەریان دەکرد.

- سەرکڵاو یان کڵاو قۆری:

ئەمیانیش بەرهەمی دەستکردە، پیشەوەر هەڵاجەکان لەبەرەگن[3] بە شێوەیەکی لێودار ئامادەی دەکەن، ئاودێرو سەپان و شوان و گاوانەکان بە هاوینان لەسەری دەکەن بۆ ئەوەی گەرماو تیشکی ڕۆژگار لە سەرو چاویان نەکات، ئەم کڵاوە بە تەواوی سەرو مل و شانی مرۆڤ دەپارێزێ و بۆی دەبیکا بە سێبەر.

- کڵاوی بیر هەڵکەن:

بەشێوەیەکی گومەزی هەڵاجە دەست ڕەنگینەکان لە بەرەگن دروستی دەکەن، ئەوانەی بیرو کارێز[4] لێدەدەن لەسەری دەکەن بۆ ئەوەی لەکاتی کار کردندا سەرو چاویان لە بەردو خاك بپارێزێت.

- شەبقە (شەبکە):

ئەمیان کڵاوێکی لێودارەو هەڵاجەکان لە بەرەگن ئامادە دەکەن، بە هاوینان لەبەر گەرماو تیشکی ڕۆژ لەسەر دەکرێت.

هەروەها یارییەکی فۆلکلۆری کوردەواریش هەیە بە نۆ کڵاو ئەنجام دەدرێت بە نێو (کڵاوێن) یان (کڵاو کڵاوێن).

لە پەندو شیعری فۆلکلۆرییدا نێوی کڵاو زۆر دەبینرێت لەوانە:

- کڵاو قۆچ:

کڵاوێکی قووڵ و درێژە، لە شێوازی گومەزدایە، هەڵاجەکان ئامادەی دەکەن. بە زۆری دەروێش و سۆفییەکانی کاکەیی و ئێزیدیی و بەکتاشییەکان لەسەری دەکەن.

*** پەندی پێشینان:**

- کڵاو تۆ قازی[٥].

واتە: تۆ لە جیاتی من دادوەر بەو بە دروستی بڕیار بدە.

- کڵاو باوەش چە ڕاستی دڕیان (کڵاوی باوکی لە ڕاستی دڕاوە)[٦].

بە یەکێکی دەڵێن فرە ڕاست گۆو هەق بێژ بێت.

- کڵاوش دایم لارەن (کڵاوی هەمیشە لارە)[٧].

واتە: دڵخۆش و لە زەوقدایە.

- کڵاوی حەق دڕاوە[٨].

واتە: زۆر ڕاستگۆو هەق بێژە.

- کڵاوی کەچەڵی فڕێداوە[٩].

واتە: لە خراپەکاری دەستی کێشاوەتەوە.

- کڵاو داڵگ نیگە وە سەر باوگ (کڵاوی دایکی ناوەتە سەر باوك)[١٠].

بە کەسێك دەوترێ کە لایەنی خاڵوان بگرێ و لایەنی مامو ئامۆزا بەردات.

*** شیعری فۆلکلۆری:**

کڵاو پەهلەوی دەسماڵ ئاورێشم[١١]
شوییەکەت بمرت خۆم نازت کیشم
**

دایك وە قوروان کەللەی کڵاوت[١٢]
دەشتی شارەزوور بۆ تانجی ڕاوت
**

هەیداد هەی بێداد دڵ بێ قەرارە[١٣]
منی شەیدا کرد ئەو کڵاو لارە
**

کڵاو گوڵگوڵی، مشکیەکەی مۆرە[١٤]
ماچ کردن خۆشە نۆرە بە نۆرە
**

شەرتە بچنم کڵاوی حەوت ڕەنگ[١٥]
بۆتی بنێرم دڵت نەبێ تەنگ
**

کڵاو ئەچنم سوێرو سەوزو زەرد[١٦]
بە دڵ و بە گیان بۆ یاری هام دەرد
**

دارەکەی ناو باخ تەنیا دارێکە[١٧]
دوو کیژ وە تەوای کڵاو لارێکە

*** کڵاوی ژنان:**

خانمی کورد هەرچەندە بە سروشت شیرین و خان و مانە بە پۆشاکی کوردی و زەرکڵاو و تاس کڵاو و کڵاوی پلپلەو پوولەدارەوە، بە پۆشاکی ئاڵاو واڵای کوردییەوە فرەتر جوان و شۆخ دەبێت و بە تەواوی سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، مخابن ژنانی ئەمرۆمان بە دوای مۆدەدا دەگەڕێن و بەرەبەرە لەو کڵاوانەو پۆشاکی کوردی خۆماڵی تۆران و بە یەکجاری دوور کەوتنەوە، بە تایبەتی لە کڵاوەکان:

- **کڵاوزەڕ، یان زەڕکڵاو:**

ئەم کڵاوە لە زێڕ یان زیو یان ورشەو زێڕینگەرە دەست ڕەنگینەکانی خۆمان دروستی دەکەن و بە پلپلەش وەکو ڕیزە گوڵینگە دەیڕازێننەوە، ژنانی خوا پێداو لە ئاهەنگ و شایی و بۆنەکاندا لەسەری دەکەن و بە لارو لانجەو نازەوە هێدی هێدی خانمانە دەڕۆن بە ڕێوە، بەجۆرێك زەوی لەژێر پێیاندا دەتەپێت، جا کوڕم دەوێ بە بینینی ئەو شۆخە نازەنیانە دڵی ئۆقرە بگرێ و خورپە نەکات.

- **تاس کڵاو:**

جۆرە کڵاوێکی ژنانەی زۆر جوانی سابڵاخییە کە بە خەیاتەو ئاورێشم گەلێك نەخش و نیگارو گوڵی جوانی لێدەکەن و لە تاس (جام) دەچێت بۆیە ئەم ناوەیان لێ ناوە، هەندێ جار بە زێڕیش دەیڕازێننەوە، بە هەقیقەت ئەم کڵاوەش هەر خانمی کورد دێت و جوانییە سروشتییەکەشی بە جوانی دەردەخات.

- **کڵاوی پلپلەدار:**

ئەم کڵاوە لە قوماشی ڕەش ئەستوور ئامادە دەکرێت و بە پلپلەی زەرد ژێر چەناگەی زەنگیانەدار ڕازاوەتەوە، بۆیە لە قوماشی ڕەش دروستی دەکەن چونکە زەرد لێی دێت و زەقی دەردەکەوێت، ژنان لە ئاهەنگ و بۆنەو شایی و جەژنی نەورۆزدا لە سەری دەکەن و پۆشاکی کوردیش دەپۆشن و شانازی پێوە دەکەن و دڵیشیان پێی خۆشە.

- **کڵاوی پوولەکەدار:**

ئەمیان لە کاڵای ڕەنگدارو پوولەکە ئامادە دەکرێت، کچۆڵەو کیژە لاوەکان بۆ جوانی لە سەری دەکەن و لە پێشی کورە هەرزەکارو لاوەکاندا پێوەی خنجکە دەکەن.

- **کڵاوی ئاسایی:**

ئەمیان لە پارچە ڕەش یان هەر قوماشێکی گونجاو ئامادە دەکرێت، ژنانی بە تەمەن لەژێر سەرپۆشەوە لەسەری دەکەن، ئەم کڵاوە هەر وەکو هی پیاوانە بەڵام لەو گەورەترو قووڵترە، یان ڕەشەکەیان ژنە تەرپۆشەکان بۆ جوانی و زەوق لا سەرە زوڵفەی بە دەوردا بەند دەکەن و دەیپۆشن.

ئەم کڵاوانەیش لە شیعری فۆلکلۆرییدا بێ بەش نین لەوانە:

لە دەروەنیخان، گیریاوم وە دیل[١٨]
کڵاوە زەڕەکەت بنێرە بەرتیل
**

چەنم پێ وتی: لە زەلمۆ مەڕۆ[١٩]
بریقەی کڵاوزەڕ دای لە تانجەڕۆ
**

حەی و بەی و نەی بورجی تاسکڵاو[٢٠]
لە هاڕەی شابخوون بۆی نەرمی گوڵاو
**

شەهیدی هەردوو چاوت[٢١]
سابڵاغم بە دەم فرۆشت
بۆ زێڕی تاس کڵاوت
**

ناردم کراوت[٢٢] لۆ بێ ناکرێ و ئامیدییانە[٢٣]
کەس لە سەری نە نابێ کیژێ خەزنەو[٢٤] تەرجانە[٢٥]

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. خامەك: قەنەوز، خام، پارچەیەکی بنەوشی ئاماڵ سوورە لە رەنگی ئەرخەوان دەکات.
٢. بلووری: مەرمەرشا، خامی زۆر سپی.
٣. بەرەگن (بەرگن): خوری بەرخ.
٤. کارێز: ئاوێ بە بن زەویدا دەیبەن و دەغڵ و بێستانی پێ ئاو دەدەن، کارێزکەن دروستی دەکات.
٥. پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لە ناوچەی کەرکوکدا، لاپەڕە ١٣٦.
٦. پەندەکە بە شێوەزاری گۆران وتراوە، بڕوانە: بڕوانە پەند و قسەی نەستەقی ماچۆ، هەردەوێڵ کاکەیی، ئینستیتیەتی کەلەپووری کوردستان، چاپخانەی کشتوکاڵ هەولێر، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٨٧.
٧. پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ، لاپەڕە ١٨٧.
٨. پەندی پێشینان، لاپەڕە ٣٢٩.
٩. پەندی پێشینانی کورد، بەرگییەکەم، لاپەڕە ٧٥.
١٠. گەردانەی ئەلوەن، عەبدولموحسن بەنی وەیس، (دار الحریة للطباعة) بەغدا، ١٩٨٨، لاپەڕە ١٦٣.
١١. شیعرەکە بە شێوەزاری هەڵهوری دەڤەری خانەقی وتراوە (هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردیی ناوچەی گەرمیان، بەرگی سێیەم، لاپەڕە ٩٣.
١٢. چەپکێ لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور، لاپەڕە ٩٣.
١٣. لە (مەقامزان خەزعەل مارف فەرەج) وەرگیراوە.
١٤. هەمان سەرچاوە.
١٥. هەمان سەرچاوە.
١٦. هەمان سەرچاوە.
١٧. هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٢.
١٨. بۆنی هەڵاڵان دێ، لاپەڕە ١٠٨.
١٩. چەپکێ لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور، لاپەڕە ٧٩.
٢٠. چەپکی لە گوڵاڵە سوورەی شارەزوور، لاپەڕە ٨٢.
٢١. گەنجینەی گۆرانی کوردی، لاپەڕە ٢٩٧.
٢٢. کراو: کڵاو.
٢٣. سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، لاپەڕە ١٠٠.
٢٤. خەزنە: ئاواییەکە سەر بە شارۆچکەی (خەبات)ی هەولێر.
٢٥. تەرجان: ئاواییەکە سەر بە شارۆچکەی (گوێر)ی هەولێر.

## * ئاسنگەری:

پیشەی ئاسنگەریش پیشەیەکی دێر زەمانی دەستکردی فۆلکلۆرییە، ئاسنگەرەکان لە ئاستی جۆشدراو ئەم بەرهەمانە دروست دەکەن وەکو کەرەستەی جوتیاری کە پەیوەندییان بە کشتوکاڵو گوندنشینەکانەوە هەیە کە ئەمانەن (گاسن، داس، تەور، تەورداس، داسولکە، پاچ، بێڵ، خاکەناز، لاویتە، تەڵە، زنجیر، مێخسکە، سەرو کەللەو رەشمە، ناڵ، لغاو، پاوەن، ئاوەزنگی، هەوجۆش، تەبەرزین، ئەنی ئاسن، قولای جۆاروجۆر، سندان، سێ گاوەسەنە، پێنج گاوەسەنە، قیمە کێش، زرێ، چوارپایە، قەیچی، برینگ، "چاری" قفڵی دوکان، ئەستێ، مقالە، بربەندی تاڵبەند، ماشە...) کە بەشێکیشیان تا ئەمرۆ ئاسنگەرەکان دروستی دەکەن‌و خەڵکی بەکاریان دەێنن، هەروەها لە ئەمرۆدا دەمە گاسن بۆ تراکتۆریش ئامادە دەکەن کە لە داهێنانی ئاسنگەرەکانە زووتر کەرەستەو حاجەتی کاری ئاسنگەرەکان لەمانە پێك هاتبوون (کویرەی خەڵوز، چەکوش، مەورەد، گاز)، بە زستان ئێواران خەڵوزەکەیان دەبردەوە بەڵام ئێستا بەهۆی کویرەی کارەباوە کاردەکەن‌و برینەوەی ئاسنەکانیش بە کۆسرە دەبرنەوە، کە لە جاران فرە ئاسانترە، لەحیم کردنیش بە ئامرازی (ولدن)ی کەهرەبائییە، لە جیاتی خەڵوزیش نەوت بە کاردێنن. ئەو سەردەمەی کویرەکانیان لە خەڵوز دەمدەدا پیشەوەرەکان نوقمی دوکەڵ دەبوون‌و هەندێ جار غازی خەڵوزەکە ئازارشی پێدەگەیاندن‌و یەکجاری رزگاربوون.

وەکو پیشەوەرە ئاسنگەرەکان باسی لێوە دەکەن، زووتر هەر سنعەتکارێ چوار کرێکاری خێراو چاپوکی دەویست، زۆریش لە جۆش‌و خرۆشەوە کاریان دەکردو هەندێ جاریش بە دەم ئیشکردنەوە گۆرانیشیان دەوت، بەڵام لەم سەردەمەدا بە بۆنەی کەرەستەی نوێکانیانەوە پێوستی تەنها بە یەك کرێکارەو ئەو زەوق‌و خرۆشەشیان نەماوەو گۆرانی وتنیش لە دوکاندا بووەتە شوورەیی.

لە کەرکوکدا بازارێك هەیە بە ناوی (بازاری ئاسنگەرەکان) هەر لە هەموو پیشەوەرە ئاسنگەرەکان لەوێ لە دێر زەمانەوە کار دەکەن، جا زۆر ئاسنگەر هەبوون‌و ئێستاش هەن لەم پیشەیەدا نێو بانگیان دەرکردووەو بەرهەمەکانیشیان زۆر چاك‌و نایاب بووە لەوانە (عەبدولواحید حەسەن جاف (١٩٣٦- )، محەمەد عەبدولواحید حوسێن (١٩٧٤- )، فەیزوڵڵا محەممەد مەحموود (١٩٤٢- )، شادرەوان حوسێن سەعید مەعرووف (١٩٣٤- ٢٠٠٦)، شادرەوان محەمەد مەحموود رۆسستەم (١٨٩٦- ١٩٥١)، سەیید محێدین عەبدولرەحمان جەباری، رەفیق نامیق سامەنسووری، حەمە چایەر، وەستا تاهیر، عەبوە کەر، مستەفا محەممەد شەریف سیامەنسووری ( ١٩٣٩- )، جەودەت حوسێن سەعید (١٩٧٣-)، عەلی حوسێن سەعید (١٩٧١- )، سەباح سەعید مەولووج (١٩٥٧- )، عەباس فەیزوڵڵا محەمەد) هەروەها بە دەیانی دیکەش. زووتر پیشەوەرەکان بە درێژایی رۆژ بازوویان لێ هەڵدەمالیی‌و لە دوکاندا لەگەڵ چەکوش‌و ئاسن‌و کوورەی پر لە ئاگردا ململانێ‌و زۆرانبازییان دەکردو بە گرجوگۆڵی کاریان دەکرد لە پێناوی دابینکردنی بژێو بۆ خۆیان‌و مندالەکانیان، ئێواران لەگەڵ مەلا بانگداندا دەستیان لەکار هەڵدەگرت‌و لە پاش کرینی مێوەجات بۆ مندالەکانیان بەرەو ماڵ شۆر دەبوونەوە.

بەڵام ئێستا لەم سەردەمەدا تەنها شەش دەمژمێر کار دەکەن‌و بەرهەماکانیشیان لە بازاردا وەکو جاران رەواجی نییەو رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو کزیی‌و نەمان دەچێت.

* **حەوجۆش:**
لە ئاسنی جۆشدراو لە شێوەی مەسینە دروست کراوە، زووتر بۆ ئاو گەرمکردنی دەستو دەموچاوشۆشتن و دەستنوێژسەندن بەکاردەهێنرا.
* **تەرازوو:**
ئامرازی کێشان و کێش بەسەنگکردنە، جۆری زۆرە، ئاسنگەرەکان لە ئاسن ئامادەیان دەکرد.
* **قەیچی (مەقەست):**
زووتر لە ئاسن ئامادە دەکرا.
* **کلیل و کۆم:**
زووتر بۆ دەرگای ئاسن لەلایەن ئاسنگەرەکانەوە ئەمەیان ئامادە دەکرد.
* **گەردوو:**
جۆرێکە لە خاکەناز.
* **درەوشە:**
ئەم ئامرازە نووکێکی باریکی تیژی پێوەیە کە لە سووژن دەکات و مشتەکەشی لە دارە، پینەدۆزەکان بۆ بنەپەرگ و چەرم بەکاریان دەهێنا.
* **قولاوی حەمالی:**
جۆرە قولاوێکە کە حەماڵەکان پێی کۆڵبار هەڵدەگرن، لە ئاسنی جۆشدراو دروست دەکرێت.
* **قولای قەسابی:**
جۆرە قولاوێکە کە قەسابەکان گۆشتی پێهەڵدەواسن.
* **سندان:**
دەزگای شت لەسەر کوتانی پینەچی و ئاسنگەر، لە ئاسنی جۆشدراو دروست دەکرێت.
* **مەرەغان (مەراغان):**
جۆرێك لە داس، لە شێوی داسی گەورەدایە، بەڵام ئەمەیان دەم و دەسکەکەی گەورەو تیژە، بۆ درووونەی گیاوگۆڵی سەر قەد ناخۆشەکانی گردو چیاکان و دەم ئاوەکان بەکاردێ.
* **قیمە کێش (چەپەچاغ):**
لە ئاسنی جۆشدراو دروست دەکرێت، دەمەکەی پان و زۆر تیژە، کلکەکەی هەر لە خۆیەتی بۆ قیمەکردن و ورد کردنی گۆشت بەکاردێت.
* **ئاولەپە:**
پارچە ئاسنێکە بەرەکەی چاڵ و گرنج گرنجە و پشتەکەشی لووسە، لەمسەرو لەوسەرەوە دوو قولفەی بۆ کراوە بەینیان پێوەبەستووە.

* **زری (قەڵخان):**
سوخمەی لە ئاسن چنراوە، کاتی خۆی جەنگاوەرەکان لە کاتی شەردا دەیانپۆشی.
* **کۆلی ئاسنین:**
بۆ ئاو خواردنەوەی ئاژەڵ بەکار دەهێنرا.
* **سێ گاوەسنە:**
ئەم ئامرازە سێ گاسنی هەیە، بەدوو گوێدرێژ جووتی پێ دەکرا.
* **پێنج گاوەسنە:**
ئەم ئامرازە پێنج گاسنی هەیە، بە دوو هێستر جووتی پێ دەکرا.
* **تەور (بیور):**
دەمەکەی لە ئاسنی جۆشدراو دروست کراوە و کلکەکەشی لە دارە، بۆ بڕینەوەی دارو درەخت بەکاردێت.
* **تەورداس (داسك، تەوراس):**
جۆرە داسێکی بچووکە لە ئاسن ئامادەکراوە بۆ ڕاپەڕاندنی لقەدار بەکاردێت.
* **داسوولکە:**
جۆرە داسێکی بچووکە لە ئاسن ئامادەکراوە بۆ دروونەی رووەك بەکاردێت.
* **پاچ (قوڵنگییەك دەم):**
لە ئاسنی جۆشدراو ئامادەکراوە، دوو جۆری هەیە: یەکێکیان دەم باریك و ئەوەی تریان پان، بۆ بژارکردنی زەوی هەڵکەندنی بەکاردێت.
* **خاکەناز:**
جۆرە بێڵێکی دەم پانە، کلکێکی دارینی درێژی هەیە، زیاتر کرێکارەکان لە بواری بیناسازیدا بەکاری دێنن.
* **تەڵە:**
جۆرە فاقێکەو ئاسنگەرەکان لە ئاسن بۆ ڕاوە ڕێوی و کەروێشك و چەند گیانداری تر ئامادەی دەکەن.
* **زنجیر:**
بە شێوازی ئەڵقەئەڵقەی تێکخراوی لە ئاسن یان تەلی قایم بە زنجیر ئامادە دەکرێ و بۆ ڕەشمەی وڵاخ و گەلێ شتی دیکەش بەکاردێت.
* **ڕەشمە (هاوسار):**
دەکرێتە سەر کەللەی وڵاخ.
* **مێخسکە (مەربەند):**
پارچە ئاسنێکی درێژەو نزیکەی دوو بست درێژییەکەیەتی، نووکەکەی تیژەو لەسەریشەوە کونێکی هەیەو ئەڵقەیەکی ئاسنیشیان پێوە کردووە، بۆ بەستنەوەی وڵاخی بەرزە لە زەوی دادەکوترێ و بە هۆی ئەڵقەیەکەوە ڕەشمەو هەوسار پێوە دەبەستن.
* **لغاو (ئاخاو، ئاخاف):**
پارچە ئاسنێکە دەخرێتە نێودەمی ئەسپەوە، بەستراوە بە هەوسارێکی قایشینی جوان و ڕختەوە.
* **قفڵ:**
لە ئاسن دروست دەکرێ و بۆ قایمکردنی دەرگاو دەرپایەی دووکانەکان بەکاردەهێنرێت.
* **مێخ:**
بۆ ڕەشماڵ و زۆر شتی تر بەکار دەهێنرا.
* **شەنی ئاسن:**
بریتییە لە چوار ئاسنی نیوە چەماوە نووك تیژ، کلکێ درێژی هەیە و بۆ قرشە و پووش کووکردنەوە بەکاردێت.
* هەروەها دەرگاو پەنجەرەو زۆر کەرەستەی تریش بەکاردێت...

## * پیشەی ئاسنگەری:

ئەم پیشەیە لە سەرەتادا لە کەرکوك بەربڵاو نەبووە لەبەر ئەوەی کەرەستەی بەکارهێنانی دیاریکراو بووە لە ژیانی رۆژانەی ئەم شارەدا، بۆیە ئەم پیشەیە هاوگونجاو بووە لەگەڵ ئەو کەرەستانەی کە بەشێکی زۆری لە لادێکاندا بەکاردەهێنرا، بە تایبەتی لە کاری کێڵان و تۆ کردن، بەڵام لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا بایەخێکی زۆر بەم پیشەیە دراوە بە تایبەتی لە سەردەمی ئەو پێشکەوتنەی کە لە ئەورووپادا سەری هەڵدا لە بوارە جیاجیاکان.

١. وەستا (عەزیز حەداد)، لە مەسیحییەکانی قەڵا بوو.
٢. وەستا (عەزاو حەداد)، لە مەسیحییەکانی قەڵا بوو، دەستێکی باڵا هەبوو لە دروستکردنی ناڵی ئاژەڵدا بە تایبەتی ئەسپ و ماین.
٣. وەستا (جەبار گۆرگیس حەداد)، دەستێکی باڵا هەبوو لە دروستکردنی بەردی دەستاری گەورە و بچووك بۆ هارینی گەنم و جۆ، بەتایبەتی لەو ئاشانەی کە بە ئاو کاریان کردووە، ئەم پیشەیەی لە باوکییەوە بۆ مابووەوە، لە دواییدا لە پیشەی سەرتاشی کاری کردووە.
٤. وەستا (یوسف بەکر مەروان حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٥. وەستا (حاجی ئەمین مەروان) و کوڕەکەی (شەریف)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٦. وەستا (محەمەد شەریف حاجی ئەمین مەروان حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٧. براکان (مستەفا، ئەحمەد، کەریم، مەجید، مەحمود محەمەد، حەمید محەمەد شەریف).
٨. هەر دوو برا (شاهین، سەلام ئەحمەد محەمەد).
٩. وەستا (خالید مستەفا محەمەد حەداد).
١٠. وەستا (فائق حەسەن حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١١. وەستا (حەمید عوسمان)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١٢. براکان (نەجم عەبدوڵڵا، عەلی عەبدوڵڵا، محەمەد عەبدوڵڵا)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١٣. وەستا (ئەحمەد چایچی) و کوڕەکانی، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١٤. وەستا (سدیق قەڵایی حەداد).
١٥. وەستا (وەحید حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١٦. وەستا (حاجی عوسمان ئەمین زاهیر) و کوڕەکانی (قادر، وەهاب، عەبدولڕەحمان)، لە بازاڕی گەورە بوون.
١٧. وەستا (باوکی عەلی حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١٨. وەستا (قودرەت زەینەل) و کوڕەکانی (نەشئەت، موراد، فیکرەت)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
١٩. وەستا (سەعید جومعە حەداد) و کوڕەکانی (سابیر، سەعید، حوسێن سەعید، خدر سەعید)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٢٠. وەستا (حاجی عومەر عەلی قلچی حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٢١. وەستا (عەبدولڕەحمان عەلی ئەمین حەداد).
٢٢. وەستا (عەدنان عەبدولڕەحمان حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٢٣. وەستا (مەحمود ڕۆستەم حەداد).

٢٤. وەستا (عوسمان مەحمود ڕۆستەم حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٢٥. وەستا (تۆفیق محەمەد حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٢٦. وەستا (سابیر وەهاب حەداد).
٢٧. وەستا (شەفیق تاهیر حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٢٨. وەستا (سەعید مەولود حەداد) لە گەڕەکی (بولاق) بوو.
٢٩. وەستا (ڕەفعەت حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٣٠. وەستا (یعقوب حەداد)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٣١. وەستا (سەمەد سەباك-سەمەد تۆگمەچی)، لە نزیك دارتاشەکان بوو.
٣٢. وەستا (شێخ خەلیفە ئەحمەد)، بۆڕیچی بوو.
٣٣. وەستا (حاجی تەحسین حاجی حوسێن بەیاتی)، کوڕەکانی (مەلا ئەیاد عیماد، موەفەق)، بۆڕیچی بوو، لە نزیك حەمامی (حاجی حەسەن).
٣٤. وەستا (سەعید فەتاح)و کوڕەکانی (ئەکرەم، عیزەددین، ئەحمەد، سەباح، نورەددین)، لە بازاڕی (حەلواچییەکان) بوو.
٣٥. وەستا (مستەفا پچاخچی)، چەقۆی دروست دەکرد لە بازاڕی (حەلواچییەکان).
٣٦. وەستا (خەلیل خەنجەرچی).
٣٧. وەستا (حاجی سالح خەنجەرچی)و کوڕەکانی (سابیر، عەبدولڕەحمان، وەستا محەمەد).
٣٨. براکان (بورهان، عیرفان، کەمال سابیر حاجی سالح خەنجەرچی)، لە بازاڕی (ئاسنگەرەکان) بوون.
٣٩. وەستا (نامیق خەنجەرچی)، لە بازاڕی (ئاسنگەرەکان) بوو.
٤٠. وەستا (شوکر)و کوڕەکەی (حەمدی)، تیغی خەنجەریان دروست دەکرد، لە بازاڕی (ئاسنگەرەکان) بوون.
٤١. وەستا (محەمەد چەقۆچی)، چەقۆی دروست دەکرد، لە بازاڕی (ئاسنگەرەکان) بوو.
٤٢. وەستا (عیزەددین چەقۆچی)، چەقۆی دروست دەکرد،

وەستا حەمدی لە کاتی کارکردندا

وەستا ئەیاد حەقی زەینەڵ لە کاتی کارکردندا

لە بازاڕی (ئاسنگەرەکان) بوو.
٤٣. وەستا (محەمەد)و هاوەڵەکەی وەستا (بەکر خەنجەرچی).
٤٤. وەستا (ئیبراهیم خەنجەرچی).
٤٥. وەستا (حاجی خالید خەلیل خەنجەرچی).
٤٦. وەستا (مەلیم خەنجەرچی).
٤٧. وەستا (غەفوور خەنجەرچی).
٤٨. وەستا (مەحمود خەنجەرچی).
٤٩. وەستا (سابیر سالح)، ناسراو بە (سابیری خەنجەرچی گەورە).
٥٠. وەستا (حەسەن خەنجەرچی).
٥١. وەستا (سابیر خدر) ناسراو بە (سابیری خەنجەرچی بچووك).
٥٢. هەردوو برا (جەلیل، ئیحسان حاجی خالید خەنجەرچی).
٥٣. وەستا (کەمال مستەفا خەنجەرچی)، لە بازاڕی (ئاسنگەرەکان) بوو.
٥٤. وەستا (ئەحمەد شوکور عەبدولڕەحمان)، ناسراو بە (حەمدی خەنجەرچی).
٥٥. وەستا (بورهان حاجی سابیر خەنجەرچی).
٥٦. وەستا (شێخ موکەرەم تەحسین خەنجەرچی).
٥٧. وەستا (ئەحمەد حەسەن محەمەد حەداد)، لە گەڕەکی (ساحە تەیەران) بوو.
٥٨. وەستا (خالید جەوەر حەداد) لە گەڕەکی (ساحە تەیەران) بوو.
٥٩. وەستا (کەمال حەداد)، لە شەقامی (پەروەردەی کۆن) بوو.
٦٠. وەستا (عەدنان حەداد)، لە شەقامی (پەروەردەی کۆن) بوو.
٦١. وەستا (محەمەد ئەبو جونێد)، لە گەڕەکی (تسن)ی کۆن بوو.
٦٢. وەستا (ئیحسان حەداد)، لە گەڕەکی (حەمام عەلی بەگ) بوو.
٦٣. وەستا (محەمەد کوێخا ڕەزا حەداد)، لە گەڕەکی (حەمام عەلی بەگ) بوو.

کەمال مستەفا ئەحمەد

فەخرەدین محەمەد عەلی

٦٤. وەستا (ئیبراهیم حومادی حەداد)، لە گەڕەکی (ئەڵماس) بوو.
٦٥. وەستا (جەبار حەداد)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٦٦. وەستا (عەلی ساقی حەداد).
٦٧. وەستا (کەمال بەکر حەداد).
٦٨. وەستا (قادر عەبدوڵڵا حەداد).
٦٩. وەستا (واحید حوسێن).
٧٠. وەستا (عەبدولرەحمان عەبدوڵڵا).
٧١. وەستا (عەلی محێددین).
٧٢. وەستا (خدر محەمەد)و کوڕەکەی (عومەر).
٧٣. وەستا (نامیق حەسەن).
٧٤. وەستا (قادر فەتاح حەمید).
٧٥. وەستا (عەلی عیزەت حەداد).
٧٦. وەستا (عەبدوڵڵا کەر حەداد).
٧٧. وەستا (محێددین قادر حەداد).
٧٨. وەستا (فەیزوڵڵا محەمەد مەحمود حەداد).
٧٩. وەستا (غەیبوڵڵا محەمەد مەحمود حەداد).
٨٠. هەر دوو برا (نورەددین حەداد)و (فەخرەددین حەداد)، بەرامبەر هەراجخانە بوون.
٨١. وەستا (بەختیار هادی موفتی حەداد)، نزیک

ئەحمەد شوکر عەبدولڕەحمان

سەلاح حاجی محەمەد

وەهاب ئەحمەد محێدین

حاجی تەحسین حاجی حوسێن

نامیق ڕەزا سامی

نورەدین محەمەد عەلی

نەخۆشخانەی (کەرکوك) گشتی بوو.
٨٢. وەستا (لەتیف حەمەد قادر حەداد)، لە گەڕەکی (ئەحمەد ئاغا) بوو.
٨٣. وەستا (موشی حەداد) لە بەرامبەر نەخۆشخانەی (کەرکوکی) گشتی بوو.
٨٤. وەستا (یوسف سەعید)، لە گەراجی (ئەتڵەس) لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٨٥. وەستا (تاهیر).
٨٦. وەستا (محەمەد-حەمە چای)، لە گەڕەکی (بوڵاق) بوو، لە بنەڕەتدا خەڵکی سیامەنسوور بوو.
٨٧. وەستا (عەبۆ گاور)، لە (خانی قازی) بوو.
٨٨. وەستا (فایق نامیق حەسەن).
٨٩. وەستا (پیرۆت عەزین).
٩٠. وەستا (حەمە ئاسنگەر).
٩١. وەستا (مەعروف حەداد).
٩٢. وەستا (نازم مستەفا).
٩٣. وەستا (ئەکرەم قادر).

## * پیشەی حەمامچێتی لە کەرکوك:

دەبینین لە ڕابردوودا لەبەر نەبوونی گەرماو لە زۆربەی ماڵەکانی کەرکوکدا، بەشێکی زۆری ئەو خەڵکە لە گەرماوی گشتیدا خۆیان دەشوشت بە تایبەتی بوونی ئەو گەرماوانە لە شارە گەورەکاندا بوونی هەبوو، خەڵکێکی زۆری ڕوویان لە گەرماوە گشتییەکانی ناو شار دەکرد.

لەبەر گرنگی گەرماو لە شارێکی وەکو کەرکوکدا بۆیە پیشەی حەمامچێتیش هاوپەیوەست بووە بە گەلێك پیشەی تر کە هەر یەکەی تەواو کەری ئەوی تریان بووە، بۆیە کۆمەڵێك کەس کاریان کردووە لەو گەرماوەدا تا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی جوانو پوخت پێشوازی لە خەڵکی بکەن بۆ خۆشوشتن.

- دەلاك:

یەکێك بووە لەو کەسانەی کە دەورێکی باڵای هەبووە بە کاری شێلانو شوشتنی ئەو کەسانەی کە پێویستی کردووە بیانشۆن، بۆیە دەلاك خاوەن تایبەتمەندی خۆی بووە لەو کارەی کە کردوویەتیو توانای ڕەوشتی ئەو کەسە بە توانایی ئەو دەلاکەی دەرخستووە کە توانیویەتی پێشوازی خەڵك بکات لەو گەرماوەدا.

- خاوەن گەرماوە:

ئەو کەسەیە کە لە ڕووی کاریگێرییەو دەورێکی باڵای هەیە لە ڕاپەڕاندنو ڕێکخستنی ئیشەکانی ناو گەرماو لە جێبەجێکردنی پێویستییەکانی دارو ئاگرو ئاو و کەرەستەکانی خۆشوشتن، تا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ئیشەکان جێبەجێ بن.

- گولخان:

بەو کەسە دەوترێت کە هەڵدەسێت بە ئاگردانی کوورەی حەمامەکەو گەرمکردنی ئاوی پێویست لە نێو حەمامەکەدا بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان دەشوشت، چونکە لە ڕابردوودا زۆربەی گەرماوەکانی کەرکوك کاریان دەکرد بە سوتانی

عابۆ عەلوان) کەسایەتی میللی لەگەڵ حاجی ئەحمەد دەلاك) لە گەرماوی دەدە حەمدی

حاجی جومعە مستەفا زەینەڵ سۆرانی

دار یان بە نەوتی ڕەش، بەڵام لە دواییدا پەرەمێزی نەوتی جێگای گرتەوە.

- چایەچی:

بەو کەسە دەوترێت کە لە نێو حەمامدا هەڵدەستێت بە ڕێکخستنو ئامادەکردنی چایو فرۆشتنی سازگو شیرو دارچینو لیمۆ بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان دەشۆنو لە هۆڵی گەرماوەکە پشوو دەدەن، پێویستیان بە خواردنەوەی جۆراوجۆرە بۆ هێورکردنەوەی لەشو گیانیان.

ئەوەی لە گەرماوەکانی کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت بوونی گەرماو هەبوو تایبەت بە پیاوان یان بە ژنان، یان هەبووە بۆ هەردووکیان بەکارهێنراوە هەر یەکەی لە کاتو ساتی دیارکراودا.

* گرنگترین گەرماوەکانی کەرکوکدا:

١. گەرماوی (عەلی بەك)، لە گەرەکی بەگەکان.

٢. گەرماوی (قەرە نوری)، لە گەرەکی (ساحة طیران)، نزیك مزگەوتی (محەمەد فاتیح)، لە ئێستادا ڕووخاوە.

٣. گەرماوی (ئەلشیفا)، لە گەرەکی شەقامی کۆماری، خێزانی نەوتچییەکان دروستیان کردووە.

٤. گەرماوی (ئەلفەرەح)، لە شەقامی کۆماری، نزیك گازینۆی (ئەحمەد ئاغا)ی کۆن بوو.

٥. گەرماوی (ئەلجمهوریە)، لە شەقامی کۆماری، نزیك هەراجخانە، (حاجی حوسێن حەمامچی) دروستی کردووە.

٦. گەرماوی (داود) بۆ پیاوان، لە شەقامی ئەلماس، بەرامبەر باخچەی (ئوم ئەلرەبیعەین) بوو، بەڵێندەر (سلێمان سەعید) دروستی کردووە.

٧. گەرماوی (ئەلهەنا) بۆ ئافرەتان، لە نزیك گەرماوی (داود) بوو.

٨. گەرماوی (ئەلساعە)، لە شەقامی کۆڕنیش بوو.

٩. گەرماوی (ئەلسەرای)، لە شوێن باخچەی مەجیدیە بوو، ئێستا نەماوە.
١٠. گەرماوی (ئەلقەلعە)، لەو شوێنەی کە ناوی گەڕەکی حەمام لەسەر قەڵا بوو، ئێستا نەماوە.
١١. گەرماوی (حاجی حەسەن) بۆ پیاوان، لە بەرامبەر مزگەوتی (نوعمان) بوو.
١٢. گەرماوی (ئەتلەس)، لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن)، (حاجی خورشید) دروستی کردووە.
١٣. گەرماوی (پیریادی)، (تۆقات) بۆ پیاوان و ژنان، لە شەقامی (سەلاحەددین)، لە گەڕەکی (پیریادی).
١٤. گەرماوی (شۆڕیجە)، لە بازاڕی شۆڕیجە، خاوەنەکەی (سەیید نوری) بوو.
١٥. گەرماوی (پیریادی)، نزیك گەراجی سلێمانی، ڕووخێنراو لە شوێنی مزگەوتی (ئەلئەقسا) بنیاتنرا.
١٦. گەرماوی (هیندییەکان)، نزیگ مزگەوتی (مەلا ڕەزای واعین).
١٧. گەرماوی (ئەلشیفا)، (شۆڕ حەمام)، نزیك خان خورما و مزگەوتی ئیلیاس، (حاجی سالح) دروستی کردووە.

حاجی ئەحمەد چرداغلو

عەبدوڵلا زەینەل

١٨. گەرماوی (عەزیز ئەفەندی) یان گەرماوی (ئەلشەباب)، بۆ پیاوان، لە بازاڕی حەلواچییەکان.
١٩. گەرماوی (جووت حەمام)، لە نزیك ئەمنی کەرامی کۆن، بەرامبەر قەڵا.
٢٠. گەرماوی (بولاق)، لە گەڕەکی بولاق نزیك مزگەوتی (خادم سوجادە)، خاوەنەکەی (حاجی سالح) بوو.
٢١. گەرماوی (کەرکوك)، لە نزیك قەڵا لە تەنیشت سینەما (خەیام)ی کۆن، خاوەنەکەی (جومعە سۆرانی) بوو.
٢٢. گەرماوی (ئەلسحی-الصحي)، لە شەو بۆ پیاوان و لە ڕۆژدا بۆ ئافرەتان، لە گەڕەکی موسەڵلا، شەقامی قەسابخانە، خاوەنەکەی (محەمەد ئەمین ئەلسەراف) بوو.
٢٣. گەرماوی (گوزگولو-ئاوێنەدار)، لە نزیك قەڵا بوو، ئێستا نەماوە.
٢٤. گەرماوی (دەدە حەمدی)، بۆ پیاوان و ئافرەتان، لە گەڕەکی (چای)، خاوەنەکەی (شێخ قودرەت) بوو.
٢٥. گەرماوی (دوێرت)، بەرامبەر مزگەزتی (نائیب) بوو، چوار گەرماوی جیاجیا و لە تەنیشت یەك بووە و هەر یەکە ناوی خۆی هەبوو.
٢٦. گەرماوی (حاجی عەبدولباقی)، بۆ پیاوان، لە گەڕەکی ئاسنگەرەکان، (حاجی مستەفا) بنیاتی ناوە.
٢٧. گەرماوی (خاسە)، خاوەنەکەی (قادر حەمامچی).
٢٨. گەرماوی (جمهوری)، خاوەنەکەی (نوری سالح).
٢٩. گەرماوی (گاورەکان).
٣٠. گەرماوی (شێخ قابیل).

محەمەد حوسێن مەحمود حەمامچی

## * پیشەی چایخانەو قاوەخانەکانی کەرکوك:

ئەم پیشەییە بە یەکێك لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کەرکوك دادەنرێت لە کۆن و نوێدا، دەبینین ئەو شوێنانەی کە قاوەی تێدا پێشکەش دەکرا لە کۆندا چای تێدا نەبوو، چونکە بە کارهێنانی چای لە کەرکوك بۆ ساڵی (١٩٠٠)ی زایینیی دەگەڕێتەوە، هەروەها قاوەخانەو چایخانەکانی کەرکوك هەر یەکەی شوێنێکی تایبەتی هەبوو، بەشێکی پەیوەست بوو بە رۆشنبیران و نووسەران و فەرمانبەران، بەشێکی تریشی تایبەت بوو بە کرێکارو هاوپیشەکان.

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە کەرکوکدا کە شوێنی قاوەخانەو چایخانەکان جێگای شانۆ بووە بۆ ئەوانەی جۆرەها چیرۆکی فلکلۆرییانەی گێڕاوەتەوە، وەکو (عەنتەر کوری شەداد، رۆستەم زاڵ، غازی پاڵەوان، فەزولی، کور ئۆغلو)، یان هەندێکیان جێگای خوێندنەوەی شیعری شاعیرە کۆنەکان بووە.

هەندێك لە قاوەخانەکانی کەرکوك جێگای یاریکردنی شەترەنج و دامەو تاولی و کاغەز بوونە، لە هەمان کاتدا گەلێك لە خواردنەوە گازییەکانی وەکو (مشن و ئۆملیت و سیفۆن)و رۆژنامەو گۆڤارو نێرگەلەی تێدا دادەنرا.

ئەوەی بەرچاو دەکرێت لە قاوەخانەکانی کەرکوکدا بە تایبەتی لە مانگی رۆژنامەدا یاری کردنی (سین و زەرف) بووە، کە بە یەکێك لە یارییە فلکلۆرییەکانی کەرکوك دادەنرێت کە هیچ پارێزگایەك وەکو کەرکوك تایبەتمەندی خۆی وەرنەگرتووە، چونکە لەبەر ئەوەی لە هەموو شوێن و کووچەیەکی ئەم شارەدا گەورەو بچووك عەودالی دەبن و چێژی کات بردنە سەری لێ وەردەگرن، بە تایبەتی لە گەڕەکەکانی (قۆریە، زێویە، بەگەکان، ئاخور حوسێن، چقور، ساری کەهیە)، لە هەمان کاتدا ئەم یارییە پێشبڕکێی پێ دەکرا لەنێوان ناوچەکان (خورماتوو، داقوق، کەرکوك)دا.

کەرەستەکانی ئەم یارییە بریتی بوونە لە (سینی، فنجان، بنجوق، بەتانی، حەسیر، قەڵەم و کاغەز) لەگەڵ بەکارهێنانی شیلەی شەکر بۆ تەڕکردنی سینییەکان تا بۆ ئەوەی فنجانەکان نەکەونە خوارەوە، لە هەمان کاتدا گەلێك مەقامزان و قۆریات خوێن لە مانگی رۆژنامەدا بە دەنگەکانیان قاوەخانەکانیان دەرازاندەوە.

### * چایخانەو قاوەخانەکانی کەرکوك:

١. (دایی جەلیل تۆفیق محەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢. (ئەسغەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣. (سەیید شاکر)، لە گەڕەکی پیریادی لە نزیك دەبابەخانە بوو.
٤. (رەشید گولە رەزا)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥. (حەمە نەجم)، لە گەڕەکی ئاوچی، بازاڕی تەنەگچییەکان بوو.
٦. (سەیید وەهاب)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٧. (ئیسماعیل-سمە)، لە گەڕەکی (موسەڵلا) بوو.
٨. (موسەڵلا)، گەڕەکی موسەڵلا، لە پشت قوتابخانەی (موسەڵلا).
٩. (ئەسلان یواسی)، لە نزیك قەسابخانەی کۆنی کەرکوك،

بە سەرپەرشتی (دایی حەسەن)و (فائیق دەمیرچی)، لە سەرەتادا لەشەقامی (ئەتلەس) بووەو خاوەنەكەی (عەزە)و (جەسەن تاوقلی) بوو.

١٠. (دایی نوری قویوقزان)، بازاڕی گەورە.

١١. (ئەلقەیسەرییە)، بە سەرپەرشتی (حەسەن چایچی)و (دایلە چایچی) شاگرد بوو لەوێ.

١٢. (عەلی جرباو)، لە بەرامبەر گەرماوی (حەسەن) بوو.

١٣. (مەلا بولبول)، لە ناو قەیسەری (قیردان) بوو.

١٤. (مالی)، لە بازاڕی گەورە لە تەنیشت ئاسنگەرەكان بوو، بە سەرپەرشتی (وەلی چایچی).

١٥. (حەمدی)، لە نزیك خانی (حاج رەئووف) بوو.

١٦. (قالندەر)، لەژێر ئۆتێلی (یلدز) بوو.

١٧. (كەچەل ئەحمەد)، لە كۆتایی گەڕەكی (چای) لە نزیك مزگەوتی (مەلا عوسمان) بووە.

١٨. (یوسف)، لە (موسەللا) لە سەرەتای گەڕەكی (چقور) بوو.

١٩. (ئیسماعیل شەوقی- عەرەب چایخانەسی)، لە پشت قەیسەرییەوە بوو.

٢٠. (مناره ئەخشینە)، لە گەڕەكی (شۆریجە)و خاوەنەكەی (ئەسعەد عارف ئاغا) بوو.

٢١. (عوسمان)، بە سەرپەرشتی (شاكر چایچی) بوو.

٢٢. (عوسمان تیری)، لە گەڕەكی (تەندورچی) بوو.

٢٣. (سەیید عاشور)، لە گەڕەكی (ئیمام قاسم) بوو.

٢٤. (محەمەد غەریب)، لە نزیك گەرماوی (حاجی باقی) بوو.

٢٥. (جووت قاوە)، لە بازاڕی گەورە بوو.

٢٦. (حەبیب عەباس)، لە بازاڕی گەورە بوو.

٢٧. (مەحمود قەلایی)، لە نزیك سینەما (خەیام)و بنكەی پۆلیسی (ئیمام قاسم)ی كۆن بووە.

٢٨. (مستەفا قەلایی)، ئێستا شیرەمەنی (ئەلقەتتان) لە شوێنی دروست كراوە.

٢٩. (لەتیف)، لە بازاڕی گەورە بوو.

٣٠. (ئوستە عوسمان ئەشعە)، لە پشت گەرماوی (حاجی حەسەن) بووە.

٣١. (ساری سیسە)، لە پشت گەرماوی (حاجی حەسەن) بووە.

٣٢. (محەمەد عەنتەر)، لە سەرەتای بازاڕی تەنەگچییەكان بوو.

٣٣. (خوێلو محەمەد)، لە گەڕەكی (خان خورما) بوو.

٣٤. (محەمەد گوڵناز)، لە گەڕەكی (شۆریجە)، دەهۆڵ ژەنەكان لەوێ كۆدەبوونەوە.

٣٥. (ئاشیرین)، لە گەڕەكی (چای)و خاوەنەكەی (عەدنان) بووە.

٣٦. (مەجیدییە)، لە شەقامی (مەجیدییە)و خاوەنەكەی (حاجی سابیر سدیق ئەلقافلی) بووە.

٣٧. (تۆپال سابیر)، لە نزیك گەراجی پاشایی لە شەقامی (مەجیدییە) بووە.

٣٨. (شكاو)، لە شەقامی (مەجیدییە)و خاوەنەكەی (شاكر ئەحمەد) بوو.

٣٩. (سۆلو چایخانە) لە شەقامی (مەجیدییە) بوو، لە شوێنی سەنتەری رۆشنبیری ئەمریكی بووە، لە بەرامبەر ئۆتێلی (ئەحمەد پالاس)، بە سەرپەرشتی (مەحمود سێوە) بووە، ناوەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی جۆگایەكی ئاو لە ناوەڕاستییەوە ڕێی دەكرد، مێزی بلیاردی لێ بوو، یاریزانەكانیش كۆمەڵێ خەڵكی رۆشنبیر بوون وەكو دكتۆرو ئەندازیارو سەیدەلانی.

٤٠. (تاها چایچی)، لە شەقامی (مەجیدییە) بووە، خاوەنەكەی باوكی رۆشنبیر (مەولود تاها قایەچی) بوو.

٤١. (ئیسماعیل ئاغا چایچی)، لە نزیك باخچەی (مەجیدییە) بوو.

٤٢. یانەی شەوانەی (كەركوك)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو، لەوێ (فائیزە ئەحمەد) وەرزێكی تەواو لە ساڵی (١٩٥٤) گۆرانی وتووەو هەروەها گۆرانیبێژی میسری (عەبدولموتەلیب)و (زەكیە جۆرج) بۆ چەند شەوێك گۆرانییان وتووە، لە ساڵی (١٩٥٦) بە هۆی كوشتنی چوار كەس لە شەڕێكدا لەم یانەیە لە ناوی ئەم شوێنە داخرا.

٤٣. (دایی خەلیل)، لە شەقامی (غازی) -شەقامی (ثورة)ی ئێستا- بوو.

٤٤. (وەستا سەعدی)، لە شەقامی (غازی) جاران نزیك گەراجی (باقی ئاغا) بوو.

٤٥. (سەیید رەشید)، لە شەقامی (ئەوقاف) بووە.

٤٦. (ئەسعەد چایچی)، لە شەقامی (ئەوقاف) بووە.

٤٧. (ئەحمەد ئاغا)، لە پێشتر ناوی (گوزگولو چای) بوو، لە سەرەتای بازاڕی (قۆریە) بوو، خاوەنەكەی (ئەحمەد مەردان) بوو.

٤٨. (یەنگی ئەحمەد ئاغا-ئەحمەد ئاغای تازە)، لە گەڕەكی (ئەلماس) بوو.

٤٩. (مەلا عەباس مەلا وەلی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٠. (محەمەد شوانی و هاوەڵەكەی عەزیز)، لە بازاڕی (ئەوقاف).

٥١. (محەمەد عەلی موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو، هەروەها ناسراو بوو بە (مەلا مەحمود)و خاوەنەكەی (دایی رەئووف) بوو، لە دواییدا ناوەكەی گۆڕا بۆ (یەلدز)و بە سەرپەرشتی (عەزیز بەیاتی) بوو.

٥٢. (شاكر پلاوالی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٣. (حاجی مستەفا عەلوان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٤. (عەباس چایچی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٥. (عیزەددین حوسێن ساقی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٦. (سەیید حەسەن)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٧. (عومەر مەلا قادر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٨. (شاكر وەحید)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٥٩. (یولدرم)، لە بازاڕی (قۆریە)و خاوەنەكەی (موختار مەناف) بوو.

٦٠. (بێشكتاش) لە بازاڕی (قۆریە)و بە سەرپەرشتی (دایی مستەفا) بوو.

٦١. (موحسن)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٦٢. (جەمال مەحمود چایچی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

٦٣. (حەسەن ئوسە)، لە بازاری (قۆریە) بوو.
٦٤. (حوسێن ساقی حەقی)، لە بازاری (قۆریە) بوو.
٦٥. (قۆریە)، خاوەنەکەی (خدر وەلی) بوو، لە شوێنی دوکانەکانی (رەشید ئەسکەندەر) بوو.
٦٦. (ئیبراهیم چایچی)، لە بازاری (قۆریە) بوو.
٦٧. (گاورباغی)، لە گەرەکی (گاورباغی-جرید مەیدان) بوو.
٦٨. (مەحمود ئەحمەد)، لە گەرەکی (جرید مەیدان) بوو.
٦٩. (جیهاد)، لە گەرەکی (جرید مەیدان) بوو.
٧٠. (سەلاح-قامشلی چایخانە)، لە گەرەکی (جرید مەیدان) بوو.
٧١. (جرید مەیدانی)، لە گەرەکی (جرید مەیدان)و خاوەنەکەی (تارق چایچی) بوو.
٧٢. (جەلیل)، لە بالەخانەی (ئەبی حەنیفە) لە شەقامی کۆماری بوو.
٧٣. (ئەلنەسر ئەلمدوەرە)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٧٤. (حەمید شوکر بەك)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٧٥. (ئەمینە کوردە)، لە پشت مزگەوتی (حاجی باقی) بوو، چایخانەیەکی بچووك بوو عەرەبانچییەکان لەوێ پشوویان ئەدا بۆ چای خواردنەوەو عارەبانەکانیان لە پشت چایخانەکە رائەوەستان بۆ ئەوەی ئەسپەکانیان ئیسراحەت بکەن، یەکەم چایخانە بووە کە ژنێك سەرپەشتی ئەکرد لە دوای مردنی پیاوەکەی (جەلال عەرەبانچی) کە ئەمە یەکەم ژنی بوو، خەلفەیەکیش چایخانەکەی ئەبرد بەرێوە.
٧٦. (گازینۆ شەباب) لە نزیك مزگەوتی (ئیبراهیم)و خاوەنەی (عوسمان کۆپرلو) بوو.
٧٧. (تۆپال محەمەد)، لە شەقامی کۆماری بوو.
٧٨. (عیزەت)، لە شەقامی کۆماری بوو.
٧٩. (عەلی مەردان)، (تۆپال محەمەد)، لە شەقامی کۆماری بوو.
٨٠. (محێدین-ئەم مەلسوم چایخانەسی)، لە شەقامی کۆماری بوو.
٨١. (زوهێر)، لە گەرەکی شاترلوو بوو.
٨٢. (عەبدوڵلا موختار سەمەد)، لە بنکەی شەمەندەفەری کەرکوکی کۆن بوو.
٨٣. (قەرە-قەرە چایخانەسی)، لە گەرەکی (بەگەکان) بوو.
٨٤. (ئەحمەد جاسم)، لە گەرەکی (بەگەکان)و نزیك گەرماوی (عەلی بەگ) بوو.
٨٥. (دایی لەتیف)، لە گەرەکی (بەگەکان)و نزیك گەرماوی (عەلی بەگ) بوو.
٨٦. (عومەر چایچی)، لە گەرەکی (بەگەکان) لە بەرامبەر گەرماوی (عەلی بەگ) بوو.
٨٧. (قەنبەر چایچی)، (رەشید کولو رەزا) لەوێ دادەنیشت.
٨٨. (شێخ جرجیس)، نزیك بانکی (رافیدەین)ی ئێستا.
٨٩. (بەیات)، لە شەقامی (ئەتلەس)و خاوەنەکەی (سامی ئەحمەد مستەفا)و بە سەرپەرشتی (محەمەد تبلاباش قەلعەلی) بوو.
٩٠. (شەهید عوسمان خدر)، لە شەقامی (ئەتلەس) بوو.
٩١. (برناو)، لە شەقامی (ئەتلەس) بوو.

٩٢. (ئالتون کۆپری)، لە بەرامبەر سینەمای (ئەتلەس) بوو.
٩٣. (مەحمود چایچی و محەمەد چایچی)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.
٩٤. (کەماڵ-کەماڵ چایخانەسی)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.
٩٥. (حەمەد سەمونچی)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.
٩٦. (حەمدی)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.
٩٧. (ڕەزا خان)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.
٩٨. (سەیید خەلیل نەجار-گازینۆ کەربەلا)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.
٩٩. (ڕەشید-ڕەشید چایخانەسی)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.

*** قاوەچییەکانی شاری کەرکوك:**

هەر چەندە ئەم پیشەیە شوێنێکی دیاریکراوی نییە لە نێو بازاردا، هەر چەندە هاوپەیوەستییەکی تەواوی نییە لەگەڵ خەڵکی بازار، بەڵام بە یەکێك لەو پیشانە دادەنرێت کە بەردەوام لە هاتووچۆدایە لە شوێنێك و بۆ شوێنێکی تر، بۆیە هەردەم لە گەڕاندان بە هەموو کەرەستەکانی فرۆشتنی قاوە، وەکو: (فنجانی قاوە، ئاو، قاوەدان)، لە هەمان کاتدا پیشەی قاوەچێتی بە زۆری لە ئاهەنگ و پرسەکان و یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر، بۆیە دەبینین لە پرسەکاندا لە یەکەم ڕۆژ و دووەم ڕۆژدا قاوەی تاڵ پێشکەش دەکەن بەڵام لە سێیەم ڕۆژدا قاوەی شیرین پێشکەش دەکەن.

١. مەحمود مەحمود قاوەچی.
٢. سەعدوڵڵا قاوەچی.
٣. عەباس بەگ قاوەچی، بووە خاوەن چایخانە لە بازاڕی (قۆریە).
٤. حوسێن ڕەفیق قاوەچی.
٥. عادل قاوەچی.
٦. وەلید قاوەچی.
٧. ئالان قاوەچی.
٨. دەروێش حەسەن قاوەچی.
٩. حاجی نورەددین قاوەچی.
١٠. شوکر محەمەد قاوەچی، چایچییەکی گەڕۆك بوو.
١١. حاجی مەجید قاوەچی و کوڕەکانی فایق و ئیبراهیم، لە گەڕەکی (موسەڵڵا).
١٢. حاجی شەریف قاوەچی و کوڕەکانی ئیسماعیل و کەریم، لە گەڕەکی (ئاوچی).
١٣. حاجی مستەفا قاوەچی و کوڕەکانی نورەددین و فەخرەددین، لە گەڕەکی (بولاق)، لە هەمان کاتدا دروستکەری قاوە بووە لە چایخانەی (جوت قاوە).
١٤. یوسف قاوەچی، هونەرمەندی مەقامی عێراقی بووە.
١٥. ئیلهام مەلا بورهان قاوەچی.
١٦. قاسم نورەددین قاوەچی.
١٧. حاجی ئیسماعیل قاوەچی.
١٨. سەیید مەحمود سەیید نوکە.
١٩. سەیید سەیفەددین سەیید نوکە.
٢٠. سەیید قاسم سەیید نوکە قاوەچی.
٢١. فەرەیدون حوسێن قاوەچی.
٢٢. عەلی قاوەچی.
٢٣. هیجران عوسمان قاوەچی.
٢٤. عەزیز قاوەچی.
٢٥. حاجی ئیبراهیم قاوەچی.
٢٦. عەباس ئیبراهیم ئالبەند.
٢٧. حەمود قاوەچی.
٢٨. نەجدەت قاوەچی.
٢٩. محەمەد تەبلەباش، برای هونەرمەندی تورکمانی (عوسمان تەبلەباش).
٣٠. قادر قاوەچی، لە بازاڕی (جووت قاوە).
٣١. حاجی جەرجیس قاوەچی، لە بازاڕی (جووت قاوە).

### * پیشەی سەرتاشی-دەلاك:

ئەم پیشەیە زۆر بەناوبانگە لە کەرکوکدا بەوەی کە هەموو نەهێنی خەڵکی دەزانێ لە نێو شارەکەدا، بەشێك لەمانە لە نێو دوکان یان لە نێو گەرماوەکان یان لە نێو نەخۆشخانەکان کاریان کردووە، بەشێکیان وەکو گەڕۆك بە گەڕەك‌و لادێیەکاندا گەڕاون بۆ سەرتاشی.

پیشەی سەرتاشی دەورێکی باڵای هەبوو بۆ کاتی ئاهەنگ‌و شایی کە هەر یەکە لە بووك‌و زاوا سەردانیان دەکرد.

لەم هەمان کاتدا پیشەی سەرتاشی پیشەیەك بوو کە کەسایەتی ئەو کەسەی بەدەر خستووە لە ڕووی پاك‌و تەمیسی‌و خاوێنی‌و ڕەوشت بەرزی، لە هەمان کاتدا دوورگرتنی لە نەخۆشی لەبەر ئەوەی کەسێکە بەردەوام هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ خەڵکی شارەکە هەیە.

کەرەستەکانی سەرتاشین بریتییە لە (گوێزان، خاولی، پەموو، کەرەستەی پاقژکردنەوە، قاچی، ئامێری سەرتاشین، زاخ).

لە پاڵ کارەکانیان وەکو سەرتاشی لە هەمان کاتدا کاری دانسازی‌و سوونەت‌و کەڵەشاخ‌و دەرمانی دەم‌و دەرمانی سووتاو و بیرۆکە‌و دوومەڵە کوێرە (ناسوور)یان کردووە، هەندێکیان بە لادێیەکاندا گەڕاون بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا.

*** وەستا سەرتاشەکان:**

١. وەستا (شوکور بەربەر)، سەرتاش‌و برینپێچی میللی، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢. وەستا (فوئاد شوکور بەربەر)، سەرتاش‌و برینپێچی میللی، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣. وەستا (حوسێن تۆفیق).
٤. وەستا (بورهان بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥. وەستا (مەلا عومەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٦. وەستا (حیکمەت بەربەر)، لە گەڕەکی (موسەڵڵا) بوو.
٧. وەستا (عوسمان بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٨. وەستا (غالیب بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٩. وەستا (فەیسەل عەباس بەربەر-شەن بەربەر)، لە بازاڕی (گەراج حەویجە) بووە.
١٠. وەستا (سەیید مستەفا بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١١. وەستا (ڕەشاد فەتحوڵڵا بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو، لە پیشەی سەرتاشی وازی هێنا و بوو بە موختاری گەڕەك لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو.
١٢. وەستا (ئەنوەر بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٣. وەستا (حەسەن بەربەر-ئەبو شوارب)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٤. وەستا (نورەددین بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٥. وەستا (حاجی تاهیر بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٦. وەستا (عەلی غەنی)، باوکی (مەلا حەقی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٧. وەستا (سمە بەربەر-سەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٨. وەستا (نوری ڕەفیق)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٩. وەستا (بەهجەت بەربەر)، لە (گەراجی حەویجە)ی بازاڕی گەورە بوو.
٢٠. وەستا (سەلاح بەربەر).
٢١. وەستا (ڕەفعەت عەلی بەربەر)، خاوەنی سەرتاشخانەی (ئیخلاس) بوو لە گەڕەکی (چای).
٢٢. وەستا (حاجی مەحمود)، لە گەڕەکی (چای) بوو.
٢٣. وەستا (سەیید مستەفا بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.

٢٤. وەستا (ئیحسان بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٥. وەستا (کناو بەربەر)، سەرۆکی سەرتاشەکان بوو لە بازاڕی گەروە.
٢٦. وەستا (محەمەد عەلی)، لە بازاڕی گەورە بوو لە تەنیشت مزگەوتی (قیردار).
٢٧. وەستا (جەماڵ بەربەر)، لە گەڕەکی (چای) بوو.
٢٨. وەستا (حەمزە بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو نزیك (خان خورما) بوو.
٢٩. وەستا (مەحمود بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو بەرامبەر (گەراجی حەویجە).
٣٠. وەستا (فەخرەددین بەربەر)، لە بازاڕی ئاسنگەرەکان بوو.
٣١. وەستا (ئەحمەد بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٢. وەستا (حاجی مەحمود محەمەد بەربەر)، لە بازاڕی حەلواچییەکان بوو.
٣٣. وەستا (کەریم بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٤. وەستا (محەمەد بەربەر)، لە بازاڕی حەلواچییەکان بوو.
٣٥. وەستا (قەنبور مەلا عومەر)، لە بازاڕی حەلواچییەکان بوو.
٣٦. وەستا (سلێمان بەربەرو کوڕەکانی حوسێن و عەباس)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٧. وەستا (سەیفەددین بەربەر)، لە بازاڕی حەلواچییەکان بوو.
٣٨. وەستا (عیزەددین بەربەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٩. وەستا (مەحمود بەربەر)، لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن) بوو.
٤٠. وەستا (عەلی عەبدوڵڵا ئەمین بەربەر)، لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن) بوو.
٤١. وەستا (عەبدوڵڵا ئەمین بەربەر)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بەرامبەر قەڵا بوو.
٤٢. وەستا (حاجی خالد بەربەر)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٤٣. وەستا (مەمەد بەربەر)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٤٤. وەستا (جەماڵ عومەر ئاغا بەربەر)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٤٥. وەستا (ئەحمەد بەربەر)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٤٦. وەستا (ئیبراهیم بەربەر-حەپە)، لە بازارەی (حەسیرەکە) بوو.
٤٧. وەستا (بۆغز بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٤٨. وەستا (کریکور بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٤٩. وەستا (وەهان بەربەر)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥٠. وەستا (خاجیك بەربەر)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٥١. وەستا (دکران بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥٢. وەستا (ئارام بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥٣. وەستا (عیزەددین بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥٤. وەستا (ڕەشاو بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥٥. وەستا (زەنولعابیدین بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥٦. وەستا (سەرکیس بەربەر)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥٧. وەستا (ئاکۆب بەربەر)، لە نزیك ئۆتێلی (پالاس) بوو، بە ڕەگەز ئەرمەنیی بوو.
٥٨. وەستا (خەلیل بەربەرو هاوەڵەکەی ئیسحاق ئاکۆب)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو، دواتر گواسترایەوە بۆ گەڕەك (عەرەفە).
٥٩. وەستا (محەمەد ئەمین بەربەر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٦٠. وەستا (مەجید بەربەر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٦١. وەستا (عەبدولقادر بەربەر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٦٢. وەستا (حاجی مەحمود بەربەر- قەرەقۆز)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٦٣. وەستا (ئەمین بەربەر)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٦٤. وەستا (عەدنان بەربەر)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٦٥. وەستا (ئایدن بەربەر)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٦٦. وەستا (حەمید بەربەر)، سەرتاشخانەی (بەیروت) لە

KARKUK
BARBER
FIVE Months.
Unit NO NIL

بڕوانامەی فەرمانی پیشەی سەرتاشی لە سەردەمی ئینگلیزەکان

شەقامی (کۆماری) بوو.
٦٧. وەستا (ئیحسان بەربەر)، لە بەرامبەر هەڕاجخانە بوو لە شەقامی (کۆماری).
٦٨. وەستا (عومەر نەجم بەربەر)، سەرتاشخانەی (ئەلحورییە) لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٦٩. وەستا (ئارام بەربەر)، بە ڕەگەز ئەرمەنی بوو، لە بەرامبەر مزگەوتی (ئیبراهیم بەگ).
٧٠. وەستا (ئەحمەد بەربەر)، لە بەرامبەر مزگەوتی (ئیبراهیم بەگ) بوو.
٧١. وەستا (قابیل بەربەر)، لە نزیك سنەما (حەمرا) بوو.
٧٢. وەستا (تۆفیق بەربەر)، سەرتاش و برینپێچی میللی بوو لە بازاڕی (قۆریە).
٧٣. وەستا (زەینەڵ بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٤. وەستا (حەمید بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٥. وەستا (مەحمود بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٦. وەستا (عومەر کوکو بەربەر)، سەرتاش و برینپێچی میللی بوو لە بازاڕی (قۆریە).
٧٧. وەستا (شوکور وائیلی)، لە سەرتای بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٨. وەستا (شوکور بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٩. وەستا (ئەحمەد بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٠. وەستا (جومعە بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨١. وەستا (مەحمود ڕەشید سەحەر بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٢. وەستا (ئەحمەد جومعە بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٣. وەستا (مەلا عەبدوڵڵا بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٤. وەستا (سەعید بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٥. وەستا (ڕەفعەت بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٦. وەستا (سدیق بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٧. وەستا (تارق مستەفا بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٨. وەستا (قادر بیرەقدار بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٩. وەستا (سلێمان ئەحمەد بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٠. وەستا (عەلی ح ەیدەر جومعە بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩١. وەستا (جەماڵ ئەحمەد بوشناك بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٢. وەستا (حوسێن بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٣. وەستا (مستەفا بەربەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٤. وەستا (مەجید محەمەد سالح عەبدی بیرەقدار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٥. وەستا (محەمەد مەردان)، برای (ئەحمەد ئاغا)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٦. وەستا (سەلمان محەمەد شەریف چولبوی بەربەر)، لە گەرەکی (جرید مەیدان).
٩٧. وەستا (ئیسماعیل بەربەر)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٩٨. وەستا (شاکر بەربەر)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
٩٩. وەستا (سەباح ئیسماعیل بەربەر)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

١٠٠. وەستا (ئیسماعیل بەربەر)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
١٠١. وەستا (حەسەن ئەبو سەباح)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
١٠٢. وەستا (ئەبو داود بەربەر)، سەرتاشێکی گەڕۆك بووە.
١٠٣. وەستا (ئەحمەد بەربەر)، لە بازاڕی (عەسری) بوو.
١٠٤. وەستا (سهیاك بەربەر)، لە گەڕەکی (عەرەف) بوو.
١٠٥. وەستا (وازگێن بەربەر)، لە گەڕەکی (عەرەف) بوو.
١٠٦. وەستا (ئایدن بەربەر)، لە گەڕەکی (عەرەف) بوو.
١٠٧. (ئانوش بالوش یان)، بە ڕەگەز ئەرمەنی بوو، لەماڵی خۆی کاری دەکرد، کە دەکەوتە نزیك کڵێسەی ئەرمەنییەکان، لە نزیك مزگەوتی (حوسامەددین).
١٠٨. (زاروهی بایجان)، لە ماڵی خۆی کاری دەکرد لە نزیك قوتابخانەی (ئەلوەتەن) لە شەقامی (ئەلمەحەتە).
١٠٩. (تاکوهی ئاشخان یان)، لە ماڵی خۆی کاری دەکرد کە دەکەوتە پشت ئینزیباتخانەی کۆن و نزیك زیوتخانە.
١٠٩. وەستا (ڕەئووف)، سەرتاشی ئافرەتان و بووك بوو، لە شەقامی (مەجیدیە) نزیك ئۆتێلی (پالاس) بوو.
١١٠. وەستا (عەبدولمەجید شێخ باقی)، سەرتاشخانەی (عەبدولمەجید)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.
١١١. وەستا (ڕەحمانە جان).
١١٢. وەستا (ئەنوەر حەلاق جەباری).
١١٣. وەستا (دایی حەسەن)، لە گەڕەکی (موسەڵلا) بوو.
١١٤. وەستا (سەیید ئەمین)، لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن) بوو.
١١٥. وەستا (کەماڵ بەربەر)، لەسەر گەڕەکی (خاسە) بوو.
١١٦. وەستا (تەها بەربەر)، لە بەرامبەر مزگەوتی (نائیب) بوو.
١١٧. وەستا (قادر بەربەر).
١١٨. وەستا (تاریق عوسمان بەربەر).
١١٩. وەستا (موعتەسەم سەیید ئەحمەد).
١٢٠. وەستا (وەهاب حەمە شەفیق).
١٢١. وەستا (محەمەد سیروان)، لە بەرامبەر چایخانەی (خورشید) بوو.
١٢٢. وەستا (فایق سەیید ئەحمەد).
١٢٣. وەستا (سابیر حەلاق)، لە بازاڕی ئیسکان بوو.
١٢٤. وەستا (غازی ئەمین).
١٢٥. وەستا (عومەر ئەحمەد)، لە بازاڕی ئیسکان بوو.
١٢٦. وەستا (عەبدوڵڵا قادر).
١٢٧. وەستا (ئەحمەد خەسرەو).
١٢٨. وەستا (نامیق فارس).
١٢٩. وەستا (محەمەد فەیزوڵڵا).
١٣٠. وەستا (بەهائەددین بەربەر)، لە بازاڕی عاشور بوو.
١٢١. وەستا (عەبە حەلاق)، دوکانەکەی لە بازاڕی عاشور لە تەنیشت دوکانی (مەحمود قۆندەرەچی) بوو.
١٢٢. وەستا (سەعید عومەر بەبەر)، لە تەنیشت چایخانەی (خورشید-ئەشەرف) بوو.
١٢٣. وەستا (سەیید ئەحمەد)، لە بەرامبەر مزگەوتی (نائیب) بوو.
١٢٤. وەستا (ئەمین بەربەر-ئەمین سەیید وەلی)، لە شوێنی گەراجی (حەسەن کەڵە مێرد) بوو.
١٢٥. وەستا (نۆمەر بەربەر)، لە بەرامبەر نانەواخانەی (حاجی هیدایەت) لە ئیمام قاسم بوو.
١٢٦. وەستا (نوسرەت بەربەر)، لە بازاڕی (ئازادی) بوو.
١٢٧. وەستا (حەمید حەلاق)، لە بازاڕی (ئازادی) بوو.
١٢٨. وەستا (کەریم حەلاق)، لە بازاڕی (ئازادی) بوو.
١٢٩. وەستا (مەلا محێددین)، باوکی شەهید (ئاشنا)، لە گەڕەکی بولاق بوو.
١٣٠. وەستا (جەماڵ) و براکانی، لە بازاڕی ئیسکان بوون.
١٣١. وەستا (بارام کاکەیی).

*** سەرتاشە گەڕۆکەکان:**

١. وەستا (مەلا بیتاقە-یەحیا)، لەلای بازاڕی مریشك فرۆشەکان بوو، لە پاڵ دەلاکیدا بیتاقەشی دەفرۆشت.
٢. وەستا (سدق)، لەلای بازاڕی مریشك فرۆشەکان بوو.
٣. ناوی نازاندرێت، لە پشت مزگەوتی (نائیب) بوو.
٤. وەستا (عوسمان شەش پەنجە).

عەبدوڵڵا ئەمین بەربەر

خەلیل بەربەر لەگەڵ کۆمەڵێك لە سەرتاشەکانی کەرکوك لە ساڵی ١٩٥٨

عیزەدین عەبدوڵلا عەزیز

شوکر وەندی

## * پیشەی بەنایی و خانوو دروستکردن و کورەچێتی :

ئەم پیشەیە زۆر بە ناوبانگە لە کەرکوك و گەرمیاندا لەبەر ئەوەی کەرەستەکانی بیناکاری لەم شارەدا دەستدەکەون، بۆیە کارکردنیش لێی زۆر ئاسانە لەبەر بوونی بەردی سپی و سوورو گەچ و قسل بە رێژەیەکی زۆر.

ئەم پیشەیە هاونگونجاوییەکی هەرەمی هەیە لەنێوان وەستاو خەلفەو شاگرد، کە هەر یەکەی بە پێی قۆناغی ئیشکردنی خۆی زانیاری بە دەست دێنێت لە پیشەکەیدا تا دەبێتە وەستایەکی کارامە.

هەندێك لە بەناکانی کەرکوك دەوری باڵایان بینیووە لە تەلارو باڵەخانەی سینەماو پردی گەور گەورەدا، کە تاکو شەستەکانی سەدەی رابردوو گەلێك لە پاشماوەکانیان لە کەرکوکدا مابوو.

هەندێك لەو بەنایانە دەستێکی باڵایان هەبوو لە هونەری نەخش و نیگارو رازانەوەی نێو کۆشك و باڵەخانەو خانووەکان.

١. وەستا (بەندە غەفوور)، (١٨٦٠-١٩٢٣).
٢. وەستا (خدر نەقاش)، سەدەی نۆزدەهەم.
٣. وەستا (عەلی رەسوڵ نەقاش)، (١٨٧٠-١٩٣٦)، لە گەرەکی (چقور) بوو.
٤. وەستا (ئیبراهیم عەبدوڵلا)، (١٨٦٤-١٩٢٩).
٥. وەستا (فەتحوش-فەتحوڵلا کەرکوکی).
٦. وەستا (حەمە مچاو-محەمەد مستەفا)و کورەکانی (عەزین)و (محەمەد)
٧. وەستا (محەمەد تەها)، (١٨٩٥-١٩٥٠).
٨. وەستا (مستۆ-مستەفا)، لە ساڵی (١٩٢٨) کۆچی دوایی کردووە.
٩. وەستا (ئیلیاس)، (١٨٧٠-١٩٤١).
١٠. وەستا (بەندە رەئووف)، (١٨٨٠-١٩٤٢).
١١. وەستا (رەفیق لوتفەڵلا)، لە گەرەکی (پیریادی) بوو.
١٢. وەستا (حەسەن رەسوڵ نەقاش)، (١٨٩٥-١٩٨٠)، ماڵی لە (پیریادی) بوو.
١٣. وەستا (کەماڵ ئەحمەد گۆزەچی ئۆغلو)، لە بازاڕی گەورە لە گەرەکی (چای) بوو.
١٤. وەستا (جەلیل بەندە ئۆغلو)، لەسەر قەڵا بوو.
١٥. وەستا (عیزەت مەحمود بایرام)، (١٨٢٢-١٩٨٤).
١٦. وەستا (تۆپاڵ فایەق)و برا گەورەکەی (سورە مستەفا).
١٧. وەستا (سدیق بەندە غەفوور)، (١٩١٤-١٩٨٧).
١٨. وەستا (محەمەد چکور)، (١٩١٨-١٩٨٨).
١٩. وەستا (ئیسماعیل چکور)، لە گەرەکی (ئاوچی) بوو.
٢٠. وەستا (عوسمان چکور)، لە گەرەکی (ئاوچی) بوو.
٢١. وەستا (حوسێن عەبدولغەنی ساقی)، لە ساڵی (١٩٢٩) لەدایکبووە.
٢٢. وەستا (شوکور پاڵەوان)، لە ساڵی (١٩٧٨) کۆچی دوایی کردووە.
٢٣. وەستا (ساڵح محەمەد بەکر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٤. وەستا (ئەحمەد)، لە بازاڕی گەورە لە گەرەکی (عەرەب) بوو.

محەمەد جۆکەر

محەمەد عەلی ئیبراهیم

٢٥. وەستا (محەمەد)، لە بازاڕی گەورە لە گەڕەكی (عەرەب) بوو.
٢٦. وەستا (تاهیر حوسێن سەمەد حەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٧. وەستا (تورك محەمەد) كوڕی (حۆری نەنە)، لە گەڕەكی (ئاوچی) بوو.
٢٨. وەستا (سەیید حوسێن محەمەد عەبدولقادر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٩. وەستا (سەیید عومەر محەمەد عەبدولقادر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٠. وەستا (ئیسماعیل عوسمان محەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣١. وەستا (سەیید خدر محەمەد عەبدولقادر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٢. وەستا (سەیید ئەحمەد قادر دەباغ)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٣. وەستا (سەیید عیزەت قادر دباغ)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٤. وەستا (سەیید مستەفا كەمال ئەحمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٥. وەستا (ئەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٦. وەستا (عومەر-گوچوك عومەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٧. وەستا (ئیبراهیم وەهاب)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٨. وەستا (ئەحمەد گۆزەچی ئۆغلو)، لە بازاڕی گەورە بوو، لە گەڕەكی (چای) بوو.
٣٩. وەستا (مستەفا قادر بەنا)، لەساڵی (١٩٤٥) كۆچی دوایی كردووە، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٤٠. وەستا (عەزیز مستەفا قادر بەنا)، (١٨٩٧-١٩٥٩)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٤١. وەستا (حاجی عوسمان ئیبراهیم ئەلقافلی)، (١٨٩٥-١٩٧٣).
٤٢. وەستا (محەمەد عەلی ئیبراهیم ئەلقافلی)، (١٨٩٨-١٩٧١).
٤٣. وەستا (حاجی نورەددین مەحمود)، لە ساڵی (١٩٢٤) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٤٤. وەستا (حەسەن باقی)، لە ساڵی (١٩٢٧) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٤٥. وەستا (حاجی قەنبەر حوسێن)، لە ساڵی (١٩٣٧) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٤٦. وەستا (زەینولعابدین زەینەل حەسەن)، لە ساڵی (١٩٤٠) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٤٧. وەستا (حاجی ڕەشید عەباس گوخە)، لە ساڵی (١٩٣٦) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٤٨. وەستا (مەحمود ئیبراهیم سەرخۆش)، لە ساڵی (١٩٢٧) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٤٩. وەستا (میقداد ئیبراهیم سەرخۆش)، لە ساڵی (١٩٢٧) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٥٠. وەستا (قەنبەر خەلیل دەروێش)، لە ساڵی (١٩٣٤) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.

عیزەت مەحموود بەیرام

٥١. وەستا (تۆفیق ئەكبەر كەوسەر ئاغا) لە ساڵی (١٩٢٣) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٥٢. وەستا (ڕەزا عەلی مەردان)، لە ساڵی (١٩٣١) لەدایكبووە، لە گەڕەكی (تسن) بوو.
٥٣. وەستا (هادی عەباس حەسەن گوڵ ئەندام)، (١٩٣١-٢٠١٠)، لە گەڕەكیس (تسن) بوو.
٥٤. وەستا (عومەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٥٥. وەستا (وەحید)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٥٦. وەستا (فەخرەددن ستار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٥٧. وەستا (نوری-نوری بزاو)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٥٨. وەستا (محەمەد عوسمان).
٥٩. وەستا (حەمە واحید).
٦٠. وەستا (محەمەد نوری).
٦١. وەستا (محەمەد مستۆ)، لە (جرید مەیدان) بوو.
٦٢. وەستا (حەسەن شەمە).
٦٣. وەستا (قادر).
٦٤. وەستا (خەلیل عوسمان).
٦٥. وەستا (عەلی).
٦٦. وەستا (جیهاد كەچەڵ).
٦٧. وەستا (ئیبراهیم بەكر ستار).
٦٨. وەستا (تۆفیق قەرە زەینەل).
٦٩. وەستا (ئەحمەد یابە).
٧٠. وەستا (شوكور قەرە زەینەل).
٧١. وەستا (عەبدوڵلا)، لە گەڕەكی (ئاخور حوسێن) بوو.
٧٢. وەستا (محەمەد خالید).

٧٣. وەستا (غازی خورشید).
٧٤. وەستا (حەکیم).
٧٥. وەستا (محەمەد بێ کەس).
٧٦. وەستا (محەمەد حەنگوڵ).
٧٧. وەستا (محەمەد ئەسڵی).
٧٨. وەستا (عومەر بەنا)، لە گەڕەکی (قۆریە) بوو.
٧٩. وەستا (سەیید محەمەد گەنجۆ).
٨٠. وەستا (شوکور سالح).
٨١. وەستا (محەمەد تەها)، لە گەڕەکی (پیریادی).
٨٢. وەستا (حەسەن مستۆ)، لەسەرەتادا لەسەر قەڵا بوو.
٨٣. وەستا حاجی ئەمین بەندە)، لە کۆنترین وەستا بوو لە کاتی عوسمانییەکان.
٨٤. وەستا (بەکر)، لە گەڕەکی (بولاق) بوو.
٨٥. وەستا (شوکور بەکر)، لە گەڕەکی (بولاق) بوو.
٨٦. وەستا (خورشید دامر)، لە گەڕەکی (بولاق) بوو.
٨٧. وەستا (خورشید زڵقچی-کەوش دوور)، لە گەڕەکی (بولاق) بوو.
٨٨. وەستا (وەهاب محەمەد).
٨٩. وەستا (مەجید محەمەد).
٩٠. وەستا (کەریم).
٩١. وەستا (نامیق توکمەچی).
٩٢. وەستا (عەبدوڵلا یوزرم).
٩٣. وەستا (مەمەد قایەچی).
٩٤. وەستا (سەیید بەهائەددین).
٩٥. وەستا (محەمەد خەلیفە قادر).

* **وەستاکانی قورکاری:**
٩٦. وەستا (ڕۆژنامە)، لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو.
٩٧. وەستا (ڕەشید چامرچی)، لە گەڕەکی (تسن) بوو.

* **کورەچییەکان:**
٩٨. (حەمیدە زلە)، لە شۆڕیجە بوو.
٩٩. (محەمەج حاجی خورشید)، لە شۆڕیجە بوو.
١٠٠. (عەبە شەماعیە)، لە شۆڕیجە بوو.
١٠١. (شەکرە)، لە شۆڕیجە بوو.
١٠٢. (عەلی ئۆمەر).
١٠٣. (جەبار گزیی).
١٠٤. (محەمەد عەواد).

تاهیر حوسێن سەمەد

جەلیل بەندە ئۆغلو

عوسمان ئیبراهیم قاسم

عیزەت قادر خدر

ئیسماعیل عوسمان محەمەد

ئەحمەد عەبدوڵڵا موسا

حەسەن تۆفیق ڕەسوڵ

* **پیشەی چەخماخچی:**

ئەم پیشەیە دەوری هەبوو لە ڕابردوودا لەو کاتەی کە بەشێك لە کەرەستەکانی وەکو (بڕنەو، سێ تیر، تۆپڵی) پێویستیان بە پرکردنەوەی باروود هەبوو بۆ قەوانەکانیان، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی ژیانو گۆڕانکاری لە کەرەستەکانی جەنگیدا ئەم پیشەیە بەرەو نەمان چوو.

١. وەستا (تۆفیق ڕەسول ئیبراهیم چەخماخچی).

٢. وەستا (حەسەن تۆفیق ڕەسول ئیبراهیم چەخماخچی).

٣. وەستا (فەرەج تۆفیق ڕەسول چەخماخچی).

٤. وەستا (محەمەد ئەحمەد محەمەد چەخماخچی)، (١٨٧٥-١٩٦٢).

٥. وەستا (عیسا تۆفیق چەخماخچی).

٦. وەستا (ڕەفیق چەخماخچی).

٧. وەستا (حوسێن عەلی چەخماخچی).

٨. وەستا (حوسێن کەرەم چەخماخچی).

٩. وەستا (ئەکرەم حوسێن چەخماخچی).

١٠. وەستا (ئیبراهیم چەخماخچی).

١١. وەستا (کولە ئەحمەد چەخماخچی).

١٢. وەستا (سەعید)، لە بەرتەکێ بوو.

١٣. وەستا (حەمە خەوخۆش)، لە (خانی سپی) لە بازاڕی گەورە بوو.

١٤. وەستا (فەرەج) کوڕی وەستا (تۆفیق)، لە بازاڕی ئاسنگەڕەکان بوو.

## * پیشەی پێڵاودووریو پینەدۆزی:

ئەم پیشەیە لە سەرەتادا پێستەی ئاژەڵیان بەکاردەهێنا لە دروستکردنی پێڵاودا لە دوای ئەوەی لە دەبەخانە خۆشدەکرا بە پێی قەبارەی جیاجیاو دیاریکراو دەبردراو لە قالبی تەختەدا چەسپدەکراو بە شێوەو قەبارەی جۆراوجۆر دروستدەکرا، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی پێڵاوی لاستیكو دروستبوونی کارگە جۆربەجۆرەکان ئەم پیشەیە تووشی پووکانەوە بوو لە کەرکوکدا.

### * پێڵاو دوورەکان:

١. وەستا (زۆراب) باوکی وەستا (رەفیق قۆندەرەچی)، لە گەرەکی (موسەڵلا) بوو.
٢. وەستا (فاتیح).
٣. وەستا (واحید)، ناسراو بوو بە (ئۆڵو واحید).
٤. وەستا (واحید)، ناسراو بوو بە (گوتو پەیوگ واحید).
٥. وەستا (واحید)، ناسراو بوو بە (کەچەل واحید).
٦. وەستا (بەکر محێددین)، ناسراو بوو بە (بویوك بەکر)، لە نزیك خان (گەنم) بوو.
٧. وەستا (عوسمان)، ناسراو بوو بە (عوسمان زیقۆ).
٨. وەستا (محەمەد زەینەی بەیرەقدار)، لە دوایی دەستی کردەوە بە فرۆشتنی پێداویستی پێڵا دروستکردن.
٩. وەستا (حەسەن عەونی)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
١٠. وەستا (ئارام)، بە رەگەز ئەرمەنی بوو، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
١١. وەستا (محەمەد عەلی موسڵاوی)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
١٢. وەستا (هادی)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو، باوکی وەستا (هیجران فیتەر) بوو.
١٣. وەستا (قاسبار) لەگەڵ وەستا (ئاکۆب)، بە رەگەز ئەرمەنی بوون، لە شەقامی (مەجیدییە) بوون.
١٤. وەستا (محەمەد سلێمان مستەفا)، ناسراو بوو بە (محەمەد تاپۆ)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٥. وەستا (هادی سلێمانی مستەفا)، ناسراو بوو بە (هادی تاپۆ)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٦. وەستا (تەیب)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو، خاوەنی سینەما (ئەتڵەس) بوو.
١٧. وەستا (محەمەد)، ناسراو بوو بە (محەمەد بەیان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٨. وەستا (سەیید رەئووف)، باوکی سەیید (کەماڵ)، لە سەرەتای بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٩. وەستا (زەینەل مەحمود قادر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٢٠. وەستا (بەهجەت عیزەت)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٢١. وەستا (عارف)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٢٢. وەستا (جومعە قادر عەزین)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٢٣. وەستا (زەینەل ئیسکاف)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٢٤. وەستا (قادر ئیسکاف)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٢٥. وەستا (غەفوور قادر)، لە (جرید مەیدان) بوو.
٢٦. وەستا (هاشم جەلال سالح)، لە (جرید مەیدان) بوو.
٢٧. وەستا (جەبار سابیر ئاغا)، لە (جرید مەیدان) بوو.

وەستا محەمەد سلێمان

ئەحمەد خورشید زەینەل

بەهجەت عیزەت

٢٨. وەستا (عومەر سابیر ئاغا)، لە (جرید مەیدان) بوو.
٢٩. وەستا (ڕەفیق حاجی حوسێن)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٠. وەستا (حاجی تەها)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣١. وەستا (بەکر)، ناسراو بوو بە (گوجوك بەکر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٢. وەستا (سوڵح)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٣. وەستا (عابدین زەینەڵ بیرەقدار)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٤. وەستا (حەیدەر زەینەڵ عەبدوڵڵا بیرەقدار)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٥. وەستا (حوسێن حەیدەر زەینەڵ بیرەقدار)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٦. وەستا (فازڵ ئەمین)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٧. وەستا (جەلیل سالح)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٨. وەستا (محەمەد جینان)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٩. وەستا (دەروێش عەلی)، لە سەرەتای شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤٠. وەستا (نامق)و هاوەڵەکەی وەستا (عەزیز هەمەوەند)، لە سەرەتای شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤١. وەستا (خدر)، لە شەقامی (ئەوقاف) نزیك (پاتا) بوو.
٤٢. وەستا (ئەوانیس)، بە ڕەگەز ئەرمەنی بوو، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤٣. وەستا (عومەر محەمەد حوسێن)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٤. وەستا (ئەحمەد)و هاوەڵەکەی وەستا (محەمەد ئیسکافی)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٤٥. وەستا (جەبار)، ناسراو بوو بە (قەرە جەبار)، لە شەقامی (دکتۆرەکان) بوو.
٤٦. وەستا (حەسیب قەڵایی)، لە بەرامبەر قشڵە بوو.
٤٧. وەستا (هادی)، ناسراو بوو بە (هادی کەچەل)، لە بەرامبەر قشڵە بوو.
٤٨. وەستا (بای عوسمان عەونی)، برای وەستا (حوسێن عەونی)، گەرۆك بوو.
٤٩. وەستا (محەمەد دورسن)، لە تەنیشت (خانی قازی) بوو، لە بنەڕەتدا خەڵکی بەرتەکێ بوو.
٥٠. وەستا (مەحمود دورسن)، لە گەڕەکی (عاشور) بوو.
٥١. وەستا (خالید)، خەڵکی گەڕەکی (سەی سەروەر) بوو.

* پینەدۆزەکان:
٥٢. وەستا (عەلی حەمە کوێی)، لە (قاری بازار) بوو.
٥٣. وەستا (ئەحمەد لەرزانە)، لە قوژبنی مزگەوتی (نائیب) بوو.
٥٤. وەستا (مام عوسمان)، لە ناو بازاری ئاسنگەرەکان بوو.
٥٥. وەستا (حەمید کاکەیی).

## * پیشەی کورتان دوور- پێستەسازیو ناڵبەندی:

*** کورتان دوورەکان:**

١. وەستا (عەزیز سەڕاج).
٢. وەستا (نوری سەڕاج).
٣. وەستا (محەمەد عارف سەڕاج).
٤. وەستا (فەخرەددین سەڕاج).
٥. وەستا (ئیبراهیم عەلی سەلمان سەڕاج):

لە ساڵی (١٩٢٢) لە کەرکوك لەدایکبووە، پیشەی سەڕاجی لە خاڵۆیەوە (حوسێن سەڕاج) بۆ ماوەتەوە کە دوکانەکەی لە بازاڕی گەورە لە تەنیشت قاوەخانەی (جووت قاوە) بوو.
هەر لە ساڵی (١٩٢٧)ەوە تا کۆچکردنی لە ساڵی (١٩٩٦) لەم پیشەیەدا کاری کردووە.

٦. وەستا (حەسیب قادر سەڕاج):

لە ساڵی (١٩٠٧) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٧٩) کۆچی دوایی کردووە، ئەم پیشەیەی لە خاڵۆی (سدیق) وەرگرتووەو گەشەی پێداوە.
لە ساڵی (١٩١٧) تا ساڵی (١٩٨٧) لەم پیشەیەدا کاری کردووەو گەلێك خەڵاتی ڕێزلێنانی وەرگرتووە، بە تایبەتی لەلایەن موتەسڕیفی کەرکوك (یوسف زیائی).
لە دوای خۆی هەر یەکە لە کوڕەکانی (حەبیب)، (ڕەفیق)و (عەبدولکەریم)و (عەبدولقادر)، (عەبدولغەنی)و (عەبدولخالق) و (عەبدوڵلا)و (عەبدولنادر)و (سلێمان) پیشەی باوکیان وەرگرتووەو پەشێکیان کاری لێ دەکەن.
"هەر کەسێ ڕۆژێ لە ڕۆژان چەکی هەبووبێت، حەسیب سەڕاج دەناسێ. هەر کاتێك باسی تفەنگییەکتیرو ماوزەرو یایلی وجاندارو قۆناخ خرو سێ تیرو پێنج تیرو پۆڵەندیو ئینگلیزیو برنەوو پۆرسەعیدو سەمینۆفو کلاشینکۆف کرا، ناوی حەسیب قادر یان حەسیب سەڕاج دێتە ناو باسەکانەوە. حەسیب قادرو فیشەك دانو زینی ئەسپو ماینو پشتێنی فەقەراتو کێلانی چەقۆو سیکارتو جووت قاوە، مانای ئەو ڕۆژگارانەت بۆ دەگێڕنەوە، کە کاری دەستیو پیشەگەری جێگای ڕێزی خەڵك بووە.
لە هەموو شارەکانی عێراقەوە ئەوانەی کە چەکیان هەبوو، لەلای حەسیب سەڕاج ڕۆژێك لە ڕۆژان فیشەك دانو کیفی دەمانچەیان بە کردن داوە.
دووکانی سەڕاجیەکەی حەسیب سەڕاج کەوتبووە بەرامبەر قەیسەری کەرکوكو بە (٧٠) مەترێك خوار چاپخانەکانی جووت قاوە. حەسیب سەڕاج پێش ئەوەی لە ساڵی (١٩٣٥) دا ئەم دووکانە بکاتەوە، گوند بە گوندو شار بە شار دەگەڕا فیشەك دانو نیلی ماینو بەرملەی جووتکردنی لە چەرم دروست دەکرد.
ساڵی (١٩٣٥)، هاتە ئەو شوێنەی کە لەسەرەوە باسمانکرد، دووکانێکی سەرپێیانەی دروست کردو، لێرەوەو لە بازاڕی جووت قاوەو لە کەرکوکەوە حەسیب قادر ناوو ناوبانگو شووهرەتی بە هەموو شارەکانی عێراقدا بڵاوبووەوە.
تەنانەت ناوی گەیشتە میسرو فیشەك دانو کیفی دەمانچەی بۆ جەماڵ عەبدولناسریش درووستکردوە.
یەکەم کەسایەتی ناودار کە فیشەك دانی لای حەسیب سەڕاج بۆ کرا، مەلیك غازی بوو. مەلیك غازی زۆر حەزی لە ڕاوکردن بوو، جۆرەها ساچمە زەنو تاپڕی یەك لوولەو دوولوولەی

وەستا ئیبراهیم سەڕاج

نوری نالبەند لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی کەرکوك

هەبوو، بەرگی ئەم چەکانە هەمووی لەلای حەسیب سەڕاج کراوە لە کەرکوك. دواتر چی ناودارو ئاغاو شێخ‌و کوێخا هەبوو کە بیستیان مەلیك غازی لەلای حەسیب سەڕاج فیشەك دانی کردووە، یان خۆیان یان یەکێك لە پیاوەکانیان دەنارد بۆ کەرکوك‌و بۆ لای حەسیب سەڕاج. فیشەك دانەکەی مەلیك غازی دەنگی دایەوە، ئیتر ئەوەی لەبەرخۆشەویستی مەلیك ئەوەی بۆ ماستاوو مەرایی ئەو ناوو شوهرەتەی حەسیب سەڕاج دەبوایە فیشەك دانێك بکات. خەڵکی واهەبوو، تفەنگی نەبوو فیشەك دانی دەکرد. بەدرێژایی مێژووی کۆن‌و نوێ بازاڕی جووت قاوە دووکانەکەی حەسیب سەڕاج گەرم بوو، چ وەك ئەوەی باشترین وەستای زەمانی خۆی بوو، چ وەك ئەوەی عێراق بەردەوام چەکی تیابووە.

دوابەدوای مەلیك غازی، نووری سەعیدو مەلیك فەیسەڵی دووەم، فیشەك دانیان لەلای حەسیب سەڕاج بە کردنداوە، بەوە ئەوەندەی تر حەسیب سەڕاج شوهرەت‌و ناوبانگی پەیداکردوە. تا وایلێهات خەڵکی بە ئاسانی دەستێ نەکەوێ وناچار بێت سەرە بگرێت تا نۆرەی بێت بۆ ئەوەی فیشەك دانێکی بۆ بکرێت. کار بەوەوە نەوەستا، ساڵی ١٩٥٦، پیشانگایەکی گەورە کرایەوە بۆ ئیش‌و کاری دەستی‌و پیشەگەری. حەسیب سەڕاج لەو پیشانگایە پلەی یەکەمی بەدەستهێناو خەڵاتی یەکەمی لەلایەن موتەسەڕیفی ئەوکاتەی کەرکوك (یوسف زیائی) پێدرا.

دوای گەڕانەوەی بارزانی لە یەکێتی سۆڤییەت، بە دیاری فیشەکدانی حەسیب سەڕاج گەیشتە دەستی، ئیتر هەر کاك بوو وەك دەڵێن (میرو پیر) ڕوویکردە دووکانەکەی حەسیب سەڕاج، ئاغا، جوتیار، تەنانەت ئەوەشی چەکی نەبوو لە خۆشەویستی بارزانی، چووە لای حەسیب سەڕاج‌و فیشەك دانێکی بە ڕاداندا.

بەڵێ، حەسیب سەڕاج هەر بەوەوە نەوەستا، دوابەدوای بارزانی، مام جەلال‌و شەهید عەلی سەربازی‌و خوالێخۆشبوو عومەر دەبابە هات، فیشەك دان‌و پێداویستی دەمانچە، ڕەواجی زیاتری پەیداکرد.

ئەمانە هەمووی، دووکانەکەی حەسیب سەڕاجی کردە دووکانێکی سیاسی، هەموو سەرکردەی حیزبەکان‌و کاربەدەستان تەنانەت عەبدوولسەلام عارف‌و عەبدولڕەحمان برای‌و ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدامیش، پیاوانی خۆیان نارد بۆلای حەسیب سەڕاج بۆ ئەوەی کەرەستەی چەکیان بۆ دروست بکات.

سەیر لەوەدایە! حەسیب سەڕاج چەند پیشەو دووکانەکەی شوهرەتی بسەندایە، ئەو بیری لەوە نەدەکردەوە دووکانە چکۆلانەکەی گەورە بکاتەوە، یاخود بیکاتە کارگەیەکی تایبەت بە کاری چەرم.

هەزار ڕەحمەت لە گۆڕەکەت حەسیب سەڕاج، کە بوویتە یەکێك لە هێماو کۆڵەکەکانی بازاڕی جووت قاوەو، دەستە ڕەنگینیەکەشت لە وڵاتانی دەوروبەردا دەنگیدایەوە. بۆ ئێمەی کوردیش جێگەی شانازیت کە بە دەستە ڕەنگینەکەت بۆ سەرکردەو تێکۆشەرانی کورد دڵسۆزانە کارت کردو بەرهەمەکانت لە کوردستان‌و لەناوهێزی پێشمەرگەدا ڕەنگی دایەوە".

٧. وەستا (ڕەفیق حەسیب قادر سەرج):

لە ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لە گەڕەکی (بەگەکان) لەدایکبووە، پیشەی سەڕاجی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە.

٨. وەستا (حاجی حوسێن مەجید سەڕاج).

٩. وەستا (حاجی ئەحمەد حوسێن مەجید سەڕاج):

لە ساڵی (١٩٣٢) لە قەڵای کەرکوك لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووەو پیشەی سەراجی لە (حاجی حوسێن)ەوە بۆ ماوەتەوە، لە (٤)ی ئەیاری ساڵی (٢٠١١) کۆچی دوایی کردووە.

١٠. وەستا (ئیسماعیل سەراج).
١١. وەستا (مەجید سەراج).
١٢. وەستا (محەمەد مەجید سەراج).
١٣. وەستا (ئەمین سەراج).
١٤. وەستا (عەبدوڵڵا سەراج).
١٥. وەستا (نەجمەدین عەبدوڵڵا سەراج).
١٦. وەستا (عەلی عەبدوڵڵا سەراج).

ئەحمەد حوسێن مەجید

*** ناڵبەندەکان:**

١٧. وەستا (بەهجەت ناڵبەند)، لە (خانی قازی) بوو.
١٨. وەستا (حاجی مستەفا ناڵبەند).
١٩. وەستا (نامق).
٢٠. وەستا (محەمەد ناڵبەند)، لە حەلواچییەکان بوو.
٢١. وەستا (رەشید ناڵبەند)، لە حەلواچییەکان بوو.
٢٢. وەستا رەفیق ناڵبەند)، لە حەلواچییەکان بوو.
٢٣. وەستا (شوکور ناڵبەند).
٢٤. وەستا (نوری ناڵبەند)، لە حەلواچییەکان بوو.
٢٥. وەستا (شێخ قادر ناڵبەند)، لە قوژبنی باخچەکەی خوار قەڵا بوو.
٢٦. وەستا (نادر ناڵبەند)، لە یەکێك لە کۆڵانەکانی بازاڕ جووت قاوە.
٢٧. وەستا (کەریم ناڵچی)، لە نزیك چایخانەی عەرەبانچییەکان لە ئەحمەد ئاغا.
٢٨. وەستا (سابیر ناڵبەند)، لە گەڕەکی (شۆڕیجە).

ئیبراهیم عەلی سەلمان

حەسیب قادر محەمەد

## * پیشەی دروستکردنی پێڵاوی کەوش و کڵاشی پەڕۆ و قاپقاپ:

پێڵاوش کەوش لە پێستەی گامێش دروستدەکرا بۆ ژێر پێڵاوەکە، سەرەوەی پێڵاوەکەش لە پێستەی بزن دروستدەکرا، پێیان دەووت (گلاسی).

*** وەستاکانی دروستکردنی پێڵاوی کەوش:**

١. وەستا (حاجی خالید حەسەن ساقی):
لە ساڵی (١٨٨٤) لە کەرکوك لەدایکبووە، دوکانی دروستکردنی پێڵاوی سووری هەبوو لە بازاڕی گەورە لە نزیك گەرماوی (حاجی حەسەن) لە بەرامبەر مزگەوتی (نوعمان)، لە ساڵی (١٩٦٤) کۆچی دوایی کردووە.
٢. وەستا (حاجی نوری خورشید)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣. وەستا (حاجی عەزیز)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤. وەستا (حاجی سدیق)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥. وەستا (زەینولعابیدین)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٦. وەستا (محەمەد نوری یەمانچی).
٧. وەستا (عەبدوڵڵا یەمانچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٨. وەستا (غێدان خورشید یەمانچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٩. وەستا (ئیبراهیم یەمانچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٠. وەستا (قادر یەمانچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١١. وەستا (ڕەفیق یەمانچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٢. وەستا (حاجی حوسێن یەمانچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٣. وەستا (نامق ڕەفیق محەمەد):
لە ساڵی (١٩٣٠) لە گەڕەکی (پیریادی) لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە باوکییەوە (ڕەفیق) فێربووە، بۆ ماوەی دە ساڵی لەم پیشەیەدا کاری کردووە و لە دواییدا پیشەی توتن فرۆشی کردووە لە بازاڕی گەورە، بەڵام لە دواییدا گوازتوویەتییەوە بۆ نزیك مزگەوتی (عەبدولڕەزاق ئەلتوحافی) لەسەر پردی شەهیدان.
١٤. وەستا (عەلی خدر یەمانچی)، ناسراو بوو بە (عەلی قۆز)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٥. وەستا (سابیر ئەحمەد).
١٦. وەستا (کەماڵ حاجی نەجم سەڕاج).
١٧. وەستا (نوری عەلی چاوەڕەش).
١٨. وەستا (فازل محەمەد یەحیا).
١٩. وەستا (محەمەد تۆفیق مرخن).
٢٠. وەستا (فایق عەلی چاوڕەش).

*** پیشەی دروستکردنی پێڵاوی کڵاشی پەڕۆ:**

ئەم پیشەیە بە زۆری لە بازاڕی گەورە بوو بە تایبەتی لە بازاڕی حەلواچییەکان لە بەرامبەر گەرماوی (حاجی باقی)، بەشێکی زۆر لە کاسبکاران لەم پیشەیەدا کاریان دەکرد، ئەم جۆرە پێڵاوە ژێرەکەی لە لاستیك یان پێستە دروست دەکرا.

شەمسەدین عوسمان عومەر جاف

*** وەستاکانی دروستکردنی پێڵاوی کلاشی پەڕۆ:**

٢١. وەستا (شەمسەددین عوسمان عومەر جاف):
لە ساڵی (١٩٣٠) لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) لەدایکبووە، ئەم پیشەیە لە باوکیو باپیرییەوە بۆی ماوەتەوە، دوکانەکەی لە بازاڕی گەورە بوو، تاوەکو ئێستاکە بەردەوامە.
٢٢. وەستا (عەلی ساڵح)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٣. وەستا (عوسمان چەغل)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٤. وەستا (مجە سور-مستەفا کلاشچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٥. وەستا (غێدان نەجم خورشید):
لە ساڵی (١٩٣٩) لە گەڕەکی (پیریادی) لەدایکبووە، لە سەرەتادا لە پیشەی کلاش دروستکردن کاری کردوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٦٣)ەوە لە پێڵاوی پەڕۆ کار دەکات لە بازاڕی گەورە.

*** پیشەی دروستکردنی پێڵاوی قاپقاپ:**
کەرکوك زۆر پێی بە ناوبانگە بەم پیشە دەستییە فلکلۆرییە، بە تایبەتی لە شەقامی (ئەوقاف)، ئەو کەرەستانەی کە بە کاردەهێنرا بریتی بوو لە (دار، چەرم، بزمار، رەنگ).
"کە لە سینەما عەلەمێن تێدەپەڕی لەوێدا چەند دووکانێکی وەستایی هەبوو قاپقاپیان دروست دەکرد. قاپقاپ لە داری سپی دروست دەکرا، زیاتر ژنانی شار بە تایبەتی ژنانی تورکمان لە پێیان دەکرد. قاپقاپ بە شێك بوو لەکەلوپەلی بووك (جیهازی بووك). ئەو ڕۆژەی بووك دەبرا بۆ حەمام دەبوایە پاوانەی ئاڵتوونو قاپقاپ لە پێ بکات. جۆرێکی تر لە قاپقاپ هەبوو تایبەت بوو بە حەمامە گشتییەکان، خەڵکی کە دەچوو بۆ حەمام لەناو حەمامەکەدا ئەو قاپقاپەی لەپێ دەکرد".

*** وەستاکانی دروستکردنی پێڵاوی قاپقاپ:**
٢٦. وەستا (ئەحمەد شاملی)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٧. وەستا (ئیبراهیم شاملی)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٨. وەستا (مستەفا سەلمان شەریف ئەلنەجار):
لە ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لە گەڕەکی (ساری کەهیە) لە نزیك گەرماوی (حاجی حەسەن) لەدایکبووە، دوکانەکەی لە شەقامی (ئەوقاف) بوو، ئێستا لە پیشەی مۆبیلیاتدا کار دەکا.
٢٩. وەستا (نەجار جەماڵ عومەر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٠. وەستا (ئەنوەر حاجی تۆفیق)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣١. وەستا (فایق شەفیق)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٢. وەستا (سەلاح عاشق)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٣. وەستا (حاجی حەسەن قلنچی)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٤. وەستا (حاجی جەمیل قابقابچی):
لە ساڵی (١٩٠٤) لە گەڕەکی (تۆپخانە) لە قەڵای هەولێر لەدایکبوو، تا ماوەیەکی چاك لەم پیشەیەدا کاری کردووە، لە ساڵی (١٩٧٠) لەبەر تەمەن درێژی وازی لێهێناوە، هەروەها دەستێکی باڵای هەبووە لە خوێندنی مەقام بە

غێدان نەجم خورشید

تایبەتی (حیجاز، سێگا، ڕاست، سەبا)، لە ساڵی (١٩٩٦) كۆچی دوایی كردووە.
٣٥. وەستا (فەخری ئیبراهیم)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٦. وەستا (محەمەد تاهیر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٧. وەستا (دەلی مەحمود)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٨. وەستا (خەلفە سدیق-دەلی سدیق)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٣٩. وەستا (سەلاحەددین)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤٠. وەستا (حەمید ڕەشید)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤١. وەستا (سەلیم سەلاوات)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤٢. وەستا (یاسین خورشید)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤٣. وستا (نەمەددین ئیخوان)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٤٤. وەستا (یونس ئەحمەد مەحمود):
لە ساڵی (١٩١٠) لە كەركوك لەدایكبووە، دوكانی هەبووە لە شەقامی (ئەوقاف)، بەڵام لە دواییدا لە پیشەی دارتاشی لە بازاڕی (قۆریە) كاری كردووە تا كۆچكردنی لە (١٦)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣).
٤٥. وەستا (قەنبەر مەلا خدر قابقابچی):
لە ساڵی (١٩٢٩) لە كەركوك لە گەڕەكی (بەگەكان) لەدایكبووە، هەر لە منالییەوە لەم پیشەیەدا كاری كردووەو لە وەستا (یونس ئەحمەد)ەوە شارەزایی پەیدا كردووە، دوكانەكەی لە شەقامی (ئەوقاف) بوو، بۆ ماوەی پەنجا ساڵ لەم پیشەیەدا بەردەوام بووە تا كۆچكردنی لە ساڵی (٢٠١٢).
٤٦. وەستا (قەرە سدیق قلنچی)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.

عەزیز لاستقچی

* پێڵاو فرۆشەكان:
٤٧. (حاجی محەمەد شانان).
٤٨. (حاجی عەلی چاوڕەش).
٤٩. (حاجی عوسمان لەیلێ).
٥٠. (فاتح عوسمان).
٥١. (بەكر حاجی محەمەد).
٥٢. (یونس شەریف).
٥٣. (عوسمان كەوشدوور).
٥٤. (جەماڵ خەفاف).
٥٥. (تۆفیق خەفاف).

قەمبەر مەلا خدر

خالید حەسەن ساقی

## * پیشەی لاستقچێتی :

ئەم پیشەیە بە ناوبانگە لەوەی کە لاستیك بە تایبەتی لاستیکی تایەی ئۆتۆمبیل بە کاردەهێنن لە دروستکردنی بۆ دەلۆی ئاو و هەڵکێشانی ئاو لەنێو بیر، یان دروستکردنی جۆرە کۆلێك بۆ ئاودان و ئالفی ئاژەڵان، یان بۆ دروستکردنی قایشی ماتۆڕو موەلیدە.

*** وەستاکانی پیشەی لاستقچێتی :**

١. وەستا (عەزین)، ناسراو بوو بە (عەزە).

٢. وەستا (شاکر خالید حەسەن):

لە ساڵی (١٩٠٨) لە گەڕەکی (پیریادی) لەدایکبووە، ئەم پیشەیە لە باوکییەوە وەستا (خالید حەسەن) فێربووە، کە دوکانی لە بازاڕی حەلواچییەکان بوو لە نزیك بازاڕی (حاجی حەسەن)، کە پیشەی دروستکردنی دەلۆی ئاوو پێڵاوی لاستیك بوو کە دەیفرۆش بە دوو درهەم، لە (٩)ی تەمووزی ساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کردووە.

٣. وەستا (عەلی بەکر)، لە بازاڕی گەورە لە خانی (سپی) بوو.

٤. وەستا (فائق عەل بەکر)، لە بازاڕی گەورە لە خانی (سپی) بوو.

٥. وەستا (نوری)، ناسراو بوو بە (نوری ئەبو شوارب)، لە بازاڕی گەورە بوو.

٦. وەستا (عیزەددین حاجی محەمەد عارف)، لە بازاڕی گەورە لە خانی (سپی) بوو.

٧. وەستا (حاجی ئەمین خورشید)و کوڕەکانی:

لە ساڵی (١٩٠٢) لە گەڕەکی (ئاوچی) لەدایکبووە، پێش ئەم پیشەیە لە پیشەی دروستکردنی پێڵاوی کەوشدا کاری کردووە، نزیکەی حەفتاو پێنج ساڵە لە بازاڕی گەورە لەم پیشەیە کاردەکان، لە ساڵی (١٩٩٢) کۆچی دوایی کردووە.

٨. وەستا (حاجی مەحمود)، لە بازاڕی گەورە بوو.

٩. وەستا (ڕەفیق لاستقچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.

١٠. وەستا (نوری زەنزەلە لاستقچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.

١١. وەستا (سابیر سامی لاستقچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.

١٢. وەستا (حاجی نەجات ئەمین خورشید):

لە ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە باوکی (حاجی ئەمین خورشید)ەوە ئەم پیشەیەی وەرگرتووە، دوکانی لە بازاڕی گەورە هەیەو تا ئێستاکە بەردەوامە.

١٣. وەستا (شەمسەددین عوسمان عومەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.

١٤. وەستا (حەسەن لاستقچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.

١٥. وەستا (خالید تەتەو)، لە بازاڕی گەورە بوو.

## * پیشەی کوتاڵ فرۆشی-قوماش فرۆش:

ئەم پیشەیە لە سەدەکانی رابردوودا لەلایەن جوولەکەکانی کەرکوکەوە کاری تێدا کراوەو بازرگانی هێنان‌و فرۆشتنی قوماشیان کردووە.

لە سەرەتادا بەشێکی لەم پیشەوەرانە گەرۆك بە گەڕەکەکاندا لەسەر شانیان قوماشیان فرشتووە، بەڵام لە دوای ئەوەی شارەکان فراوان بوو کۆگاو شوێنی گەورە گەورە کرایەوە بۆ فرۆشتنی قوماش.

"... بەشێکی تری بازاڕی گەورە کوتاڵفرۆشەکانە، ٧٠ بۆ ٨٠ ساڵ بەر لە ئێستا، کوتاڵی فەتاح پاشاو فاسون‌و خام‌و جاو و کوتاڵی ئینگلیزی وهندی دەهات بۆ ئەم بازارە، ئەوعەیامە کوتاڵ بە گەز دەپێورا، گەز لە مەتر کەمتربوو، نزیکەی (٦٠) سنتیمتر بوو پێنج گەز دەیکردە سێ مەتری ئێستا. جگە لە کوتاڵفرۆشەکان بازاڕی جوملەچیەکانیش هەر لەو بازاڕە گەورەیە بوو".

١. (محەمەد بازرگان-سورە محەمەد)و کوڕەکانی (جاسم)و (عەزین).
٢. (محەمەد ناسك)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣. (محەمەد ئاوچی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤. (عەلی مەردان تازەیی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥. (مونشی)، بە ڕەگەز جوولەکە بوو، لە خانی (ناسیح بەگ) بوو.
٦. (عەبد)، بە ڕەگەز جوولەکە بوو، لە خانی (ناسیح بەگ) بوو.

عەبدولڕەحمان حاجی محەمەد

حەمید سدیق سابیر

٧. (محەمەد گدەك)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٨. (حاجی حوسامەددین)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٩. (عیزەددین سەیید محێددین جومعە):
لە ساڵی (١٩٢٣) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە تەمەنی دوانز ساڵییەوە پیشەی بەرگدووری لە (ئەحمەد چکەوە) وەرگرتووە، ماوەیەکیش لە چلەکان لە بواری ئاڵتونچێتی کاری کردووە، لە دواییدا لە پەنجاکاندا گەڕاوەتەوە پیشەی بەرگدووری‌و لە کاری دشداشەو شەرواڵدا کاری کردووە، لە پیشەی کوتاڵ فرۆشیدا تا ساڵی (١٩٩٩) کاری کردووە، لە (١٣)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.
، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٠. (حاجی عەبدولڕەحمان سالح)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١١. (مەردان سەفەر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٢. (عەبدولواحید حەسەن-حەسۆك)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٣. (محەمەد کەریم شاسوار)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٤. (تۆپاڵ حەسیب)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٥. (یەحیا ئەمین ڕەزاق یەحیاوەیی):
لە ساڵی (١٩٣٨) لە گوندی (یەحیاوە) لە دایك بووە، لە ساڵی (١٩٥٩) (دار المعلمین)ی لە کەرکوك تەواو کردووە، لە دوای تەواوکردنی پیشەی مامۆستایی بۆ ماوەی سی‌و شەش ساڵ کاری کردووە لە پیشەی بازرگانی لە بازاڕی گەورە.
١٦. (فەیزوڵڵا شەریف یەحیاوە)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٧. (سادق ڕەشید مەحاو لەیلان)، لە بازاڕی گەورە بوو.
١٨. (حەیدەر مەحاو لەیلانی)، لە بازاڕی گەورە بوو.

عەلی ڕەفیق لوتفەلڵا

١٩. (بەشیر لەیلانی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٠. (نوری گونیەچی)، لە بازاڕی قەیسەری بوو.
٢١. (حاجی محەمەد بەیرام لەیلانی):
لە ساڵی (١٩٣٢) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٦٠) ەوە کاری لەم پیشەیە کردووە لە بازاڕی گەورە تا پەکی کەوت، لە ئامۆزاکەیەوە (حاجی سدیق ڕەشید) فێری ئەم پیشەیە بووە.
٢٢. (عەبدوڵڵا تازەلی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٣. (حاجی ئیسماعیل عیزی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٤. (شەمسەددین خورشید بەشیری)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٥. (بەرقی محەمەد تاووق)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٦. (جاسم محەمەد جەلاو)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٧. (عوسمان سەعید)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٨. (حاجی موئەیەد نورەددین محەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٢٩. (حوسێن کۆماندۆز تازەیی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٠. (حاجی ڕەشید بازرگان)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣١. (فایق سدیق چارداغلی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٢. (عادل محەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٣. (عەبدوڵڵا سەلالی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٤. (حوسێن سۆڵان)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٥. (یونس سەڵاحەددین)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٦. (ئەکرەم ڕەفیق)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٧. (حاجی عەلی ڕەفیق لوتفەڵڵا):
لە ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە، پیشەی بازرگانی لە (قادر بازرگان)ەوە بۆ ماوەتەوە، لە ساڵی (١٩٩٣)، دوکانەکەی لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٨. (خەیروڵڵا بەگ تازەیی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٣٩. (موشیر بەگ تازەیی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٠. (فەخرەددین حاجی قادر)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤١. (نوری محەمەد حاجی عەبدوڵڵا قەتتان)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٢. (حاجی تۆفیق حەسەن عەجەم)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٣. (حاجی فازڵ بیاتی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٤. (عەباس فازڵ بەیاتی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٥. (نوری بەگ یەحیاوەیی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٦. (نوری-ئەبو محەمەد سەیدەیی)، لە بازاڕی قەیسەری بوو.
٤٧. (سدیق بەیرام)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٨. (ئەحمەد جێگاو)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٤٩. (تەها قەتتان)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٠. (سدیق محەمەد حاجی نیعمەت)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥١. (مەسنور لەیلانی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٢. (حاجی محەمەد عارف)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٣. (حاجی قادر خورشید)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٤. (محەمەد عەلی تازەیی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٥. (فازڵ حاجی عەلی لەیلانی)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٦. (حاجی نوری قادر)، لە بازاڕی گەورە بوو.

عەبدولڕەحمان محەمەد سالح محەمەد ئەمین

٥٧. (ئەحمەد محەمەد ئەلسەواف)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٥٨. (سەیفەددین محەمەد تائی)، لە گەڕەکی (ئەحمەد ئاغا) بوو.
٥٩. (باڕووخ)، بە ڕەگەز جوولەکە بوو، لە بازاڕی (قۆریە) لە نزیك دوکانی (حاجی تۆفیق) بوو.
٦٠. (ئەنوەر عیسا)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.
٦١. (ئەحمەد دەدەن)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٦٢. (جاسم محەمەد)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٦٣. (نورەددین خورشید)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٦٤. (جەلیل خورشید)، لە بازاڕی گەورە بوو.
٦٥. (ئەحمەد مزراب حەسەن عەلا کولە لەیلان):
لە ساڵی (١٩٣٠) لە شارۆچکەی لەیلان لەدایکبووە، ماوەیەك لە بواری کشتوکاڵی و بەخێوکردنی ئاژەڵ و بازرگانیدا کاری کردووە، هەروەها ماوەیەك لە بواری بەخێوکردنی پەلەوەرو بازرگانی ئارد لەگەڵ (جەلال دەروێش کەریم) کاریان کردووە، ماوەیەکیش لە بواری فرۆشتنی قوماشدا لە بازاڕی (قۆریە) کاری کردووە، لە ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.
٦٦. (جەلال قەساب)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٦٧. (عەبدوڵلا بازرگان)، لە (جرید مەیدان) بوو.
٦٨. (دایی سەعید)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٦٩. (عەزیز بەنا)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٠. (شوکور بەزان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧١. (خالید سەیفەددین ئەلتائی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

حوسێن محەمەد فەتاح

عومەر محێدین فەتاح

٧٢. (جەماڵ ئەحمەد عیسا)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٣. (قیاد فوئاد موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٤. (هادی سەعید دەباغ)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٥. (عەبدولرەحمان بەکر ئەفەندی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٦. (محەمەد شاترلوو بازرگان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٧. (محەمەد نوری عەلی)و (ئەحمەد حەمامچی):
(محەمەد نوری) لە ساڵی (١٩١٤) لە گەڕەکی (بەگەکان) لەدایکبووە لە نزیك گەرماوی (عەلی بەك)، لە سەرەتادا لە پیشەی کشتوکاڵ لەگەڵ باوکیدا کاری کردووە لەبەر ئەوەی بێستانێکی گەورەیان هەبووە لە ناوچەکەدا، بەڵام لە دواییدا لەگەڵ خاڵۆی لە بواری بازرگانی فەرش و قاڵی و جلوبەرگی ئامادەکراو کاری کردووە، ماوەیەکیش لە بازرگانی غەڵوزی بەردین و قوماشدا لە بازاڕی (قۆریە) کاری کردووە، لە دواییدا گوازتوویەتییەوە بۆ شەقامی (کۆماری) لەژێر گازینۆی (ئەلموەدەوەرە)، هەروەها دەستێکی باڵای هەبووە لە هونەری وێنەکێشاندا، لە (٢٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٨)دا کۆچی دوایی کردووە.
٧٨. (عیسا عەلی عەباس)، (١٩٢١-١٩٨٦)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٧٩. (تالیب عەلی عەباس)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٠. (ڕەئووف موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨١. (خالید ڕەئووف موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٢. (جیهاد فوئاد موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٣. (عەلی عومەر گلی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.

عیزەدین محێدین جومعە

٨٤. (سەیید فوئاد سەیید محەمەد)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٥. (نەجم سەید قادر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٦. (عەزرە)، بە ڕەگەز جوولەکە بوو، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٧. (محەمەد ئەحمەد ئەفەندی داقوقی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٨. (گۆرگیس ئەلبەزان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٨٩. (سەرباز محەمەد داقوقی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٠. (عوبێد ڕەشید)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩١. (محەمەد ڕەزا جومعە)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٢. (فاتیح عەبدولرەزاق ڕەزا):
لە ساڵی (١٩٣٤) لە کەرکوک لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە (حاجی محەمەد)ەوە وەرگرتووە لە بازاڕی (قۆریە)، بۆ ماوەی (٤٥) ساڵ لەم پیشەیەدا کاری کردووە، لە ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.
٩٣. (سەباح جەلال قەساب)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٤. (عومەر سەیید حوسێن ئەفەندی)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٥. (سەیید محێددین)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٦. (سەیید عیرفان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٧. (خەیروڵڵا ئەحمەد موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٨. (جەماڵ سەیید ڕەئووف)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
٩٩. (حاجی عومەر محێددین فەتاح):
لە ساڵی (١٩١٨) لە گەڕەکی (شاترلوو) لەدایکبووە، بۆ ماوەی چل ساڵ لە بازاڕی (قۆریە) کار کردووە لەم پیشەیەدا، لە ساڵی (١٩٨٣) کۆچی دوایی کردووە.
١٠٠. (شێخ مەحمود)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠١. (حاجی محەمەد)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو، شارەزا بوو لە دەستگرتنەوەو شکاوی.
١٠٢. (ئەحمەد موختار)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠٣. (حاج تۆفیق)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠٤. (حاجی عەبدوڵڵا)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠٥. (مەلا عومەر)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠٦. (حوسێن گڵا)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠٧. (وداد بازرگان)، لە بازاڕی (قۆریە) بوو.
١٠٨. (حاجی ئەورەحمان عیزەت).
١٠٩. (حەمە سەعید حاجی قادر).
١١٠. (حاجی نامیق کوردە).
١١١. (حاجی مەجید مستەفا).
١١٢. (عومەر بەکر).
١١٣. (تالیب مەلا بەهاو-تالیب بەهائەددین).
١١٤. (جەواد مەلا بەهاو-جەواد بەهائەددین).
١١٥. (حاجی مەلا بەهاو).
١١٦. (حاجی ئەحمەد عەجەم).
١١٧. (عومەر تاین).
١١٨. (حاجی ڕەحمەتوڵڵا).
١١٩. (حاجی ئەورەحمان ڕەشید).
١٢٠. (مەجید حاجی ساڵح).
١٢١. (حاجی عەبە-عەبدوڵڵا حاجی ساڵح).
١٢٣. (حاجی عەبدوڵڵا حاجی شەریف).
١٢٤. (سەی خەلیل سەی جەبار).
١٢٥. (چەتۆ بازرگان).
١٢٦. (عەبدوڵڵا ڕەشید).
١٢٧. (پاشا مەجید سڵاو).

فاتیح عەبدولرەزاق ڕەزا

فایەق سالح لوتفەللا

١٢٨. (خەلیل توپەڵ).
١٢٩. (حاجی محەمەد نازك).
١٣٠. (حاجی سیوت).
١٣١. (كەماڵ ڕەزا).
١٣٢. (حاجی غازی).
١٣٣. (مەردان ئەمین گەوەر).
١٣٤. (حەمە ساڵح حاجی قادر).
١٣٥. (حاجی محەمەد تەها).
١٣٦. (شێخ محەمەد ساڵح).
١٣٧. (سەی هاشم).

تۆفیق حاجی حوسێن

محەمەد بەیرام لەیلانی

محەمەد ڕەزا عەبدولڕەزاق

محەمەد عەلی ئەمین

١٣٨. (حاجی فەتاح).
١٣٩. (سەی لەتیف جەباری).
١٤٠. (سەعدوڵڵا ئەورەحمان).
١٤١. (حەمەی حاجی ڕەشید).

١٤٢. (حەمە شەکر-محەمەد مەحمود لەیلانی).
١٤٣. (حاجی مەحمود دەروێش لەیلانی).
١٤٤. (حەمید ساڵح).
١٤٥. (ڕەزا بازرگان).

محەمەد نوری عەلی

یەحیا ئەمین ڕەزاق

ویداد بازرگان

١٤٦. (حەسۆ بازرگان).
١٤٧. (حەبیب بازرگان).
١٤٨. (عاسی حاجی عەلی شەمە).
١٤٩. (حاجی حەسەن).
١٥٠. (ئەحمەد حاجی محەمەد عارف).
١٥١. (حاجی باین).

حاجی عەبدولمەجید

١٥٢. (ناسیح مەردان).
١٥٣. (حوسێن سەی سەمین).
١٥٤. (عومەر عەلی حەمامچی).
١٥٥. (حاجی ئەشرەف).
١٥٦. (نەجدەت حاجی ئەورەحمان عیزەت).
١٥٧. (نەجات سەی عەبدوڵڵا).
١٥٨. (حاجی عەلی سلاو).
١٥٩. (ئەحمەد فەرەج).
١٦٠. (مەلا ئیسماعیل).
١٦١. (عەلی حاجی قادر).
١٦٢. (عومەر کەریم).
١٦٣. (شەوکەت محێددین).
١٦٤. (سەڵاح حاجی فەخرەددین).
١٦٥. (عەلی وەهاب).
١٦٦. (تاهیر بازرگان).
١٦٧. (سلێمان بازرگان).
١٦٨. (نوری حاجی عوسمان بازرگان).
١٦٩. (فایق حاجی نامیق).
١٧٠. (سەڵاح حاجی عەزین).
١٧١. (حەمید عەبدولرەحمان).
١٧٢. (ئەحمەد حەمەخان).
١٧٣. (حوسێن سەیید محەمەد):
لە ساڵی (١٩٣٩) لە گەڕەکی (شۆڕیجە) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابرد،ووەوە کاری کردووە لەم پیشەیە بە شێوەیەکی گەڕۆك لە بازاڕی (قۆریە) تاوەکو ئێستا.
١٧٤. (محەمەد موسا).
١٧٥. (حەمە ئەمین پاپیلانی).

ئەحمەد مزراب حەسەن

١٧٦. (حاجی فەتاح محەمەد).
١٧٧. (شێرزاد حەمە سەعید).
١٧٨. (حەمە زیاد بەهائەددین).
١٧٩. (نوری کاکە حەمە).
١٨٠. (سەباح سەی عەبدوڵڵا).
١٨١. (حاجی جەبار فەتاح).
١٨٢. (حاجی ئەحمەد لەرزانە).
١٨٣. (محەمەد غەفوور).
١٨٤. (نوری فەقێ).
١٨٥. (عەبدولرەحمان زەنگەنە).
١٨٦. (عیزەددین سورە محەمەد).
١٨٧. (سەی محێددین بازرگان).
١٨٨. (حاجی عوسمان بازرگان).
١٨٩. (فەقێ محەمەد).
١٩٠. (فەخرەددین ئەمین گەوهەر).
١٩١. (حاجی عەزیز سوورە).
١٩٢. (خالید بازرگان).
١٩٣. (عومەر مام رەش).
١٩٤. (جەلال فەقێ محەمەد).
١٩٥. (حاجی عەباس).
١٩٦. (حاجی عوسمان خدر).
١٩٧. (حاجی عەبدولرەحمان عیزەت).
١٩٨. (حاجی مستەفا).
١٩٩. (حاجی حەمید بەرتەکێ).
٢٠٠. (حاجی ئەحمەد ساڵح).
٢٠١. (نوری حاجی عوسمان).
٢٠٢. (شامیل حوسێن).
٢٠٣. (خالید ئەحمەد).
٢٠٤. (سەعدون عەبدولرەحمان رەشید).
٢٠٥. (وادی)و (چەتۆ)ی برای.
٢٠٦. (نوری ئەمین گەوهەر).
٢٠٧. (حاجی رەشید)، لە بازاڕی (شۆرێجە) بوو.
٢٠٨. (فایق ساڵح لوتفەڵڵا):
لە ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە (حاجی قادر خورشید بازرگان)ەوە بۆ ماوەتەوە کە دوکانی هەبوو لە بازاڕی قەیسەری.
٢٠٩. (محەمەد عەلی ئەمین محەمەد تەرزی):
لە ساڵی (١٨٩٠) لە گەرەکی (ئاخور حوسێن) لەدایکبووە، لە سەرەتادا لە پیشەی بەرگدووری بۆ ماوەی پانزە ساڵ کاری کردووە، لە دواییدا ئەم پیشەیەی لە باوکییە بۆ ماوەتەوەو بۆ ماوەی بیستو پێنج ساڵ بەردەوام بووە، لە ساڵی (١٩٦٣) کۆچی دوایی کردووە.
٢١٠. (عەبدولرەحمان حاجی محەمەد ساڵح سەعدوڵڵا):
لە ساڵی (١٩٠٠) لە کەرکوك لەدایکبووە لە گەرەکی (مەیدان)، تاوەکو ساڵی (١٩٥٤) لەم پیشەیەدا کاری کردووە، لە ساڵی (١٩٥٩) کۆچی دوایی کردووە.
٢١١. (حاجی محەمەد رەزا عەبدولرەزاق قوبانچی):
لە ساڵی (١٩٢٧) لە قەڵای کەرکوك لەدایکبووە، لە سەرەتادا لە کۆمپانیای نەوتی باکوور بۆ ماوەی دوو ساڵ دامەزراوە، بەڵام لە دواییدا لە پیشەی بازرگانی لە بازاڕی (قۆریە) کاری کردووە تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کردووە.
٢١٢. (حاجی تۆفیق حاجی حوسێن):
لە ساڵی (١٩١٤) لە کەرکوك لەدایکبووە، برای وەستا (رەفیق قۆندەرەچی) بوو، لە سەرەتادا لە پیشەی دروستکردنی پێڵاودا کاری کردووە، لە دواییدا لە بواری کوتاڵ فرۆشیدا لە ساڵی (١٩٥٢) کاری کردووە تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کردووە.
٢١٣. (عەبدولرەحمان محەمەد ساڵح محەمەد ئەمین):
لە ساڵی (١٩٢٤) لە گەرەکی (بولاق) لە کەرکوك لەدایکبووە، لەگەڵ وەستا (نورەددین) لە پیشەی بەرگدووریدا کاری کردووە، بەڵام لە دواییدا لە پیشەی کوتاڵ فرۆشیو بازرگانی کوتاڵدا بەردەوام بووە، لە ساڵی (١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە.
٢١٤. (حەمید سدیق سابیر):
لە ساڵی (١٩٢٨) لە گەرەکی (بولاق) لەدایکبووە، لە سەرەتادا لەسەر ماتۆڕ بە شێوەی گەڕۆك کاری کردووە، لە دواییدا لە بازاڕی گەورە بە هاوبەشی لەگەڵ (محەمەد عەباس ساڵەیی) لەو پیشەیەدا بەردەوام بووە، لە دواییدا گوازتیەتییەوە بۆ نزیك گازینۆ (مەجیدیە)، هەروەها لە ساڵی (١٩٦٣) لە بازاڕی (قۆریە) دوکانێکی بۆ فرۆشتنی قوماش لەگەڵ (حاجی فوئاد موختار) کردووەتەوە، تا ساڵی (١٩٧٢) بەردەوام بووە، لە ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.
٢١٥. (عەبدوڵڵا غەیبوڵڵا کاکەیی).
٢١٦. عوسمان ئەحمەد گۆگجەیی، بازرگانی گەڕۆك.

## * پیشەی بەرگدووری:

١. وەستا (سالّح ئەحمەد مورتەزا–سالّح دیمەشقی):
لە سالّی (١٩١٨) لە سوریا لەدایكبووە، لە سالّی (١٩٤٠) لە كەركوك خێزانی پێكەوەناوەو نیشتەجێ بووە، بەناوبانگ بووە لە پیشەی بەرگدووری پیاوان‌و ئافرەتان‌و سەربازیدا، بەرگدووری مەلیك (فەیسەلّی دووەم) بووە لە سالّی (١٩٥٦)، لەم پیشەیەدا بۆ ماوەی پەنجا سالّ كاری كردووەو نزیكەی چل وەستای كارامە لەژێر دەستی پێگەیشتوون لە كەركوك‌و هەولێرو بەغدا، خاوەنی دوكانی بەرگدووری (دیمەشق) بوو لە سەرەتا لە شەقامی (ئەوقاف)، لە دواییدا گوازتییەوە بۆ بازاری زێرنگەرەكان، لە سالّی (١٩٩٠) كۆچی دوایی كردووە.
٢. وەستا (مەجید)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٣. وەستا (رەشید)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٤. وەستا (خۆرشید)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٥. وەستا (محەمەد فەوزی)، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٦. وەستا (زەكی)، بە رەگەز لە مەسیحییەكانی قەلاّ بوو، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٧. وەستا (واسیل)، بە رەگەز ئەرمەنی بوو، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٨. وەستا (بوغز)، بە رەگەز ئەرمەنی بوو، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
٩. وەستا (مەلا مەحمود)، ناسراو بە (شێخی بەرگدوورەكان)، خاوەن بەرگدووری (خەیام) بوو، لە گۆڕەپانی (سەرای).
١٠. وەستا (محەمەد شەفیع)، بە رەگەز هیندی بوو، لە شەقامی (مەجیدییە) بوو.
١١. وەستا (عوسمان) باوكی دكتۆر (یونس عوسمان) كە بەڕێوەبەری تەندروستی جارانی كەركوك بوو، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
١٢. وەستا (قادر حاجی ئەیوب)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
١٣. وەستا (عیزەددین عەلی مەردان)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
١٤. وەستا (محەمەد رەئووف)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
١٥. وەستا (تاهیر تەما)، خاوەنی بەرگدووری (بەلقیس) بوو لە شەقامی (ئەوقاف).

حەمزە خەیات

١٦. وەستا (ئەحمەد یەلّماز مەحمود موفتی):
لە سالّی (١٩٠٣) لە كەركوك لە بازاری حەلواچییەكان لەدایكبووە، لەلای خالّۆی (تەیب عەلی خەیات) فێری ئەم پیشەیە بووە لە دوكانەكەی كە نزیك مزگەوتی (منارە نەخشینە) بووە، لە دوای كۆچكردنی خالّۆی ئەم پیشەیەی گرتووەتەوە ئەستۆو لە سالّی (١٩٥٥) گواستوویەتییەوە بۆ شەقامی (ئەوقاف)، لە سالّی (١٩٨٢) كۆچی دوایی كردووە.
١٧. وەستا (تەیب)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
١٨. وەستا (هاشم)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
١٩. وەستا (ئەسعەد سابیر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٠. وەستا (عەبدولهادی وەدود)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢١. وەستا (حەسەن)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٢. وەستا (نافع عەلی مەردان نوری):
لە سالّی (١٩٣١) لە گەرەكی (موسەلّلا) لەدایكبووە، ئەم پیشەیەی لە برا گەورەكەی وەستا (عیزەددین عەلی مەردان)ەوە فێر بووە، دوكانێكی بۆ كردووەتەوە لە شەقامی (ئەوقاف).
٢٣. وەستا (خەیروڵلا زەینەلّ)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٤. وەستا (نازم مالّەلّلا)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٥. وەستا (سامی تاهیر)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو.
٢٦. وەستا (مەجید رەفیق)، خاوەنی بەرگدووری (فینۆس) بوو لە شەقامی (ئەوقاف).
٢٧. وەستا (زەینەلّ)، لە شەقامی (ئەوقاف) بوو لەگەلّ وەستا (عەبدولهادی وەدود).
٢٨. وەستا (محەمەد مەجید)، خاوەنی بەرگدووری (یەلّدز) بوو لە بازاری (عەسری).

٢٩. وەستا (کەماڵ محەمەد)، کوڕی (مەلا تۆپاڵ محەمەد)، لە بازاڕی (عەسری) بوو.

٣٠. وەستا (عەلی مەردان)، لە بازاڕی (عەسری) بوو.

٣١. وەستا (سەیید نامق)، خاوەن بەرگدووری (ئەلئەخا) بوو لە شەقامی (ئەتڵەس).

٣٢. وەستا (تاهیر)، خاوەن سینەما (ئەتڵەس)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٣٣. وەستا (ڕەفعەت)، بەرامبەر سینەما (ئەتڵەس) بوو.

٣٤. وەستا (وەستا حەسەن کەواکب)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٣٥. وەستا (ناسیح سەعید عەلی تەرزی):

لە ساڵی (١٩٤٢) لە گەڕەکی (ئاغاکان) لە قەڵا لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە باوکییەوە (سەعید عەلی تەرزی) وەرگرتووە، لە سەرەتادا کاری کردووە لەلای وەستا (ساڵح سووری- ساڵح دیمەشقی) لە شەقامی ئەتڵەس، لە ساڵی (١٩٦٩)ەوە لەم پیشەیەدا لە شەقامی (ئەتڵەس) کۆگای تایبەتی خۆی هەبووە، ماوەیەك کارگەیەکی بۆ دروستکردنی کەلوپەلی ئافرەتان و پیاوانی ئامادەکراوی کردەوە بە ناوی کارگەی (ئەلئەخا) لە شەقامی (ئەوقاف) لە ساڵی (١٩٩٦)، لە (١٨)ی شوباتی ساڵی (٢٠١١) کۆچی دوایی کردووە.

٣٦. وەستا (تاهیر سابیر سومانچی ئۆغلو)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٣٧. وەستا (عادل تەرزی)، خاوەنی بەرگدووری (ئەلئەندەلوس) بوو لە شەقامی (ئەتڵەس).

٣٨. وەستا (شوکور تکەر)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٣٩. وەستا (ئیبراهیم)، لە بازاڕی (عەسری) لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٤٠. وەستا (نازم بەگتاش)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٤١. وەستا (ئیسماعیل مستەفا تەها بیرەقدار-ئیسماعیل ئەفەندی):

لە ساڵی (١٩٣١) لە گەڕەکی (پیریادی) لەدایکبووە، ئەم پیشەیەی لە وەستا (محەمەد شەفیع هیندی)یەوە لە شەقامی (مەجیدییە) فێربووە، ماوەیەکیش لەلای وەستا (ساڵح دیمەشقی) کاری کردووە، لە ساڵی (١٩٥١) کۆگایەکی تایبەتی بە خۆی کردووەتەوە لە بەرامبەر چاپخانەی (ئەحمەد ئاغا)، بەڵام لە دواییدا گواستوویەتیەوە بۆ بەرامبەر مزگەوتی (ئیبراهیم بەگ)، لە دوای ماوەیەکی تر شوێنەکەی چووەتە شەقامی (ئەتڵەس) لە نزیك سینەما (ئەتڵەس)، بۆ ماوەی چل ساڵ تا ئەوەتەکان بەردەوام بووە.

٤٢. وەستا (نورەددین ساڵح):

لە ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە باوکییەوە فێری ئەم پیشەیە بووە لە بازاڕی قەیسەری، بۆ ماوەی چل ساڵ لەم پیشەیەدا کاری کردووە، خاوەنی بەرگدووری (کەرکوك) بوو لە شەقامی (ئەتڵەس)، لە ساڵی (١٩٧٨) کۆچی دوایی کردووە.

٤٣. وەستا (کەماڵ ئەحمەد)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٤٤. وەستا (ئەنوەر ئەبو قۆریات)، لە بازاڕی (عەسری)، لە شەقامی (ئەتڵەس) بوو.

٤٥. وەستا (بەکر)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.

٤٦. وەستا (عەزرە)، بە ڕەگەز جوولەکە بوو، لە شەقامی (کۆماری) بوو.

٤٧. وەستا (جەبار)، بە ڕەگەز مەسیحی قەڵا بوو، لە شەقامی (کۆماری) بوو.

٤٨. وەستا (جەماڵ عەزیز):

لە ساڵی (١٩٤٣) لە قەڵا لە گەڕەکی (مەیدان) لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٧٠) بەرگدووری (جەماڵ)ی کردووەتەوە لە شەقامی (کۆماری).

٤٩. وەستا (ئیبراهیم تازەیی)، لە شەقامی (دکتۆرەکان) بوو.

٥٠. وەستا (یۆغز-بوغداسار)، بە ڕەگەز ئەرمەنی بوو، لە شەقامی (کۆماری) بوو.

٥١. وەستا (شەوکەت ئەبو عەبدوڵڵا پاکستانی)، لە شەقامی (کۆماری) بوو.

٥٢. وەستا (عەبدولخالق)، لە بەرامبەر سینەما (سەلاحەددین) بوو.

چۆڵەوانی بووە بە ڕێکەوت کابرایەکی ڕووخۆش و خانەدان بەڵام مەلوول و بریندار دەبینی لێ دەپرسی ئەوە دەدرکێنی کە ئیمام قاسمە ولە دەست زۆرداری عەباسییەکان هەڵاتووەو خۆی شاردووەتەوەو تکای لێ دەکا بە تەنیا جێی نەهێڵێ، ئیمام بەزامە قورسەکەیەوە سکاڵا دەکات و ئەوەندەی پێ ناچێ کۆچی دوایی دەکات ئەمیش بە ڕێزەوە دەینێژێ گومزێکیشی بۆ بنیات دەنێ و بەیەکجاری واز لە سەفەرەکەی دێنی و لێرە نیشتەجێ دەبێ و دەبێتە کلیلداری ئەم ئارامگەیە.

* بۆچوونێکی تر:

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی سەبارەت بە مزگەوتەکە دەنووسێت:- مزگەوت و مەدرەسەی ئیمام قاسم زۆر زل بوو لەوێ گۆڕێ هەبوو هی دەورانی قەرەقۆینلو بوو (١٤١١-١٤٧٠)ز ئەمانە لە هەموو جێیەك نەزرگەی چەند سەیدێکیان دائەمەزراند بە ناوی ئال ئەلبەیت. قسەکەی مەلا جەمیل وای دەردەخات کە گۆڕەکە هی ئیمام قاسمی نەوەی ئیمام عەلی نەبێ، ئەوەش زۆر ڕێی تێدەچێت، چونکە زۆرێك لە ئیمامەکان و کەسە پیرۆزەکان لە چەندین وڵاتی ئیسلامیدا مەزارو گۆڕیان هەیە کە دۆزینەوەی شوێنی گۆڕی بنەڕەتی ئەو پیاوە پیرۆزانەش بە تەواوەتی نازانرێت. (گوران فەتحی-شاری کەرکوك بەشێك لە مێژووی مزگەوت، تەکیە، خانقاو زاناو پیاوە ئاینییە ناودارەکانی-چاپی ئینستیتوتی کەلەپووری کورد ٢٠١٢ سلێمانی ل٥٤).

تێبینی / ئیمام قاسم نێژراوە لە ناحیەی القاسم کە دەکەوێتە شاری حیلەو قەبرەکەی لەوێیە وەك لە کتێبی (مراقد الائمة) هاتووە

*** جوگرافیای ناوچەی ئیمام قاسم:**

لە سەرچاوە عوسمانییەکان کە بە تورکی نووسراوە تێداهاتووە کە ناوچەی زێویە ئەبێتە دوو بەشەوە:- زێویەی سەروو (ئیمام قاسم) زێویەی خواروو (ئاخور حوسێن) گەڕەکی زێویە لە کۆندا گوندێکی بچووك یا کێڵگەیەکی کشتوکالی بووە.

هەروەها لە سنووری شارەوانی (حدود البلدیە) کرابووە دوو بەش ئیمام قاسمییەکەم ئەم گەڕەکانە بوو (ئیمام قاسم و ئاخور حوسێن و سەید سەروەرو بەرتەکیە) وئیمام قاسمی دووەم (عاشورو زێویەو یادگارو ئازادی و ئیسکان) ئەمە دیاری ئەدا لە کاغەزی وەسڵی کارەبا و ئاو.

ئەم ناوچە گەڕەکە ڕووبەرێکی گەورەی هەیە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوك. لە باکوورییەوە گوندی یار وەلی و لە باشوورییەوە قەڵاو لە ڕۆژئاوایەوە خرخاسە "ڕووباری خاسە"و لە ڕۆژهەڵاتییەوە ڕێگەی سلێمانی-کرکوك.

ئەم گەڕەکە دوو پردی سەرەکی ئەیبەستێت بەودیوی شاری کەرکوك یەکەم پردی کۆن "خەبات" دەیبەستێت بە دیوی خانەقاو شاترلو، دووەم پردی سەروو دەیبەستێت بە فلکەی ئیخوان و ڕەحیم ئاوا، هەروەها پردی پیادە ئەیبەستێت بە کۆرنیش و تەپەو ئەلماس.

ئەم شوێنەی ناوچەی ئیمام قاسم لە کۆندا پێی دەوترا زێویە (کە ناوێکی زۆر کۆنە زێوا-زێبا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی میدییەکان) گەڕەکی زێویە-زێوە لە کۆندا گوندێکی بچووك بووە کەوتووەتە تەنیشت ڕووباری خاسە لە تەختایی بەرامبەر قەڵا لە باکوورییەوە. مەرقەدی ئیمام قاسم و مزگەوتەکەی کەوتووەتە ناوەڕاستی زێویە دواتر ئاوەدان بووەتەوە خانو لە دەوروپشتی دروستکراوە بووەتە گەڕەکی ئیمام قاسم بەناوی ئەم زاتە پیرۆزەوە ناوەکەی زاڵ بووە بەسەر ناوە کۆنەکەی زێویە وەك دەڵێن ناولێنانی گشت بە بەشێك (تسمیة الکل بالجزء) تا ئێستا باکووری ئیمام قاسم هەر بەناوە کۆنەکەی ماوەتەوەو پێشی ئەڵێن سەرگەی زێویەوە بە باشووری ئیمام قاسم دەوترێ زێویەی خواروو کە گەڕەکی ئاخور حوسەینی تێدایە.

سنووری گەڕەکی ئیمام قاسمی کۆن لە چایخانەی یادگارەوە دەست پێ دەکات لە دواییدا ئەبێتە دوو بەش لای خاسە پێی ئەڵێن زێویە لای مەکینەی بەفرەکە دەست پێ ئەکات تاکو چایخانەی عاشور تێ دەپەڕێ بەلای خاسەوە.

دووەم لای گەڕەکی ئیمام قاسم لە قەبرستانەوە دەست پێ ئەکات لای بەیتالخانەی کۆنەوە دائەبەزی بۆ لای قوتابخانەی ئیمام قاسمی سەرەتایی کوران دوایی تەکیەی شێخ نورەدین شێخ سالح چیمەن تا چایخانەی عاشور ئینجا بە چەپەوە لای مزگەوتی ئیمام قاسم تاکو ئەگاتە سەر کۆڵانەکەی سەید سەروەر نزیکی تەکیەی شێخ حەسەن قرەچێوار لەوێدا گەڕەکی ئیمام قاسم تەواو ئەبێت، بەڵام لە ڕەسمیاتە گەڕەکی زێویە نییە هەر بە ئیمام قاسم ئەناسرێت، بەڵام ئێستا گەڕەکی ئیمام قاسم وەك ناوچەیەکی فراوان چەند گەڕەك و کۆڵانێك ئەگرێتە خوی.

گەڕەك بە یەکەیەکی بنچینەیی دەژمێردرێت لە پێکهاتەی شارەکاندا کە ڕووخسارەکانی پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتییانەی تێدا ئەردەکەون، هەموو شارێکیش وەك ئەرێتە چەند گەڕەگێك دەگرێتە خۆ هەر گەڕەگێك لە گەڕەکەکانی شار لە شەقامێکی پان و کۆڵانە تەسك و تەنگ و پیچاو پێچەکانی کە لقی شەقامە گەورەکان پێکدێت.

شاری کەرکوك و گەڕەکی ئیمام قاسم-یش هەر بەم شێوەیەیە.

*** ناوی گەڕەك و کۆڵانەکان:**

١. ئیمام قاسم
٢. زێویە
٣. عاشور
٤. ئاخور حوسێن
٥. بەرتەکیە
٦. سەی سەروەر
٧. یادگار
٨. ئازادی
٩. ئیسکان
١٠. ئیسکانی تازە
١١. جمهوری (خانوە قورەکان)
١٢. کیلانەکە
١٣. قاپلی باغ

١٤. سەر شاخ (حوسێن ئاوا)
١٥. حەی موسەنا
١٦. قەراغ خاسە
١٧. بارودخانە
١٨. چوار باغ
١٩. شێخە سوورە
٢٠. سێکە جاخ-کۆنترین کۆڵانە لە گەرەکی زێویە

*** ناوی گەرەکەکان لە کوێوە هاتووە یا لەچی وەرگیراوە:**

١. گەرەکی ئیمام قاسم:- ناوەکەی لە مەرقەدی پیرۆزی ئیمام قاسم وەرگیراوە کە لەم شوێنەیە.
٢. زێویە:- ناوێکی کۆنە لە زێویو (زێویا-زێبیا) وەرگیراوە بووەتە زێویە - زێوێ - زێوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ماننا (میدییەکان).
٣. سەید سەروەر:- بە ناوی لەقەبی سەید محەمەد ئاغا پیریادی نراوە کە لە قەبرسانی شێخ محێدین لە کەرکوك نێژراوە.
٤. عاشور:- بەناوی خاوەنی چایخانەی عاشورەوە نراوە.
٥. بەر تەکیە:- بەناوی تەکیەی گەورە-تەکیەی تالەبانی نراوە.
٦. یادگار:- بەناوی کەسێکەوە نراوە (یادگار حاجی نوری) کە لە گوندی یاروەلی هاتووەتە ئەم شوێنە لە زێویە چایخانەیەکی لێ کردووەتەوە لە چلەکان.
٧. ئاخور حوسێن:- بەناوی پیاوێك ناوی حوسێن بووە بۆ حەوانەوە خان و ئاو و خوری وڵاغی هەبووە لەو شوێنە، بۆ چوونێکی تر هەیە کە ناوی لە (ئاخوند حوسێن)ەوە هاتبێت کە لەوانەیە پیاوێکی ئاینی گەورە لەو ناوچەیەدا هەبووبێت. (سمکۆ بەهرۆز-مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و بەڕێوەبەرییەکانی پارێزگای کەرکوك-٢٠٠٥ چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی ل٦٩).
یا ئەبێت ناوەکەی لە ئاخی حوسێن واتا عەردی (خاك) یا موڵکی حوسێن ناوێك هاتبێ.
وەرایەکی دیکەش هەیە کە گوایە لە (الفرقة الأخیة)، (ڕێبازی برایی)وە هاتووە (وەرگیراوە) کە ڕابەرەکەیان ناوی شێخ حوسێن بووە بە ئەمری سوڵتان مرادی چوارەم لە ئەنادۆڵەوە هاتووە بۆ ئەم شوێنە کە پێی ووتراوە (اشاغی زێویە) واتە زێویەی خواروو مریدەکانی لە دەوری کۆبوونەتەوە بووەتە گەرەکێك بە ناوییەوە کە لەوێش نێژراوە و مەرقەدەکەی شوێنی تا ئێستا لەو گەرەکەیە و ڕووخاوە وە ئەمانە لە بەکتاشەکان بوون کەوتبوونە کەرکوك.
٨. جمهوری:- گەرەکی خانوە قورەکان بەناوی کۆماری (جمهوری) عێراقەوە نراوە لە دوای شۆڕشی (١٤)ەی تەموزی ١٩٥٨ز.
٩. ئیسکان:- بەناوی خانوەکانی (مشروع الإسکان)ەوە نراوە ساڵی ١٩٥٩.
١٠. ئازادی:- گەرەکێکی تازەیە لە ساڵی ١٩٥٧ دروستکراوە لە سەرووی زێویە ناوەکەی لە دوای شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ لێنراوە.
١١. ئیسکانی تازە:- تەنیشت گەرەکی ئیسکانی کۆنە لە ڕۆژهەڵاتییەوە لە ساڵی ١٩٦٤ بنیاتنراوە.
١٢. گۆڕستانی شێخ محێدین:- بەناوی ئەم زاتەوە نراوە شێخ محێدین کوری شێخ حەسەن گڵەزەردە کوری شێخ محەمەد نۆدێی کوری شێخ عەلی وەندەرینی کوری شێخ بابا ڕەسوڵ بەرزنجی کە ناسراوە بە شێخ محێدینی کەرکوك.
١٣. گۆڕستانی ئیمام محەمەد:- بەناوی ئەم زاتەوە نراوە کە برا بچووکی ئیمام قاسمە وەکو ئەڵێن.
١٤. گۆڕستانی قرخلەر:- بەناوییەکی لە زانا ئایینییەکانی ئەم گەرەکە نراوە کە لە ئەستەمبوڵ گەڕاوەتەوە لە ڕێگا چەتە ڕێی لێگرتووە کە لێیان پرسیوە چەندی پارەو لیرەت پێیە ووتویەتی چل و بروایان پێ نەکردووە کە مەلایەك ئەو هەموو لیرەیەی هەبێ وازیان لێ هێناوە دواتر گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك لە گەرەکی ئیمام قاسم مەلایەتی کردووە لە دوای وەفاتی نێژراوە لەو شوێنەی ئێستا کە پێی ئەڵێن قرخلەر واتە چلەکان بەناوی ئەوەوە (لە سەر زاری مامۆستا محەمەد تاهیرەوە).
١٥. خاسە ناوەکەی چەمی خاسە کۆنە وشەیەکی گۆڕاوە لە وشەی (حاشا-خاشا) کە گۆڕانێکی زۆری بەسەر هاتووە لە (حاسا-خاسا) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانییەکان لە دواجاردا بووەتە خاسە - خاصە گیرساوەتەوە بەم ناوە.
* چەمی خاسە (رووباری خاسە):
فراوان ودرێژە ئەکەوێتە ناوەندی کەرکوك و بەتەنیشت گەرەکی زێویە و ئیمام قاسم و ئاخور حوسێن ئاوەکەی تێئەپەڕی و ئەڕوات.

*** ناوی شەقامەکان:**

١. شەقامی ئیمام قاسم-دەست پێی ئەکا لە ئاخور حوسێنەوە بە بەردەم مزگەوتی نائیب ئەڕوات. بە ئاراستەی باکوور تێدەپەڕێ بە بەردەم مزگەوتی سەید غنی و تەکیەی قەرەچێوار و مزگەوتی ئیمام قاسم تا وەکو یەك ئەگرێ لەگەڵ جادەی کۆنی ڕێی سلێمانی.
٢. شەقامی سیروان
٣. شەقامی سلێمانی
٤. شەقامی ئازادی
٥. شەقامی ئیسکان
٦. شەقامی ئیسکانی تازە
٧. شەقامی شەهیدان
٨. شەقامی شەهید عەزەدین
٩. شەقامی شەهید عادل یاروەلی
١٠. شەقامی خاسە
* پاسی حکومی (مصلحة نقل الرکاب) ژمارە٧ی لێ نووسرابوو (مقر القیادە-الإسکان) یا (مقر الشرطة-إمام قاسم) بۆ گواستنەوەی هاووڵاتیان کەوتە کار ساڵی ١٩٦٢

*** ناوی بازارەکان:**
١. بازاڕی حەسیرەکە
٢. بازاڕی عەلوەکە
٣. بازاڕی بچووك-ئاخوڕ حوسێن
٤. بازاڕی ڕێگەی سلێمانی
٥. بازاڕی ئازادی
٦. بازاڕی عاشور
٧. بازاڕی زێویە
٨. بازاڕی ئیسکانی تازە
٩. بازاڕی ئیسکان
١٠. بازاڕی گەنم فرۆشەکان
١١. بازاڕی حەیوان فرۆشەکان (جامبازەکان)

*** ناوی گۆلەکان:**
١. گۆلی ئینگلیزەکان لە ڕێی یارەملی
٢. قاتر بۆغان لە ڕێی یارەملی
٣. گۆلی سێ دارە ( جێی تەلفزیونی کەرکوك لە ئیسکان-ئازادی) هێن تورك بو بۆ سەربازی فێرار.

*** ناوی کانی ئاو:**
١. شێخ محێدین (بلاغەکە)
٢. کلێسە لە بەرتەکیە (بلاغ)
٣. جۆگەی زێویە
٤. ئاوی ئاشە سوورکە
٥. ئاوی خدر زندە

*** ناوی سەیرانگا:**
١. چوارباغ
٢. حەسەن گوڵێ
٣. قەراغ خاسە لە جەژنەی رەمەزان و قوربان (نزیك پردی خەبات ئێستا بووەتە سەیرانگە)

*** ڕووداوە گرنگەکانی ناوچەی ئیمام قاسم:**
١. لە کاتی داگیرکردنی کەرکوك لەلایەن نادر شاهەوە ساڵی ١٧٣٢ز سوپای ئێران فرمانی وەر ئەگرت لە مۆلگاکەی (بارەگای) کە کەوتبوە زێویەی سەروو (ئیمام قاسم) وتا ئێستا هەر بەم ناوە ناسراوە لە کەرکوك.
٢. لە ساڵێ ١٩١٧ سوپای عوسمانی گەرەگی زێوێی یان سوتاند.
٣. لە ساڵی ١٩١٨ سوپای ئینگلیز لە زێویە کەمپیان دانا (لە جێگەی قوتابخانەی غەزالی کوران) بەڵام خەڵکەکە کەوتنە تەقەکردن لێیان بۆ لایەنگیری شێخ مەحمودی نەمرو شۆڕشەکەی دژی ئینگلیز. ولەو ساڵەدا ئینگلیز پیاوێکی بە ناوی نەریمان شەهید کرد مامی سەعید باخەوان بو.
٤. لە شەڕی ئەرمەنی لە ٤ ئایاری ساڵێ ١٩٢٤ لە کەرکوك ناەیق قەمەرو حاجی مەحمود تەکیە شەهید بوون (لە ڕاستیدا ئەمە شەڕی هێزی لیڤی بوو کە لە تیارییە ئاسوورییەکان پێکهاتبوو).
٥. شیعەکان لەناو مزگەوتی ئیمام قاسم شینیان بۆ ئیمامی حوسێن ئەکرد لە عاشورادا (١٠ محرم) ساڵانی سی و چلەکان بەڵام مەلا قادری ئیمام مەنعی کرد، تا ئێستا چەندماڵێك لەوانە ماون لەم گەرەکە.
٦. یەکەم کۆبوونەوە بەسترا لەنێوان رەفیق حیلمی ودامەزرێنەرانی کۆمەڵەی دارکەر لە هاوینی ساڵی ١٩٣٨ز بۆ گفتوگۆ لە بابەتی گۆڕینی کۆمەڵەکە بۆ حیزب لە ماڵی یونس تۆفیق لە گەرەکی ئاخوڕ حوسێن کە ئەکاتە ئامۆزای رەفیق حیلمی.
٧. گردبوونەوەی حەقەکان لە سەرووی زێویە کە ناسراوە بە ڕووداوی دارەقولە بۆ نارەزایی گرتنی مامە رەزا رابەری حەقەکان لە ساڵی ١٩٤٤ز.
٨. سەردانی موتەسەریفی کەرکوك سەعید قەزاز بو قوتابخانەی سەرەتایی ئیمام قاسم ساڵی ١٩٤٨- ١٩٤٩ ودروستکردنی تواڵیت بو قوتابیان.
٩. هاتنی خیزانە شیعەکانی خوارووی عێراق بۆ زیارەتی مەرقەدی ئیمام قاسم لە بەنجاکانەوە تاوەکو ئێستا، لە مانگی رەجەبدا (نور) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە مزگەوتەکە دەمانەوە.
١٠. بەستنی کۆنگرەی سێی پارتی ساڵی (١٩٥٣) لە کەرکوك بەنهێنی لەم گەرەکە لە ماڵی عەلی حەمەدی، لەم کۆنگرەیەدا ناوەکەی گۆڕا لە پارتی دیموکراتی کورد بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان، وئیبراهیم ئەحمەد بە سکرتێر هەڵبژێرا. (م٠عەلی پەرلەمان-کتێبەکەی عەلی حەمدی سیمبولی کوردایەتی- سلێمانی ٢٠١٣ ل٢٣).
١١. هێنانەوەی تەرمی خوا لێخۆشبوو شێخ مەحمودی حەفیدی نەمر لە بەغداوە بۆ سلێمانی ساڵی(١٩٥٦) وە تێپەڕبوونی ئۆتۆمبێلەکان بە گەرەکی ئیمام قاسم-زێویە ئەوسا ڕێگەی سلێمانی-کەرکوك بەم گەرەکەدا ئەڕۆیی، هەموو خەڵکی گەرەك بە داخ و گریانەوە بەڕێیان دەکرد.
١٢. تێپەڕبوونی کەژاوەی مەلیك فەیسەڵی دووەم بە گەرەکی ئیمام قاسم ساڵی (١٩٥٧) کە دەڕۆیشت بۆ سلێمانی . خەڵکی گەرەك بە پیاو و ژن و منداڵەوە پێشوازییان لێکرد ئەم دیو ئەو دیوی جادەکە جەماوەر وەستا بوو سڵاویان لێ ئەکرد گوڵ باران ئەکرا لەلایەن دیدەوانی کچانەوە.
١٣. لە ساڵی ١٩٥٨ بڕیار بوو کە ئاهەنگی جەژنی نەورۆز بکرێت لە چوارباغ بەڵام نەکرا بەهۆی قەدەغەکردنی لەلایەن حکومەتەوە لە بەغدا بە پۆلیسی سوارە تێکدرا
١٤. هاتنی سەرکردەی کورد خوالێخۆشبوو بارزانی نەمر مەلا مستەفا لە ٢٥ تشرینییەکەم ١٩٥٨ بە میوانی بۆ ماڵی عەونی یوسف کە ئەوسا حاکم بوو لە کەرکوك لە ئیمام قاسم دائەنیشت کە بەرێزی لە ڕوسیا گەرایەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکرا لەلایەن خەڵکی گەرەك بە هەموو چین و توێژەکانی و ئەمە بە یەکێك لە هەرە ڕووداوە گرنگەکانی ئەم گەرەکە دائەنرێت.
١٥. دامەزراندنییەکێتی قوتابیانی ئاینی لە کەرکوك لە ماڵی خوالێخۆشبوو عەلی سەربازی لە گەرەکی سەید سەرەوەر نزیك بە مزگەوتی ئیمام قاسم لە شەوی ٢٣/٢٢ی

کانوونییەکەمی ساڵی ١٩٥٨ کۆنگرە بەسترا بە نهێنی، ئەو کەسانەی سەرپەرشتی کۆنگرەکەیان ئەکرد هەڤاڵان عومەر دەبابەو عەلی عەبدوڵڵاو مامۆستا مستەفا نەریمان بوون. (عومەر حاجی عەلی ڕەزا زەنگەنە-لە بیرم دێ ژانەکانی کورد-٢٠٠٨ کەرکوك ل١٧ و١٨ و٣٦).

ئەندامانی کۆنگرە ئەمانە بوون

١- مەلا ڕەئووف هەمەوەندی

٢- مەلا بەختیار شوانی

٣- مەلا عومەر دیبەگەیی

٤-مەلا عوسمان خاڵدانی

٥- مەلا عومەر زەنگەنە خەڵکی بناری گل

٦- عومەر عەلی ڕەزا

١٦. کردنەوەی لقییەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان لە دوای ١٤ تەموزی ساڵی ١٩٥٨ هەروەها کردنەوەی لقییەکێتی لاوانی دیموکراتی عێراق.

١٧. ئاهەنگی جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩ کە شەوی ٢٠ لە سەر ٢١ ی ئەو ساڵە کرا تاکو ئێستا ئاهەنگی وەها نەگێراوە بە ئاشکرا لە مێژووی شاری کەرکوك وە بەسەرپەرشتی و هاوبەشی هەردوو حیزبی پارتی و شیوعی گەورەترین ئاگری تێدا هەڵگیرسا لە شوێنی چایخانەی خورشید لە گەرەکی ئیمام قاسم و گۆرەپانەکەی پشتیدا کرایەوە خەڵکان بەتایبەتی گەنجان پۆل پۆل بەریز وریك وجوان لە گەرەگەکانی شۆریجەو پیریادی و بلاغ و بەرتەکیەو ئاخورحوسێن و زێوێە بە مەشخەلی ئاگرەوە هاتن بۆ بەشداربوون دەچوونە شەقام و گۆرەپانەکە بە سروودی نەورۆز و ئەی ڕەقیب. هەموو ماڵەکانی گەرەکی ئیمام قاسم ڕازابوونەوە بەچلی دار و گوڵ و کاغەزی ڕەنگاورەنگ و شەقامەکان بەگلۆپی ڕەنگین. سەربانی ماڵەکان پڕبوون لە ژنان و کچانی گەرەك. لاوان گورانی و سروودیان دەوتەوە و هەڵپەرکێی کوردی تاکو شەوێکی درەنگ بەردەوام بوو.

١٨. هەروەها ئاهەنگییەکەم ساڵیادی شۆرشی ١٤ گەلاوێژ بەهەمان جۆش وخرۆش گێرا شەوی ١٣ لە سەر ١٤ تەموزی ١٩٥٩ز.

١٩. گرتنە خۆی ماڵە تورکمانەکانی قەلا لەلایەن خەڵکی ئیمام قاسمو ئاخور حوسێن و زێویە کاتی ڕووداوی کەرکوك ١٤-١٦ تەموز ١٩٥٩.

٢٠. سینەمای گەرۆك ئەهاتە گەرەکی ئیمام قاسم فلیمی پێشان خەڵکی ئەدا لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان.

٢٢. مانگرتنی ١٩٦١ز لە گۆرستانی ئیمام قاسم بەلام نەهێشترا تا سەر بچێ وئەنجامی بێ وەتێیدا عەزەدین خەتاب و ئەسکندەر گیران لەلایەن پۆلیسەوە.

٢٣. شەهیدبوونی کۆمەڵێ پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شۆرشی ئەیلول "١٩٦١-١٩٧٥" کە خەڵکی ئەم گەرەکە بوون.

٢٤. سەردانی خوا لێخۆشبوو عومەر دەبابە و لەگەڵ هەندێ لە پێشمەرگەکانی بۆ ماڵی کاکەی حاجی مەحمود لە ئیمام قاسم ساڵی ١٩٦٣ کاتی گفتەگۆکردنی نێوان شۆرشی کوردو حکومەتی ئەوسای عێراق، خەڵکانێکی زۆر چوون بۆ پێشوازی لە بەرێزی و بۆ دیتنی پێشمەرگە کە یەکەم جار بوو دەیانبینی لەناو شاری کەرکوك.

٢٥. زەماوەندی خوالێخۆشبووان مامۆستا تەحسین تاڵەبانی و فەوزیە خانی خوشکی بەرێز مام جەلال ساڵی ١٩٦٣ ڕوودا وێکی سەیرو خۆشبوو هەموو کچ و ژنانی گەرەکەکانی ئیمام قاسم ڕژانە ماڵی خوالێخۆشبوو شێخ حەبیب باوکی شێخ تەحسین بۆ دیتنی بووك و پێشوازی لێی.

٢٦. لە ڕووداوە دڵ تەزێنەکان:. لەسێدارەدانی ٢٨ کەس لە کەسایەتی حیزبی شیوعی لە ٢٣ حوزەیران ساڵی ١٩٦٣ بە بیانووی ئەوەی کوردو شیوعین، ئەم شەهیدانە زۆربەیان خەڵکی ئەم گەرە تێکۆشەر بوون و هەموویان لە گۆرستانی ئیمام قاسم نێژران، ئێستا بووەتە گۆرستانی شەهیدان.

٢٧. ڕووخاندنی خانووەکانی گەرکی جمهوری ودەرکردنی ماڵەکانی لە هاوینی ساڵی ١٩٦٣ز.

٢٨. گەرانەوەی مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لە دوای بەیانی ١١ ئاداری ١٩٧٠ لەگەڵ کادرو پێشمەرگەی ئەیلول عەریف خەلیل کە هەموو خەڵکی ئیمام قاسم ئەو ڕۆژە باسی ئەکەن تا ئێستاش کە بۆ یەکەم جار ئاهەنگیان ساز کرد لە ماڵیان هەموو گەرەك کۆبوونەوە.

٢٩. سەردانی عەدنان قەیسی پاڵەوانی زۆرانبازی جیهانی بۆ یانەی سۆلاف لە ١٢/٢ ساڵی ١٩٧٠ز.

٣٠. بەستنی کۆرێکی شیعر خوێندنەوە ساڵی ١٩٧٢ لە ناوەندی ئیمام قاسم کە تایبەتبوو بە یەکەم مەهرەجانی شیعری کوردی کە لە کەرکوك بەسترا لەو ساڵەدا.

٣١. شەهیدبوونی پۆلێ لە پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان (١٩٧٦-١٩٩١) کە خەڵکی ئەم گەرەکە دێرینە بوون.

٣٢. لە سەر ڕاسپاردەی سەرۆك مام جەلال لەلایەن چەند سەرکردەیەکی بە توانا لە گەرەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك لە ٢٥/ ١٩٧٦/٤ یەکێتی خوێندکارانی شۆرشگێری کوردستان دامەزرا لە ماڵی محەمەد خورشید لە دواییدا ناوەکە گۆرا بۆ کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان.

٣٣. خۆپیشاندانە مەزنەکەی ١٩٨٢/٥/٦ کەکۆمەڵێك گەنجی خوێن گەرمی گەرەکی ئیمام قاسمو گەرەکە کوردەکانی تر ئەنجامیاندا پاش بەخاك سپاردنی شەهید مامۆستا هاشم ڕەئووف لە گۆرستانی شێخ محێدین وە بڵێسەی خۆپیشاندانەکە دەستی پێکرد وبەرەو ئامادەیی سەورەی کوران (ئازادی ئێستا) وبازاری حەسیرەکە کەوتنە رێ دواتر بۆ ناو ئاسنگەرەکان و حەلواچییەکان وەلە لایەن دامودەزگا داپلۆسینەکانی ڕژێمی بەعس بەرەنگار بوونەوە وهەندیکیان لێ گرتن ویا بریندار بوون ولە ئەنجامی ئازار وئەشکەنجەدان چەندین کەم ئەندامی لێ کەوتەوە وچەند کەسێکیان دواجار سزادران بە سێدارەدان و چەند ساڵی زیندانی و حوکمی هەتاهەتایی ئەمانە لە دوای دەرچوونی لێبوردنی گشتی بەرەڵڵا کران.

٣٤. لە ساڵی ١٩٨٧ کاتی جەنگی عێراق و ئێران موشەکێك کەوتە کیلانەکە لە گەرەکی ئیمام قاسم لە ئەنجامدا ماڵێکی

نۆر ڕووخاو وشەهیدی لێکەوتەوەو چەند خانەوادەیەك تیاچوو بەپیاوو ژن و منداڵەوە.

٣٥. سەردانی بەڕێز نیچیرڤان بارزانی بۆ ماڵی شەهید عەزەدین قەرە محەمەد لە ٢٢ی ئایاری ساڵی٢٠٠٣

٣٦- دانیشتووانی گەڕەکی ئیمام قاسم سێ جار کۆڕەویان کردووە لە مێژووی تازەی کەرکووکدا.

یەکەمیان ساڵی ١٧٩٩ز کاتی بڵاوبوونەوەی پەتای ڕەشاو (تاعون). دووەمیان لە جەنگییەکەمی جیهانی (سەفەر بەلك) ساڵی ١٩١٤ز . سێیەم لە کاتی راپەڕینی جەماوەر ساڵی ١٩٩١ز.

*** ناوی ئەو کەسایەتییانەی لە گەڕەکی ئیمام قاسم دانیشتوون:**

١. ئیبراهیم ئەحمەد (خوالێخۆشبووی محامی و سیاسەتمەدار) ١٩٥٣-١٩٥٨ وەلە ساڵی ١٩٥٤ خاتوو هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد ناونووسکرا لە پۆلییەکی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئیمام قاسمی کچان.

٢. حەمە ڕەشید خان بانەیی ئەم کەسایەتییە کوردە لە گەڕەکی ئاخور حوسێن دانیشتووە لە پەنجاکان نێوان ١٩٥٠-١٩٥٨ز.

٣. ئەحمەد غەفوور بابان "سیاسەتمەداری شیوعی" مامۆستای وانەی کوردی بوو لە قوتابخانەی نەجاحی سەرەتایی ١٩٥٩-١٩٦١.

٤. عەونی یوسف (سیاسەتمەداری پارتی) حاکم بوو لە کەرکوك لەساڵی ١٩٥٨.

٥. نوری شاوەیس (خوالێخۆشبوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان مدیر ئەشغاڵی کەرکوك بووە لە پەنجاکان.

٦. جیهان سدیق شاوەیس (سیاسەتمەدار) لە ١٩٥٨-١٩٦٠.

٧. عومەر دەبابە (سیاسەتمەداری کورد محامی بوو لە کەرکوك لە ماڵی برای تاهیر مستەفا بوو لە ١٩٥٨-١٩٦٠.

٨. ئیسماعیل حەقی شاوەیس ئەفسەرێکی گەورەبوو لە سوپای عێراق لە چلەکانی سەدەی رابردوو.

٩. مستەفا نەریمان (خوالێخۆشبوو نووسەرو ئەدیب) بەڕێوەبەری قوتابخانەی نەجاح بوو لە ١٩٥٨-١٩٦١.

١٠. تاهیر تۆفیق "گۆرانی بێژی بەناوبانگ" لە پەنجاکان.

١١. مەکی عەبدوڵلا "هونەرمەند عەلی ئەفەنی" ساڵی ١٩٥١ کە پێشتر قوتابی بووە لە سەرەتایی ئیمام قاسم لە چلەکان.

١٢. حەسەن تەلحە "دکتۆر نۆرینگەو ماڵەکەی" لەم گەڕەکەبوو لە ناوەراستی شەستەکان.

١٣. ئەحمەد تانی "عەقید سوپا" لە پەنجاو شەستەکان.

١٤. عەبدولرەزاق عەبدولواحد (شاعیری عێراقی) مامۆستا بوو لە ناوەندی غەربیە لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان ١٩٥٨-١٩٦٠.

١٥. عەزەدین ڕەحمەتوڵلا بەڕێوەبەرێکی گەورەبوو کچێکی مامۆستای سەرەتایی بوو بەناوی ست عەدویە لە قوتابخانەی ئیمام قاسمی کچان لە پەنجاکان و شەستەکان.

١٦. حاکم عەلادین لە شەستەکان.

١٧. عەمید ئەحمەد حەسەن لە شەستەکان.

١٨. عەلی کەمال باپیر "شاعیری ناسراو" لە پەنجاکان.

١٩. ئازاد شەوقی هونەرمەندی شێوەکار-لە پەنجاکان پێشتر قوتابی بووە لە قەتابخانەی سەرەتایی ئیمام قاسم .

٢٠. دکتۆر حەبیب سەیفوڵلا-نۆرینگەکەی لە شەستەکان لە گەڕەکی ئاخور حوسێن بووە.

٢١. دکتۆر عەبدولرەحمان محەمەد عەلی-نۆرینگەکەی لە شەستەکان لە گەڕەکی ئاخور حوسێن بووە.

٢٢. دکتۆر مارف خەزنەدار-مامۆستا بوو لە ناوەندی شەرقیە لە کۆتایی پەنجاکان ١٩٥٨-١٩٥٩.

٢٣. ئەنوەر مەحمود سامی- شاعیر"ئەنوەر غەسانی" مامۆستابوو لە ناوەندی شەرقیە ساڵی ١٩٥٨-١٩٦٠.

٢٤. محەمەد فەخری ئەفسەری پۆلیس لە چلەکان باوکی دکتورە نەسرین فەخری (مامۆستاو نووسەر).

٢٥. عوسمان خۆشناو "نووسەرو ڕۆژنامەنووس"فەرمانبەر بوو لە شـارەوانی لـە پەنجاکان تا حەفتـاکان و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی گاوریاغی بوو نێوان ساڵی ١٩٥٩-١٩٦٠ز.

٢٦. تایر چەلەبی کۆیی-بازرگانی تووتن بوو لە چلەکان.

٢٧. عەبدولقادر بەرزنجی-ئەفسەرو نووسەر گۆڤاری شەفەقی دەرئەکرد لە ١٩٥٨-بو ١٩٦٠ وە شوێنی کوڤارەکەشی ساڵی ١٩٥٩ لەم گەڕەکە بووە.

٢٨. عەبدوڵلا ئیسماعیل (مەلا ماتۆر) "سیاسەتمەدار لە پەنجاکان".

٢٩. عەبدولسەمەد خانەقا "چیرۆکنووس" لە ١٩٥٨-١٩٦٠.

٣٠. ئەنوەر تاهیر (هونەرمەند) مامۆستا بوو لە قوتابخانەی نەجاح ١٩٦٢-١٩٦٣.

٣١. رائید تەیار حەسەن حاجۆ-ئەفسەری فرۆکەوانی هەلیکۆپتەر لە ناوەراستی شەستەکان.

٣٢. عومەر عارف-نووسەر مامۆستا بوو لە ناوەندی غەربیە ساڵی ١٩٥٨-١٩٦١.

٣٣. عەبدولقادر-ئەفسەرێکی عەرەبی گەورەبوو لە سوپای عێراق لە شەستەکان.

٣٤. ئەحمەد ساڵح باوکی دکتۆر بەرهەم کە دادوەر بووە لە کەرکوك.

٣٥. کاکە حەمەی خانەقا پارێزەر و خێزانەکەی ست سەعدیە خان.

٣٦. سەبری عەبۆ خاوەنی چاپخانەی شیمال لە کەرکوك کە دیانێکی (مسیحی) موسلاوی بوو زۆر خزمەتی کتێبی کوردی کرد لە چاپکردنیان ماڵی لە سەرەتای شەستەکان لەم گەڕەکە بووە.

٣٧. فاتیح مەلا داود سیاسەتمدارو ئەفسەر ساڵی ١٩٦٣ لە سێدارەدرا.

٣٨. عەبدوڵلا عەبدولرەحمان زەنگەنە ئەدیب ونووسەر.

٣٩. تاهیر سادق (تاهیر ئەفەنی) کە خەڵکی کۆیە بوو باوکی نووسەر فوئاد و جێگری پارێزگای سلێمانی قوباد و ئەفسەری پۆلیس مەحمود.

٤٠. عومەر کەریم ئاغا هونەرمەندو ئەکتەری ناسراو کە خەڵکی سلێمانییە لە ساڵی ١٩٦٣ ز لە ئیمام قاسم دانیشتووە و قوتابخانەی ئامادەیی موسەڵلای لە کەرکوك

تەواو کردووە.
٤١. مەلا عەبدولکەریمی مودەریس کە خەڵکی بیارە بوو ئیمام و مامۆستا بووە لە مزگەوتی تەکیەی تاڵەبانی (تەکیەی گەورە) ساڵانی (١٩٥٥-١٩٦٠) و هەندێ لە کتێبەکانی لە کەرکوك چاپکردووە لە چاپخانەی تەرەقی هی محەمەد ئەمین عەسری.
٤٢. کاکە مەم بۆتانی چیرۆکنووس خوشکەزای عومەر دەبابە بوو لە گەڕەکی ئیمام قاسم دانیشتووە لە ماڵ خالی تاهیر مستەفا لە پەنجاکان ئێستا سەرۆکییەکێتی نووسەرانی کوردە.
٤٣. هادی ئاغای سەربەشاخ لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن لە سەرەتای شەستەکان.
٤٤. هەندێ لە ماڵە بەرزانییەکان لە ئیسکان دائەنشتن لە ساڵانی ١٩٥٩-١٩٦١ ز.
٤٥. عەلی کەمال بەڕێوەبەری غابات لە کەرکوك کوڕەکەی حوسێن عەلی کەماڵ بریکاری وەزارەتی ناوخۆیە لە حکومەتی عێراق ساڵی ٢٠١١.
٤٦. دارا تۆفیق (ئەندامی پارتی) ماڵی باوکی لە ئیمام قاسم دانیشتوون کە فەرمانبەر بووە لە کەرکوك ساڵی ١٩٤٠ کە ئەوکات خوالێخۆشبوو دارا قوتابی سەرەتایی بووە لە قوتابخانەی ئیمام قاسم.
٤٧. عارف تەیفور جێگری ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لە دوو خول ٢٠٠٥-٢٠١٤ قوتابی پۆلی چوارەم بووە لە سەرەتایی ئیمام قاسم ١٩٥٤.
٤٨. ئەنوەر مەحمود خان دزلی-کەسایەتی کۆمەڵایەتی، قوتابی سەرەتایی ئیمام قاسم بووە کە باوکی مەحمود خانی دزلییەکێك بووە لە لایەنگرانی شێخ مەحموود.
٤٩. هەردوو نووسەرو ئەدیب کەمال غەمبارو جەمال غەمبار.
٥٠. خالید دلێر-شاعیرو هونەرمەندی کۆچ کردوو.
٥١. شەکیب ئەفەندی-خەڵکی سلێمانی بووە بەڕێوەبەری خەزینەی کەرکوك لە گەڕەکی ئیمام قاسم دانیشتووە و کوڕەزاکەی جەمیل ئەمین شەکیب لەم گەڕەکە لەدایکبووە لە کەرکوك ساڵی ١٩٢٦ کە گەڵێك فەرمانی حکومی کردووە وەك مودیر تەحریراتی سلێمانی ١٩٧٠.
٥٢. شێخ عەلادینی شێخ جەسیمی شەمزینی کە لە نەوەی شێخ عوبیدوڵڵای نەهرییە لە ئیمام محەمەد لە قەبرسانی ئیمام قاسم بە خاك سپێردراوە فاتمە خانی خوشکی خێزانی شێخ محەمەد عەلی تاڵەبانییە.
لەپاش سەرنەکەوتنی شۆڕشی شێخ عوبیدوڵڵای نەهری لە ساڵی ١٨٨٢ز خزمەکانی ڕوویان کردووەتە ناوچەی کەرکوك‌و چەند پارچە زەوییەك دەکڕن لە گوندی سۆنە گۆلی.
٥٣. دکتۆر قدامە الملاح پێشکەشکاری بەرنامەی (العلم للجمیع) لە تەلەفزیۆنی بەغدا.
٥٤. کوێخا عوبێد حاجی لەتیف پاپیلان باوکی ئەندازیاری کشتوکاڵ جەلال عوبێد.
٥٥. سیاسەتمەدار خوالێخۆشبوو عەلی حەمدی ئەندامی جارانی لیژنەی مەرکەزی پارتی لە پەنجاکان ١٩٥١- ١٩٥٣.
٥٦. مەلا مەعسوم هەورامی باوکی دکتۆر فوئاد ئەندامی دامەزرێنەری (ی.ن.ك) سەرۆك کۆماری عێراق ساڵی ٢٠١٤
٥٧. شێخ محەمەد شێخ عەلی حەسەنی قولە شێخ محێدین کەرکوکی بەرزنجی خاوەن تەکیە لە گەڕەکی سەید سەروەر پشت مزگەوتی نائیب. کوڕەکەی شێخ ستار و هەردوو کوڕەکەی شێخ عەبدولقادر و عەبدولقەهار.
٥٨. خالە شەهاب (شەهید شەهاب شێخ نوری) دامەزرێنەرو سەرکردەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە سەرەتای حەفتاکان.
٥٩. عولەما (عەبدولڕەحمان زەبیحی-ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی) لە ماڵ باوکی حەمەی موکری دانیشتووە لە پەنجاکان.
٦٠. حەپسە خانی نەقیب و شێخ قادری مێردی ماڵیان لە تەنیشت ماڵی مەلا قادری ئیمام بووە بەرامبەر مزگەوتی ئیمام قاسم.
٦١. سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی گۆرانیبێژی ناودارو ناسراو. سەردانی گەڕەکی بەر تەکیە کردووە هاتووەتە ماڵی عەلی مەردان.
٦٢. دکتۆر شەماڵ عەقراوی‌و خێزانەکەی نۆرینگەیان لە گەڕەکی عاشوور هەبووە.
٦٣. حەسەن چاف-نووسەرو ئەدیب ماڵیان لە گەڕەکی ئازادی بووە ساڵی ١٩٥٧
٦٤. عەبدولواحید گۆزەچی گۆرانیبێژی تورکمانی لە سەرەتای پەنجاکان دانیشتووە.
٦٥. قادر مەردان-هونەرمەند گۆرانیبێژی کوردی ومیوزیك ژەن.
٦٦. سالح هەژار-شاعیر خەڵکی هەڵەبجە بوو لە ئیسکان دائەنیشت لە حەفتاکان.
٦٧. ئیسماعیل شاوەیسی قایمقام خەڵکی سلێمانی بوو.
٦٨. وەمیز جەماڵ عومەر نەزمی-پارێزەرو سیاسی خەڵکی کفری بوو.
٦٩. زوهدی داوودی-مامۆستاو نووسەرو ئەدیب خەڵکی دوزخورماتوو بوو.
٧٠. عوبێد عەبدولڕەحمان زیائەددین-مامۆستاو سیاسی خەڵکی کفری بوو.
٧١. مەلا سالح قەساب-خاوەن کارگەی بەفر بوو لە ئیمام قاسم.
٧٢. عومەر تۆفیق-نووسەر خەڵکی سلێمانی لە ساڵی ١٩٦٨.
٧٣. دکتۆر قەیس مەعروف-نۆرینگەی پزیشکی ددان لە ئاخوڕ حوسێن لە سەرەتای حەفتاکان.
٧٤- ڕەمزی ئەفەندی عەبدولکەریم-خەڵکی سلێمانییە تێبینەری هونەری بوو لە دایرەی ئەشغاڵ و بیناسازی کەرکوك لەم گەڕەکە خانوبەکی کردووە لە سەرەتای چلەکان و بووەتە دانیشتووی ئەم گەڕەکە.
٧٥- عوسمان قۆجە قەساب- مامۆستاو سەرپەرشتیاری کۆمەڵایەتی، خەڵکی هەولێر بوو.

قادر فەرەج

حاجی نەجم مستەفا

مام تۆفیق جەڕاح

ئەسعەد ئەمین ئاغا

ئیسماعیل محەمەد

عەبدولڕەحمان یاروەلی

غازی محەمەد نووری

سابیر حەلاق

فایق یاروەلی

خورشید غەفور یاروەلی

حەمەئەمین قەبر هەڵکەن

مدحەت ئەمین ئاغا

مەلا عادل مەلا سابیر

شێخ ڕەشید ئەحمەد

جیهاد جومعە

مەلا ئەحمەد سوور

مەلا ئەحمەد

مەلا عەلی فەتحوللا

حاجی فەتاح بازرگان

جومعە محەمەد

جەبار محەمەد ئەمین

مەلا تەها حەسلری

ڕەئووف چایچی

مەلا ڕەزای واعیز

مەلا عەبدولڕەحمان ڕەزا

مەلا عوسمان بانگدەر

مەلا عومەر گومبەتی

حاجی عیزەدین عەزەم

قازی بەهادین ساڵح

مەلا عەلی لەیلان

مەردان سالح مالی

محەمەد ئەمین شەربەتچی

عیزەت ئاغا زیوەلی

محەمەد موختار

شەهید جەبار پیرۆزخان

لەتیف حامید بەرزنجی

عەبدولڕەحمان قرگەیی

حاجی جەبار حاجی ئەحمەد

مەلا ئەحمەد زێویە

غازی عەبدوڵڵا

فازڵ سەید ئەمین

مەلا سەمەد حەسەن

جەبار مستەفا

عەبدولخالق قادر

مەریوان فازڵ

خورشید گبابچی

حەمید خەیات

عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین

عومەر بەگر

شێخ عەبدولکەریم کەسنەزانی

یونس تۆفیق ئامان

وریا جاف

مەلا سیروان

شێخ عەبدولکەریم قەرەچێواری بەرزنجی

کەمال غەریب

محەمەد نوری عوسمان

وشیار محمد نوری

حەسەن عەبدولکەریم

سەید حوسێن بەنا

عەتا بازرگان

شێخ مارف بەرزنجی

حاجی عوسمان بازرگان

عەبدولکەریم حەسەن

حاجی عەبدولڕەحمان عیزەت

سەعید عەبدولڕەحمان

محەمەد سابیر مەحموود

جەودەت عەلی بەکر

ئەمین عوسمان

حەسەن جاف

نیاز سەعدوللا

حەکیم جالاك

ئازاد حەمە ساڵح

محەمەد ئەحمەد خەلیفە

عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا

عەبدولقاد محەمەد خەلیفە

کامەران کەمال غەریب

چالاك محەمەد نووری

نەجات عەلی بەکر

حوسێن عەبدولکەریم

ئەسوەد مەلا نوری

مەعاون محەمەد حەسەن

هیشام محەمەد

فەرەج دووزەلە

عەلی سەید حوسێن

عەبدولڕەحمان مستەفا

مامۆستا عەبدولعەزیز تاهیر

شەهید
نەجیب محەمەد ساڵح

د. کاوە مەحموود

ئیسماعیل تەها ئەحمەد

خوشید عوسمان ڕابی

عەبدولستار محەمەد ڕەسوڵ

پیرۆت فازڵ تاڵەبانی

شێخ ستار بەرزنجی

حاجی سالح چەکمەڕەق — مەلا مەجید — حاجی سەعید زەنگنە

سەیفەدین سابیر — بورهان جاف — حاجی ئیسماعیل قاوەچی

عیماد محەمەد شەیف — بەرزان ئەحمەد — یاسین عەبدوڵڵا

محەمەد مەلا نەجیب — ئیحسان محەمەد نەجیب — سەلیم محەمەد نەجیب

جەلال محەمەد قادر

کەریم عەزیز

فاتح میرزا

موعتەسەم سالەیی

فاتح محمد خورشید

فوئاد کەریم

ئازاد فاتیح محەمەد

فایەق محەمەد خوشید

نورەدین مەجید

مستەفا ئەمین بابان

سیروان سەرگەڵویی

ڕەمەزان زامدار

مەلا نەجیب

مەحموود قەساب

عیزەدین قەرە محەمەد

عەریف خەلیل رەشید

عەباس وێنەگر

کاکە حەمەی لیمۆ

مەلا سدیق باخەوان

حوسێن چایچی

ئەحمەد ئەمین

شەهید عەلی شوان
فەتحوللا کەوش دوور
عومەر عەلی باخەوان
موستەنسر عەلی
جەودەت عەبدولڕەحمان
عادل عومەر
ئەحمەد محەمەد سالح
سالح محەمەد ڕەباتی
محەمەد سالح خورشید
مەلا حەمید
مستەفا باخەوان
حاجی محمود باخەوان

شێخ عزەدین گلنی جنار

شێخ حوسێن بەرزنجی

مەلا شێخ عومەر بەرزنجی

عەبدولڕەحمان نفووس

حاجی رەحیم ئارا بەگ

شێخ مەحمود بەرزنجی

سەید حەسەن

عەلی ئەحمەد عەلاف

فاروق یونس

حسێن حەمەعەلی زەنگنە

حەمە تەقی

حەمە سالح حاجی قادر

سەلاحەدین حوسێن

نەوزاد حەمە سالح

نەجات حەمەصالح

عەبدوللا موزەمید

فەیسەڵ ئەمین

فەهمی عەبدوڵلا

عەلا خەتیب

سامی موختار

عەبدوڵلا موختار

* ماڵە تورکمانەکان:-

١. ئەحمەد چەلەبی
٢. حوسێن ئەجار
٣. مەلا تەها
٤. عەزەدین رەحمەتوڵڵا
٥. رەفعەت دۆزئەکان
٦. خێریە خان
٧. دکتۆر جەماڵ
٨. نامیق شاکر
٩. شەفیق ئەفندی
١٠. عوبێد چەلەبی
١١. مەمەد ئالبەند

* ماڵە عەرەبەکان:-

١. ماڵی مەشایخی
٢. ماڵی موسلاوی
٣. مەجید موختار
٤. عەلوان کارەباچی

* مزگەوتی ئیمام قاسم:-

ئەکەوێتە گەرەکی ئیمام قاسم و دروستکراوە بەگەچ و بەردو لەسەر ستون و کەوان وەستاوە کە ئەوکاتە بڵاوبووە لە سەردەمی ئیسلامی بەجێماو.

مێژووی بنیاتنانییەکەمی نەزانراوە. کاتێ ئەڵێن ئیمام قاسم بیری ئیمام قاسمی کوری موسا کازم کوری جەعفەر سادق ئەکەین دەڵێن نێژراوە لەم مزگەوتەو گومەزێك کراوە لە سەر مەرقەدی.

لەو ساوە سەتان ساڵە خەڵك سەردانی ئەکا کە ئەوە ئیمام قاسمەو کە نەسەبی دەگەرێتەوە بۆ (اهل البیت) وئەم ناوچەیە ناونراوە بە گەرەکی ئیمام قاسم نسبەت بەم مەرقەدە ئەشێ ئەمە مەقامی ئیمام قاسم بێ.

مەرقەدەکە چەند جارێ رێکخستراوەو تازەکراوەتەوە لە سەر دیوارەکەی شیعرو نووسین هەیە بە زمانی تورکی لە سەر کەرتێ لە مەرمەر نووسراوە:

حەزرەتی کەتخدا زولفەقار پاشا خودا ویستی ئاسانی بکا بۆ خێری هەستا بە نۆژەنکردنەوەی گومەزی ئیمام کوری ئیمام لە مانگی شەعبانی شکۆمەند لە مانگەکانی ساڵی هەزارو بیست و سێ ١٠٢٣ کۆچی.

ئەم پارچە شیعرانە مێژووی نۆژەنکردنەوەکە ئەچەسپێنێ لە دێری کۆتایی شیعرەکە بە ژمارە پیتەکان (حساب الجمل).

یەکەم نۆژەنکردنەوە:

مژدەو تعمیر تأریخ حدیث اهل بیتی
امان لامتی امتمە اهل بیتمدر امان
١٠٣١ هـ

دووەم نۆژەنکردنەوە:

رقوم سالنە تأریخ ویردی هاتف غیب
هدایت ازلیدر محب رسم عگا
١١٠٣هـ

سێهەم نۆژەنکردنەوە:

حرف منقوگ ایلە قابل سویلدی تأریخنی
قاسم اولاد علی المرتچادر بو امام
١٣١٢هـ

تێبینی:-

یەکەم:- مزگەوتی زێویە کە ساڵی ١٧٨٢ز بنیاتنراوە، دواتر بە رەنجووری ناسراوە چونکی ئیمام و مودەریسی بووە، دوایی نەماوە بووەتە کەلاوە لە پاشان مەلا جەبار ساڵەیی و حاجی تۆفیق تازەیان کردووەتەوە ساڵی ١٩٥٨ز ناسراوە بە مزگەوتی یادگار یان مەلا جەبار، ئێستا ناویی بووە بە مزگەوتی رەحمان.

دووەم:- مزگەوتی مەلا محەمەد گۆڵدەرە (ماڵی حاجی نوری بووە) کراوەتە مزگەوتێکی بچووك لە شەستەکان. ئێستا مامۆستا نورەدین مەلا مەجید مزگەوتەکە ئەبا بەرێوە ومەلایەتی ئەکا.

* ناوی مزگەوتەکان:

١. مزگەوتی ئیمام قاسم-ساڵی بنیاتنانی پێش ١٦٠٠ز.
٢. مزگەوتی سەی غەنی-ساڵی بنیاتنانی ١٠٤١هـ/١٦٣١ز.
٣. مزگەوتی دەللی باش-ساڵی بنیاتنانی ١٠٤٣هـ/١٦٣٣ز.
٤. مزگەوتی مەلا ئەحمەد گرده (کوردە)-ساڵی بنیاتنانی ١١٥٢هـ/١٧٣٩ز.
٥. مزگەوتی شێخ محێدین-ساڵی بنیاتنانی ١١٧٩هـ/١٧٦٥ز.
٦. مزگەوتی زێویە-ساڵی بنیاتنانی ١١٩٧هـ/١٧٨٢ز.
٧. مزگەوتی مەلا عومەر گومبەتی-ساڵی بنیاتنانی ١٢٢٠هـ/١٨٠٥ز.
٨. مزگەوتی نائیب-ساڵی بنیاتنانی ١٢٣١هـ/١٨١٦ز.
٩. مزگەوتی تەکیە-ساڵی بنیاتنانی ١٢٦١هـ/١٨٤٥ز.
١٠. مزگەوتی قەرەچێوار-ساڵی بنیاتنانی ١٢٦٤هـ/١٨٤٧ز.
١١. مزگەوتی شێخ جەواد شێخ خچر-ساڵی بنیاتنانی ١٢٨٢هـ/١٨٦٥ز.
١٢. مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغا-ساڵی بنیاتنانی ١٢٩١هـ/١٨٧٤ز.
١٣. مزگەوتی شێخ نورەدین-ساڵی بنیاتنانی ١٣٥٩هـ/١٩٤٠ز.
١٤. مزگەوتی ئازادی-ساڵی بنیاتنانی ١٣٧٧هـ/١٩٥٧ز.
١٥. مزگەوتی یادگار (رەحمان) کە ناسراوە بە مزگەوتی مەلا جەبار-ساڵی بنیاتنانی ١٣٧٨هـ/١٩٥٨ز.
١٦. مزگەوتی مەلا محەمەد گۆڵدەرە لە شەستەکان بنیاتنراوە.
١٧. مزگەوتی سەید ئەحمەد شێخ کەریم بەرزنجی-ساڵی بنیاتنانی ١٣٨٥هـ/١٩٦٥ز.
١٨. مزگەوتی ئیسکانی تازە-ساڵی بنیاتنانی ١٣٨٨هـ/١٩٦٨ز.
١٩. مزگەوتی رزگاری لە بارودخانە ساڵی بنیاتنانی لە دوای ٢٠٠٣ز.
٢٠. مزگەوتی شەهیدان-ساڵی بنیاتنانی ١٤٢٦هـ/٢٠٠٥ز.
٢١. مزگەوتی هیندی-بەرامبەر گەرەکی ئاخور حوسێن لەقەد قەڵا ئێستا نەماوە.

*** ناوی تەکیەو خانەقا:**

١. تەکیەی شێخ محێدین ١١٧٩ه‍-١٧٦٥ز
٢. تەکیەی گەورە تەکیەی تاڵەبانی ١١٨٥ه‍-١٧٧١ز
٣. تەکیەی شێخ حەسەن قەرەچێواری ١٢٦٤ه‍-١٨٤٧ز
٤. تەکیەی نەقشبەندی (خانەقای شێخ خدر) ١٣٠٦ه‍-١٨٨٨ز
٥. تەکیەی شێخ نورەدین مەشایخی ١٣٥٩ه‍-١٩٤٠ز.
٦. تەکیەی شێخ عەزەدین کانی چنار ١٣٨٥ه‍-١٩٦٥ز
٧. تەکیەی بەرزنجی / سید ئەحمەد شێخ کەریم ١٣٨٥ه‍-١٩٦٥ز.
٨. تەکیەی شێخ عەبدولکەریم کەسنەزانی ١٣٨٩ه‍-١٩٦٩ز
٩. تەکیەی سەی مونجع (ئێستا نەماوە)
١٠. تەکیەی شێخ محێدین لە ئاخورحوسێن
١١. تەکیەی شێخ عەبدولکەریم عەوەڵان کە دەکەویتە سەر شاخ لە پەنجاکان دروستکراوە ئێستا نەماوە.
١٢. تەکیەی شێخ قەرە حەسەن لە ئاخور حوسێن.
١٣. خانەقای مەلا عومەر گونبەدی (گومبەتی) ١٢٢٠ه‍-١٨٠٥ز.

*** مەرقەدەکان و ئەزرگاهەکان:-**

١. مەرقەدی ئیمام قاسم
٢. مەرقەدی ئیمام محەمەد
٣. مەرقەدی شێخ محێدین
٤. مەرقەدی ئەخی حوسێن
٥. مەرقەدی شێخە سوورە
٦. مەرقەدی پەنجە
٧. مەرقەدی دەدە مەردان (کەسێکی کاکەیی بووە) گۆڕەکەی لە ئاخور حوسێن بووە.
٨. مەرقەدی شێخ مەحمودی زەنگنە باپیرە گەورەی تاڵەبانییەکان.
٩. مەرقەدی تۆپەڵ پاشا
١٠. مەرقەدی حەمە شنە
١١. مەزارگەی ئیمام غەیبی
١٢. ئیمام عەباس (شوێنەوارو ئەزرگا).
١٣. قەبری شەخسێك نەزانراوە کێیە لە گەرەکی ئاخور حوسێن-دەکەوتە پاڵ دیواری ماڵی عەبدولقادر بەرزنجی مودیری تەجنیدی کەرکوك

*** ناوی شوێنە پیرۆزەکان:**

١. خدر زندە
٢. شێخ سورەکە (شێخە سوورە )
٣. شێخ رەش
٤. حەسەن گوڵێ
٥. ئیمام غەیبی
٦. مام هیندی

*** ناوی گۆڕستانەکان (قەبرسانەکان):**

١. گۆڕستانی مزگەوتی ئیمام قاسم ئەمە بچوك بوو دەکەوتە پشت مزگەوتەکەوە رژێمی لە ناوچوو لایبردو تەختی کرد لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو لە جێگەی دوو ماڵی دروست کرد. ئەم گۆڕستانە قەبری زۆر کۆنی تێدابوو دەگەڕایەوە سالأنی ١٧٠٠ و ١٨٠٠ و ١٩٠٠ز.
٢. گۆڕستانی ئیمام قاسمی گشتی (گۆڕستانی گەورە) دەبێتە سێ بەشەوە:-
- گۆڕستانی شێخ محێدین
- گۆڕستانی ئیمام محەمەد
- گۆڕستانی قرخلەر
٣. گۆڕستانی تەکیە
٤. گۆڕستانی شەهیدان
٥. گۆڕستانی حەسەن گوڵێ

*** مەلاو پیاوە ئاینییەکان:-**

١. مەلا عوسمان مەلا قادر
٢. مەلا قادر ئیمام (عبد القادر الخگیب)
٣. مەلا نورەدین دەربەندی-خانەقای مەلا عومەر گومبەتی بنیاتناوە ساڵی ١٢٦٥ه‍-١٨٤٨ز
٤. مەلا ئەبو بەکر مەلا نورەدین
٥. مەلا ئیبراهیم مەلا ئەبو بەکر
٦. مەلا عەبدوڵلا حاجی مەلا ئیبراهیم
٧. مەلا ساڵح مەلا عەبدوڵلا
٨. مەلا عومەر مەلا ساڵح عومەر گونبەدی (مەلا عومەر گومبەتی)
٩. مەلا سدیق مەلا ساڵح عومەر گونبەدی
١٠. مەلا عومەر مەلا عەبدوڵلا عومەر گنبدی
١١. مەلا ئەحمەد حاجی مەلا ئیبراهیم عومەر گنبدی
١٢. مەلا شێخ عیسا شێخ محەمەد تەوەکەڵی بەرزنجی
١٣. مەلا ئەحمەد گردە (کوردە)
١٤. مەلا شێخ عەبدولغەفوور حاجی
١٥. مەلا مەحمود شێخ مەلا عەبدولغەفوور
١٦. مەلا عەبدولرەحمان مەلا مەحمود
١٧. مەلا ئەمین مەلا عەبدولڕەحمان شێخ کەپەنك ( مەلا ئە مین گردە)
١٨. مەلا عەلی مەلا ئەمین گردە
١٩. مەلا رەفیق مەلا عەلی
٢٠. مەلا عەبدوڵلا مەلا رەفیق (مەلا عەبدوڵلا رەش)
٢١. مەلا قادر ترێ خۆر
٢٢. مەلا سەلام ترێ خۆر
٢٣. مەلا عەلی حیکمەت سیامەسوری
٢٤. مەلا سەمەد حەسەن
٢٥. مەلا عەلی فەتحوڵلا
٢٦. مەلا عەلی لەیلانی
٢٧. مەلا شەریف مەلا محەمەد کوردی
٢٨. مەلا شێخ سەعید شێخ خدر نەقشبەندی

٢٩. مەلا شێخ جەواد شێخ خدر نەقشبەندی
٣٠. مەلا شێخ تەها شێخ سەعید
٣١. مەلا ئەحمەد سالح (مەلا ئەحمەد سوورە)
٣٢. مەلا مەحمود مەزناوی
٣٣. مەلا محەمەد مەزناوی
٣٤. مەلا سەی سەعید عەرەب
٣٥. مەلا کەمال مەحمود
٣٦. مەلا جەبار سالەیی
٣٧. مەلا سالح قادر کانی چناری
٣٨. مەلا محەمەد عەبدولکەریم شێخانی
٣٩. مەلا ئەورەحمان مەلا عەلی حیکمەت
٤٠. مەلا سالح عەبدولکەریم
٤١. مەلا محەمەد عەلی کەپەنك رەش
٤٢. مەلا محەمەد خورشید سیامەنسووری
٤٣. مەلا جەمیل مەلا مستەفا
٤٤. مەلا محەمەد ئەمین سەعید
٤٥. مەلا ئەحمەد زێویە
٤٦. مەلا سەی محیدین جەباری
٤٧. مەلا فەتاح جەباری
٤٨. مەلا محیدین فەتاح
٤٩. مەلا سدیق جەباری
٥٠. مەلا محەمەد چیمەنی
٥١. مەلا ئەحمەد مەلا رەبیع
٥٢. مەلا شێخ عەباس
٥٣. مەلا سویفەتەللا عەلی حیکمەت
٥٤. مەلا رەزا واعیز
٥٥. مەلا شێخ ستار شێخ محەمەد
٥٦. مەلا محەمەد قرگەیی
٥٧. مەلا ئەحمەد ناجی
٥٨. مەلا محەمەد مەحمود مودەرس
٥٩. مەلا ناسح مەلا محەمەد مودەریس
٦٠. مەلا شێخ محەمەد سالح شێخ ئەحمەد تاڵەبانی
٦١. مەلا سەید غەنی
٦٢. مەلا عەبدولغەنی عەبدولحەمید
٦٣. مەلا ئەحمەد مەلا شەریف
٦٤. مەلا تەها شێخ قاسم خەلیفە
٦٥. مەلا رەفعەت حاجی رەشید بیبانی
٦٦. مەلا محەمەد تابور ئیمام (سیامە سوری)
٦٧. مەلا حەبیب کەرکوکی
٦٨. مەلا سالح مەلا حەبیب
٦٩. مەلا عەبدولحەمید ئەحمەد
٧٠. مەلا شێخ یوسف شێخ عەلی تاڵەبانی
٧١. مەلا عەباسی ئیمام قاسم
٧٢. مەلا عەباس مەلا هادی
٧٣. مەلا محەمەد مەلا سالح
٧٤. مەلا عەبدولستار قەرەداغی
٧٥. مەلا کامەران خەلیل
٧٦. مەلا سیروان سەید ئەحمەد
٧٧. مەلا عەبدولرەحمان ئەحمەد
٧٨. مەلا محەمەد ئەمین
٧٩. مەلا ئەحمەد مەلا محەمەد ئەمین
٨٠. مەلا سەعید نائیب
٨١. مەلا رەزا عەبدوڵڵا
٨٢. مەلا تەیفور فەتاح
٨٣. مەلا سابیر حاجی قوربانی رەزا (مەلا سەبور)
٨٤. مەلا رەسول قرگەیی
٨٥. مەلا ئەحمەد فەیلەسوف
٨٦. مەلا سید ئەحمەد جەباری
٨٧. مەلا وەهاب مەلا ئەحمەد
٨٨. مەلا محەمەد مەلا عەلی فەتحوڵڵا
٨٩. مەلا سالح نوری ئەحمەد
٩٠. مەلا محەمەد خدر
٩١. مەلا عەبدوڵا قەرەهەنجیری
٩٢. مەلا سەید حوسێن
٩٣. مەلا حوسێن تەپەلوو
٩٤. مەلا گەیلان محەمەد
٩٥. مەلا رزگار مەحمود
٩٦. مەلا شێخ عومەر شێخ سالح پەڵکانە بەرزنجی
٩٧. مەلا حاجی مستەفا
٩٨. مەلا شەمال جەلال
٩٩. مەلا هاشم
١٠٠. مەلا سەلاحەدین
١٠١. مەلا سۆران
١٠٢. مەلا ئەبو بەکر
١٠٣. مەلا ئەوزاد محەمەد
١٠٤. مەلا محەمەد شێخ فاتیح
١٠٥. مەلا یوسف شێخ عەبدوڵڵا
١٠٦-مەلا محەمەد گۆڵدەرە
١٠٧. شێخ ئەحمەد تاڵەبانی شێخ مەحمود زەنگەنە
١٠٨. شێخ عەبدولرەحمان خاڵس
١٠٩. شێخ عەلی خاڵسی (شێخ عەلی گەورە شێخ عەبدولرەحمان تاڵەبانی).
١١٠. شێخ محەمەد عەلی تاڵەبانی
١١١. شێخ جەمیل تاڵەبانی
١١٢. شێخ عەلی شێخ جەمیل تاڵەبانی
١١٣. شێخ عەبدوڵڵا شێخ رەزا تاڵەبانی
١١٤. شێخ عەبدولغەفوور شێخ ئەحمەد تاڵەبانی
١١٥. شێخ عەبدولکەریم شێخ ئەحمەد تاڵەبانی
١١٦. شێخ محیدین کەرکوکی بەرزنجی
١١٧. شێخ محیدین بەرزنجی دووەم
١١٨. شێخ عەبدولکەریم کەسنەزانی
١١٩. شێخ محەمەد شێخ عەبدولکەریم کەسنەزانی
١٢٠. شێخ سالح چیمەنی
١٢١. شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی قەرەچێواری
١٢٢. شێخ ئیبراهیم شێخ محەمەد بەرزنجی
١٢٣. شێخ وەهاب شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی

١٢٤. شێخ نورەدین مەشایخی
١٢٥. شێخ حوسێن شێخ ئەحمەد تاڵەبانی
١٢٦. شێخ محەمەد شێخ عەبدولعەزیز شێخ محێدین کەرکوکی
١٢٧. شێخ عەبدولرەحمان شێخ عەبدولعەزیز بەرزنجی
١٢٨. شێخ حەسەن شێخ محێدین کەرکوکی بەرزنجی
١٢٩. شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد بەرزنجی
١٣٠. شێخ محەمەد ئەمین مەلا قاسم
١٣١. شێخ ڕەحیم شێخ محەمەد شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی
١٣٢. شێخ محەمەد شێخ محێدین بەرزنجی
١٣٣. شێخ محەمەد شێخ عەلی شێخ حەسەن قوله
١٣٤. شێخ ستار شێخ محەمەد شێخ عەلی شێخ حەسەن قوله
١٣٥. شێخ مەحمود خەلیفه
١٣٦. شێخ ئەحمەد خەلیفه
١٣٧. شێخ عەبدولرەحمان کانی چنار
١٣٨. شێخ محەمەد کەرەدان
١٣٩. شێخ حوسێن سەید محەمەد جەباری
١٤٠. شێخ عیزەددین کانی چنار
١٤١. شێخ سەدرەدین شێخ نورەدین
١٤٢. سەید حەسەن کۆڵه سەید عەبدولرەحمان پیرحەیاتی
١٤٣. سەید عەبدوللەتیف بێدەری
١٤٣- شێخ محێدین (ئاخور حوسێن)
١٤٤. خەلیفه نوری

* مەلا تەیفور بەشداری دامەزراندنییەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی له کوردستان کردووه له ٢١ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٠ کەسێکی نیشتیمان پەروەر بووه ئیجازەی مەلایەتی له مەلا عومەر گومبەتی وەرگرتوه له مزگەوتی ئیمام قاسم وه له ساڵی ١٩٩٣ شەهید کراوه.

* ناوی خادیم مزگەوتەکان و قورئان خوێنەکان:
١. مەلا عوسمان-بانگدەر-مزگەوتی ئیمام قاسم
٢. مەلا سەعدی-خادیم و بانگدەر-مزگەوتی نائیب
٣. مەلا لەتیف-خادیم و بانگدەر-مزگەوتی ئیخوان
٤. مەلا عەبدولواحد-خادیم-مزگەوتی قەرەچێوار
٥. مەلا بەهادین-خادیم و بانگدەر-مزگەوتی سەی غەنی
٦. مەلا سدیق کەریم-خادیم و بانگدەر-مزگەوتی دەللی باش
٧. مەلا سەعید-بانگدەری مزگەوتی ئیمام قاسم بووه
٨. مەلا مەجید-بانگدەری مزگەوتی سەید غەنی له ئاخورحوسێن
٩. مەلا سەید ئیبراهیم-خادیم مزگەوتی مەلا محەمەد گۆڵدەره
١٠. مەلا مەولود-بانگدەری مزگەوتی ڕەحمان له زێویه
١١. مەلا ڕۆستەم ڕەشید-خادیم ئێستای مزگەوتی نائیب
١٢. مەلا عیرفان-خادیم و بانگدەری ئێستای مزگەوتی ئیمام قاسم
١٣. مام خەلیفه-خادیم و بانگدەری مزگەوتی شێخ عەبدولکەریم قرە چێواری بەرزنجی
١٤. حاجی مەحمود باغەوان-قورئان خوێنی-مزگەوتی ئیمام قاسم.
١٥. مەلا کەریم حافز (کوێر) قورئان خوێن
١٦. مەلا جەوهەر (کوێر)-قورئان خوێن
١٧. مەلا عەبدوڵڵای کوێر-قورئان خوێن
١٨. مەلا کامیل ئەحمەد-قورئان خوێن
١٩. مەلا تەها-قورئان خوێن
٢٠. مەلا ئیبراهیم کوێر-قورئان خوێن
٢١. مەلا سەلام کوێر-قورئان خوێن
٢٢. ئه نوەر حاجی عەلی-قورئان خوێن
٢٣. سه باح زاهیر-قورئان خوێن
٢٤. سەید گوڵ شێخ محێدین-قورئان خوێن
٢٥. مەلا سلەیمان-قورئان خوێن
٢٦. مەلا جەلیل-قورئان خوێن
٢٧. مەلا ئەحمەد
٢٨. مەلا سەید شەریف
٢٩. مەلا خەلیل عومەر
٣٠. مەلا مەحمود عەرەب
٣١. حەمید مەلا ئەحمەد
٣٢. مەلا محێدین حوسێن سوور
٣٣. مەلا عادل مەلا سابیر
٣٤. مەلا سالح مەجید
٣٥. مەلا سامان
٣٦- مەلا حەمید عەبدوڵڵا-قورئان خوێن
٣٧- مەلا ئیبراهیم قادر-دەرسی ئاین و قورئانیان دەخوێند به منالان له حوجره
٣٨- مەلا واحید وەلی- دەرسی ئاین و قورئانیان دەخوێند به منالان له حوجره
٣٩- مەلا عەلی مەحموود- دەرسی ئاین و قورئانیان دەخوێند به منالان له حوجره
٤٠- مەلا ئەحمەد سالح - دەرسی ئاین و قورئانیان دەخوێند به منالان له حوجره
٤١- مەلا مەجید- قوئانی دەخوێند به منالان له دوکانەکەی

* ئافرەته قورئان خوێنەکان:
١. مەلا ئایشەخان (عائشه مەلا مستەفا)- قورئانی دەخوێند به منالانی کور و کچ له ماڵی خۆی.
٢. مەلا بەهیه (بەهیه محێدین) قورئانی به منالان ئەخوێند له ماڵی خۆی.
٣. مەلا حەبیبه قورئان خوێنبوو، لەماڵی خۆی دەرسی ئایینی به مندالان ئەوتەوه.
٤. مەلا ئیسکۆ قورئانی به منالان ئەخوێند له ماڵی خوی
٥. مەلا ئەمنه (ئامینه فەتحوڵڵا ئەحمەد) قورئانی به منالان ئەخوێند له ماڵی خوی.
٦. مەلا نەسیم قورئان خوێنبوو ( نەسیمه ڕەشید).
٧. مەلا شەوکەت قورئان خوێنبوو.

٨. مەلا هەیبەت قورئان خوێنبوو.
٩. مەلا فەریدە قورئان خوێنبوو
١٠. مەلا عەتیە قورئان خوێنبوو.
١١. مەلا نەعیمە قورئان خوێنبوو.
١٢. مەلا ئامینە مەعروف قورئان خوێنبوو.
١٣. نەنە حەمدیە قورئان خوێنبوو
١٤. مەلا ناهیدە قورئان خوێنبوو
١٥. مەلا حەسیبە کچی حاجی عەزەدین عەزەم پێش نوێژی ئەکرد وەك ئیمام لە ماڵی خۆی بۆ ژنان قورئان خوێنبوو.
١٦. مەلا فاتم قورئان خوێنبوو.
١٧. مەلا سەعدیە محەمەد ئەحمەد قورئان خوێنبوو
١٨. بەدریە مەلا خالید عەبدوڵڵا

* **قوتابخانە ئاینییەکان:**
١. بە گوێرەی ساڵنامەی عوسمانی ١٣٣١هـ-١٩٠٣ز ئەم قوتابخانانەن:-
-- قوتابخانەی مزگەوتی ئیمام قاسم لە گەڕەکی ئیمام قاسم و ماموستاکەی شێخ محەمەد ئەفەندی بنیاتنراوە لەلایەن سوڵتانی عوسمانی عەبدولحەمیدی دووەم، ئەم قوتابخانەیە ساڵی ١٨١٥ز مەلا عوسمان مەلا قادر دایمەزراندووە و لەدوای وەفاتی خۆی کورەکەی مەلا قادر بووەتە ماموستای قوتابخانەکە و ئەیبرد بەڕێوە تا کۆتایی ساڵی ١٩٢١.
-- قوتابخانەی مزگەوتی سەید غەنی لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن و ماموستاکەی سەید محێدین.
-- قوتابخانەی مزگەوتی نائیب زادە لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن و ماموستاکەی مەحمود ئەفەندی.
-- قوتابخانەی مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغا لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن نزیك ناوەندی ئیمام قاسمی کوڕان و ماموستاکەی عەلی ئەفەندی.
٢. قوتابخانەی عیلمی ئاینی (المدرسة العلمية الدينية) ساڵی ١٩١١ز کراوەتەوە بۆ قۆناغی سەرەتایی، خوێندن تێیدا شەش ساڵ بووە، سەردەمانێك لە ساڵی ١٩٢١ز بووەتە دواناوەندی، ئەمە قوتابخانەیەك بوو لە بینایەکی دوو نهۆم بە تەنیشت مزگەوتی ئیمام قاسم بەرامبەر ماڵی مەلا قادر ئیمام کە خۆشی ماموستا بووە تێیدا. ئەم قوتابخانەیە زۆر کۆن بووە لەسەر دەرگاکەی ناوی هەڵکۆڵرابوو لەسەر بەردی قایەی سوور بە تورکی و عارەبی نووسرابوو، لە دوواییدا قوتابخانەکە نەماو داخرا، دەبێ لەبەر چەند هۆیەك بێ وەك کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی فەرمی سەر بە وەزارەتی مەعاریف یا کەمی قوتابیان و یا تەمەن گەورەیی و مردنی ماموستاکانی و هەر هۆیەکی تر بێ، بەڵام بیناکەی مایەوە بە بەتاڵی تا سەرەتای شەستەکان، ئینجا بوو بە قوتابخانەیەکی ئاینی سەرەتایی سەر بە دایرەی ئەوقافی کەرکوك.
٣. قوتابخانەی ئەوقافی ئاینی: (مدرسه الاوقاف الدينيه): چەند ساڵ لە دوای داخستنی قوتابخانە کۆنەکەی ئاینی لە ئیمام قاسم دواتر بۆ ماوەیەك لەسەرەتای شەستەکان و تا سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوو لە بیناکەی قوتابخانەیەکی ئاینی سەرەتایی تێدا کرایەوە بەناوی ئەوقافەوە کە مانگانە مووچەی ئەدایە قوتابییەکانی و بێجگە لەوەی جلوبەرگی ئەدانێ وەك یارمەتی، لەم قوتابخانەیە منالانی تەمەن شەش ساڵ و گەورەتری وەرگرت کە لە پۆلی یەك و تا پۆلی شەشی تێدابوو بە تەواوکردنی ئەو قۆناغە خوێندنە دواتر قوتابی دەچووە مەعهەدی ئیسلامی یا بۆ ناوەندی بۆ تەواوکردنی دەرسەکانی ئەم قوتابخانەی ئەوقافە لە دواییدا گواسترایەوە بۆ شوێنێکی ترو بیناکەی ماوە، ئێستا بووەتە ماڵ و چەند خێزانێکی تیا نیشتەجێن.
٤. قوتابخانەی مزگەوتی ئیمام قاسم: کە فەقێیان تێیدا ئەیانخوێند لەژێر دەستی مەلاکانی مزگەوتەکە لە حوجرەیەك و هەر لەوێ دەنوستن.
٥. قوتابخانەی مزگەوتی دەلی باش
٦. قوتابخانەی مزگەوتی زێویە
٧. قوتابخانەی مزگەوتی شێخ جواد
٨. قوتابخانەی مزگەوتی مەلا عومەر گومبەتی
٩. قوتابخانەی مزگەوتی تەکیەی گەورە
١٠. قوتابخانەی مزگەوتی شێخ عە بدولکەریم قەرەچێواری بەرزنجی
١١- قوتابخانەی مزگەوتی سەید غەنی
١٢- قوتابخانەی مزگەوتی نائیب
١٣- قوتابخانەی مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغا
١٤- قوتابخانەی مزگەوتی شێخ محێدین بەرزنجی
* ناوی قوتابخانەکان: یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لە کاتی موتەسەریفی کەرکوك هاشم پاشا لە ساڵی ١٢٨٥هـ / ١٨٦٨ز دروستکراوە (بنیاتنراوە)بە هاوکاری خەڵکان لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن-ئیمام قاسم لە جێگەی ماڵی دکتۆر باباجان بەرامبەر قەڵا.
قوتابخانەی سەرەتایی ئیمام قاسمی کوڕان هەوەڵ جار لە ساڵی ١٩٣٤ کراوەتەوە لە شوێنێك تەنیشت ماڵێك بوو ناسراو بە موسڵاوی نزیك ئاسیاوە کۆنەکە لە کۆڵانێك بەرامبەر باغی مستەفا ئەچووە جادەی کۆنی ڕێگەی سلێمانی دوایی چووەتە شوێنی ماڵێکی گەورە بەرامبەر خاسە ئینجا چووەتە شوێنێکەی ئێستای لە لێژایی عاشور نزیك تەکیەی شێخ نورەدین پشت قەبرسانەکە.
- قوتابخانەی ئیمام قاسمی سەرەتایی کوڕان دوو جار بووەتە دوو قوتابخانە (١و٢) یەکەم لە چلەکان لە ماڵێك بوو لە کۆڵانێ تەنیشت بینای قوتابخانەکە شوێنی ئێستای لێژایی عاشور وەدووەم جار ئیمام قاسمی دووەم لە ناوەراستی پەنجاکان لە شوێنی قوتابخانەی ئیمام قاسمی سەرەتایی کچان کە ماڵێکی گەورە بوو بەرامبەر خاسە ڕێگەی سلێمانی جاران ئێستا بینایەکەی تەخت کراوە سەردەمێکیش دایرەی تەسویە بووە لە ناوەراستی شەستەکان. ئەم قوتابخانەی ئیمام قاسمی دووەمە دواجار بووەتە قوتابخانەیەکی سەربەخۆ بە ناوی قوتابخانەی ئیمان لە ساڵی ١٩٦٠ وە گەڕاوەتەوە بینای ئیمام قاسمییەکەم.

*** یەکەم سەرەتاییەکان:**

١. قوتابخانەی ئیمام قاسمی کوڕان لەساڵی (١٩٣٤) دروستکراوە.
٢. قوتابخانەی نەجاحی کوڕان لە ساڵی (١٩٣٨) دروستکراوە لە بەر تەکیە.
٣. قوتابخانەی ئیمام قاسمی کچان لە ساڵی (١٩٣٩) دروستکراوە.
٤. قوتابخانەی ئەیوبیەی کوڕان لە ساڵی (١٩٥١) دروستکراوە لە ئاخور حوسێن.
٥. قوتابخانەی ئیمام قاسم ی سەرەتایی شەوانەی کوڕان لە ساڵی (١٩٥٢) دروستکراوە.
٦. قوتابخانەی دایکان (الإمهات) ئێواران لە دوای نیوەڕۆ لە بنایەی قوتابخانەی نەجاح لەبەر تەکیە ڕێگەی سلێمانی ١٩٥٩-١٩٦٤ز.
٧. قوتابخانەی ئیمانی کوڕان لە ساڵی (١٩٦٠) دروستکراوە لە ئیمام قاسم.
٨. قوتابخانەی ئازادی (إبن الارقم) کوڕان لە ساڵی ١٩٦١ دروستکراوە.
٩. قوتابخانەی وەهرانی کوڕان لە ساڵی (١٩٦٣) دروستکراوە لە بەر تەکیە.
١٠. قوتابخانەی الاخلاص-کچان لە ساڵی (١٩٦٧) دروستکراوە.
١١. قوتابخانەی فارابی کوڕان لە ساڵی (شەستەکان) دروستکراوە لە ئیسکان.
١٢. قوتابخانەی غەزالی کوڕان لە ساڵی (شەستەکان) دروستکراوە لە ئازادی.
١٣. قوتابخانەی ئامینەی کچان لە ساڵی (شەستەکان) دروستکراوە لە ئاخور حوسێن.
١٤. قوتابخانەی ئەسمائی کچان لە ساڵی (شەستەکان) دروستکراوە لە ئیسکان.
١٥. قوتابخانەی خانزاد-کچان لە زێویە لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە.
١٦. قوتابخانەی پیرەمێردی کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە لە ئیمام قاسم.
١٧. قوتابخانەی بێکەسی کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە لە بەر تەکییە.
١٨. قوتابخانەی نالی کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە لە ئیمام قاسم.
١٩. قوتابخانەی هەڵمەتی-کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە.
٢٠. قوتابخانەی هیوا-کچان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە.
٢١. قوتابخانەی ڕزگاری-کوڕان لە ساڵی ١٩٧٠ دروستکراوە دواتر ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (إبن بطوطة) لە ١٩٧٥.
٢٢. قوتابخانەی گەل-کوڕان لە ساڵی (١٩٧١) دروستکراوە.
٢٣. قوتابخانەی مەهابادی کچان لە ساڵی (١٩٧٢) دروستکراوە لە ئیسکانی تازە.
٢٤. قوتابخانەی کازیوە ( اسكان الاولى)-کوڕان لە ساڵی (١٩٧٢) دروستکراوە.
٢٥. قوتابخانەی حذيفة بن اليمان-کچان لە ساڵی (١٩٧٤) دروستکراوە.
٢٦. قوتابخانەی ئیدریسی لە ساڵی (١٩٧٥) دروستکراوە.
٢٧. قوتابخانەی عێراقیەی کوڕان لە ساڵی (١٩٧٧) دروستکراوە.
٢٨. قوتابخانەی (العطاء) کوڕان لە ساڵی (١٩٧٨) دروستکراوە لە بەر تەکیە.
٢٩. قوتابخانەی ئازادی کچان لە ساڵی (حەفتاکان) دروستکراوە.
٣٠. قوتابخانەی ئەلبەکر کوڕان لە ساڵی (حەفتاکان) دروستکراوە لە ئازادی.
٣١. قوتابخانەی تهامەی کچان لە ساڵی (حەفتاکان) دروستکراوە لە ئیسکانی تازە.
٣٢. قوتابخانەی عەشتاری کچان لە ساڵی (حەفتاکان) دروستکراوە.
٣٣. قوتابخانەی بیلال حەبەشی کچان لە ساڵی (حەفتاکان) دروستکراوە لە زێویە ئازادی.
٣٤. قوتابخانەی سەنادید-کوڕان لە ساڵی (١٩٨٠) دروستکراوە.
٣٥. قوتابخانەی مواهب-کچان لە ساڵی (١٩٨٤) دروستکراوە.
٣٦. قوتابخانەی خەلیج عەربی کچان لە ساڵی (١٩٨٦) دروستکراوە.
٣٧. قوتابخانەی سەلام-کوڕان لە ساڵی (١٩٨٨) دروستکراوە.
٣٨. قوتابخانەی جەزائیر-کچان لە ساڵی (١٩٨؟) دروستکراوە.
٣٩. قوتابخانەی قەندیل-کچان (القيروان).
٤٠. قوتابخانەی ابن النفيس
٤١. قوتابخانەی عەمرو بن عاس
٤٢. قوتابخانەی ئەبو عەلا معەری
٤٣. قوتابخانەی نەخوێندەواری ژنان
٤٤. قوتابخانەی ابو محجن الثقفي-کوڕان
٤٥. قوتابخانەی المعقل-کچان لە ساڵی (١٩٩٣) دروستکراوە.
٤٦. قوتابخانەی شەهید ڕەشاد کچان لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە لە ئاخور حوسێن.
٤٧. قوتابخانەی زێویەی - تیکەڵ لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.
٤٨. قوتابخانەی چرۆ-تێکەڵ لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.
٤٩. قوتابخانەی گولان-کچان لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.
٥٠. قوتابخانەی هێمن-تێکەڵ لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.
٥١. قوتابخانەی بەر تەکیە-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠٤) دروستکراوە.
٥٢. قوتابخانەی نەمران-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠٤) دروستکراوە.
٥٣. قوتابخانەی سەربەستی-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.
٥٤. قوتابخانەی دەروازە-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.
٥٥. قوتابخانەی بێخود-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣

دروستکراوە.

٥٦. قوتابخانەی ئاڤان-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٥٧. قوتابخانەی یادگار-کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٥٨. قوتابخانەی چوارباغ-کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٥٩. قوتابخانەی کوردستان-کچان (عشتار) لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٠. قوتابخانەی کازیوە-کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦١. قوتابخانەی قانیع-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٢. قوتابخانەی گردی نەورۆز-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٣. قوتابخانەی ئازادی-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٤. قوتابخانەی ژیانەوە-نەوجەوانان کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٥. قوتابخانەی ڕزگاری-نەوجەوانان کوڕان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٦. قوتابخانەی سەردەم-نەوجەوانان کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٧. قوتابخانەی بڵێسە-کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٨. قوتابخانەی شادمان-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٦٩. قوتابخانەی قەڵای دمدم-تێکەڵ لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

٧٠. بنکەی نەهێشتنی نەخوێندەواری چرۆی ئافرەتان لە ساڵی (٢٠١٣) دروستکراوە.

*** دووەم ناوەندییەکان:**

١. ناوەندی کەرکوکی کچان ساڵی ١٩٥٩ دواتر ناوەکەی بووە بە مەیسەلون لە هەشتاکان ئێستا ڕەنجووری ناوە لە ٢٠٠٣ بەدواوە.

٢. ناوەندی ئیمام قاسم ی کوڕان ساڵی ١٩٥٩ دروستکراوەو دواتر بووە دوا ناوەندی لە سەرەتای حەفتاکان، ئینجا بووەتە دوو بەشەوە لە سەرەتای هەشتاکان، ئامادەیەکەی بەناوی "الثورة"و ناوەندییەکەی بەناوی ئیمام قاسم ماوەتەوە.

٣. ناوەندی معاذ بن جبل-لە ساڵی (١٩٦٨) دروستکراوە لە ئیسکانی تازە.

٤. ناوەندی کاوەی کوڕان-کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە لە ئیسکانی تازە.

٥. ناوەندی شۆڕش-کوڕان لە ئیمام قاسم لە ساڵی (١٩٧٣) دروستکراوە.

٦. ناوەندی عەبدولڕەحمان ناسر-کوڕان لە ساڵی (١٩٧٨) دروستکراوە لە ئیسکان.

٧. ناوەندی مەیسلون-کچان لە ساڵی (١٩٨٠) دروستکراوە.

٨. ناوەندی ئیقبال - کچان-لە ساڵی (١٩٨٨) دروستکراوە لە ئیسکانی تازە.

٩. ناوەندی ئیسکان-کچان لە هەشتاکان دروستکراوە.

١٠. ناوەندی ئافاق-کچان لە ساڵی هەشتاکان دروستکراوە.

١١. ناوەندی کەرامە-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠١) دروستکراوە.

١٢. ناوەندی ڕزگاری کوڕان-لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە لە ئیمام قاسم.

١٣. ناوەندی بۆتان-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠٦) دروستکراوە.

١٤. ناوەندی ئاڵا-کچان-لە ئیمام قاسم لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

١٥. ناوەندی شێخ ڕەزا-کوڕان-لە بەرتەکییە لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

١٦. ناوەندی ژیانەوە-کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

١٧. ناوەندی بێخود-کوڕان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

١٨. ناوەندی بەرتەکیە-کوڕان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

١٩. ناوەندی ئاڤان-کچان لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە.

*** سێیەم ئامادەییەکان:**

١. ئامادەیی ئیمام قاسم-کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە.

٢. ئامادەیی ١١ ئازاری-کچان لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکراوە.

٣. دواناوەندی مامۆستایانی کوردستان-کوڕان شەوان لە ساڵی ١٩٧١ دروستکراوە دواتر ناوەکی بووەتە (ثانوية ابو ايوب الانصاري المسائية) ساڵی ١٩٧٦.

٤. ئامادەیی الثورة-کوڕان لە ساڵی (١٩٨١) دروستکراوە.

٥. ئامادەیی پیشەسازی پاشکۆی ئامادەیی سەورە-کوڕان لە ساڵی (١٩٩٦) دروستکراوە.

٦. ئامادەیی پیشەسازی ئەقسا-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠١) دروستکراوە.

٧. ئامادەیی ئازادی-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.

٨. ئامادەیی پیشەسازی ئیمام قاسم-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.

٩. ئامادەیی هۆزان-کچان لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.

١٠. ئامادەیی ڕەنجووری-کچان لە ساڵی (٢٠٠٣) دروستکراوە.

١١. دار القلم-ئەهلی سەرەتایی و ناوەندیو ئامادەیی لە پێشدا لە گەڕەکی ئازادی بوو لە ساڵی (٢٠٠٤) دروستکراوە.

١٢. ئامادەیی بێخود-کوڕان شەوان لە ساڵی ٢٠٠٥ دروستکراوە.

١٣. ئامادەیی پیشەسازی ئازادی-کوڕان لە ساڵی (٢٠٠٦) دروستکراوە.

١٤. ئامادەیی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی-ئیسلامی کوڕان لە ساڵی (٢٠١٠) دروستکراوە.

١٥. ئامادەیی حەمرین-کوڕان لە ساڵی (٢٠١٠) دروستکراوە.

*** هۆکارەکانی سەرهەڵدانی بزاڤ و ئایینزاکان:**

گەلێك هۆکار دەوریان بینیوە لەو بزاڤە ئایینیانە کە ئەمانەی خوارەوە نموونەیانە:

**١. فراوانبوونی دەوڵەتە ئیسلامییەکان:**

لە سەرەتادا ئیسلام لەناوچەیەکی بەرتەسکدا گەشەیکرد، بەڵام لەدوای خەلافەتی راشدینداو لەماوەی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و سەردەمەکانی لەوەودواوە زۆر فراوانبوو، دەڤەرێکی زۆر گەورەو فراوانیان بەرکەوت و نەتەوەیەکی زۆری غەیری عەرەب هاتنە نێو ئایینەکەوە، کە ئەمە لەگەڵ خۆیدا کاریگەرییەکی باڵای بەجێهێشت لەسەر ئاین و راڤەکردنی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکان و هەڵسەنگاندنی ئایینی. لەو رێرەوە کە فراوانی ئاقاری دەوڵەتی ئیسلام بە خۆیەوە دیت، کە ئەمیش وەرچەرخان بوو بەرەو ئەوەی ئیسلام لە قاوغێکی نوێی بزاڤە ئایینییەکان خۆی ببینێتەوە.

**٢. جیاوازی لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا:**

لەگەڵ فراوانبوونی دەوڵەتە ئیسلامییەکان، جیاوازی دەوڵەتە ئیسلامییەکان هۆکارێکی هەرە گەورەبوو لە پێگەیاندنی بزاڤە ئایینی و ئایینزاکان لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا، چونکە بۆ نموونە بیرو باوەڕی ئایینی لە سەردەمی ئەمەوییەکان جیاوازیی هەبوو لەوەی کە هەبوو لەسەردەمی عەباسییەکان بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی عوسمانییەکان.

ئەمەوییەکان لە بەربەرەکانییەکی خێڵەکی و سیاسی دەورێکی بە هێزیان بینی لە رووخاندنی خولەفای راشدین، بە پێچەوانەی عەباسییەکان ئایینیان کردە دەسکەڵای بەهێزی خۆیان بۆ رووخاندنی ئەمەوییەکان و هەوڵی راکێشانی ناوچەکانیاندا لەلای ئایینی و هاتنە سەر تەختی دەسەڵات. بۆ نموونە لە سەردەمی عوسمانی و سەفەوییەکاندا دەوڵەت دابەش بوو بەسەر دوو مەزهەبی شیعەو سوونەداو ناوچەکانیش لەو پێڕەوەدا رەنگی دایەوە کە ناوچەکانی کوردستانیش بێبەش نەبوون لە چوارچێوەی ئەو سیاسەتە بە کەرکوکیشەوە، هەر ئەم دیاردەی جیاوازی دەوڵەتە ئیسلامییەکان، رەنگدانەوەی بەهێزی دروست کرد لەسەر ئاستی شەرو پێکدادان و ناوچە داگیر کراوەکان و ململانێی سیاسی و سەربازی لەو چوارچێوەدا خۆی دەبینیەوە کە بەشێکی ئەو شۆڕش و راپەرینانەی چوارچێوەیەکی ئایینی وەرگرت و جیهانی ئیسلامی بەو پێوەرە دابەش بوو.

**٣. کاریگەری قوتابخانە فیکرییەکان بەسەر ئایینەوە:**

لەو ماوە درێژەی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا گەلێك قوتابخانەی ئایینی و فیکری و فەلسەفی لە هەموو دەڤەرەکانی دەوڵەتەکان روویداو دەورێکی بەرچاویان بینی لە بەرەوپێشچوونی هەڵسەنگاندنی ئاین و فەلسەفەی ئایینی و فیکرو بۆچوونی ئایینی و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی بەرچاو لە روونکردنەوەی لایەنە شاراوەکانی تەمومژی و فەلسەفەی واقیعەکە لەگەڵ ئاییندا، تا چ رادەیەك لایەنە شاراوەکانی شیدەکرێتەوە، تا بەوەی ببێتە ئەوەی لەو چوارچێوەیە ئاوەزو بیری جیاوازی ئایینی تر بێتە گۆڕێ.

**٤. کاریگەری راپەرین و خۆپیشاندانەکان دژی دەوڵەتە ئیسلامییەکان:**

دەوڵەتە ئیسلامییەکان، لەو ماوە دوورو درێژەی بە سەریان برد، هەردەم لە بەربەرەکانێیەکی بەردەوامدابوون لەگەڵ ئاقارەکان و دەوڵەتەکانی دەورووبەریان بۆ گواستنەوەی دەسەڵات و بەربەرەکانی سەربازی و سیاسی دەوڵەتەکەیان، بۆیە دەبینی هەمووکات ناوچەکانی لەرووی خزمەتگوزارییەوە پشتگوێ خرابوون، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا پێچەوانەیەکی گەورەی شۆڕش و راپەرینی دژی دەوڵەتەکە دروست کردبوو. بەرامبەر ئەم پشتگوێخستنە دەبینی راپەرینەکان و شۆڕشەکان شێوازی جۆراو جۆریان بەکار دەهێنا بۆ سەرنج راکێشانی خەڵکی. ئاقارەکان دژی دەسەڵاتی ئیسلامی کە ئەمەش لەگەڵ خۆیدا شێوازی تازەی ئایینی هێنایە گۆڕێ و بە بەرگێکی تر بایەخی بە برەوی خۆی دەدا، کە نموونەی ئەمەمان زۆر زۆر بوو لەناوچەکانی کوردستان و کەرکوك، بەتایبەتی ناوچەکانی داقوق و خورماتوو کە لەپای ئەم بەرگری کردنانەدا ناوچەکە تووشی کاولکاری و وێرانی دەبوو، تا ماوەیەکی چاك ناوچەکە کپ دەکرایەوە، شۆڕش و راپەرین و بزاڤە ئایینییەکەش لەگەڵ خۆیدا تووشی داڕووخاندن دەبووەوە. هەر ئەم کاریگەرییە ئایینیانە وایدەکرد دەسەڵاتی مەرکەز لەو ناوچەیە بێ هێز بکات و ناوچەکە بەرەو سەربەخۆیی و کەلێنی ئایینی و بزاڤی ئایینی ببات، کە دەرەنجامەکەی بەکەلێن بەرەو تێگەیشتن لە ئاین دەڕۆیشت.

**٥. کاریگەری ئایینەکانی پێش ئیسلام:**

دەتوانین بە یەکێك لە هۆیە گرنگەکانی دابنێین کە دەورێکی باڵایان بینی لەسەر هەڵدانی مەزهەب و بزاڤە ئایینییەکان، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینییەوە کە بەراوردکردنی نێوان ئایینەکان لە تەرازوویەك و هەڵسەنگاندنی لەگەڵ ئیسلامدا رێگە خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی دەروازەی بیرکردنەوەکان فراوان بێت و بەرجەستەکردنی مەزهەبی تر خۆی بقۆزێتەوە. لەنێو ناوچە ئیسلامییەکاندا ئایینەکانی وەکو زەردەشتی، جولەکایەتی، مەسیحی، مەزدەکی، مانی، بە شێوازێکی ترو بە بەرگێکی تر هاتنە نێو پانتایی گۆڕەپانەکە، کە تووشی بەربەرەکانی بوو لەگەڵ ئیسلام و لق و پۆی تری دروستکرد کە هەڵگری ژینگە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلام کە لەرووی نەتەوەو داب نەریتی کۆمەڵایەتی و زمان و رۆشنبیرییدا جیاوازی هەبوو لەنێوانیاندا.

ئەوەی لێرەداگرنگە ئاماژەی پێ بکەم، ناوچەیەکی وەکو کەرکوك پارچەیەکی ئەو ئاقارانەبووە کە کەوتبوون بەر کاریگەری ئەو هۆکارانەو هەموودەم لە بەربەرەکانێدا بووە بۆ سەرهەڵدانی ئەو بزاڤە ئایینییانە.

لەگەڵ بەرەو پێشچوونی رۆژگاردا کەلێنە مەزهەبییەکان

زۆر زیادیان کردوو، لەگەڵ فراوانبوونی هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی، کاریگەرییەکانی ئەم فراوانییە زۆر زیادی کردوو لە هەردوو دەوڵەتەکە مەزهەب بووە بنەمایەکی سەرەکی ئایینی ئیسلام لە دەوڵەتەکانیان ئەویش لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە سیاسەتو ڕووی سەربازی دەوڵەتەکەی لەسەر دادەرێژراو بنەماکانی دەوڵەتی لەسەر شیدەکرایەوە کە ئەمیش زۆر بە زەقی ئەو بەربەرەکانییە بەدیار دەرکەوتو کوردیشو ئیمارەتە کوردییەکانی ئەوکاتە بەدەر نەبوون لەو کاریگەرییەوە لە زۆر باردا سیاسەتی ئیمارەتە کوردییەکانی لەسەر دادەرێژراو هەر لەو پێودانگەوە دەبووە دوو بەشەوە، کە لە هەندێك کاتدا کورد زەرەرمەند دەبوو، بەکاولکاری کورد دەگەرایەوە.

(کوردستان کەوتووەتە ناوەراستی خاکی موسڵمان نشین، پەنجا میل لە بەغدادو ٢٠٠ میل لە دیمەشقەوە دوورە، کە دوو پایتەختی کەلتووری ڕۆحی خەلافەتی ئیسلامی سەدە ناوەراستەکانی دوورە سەرزەمینی کوردنشینی لەو سەرزەمینانەبوو،کە هێزە موسڵمانەکان لەسەرەتای سەدەی حەوتەمی زاینیدا زوو هێرشیان کردە سەریان...).

لەبەر ئەوە بمانەوێت نەمانەوێت کاریگەری جیهانی ئیسلامی دەوری خۆی چ بە گەورەیی یان بە بچووکی بێت بینی لە بەرەوپێشچوونو تێکەڵکردنی لەگەڵ ڕووداوە ئایینییەکاندا لە کوردستانو هەر ناوچەو دەڤەرێك دوورو نزیك کەوتە بەر ئەو کاریگەرییە.

(دەوروبــەری سێ لـەسـەر پێنجی کـورد کـە زۆربـەیـان بە کرمانجی قسە دەکەن، لایەنی کەم بەناو موسڵمانی سووننەی بە مـەزهـەب شافیعی لە شارەکانی کرماشان، کەنگاوەر، هەمەدان، قروەو بیجار لە کوردستانی باشوورو ڕۆژهەڵات لە ئێران، شیعەی دوانزە ئیمامی هەیە، بێ لەوە هەندێ شیعەی دوانزە ئیمامی لە (مەلاتی)، ئادیامانو ماراشی ئەوپەری کوردستانی ڕۆژئـاوای تورکیا هەیە، بـەڵام لە خوراساندا ژمارەیەکی زۆری کوردی شیعە هەیە.. ژمارەی کوردی شیعە دەوروبەری ملیۆنێك تا ملیۆنو نیوێك دەبێ، واتە ژمارەیان (٥٪) تا (٧٪) ی سەرجەمی دانیشتووانی کورد دەبێ).

مەزهەبی شافعی سووننی لە سەدەی ناوەراستەکاندا لە نێو کرمانجەکاندا دەرکـەوت. لەوکاتەدا ئێرانیش وڵاتێکی موسڵمانی بە مەزهەب سووننی شافعی بوو، لە دەوروبەری کۆتایی سەدە ناوەراستەکاندا خێڵاتی تورك لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتنو لە چاکترین شوێنەکانی (ئەناتۆلیا) نیشتەجێبوون. ئەم خێڵانە ئەو مەزهەبی حەنەفییەشیان لەگەڵ خۆیان هێنا کە لـەناوەراستی ئاسیا باوە. مەزهەبی حەنەفی سنگی لە ڕۆژئـاوای کوردستاندا چەقاند کە لەمەوبەر خاکی بیزانتە مەسیحییەکان بوو، ئەم مەزهەبە جێی بە مەزهەبی شافعی کوردەکـان لـەق نـەکرد، بـەڵام توانـی تەریقەتی سۆفیاتی نەقشبەندی کە تایبەت بوو بە ناوەراستی ئاسیا لە کوردستان پەیدا بکات ئێستا کوردەکانی سـەر بە مەزهەبی شافعی گەورەترین گرووپی مەزهەبی سووننە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوەراست پێکدێنن، ئەمرۆ کورد کەوتووەتە نێوان فارسە شیعەکانو ئازەر لە ڕۆژهەڵاتدا، تورکە سووننە حەنەفییەکان لە ڕۆژئاواو باکووردا عەرەبە حەنەفییەکانی سوریاو باکووری عێراق (زێدەگای مەزهەبی حەنەفی) لە باشووردا. بۆنموونە ئەوەی لەسەرچاوەی ئامارەکاندا ئاماژەی پێدەکرێت ئەوەیە کە ناوچەیەکی کەرکوك ڕێژەی لە سەدی (٨٧,٥)ی مەزهەبی سووننەنو لەسەدی (٨,٣)ی مەزهەبی شیعەن.

*** لە ئینسکلۆپیدیای گشتی ئاوا باسی ( شیعە ) دەکات:**

(مەزهەبێکی سەرەکی ئایینی ئیسلامە، پاش سووننە. شیعە بەو کەسانە دەوترێت کە پەیرەوی ئەو بیروباوەرە دەکەن، کە دەبێت پێشەوایەتی ئیسلام پاش کۆچی دواییکردنی پێغەمبەر (د.خ)، بۆ عەلی کوری ئەبی تالیب بێت، چونکە ئامۆزایەتیو (اهل البیت)ە، بـەڵام هەندێکیان پـەیرەوی ئـەو باوەردەکـەن، کە دەبێـت پێشەوایەتی ئیسلام دوای عەلی کوری ئەبی تالیب بۆ عەباسییەکان بێت، کۆمەڵێکی تریان لەسەر ئەو بـاوەرەن، کە دەبێت بۆ کەسانێك بێت، هیچ پەیوەندییەکیان بە (اهل البیت)ەوە نەبێت، شیعە ئەمرۆ بوونەتە چەند بەشێك وەك: دوانزە ئیمام، زەیدی، ئیسماعیلی، نەسیری، هەروەها، هەرچەندە لە کوردستاندا ژمارەیان کەمە، بەڵام لە چەند تیرەو تایەفەیەك پێکهاتوون وەك: – عەلی ئیلاهی، کاکەیی، شەبەك،.. تا شیعە گەلێ نووسەرو زاناو بیرمەندی بەرز.بەرزیان تیا هەڵکەوتووە، کە کاریگەری گەورەیان هەبووە لە ژیانی سیاسیو فیکری ئیسلامیدا).

کاریگەری ئەم مەزهەبی شیعەو سووننەیە لە دوای مردنی عەلی کوری ئەبی تالیب زۆر فراوان بووەو بووە بەربەرەکانی موسڵمانو ئومەوییەکانو لـەوە دوایـش ئـەو کاریگەرییە زۆر بە زەقی بەدەرکەوت لە دەوڵەتی عەباسیو ئەو ڕێبازە ئایینییەی هەڵیان گرت بۆ بەربەرەکانی هاتنە سەر دەسەڵات کە بانگەوازی پێش دەسەڵاتو دوای دەسەڵاتیان زۆر لێکتر جیاوازبوو.

ئـەم کاریگەرییە کوردستانی گـرتـەوەو ئایین کـەوتـە بەر بـەرداشـی ئـەو بەربەرەکانیانەوە وردە وردە کارتێکردنی بەسەر ئایینە کۆنەکانی کوردستان بەجێهێشت.

(گـرووپـە کـوردە موسڵمانە بە مـەزهـەب جیاجیاکان، بە تایبەتی شیعەو سووننەکان، لەوەتەی بوونەتە موسڵمان نا تەبایيو نەگونجانیان لەنێواندا هەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ناتەبایيو نەگونجانە هەم لە گەوهەردا هیچ جیاوازییەکی لـەگـەڵ ناتەبایی گـرووپـە جیاوازەکانی شوێنەکانی تری جیهانی ئیسلامدا نەبووە هەم لە توندو تیژیداو هەم دووبارە بوونەوەیدا..).

بـۆیـە ڕۆژگــار سـەلماندی دووژمـنـیـش توانـی سـوود لەو مەزهەبانە وەربگرێت بۆ تێکدانی کوردو چەواشەکردنی بۆ ئەوەی نەتوانێت هەولییەکگرتن بدات.

*** ئەو تایەفەو بزوتنەوانەی لە کەرکوکدا سەریان هەڵداوە:**

دەبینین کەرکوکیش وەکـو نـاوچـەکـانـی تـری کوردستان لەدوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام گەلێك تایەفەو بزووتنەوەی ئایینی سەریان تیاهەڵداوە، یان لەناوچەکانی ترەوە یان

ولاتانی دەورووبەرەوە هاتوونەتە شارەکەو گەشەیان کردووەو کاریگەری خۆیان بەجێهێشتووە بەسەر کۆمەڵگەی کەرکوک‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کەرکوکدا، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە لە کەرکوک لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا جێگەو پێگەی ڕووداوە مێژووییەکان بووە بەتایبەتی لە ماوەی خەلافەتی دەولەتی ئەمەوی‌و عەباسییەوە سەنگی ئەم کاریگەرییە زۆری کرد بەتایبەتی لە ماوەی بەربەرەکانی دەولەتی عوسمانی‌و سەفەوییەکاندا.

*** هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئەم تایەفەو لقە ئایینیانە:**

١. کەرکوک ناوچەیەك یان چەقێکی دیاری ڕووداوە مێژووییەکان بووە، ئەویش لەوەدا بەرچاو دەکەوێت کە ناوچەیەکی وەکو داقوق هەردەم جێگەی بەربەرەکانی خەوارج بووەو ڕێگەی خۆسازدانی شۆڕش بووە دژی خەلافەت.

٢. سەرەڕێی ناوچەکەو بەستنەوەی بەناوچەکانی تر هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ سەرهەڵدانی تایەفە ئایینییەکان، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ڕێگا بازرگانییەکان شوێنێکی ئاسانە بۆ کۆچ‌و هاتووچۆی ناوچەکانی بۆیی‌و نیشتەجێبوون‌و گواستنەوەی گەلێك تایەفەی ئایینی بۆی.

٣. چڕکردنی بەربەرەکانی نێوان دەولەتی عوسمانی‌و دەولەتی سەفەوی لەسەر کوردستان‌و گرنگی کەرکوك لەو ڕووداوانەدا دەورێکی بالأیان هەبوو لە قوڵکردن‌و فراوانکردن‌و کەلێن دروستکردن لەبڵاوبوونەوەی مەزهەب‌و تایەفە ئایینییەکان.

٤. کۆچکردنی نەتەوەو تایەفەیەکی زۆر بۆ کەرکوك، یان کۆچپێکردنیان بۆ ئەم شارە بووە هەڵگری جۆرەها تایەفەی ئایینی‌و جێگرکردنی لەم شارەدا.

*** جۆرەکانی تایەفە ئاینییەکان:**

ئەم تایەفەو بزووتنەوەو لقە ئایینییانە گەلێك بەش‌و جۆری هەیە کە هەریەکەی بەسەر ئایین‌و بیرو باوەڕێکەو ئەم تایەفانە دابەش بووەتە سەر ئایینەکانی ئیسلام‌و مەسیحی‌و جوولەکە.

تایەفە ئایینییەکانی ئیسلام دابەش بووەتە سەر مەزهەبی شیعەو مەزهەبی سوونی، لەنێو ئەم مەزهەبانەدا لق‌و پۆی لێبووەتەوەو لەو نێوانەشدا تەریقەتی وەکو نەقشبەندی‌و قادری‌و جۆرەهای تر سەریهەڵداوە.

ئایینی مەسیحیش وەکو مێژوویەك لەو شارەدا گەلێك مەزهەبی جۆراوجۆری تێدا گەشەی کردووە وەکو کلدانی‌و ئاسووری‌و نەستووری‌و کاسۆلیکی‌و ئەرمەنی‌و ئەرسەدۆکس، لەنێو ئەم تایەفە مەسیحییانەدا دابەش بووەتە سەر کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی‌و کڵێسەی ڕۆژئاوایی. نموونەی کڵێساکان لەسەر ڕووی دابەشبوونی مەزهەبەوە دابەشبوونەو هەریەکە کڵێسەی تایبەتی خۆی بەو مەزهەبە هەیە.

**١. بەکتاشی:**

ڕێبازێکی ئایینی تێکەڵاوە لە شیعەو سۆفێتی، بنەچەیان دەگەڕێتەوە سەر (سەید محەمەدی ئیبراهیم ئاتا) کە بە (حاجی بەکتاش) بەناوبانگە، پیاو چاکێکی تورکە، لەسەدەی سیانزەهەمدا لە خوراسانەوە چووە بۆ ئەنادۆل. خانەقایەکی دروست کرد کە بەخانەقای پیر ئاوی ناسراوە، دەستیکرد بەبڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەی کە تێکەڵاوە لە ڕێبازەکانی پێش خۆی کە ڕێبازی قەلەندەری، ویسوی، حەیدەریە، کەلە ناو تورکەکاندا بڵاوبوو بڕوایەکی بەرزیان بە دوانزە ئیمامەکان هەیە، کە غەیبین‌و چاوەڕوانی ڕۆژێکن کە دەبێت دەربکەوێت، لەو باوەڕەدان عەلی کوڕی ئەبی تالب فریادڕەسیانەو بە نموونەی مرۆڤی بالأی دادەنێن، کە ڕاستی خوایەتی تیا کۆبووەتەوە. هەروەها بڕوایان بە فەرمانڕەوایەتی (اهل البیت)و جیاوازی بوونیان لە دوژمنەکانیان هەیە، هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم ڕێبازە لەناو گەل‌و نەخوێندەوارەکان بەخێرایی.. ئاسانی شێوەو تێگەیاندنی‌و نەرمی‌و قسەخۆشی شێخەکانی‌و دوور لە توندوتیژی بوو.

حاجی بەکتاش لەپێشا پەیوەندی بە (سیوی)یەکانەوە توووند بووە، بەلام وردە وردە لێیان جیابووەتەوە، بیروباوەڕی سەربەخۆی خۆی جیاکردەوەو پەیوەندی بە ئینکشارییەکانەوە کرد بەهۆی سولتان ئۆرخان (١٣٢٦-١٣٨٩) کە لەگەڵ هێزێکی سوپای ئینکشاریدا چووە بۆ لای حاجی بەکتاش و داوای پیرۆزلێکردنی لێکرد، ئەویش دوعای بۆ خۆی‌و سەربازەکانی کرد، کە خوا سەریان بخات، لەو ساوە ئینکشارییەکان خۆیان ناونا (بەکتاشی)، ئیتر پەیوەندییەکی توووند لەنێوان سوپای ئینکشاری‌و بەکتاشیدا دروست بوو.

تەکیەکانیان بەهەموو لایەکدا بڵاوبووەوەو لە تەنیشت هەر سەربازگەیەکەوە تەکییەکی بەکتاش دروستکرا، تاکو بەتەواوی دەسەڵاتیان بەسەر ئینکشارییەکاندا پەیدا کرد، سولتان مەحمودی دووەم لەساڵی ١٨٢٦دا لەناویانی برد.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە سوپای ئینکشاری (یەنی چری) لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بریتی بووە لە لاوانی مەسیحی کە دەولەتی عوسمانی کاریگەری لەسەریان بووەو ئیسلامی بەسەریاندا سەپاند، بۆیە باوەڕیان بە بەکتاشی هێنا لەبەر ئەوەی ڕێگەی بە (مەی)و (حەرام کراو) دەدا.

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسی بکەین لە کەرکوکدا لەسەردەمی عوسمانییەکان تەکیەیان هەبووە، بەشێکی کەمیان تاکو ئێستا کە ماون‌و ئەو تەکیانەی کە هەیە بریتییە لە (ئەشاغی تەکیە)و (دەدە جەعفەر تەکیەس). ئەوانەی لە دەوری ئەم تایەفەیە بڵاوبوونەتەوە بریتین لە تورکە ئازەرییە شیعەکان‌و تاکو ئێستاکە لەسەر کتێبی بەکتاش دەڕۆنە ڕێوە).

لەبەر ئەوە بڵاوبوونەوەی تایەفەی بەکتاش لەم ناوچەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك کە خۆی لەم خاڵانەدا چڕدەکاتەوە:

١. بڵاوبوونەوەی ئەم تایەفە ئایینییە لەگەڵ سوپای ئینکشاریدا هاتووەتە ناوچەی کەرکوك.

٢. هەوڵدانێك بوو بۆ ئەوەی بتوانن بەوەی جێگەیەکی وەکو کەرکوك گونجاو بووە بەتایبەتی (داقوق)، لەبڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە تایەفانە بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێگە سەربازییەکانیان.
٣. بەکارهێنانی ئایینی وەکو دەسکەلایەك بۆ لێدانی هەر بزووتنەوەیەك کەلەو ناوچەیەدا سەرهەڵبدا.

**٢. قزڵباش (سرخ سر) کڵاوسوور:**

(کۆمەڵێك بوون، لایەنگرانی شێخ حەیدەری کوڕی شێخ جونێدی سەفەوی، کوڕەزای شێخ سەفیەدینی ئەوردەبیلی سەفەوی کوردن. شێخ حەیدەر لە پێشا سونی بوو، دواجار لەو مەزهەبە وەرگەڕاو بوو بە شیعەو زۆر بە توندی خووی پێوەگرتو فەرمانی دا بەلایەنگرەکانی کە سەروپێچی سوور ببەستن و دوانزە کلۆشی تێبخەن تاکو ئەو کلۆشانە گوزارە لە دوانزە ئیمامە شیعەکان بکات. قزڵباش وشەیەکی تورکیە، بەمانای (سەرسوور) ئەم ناوە بەسەر ئەو لایەنگرانەی شێخ حەیدەری سەفەویدا برا، کە کورد بوون، پاشان ئەمانە هەر بەلایەنگیری ئەو بنەماڵەیە مانەوە، تاکو شا ئیسماعیلی سەفەوی چووە سەر تەختی ئێران، ئیتر ئەمیش قزڵباشەکانی دژی سونییەکان بەکارهێنا).

(یان دەتوانین بنەڕەتییەکان بگەڕێنینەوە سەر (حامیات) ی سەربازی ئازەربیجانی کە (نادر شا) (١٧٣٠ – ١٧٤٧) دروستی کرد (قزڵباش) یەکێك بووە لەو هۆزانەی کە (شا ئیسماعیل سەفەوی) سوپایەکەی بەهێزی لێ دروست کرد.

بۆیە دەبینین کە ئەم قزڵباشانە ماوەیەکی چاك دەوریان بینی لەناوچەی کەرکوکداو لەماوەی بەربەرەکانی عوسمانی و سەفەوییەکاندا، هەوڵێکی ئایینی گەورەیان گێڕا لە تواناکانی بەربەرەکانی شیعەو سونە کە ناوچەیەکی وەکو داقوق تاکو ئێستاکە ئەم پاشماوانە جێگەی خۆی هەیەو لایەنگری هەیە.

**٣. خەوارج - شوراتەکان:**

کۆمەڵێکی ئیسلامین، لایەنگرانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوون،و بڕوایان بە بیروبۆچوونەکە هەبوو، دواجاریش لەڕێزەو لایەنگری عەلی دەرچوون، لەبەر ئەوەی لە شەڕی (سەفین)دا بەشەڕ وەستاندن ڕازی نەبوون، داوای ئەوەیان دەکرد کە دەبێت خوا حەکەم بێت، واتە بەگوێرەی قورئان ئەبێ ناوبژی بکرێت. ئیتر بوون بە دوژمنی عەلی و دواجار بە کوشتنیاندا، هەموو دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەو دوای ئەوەش، کە ئەمەوی و پاشان عەباسییەکان بوون، دژیان وەستانەوە، کوشتارێکی زۆریان لێکردوون، ئیتر بە گەلێ شوێندا بڵاوبوونەوە، هەندێکیان بۆ مەغریب کۆچیان کردووە، گەلێ دەستەو کۆمەڵیان لێبووەتەوە، لەوانە:

(ئەزاریقە، نەجدات، ئەبازیە، حەفریە) لەئایین و بیروباوەڕەکەیاندا زۆر توندڕەو بوون، زۆریش دڵسۆز بوون، تاکو مردن لە پێناویدا جەنگاون، باوەڕیان وابوو، کە دەبێ خەلافەت لەپاش ئەو چوار خەلیفانەی دوای پێغەمبەر بەهەڵبژاردن بێت، کار بەشێکە لە ئایینی، گەلێ شاعیری ناوداریان تیا هەڵکەوتووە لەوانە: (عیمرانی کوڕی حیتان)و (تەرماحی کوڕی حەکیم).

(شوراتەکان ماف ئەوە بە میللەت دەدەن، ئەو ئیمامە (خەلیفە) فەرمانڕەوایانە بڕوخێنن کە لەفەرمانی خواو پێغەمبەر (د.خ) لا دەدات، دانیشیان بەوەدا ناوە کە (ئیمامی) ماف ئەو کەسەیە کە کۆمەڵ واتا (میللەت) ڕازی بووەو بۆ ئیمامی هەڵیبژاردووە، سا ئەو کەسە چ جنس و چ ڕەنگێك بێت، خوای دەکردبەندەیەکی ڕەشی حەبەشی دەبوو، ئەمەش دیموکراس گەریی تیپە (کۆمەڵە) زۆرە جۆربەجۆرەکاندا کە دەیانویست لە هەڵبژاردنی خەلیفەدا بەسەر خەڵکیدا بیسەپێنن، وەك شمشێر هەڵیان کێشابوو.

جا بە پێی ئەم باوەڕە دیموکراسییە، بۆ ئەبوبەکرو عومەر نەبێت، بڕوایان بە خیلافەتی کەسی تر نەبووەو دانیان پێدا نەناوە، مەگەر ئەوانەی کە شوراتەکان خۆیان هەڵیان بژاردبن.

هەرچی خەلیفایەتی (عوسمانی)یشە، ئەوە تەنیا شەش سالییەکەمی نەبێت، ئەو دوایان بەشەرعی دانەناوە. خەلیفایەتی (عەلی)یشیان لە سەرەتایەوە تا کاتی شەڕەکەی (سەفین) بە شەرعی زانیوەو دانیان پێدا ناوە، لەپاش ئەو شەڕەشەوە، ئیتر لە (عەلی) هەڵگەڕانەوەو بەو چاوەوە سەیریان دەکرد کە سەیری (معاویە)یان پێدەکردو هەردووکیان بەکافری هاوشان لەقەڵەم دەدان.

دوژمنایەتیکردنی ئەو دوو هاودژە لەبەر ئەوە بووە کە لە ڕێگەی ڕاستی شەریعەت لایان داوەو خۆشیان بۆ ئەوە هاتوونەتەبەر کەمان و ڕەوا بهێننە جێی ڕاست و پلەی شایستی خۆی، بەڵام ئەو دووبەرەکی و پچڕپچڕی و کوشتارەی کەوتە نێوانیان بوو بە مایەی بڵاوەپێکردن و لەکیس چوونی هەموو کۆشش و خەباتێکیان و دەرفەتی تەواویشی بۆ دوژمنەکانیان ڕەخساند کە دوویان کەوت و هەموو شۆڕشەکەیان سەرکووت بکەن. هەر لەبەر ئەوەشە کە مێژوونووسێکی وەکو (فلهاوزن) بڵێت: (ڕامیارییەکی بێ ڕامیارییان بووە).

شۆڕشەکەیان یەکەم جار لەسەر کەناری چەپی (دیجلە) پێکهات و ئەگەر بشهاتایە بشکانایە هەر دەیانتوانی دەست بەسەر ڕێگای بازرگانی فارس و عیراقدا بگرن.سەردەمی معاویەو ئەو کردارانەی لەلایەن معاویەو والییەکانییەوە دژی بزووتنەوەکەیان کراوە.

پاش ئەوەی کاری ئیمامەت سالی (٤١)ی کۆچی بە قازانجی معاویە تەواو بوو شوراتەکان پێی ڕاپەڕین و شەڕیان لەگەڵ کردو سەرکردەکەشیان (فروەی کوڕی نوفلی ئەشجەعی) بوویە، پێنج سەد سوارەوە (عەلی)و (حەسەن) ی بەجێهێشت و چووە (شارەزوور)و لەوێ مایەوە... پاش ئەوەی حەسەن وازی لە خەلافەت بۆ معاویە هێنا، (فەروە) بەلایەنگیرانی خۆی وت: "ئەوە هاتە پێش کە چوونە سەر معاویە شەڕ لەگەڵاکردنی تێدا نەمێنی".

هەر ئەم بەردەوامییە شۆڕشەکانیان لە کوفەو بەسرەو کرمان و شارەزوورو داقوق و ناوچەکانی تر بەردەوام بوو.

(ئەمە نەبێ خەواریجەکان دەستیان لە شۆڕش و ئاژاوەنانەوە هەڵگرتبێ دوای مردنی (یەزید) بڵاوەیان لێکردووە، بوونەتە چەند بەشێك یەکێك لەوانە پێی وتراوە (ئازاریقە) ئەمانە زۆر ئازاو دلێر بوون و دڵڕەق، بەکۆمەڵ موسلمانان و ژن و

منداڵەکانیان کوشتوون، جگە لەوەش بەشێکی تریان کە پێیان وتوون (شەبیب ئەلشیبانی) لە باکووری عیراقدا لەنێوان (ماردین و نسێبین)دا لەساڵی (٧٦)ی کۆچیدا هێرشیان کردووەتەوە سەر (کوفە)، (حجاج)یان بەزاندووە لە ماڵەکەی خۆیدا بەرگری لەخۆی کردووە تا لەشکرێکی پێ ڕاگەیاندراوە، هێرشی کردووەتە سەریان (شەبیب) بەرگەی نەگرتووەو کوژراوە، (غزالە) دایکی شوێنەکەی گرتووەتەوەو لەگەڵ (حجاج)دا جەنگیوە تا ئەویش کوژراوە، هەر چۆنێ بوو بێت خەواریجەکان جار لەدوای جار تا کاتی (هارون ئەلرەشید) لەگەڵ ئەوانەیدا کە بە موسڵمانیان نەزانیوە جەنگیون).

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە ناوچەی داقوق لە کەرکوك پێگەیەکی گرنگ و بنەرەت و سەرەکی شۆڕشی شوراتەکان بووەو گەلێك شەڕی خوێناوی تێدا ڕوویداوە بە تایبەتی لە سەردەمی ئەمەوییەکانداو تا سەردەمانێکی دوورو درێژ درێژەی کێشاوە، کە تا سەردەمی عەباسییەکانی خایاندوە.

**٤. بزووتنەوەی (بابی- بابیيە):**

(مەزهەبێکی ئایینی نهێنیە، داوای خاسکاری و یەکسانی موسڵمانانی کردووە، لە ساڵی (١٨٤٤)ی زاینی لە (شیراز) سەری هەڵداوەو لەلایەن (عەلی کوڕی محەمەد)، (١٨١٩ – ١٨٥٠)، کە نازناوی خۆی کردبوو بە (باب) دامەزراوە، باب خۆی بە جێگری هەر سێ پێغەمبەرەکە (موسا، عیسا، محەمەد) داناوە، هەر سێ ئایینەکەی لە مەزهەبەکەیدا کۆکردووەتەوەو دەستورەکانی لە سۆفیگەرێتی و غەنوسی و شیعییەوە وەرگرتووە.

ئەم بابییانە، کاتی خۆی ئاشووبێکی گەورەیان نایەوە، کە بووە هۆی زیندانیکردنی (باب)، لەبەر ئەوە موریدەکانیان شۆڕشێکیان بەرپاکرد، زۆریان لەو شۆڕشەدا کوژراون و شۆڕشەکەشیان دامرکێنرایەوە، (باب)یش خنکێنرا لەو ساڵەی شۆڕشەکەدا لەساڵی (١٨٥٠)ی زاینیدا. ئەوانەی تر پەرتەوازە بوون و ڕوویان کردە (ئەستەمبوڵ) و گەلێ شوێنی تر، پاشان بوونە بەهائییە، ئەم کۆمەڵە لەلایەن گەلێ لەو وڵاتانی وەك ڕووسیا و تورکیا و ئینگلیز بۆ مەرامی سیاسی خۆیان لەکاتی خۆیدا بەکاریان هێناون).

ئەڵێن ئەم (باب)ە یەکێك بووە لە قوتابییەکانی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی، ئەم منداڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە. لەتەمەنی بیست و دوو ساڵیدا ژنی هێناوە، کە تەمەنی گەیشتووەتە بیست و پێنج ساڵان توانی خەڵکی بە نهێنی بانگهێشت بکاتە سەر بیروباوەڕەکانی و خەڵکان لەخۆ نزیك بکاتەوە، پاش دڵنیابوون لێیان بانگی بەگوێیان دادا کە خوا مەقامی یان پایەی (باب – دەروازە)ی پێبەخشیوە.

ئەم شێخانە باوەڕیان بە (باب) هێناو بە (بابی) ناوزەد کران، سەرەتا پێدەچێ کە هەژدە کەس لەمانە باوەڕیان بە (باب) هێنابێ و بوون بە موریدی بە ژمارەی پیتەکانی (حیّ) ناونران، پەیرەوانی بابییە بەناوی (اهل البیان)یش دەناسران و هەر لە مانیشەوە ڕێبازەکانی بەهائییە و ئەزەلییە پەیدا بوون.

لایەنگرانی (باب) بۆ بڵاوکردنەوەی بیرباوەڕی (باب) کەوتنە گەڕان و بڵاوبوونەوە بەناو سەرتاسەری ئێران و تورکستان، لە مزگەوت و شوێنە گشتییەکاندا دەستیان کردە وەعزدان و پیاهەڵدان بە شان و باڵای باب و بیروباوەڕی).

بەم هۆیەوە باب ئاوازەیەکی خۆشی بەدەست هانی و لەهەموو شارانی ئێراندا باسی بیروباوەڕی ئەو دەهاتە گۆڕێ، لەبەر ئەمە زانایانی شیعەی ئێران دەستیان کردە نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بەم بیروباوەڕەی باب و بە توندی بەرەنگاری بوونەوە.

بەڕێز هاشم کاکەیی دەڵێت: "بابیە بزاڤو بیروباوەڕێکی ئایینی و سیاسی گەلێ کۆنەو بەهۆی سەید عەلی محەمەدی شیرازی (باب) زیندوو کراوەتەوە لەناوچەکانی ئێران و پەیوەندییەکی تووندوتۆڵی هەبووە بە بیروباوەڕی شەیخییەی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی و پاشان پەل و پۆی هاویشتووەتە ناو خوارووی عیراق و بەغداو شارو شارۆچکەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، پاشان پەلوپۆی هاویشتووەتە یەك دوو شاری کوردستانی باشوور وەکو کەرکوك و سلێمانی کە کاریگەری بیروباوەڕەکە بەسەر دانیشتووانی یاخود پیرەکانی ئەهلی هەق و هەقەکانی سەرگەڵووە بووە".

*** بیروباوەڕەکانییان:**

(لە بیروباوەڕەکانی بابییەکان، باوەڕیان بە خوایەکی تاك و تەنیایەو ئەو زاتە ئەزەلییەو بەبڕوای ئەوان دەتوانێ لەلەشی مرۆڤێکی خاوێنی دینداردا بەرجەستە بێت، بەگوێرەی ئەحکامەکانی کتێبی (البیان) دەچنە ڕێگاوە، بۆیە بە (اهل البیان) دەناسرێن، ئەم تایەفەیە ژمارەکانی پێنج و نۆ وحەوت یان لاپیرۆزەو قیبلەی ئەوان (عەکا)یەو نوێژی بەیانی و نیوەڕۆژەیان هەیەو لەکاتی سەفەریشدا یەك سوژدەیەك دەبەن و نوێژی بەکۆمەڵیان نییە، مرۆڤی بەتەمەن و نەخۆش و ئافرەتی بێنوێژ نوێژیان لەسەر نییە، هەروەها ڕۆژوویان چەند ڕۆژێکە، مەی خواردنەوەو جگەرەکێشانیان لا حەرامە، زۆر بەئەدەب و ڕەوشتن، گەلێك سەخی و دەستبڵاون و هاوڕێتی و هاوسێیەتییان خۆشەو لەکاری ئاژاوە دوورن.

شایانی باسە بابییەکان زۆر گرنگی بەڕۆڵی ئافرەت دەدەن و دان بەمافەکانیاندا دەنێن و بۆشیان هەیەو ماوەیان پێدراوە ببنە باڵادەست لەکاروباری ئایینی تایفەکەیاندا.

نووسینەکانی باب لەلایەن موریدانییەوە بە وەحی ئاسمانی تەماشا کراوەو لەدڵی یارانیدا خۆشەویست بووە، لە ڕووی خۆشەویستی و ئەدەب و ئەرکانەوە بەموریدانی خۆی ووتوە دەبێ زۆر بێ وێنە بن و لەناو خۆتاندا تۆوی زانست و زانیاری و هونەرو سەنعەتی سوودبەخش بێننە ئاراوە لە خەزێنەی یارانەوە دەبێت پێداویستی برسیان و هەتیوان و بێوەژنان و نەخۆشی و پەککەوتە بدرێت و سواڵکردن لەناو یارانی بابییە قەدەغە بکرێ نابێ بەهیچ جۆری ماددە سرکەرەکان بەکاربهێنرێت.

لەڕاوبۆچوونیان گوێنەدانە گۆڕستان و نەخواردنەوەی مەی و

جگەرەکێشان‌و ئافرەتیشیان ئازادەیەك سەربەستەو بۆی هەیە سەرپۆش‌و پەچە نەکات، هەروەکو (قورەتولعەین) کە چارشێوی خۆی فڕێدا.

*** هۆیەکانی سەرهەڵدانی باب:**

١. زوڵم‌و زۆری دەسەڵاتی دەوڵەتە ئیسلامییەکان یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کە دەوربیبنێت کە بیروباوەڕی ئەم جۆرە بزوتنەوانە سەرهەڵبدات.

٢. زوڵمکردنی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەنەتەوەکانی غەیری عەرەب دەوری هەبووە لە گەشەکردنی ئەم جۆرە بزاڤە ئایینییانە.

٣. لاوازیی بیروباوەرەکانی ئیسلام کاریگەری خۆی هەبوو لەم جۆرە بزوتنەوانەدا.

٤. گەشەکردنی شیعەگەری دەوری گەورەی هەبوو لەبەربەرەکانی‌و سەرهەڵدانی بیروباوەڕی بزاڤی ئایینی تر، لەگەڵ پێداویستییەکاندا ناگونجا.

**٥. سابیئە مەندائییەکان:**

ئەمانەش یەکێکن لەو تیرە ئایینیانە کە مێژوویەکی دوورودرێژیان هەیە لە ناوچەکانی کوردستان‌و خاوەنی کەلەپورێکی زۆر گەورەن، گەلێك رەگی قوڵیان هەیە کە لە مێژوودا رۆچووەتە خوارەوەو تێکهەڵکێشی گەلێك کەلەپوورو شارستانی ئایینەکانی تری رۆژهەڵاتی ناوەراستن.

گرنگی ئەم تیرە ئایینیە لەوەدایە خاوەنی تایبەتمەندیەکی بەرفراوانی کەلەپوورو داب‌و نەریتی کۆمەڵایەتییە کە تاکو ئێستاکە بەشێکی گرنگی ئەم کەلەپوورە کارا کراوە لە سرووتە ئایینییەکانیاندا، تاکو ئێستاکە ژیانیان لەسەر پێرەوی ئەم دابونەرێتی ئایینیە بەرێوە دەچێت.

ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکەم ئەم تیرە ئایینیە، بەگەلێك شێوەی جیا، جیا ناوی هاتووەو گەلێك نووسەر باسیان کردووەو لەژێر ناوی جیا جیا ئاماژەیان پێیان کردووە.

((سابیئە، سوبیی، سوبیا، ناسورانی، مەعمودیان، نەبەتییەکان، گنوسی، خەمیری، کیماری، موغتەسیلە، مەشخانی، نشیانی، میسانی)). ئەمە ئەو کۆمەڵەناوانەن کە باسیان کراوەو هەر هەمووی لە مێژووی (سابیئەکان دەکۆڵێتەوەو دەگەرێتەوە سەر مێژوویان، بەڵام ئەوەی زیاتر گرنگەو باسی زیاتری لێکراوە (سابئیە)یەو ئەوانی تر چەند مێژوو نووسێك ئاماژەیان پێکردووە، هەروەها ئەم تیرە ئایینییە تووشی لەناوچوون‌و کوشت‌و برێکی زۆر بووەو لە سەردەمانێکدا گەلێکیان لێکوژراوەو هەر ئەو کاریگەرییە وایکردووە فەوتاندنی زمانی دەوری خۆی هەبێت لە دەستدانی بەشێکی زۆری کەلەپوری لە ناوچەکەدا.

(ئێستا زمان، یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکان کە رووبەرووی مەندائییەکان بووەتەوە، وەك لە دەقە نوسراوەکانیاندا دەردەکەوێت، ئەوان جاران بەزاراوەیەکی زمانی کەناری ئارامی دەدوان، بەڵام ئەو زمانە ئەمرۆ چیتر لای مەندائییەکان قسەی پێناکرێ، زمانی عەرەبی دەمێك ساڵە بەتەواوی جێگەی مەندائییەی گرتووەتەوە، لەناو مەندائییەکانی ئێرانیشدا ئەو زمانە لە بارێکی مەرگباری پاشەکشەدایە.

زمانی مەندائی لە بیست‌و سی پیتی ئارامی پێکهاتووە، ئەو زمانە وەك زمانە سامییەکانی تر یان ئەو زمانانەی بەرێنووسی گۆردراوی ئارامی دەنوسرێن لە راستەوە بۆ چەپ دەنووسرێت، زمانی مەندائی یان (راتنا)، لە دووتوێی خۆیدا، فەرهەنگ‌و کەلتوورێکی زۆر کۆن‌و دێرینی پاراستووە، لێکۆڵینەوەو پاراستنی زیندووکردنەوەی ئەو زمانە ئەرکێکی مرۆڤایەتی‌و جیهانییە، هاوکات خزمەتێکی گەورەشە بۆ تێگەیشتنی شارستانییەتی کۆنی میزۆپۆتامیا، ئەو شارستانییەتەی کە جێ پەنجەی بە هەموو قۆناغەکانی گەشەسەندنی شارستانی مرۆڤایەتییەوە زەق‌و دیارە.

*** مەندائییەکانی کەرکوك:**

زانیاریمان زۆر کەمە دەربارەی ژمارەو مێژووی مەندائییەکان لەم شارەدا، بەڵام سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆمەڵێکیان لەم شارەدا ژیاون‌و خەریکی پیشەگەری ئاڵتونچێتی بوونەو گەلێك کەسی بەناوبانگیان تێدا هەڵکەوتووەو بە (صوبی – سوبی) لەم شارەدا بەناوبانگ بوونە.

لە ساڵانی نێوان (١٩٢٠ – ١٩٤٧) لەسەر ژمێرییەکاندا هیچ رێژەیەکی ئەم تیرە ئایینییە بەرچاو ناکەوێت لەم شارەدا، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٧)دا ژمارەیان (٢٠٧) کەس تۆمار کراوە کەلە گەرەکەکانی (ساری کەهیە، ٨٢ کەس)، (بەگەکان – ٤٢ کەس) (شاتەری – شاترلو، نییە، خاسە – ٢١ کەس)، (ئاغاکان، ئاغالق – ١٢کەس)، (گەرەکی مەیدان – ١٢ کەس)، (حەمام موسڵمان – ٣٠کەس)، (گەرەکی نەوتی کەرکوك – ١٦ کەس).

بەڵام ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە ماوەی نێوان حەفتاکان‌و تا ئەم ساڵانەی دوایی رێژەیان زۆر زۆر زیادی کردووەو پەرستگای تایبەتی بەخۆیان دروستکردووە بۆ سرووتە ئایینییەکانیان، بەڵام بەبۆچونی خۆم زۆربوونی رێژەیان لەم شارەدا دەگەرێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

١. پرۆسەی بەعەرەبکردن‌و هەنگاوی بەعسی بەراگوێزانیان لەخوارووی عیراقەوە بۆ ئەم شارە، یەکێك بووە لە هەنگاوەکانی بۆ ئەوەی هەوڵ بدات ئەم تیرە پەرش‌و بڵاو بکاتەوە.

٢. راکردنی خەڵکە سابئییەکە لە خوارووی عیراق تا بەوەی لەبەرچاوی بەعس ون بێت یەکێك بووە لەو هۆکارانە کەلەنێو کۆمەڵگەی فرە مەزهەبی خوارووی عێراق جێگەیان نەدەبووە.

٣. ئاسوودەییان هۆکار بووە لەم شارەدا بۆ زیاتر گەشەو زیادبوونیان لە بارێکی سروشتی دا، کە کۆمەڵگەی کەرکوك لەو بەربەرەکانییەی خوارووی عێراق بەدوور بوو.

*** دابونەریتی مەندائییەکان - سابئییەکان:**

پێگەی کۆمەڵایەتی ژن لە کۆمەڵگەی مەندائیدا، وەکو نەریت لەپیاو کەمترە. ئەوەی من هەستم پێکردووە ژنی مەندائی لە زۆر رووەوە ئازادە، لە هاوسێکانی باشترە.

جاران فرەژنی لەناو مەندائییەکاندا نەبوو هیچ دەقێکی ئایینی نووسراو نییە لەدژی ئەو دیاردەیە، بەڵام وەکو نەریتێکی ئایینی، فرەژنی نەبووە، لەم دواییەداو لەژێر کاریگەری نەریتی هاوسێکانیاندا، دیاردەی فرە ژنی لەناو مەندائییانی عێراقدا بەرچاو دەکەوێت.

بەڵام بە بۆچوونی من دەگەرێتەوە بۆ داخراوی کۆمەڵگەکەیان، مانەوەی ئافرەتێکی زۆر لەو تیرە ئایینییە هۆیەکی گرنگە بۆ ئەوەی فرە ژنی وەکو ئایینەکانی تر سەرهەڵبدات.

(بنەماڵەی مەندائی، بەپێچەوانەی دەوروبەرەکەی، پێکهاتەی خێڵەکی نەناسیوە، من وای بۆ دەچم کە مەندائییانی بەرایی، وازیان لە خێڵ، تیرەکانی خۆیان هێناوەو لەسەر هاوبیری، لە ئایینێتی کۆبونەتەوە).

لای مەندائییەکان، رۆژانی یەکشەممە رۆژی خواپەرستیو روو لە پەرستگای (مەندی) کردنە، خەتەنەکردنو بەگوێرەی دەقی نووسراو، گوناهێکی گەورەیە، لایان وایە لەشی مرۆڤ شتێکی تەواو بێخەوشە، ئایینی مەندائی بناغەی سیستمێکی کۆمەڵایەتی تەواوی بۆ پەیرەوانی داناوە.

مەندائییەکان ژمارەیەك کتێبی دەستنووسیان هەیە کە هەموویان بەزمانی مەندائی نووسراون؛ کتێبەکان بابەتی جۆراوجۆریان لەخۆیان گرتووە.ناسراوترین کتێب بریتییە لە کتێبی (گنزا) واتای (گەنجینە) دەگەیەنێ، هاوکات پێشی دەگوترێت (سیدرا رەببا - کتێبی مەزن)، (گنزا) دوو بەشە (گنزا - ئیمین)، گنزای راستە) کەبەشە زۆرەکەو هاوکات گرنگەکەی گنزایە، لەم بەشەدا چەندان بابەت هەن لە بوارەکانی میتۆلۆژیا، زانستی لاهوتیو لێکۆڵینەوەی رەوشتی، بەشەکەی تر (گنزا سمالە - گرنزای چەپە) زۆر بچوکە، هەندێ هەڵبەستو نزای ئایینی لە خۆگرتووە.

((ساختاری خێزانی مەندائی، جیاوازییەکی دیارو بەرچاوی لەگەڵ ساختاری خێزانی، خەڵکی دەوروبەریان نیە، بنچینەی خێزانی دایكو باوکە، زۆر جار پتر لە نەوەیەك لەژێر بنمچێکدا پێکەوە دەژین، پاشماوەی باوکسالاری، لە دەسەڵاتی زاڵی پیاودا، لەناو خێزان رەنگی داوەتەوە، مەندائی ئایینێکی داخراوە، واتا دەرگای بۆ کەسانی تر نیە گەر بیانەوێ بێنە سەر پێرەوی ئەو ئایینە، هەر بەهەمان شێوەش ژنهێنانو شووکردن، لەناو خۆیە، ئامۆزاو پورزاو خالۆزا دەتوانن ببن بەهاوسەرییەکتر، لەبەر کەمی ژمارەیان، زۆریان خزمییەکترنو خوێنیان تێکەڵە، ئەمەش وا دەکات لە دوا رۆژدا تووشی کێشەی تەندروستی ببنەوە..)).

لێرەدا داخرانی ئایینەکە لەلایەك داخرانی کۆمەڵگەکەیان لەلایەکی ترەوە، هۆکارێکی گرنگی بەرەو نوو چدانو سرینەوەی ئاسەواری پاشماوەی مەندائییە لەناوچەکەدا، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە ناجێگری ناوچەکەو بڵاوبوونەوەیان لەناوچەیەکی فراوان وای کردووە بکەونە نێو کۆمەڵگەیەکی فرە نەتەوەو فرە ئایینەوە کە رێبازە بنەرەتییەکەی مەندائی خۆی لەدەست داوە. ئەم کاریگەرییە لە خێزانەوە سەرچاوەی گرتووەو لەوێوە دەست پێ دەکات. کۆمەڵگەی کەرکوك وتایبەتمەندی فرە نەتەوەییو فرە ئاین تێدا جێگایەکی بەرچاوە وادەکات کە کۆمەڵگەی مەندائی بتوانێت تێدا بتوێتەوەو خۆی لەگەڵ بارە ناجێگرەکەیدا بگونجێنێت.

((خێزانی مەندائی کاتێ کە رووبەرووی کێشەو ناکۆکی دەبێتەوە ئەوا لەلایەن خزمانی نزیكو کەسانی جێرێزی بنەماڵە، هەوڵی چارەسەری بۆ دەدرێ، پیاوانی ئایینی خۆ لەکێشەی خێزانی هەڵناقورتێنن، مەگەر لەسەر داخوازی لایەنی ناکۆکییەکە بێت رێگا لەیەك جیابوونەوەی ژنو مێرد نەگیراوە، بەڵام وەك دیاردەیەکی ناحەزو نەویستراو تێی دەروانن)).

((دیاردەی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام یەکێکە لەکاریگەرییە گەورەکانی سەر کەلەپورو شارستانی مەندائییەکان، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بەعەرەب کردنی ناوچەکانی بڵاوبوونەوەی مەندائیو کارتێکردنی ئیسلام تێدا رێچکەیەکی گەورەی وای دروستکردووە"کە ئەمرۆ تەنیا کەمێکی ئەم سیستەمە بە ساختاری کۆمەڵایەتیو ژیانی رۆژانەیانەوە دیارە))، چونکە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بووە تێکەڵ بوونی شارستانی لەلایەكو توانەوەی بەشێکی گەورەی لەپرۆسەی بەعەرەب کردنو ئیسلام بووندا.

((یەکێ لەدیاردە زەقەکانی توانەوەیان لەناوەکانیان دەردەکەوێت پێش پەلاماری عارەبان بۆ سەر ناوچەکە ناوی تایبەتی مەندائی لە ناویاندا باو بوو، ناوی ساسانی کوردیش دیارەیەکی تارادەیەك ئاسایی بوو دەتوانین بۆ سەلماندنی ئەمە چاوێك بەو چەند ناوەدا بخشێنین کە لەو بەڵگەنامەدا کە بۆمان بە جێماوە دەست دەکەون. هەندێ لەناوە باوەکانی سەردەمی پێش پەلاماری عەرەب بریتین لەزازای، ئەتهردامویا، ئەشکەندا، ئادەم، زەهرون، ئانۆش، یەهیا، بۆکوران، رایی، زەکیە، هەوا، تیمات، بۆکچان. لەناوە ساسانییەکانی هەمان سەردەمیشدا: بەختیار، بەهرام، سەرمەد، هۆرمز، سامان، یاسەمین)).

هاتنی بەعسییەکانو جێبەجێکردنی پێرەوی شۆڤینانەیان یەکێکە لە کاریگەرە گەورەکانی تەفروتوون کردنی کەلەپوورو شارستانی مەندائییەکان لەعێراق بەگشتیو کەرکوك بەتایبەتی، کە کۆمەڵگەکەیان کەوتە بەرلێشاوێکی گەورەو فراوانی بەعەرەبکردن، توانەوەی کۆمەڵگەی مەندائی کەخۆی دەبینێتەوە لە پەرتەوازە بوونی ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکە بۆ وولاتانی دەوروبەرو راکردنیان بەرەو هەندەران.

یەکێك لەو کاریگەرییانەی توانەوەی زمانیانو لەدەستدانی زمانی بنەرەتی خۆیانو چاپکردنی کتێبە پیرۆزەکەیان بەناو (کەنزارەبا) بۆ زمانی عەرەبیو شێواندنی زمانی بنەرەتی کتێبەکەیان وەرگێرانی گەلێك لایەنی کە لەگەڵ خواستی رژێمەکەدا بگونجێتو دوور بێت لە کەلەپووری مەندائی.

((بەگشتی مەندائییەکان هەوڵیان داوە بۆ خۆ پاراستن بە گۆشەگیری بمێنێتەوە، ئەوانەشیان کە توانیویانە،

لەكاروپیشەیان یان هەر بوارێكی تر وا پێشبكەون، ئەوا هەوڵیان داوە خۆ گەرانەوەیان بۆ ئایینی مەندائی تا ئەوەندەی دەكرێ بشارنەوە. ئەمەش وای كردووە كە تاكی مەندائی بەپێی كاتو شوێنو پێویستی خۆی بەشێوەی جۆراوجۆر دەربخات، ئەمانە هەمووی بوونەتە هۆكارێكی تر تا زانیاری خەڵك لەسەر مەندائییان تەمو مژاوی بێت، لەناو ئەو كۆمەڵگایەدا هیچ كەسایەتییەكی ناسراو هەڵنەكەوتووە، ئەگەر ڕووبەڕووی چەند ناوێكی دەگمەنیش دەبینەوە ئەوا زوو هەست دەكەین كە ئەو كەسانە هەوڵیان داوە پێناسەی مەندائی بوونی خۆیان بەدەر نەخەن.

لەو كەم كەسانەی كە ڕۆڵی دیارییان بینیووە دەكرێ ناوی (مالك سەیف) بێنین كە یەكێ بوو لە ڕێبەرە سەرەتاكانی پارتی كۆمۆنیستی عێراق، پێش ئەوەی وازبێنێ، دواتر دەزگاكانی ڕژێمە لە دژی پارتی كۆمۆنسیتی عیراقی بەكاریان هێنا، هەروەها (عەبدولرەزاق عەبدولواحید) كە وەكو شایەری تایبەتی سەدام ناسراوە دوای ڕزگاركردن عێراق هەڵهاتو لە پاریس گیرسایەوە)) دەستیشی هەبوو لەگۆڕینی كتێبی پیرۆزی مەندائییەكان.

*** ڕێورەسمی لە ئاو هەڵكێشان:**

یەكێك لەو دیاردانەی بیروباوەڕی مەندائییەكان ئەوەیە كە مەراسیمو سرووتی ئایینەكانیان لەتەك ئاوو ڕووبارەكان دەكەنو گەلێك دیاردەی لەو جۆرانە یان لەو شوێنانە جێبەجێ دەكەن.

((خۆ لەئاو هەڵكێشانو جەمكردن بەئاو، یەكێكە لەزەقترینو بەرچاوترین دیاردەی لای مەندائییەكان، مەندائیو ئاو دوودوانەی جووتو تەبانو هەرگیز لێك جوێ نابنەوە، ئەوان شێوازی جۆراوجۆری بە ئاو جەمكردنیان هەیە، هەریەكە، بۆ مەبەستیو بەشێوەیەك ئەنجام دەدرێ، ئەوان بەئاوی پیرۆزی جەمكردن دەڵێن (یەردەنە) ئەم ووشەیە واتای (بە ئوردنكردن) دەگەیەنێت. هەر چەندە ئەوان هەزاران میلیش لە ڕووباری ئوردنەوە دوورن، ئەمە (یۆحنای مەعمەدان) مان بیر دەخاتەوە كاتێ لە كەناری ڕووباری ئوردندا پێڕەوانی خۆی لەئاو، ئەو ڕووبارە جەم دەكرد.

مەندائییەكان، ئەگەر دەستیان بەسەر ڕابگات، ئەوا لە ئاوی پیرۆزی پێ مەندامەندی جەم دەكەن، ئەو ئاوە لە ئەستێلكێكی بەشی پێشەوەی پەرستگا هەڵكەوتووە، دەنا دەكرێ جەمكردن لە ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو ئەنجام بدرێت، ئەوان وا دادەنێن كە ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو، هێما بۆ ژیان دەكات، یان خۆی بەشێكە لەسەرەتای ژیان)).

بەڵام ئەوەی ئێستا دەبینرێت لەشوێنی پەرستنەكانیاندا ئەم جۆرە جەمكردنو لە ئاو هەڵكێشانەیان دروست كردووە كە بریتیە لە حەوزێكی گەورەی ئاوو كە حەوزەكە ئاو لەبەری دەڕواتو مەراسیمی ئایینی خۆیانی تێدا جێبەجێ دەكەن.

**٦. بارانی:**

ئەمەش یەكێكە لەو لقو مەزهەبە ئایینیانە كە لە سەردەمانێكی زۆر زووەوە لە ناحیەی قەرەداغ هاتوونەتە ناوچەی كەركوكو لە گوندی (شێخ جگری - جگێری) گیرساونەتەوە، هەواڵەكان ئەوە پشتڕاستەدەكەنەوە كە خەلیفەی تەریقەتی شێخ عوسمانی بیارە بوونە.

دەربارەی بنەڕەتی ئەم لقە ئەوەیە كە (بارانی)و (شێخە) دوو برا بوونە لەو ناوچەیەوە هاتوونەتە خواروو، بارانی ئەم كوڕانەی هەبووە بەناوەكانی: ئەحمەد، سەعید، مستەفا، بەڵام (شێخە) دەربارەی بنەچەی هیچ زانیارییەكمان نییەو نەوەكانی نازانرێت كە لەوانەیە منداڵی نەبووبێت.

ئەم تەریقەتە سۆفیەش لەوگوندە بەناوی باپیرە گەورەیانەوە بارانی ناوبانگی دەركردووەو سرووتەكانی بەجێهێناوە.

ئێستا نەوەی ئەم بارانییە بەناوی ئەحمەد سەعید ئەحمەد بارانی تەكیەیان هەیە بەناوی تەكیەی بارانی لە ئەستەمبوڵو بەشێكی نەوەكانیشیان لە كەركوك دەژین كە محەمەد بارانی كوڕی مستەفا بارانییە لە كەركوك.

دەربارەی بنەڕەتی بیروباوەڕە ئایینیەكەیان زانیاریمان زۆر كەمە كە بەشێكی زۆر كەمی ماوە، ئەوانەی كە لەنزیكەوە شارەزایین ئەوە دەخەنە ڕوو كە تەریقەتێكی سۆفیانەبووەو باوەڕیان بەبارانو باران بارین بووەو لەكاتی نەبارینی باراندا نوێژی تایبەتییان كردووەو داواو نزاو پاڕانەوەی تایبەت بەو كارەیان كردووە.

بۆیە بنەڕەتی كارەكەو كاریگەرییو سەرهەڵدانو چۆنیەتی گەشەكردنیو هۆكارەكانی چین نازانینو پێویستمان بەسەرچاوەی زۆرترە بۆ بەدواداچوونی بنەڕەتی ئەم لقە سۆفیگەرییە.

**٧. حەقە - حەمە سوورییەكان:**

ئەمیش یەكێكە لەو بزووتنەوە ئایینییانەی كەلەسەردەمانێك لە كوردستاندا گەشەی كردووە، لەدوایشدا لە كەركوك گیرسایەوەو ڕێرەوێكی گەورەتری لەخۆی گرت كە تاكار گەیشتە ئەوەییەكێك لە ڕۆژنامەكانی ئەو سەردەمە چاوپێكەوتنێكی لەگەڵ حەمەسوور كردبوو نووسیبووی: دابەزینی پێغەمبەرێك لە كەركوك.

بزووتنەوەیەكی ئایینی كۆمەڵایەتی ناو كوردەوارییە، وەچەیەكی ڕێبازی سۆفینیزمەو دەگەڕێتەوە سەر تەریقەتی نەقشەبەندی، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لەلایەن (شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵە)وە لە كوردستان هاتە كایەوە، پاشان ڕێرەوێكی نیشتماپەروەری وەرگرت یاخیبونێكی سۆفینیزمییە لە نەرێتی ناجۆرو پڕ جەورو ستەمی ناو كۆمەڵ، بەهۆی ئەوەی كە ڕێبازێكی داخراوە هەر ئەو كەسانەی هاوبیرن كە باوەڕیان پێیەتی، ئاگاداری هەڵسوكەتی ناو ڕێبازەكەن، لەبەر ئەوەشە زۆر بڵاونەبووەتەوە تەنها لەناوچەی سوورداشی نزیك شاری سلێمانیو چەند گوندێكی ناوچەی كەركوك بڵاوبووەتەوە.

بیروباوەڕیشیان هەقپەرستیو برایەتیو یارمەتیدانو هەرەوەزییەكتریو سەربەستی ئافرەتو ڕەوشتو خووی بەرزو دابەشكردنی ئەركو كار لەناو یەكتریدا. پاش شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵە، مامە ڕەزاو حەمەسوور سەرۆكایەتی ڕێبازەكەیان گرتە دەست.

*** هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی حەقە:**

**١. گۆرانکارییەکانی سەرگۆرەپانی کوردستان:**

دەتوانین بڵێین یەکێکە لەو هۆیانەی کەلەسەدەی بیستەمدا کوردستان بەخۆیەوە دیت، ئەویش لەچوارچێوەی رووداوەکان و پەیمانەکانی سەر گۆرەپانی جیهان و دەوری ئەو پەیمانانە لە دابەشکردنی کوردستان کە ئەمە لەگەڵ خۆیدا بووە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی لەو جۆرە کە بکەوێتە ژێر کاریگەری هەستی نەتەوایەتی و چوواندنی لەسەر بۆچوونێکی ئایینییانە تاکو بەوەی خزمەتی کۆمەڵی کوردەواری بکات لەسەر ئاستێك تاکو بتوانێت خزمەتی کورد بکرێت، هەرچەندە ئەم بزووتنەوەیە نەیتوانی وەکو پێویست ئەو رۆڵە ببینێت.

(لەو سەردەمەدا کە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە تەریقەتی نەقشەبندی بڵاودەکردەوەو خەریکی دامەزراندنی بناغەی جووڵانەوەی (هەقە) بوو، بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی لە عێراقدا لە پەرەسەندندا بوو، بەتایبەتی لە کوردستاندا، شەری بەردەرکی سەرای سلێمانی نموونەیەکی باش و ئاشکرای ئەم پەرەسەندنەی بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی بوو لەم ناوچەیەدا. ئینگلیزەکانیش کە لەلایەکەوە شارەزای ئەوە بوون بیروباوەری ئایینی ئەگەر لە جیاتی ئەوەی بۆ سوودی کۆنەپەرستی بخرێتەکار لەکۆمەڵانی خەڵکدا دەکات و لەلایەکی تریشەوە لەخەڵکی تر ووردتر لەکاکڵی قووڵی جووڵانەوەی هەقەو سۆفییەتی شێخەکانی شەدەڵە دەگەیشتن و هەر لە سەرەتاوە باش لەو بنەتۆوە شۆرشگێرانەیە حاڵی بووببوون کە ئەم جووڵانەوەیە لە زەوی بەپیتی کۆمەڵایەتی ناو جوتیارانی ئەو ناوچە کرێنەدا دائەچەقاند، هەر لەسەرەتاوە بەخۆیان و نۆکەرەکانیانەوە لە گەورەپیاوانی میری لە ناوچەکەدا، کەوتنە هەوڵ و تەقەلادان بۆ ئەوەی جووڵانەوەی هەر لە بێشکەکەیدا بخنکێنن و نەهێڵن پەرەبسێنی بۆ ئەوەی شێخ عەبدولکەریم لەو بیرو سەودایە وەرگێرن کە لەسەریدا بوو).

هەربۆیەش ئەوە زۆر بەروونی دەردەکەوێت لەو بەربەرەکانییەی کە کاربەدەستان کردیان دژی هەقەکانی ناوچەی کەرکوك و گەلێك تاوانیان دایە پاڵ تا بەوەی کە لەنێو کۆمەڵگە دابشۆرێت و نەگەن بەوەی ئامانجەکانیان بپێکن و خواستەکانیان بگاتە مەرام کە نموونەی ئەو راستییانە زۆر بوو کە گەواهی بۆچۆنەکان پشتراست دەکاتەوە.

**٢. تێنەگەیشتن لە ئاین:**

دەبینین لەو سەدەیەدا گۆرانەکان بەجۆرێك چەواشە بوو کە ئایینیش کەوتە ئەو چوارچێوەیە، بۆیە پێویستی بەرێنمایی هەبوو تا بەوەی بگەرێتەوە سەر بارە ئاساییەکەی خۆی بەوەی ئەرکە مرۆڤایەتییەکەی بەجێبهێنێت.

(شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە مەیدانی تەریقەتدا بەوە نەوەستاوە کە رێبازی ئایینی بەساکاری، دوور لە باری ژیانی کۆمەڵایەتی، لەناو خەڵکەکەی دەوروپشتییدا بڵاوبکاتەوە، بەڵکو بایەخی بەژیانی کۆمەڵایەتیش داوە، هەمیشە خەریکی ئەوە بووە کارێك بکا مورییدەکانی رووبکەنە چاکەو ژیانێکی پاك و دۆستانەیان لەناو خۆیان و لەگەڵ خەڵکی تردا هەبێت و یارمەتی خۆیان و هەموو موسڵمانان بدەن و خۆیان لەپیاو خراپان دوور رابگرن و توخنی زۆرداران نەکەون و بەربەرەکانێتی هەموو جۆرە جەورەو زۆرو ستەمێك بکەن. بە کورتی شێخ عەبدولکەیم تەقەلایەکی زۆری لەناو مەنسوبەکانیان بۆ ئەوە داوە کە ئایینی ئیسلام بەشێوەی راستەقینەی خۆی و بەپێی مەبەستە ئایینییە ئەسڵەکەی لە خەڵکی بگەیەنێت و تەنها بریتی نەبێت لە نوێژو رۆژوویەکی بە رەواڵەت. هەر لەسەر ئەمەشەوە لەسەرەتا سەرچاوە دەگرێت کە چۆن بەو جۆرە گەشەی کرد و رێبازەکەی پەرەی سەند.

**٣. بایەخدان بە تەریقەتی نەقشبەندی:**

رەنگە یەکێك بێت لەوهۆیانەی کە دەوری بینیبێت لەگەشەکرنی تەریقەتەکە بەبەرگێکی نوێ لەناو کۆمەڵگە کە دووبارە گرنگییەکی رابردووی خۆی دووبارە بکاتەوە و بگاتە ئاستێکی زۆر گەورە کە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بێت.

*** کەلەپووری ئایینی حەقەکان:**

ئەوەی لێرەدا گرنگە، ئەوەیە کە حەقەکان کۆمەڵێك کەلەپووری ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییان هێنایە گۆرێ کە لەوەوپێش لەناوچەکە نامۆ بوو یان بە شێوەیەکی تر، بارێك بوو پێویستی بەوە هەبووە کە کۆمەڵگەکە زۆر بە قورسی کەوتبوو لەسەری و خۆگونجاندن لەگەڵی پێویستی بە رێنومایکردن هەبوو تاکو بەوەی بتوانن حەقەکان جێ پەنجەی خۆیان لە نێو کوردەواریدا بچەسپێنن.

لەبەر ئەوە رێنومایییە ئایینییەکانیان دەنگدانەوەیەکی باشی دروستکرد، کە هەندێك لە کۆمەڵگەکە کەوتنە بەربەرەکانی کردن لەگەڵیانداو بوختانی پرو پووچیان بۆیان رێکخست بانگەوازەکانیان بۆ: برایەتی، هەق پەرست، گیانی هاوبەش، ئابوونە، تەگبیرورا، سەربەستی ئافرەت، رەوشت، کاروباری رێکخستن، بایەخدان بە ناومال، پاك و تەمیزی، نەتەوە پەرستی، خۆشەویستی، بایەخدان بە هونەری بیناکاری..

مەبەست لە (برایەتی) ئەوەبوو هەموو هەقەکان براو خوشکییەکترین و هیچ جۆرە جیاوازییەك لەنێواندا نییەو نابێت ببێ، چ بە هۆی دەوڵەمەندی و هەژاری و چ بە هۆی رەگەزی کۆمەڵایەتییەوە.

هەر ئەم بانگێشی (برایەتی)یە وایکردبوو کە گەلێك دەوڵەمەندو هەژارو ئاغاو دەست رۆشتووی لە خۆی کۆکردبووە کە دەستیان هەبوو لە گەشەکردنی کۆمەڵەدا. کە یەکێك لەوانە مەلا سەلامە کە بەناوبانگ بوو بە (مەلا سەلامی ترێ خۆر) کە پیاوێکی بە دین و رەوشت بەرز بووە لە کەرکوکدا.

هەروەها ئەم برایەتییە رەنگدانەوەیەکی گەورەی دروست کرد لە سەر ئاستی پەیوەندی نێو خودی لادێکانی کەرکوك و دەوروبەری کە سەرنجی هەموو لایەکی راکێشا بۆ سەرنجی ئەم بۆچوونە. کومەڵەی هەقە زۆر بوو لە (هەق پەرستی)

بوونو لایەنی هەقیان دەگرت با قازانجی خۆشیانی تێدا نەبووایە.

زۆرجار ڕێکەوتووە دوو کەس لە هەقەکان لەسەر شتێك ناخۆشیان کەوتووەتە نێوان، برای هەر کام لەم دوانە ئەگەر زانیبێتی براکەی خۆی لەسەر هەق نییە، لایەنی نەگرتووە لە دژی پیاوەکەی ترو بە پێچەوانەیشەوە وا ڕێك کەوتووە پشتگیری کەسانێکیان کردووە لە دژی کەسی خۆیان کە هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵیان نەبووە، هەر لەبەر ئەوە کە لایان وابووە ئەو کەسانە لە کێشەکەیاندا لەگەڵ کەسەکانی ئەمان لەسەر هەقنو هەق بە لای ئەوانەوەیە.

ئەم (هەق پەرستی)یە لەوەدا ڕەنگی دابۆوە کە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لەنێوان کەسەکانی گوندێك لە گوندەکانی تر دروست کردبوو کە زۆر بە زەقی سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، یان دەروازەیەکی گەورەی یەکگرتنی کۆمەڵایەتی دروست دەکرد.

*** (گیانی هاوبەشی):**

واتە پەرەپێدانی گیانی هاوبەشی لە سامانو داراییدا بە گشتی، بە پێی ئەم پێرەوە هیچ کەسێکی هەقە خۆی لە ئاستی کۆمەڵەکەیدا بە خاوەن ماڵو سامانو زەوی نەزانیوەو هەر ماڵێکی بووبێ وا دانراوە هی هەموو کۆمەڵەکەیە نەك تەنها هی ئەو، بە واتایەکی تر ئەو ماڵە بە ئەمانەت دانراوە لەژێر دەستی خاوەنەکەیدا.

شێوەی ژیانی هاوبەشیو هەستییەکێتیو بێ تەماعی ناو هەقەکان وای دەردەخست کە باوەڕیان بە جۆرە سۆشیالیزمێك بووبێ، چونکە کەسیان بێ پرسی ئەوانی تریان، یان بێ بەشداریکردنی کۆمەڵ دەسکاری ماڵو سامانی خۆی نەدەکرد.

هەر ئەم گیانی هاوبەشە جۆرە پێشکەوتنێکی لە ژیانیان دروست کردبوو کە هەموو جۆرێکی ژیانیانی ڕێکخستبوو کە هەنگاوی گەورەتری دەنا وەکو ئاوەدانیو بایەخدان بە کشتوکاڵو دروستکردنی خانوو ڕێکخستنی کاروبارەکانی ژیانیان. هەقەکان باوەڕیان وابوو کە جیاوازی لەنێوان پیاوو ئافرەتدا نییەو هەموو خوشكو براییەكنو هەموو ئافرەتێك وەك هەر پیاوێك، خاوەن مافە لە بەشداریکردنی بەڕێوەبردنی کۆمەڵو خێزانو لە پرسو ڕای ناو برایەتیو لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانداو بە هیچ جۆرێ زۆر لە ئافرەت نەدەکرا لە بە شوودانیان. لە ناو هەقەکەندا (شیربایی) نەبوو، تەنها مەرجێك کە بوو، قایل بوونی کوڕو کچ بوو بە یەکتر، لەمە بەولاوە، وەك لەناو هەموو موسڵماناندا، شیرینی دەخورایەوەو ژن مارە دەبراو بە بووکی دەبراو دەگوێزرایەوە.

هەر ئەم کاریگەرییەی سەربەستی ئافرەت بوو بە چەکێکی کوشندە بە دەستی دوژمنانەوە بۆ ئەوەی گەلێك بەندو باوی نابەجێ بخەنەڕوو تا بەوەی بتوانن مەرامەکانیان بگاتە جێ. دەبینین هەر دەم هانی دەسەڵاتدارانیان داوە بەوەی کە دژیان بووەستێ بە ڕێ لادەر لە ئاینو ئیسلامیان ناوزەد کردووەو هەر ئەوەبوو ئەو کۆرەوە گەوریان کرد دژی دەسەڵاتداران لە کەرکوك.

ڕەوشت بڕیتیبووە لە کۆمەڵە ئامۆژگارییەك ئەبوو هەموو بێ جیاوازی پێڕەویی لێبکەنو هەر کەسێ پێڕەویی لێ نەکردایە یان بە پێچەوانەیەوە بجوولایەتەوە پێیان ئەوت (بێ ڕەوشت) و بە گوێرەی بێ ڕەوشتییەکەی ئەبوو هەندێ پارەبدا یا بۆ ماوەیەك (تەجمید) بکرێ یا ئەرکێکی بەسەردا بدرێ.

کە نموونەی ئەو جۆرە ڕەوشتانە:-

دەستو زمان پاکیو دوورکەوتنەوە لە دزیو درۆزنیو بووختانو دووزمانی، پاكو خاوێنیو پاراستنی لەش ساغی پێڕەویی فەرمانی ناو کۆمەڵو دەرنەچوون لە ڕیزی برایەتی وەك خۆیان ئەیان وت.

**٨. کاکەیی - ئەهلی هەق - یارسان:**

کاکەییەکانیش خاوەنی هەڵگری ئایینێکی کۆنی ناو کۆمەڵگەی کوردەوارین کە بەرەگی مێژوودا ڕۆچووەتە خوارەوەو پاشماوەی ئەو ئایینانەن کە لەپێش ئیسلام لە کوردستان برەوی هەبوو هەر بۆیە دابونەریتو ڕێوڕەسمی سرووتە ئایینییەکانو بۆنە دینییەکانیان گواهی ئەو ڕاستیەن کە تێك هەڵکێشی پاشماوەیەکی زۆر قووڵی شارستانی کوردستانن.

کاکەییو ئەهلی هەقو یارسان هەریەکەیان کۆمەڵێك ناون کە ئاماژە بەو ئایینە کۆنە دەکەنو هەریەکەیان هێمای قۆناغێکە کە ناوەکەی بە سەردا سەپێنراوەو لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامیش کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئەو ئایینەو گەلێك دابونەریتو شارستانی ئایینی لەدەستداوە کاکەیی وەکو ئایینێك بەگەلێك ناوچەی کوردستاندا بڵاوبووەتەوەو ناوچەکانی مەندەلیو خانەقینو هەڵەبجەو سنەو کرماشانو قەسری شیرین، تەوێڵەو بیارەو هەورامانو موسڵو کەرکوك بەشێکن لەو ناوچانەی کاکەیی بەشێوەیەکی بەرچاو تیایاندا بڵاوبوونەتەوە کەرکوك یەکێکە لەو ناوچانەی کە شوێنێکی بەرچاوی بڵاوبوونەوەی کاکەییەکانەو خورماتوو و داقوقو ناوشاری کەرکوك شوێنێکی بەر چاوی بڵاوبوونەوەی کاکەین، دابونەریتی کاکەییەکانی کەرکوك هەڵگری دابونەریتێکی ڕەسەنی کاکەییو لەگەڵ ئایینەکانی تری نێو کەرکوك جۆرە هاوبەشیو تێکەڵ بوونێکی سرووتە ئایینییەکانی تێدا بەرچاو دەکەوێت کە هەڵگری ماوەیەکی دوورو درێژی پێکەوە ژیانییەکترییە، هەر لەکەرکوکداو لەدەوروبەری گەلێك نزارگەو مەرقەدی پیرۆزی کاکەیی هەیە کە نموونەیان (ئیمام ئەحمەدە) لەکەرکوك کە کاکەییەکان لە بۆنەو مەراسیمەکانیاندا زیارەتی دەکەنو بە شوێنێکی پیرۆزی کاکەیی دادەنرێت. گەلێك شوێنی تریان هەیە لەناوچەکانی داقوقو خورماتوو و کفری کە هەڵگری دابونەریتی کاکەییەکانن.

"ئیسحاق سوڵتان (١٣١٦ - ١٣٩٤) کوڕی شێخ عیسای کوڕی بابا عەلی هەمدانییە پیاو چاكو دامەزرێنەری ڕێبازی (ئەهلی هەق - هەقە کاکەیی)یە، کە ڕێبازێکی سۆفیگەرییە لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەری ناسراوی کورد، لەبەرزنجە لەدایك بووە. خوێندنو پێگەیشتنی هەر لە بەرزنجە بووە. دواجار لەجێگای باوکی دانشیتووەو دەستی کردووە

بە ئیرشاد، دوای ئەوە چووەتە دێی (پردێوەر)ی ناوچەی هەورامان‌و دەستی کردووە بەدامەزراندنی ڕێبازەکەی کە ڕێبازی (هەقە - کاکەیی)یە ئیتر ژیانی بە ئیرشادو شێخایەتی‌و بڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەی بردووەتە سەر، خەڵکی ناوچەکەش لەبەر گەورەیی‌و ڕێز لێگرتنی پایەو مەقامی ئایینی‌و ناز ناوی (سوڵتان، مەولا، شا - کاکە)یان بە بەردابڕیوە، وەك (سوڵتان ئیسحاق - شا سەهاك) حەوت کوڕی بووە، هەموویان بوونە پیری تەریقەت‌و بەرامبەر بە ناوبانگی کاکەیی ناسراون.

* دابونەریتی ئایینی کاکەییەکانی کەرکوك:

١. دنیاو کۆمەڵگەیەکی داخراو:
کاکەییەکانی کەرکوك لەبەر ئەوەی لەژینگەیەکی تایبەتی دەژین بۆیە دەبینین کاریگەرییە مێژووییەکان‌و سیاسەتی حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی بەسەرەوە دیارەو کۆمەڵگە ئایینییەکەیانی بەرەو داخران‌و تەم‌و مژاوی بردووەو وایکردووە کە تێکەڵ بوونیان لەگەڵ دەوروبەریاندا زۆر سنووردارەو لەچوار چێوەی دابوونەریتی ئایینی خۆیان خول دەخواتەوە کە ئەمە لەلایەکەوە باشی دابونەریتی‌و ئایینەکەی پاراستووە، لەلایەکی ترەوە بە خراپ کەوتووەتەوە کە کۆمەڵگەکەیانی لەسەر بنەما ئایینیەکەیان دابەش کردووە کە دەرچوون لێی زۆر بەزەحمەت دەکەوێتەوەو لادان لێی چینەکانی نێو کۆمەڵەکەیان بەرەو داڕووخان دەبات، بۆیە زۆربەی کاکەییەکان پابەندی ڕێنومایە ئایینییەکانی کۆمەڵگەکەیانن.

٢. سەر ڕاستی‌و درۆنەکردن:
ئەوەی لە کاکەییەکانی کەرکوك دەبینرێت سەر ڕاستی‌و درۆنەکردن لە ژیانی ڕۆژانەیان، هەڵسووکەوتیان لەگەڵ چین‌و توێژەکانی شارەکە لە چوارچێوەیەکی ئایینی‌و برایەتی‌و پێکەوە ژیان خول دەخوات، بۆیە دەبینین ڕێنومایەکانیان ڕەنگدانەوەی ڕەوشتی ڕۆژانەیانن.

٣. پاراستی زمانی ماچۆیی:
تاکو ئێستاکە کاکەییەکان خاوەنی کەلەپورێکی دەوڵەمەندی زمانی ماچۆیین‌و لەماڵ‌و جێگا تایبەتی‌و گشتییەکانیان قسەی پێدەکەن‌و هەر ئەم پاراستنی زمانە وایکردووە کە کەلەپورێکی گەورەی ناوچەکە بپارێزێت‌و تاکو ئێستاکە ئەو شارستانییە پاشماوەکانی زۆر بەڕوونی لە کەلەپوری کەرکوکدا دیارەو بەرچاو دەکەوێت.

٤. هێشتنەوەی سمێڵ:
ئەوەی کە کاکەیی‌و کاکەییەکانی کەرکوکی پێ دەناسرێتەوە، هێشتنەوەی سمێڵ‌و پیرۆزی لای ئایینەکەیان‌و بایەخ دان‌و بەگرنگی وەرگرتن لەلایانەوە.

٥. ئاهەنگ‌و بۆنەو سرووتی تایبەتی:
تاکو ئێستا کاکەییەکان بایەخ بە ئاهەنگە ئایینی‌و سرووتەکانیان دەدەن‌و لە گەڵێك بۆنەدا کەرەستەی مۆسیقی بەکار دەهێنن وەکو دەف‌و ساز.
هەر ئەم ئاهەنگ‌و بۆنانە پاراستنێکی ئایینی گەورەیان دروست کردووەو بایەخی خۆی هەیە لەبەردەوامی شاراوەیی ئایینەکەو تەنها لایەنگرانی سەر بە ئایینەکە دەرکی پێ دەکەن.

٦. ئاربووکردن‌و یارمەتی یەکتری:
کاکەییەکانی کەرکوك لە نێو خۆیاندا ئاربوو کۆمەکی یەکتری دەکەن لە شایی‌و ئاهەنگ‌و لەپرسەو لێ قەوماندا‌و دەستییەکتری دەگرن‌و نایەڵن هەژاریان تێدا دەربکەوێت.

* سەرچاوەكان:-

- گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٣)ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٨٣، لاپەرە (١٣٥)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی:- (من مواقع الاثرية في كوردستان بەردە بەلكە)، لە نووسینی (كەمال نوری مەعروف).
- گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی دووەم ١٩٨٣، لاپەرە (١٤٧)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی:- (من مواقع الاثرية في كوردستان كەریم شایەر)، لە نووسینی (كەمال نوری مەعروف).
- (مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الوجيز في تاريخ حضارة وادي الرافدين)، بەشییەكەم، تاها باقر، بلاوكراوەكانی (دار البيان)، چاپییەكەم، ساڵی ١٩٧٣ چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا.. لاپەرەی (١٩٩).
- (حضارة العراق)، بەرگی یەكەم، لاپەرە (١٤٥ تا ١٤٦).
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥ و ٥٦)، لاپەرە (٣٦)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی (یەكەمین لانكەی مرۆڤایەتی) لەنووسینی (رەزا شوان).
- (حضارة العراق)، بەرگی یەكەم، لاپەرە (١٤٧).
- (ئاین و باوەر لە كوردستاندا)، كەریم زەند، چاپخانەی سلێمانی، ١٩٧١.
- (ئینسایكلۆپیدیای گشتی)، یاسین سابیر ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- گۆڤاری (كەركوك)، (بابیەو بابەكییە)، هاشم عاسی كاكەیی.
- گۆڤاری (الف باء)، ژمارەیەكی تایبەت بە مەندائی.
- (شوراتەكان)، موسلح جەلالی، دەزگاری رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی.
- (گەرانەوەیەك بۆ سەرەتاكانی ئیسلام)، زەبیحوڵلای مەنسوری، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- لێكۆڵینەوەیەكی زمانەوانی دەربارەی مێژووی ولاتی كوردەواری، د. جەمال رەشید، دەزگای رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی، بەغدا، ١٩٨٨.
- ئاین و باوەر لە كوردستاندا، گەریدە كەریم زەند.
- (ملامح من التاريخ القديم ليهود العراق)، د. ئەحمەد سوسە، (مركز الدراسات الفلسطينية)، زانكۆی بەغدا، چاپخانەی (اسعد)، بەغدا، چاپییەكەم، ١٩٧٨.
- (تأريخ العراق السياسي الحديث)، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، بەشی دووەم، چاپی حەوتەم.
- (تأريخ الوزارات العراقية)، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، بەشییەكەم.
- (اربيل في ادوارها التأريخية، دراسة تأريخية عامة لأربيل وانحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى)، زوبێر بیلال ئیسماعیل، چاپخانەی (النعمان)، نەجەف، ١٩٧١.
- (دراسات كردية حول بلاد سوبارتو)، د. جەمال رەشید.
- (تأريخ الكنيسة السريانيية الشرقية)، الأب البير ابونا، بەشییەكەم.
- (شهداء المشرق)، الأب البير أبونا، بەشییەكەم.
- (تاريخ ابرشية الموصل السريانيية)، صليبا شەمعون، مطران الموصل وتوابعها لسريان الارثودوكسي، چاپخانەی (شفيق)، بەغدا، ١٩٨٤.
- (دليل الجمهورية العراقية).
- (جغرافية العراق الثانوية)، تاها هاشمی، چاپخانەی (السلام)، بەغدا.
- (المنجد، معجم مدرس للغة العربية)، لویس مەعلوف، چاپی دوانزەهوم، نیسان، ١٩٥١، چاپخانەی (الكاثوليكية)، بەیروت.
- (مجمع الكنائس الشرقية، توجية لتطبيق المبادئ الليترجية الواردة في (مجموعة قوانين الكنائس الشرقية)، منشورات اللجنة الأسقفية لوسائل الإعلام، جل الديب- لوبنان.
- ( القاموس العلمي، عربي، كوردي)، بەشییەكەم، كەمال جەلال غەریب، چاپییەكەم، ١٩٧٤، چاپخانەی (كامران)، سلێمانی.
- (الفن في العراق القديم)، ئەنتوان مورتگارت، وەرگێرانی: عیسا سلێمان، سەلیم تاها تكریتی، چاپخانەی (أديب بغداديه)، بەغداد، ١٩٧٥.
- (اثار بلاد الرافدين)، وەرگێرانی: د. سامی سەعید ئەلئەحمەدی، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٠.
- (كنيسة المشرق، الفجر الأصيل)، الأب دكتۆر یوسف حبی، بەغداد ١٩٨٩، چاپخانەی ئۆفسێتی (المشرق).
- (الكشاف الاثري في العراق)، د. قەحتان رەشید ساڵح.
- (حضارة العراق)، كۆمەڵێك مێژوونووس، بەرگی سێیەم.
- گۆڤاری (الثقافية)، ژمارە (٢٤٠)، زانكۆی ئوردن.
- گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٨٩- ٩٠)، ١٩٩٥.
- گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٩١- ٩٢)، ساڵی بیست و سێ، ساڵی ١٩٩٥.
- گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (١٠٧- ١٠٨)، ساڵی بیست و حەوت، ساڵی ١٩٩٩.
- گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٥٣- ٥٤)، ١٩٨٦.
- گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (١١١- ١١٢)، ساڵی بیست و هەشت، ساڵی ٢٠٠٠.
- (گۆڤاری بين النهرين)، ژمارە (١١٣- ١١٤)، ساڵی بیست و نۆ، ساڵی ٢٠٠١.
- گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٢٧)، ساڵی حەوتەم، ساڵی ١٩٧٩.
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢٤٦).
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٣٥٩).
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢٤٧).
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٣٦٠).
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢١٨- ٢١٩).
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢٢٠)، ساڵی بیست و دوو، ١٩٨٦.
- گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢١٦).
- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە (٧- ٨)، ١٩٨١.

- گۆڤاری (الاخـاء)، ژمـاره (٢- ٣)، ساڵی بیست و دوو، ١٩٨٢.
- گۆڤاری (الاخاء)، ژماره (١٠)، ساڵی ١٩٨٣.
- گۆڤاری (الفنون)، ژماره (٤٤)، ١٨ی حوزیران، ١٩٧٩.
- گۆڤاری (نجم المشرق)، ژماره ٢٧، ساڵی حەوتەم، ٢٠٠١.
- گۆڤاری (سومر)، بەرگی یەکەم، جلدی ٣٣، ١٩٧٧.
- گۆڤاری (سومر)، بەرگی یەکەم دووەم، جلدی دوانزه، ١٩٥٦.
- گۆڤاری (پەیڤین)، ژماره ١٠، ساڵی ٢٠٠٠.

## * کەرکوك و ئایینی مانی:-

د. کەیوان ئازاد ئەنوەر

### * مانی و پەیامەکەی لە کەرکوك:

(مانی) کێ بوو:

(مانی) کەسایەتییەکی ئایینی بوو لە سەرەتای سەدەی سێیەمی زایینی، کە بنەماکانی ئایین و فیکرێکی نوێی خستەڕوو. ئەو سەربارێ ئەوەی ململانێی لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای ئیمپراتۆرێتی ساسانییدا کرد، کە (زەردەشتی) بوو، ململانێشی لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای ئیمپراتۆرێتی بێزەنتی کرد، کە (مەسیحی) بوو. (مانی کوڕی پاتك کوڕی ئابراسام)، یەکێك بوو لە ئەندامانی بنەماڵەی ئەشکانی[1]. باوکی مانی (پاتکـpatic) یەکێك بوو لە میرەکانی دەوڵەتی (ئەرساسید)ی هەرێمی ئەرمەنستان[2].

(مانی) لە گوندی (مەردینۆ)ی کەناری چەپی ڕووباری دیجلە لەدایکبووە[3]. لەو گوندەشەوە سەرەتاکانی تەمەنی بەسەربرد.

سەبارەت بە ساڵی لە دایکبوونیشی بیروڕای جیاواز هەیە، بەڵام بە زۆرێك لە تۆمارە مێژووییەکان ئەو مێژووە بۆ (١٤)ی نیسانی ساڵی (٢١٦)ی زاینیی دەگێڕنەوە[4]. ئەو جگە لەوەی لە نێو خێزانێکی سەر بە بنەماڵەی ئەشکانی فەرمانڕەوا و لە نێو کۆمەڵێکی ئایینی دا لەدایکبوو، لەگەڵ چەندین کۆمەڵی جیاوازی وەك (جوو، زەردەشتی، مەسیحی، بەرگ سپییەکان) و دەیان کۆمەڵی تردا درێژەی بە ژیاندا. هەریەك لەو کۆمەڵانەش خاوەنی کتێب و بنەما و یاسا و داب ونەریتی تایبەت بە خۆیان بوون. هەموو ئەوانەش کاریگەری تایبەتیان لەسەر پەروەردە بوون و فیکری مانی دروستکردو ئاسۆی بیریان فراوانکردو هانیان دا ئایینەکانی سەردەمی خۆی بخوێنێتەوە[5].

سەرەتاکانی تەمەنیشی و تا شەش ساڵی (٢١٦-٢٢٢ز) لە گوندی (مەردینۆ) بەسەر برد. هەر لەو گوندەو لەگەڵ باوکیدا تێکەڵاو بە کۆمەڵی بەرگ سپییەکان بوو. ئەو کۆمەڵەی کاریگەرییان لە سەر باوکی دروستکرد. لە تەمەنی شەش ساڵیشەوە، تا ئەو کاتەی یەکەم سروشی وەرگرت (٢٢٢-٢٢٩ز) لە نێو کۆمەڵی (دیسانی)دا بووە و لە نێو ئەو کۆمەڵەدا ژیا[6]. ئەوەش دوای کۆچکردنی خێزانەکەی بۆ ناوچە دەشتاییەکانی (میسان و بەتایح) و نیشتەجێبوونیان لە گوندێکی نزیك (میسان)[7]. لەوێش شارەزای ئەو کۆمەڵەو بیروباوەڕەکانیان بوو، کاریگەرییان لەسەر دروستکرد. لەوماوەیەدا سەردانی شاری (بابل)ی کرد ئەو شارەی یەکێك بوو لە مەڵبەندە گرنگەکانی زانست و زانیاریی جیهانی کۆن[8]. ئەمەو سەردانی ناوچەکانی کوردستان و ئەرمەنستانی کرد[9].

دوای ئەوەشی (ئەردەشێری کوڕی پاپەکان) ئیمپراتۆرێتی ساسانی دامەزراند، بە هۆی بەرەسمی ناسینی ئایینی زەردەشتییەوە دەسەڵاتی تەواوی بە موغەکان داو داوای لێکردن هەوڵی بڵاوکردنەوەو بەڕێوەبردنی کاروباری ئایینی خەڵکی بدەن[10].

(مانی کوڕی پاتك)یش لە ماوەی (سێ) ساڵی یەکەمی دەسەڵاتی ئەردەشێردا (٢٢٦-٢٢٩ز) بۆ ئەوەی وەك ئەندامێکی بنەماڵەی پێشوو نەکەوێتە بەر دەست ساسانییەکان و نەناسرێتەوە، خۆی لە ناو کۆمەڵی بەرگ سپییەکاندا شاردەوە[11]. کاتێکیش گەورە بوو، بۆ زیادکردنی زانیارییەکانی و دوورکەوتنەوە لە بەرپرسانی ساسانی گەشتێکی بۆ ئەرمەنستان دەستپێکرد. لەو گەشتەشیدا بە شارەکانی (کرخا-کەرکوك) و (ئەربێلا-هەولێر)دا تێپەڕی[12].

لە سەردانی شاری (کرخا-کەرکوك)یشدا چەند ڕۆژێك مایەوەو هەوڵی پەیداکردنی پەیڕەوانی بۆ پەیامەکەیدا، بەڵام سەرچاوەکان باس لە شێوازی سەردانەکەی و ماوەی مانەوەی و سەرکەوتنی لە گەشتەکەیدا نەکردووە. دوای مردنی ئەردەشێر لە کۆتایی ساڵی (٢٤١ز)[13]، شاپووری کوڕی، کە بە (شاپووری یەکەم) ناسرا بوو، بووە دووەمین ئیمپراتۆری ساسانی. کاتێکیش (مانی) هەواڵی مردنی (ئەردەشێر)ی بیست، کۆتایی بە گەشتەکەی هێناو بۆ نێو سنووری ئیمپراتۆرێتی ساسانی گەڕایەوە[14]. لەو گەڕانەوەشیدا توانی بگاتە کۆشکی شاهانەو بە دیداری شاپوور بگات. ئەو چاوپێکەوتنەش ڕۆژی (چوارشەممە) یەکەم ڕۆژی مانگی (نەورۆز) بەرامبەر بە (٢١)ی ئاداری ساڵی (٢٤٢ز) لە شاری (بلابات)، لە هەرێمی خوزستان بەڕێوە چوو[15].

ئیمپراتۆری ساسانیش لەو مەراسیمە گەورەیەدا پێشوازی لێکرد[16]. دیدارەکەش سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا. سەرەتا قەناعەتی بە شاپوور کردو باوەڕی پێهێنا[17]. دواتر قەناعەتی بە ژمارەیەك سەرکردەی ساسانی هێنا[18]. لەگەڵ ئەوانەشدا لە سەرتاسەری ئیمپراتۆرەکەیدا ڕێگای بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی پێدا[19]. یەکێکیش لەو ناوچانە شاری کەرکوك بوو. لە بەرامبەر ئەو ئازادییەشدا بواری پێدرا لە تەیسەفون و شارە گەورەکانی ژێر دەسەڵاتیدا پەرەستگایان بۆ دروستبکات. دوای (دە) ساڵ لە باوەڕهێنانی ئیمپراتۆرێتی ساسانی بەو ئایینە لە ساڵی (٢٥٢ز) لێی هەڵگەڕایەوە[20]. (مانی)ش لەژێر فشارێکی سەختدا بە ناچاری ئیمپراتۆرێتی ساسانی بەجێهێشت[21].

سەرەتاش بەرەو سنوورەکانی باکووری خۆرهەڵاتی ئەو دەسەڵاتە ڕۆیشت و یەکێك لەو شارانەشی سەردانی کرد شاری (کرخا) بوو[22]. دواجار لە سەردەمی (بارامییەکەم) چوارەمین ئیمپراتۆری ساسانی[23] فرمانی دەستگیرکردنی (مانی)و کوشتنیدا[24]. ئەوە بوو لە دەستگیرکردن و دواتر دادگایکردنی لەنێوان ڕۆژانی (٣١)ی کانوونی دووهەم تا (٢٦)ی شوباتی ساڵی (٢٧٧ز ) زیندانیکراو لە پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دووشەممەدا لەژێر ئەشکەنجەدا کۆچی دوایی کرد[25]. ئەوەش دوای ئەوەی پێستەکەیان گووری و جەستەکەیان پارچەپارچە کردو کەللە سەرەکەیان بە دەروازەی شاری جوندیشاپوورەوە هەڵواسی[26]. دواتر پەیڕەوانی پارچە سووتاوەکانی جەستەکەیان و خۆڵە مێشەکەیان کۆکردەوەو لە شاری (تەیسەفۆن) بە خاکیان

سپارد[٢٧]. بەو شێوازە کۆتایی بە تەمەنی ئەو ڕابەرە ئایینیە هات، کە لە ماوەی (شەستو یەك) ساڵی تەمەنیو نزیکەی (سیو شەش) ساڵی بانگەوازی پەیامبەرایەتیدا ململانێی سەردەمو ئایینو بیروباوەڕەکانی کرد.

**مانی لە کەرکەوك:** ئایینی مانی بە شێوازێکی خێراو بەربڵاو بە کوردستاندا بڵاوبوویەوە، یەکێکیش لەو شارانەی کوردستانیش لەو کاتەدا شاری (کەرکوك) بوو. ئەوەش بەم بەڵگانە:

**یەکەم:** نزیکی مەڵبەندی ئایینەکە، کە شاری بابلو دەوروبەری بوو لە ناوچە کورد نشینەکانو لەوانەش (کەرکوك).

**دووەم:** پشتیوانیکردنی (شاپووری یەکەمی) دووەمین دەسەڵاتداری ساسانی لە (مانی) پەیامبەری (مانیزم)و باوەڕ هێنانیو ئاسانکاری بۆ هەرچی زووتری بڵاوبوونەوەی بەسەرتاسەری ئیمپراتۆریەتەکەدا[٢٨]، هۆکارێکی گەورەی گەیاندنی بوو بە کوردستان، چونکە بەشێکی گەورەی ناوچەکانی باکوورو خۆرهەڵاتو باشووری لەژێر دەسەڵاتی ئەو فەرمانرەوا ساسانییەدا بوو[٢٩].

**سێیەم:** گەشتە سەرکەوتووەکانی (مانی)و خوێندکارەکانی بۆ ناوچە کوردنشینەکان بە مەبەستی بڵاوکردنەوەو پەیداکردنی پەیرەوان بۆی، ڕۆڵی خۆی لەو بوارەدا بینی. لەم بوارەدا سەرەڕای گەشتەکانی خۆی، خوێندکارەکانیشی بۆ ناوچەکانی (ئەدیابێنیو کرخاو شامو خۆراسان) ڕاسپارد، کە ئەوەش ڕۆڵیان لە بڵاوبوونەوەی مانیزم لە کوردستاندا بینی.

**چوارەم:** ئایینی ڕەسمی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان زەردەشتی بوو. ئەویش لەبەر سەختیو قورسی بنەماو ئەرکە ئایینییەکانیو کردەوە خراپەکانی موغەکان لەگەڵ خەڵکیدا ئایینی زەردەشتییان لە بەرچاوو لە دڵو دەروونی کۆمەڵانی خەڵکیدا ناشیرین کردبوو، بۆیە بەشێکی ناوچە کوردنشینەکان بۆ هەلێك دەگەڕان واز لەو ئایینە بهێننو ڕووبکەنە بیروباوەڕێکی تر. لەم بوارەدا مانیزم بە هۆی بوونی پەیامبەرەکەیو خوێندکارانیو پشتیوانی سیاسی ساسانییەکان بۆی شیاوترین بیروباوەڕی بێ کێشەی سەردەمەکە بوو.

**پێنجەم:** بانگەشەکانی (مانی) لە ناوچە کوردنشینەکان بەوەی پەیامەکەی ڕاسترینو پاکترین بیروباوەڕەکانی بەر لە خۆیو سەردەمەکەی بوو[٣٠]. کاریگەری خۆی لە باوەڕی کۆمەڵی کوردەواریدا دروستکردو زیاتر باوەڕ پێهێنانیان بۆی کردە واقیع.

**شەشەم:** نزیکی بنەماو ئەرکەکانی مانیزم لەو ئایینو بیروباوەڕانەی پێشتر لە کوردستاندا بڵاو بووبوونەوە، یارمەتی بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینەی دا[٣١].

لەم بوارەدا (میهردادی ئیزدی)ش ڕای وایە ئایینی مانی دوای ئایینەکانی زەردەشتیو جوو بەر لە مەسیحییەت لە کوردستاندا بڵاوبووەتەوەو کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەی کوردی دروستکردووە، یەکێك لەو ناوچانەش کەرکوك بووە[٣٢].

لە ڕووی ئەو ڕاستییە مێژووییانەوە دەگەینە ئەوەی، کە ئەم ئایینە لە سەرەتاکانی دەرکەوتنی گەیشتووەتە ناوچە کوردنشینەکانو کاری لە کۆمەڵگەی کوردی کردووە. ئەوەش بۆ سەرەتای ساڵی (٢٤١ز) دەگەڕێتەوە، کە (مانی) دوای وەرگرتنی دووەمین سرووش دەستی دایە بانگەوازەکەی. زۆریش پێدەچێت سەرەتای بڵاوبوونەوەی لە مەڵبەندە کوردنشینەکاندا بۆ ناوچەکانی (پارسو خوزستانو پاشان لورستانو شارەزوورو کرخاو ئێربلو جزیرەو نوسیبین) بگەڕێتەوە. ئەوەش دوای ئەوەی مانی لە ساڵی (٢٤١ز) ی کۆتایی بە گەشتەکەی هێناو لە ڕێگای دەریاوە بۆ نێو سنووری ئیمپراتۆرێتی ساسانی گەڕایەوە. بە پیادەش بە مەبەستی پەیداکردنی پەیڕەوانی نوێ بۆ ئایینەکەی بە ناوچەکانی پارسو خوزستانو میساندا تێپەڕی[٣٣]. بەو ناوچانەی چەندین مەڵبەندی کوردنشینی تێدا بوو[٣٤]. لەو گەشتەییو لە گەڕانەوەی دا چەندین کەسایەتیو خەڵکانی ئەو ناوچانە باوەڕیان پێهێنا[٣٥]. زۆریش پێدەچێت کوردەکانی ئەو مەڵبەندانە (مانی)یان بینیبێتو بە ئایینەکە ئاشنا بووبنو هەندێکیان باوەڕشیان پێهێنابێت.

بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە چەند ناوچەیەکی کوردستانی گرتەوە. (مانی) لە گەشتەکەیداو لە بەهارو هاوینی ساڵی (٢٤٢ز) سەردانی چەندین گوندو شاری کوردنشینی کرد. لەوانە سەردانی (هەولێر)ی کردو (سێ) ڕۆژ لێی مایەوە[٣٦]. ئاسایی دەبێت لەو گەشتەیدا لە (بابل)ەوە بۆ (هەولێر) بە (کەرکوك)دا تێپەڕ بووبێتو پەیڕەوانی بۆ خۆی دروستکردبێت. هەر لەو سەردانەدا چووە شارەکانی (ڕوهاو نوسەیبین)و باوەڕی بەشێکی دانیشتووانەکانی بە دەست هێنا[٣٧]. چەندین نامەی بۆ خوێندکارو پەیڕەوانیشی لەوشارانە نووسیو بە درێژایی تەمەنی چاودێریکردن[٣٨]. ئەمەو زۆر پێدەچێت بازرگانو پیشەوەرو ڕۆشنبیرانی شارەکانی (کەرکوكو هەولێرو ڕوهاو نوسیبینو هەمەدانو کەنگاوەرو حولوان) لە پێشەنگی یەکەمین باوەڕهێنەرانی مانیزم بووبنو پشتیوانیان لێکردبێت.

کاتێکیش لە ساڵی (٢٥٢ز) لەلایەن شاپوورەوە لە (مانی) دراو ئایینەکەی قەدەغە کرا[٣٩]. ناوچە کوردنشینەکانو لەوانەش (کەرکوك) بوونە یەکەمین وێستگەی داڵدەدانی (مانی) و دەربازکردنی بوون لە دەست بەرپرسانی ساسانی[٤٠]. لە لایەکی ترەوە ئەو فشارو چاودێریکردنو ڕاوەدونانە مانییەکانی کوردستانیشی گرتەوە، بۆیە بڵاوبوونەوەی ئایینەکە دوای ساڵی (٢٥٢ز) لەو شارە سنووردار کراو باوەڕهێنان پێی بە قۆناغی نهێنیدا تێپەڕی، بۆیە لەو سەردەمە بەدواوە جگە لە سەردەمی (هورموزی یەکەم ٢٧٢-٢٧٤ز) نەبێت، کە ئازادی بڵاوبوونەوەی ئەو پەیامەی دا فشارێکی توند کەوتەسەر باوەڕدارەکانی.

*** پەراوێزو سەرچاوەکان:**

١. بڕوانە:
- أبو الفرج محمد بن أبي يعقوب ابن النديم، (الفهرست)، الطبعة الأولى، كتێبخانة الخياط-بيروت، لبنان، ١٩٦٤م، الصفحة ٣٢٧.
- عبد الحسين زرين كوب، (تاريخ مردم ايران- ايران قبل از إسلام- كشمكش باقدرتها)، ضاث اول، مؤسسه انتشارات امير كبير- چاپخانه سپهر، تهران، ايران، ١٣٧٤ه.ش، ٤٣٤/١.

٢. گۆڤاری (لالش)، ژمارە (٤)، چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر، هەرێمی کوردستانی عێراق، ١٩٩٤، لاپەڕە ٩، امیل: س.پ، لل١٣- ١٤، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (ئۆلامانی–Manichaeism، وێنگەهاوی یائێرانی)، پۆلێك پسپۆر، وەرگێرانی: د. دەروێش شەرۆ.

٣. بڕوانە:
- أبي الريحان محمد بن احمد البيروني، (الأثار الباقية عن القرون الخالية)، اعتني بنشره: ادوارد سخاو، الطبعة الأولى، طبعة ليبزك، هولندا، ١٩٢٣م، الصفحة ٢٠٨.
- د. جهانگير اوشيدرى، دانشنامه مەزديسنا-واژەنامه توچيحى ايين زرتشت، چاپ اول، چاپخانەی سعدی-تهران، ايران، ١٣٧٧ه.ش، لاپەڕە ٤٢٣.

٤. اوشیدری: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٢١.

٥. ارثر كريستنسن، (ايران في عهد الساسانيين)، ترجمة: يحيى الخشاب، مراجعة: عبدالوهاب عزام ، الطبعة الأولى، مطبعة لجنة التاليف والترجمة والنشر- القاهرة، مصر، ١٩٥٧م، الصفحة ١٧١.

٦. د. محەمەد جواد مشوكور، (خلاصه اديان در تاريخ دينهاى بزرگ)، چاپ ششم، انتشارات شرق، چاپخانه نادر- تهران، ايران، ١٣٧٧ه.ش، لاپەڕە (٢٣٢-٢٣٦).

٧. بڕوانە:
- ابن النديم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٢٨.
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧١.
- پۆلێك پسپۆر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٩.

٨. براونە:
- عباس قدیانی، (تاریخ ادیان ومذاهب در ایران)، چاپ اول، انتشارات انیس-تهران، ایران، ١٣٧٤ه.ش، لاپەڕە ١٧٤.
- مشوکور، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٣٧.

٩. احمد بن ابي يعقوب، (تأريخ اليعقوبي)، الطبعة الأولى، مطبعة الغري-النجف، العراق، ١٣٥٨ه، ١٢٩/١.

١٠. بڕوانە:
- ابو الحسن علي بن الحسين المسعودي، (مروج الذهب والمعادن الجوهر)، تحقيق: محي الدين عبدالحميد، الطبعة الاولى، دار الكتب العلمية-بيروت، لبنان، ١٩٩٧م، ٢٣٠/١.
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٦.

١١. بڕوانە:
- ابن الندیم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٢٨.
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧٠.

١٢. ويدن گرن، (مانى وتعليمات او)، ترجمه: نزهت صفاى اصفهانى، چاپ اول، چاپ نوبهار-تهران، ايران، ١٣٧٧ه.ش، لاپەڕە ٣٦.

١٣. بڕوانە:
- ابو الفداء، (الاخبار القويمة عن الحوادث القديمة)، الطبعة الأولى، مطبعة محەمەد مطبعة-القاهرة، مصر، ١٩١٩م، لاپەڕە ١٧٣.
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٦٩.

١٤. کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧١.

١٥. بڕوانە:
- کریستنسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧١-١٧٢.
- ن. و. پیکولوسکایاو دیگران: ایران از دوران باستان تاپایان سده هجدهم، ترجمه: کریم کشاورز، چاپ پنجم، انتشارات پیام، چاپخانه مروی- تهران، ١٣٦٣ه.ش، لاپەڕە ٧٢.

١٦. بڕوانە:
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧١.
- ڕشید عەبدولڕەحمان، (مێژووی زاگرۆس)، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- هەولێر، هەرێمی کوردستانی عێراق، ٢٠٠١ز، لاپەڕە ٣٣٥.

١٧. ابي العباس احمد بن يوسف بن احمد الدمشقي القرماني، (أخبار الدول وآثار الأول في التأريخ)، الطبعة الأولى، طبعة عالم الكتب- بيروت، لبنان، بلا، الصفحة ٣٥٤.

١٨. بارندر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٥٠.

١٩. بڕوانە:
- ابن الندیم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٢٨.
- ول ديورانت، (قصة الحضارة)، الطبعة الأولى، دار الفكر- بيروت، لبنان، ١٩٨٨م، ٢٨٧/٤.

٢٠. بڕوانە:
- اليعقوبي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٣٠/١.
- غلامرضا انصاف ثور، (تاریخ زندگی اقتصادی روستائیانو طبقات اجتماعیات ایران از دوران ماقبل تأریخ تا پایان ساسانیان)، چاپ اول، تهران، ایران، د.ج، الصفحه ٣٧٠.

٢١. بڕوانە:
- اليعقوبي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٣٠/١.
- اوشیدری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٢٣.

٢٢. بڕوانە:
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢١٥.
- اوشیدری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٢٣.

٢٣. مرچا الیاده: ایین گنوسی ومانوی، ترجمه: ابو القاسم اسماعیل پور، چاپ اول، تهران، ایران، ١٣٧٣ه.ش، الصفحه ٣٧٠.

٢٤. بڕوانە:
- اليعقوبي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٣٠/١.
- البيروني، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٠٨.
- زرين كوب، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤٧٣/١.

٢٥. بروانە:
- قدیانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧٥.
- ویدن گرن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٩.
- رشید عەبدولڕەحمان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٣٦.

٢٦. بروانە:
- الیعقوبی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٣٠/١.
- الطبري، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤٨٦/١.
- زرین کوب، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤٧٣/١.

٢٧. ویدن گرن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٩-٦٠.

٢٨. بروانە:
- الیعقوبی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١/ ١٢٩.
- القرمانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٥٤.
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٦٩-١٧٠.
- پیکولوسکایا و دیگران، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٨٥.
- زرین کوبن هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤٢٣/١.

٢٩. بروانە:
- محەمەد امین زکی، (کوردو کوردستان)، چاپی یەکەم، چاپخانەی دار السلام-بەغداد، عێراق، ١٩٣١ز، ١١٦/١-١١٧.
- د. جمال رشید احمدو د.فوزي رشید، (تأریخ الکرد القدیم)، الطبعة الأولى، مطابع دار الحکمة-اربیل، العراق، ١٩٩٠م، الصفحة ١٢٢.

٣٠. بروانە:
- کریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٨٠.
- ویدن گرن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٢.

٣١. بروانە:
- د. ڕەشاد میران، (ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا)، چاپی دووەم، بلاوکراوەکانی کتێبی سەنتەری برایەتی- ژمارە (٧)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان-هەولێر، هەرێمی کوردستانی عێراق، ٢٠٠٠ز، لاپەڕە ١٠.

32. Mehrdad ،R.Izady: (THE KURDS: ACONISE HAND BOOK) Taylor & Francis International Publishes ،Washington ،U.S.A، 1992A.C, P131.

٣٣. بروانە:
- مهرداد بهار، (ادیان اسیایی)، چاپ اول، انتشارات چشمه، چاپخانه مهدی، تهران، ایران، ١٣٥٧ ه.ش ، الصفحه ٨٢.
- حبیب الله تابانی، (وحدت قومی کردو ماد-منشا نژاد-تاریخ تمدن کردستان)، چاپ اول، نشره گستره، تهران، ایران، ١٣٨٠ه.ش، لاپەڕە ٣٣٨-٣٣٩.

٣٤. بروانە:
- ابي اسحاق ابراهیم بن محمد الفارسي الاصطخري، (المسالك والممالك)، تحقیق: د.محەمەد جابر عبدالعال الحیني، مراجعة: محەمەد شفیق غربال، الطبعة الأولى، طبعة وزارة الثقافة والأرشاد القومي-الأدارة العامة للثقافة، القاهرة، الجمهوریة العربیة المتحدة، ١٩٦١م، الصفحة (٦١-٦٥، ٧٠-٧٢).
- محەمەد امین زکی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١١٤/١-١١٦.

٣٥. بروانە:
- ابن الندیم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥.
- بهار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٨٢.
- ویدن گرن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٤-٤٥.

٣٦. ویدن گرن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٠.

٣٧. بروانە:
- ویدن گرن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٠.
- تابانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٤٧.

٣٨. بروانە:
- زرین کوب، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤٣٩/١.
- د. تقي الدباغ، (الفکر الدیني القدیم)، الطبعة الأولى، دار الشؤون الثقافیة العامة- بغداد، العراق، ١٩٩٢م، الصفحة ٢٠٢.

٣٩. بروانە:
- الیعقوبی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٢٩/١.
- غلام رضا انصاف پور: تاریخ زندگی اقتصادی روستائیان وطبقات اجتماعی ایران از دوران باستان تاپایان ساسانیان، چاپ اول، تهران، ایران، د.چ، لاپەڕە ٣٧٠.

٤٠. بروانە:
- رحیم رئیس نیا، (اذربایجان در سیر تاریخ)، چاپ اول، تهران، ایران، د.چ، ٨١٧/٢.
- تابانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٤٥

### * جولەکەکانی عێراق:-

د. کازم حەبیب
دەربارەی بوونی جولەکەکان لە عێراق، بەسێ قۆناغدا هەنگاوی ناوە لە بوونی ژیانو شارستانییان لە عێراقدا. لە قۆناغییەکەمدا کە کۆنترین ماوەیە لە کوردستاندا بۆ کاتی سەردەمی ئاشوورییەکان دەگەڕێتەوە کە وەکو بەندی بەلێشاو هێناویانن بۆ وولاتی (ئاشوور) ئەویش لە سەردەمی:- شەلمانسەری سێیەم (٨٥٩- ٨٢٤)ی پێش زایینی، تەجلات بلاشەری سێیەم (٧٤٦- ٧٢٦)ی پێش زایینی، شەلمانسەری پێنجەم (٧٢٧- ٧٢٢)ی پێش زایینی، سەرجۆنی دووەم (٧٢٢- ٧٠٥)ی پێش زایینی، سەنحاریب (٧٠٥- ٦٨١)ی پێش زایینی، ئەسەرحەدون (٦٨٠- ٦٦٩) ی پێش زایینی لە قۆناغی دووەمدا کلدانییەکان هێرشیان کردووەتە سەر ناوچەکانیانو تالأنیان کردووە.
لە قۆناغی سێیەمدا بۆ سەردەمی هاتنی ئیسلام دەگەڕێتەوە لە سەردەمی خەلیفە عومەر کوری خەتاب. بەشێوەیەکی گشتی وڵاتی نێو دوو ڕووبار، ماڵی دووەمی جوولەکەکان بووە کە وەکو ئۆرشەلیم، قودسو فەلەستینی پیرۆز بوو لایان، کە گرنگ بوو بۆ پاراستنی سرووتە ئایینیو بەرەوپێش چوونی ئەدەبو شارستانی هزریو ئایینیو رۆشنبیرییان، بۆ جولەکەکان دەورێکی بالأیان بینیوە لە پاراستنی کەلەپورو شارستانیان.

### * دابەشکردنی جوگرافی دانیشتووانی جولەکەکان
لەنێوان ساڵانی (١٩٢٠- ١٩٧٧) لە عێراق

| شار | (ساڵی ١٩٢٠) | (ساڵی ١٩٤٧) | (ساڵ ١٩٥٤) | ساڵی(١٩٧٧) |
|---|---|---|---|---|
| کەرکوك | (١٤٠٠) کەس | (٤/٠٤٢) کەس | (٥)کەس | (٦)کەس |

زۆربەی دانیشتووانی جولەکەکانی عێراق لە شارەکانی ژیاون، تەنها بەشە زۆرەکەیان لە گوندەکان ژیاون، کە تەنها کوردستان نەبێت کە رێژەیەکی زۆری جولەکە لە کشتوکاڵ کاریان کردووە.
دابەشکردنی جوولەکەکان لەنێوان شارو گوندەکان لە هەولێرو سلێمانی و کەرکوك و موسڵ
ژیانی عێراقییەکان رەنگدانەوەی خۆی بەسەر ژیانی جولەکەکان داوەتەوە و هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ موسڵمانو مەسیحیەکانو لایەنگرانی تری ئایینییەکان. تەنها جیاوازی لەنێوان ئەم پێکهاتە ئایینییانەوە ئایینزاکان لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەریەکەیان سرووتو رێورەسمی تایبەتی خۆیان هەیەو ژیانێکی خێزانی تایبەت.

| ڕەگەزی پیاو و ئافرەت | هەرێمی کوردستان و موسڵ | | ناوچەکانی تری عێراق | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| | شارستانی | گوندنشین | شارستانی | گوندنشین | |
| | ٥٢٢٢ | ١٣١٢ | ٥٢٥٦٨ | ٨٦٢ | ٥٩٩٦٤ |
| | ٥٥٢٧ | ١٣٩٣ | ٥٠٦٥٧ | ٤٥٩ | ٥٨٠٣٦ |
| کۆی گشتی | ١٠٧٤٩ | ٢٧٠٥ | ١٠٣٢٢٥ | ١٣٢١ | ١١٨٠٠٠ |

*** جوولەکە لە کۆمەڵگەی عێراقدا:-**

**د. خەیریە قاسمیە**

جوولەکە بەشێوەیەك لە عێراقدا ژیاون، وەکو دانیشتووانی بنەڕەتی، نەك وەکو لایەنگرانی دەولەتی بیانی، لە ناوچەکانی خوارووو و ناوەڕاستی عێراق بەزمانی عەرەبی و لە کوردستان بەزمانی کوردی ئاخاوتنیان کردووە، بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییان لەگەڵ هەموو عێراقییەکان باشبووە.

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ئاسان بووە جوولەکەیەك لە موسلمانێك جیابکرێتەوە، ئەویش بەو کلاوەی سەری، بەڵام لە دوای داگیرکردنی بەریتانییەکان، هەندێك لە جوولەکەکان، کلاوی ئینگلیزیان لەسەر دەکرد (Tropicalhats)، موسلمانەکان ئەم کارەیان نەدەکرد، لە ماوەی حوکمی پاشایەتی لە سەردەمی (مەلیك فەیسەڵ) زۆری جوولەکەکان (سیدارە)یان (فەیسەلییە)یان لەبەر دەکرد، کە جلووبەرگی لەبەر کردنی رۆشنبیرانی عەرەب و دەولەمەندەکانیان بووە.

لە ئەوەی کۆتایی لە جوولەکەکانی عێراق، جیاوازی لە ناونانی ناوەکانیش بزربوون، لە کاتێکدا بەشێکی کەم لە جولەکەکان پابەندی ناوی تەوراتی دەبوون، بەڵام بەشێکی زۆریان ئارەزووی ناوی عەرەبی و ئەورووپی دەبوون وەکو (فەیسەڵ، غازی، ریتشارد، مۆریس) بۆیە لە هەندێك باردا جیاوازی لە رووی ناوەوە زەحمەت بوو. وەکو زانراوە کە جوولەکان لە گەرەکی تایبەت بە خۆیان ژیاون لە شارو شارۆچکەکانی عێراق، هەروەکو لە کوردستانیش و شارەکانی بەو جۆرە، بەڵام لە دوای شەڕی جیهانییەکەم لەو قاوغەی خۆیان هاتنە دەرەوە لە گەرەکی شارەکانی (بەغدا، بەسرە هەولێر، کەرکوك، حیلە)، چوونە شوێن و گەرەك و شەقامی تر لە شارە گەورەکان، بەشێوەیەکی تر تێکەڵبوونیان لە شوێنی تر کە تەنها جوولەکەی تێدا نەدەژیا، بۆ نموونە لە ناوچەی (ئەلعەشار) و (عەمارە) کە ناوچەی جوولەکە نەبوون بڵاوبوونەوە.

هەر لە سییەکانی سەدەی بیستەم، پرۆپاگەندەی عەرەبی دژی جوولەکە بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد بەتایبەتی لە بەغدادا ئەویش بەهۆی ئەوەی کە کۆبوونەوەی ژمارەیەك رۆژنامەو ئاوارە سیاسییەکانی فەلەستین و سوریاو بیانییەکان، دەوری هەبوو لەو سیاسەتە دژەی دژ بە جولەکە، بەڵام لە شارەکانی تری عێراق بەهیچ شێوەیەك توندتیژی لەو جۆرە بەرچاو نەکەوتووە نە لە پێش ساڵی (١٩٤١) و لە دوای ئەو ساڵەوە، بەڵکو هەندێك لە گەرەکانی ئەو شارانە ئەرکی پاراستنی جوولەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو.

شیعە زۆربەی ناوچەکانی عێراق پێکدەهێنا، بێجگە لەناوچە کوردییەکان، بەڵام لە خوارووو زۆربەی سەرەکی دانیشتووان بوو، لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بەدەستی سوونەوە بوو، بەڵام پەیوەندییان لەگەڵ جوولەکە باشبوو.

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم جوولەکەکان کەوتنەداوی پیشەسازی پیشە دەستییەکان و فرۆشتنی گەرۆك، یان لە پرۆژەی بازرگانی بچووك، لە کوردستانیش لە کشتوکاڵ کاریان کردووەو کەمێکیان نەبێت لە بازرگانی دەرەکی کاریان نەکردووە.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لەنێو جوولەکەکاندا بازرگانی دەولەمەند لە شارەکانی بەغداو موسڵ و بەسرە برەوی سەند، لە هەمان کاتدا ژمارەی بازرگانیان کەم بوو.

ژمارەیەکی زۆر جولەکە لە عێراقدا بلاوبووە بەتایبەتی لە بەغدا، موسڵ، بەسرە، کەرکوك، کە هەلدەستان بەکاری ئابووری جۆراو جۆر، پەیوەندییەکی پتەویان هەبوو لە رووی بازرگانییەوە لەگەڵ هیندو ئێران، ئەم پێگەیە بوو بە هۆی گەشەکردنی کردنەوەی کەناڵی سویس لە میسر لە ساڵی (١٨٦٨)ی زایینی.

هەروەها فراوانبوونی ئەم پێگەیە لەسەرووبەندی داگیرکردنی بەریتانیا لە عێراق لەدوای شەڕی جیهانییەکەم لە ساڵی (١٩١٩) زیاتر بوو.

باری ئابووری جولەکە لە کوردستان گەشاوە نەبووە، کە زۆر بەیانی لە بارێکی هەژاری ژیاون، پیشەوەرە بە تواناکانیان لەنێویاندایە لە بواری بازرگانی و پیشەسازیدا، هەیانە کاردەکەن لە بواری: چنین، رەنگکاری، ئاڵتونچێتی، پینەدۆزی، بارهەڵگر، پێستەخۆشکردن، سەیرەفە یان ئاڵووێری پارە گۆڕین، مامۆستا، کشتوکاڵ یان کارکردن لە بواری بێستاندا، بەشێکیان لە بواری بەخێوکردنی وولاخ و کشتوکاڵی برنج و نۆك و کونجی و توتندا کاریان کردووە.

جیاوازی جوولەکە کوردەکان لەوەدا بوو کە لەشێکی توانا و بەهێزیان هەبووە، توانای ئەوەیان هەبوو کە کاری قورس بکەن، جوولەکانی کوردستان جلوبەرگیان وەکو جلوبەرگی کورد بووە، تەنها لە جلووبەرگی ئاییندا جیاوازیان هەبووە.


* سەرچاوە:-

– د.خيرية قاسمية، يهود البلاد العربية، مركز دراسات الوحدة العربية، ٢٠١٥، بيروت، لاپەرەی جۆراوجۆر.

*** بڵاوبوونەوەی تەسەوفو تەریقەتەکان لە کەرکوك:-**

لە دەمەوەختی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامو لەدوای گەشەکردنی کەوتە ژێر کاریگەریی گەلێك لە پاشماوەکانی ئایینییە کۆنەکان، کە هەندێکیان تێکەڵ بە کەلەپووری ئیسلام بوونو لە هەمان دۆخدا بووە سەرهەڵدانی گەلێك لە بیری تەسەوفو تەریقەتی ئایینی، کە هەندێکیان بەرەگێکی قووڵدا ڕۆچوونە لەسەر بیروباوەرە ئایینە کۆنەکانی کوردستان وەکو مانەوی، کاکەیی، یارسان، عەلی ئیلاهی، یەزیدی، زەردەشتی.
بڵاوبوونەوەی تەسەوفو تەریقەتەکانی لە کوردستان ڕەنگو بۆیەکی کوردستانیو ئایینی تایبەتی هەیە، کە هەڵگری گەلێك ڕەنگو بۆیە کە لە ژینگەیەکی جیاواز لە ناوچەکانی تر سەری هەڵداوە، هەر کاتێك لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت، سەرنجەکان بۆ گەلێك شت هەنگاو دەنێت کە ڕابردوویەکی دووروودرێژی هەیە. "... فەلسەفەو بیرو هزرو ئیدو هوودەی سۆفیگەری لە بنەڕەتدا عەرەبی نییەو دامەزرێنەرانی سۆفیگەری نەوەی نەتەوە نا عەرەبەکاننو لە بنەمادا لە ئایینە ئارییەکاندا هەبووەو لەو ئایینە ئارییانەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان گوازراوەتەوە بۆ ڕووبەری جوگرافیای ئیسلامیو ڕەنگو ڕووخسارێکی واشیان داوەتێ کە خەڵكو هەندێ لە شارەزاو زانایانیش بەرەوتێکی ئیسلامی بزانو پەسەندی بکەن..."[1].
"... بە دڵنیاییەوە دەیڵێمو دەیانو سەدان سەرچاوەی عەرەبیو ئەورووپایش ئەوە دەسەلمێنن کە سۆفیگەری ئیسلامی کاریگەری نا ئیسلامی زۆر لەسەر بووەو دەوری لەسەری بینیووە.."[2].
لەبەر ئەوە دەڤەرێکی وەکو کەرکوك ڕەنگدانەوەی ئەو ئایینە کۆنانەی پێوە دیارە لەسەر چوارچێوەی سۆفیگەریو لەوە دوای ئایینیش دەوری بینی لە بڵاوبوونەوەی تەریقەتەکاندا.
لەسەرەتادا ئەم تەریقەتو سۆفیگەرییانە چوارچێوەیەکی گشتی وەرگرتبوو بەڵام لە دوایدا؛ کەوتە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی چەسپاو کە لە خولگەیەکی تەسکدا خوولی دەخواردەوەو دەسەڵاتە یەك لە دواییەکەکان دەوریان بینیی لە قۆستنەوەی ئەم بارە بۆ بەرژەوەندی خۆیان.
".. سەیریش ئەوەیە کە لە زۆربەی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان ولە کۆمەڵگای کوردەواری ولە کۆمەڵگای عیراقشیدا وا باوەو وا ڕۆیشتووە کە سۆفی یان سۆفیگەرێتی بریتییە لە پلەو پایەیەکی ئایینیو سۆفی دەبێ ڕیشی قەڵەمتاشکراوی هەبێو تەزبیح بەدەستو کەشکۆڵ لەمل بێو تەنانەت سۆفیگەرێتی وەکو پلەیەکی ئایینی لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا بووە بە حاڵەتێکی ڕابەری ڕێبازی (نەقشی) یان تەنانەت کە شێخێکی ڕابەری ڕێبازی (قادری) کۆچی دوایی دەکات ئیتر کوڕەکەی دەبێ بە جێنشینیو ئەگەر کوڕی نەبێ یان برازای یان خوشکەزای یاخود کچەزای یان یەکێك لە بنەماڵەکەی دەبێتە جێنشینیو ڕەنگە ئەو جێنیشینە نوێیە هیچ هەلومەرجێکی شایستەی ئەو جێنشینییەی تیا نەبێو لەڕاستیدا ئەم مەسەلەی میراتگریو جێنشینکارییە زیاتر لە سەردەمی سوڵتانگەریی عوسمانییەکاندا هاتە کایەوکاری پێکرا.. ئەویش بۆ ئەوە بوو دەماری شۆڕشگێڕیو یاخی بوونو دژە باو لە ڕۆحی سۆفیو سۆفیگەرێتیدا بڕچێنن یان بە تەواوی بیمرێننو بە جۆرێك لە جۆەکانی هەڕەشەو سەرکوتکردنو تۆقاندن یاخود بەپارەو سامانو دەم چەورکردن ڕێبازەکەو شوێنەکەو توانی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن"[3].
هەر لەم چوارچێوەیەدا گەلێ لەو تەکییەو خانەقایانەی کەرکوك کە سەر بە تەریقەتە جۆربەجۆرەکان بوون، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە حیسابی بۆ کراوەو لە گەلێك باردا پارەو پایەو شوێنو پێگەی دیاریکراوی بۆ جێبەجێکراوە تا بەلای خۆیاندا ڕابکێشرێت.
"... عوسمانییەکان بایەخیان بە زانایانو دادوەرانوقوتابیانی شەریعەت دەداو بایەخیان بەلایەنی ئایینی دەدا لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتیو سیاسی تا بەوەی خزمەتی بەرژەوەندی بەرزی عوسمانییەکان بکات.."[4].
".. بزووتنەوەی بابائییەکانو ڕێبازەکەی بە جۆرێك تەشەنەی کردووەو پەرەی سەندووەو جەماوەر پشتگیری لێکردووە دەوڵەتی عوسمانی لێی ترساوەو کەوتووەتە خۆی بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەم ڕێبازەی خستووەتە ناو قاڵبو بووەتەیەکی ئایینییەوەو سوپای عوسمانی پێوە پەیوەست کردووە... ئەگەر وای نەکردایە کار لەکار دەترازاو ڕێبازی سۆفیگەری (بەکتاشی) لە مێژوودا پلەوپایەکی دی دەبوو.. ئەم قسانە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێبازی (بەکتاشی) لە بنەمادا یاخیبونێك بووە لە هەندێ سنوورو قاڵبی باوی ئایینو مەترسی بووە لەسەرپێگەو کۆڵەکە ئایینییەکانی دەوڵەتی عوسمانیو ئەو دەوڵەتە ناچار بووە بەفرتو فێڵ هەڕەشەو پیلان. ڕەگە مەترسیدارەکانی ڕێبازەکە لەبن هەڵبکێشێو تابورەکانی بنەبڕ بکاتو بیکات بە قەڵەکەی مەلا نەسرەدینو ئینجا خۆی ببێ بە خاوەنیو پشتگیری لێبکاتو بیکات بە دابو ڕەسمی ئایینی سوپای عوسمانی.
دەوڵەتی عوسمانی ناچاربووە چ بە پارەو چ بە فرتو فێڵ چ بە تۆقاندن گۆڕانکارییەك لە ڕێبازەکەدا بکرێو مەترسی بۆ سەر دەوڵەت نەمێنیو بۆ چاوشکاندنو دواتر لووت و گوێکردنی بکرێت بە ئایینی ڕەسمی ناو سوپای دەوڵەتی عوسمانی.
(ئیمام تابووری)ی سوپایی کە تاوەکو حەفتاکانیش لەناو سوپای عێراقیدا هەبوو بە میراتگری لە سوپای دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ سوپای دەوڵەتی عێراقی مابۆوەو دەوری ئەو (ئیمام تابوورانە) لەناو سوپای عوسمانیدا ئەوە بووە لە ڕێی گوتاری پێش نوێژو دوای نوێژدا لەلایەن تابۆرو نا ئیسلامیو سەرکێشەکانی ڕێبازی بەکتاشی لەبیر بەرنەوەو ڕێبازەکە دەستەمۆ بکەنو بڵێن ئەوە تا خۆمان پشتگیری لێدەکەینو لەناو سوپادا بڵاوی دەکەینەوە"[5].
هەر ئەو ڕاستییەش یەکلادەبێتەوە کە (بەکتاشی) لە سەردەمی خۆی لە کەرکوك، دەوری گرنگی بینیوەو لە ناوچەکانی بڵاوبوونەوەی هەنگاوی باشی ناوە بەتایبەتی

لەناوچەکانی (داقوق)و (خورماتوو). کەرکوکیش بەپێی سەردەم و قۆناغە مێژوویییەکان، گەلێك تایبەتمەندیو گۆڕانکاری ئایینی سەری هەڵداوەو بەپێی پێویست دەوری سەرەکیو لاوەکییان بەدەستهێناوە لەپێناو تایبەتمەندیداو توانای ئەو خەسلەتانە لە گۆڕانو پێشکەوتنیدا.

لەبەر هۆکاری هەمەڕەنگی ئایینەکان لەم دەڤەرەدا دەوری سەرەکی بینیووە لە هەمەڕەنگی تەریقەتو تەسەوف لەم ناوچەیەدا لە هەمان کاتدا جیاوازیو تایبەتمەندی سەرهەڵدانی هەریەکەیان لە دەڤەرە جیاجیاکانی لە هەندێ کاتدا ئەم ئۆڵوانە دەوریان بینیووە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی سەردەم بۆیە هەریەکە لە:- بەکتاشی، قزلباش، خەوارج، (بابی-بابیە)، مەندائیی، حەقە، بارانی، کاکەیی، نەقشبەندی، قادری، دەوری بەرچاویان بینیووە لە پێگەیشتنی ئایینی لەم دەڤەرە بەوشێوە بەرچاوەی کە گەشەی کردووە تێیدا.

**"دانەری تەریقەتی قادری شێخ عەبدولقادری گەیلانییە"**[6].

یەکەم ڕێبازی تەریقەت کە لە کوردستان بڵاوبووبێتەوە (نوور بەخشی) بووە، لەلایەن پیاوێکەوە بەناوی (سەید محەمەد نوور بەخشی). کە دەکاتە برای (شێخ عیسا)و (شێخ موسا) بەرزنجی، سەید محەمەدو براکانی لە (٨٦٠) کۆچی لە سەردەمی باوکیانو باباعەلی هەمەدانی) هاتوونەتە بەرزنجە[7].

تەریقەتی نووربەخشی تا سەردەمی بابا ڕەسوڵ (١٠٦٥-١٦٤٦) برەوی هەبووە، ئەم پیاوە تەریقەتی (علوية) کە بەشێکە لە تەریقەتی (خلوتية) تێکەڵی نووربەخشی دەکات، ئەم تەریقەتە لەنێو ساداتەکانی بەرزنجەدا. برەوی پەیداکردو دواتر هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، ئەم بارودۆخە تا سەردەمی شێخ محەمەدی نۆدێیی ناسراو بە (کبريت الاحمر) بەردەوام بوو، دوای مردنی سەید محەمەد (سەید ئیسماعیلی قازانقایی) کوڕی دەبێتە جێگرەوە، لە هەندێ سەرچاوەدا بە ئیسماعیل ولیانی ناوی هاتووە، پاش وەرگرتنی هەردوو تەریقەتەکە کە لە باوکییەوە کە پێشتر باسمان کرد. ڕۆیشت بۆ بەغداو چووە خزمەت (شێخ ئەحمەد ئەحسائی)و بەیعەتی پێداو پاشان بەهۆی ئەرەوە تەریقەتی (قادری) وەرگرت، پاش گەڕانەوەی لە بەغدا لە گوندێك بەناوی (قازانقایە) نیشتەجێ بوو.

خەڵکی کوردستان لە هەموو شوێنو ناوچەکانەوە ڕوویان تێکردو زۆربەی زاناو پیاوە ئایینییەکان بەیعەتیان پێکرد، ئەویش چوار جێگرەوەی وەکو نوێنەری خۆی دیاریکرد کە بریتی بوون لە:- کوڕەکەی خۆی (سەید ڕەزا دێلێژی)، براکەی (عەلی دۆڵپە قولی)، برازاکەی (شێخ محەمەد قووڵەیی)، (مەلا عەلی سوسەیی).

(سەید محەمەد نووربەخشی) ڕۆیشت بۆ (هەرات) لە پاکستان نیشتەجێ بوو. (شێخ موسا) لە بەرزنجە مایەوەو خوشکی حاجی شێخ خالیدی خواستو کردییە هاوسەری، پاشان بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی تەریقەت چووە ناوچەی (ئاغجەلەر)، بەڵام لەوێ کوشتیانو لە بەرزنجە بەخاك سپێردرا.

دوای کوشتنی شێخ موسا، براکەی (شێخ عیسا)، ژنەکەی دەخوازێو ئەنجامی ئەم هاوسەرگیرییەش خستنەوەی دوانزە کوڕ بوو، کە ئەم کوڕانە لە سلێمانیو دەورووبەری بڵابوونەتەوە.

(سەید بابا ڕەسوڵ) کوڕی سەید عەبدولکەریم، لە دوای خۆی حەڤدە کوڕی بەجێهێشتووەو لە کوردستان پەرشو بڵاوبوونەتەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە: عەبدولسەمەد، عەبدولکەریم، عەبدولسەید، عەلی، ئیسماعیل، ئیسحاق، حەسەن، حوسێن، یوسف، ئەحمەد، محەمەد، ئیبراهیم، حەیدەر، زەنوون، زەین ئەلعابدین، بایە زید، عەبدولڕەسول. کە زۆربەی ساداتەکانی بەرزنجە دەچنەوە سەر ئەم پیاوچاکەی (عەبدولڕەسوڵ). ساداتەکانی سەرگەڵوو لە نەوەکانی سەید عەبدولسەمەدن، کە ناودارترینیان کەسایەتی ئەوان (سەید ئەحمەد سەردارە)، کە خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و باپیرەی سەید ئەحمەدی خانەقایە لە کەرکوك.

ساداتەکانی هەردوو ئاوایی (میرناسر)و (قەڵخانلو) لە ناوچەی (خورماتوو)، هەندێ لە ساداتەکانی بەرزنجە لەوانە (سەید تەها بەرزنجی) لە نەوەی ئەوان دەژمێردرێن، هەموویان لەنەوەزاکانی سەید ئیسماعیلن.

ساداتەکانی ناوچەی (کونە کۆتر) لە نەوەی سەید بایەزیدن، ساداتەکانی (ئەبی عوبەیدە) لە نەوەی (سەید حەیدەر)، ساداتەکانی (کاکەسووری)و (پیر حەسەن) لە نەوەی (سەید حەسەنن)، ساداتەکانی (نۆدێ) لەوانە شێخ مەعرووف نۆدێیی و ساداتەکانی قەڵاگا، مەرگە، قەڵای شێروانە، سەڵاحییە، ناوچەی دیالە، لەنەوەکانی سەید عەلین، کە بە (وندرینی) دەناسرێت، شێخ حەسەن گڵەزەردی باپیرەی ساداتەکانی قەرەحەسەنو کانی سپیکە لە قەرەداغ و دارانی، قەلە، تیمار، عومەرەگدە، سەرژێ، شۆڕیجە، کۆیە، سندرلانو گڵەزەردە، ئەویش کوڕی شێخ محەمەدی نوێییە (کبريت الاحمر).

لە ساڵی (١٦٧٧)ی زایینی لەدایکبووە ولە ساڵی (١٧٦٢)ی زایینی کۆچی دوایی کردووەو لە گڵەزەردە بەخاك سپێردراوە، دەڵێن زانایەکی گەورەو بەناوبانگو لە خواترس بووە[8].

*** بنەماڵەکانی قادری لە کەرکوك:-**

**١- شێخ عەبدولکەریمی کرپچنە:-**

ڕابەری ئەم سەردەمەی تەریقەتی قادری لە کوردستان، سەید عەبدولکەریم بوو، لە (١٣٩٨)ی کۆچی لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە لە کرپچنە بەخاك سپێردراوە[9].

ئێستا لە جێگەکەی (شێخ محەمەد) تەریقەتەکە دەباتەڕێوە.

٢- شێخ محەمەد عەلی کوڕی عەلی تاڵەبانی، ڕابەری تەریقەتی قادری دەکات، هەروەها خانەدانی سەید عەبدولڕەحمان نزیکەی چل تا پەنجا ساڵ لە سەدەی نۆزدە دا یەکێك بووە لە کەسایەتییە ئایینییە گەورەکان لە کوردستانو نزیکەی پەنجا هەزار موریدی هەبووەو و لەسەر تەریقەتی قادری بووە[10].

ئێستا شێخ یوسف شێخ عەلی ڕابەرایەتی دەکات لە تەکییە

تاڵەبانی.

٣- بنەماڵەی قەرەچێوار:-

ئەم بنەماڵەیە دەکەوێتە چەمچەماڵ لە کوردستانی عێراق، حاجی شێخ ئیبراهیم خەریکی ئیرشادوڕێخوێنییە.

٤- تەکیەی (شێخ عەبدولڕەحمان):-

ئەم تەکیەیە شێخ محەمەد شۆڕیجەی شێخ عەبدولڕەحمان نەجمەدین بەرزنجییە لە گەڕەکی شۆڕیجە، کە لە بنەڕەتدا لە دڵی شۆڕیجە بووە لە دوایدا هاتوونەتە ئەم شوێنەی ئێستایان.

٥- تەکیەی (سەید ئەحمەد):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی سەید عەبدوڵڵا سەید ئەحمەد کەریم بەرزنجییە، کە شوێنەکەی لە پشت کڵێسە سوورەکەیە

٦- تەکیەی (شێخ عیزەدین):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی شێخ عەبدولڕەحمان شێخ عیزەدین کانی چنارە، ئەم تەکیەیە لە گەڕەکی ئازادیە.

٧- تەکیەی (سەید عەتا) ئەحمەد محەمەد پیرخدرییە کە ئێستا لە کۆتایی گەڕەکی ئازادییە لە (دەروازە)ی ئێستا.

٨- تەکیەی (سەید عەلی):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ عەلی ئەمینی ئەحمەد شێخانی)یە ئەم تەکیەیە لە گەڕەکی (حیساباتە).

٩- تەکیەی (شێخ ئیبراهیم):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ لەتیف ئیبراهیم محەمەد بەرزنجییە)، لە گەڕەکی (ئەلواستی).

١٠-تەکیەی (شێخ حوسامەدین):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ سەفائەدین محەمەد حوسامەدین، لە گەڕەکی (ئەحمەد ئاغا).

١١-تەکیەی (جەباری):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید فیکرەت کوڕی محەمەد هادی جەباری ڕەفاعی قادرییە، کەوتووەتە سەر بازاڕی جووت قاوە لەسەر دەرگای قەڵا.

١٢- تەکیەی (قەرەچێواری):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ وەهاب عەبدولکەریم کوڕی حوسێنی قەرەچێوارە) لە گەڕەکی ئیمام قاسمە.

١٣- تەکیەی (شێخ شۆڕش):-

ئەم تەکیەی بەسەرپەرشتی (شێخ شۆڕش کوڕی لەتیف تاهیر بەرزنجی)یە، لە گەڕەکی شۆڕیجەیە.

١٤- تەکیەی (پیرخدری گەورە):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ محەمەد کوڕی عەلی کوڕی فەرەج پیر خدرییە، لە گەڕەکی دەروازە.

١٥- تەکیەی (عەوەڵانی):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ ئەکرەم کوڕی محەمەد کوڕی سدیق عەوەڵانی قادرییە، لە گەڕەکی حوریە.

١٦- تەکیەی (سەید حەسەن پیریادی):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید حەسەن کوڕی سەید کەریم کوڕی سەید حوسێنی پیریادیە، لەسەر ڕێگای گوندی (چیمەن-سلێمانی).

١٧- تەکیەی (شێخ عبدولباقی):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ عەبدولعەزیز کوڕی مستەفا عەبدولباقی)یە، بەرامبەر چێشتخانە (عەبدوڵڵا) لە سەرەتای شەقامی (الجمهورية).

١٨- تەکیەی (کەسنەزانی):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ عەبدولقادری کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەد (گوڵباخی)یە لە گەڕەکی (پەنجا عەلی).

١٩- تەکیەی (شێخ سەلمان کوڕی عوبێد کوڕی حەسەنە لە ڕابردوودا لە گەڕەکی (ئەلماس) بوو، بەڵام لە ئێستادا نەماوە.

٢٠- تەکیەی (شێخ ڕەئووف):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ تەها کوڕی ڕەئووف بەرزنجی)یە، لە پشت بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کۆنەوەوە لە شەقامی (ئەتلەس).

٢١- تەکیەی (جەباری):-

ئەم تەکیەی بەسەرپەرشتی (شێخ نوری کوڕی عەبدولجەبار جەبارییە)، لە گەڕەکی (حیسابات).

٢٢- تەکیەی (شێخ لەتیف-لوتفی):-

لەکاتی خۆیدا لە گەڕەکی (تەپە)بووە، ئێستا شێخ (عوبێد) سەرپەرشتی دەکات ئازناوی شیعری (هەوری)یە.

*** تەریقەتی نەقشبەندی لە کەرکوك:-**

ڕابەرو دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی، شێخ بەهائەدین محەمەد نەقشبەندی محەمەدی کوڕی محەمەد بوخارایە، ئەم پیاوە شارەزایەکی زۆری لە زانستی ئیلاهی هەبووە، پلەو پایەیەکی بەرزی هەبووە[11].

بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردنی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستان لەلایەن (مەولانا خالیدی شارەزووری)یەوەیە، کە تەریقەتەکەی لە عیراق و ئێران و تورکیا و سوریا بڵاوکردووەتەوە، باوکی مەولانا خالید ناوی (حوسێنی)ە لە تیرەی میکائیلییە سەر بە عەشیرەتی (جاف)ە لە کوردستانی عێراق[12].

زۆربەی مێژوونووسان (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بە پەرەپێدەرو برەوپێدەری سەرەکی و ڕەسەنی ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستان دەزانن، لە کاتێکدا ئەم ڕێبازە پێش مەولانا لە کوردستان بوونی هەبووە.

ئەلبەتە بڵاوبوونەوەی زیاترو کاریگەری ڕێبازەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەستپێکی سەدەی نۆهەمی کۆچی، کاتێك شێخان و جێنیشینەکان بەشێوەیەکی پەرشوبڵاو دەسەڵاتی خۆیان جگە لە خوراسان و پشتی دەریا بە شوێنان و وڵاتانی تری وەکو کوردستان گەیاندووە، بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو نا، چونکە بەڵگەیەکی ڕۆشن هەیە بریتییە لەوەی کە لە ڕۆژئاوای ئێران ڕێبازەکانی سۆفیگەری شیعە مەزهەب و لە ناوچەکانی کوردستان ڕێبازی سوق قادری ڕێگربوون لە پەرەسەندی ڕێبازی نەقشبەندی بەڵام لە ڕێگای مەولانا خالیدی نەقشبەندیەوە ڕێبازەکەی برەوی خۆی وەرگرت.

دوای مەولانا خالید، خەلیفەو شێخانی نەقشبەندی بە هەموولایەکی کوردستان بڵاوبوونەتەوەو لە شاروشارۆچکەو گوندەکاندا چەندین تەکیەو خانەقایان دامەزراندووە مەولانا خالید نزیکەی چوار سەد خەلیفەو جێنیشینی هەبووە

لە کوردستان، گرنگترین و دیاریترینیان (شێخ عوسمان سیراجەددین تەوێڵەیی و سەی تەهای نەهری شەمزینی و شێخ ئیسماعیلی هەنارانی و شێخ ئەحمەدی خەتیبی ئەربیلی و شێخ محەمەدی خانی..)[12].

لەدوایدا وورده.. وورده ئەم تەریقەتە لە بەشێکی فراوان لە ناوچەکانی کەرکوك بڵاوبوونەتەوەو بەشێکی بەرچاو لە تەکیەو خانەقایان لە چەمچەماڵ و کەرکوك و گەرمیان گەشەو بڵاوبوونەتەوە.

١- تەکیەی (سەید ئەحمەد خانەقا):-

" یەکێکە لە بنەماڵە گەورەکانی کوردستان... خانەقا لە دەورووبەری ساڵی (١٨٣٤)ی زایینی بە فەرمانی (سوڵتان عەبدولمجیدییەکەم) کە پاشای عوسمانی بووە، دروستکرا بۆ (شێخ قادر) کە نەوەی (شێخ ئەحمەدی سەردارە) کە یەکێك بووە لە خەلیفە دیارەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی.

شێخ قادر پێنج کوری هەبووە بە ناوەکانی (جەواد، حوسێن، مەحمود، عەلی، مارف).

شێخ قادر لە ساڵی (١٣٧٧)ی کۆچی لە خانەقین کۆچی دوایی دەکات و شێخ حوسێنی کوری جێگەی دەگرێتەوە لە دوای خۆی دوو کورو سێ کچی هەبووە بەناوی ئەحمەد، عومەر، کچەکانی (فاتیمە) دایکی شێخ رەئووف خانەقا دەبێت.

سەید ئەحمەد سەید عومەر هەردووکیان خوێندوویانەو خوێندەوارێکی باش بوونە، بەڵام سەید ئەحمەد، کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی بە ئەدەبەوە زانیووەو شارەزای بووە..[14].

٢- خانەقای (مەلا عومەر گومبەتی):-

" بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە، چونکە بنەماڵەکەیان سەرەتا نیشتەجێی دێی (عومەر گۆمبەد) بوون، کە دەکەوێتە نێوان شارۆچکەی تەقتەق و کۆیەوە، ئەم بنەماڵەیە یازدە نەوەیە هاتوونەتە شاری کەرکوك، باپیرە گەورەی بنەماڵەکە ناوی (جومعە)بووە، خەڵکی دەربەندی زەهاو بووە، کوری ئەویش ناوی (مەلا هاشم)بووە کە بەمەلا شەلە (شەلەوەندی) بەناوبانگ بووە، کوری ئەویش ناوی (مەلانوورەدینییەکەم) ە، کوری ئەویش ناوی (مەلا ئەبوبەکرییەکەم)ە، کوری ئەویش ناوی (مەلائیبراهیمییەکەم)ە، ئەویش (مەلا نوورەدینی) هەبووەو دواتر (مەلا ئەبوبەکری دووەم)ی هەبووە، بنەماڵەکەیان خوێندەواری (نەقشی)بوون، لە ئۆمەر گومبەدی لای کۆیەوە هاتوونەتە کەرکوك و لە گەرەکی زێوییە نیشتەجێ بوونە..) [15].

٣- خانەقای (شێخ خدر):-

".. لە ساڵی (١٢٨٢)ی کۆچی بنیادنراوە، بەمزگەوتی شێخ جەواد) ناوداره، نزیك مزگەوتی (ئیمام قاسم)، ئەم مزگەوتە ماوەیەك ناوی مزگەوتی (مەلا تەها) بووە، ئەمانە لە شێخانی عەودالآن بوون[16].

٤- خانەقای (نەقشبەندی-خانەقای عەبدولخالق):-

ئەم خانەقایە لە گەرەکی (بڵاخە)، ماڵی باوکی ئەسیری شاعیر بووە، ساڵی (١٨٨٨)ی زایینی بنیادنراوە لە هەندێك شوێن بە خانەقاو لە هەندێك شوێنی تر بە تەکیە ناونراوە[17].

* تەریقەتی (رەفاعیە):-

پەیرەوانی کاری ئەم تەریقەتە (سەید ئەحمەد رفاعی)یە، خەڵکی بەسرەیە، تەریقەتی دەروێشانەی ئەو دنیاگەری ماڵبەکۆڵ بووە وزنجیرەی شێخایەتی ئەم دەچێتەوە سەر مەعروفی کەرخی کە لە تەواوی ئاسیا ئەم تەریقەتە بەربڵاو پەیرەوکاری هەیە بە تایبەتی لە وولاتی ئێران رەچەڵەکی ناوی (رەفاعی) دەگەرێتەوە سەریەکێ لەباو باپیرانی بەناو (رەفاعە)، بەڵام هەندێك دەیگەرێنەوە سەر خێڵێك بە هەمان ناو.

موریدانی رەفاعی ئامازەیان بە نووسراوو پاشماوەکانی رەفاعی نەکردووە، جگە لە (أبا الحصری) کە هەندێك بەرهەمی دەواتە پاڵ (رەفاعی).

بەڵام نووسەرانی ژیانی (سەید ئەحمەد) ئەو پاشماوانەی کە دەدرێتە پاڵ (رەفاعی) بە جێگەی گومان و دوودڵی دەزانن. واتا پشتراستی ناکەنەوە لە کتێبی (فاروقی) نەوەییەکێ لە موریدەکانی رەفاعی کە ناوی (عومرە) بەم شێوەیە باسی خێزانی رەفاعی دەکات:-

یەکەم جار رەفاعی (خەدیجە)ی برازای مەنسوری کردووەتە هاوسەری خۆی، پاشان (نەفیسە)ی کچی (محەمەدی کوری ئەلقاسمیە)ی کردووەتە هاوسەری، ژمارەیەك زۆر کچی هەبووە، سێ کوری هەبووە پێش مردنی باوکیان کۆچی دواییان کردووە، دوای مردنی (رەفاعی)یەکێ لە خوشکەزاکانی بەناوی (عەلی کوری عوسمان) رابەرایەتی تەریقەتی رەفاعی دەگرێتە ئەستۆ[18].

* بنەماڵەکانی رەفاعی لە کەرکوك:-

ئەوەی جێگەی سەرنجە تەریقەتی رەفاعی لە کەرکوك هاوگونجاوە لەگەڵ پرۆسەی بەعەرەبکردن لەم شارەدا، ئەویش لە پرۆسەیەکدا حکومەتی بەعس هەستا بە پێدانی پارەو ئیمتیازات لە پای ئەوەی تا بتوانێت رووکاری تەریقەتەکانیش لە چوارچێوەی کوردایەتی خۆی دەرکاتە دەرەوە.

١- تەکیەی (شێخ فوئاد سوڵتان حەفتاوی) لە گەرەکی شۆریجە.

٢- تەکیەی (سەید عەواد):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەیە مەکی تەها عەواد ئەلنعێمی لە گەرەکی (ئەلواستی).

٣- تەکیەی (سەید عەلاوی):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید عەبدوڵڵا نەجم عەبدوڵڵا) یە لە (ساحة الطیران) لە تەنیشت گۆرستانی (تەعلیم تەپە).

٤- تەکیەی (ئەبو علوگ):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید محەمەد حەمید محەمەد) ە لە شەقامی (سەلاحەدین).

٥- تەکیەی (سەید عەجیل):-

ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید عەجیل عومەر ئەلخەتاب) ە لە گەرەکی (شۆریجە) لە خانووەکانی (دور الشرطة).

٦- تەکیەی (ئەلحەدیدی):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ عەلی مستەفا عەلی ئەلحەدیدی)یە لە گەڕەکی (ڕاپەڕین).
٧- تەکیەی (سەید حەمەد عەبدولغفور):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ ئەحمەد حەمەد عەبدولغفور ئەلمشایخی)ە لە گەڕەکی (موسەلاّ).
٨- تەکیەی (ئەلرەفاعیە):-
بەسەرپەرشتی (سەید ئەحمەد حوسێنی حەمید ئەلرەفاعی لە گەڕەکی کوشتارگەی کۆنی کەرکوك.
٩- تەکیەی (ئەلرەفاعیە):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید عەواد حەموودی ساڵح)ە لە گەڕەکی (عروبە).
١٠- تەکیەی (شێخ قاسم):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ قاسم عەبد محەمەد ئەلنعێمی)یە لە ڕێگای بەغدا.
١١- تەکیەی (مەولانا):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ ئەحمەد تەها ئەحمەد)ە لە گەڕەکی (موسەلاّ).
١٢- تەکیەی (ئەبو حەمزە):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید ڕەعد سەید عەلی محەمەد) ە لە گەڕەکی (ئەلواسطی).
١٣- تەکیەی (عسەینی):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (عەبدوڵلا عەلی خەڵەف)ە لە گەڕەکی (ڕاپەڕین).
١٤- تەکیەی (ڕجێبات):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید محەمەد ساڵح بلو)ە لە کۆتایی پەنجا عەلی لە گوندی (ڕجێبات).
١٥- تەکیەی (ئەلعەشرە ئەلموبەشەرە):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (عەبدولوەهاب توعمە)یە لە گەڕەکی (ڕووناکی).
١٦- تەکیەی (سەید محەمەد):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید محەمەد مەنسور ئەلنعێمی)یە لە شەقامی (ئاگر کوژێنەوە).
١٧- تەکیەی (سەید شویش):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید مەنسور شویش ئەلنعێمی)یە لەسەر ڕێگای (بەغدا).
١٨- تەکیەی (سەید حەسوون):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید ئەحمەد حوسێنی جەعفەر ئەلنعێمی)یە لە گەڕەکی (یەکی ئادار).
١٩- تەکیەی (سەید تەها):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید عیزەدین محەمەد تەها ئەلنعێمی)یە لە گەڕەکی (العلماء).
٢٠- تەکیەی (سەید یاسین):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (سەید عەبدوڵلا یاسین جەعفەر ئەلنعێمی)یە لە پشت گەراجی ئۆتۆمبیلەکانی سلێمانی.
٢١- تەکیەی (سەید نورەدین).
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی سەید نورەدینە لە گەڕەکی (زێویە).

٢٢- تەکیەی (شێخ عیزەدین):-
ئەم تەکیەیە بەسەرپەرشتی (شێخ عیزەدین ساڵح ئەلمەشایخی) بەرامبەر قوتابخانەی سەرەتایی (پیرەمێرد).

*** تەریقەتی (شازلی-الشاذلیة ):-**

" دامەزرێنەری ئەم تەریقەتە (الولي الكبير ابي الحسن علي کوری عەبدوڵلا کوری عەبدولجەبار ئەلشازلیە)یە ئیمام (ئیمام (شازای) لە ساڵی (١١٩٦- ١١٩٧)ی زایینی لە (غەمارە) لە نزیك (سەبتا) لە وڵاتی تونس لە دایکبووەو لە بیابانی میسر لە (حمیثر) لە ساڵی (١٢٨٥)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.
ئیمام شازلی بەردەوام خەریکی خوداپەرستی و عیبادەت بووەو زەهدی فێر موریدەکانی کردووە، لە وڵاتی میسر (شازلیە) گەلێك لقی هەیە، لە وڵاتی سودان بە دووەم تەریقەت دادەنرێت لە رووی بڵاوبوونەوەکە مەڵبەندەکەی وڵاتی (بەربەرە)، هەروەها شازلیە لە سوریاش تەشەنەی کردووە کە (العارف بالله محمد الهاشمي) دایمەزراندووە بە (الشازلیە الدرقاویە) ناسراوە، هەروەها لە وڵاتی لیبیاو تونس و جەزائیرو هەندێ باکووری ئەفریقا بڵاوبووەتەوە[19]".
لە کەرکوك تەکیەی شازلی هەیە بەسەرپەرشتی (شێخ محەمەد جیهاد ئەلسالحی)یە لە گەڕەکی ماموستایان لەسەر ڕێگای بەغدا. ئەم تەکیەیە زیاتر کاریگەری نەتەوەی تورکمانیان بەسەرەوە زاڵە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- سۆفی و سۆفیگەرێتی کاریگەری هزرو ئیدوکلتورە نائیسلامییەکان لەسەر سۆفی و سۆفیگەرێتی ئیسلامی، لەتیف هەلمەت، ٢٠٠٩، لاپەرە (٨٨).

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٢).

٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠١-١٠٢)

٤- معجم شيوخ الإسلام في العهد العثماني (٨٢٨-١٣٤١) ه، (١٤٢٥-١٩٢٢)م، المؤسسة- الاعلام، بەرگییەکەم، ترجمة سدقي علي شقيرات، علم الكتب الحديث للنشر والتوزيع، ٢٠١٤، لاپەرە (٦٧).

٥- سۆفی و سۆفیگەرێتی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٢-١٠٣)

٦- مێژووی تەسەوف لە کوردستان، محەمەد رەئووف تەوەککولی، وەرگێرانی یوسف زاهیر هەورامی، چاپخانەی رۆژهەلات، ٢٠١٥، لاپەرە (١٥٢).

٧- تأريخ السليمانية وانحائها، لاپەرە (٢١٩).

٨- مێژووی تەسەوف لە کوردستان، محەمەد رەئووف تەوەککولی، وەرگێرانی: یوسف زاهیر هەورامی، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٥، لاپەرە (١٦٦- ١٧٢).

*هەروەها بروانە:-

- ساداتی بەرزنجە، مەلا مستەفا (سەفوەت)ی حاجی مەلا رەسولی دێلێژە، چاپخانەی کۆمپانیای مەحوی، ٢٠١٥، لاپەرە جۆراوجۆر.

٩- مێژووی تەسەوف، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩٣).

١٠ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٠٥).

١١- مێژووی تەسەوف لە کوردستان، محەمەد رەئووف تەوەککولی، وەرگێرانی: یوسف زاهیر هەورامی، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٥، لاپەرە (٢٢٦).

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٣٠).

١٣- نەقشبەندی لە کوردستان، ئەمیر وەزیری، وەرگێرانی: عەلی میرزا عارف هەورامی، چاپخانەی (کارۆ) سلێمانی، ٢٠٠٩، لاپەرە (٢٢٨).

١٤- یادگاری خانەقا، شێخ رەئووف خانەقا، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، ٢٠١٣، لاپەرە (١٥- ١٦).

١٥- شاری کەرکوك بەشێك لە مێژووی (مزگەوت، تەکیە، خانەقا، زاناو پیاوە ئایینی)یە ناودارەکانی، گۆران فەتحی، ئنیستیوتی کەلەپووری کورد، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەرە (٧٣- ٧٤).

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٧).

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٨).

١٨- مێژووی تەسەوف لە کوردستان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٥).

١٩- تەریقەتی نەقشبەندی بنەماو ئامانجەکانی، بەرگییەکەم، عەبدولرەحمان بێلاف بەرزنجی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، لاپەرە (٦٨).

*** بڵاوبوونەوەی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی**
*** تەریقەتی قادری: - لە ناوچەی چەمچەماڵ**

فەرهاد عەبدولعەزیز

ئەم تەریقەتە لەناوچەی چەمچەماڵدا زۆرترین دواكەوتەی هەبووە. بەتایبەت لە سەردەمی (حاجی كاك ئەحمەدی شێخ) دا تەریقەتی قادری لەناوچەی چەمچەماڵدا زۆربرەوی پەیدا كردووەو لایەنگری زۆر بووە. چەندین جارسەردانی گوندو ناوچە جۆربەجۆرەكانی دەڤەرەكەی كردووەو لە زۆربەیاندا بەدەستی خۆی بەردی بناغەی مزگەوتەكانیانی بۆ داناون.

بوونی تەكیەی تەریقەتی قادری لە ناوچەی چەمچەماڵدا، تەنانەت پێش سەرهەڵدانی بنەماڵەی (كاك ئەحمەدی شێخ) یش، هۆكارێكی كاریگەری تر بووە، كە رۆڵی هەبووە لە بڵاوبوونەوەی ئەو تەریقەتە بەناو خەڵكی ناوچەكەدا. ئەویش خۆی لە بوونی شێخانی تەریقەتی قادریدا بینیوەتەوە، لە گوندی بەرزنجی ناوچەی قەرەداغی نزیك بەناوچەی سەنگاو. دواتر پەلكێشانی شێخانی بەرزنجە بۆ ناوچەی سەنگاو، وایكردووە كەوەك سەرەتا بنەماكانی تەریقەتی قادری بگاتە ئەم دەڤەرە. هەروەها بوونی تەكیەی (شێخ عەبدول جەبار) لە ناوچەی جەباری و سەرهەڵدانی تەكیەی تاڵەبانی لە گوندەكانی (تاڵەبان)ی سەر بە چەمچەماڵ، لەسەردەستی مەلا مەحموودی زەنگەنە لە ساڵی (١٧٤٧)ی زایینی. لەسەر رووی ئەمانەشەوە بوونی تەكیەیەكی گرنگ و گەورەی تەریقەتی قادری، لە گوندی كرپچنەی ناوچەی سەنگاو، تێكرا رۆڵی ئێجگار گەورەو كاریگەریان هەبووە لە راكێشانی خەڵكی ناوچەكە بەلای تەریقەتی قادریدا.

یەكێك لەو تەكیەیانەی كە لێرەدا پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بكەین، تەكیەی كەسنەزانی قادرییە لە گوندی كرپچنە. چونكە یەكێك بووە لەو تەكیەیانەی كە دەتوانین بڵێین لە هەموو تەكیەكانی تر زیاتر رۆڵی هەبووە لە راكێشانی خەڵكی ناوچەكە بەلای تەریقەتی قادریدا. چونكە ئەم تەكیەیە بەدرێژایی مێژووی خۆی بەكاری ئیرشادو زیكرو دەف و دەروێشەوە خەریك بووە. هەروەها چەندین تەكیەی تری سەربە تەكیەی گەورەی كرپچنەی لە گوندو شارو ناوچە جیا جیاكاندا دامەزراندووە. لەوانە هەر لە ناوچەی چەمچەماڵدا لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ و گوندەكانی پێنج ئەنگوست، گوندی هەشەزینی و چەندین شوێن و جێی تریشدا تەكیەیان دامەزراندووە. تەكیەی كرپچنە سەرەتا لە سەردەمی شێخ عەبدولقادری كوری شێخ كەریمی كەسنەزان دا، لە كەسنەزانی قەرەداغەوە هاتووەتە كرپچنەی سەنگاو، ئەویش لەسەر داوای عەشایەری ناوچەكانی كرپچنەو سەنگاو.

بەهاتنی تەكیەی كەسنەزان، كرپچنە، بووەتە مەڵبەندێكی ئایینی گەورەو مەرجەعی لایەنگرانی تەریقەتی قادری، نەك تەنها لە ناوچەی چەمچەماڵ، بەڵكو لە ناوچەكانی تری كوردستان و دەورووبەریشدا.

كە ساڵانە چەند جارێك لەو ناوچانەوە بۆ دیدەنی تەكیەی كەسنەزان و بەشداری لە زیكرو موناجاتی شێخ و مووریدانی ئەو تەكیەیەدا، دەروێشێكی زۆر روویان لە كرپچنە كردووە. ئەدموندز، دیمەنییەكێك لەو زیارەتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە گروپێكی تێكەڵاو لە دەروێش و گوندی، لە موریدانی شێخ عەبدولقادری كەسنەزان، بەدەم زیكرودەف ژەنینەوە بۆ كرپچنە ئەنجامیان داوە. ئەو كە لە ناحیەی قادر كەرەم ئەو كۆری زیكرو دەروێشانەی بینیووە، دەگێڕێتەوە كە چۆن لە پێش مەرقەدی شێخ محێدینی باوكی شێخ عەبدولكەریمی قادركەرەمدا ئەڵقەیان لێداوەو درێژەیان بە زیكرەكەیان داوە، ئەو دەڵێت (دەروێشەكان سەریان بە شێوەیەك رادەوەشان كە دەتگوت هەر ئێستا مێشكیان بڵاودەبێتەوە).

شیاوی باسە ئەم زیارەتە لە كاتێكدا بوو كە بنەماڵەی شێخ عەبدولقادری كەسنەزان تازە لە هەورامان گەراوونەتەوە، ئەو جەماوەرەش بۆ دیدەنی جێگرەكەی كە (شێخ حوسێنی)ی كوری بووە، روویان لە كرپچنە كردووە.

بوونی ئەم هەموو تەكیەو مەڵبەندانەی سەر بە تەریقەتی قادری لە ناوچەی چەمچەماڵ، كارێكیان كردووە كە زۆربەی زۆری خەڵكی ناوچەكە دواكەوتەی تەریقەتی قادری بن، بە جۆرێك لە سەرانسەری ناوچەكەدا جگە لە بەشێك لە خەڵكی قەڵا سێوكەو ئاغجەلەر كە دواكەوتەی تەریقەتی نەقشبەندی بوون، تەواوی ناوچەكەو هۆزەكان تری دەڤەرەكە زۆر بە شێخەكانیان سەرسام بوون. هەر كاریگەری تەریقەتی قادریش بووە كەوای لە سەرجەم هۆزەكانی ناوچەی چەمچەماڵ كردووە، زۆر بە پەرۆشەوە بەشداری راپەرینەكانی شێخ مەحموود بكەن و تا دوا ساتێش لە گەڵیدا بمێننەوە

*** تەریقەتی نەقشبەندی:-**

تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەی سورداشەوە لەسەر دەستی حاجی شێخ رەزای كوری شێخ عوسمانی كوری شێخ قادری قەڵا سێوكە، هاتووەتە ناوچەی قەڵاسێوكەو ئاغجەلەر.

ئەویش لەسەر وەسییەتی (شێخ عەبدولقادر كوری شێخ ئەحمەدی سەردار) كە شێخی تەریقەتی نەقشبەندی بووە لە ناوچەی سورداش، رێگەی پێدراوە ببێتە شێخی ئیرشاد.

حاجی شێخ رەزا، لە گوندی سەربازی ناوچەی ئاغجەلەر دانیشتووە، پاش خۆی (حاجی شێخ مستەفا كوری تەریقەتی خەڵكی داداوە، ئەم بارەگایەی تەریقەتەكەی جارێكیتر گێڕاوەتەوە بۆ ناوچەی سورداش و لە گوندی شەدەڵە نیشتەجێبووە، تا لە ساڵی (١٩١٥)ی زایینی لە شەری بەرەنگاربوونەوەی ئینگلیزدا لە خوارووی عیراق شەهید بووەو لە بەغدا نێژراوە.

ئەم دووركەوتنەوەیەی مەڵبەندی تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەی قەڵاسێوكە وایكردووە كە ئەو تەریقەتە لە ناوچەی چەمچەماڵ و تەنانەت لەناو خودی ناوچەی قەڵا سێوكەشدا بەشێوەیەكی بڵاو تەشەنە نەكات.

شێخ عەبدولكەریمی كوری حاجی شێخ مستەفای ناسراو بە شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵە، كە لە دەورووبەری ساڵی

(١٩١٩)ی زایینی سەرپەرشتی تەکیەکەی باوکی وەرگرتووە، چەند ڕێنمایی و ئامۆژگاریی نوێی لەناو موریدەکانیدا بڵاوکردووەتەوە کە ئاکام لە کۆتایی بیستەکاندا بزووتنەوە ڕێبازێکی (ئایینی- کۆمەڵایەتی) لێکەوتووەتەوە کە بە ڕێبازی (حەقە) ناوی دەرکردووە.

حەقە، بە حوکمی ئەوەی بایەخی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایینیش داوە، ئەو گۆڕانکارییانەی کە حەقەکان لە ڕووی ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە بانگەشەیان بۆ کردووە، وەك گوێنەدان بە نوێژو ڕۆژگرتن، یان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە وەك داواکردنی سەربەستی و یەکسانی ئافرەتان، کارێکیان کردووە کە خەڵکی پڕوپاگەندە بۆ ڕێبازەکە بکەن و درۆ بەدەم موریدەکانییەوە هەڵبەستن.

کاریگەری تەریقەتی نەقشبەندی، دواتر بزووتنەوەی حەقە لەسەر خەڵکی ناوچەی قەڵاسێوکە بەشێوەیەك بووە، کەوایکردووە ئەم ناوچەیە بەشداری کاریگەرییان نەبێت لە ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموودا لە کاتێکدا لە تەنیشت ئەوانەوە هۆزی شێخ بزێنی زۆر بە گروتینەوە تێکەڵ بەو ڕاپەڕینە بوون، چونکە شێخ بزێنییەکان سەر بە تەریقەتی قادری بوون.

* سەرچاوە

- ناوچەی چەمچەماڵ لەنێوان ساڵانی هەردوو شەڕی جیهاندا (١٩١٨-١٩٣٩) توێژینەوەیەك سەبارەت بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ڕووناکبیری، فەرهاد عەبدولعەزیز، ٢٠١٣، لاپەڕە (١٤٨- ١٥٥).

*** ( پیریادی - پیرحەیاتی )**

هەریەکە لە پیریادی، پیرحەیاتی، رەنگدانەوەیەکی مێژوویی دووروودێژی هەیە کە بۆ سەردەمانێکی زۆر دوور دەگەڕێتەوە، یان لەوانەیە پاشماوەی ئەو ئاینە کۆنانەی کوردستانی گەورە بێت، بەڵام لە دوایدا تێکەڵی کەلەپوور و شارستانی ئاینی ئیسلام بووەو بۆتە بەشێك لە خزمەتی ئەو ئاینە.
ئەگەر سەیری ڕێچکەی بڵاوبوونەو گەشەکردنی پیریادییەکان بکەین دەگەینە ئەو ڕاستییە کە هەڵگری گەلێك کەلە پووری ئاینی کوردەوارییە، کە تاکو ئێستاکە لە پەیرەو ژیانی ڕۆژانەیاندا هەڵگری ئەو خاسییەتانەن، کە هەردەم لە هەڵسووکەوتیاندا ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە. یان لە پەیرەوە ئاینییەکانی ئیسلامدا جوانکاری خۆیان بەدەر دەکەوێت.
لە کۆندا ئەم پیریادییانە لەو ناوچانە گەشەیان کردووە یان لە ژینگەیەکیاندا سەری هەڵداوە کە شوێنکاری ئاینییە کۆنەکانی وەکو زەردەشتیو کاکەیی نێو کوردستان بوونە ڕوون نییە لە چۆنێتی پەیوەندییەکان بەڵام ئەوە یەکلادەبێتەوە کاتێك هەڵکێشی کەلەپوورییەکتری بوونە.
پیر، یاد، حەیات، هەریەکە لەم دەستەواژانە مێژووییەکی دووروودێژی هەیە، کە بنەڕەتی ناوەکان بۆ سەردەمانێکی زووی مێژووی دەگەڕێتەوە.
پیر گەورە، یان پیاوی گەورە، یان ڕدێن سپی، یان پیاوی خاوەن دیدەو بە ئەزموون.
حەیات: ژیان، زیندوو، جۆرێك لە نەمر.
یاد: ڕابردوو، بیروهزر.
پیریادی، پیری حەیات، ڕەنگدانەوەی پیاوی بە ئەزموونو هەمیشە نەمر زیندوو کە چاکەکانی بەردەوام بە دەردەکەوێت.
"... بنەماڵەی (سەیدی پیریادی) لە ڕەگەزدا نەوەی برایەکی (بابا سەید زەنون پیریادی) بوون لە سەرەتادا لە گوندی (تەکیە)ی نزیك بە دەربەندیخان نیشتەجێ بوونو تەکیەو مزگەوتیان لەوێ دامەزراندووە، بۆیە ناوی گوندەکەیان (تەکیە) ناونراوە، بەڵام پاش چەند ساڵێك سەیدەکانی (تەکیە) بڕیاری بارکردن دەدەنو لە گوندی (پیریادی) نزیك بە چەمچەماڵ دەحەوێنەوە نەوەی (بابا سەی ژەنون) لە گوندی پیریادی تەکیەو مزگەوتی خۆیان دادەمەزرێننو هەندێکیان باردەکەنو بڵاودەبنەوە لە ناوچەکە بە تایبەتی لە گوندی (مۆفەر)و (چەشمە بەردین)و (قۆرەتە)و (عەلی مەنسوور).
ئەوماوەیەی کەلە (تەکیە)ی دەربەند بازیان بوونە، بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات باوەڕیان پێیان هێناوەو لە دەوری تەکییەکەیان نزیك بونەتەوە، بەشێکیان لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە.
" عوسمانییەکان (٤٥) گوندی ناوچەی چەمچەماڵیان فەرمان دەکەن یان (وەقف) بۆ سەر بنەماڵەی سەیدی (پیریادی) بۆ ئەوەی تەکیەو مزگەوتیان بەڕێوەبەرن کە چەمچەماڵ یەکێك بووە لەو (٤٥) گوندە لەو سەردەمانەدا...
دوای فراوانبوونو گەشەکردنو ناوبانگ دەرکردنیانو بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بەربڵاو گەشە بکەن بە هەموو لایەکدا دەکەونە تەکیە دروست کردنو بڵاوبوونەوە کە بەشێکیان چوونەتە قەرەداغ، چیمەن، مۆفەر، هەر ناوچەیەك تەکیەی خۆی هەبووە.
(گەڕەکی پیریادی دێرینترین گەڕەکە لەگەڵ سەرەتای دامەزراندنی ئەو بەری (خاسە) واتە بەری قەڵا ئەم گەڕەکەش ئاوا کراوەتەوە.
" ئەو کاتە گەڕەکی (پیریادی) ئاقارێکی فراوان بووە، کە ناوی گەڕەکە کە بە ناوی دانیشتووانی پیریادییەوە ناونراوە کە پیریادییەکانی چەمچەماڵ یەکەم ماڵ بوونە بناغەی ئەم گەڕەکەیان دامەزراندووە، چونکە لە کۆنەوە خەڵکی چەمچەماڵو گوندی (پیریادی) کاروانیان بۆ کەرکوك کردووە بە کەرو وولاخو دارو غەلووزو گەنمو برنجو توتنیان هێناوە بۆ کەرکوك، کە بەشێکیان لەو ئاقارە نیشتەجێ بوونە.
لەبەر ئەوە چەند هۆکارێکی هەبوو بێت بۆ کۆچکردنیان بۆ کەرکوك:-
١- لەوانەیە هۆکاری ئاینی بووبێت، کە دەوری بینووە لە بڵاوکردنەوەی باوەڕەکەیان بۆ کردنەوەی تەکیە بووبێت.
٢- لەوانەیە هۆکاری بازرگانی بووە بۆ کارکردنو ئیشکردن لەم شارە، هەر لەبەر ئەمەیە کاریان کردووە لە گەلێك کاری دار فرۆشیو تەنوور دروست کردنو پێستە خۆشکردن و بیناکارییدا.
گەلێك لە سەرچاوەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە پیریادییەکان تێکەڵاوییەکی جوانیان هەبووە لەگەڵ تورکمانو جولەکەکانو گەلێك لە هۆزەکانی تری ئەو ئاقارە.
بۆ نموونە تێکەڵاویان لەگەڵ جوولەکەکان زۆر بە هێز بووە بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هاوبەش بوونە لە گۆڕستانی جولەکەکان لە ناشتنی مردووەکانیان، یان وەکو مەلا عابید کە لە بنەڕەتدا جوولەکە بووە کاتێك کەسوکاری مردوونە ئافرەتێکی گەڕەکی پیریادی بە خێوی کردووەو گەورەی کردووە کە لە دوایدا بووەتە موسڵمانو تا مردنی لە مزگەوتی (مەلا عابیدا) بووە.
ساڵانە لەم گەڕەکەدا پێشبڕکێی قورئان خوێندنو مەقامو تەراویحیان کردووەتەوەو ناوبانگیان لە بەغداو موسڵ بڵاوبووەتەوە.

*** دابوونەریت و بیروباوەڕی پیریادی:-**

١- هەردەم هەوڵی ئەوەیان داوە کە هەژارو لێقەوماوان دڵدە بدەن لە هەموو سەردەمەکاندا بە خۆڕاییو بێ بەرامبەر.
٢- بایەخیان زۆر بە دەورووبەیان داوەو خاوەن پەیوەندی پتەو بوونە.
٣- لەگەڵ هەموو چینو توێژەکاندا هاوگونجاوو بوونەو خۆیان گونجاندووە.
٤- زمانی پاراویان هەبوو لەگەڵ خەڵکیو لێك تێگەیشتن.
٥- زمانی ئاینیان دەوری بینیووە لە بڵاوبوونەوەو ڕێزگرتنیان.
٦- خاوەن پیشەبوونەو سادەییان دەوری بینووە لە سەرکەوتنی پیشەکەیان، ناوبانگ دەرکردنیان.

٧- کەسایەتی و پیاوی ناوداریان تیا هەڵکەوتووە کە خزمەتی مرۆڤایەتیان کردووە.

٨- پاراستنی کوردەواری خۆیان لەپاڵ بیروباوەڕە ئایینییەکەیان کە هەردەم هەوڵیان داوە بە زمانێکی کوردی پاراو خزمەتی ئایینییەکە بخەنە ڕوو.

٩- جیاوازی نەکرد لە یارمەتی لە هەموو توێژو ئایین و زمان و نەتەوە.

١٠- گەلێك زاناو مەلای ئاینیان تێدا هەڵکەوتووە کە نموونەیان مەلا عەبدوڵای خەڕیانە لە گوندی خەڕیان لە ناوچەی هەورامان.

١١- هەڵکەوتنی پیاوی سیاسی و ڕۆشنبیر لە هەموو بوارەکاندا.

* شەجەرەی تەریقەتی ( پیریادی - قادری )

سەید زەنوون (زەنوور)
فەتحوڵڵا سەید زەنوون
عەبدولکەریم فەتحوڵڵا سەید زەنوون
حوسێن عبدولکەریم
حەبیب حوسێنی عەبدولکەریم
شوکور ئەڵڵا حەبیب
بابە محەمەد شوکور ئەڵڵا
بابە ئیبراهیم بابە محەمەد
یەحیا بابە ئیبراهیم
خالید یەحیا بابە ئیبراهیم
یەحیا خالید
ئەحمەدی گەورە
یەحیا ئەحمەدی گەورە
حوسێنی یەحیا
کەریم حوسێن
حەسەن کەریم
سەید عەلی حەسەن

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (١١)، شوباتی ٢٠٠٤. لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:- محلة پیریادی بکرکوك اسسها اهالي قرية پیریادی في چمچمال، نووسینی:- د. زەنوون پیریادی، لاپەرە (١٣٥- ١٣٦).
٢- ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (١٠٢٨) لە ڕۆژی ٢٨ی کانوونییەکەمی ساڵی (١٩٨٨) لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:- پیریادی نووسینی د. زەنوون پیریادی.
٣- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٩٨)، ساڵی ١٩٩٧.

## * شوێنە پیرۆزەکانی یارسان

**هاشم کاکەیی**

هەر میللەت و ئاینێك پیاوچاك و ناوداری خۆی هەیە، کاکەیی یارسانیش پیرو پیاوچاکی خۆی هەیە بەدرێژایی مێژووی پەیدابوونی لەسەر خاکی کوردستان، ناوی ڕێبەران و کەسایەتییەکانی بەسەرتۆپی کوردستان و عێراقەوە دیارن و ناسراون، بڕێجار لەقەد پاڵی شاخێك و یان لەژێر دارەگوێزێك ئارامگای شەخسێکی کاکەیی یارسانی دەبیندرێت و بوونەتە زیارەتگای یاران و برواداران، بۆ نموونە سان سەهاك لە شێخانی نەوسوودو باباناوز لە سەرگەتی خورماڵ و بابایادگار لە ناوچەی ڕێژاوی سەربە کرندی خوارووی کرماشان لەنێوان کێوەبەرزەکانی داڵەهۆ و سەرانە. شا ئیبراهیم کورەزای سان سەهاك لە بەغداد و ئیمام ئەحمەدی کەرکووکی ناسراو بە (خان ئەحمەد) کە ئەم زاتانە لە پیرەکانی کاکەیین و لە ئەردەڵانییەکان و فەرمانڕەوابوون و ناوییان لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە. ئەم بابانەی ناوچەکانی بناری گل و کفری و خانەقین وەك باوە شاسوار، باوە قەتاڵ، باوەپلاوی، شێخ باوە، شا هەیاس، لەشاری موسڵ (وەردەك)، جگە لە مەقامە پیرۆزەکانی باوە حەیدەرو باوە یادگار بەداخەوە بەدەستی داعش تەقێندرانەوە. میر ئەسکەندەر لە هاوار(هەڵەبجە)، بابا غەیب (تەوێڵە)، باباناوز سەرگەت (خورماڵ). میری سوور(شارەزوور)، ئەشکەوتی مەرنەوی. ئەحمەد برندە (میرەدێ). تەکیەی باوە هەیاس (تۆبزاوە)، تەکیەی میر سوور (تۆبزاوە)، تەکیەی باوەنەسرەت (کۆبانی/عەرەبکۆی)، تەکیەی باوە ڕەشید (عەلی سەرای)، تەکیەی عەلەمدار (عەلی سەرای)، تەکیەی سەید برایم عەلەمدار (زەنقر)، تەکیەی خاتووشایە (عەلی سەرای)، تەکیەی سەید چراو (زەنقر)

ڕۆشنبیران و مێژوونووسان چاك دەزانن ئەم زاتانە هەموویان کوردن و سەر بە ئایینی کاکەیی یارسانن گەرچی هەندێکیان ناوو مێژوویان شێوێندراوە پاش بە موسڵمان بوونی ناوچەکە بە عەرەبی بیابان ناوزەد کراون هەر لەبەر ئەو هۆیەش بووە دەسکاری نەکراون و وەك خۆیان ماونەتەوە، هەندیکیشیان کراونەتە موڵکی ئاینێکی تر بەهەڵە. لەم ڕۆژانەدا دەنگۆی داگیرکردنی ئەم شوێنە پیرۆزانەی کاکەیی یارسان لە ئارادا هەیەو گوایە لایەنێك بەتەمایە بیخاتە سەر وەقفی برایانی شیعە ئەمەیش بووەتە مایەی نیگەرانی پەیڕەوانی کاکەیی کە بەهەڵێکی دەزانن بۆ سڕینەوەی ئاینەکەیان، بۆیە نابێ ئەو شوێنانە بەهیچ شێوەیەك لە لایەن برایانی سوننەو شیعەوە دەسکاری بکرێن، چونکە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرمان هەیە هەموو باوەکانی کوردستان موڵکی ئاینی کاکەییە پەیوەندییان بەو لایەنانەوە نییە.

باوە مەحمی، باوە -بابامەحمود دوو جۆرە پێناسەی هەیە یەکەمیان لە بنەماڵەی پیرسەید باوەیسی عەلەمداری یارسانییە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی ژیاوە هاتووەتە خانەقین و ئاینی کاکەیی یارسانی بڵاوکردووەتەوە لە ناوچەکە و ئەو دوو گوندانەی بەناوەکانی (باوە مەحموی) و (باوەپلاوی) بەناوی ئەو زاتەوە ناونراون، ڕای دووەمیان دەوترێ لەسەردەمی باوەناوز سەرگەتیدا ژیاوە لە ٥٣٠ك لە ژیاندا بووەو هاوڕێی شێخ باوای حەکیم بووەو هاتووەتە خانەقین و باوەڕی یارسانی بڵاوکردووەتەوە و برایەکیشی هەبووە بەناوی باوە بەهار بەگوێرەی یاداشتی بابم. ناوی دایکی گوڵ پەری بووە دەوترێ باوکی ناوی باوە گیلدی بووەو لە شاری سلێمانی وەفاتی کردووە. مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ ناوی ئەو شوێنانەی سلێمانی نووسیوە لە یاداشتەکانیدا وەك باوە چیچەك و باوە گیلدی کە کاکەیی یارسانین.

. ئاینی یارسان هەموو شارو شوێنەکانی کوردستان بەپیرۆز دەزانن و بارگای تیشکو تەجەلیاتی خوای بەرکەوتووە. مامۆستا عەبدوللەتیف گلی سەبارەت شوێنە پیرۆزەکانی کاکەیی نووسیویەتی (لە باسی مێژووی هۆزی گل): باوەقەتاڵ زیارەتگەیەکی ئاینییە بەسەر لوتکەی چیایەکەوە لەنزیك ئاوایی (کۆرمۆری جان وەیس بەگ)، کانیاوێکی گەراویشی لەپاڵدایە، پێشان خەڵکی ناوچەو دەورووبەری و زۆر لە کاکەییەکانی هەورامان، هەموو ساڵێ دەهاتن بۆ سەر ئەم باوە قەتاڵە بۆ زیارەت و بەرەکەت و دەواریان لێهەڵدەدا و چەند مانگێ لەوێ دەمانەوە، هەروەها زۆر لە کاکەییەکانی ناوچەی کەرکوك هەموو ساڵێ دەهاتن بۆ زیارەتی[1]عەبدوللەتیف عەبدولمەجید گلی، چەند لاپەرەیەك لەمێژوو و ژیانی و فۆلکلۆری هۆزی گل، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژ(١١١)ساڵی ١٩٨٦ل١٢١ ئەمە دێرەیشی بەدەمی کاکەییەکانەوە نووسیوە) (ئەی باوە قەتاڵ نەتکرد خوڵکمان/ پەنای شارەکان بییە موڵکمان).

### * کاکەیی لە خورماتو، کفری و کەلار:

ئەوەی مێژووی ناوچەی گەرمیان بخوێنێتەوە سەرنج لە ئاسەوارو گۆڕی پیاوچاکان و شوێنەوارەکان بدات بۆی دەردەکەوێت دەڤەری گەرمیان لانکی پیران و پیاوچاکانی کاکەییە چەندین باوە و بنەماڵەی کاکەیی لە خورماتودا هەبوون، بەڵام وادیارە وردە وردە نەوەکانیان خۆیان گۆڕی و دۆنای دۆنێکی زایەرییان کرد ! لەگەڵ ئەمەیشدا هەندێ بنەماڵیان دیارن تائێستا وەك خۆیان ماونەتەوە، مام عزەت هەبوو ناودارترین پیاوی ئەم بنەماڵانە بوو، زاتێکی قسەخۆش و دانا, سینە پڕخەزینە، بەردەوام هامشۆی باوکمی دەکرد لە موسەڵلای شاری کەرکوك. جگە لەم زاتە لە خورماتوو بنەماڵەی گۆزەچیە کاکەییەکان زۆر ناسراون بەو پیشە کەلتوورییەوە، ئەمانەلەمێژەئەوکارەدەکەن‌لەباوباپیرانیانەوە، کەپیشەیەکی کۆنی پیرۆزیناوئاینی یارسانە، ناسراوترینیان وەکو: مام کەماڵ و جەماڵ گۆزەچی و عومران و هەیاس عەباس گۆزەچی و ئیسماعیل گۆزەچی. کاکەییە زۆر هەبووە لە ناوچەی (گل)، بەتایبەتی لەزەمانە کۆنەکاندا و پەیوەندییەکی توندو تۆڵیان لەگەڵ گلدا بووە، بوونی باوە قەتاڵ لەسەردەمی عوسمانی لەوێدا کە زۆر لەپێش جان وەیس بەگی گەورەی گل لەگەڵ کاکەییەکان لەوێدا بوون،

نیشانەی نیشتەجێ بوونی کاکەییە لەو ناوچەیە. مامۆستا عەبدولەتیف گلی لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ساڵی ١٩٨٦، چەند لاپەڕێك لە مێژوو و ژیانی و فۆلکلۆری هۆزی گل. سەبارەت شوێنە کۆنەکانی ناوچەکەی نووسیویە: ((هەندێ شوێنیشی تێدایە هەر لە کۆنەوە بەشوێنی ئایینی و پیرۆز ناسراوون، وەك: باوە قەتاڵ: زیارەتگەیەکی ئاینییە بەسەر لوتکەی چیایەکەوە لەنزیك ئاوایی (کۆرمۆری جان وەیس بەگ)، کانیاوی گەراویشی لەپاڵدایە، ئاوەکەی گۆگردییە، پێشان خەڵکی ناوچەکەو دەوروبەری و زۆر لە کاکەییەکانی هەورامان هەموو ساڵێ دەهاتن بۆسەر ئەم باوەقەتاڵە بۆ زیارەت و بەرەکەت و دەواریان هەڵدەداو چەند مانگێ لەوێ دەمانەوە، هەروەها زۆر لە کاکەییەکانی ناوچەی کەرکوك هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ زیارەتی، وادیارە باوەقەتاڵ یەکێ لە پێشەواکانی کاکەییەکان بووبێ. لەبارەی بیناکردنی ئەم زیارەتگەوە پیرەپیاوو پیرەژنەکانی ئەو بنارە سەرگوزەشتەیەك دەگێڕنەوە دەڵێن: وەختی خۆی جان وەیس بەگی گەورەی سەرۆکی خێڵی گل تووشی دەردێکی پیس دەبێ، هەر حەکیمێك دەهێننە سەری بۆی چارناکرێ، ماوەیەکی زۆر لەناو جێگادا دەکەوێ چاوەڕوانی مەرگی خۆی دەکات. ڕۆژێکیان کە جان وەیس بەگ لە گیانەلادا دەبێ و خەڵکەکە خەریکی کفن و ئامادەکردن و ئاو گەرمکردن بۆ شۆردنی دەبن، سەیر دەکەن وا جان وەیس بەگ هۆشی هاتەوە بەبەراو ساغو سەلیم ڕاست بووە لەجێگاو چووە ناو خێڵەکەی پێی ووتن لە گەڵی بکەونە ڕێ بۆ لوتکەی چیاکەی نزیك ئاوایی، پێیان دەڵێ یەکێ لەخسانی خوا هاتووەتە خەوی پێی وتووە لە جێگاکەی هەڵسێ و بچێ بۆ سەر لوتکەی ئەو چیایە، لەوێ شوێنی ڕمێك دەبینێ تەقاندویانەو چەقیوە بە زەوییەکەدا، ئەوە نیشانەی باوەقەتاڵی پیاوخاسی کاکەییە، گومەزێکی بەسەرەوە بکاتەوە. جان وەیس بەگ لەگەڵ خێڵەکەیدا دەڕۆن بۆ سەر لوتکەی چیاکە، دەبینن ڕاستە وا شوێن تیرەکە دیارەو چەقیوە بە عەرزەکەدا، لەوێ ماڵێك بەبەردو گەچ بە گۆشتاوی گۆشت گا گیراوە دروست دەکات. تا ئێستاش کەلاوەی ئەو ماڵە هەرماوە. جان وەیس بەگ کە خۆیشی پاش ماوەیەك دەمرێ هەر لەو ماڵەدا گۆڕی بۆ هەڵدەکەنن و دەیشارنەوە.))

[٢]عەبدولەتیف گلی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٨٦، ل١٢١). من پێموایە چۆڵبوونی ئەو ناوچەیە لەکاکەیی بۆ ئەو ئاژاوانەی نێوان هۆزە کوردەکان و دژایەتی باوەڕی کاکەیی دەگەڕێتەوە، لە زۆر شوێن ئاوایی ئێمەیان داگیر کردووە و کاکەییان لێ دەرپەڕاندوە، کاکەییش لەسەرەتای هاتنی ئینگلیزو پێشتریش شەڕی نەبووە لەگەڵ ئەو هۆزانەی ناوچەکەو بۆ وەرگرتنەوەی ماف خۆی، تەنیا ڕووداوێك لەنێوان کاکەیی (قەڵخانلو) و هەمەوەند بووە لەسەردەمی عوسمانی . هەروەها شەڕێکیش لەگەڵ تاڵەبانی داقوق. ئەم کاکەییانە هەمیشە ئاشتی خواز بوون، لەبەر پاراستنی باوەڕەکەیان ملکەچی ئەو دەرپەڕاندنانە بوون لەزۆر جێگاو شوێن.(ئەی باوە قەتاڵ نەتکرد خوڵکمان/ پەنای شارەکان بییە موڵکمان) ئەم بەیتە فۆلکلۆرییە ڕەنگە لەدەمی کاکەییەکانی بناری گل تۆمارکرابێ. محەمەد بەگ جان وەیس بەگ ١٨٨٥-١٩٦٠ سەرۆکی گل لە ١٩٠٧ نەوتی ناوچەی گلی سووتاندوە دەوڵەتی عوسمانی لە شاری کەرکوك بەندی دەکات و فەرمانی خنکاندنی دەدەن، بەڵام بەهۆی دەسەڵاتی سەیدئەحمەد خانەقاو سەید وەلەد کاکەیی لە مردن ڕزگاری بووە[٣] عەبدوللەتیف گلی لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٨٦، ل١٢٠). لە کفری چەندین بنەماڵە کاکەیی هەبوون بەڵام توانەوە، تەنیا ئاسەواری باوە شاسوارمان ماوە جگە لە قسنی وەجاغ زادەی باوەکان، باوە مەحمی، لە کفریدا لەناو گەڕەکی(ئیسماعیل بەگ) کۆڵانێك هەیە، بەناوی دەدەکانی کاکەییەوە ناوبانگی دەرکردووە کە جاران هەموو کاکەیی بوون، زۆربەی دوکان و بازاڕیان بەدەستەوە بوو، خوالێخۆشبوو مامۆستا مستەفا نەریمانی نووسەر کە خەڵکی کفری بوو زۆری بۆ باس کردم سەبارەت بە کاکەییانی کفری کە لە چلەکانی سەدەی بیست ژمارەیان زۆرو لەبەرچاو بوونە لەشاری کفری زۆر بنەماڵەشیان بە تورکی و ماچۆ قسەیان کردووە. نووسەر سەلاحەدین عەبدولحەمید عەبدوڵلا لە کتێبەکەی (شاری کفری) دەڵێ: لە ڕووی ئاینیەوە چەند ماڵێکی کاکەیی نەبێ هەمووی موسڵمانن)[٤]سەلاحەدین عەبدولحەمید عەبدوڵلا، شاری کفری لە تەرازووی ڕەسەنایەتی و شارستانییەتدا چاپخانەی ڕەهەند سلێمانی ٢٠٠٨)ل٢٦). بەڵام باشە ئاماژەی بە شاعیر خەلیل منەوەر کاکەیی کردووە، کە خەڵکی کفری بووە کاتێ قۆجە شاوڵی جوولەکە دەبێتە ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی کفری لە شیعرێکدا وتوویە (ئەوساکە زانیم کفری کاولە / ئەعزای مەجلیسمان قۆجە شاوڵە)[٥] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦. بەداخەوە لە کتێبی (ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٤٥، حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، بەهیچ شێوەیەك ناوی کاکەیی لەو شارەی باوەشاسوار باس نەکردووە لە لاپەرە (١٢١) نووسیویە: ((بەشی ئیسماعیل بەگ، ئەم کوچەو کۆڵانانەی لەخۆگرتبوو ١-دەدە ٢-کویلی ٣-قشلە ٤-ئیسماعیل بەگ ٥-کرمانج))[٦]ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٤٥، حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، کەرکوك ٢٠١٠ ل١٢١). بەڵام ئەوەتانێ مامۆستا نەریمان لە باسێکی شاعیری هجری دەدەی کاکەیی نووسیویە: ((دەدە: لەناو تورکماندا بەبرای گەورە دەڵێن (دەدە) بەرامبەر (کاکەی) کوردییە، بەڵام لەناو کاکەییەکاندا (دەدە) پایەیێکە لەخوار (باوە) و (سەید)ەوە، کاکەیی وەك هۆزێك هەموو کوردن، بەڵام کاکەیی وەك ئایینێك تورکمانیشیان تێدا هەیە، لە کەرکوك لە گەڕەکی (چای) بڕێك لە دەدەکانی کاکەیی مەزهەب هەیە، لە کفریدا لەناو گەڕەکی (ئیسماعیل بەگ) کۆڵانێك هەیە بە (کۆڵانی دەدە) ناوبانگی دەرکردووە، کە جاران مەڵبەندی دەدەکان بووەو ئێستا وەچەیان لێماوەتەوە (هجری دەدەیش یەکێکە لە دەدەکانی گەڕەکی چای لەشاری کەرکوکدا، نازناوی شیعری (هجری) بۆخۆی هەڵبژاردوەو پایەشی لە کاکەیەتێدا (دەدە)بووە.[٧] بڕوانە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٧)ئەیلولی ١٩٨٥ ل٢٢٢. هەروەها لەکتێبی ناوچەی کفری ل١٣٠ کە باسی هۆزی داودە دەکات دەڵێ: ((داودەی کوردستان لە گوندەکانی (قەڵخانلو، عەزیز قادر، توکن، تەپە

چەرموو، دوراجی، زندانە، پەڵكانە، ...هتد و داودەی گەرمیان لە گوندەكانی (حەوت تەغار و عەلی سەرای نیشتەجێن))، وادیارە بەهەڵە ناوی عەلی سەرای هاتووە چونكە عەلی سەرای داودەی تێدا نیەو ناوچەی داودە بەپێی ئەو هەرێمەی تیایدا دەژین كراوەتە دوو بەشەوە (داودەی كوردستان) و (داودەی گەرمیان)، داودەی كوردستان بەو داودە نیشتەجێبووانەی دێهاتەكانی ڕۆژهەڵاتی دوزخورماتوو هەوەها ڕۆژهەڵاتی ژووروی كفری دەژین، لە دێهاتەكانیان: دوراجی، چەوری، زندانە، تەپەچەرموو، قوری چای)یە، بەڵام (داودەی گەرمیان)یش كەوتوونەتە ڕۆژئاوای دوزخورماتووەوە، لە دێهاتەكانیان: (حەوت تەغار، پارەپارە، ئەلبو سەباح، شاسەیوان)ن، بۆیە من پێموایە برێك لەو گوندەكانی داودە، كاكەیی هاوشانی ئەوان تێیدا ژیاون و تێكەڵ بەیەكبوونە، وەك پارەپارەو هەفتەغار، كۆمەڵێك هەفتەغاری ئێستا كاكەیین و بەڵام ناوبردنی گوندی عەلی سەرای كاكەیی لەو سەرچاوەیە هەڵەیە؟ كاكەییەكان دەگێرنەوە ئاغایەكی داودە هەبووە، كتێبی پیرۆزی كاكەیی دەخوێندەوە تامرد پیشانی كەسی نەداوە. لە فەرهەنگی (المنجد) نووسراوە داودە خاوەن ئاینێكی تایبەت بوونە لە قاموسی (المنجد في اللغة والاعلام) سەبارەت بە (داودە) نووسراوە: الداوديون طائفة كردية تعيش في نواحي خانقين ((العراق)) يتبعون داود النبي مفضلين اياه على سائر الاولياء لهم كتابهم الزبور)[8] ص٢٨٢. چاپی ساڵی. لە نووسینێكی مامۆستا ڕۆژبەیانی لە گۆڤاری سردەم العربی ژمارە(٢)ی ساڵی ٢٠٠٣ (كركوك في عهد الاستعمار البريطاني، نووسیویە دەڵێ لە وەزراەتی عەبدولموحسین، جەعفەر عەسكری بووە باڵیۆز لە لەندەن، دوو وەزیری دیكەی كوردیش هەبوون لەم وەزارەیە، ئەوانیش یاسین سەلمان كاكەیی بوو كە نازناوی هاشمی بەخۆیەوە نابوو، وەنوری مەلا سەعید...ئەم دوو كوردە كەلە (كوردایەتی- خەباتی نەتەوەیی وازیان هێنا) خەڵكی شاری (كفری)بوون، لەپێناو شاردنەوەی ڕاستی كوردبوونی خۆیان پەیوەندی خۆیان بە كفرییەوە بچڕاند، بەڵام میمك-پووری(یاسن) ژنی یەكێك لە گەورەكانی كاكەیی بوو لە كەركوك..یادم نیە بەتەواوی خێزانی سەید خەلیل یان سەید وەلەد بوو. هەوەها خوشكەكەی خێزانی خالد شێخ عەلادینی نەقشبەندی بیارە بوو.))[9] گۆڤاری سەردەم العربی ژمارە(٢)ی ساڵی ٢٠٠٣ (كركوك في عهد الاستعمار البريطاني، ترجمة:انور مندلاوي، ل١٢٥. من لە خوا لێخۆشبوو، عەدنان ئاغای كاكەیی پرسیاری ئەم بابەتەم كرد، بەڵام ئەو وتیی شتی وا نییە. ئەڵێن ئیسماعیل قەرەنی كاكەیی بووە بەرپرسی تەشریفاتی پاشایەتی بووە. هەروەها سەید محەمەد وەهەب نوێنەر بووە لە پەرلەمانی عێراقی پاشایەتی، بەڵام لەسەرچاوە باوەرپێكراوەكان ئەمەم نەبیستووە. هەروەها شاعیر خەلیل منەوەر زۆر لە كفری دا ژیاوە زۆربەی داستانە شیعرییەكانی لەو ناوچەیە وتوون، دەیان خزم و كەسوكاری كاكەیی لە كفریدا هەبووە بڕوانە دیوانەكەی ناوی خەڵكان دەبات و لە شیعرێكی دەڵێ بە چاوشەكان بەڵێ بەشەرتێ حاڵداشم بكەن) / لە شایی توركمان شاباشم بكەن. سەرەڕای دوو شاعیری دی بەناوەكانی شەوقی و گریانی. كە پلەی نەقیبیان بووە لە سوپای عوسمانی. شیعرەكانیانم بەچاپ گەیاند لە ٢٠١٦. باوكی شەوقی بەقاڵ بووە لە كفری و بە سەیدسەمین دەناسرێ. نووسەرو سیاسییەكی ناوداری كاكەیی كفری ناوی سەید هاشم بووە. شاری كەلاریش گوندێكی كۆنی ناوچەی گەرمیانە بەندە لە ساڵی ١٩٧٧دیتم گوندێكی بچوك بوو، بەڵام لەم سەردەمە شارێكی گەورەو فراوانە، لە كەلار چەندین بنەماڵەی كاكەیی هەیە و خاوەن تەكیەی خۆیانن (تەكیەی باوە ڕەشید) ناسراوترینیانە

تێبینی ئەم نوسیانەم كتێبێكە بەناوی مێژووی كاكەیی/ یارسان لە كوردستاندا و ئامادەیە بۆ چاپ

*** كاكەییە گۆرانەكانی باقوبە و خانەقین و مەندەلی:**

محەمەد ئەحمەد ئەلحوسێنی لە گەشتەكەیدا (رحله المنشی البغدادی) باسی شاری باقوبەو خانەقین و گوندەكانی شارەبان و قزلرەبات دەكات. دەربارەی قزلرەبات دەڵێ بەروبوومی ئەم گوندە گەنم و جۆ و توتنە، خەڵكەكەیشی سوننەو عەلی ئیلاهین و لەو شوێنەیشدا پێنج گوندی بچووك هەن خەڵكەكەی عەلی ئیلاهین (د.كەریم نەجم شوانی لە كتێبەكەی الكاكائية اصولها وعقائدها/ بەكاكەییان دەزانێ-هـ.ك) و زمانی ئەو شوێنانەیش كوردیین، بلێ كێ هەیە بە توركی بدوێ. خەڵكەكەی قزلرەبات ٦٠٠ ماڵە[1] رحلة المنشي البغدادي الي العراق. ت. عباس العزاوي ط١ شركة دار الوراق ٢٠٠٨ ل٥٦. لە خانەقین- لەناوچەی خانەقین و گەبیە و مێخاس و حاجی قەرە و پیكە و عەماراو كەرەپو و چەمچەقەل و قەڵەمە بە سەرۆكایەتی ڕەشید باوە وەلی و سیاولەو باریكە و باپڵاوی پچووكی و ئەمین باپیرو دارەخورما بەسەرۆكایەتی حوسێن سەی عەزیز. لە دێی سەی برزۆ پەلەچەفت و دەربەندجق.[2] كەریم زەند، ئاین و باوەر لە كوردستان دا، ل٧٨

كاكەیی هۆزێكی گەورەو ناسراوە وەك باوەرێكی ئایینی - لقێكی بچوكی لە خانەقین و دەوروبەریدا هەیە، لقەكانی دیكەیشی هان لە مەندەلی، كفری، داقوق، هەڵەبجە، ئاسكی كەڵەك (گوێر)و لە پارێزگای كرماشانی كوردستانی ئێران لە قەسرشیرین و كرند و سەهەنەو دەینورو شوێنانی تر[3] بروانە محمد جمیل الروزبیانی مدن كردیە قدیمە مگبعە هەوال السلیمانیە ١٩٩٩ ل٢٦١. هەروەها لەبەشی مەقام و گۆرە پیرۆزەكانی خانەقین ئەم شوێن و گۆرانە لەكەسە پیرۆزییەكانی كاكەیی ئەژماركراون عەلەمدار، باوەمەحمود، ئیمام ئەحمەدی خانەقین[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦٧. بە گوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ لە خانەقین و ناحیەی قۆرەتو ژمارەی كاكەیی لە گوندی مێخاس تایر عوزیر ٤١٦ كەس و لە گوندی باوە مەحمود و حوسێن كاكی و ئەمین باپیرو باوە سمایل ٢٨٠كەس بووە. گوندی قەرامی- قەرەمیت ٢٧١كەس، گوندی شێخ ڕەحیم ٦٥كەس، باوەپڵاوی ٢٢٥كەس، گوندی پیویكە ١٢٥كەس، گوندی چەمچەقەل تایر عوزێر ٢٤٢كەس. گوندی كەرەپویلە ٢٩٧كەس، گوندی باریكە ١٩٦كەس. پلەچفت كاكەیی (؟) بووە[5] بروانە محەمەد

سەعید سۆفی، ناوچەی گەرمەسێر لەناو پاکتاوی رەگەزیدا گۆڤاری کەرکوك ژ(٤) بەهاری ٢٠٠٣ ل١٨-٢١-٣٣-٣٦).
هەروەها گوندی مێخاس عەلی خان ٢٠٠ کەس و چەند خێزانێکی کاکەیی لە دەلی عەباسدا هەبوون لە ١٩٧٧. ئەم گوندانەی جەلەولایش کاکەیی تێدا هەبوون: شێخ باوە- ئاوایی گەورە، بەیانلو. ئەم ناوەی شێخ باوا کە دراوەتە پاڵ ئەم گوندە زۆر کۆنەو دەگەڕێتەوە بۆ زاتێکی مەزنی کاکەییان کە لە دەقە پیرۆزەکاندا بەناوی(شێخ باوای حەکیم) ناوی هاتووە هاوشێوەی باوەشاسواری کفری و شاخۆشینی هۆرین شێخان، کفری و هۆرین شێخانیش لە سەردەمانێکی زۆر کۆنەوە کاکەییان تێدا هەبووە. بەڵام بەهۆی سیاسەتی ڕاگواستن و تەعریب و شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران زۆربەی کاکەییان و کورد بەگشتی بەرەو ڕومادی و شارەکانی دیکەی عێراق دوورخرانەوە و هەندێ بنەماڵەش وەك کوردانی فەیلی بەرەو ئێران دەرکران ناسنامەی عێراقی بوونیان لێ سەنراوەتەوە. نووسەر (سلیم مطر) لە کتێبی (الذات الجریحة، باسی تەعریب و ڕاگواستنی کاکەیی شاری خانەقین دەکات و دەڵێ ڕژێمی سەدام ٧٠٠ خێزانی دانیشتووی خانەقینی ئاگادارکردەوە کەدەبێ ناسنامەی نەتەوەییان لە کوردەوە بگۆڕن بۆ عارەب و بەتایبەتیش هۆزی کاکەیی کەناسنامەی نەتەوەییان بوو بە بەیاتی و تائی، ڕژێم توانی ٧٠٠خێزان ڕاگوازێتەوە ئەوانەی کە کوڕیان لە کوردستان بوون یان لە دەرەوەی وڵات، ئەوەی سەرپەرشتی پرۆسەی ڕاگواستن و تەعریبی دەکرد ڕۆکان تکریتی بوو(٦)سلیم مطر، الذات الجریحة، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، گ٢ ٢٠٠٠بیروت)ل٢٣. هەر ئەم نووسەرە کورتە باسێکی مێژووی کاکەیی نووسیوە بەوەی بەشێکی ڕەسەنی پێکهاتەی دانیشتووانی عێراقن و ناوەکەیان لە کاکەی کوردییەوە هاتووە، بیروباوەڕیان بەنهێنی دەشارنەوە لەبەر نەبوونی ئازادی ڕادەربڕین و باوەڕ و بڕوایان بە دۆنای دۆن و دەورەکانی دابەزینی ڕۆح لە جەستەدا هەیە پیرۆز ڕاگرتنی ژمارە حەوت و بەرجەستەبوونی خوایی حەوت جار بووە. کاکەیی بەشێوەیەکی گشتی خەڵکانی ئاشتیخوازن و لە کرانەوەدان بەرووی کۆمەڵگەدا و تێکەڵی دەبن لە رووی ژن و ژنخوازیی لەدەرەوەی تایفەکەیانەوە.(٧)بڕوانە ل٤٤٢ سەرچاوەی پێشوو

*** کاکەییە گۆڕانەکانی قەزای مەندەلی:**

دانیشتووانی مەندەلی:- کورد یەکێکە لەدانیشتووانە ڕەسەنەکەی ئەم شارەو دەوروبەری، لەمەندەلی دا گەلێ تیرەو هۆزی بەناوبانگ هەیە وەك: قەرە ئالوس، کاکەییەکانو حوسێن موسلم کاکەیی خەڵکی قەڵەم حاج و باوە ڕەزای کاکەیی لە مێژووی مەندەلی دا بەناوبانگو دیارن، لەسەردەمی عوسمانیو هاتنی ئینگلیزەکان، ئەمانە خاوەن تەکیە بوونە لە قەڵەم حاجو ئەم تەکیەیە لەلایەن سەید وەلی کوڕی سەید عەلی بەڕێوە دەبرا، پاشان لەلایەن (سەید ئەحمەد مەترود)و بەڕێوە براوە لە ساڵانی پەنجاکاندا، خەڵکانی کاکەیی قەڵەم حاجو دوو شێخ ئەم شوێنە پیرۆزەیان دروست کردووە. کاکەییەکان قەڵەم حاجی مەندەلی لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە لەم شارۆچکەیەدا دەژین، ڕەنگە بەشێك بن لەگۆرانەکانی هەردوو دەوڵەتی حەسنەوێو عەنازی - عەیاری، ئەمانە خاوەن ماڵو داراییەکی زۆر بوون)[1]بڕوانە محمد جمیل الروژبیانی مدن کردیة قدیمة،، حکومة اقلیم کوردستان، مطبعة هةوال السلیمانیة س١٩٩٩،ص١٧٣. بەڵام بەهۆی بچڕانی ئاو لە شارۆچکەی مەندەلی باخو بێستانەکانیان فەوتان، ئەمانە بەزۆری جوتیاری ناوچەکە بوونو بڕێکیشیان بازرگانی دانەوێڵە بوون، پەیوەندییەکی چاکیشیان لەگەڵ خەڵکی مەندەلی دا هەیە هەر وەك هەمو شوێنانی تر کە تێیدا دەژین. دوو شێخ کە ٣٠٠ ماڵ کاکەیی بوونەو دوو هەزار کەس بوون لە ساڵی ١٩٥٧ هەروەها قەڵای میرحاج و (دەرو) هەموو کاکەیین، دکتۆر عەبدوڵڵا غەفور لە کتێبی (جوگرافیای کوردستان)، نووسەر ناوی کاکەیی قەڵەم حاجی دەبات لە مەندەلی و دەڵێ: ((دانیشتووانی گەرەکی قەلم حاج، لە شارۆچکەی مەندەلی بە قەڵەم حاج بەناوبانگن، واتە کاکەیی..قەڵەم حاجەکان بڕوایان وایە، کە گەرەکی قەڵای میرحاج و قەڵای بالی، لەلایەن دوو براوە دروستکراون، برای گەورە ناوی لە قەڵای خۆی ناوە بالا، لەدواییدا بۆتە بالی و برا بچووکەکەشیان قەڵاکەی بەناوی خۆیەوە (میرحاج) ناوناوە، لەبەرئەوەی خۆی حاجی بووە..))(٢)دکتۆر عەبدوڵڵا غەفور(جوگرافیای کوردستان) چاپی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٥ل٢٠٣. لەمەندەلی دا گەلێ مەزارگاو گۆڕی پیاوچاکی کاکەیی هەیەو بەچاوی ڕێزەوە تەماشا دەکرێنو بەشوێنێکی پیرۆز دەزاندرێن. لە (سیاحەت نامەی حدود)دا هاتووە کە دێی (دێ شێخ) بەواتای گوندی شێخ دێت لەبەر ئەوەی (دە) یاخود (دێ) بەواتای گوند دێتو لە مەندەلییەوە دوساتە ڕێ بەپێیان دوورەو قەڵەم حاجیش گەرەکێکی مەندەلییەو ئەکەوێتە سەر ڕێگای قازانیە، بنەڕەتی ناوەکەشی (قەڵای میرحاج)ە، گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. لە (لغە العرب)دا بەداخەوە بە (علی اللهیە) نێو براون کە لەڕاستیدا وا نییە وەکو مامۆستا العزاوی ئەڵێ بەڵکو ئەوانە کاکەیین)[3] بڕوانە المحامي، عباس العزاوي، الکاکائیة في التاریخ، شرکة التجارة للطباعة، ١٩٤٩، ص ٣٨. کاکەییەکانی قەڵەم حاج لەلایەن (باوە ساڵح کوڕی باوە ڕەزا)وە سەرپەرشتی دەکران کە بنەچەی دەگەڕێتەوە بۆ (باوە گوڵاوی) کە لە گوندی (دووشێخ) نێژراوە کە پێشتر لە شێخەکانی کاکەییانی ئێران بوو لەکاتێ سەردانی دووشێخ دا لەوێ کۆچی دوایی کردووە. (سەید ئەحمەد مەترود) لە بنەچەی ڕۆحییەوە دەگەڕێتەوە بۆ (باوە عەباس_سەیدعەباسی حیلمی هـ.ك) کە سەرپەرشی کاروباری ئایینی کاکەییانی (داقوق) ی دەکردو لە گوندی (تۆبزاوە) دادەنیشت.لە (دووشێخ) یش سەرپەرشتی کاکەییان لە لایەن (سەید ئینعام سەید عەباسی گەورە)و (سەید وەلی سەید مەهدی)و (باوە نەجم حەسەن)دەکرا[4]محمد جمیل ڕۆژبیانی، مدن کردیة قدیمة، مطبعة هەواڵ ١٩٩٩، ل١٩٢. مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لە لێکۆڵینەوەیەکی خۆی بەناوی (بندنجین (مندلی) في التاریخ

قدیما وحدیثا لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری دەستەی کورد بڵاوکراوەتەوە، ژمارەی دانیشتووانی مەندەلی دەستنیشان کردووە لەگەڕەکەکان و ناوبردنی کوردی جەعفەری و کوردی سوننی و تورکمان و عەرەب. لەبەرامبەر (قەڵای میرحاج) کە دانیشتووانەکەی هەموو کاکەیین نووسیویە ٦٩٤ کەسن، هەموویان کوردی گۆرانن و سەر بە دیانەتی کاکەیین. هەروەها نووسیویە: گەڕەکی (دووشێخ) ٥٥٢ کەسن و هەموویان کوردی کاکەیین و سەربەدیانەتی کۆنن).[٥] بندنجین (مندلی) في التاریخ قدیما وحدیثا گۆڤاری کۆڕی زانیاری دەستەی کورد بەرگی هەشتەم ١٩٨٠، ل٢٨٣. لەبەشی ئاین و باوەڕدا ڕۆژبەیانی باسی خەڵکانی مەندەلی دەکات کە موسڵمانی شیعەو سوننەن، هەر لەوێندەر پاشماوەیەك لە قزلباشانی توندڕەو هەن، وە جگە لە موسڵمانان لێرەدا کاکەیی هەن، خەڵکان بە عەلی ئەڵلاهییان دەزانن، بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە کاکەیین واتە لەسەردینی کۆنی کوردان))(٦) محمد جمیل الرۆژبیانی، بندنجین (مندلی) فی التاریخ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٩٠. لە مەندەلی چەندین گۆڕی کۆن هەن گۆڕی باباگوڕجی - باوە گوڕزەدین شوێنی پیرۆزی کاکەیین
من پێموایە ئەو (دێو-دیاوس)ە، کە ڕۆژبەیانی باسی دەکات هەڵەیە، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە دەگەڕێنەوە بۆ (داوو-داوود)ی کەوەسوار، کەپێشتر باسی کەلی داوود و خەڵکانی کاکەیی کە بەداودی و خاوەن کتێبی زەبور دەناسرێن کرد.
ڕۆژبەیانی نووسیویە کاکەییەکان (نحلە-پوورە)یەکی ناسراون، خەڵکەکەی لە ناوچەکانی کوردستانی عێراق و ئێران و ئازەربایجان و وڵاتی چیا -بلاد الجبل (العراق العجمی) دا بڵاوبونەتەوە. لەگەڵ سەرۆکە ڕۆحیەکانیان دانیشتووم لە هەموو لایەکی کەرکوك و موسڵ و مەندەلی))(١١) هەمان سەرچاوە بندنجین (مندلی) فی التاریخ قدیما وحدیپا گۆڤاری کۆڕی زانیاری دەستەی کورد بەرگی هەشتەم ل٤٢٦
ناوچەکانی هەورامان بە قسەی نووسەر (محمد بهاء الدین) تا ساڵی (٨٤٢ك) بە هۆی سەختی شوێنەکەیانەوە هەر بەسەرزار موسڵمان بوونەو لە ژێرەوە لەسەر ڕەوشتی ماریفەتی پیرشالیار ڕۆیشتوون.(١٩)محەمەد بهاالدین مەلا صاحب، پیرشالیاری زەردەشتی و هەندێ لە بوێژو پیاوە بە ناوبانگەکانی هەورامان، چاپخانەی شەفیق بەغداد ١٩٦٨ ل٩ و ١٠. پیر تەیمور هەورامی، پیر ئاری هەورامی، پیر باباغەیب هاواری، ئەم زاتانە لە گرۆی ٧٢ پیرەی یارسانی هەورامانن و لە سەردەمی سان سەهاکدا ژیاون. نووسەر ئەیوب ڕۆستەم دەڵێ دکتۆر سدیق بۆرەکەیی لەکتێبی مێژووی وێژەی کوردی، بەرگییەکەمدا، ناوی ژمارەیەك لەپیرەکانی هەورامان و شاهۆی هێناوەو چەردەیەك لەژیاننامەو فەرموودەکانی ئەوانی خستووەتەڕوو، کە ٧٢ پیرەو ٩٩ پیرەی شاهۆ، هەر هەموویان یارو لایەنگری سان سەهاك و پیریی ئاینی کاکەیی/یارسان بوون.(٢٠) ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کولتوورییە، ب/١-٢ چاپی سێیەم، مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەورامان ٢٠١١ ل٢٢٧. هەر لەم سەرچاوەیەدا بەراشکاوانە ئاماژە دراوە بە پیربنیامین کە پیرخدری شاهۆی یارسانەو یەکێکە لە بازنەی (حەوتەن جاویدان)و لە یارانی سان سەهاك بووە. ل٢٢١. زۆربەی شوێنە پیرۆزەکانی کاکەیی/یارسان لە شارەزووردان (شنروێ، هاوار، تەپەسۆ-تەپی سەفا، سەرگەت، دەرەشیش، میری سوور، هۆرێن، ئەحمەبرنە، مەزاری باباسەرهەنگ لە شارەدێی تەوێڵە)، زۆربەی ئەم شوێنانە لە کتێبی ئاینییان ناویان براوە.(٢١) ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان ل؟. مسیۆ چریکۆڤ بەدەمی خەڵکی ناوچەکەوە دەدوێ و دەڵێ: (((کۆنجی) لەمەر داودیانەوە دەیگوت ئەو تایفەیە خزمەتێکی زۆریان بەخەڵکی ناوچەکە کردووە، لەکاروباری هەرەوەزەوە بگرە تا مەسەلەی دەست گرتنی زاوا و ژن گواستنەوەو یاریدەدانی قورکاری، هێندە پێرەوکاری حەزرەتی داوودن و لە ڕێگای ئەودا گیان فیدان)).(٣٦) سیاحەتنامەی مسیۆ چریکۆڤ. ل ١٢١. لەمەر ڕۆژی جەژنی خەڵکی کوردی یارسانی چریکۆڤ نووسیویە ((لەسەرەتای ساڵی نوێدا لە کرێند تایفەی عەلی ئەلایی سیازدە ڕۆژ شەوانە جەژن دەگرن، ئەمن هۆی ئەو جەژنەم زانی و نە ئەوانەی لێم پرسین دەیانزانی لەچیرا هاتووە))
(٣٧) سیاحەتنامەی مسیۆ چریکۆڤ.ل١٤٣. هەر سەبارەت بە تایفەی گۆران-یارسانی لەسەفەرنامەکەی چریکۆڤدا هاتووە زۆرێك لە تایفەی کەلوڕو گۆران لە وەرزی زستاندا مەڕو ماڵاتی خۆیان دەبەنە ناوچەکانی خانەقین و بەعقوبە..
گۆران پێشتر بە گەبران ناویان هاتووە، بەڵام ئەو ناوە زمان سوواندویەتی بوە بە گوران، یان گۆران. خێڵی گۆران بەچەند دەستەیە دابەش دەبن: زەنجاری و کرندی..ئەم هۆزە لەنێوان گاهوارەو کرماشاندا دەژین. خێڵی کەلهوڕ چەند دەستەن هەروەك هارون ئاوایی و گەیلانی و مەنسووری و، سەرجەمی وان چواردەهەزار بنەماڵەن، سەنجاوی خۆیان چوارهەزار خێزانن، زەنجاری حەوت هەزار خێزان، کرندی سێ هەزار بنەماڵەن)(٣٨) هەمان سەرچاوە ل١٥٠
لە باسی ڕێژاودا نووسیویە: ڕێژاو بەشی محاڵی کرماشانە، خەڵکی ناوچەکە هەمووی شافعی مەزهەبن، بەڵام خەڵکی باوەنیج داودین. (٣٩) هەمان سەرچاوە ل١٥٤. خەڵکی ناوچەکە تا بڵێی قەڵافەتدارو جوانچاك و چاوبرۆ ڕەشن زۆریش لە خەڵکی ئەورووپا دەچن، ئەوەی دەبینی پێچ و کڵاوی مەولەوی لەسەردایە، دەڵێن عوسمانی گەڵ ڕێژاو بە هۆزی گۆران دەفرۆشن، قەڵای شا، بەتایفەی کەلهوڕ.(٤٠) هەمان سەرچاوە ل١٥٤-١٥٥. پاشان باسی بابایادگار دەگێڕێتەوە لە گوندی زەردە و دەڵێ: زیارەتچییان شاڵی سەوز لەگەڵ خۆیان دێنن و لەسەر گڵکۆکە دایدەنێن و کوتێك لەو شاڵەی کەسێکی لەوە پێشتر بردوویەتی لەگەڵ خۆیان دەبەنەوەو وەك متفەرك بەلایانەوە پیرۆزە. زۆرێك لەو کەسانەی سەردانی ئەو پیرو موورادانە دەکەن وەك پێشکەشی شتی ئەنتیکە و بەنرخ لەسەر گۆڕەکان بەجێدەهێڵن، ئێمە (واتە چریکۆڤ) چەند دانەیەك لەو پێشکەشی یادگارانەمان لەگەڵ خۆمان هێنا، یەکێ لە بەڵەدەکانمان گوتی ئەوانە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ دەورەی حەزرەتی نوح، شتەکان زۆر وەك پوولەك و گوێچکەماسی دەچوو، لە شێوەی گوێزێکی پووچەڵ، ئەوی دیکە زۆرتر وەك مەرجان وابوو. (٤١) هەمان

سەرچاوە ل١٥٨. دوای ئەمانە دێتەسەر (دوکانی داود)و دەنووسێ: ((دوکان داود: خەڵکی کرند داودین، باسی ئەو ئەشکەوتەیان بۆ کردین، زۆرکۆنەو بەبیری کەس نییە....دوو کەس خەڵکی کرند بەو کێوە ڕژدەدا هەڵزنان و هیچ ترسیان لەبەربوونەوە نەبوو، وەختێ پرسیمان چۆنە ناترسن، گوتیان ئەو کەسەی خەتایەك لەخۆی شك ببات لەچوونە سەرێ دەترسێ، ئەو دووکەسە هاورێیەکی خۆیان هەڵکێشاو دوای ئەویش گوریسیان بۆ ئێمە شۆر کردەوەو هەڵیاین کێشاین (٤٢) هەمان سەرچاوە ل١٦٢- مامۆستا ڕۆژبەیانی لە نووسینەکانی خۆیدا دەخمەی کەلی داود-دوکان داود- کە دوو گۆڕی پادشای مادەکانی تێدایە بە ناوەکانی کیاکسارو ئاستیاگ، هاتووە ناوی سوڵتان سەهاکی یارسانی بە ئاستیاگ بەستووەتەوە. (٤٣)گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب ٨ (بندنجین مندلي في التاريخ قديما و حديثاً ل٤٢٩).

ئیدموندز دەڵێ: کەسێکی نا کاکەیی پێی وتم هەرچەندە کاکەیی بەهەموو تایفەکە دەوترێت، بەڵام ناوی کاکەیی دەبێ تەنیا بە پیرەکان بوترێت بە خەڵکەکەیش داودی(٤٤) ل ١٧٣. لە (مرات الظفر)دا هاتووە کە ئەو شوێنەی ناوبانگە بە تەنگەبەری داود، کە بریتییە لە تاقێك-دەخمە-و قەبرێکی تێدایە، خەڵکی ئەم شوێنە بەقەبری داود پێغەمبەری دەزانن کە بە(داود کەوەسوار) بەناوبانگە(٤٥) حديقة ناصريةو مرات الظفر، بەکوشش محمد ڕەوف توکلی، ل ٢٥٥. لە هەمان سەرچاوە، هاتووە ئەم تاق و هەیوانە خەڵکانی عەوام بە دوکان ئاسنگەری داودی دەزانن و تایفەی (گۆران)، ئەو شوێنە بە زیارەتگای خۆیانیان بڕیارداوە، زۆرجاریش بۆی سەردەکەون و دەچنە ناو دەخمەکەوە...حوسێن خان میرپەنجە کوری خوالێخۆشبوو ئەسەدوڵلا خان سەرتیپ و حاکمی پێشووی گۆران و زەهاو سەرۆکی فەوجی گۆرانە، کە لەباو باپیرەوە حاکم و سەرۆکی تایفەی گۆران بوونە(٤٦) حديقة ناصريةو مرآت الظفر ل٢٧٧-٢٧٨.

باشترین نووسینێك لەسەر کاکەیی-یارسان نووسرابێتەوە کتێبەکەی ئیڤانۆڤا ١٩٥٣-هۆڵەندا،. (پێرەوانی ڕاستی یارانی کوردستان (ئەهلی هەق)ە، نووسەر ئیڤانۆڤ لە ساڵی ١٩١٨ ئاسیاوی لەگەڵیان پەیدا کردووە. نووسەر دێتەسەر بیروباوەڕی کاکەیی/ئەهلی هەق و تاوتوێی دەکات و دەڵێ: ((لە بیروباوەرە ئاینییەکانی ئەهلی هەقدا کە پەیوەندییان بە مێژووەکەیانەوە هەیە، ئەهلی هەق بە زەمەن، پێشی زەمەن پێکهاتووە، زانستێکی خۆشی دروستبوونی گەردوونیان هەیە، پاش خەلیقە، بەڵام ئەوان ڕاستەوخۆ بۆ سەردەمی پەیامبەرو (عەلی) دەپەڕنەوە، خەرافاتەکانی شیعە کە لەم بارەوە هەڵبەستراون و دەگوترێنەوە، پێناچێ ڕەسەن بن و ئەسڵێکیان هەبێ، ڕاستە وەك سیستەمی دروززەکان ((عەلی خۆی وەك کەسێکی پەنادراو دەبینێتەوە). (٦٩) ئیڤانۆڤا، پێرەوانی ڕاستی یارانی کوردستان (ئەهلی هەق)ە، ١٩٥٣-هۆڵەندا، وەرگێرانی ئاسۆ کەریم، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری ٢٠٠٣ ل ٢٠٠). لە کتێبی لورستان الکبری، د. رمضان شريف الداودي، چەندین پیری یارسانی- کاکەیی ناوبردووە کە سەر بە لورستان بوون لەوانە: پیرمەنسوور شوشتەری و، پیر ئەحمەد لورستانی و، پیر حەیدەر لورستانی و، پیرمەحمود لورستانی. پیرناسر بەختیاری و دەڵێ زۆربەی هۆزەکانی لەك لە ئەهلی حەقن و کە ناسراون بە عەلی ئیلاهی، لەوانەی پاڵیان بەخۆیانەوە نا بەرادەیەکی زۆری توندرەوی لە باوەری شیعەییدا و دەرحەق ئیمامەکانیان زیادەرەوییان کرد بەشێوەیەك لە سنووری دروستکراویان دەرکردن و ئیمامیان بەخوا چوواند. ئەم ڕێبازە لە لورستان جێگیربوو، تا ئێستاش هەیە، مینۆرسکی سەبارەتی وتوویەتی ئەمە ئاینێکی کوردی پەتییە و ئەدەبیاتیان بە شێوەزاری گۆرانی کوردییە (٩٧) د. رمضان شريف الداودي، لورستان الكبرى، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر ٢٠١٠ ل١٣٥-١٤٢ نووسەر ڕەشید خیون ئەویش لە کتێبی خۆی دوو دڵە لەوەی ئایا کاکەیی دینێکی سەربەخۆیە یان بەشێکە لە ئیسلام و لە فتووەی عەرەبییەوە هاتووە دەڵێ لەو تایفانەی کە سەرپێچی ئوسوڵی ئیسلامیان کردو پاڵیان دا بەچیاکانەوە بوونی خۆیان بەبوونی چیاکان بەستەوە ئەوانە تایفەی کاکەیی یا ئەهلی هەق بوو(١٠١) رشيد خيون، الاديان و المذاهب بالعراق منشورات لسان الصدق ٢٠٠٥ ص٤٢١. بەڵام (الاب كرملي) دوای چاوپێکەوتنی بە یەکدو مەرجەعی ئەوسای کاکەیی کەوا کاکەیی عەلی ئیلاهی نین و موسڵمانیش نین و دەڵێ کاکەیی بەگوێرەی بارودۆخ خۆی دەگۆڕێ و لەپێش موسڵمان موسڵمانن و لەپێش مەسیحی مەسیحین(١٠٢) الاديان والمذاهب ص٤٢٧). هنري بندية رحلة الي كردستان في بلاد مابين النهرين ١٨٨٥، ترجمه يوسف حبي، دار اراس للطباعة والنشر، ٢٠٠١ اربيل. هەر سەبارەت بە ئاین و باوەڕی ئەردەڵانییەکان و گۆران نووسیویە: ((تێکەڵاوی ئەردەڵانی و گۆرانەکان میراتێکی کولتووری دیاری داهێناوە- کتێبێکی زۆر بەزمانی گۆرانی، ئەو زمانەی تا کۆتایی سەدەی هەژدە زمانی شیعر، مێژوو، نووسینی ئاینی و ئیتنیکی و کۆشکی ئەردەلانی بوو... لەوەدەچێ ئەردەڵانییەکان لەرابردوودا لەگەڵ گۆرانەکان دا یەك باوەڕی ئاینییان هەبووبێ، ناوی عەلی، کە لە ناو ئەهلی هەق دا خوایە، لەناوی کۆمەڵێك لە فەرمانڕەوایانی ئەردەڵانیدا هەیە، بەتایبەتیش ناوی کەلب عەلی خان کە لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا فەرمانڕەوا بووە، سەرنج ڕادەکێشێ کە کتومت ماناکەی دەبێتە (سەگی عەلی). ڕەنگە هەرگیز وا نەبێت کە ئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا خۆیانیان کردووە بە شیعە (تا دڵی شای فارسان خۆش بکەن) هەروەك ج. ریچ دەڵێ ئەوەی ئەردەڵانییەکان سەر بەئاینی ئەهلی هەق بووین، یان شیعەی ئەوپەڕگیر، لای عەبدوڵلا مەردۆخ گومان هەڵناگرێ هەروەها ئەوەش کە باپیرە گەورەی بنەماڵەکە لە خێڵی گۆران بووە(٤) هنري بندية رحلة الى كردستان في بلاد مابين النهرين ١٨٨٥، ترجمة يوسف حبي، دار اراس للطباعة والنشر، ٢٠٠١ اربيل ل١٧٥. مەستوورەی کوردستانی لە مێژووی ئەردەڵان دەڵێ (قەڵای زەڵم و پاڵنگان پایتەختی تیرەی گۆران بووە)(٥) ل٤٢ مەستوورەی کوردستانی، مێژووی ئەردەڵان. لورستانی بچووك (فەیلی) لە ڕووی دابەش بوون کارگێڕییەوە، ناوچەی پشکۆ و پێشکۆ(ماسبذان) سەربە هەرێمی چیا بوون و لە

ڕووی ئیداری و باج و پیتاکەوە سەربە بەغدا بوون(٤٣) عبدالجليل فيلي، اللور (الكورد) الفيليون في الماضي والحاضر، مطبعة وزارة التربية اربيل سنة ١٩٩٩. ل٥٥. ئەوە ڕاستە هەندێ بنەماڵەی کاکەیی هەن وەك لەك دەگەڕێنەوە بۆ فەیلی لوڕستان و تێکەڵییەك بوونە لە مێژە هۆزەکانی دلفان و تیرهان و کەڵهوڕ: شەهبازی مەنصوری دانیشتووی گەیلان و ئیوان و ئیسلام ئاباد و سەرپێڵ زەهاو و مەندەلی. زەند و سنجاوی و قەڵخانی و گاوارەیی ئەمانە هەموو کەڵهوڕن و لەسەر باوەڕی ئەهلی هەقن، بەڵام زۆرینەیان ماچۆ زمانن و گۆرانن، بۆیە ناکرێ نووسەر عەبدولجەلیل فەیلی بڵێ کاکەیی هەموویان دەگەڕێنەوە سەر لوڕ فەیلی وەك لە لیستی لاپەڕە (١١٣) کتێبەکەی ئاماژەی بۆ دەکات. بەڵێ سەرەرای ئەو بنەماڵانە چەند بنەماڵەیەکی وەك میرشاخۆشین لوڕستانی و میرخەسرەوی لوڕستانی لە مێژووی کاکەییدا بەناوبانگن و زمانیان و نووسراوە پیرۆزەکانیان بە لوڕییە هاوشانی زمانی ماچۆی گۆران. نووسەر ئەمەشی نووسیوە کە عەشیرەتی دەلۆ و شەرەفبەیانی لە خانەقین بەزاری لوڕی (کوردی فەیلی)دەدوێن لە کاری ڕۆژانەیاندا پێموایە ئەوانە بەشێکن لە کوردی فەیلی، بەڵام تا ئێستا بەڵگەی باوەڕپێکراوم نەدۆزیوەتەوە کەوا لە هۆزەکانی لوڕی فەیلی بن.(٤٤) عبدالجليل فيلي، اللور (الكورد)الفيليون في الماضي والحاضر،ل١٢٦. خەسرەو جاف لە کتێبی (اللر كرد ام لر) ترجمه: محمد البدري،دار ئاراس للطباعة والنشر اربيل٢٠٠٥ هاتووە کە چگنی: ناوچەیەکی گەرمیانی لوڕستانە لە نیوان چیاکانی(سپی کۆ)و چیاکانی(چل ران) و (تەنگ تونیلە) و چیاکانیشی بریتین لە: سپی کۆ، بافتە، سیاکۆ، برئافتاب، پیل وەراز.(٤٨) سەرچاوەی پێشوو،(اللر كرد ام لر) ل٦٤. دیارە منیش(هاشم/ك) مەبەستم لە چگنی ناوی ئەو هۆزەیە لە شەرەفنامەدا ناوی هاتووە، هاوشانی زەنگنەو سیامەنسور. فەرمانرەوایانی چگنی لە بنەرەتدا گۆرانن، هەروەها دەمەوێ ئاماژە بەناودارێکی یارسانی بکەم کە ماوەیەك لێرەدا بووە بەناوی (وسێنەی سیاکۆ). هەروەها گۆڕی (باوە دانیال) لە دەرتەنگێك نزیکی (چگنی) دایەو بە درەتەنگی موسا دەناسرێ. و (گومەزی ئەبولوەفا) یش دەکەوێتە باوەشی کێوە (برە کازم) و ئەبولوەفا بەیەکێك لە عاریفانی ئەهلی حەق و یەکێك لە خەلیفەکانی سوڵتان ئیسحاق دێتە ئەژمار. هەروەها (داود ڕەش)- بۆرە سوار داود: کە ٥ کم لە کۆهدەشتەوە دوورە کە گومەزێکی چوارگۆشەیە، هەر لایەکی ٧ مەترە، لەراستیدا لە مەزارەکانی ئەهلی هەق دەژمێردرێت، هەندێکیش لایانوایە ئەوە گۆڕی نەوەی شوجاعەددین خورشیدی دامەزرێنەری لوری بچووکە. هەروەها (مەقامی باباتاهیر) کە مەزارەکە دەکەوێتە باشووری قەڵای (قلك الافلاك) خەڵکەکەی لوڕستان لەو باوەڕەدان ئەوە گۆڕی شاعیر باباتاهیری عوریانە.(٤٩)بڕوانە خەسرو جاف، (اللر كرد ام لر) ل٦٩-٧١

*** گەشتێك بۆ کەرکوك**
**باسێکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کاتی کەرکوکە**

د. سانیحە ئەمین زەکی
و. ئەنجام سەعید

پێشووی هاوینی ساڵی ١٩٣١ بوو، باوکم بە نیازی سەردانیکردنی لەندەن بوو بۆ جێبەجێکردنی کارێکی تایبەت بۆ وەزارەتی مەعاریفی ئەوکات، ئەویش لەچاپدانی دوو کتێبی (ئەتڵەس) بوو، واتە نەخشەی جوگرافی بە زمانی عەرەبی، یەکیان بۆ خوێندکارانی هەردوو قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی، ئەویتر بە قەبارەیەکی بچووکتر بۆ خوێندکارانی قۆناغی سەرەتایی.
باوکم بڕیاریدا بە شەمەندەفەر گەشت بۆ ئیستانبوڵ بکات و لەوێوە بۆ کیشوەری ئەورووپا لەبری ئەوەی بە ئۆتۆمبێل و لە رێگەی کەشتییەوە بچێتە بەیروت، چونکە باوکم حەزی لە گەشتی دەریایی نەدەکرد.
ئەوکات کۆمپانیاکانی فڕینی هاونیشتمانیان نەبوون و ئەو فرۆکانەش کە هەبوون یان موڵکی حکومەت بوو یان هی کۆمپانیا پیشەییە گەورەکان بوو.
دایکم خەڵکی کەرکوك بوو، بەڵام لە ڕۆژی شووکردنییەوە کە دەیکردە ماوەی دوانزە ساڵ، کەرکوکی نەبینیبوو، بۆیە پێشنیاریکرد سەردانی خوشکێکی بکات لە کەرکوك و پشووی هاوینە لەوێ بەسەر بەرێت، باوکیشم بەمە قایل بوو، بەر لە گەشتەکەمان دایکم دەستیکرد بە کڕینی دیاریی بۆ خزم و کەسوکاری، دواتر باوکم بردینی بۆلای وێنەگر (دورادۆ) بۆ گرتنی وێنەیەکی بۆ یادگاریی پێش گەشتکردنمان.
باوکم لەگەڵ (حەسەن فەهمی) مامم بەرەو ئەورووپا گەشتیان کرد.
ژمارەی ئێمەش زۆر بوو بۆ گەشتەکەی کەرکوك، پێکهاتبوو لە دایکم و شەش منداڵ، من کە تەمەنم یانزە ساڵان بوو گەورەی هەموویان بووم، (فاروق) بچووکی هەموومان بوو و تەمەنی (٩) مانگ بوو، هەروەها کچێکی هەرزەکار بوو بە ناوی (عایشە) لەگەڵ خزمەتکارێك کە تەمەنی چواردە ساڵان بوو بۆ چاودێریکردنی (فاروق) واتە بەم خزمەتکارەوە ژمارەی خێزانەکەی ئێمە دەگەیشتە نۆ کەس، هەروەها کچێکی پوورم کە پێش چەند ڕۆژێك پەیمانگەی مامۆستایانی تەواو کردبوو، کە زۆر دڵخۆش بوو، چونکە لە کۆتایی پشووەکەی هاوین بە مامۆستا دادەمەزرا. (ئەحمەد)ی برا گەورەم لە ماڵی مامم مایەوە لە بەغدا.
ئێمەش شەوێکیان سواری شەمەندەفەرێك بووین لە وێستگەی باکووری بەغدا، بەڵکو بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بگەینە کەرکوك، منیش زۆر دڵخۆش بووم، کاتێك کە شەمەندەفەرەکە دەڕۆیشت هەمان هەستی پێشووم دەکرد کە بەر لە چەند ساڵێك چووبووم بۆ مووسڵ، کاتێك شەمەندەفەرەکە بەسەر هێڵە ئاسنینەکە دەڕۆیشت وامدەزانی لە هەواد دەخلیسکێم.

پاش ئەوەی وێستگەی شاری (بەعقوبە)مان بەجێهێشت، شەمەندەفەرەکە لە یەکێك لە وێستگەکان وەستا، زیاتر دڵخۆش بووم کە گوێمان لە دەنگی فرۆشیارەکان بوو بەهەردوو زمانی عەرەبی و تورکی هەواریان دەکرد، یەکێك دەیووت (رەگی و قارین)، یەکێکی تر دەیووت (لبن و یۆغورت) وامدەزانی گەشت بۆ وڵاتێکی دوور دەکەم کە خاوەن زمانێکی جیاواز و نامۆیە.
بەدەم ڕێکردنی شەمەندەفەرەکەوە نووستم، بەیانی کە بەخەبەر هاتم بینیم شەمەندەفەرەکە بە تەنیشت زنجیرە چیایەك ڕێدەکات زەوییەکەش هەمووی تاوێری گەورە و بەردە، لە ناخی خۆمدا پرسیم: ئەی کوا ئەو خۆڵ و قوڕ و لیتەیەی دەوری داوین لە بەغدا!؟.
ئەوسا بیرم کەوتەوە کە ئەمە چیای (حەمرین)ە، کە پێش شەش ساڵ لەمەوبەر بینیوومە.
ناوی وێستگەکان نامۆ بوون بەلامەوە وەك: (کفری) ئەو شوێنەی کە پوور و خاڵم کۆچی دواییان تێیدا کردبوو و (دووزخورماتوو) و (تاووق) و (تسعین)، پاشان وێستگەی کەرکوك، لەوێ بە سواری عەرەبانە چووینە ماڵی پوورە گەورەکەم لە گەڕەکی (شاترلوو)، مێردی پوورم (حوسێن بەگ نەفتچی)دەیکردە کوڕی خاڵی دایکم، چونکە پوورم مێردی کردبوو بە کوڕی خاڵی خۆی.
لەلایەن چەند ژن و پیاوێك کە جلوبەرگی تورکمانی و کوردییان پۆشیبوو هاتن و جانتاکانمانیان بردە ژوورە.
ماڵەکەی پوورم گەورە و فراوان بوو، لە ناوەندی ماڵەکە باخچەیەکی گەورەی تێدابوو درەخت و گوڵی جۆراجۆر و تەنها یەك دار خورمای هەبوو، چونکە دار خورما دەگمەنە لە شاری کەرکوك.
پوورم و منداڵەکانی پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین ئەوان پێکهاتبوون لە دە منداڵ، شەش کوڕ و چوار کچ و تەمەنیان لەنێوان شەش ساڵ بۆ بیست و شەش ساڵ دەبوو، تەمەنی پووریشم چل ساڵ بوو، چونکە لە تەمەنی سیانزە ساڵییەوە بەشوویان دابوو.
کاتی ژەمە خواردنەکان خۆشترین کات بوو، حەسیر و دۆشەکی تەنکمان ڕادەخست لەژێر داری ترێکاندا گەورە و بچووك دادەنیشتین و ژمارەمان نزیکەی (٣٠) کەس دەبوو، هەموومان پێکەوە نانمان دەخوارد.
سەرجەم ئەو خواردنانەی کە دەمانخوارد هەر لە هێلکە و کەرە و پەنیر و ماست، هەمووی هی گوندەکەی خۆیان بوو گوندی (تۆبزاوا)، تەنانەت نانە گەرمەکەش ژنە کوردێکی گەنجی جوان لە ماڵیان دەیکرد.
خواردنەکانیان زۆر خۆش و بەتام بوو، گەنمیان بە چەند جۆرێکی جیاواز لێدەنا وەکو قەرەخەرمان و ساوەر و بروێش... هتد.
چێشت لێنەرەکە نیوەڕوان و شەوان خواردنی دەنارد بۆ میوان و خزمەتکاری دیوەخانەکە، مەنجەڵەکانی چێشتخانەکە زۆر گەورە بوون، تەنانەت شووتییەکانیشیان زۆر گەورە بوون، قەبارەی هەر شووتییەك سێ جار هێندەی شووتییەکانی بەغدا دەبوون.

لەگەڵ کورەکانی پوورم دەستمان بە قسەکرد سەبارەت بە نیشتمان، هەرچەندە ئەوکات من تەنها خوێندنی سەرەتاییم تەواو کردبوو بەڵام چەند کتێبێکی وەرگێڕدراو بۆ عەرەبی خوێندبووەوە، بۆیە بوێر بووم و لەخۆم ڕادەبینی گفتوگۆ لەگەڵ ئەم خزمانەمدا بکەم، چونکە هەستم دەکرد دژی ئەو خۆشەویستییەی منن بۆ وڵات و نیشتمانەکەمان، ئەوان پڕ بوون لە (شۆڕشی عەرەبی) و هەموو ئەوانەی پشتگیرییان کرد و ڕووبەڕووی دەوڵەتی عوسمانی ببوونەوە و هێزی بیانی و داگیرکەریان هێنایە وڵاتەکەوە، هەمیشە دەیانوت (کەرکوک و هەولێر و سلێمانی) پارچەیەکە لە تورکیا و دەبێ بگەڕێتەوە بۆ تورکیا.

ئەم قسەیە زۆر قورس بوو بەلای منەوە، هەرچەندە بەناوی سوعبەتەوە دەیانوت، بەمەبەستی تووڕەکردنی (ئامینە) ی کچە خاڵیان، کە ئەویش هاوڕابوو لەگەڵ مندا و بە شێوەیەکی توند گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، منیش پاڵپشتی (ئامینە) بووم، واتە هەردووکمان دژی کۆمەڵێ گەنجی تەمەن سەروو بیست ساڵەوە ببووینەوە، کە خۆشەویستی تورکیا و غازی مستەفا کەمال پاشا ناخی داگیر کردبوون.

لەنێویاندا پوورزایەکیان دانیشتبوو بەناوی (نازم نەفتچی)، کە بەرامبەریان لە ماڵێکی گەورەدا دەژیا لە کەرکوك، ناوبراو لەگەڵ کۆمەڵێك نێردرابوون بۆ مووسڵ بەمەبەستی گەڕاندنەوەی شارەکە بۆ دەوڵەتی تورکیا، ئەمەش بەدڵی ئەمان بوو، بۆیە زۆر ڕێزیان لێدەگرت وەکو (شا)یەك بێت و لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارێ.

گفتوگۆی نێوانمان تا دەهات گەرمتر دەبوو، باس هاتە سەر هاتنە ژوورەوەی ئینگلیز بۆ وڵاتەکەمان من زۆر دەمارگیر ببووم، تا یەکێکیان ناوی (خاتوو قەحتان)ی لێنام، واتە کچی قەحتان کە دەکاتە باپیری عەرەب، هەرچەندە من لە بنەڕەتدا هەرسێ کلتوور و داب و نەریتی عەرەب و کورد و تورکمانم تێدا کۆببووەوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش سۆز و خۆشەویستی باڵی کێشابوو بەسەرماندا، قسەکانیش سنووری نەدەبەزاند و یەکترمان بێزار نەدەکرد.

پاش ماوەیەك لە قسەکردن هەستم دەکرد بەرەبەرە قسەکان کاریگەریم تێدەکەن، لە ناخی خۆمدا دەمپرسی: ئایا چی دەبوو ئەگەر عەرەب لەبری شەڕکردن دژی تورك شەڕیان بکردبایە دژی ئینگلیز؟

خۆ ئینگلیز و فەرەنسییەکان فێڵیان لە عەرەب کرد و وڵاتەکەیان داگیرکرد، وادیارە شۆڕشی عەرەبی تەنها فێڵێك بووە لە نەتەوەی عەرەب کراوە، سەرەڕای ئەوەی عەرەب هاوکاری ئینگلیزەکانیان کردووە و دژی دەوڵەتی عوسمانی جەنگاون؟ بەڵام ئەو هەستەم بۆ دایکم نەدرکاند، چونکە عێراقییەکی نیشتمانپەروەرە و خۆشی بە دەوڵەتی عوسمانی نەدەهات.

ئێمە سەرسام ببووین بەو ئازادییەی بە ژن بەخشراوە لە تورکیا، بەڵام من دەمزانی کە تورکەکان دوژمنی ئێمەن، بۆیە پاش جەنگەکە پەشیمان بووینەوە و دەرکەوت ئەوان ڕقیان لێمانە و بە خایەنمان ناودەبەن؟

لە تورکیا ستایشی زۆری (مستەفا کەمال پاشا)یان دەکرد و بە (غازی)یان ناودەبرد، منیش ستایشی شاکەی خۆمانم دەکرد بەوەی خوێندنگەی بۆ کردووینەتەوە و مامۆستای لە دەرەوەی بۆ هێناوین و سینەمای هێناوەتە وڵاتەکەوە و هاووڵاتیانی ناردە ئەورووپا و ئەمریکا، تەنها شت کە (شا) دەستی تێنەخستبێت سەرپۆشی ژنان بوو، بۆیە کەسوکارم لە کەرکوك هەرگیز باسی سفووری ژنانیان تورکیایان نەدەکرد، چونکە خوشکەکانیان لەژێر سیستەمێکی سەرکوتکەر دەژیان و سەرپۆش ئەرکی هەموو کەسێك بوو لەو سەردەمە.

پاش تەواوبوونی شیوی نیوەڕۆی ڕۆژییەکەم، هەستم بە شتێکی سەیر کرد، تەماشام کرد هەموو ئەوانەی لە ماڵەوەن لە خزمەتکارەکان و گەورە و بچووك دەستیان لە کارەکانیان بەرداو بەبێ دەنگی هەڵسانە سەرپێ.

تومەزە باوکیان هاتە دیوەخانەکەوە و بەرەو ژوورەکەی خۆی چوو و دوابەدوای ژنەکەی واتە پوورم دوایکەوت، هەر کە چووە ژوورەوە جموجۆڵ کەوتە ناویانەوە و دەستیان کردەوە بە کارەکانی خۆیان.

بەم ڕەفتارە پڕ لە ڕێز و خۆشەویستییە زۆر سەرسام بووم وامدەزانی سەیری شانۆ دەکەم، (مامە حوسێن بەگ) وەك (جۆرجی سپی) لە ڕۆڵی ناپلیۆن) دەهاتە پێش چاوم.

تەنانەت بڕیارم دا پاش گەڕانەوەمان بۆ بەغدا، ئێمەش هەمان شت بکەین بەرامبەر باوکمان، بەڵام بە حوکمی ئەو کەشوهەوا پڕ لە ئازادییەی ماڵمان بڕیارەکەم بیرچووەوە.

یەکێك لە کارەکەرەکان سینییەکی خواردنی برد بۆ ژووری (حوسێن نەفتچی) باوکیان، پاشان ئێمە چووینە ژوورەوە و سڵاومان لێکرد و دەستیمان ماچ کرد، ئەویش بەڕووییەکی خۆشەوە پێشوازی لێکردین و یەکەیەکە پرسیاری قوتابخانەی لێدەکردین.

بەیانیان حوسێن نەفتچی ماڵی بەجێدەهێشت و دەچووە گوند و نیوەڕۆ دەهاتەوە و پاش شیوی نیوەڕۆ کاتژمێرێك دەخەوت ئیتر، دەڕۆیشت تا شیوی شەوێ نەدەهاتەوە مەگەر میوانی هەبوایە.

(حوسێن نەفتچی) یەکێك بووە لەوانەی ڕەتی کردبووەوە دەنگ بە شا فەیسەڵییەکەم بدات لەکاتی دەنگدانی ساڵی ١٩٢١، چونکە ویستوویەتی لیوای مووسڵ بچێتەوە سەر تورکیا.

پاش ئەوەی مووسڵ چووەتەوە سەر عیراق، فەرمانڕەوایەتی کەرکوك درایە دەست کەسانی تر، بنەماڵەی (نەفتچی)یەکان بەمە قەڵس بوون، بۆیە ڕقیان لە ئینگلیز و کاریگەرییەکانیان بووەتە لەسەر وڵاتەکە، بەڵام دەسەڵاتدارانی (فەیسەڵ)، (حوسێن نەفتچی)یان نەچەوساندەوە و دەربەدەریان نەکرد، بەڵکو بەڕێزەوە لە وڵاتەکە دەژیا و لە ساڵی ١٩٣٨ لە سەردەمی (شا غازی) بە جێگری پارێزگاری کەرکوك هەڵبژێردرا.

(جەمیلە)ی پوورم واتە خێزانی (حوسێن بەگ) شاژنی ماڵ بوو و خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز بوو لە بەڕێوەبردنی ماڵەکە و ڕێز و خۆشەویستی بڵاوکردبووەوە لەنێوان کوڕ و کچەکانیدا.

بەڵام لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا زۆر ماندوو نەبووە، چونکە هەموو منداڵێك لە منداڵەکانی بەخێوکەری (تورکمانی

یاخود کوردی) بۆ گرتبوو، بۆیە پوورم زۆربەی کاتی بە چنینی خوری مەرەکانیانەوە بەسەر دەبردو هەرچەندە نەچووبووە بەر خوێندن، بەڵام پاش شیوی شەوان و پێش هاتنەوەی مێردەکەی کچەکانی چیرۆکی وەرگێڕدراویان بۆ دەخوێندەوە.

پوورم هاوشێوەی ئێمە عەرەبی دەزانی بە حوکمی باوکی کە داواکاری گشتی بوو لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی لە شارەکانی بەغداو عیمارە و کەربەلا، بۆیە هەموو منداڵەکانی تورکی و عەرەبیان دەزانی، بەڵام عەرەبییەکەی خزمانی کەرکوکمان شێوەی ئاخاوتنی تورکمانی پێوە دیاربوو.

سەرەڕای ئەوەی ماوەی دوو مانگ لەماڵیان بووم، بەڵام هەر ڕووخۆش بوون لەگەڵمدا و وامدەزانی ماڵی خۆمە.

پوورم دایکی دە منداڵ بوو، شەش کوڕ و چوار کچ، سیان لە کوڕەکانی نامۆ بوون، لە کەرکوك کڵاوی تورکییان لەسەر دەکرد و بە تورکی ئیستانبوڵ دەئاخاوتن، چونکە باوکیان لە ساڵی ١٩٢٨ لەبەر نەبوونی دواناوەندی لە کەرکوك هەرسێکیانی بۆ خوێندن ناردبووە ئیستانبوڵ.

خوێندن و گوزەران کاریگەریی زۆری خستبووە سەر ئەم سێ کوڕە تەنها تورکیا و کەمال پاشا بەلایانەوە گرنگ بوو، خۆشەویستی و ڕێزیان بۆ سەرۆکی کۆماری تورکیا دەگەیشتە پلەی پەرستن، بەڵام لەچاو ئەو سەرسام بوونەیان بە سەرۆکۆماری تورکیا و دانپێنانی بە مافەکانی ژنی تورك ئەمان پێچەوانەی تورکیا هیچ جۆرە ئازادییەکیان فەراهەم نەکردبوو بۆ خوشکەکانیان.

بە کورتی کچەکان هەمان ئازادی دایك و داپیریان هەبوو لە ڕابردوودا بەهۆی بوونی باوکیان و زاڵبوونی بەسەر شتەکاندا، هەموو ئەمانەم هەست پێکرد لە زاری (ئامینە)ی خوشکیان، کاتێك بینیم نیگەرانە لەو دۆخە پڕ لە جیاوازییە، کە سیان لە براکانی پشووی هاوین دێنەوە لە جیهانێکی تر دەدوێن لە ئیستانبوڵ، باسی قوتابخانەی تێکەڵ و ئافرەتی تورکی سفوور و شوێنی خۆش و دڵگیر بە بەهەشت ئاسا دەکەن، کچەکانیش ئازادییەکانیان قەتیسە و تەنها گوێدەگرن و هیچی تر.

ئەم ماڵە کە لە یەك نهۆم پێکهاتبوو ڕۆژانە نزیکەی چل کەسی نانئەدا بە ژن و پیاوەوە، شوێنی خوانەکە دوانزە کەسی دەگرت، هەروەها خوانێکی تر هەبوو تایبەت بە منداڵان، هەموو کەوچك و قاپ پەرداخەکانی لە جۆرێکی سادە و ساکار بوون.

جلوبەرگی سەرجەم خێزانەکەش جلوبەرگی مۆدێرن و ڕۆژئاوایی بوو، وەك جلوبەرگی (ئەفەنی و خانەمەکانی) بەغدا، ڕاخەری ژوورەکانیش فەرشی فارسی گرانبەها بوو، بەڵام نازانم ئەگەر پارەیان لە بانکەکان هەبووبێ یان نا، چونکە بیرم لەو بابەتە نەکردبووەوە، جار بەجار پوورم دەبینی پارەی دەکردە سنووقێکی تەختەوە کە قفڵێکی پێوەبوو هەر کات پێویستی بە پارە بوایە لێی دەردەهێنا.

سەرجەم خواردنەکانیان لە دێهاتەکانەوە دەهات هەر لە دانەوێڵە و سەوزە و گۆشت... هتد.

زەوییەکی فراوانیان هەبوو نەوتیان لێدەردەهێنا (پێش جەنگی جیهانییەکەم)، ڕێگەیان نەدەدا بە (کۆمپانیا بیانییەکانی نەوت) زەوییەکانیان هەڵکەنێت، بەڵام پاش هاتنە ژوورەوەی ئینگلیز بۆ عێراق، بە ئارەزووی خۆیان زەویان هەڵکەن و نەوتێکی زۆریان برد، بەبێ ئەوەی هیچ پشکێکی بۆ بنەماڵەی (نەفتچی) تێدا بێت، کە سەروەختێك ئەم بنەماڵەیە نەوتیان لە زەوییەکەیان دەردەهێنا و بە نرخی ئاو دەیانخستە بازاڕەوە بەهۆی ئەوەشەوە نازناوی (نەفتچی) یان وەرگرت.

پشووی هاوین تەواو بوو و گەڕاینەوە بەغدا، لە هەمان کاتدا باوکیشم لە گەشتەکەی ئەورووپای گەڕابووەوە، بەڕاستی گەشتێکی خۆش و سەرنج ڕاکێش بوو و کاریگەرییەکی زۆری لەسەر جێهێشت هەرگیز لەبیرم ناچێت.

* سەرچاوە:-

– ذكريات طبيبة عراقية، د. سانحة امين زكي، لندن، دار الحكمة، چاپی دووەم، ٢٠١٥

*** دەربارەی ( بابەگوڕگوڕ ):-**

د. ڕافیدە عەبدوڵڵا

ئێمە هیچ بەڵگەیەکی دیاریکراومان نییە، تا ئێستا ووشەی بابەگوڕگوڕمان لە سەرچاوە مێخییەکان بۆ پشتڕاست نەبووەتەوە، نازانین لەوانەیە لە پاشەڕۆژ، سەرچاوەی پێویستمان بەدەستبکەوێت. کە لە سەردەمی ئەسکەندەری مەکەدۆنی باسی هاتووە، کە زۆر سەرسام بووە بەم ئاگرەی کە بارانیش نایکوژێنێتەوە، بەڵام وەکو ناوی بابەگوڕگوڕ، تا ئێستا لە سەرچاوە مێخییەکان بەدەستمان نەگەیشتووە، بە تێبینی ئەوەی کە ووشەی (گوڕ... گوڕ) ووشەیەکە کە دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش باوە لە زمانە کۆنەکانی دانیشتووانی کۆنی کوردستان وەکو لولوپی، گۆتییەکان، سووبارییەکان، کە بە تایبەتی لەناوە کەسییەکانیان برگەکانیان دووبارە دەبنەوە، وەکو داد. داوا.. زوو.. زیی.. زیی، ئەمانەمان هەیە لە زمانی کوردی کۆن، بەڵام نازانم تا چەندێك ووشەی باباگوڕگوڕ پەیوەندی بەم ووشانەوە هەیە.

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە بە دەستمان گەیشتووە لە دەڤەری کەرکوك و دەورووپشتی.

پەرستگایەك هەبووە لە ماوەی هەزاری سێیەمی لەو شوێنەی، کە ئێستا پێی دەوترێت (تل النمل) واتا گردی مێروولە، گردێکە ئەکەوێتە ئەو شوێنەی کە ئاوی زێی خواروو دەچێتە، ناو ڕووباری (دیجلە) لەو ناوچەیەی پێی دەوترێت (الفتحە) لە ساڵی (١٩٩٥)ی زایینی، زانیارییەکی وا گەیشتە مۆزەخانەی عێراقی لە (بەغدا)، ووتیان گردێك هەیە لە ڕۆژئاوای کەرکوك کە دەستدرێژی دەکرێتە سەری، پاش دوا کەوتنی ئەو هەواڵە، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراقی بۆی دەرکەوت لەو شوێنە گەلێك گۆزەو پاشماوە دەردەهێنرێت و دەفرۆشرێت، ئەوە بوو چەند گۆزەیەك گەیشتە مۆزەخانەی عیراقی بەغدا بۆیان دەرکەوت کە ئەم گۆزانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایینی بۆ سەردەمی بەرەبەیانی خێزانەکان کە پێی دەوترێت (عصر فجر السلالات) بە خێرایی تیمێکیان دروستکرد بۆ فریاکەوتنی ئەو پاشماوانەی کە مابوو لە ، کارێکی کنەو پشکنیان کرد بە بەسەرکردایەتی (بورهان شاکر)، پاشماوەی تەلارسازییەکی سەیریان تێدا دۆزییەوە، کە بازنەیی بوو، سەکۆیەك بوو گەورە، لە دەور سەکۆکە، بە لێواری سەکۆکە، تاق یان ئاگردانی بچکۆلە هەبوو، لەناو ئاگردانەکان پاشماوەی خۆڵەمێش هەبوو، لەگەڵ ئێسکی باڵندەی سووتاو هەبوو، لە ئەنجامدا تێگەیشتن کە ئەم بنیاکارییەکی سرووتی ئاینییە، پاش بەردەوام بوونی کنەو پشکنین، دەرکەوت ئەو ڕێگایەی کە دەگات بە سەکۆکە ڕێگایەکی پێچاوپێچە (سەخت) دەرکەوت کە کۆمەڵێك تابلۆی مێخی هەیە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی بنەماڵە سۆمەرییەکان، کە ئەم پەرستگای خاوەن (گڕا) بووە، (گڕا) بەمانای (گڕی ئاگر)، یەکێکە لەو خواوەندە پلە بەرزانەی کە ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای خوداوەندەکانە لە بیروباوەڕی ئایینی (میزۆپۆتامیا)ی کۆن، دیارە پەرستشی (گڕا) لەو سەردەمە کۆنە ئاماژەیە بەوە دەکات کە ئاگر وەکو هێزێکی پیرۆز لە سروشت کە لە هەزارەی پێنجەمی پێش زایینی، لە سەردەمی (حەلەف)ەوە ئێمە زانیاریمان هەیە لەسەر ئەوەی کە هەر چوار تووخمە پیرۆزەکانی سروشت پەرستراوە بە بەڵگەی بوونی ئەو خاچە چوار گۆشەیە کە پێی دەوترێ خاچی (حالتی) دیارە هەر لە کۆنەوە پەرستراوە لە سەردەمەکانی دواتر بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم گڕایە ئەنووسرێ لەنێوان نیشانەی گرسووە کە دەبێتە بەشێك لە ناوی خواوەند (نرگرسو) دەخوێندرێتەوە بە شێوەی (گڕ).

لە سەردەمی ئاشووری (ئاشوور ناسر پالی دووەم) کە نێوان ساڵانی (٨٨٣- ٨٨٥)ی پێش زایینی فەرمانڕەوا بووە، باس لەوە دەکات لەکاتی ئەنجامدانی هێرشە سەربازییەکاندا، دژی ئەو شوێنانەی کە داگیری کردوون و هێرشی کردووەتە سەریان دەڵێت:- (خواوەند گڕ پێشم کەوت بە گوورزە ئاگرینەکەی خۆی)، بەڵام باسی گورزی هێزی دەکات کە چۆن پێشی کەوتووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دووژمنەکانی خۆی.

یەکێك لە بۆچوونەکانی سەردەمی هەڵدانی پەرستشی (ئاگر) لە ئایینی زەردەشتی، یەکێك لە بۆچوونەکان ئەوەیە کە ئایینی زەردەشتی زۆر کۆنە ڕەگوڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخە بەستەڵەکەکان، کاتێك ئاگر زۆر گرنگ بووە بۆ مرۆڤ لەو کاتەی کە دنیا ساردو بەستەڵەك بووە، دیارە مرۆڤ لەو کاتەوە گرنگی زانیوە و وەکو هێزێکی پیرۆز سەیری کردووە.

* ناسینەوەی باباگوڕگوڕ
د.زرار سدیق تۆفیق

**مەزاری باباگوڕگوڕ لە گوندی باباگوڕگوڕ لە دەڤەری قروە**

باباگوڕگوڕ ناوێکی ناسراوە و لەوە ناودارترە ئێمە لێرە لەسەری بدوێین و لای کوردی کوردستانی باشوور بووەتە هێما و ناسنامەی شاری کەرکوك، کەچی هاوکات تا ئێستا کەسمان هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بە ژیاننامەی نییە و نازانین کێیە و چ کارە بووە و لە چ سەردەمێك ژیاوە، ئەم چەند لاپەڕەیە هەوڵێکە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە.
سەبارەت بە باباگوڕگوڕ، کەم کەس هەیە لە کوردستانی باشوور ئاگاداری ئەوە بێت کە جگە لەوەی کەرکوك، لە سێ شوێنی دیکە بوونی هەیە، گرنگترین و کۆنترینیان جێگایەکی پیرۆزەو ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە کەسایەتی باباگوڕگوڕەوە و بگرە زێدی ڕەسەنی بووە، ئەویش دێی بابەگوڕگوڕە کە بە بیست کیلۆمەترێك دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی قروەی ناوەندی ناوچەی ئەسفەند ئابادی سەر بە پارێزگای سنە- کوردستان و دێیەکێش هەر بە ناوی باباگوڕگوڕ ناوزەدکراوە[1]، لە مێژەوە خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەر بۆ دوعاو نزا بەردەوام سەردانی گڵکۆکەیان دەکرد کە بەسەر گردێکەوە بوو، لە تەنیشتیشیدا کانیاوێکی گۆگردی خۆرسك هەڵدەقوڵێت و گەلێك کەرامات و کاری سەیری لێدەگێڕنەوە و ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی خانیکوف لە سەدەی نۆزدە سەردانیکردووە[2].
لە هەولێریش گڵکۆیەکی باباگوڕگوڕ هەیە کە کەمتر ناسراوە دەکەوێتە سەنتەری شارەوە و ئێستاش کەوتووەتە ناو پارکی شانەدەرەوە.
باباگوڕگوڕ لە دەرەوەی کوردستانیش یادگاری و شوێنەواری هەیە، مزگەوت و تەکیەی باباگوڕگوڕ لەنزیك هەراجخانەکەی گەڕەکی مەیدان لە سەنتەری شاری بەغدا، یەکێکە لە مزگەوت و تەکیە دێرینەکانی بەغداو لە ساڵی ١٠٨١ ك/١٦٧٠ز لە تەنیشت گۆڕوگڵکۆی پیاو چاکێکەوە بنیاتنراوە یان نۆژەنکراوەتەوە بەناوی باباگوڕگوڕ، چەندین دوکان و عەلوەیەك و قاوەخانەیەك و زەویی چاندن لەسەر مزگەوتەکە وەقفکراوە[3]، ئەم مزگەوتە تا ئەم ساڵانەی دواییش هەر مابوو.

*** باباگوڕگوڕ کێیە و بۆ بەم ناسناوە ناسراوە:**
سەبارەت بە باباگوڕگوڕەکەی ناوچەی قروە، تەنها ئەوەندە دەزانین کە ئیمام زادە بووەو ناوی سەید جمال الدین بووە، میرزا (شکراللە)ی سەنندجی دەڵێت "ڕەچەڵکی دیار نییەو نەمزانیوە یەکێکی دی بۆچوونێکی نوێی هەبێت".
باباگوڕگوڕەکەی لەمەڕ بەغداش نەناسراوە و سۆفییەکی نادیاری کوردە و ناسنامەی ئەو ڕوون نییە لەچ سەردەمێکدا ژیاوە و هیچ سەرچاوەیەکی کۆن زانیارییەکی باوەڕپێکراوی وەهای لەبارەوە بەدەستەوە نەداوە، (عبدالحمید عبادة) ( م: ١٩٣٠) لە کتێبێکی دەربارەی مزگەوت و شوێنە ئایینییەکانی بەغدا داناوە، دەڵێت "کەس ژیاننامەی باباگوڕگوڕی دەست نەکەوتووە"وەلێ شێخ محەممەد ساڵح سوهرەوەردی (١٨٩٤-١٩٥٧) بێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەکەی بدات، هەندێك زانیاری دەربارەی باباگوڕگوڕ بەدەستەوە دەدات و دەڵێت پیاوچاکێکی کورد بوو و یەکێك بوو لەو ڕێبەرە سۆفیانەی کە لە دەورووبەری ساڵی ٩٠٠ك/١٤٩٤-١٤٩٥ز ژیاون و تەکیەیەکی هەبوو لە گەڕەکی مەیدان و تیایدا دەرسی دەگووتوە و ڕێنوێنی و ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد و بە باباگوڕگوڕ دەناسراو نیشانەی جوامێریی تێیدا بەدی دەکراو بێ بەرامبەر قورئانی بۆخەڵکی دەخوێندەوە، پاشان تەکیەکەی بووە تەکیەی بەگداشییەکان و لە ساڵی ١٠١١ك/١٦٠٢-١٦٠٣ز مردو لە هەمان شوێن نێژراو خەڵکی بەغدا باوەڕیان پێی هەیە و سەردانی گۆڕەکەی دەکەن[4].
لەم ئاخافتنە دەردەکەوێت کە سوهرەوەردی بەخۆشی زانیارییەکی وردی لەسەر سەردەمی باباگوڕگوڕ نەبووە، چۆن لە ساڵی ٩٠٠ ك/١٥٠٥ز لە ژیاندا بووە و لە ساڵی ١٠١١ك /١٦٠٢-١٦٠٣ز مردووە و ڕێی تێناچێت سەد و دە ساڵ ژیابێت.
پارێزەر عەباس ئەلعەزاوی و دکتۆر عیماد عەبدولسەلام پێیانوایە ئەم باباگوڕگوڕە یەکێك بووە لە ڕێبەرانی تەریقەتی بەگتاشی کە لە سەرەتای سەردەمی عوسمانیدا بەناو عێراقدا بڵاوبوونەوە بەهۆی ئەوەی موریدو لایەنگرانی بەگتاشی لەڕیزی سوپای ئینکشاری خزمەتیان دەکرد[5].
وادیارە ئەم دوومێژوونووسە عێراقییە تەنها لەبەر ئەوە ئەم سۆفییە خەلوەتنشینە کوردەیان بە سۆفییەکی ڕێبازی بەگتاشی داناوە، چونکە هەڵگری نازناوی" بابا "بووە کە بە بۆچوونی ئەوان تایبەتە بە لایەنگرانی ئەم ڕێبازەوە، بەڵام ئەم بۆچوونە هەرگیز لە جێگەی خۆیدا نییە و نازناوی" بابا" بە نزیکەی پێنج سەد ساڵ بەر لە هاتنی عوسمانییەکان و بەگتاشییەکان و تەنانەت بەر لە دەرکەوتنی ڕێبازی بەگتاشیش بەسێ سەد ساڵێك، نازناوی زیاتر لە سۆفییەکی کورد بووەو بە بابا دەناسران، وەك بابا جەعفەری ئەبهەری (م: ٤٢٨ك/١٠٣٦ز) و باباتاهیری هەمەدانی(م: ٤٩٠ك/١٠٩٧ز)، جگە لە محەمەد ساڵح سوهرەوەردی نالێت باباگوڕگوڕ سۆفیەکی بەگتاشی بووە، بەڵکو دەڵێت خەلوەتگاکەی دواتر کرا بە خەلوەتگایەکی بەگتاشی، دکتۆر عماد عبدالسلام کە بەخۆیشی مزگەوتەکەی بینیوە و لێکۆڵینەوەی مەیدانی لەسەر ئەنجامداوە دەڵێت"مزگەوتەکە لە مێژوویی وەقفنامەکە- ساڵی ١٠٨١کۆچی/١٦٧٠زایینی- کۆنترە و دیارە لەو ساڵەدا نۆژەنکراوەتەوە، گۆڕەکەی باباگوڕگوڕیش لە مزگەوتەکە کۆنترە[6].
کەچی دەربارەی بابا گوڕگوڕەکەی لەمەڕ کەرکوك، چ ڤەکۆڵینێکی ورد و زانستیی لەسەر ئەنجام نەدراوە و ئەوەی هەیە تەنها بۆچوونی بێ بنەماو شرۆڤەکردنی سۆزدارانەیە و کە زۆربەیان لە ڕاستییەوە دوورن و بەڵگەی مێژوویی پشتڕاستیان ناکاتەوە و زیاتر لێکدانەوەی خودیین.
سەبارەت بە واتای وشەی لێکدراو باباگوڕگوڕیش، زیاد

لە لێكدانەوەیەكی نازانستی هەیە، كە تەنها شیكردنەوەی وشەكە كراوەتە بنەماو بەرووداوێكی ئەفسانە ئامێز پاساوی بۆ هێنراوەتەوە، لەوانە باباگوڕگوڕەكەی دەڤەری قروە، ئەژدیهایەكی لە دوورەوە بینیووە و گازی باوكی كردووەو بە توركی گوتویەتی: بابا گوڕگوڕ، واتا:بابە بروانە، یان:بروانە بروانە، ئەویش شیرەكەی هەڵگرتووە و ئەژدیهاكەی كوشتووە، گوایە ئەو گردەمار ئاسایەی لەنزیك گڵكۆكەوەیەتی ئەو مارەیە و ئەودرزەی وا بە گردەكەشەوەیە ئەوا شوێنەواری شیرەكەیە[٧].

كوردناس مینۆرسكیش وشەكە بە توركی دەزانێت مانای بە " بەخوڕ لافاوی لێدێت"لێكداوەتەوە[٨]، كەچی شێخ محەمەدی مەردۆخ وشەكەی بە كوردی دادەنێت و مانایەكی بۆ دۆزیوەتەوە[٩].

ئەو بۆچوونەش لە ئارادا هەیە كە ناوی كەركوك پەیوەندیی بە وشەی گوڕگوڕ یان كوڕكوڕەوە هەیە و لێیەوە دارێژراوە، گوایە وشەكەش لە دەنگی بڵێسەی ئەو ئاگرەوە وەرگیراوە كە لە كێڵگە نەوتییەكانەوە هەڵدەستا و ئەم دیاردە سروشتییەش بەكاری پیاو چاكێك دانراوە كە دیارە لەو ناوە گۆشەگیر بووە و بۆیە پێی گوتراوە باباگوڕگوڕ، واتا ئەو پیاو چاكەی وا گڕی لێهەڵدەستێت[١٠]. من باوەڕ ناكەم پەیوەندییەكی ئاوەها لەنێوان هەردوو وشەی كەركوك و باباگوڕگوڕ و هەبێت و ئەگەر ئەمە وەهابێت ئەی ناوی هەرسێ باباگوڕگوڕەكەی قروەی كوردستانی ڕۆژهەڵات و بەغدا و هەولێر لە چییەوە هاتووە كە نەوتیان لێ نییە تا گڕبگرێت و بڵێسەی ئاگریان لێ بەرزببێتەوە، ئەم ناوە واتا باباگوڕگوڕ پێش ئەوەی بەو ناوچەیەی نزیك كەركوك بگوترێت كە نەوتی لێهەبووە، پێشتر بە شوێنانی دیكە گوتراوە.

*** لەنێوان باباگوڕگوڕ و شێخ یوسفی گۆرانیدا:**

گومانی تێدا نییە كە كەسایەتییە ئایینییەكان، ئەوانەی تێكەڵی كۆمەڵانی خەڵك دەبوون و دەچوونە ناو میللەتەوەو دەبوون بە خەمخۆر و ڕێنیشاندەریان، لەنێو كوردەواریدا زێدە ڕێزدار و خۆشەویست بوون و كردار و گوفتاریان بە هەند وەردەگیردرا و ئاخافتن و فەرمانیان ڕەتناكرایەوە و بە كەرامات دادەنراو لە كاتی تەنگانەو نەهامەتیدا پەنایان بۆ دەبردرا و داوای چارەسەریان لێدەكرا، بۆیە وەك گوزارشتێك لە ڕێزلێگرتن و خۆشویستنیان، زیاتر نازناوی" پیر" و"شێخ" و"بابا" یان لێدەنرا و هەر بە نازناوەكانیانەوە ناودەبران و دەناسرانەوە و بگرە ناوبانگیشیان پێوە دەردەكرد، تا ئەو ئاستەی بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار ناوی دروستیان لەیاد دەكرا.ئەم تەرزە كەسایەتیانە لە سەرچاوە بیانییەكان و لە دۆكیومێنت و نووسراوە فەرمییەكانی دەوڵەتاندا بەم نازناوانە ناناسران، بەڵكو بەناوی تەواوی خۆیانەوە ناودەبران، لەم ڕوانگەیەوە دەكرێت بڵێین نازناوە میللییەكانیان یارمەتییەكی ئەوتۆمان نادەن بۆ ئەوەی لە سەرچاوەكان ژیان و بەسەرهاتیان بدۆزینەوە، بەڵكو دەبێت بگەڕێین بەدوای كەسانێكدا كە لە كار و كردەوەدا یان لە هەڵسوكەوتێكیاندا هاوشێوەیان بن.

سەرچاوە میسرییەكانی سەردەمی مەملوكی، لە كەڵە سۆفییێكی خەڵوەتگیری كورد دەدوێن بەناوی شێخ جمال الدین یوسفی كوڕی عەبدوڵای كوڕی عومەری كوڕی عەلیی كوڕی خدری گۆرانی، كە بە شێخ یوسفی گۆرانی عەجەمی دەناسرا، چونكە گۆران واتە لە كوردە گوندنشینەكان بوو نەك كۆچەرییەكان و خەڵكی وڵاتی عەجەم-ئێرانی ئێستا بوو كە لە ناوەڕاستی مانگی پێنجی ساڵی ٧٦٨ك/١٣٦٧ز مردووەو بە ئامادەبوونی جەماوەرێكی زۆر لە موریدوشوێنكەوتووانی لە خەڵوەتگاكەی خۆی لە چیای قەرافە لە قاهیرە بەخاكسپێردراوە، ئەم سەرچاوانە ستایشی شێخ یوسفی گۆرانی دەكەن و بە مرۆڤێكی نورانی و دیندار و پایە بەرز و مەندو پێگیر بە شەرع و سوننەت وەسفی دەكەن[١١]، ولی الدین العراقی(م: ٨٢٦ك/١٤٢٣ز) دەڵێت "خەڵكی ڕای جیاوازیان لەسەر هەیە و زۆربەیان بەقوتبی سۆفیگەریی سەردەمی خۆی دەیژمێرن و كەسانی دی بەحلولیەت تاوانباری دەكەن و وەك ئیمامی گومڕایی لێی دەڕوانن[١٢]. مەقریزی(م:٨٤٥ك/١٤٤١ز)بە" الشیخ المسلك " یان " الشیخ الملك" و"مربي الفقراء" دایدەنێت[١٣].

دوای مردنی شێخ یوسفی گۆرانی، بنەماڵەكەی هەر لە میسر نیشتەجێبوون و ژمارەیەك لە نەوەكانی لە كوڕ و كچ بوونە كەسانی زانا و ڕۆشنبیر[١٤]و بە بنەماڵەی (العجمي) دەناسران كە یەكێك بوو لە بنەماڵە زانستییە ناودارەكانی قاهیرە.

هەر لەبەر مەزنی و پایەبڵندیی شێخ یوسفی گۆرانی بوو، فەقیهێكی كورد بەناوی فخرالدین ئەحمدی كوڕی محەمەد(م: ٨١٧ك/١٤١٤ز)لە نەوەی قازیی ناودار سەدرەددین عەبدولمەلیكی كوڕی عیسای كوڕی دەربازی مارانی(م: ٦٠٥ك/١٢٠٨ز) كتێبێكی داناوە لەسەر مێژووی ئەم بنەماڵەیە[١٥]، یەكێكی دی بەناوی (شمس الدین محەمەد بن احمد بن ابی السرور البكری الصدیقی المیسری(١٠٠٥ . ١٠٧٨ هـ/١٥٩٧-١٦٧٤ز)) كتێبێكی داناوە لەسەر ژیاننامەو مەناقبی یوسفی گۆرانی بەناونیشانی(الدر الجماني في مناقب سيدي يوسف العجمي الكوراني)، دانەیەكی ئەم كتێبە لە دەزگای كتێبی میسری (دارالكتب المیسریة) پارێزراوە[١٦] . دڵنیام لەوەی ئەم كتێبە زانیاریی نوێ لەخۆ دەگرێت سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی شێخ یوسفی گۆرانی .

یوسفی گۆرانی بەخۆیشی لە بواری سۆفیگەریدا كتێبێكی داناوە بەناونیشانی(ریحانة القلوب في التوسل-(و التوصل- الى المحبوب) كە دەربارەی ڕێوشوێنی پەیوەستبوونی موریدانە بە سۆفیگەرییەوەو خۆشبەختانە ئەم كتێبە ماوە و دانەی دەستنووسی لە كتێبخانەكانی بەرلین و قاهیرە و دیمەشق وموسڵ و ئەستەنبوڵ پارێزراوە، ئەمە وێرای كتێبی (بیان اسرار الطالبین في التصوف)و (بدیع الانتفاث في شرح القوافي الثلاث ) و(حیزب التَّوحید) و نووسینی دی[١٧].

شێخ جەمال الدین یوسفی گۆرانی سۆفیەكی خەرقپۆشی ڕێبازی سوهرەوەردی بوو، بە مەزەندە لە دەورووبەری ساڵی ٧٠٠ك/١٣٠٠ز لە ناوچەیەكی سەر بە ئوستانی كوردستان -سنە لەدایكبووە، وەلی ئەوەی جێگەی داخە لە قۆناغی كوردستانیی ژیانیدا زانیارییەكی وەهای لەسەر نییە، تەنها

ئەوەندە هەیە کە هەرلەتاق لاوێتییەوە تێکەڵ بەجیهانی سۆفیگەری بووەو خەرقەی سۆفییەتی لە هەردوو سۆفی حسام الدینی شمشێری خەڵکی دەڤەری شمشێر لە کوردستانی ئێران ونجم الدین مەحمودی ئەصپەهانی وەرگرتووە و ئەوانیش لە نورالدین عبدالصمدی نەتنزییەوە[18]، سۆفی نجم الدین مەحمودی ئەصپەهانی لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچیدا، لە ناوچەیەکی کوردستانی ڕۆژهەڵات گۆشەگیر بووە و لە کتێبی (مناهج الطالبین ومسالك الصادقین) رەخنەی لە خەڵکەکە گرتووە.

دواتر کەسایەتییەکی ئایینی ناودار و پایەبەرز لێدەرچوو و ناوودەنگی بە جیهانی ئیسلامی بڵاوبووەتەوە و گەیشتە ئەوپەڕی جیهانی ئیسلامی و سۆفییەك بە ناوی عەلی کوڕی محەمەد ناسراو بە (ابن المحروق )لە غەرناتەی وڵاتی ئەندەلوسەوە ملی ڕێگای گرتووەتە بەر و بەنیازی دیداری جمال الدینی گۆرانی لە ساڵی ٧٤٣ك/١٣٤٢ز گەیشتووەتە خزمەتی و تەریقەتی لێوەرگرتووە و ستایشیکردووە[19].

پاشان لەدوای ئەو ساڵە، ڕووی کردووەتە میسرو لە قاهیرەی پایتەخت بە یەکجاری گیرساوەتەوە و دیار نییە بە چ پاساوێك ئەم کۆچەی کردووەو بۆچی تامردنی لە ساڵی٧٦٨ك/١٣٦٧ز لە وڵاتی غەریبی ماوەتەوە و نەگەڕاوەتەوە کوردستان، بەڵام دڵنیاین لەوەی کە سەرەتا چووەتە بەغداو ماوەیەك تێیدا ماوەتەوە و شوێنەواری بەجێهێشتووەو لە خانەقایەك خەڵوەتیکردووە، بۆیە دواتر بەناوی ئەوەوە ناونراوە و دیارە سەردانی گۆڕی شێخی جونەیدی بەغدادیشی کردووە بە بەڵگەی ئەوەی بەپێی ئاخافتنی سەرچاوەکان ئەو بوو ڕێبازی سۆفیگەریی جونەیدی لە میسر زیندوو کردەوە و بە هەڵە وا زانراوە کە ئەو گۆڕەی لەنزیك خەڵوەتگاکەی بەغدای بووە گۆڕی ئەوە، بەڵام ئێمە لەوە دڵنیاین کە ئەو گۆڕە پەیوەندی بەوەوە نییەو ئەو وەك باسکرا لە خەڵوەتگاکەی لە چیای قەرافە لە قاهیرە نێژراوە، مورتەزا نەزمی زادە(م:١٧٢٣ز)لە کتێبی (تذکرة الاولیاء) کە تایبەتە بە ناساندنی ئەو ئیمام و سۆفی و زاهیدانەی وا لە بەغدا نێژراون، باسی گۆڕی باباگوڕگوڕی نەکردووە[20].

### * باباگوڕگوڕ لە کەرکوك:

ئەوەندەی ئێمە بزانین و لێی ئاگاداربین، بەر لە سەدەی حەڤدەهەم و بەرلەوەی تیرە و خێڵ و بنەماڵەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات پەیتا پەیتا لە کەرکوك و دەورووبەری نیشتەجێبن، باسی هەبوونی جێگایەك یان گڵکۆیەك بەناوی باباگوڕگوڕلە کەرکوك نەکراوە.

مێژوونووسان و گەڕیدە و جوگرافیناسانی ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامی و سەردەمانی دەسەڵاتی مەغۆل و تورکمان، هیچیان ناوی بابا گوڕگوڕیان نەهێناوە–چونکە لەو دەمانە بوونی نەبوو و لە سەردەمانی دواتر دەرکەوتووە – هەرچەند هەندێکیان بەخۆیان هاتوونەتە کەرکوك وەك ئوسامە–اسامە بن منقذ(م: ٥٨٤ك/١١٨٨ز)کە لە ساڵی ٥٢٦ك/١١٣١ز لە کەرکوك بووە و یاقوتی حەمەوی(م:٦٢٦ك/١٢٢٩ز) کە وەك خۆی دەڵێت قەڵای کەرخینی–کەرکوکی بینیووە.

حمدالله مستوفی(م:٧٥٠ك/١٣٤٩ز) ئاماژەی بە نەوتی کەرکوك داوە بێ ئەوەی بە باباگوڕگوڕ ناوزەدی بکات[21]، مەتراقیزادە (م پاشی ٩٥٨ك/١٥٥١ز) کە یاوەری سوڵتانی عوسمانی سلێمانی قانونی بوو لە هێرشەکەی بۆ سەر عێراق و کوردستان لە ساڵانی ٩٤٠–٩٤١ك/١٥٣٤–١٥٣٦ز، هاتووەتە کەرکوك و لە گەشتەنامەکەیدا باسی گوندەکانی ئیفتخارلو–ئیفتخار– حەفتتەخار، کەڵوتە، سەلوکان، لەیلانی کردووە، کەچی ناوی بابا گوڕگوڕی نەهێناوە[22].

نـوژدار و ڕووەکـنـاسـی هـۆڵـەنـدی لیـونـهـارت راوولـف لە گەشتەکەیدا بۆ ڕۆژهـەڵات، لـە ڕۆژی ٢٦–١٢–١٥٧٤ز گەیشتە کەرکوك و لە گەشتنامەکەیدا وەسفێکی کورتی شـارەکـە دەکـات و دەڵـێـت نـاچـار بـوویـن لـە وەرگـێـڕێـکـی کوردیزان بگەڕێین، وەلێ ئەمیش باسی هەبوونی شوێنێك بەناوی باباگوڕگوڕ ناکات[23].

وەك ڕوونە هۆزەکانی هەمەوەندو زەنگەنەو شوانی کێشك و گەرووسی و دەربەندی و کاکەیی ولەك و ڕۆژبەیانی و مەنمی ..رەگێکیان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات هەیەو بەدرێژایی سەردەمی عوسمانی بە چەند شەپۆلێك پەڕیوەی ئەمدیو بوونە و هاتوون لە دەشتاییەکانی کەرکوك و گەرمیان نیشتەجێ بوونە و ئەم هۆزانە لە مێژەوە بەردەوام رایەڵەی ئەمدیو و ئەودیویان کردووە، ئەم کوردانە جگە لە شێوەزار و جلوبەرگ و نەریتی کۆمەڵایەتی، ناوی خێڵ و هۆزی خۆیان و ناوی ژمارەیەك شوێن لە گوندو چیا و مەزاری زێدییە کەمیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتوو لە نیشتمانی نوێیان بۆ ناونان بەکاریا هێنایەوە– ئەم دیاردەیە لەنێوان هەموو میللەتانی جیهانی ئیسلامیدا باوە– لەوانەش: باباگوڕگوڕ، پەنجە عەلی کە گوندێك بوو لە تەنیشت کەرکوك لەسەر ڕێگای لەیلان و ئێستاش بووەتە گەڕەکیکی شارو دیارە بەناوی کێوی پەنجە عەلییەوە ناونراوە کە کێوێکە بەرزییەکەی دەگاتە ٢٨٦٠ مەتر و دەکەوێتە ناوەڕاستی سێگۆشەی نێوان سنە وکامیاران و قروە.

حمدالله مستوفی ناوی بە پێنج ئەنگوشت هێناوە .کێوی پەنجە عەلی–گوایە پەنجەی ئیمام عەلییە.

چەمچەماڵ کە شارۆچکەیەکە لە دامێنی چیای بێستون و لە سەردەمی مەغولییەوە–سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچی– بەردەوام ناوی دێت و لە دەستپێکی سەدەی هەشتی کۆچی/ چواردهەمی زایینی کرایە ناوەندی هەرێمی کوردستان.

ئەمانەو جگە لە ناوی گوندەکانی:کەڵهوڕ، گەڵباخی، سیامەنسوور، ڕۆژبەیانی، قەیتول ...هتد، لە دەفتەری تاپۆی ولایەتی موسڵ کە دەگەڕێتەوە بۆ دەستپێکی سەردەمی عوسمانی–سەدەی شازدە –ناوی هۆز و گوندەکانی کەڵهوڕ و سیامەنسوور و عومەربەگ و گۆگجە هاتووە.

بێگومان زۆربەی ئەم کوردانە لە گوندەکانی سەر بە هەردوو ئوستانی سنە و کرماشانەوە هاتبوون، بۆیە بە " گۆران "واتە گوندنشین دەناسران، گەڕۆکی ئیتاڵی دومنیوکیو سیستینی(١٧٥٠–١٨٣٢) بە کەرکوکدا تێپەڕیوە و لە گەشتنامەکەیدا–ساڵی ١٧٨١ز–دەڵێت: "دانیشتووانی کەرکوك کوردن لە هۆزی گۆران"[24].

بە گوێرەی گەڕان و پرسیار و سۆراخکردنم، بەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەم ئاماژە بە باباگوڕگوڕی نزیك کەرکوك نەکراوەو نووسەری عوسمانی ناسراو کاتب چەلەبی (١٦٠٩-١٦٥٧ز) ڕەنگە یەکەم کەس بێت ناوی باباگوڕگوڕی هێنابێت بە شێوەی کورکور بابا-گوڕگوڕ بابا [٢٥]، دوای ئەو گەڕیدەی فەرەنسی جیننوتیر Jean Otter کە ساڵی١٧٤٨ز بەڕێگای کوردستاندا چووەتە بەغدا و بەسرە و بە کەرکوکدا گوزەری کردووە یەکەم گەڕۆکی ئەورووپییە ئاماژەی بە هەبوونی شوێنێك کردبێت بەناوی باباگوڕگوڕ لە کەرکوك[٢٦].

ئەنجام:

لە ئەنجامدا دەکرێت بڵێین کە باباگوڕگوڕەکەی ناوچەی قروە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئەوانەی کەرکوك و هەولێر و بەغدا، گڵکۆ و شوێنەواری یەك کەسایەتین کە لە کوردستان بە باباگوڕگوڕ ناسراوە و ناوی دەرکردووە.

ئێمە هیچ بەدووری نازانین کە ئەم کەسایەتییە هەمان شێخ جمال الدین یوسفی گۆرانی بێت واتاجمال الدین یوسفی گۆرانی نێو سەرچاوەکان و باباگوڕگوڕی نێو کوردەوارییەك کەسایەتی بن بە بەڵگەی ئەوەی نازناوی هەردووکیان جمال الدینە و هەردووکیانیش لە کوردی گۆرانن و وەك ڕوونە کوردە گوندنشینەکانی هەردوو پارێزگای سنە و کرماشان بە گۆران دەناسران بۆ ئەوەی لە هۆزە کوردە ڕەوەندەکان جیابکرێنەوە کە بە کورد دەناسران و ئەگەر لە سەرچاوەکان وردبینەوە دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە مەبەست لە گۆران زیاترخەڵکانی گوندنشینە، کەچی کورد واتا هۆزە کۆچەرییەکان[٢٧] بۆیە جمال الدین یوسف هەر بە گۆرانی ناوبراوە.

گڵکۆکەی لای قروە یسەر بە پارێزگای کوردستان، مەڵبەندی بنەرەتیی دەرکەوتن و پایەداربوونی باباگوڕگوڕبووە و هەر لەوێ ئەو ناوەی لێنراوە.

جمال الدین یوسفی گۆرانی سۆفییێکی بزێو و گەڕۆك بووە وسەرلەبەری ژیانی بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی سۆفیگەری تەرخانکردووە و دیارە لەهەر شوێنێك گیرسابێتەوە گۆشەیەکی هەڵبژاردووە و خەڵوەتگیر بووە و وەك سەرچاوە میسرییەکان دەڵێن جگە لە خەڵوەتگاکەی لە چیای قەرافە لە قاهیرە، چەندین گۆشە و خەڵوەتگای دی هەبووە، چ لە میسرو چ لە وڵاتانی دی، دیارە مەبەستیان لەوڵاتی دی، عێراق و کوردستانە وەك خەڵوەتگاییەکەمی خۆی لە قروە یان ئەوەی لە بەغدا هەیبوو.

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر سۆفیی ناودار: عبدالوهاب بناحمد بن علی الشعرانی (م:٩٧٣ ك /١٥٨١ز) ڕاستییەکی درکاندووە کە هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە جمال الدین یوسفی گۆرانی هەمان ئەو سۆفییە کە لە کوردستان و لە بەغدا بە باباگوڕگوردەناسرا، ئەوەتا دەڵێت "هەموو ڕۆژێك تا ئێوارە لە خەڵوەتگاکەی دەمایەوەو ناهاتە دەرەوە و تەنها لە کاتی نوێژکردن دەرگای دەکردەوە، دەمێك لە خەڵوەتگاکەی دەربهاتایە چاوی وەك پارچە پشکۆیەکی لێدەهات و دەگاشەیەوە " وکان...اذا خرج من الخلوة یخرج وعیناه كأنهما قطعة جمرة تتوقد..."[٢٨].

دیارە ئەوەش بەدوور نازانرێت کە ئەم سۆفییە کوردە، زگماك هەندێك تایبەتمەندی جەستەیی هەبووبێت و چاوی جۆرە شەوقێکیدا بێتەوە یان گڕی لێبووبێتەوە بۆیە بە باباگوڕگوڕ ناسراوەو دەمێك هاتووەتە بەغداو لەناو حەلقەی سۆفیانداو لە خەڵوەتگادا هەر بە باباگوڕگوڕ ناسراوە، وەلێ کە چووەتە میسر و لەوێش هەر بە خەڵوەتنشینی ماوەتەوە بەناوی خۆیەوە ناسراوە.

لێرەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت لەبەر ئەم تایبەتییەی شێخ یوسف بە باباگوڕگوڕ ناسراوەو لەبەر ئەم خەسڵەتەی چەندین ئەفسانەی بۆ هەڵبەستراوە و دەڵێن ئەگەر بەچاوی سەیری هەرشتێکی بکردایە ئەو شتە دەبووە زێڕ و ڕۆژێکیان چاوی کەوتووەتە سەر سەگێك و ئەمەش بووە بەهۆی هەموو سەگەکان لە دەوری کۆببنەوە و ئەگەر ڕابووەستایە ڕادەوەستان و ئەگەر بڕۆیشتایە دەڕۆیشتن و ئەمە و چەند ئەفسانەیەکی دی[٢٩].

باوەڕناکەم جمال الدین یوسفی گۆرانی واتا باباگوڕگوڕ هاتبێتە کەرکوك بۆیە نە گۆڕ نە گڵکۆ نە تەکیەی لە شارەکە بوونیان نییە و تەنها ئەو شوێنەی کە بە هۆی هەبوونی ڕێژەیەکی زۆری نەوتەوە، بەردەوام بڵێسەی ئاگری لێ بەرزدەبووەوە لەلای کوردی گۆرانەوە بە باباگوڕگوڕ ناونرا و وەك کەراماتی پیاوچاکێك لەوێنەی باباگوڕگوڕەکەی لای خۆیان لێکدراوەتەوە، واتا بەرزبوونەوەی بڵێسەی ئاگر چوێنرا بە گڕی چاوی یوسفی گۆرانی و ژنان بۆ دوعا و نەزرگرتنەوە بەدەم گوتنەوەی: " باباگوڕگوڕ بە گوڕ هاتم بۆ کوڕ هاتم "، سەردانیان دەکرد .

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-
١- علي اكبر كردستاني، الحديقة الناصرية، الترجمة العربية جان دوست(اربيل:٢٠٠٤)، ص٤٩، هيوار، دائرة المعارف الإسلامية، ٢٧٨/١٢ .
٢- ميرزا شكرالله سنندجي، تحفة ناصري(تهران:١٣٧٥ه.ش)، ص١٧٩، الحديقة الناصرية، ص٤٩.
٣- محەمەد سعيد الراوي، خير الزاد في مساجد وجوامع بغداد، تحقيق الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف، مركز الدراسات والبحوث الإسلامية، ص ٢٦٤-٢٦٧، مصطفى جواد واحمد سوسة، دليل خارطة بغداد المفصل، كتێبخانە الحضارات (بيروت:٢٠١١)ص٢٩٧، عباس العزاوي، تأريخ العراق بين الاحتلالين، الدار العربية للموسوعات، ١٠٤/٥.
٤- بۆ ئەم بابەتە بروانە:عماد عبدالسلام رؤوف، بابا كوركو الكردي الأب النوراني، لە كتێبی: دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، ط ٢، دار الزمان (دمشق:٢٠١١)، ص ٣٩٧-٤٠٦.
٥- العراق بين الاحتلالين، ١٢٠/٥، دراسات وثائقية، ص٣٩٩.
٦- دراسات وثائقية، ص ٤٠١ .
٧- تحفة ناصري، ص٧٩، الحديقة الناصرية، ص٤٩.
٨- دائرة المعارف الإسلامية، مادة سنة، ٢٧٢/١٢ .
٩- تحفة ناصري، ص٧٩، ص٤٦٢ .
١٠- كركوك مدينة القوميات المتآخية، ص١٠٣.
١١- ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة، دارالجيل، ٤٦٣/٤، ابن تغريبردي، المنهل الصافي والمستوفي بعد الوافي، مطبعة دار الكتب والوثائق (القاهرة: ٢٠١١) ٢١٧/١٢ .
١٢- الذيل علي العبر فيخبر من غبر، موسسة الرسالة (بيروت:١٩٨٩)، ٢٢٥/١ .
١٣- السلوك لمعرفة دول الملوك، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٧)، ٣١٠/٤، ٣١٢/٦.
١٤- السخاوي، الضوء اللامع، ٩٤/٩، السلوك لمعرفة دول الملوك، ٣١٢/٦.
١٥- المقريزي، درر العقود الفريدة، ٢١٠/٢، السخاوي، الضوءاللامع، ٢١٦/١-٢١٧، ٣٣/١٠ .
١٦- كارل بروكلمان، تاريخ الادب العربي، ٩٥/٨، ئەمەش وەسفی كتێبەكەیە وەك لە ماڵپەڕی كتێبخانەكە هاتووە "الدر الجماني في مناقب سيدي يوسف العجمي الكوراني، الصفحة الأولى (الحمد لله الذي فتح لأوليائه ابواب الكرم ... اما بعد سلك الله بي وبك سبيل مرضاته ... فقد سألني من لا يسعني مخالفته ويجب علي طاعته ان اجمع شيئا من مناقب الأستاذ ... ...ولله الحمد على الدوام وارجوه التخلص في المبدأ وحسن الختام إنه على ما يشاء قدير نعم المولى ونعم النصير وصلى الله على سيدنا محەمەد وعلى آله وصحبه وسلم).نسخ معتاد ١٧عربي ١٥ ٢٠ * ١٥سم، نسخة مصححة وعلى بعض هوامش الصفحات توضيحات .ميسر . دار الكتب المصرية . رقم: ٣٢٧ تاريخ.
١٧- حاجي خليفة، كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٢ )، ٢٦٠/١، إسماعيل باشا البابانى البغدادي، هدية العارفين (استانبول:١٩٥١ )، اعادت طبعه بالأوفست: دار إحياء التراث العربي ببيروت، ٥٥٧/٢-٥٥٨، كارل بروكلمان، تأريخ الأدب العربي، ٢٤٣/٧-٢٤٤، ٣٣٣/٤.
١٨- جامي، نفحات الانس، ص٤٩٢، ٨٧٩ .
١٩- لسان الدين الخطيب، الاحاطة في اخبار غرناطة، ١٩١/٢.
٢٠- بروانە:المنتخب من تذكرة الاولياء، الترجمة العربية (بغداد:٢٠١٣) .
٢١- نزهة القلوب، ص .
٢٢- رحلة مطراقي زاده نصوح افندي السلاحي، ترجمة صبحي ناظم توفيق، تحقيق د. عماد عبدالسلام رؤوف، المجمع الثقافي (ابوظبي: ٢٠٠٣ ). ص٢٩-٣١، ٧٤، ١٠٨، ١١٤، ١١٨ .
٢٣- رحلة الرحالة الهولندي ليونهارت راولف، ص١٩٧-١٩٨ .
٢٤- رحلة من اسطنبول الى البصرة، الترجمة من الفرنسية الاب بطرس حداد، دار وكتێبخانة البصائر (بيروت:٢٠١٠)، ص١٠٨.
٢٥- كتاب جهان نما (انقرة:٢٠٠٩)، ص٤٥٢ .
٢٦- هلك وتحكيم، كركوك في كتابات الرحالة الفرنسين، ص١٤٨، نرمين امين، كركوك الشواهد والمواقع، القرن ١٨-١٩، ص٦٢٧، ئەم دوو گوتارە لە كتێبی (كركوك مدينة القوميات المتآخية، مركز كربلاء، لندن٢٠٠٢) بڵاوكراوەتەوە.
٢٧- بروانە كتێبەكەی نووسەر:كۆمەڵگای كوردەواری لە سەدەكانی ناوەڕاست (هەولێر:٢٠١٤).
٢٨- الطبقات الكبرى (ميسر: ١٣١٥هـ)، ٥٩/٢ .
٢٩- الطبقات الكبرى (ميسر: ١٣١٥هـ)، ٥٩/٢ .

*** قەرەجەکانی کەرکوك:-**

فەلەکەدین کاکەیی
سەمیرە ئەحمەد
حەمەسەعید زەنگەنە
سەباح ئیسماعیل
مەلا شاخەوان

*** قەرەج... کێن؟**

بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ڕەسەنی قەرەج، زۆربەی لێکۆڵەرەوانی بواری شوناسی، ڕەسەنی قەرەج، دەگەڕێننەوە بۆ هیندستان. وشەی (غجر)ی عەرەبی واتا (قەرەج) وشەیەکی هیندییە شێوازە زمانێکی کۆنی هیندییە بەناوی (الغجراطیة). لەم ٣ هەزار ساڵەی دوایدا بە شەپۆل لە هیندەوە کۆچیان کردووە بەناو ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا تێپەڕبوون بەرەو ڕۆژئاواو باکوور. ئەوانە تاکە گەلێکن کە هیندستان ڕەوانەی ئەورووپای کردوون، بەرامبەر کۆچیان کردووە بۆ هیندستان، قەرەج زۆربەیان لە هیندستاندا دەژین، هەروەها لە وڵاتانی تردا هەن. لێکۆڵەر (هوارد غرینفلید) دەڵێ: قەرەجەکان ئەو دەوارنشینە ڕەسەنانەن کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کۆچ دەکەن‌و نایانەوێ پابەندبن بە نیشتەجێبوون لەناو کۆمەڵگادا ئەوانە هیچ داب‌و نەریتێکیان نییە.

حەمید هاشمی دژی بۆچوونی هواردەو دەڵی ئەمانە نیمچە کۆچەریین، سیمای گوزەران‌و ڕۆشنبیرییان زۆر جیاوازە لە دەوارنشینەکانەوە، ئەمانە لە گەلانی قۆقازییە دێزەکانن‌و لە سەدەی ١٣و ١٤ لە هیندەوە هاتوون بۆ ئەوروپاو ئێستا بە شێوەیەکی سەرەکی لە تورکیاو ڕووسیا ئینگلتەرەو ولایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکادا هەن.

سەبارەت بە قەرەجەکانی عێراقیش وازیان لە ژیانی کۆچەری هێناوە پاش ئەوەی لە ئۆردوگاکانی ناو عێراقدا دابەشبوون‌و نیشتەجێ کران، کاتی ڕژێمی صدام نیشتەجێی کردن‌و ڕەگەزنامەی عێراقی پێبەخشین. بەڵام پاش لەناو چوونی ڕژێم باری گوزەرانیان ئاڵۆزو نا ئارام بوو، چونکە ڕژێم بە مەبەستی خۆی بەکاری دەهێنان‌و ئافرەتەکانیان لە بەزم‌و کۆڕ گەرمی و لەشفرۆشی‌و سەماو گۆرانی بۆ گەورە پیاوانی ڕژێم ژیانی بۆ خۆشکردبوون، ئێستا لە بارودۆخێکی خراپدا دەژین، بە گووتەی خۆیان گرووپە ئیسلامییەکانی خوارووی عیراق بەتایبەت هێزی سەدر لێیان دەکوژن‌و ڕەویان پێدەکەن بە بیانووی ئەوەی ئەمانە بەدڕەوشتن ولەشفرۆشن.

میسرییەکانیش بەو کەسانە دەڵێن قەرەج کە هەمیشە لە کۆچ کردندان‌و ئافرەتەکانیان خەریکی کاری جادووکارین. یەکێکن لە خێلە کۆچەرییەکان کە پێستێکی زیوی‌و قژێکی ڕەشیان هەیەو لە ڕەگەزی هیندییەکانن، لە جیهاندا بە ڕۆمەنی ناسراون. زانای شوناسی بواری قەرەج (لوتفی خوری) دەڵی: وشەی (غجر) وشەیەکی تورکییە لە وشەی (کۆچەر)ەوە هاتووە، چونکە لە باکووری مووسڵ پێیان دەڵێن (غوجرو)و کوردەکان پێیان دەڵێن (قەرەج). ڕایەکی تر هەیە گوایە وشەی قەرەج لە وشەی (قاجاری)یەوە هاتووەو خێڵێکی تورکییە، (قاجاری) مانای کاولی نییە هەڵەیە گەر قاجاری بە کاولی ناو ببەین. دەڵێن لە ڕەگەزی ئارییەکانن کە ئەمەش وایکرد لە کاتی شەڕی نازییەکاندا بە ڕەقی بجولێنەوە لەگەڵیانداو بیانخەنە ژووری پڕ لە غازەوە.

قەرەجەکان خۆیان بە زۆر بە گەلانەوە دەبەستن، بەڵام هەموو بۆچوونەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕەگەزی ڕەسەنی قەرەج هیندییەکانن، بەڵام بەناوی جۆر بە جۆرەوە لە جیهاندا بڵاوبوونەتەوە.

لەبارەی وڵاتی خۆمانەوە وشەی (غجر) یا قەرەج وشەیەکی میللییەو لە فایل‌و بەڵگەنامەو دەزگاکانی ڕاگەیاندن‌و زۆربەی وڵاتانی عەرەبیدا بەکاردێت‌و کاولیش بەکاردێت بۆ ئەوانەی کە خەریکی سەما کردن‌و گۆرانی وتن‌و ڕێکخستنی بەزمن.

بۆ ئەم مەبەستەش نیشتەجێ بوون لەو ئۆردوگایانەی کە نزیك شارە گەورەکانن، تا سەرەتای هەفتاکانیش کۆچەری بوون، دوای ئەوە لە سەرەتای هەشتاکانەوە ڕەگەزنامەی عێراقیان پێدرا.

(د. مستەفا جواد) تێڕوانینی وایە، کە ناوی کاولی لە ناوی شاری کابلی پایتەختی ئەفغانستانەوە وەرگیراوە، واتە سەرچاوەکەی کابلیەو ڕەسەنی کاولیش دەچێتەوە سەر قەرەج‌و ڕەگەزی هیندی. ئەمەش لەوەو سەرچاوەی گرتووە کاتێك کە کۆچیان کرد لە هیندستانەوە بۆ ئێران، چونکە شاری کابل دەڕوانێتە سەر ڕێرەوی ڕۆژئاوای خەیبەر، کە دەکەوێتە نێوان هیندو ئەفغانستان، ئەم بۆچوونەیان زیاتر باوە بۆ شیکردنەوەی مانای کابل، بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدایە ئەوەیە، کە هەموو شەپۆلی کۆچەرییان لەو ڕێگایەوە هاتووچۆیان دەکرد بۆچی بە هەموویان ناوتریێ کاولی؟ ئەوەی بیزانین ئەوەیە کە کاولییەکێکە لە تیرەکانی قەرەج‌و قەرەجی تریش هەیە لە شێوەی ئەوان، بەڵام بەناوی جیاواز؟

پاپا (انستانس گاری کرمەلی) ڕای وایە کە خێڵێکی شەڕانگێز هەیە لە ناحیەی مولتان، لە هیند دەژیان، کاولییەکان لە ئەوانەوە نزیکن، چونکە ئەمانیش ڕەگەزیان هیندییە، کە پێکهاتووە لە وشەی (اتکول، واتا کۆڕو کۆمەڵ) یا کول کە گوندێکە لە فارس. مامۆستا شاکر الضابط دەڵێ:

کاووڵ بە زمانی تورکی بە مانای ڕووخاو دێت واتا لە تورکیادا هەر کەسێك کە خانووەکەی بڕوخێ‌و شوێنی نیشتەجێبوونی نەمێنێ، دەبێ بە کۆچەری. لە فەرهەنگی فارسیشدا هاتووە کە زاراوەی کاولی بەرامبەری وشەی لورییەو یەکێکە لە ناوەکانی قەرەج کە هیندییەکان ئەم ناوەیان لێناوەو لە ئێران ئەلفەکەی لابراوە بووە بە کولی. بەڵام خەلیل شێخ عەلی لە ڕاپۆرتێکیدا کە لە ڕۆژنامەی بلدی البغدادی ژمارە ٣٥٣ ساڵی (١٩٦٥)دا بڵاوی کردووەتەوە نووسیویەتی وشەی (کالیە) لە ئیسپانیا بۆ لەعنەت لێکردن بەکاری دێنن، بەڵام وشەکە ئیسپانی نییە.

زماننناسانی ئیسپانیش دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە

وشەی (کالیە)، تەنها لە زاراوە هیندییەکانەوە هاتووەتە ناو فەرهەنگی ئیسپانییەوە. حەمید هاشمیش دوور لەو رایە دەڵێ سەرچاوەی وشەی کاولی لە ڕۆژهەڵاتەوەیە، ئەگەر نزیکییەك هەبێت لەنێوان زاراوەی کاولی لە عێراقداو کاولی ئیسپانیادا، ڕەنگە وشەی کالیە کورتکراوەی وشەی کاولی بێت. وشەی دووەم کۆنترە چ شوێنی و چ کاتی دەتوانین بڵێین کە لە (ڕۆژهـەڵات - هیند) وشـەی کاولیە. هەروەها حەمید هاشمی پاش لێکۆڵینەوەیەکی کە لەسەر قەرەج ئەنجامی دابوو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە وشـەی کاولی ناوی خێڵێکە لە هیند کە ئافرەتەکانیان زینایان دەکرد، یا خەریکی سەماکردن بوون، بڕوایان وابوو کە خزمەتێك بە ئایین دەگەیەنن، چونکە بۆ پیاوانی ئایینیان دەکرد، هەروەها لەشفرۆشییان دەکرد لە پەرستگاکاندا، بەتایبەت پەرستگای مەلیك (کولی - کـاول)و هۆگربوون بە مەلیك کاوڵەوە بەتایبەت پاش کۆچ کردنیان.

(ول دیورانت) دەڵێ کۆچەکانیان بە تایبەت بۆ ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاسـتو عیـراق پاشکۆی کـۆچ بـوو بـۆ لای خزمە کۆچەرییەکانیان لە خێڵەکانی پێش خۆیان، وەك شاعیر فیردەوسی دەڵـێ لەسەر داوای شای فارس بوو. هەروەها دەڵـێ: لە خـواروی وڵاتـدا ئـارەزووی پیاوەکان جێبەجێ دەکەن، کە پێیان دەوترا (کارەکەری پەروەردگار- خادمات الله) بەبڕوای خۆیان داوا ئاسمانییەکانیان پەیرەو کردووە.

پەرستگارانی پـەروەردگـار، یا (دافـاس) ئـەوانە بوون کە لەشفرۆشیان دەکرد، لە هەموو پەرستگایەك ژمارەیەك ئافرەت ئامادە دەکران لەوانەی کە پەرستگایان بە پلەییەکەم بە پیرۆز دەزانـی بۆ سەماو گۆرانی، دەگونجێ کە ناویان ببرێـت بە چێژبەخشەکانی کاهنو بـەراهـمـەکـان، ئەوانە ژیانیان تەنها بریتی بوو لە ژیانی ناو پەرستگاکان، بەڵام هەندێکیان تۆزێ بواریان فراوانتر بوو بەوەی کە لە دەرەوەی پەرستگاکانەوە بە کرێ دەیانبردن بۆ کاری لەشفرۆشی، بە مەرجێ نیوەی داهاتەکەیان بدەن بە پیاوانی ئایینی، ئەوانەی کە زینایان دەکرد هەمیشە سەرقاڵی سەماو گۆرانی بوون لە ئاهەنگە گشتیو کۆبوونەوە تایبەتییەکاندا، وەك چۆن کچانی (جیشا) دەیکـەن لـە یابان. بڕێکی کەمیان خوێندنەوەو نووسین فێربوون، یا گفتوگۆی ڕۆشنبیری لە سەکۆکاندا، هەرچەندە هەرگیز پاڵپشتی ژنەکانیان ناکەن بۆ فێربوونو خوێندنو ناهێڵن تێکەڵ بە میوانان بن، ئەوانەی کە دەخوێننەوە لە (hetairai) یابانی دەچـن. لە ساڵی (١٤٠٠)دا لە پەرستگای مەلیك کـاول، ڕاجاما لە تانجور (٤٠٠) ئافرەت لە کارەکەرەکانی پـەروەردگـار هەبوون کە نەریتیان وابوو، هەرگیز وا بیریان نەدەکردەوە کە ئەمە دژی ڕەوشت بێت، بەڵکو زۆر لە ماڵە ماقوڵەکان کچەکانی خۆیان دەناردە پەرستگاکان بەو ڕوحییەتەی کە کوڕەکانیان دەدا بە کاهینەکان.

کـەواتـە بـەپێـی ئـەم ڕوونـکـردنـەوانـە وشـەی کـاوڵـی سەرچاوەکەی قەرەجە.

قـەرەجـەکـان توێژێکی بـێ ناسنامەو بـێ ناونیشانی کۆمەڵن، جگە لە ڕوانینێكو وێناکردنیان وەکو دەرۆزە کـەرێـك، هیچ کـاتـێـك بـەچـاوی مـرۆڤـەوە سـەیـر نـەکـراوە، نزیکبوونەوە لێیان خۆی لە خۆیدا گومانێك دروست دەکات، جیهانی داخراوی قەرەج بەلای ئێمەوە هەمیشە دەرگایەکی داخراو و کلۆم دراوە بەڕووی دەوروبەرییەوە. قەرەجەکان لە هیچ شوێنێك خاوەنی پارچە زەوییەك نینو هـەردەم لە گەڕاندان.

نیشتمانی ڕاستەقینەی ئـەوان ئەو پارچە زەوییە کە چەند ڕۆژێك گوزەرانی تێدا دەکەنو چادری تێدا هەڵدەدەن، کاتێکش بنەو بارگەیان پێچایەوە هەر ئاوری لێ نادەنەوە.

بە قسەی خۆیان، زمانی ئەمان شەکاکەو، موسڵمانن‌و نوێژ دەکەن، بەشێکی زۆریان ئەوانەی لە کەرکوکن خۆیان بە کورد دادەنێن، لە ڕابردوودا گەرمیانو کوێستانیان کردووە بەڵام لە ئێستادا بەشێوە فـراوان نییەو ماوەیەکی زۆر لە شوێنێکدا دەمێننەوە.

زۆریان حەز لە خوێندنە، هەندێکیان خۆیان فێری زمانی عەرەبی و ئینگلیزی کردووە، لەبەر ئەوەی زەوییان نییە لەبەر ئەوە ناتوانن بچنە قوتابخانە، بۆیە زۆربـەی منداڵەکانیان نەخوێندەوارە.

قەرەجەکانی کەرکوك پیاوەکانیان لە ماڵەوە دادەنیشنو ژنەکانیان بە ڕۆژ کاردەکەن، دۆزەکـەری دەکات لە شوێنە گشتییەکان.

زۆربـەی ژن هـێـنـان لـەنـێـو خـۆیـانـدایـەو زیـاتـر بە خۆشەویستی دەبێتو تەڵاق دانیش لەلایان هەیە، ژن بە بێگانە دەدەن ئەگەر ڕەوشتی باش بێو ڕێکوپێك بێ، بەڵام بەکەسی وەکو خۆیانی دەدەن، بە جێنشینی نـادەن، بەڵام ئەوان کچ دەدەن بەوە کەسەی کچیان پێبدات.

زۆربەی پیاوەکانیان دەهۆڵو زوڕنا دەژەنن، هەندێکیان کرێکاری دەکەنو بەشێکیان نەخۆشن، ژنەکانیان کار دەکەن بۆ بژێوی، بەڵام نایەڵن کەسی بێگانە بێتە ناویانەوە، ڕۆژانی هەینی، دەچن بۆ سەیرانگاکان لەوێ بە پارە دەهۆڵ دەکووتن، هەندێکیان ددانسازی هەندێکیان ڕاوە کەوە دەکەن.

قەرەجەکانی کەرکوك، دیارە نازانن کە ئەوان، هەرچەندە خۆیان بە کـورد دەزانـن، بـەڵام لەسەر ئاستی جیهاندا، لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە نوێنەرێکی چاودێریان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (un)دا هەیە.

تـەلـەفـزیـۆنـی بـەریـتـانـیـا (BBC) سـاڵـی (١٩٨٥) بەرنامەیەکی هەفتانەی دانا لەمەڕ دابەشبوونی جوگرافیای قەرەجەکانو کەلتوورو دابونەریتیانو زمانو ڕەسەنیان.

هەر هەفتەیەك نوێنەرانی قەرەجی وڵاتێکیان مێوانداری دەکرد، لە وڵاتانی ئاسیاوە تا ئەورووپاو ئەمریکای باشوورو باکوور.

نوێنەری قەرەجی (میسر) گوتبووی کە لە کوردستانەوە چوونەو لە ئەسڵدا خەڵکی کوردستانن.

بـەڵام زۆربـەی شـارەزایـان ڕەسـەنـی قـەرەجـی دونیا بۆ هیندستان دەگەڕێنەوە، لە کۆنگرەیەکی جیهانیی قەرەجاندا، چەندین ساڵ پێش، وەزیری دەرەوەی هیندستان نامەیەکی بۆ کۆنگرەکە نارد بوو کە دەوڵەتەکەیو قەرەج بە هاووڵاتیی هیندستان دەزانێت.

*** ڕووناکی لە دەڤەری کەرکوك**

د. ئیبراهیم خەلیل

لە کەرکوك مرۆڤ لە سەردەمە زووەکاندا، نەوتیان بەکارهێناوە بۆ ڕووناکردنەوەی گەڕەك و ماڵەکان بۆ ئەوەی ڕۆشناییان دەستبکەوێت، بەتایبەتی لەو خانووانەی کە دووێرو خەزنە بووەو شوێنێکیان دانابوو بۆ چراو فانۆس و مۆم پێیاندەوت چرادان کە هەندێکی بە نەوتی زەرد کاری دەکرد. لە سەرەتادا بریتی بوو لە قوتیلە یەك کە لۆکەیان دەکردە ناوی و ئاگریان دەدا کە بۆنێکی ناخۆشی دەردەدا لەنێو ژوورەکە.

لە ساڵی (١٨٨١) بۆ یەکەم جارو لە سەردەمی موتەسەریف (محەمەد مونیر پاشا)، هەستان بە دانانی فانۆس لە شەقام و گەڕەکەکانی کەرکوك، کە کەسی تایبەت هەبوو بە شەوان و پاککردنەوەی فانۆسەکان لە ڕۆژدا.

بەشێك لە کارمەندان لەلایەن شارەوانییەوە دانرابوو، کە کاریان چاککردن و دانانی چراو هەڵکردنی بوو لە شوێنە بەرزەکانی شەقامەکانی کەرکوك کە بە دارێکی ئاگرەوە چراکەیان هەڵدەکرد.

بەڵام کاتێك ئینگلیزەکان هاتنە کەرکوك لە ١٤ی مایسی ساڵی (١٩١٨)، هەستان بە دانانی وێستگەی دیزلی بچووك.. بچووك لە شارەکە بۆ ڕووناککردنەوەی شوێنەکانی خۆیان و ئەو جێگایانەی کە نزیکە لێیانەوە کە کۆمپانیای نەوتی عێراقیش وێستگەی ڕووناککردنەوەی خۆی هەبوو.

بەڵام ئەو کارەبایەی کە لە کۆمپانیاوە دەگەیشتە شاری کەرکوك لە سێ هەزار کیلۆ وات زیاتر نەبوو، ئەم هێزەش لەگەڵ قەبارەی دانیشتووان شارەکە نەبوو، بەشی نەدەکرد بۆیە دەسەڵاتی پارێزگا داوای زیاتر کردنی هێزی کارەباری دەکرد.

لە ساڵی (١٩٤٧) کۆمپانیای نەوتی عیراق هەستا بە دامەزراندنی وێستگەیەکی تر بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا کە لە نیسانی ساڵی (١٩٥١) کارەکانی تەواو بوو، کە پێویستی کێڵگەکانی نەوت و دانیشتووانی کەرکوکی پڕ دەکردەوە، کە دوو ملیۆن و نیو کیلۆ واتی دەدا بە کەرکوك.

ڕێژەی بەکارهێنانی کارەبا لە ساڵی (١٩٥٠) لە شاری کەرکوك بۆ ڕووناککردنەوە (٣٠٦و ١١٢١٥) کیلۆ وات کە کۆی گشتی (٥١/٦١٣/٤٦٦) کیلۆ وات لە ساڵی (١٩٥٦) پانتایی بەشدارانی بەکارهێنانی کارەبا لە کەرکوك گەیشتبووە (٩٣٥٤) کەس. کە داهاتی ئاوو کارەبا لە شاری کەرکوك (١٠٠٠٠٠) هەزار دینار بوو ساڵانە، کە بەشێکی بۆ چاککردنی باری کاروبارەکانی پرۆژەکانی ئاوو کارەبا سەرف دەکرا.

(مجلس الاعمال) هەستا بە دامەزراندنی وێستگەی کارەبایی بە هێزی (٦٠) میگاوات لە ناوچەی (دووبز) لەسەر زێی بچووك بۆ پێدانی کارەبا بە ناوچەکانی کەرکوك، هەولێر، سلێمانی، موسڵ، پێکهاتبوو لە چوارێکەی تۆربینی هەڵمی کە فراوانی هەریەکەیەکی (١٥٠٠٠) میگاوات بوو کە هەڵم دەردەکات لە ڕێگای سووتاندنی غازی سروشتی

*** وێستگەکانی کارەبای ئێستای کەرکوك.**

١- وێستگەی کارەبای (دووبز):-

پێکهاتووە لە یەکەکانی هەڵمی غازی، لە ئێستادا تەنها بە غاز کاردەکات.

٢- وێستگەی غازی کەرکوك:-

لە دووری ٢٠ کیلۆ مەتر لە کەرکوکەوە دوورە، لە ناوەندی ناحیەی تازەیە بە دووری سێ کیلۆ مەتر، کە (٣١٥) میگاوات کارەبا دەدات، لەسەر بنەمای دوو یەکەی غازی دروستکراوە ئەم پرۆژەیە لە ساڵی (٢٠٠٤) لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەمریکییەوە دروست کراوە، وەکو دیاری پێشکەش بە خەڵکی کەرکوك کراوە بە گوژمی (٣٠٠) ملیۆن دۆلار.

٣- وێستگەی کارەبای (مەلا عەبدوڵڵا):-

وێستگەی کارەبای مەلا عەبدوڵڵای غازی پێکهاتووە لە یەکەی غازی لە جۆری (فریم ٥) و یەکەکانی (فریم٦) کە بە هەردووکی (٦٠) میگاوات.

* بەڕێوەبەرەکانی کارەبای کەرکوك:-

١- محەمەد عەلی
٢- عەبدولحەمید سەیفەتوڵڵا
٣- جابر عەباس عەلی
٤- خالید ئیبراهیم فەوزی عەبوش
٥- ئیبراهیم خەلیل ئەلجومەیلی
٦- خالید ئیبراهیم فەوزی
٧- فەلاح حەسەن محەمەد سدیق.
٨- سامی یوسف جەجۆ
٩- یالچین مەهدی ڕەشید.

*** ئاوو سەرچاوەکانی ئاو لە کەرکوك:-**

**د. ئیبراهیم خەلیل**

کەرکوك یەکێکە لەو شارانەی کە پشت بە باران بارین دەبەستێت و بەدرێژای ساڵ، بایەخ بە کاتەکانی باران بارین دەکات و زۆر بەکەمی لەسەر رووبارو لقەکانی پشت دەبەستێت.

لە کەرکوك و دەوروبەری گەلێك رووبارو لقی هەیە کە بەشێکیان لە رووباری زێی بچووکەوە ئاو وەردەگرن، کە رووبارەکان وەکو رووباری خاسە، داقووق، ئاوەسپی لە پێش شەری جیهانییەکەمدا، کەرکوك بەوە بە ناوبانگ بووە کە زۆری لق و سەرچاوەی ئاوی هەبووە بۆ خواردنەوەو ئاودان و ئاودێری زەوییە کشتوکاڵییەکانی، کە بە ناوبانگ بووە بە سازگاری و رِوونی شیرینی تامەکەی، کە بە ناوبگترین ئاوەرِۆ و لقەکانی بریتی بووە لە:-

١- لقی قۆریە
٢- لقی تسن
٣- لقی زێویە
٤- لقی بلاوە

لە سەرەتادا ئەم لقی ئاوانە بەش هەموو کەرکوکی دەکرد، بەڵام لە دوایدا کە ئاو کەمیکردو خەڵکەکە زۆر بوو، شەرِو ناخۆشی دروست بوو لەسەر ئاوو بەشە ئاو بۆ بەرووبووم کشتوکاڵییەکان.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە حکومەت هەستا بە دابەشکردنی ئاوەکانی ئەو لقانەن بەپێی بەش و دابەشکردنی بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکاندا بەپێی دابەشکردنی بۆ (٨٠) تاق، بەپێی ئەوەی هەر تاقێك بۆ ماوەی سێ سەعات ئاوی پێدا دەروات کە بەم شێوەیەی خوارەوە:-

١- بۆ زەوییەکانی خەڵکی کەرکوك بە (٣٩/٥) تاق
٢- بۆ زەوییەکانی تایبەتە بە بەرێوەبەرایەتی ئەوقاف بە (٢٧/٥) تاق
٣- بۆ ئەو زەوییانەی (میری) بە (١٣) تاق.

ئەوەی کە هەڵدەستێ بە رێکخستن بۆ ئەم دابەشکردنەو کارکردن و بۆ جێبەجێکردنی پێی دەوترا (ئاغای ئاو - صو غاسی) لە هەمان کاتدا کێشەکانی چارەسەردەکرد هەروەها لە کەرکوك و دەوروبەری کارێزو کانیاوێکی زۆر هەبوو کە دەورێکی سەرەکی هەبوو بۆ ئاودان و بەکارهێنانی لە پێویستی مرۆڤ بۆ ئاودێری و باخەکانی دەوری کەرکوك.

لە هەمان کاتدا لادێکانی دەوروبەری کەرکوك زیاتر پشتیان بە بیروکارێزو کانیاو دەبەست بۆ پێویستییەکانی ژیانی رۆژانەیان.

*** کارێزەکانی کەرکوك:-**

١- کارێزی (تسن)
٢- کارێزی (باباگورگور)
٣- کارێزی (بەلاوە)
٤- کارێزی (تۆپزاوە)
٥- کارێزی (یایچی)
٦- کارێزی (عەرەفە)
٧- کارێزی (حاجی جەمیل) لە شۆریجە.
٨- دووکارێزی گوندی (بانگۆل)
٩- کارێزی (شێخ نایف) لە گوندی (باوە)

١٠- کارێزی (شێخ جەبار) لە گوندی (چیمەن)
١١- کارێزی (وەستا خدر)
١٢- کارێزی (شێخ حوسێن)
١٣- کارێزی (جانی)
١٤- کارێزی (تەکیە)
١٥- کارێزی (باخ سۆق) لە (ئۆمەرەگەدە)
١٦- کارێزی (باخ حەمید حەسەن) لە (ئۆمەرەگەدە)
١٧- کارێزی (باخ شێخ عیزەدین)
١٨- کارێزی (یونس)
١٩- کارێزی (گۆم سۆق) لە گوندی گەنیاك
٢٠- کارێزی (کویخا رەحیم - مێرگەبان) لە (گەنیاك).
٢١- کارێزی (ئەحمەد سوڵتان) لە شیوەی گوزەبینی لە گەنیاك
٢٢- کارێزی (مەرخوادەی خواروو)
٢٣- کارێزی (مەی بانە) لە گوندی مەرخوادەی سەروو.
٢٤- کارێزی (حەوزەکەی بەر ئاوایی) لە گوندی مەرخوادەی سەروو.
٢٥- کارێزی (مەیدان حاجی محەمەد) لە گۆڵەمە
٢٦- کارێزی (حاجی ستار) لە شێخ محەمەدی خواروو و سەروو.
٢٧- کارێزی (شێخ رەحمان شێخ محەمەد) لە شێخ محەمەدی
٢٨- کارێزی (عەمر بلاغ) لە سالەیی.
٢٩- کارێزی (شەخسەکە یەك) لە سالەیی
٣٠- کارێزی (شەخسەکە دوو) لە سالەیی
٣١- کارێزی (کونجیلی) لە سالەیی
٣٢- کارێزی (تکان لی) لە رێدار
٣٣- کارێزی (زەرکان) لە پەریخانی خواروو
٣٤- کارێزی (تەرجیل) هی عومەر ئاغای تەرجیل بوو
٣٥- کارێزی (بادەوا)
٣٦- کارێزی (کوورە) لە گوندی قەرەچێوار.
٣٧- کارێزی گوندی (قەشقە)
٣٨- کارێزی رۆخانی عەلی زاڵەو جەلال ئاغا.
٣٩- کارێزی (تۆپزاوی حوسێن بەگ)
٤٠- کارێزی (مەحمود ئاغا) لە (ترکەڵان)
٤١- کارێزی (سەید عومەر) لە (ترکەڵان)
٤٢- کارێزی (ئەحمەد بەگ) لە (یایچی)
٤٣- کارێزی (مامشە)
٤٤- کارێزی (باوە)
٤٥- کارێزی (کانی میرزا)
٤٦- کارێزی (مەلا تەها)
٤٧- کارێزی (مەلا عەزین)
٤٨- کارێزی (چڵکنە) لە گوندی (دار ئەختیار)
٤٩- کارێزی (کۆمەڵە) لە گوندی (دار ئەختیار)
٥٠- کارێزی (رەحمانە کوڵە) لە گوندی (دار ئەختیار)
٥١- کارێزی (شێوەی لوولەکە) لە گوندی (دار ئەختیار)
٥٢- کارێزی (گەزەکان) لە گوندی (دار ئەختیار)
٥٣- کارێزی (پەڵکە) لە گوندی (دار ئەختیار)
٥٤- کارێزی (بەر رەزەکە) لە گوندی (دار ئەختیار)

٥٥- کارێزی (قومەکە) لە گوندی (دار ئەختیار)

*** هەڵوێستەیەکی مێژووی چۆنێتی ئاو لە کەرکوك:-**

سەرچاوەی ئاوەرۆکانی ئاو بۆ کەرکوك لە کۆندا لە سەرووی کەرکوکەوە هەڵدەقوڵا لە گوندی (گورگی)و (یاروەلی) لە سەرەتایی رووباری خاسە، بەرامبەر (باروودخانە)ی کۆن، کە دوو رێرەوی هەڵقوڵاوی هەبوو، ئاوەرۆییەکەمی لەبەری دەستەراستی کەرکوك دەهاتە ئاوچەی زێویەوە، لەوێوە دووبەشی لێ دەبووەوەو دەهاتە (دەبەخانەو بوخاری)، ئەوی دەستەچەپی رێرەوی خۆی دەگرت بەرەو دەڤەری (قۆریە)و لە سەرەتادا لەلای ماڵی قازییەوە لێژ دەبووەوە خوارەوە و لەوێوە دەبوو بەدوو لق یان رێرەوەکە لقێکیان دەچوو بۆ گەرەکی (شاترلو) ئەوی تریان بۆ گوندی (بلاوە)، لقەکەی گەرەکی (شاترلو) دەچووە شوێنی (سوق المرکزی) جاران و لەوێوە دەبوو بەدوو لق لقێکیان دەرۆیشتە بازاری قۆریەو ئاڵتونچیو مزگەوتی مەلا ئەحمەدو مەلا سەعید ئینجا گلۆر دەبوو بۆ گاورباغیو دێی بلاوە. کە هەروودکیان لە بلاوە یەکیان دەگرتەوە.

هەروەها ئاوە... ئاوە لە ساڵێکدا چەند جارێك کرێکاریان کۆ دەکردەوە بۆ پاککردنەوەی ئاوەرۆکان بۆ ئەوەی ئاو. بەشێوەیەکی رێکوپێك بکاتە شوێنەکان.

لە ساڵی (١٩٥٠)ی زایینی کاتێك (مجلس الاعمار) دامەزرا لە عێراق، لە ئەستۆیدا بوو کە هەستێت بە هەڵکەندنی بیری ئیرتیوازی لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی عێراق کە لە لیوای کەرکوك (٣٥) بیری ئیرتیوازیان لە ناوچە جۆربەجۆرەکانیان هەڵکەند.

لە ساڵی (١٩٣٠) بۆ یەکەم جار لە سەردەمی موتەسەریفی کەرکوك تەحسین بەگی سەربازی (١٩٣٠- ١٩٣١) پرۆژەی ئاوی خواردنەوەی کەرکوك دامەزرا لە سەردەمی موتەسەریف جەمیل ئەلراوی (١٩٣٢- ١٩٣٦) پرۆژەکە فراوان کرایەوە.

لە ساڵی (١٩٤٦)ی زایینی، شارەوانی کەرکوك هەستا بەراکێشانی بۆری لە رووباری زێی بچووك لە (دوبز) بۆ کەرکوك لە سەردەمی موتەسەریف (عەبدولجەلیل حەسەن پرتۆ) بەراکێشانی نیو ملیۆن گاڵۆن ئاو.

لە ساڵی (١٩٥٠) بەرێکەوتن لەگەڵ موتەسەریفی کەرکوك و کۆمپانیایی نەوتی عێراق، هەستان بە دامەزراندنی پرۆژەی ئاوی کەرکوك، کە نزیکەی نیو ملیۆن گاڵۆن ئاوی دەدا.

هەروەها لە ساڵی (١٩٥٦) بەسەرپەرشتی وەزیری ناوخۆ سەعید قەزاز پرۆژەی ئاوی کەرکوك کرایەوە کە لەسەر ئاستێکی فراوان بایەخی پێدراو زیاتر ئاو گەیەنرایە نێو شارەکە.

لەدوایشدا کردنەوەی پرۆژەی ئاوی حەویجە بایەخ و گرنگییەکی تری دا بە پێشکەوتنی بەدەستهێنانی ئاو لە کەرکوك.

*** کێش و سەنگ و پارە لە کەرکوك:-**

د. بەختیار سەعید
شاکر زابت
عەبیر عەدنان یوسف

کێش و سەنگ و شلە یەکێکە لەو پێویستییانەی ژیانی مرۆڤ کە هەر لە دێر زەمانەوە بەکاری هێناوەو قۆناغ بە قۆناغ پێشکەوتنی تێدا کردووە بۆ چاککردنی پێویستییەکانی ژیانی تا بۆ ئەوەی کارەکانی ڕۆژانەی فەراهەم بکات. لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی شارستانی ئەم پێوانانەش گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لە هەریەکەو دەڤەرێکدا جیاوازی و گۆڕانی خۆی هەبووە، ئەویش بەپێی پێویستی شوێنەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

دەڤەری کەرکوکیش هیچی کەمتر نەبووە لە ناوچەکانی تر بۆ بەکارهێنانی پێوان و کێشان بەڵام ئەویش بەهۆی جیاوازی شارستانییەکانی جیاوازی پێوان و کێشانەکانیش تایبەتی خۆی هەبووە.

بەکارهێنانی پێوانی کێش و سەنگی هەریەکە لە میوەو ووشکە و گۆشت و خواردن و بەرووبووم پێویستی بەداهێنانی تایبەت هەیە تا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دروست و بەرچاو کارەکانی بباتە ڕێوە.

لە وولاتی نێو دوو ڕووبار گەلێك سەنگ و کێش و پێوان بەکارهاتووە کە کەرکوکیش بەدەر نەبووە لە بەکارهێنانیدا وەکو:-

کور Kur ۳۰۰ لتر.
سوت sut ۸۰ لتر.
پیی pi ٦۰ لتر.
قا ga ۱ لتر.
بلتو biltu ۳۰ کیلۆ گرام.
ئەلمان man ٥۰۰ گرام.
شیقل shigl ۸/۳ گرام.
شی sheu ٤٦.،. گرام.

بەڵام کرێکارو جوتیاری کەرکوك لە پارچە کشتوکاڵییەکانیاندا، بە تایبەتی لە سەردەمی هورییەکان لە شاری گاسوور گەلێك کێش و سەنگیان بەکارهێناوە لە کاروباری بازرگانییەکانیان ئایە گەورە بوایە یان بچووك کە ئەمانە نموونەیانە:-

ئەمرو imru ۸۰۰ قا.
تلو tallu ۸ قا.
سوتو sutu ۸ قا.
کاسو kasu ۱و۰ قا.
سو su شیقل.
زوزو zuzu ½ شیقل.
پارا - صیخرو para-sikhru ۱/ ۳ شیقل.
ریبوتو rebutu ٤/۱ شیقل.
تومو tummu ٤/۱ شیقل.

میشلو - صیخرو (mishlu-sikhur) ۸/۱ شیقل.
پراس - راب (paras-rab) ٦/٥ شیقل.

پارە یەکێکە لە هۆکارەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و هۆکارێکی گرنگی ئەنجامدانی ئاڵو گۆڕی بازرگانییە. لەم بارەیەوە جێگەی سەرنجە کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا دراو پارەی بەکارهێنراو زوو دەگۆڕان و زۆر جار کێشەی بۆ خەڵك دروست دەکردو بەگوێرەی پێداویستی ئەوان نەبوو، ئەمە بێجگە لە جۆراوجۆری دراوەکان لە ناوچەکاندا.

لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا لە کەرکوك و ناوچەکانی دەورووبەریدا چەندین جۆرە دراو بەکارهاتووە، لەوانە (قروش)، ئەم دراوە یەکێك بووە لە دراوە جێگیرەکانی دەوڵەتی عوسمانی. ئەم دراوە دراوێکی زیوی بووە یەکەم جار لە ساڵی (۱٦۸۸)ی زایینی لێدرا، ئەمەش دووجۆری هەبوو قروشی ساغ و قروشی چروك (واتە خراپ).

جێگەی سەرنجە نرخییەك قروشی هاوتای (۰۸/ ۹) فلسی عێراقی بوو کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا بەکاردەهات، بەڵام نرخییەك قروش یەکسان بوو بە نیو پینسی ئینگلیزی ئاقچە یەکێك بوو لە دراوە زیوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، کە لە سەردەمی مەغۆڵەکانیش بەکارهاتووەو عوسمانییەکانیش بەکاریان هێناوە کە پێی دەوترا ئاقچەی عوسمانی، بەهای ئەم دراوە دەیکردە چارەکە مسقاڵی زێڕ، هەروەها دراوی ناوبراو بە ڕێژەی ۹۰٪ پێکهاتەکەی زیوو بوو، بەڵام دواتر بەهۆی دابەزینی بەهاکەی لە ساڵی (۱۸۲۷)ی زاینی لە لێدان وەستا، جێگەی ئاماژەیە کە (ئاقچە) لە هەندێك ویلایەتی عوسمانی پێی دەوترا (فلوسی عوسمانی).

جگە لەم دراوانە چەند دراوێکی تری زیوی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتوون لەوانە چەرخی هەشتی و دراوی مەجیدی، ئەم دراوەی دوایی لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجید (۱۸۳۹-۱۸٦۱)دا لێدرا، سەبارەت بە بەهاکەی نرخییەك مەجیدی (۲۰) قروش و نیو مەجیدی (۱۰) قروش و چارەکە مەجیدیەك (٥) قروش بوو.

هەروەها دراوی (پارە)ش یەکێك بوو لە دراوە زیوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەم دراوە لە کەرکوك و ناوچەکەدا بەکارهاتووە، سەبارەت بە بەهاکەشی ئەکاتە (۱۰) پارە بەرامبەر بوو لەگەڵ یەك قروشی خراپ و (٥) پارەش دەیکردە نیو قروش. هەروەها دراوی فلوسی مسییەکێك بووە لەو دراوە عوسمانییانەی کە لە دەڤەری کەرکوکدا بەکارهاتووە، سەبارەت بە بەهای ئەم دراوە لە کۆتایی سەدەی حەفدەدا ئەوا نرخی (٥) فلوس دەیکردە یەك پارە.

هەرچی لە بارەی دراوی زێڕی بەکارهاتوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا لیرەی زێڕ هەبوو، ئەم دراوە لە کەرکوك و ناوچەکە بەکارهاتوو، دەربارەی نرخەکەشییەك لیرەی زێڕ دەیکردە (۱۰۰) قروش. هەروەها چەند جۆرە دراوێکی تری زێڕ لە ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتوون لەوانە:-
زێڕ ئەستەمبوڵ و زنجیرلی و ڕۆمی.

شایانی ئاماژە بۆکردنە کە بەکارهێنانی دراوی تورکی لە کوردستاندا لە چوارچێوەیەکی فراوان نەبووەو بەتایبەتی خەڵکی ناوچەکە مامەڵەیان بەرێگەی ئاڵوگۆڕی شمەکیش

(المقایضة) کردووە، نیبور لەم بارەیەوە دەڵێت:-

" ویستم لە ماوەی دانیشتنم لە موسڵ بەهەل وەربگرم دەستم کرد بە گەران بەدوای بوونی دراوی رۆمانیو یۆنانیو فارسی، بەڵام خەڵکی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەتوانیت لە ناوچەکانی کوردستان ئەم جۆرە دراوانەت دەست بکەوێت لەبەر ئەوەی لەو ناوچانەدا دراوی تورکی بەکەمی بەکار دەهێنرێت. شایەنی باسە لە ناوچە کوردییەکاندا بێجگە لە دروای عوسمانی دراوی فارسیش بەکارهاتووە.

سەبارەت بە یەکەکانی کێشانو پێوانەکردن لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەتوانین بڵێین ئەم یەکانە جێگیر نەبوو، بەڵکو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆران، بەڵام سەبارەت بە دەڤەری کەرکوک ئەوا دەبینین لە سەدەی نۆزدەدا چەندین یەکەی کێشانو پێوانەکردن بەکارهێنراون.

لە سەدەی هەژدەهەمیندا، زانایانو لێکۆڵەرەوان بیریان لەوە کردەوە کە دەروازەی جۆراوجۆر بدۆزنەوە بۆ ئەوەی بتوانن کێشەو ئاستەنگەکانی پێوانە چارەسەر بکەن و رێگا چارەی گونجاوی بۆ بدۆزنەوە، هەر بۆیە (مەتر)و (لیرە)و (گرام)، (فرانک) جۆرەها پێوانە بوون کە لەسەر ئاستی ئەورووپا ناوبانگی خۆی پەیدا کرد.

بۆیە دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینیی بریاری دا کە گەلێك لە پیرۆی (مەتری) بەکاربهێنێت، بەڵام لە پاڵ ئەمانەشدا هەر پێوانە کۆنەکان بەکاردەهێنرا، کە ئەمانەش نموونەیانە کە لە کەرکوكو شارۆچکەی (کفری) بەکاردەهێنرا:-

١- (وەقیە) هاوسەنگە بە (١٠٠) دەرهەم.
٢- (حۆقەی ئەستانە) هاوسەنگە بە (٧٣٦/ ٣٢٠) گرام.
٣- (کیلۆ) هاوسەنگە بە (٧٠٦٧، ٠) پاوەند.
٤- حۆقەی ئەستانە هاوسەنگە بە (٤٠٠) دەرهەم.
٥- حۆقەی ئەستانە هاوسەنگە بە (٩٤٤/ ٢٨٢) گرام.
٦- ١ کلیۆ هاوسەنگە بە (٢٦٨/ ٢) پاوەند.
٧- حۆقەی کەرکوك هاوسەنگە بە بۆشی جێهێڵراوە.
٨- ٢ حۆقەی ئەستانە هاوسەنگە بە (٥٦٦) گرام.
٩- ١ کلیۆ = ٨٢٦٨/ ٢ پاوەند.
١٠-باتمان هاوسەنگە بە( ½ ٦)ی حۆقەی کەرکوك.
١١-١٣ حۆقەی ئەستانە هاوسەنگە (٦٧٩) گرام.
١٢- ١٦ کیلۆ هاوسەنگە بە (٧٤٨/ ٣٦) پاوەند.
١٣- (چاکی) هاوسەنگە بە ١٦ باتمان، ئەم کێشانە تایبەت بووە بە کێشانی بەردی خانووکردن.
١٤ - (لیرە ج جاکیسی) هاوسەنگ بووە (٣) باتمان، ئەم تایبەت بووە بەکێشانی (گەچ).
١٥- (تەغاری گەنم) هاوسەنگ بووە بە (٣٠٠) حۆقەی ئەستەنبول کە بەرامبەر بووە (٣٠) کیویج) کە هاوسەنگ بووە بە (٣٥٠/ ٥٠٠) کیلۆ گرامو هاوسەنگ بووە بە (٤٥/ ١١٠٢) پاوەند.
١٦- (تەغاری جۆ) هاوسەنگ بووە بە ٣٠٠ حۆقەی ئەستەنبول کە هاوسەنگ بووە بە (٣٠) (کیویج) کە دەکاتە (٨٨٣/ ٣٨٤) کیلۆ گرام کە هاوسەنگی (٤٤٨) پاوەند.
١٧- (گرێی بچووك) بۆ پێوانەی خوری بەکارهاتووە کە دەیکردە هەشت گرێ کە هاوسەنگ بوو بە باتمانی کەرکوك.
١٨- (گرێی گەورە) بۆ پێوانە خوری بەکارهاتووە کە دەیکردە (شەش گرێ) کە هاوسەنگی باتمانی کەرکوك بووە.

*** ئەو کێشانانەی کە لە شارۆچکەی (کفری) بەکارهاتووە:-**

هەمان کێشانەکانی بەغدا بەکارهاتووە کە حۆقەی ئەستانەیان بەکاردەهێنا.

١- ١٠ حۆقەی ئەستانە هاوسەنگ بوو، بە (٤٥/ ٨٢٩) گرام.
٢- ١٢ کلیۆ هاوسەنگ بووە بە (٦٠٨/ ١٦٩) پاوەند.
٣- وەزنە هاوسەنگ بوو بە (٦) باتمان.
٤- ٦٠ حۆقەی ئاستانە هاوسەنگ بوو بە (٩٧٦٧) گرام.
٥- ٧٦ کیلۆ هاوسەنگ بوو بە (٦٠٨/ ١٦٩) پاوەند.
٦- تەغار هاوسەنگ بووە بە (٢٠) وەزنەو (١٢٠٠) حۆقەی ئاستانە هاوسەنگ بوو بە (٥٣٤) گرامو (١٥٣٩) کیلۆ بەرامبەر بە (١٦/ ٣٣٩٢) پاوەند بووە.

بەڵام لە دوای رووخاندی دەوڵەتی عوسمانیو دروستبوونی دەوڵەتی عێراق لە دوای شەری جیهانییەکەم، حکومەتی عێراقی یاسایەکی بە ژمارە (٧) لە ساڵی (١٩٣١) دەرکرد دەربارەی بەکارهێنانی (مەتری) بە پێوانەکردن، هەرچەندە هەندێك لە کێشەکانی کۆن وەکو خۆی مایەوە.

*** سەرچاوە:-**


١- ارابخا (کرکوك حالیاً) دراسە سیاسیە حچاریە (٣٥٠٠- ٥٣٩) ق.م، عەبیر عەدنان یوسف ئەلنەجار نامەی ماستەر، ٢٠١١، لاپەرە (٧٧- ٨٠).
٢- گۆڤاری (٩٧)، شوباتی ٢٠١٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (المیزان)، شاکر سابیر زابت، لاپەرە (١٥- ١٩).
٣- کەرکوك لە سەردەمی نۆزدەهەمدا، لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاریو ئابووری، بەختیار سەعید مەحموود شوانی ٢٠٠٩، لاپەرە (٢١٧- ٢٢٠).

*** گۆڕوگۆڕستان لە کەرکوك**

د. ئیبراهیم خەلیل

لە کەرکوك گەلێك گۆڕستان هەبووە، کە بەشێکیان لە سەردەمانێکی مێژوویدا ناوبانگی هەبووە، بەشێکی تریان لە ئێستادا شوێنەواریان نەماوەو لەناوچوونە، یان هەندێکیان لە سەردەمەکانی دواتر دروستکراوە لەبەر پێویستی مرۆڤ لەو شوێنانەدا:-

١- گۆڕستانی (قەڵا):-

ئەم گۆڕستانە لەسەر قەڵایە، لە گەرەکی حەمام لە ڕۆژهەڵاتی مەرقەدی پێغەمبەر (دانیال)، ئەم گۆڕستانە هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە گەلێك شاعیرو زانای ئایینی و نووسەران و سەرکردەکانی تێدا نێژراوە، بۆ نموونە گۆڕی حەسەن ئەفەندی، عەونوڵڵا کازمی، ڕەفعەت پاشا، عومەر محەمەدو ئەحمەد ئاغا عەبدوڵڵای تێدا نێژراوە.

٢- گۆڕستانی (موسەڵڵا - گۆڕستانی جوولەکەکان)

گەورەترین گۆڕستان بووە لە ڕابردوودا، کە بە گۆڕستانی جوولەکەکان بەناوبانگ بووە، لە ئێستادا بەشێکی گەورەی لێ ڕووخاوە، لە ڕابردوودا نوێژی هەردوو جێژنەیان تێدا کردووە، هەروەها نوێژی بێ بارانیان تێدا کردووە، دوو شەقام قەبرسانەکەی کردووەتە سێ بەشەوە.

کە بریتییە لە گۆڕستانی (سەید یوسف-ئەبوعلوگ)و سەیدی و سەید قیزی، لە دوای ڕۆیشتنی جوولەکەکان ئەم قەبرسانە بەرەو کاولکاری ڕۆیشت.

٣- گۆڕستانی (ئیمام ئەحمەد):-

کەوتووەتە گەرەکی (موسەڵڵا) لەسەر شەقامی (سەلاحەدین) بەرامبەر مزگەوت (مەلا ئلیاس)، ئیمام ئەحمەد لە گەرەکی موسەڵڵا بەناوبانگ بووە بە (سەید خان ئەحمەد)، کە کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم، ئەم گۆڕستانە زیاتر کاکەییەکان مردووەکانیان تێدا دەنێژن.

٤- گۆڕستانی (شێخ محێدین):-

گۆڕستانێکی گەورەیە لەنێوان گەرەکی (بولاق)و (بەرتەکیە) لە ڕۆژئاوای تەکیەی گەورەی تاڵەبانی و مزگەوتی مەجیدییە شێخ محەمەد (محێدین) کوڕی شێخ حەسەن لە ساڵی (١١٢٣) ی کۆچی لە گوندی (قولە) لە دایکبووەو هەر لەو گوندە فێری زانستەکانی ئایینی بووە لە سەردەمی شێخ ئیسماعیل وەلیانی خوێندوویەتی لە ساڵی (١١٧٩)ی کۆچی هاتووەتە کەرکوك و لە ساڵی (١١٩٥)ی کۆچی دوای کردووە، یەکێکە لە زاناکان و گەلێك کتێبی ئایینی هەیە.

٥- گۆڕستان و مەرقەدی (ئیمام قاسم):-

کەوتووەتە گەرەکی (ئیمام قاسم)، کەوتووەتە پشت مزگەوتی ئیمام قاسمەوە، لەم گۆڕستانە (محەمەد پاشا ساری کەهیە) والی کەرکوك و (تۆپاڵ عوسمان پاشا) سەرکردەی عوسمانییەکان لەگەڵ (نادرپاشا) لێرە نێژراوە.

لە ساڵی (١٠٢٣)ی کۆچی ئەم گۆڕستانە لە سەردەمی موتەسەریف (زولفیقار پاشا)ەوە نۆژەن کراوەتەوە، دووبارە لە ساڵی (١٠٣١)ی کۆچی نۆژەن کراوەتەوە، بۆ سێیەم جار لە ساڵی (١٣١٢)ی کۆچی نۆژەن کراوەتەوە.

٦- گۆڕستانی (کڵێسە سوورەکە):-

کەوتووەتە سەرڕێگای (کەرکوك - سلێمانی) بەرامبەر تەکیەی تاڵەبانی، گۆڕستانی مەسیحییە تورکمانی خەڵکی قەڵایە.

٧- گۆڕستانی (شێخ کندی):-

کەوتووەتە کۆتایی گەرەکی (پیریادی) لەلای ڕۆژهەڵاتی کانەکانی هەڵکەندنی بەردوگەچ، مەرقەدی شێخ شەمسەدین لێ بووە، گۆڕی زانای ئایینی محەمەد قوتبی لێیە باپیرەی عەبدولمەجید مەردان.

٨- گۆڕستانی (جەلالی):-

ئەم گۆڕستانە کەوتووەتە گەرەکی (شاتەرلو) لە ساڵی (١٦١٢)ی زایینی ئاماژە بە بنیاتنانی کراوە کە هی هۆزی گەورەی (جەلالی -گەلاڵی)یەکانە، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو لە کاتی کردنەوەی شەقام ئەم گۆڕستانەی کردە دووبەشەوە

لەم گۆڕستانە گەلێك شاعیرو نووسەر وەکو:-

مەلا سابیر، محەمەد سادق، عیزەدین عەبدی، ڕەشید کازم، موحسن بەهجەت، حەسەن عیزەت زەینەل، ئەحمەد ئۆتراقچی، مستەفا، ڕاغیب، خەلیل زەکی پاشا، جەمال کەمال، سەباح بەهلول نێژراوە.

لە بەشەکەی تری قەبرسانەکە هەر یەکە لە ئەحمەد ئاغا، مستەفا کەمال بایجەلی، مەلا ئەحمەد حەکیم، مەلا حەسیب مەحموود نێژراوە.

٩- گۆڕستانی سەید (عەبدولجەلیل):-

ئەم گۆڕستانە کەوتووەتە شەقامی کۆماری نزیك لە گۆڕستانی (شەهیدانی تورکمان-جەلالی) لە گۆڕەپانی سەید جیهاد لە دووڕیانی کرێکاران، لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو شەقامێك لە ناوەڕاستی قەبرسانەکە کرایەوە کە کردیە دوو بەشەوە کە لە بەشی ڕۆژهەڵاتییەوە مەرقەدی سەید عەبدولجەلیل و قوتابخانەی محەمەد سادق و مزگەوت و تەکیەی سەید عەبدولجەلیل و بەڕێوەبەرایەتی ئاگر کوژاندنەوە کرایەوە، بەشی ڕۆژئاوای (ئێستا پشتگوێ خراوەو تووشی داڕوخان بووە).

١٠- گۆڕستانی (سەید عەلاوی):-

ئەم گۆڕستانە کەوتووەتە نێوان دووڕیانی کرێکاران و گۆڕەپانی (الطیران) شەقامێك دەیبڕێت و دەیکاتە دوو بەشەوە، کە لە ساڵی (١٩٤٥)ەوە بۆی ڕاکێشراوە.

١١- گۆڕستانی (تەعلیم تەپە):-

کەوتووەتە کۆتایی گەرەکی (بەگەکان) لەسەر ڕێگای عەرەفە لە کاتێکدا شەقامێك کراوەتەوە، گۆڕستانەکەی کردووەتە دوو بەشەوە، لەکاتی عوسمانییەکاندا سەربازەکانی لەم شوێنەدا فێری چۆنییەتی بەکارهێنانی چەك دەکران.

١٢- گۆڕستانی (نەوتچییەکان):-

کەوتووەتە گەرەکی (شاتەرلو) کە گۆڕستانی خێزانی نەوتچییەکانە

١٣- گۆڕستانی (تەکارتە):-

کەوتووەتە شەقامی (بابەگوڕگوڕ) لە گەڕەکی (شاتەرلو)، هەر لە سالی (١٩٤٥)ی زایینییەوە بوونی هەبووە.
١٤- گۆڕستانی (دەمیرباش):-
گۆڕستانێکی کۆنو بەجێهێڵراوە لە گەڕەکی شاتەرلو لە پشت بنکەی پۆلیسی فریاکەوتن
١٥- گۆڕستانی (سوڵتان ساقی):-
ئەم گۆڕستانە کەوتووەتە گەڕەکی (تسن)ی کۆن کە نیو کیلۆمەتر لە گۆڕستانی سوڵتان ساقییەوە دوورە.
١٦- گۆڕستانی (شۆریجە):-
ئەم گۆڕستانە بەرامبەر نەخۆشخانەی (ئازادی)یە لەسەر ڕێگای گشتی (شۆریجە) کە بەرەو ڕووناکی دەچێت.
١٧- گۆڕستانی (ڕەحیماوا):-
لە ئێستادا گەورەترین گۆڕستانی کەرکوکو دەکەوێتە سەر ڕێگای (کەرکوك-هەولێر).
١٨- گۆڕستانی (باروتخانە):-
ئەم گۆڕستانە کەوتووەتە سەر ڕێگای کەرکوك-سلێمانی لەنێو گەڕەکی باروودخانە لەلای باژگە کۆنەکەی کەرکوك.
١٩- گۆڕستانی (تەپەی مەلا عەبدوڵلا):-
لە نزیك باخچەی (أم الربیعین) بووە، بەڵام لە ئێستادا نەماوە بووەتە خانوو.
٢٠- گۆڕستانی (سوڵتان ساقی):-
ئەمە لەنێو فرۆکەخانەی کەرکوکە
٢١- گۆڕستانی (کلدانەکان):-
لەسەر (کڵێسە سوورەکەیە) لە گەڕەکی ئیسکان
٢٢- گۆڕستانی (ئەرمەنەکان)
لەسەر ڕێگای (کەرکوك-هەولێر)ە لە گوندی سێکانیان.
٢٣- گۆڕستانی (ئاسورییەکان):-
ئەم گۆڕستانە لە گەڕەکی (عمل شعبی)یە لە نزیك (مرکز تدریب کرکوك)ی جاران.
٢٤- گۆڕستانی ئەرسەدۆکسەکان:-
ئەم گۆڕستانە لەسەر ڕێگای (کەرکوك-تکریت)ە
٢٥- گۆڕستانی سابیئییەکان:-
ئەم گۆڕستانە لە ناوچەی (الصیادە)یە لە شاری پیشەسازی.
* مردوو شۆرو گۆڕهەڵکەنەکان:-
١- حاجی عەلی شەمە
٢- عەبدولڕەحمان کەریم محەمەد قەساب.
٣- مەلا بورهان مەحموود
٤- مەلا ئومێد
٥- مەلا ڕەحیم
٦- مەلا حوسێن مەحمود
٧- مەلا عومەر بەربەر
٨- حاجی محەمەدو منداڵەکانی.
٩- جەودەت عەبدولڕەحمان
١٠- حوسێن یەحیا.
١١- عومەر جەلال
١٢- ئەکبەر ستار
١٣- سەدرەدین جەلال جاف
١٤- مستەفا محەمەد
١٥- ئەمینە نامیق
١٦- هەیبەتە سوور
١٧- قەدریە محەمەد سەفەر
١٨- تەها ئەلاوێردی
١٩- لەتیف عارف
٢٠- دەروێش سدیق
٢١- فیکرەت عیزەدین
٢٢- جەلیل سەید خەلیل
٢٣- مەلا بورهان مەحمود
٢٤- ئەشرەف نورەدین عوسمان
٢٥- حەمود عەلی
٢٦- حوسێن سابیر
٢٧- فاروق نامیق کەبابچی
٢٨- جەلال حاجی خەلیل
٢٩- تورهان یوسف بەکر
٣٠- یەشار ئەحمەد
٣١- کەماڵ بەقاڵ
٣٢- عەباس فازل
٣٣- حوسێن عەلوش
٣٤- فەلاح نوری عەبدوڵلا
٣٥- شوکور مەحمود
٣٦- حەسەن هاشم
٣٧- باجی فاتیمە
٣٨- زەکی محەمەد زەنگەنە
٣٩- حاجی ڕەفعەت ستار
٤٠- شەفیقە غائیب ئەحمەد
٤١- خڵخاس
٤٢- دولبەر شاکر بەکر
٤٣- عەمران عەلی
٤٤- عیسام
٤٥- ئەحمەد جەلعود
٤٦- سالح عەبدوڵلا
٤٧- خێزانی مەلا محێدین
٤٨- خەمیس بەقاڵ
٤٩- حاجی حەمزە عەباس
٥٠- عەلی عەبدوڵلا ڕەزا
٥١- مام ئەحمەد
٥٢- حوسێن ڕەفیق قاوەچی
٥٣- تەها حوسێن تۆفیق
٥٤- مەلا مەردان - مەلا تەرقە
٥٥- مەلا عەلی
٥٦- مەلا زەمزەم
٥٧- عیزەت بەگ
٥٨- نەجمەدین سدیق محەمەد دەروێش
٥٩- مەلا یوسف

*** قورئان خوێنەکانی کەرکوك:-**

١- مەلا سابیر عەبدولقادر کەرکوکی
٢- مەلا تەها عەبدولقادر کەرکوکی
٣- سەید زەینەڵ سابونچی
٤- مەلا عەبدوڵڵا لۆبیاچی
٥- مەلا محەمەد سۆفی
٦- تۆپاڵ مەلا محەمەد مەردان
٧- مەلا حەسوون عەبدولوەهاب گولەمەن
٨- مەلا تەیب مەلا رەشید
٩- مەلا سالح عەرەب
١٠- مەلا حەسەن ئەحمەد جگەرچی
١١- حاجی مستەفا عومەر گۆزەچی
١٢- مەلا عەلی جومعە سۆرانی
١٣- مەلا عومەر سلێمان یاپچی
١٤- مەلا حەسەن ئەلیاس
١٥- مەلا شاکیر قادر وەلی
١٦- مەلا عەلی یونس ترکەلانی
١٧- دەروێش جیهاد محەمەد سامی
١٨- حاجی نورەدین ئەحمەد محێدین
١٩- مەلا عومەر تاهیر موخلیس
٢٠- مەلا بورهان ئەحمەد مەردان
٢١- مەلا حەسەن جەعفەر سادق
٢٢- مەلا هیشام عەلی حەیدەر
٢٣- مەلا جومعە زەینەڵ دەباغ
٢٤- مەلا عومەر محەمەد کەریم
٢٥- مەلا نورەدین خورشید
٢٦- حاجی قاسم مستەفا بیرەقدار
٢٧- مەلا نوری قادر شەکرچی
٢٨- مەلا عەبود مەدەد
٢٩- حاجی مەحموود عەباس
٣٠- مەلا ئەحمەد مەولود قۆریالی
٣١- مەلا عەلی قۆریالی
٣٢- حاجی فاتیح عەبدولعەزیز هورمزی
٣٣- مەلا عەبدولواحید سەمەد ترکەلانی
٣٤- مەلا عومەر شوکور
٣٥- عەبدولسەمەد مستەفا زەینەڵ
٣٦- عەباس ئەحمەد ئیبراهیم
٣٧- مەلا عەباس جەماڵ عەلی
٣٨- مەلا حەسەن عەلی
٣٩- مەلا حەیدەر بەشیری
٤٠- مەلا نەجم فارس ئەحمەد
٤١- مەلا ئەحمەد عەبدوڵڵا
٤٢- مەلا ئیسماعیل پلانچی
٤٣- عەبدولکەریم زەینەڵ ئەلعابدین
٤٤- مەلا محەمەد ئەفەندی
٤٥- مەلا عەبود بوستانچی
٤٦- مەلا نورەدین بەقال
٤٧- مەلا جەعفەر سادق قەلایی
٤٨- مەلا عەبدولواحید ترکەلانی
٤٩- مەلا جەوهەر
٥٠- مەلا سامان گۆگجە

*** لێکترازانی کۆمەڵگەی کەرکوك**

ئەگەربێت‌و سەیری کۆمەڵگەی کەرکوك بکەین دەبینین کۆمەڵگەیەکی فرەنەتەوەو ئایین‌و فرە زمانەوە هەڵکەوتێکی ئەوتۆی تێدا دروست بووە کە سەرنجی گەلێك کەسی بۆ ئەوە راکێشاوە یاخود سەرنجی لەوەدا یەکی گرتووە کە چۆنییەتی مامەڵەکردنی ئەم خەڵکەو دەوری هەریەکە لەم نەتەوەو پێکهاتانە بە شێوەیەکی ئەوتۆ خەسڵەتی گرتووە کە بووەتە بەشێکی تایبەت‌و دیاریکراو لە کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتدا.
ئەوانەی لە نزیکەوە سەیری کەرکوك دەکەن بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە لە دەرەوەی کەرکوکەوە سەیری ناوەوەی کەرکوك دەکەن، لێکدانەوەی جیاوازیان بۆ دروست دەبێت لەو چوارچێوەیەی کە بیرکردنەوەمان بۆ چۆنییەتی پێکەوەژیانی ئەم نەتەوەو پێکهاتانە لەسەر چ بنەمایەك دارێژراوە.
ئەگەر سەیری دروستبووی کۆمەڵگەی کەرکوك بکەین هەر لە رەوتی رووداوە مێژووییەکانەوە تاکو ئێستا کە ئەو سەرنجە یەکلا دەبێتەوە کە هەردەم ئەم شارە لە ململانێیەکی گەورەدا بووە لەپێناو ژیان‌و هەوڵدان بۆ مانەوە لە رەوتی شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا.
رابردوو ئێستای ئەم شارە لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە کۆمەڵێك کاریگەری‌و هۆکار دەوریان بینیوە لە برەودانی دروستبوونی کۆمەڵگەی کەرکوك، هەروەها کۆمەڵێك هۆکاریش توانایەکی بەهێزیان هەبووە لەپێناو ترازانی شیرازەی کۆمەڵەو پێکهاتەکانی نێو کۆمەڵگەی کەرکوك.
حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی ئەم شارە بەشێوەیەك رێچەکەیان گرتووە یان توانیویانە لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە بنەماکانی کارکردنیان لە خزمەتی سیاسەتی حکومەتەکەیان بێت، یان بەواتایەکی تر ترازانی ئەو کۆمەڵگایە هۆکارێکی گرنگە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەرامەکانی حکومەتە یەك لەدوایەکەکان.
ئەوەی لێرەدا گرنگە بیڵێین ئەوەیە رەوتی ئەو مێژووە یەك لەدوایەکەی ئەم شارە پێویستی بە شرۆڤەکردن‌و لێکۆڵینەوە هەیە لە چۆنییەتی دروستبوونی کۆمەڵگەی کەرکوکدا.
هۆکارەکانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و رۆشنبیری رۆڵێکی باڵایان بینیوە لە دروستبوونی پێکهاتەی کەرکوکدا، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەوەی کە کەرکوك لەرووی شوێنی ستراتیژی ناوچەکە لە رووی جوگرافیاو شوێنی سەربازی ئەم شارە بۆ هێرشە یەك لە دوایەکەکانی مێژوو، بۆیە ئەو حکومەتانەی هاتوونە گرنگییەگی تایبەتیان بە کەرکوك داوە ئەویش لەبەر ئەوە بتوانن هەوڵەکانیان چڕبکەن لە رووی کاریگەری لەسەر نەتەوەو پێکهاتەکانی.
سیاسەتی دەوڵەتە یەك لە دوایەکەکان تا ماوەی عوسمانییەکان‌و لەوەو دوای هاتنی ئینگلیزو حکومەتەیەك لەدوایەکەکانی عێراق رەچاوی ئەوەیان کردووە کە چۆن‌و بە چ شێوازێك هەوڵی ترازانی پێکهاتەکانی کەرکوك بدەن.
یەکێك لەو خاڵە گرنگانەی کە هەنگاویان بۆ ناوە سیاسەتی ئاژاوەو دووبەرەکی‌و نانەوەی فیتنە لەم شارەدا لەنێو پێکهاتەکانی بۆ ئەوەی هەوڵبدەن هەردەم ئەو پێکهاتانە لە لێکترازاندا بن، نموونەشمان لەم جۆرە کردارانە هەر لە دەوڵەتی عوسمانییەوە تا پرۆسەی ئازادی جۆراوجۆرە وەکو ئاژاوەی سەردەمی عوسمانییەکان‌و هێزی لیڤی سەردەمی ئینگلیزەکان‌و رووداوی (١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨)ی سەردەمی عەبدولکەریم قاسم کۆمەڵێك رووداوی زەقن کە بەهیچ جۆرێك پێکهاتەکانی کەرکوك دەوریان تێدا نەبینیوە بەڵکو لە دەرەوەی کەرکوکەوە دەسە دەرەکییەکان رێگە خۆشکەربوون بۆ نانەوەی ئاشووب‌و ئاژاوەگێری.
ئەوەی لێرەدا گرنگە بیڵێین کەم ئەم ئاژاوانە دەوری گەورەیان بینیوە لە لێکترازانی ئاشتەوایانەی پێکهاتەکانی کەرکوك، لەسەر ئەو بنەمایەی خولقاندنی ئەو ئاژاوانە بووەتە هۆکارێکی گرنگ کە دەستی دەرەکی هەردەم دەستە باڵابن لە تێکدانی بارەکەدا، هەر بۆیە تاکو ئێستاکە چارەسەرکردنی کەرکوك پێویستی بە لێك تێگەیشتنێکی ناوخۆی هەیە بۆ ئەوەی بتوانن دەستە دەرەکییەکان لێك بترازێنن‌و کۆمەڵگەیەکی ئاشتی بەر قەراربێت.
لەرووی ئابووریشەوە کەرکوك بریتییە لەوەی کە ناوچەیەکی دەوڵەمەندبووە، بەڵام هیچ کاتێك ئەوپیت‌و بەرەکەتییە لە خزمەت ئەم شارەو دانیشتووانەکەیدا نەبوو بگرە بووە بە نەهامەتی و کێشەیەکی گەورە بۆ لێکترازانی کۆمەڵگەی کەرکوك، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەردەم سیاسەتی ئابووری حکومەتەیەك لەدوایەکەکان بەشێوەیەك دارێژراوە کە هەردەم خەڵکی کەرکوك لە راوەدوونان‌و سووتان‌و کاولکردن‌و گرتن‌و رووخاندنی گوندەکانی بێت، کە ئەویش بەوەدا هەڵگەراوەتەوە کە چواردەوری کەرکوك تەنراوە بە ئوردوگای سەربازی‌و زۆرەملێ، کە ئەمە وایکردووە کۆمەڵگەیەکی بێ بەرهەم کە لە رابردوودا کۆمەڵگەیەکی بەرهەمهێنەر بووە دروست بێت.
بۆیە رەنگدانەوەی ئەم سیاسەتە ئابوورییە بەم شێوەیە بووە بە پەراگەندەو سەرگەردانی پێکهاتەکانی شارەکەو ژیانی لە دەرەوەی وڵات بەسەربردووە یان کەوتووەتە بەر لێشاوەکانی سیاسەتی بەعس بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە ناسینەوەی شارەکەی لاناموٚ بێت، یاخود ئینتیمای نەتەوەی نەبێت بۆ گەرانەوە بۆ کەرکوك، چونکە هیچ زەوییەکی کشتوکاڵی یان بەرهەمهێنەر نایبەستێتەوە بە شارەکەی تا بۆ ئەوەی ئارەزووی بازوویەکی بەرهەمهێنەری هەبێت، ئەمە سیاسەتێکی رۆژو دوو رۆژ نەبووە، بەڵکو پرۆسەیەکی درێژ خایەنی قۆناغ بە قۆناغ بووە کە توانیویەتی کەسایەتییەکانی خەڵکی کەرکوکی تێدا ناموٚ بکات.
ئەوەی لەدوای پرۆسەی ئازادیشەوە بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە ناموٚی تاکی کەرکوك تاکو ئێستا رەنگدانەوە بەسەردا ماوە و بووەتە بەشێك لە گرێ کوێرەکانی دەروونی کە بەبێ چارەسەر ماوەتەوە کە ئەویش پێویستی بەوە دەکات پێکەوە دەست بخرێتە سەر برینەکان‌و بۆ سارێژکردنی‌و نەمانی ئەو بارە ناموٚیە.
حکومەتە یەك لەدوایەکەکان سیاسەتێکی رۆشنبیریی سیاسییانەیان بەکارهێنا تا بەوەی ئەدەب‌و شیعرو چیرۆك

لە خزمەت سیاسەتدا بێتو ڕۆشنبیریی‌و هزری فیکری مرۆڤایەتی پاشکۆیەکی دەستەمۆی سیاسەت بێ بۆ ئەوەی سیاسەت بتوانێت هەموو لایەنە جوانکارییەکانی تایبەت بە کەرکوک نامۆ بکات.

ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەو بەها ڕۆشنبیرییەی لە ڕابردوو هەبوو لە کەرکوک هەمووی کرایە و لە تەنووردانی سیاسەتدا سووتا بە شێوازێکی ئەوتۆ کە ناسینەوەی زۆر زەحمەت بێ.

ئەوانەش کە داهێنانیان کرد لەم شارەدا لەڕووی ڕۆشنبیرییەوە بەوەدا شکایەوە کە هەموویان ئاوارەو دەربەدەری شاران بن یان بەرهەمەکانیان لە کونجی تاریکیدا. یاخود بوو بە خۆراکی ئاگرو لە نەماندا بزر بوو، کەرکوکیش بوو بە خاڵی سفر لە ڕۆشنبیریی‌و هزرە مەعریفییەکان کە تاکو ئێستا کە خۆی نەگرتووەتەوە.

یاخود نەیتوانیوە ئەو ئینتیما نەتەوەییەی خۆی بەدەستبهێنێت، بۆ ئەوەی بتوانێت مۆرکی جوانکاری خۆی دەربخات، چونکە کاریگەرییەکانی میدیا و ڕاگەیاندنی بەعس بەشێوەیەك داڕێژرابوو کە دەرباز بوون لێی زۆر ئەستەم بوو، بۆیە پێویستی بە بەرنامەی ڕۆشنبیریی بەردەوام هەیە بۆ دووبارە گەڕانەوەی خاسییەتە تایبەتییەکانی ڕۆشنبیری ئەم شارە.

*** جارانی دادگاکانی کەرکوك**

**شەرەفەددین جەباری**

ئەم وێنانە لە دادگاکانی کەرکوك گیراوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٥ کە لەلایەن فۆتۆگرافەرێکی ئینگلیزەوە گیراوە بەناوی ماکس ئەهلێرت کە لەلایەن کۆمپانیای ئۆلیستینگ بیلدەوە بەرهەمهێندراوە.

دادگای کەرکوك لەنێوان ساڵانی ١٨٥٣-١٩٧٠ جێگەکەی لە سەرای کەرکوك بوو، بەڵام لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا گواسترایەوە بۆ بینایەکی دوو نهۆمی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا تەلارێکی گەورەی چەند نهۆمی بۆ دروستکرا.

ئەوەی لەم وێنانەدا بەرچاو دەکەوێت هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی خەڵکییە لە دادگای کەرکوك کە سادەیی هەستپاکی خەڵکەکەی بەرچاو دەکەوێت لە سکاڵانووس و دادوەر و داواکار و پارێزەر و بەرگریکاری داواکار.

لەم وێنانەی بەرچاو دەکەوێت زۆری خەڵکەکەی بە جلوبەرگی کوردی وەکو کەوا و سەڵتە و کەواو چاکەت و مشکی و جەمەدانییەوەیە کە زۆربەیان خەڵکی لادێکانی کەرکوکن کە بۆ کار ڕایکردنی کاروبارەکانی ڕۆژانەیان هاتووچۆی دادگایی کەرکویان کردووە.

تاوانبار و بەرگریكاران بەرامبەر پارێزەران لە دادگایی كەركوك

تاوانبار و بەرگریكاران بەرامبەر پارێزەران لە دادگایی كەركوك

*** پارێزەری لە عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان:-**

**ئەحمەد مەجید ئەلحەسەن**

هەروەکو دیارە کە عێراق بەشێك بووە لە دەوڵەتی عوسمانی هەر لە ساڵی (١٥٣٤-١٩١٧) هەر بۆیە پێشکەوتنی پارێزەری هاوپەیوەست بووە بە پێشکەوتن و گۆڕانی لە دەوڵەتی عوسمانیدا، بۆیە خوێندنی لە ئەستەمبوول رەنگدانەوەی بەسەر عێراقدا هەبووە، چونکە پارێزەری هاوگونجاوی بەرزی (الفقه الاسلامي) بووبوو تا گۆڕانکاری لە پارێزەری ئەوەی لە رۆژئاوادا باوبوو.
پێشەی پارێزەری بەو شێوە باوەی ئێستای ئاشنا نەبووە پێی یاسای عوسمانی تا ساڵی ١٨٧٥ی زایینی، تا ئەو کاتەی لە دەقێکدا ئاماژە کراوە بەوەی کە خۆی ئامادە بێت یان لە رێگای بریکارەوە بەرگری لێبکات. هەروەکو ئەوەی رێکخراوە لە (مجلس شورای الدولة) و (دیوان الاحکام العدلیة)، ئاماژە بە بریکار کراوە، بەڵام ئاماژە بەوە نەکراوە دەبێت پارێزەر بێت، چونکە لەو کاتەدا ئەو وشەیە باونەبووە.
بەڵام لە دوای دامەزراندنی قوتابخانەی ماف لە ئەستەنبول لە ساڵی (١٨٧٤)ی زایینی، سەرەتایەکی راست بوو بۆ پیشەی پارێزەر بە مانا سەردەمییەیانەکەی، بەڵام تا سەرەتای سەدەی بیستەم بە تەواوی جێگیر بوو، چونکە تا ئەو کاتە لەنێوان (وکیل الدعاوي) و (الافوکاتو) هەڵبەزو دابەزی دەکرد.
ئەو پارێزەرە کەرکوکییانەی کە لەو سەردەمەدا لە ئەستەنبوڵ لە بەشی پارێزەری دەچوون بریتی بوون لە:-
١- محەمەد خورشید، ساڵی ١٩٠٩.
٢- محەمەد شەفیق رەحمەتوڵلا، ساڵی ١٩١٣
٣- عەبدولکەریم عەبدوڵلا.
بەڵام لەدوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٠٨ قوتابخانەی (ماف) لە بەغدا کرایەوە، سەرەتای دەرکەوتنی پارێزەری بوو بە شێوەیەکی پیشەیی پارێزەری بوو بە شێوەیەکی راست و دروست و ئەمانە دەرچووی سەرکەوتوو بوون لەم بوارەدا:-
١- مەحموود سوبحی ئەلدەفتەری
٢- حەسەن عەبدولوەهاب نائیب
٣- عەلائەدین عەبدولوەهاب نائیب
٤- مستەفا کامیل عارف ئاغا
٥- شێخ ئەحمەد رەفیق
٦- جەلال ئالوسی

***چەند ڕواڵەتێکی شاری کەرکوك:-**

**موعتەسەم ساڵەیی**

پارێزگای کەرکوك دەکەوێتە ناوچەی گەرمیان، سنووری گەرمیان لە دەربەندی بازیانەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە دەروازەی ئینجانە لە گەروویەکی ڕیزە چیای حەمرین، لەسەر ڕێگای سەرەکیی نێوان شاری کەرکوك و شاری بەغدای پایتەختی عێراق.

(میر سمایلی زەنگەنە) کە لەنێوان ساڵانی (١٥٩١-١٦٨٨) ی زایینیدا ژیاوە، خاوەنی دەسەڵات و سوپای تایبەتی خۆی بووە، قەڵەمڕەوی ئەمارەتەکەی تاوەکو بەرزاییەکانی حەمرین ڕۆیشتووە، هەر میر سمایلیش قەڵای ئینجانەی دروستکردووەو دەسەڵاتی خۆی سەپاندووە، بەداخەوە لە سەردەمی بەغدا بەچاوی خۆمان دەمانبینی کە ڕژێمی بەعس ئەو قەڵا دێرینەی کردبوو بە بازگەی سەربازی بۆ دەستگیرکردن و تۆقاندن و ڕووتانەوەی خەڵکی هاتووچۆکەر.

لە سەردەمانی کۆندا خێڵێك بە ناوی (هەمرانۆ)وە لە باکووری وڵاتی بابلدا لەسەر ڕیزە چیای حەمرینی ئێستادا ژیاون، وەها پێدەچێت کە وشەی حەمرین لە ناوی ئەو خێڵەوە سەرچاوەی گرتبێت (بڕوانە کتێبی المدخل الی تاریخ العراق القدیم، دکتۆر سامی سعید الاحمد، لاپەرە ١٥٨) بەپێی بۆچوونی مێژوونووسی ئەرمەنی ناسراو (موڤیس) کە لە سەدەی پێنج و سەرەتای سەدەی شەشدا ژیاوە، ساسانییەکانی ئاشنای میدییەکان ناوچەی کەرکوکیان ناوناوە (گەرمەکان-Gamarkan) کە سنوورەکەی لە باکووری ڕۆژئاوای زێی بچووکەوە دەستی پێکردووە تاوەکو باشووری ڕۆژئاوای چیای حەمرین، هەروەها سەرچاوە سریانییەکان ناوی کەرکوك و دەوروبەریان نابوو (باپ گەرمە-Bethgarma) ئەوەی شایەنی باسە ئەم دوو ناوە کۆنانە لە وشەی (گەرمیان)ی ئێستاوە زۆر نزیکن.

حکومەتی بەعس بە تایبەتی لە پاش ساڵانی هەشتاکان، سیاسەتی تەعریب و بە عەرەبکردنی زۆرە ملێی بەخەستی خستەگەڕ و پیادەی کرد، ئەویش لە پێناوی سڕینەوەی ناسنامەی کوردی، بۆ ئەم مەبەستە شۆڤێنییە ڕەگەز پەرستییەش بە ملیارات دیناری لە شاری کەرکوکدا خستەکار، بەڵام خۆشبەختانە بە پێچەوانەی نەخشەو پیلانی گڵاوی دوژمنانەوە، کورد هەرگیز نەتوایەوەو بگرە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر پەرەی سەند و گەشایەوە، ئەم دیاردەیەش بووە مایەی سەرسووڕمانی دوژمنانی باوە کوشتەی کورد و خۆشحاڵی دۆست و لایەنگرانی میللەتەکەیان، گەر ویستمان باسی تۆبۆگرافیای شارەکە بکەین، نابێت ناوی خڕی خاسە فەرامۆش بکەین، چەمی خاسە یاخود بەستی خاسە لەنێو گوندەکانی ناوچەی شوانەوە سەرچاوە دەگرێت و لق و چڵەکانی بەرەو خوار دەبنەوە (سەیدان) یەکەم گوندی ناوچەی شوانی سەرخاسەی شاری کەرکوکە، بەستی خاسە لەو گوندەوە دەست پێدەکات، دوو گوندی سەیدان هەن، کە سەیدانی ژووروو و سەیدانی خواروون، نێوانی هەردوو گوندەکەیش دە خولەك پتر نییە، خڕی خاسە بە نێوەڕاستی شاری کەرکوکدا ڕەتدەبێت و شارەکە دەکات بەدوو بەشەوە، بەشی ڕۆژئاوا لەگەڵ بەشی ڕۆژهەڵات کە بەری قەڵا دێرینەکەیە، پانی چۆمەکە دووسەد یاخود سێ سەد پێیەك دەبێت، لە وەرزی هاویندا وشك و برینگە و ئاوی پێدا ڕەتنابێت و پڕە لە زیخ و چەو و قووم، کە کەرەستەیەکی شیاو و لەبارە بۆ چیمەنتۆ و کاری بیناسازی، لەناو کوردەواریدا باوە کە بە چەمی خاسە و چەندین چەمی تر لە کوردستاندا دەوترێت (خڕ) چەندین بۆچوون بۆ لێکدانەوەی وشەی (خڕ) هەن، هەندێك دەڵێن گوایە لە دەنگی خورەخوری ئاوەوە هاتووە، بەتایبەتی لە وەرزی باران بارینیدا، لە وەرزی زستان و بەهاردا لافاو دەکات و ئاوەکەی بە خوڕ دەڕوات، هەروەها لە گەرمیاندا بە بەردی خڕ دەوترێت (خڕگە) کە لەنێو خاسە و چۆمەکاندا زۆرن، هەندێکی تریش لەو بڕوایەدان کە کاتی خۆی ڕێڕەوی ڕووباری دیجلە زەلکاوەکانی خوارووی عێراقی بڕیوەو بەرەو خوار بووەتەوە، ناویان ناوە (خڕ) یاخود (خارو) کە بە مانای کەناڵی ئاو دێت، ئەو ڕێڕەوە ئاوەیش لە سەردەمانی کۆندا سنووری نێوان عیلام و وڵاتی بابلی کۆنی پێکهێناوە.

ساڵانی زوو تاوەکو ساڵانی شەستەکانیش سێ جۆگەلەی ئاو لە ژوورووی شاری کەرکوکەوە هەڵبەسترابوون، دووانیان بە کەناری ڕۆژئاوای خڕکەوە ڕەتدەبوون و یەکێکی تریشیان بە کەناری ڕۆژهەڵاتی خڕکەوە ڕەت دەبوو، ئەویش بۆ ئاودێریکردنی باخەکانی سەوزەی ژوورو و خوارووی شاری کەرکوك، بەڵام لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا ئەو سێ جۆگەلە ئاوە کوێربوونەتەوە بە نیسبەت وشەی (خاسە) وە زۆرجار بە هەڵە ماناکەی لێکدەدرێتەوە، هەندێك لە عەرەبەکان بە هەڵە ناوی دەبەن و پێی دەڵێن (خاصة الأدهم) ئەم وشەیەش دروستکراوە، چونکە بوونی میللەتی عەرەب لە شاری کەرکوکدا تازە و نوێیە، وەهایشی بۆ دەچن گوایە وشەی (خاصة)بە زمانی عەرەبی بە مانای (تایبەتی) دێت، عوسمانییە داگیرکەرەکانیش دەستکاری ناوەکەیان کرد و ناویان لێنا (خاسە سوو) کە بە زمانی تورکی بە مانای (ئاوی خاسە) دێت ئێمەی کوردیش هەندێك جار بە هەڵە مانای ئەم وشەیە لێکدەدەینەوە، دەڵێین گوایە ناوەکەی لە وشەی (خاس)ی شێوەزاری گەرمیانەوە وەرگیراوە، کە مانای (چاك) یاخود (باش) دەبەخشێت، لە سەردەمانی کۆنەوە کورد وتوویەتی ئاوەکەی خاسە بە مانای ئاوەکەی باش و سازگارە.

سەرچاوە مێژووییەکان لەم ڕووەوە دەڵێن کە پاشای ساسانی (شاپووری دووەم ٣٠٩-٣٧٩ز) کەسایەتییەکی زاڵم و ستەمکار بووە کە بەرادەیەکی زۆر مەسیحی و دیانەکانی چەوساندووەتەوە و زۆریشی لێ کوشتوون، لە ساڵی (٣٢٨) ی زایینیدا ئاگر لە شاری کەرکوك بەردەدات و خاپووری دەکات، خەڵکی شاریش بە تایبەتی مەسیحییەکانی شاری کەرکوك هەڵدێن، لە شوێنێکدا لە کەناری خڕی خاسەدا جێگیر دەبن (ئەوسایش ئەم ناوەی ئێستای نەبووە) ئەو مۆڵگایەش ئەوسا ناوی لێنرا ناوچەی ئاوار هەڵاتووە (حاشا) لێکراوە

دەربەدەرەکان، هەر کە سوپای ساسانییەکان شوێنەکەیان پێدەزانن هێرشیان دەبەنە سەر و گەلێکیان لێدەکوژن، بۆیە ئیتر هەر لەو سەردەمە کۆنەوە ناوی (خاسە) بڕایە سەر سەرجەم چەمەکە.

ناوی (خاسە) لە وشەیەکی کلدانی و سریانیدا هاوڕەگەزن، بۆیە لە زمانی عەرەبیشدا وشەی (حاشا) بەکاردێت، ئێمەی کوردیش ئەم وشەیەمان لە عەرەبەکانەوە وەرگرتووەو بەکاری دەهێنین، کە بە مانای نکۆڵی کردن دێت، لە پاشاندا وشەی (حاشا)ی ناوی چەمەکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو بووە بە (حازا)، (حاسا) و، لە پاشانیشدا سەقامگیری بەخۆیەوە بینیوە بووە بە (خاسە) ئێستا ئێمەی کوردیش بە چەمەکە دەڵێین (خڕی خاسە) خڕی خاسە بەدووری چەند کیلۆمەترێك لە باکووری شاری کەرکوك بە تەنیشتی گوندی (یاروەلی)دا ڕەتدەبێت، لە خوارووی گوندەکەدا لەتەك چەمی (خۆشی) دا یەك دەگرنەوە، عوسمانییەکان ناوی چەمەکەیان گۆڕی و کردیان بە (قوشی) کە بە زمانی تورکی بەمانای چەمی باڵندە و تەیر و تواڵ دێت، وەکو زانراوە ساڵانی زوو لە دەورووبەری چەمی خۆشیدا پەلەوەرێکی زۆر هەبوون بە تایبەتی باڵندەی کۆتر، تاوێرێکی بلند و سەخت هەبوو پێیان دەووت کونە کۆتر کە بە سەدان مەلی کۆتری لەخۆ دەگرت، ئەم چەمی (خۆشی)یە لە وەرزی هاوین و زستاندا ئاوی لێنابڕێت و کانیاوێکی زۆری تێدایە، ساڵانی زوو لە وەرزی هاویندا هەمووی دەکرا بە بێستانی ترۆزی و کاڵەك و شووتی، تەنانەت (ترۆزی خاسە) ناوبانگێکی زۆری هەیە، هەندێك جار درێژییەکەی مەترێك زیاتر دەبێت، هەروەکو دەگێڕنەوەو دەڵێن لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا سوپای ئینگلیز بەربەستێکیان لە نێوچەمی خۆشیدا هەڵبەستبوو گۆماوێکی گەورەو قوڵیان پێکهێنابوو، لە ڕۆژانی گەرمی وەرزی هاویندا سەربازە ئینگلیزەکان لەتەك ژنە ئینگلیزەکاندا پێکەوە مەلەیان لەنێو گۆماوەکە کردووە.

*** ئینگلیزەکان له کەرکوك پاسکیلیان کرد به نەریت:-**

**عیماد جەباری**

**عەشقی کەرکوکییەکان بۆ پاسکیل کۆتایی نایەت**

ئەگەرچی ئێستا له ژیاندا نەماوە، بەڵام هێشتا دەنگی مەلا حوسێنی سەموون فرۆش، له بیرەوەری حاجی رەحیمی (٨٠ ساڵ) ماوه، مەلا حوسێن به پاسکیلێکی جۆری فلێپس لەنێوان ساڵانی شەست تاوەکو هەشتاکان به گەرەکەکاندا سەرقاڵی سەموون فرۆشتن بوو، بەهۆی ئەوەی پیاوێکی نابینا بوو خەڵکێکی زۆر بووبوونه موشتەری و بەیانیان له چاوەروانیدا بوون، حاجی رەحیم وای ووت.
هەر کات باسی مێژووی پاسکیل له کەرکوك بکرێت، بەتەمەنەکان خەیاڵیان دەروات بۆلای پیاوێکی نابینا به ناوی (مەلا حوسێن) که به سواری پاسکیل سەموونی فرۆشتووە، حاجی رەحیم باسی ئەو رۆژانەی کرد که تێیدا له تەمەنی هەرزەکاریدا بووه و له ناو بازار کچ و کوری ئینگلیزەکانی بینیوه به پاسکیل هاتوونەته ناو بازار و سەردانی سینەمای هاوینەیان کردووە، حاجی رەحیم ئێستا ئاخ بۆ ئەو رۆژانه هەڵدەکێشێت که دێتەوه یادی لەگەڵ برایەکی دیکەیدا دوو پاسکیلیان کریوه لەلای یەکێك له بریکارەکانی کۆمپانیای بریتانییەکان له جۆری ئەنکۆڵ، حاجی رەحیم وتی: رۆژانه به پاسکیل چوومه سەر کار له نانەواخانەیەك وەك شاگرد کارم دەکرد، زۆر به دەگمەن کچ و کورێکی کەرکوکی هەبێت له پاسکیل نەزانێت، ئەمەش وایکردووە کەرکوك به تەنیا به نەوتەکەیدا نەناسرێتەوە، نەریتی پاسکیل سواریش یەکێکی تره ناسنامەکانی خەڵکی ئەو شاره و لەو کاتەوەی ئینگلیزەکان بۆ دروستکردنی کۆمپانیای نەوتی باکوور روویان له شارەکه کردووه تا ئێستا دانیشتووانەکەی خۆشەویستیان بۆ پاسکیل سواری کۆتایی نەهاتووە.
زاهیر شکور نووسەرێکی کەرکوکه و ئاگاداری مێژووی شارەکەیەو باس لەوه دەکات کۆمپانیاکه ژمارەیەکی زۆر پاسکیلیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بوو، ئەو کات به قیستی مانگانه دەیانفرۆشت به کرێکارەکانی کۆمپانیاکه.
کۆمپانیای نەوتی باکوور لەلایەن کۆمپانیایەکی بەریتانییەوه له ساڵی ١٩٢٧ دروست کراوه بۆ ئەو مەبەستەش کۆمپانیاکه ژمارەیەکی زۆر ئەندازیارو کارمەندی لەو وڵاتەوە هێناوەته کەرکوك، کۆمەڵەیەکی بۆ نیشتەجێ کردنیان دروست کردبوو له نزیك کۆمپانیاکه که ئێستا به گەرەکی عەرەفه دەناسرێت و کەوتووەته رۆژئاوای شارەکەوە.
به بیرەوەری ئەو پیرەمێردانەی له ژیاندا ماوون، دوو بریکاری پاسکیل فرۆش له کەرکوکدا هەبوون، یەکێکیان بریکاری کۆمپانیای (هەمبەر و فلێپس)ی ئینگلیزی بووه، بریکارێکی دیکەش تایبەت بووه به فرۆشتنی پاسکیلی جۆری ئەنکۆڵی ئینگلیزی.
نووسەرێکی تری کەرکوك که ئێستا تەمەنی بەرەو هەڵکشان چووەو سەردەمانێکیش به پاسکیل چووەته خوێندنگه،

پاسکیلی هەمبەر و یەکەم ریکلامی کە لە کەرکوک بڵاوکرایەوە

چەندین هۆکار بۆ دیاردەی پاسکیل سواری لە شارەکە دەگەڕێنێتەوە، دیارترینیان بوونی کۆمپانیای نەوتی باکوور و کەمی ئۆتۆمبێل و ڕێگاوبانەکانی شارەکەش کە تەختە و بۆ پاسکیل سواری گونجاوە.

سەباح بازرگان، (٦٦ ساڵ) دەڵێت: لە قۆناغی ئامادەیی دا ناچار بووم پاسکیل بکرم بۆ هاتووچۆکردنم لەماڵەوە بۆ خوێندنگای کەرکوك کە تەنها ئامادەیی شارەکە بووە ئەو کات.

وتیشی : ئێستاش بە بیرمە پاسکیلی هەمبەر کە باشترینیان بوو نرخی ١٠ دینار بوو، پاسکیلی دیکەی هەرزان بەهاش هەبوون کە چینی بوون و نرخیان لە دوو دینار تێنەدەپەڕی لە رابردوودا بەشێوەیەك پاسکیل لە کەرکوك زۆر بووە، قسەیەك بووەتە باو لەناو خەڵکی ناوچەکانی تردا بەوەی کەرکوکیان ژن نادەن بە کەسێك لە پاسکیل نەزانێت بەڵام ئێستا ئەم قسەیە باوی نەماوە.

ئەگەر سەردەمێك پاسکیلی مۆدێل هەمبەر و فلیپس، برەویان هەبووبێت و پاسکیلی دلخوازی گەنجانی کەرکوك بووین، بەڵام ئێستا تەنها لە بیرەوەری خەڵکدا ماونەتەوەو پاسکیلەکانی جۆری جیهان و سەبعە وتایەپان بازاڕیان گەرمە.

سەلام مەعروف، یەکێك لە بریکارەکانی پاسکیل لە کەرکوك، بە ئاژانسی راگەیاند بەهۆی هەرزانی نرخەکەیەوە لەم کاتەدا داوا لەسەر پاسکیلی سەبعە کە لەنگەیە زۆرەو نرخەکەی لە ٧٠ هەزار تێناپەڕێت، بەڵام جیهان کە باشترینیانە لە ٢٠٠ هەزار دەست پێدەکات و تاوەکو ٣٠٠ هەزار، پاسکیلی تایە پان نزیك ١٥٠ هەزار دینارە.

سەلام مەعروف، وتی : بازاڕی پاسکیل پەیوەندی بە پشووی هاوینەوە نییە هاوشێوەی یارییە تەکنەلۆژییەکان، بەڵکو هەموو کات بازاڕی گەرمە.

## * مێژووی دامەزراندنی گەڕەکی ڕەحیماوا :-

سەروەر سالەیی
بنەماڵەی خالدانییەکان لە دەرەوەی کەرکوکەوە هاتوون و لە ناوچەکانی کەرکوك گیرساونەتەوە و بە کاروباری جوتیاری و ئاژەڵدارییەوە سەرقاڵ بوون.. بە گەڕانەوەی بۆ مێژووی کۆنی بنەماڵەکە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە بنەماڵەکە لە سەردەمی میر سمایلی زەنگنە و لە سەرەتاکانی سەدەی یانزەیەمی کۆچی لە گوندی هەرێنە نیشتەجێبوون و دوای چەند ساڵێك ئەو ناوچایەیان جێهێشتووە و ڕوویان کردووەتە گوندی خالدان لە ناوچەی هەمەوەند و خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوونە.
محەمەد ئەمین خالدانی، چیرۆکی هاتنی بنەماڵەکە بۆ سنووری کەرکوك بەمجۆرە دەگێڕێتەوە: "لە ساڵی ۱۰۳۵ باپیرە گەورەی ئێمە، کە ناوی ساڵح قادر بووە و کەسایەتییەکی خێڵی زەنگنە بووە، لە گوندی هەرێنە ژیاوە و ویستوویەتی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی خێڵەکەی خۆی بکات و لە هەمان کاتدا کەسێکی تریش ویستوویەتی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ئافرەتە بکات، بەڵام پاش ئەنجامدانی تیر و پشك لەنێوانیان ئافرەتەکە دراوە بە ساڵح قادر".
بەپێی وتەی ناوبراو، ئەو ڕووداوە لەو سەردەمەدا بووە کە خێڵی زەنگنە بە ناوچەکانی هەمەوەند و جەباری و قەرەحەسەن بڵاوەیان کردووە و باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیەش ڕووی کردووەتە ناوچەی هەمەوەند و گوندی خالدانی ئاوەدان کردووەتەوە، کە لە سەرەتادا بنەماڵەکە بەناوی (جەماعەتی خالەکان) ناسراوبوون و دواتر ناوی گوندەکە نراوە (خالدان) کە دەکەوێتە سنووری قەزای چەمچەماڵەوە.
بە تێڕوانین لە زنجیرەی ڕەچەڵەکی بنەماڵەکە، دەردەکەوێ کە ساڵح قادر دوو کوڕی هەبووە بە ناوەکانی ئەحمەد و محەمەد کە بە هەمان شێوەی باوکیان لە گوندی خالدان نیشتەجێبوونە.
بەدرێژایی مێژوو، بنەماڵەکە لە سنووری کەرکوك و دەورووبەری چەندین لقی لێبووەتەوە، کە ئەوانیش بریتین لە خانەوادەکانی:
* خانەوادەی حاجی حەسەن باوکی کوێخا کەریم خالدانی.
* خانەوادەی ساڵح مەحموود ناسراو بە ساڵح هەیبەت.
* خانەوادەی عەبدول و کاکەوڵڵا.
* خانەوادەی حاجی میرزا.
* خانەوادەی شەریفە سوور.
* خانەوادەی حاجی تۆفیق و فەتاح ڕەشید.
* خانەوادەی کاکەوەیس.
* خانەوادەی یەعقووب.
* خانەوادەی ناسر و ئەمین و فەرهاد.
* خانەوادەی سۆفی ساڵح.
پاش فراوانبوونی بنەماڵەکە، بەشێك لە خانەوادەکانی ئەو بنەماڵەیە جیابوونەتەوە و بەرەو ناوچەکانی قەرەحەسەن و گوندی سیامەنسوور و شۆڕیجەی قەرەحەسەن و شۆڕاو و ناوەندی کەرکوك کۆچیان کردووە.
هەر یەکە لە خانەوادەکانی یەعقوب و سۆفی ساڵح گوندی شۆڕاویان ئاوەدان کردووەتەوە و هەریەکە لە ئەمین و ناسر سەمین ڕوویان کردووەتە ناوچەی سالەیی و لە گوندی بیبانی گەورە نیشتەجێ بوون و پاش نیشتەجێبوونیان لەو گوندە، ناسر سەمین هاتووەتە شۆڕاو و هاوکار بووە لە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکە و دواتر گەڕاوەتەوە بیبانی گەورە و تا مردنی لەوێ ماوەتەوە.

### * گەڕەکی ڕەحیماوا

لە ساڵی ۱۹٤٤ بەدواوە بەشێك لە خانەوادەکانی ناو بنەماڵەکە لە ناوچەکانی خۆیانەوە کۆچیان کردووە بۆ ناوچەکانی تری کەرکوك، لەوانەش کەریم و مەلا ڕەحیم و عەزیز کە کوڕی کاکەوەیس بوون لەگەڵ کۆمەڵێك خزم و کەسوکاری خۆیان لە گوندی شۆڕاوەوە ڕوویان کردووەتە ناوچەی سۆنەگۆلی و گوندی سۆنەگۆلییان ئاوەدانکردووەتەوە و لەو گوندەش بەهەمان شێوە سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون و تا ساڵی ۱۹٥٤ لەو گوندە ماونەتەوە، هەر لەو ساڵەدا بەهۆی زەوییەکانی ئەو گوندەوە، کێشە و ناکۆکی کەوتووەتە نێوان ئەو خانەوادانە و کوڕەکانی شێخ جەمیل تاڵەبانی و دەرئەنجام ئەو خانەوادانە گوندەکەیان جێهێشتووە و ڕوویان کردووەتە گەڕەکی ڕەحیماوا، کە ئەوکات تەنیا دوو ماڵی تێدابووە، یەکێکیان ماڵی ڕەحیم غەفوور ناسراو بە (کوێخا ڕەحیم) بووە، کە گەڕەکەکە بەناوی ئەوەوە ناونراوە، لەگەڵ ماڵێکی تر کە خاوەنی ئەو ماڵەش ناوی ڕەحیم بووە.
ڕەحیم غەفوور ناسراو بە کوێخا ڕەحیم، کە گەڕەکی ڕەحیماواش بەناوی ئەوەوە ناونراوە، مێژووی لەدایکبوونی

دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم ١٨٨٨ و لە (٢٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٧٦) کۆچی دوایی کردووە، هاوکات یەکەم کەسە کە لە ڕەحیماوای ئێستا نیشتەجێبووبێت و گەڕەکەکەی بەناوەوە نراوە، یەکێکە لە نەوەکانی محەمەد ساڵح.

### * کەسایەتییەکانی بنەماڵەکە

بنەماڵەکە چەندین کەسایەتی دیار و ناوداریان تێدا هەڵکەوتووە، کە لەڕووی عەشایەری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و سیاسییەوە ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە لەوانەش:

* حاجی کوێخا عەبدولکەریم حاجی حەسەن، کە لە سەدەی بیستەم ژیاوە، وەك باسدەکرێت کەسێکی ئازاو خانەدان بووە و دیوەخانێکی گەورەی هەبووە کە جێگایەك بووە بۆ حەوانەوەی کەسانی کەمدەرامەت، جگە لەوەش دیوەخانەکەی بەردەوام لە پێشوازی پیاوماقوڵانی ناوچەکە و خزمەتکردنی هێزی پێشمەرگە بووە، کە ماوەیەکی زۆر هێزەکانی پێشمەرگە لە دیوەخانەکەی ماونەتەوە، ناوبراو لە وەچەکانی محەمەدی کوڕی ساڵح قادرە.

* ساڵح مەحموود ناسراو بە ساڵح هەیبەت، کە لە گوندی خاڵدان ژیاوە و بەهەمان شێوە کوێخا عەبدولکەریم دیوەخانی هەبووە و لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاوە لە نەوەی محەمەدی کوڕی ساڵح قادرە.

* حاجی ڕەحیم حاجی میرزا، کەسایەتییەکی تری بنەماڵەکەیە کە خاوەن مەقامێکی باش بووە لەناو خزم و کەس و پیاوقوڵانی سەردەمەکەی خۆی و ئەویش دیوەخانی تایبەت بەخۆی هەبووە، کە ماوەیەکی زۆر شوێنێك بووە بۆ حەوانەوەی کەسانی هەژار و کەمدەرامەت.

* محەمەد دەروێش قادر یەکێکی ترە لە کەسایەتییەکانی بنەماڵەکە، کە لە گوندی خاڵدان ژیاوە و بە بوێری و چاونەترسی ناسراوە و یەکێکە لە نەوەکانی ئەحمەدی کوڕی ساڵح قادر.

* ناسر سەمین یەکێکە لەو کەسایەتییانەی بنەماڵەکە کە لە سنووری ساڵەیی نێشتەجێبوون و لە سەرەتای ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابردووەوە لە گوندی بیبانی گەورە جێنشین بووە و ئەویش بە بوێری و دیوەخانەوە ناسراوە و یەکێکە لە نەوەکانی محەمەد ساڵح.

* کوێخا حەمەخانی شۆراو، یەکێکی ترە لە نەوەکانی محەمەد ساڵح.

* مەلا ڕەحیم کاکەوەیس پاش ئەوەی چەند ساڵێك لە گوندی شۆراو ژیاوە ڕووی کردووەتەوە گوندی سۆنەگۆلی و ماوەی (١٠) ساڵ کوێخای ئەو گوندە بووە، ناوبراو کەسێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بووە و بەپێی وتەی ئەو کەسانەی کە ئاشنای بوون بەردەوام لەسەر ڕێبازی چاکەکردن بووە.

* ڕەحیم غەفور ناسراو بە کوێخا ڕەحیم، یەکەم کەسە کە لە ڕەحیماوای ئێستا نیشتەجێبووبێت، یەکێکە لە نەوەکانی محەمەد ساڵح و گەڕەکی ڕەحیماوا بەناو ئەوەوە ناونراوە.

* محەمەد سۆفی ساڵح لە گوندی شۆراو ژیاوە و دیوەخانی هەبووە و بەسەخاوەت ناسراوە.

* مەلا شافی، کە یەکێك بووە لە شاعیرەکانی کەرکوك بەوە ناسراوە کە شیعری هەجوی دژ بە تورکەکان نووسیوە هەر بەو هۆیەشەوە پەنجەیەکی بڕاوەتەوە.

* فەرهاد مەلا شافی بەهەمان شێوەی باوکی شاعیر بووە و کۆمەڵێك شیعری بەپێزی هەیە و لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا بێسەروشوێن کراوە.

* محەمەد ئەمین خاڵدانی تەمەن (٧٠) ساڵ یەکێکی ترە لە کەسایەتییەکانی بنەماڵەکە، کە ساڵانێکی زۆر پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە و بەدرێژایی ئەو ماوەیەش چەندین پلەی سەربازی و پۆستی حیزبی پێبەخشراوە لەناو پارتی دیموکراتی کوردستان و ئێستاش لە ژیاندا ماوە و لە مەکتەبی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کەرکوکی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەوام دەکات.

*** ناسینەوەی پیریادی - پیرحەیاتی:**

**د. زرار سدیق**

پیریادی، گەورەدێیەکی دێرینی کوردستانە و بە چەند کیلۆمەترێك لە رۆژهەلاتی شارۆچکەی چەمچەماڵەوە دوورە، ئێستاش بووەتە گەرەکێکی کۆمەڵگای زۆرەملێی شۆرش. دیارە ئەم گوندە بەناوی پیاوچاکێکەوە ناونراوە، ناوی لای خەڵکی ناوچەکە کراوە بە (یادی) و بە پیریادی ناوی ماوەتەوە، کە دەبێ ماوەیەك لەوێ ژیابێ و تا مردنی کردبێتی بە خەڵوەتگەی خۆی. گەرەکێکی ناوجەرگەی شاری کەرکوکیش لای رۆژهەلاتی قەلاوە، هەر ناوی پیریادییە و وا باوە پیریادییەکان لە گوندەکەی خۆیانەوە هاتوون و ئەم گەرەکەیان ئاوەدان کردووەتەوە.

بە ئاگاداری ئێمە، لەنێو جەماوەری بەربلاوی پیاوچاکان و تۆبەکارانی کورد و کورستاندا، واتە چ کوردان یا ئەوانەی کە هاتوونەتە کوردستان وبیروباوەری صۆفێتییان بلاوکردووەتەوە، کەسیان ناوی یادی نییە، تا خەڵکی ناسناوی رێزلێنانی (پیر)ی پێببەخشێ و بە پیریادی بانگی بکا، دواتریش لە یادی نەکردبێ و ناوی بەسەر شوێنەکەدا برِیبێ. پرسیار ئەوەیە دەبێ ئەم پیریادییە کێ بێ و چ کارە بووبووبێ؟

گەرۆکی عوسمانی "میتراقی زادە" لە گەشتنامەکەیدا - ساڵی ١٥٣٤ز- راستییەکی گرنگی ئاشکرا کردووە کە هاریکارمان دەبێ تا هەنگاوێك بچینە پێشەوە بەرەو ئاشنابوون و پەیبردن بە ناسنامەی پیریادی. ئەو لە رێی چوونیدا بۆ کەرکوك بەرەو شارەزوور، ناوی چەند شوێن و گوندێکی هێناوە، وەك کاروانسەرای سەرەرێ وابوون، لەوانەش شوێنێکی بە (ضریح حیاتي) یاداشت کردووە، کە وەك لە رێرەوی گەشتەکەیدا بە یاوەریی سوڵتانی عوسمانی دەرکەوتووە، هەمان "پیریادی"ی نزیك چەمچەماڵە، واتە ناوی دروست و دەستکاری نەکراوی شوێنەکە پیرحەیاتی بووە، وەلێ وەك دیاردەیەکی دیار و زانراو لە زمانی کوردیدا، بەرەبەرە سووك کراوەتەوە و دەنگی "ح"ی تێدا نەماوە، تا بووە بە پیریادی، وەك چۆن شێخ عەبدوڵلا بووە بە شێخوڵلا.

ئەوە زانیمان پیریادی راستییەکەی (پیرحەیاتی)یە، ئەی دەبێ ئەم (پیرحەیاتی)یە کێ بێ؟ ئایا دەبێ هەمان صۆفی حەیاتی کوری قەیسی حەرِرانی (م:٥٨١ك/١١٨٥ز) نەبێ کە صۆفییەکی نادیار نییە، بەڵکو ناسراوە و ژیاننامەی تا رادەیەك روونە و لەو کتێبانەی وا سەبارەت بە ژیاننامە و مەناقیبی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دانراون، باسی ژیان و سەربوردەی کراون؟[1] ئێمە تەواو دڵنیا نین کە هەر ئەو بووە، واتە صۆفی حەیاتی کوری قەیسی حەرِرانیی هەمان "پیرحەیاتی"یەکەی لەمەر کوردستان.

بەڵام تەواو دڵنیاین لەوەی کە هەمان ئەو "پیرحەیاتی"یەیە لە ئەندامانی رێبازی صۆفێتیی (شەنبەکی - هاواری - وەفائی) و یەکێك بووە لە قوتابیانی شێخ ئەبولوەفا - شەهریار، تەنانەت ناوی لە لیستی قوتابیان و پێرەوانی پیر مەزن و لە کتێبی (تزکرە المقتفین)، هەر بە (بر حیاه)، واتا پیرحەیات تۆمارکراوە[2]، بێ ئەوەی شتێك دەربارەی نووسرابێ، بەڵام دیارە ئەم و دەیان قوتابیی دی پاش مردنی ئەبولوەفا - پیرشەهریار کەوتوونەتە خۆ بۆ بلاوکردنەوەی بیروباوەری صۆفیانەی پیری ناوبراو و هەریەکە رووی کردووەتە شوێنێك، چ لە کوردستان و چ وڵاتانی دەورووبەری، بۆیە دەبێ پیرحەیاتی هاتبێتە ناوچەکانی دەورووبەری کەرکوك و سەرقاڵی بلاوکردنەوەی بیروباوەری صۆفیگەری بووبێ و خەڵکانێك باوەریان پێ کردبێ و بە پیرۆز رایان گرتبێ.

دواتر ئەو شوێنەی هەر لێی ماوەتەوە، بە پیریادی ناسراوە و تا ئێستاش هەر بەو ناوە دەناسرێ، کەچی مەخابن تا ئێستا کەس نەیزانیوە سەربوردەی پیریادی بەم شێوەیە بووە، وەك چۆن پیرئەلیاسی کودریش (الیاس الکردي)[3] هاتووەتە هەمان ناوچە و هێشتا گڵکۆکەی هەر ماوە بە "باوە ئەلیاس" ناسراوە.

* پەراوێز:-

(١) بروانە: التادفي، قلائد الجواهر، ص١١٥-١١٦.

(٢) تذکرة المقتفین، ص١٣٦.

(٣) تذکرة المقتفین، ص١٣٩.

*** بنەماڵەی خەلیفەی زەنگەنە: دیرۆکیان، یاداشتەکانیان، بەڵگە و وێنەکانیان.**

نووسینی : شەرەفەدین جەباری، کەرکوك

خەلیفەی زەنگەنە یەکێکە لە بنەماڵە کەرکووکییە ناسراوەکان و پەیوەندییەکی فراوانیان هەیە لەگەڵ پێکهاتەکان و قەدەری زۆربەی تاکەکانی وای هێناوە کە هەر لە مێژەوە، ببنە خاوەن پلەی وەزیفی و ئیداری و بڕوانامەی بەرچاو لە بوارە جیاجیاکاندا، کە نەوە بەنەوە، لانی کەم لە سەد ساڵی ڕابردوودا، پێی ناسراون.

***بنەچەی (خەلیفە) :**

بنەچەو ڕەگی ئەم بنەماڵە کەرکوکییە، دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنێکی دوورو قووڵ لە هەبوون لە سنووری پارێزگای کەرکوك و عەشیرەتی زەنگەنە کە ئەم بنەماڵەیەی بۆ دەگەڕێتەوە، بە بەردەوام، فاکتەرێکی گرنگ و سەرەکی بووە بۆ چەسپاندنی ئارامی و ئاشتی لە ناوچەکە.

دیارە عەشیرەتی زەنگەنە، یەکێکە لە عەشیرەتە گەورەو بە ناوبانگەکانی کورد و بە گشتی خەڵکێکی ڕۆشنبیر و بە سەلیقەن و مێژوویەکی دێرینیان هەیە و لە کتێبی "شەرەفنامە"ی میر شەرەفخانی بەدلیسیدا کە لە ساڵی ١٠٠٥ ی کۆچیدا (١٥٩٦ی زایینی) دا بڵاویکردووەتەوە و نووسخەی لە زۆربەی کتێبخانە جیهانییەکاندا هەیەو تەرجەمەکراوە بۆ چەندین زمانی زیندوو، مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانیش (١٩١٣ – ٢٠٠١)، لەلایەن خۆیەوە هەستاوە بە گۆڕینی نووسخەیەکی فارسی (شەرەفنامە) بۆ عەرەبی لە ڕێکەوتی ١١ی ئایاری ١٩٤٣ وە دەستی کردووە بەو تەرجەمەیە لە کاتێکدا لە عیمارەی خوارووی عێراق بەندکراوبووە لەسەر ڕۆشنایی نووسخە ئەسڵییەکانی "شەرفنامە"وەك خۆی لە پێشەکی چاپە عەرەبییەکەی دا باسی کردووە کە لەلایەن (چاپخانەی نەجاح)ی بەغدا ساڵی ١٩٥٤ لە بڵاوکراوەکانی (کۆمەڵگەی زانستی عێراقی)یەو، نووسخەی ئەو چاپکراوەش لە مەکتەبەی تایبەتی، حاکم موعتەسەم خەلیفە هەیە، کە یەکێکە لە کەسە ناسراوەکانی ئەو بنەماڵەیە وەك دواتر دێمە سەری و لەلایەن خودی مامۆستا ڕۆژبەیانییەوە، پێشکەشی کراوە، بەپێی ئەو نووسینە دیاری ئامێزەی کە لەسەر پەڕەی یەکەمی کتێبەکە هەیە.

دیارە مامۆستا جەمیل چەندین پەراوێزی بۆ کتێبەکەی (میر شەرەفخان) نووسیوە لە کاتی تەرجەمەکردنی و سەبارەت بە عەشیرەتی زەنگەنەش لە لاپەرە (١٦) نووسیوێتی: "زەنگەنە یەکێکە لە عەشرەتە کوردییەکان توانیویەتی لە سەردەمی دەوڵەتی سەفەوی، ئیمارەتێك پێکبهێنێت کە سەردەمانێك ژیاوە پاشان پەیوەندی تێکچووە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران، بۆیە ئیدارەکەی هەرەسی هێناوە و کۆچیان لێی کردووە و ئەمرۆ بەشێکیان ماون لە دەورووبەری کەرەند لە ئێران (واتە لە خۆرهەڵاتی کوردستان، نووسەر)، و بەشێکی تریش لە عێراق لە لیوای کەرکوك نیشتەجێن".

هەروەها لە کتێبی (مێژووی عەشیرەتی زەنگەنە)ی کە بە کوردی لەلایەن م.محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە (١٩٤٠ – ٢٠١٢) وە دانراوە و لە ساڵی ١٩٨٠ چاپکراوە لە"چاپخانەی ئەندەلوس"ی بەغدا، لەلایەن بەڕێز حاکم موعتەسەمەوە، چەندین بەڵگەنامەو دەستنووسی دەگمەن لە سەر مێژووی عەشیرەتی زەنگەنە و دیارترین کە سایەتییەکانی، داوە بە (م. محەمەد) وەك باسی کردووە لە کتێبەکەیدا. لەوانەش دەستنووسێك بە زمانی تورکی کە نووسراوە بە دەستنووسی مەلا عەبدولڕەحمان ڕۆژبەیانی لە ساڵی ١٣٠١ ی کۆچی.

دیارە بەهۆی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی (مەلا عەبدولڕەحمان) بۆ ڕاست نووسینەوەی مێژوویی، م. محەمەد، زۆر پشتی بەو دەستنووسە بەستووە وەك باسی کردووە لە کتێبەکەیداو لە لاپەرە (٥)ی داو بە پشت بەستن بەو دەستنووسە، سەبارەت بە عشیرەتی زەنگەنە هاتووە :"عەشیرەتێکە لە عەشیرەتە کوردییەکان، سەرۆکەکەیان نەوشیروان بەگە، ئەم سەرۆك عەشیرەتە لەگەڵ خزمەکانی لە ساڵی (٩٧٥ی) کۆچی، نیشتەجێبوونە لە گوندی گەڕاوی ناوچەی گلی سەر بە سەنجەقی شارەزوور".

ناوهێنانی سەنجەقی شارەزور لەلایەن مەلا عەبدولڕەحمان لە دەست نووسەکەیدا، ئەمە تەئکید کردن و ئاماژەیەکە، کە کەرکوك هەر لە مێژەوە سەر بە ویلایەتی شارەزوری نزیك سلێمانییە و هەر واشەو ئەم ڕاستییەش لە زۆر سەرچاوەکاندا هاتووە و کەرکوك پایتەختی ویلایەتی شارەزورە و گوندی (گەڕاوی) ش، گوندێکی سەر بە ناوچەی گلی ناحیەی قادر کەرەمی پارێزگای کەرکوکە، بەپێی دەلیلە مێژووییەکان، سەرەڕای ئەو گۆڕانکارییە ئیدارییانەی کە بەعسی ڕووخاو، لە چوارچێوەی سیاسەتی تەعریب ئەنجامی داوە لە پێناو کەم کردنەوەی ڕێژەی کورد و ڕۆڵی عەشیرەتەکانی لە ناوچەکەدا.

هەروەها لە کتێبەکەدا هاتووە:"ئەم پیاوە وەفاتی کردووە (واتە نەوشیروان، نووسەر)، لە ساڵی ١٠٠٠ ی کۆچی، لە گوندی گەڕاوی ناوچەی گل".

بەڕێز شکور خەلیفەش (حەمە شکور، ١٩٣٢– ٢٠١٠)، کە یەکێکی ترە لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەم بنەماڵەیە و گەشتووەتە پلەی وەزیفی باڵا لە دەوڵەتی عێراق وەك وەکیلی موتەسەریفی بەغدا (١٩٦٤– ١٩٦٨) و وەکیلی پارێزگاری حللە (کۆتایی هەشتاکان ١٩ ٨٧– ١٩ ٩٠)، و بەغدا و ماوەیەکیش وەك پارێزگاری بەغدا دەسەڵاتی هەبووە (١٩٩٠ – ١٩٩٥)، وەك لە یاداشتەکانی ئاماژەی بۆ کردووە و لە برگەکانی دواتری ئەم بابەتەدا خراوەتەڕوو، کە هەر لەو یاداشتانەشدا سەبارەت بە بنەماڵەکەیان، (حەمە شکور) نووسیویەتی:

بنەماڵەکەمان کەپێی دەوترێ خەلیفە، ژیاون بەر لە سەدان ساڵ لەگەڵ بنەماڵەی تاڵەبانییەکان لە گوندی (تاڵەبان) ی نزیك کەرکوك، هەردوو لایەن، نەوەی میر سمایل زەنگەنەن لە

کۆندا سالێك شێخ ئەحمەدی هیندی لاهوری لە هیندستانەوە دێتە کوردستان و ئەچێتە گوندی تاڵەبان لای شێخ ئەحمەد میوان ئەبێت کە باپیرە گەورەی تاڵەبانییەکانە، بەپێی تەریقەتی قادری، شێخ ئەحمەدی هیندی لاهوری، مەشێخەت ئەدات، بە (شێخ ئەحمەد) و خەلافەتیش ئەدات بە (شێخ مەحمود) کە باپیرەی ئێمەیە".

"لێرەدا شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵێ: (ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا، کە کاك حەمە شکور ئاماژەی بۆ کردووە، لە دیوانەکەی شێخ ڕەزای، چاپی دووەمی بەغدای ١٩٤٦ دا لە لاپەرەی (١٤) دا هەیە بە ناونیشانی"لە باسی باب و باپیری تا دەگاتە خۆی". نووسەر).

خوا وەختێ کە حەزکا بەندەیەکی خۆی بکا خۆش نود
لە ڕێگەی دوورەوە بۆی دێ بەپێی خۆی شاهدی مەقصود
لە هیندستانەوە شەش مانگە ڕێ تا خاکی کوردستان
خوا شێخ ئەحمەدی هیندی ڕەوان کرد بۆ مەلا مەحمود
مەلا مەحمودی زەنگەنە یەعنی قوتبی دائرەی ئیرشاد
لە دەوری مەرقەدی هەر دەنگی یاهوو دێت و یامەعبود
لە پاش ئەو ئەرشەدی ئەولادی شێخ ئەحمەد لە جێی دانیشت
یەعنی وەك سلێمان جێ نشینی حەزرەتی داوود".

هەروەك کاك حەمە شکور نووسیوێتی:

لە پاشان دێنە کەرکوك، گەرەکی بەرتەکێ (ئیمام قاسم)، لەوێ ئەلێت (واتە شێخ ئەحمەدی هیندی بە شێخ ئەحمەد تاڵەبانی و مەلا مەحمود زەنگەنە دەلێت، نووسەر)، تەکیە و خانووی خۆتان دروست بکەن، ئینجا ئەم تەکێیەی (تەکێیی تاڵەبانی، نووسەر)، کە ئێستا برای تێکۆشەر مام جەلال، پارەیەکی زۆری بۆ تەرخان کرد بۆ تازە کردنەوەی، دروست ئەکەن. ماڵی باپیرم لەگەڵ ماڵی باپیری تاڵەبانییەکان، هەتا ئەمرۆ ماوەو بەرامبەر بە یەکە، باوك و باپیرمان خوا لێیان خۆش بێت، هەر لەو تەکێیەو سەرقەبرانی نێژراون، بەم هۆیەوە یەك ماڵ بووین، کە شێخ حەسەن بوو بە موتەسەریفی سلێمانی (شێخ حەسەن تاڵەبانی کورە زای شاعیری گەورە شێخ ڕەزایە لە نێوان، ١٩٤٦ - ١٩٤٨، بۆتە موتەسەریفی لیوای سلێمانی، نووسەر)، زۆر جار ئێمە لەگەڵ باوك ودایکمدا، ئەچووین بۆ ماڵیان، ئەوانیش زۆرجار ئەهاتن بۆماڵمان، لەبەر ئەوەی ئەیانزانی کە ئێمە کەسی یەکین".

م. محەمەد عەبدولرەحمان زەنگەنە لە لاپەرە (٤٠)ی کتێبەکەی کە پێشتر ئاماژەی پێدرا دەنووسێ:

خەلیفە مەحمود کورەکەی، کە خەلیفە ئەحمەد بوو، ناردی بۆ تەکێیی تاڵەبانی، خەلیفە ئەحمەد، خزمەتی مامی خەلیفە محەمەدی کرد، خزمەتێکی زۆر چاك، کە شایستەی بێ، خەلیفە محەمەد ئەمری خودای کرد. خەلیفە ئەحمەد لە جێگای خەلیفە محەمەد، مامی جێگیربوو، لەبەر ئەوە خەلیفە ئەحمەد بوو بە خەلیفە، چونکە خەلیفە محەمەدی مامی، ووجاغ کوێربوو، بە درێژایی تەمەنی ژنی نەهێنا، تەمەنی(١١٥) ساڵ بوو، خەلیفە ئەحمەد، برایەکی هەبوو ناوی حسێن بوو، ڕۆیشت بۆ شەڕی قارس و بایەزید و نەگەڕایەوە، خەلیفە ئەحمەد کوڕێکی هەبوو لە ساڵی ١٣٠١ کۆچی، تەمەنی سێ ساڵان بوو، ناوی محەمەد بوو".

دیارە، م. محەمەد عەبدولرەحمان زەنگەنە، لە کتێبەکەیدا ئاماژەی نەداوە بۆ کورەکەی تری شێخ ئەحمەد خەلیفە کە ئەویش عەلی-یە (شێخ حەمە عەلی، ١٨٨٠ - ١٩٧٣)، ئەدیب و بەڕێوەبەری ئەوقافی سلێمانی، کە تەنها کوڕێکی هەبوو، ئەویش، شکورە، (حەمە شکور، ١٩٣٢- ٢٠١٠).

لەمەدا دەردەکەوێت، کە خەلیفە مەحمود زەنگەنە (درووستکەری تەکێیی تاڵەبانی کەرکوکە لەگەڵ شێخ ئەحمەد تاڵەبانی)، دوو کوڕی هەبووە بە ناوەکانی ئەحمەد و حوسێن، حسێنیان لە شەڕی قارسدا وون بووە، بەڵام ئەحمەد نەوەی خستووەتەوە و دوو کوڕی بەجێهێشتووە لە دوای خۆی کە ئەوانیش : عەلی(شێخ حەمە عەلی) و محەمەد (شێخ محەمەد، ١٨٨٢- ١٩٦٧، قایمقامی قەزای مەرکەزی کەرکوك)،

(شێخ حەمە عەلی)، تەنها کوڕێکی هەبووە (حەمە شکور)، بەڵام (شێخ محەمەد خەلیفە، (١٨٨٢- ١٩٦٧)، نەوەیەکی زۆری خستووەتەوە، چونکە دوو جار هاوسەرگیری کردووە، نەوەکانی لە خێزانی یەکەمی ئەم بەڕێزانەن : عەبدولقادر (١٩١٤- ٢٠٠٣)، مە ئموون (١٩١٠ -١٩١٨)، موعتەسەم (١٩٢٣-٢٠٠١)، عایشە (١٩٠٣- ١٩٦٨) و لە خێزانی دووەمی: فەرەیدون (١٩٣٩-)، سەردار (١٩٥٠ -)، نەوشیروان (١٩٥٧-١٩٨٦) پاکیزە (١٩٣٩-٢٠٠٧)، گەلاوێژ (١٩٤١ - ٢٠٠٨)، ڕەوشەن (١٩٤٦- ١٩٨٨)، وەك لە سەرجەلەی بنەماڵەکە هاتووە.

ماوەتەوە بڵێن کە نازناوی خەلیفەی تایبەت بەو بنەماڵەیە، لەوەوە هاتووە چونکە باپیرە گەورەیان، شێخ مەلا مەحمود، خەلیفەی شێخ ئەحمەدی هیندی لاهوری بووە، کە ئەویش واتە شێخ ئەحمەد هندی، یەکێك بووە لە موریدەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، حاکم موعتەسەمیش، لە یاداشتەکانیدا، باسی ژمارەیەك لە تەریقەتە سۆفیە بە ناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامی کردووە وەك: ڕیفاعی، قادری، بەدەوی، دەسووقی، نەقشبەندی، سەهروەردی، شازلی، سەنووسی، مەولەوی، ئیدریسی، بەکداشی.

*** شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد (١٨٨٢- ١٩٦٧) قایمقامی قەزای مەرکەزی کەرکوك:**

شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد (١٨٨٢ - ١٩٦٧) لە گەرەکی بەرتەکێی شاری کەرکوك لە دایکبووە و زانستە ئایینییەکانی لە سەرەتای خوێندنیدا، لە سەر دەستی گەورە زاناکانی ئەو سەردەمەی کەرکوك وەرگرتووە وەکو باوکی و شێخ عەبدولحەمید مودەریس لە مزگەوتی بولاق خوێندوە، ناوەندی روشدیە وسولتانیەی، هەر لەو شارە تەواوکردووە لە پاشان دا، لە ساڵی ١٩٠٠ دامەزراوە وەکو (کاتبی یەکەم) لە (فەرمانگەی ئیستملاکی کەرکوك) لە سەردەمی عوسمانیدا و بە هەموو توانایەکی، کاری کردوەو ئەوەش بووەتە مایەی ڕەزامەندی کاربەدەستان، هەر بۆیەش ناردوویانە بۆ تورکیا بۆ وەرگرتنی وانەکانی ماف لە ساڵی ١٩١٠ و بە سەرکووتویی تەواوی دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك.

بەشداری کردووە لە تاقیکردنەوەی بەڕێوەبەری ناحیەکان

که وەزارەتی ناوخۆ ئەنجامیدابوو بۆ فەرمانبەرە کارگێرییە بە تواناکان و لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەووتوو دەبێت هەر بۆیە دادەمەزرێت وەك (بەرێوەبەری ناوچەی قەلغانلوو) ی نزیك کەرکوك پێش داگیرکردنی بەریتانیا بۆ شارەکە لە ساڵی ١٩١٦ کە لە پاش ئەوەدا، ئیدارەی چەندین شوێنی کردووە.

لەگەڵ پێکهێنانی شانشینی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ دا، لە ناحیەی گوێر دەست بەکاربووە تاساڵی ١٩٢٤ ماوەتەوە، پاشان گواستراوەتەوە بۆ (موتەسەرفیەتی لیوای کەرکوك) وەك بەرێوەبەری فەرمانگەی یەکلاییکردنەوە (مافدارێتی زەوی و سیستمی پێدانی لیزمە) و لەو بوارەدا هەوڵەکانی، رۆڵی هەبووە بۆ پێدانی کەرەستە کشتووکاڵییەکان بە جوتیاران لە سەرجەم قەزاو ناحییەکانی لیوای کەرکوك و کارەکانی سەدایەکی باشیی بووە، هەر بۆیە وەزیری ناوخۆی ئەو سەردەمە، تالب ئەلنەقیب، ناردوویەتی بە شوێنیا بۆ سەردانی کردنی بەغداو سوود وەرگرتن لە بیرۆکەکانی لە بابەتی (یەکلاییکردنەوەی زەوی کشتوکاڵی).

پاش گەرانەوەی لە بەغدا، گواسترایەوە بۆ سلێمانی و ئەنجام دانی هەمان کار و بوویە (بەرێوەبەری گەنجینەی سلێمانی) لە ساڵی ١٩٣٠، پاش چوار ساڵ مانەوە لەو پۆستەی و لە ساڵی ١٩٣٤ دەگوازرێتەوە بۆ (موتەسەرفیەتی لیوای کەرکوك) و وەك (بەرێوەبەری ئیدارە) بۆ جاری دووەم دەست بەکاردەبێت و لە ساڵی ١٩٤٠ دەکرێتە (قایمقامی ناوەندی قەزای کەرکوك) هەتا ساڵی ١٩٤٤ لەو پۆستە دەمێنێتەوە و لەپاشی نزیکەی (٤٠) ساڵ خزمەتی وەزیفی، خانەنشین دەکرێت و خۆی تەرخان دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی خەڵکی شارەکە هەتا ئەو دەمەی لە ساڵی ١٩٦٧ کۆچی دوایی دەکات.

دیوەخانەکەی لە گەرەکی بەرتەکێی شاری کەرکوکە، پێگەی دیاری هەبووە بەو پێیەی یەکێك بووە لە سەرۆك عەشیرەتەکانی زەنگەنە، زۆربەی سەرۆك عەشیرەتەکان و نوێنەران و موتەسەریفەکانی کەرکوك، سەردانیان دەکرد بە بەردەوامی لەو دیوەخانەی، هۆیەك بووە بۆ چارەسەرکردنی چەندین کێشەو هەروەك هەژموونی هەبووە لەلای حکومەتی تورکیا بەهۆی بوونی مامی، (فەریق یوسف ئاغا) سەرکردەی یەکێك لە فەیلەقە عوسمانییەکان کە لە شاری(ئەرز رووم) کۆچی دوایی کردووە و هەتاکو ئێستاش نەوەکانی لە پەیوەندییەکی بەردەوامدان، بە بنەماڵەی خەلیفە.

دۆستایەتییەکی بەهێزی هەبوو لەگەڵ هەر یەك لە: شێخ رەزای واعز، موفتی کەرکوك و عەبدوڵلا ساڤ یەعقوبی، ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عوسمانی و سەید ئەحمەد خانەقا و نازم نەفتچی و مامۆستا رەفیق حلمی وشێخ حەبیب تاڵەبانی سەرۆکی عەشیرەتی تاڵەبانی و شێخ حەسەن تاڵەبانی موتەسەریفی لیوای سلێمانی و سەعید قەزاز وەزیری ناوخۆ.

شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد، لە یەکێك لە نووسراوەکانیدا کە مێژووی ساڵی ١٩٢٢ بە سەرەوەیە دەڵێت :

زۆرینەی دانیشتووانی کەرکوك رقیان لە ئینگلیزە، چونکە دانیشتووانەکەی زۆرینەی موسڵمانن و هەژموونی حوکمی عوسمانیان بەسەرەوەیە هەر بۆیە دانیشتووانی کەرکوك هەستاون بە چەند جوڵانەوەیەك و نارەزایەتیی دژی ئینگلیز".

بۆ نموونە ساڵی ١٩٢٢ دەسەڵاتدارانی ئینگلیز هەستاون بەدەستگیرکردنی هەر یەك لە سەید ئەحمەد خانەقا کە یەکێك بووە لە رووە کارییگەرییەکان لە لیوای کەرکوك و نازم نەفتچی بەهۆی پاڵپشتی نەکردنیان لە سیاسەتی ئینگلیز و ماندانی خەڵك دژیان".

*** رووداوی لیڤی و رۆڵی شێخ محەمەد خەلیفە**

پاش (رووداوی لیڤیی ساڵی ١٩٢٤) ی جووت قاوەی (بازاری گەورەی کەرکوك)، مەندوبی سامی بەریتانی، کە حاکمی کردەیی وڵات بووە، موتەسەریفی کەرکوك سلێمان فەتاحی، لە سەر کار لابردووەو لە شوێنەکەی، سەرۆکی شارەوانی عەبدولمەجید یەعقوبی داناوە.

حاکمی بەریتانی کەرکوك، زانیاری پێشوەختی هەبووە لە سەر هەژموونی شێخ محەمەد لە سەر دانیشتووانی کەرکوك و پاش رووداوەکە هەر یەك لە: کۆڵۆنێل کۆرنا والیس و مەیجەر لونکریت و کابتن نۆئیل حاکمی کەرکوك، سەردانی ماڵی خەلیفەیان کردوو داوایان لی کردووە خۆی و ئەشرافەکانی کەرکوك، بەشداری بکەن بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخە شێوێنراوەکە پاش رووداوەکە.

شێخ محەمەد خەلیفە بە میوانەکانی وت: ئێوە تەعداتان کردووەتە سەر خەڵکی بێ گوناه و ماڵ و موڵك و شوێنی کاریانتان وێران کردووە، بۆ ئارام کردنەوەی بارودۆخەکە و هاووڵاتیان، دەبێت یەکەم : قەربووی هاووڵاتیان بکرێت لەو زەرەرو زیانەی لێیان کەوتووە، دووەم: سزادانی سوپای لیڤی.

لە ئەنجامی ئەو هەوڵەی شێخ محەمەد و پیاوانی تری ئەو سەردەمەی کەرکوك، ئینگلیزەکان هەستان بە تەرخانکردنی (٢٠٠) هەزار روپێ بۆ دابەشکردنی بە سەر زیان لێکەوتواندا و تاوانبارانیش سزا دران، لەوەدا بۆ بەرپرسە ئینگلیزەکان دەرکەوت، مەودای هەژموونی شێخ محەمەد لە سەر هاووڵاتیان، هەر بۆیە لە خۆیانیان نزیك کردەوەو لە زۆر بابەتی گرنگدا، راوێژیان پێدەکرد، بە تایبەت کۆڵۆنێل، کۆرنا والیس، بە بەردەوام سەردانی دەکرد لە دیوەخانەکەی ماڵەوەی، چونکە ئەو ئەفسەرە سەرسام ببوو، بە هێز و هەژموونی کەسایەتی و زانست و رۆشنبیری شێخ محەمەد.

*** شێخ عەلی (شێخ حەمە عەلی) ئەحمەد(١٨٨٠-١٩٧٣)، بەرێوەبەری ئەوقافی سلێمانی،**

(شێخ حەمە عەلی) ساڵی ١٨٨٠ لە گەرەکی بەرتەکێی کەرکوك لە بنەماڵەیەکی ئایینی کە لەو کاتەدا مەنزڵگەی هەموو چین و توێژەکان بووە دێتە دنیاوە، شێخ حەمەعەلی بۆ خۆی مەرجەعێك بووە لە مەرجەعەکانی ئیسلام و لەسەر ئەو بنەمایە، ماوەیەکی زۆر بەرێوەبەری ئەوقافی سلێمانی بووە و مەلا عەبدولمەجیدی قوتب موفتی کەرکوك وەسفی

کردووە بە"قوتبی زەمان".
هەر لە منداڵییەوە بەزیرەکی دەرکەوتووە، بۆیە نێردراوە بۆ وەرگرتنی فێربوونی سەرەتایی و چوونە قوتابخانەی ڕوشدیە وپاشان سەفەری کردووە بۆ ئەستەنبوڵ بۆ بەردەوامبوون لە فێربوون و خوێندنی زیاترو باڵا کە لە ئەنجامیدا (کۆلێجی یاسا) تەواو دەکات و دەگەڕێتەوە کەرکوک، کە ئەوکات لەگەڵ هەردوو شاری سلێمانی و هەولێر، سەر بە ویلایەتی موسڵ بوونە و کەرکوک پایتەختی ئەو ویلایەتە بووە هەر وەك چۆن لە پێش پێکهێنانی ویلایەتی موسڵ، کەرکوک پایتەختی سەربلندی ویلایەتی شارەزور بووە، لە ساڵی ١٩٢٥ شێخ حەمە عەلی دادەمەزرێ لە (موتەسەرفیەتی لیوای کەرکوك) و پاشیان بە چەند ساڵێك بەهۆی تواناکانیەوە دەبێتە (بەڕێوەبەری گەنجینەکانی کەرکوك) وماوەیەکی زۆر لەوێ دەمێنێتەوە پاشان دەگوازرێتەوە بۆ سلێمانی و دەبێتە بەڕێوەبەری ئەوقافی ئەو شارە تاکو ساڵەکانی پەنجاکان و پاشان دەگوازرێتەوە بۆ هەولێر و پاشان بۆ موتەسەریفیەتی لیوای بەغدای پایتەخت و ساڵانێك دەمێنێتەوە هەتاکو خانەنشینی و دواتر هەر لەوە شارە لە ساڵی ١٩٧٣ کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی دەهێنرێتەوە بۆ بەرتەکێ و لەوێ دەنێژرێت.

شێخ حەمە عەلی، پەیوەندییەکی بەرفراوونی هەبوو لەگەڵ چین و توێژەکانی کوردستان وعێراق و بە دیداری شێخ مەحمودی حەفید شاد بووە، تاقە کوڕەکەشی (حەمە شکور ١٩٣٢- ٢٠١٠)، بە هەمان ڕێچکەی شێخی باوکی، داناو هەڵکەوتوبووە لە بوارە جیاجیاکاندا و گەشتووەتە پلەی ئیداری باڵا لە دەوڵەتی عێراقدا و هەر لە کۆتایی پەنجاکانەوە هەتاکو ساڵانی دەورووبەی دوو هەزارەکاندا و لە یاداشتەکانیدا کە پێش مردنی بەچەند ساڵێك نووسیوێتی، ئاماژەی بە بەشێك لە مێژووی ژیانی خۆی کردووە.

شێخ جگە لەشارەزاییە وەزیفی و ئاینی وکۆمەڵایەتییەکەی، شارەزاو سەلیقەیەکی باشیشی هەبووە لە بواری ئەدەب و نووسیندا و پاش خۆی چەندین دەستنووس و نووسینی جیاجیای بە جێهێشتووە چ بە کوردی یان عەرەبی، لە نێو ئەوانەشدا، ئەو پەراوێزو نووسینانەن کە بە دەست و خەتی خۆی نووسیوێتی لە سەر دیوانەکەی شاعیری گەورە، شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٥ - ١٩٠٩)، کە بۆ دووەم جار لە ساڵی ١٩٤٦ لە بەغدا چاپ کراوە.

دیارە هەر دوو شێخ (بنەماڵەی خلیفەی زەنگەنە و تاڵەبانییەکان) وەك لە پێشەکی بابەتدا ئاماژەی پێدرا، کەسی یەك و دراوسێ بوونە بە تەنیشت تەکێی تاڵەبانی و شێخەکانی لە گەڕەکی بەرتەکێی کەرکوك، هەر چەندە جیاوازی تەمەن بە ساڵانێکی زۆر هەبووە لە نێوان هەردووکیاندا، بەڵام وەك لە شیعر و بەسەرهاتەکاندا دەردەکەوێت، بەینیان خۆشبووەو ڕێزیان لە یەکتر گرتووە.

لەونووسینانەدا شێخ حەمە عەلی، هەندێ لەو بەسەرهاتوو نوکتانەی تۆمارکردووە کە لە ژیانی شێخ ڕەزادا ڕوویان داوە، کەوا دیارە شێخ حەمە عەلی ئاگاداری بووە یاخود بینیویەتی هەروەها لە دەست نووسێکی جیادا کە کەڵکی بڵاوکردنەوەی نییە ولە چەندین پەڕەی کۆنی زەرد هەڵگەڕاو پێکدێت و مێژووی نووسینی بە سەرەوە نیە، بەڵام وادیارە وباوەڕیشم وایە هەر لە ساڵانی کۆتایی پەنجاکان بۆ دوا ڕۆژەکانی ژیانی خۆی نووسیبێتی، زۆر بە توندی هەجوی شێخ ڕەزای کردووە و ڕەخنەی لە هەردوو ستایلی کەسی و شیعری شێخ ڕەزا گرتووە.

هەروەها شێخ حەمەعەلی، لەکۆتایی هەر نووسینێکدا لە سەر پەڕەکانی دیوانەکەدا، ناوی خۆی و ئەدرەسی و شوێنی ئەو نووسینانەی بەیان کردووە و واژۆشی لە سەری کردووە.

ئەوەی جێی داخە، ئەو دیوانە دەگمەنەی شێخ ڕەزا، کە شێخ حەمەعەلی ئەو هەموو نووسین و پەراوێزانەی لەسەری نووسیوە تادوا ساتەکانی ژیانی، وادیارە پاش کۆچی دوایی، لەلایان کەس و کاری یەوە بە مەبەستی پاراستنی لە بەرگی دەگرن، بەڵام لە کاتی ئەو بەرگرتنەدا بەداخەوە قەبارەی دیوانەکە بچووك دەکرێتەوە و دەبێتە مایەی نەمانی زۆرێك لەو نووسینانە هەروەها زۆرێك لە نووسینەکان، بەهۆی ڕۆژگارەوە، حیبرەکەی تێکەڵ دەبێت و بەباشی ناخوێندرێتەوە.

**هەندێك لە نووسینەکانی شێخ حەمە عەلی لە سەر پەڕەی دیوانەکەی شێخ ڕەزا :**

(١)

**دەروێش میکائیل**

لە کەرکوك و لە گەڕەکی بەرتەکێ و لە تەنیشتی ماڵی ئێمەوە، پیاوێکی بە تەمەن ئەبێ ناوی دەروێش میکائیل ئەبێ و ژن و منالی نابێ و بە تەنها لە ژوورێك وەقتی خۆی بە سەر ئەبرد، ڕۆژێك شێخ ڕەزا ئەچێتە لای و پێی دەڵێ: دەروێش میکائیل پێنج لیرەم بدەرێ بە قەرز هەتاکوو مەعاش وەرئەگرم و ئەیدەمەوە ؟، ئەڵێ بۆ چیتە ؟ ئەڵێ پێم لازمە؟، ئەڵێ بەیانی وەرەوە هەتاکوو بۆت جێبەجێەکەم ! بۆ بەیانی دووبارە شێخ ڕەزا ئەچێتەوە لای و ئەڵێ: شێخ ڕەزا پێم بڵێ بۆ چیتە ؟ شێخ ڕەزاش وا ئەزانێ پێی خۆشە چونکە بۆ کارێکی خێرە و پێی ئەڵێی: دەروێش میکائیل ژن ئەهێنم، ئەڵێ تۆ ژن ئەهێنیتە سەر دایکی محەمەد و عەبدوڵلا، بە خوای پارەت نادەمێ، هەر چەندێ محاوەلە ئەکات بێ فائیدە ئەبێ ونایداتێ، ئینجا شێخ ڕەزاش ئەم هەجویەی ئەکات :

جاشك ترین میکائیل عەهدی بەجێ نەهێنا
عومری گەیشتە هەشتا وازی لە کەر نەهێنا
ئامیازی بو تراندی وتی ئەم جارە بەهارە
تەئریخی دەر نەهێنا تەئریخی دەر هێنا

ئیمزا محەمەد عەلی ئال خەلیفە بەغداد، مدینه الحریه الكاظمية في الدار المرقمة ٦٦/ ٢٣٤ ، ٢٠/ ٦/ ١٩٦١".

(٢)

**ئەفسەرە عەرەبەکە !**

ئەفسەرێکی عەرەبی بەغدا شاعیر ئەبێ و هەمیشە لە عەیبی شێخ ڕەزا ئەدوێت و ئەڵێ شێخ ڕەزا پیاوێکی درێژو بێ عەقلە، ئێوارانێك لە مەجلیس ئەبن ئەو کاتەی شێخ ڕەزا لە بەغدا دەبێت، دەست ئەکەنە شەڕە شیعر، شێخ ڕەزا پێی

ئەڵێ:

الم تعلم افولا کالفول * اذا کلمت ام بولا تبول
فوالله الذي خلق المرايا * قديم لايزال لايزول
لان تنطق بأني من طوال * طوال الناس ليس لهم عقول
لاركب فوق ظهرك ياخليل * لادخل........................

شێخ ڕەزا ئەم شیعرانە لە حەقی ئەم ئەفسەرە خوێندەوەو بەهەر حاڵ هەڵئەسێ و ئەڕوات. ئیمزا محەمەد عەلی خەلیفە لە بەغدا و لەخانووی ژمارە (٧٥) لە کەرادە مریەم نزیکەی قاعەی خولد، ١٩ی شوبات ١٩٦٧ و ١٠ زی القعدە ١٣٨٦".

(٣)

**مەلا کەتەکە و منالەکەی !**

شێخ ڕەزای شاعیر ئێوارەیەك لە مەجلیسی خادم سوجادە ئەبێت و بۆ نوێژی عسر هەڵئەسێ وئەڕوا ونوێژی کرد و کە هاتەوە تەماشا ئەکات مەلایەکی کەتەو مێزەرێکی گەورەی بەسەرەوەیە و لە جێگاکەی شێخ ڕەزا دانیشتوە و منالێکی دە دوانزە ساڵان لە تەنیشتی ئەو مەلایە دانیشتووەو شێخ ڕەزاش ئەچێتە بەینی هەردووکیان دائەنیشێ، مەلاکە ئەڵێ بۆچی لەولاوە دانەنیشتی، شێخ ڕەزا پێیی ئەڵێ ئەی تۆ بۆ جێگەی منت گرت و منالەکەتیش لە تەنیشت خۆت داناوە ئەڵێ من شاعیرم، شێخ ڕەزاش ئەڵێ منیش ماعرم (لە وەڵامدا کابرای مەلا بەرستەیەکی شیعری فارسی قسە بە شێخ ڕەزا ئەڵێت و شێخیش بە فارسی هەجویەکی توندی دەکات، نووسەر)، مەلا کە ئەم شیعرەی شێخ ڕەزای بیست، دەر حاڵ هەڵسا لەگەڵ کورەکەی ڕۆیشتن.

١٩ی شوبات ١٩٦٧ و ١٠ی زی القعدە ١٣٨٦، ئیمزا محەمەد عەلی خەلیفە بەغدا لە خانووی ژمارە (٧٥) لە کەرادە مریەم نزیکی قاعەی خولد".

(٤)

**سەعید ئاغا !**

لەلاپەرە (٦٦)ی دیوانەکەدا و لەخوارەوەی شیعرەکەی شێخ ڕەزادا، بەدەست وخەتی شێخ حەمە عەلی، ئەم پارچە شیعرە نووسراوە کە پێدەچێت هی شێخ ڕەزابێت و لای شێخ حەمە عەلی پارێزراوبێت کە مێژوو شوێنی نووسینەکەی لەخوارەوە نووسراوە بەم شێوەیە:

"بووم بە میوانی سەعید ئاغای یوبلە
هەر بنی نوخانێکی صەد فێڵە
لە سەروو صورەتی عەجەب ماووم
ئەم قورمساغە گۆڵە یا دێڵە.
اربیل، ٢/ ١٠/ ١٩٥٧".

هەروەها لە هەمان لاپەرەدا ئەم شیعرە نووسراوە:

"حەرام زادە و دایك خۆ..... لە بەر ...... زۆرە
..... و........ و قشە گاڵتە و ..... دەم بۆرە
٣ كانون الاول ١٩٧١ و ١٤ شوال ١٣٩١".

(٥)

**بیست قسناغ چەڵتوك !**

لە لاپەرە (٢٥٨)ی هەمان دیواندا، شێخ حەمە عەلی، ئەم بەسەر هاتەو شیعرەی شێخ ڕەزای نووسیوە:

خوالێخۆشبوو شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی عادەتی وائەبێ هەموو ساڵێك ئەمر ئەكات بەوەكیلی لە لەیلان، (لەیلان، قەرە حەسەن، ناحیەیەکی دێرینی سەر بە کەرکوکە، نووسەر)، کە چەڵتوك دابەش بكات، دەروێش قادر کە مەشهوورە بە قالە جوت یار، بیست قسناغ چەڵتوك بۆ شێخ ڕەزا ئەنێرێ و واجوابی ئەداتەوە:

لە بیست قسناغ چەڵتوك سیانی کەم کرد یەکێکی هەر کە پێوامان ئەوەڵ جار
یەکێکی خۆڵ و یەکێکی دار و جان لێیان ساندم چوار چەرخیش کرێ بار
چەڵتوکی کەرە و نابێ وە برنجیش ناخورێ بێ ڕەنجوو ئازار
لە پاش خواردن و حەل بوون ئەترشێ سی...... بەڕیشی قالە جوت یار"

(٦)

*** ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی ناونیشانی شیعرێکی دیوانەکەی شێخ ڕەزا :**

هەروەها لە لاپەرە (١٧١)ی دیوانەکەدا، شێخ حەمە عەلی هەڵەیەکی ناونیشانی شیعرێکی شێخ ڕەزا کە بەناونیشانی:"جەنگی تاڵەبانی و زەنگەنە"یە، ڕاست دەکاتەوەو دەنووسێ :

عەشیرەتی زەنگەنە، بە عەشیرەتی تاڵەبانی ئەژمێرێن چونکە تاڵەبانی لە ئەسڵی عەشیرەتی زەنگەنەوە هاتوون و هەرگیز لەگەڵ تاڵەبانییەکان نەجەنگاون و لەم جەنگەدا بەیەکەوە لەگەڵ تاڵەبانییەکاندا، شەڕی داوودەو هەمە.....(ئەو دوای وشەکە دیار نییە لە کەتێبەکەیدا، نووسەر)، وئەگەر شیعرەکان زۆر چاك بخوێننەوە، دەر ئەکەوێت کە سواری زەنگەنەکان چۆن شەڕێکیان کردووە بە تواناییەوە لە جانبی تاڵەبانییەکان، واژۆ، محەمەد عەلی خەلیفە، بەغداد، (مەدینە الحریە ١٩ / ٦ /١٩٦١)".

(٧)

**برازا ئەزیزەکەم !**

لە لاپەرە (٥٤)ی دیوانەکەی شێخ ڕەزادا (چاپی دووەم ١٩٤٦) پارچە شیعرێکی شێخ ڕەزا بەناوی"برازا ئەزیزەکەم"هەیە، شێخ حەمە عەلی خەلیفە لە خوارەوەی نووسیوێتی"شێخ حەمە عەلی کەرەیە"واتە شێخ ڕەزا لەوشیعرە مەخسدی شێخ محەمەد عەلی کەرەی برازای خۆیەتی شیعرەکەش بەم جۆرەیە :

"رووم کردە بەزمی خاص برازا ئەزیزەکەم
ئەمشەو بەصەد (نازو)* تەوازع و ئخلاص و سەرکزی
روانیم لە دەرزی قاپیەوە خۆی و تابیعان
دانیشتبون دوو ریزە لە دەوری خلەی کەزی
دەت وت تەمێ کرابوو بەمەخصوصی قاپیەوان
خۆی کرد بەنێرە تورك و وتی (کیم بیلیر سزی)؟
پێم وت منم فلانە کەسم مامە شێخ ڕەزام

تانمز میسن (خومەییس ئەفەندی) مەگەر بزی ؟
ئەم سەددی بابە بۆ منە ئیزهاری کە تابڕۆم
یان مەر حەمەت کە:....... لەسەرما....... تەزی
ئەمجا بە کوردی هاتە، تەکەللوم، وتی بەڵێ
لەو شێخە حیلە بازەکان و قومار بازو کەر دزی
وەختێ کە لەم موعامەلەیە زانیم غەرەز چیە
دەر حاڵ گەڕامە پاشەوە ئەمما بە عاجزی"
*(نازو) ئەم وشەیە بەدەست و خەتی شێخ حەمە عەلی خە لیفە نووسراوە و ئیزافە کراوەتە سەر شیعرەکە.

* **حاکم موعتەسەم شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد خەلیفە** (١٩٢٣-٢٠٠١).

لە نزیك تەکیێ تاڵەبانی لە ماڵەکەی خۆیان، لە گەڕەکی بەرتەکیێ شاری کەرکوك لە ٢ / ٢ / ١٩٢٣ لە بنەماڵەیەکی ناسراو هاتووەتە دنیاوە و خوێندنی سەرەتایی لەو شارە تەواکردووە، بەڵام قۆناغی خوێندنی ناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە بەهۆی ئەوەی باوکی، پۆستی (بەڕێوەبەی گەنجینەی سلێمانی) پێدراوە ولە پاشان خوێندنی ئامادەیی لە کەرکوك تەواوکردووە لە ساڵی ١٩٤١، کە ئەنجامی ئەو خوێندنەی نایاب بووە و لە توانایدا بووە بۆ چوونە کۆلێجی پزیشکی، بەڵام خۆشەویستی بۆ خوێندن لە (کۆلێجی مافەکان)، پاڵنەری بووە بۆ چوونە ئەو کۆلێجەوە کە لە ساڵی ١٩٤٤ بە سەرکەوتوویی تەواوی کردووە و بە دەستهێنانی (لیسانسی مافەکان) بە پلەی نایاب و هەر لە ساتی دەرچوونییەوە، کاری پارێزەری کردووە و تێیدا سەرکەوتووبووە، هەر بۆیە، گەورە خاوەن موڵکەکانی کەرکوك وەکو: دارا بەگ داودە، فەتاح ئاغا کاکەیی، هەردوو بنەماڵەی نەفتچی و ئاوچی، ڕایان دەسپارد بۆ بریکاریکردنیان لە چارەسەرکردنی کێشەی زەوی زارو موڵکەکانیان.
بەردەوام بووە لە کارەکەی هەتاوەکو لە ساڵی ١٩٤٨ دا، خوالێخۆشبوو سەعید قەزار موتەسەریفی ئەو دەمی کەرکوك، سەردانی ماڵیانی کردووەو هانیدا کە ببێتە دادوەر، ئەوەش وای لە بەڕێز موعتەسەم کرد کە مامەڵەی دامەزراندن پێشکەش بە (سەرۆکایەتی دیوانی مەلەکی) بکات وپاش تەوابوونی ئیجراتاتی بەدواداچوونی لەلایەن (دیوانی مەلەکی)، جێنشینی ئەوکاتی عێراق، میر عەبدولئیلا، (بریاری مەلەکی) بەم دەقەی خوارەوە دەرکرد:
لە سەر بنەمای پێویستییەکانی بەرژەوندی گشتی و لە سەر بنەمای ئەوەی کە فەخامەتی وەزیری داد، خستییە ڕوو، فەرمانماندا بە ئەمەی خوارەوە: دامەزراندنی بەڕێز موعتەسەم کوڕی بەڕێز محەمەد ئەحمەد خەلیفە، بە پۆستی دادوەر لە سەرۆکایەتی دادگای کەرکوك و فەرمانمان دەرکرد بەم بابەتە بۆ حەزرەتی مەقامی پایە بەرز، موزاحم ئەلباچەچی، سەرۆك وەزیران بۆ کارکردن پێی، نووسرا لە بەغدا ساڵی ١٩٤٨، پادشای عێراق بە بریکاری عەبدولئیلا".
سەبارەت بە ڕۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی بە ڕێز حاکم موعتەسەم کاك هەڵگوردی کوڕی دەڵێت:
زۆربەی دانیشتووانی کەرکوك، حاکم موعتەسەم، جێی مەبەستیان بووە لە کاتی هەر کێشەو تەنگەژەیەکدا و دیوەخانەکەی لە ماڵ، دیوەخانی ئەدەب و سیاسەت بووەو کەسایەتیەکان و پیاو ماقوڵانی شار، تێیدا کۆدەبوونەوە.
ئەو سەر بە هیچ حزبێکی سیاسی نەبووە بەڵام هاوڕێکانی بەشدارییان کردووە لە خەباتی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، نموونەی خوالێخۆشبوان: مامۆستا برایم ئەحمەد و جەرجیس فەتحوڵلا محامی و هەر وەك لەگەڵ خوالێخۆشبوو پارێزەر کاك عومەر دەبابە، پەیوەندییەکی دۆستانەی بە هێزی هەبووە، هەروەك بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی هەبووە لە گەڵ، سەرکردەو کەسایەتییەکانی تری بزوتنەوەی کورد، هەر لەبەر ئەو هۆیەو هۆی دیکەش، بێ بەشکراوە لەوەرگرتنی پۆستی باڵا لە دەوڵەتی عێراق.
لە ساڵی ١٩٥٩ نازم تەبەقچەلی سەرکردەی فیرقەی دوو، هەوڵیدا بۆ گواستنەوەی بۆ دەرەوەی کەرکوك و هەوڵەکەی چووە سەروو، گواسترایەوە بۆ قەزای چەمچەماڵ و لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، سەرکردەکانی شۆڕش، سەردانیان کردووە بە مەبەستی هەڵوەشانەوەی مۆڵەتەکانی هەڵگرتنی چەك، کە لای هاووڵاتیان بووە لەو ناوچەیە، بە مەبەستی پێشکەشکردنی بۆ شۆڕش، هەروەك هۆکارێك بووە بە هاوکاری برا گەورەکەی، (عەبدولقادر) بۆ لابردنی (زعیم سدیق) لە پۆستەکەی و دوورخستنەوەی و پاشان خانەنشینکردنی بە هۆکاری خۆ هەڵقورتاندنی لە کاروباری قەزایی و توندبوونی ناکۆکییەکانی نێوانیان، پاش ئەوەی حاکم موعتەسەم ڕەتی کردووەتەوە بە دەرکردنی بڕیارەکانی بەندکردن بەبێ تۆمەت، دژی خەڵکانێك هیچ گوناهێکیان نەکردبوو.
پاش ساڵی ١٩٦٣، حاکم موعتەسەم دامەزرا وەکو (سەرۆکی دەستەی لێکۆڵینەوە) ی تایبەت لە (ئەنجومەنی عورفی عەسکەری) لە بەغدا و لەو شوێنە توانیویەتی، چەندین هاووڵاتی بێتاوان لە پەتی سێدارە ڕزگار بکات ولە ساڵی ١٩٦٤ بەهۆی لێهاتوویی، سەرۆك کۆماری ئەو دەمە، عەبدولسەلام محەمەد عارف، مەرسومێکی دەرکردووە بە دامەزراندنی وەکو"سەرۆکی سەرپەرشتی دادوەری"بەڵام ئەو ڕەتیکردووەتەوە ئەو پۆستە وەرگرێت و لە ساڵی ١٩٦٧، گواستراوەتەوە بۆ (سەرۆکایەتی دادگای هەولێر) ماوەتەوە لەوێ تا ساڵی ١٩٦٩ و پاشان گواستراوەتەوە بۆ کەرکوك بۆ سەرۆکایەتیکردنی (دادگای تاوانەکانی کەرکوك).
لە پێش هەرەسی دانوستانەکانی ساڵی ١٩٧٤ لە نێوان بزوتنەوەی کوردو حکومەتی عێراق، لەلایەن حکومەتەوە، ئەوکات پێشنیاری پۆستی وەزیری بۆ کراوە بەڵام ئەو ڕەتی کردووەتەوە.
لە ساڵی ١٩٧٥ دووبارە گواستراوەتەوە بە فەرمانی لایەنە باڵاکانی ڕژێمی بەعس بۆ هەولێر کە ئەوەش ناچاریکردووە بۆ پێشکەشکردنی دەست لەکار کێشانەوەی بۆ وەزارەت، هەتاوەکو، ئەحمەد حەسەن بەکر، بروسکەیەکی کورتی بۆ ناردووە تێیدا هاتووە"ڕازی نابم لە سەر دەست لە

کارکێشانەوەکەت، دەوڵەت پێویستی پێتە"، لە پاش ئەوە ئینتیداب کراوە لە سەرۆکایەتی دادگای هەولێر بۆ سەرۆکایەتی دادگای کەرکوك، کە تێیدا ماوەتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٦ و لەو ساڵەدا داوایەکی پێشکەشکردووە بۆ خانەنشینکردنی و ڕەزامەندی لە سەری دراوەو خۆی تەرخانکردووە بۆ تەواوکردنی، کاروانە یاساییەکەی و نووسینی تۆژینەوە بۆ گۆڤاری داد.

لە پاش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی کوردستان، هێزەکانی گاردی کۆماری ماڵەکەی پشکنی، وەکو هەموو ماڵەکانی تری گەڕەکە کوردییەکانی کەرکوك و حاکم موعتەسەم پێشهاتنە ناوەوەی سوپای ڕژێم بۆ کەرکوك، ماڵەکەی بەجێهێشتبوو لەگەڵ خێزانەکەیدا و لە ئەنجامی ئەوەدا، ماڵەکەیان بەر شاڵاوی دزی و فەرهوود کەوتبوو وکتێبخانەکەشی بەهەمانشێوە وێرانکرابوو، ئەمە جگە لە فەوتانی زۆربەی بابەت و کەرەستە فلکلۆری و مێژووی و ئاسەوار وچەکی هەمە جۆری دەگمەن و وێنەکانی لەگەڵ کاربەدەستانی سەردەمی مەلەکی، وەکو وێنەی لەگەڵ مەلیك فەیسەڵی دووەم ونوری سەعید و ئەوانی ترو وێنەکانی لەگەڵ موتەسەڕیف و پارێزگارەکانی کەرکوك لە هەردوو سەردەمی مەلەکی و کۆماری.

هەروەها فەوتانی چەندین پارچە فیلمی سینەمایی و دۆکیۆمێنتاری کە بەشێکی زۆری مێژووی بنەماڵەکەیان وشاری کەرکوکی تێیدا لە خۆدەگرت و فەوتانی دیارییە ناوازەکان کە پێشکەشی کرابوون، لەلایەن کەسایەتییە فەرمییەکانی دەوڵەت و سەرۆك هۆزە کورد و تورکمان و عەرەب و نەتەوەکانی تریش.

ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەکەی، بە هەزاران کتێبی دەگمەن و دانسقە هەژماردەکران و جگە لە چەندین تۆژینەوەو لێکۆڵینەوە، لە بوارە جیاجیاکانی یاساو تەشریعات و دەستنووسە عوسمانیە دەگمەنەکان و چەندین پارچە، قاپ و قاچاخی فوخاری کە هی سەردەمی ساسانی بووە، کتێبە زانستی و عەسکەری و مەنهەجەکانی کۆلێجی سەربازی و کۆلێجی ئەرکان و کتێبە یاساییەکان بە هەموو لقەکانی یەوەو گۆڤارە دەگمەنەکانی ئەو سەردەمانە کە هەندێکیان مێژووی چاپەکەی، دەگەڕایەوە بۆ ساڵانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم.

لە ئەنجامی ئەو بارە نا هەموارەی کە کەرکوك و خەڵکەکەی‌و بە دەستیەوە دەی ناڵاندو فەوتانی زۆربەی هەرە زۆری کەرەستەو یادەگاری و ئەرشیفەکانی، نەخۆشی و بێ تاقەتی ڕووی تێدەکات و وابەستەی جێگەی دەکات و هەتاوەکو ڕۆژی ٣ی ئاداری ٢٠٠١، بە یەکجارەکی ماڵئاوایی لە دنیادەکات و هەزاران کەس بەشداری لە پرسەکەی دەکات و بۆماوەیەکی زۆر پرسە بەردەوام دەبێت و چەندین شاعیر و ئەدیبی نەتەوە و پێکهاتە جیاجیاکان ڕێزی لێدەنێن."

***خول و ئیفاد و کۆنگرەکان**

حاکم موعتەسەم بەشداری کردووە لە چەندین خول و ئیفاد وکۆنگرە، لەوانەش : ئیفادەکانی وەزارەتی داد بۆلوبنان ١٩٥٥، میسر ١٩٥٧ ئەردەن ١٩٦٠ تورکیا ٦٢ ١٩ بۆجارێکی تر میسر ٦٩, ١٩٧١، تورکیا١٩٧٥.

* چەند وێستگەیەك

* تەنها خانوویەکی بەجێهیشتووە، ئەویش بە قەرزی (بانکی خانووبەرە) دروستی کردووە.

* سوودی بینووە لە پەیوەندییە فراوانەکەی بۆ خزمەتکردنی خەڵك و لێقەوماوان.

* چەند جارێك مەلیك فەیسەڵی دووەم و نوری سەعیدی بینیووە.

* چەند جارێك ناوی هاتووە لە کتێبی"مذكرات الطبقجلي وذكريات جاسم مخلص المحامي"کە ساڵی ١٩٨٦ لە بەغدا چاپکراوە لە میانی ئیفادەی شایەتەکان، بۆ دادگاییکردنی ژمارەیەك لە ئەفسەرە تۆمەتبارەکان لە دۆسێی ڕووداوەکانی ئاداری ١٩٥٩ ی، بزووتنەوەی شەواف، لە لاپەڕەکانی ٦٢و ٦٤ و ٦٨ ی کتێبەکە".

*** بەشێك لە یاداشتەکانی حاکم موعتەسەم.**

لە یاداشتەکانیدا حاکم موعتەسەم، لە سەرچەندین دیاردەو ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەسایەتییەکانی مێژووی، کۆنی ڕۆژگارەکانی کەرکوك و عێراقی نووسیوە، ئەمەی خوارەوەش بەشێکە لەو یاداشتانە:

شەقاوەکانی کەرکوك لە سەرەتای (سەدەی بیست) دا بە حوکمی پۆستم وەکو (دادوەری لێکۆڵینەوەی کەرکوك)، بۆ ماوەیەکی زۆر زانیاریم پەیدا کرد لە ڕێگەی (دۆسێکانی تاوان) لە دادگا، لە سەر چەندین شەقاوەی ناسراوی کەرکوك و لەبەر ئەوەی شارەکە ئەوکات، شارێکی بچووك بووە و زۆربەی خەڵکەکەی یەکتریان دەناسی، بەشێکی زۆری شەقاوەکان پەنایان بۆمن دەبرد، کاتێك کە بەند دەکران و یارمەتی هەندێکیانم دا، بۆ دامەزراندنیان لە فەرمانگەکان بۆ ئەوەی واز لە شەقاوەیەتی بێنن".

*** لە بیستەکاندا بەفیعلی کەرکوك لەلایەن شەقاوەکانەوە حوکمدەکرا!.**

هەندێك لە شەقاوەکان هەڵوێستی نیشتمانیان بووە، وەکو: (م. ع) کە هێرشی کردە سەر کەسێك پاش ئەوەی گوێی لێ بوو، هێرش دەکاتە سەر بزووتنەوەی کورد، لە بیستەکاندا بە فیعلی کەرکوك لەلایەن شەقاوەکانەوە حوکم دەکرا،خوالێخۆشبوو، عەبدولمەجید یەعقوبی موتەسەڕیفی ئەوکاتی کەرکوك، بۆی باسکردم کە ئەو لە هەندێك حاڵەتدا، پەنای دەبرد بۆ هەر دوو شەقاوە: () و () بۆ کۆنترۆڵکردنی هەندێك ناوچە، کە کێشەیان تێدا ڕوویداوە لەو سەردەمەدا. دووا شەقاوەکانیش لە کەرکوك، باسیان کۆتایی پێهات لەگەڵ هاتنی بەعسیەکان بۆ دەسەڵات.

لە شەقاوە ناسراوەکانی کەرکوکیش () کە خاوەن لە شێکی بە هێزو ئازاو نایابوو، ئیدارەی چاپخانەیەکی ئەدا، کاتێك بینیم لە ساڵی ١٩٦٥، سکاڵایەکی پێشکەشکردم دژی کەسانێك، پێیوتم کە شەڕی پێدەفرۆشن پاش ئەوەی تەمەنی گەورە بووەو ئەو هێزەی جارانی نەماوە".

"پرسیار دەکەین بۆ شەقاوە ؟ بۆ ئەوەی وەلامەکە تەواوبێت، دەبێ هەروەها پرسیاری ئەوە بکەین و بلێین: بۆ چی شەقاوەکان لە ژیانماندا ونبوون ؟ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێشتر، بۆ رۆژگارەکانی حوکمی عوسمانی، پاشان سەردەمی داگیرکاری بەریتانیا و هاتنەکایەوەی حوکمی مەلەکی، دەبینین کە شەپۆلی شەقاوەیەتی بەربلاوبووە لە سەدەی نۆزدەهەم پاشەوەی دەسەلاتی عوسمانی لاوازبووە و جەهالەت و هەژاری و نەخۆشی، بالی کێشاوە بە سەر هەموو شوێنێکی ولاتدا. بە هەر حالْ شەقاوە پەیدانابێت، مەگەر لە شارە گەورەکاندا نەبێت، چونکە لە گوندو خێلەکاندا سەر هەلنادات، لە بەر ئەوەی رۆلەی بنەمالەیەکن، هەر شەقاوەیەکیش لە کەرکوك، پارێزگاری دەکرد لە خەلکی گەڕەکەکەی، بەلام شەری دەفرۆشت، بە خەلکی گەڕەکەکانی ترو بەرەنگاری شەقاوەکانیانی دەکرد، هەروەك هەر گەڕەکێك شانازی دەکرد بە شەقاوەکەی و بە تەنگی شاردنەوەی بوو لە کاتی راوە دوونانی لەلایەن جەندرمەی عوسمانی".

"کەسی شەقاوە، سەرەتا ئەو گەنجێکی جاهیل و کارێکی نییە بیکات و لە سەری بژی، کاتێك دەبینێت لە خۆیدا توانای هەیە بۆ بردنی بژێویەکەی لە خەلکانی تر، ئەو کارە دەکات و ئەوەشی زیاتر هانی دەدات بۆ ئەوە، پەرتەوازەبوونی خودی کۆمەلگە ولاوازی حکومەت و دەزگاکانی.واتە شەقاوەیەتی دەرەنجامێکی پێشبینی کراوە بۆ بارودۆخە ناهەموارە، سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتییەکان، هەر بۆیە نابینین ئەمرۆ کەس شەقاوەیەتی بکات، چونکە خوێندن بلاوبۆتەوەو کار زۆر بووەو ئاستی بژێوی بەرز بۆتەوە".

*** سەردەمی زێڕینی شەقاوە!**

نامانەوێت سەردەمی شەقاوەکان رەنگ رێژ بکەین بە بریقەی ئالتون و شانازیکرن پێوەی، بەلکو ئەوە دەلێین بۆ ئاماژەپێدان بۆ ئەو سالانەی کە تێیدا بوونیان بەربلاوبووەو زۆر بووە لە دوو دەیەی دوایەمینی سەدەی نۆزدەوە، هەتاکو سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم کە لە پاشی ئەو رۆژگارانەوە، ئیتر نەمانزانی بۆ شەقاوەیەتی بوونێك، مەگەر لە ناوچە گەلێکی دواکەوتوو تێیدا دروستکرا (شوێنە نشینە هەژارەکان)".

*** رووداوی لیڤی و ئازایەتی ( عەلی بەستێ )**

سەبارەت بە هەولی تەعداکردنی سوپای لیڤی دژی گەرماوی ژنان لە ٤ ی ئایاری ١٩٢٤ پاش رووداوەکانی ئەو رۆژەی کەرکوك: حاکم موعتەسەم نووسیویەتی :

لە سالی ١٩٢٤ کۆمەلێك لە سوپای لیڤی کە هاوکاری سوپای بەریتانیابوون، دەستیانکرد بە هێرشکردنە سەر گەرماوەکانی ژنان لە بازاری جووت قاوەی کەرکوك لە هەولێکدا بۆ دەستدرێژی کردنە سەر ژنان لەناو ئەو گەرماوانەو لەوکاتەدا کاتێك (حاجی عەلی بەستێ)، بینی ئەو هێزە لە هەولی دەستدرێژی کردندایە، بەرەنگاریپانیکرد لەگەلْ براکەی محەمەد بەستێ و کەسێکی تر بە ناوی حوسێن چیمەنی و توانیان بەر پەرچی ئەو هێزە بدەنەوەو زیانێکی زۆریان لێبدەن، هەر بۆیە لە تۆلەی ئەوەدا، هێزە تێکشکاوەکەی لیڤی، چوونە سەر قەلای کەرکوك و تەعدایان کردە سەر خەلك و مەلایەکیان خنکاند، پاشەوەی ئەم هەوالە بلاوبۆوە، عەشیرەتەکانی وەك: زەنگەنە و شوان و تالەبانی و کاکەیی، راپەڕین بۆ بە هانای حاجی عەلی بەستێ و ئاوەلانی و پێکەوە دژی هێزەکە شەریان کرد و توانیان قەلا، لە سوپای لیڤی پاك بکەنەوە پاش شەرێکی قورس و ناچاریانکردن، پاشەکشێ بکەن بۆ ناوەوەی فرۆکەخانەی سەربازی".

پاش ئەم کارەی عەلی بەستێ، ژنان دەرچوون لە گەرماوەکان بە هەلهەلەلێدان وخۆشی، بۆ سلاوکردن لەو پالەوانەی کە پاراستنی، لە دەستدرێژی و ئیتر لەو کاتەوە حاجی عەلی (کە ناسراویشە بە عەلە بەستێ، نووسەر) ناوبانگییەکی زۆری دەرکرد".

هەروەها لە کردەوەو هەلوێستەکانی تری عەلی بەستێ، رووبەڕووبوونەوەی بۆ داود سەلمان جەنابی، سەرکردەی فیرقەی دووی کەرکوك، کە هەولی داوە گەنجان هانبدات بۆ پەیوەست بوون بە رێکخراوی گەنجانی سەر بە حزبی شیوعی و قەدەغەکردنی گەنجان بۆ پەیوەست بوون بە (یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان)، پاشەوەی یەخەی رادەوەشێنێ پێی دەلێت"ئەی فەرماندەی فیرقە، ئەم ناوچەیە، ناوچەیەکی کوردستانییە بۆت نییە مەنعی لاوانی کورد بکەیت بۆ هاتنە ناوەوەی یەکێتی لاوانی کوردستان"، شیاوی باسە خوالێخۆشبوو، عەلی بەستێ لە دایکبووی ١٩٠٠ ی کەرکوکە و لە سالی ١٩٦٣ کۆچی دوایی کردووە پاشەوەی کوڕەکەی (مەحمود، نووسەر)، لە سێدارە درا لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف، هەروەها عەلی بەستێ، یەکێك بووە لە سوارەکانی شێخ مەحمودی حەفید و لە یەکێك لە شەڕەکاندا لەگەلْ ئینگلیزدا، شێخ مەحمود بەهۆی ئازایەتی بە (ستێوە) ئەسپ و چەکەکەی بە دیاری پێداوە".

(لێرەدا شیاوی باسە ئاماژە بەوەبکەین، کە زۆر بەدەگمەن لەسەر ئەو پیاوە ئازاو کەلەمێردە (عەلی بەستێ)، نووسراوە، کە جگە لەم باسە یاداشت ئامێزەی خوالێخۆشبوو حاکم موعتەسەم، مامۆستا حەسەن جاف- یش، رۆمانێکی بەپێزوو جوانی نووسیوەتەوە بە ناوی"عەلە بەستێ کە تێیدا باسی زۆر رووداوی کەرکوکی کردووە (بەتایبەت رووداوەکانی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٩) و رۆلی خوالێخۆشبوو بنەمالەکەی لەو رووداوانە، نووسەر)."

*** یاداشتەکانی لەسەر بارودۆخی عێراق پاش تەمموزی ١٩٥٨**

پاش ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ و لادانی پاشایەتی لە ولات، رارایی و ونبوونی دلنیایی بلاوبۆوە لەلای خەلك، حزبە جیاوازەکان دەستیانکردە شەڕو ململانێ لە نێوانیاندا، زۆر لە خەلك ئیعدامکران بەبێ لێکۆلینەوەو دادگاییکردن، بنەمالەی پاشایەتی بە تەواوەتی ئیبادەکران و میر عەبدولئیلا و نوری سەعید، راکێشران لە شەقامەکانی بەغدا و زۆرێك لە پیاوانی ولات لە سەرووپانەوە، ئیداری دیار، سەعید قەزاز، ئەو پیاوە دلێرو رەسەنە کوردەی کە خزمەتی کۆمەلگەی کردووە و قرنەکانی هەویرکاری (الاعاشە) ی دامەزراندوە بۆ ئەوەی

هەژاران بە نرخێکی هەرزان نانیان دەستکەوێت و پرۆژەی ئاوی کەرکوك و بەربەستی (کونە کۆتری) لە ناوچەی دووبز ساڵی ١٩٥٦ دامەزراندووە، ڕووبەڕووی مەرگ بووەوەو لە دادگا بە هەموو مەردایەتی و لە کاتی خوێندنەوەی حوکمەکەی سەری وتی: (کاتێك دەچمە بەر پەتی سێدارە، زۆرێك لە ئێوە لەژێر پێمدا دەبینم)".

سیستمی حوکمڕانی نوێ، نەیتوانی ئاسایش و ئاشتی ڕاستەقینە بۆ هاووڵاتیان دابینبکات وەك لێیان چاوەڕێ دەکرێت، موزایەدە بە دروشمە بریقەدارو نەزۆکەکان لە نێوان حیزبەکان دەستی پێکرد، هێزە دەرەکی و ناوەکی بە هەموو توانا مادی و مەعنەویەکانیان، هەوڵیاندا پەیوەندییە ئەزەلی و ڕۆحی، نێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگە تێکبدەن، هەروەك هەوڵیانداوە سیستمی نوێش لە ناوبەرن.

لێرەشدا نموونەیەکی واقعی دەنووسم، کە بە سەرخۆمدا ڕوویدا لە کاتی ڕووداوە ناخۆشەکانی کەرکوکی تەمموزی ١٩٥٩ و چۆن هێزی دەرەکی، کاری دەکرد بە مەبەستی تێکشکاندنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان چین و توێژە ڕەسەنەکانی کۆمەڵگەی کەرکوك.

پێش ساڵی ١٩٥٨ ، کەسێك حوکمدرا بە زیندانیکردن لە تاوانێکی ئاسایی لە دادگای کەرکوك و پاش ١٤ / ٧ / ١٩٥٨ ئازادکرا بە لێبوردنی گشتی، هەوڵیدا ڕووداوە خوێناوییەکانی کەرکوك بقۆزێتەوە لە تەمموزی ١٩٥٩، بۆ مەبەستە تایبەتەکانی و کوشتنی خۆم و خێزانم لەو ڕۆژە شوومەدا (١٤ /٧ / ١٩٥٩)

لەو ڕۆژەداو پاش نیوەڕۆ، یەکێك لە ئاسیاوەکانم هات بۆ ماڵم و پێی وتم: دەبێت هەر ئێستا ماڵ بە جێبهێڵیت، چونکە گوێم لێبووە هەندێك کەس دەیان وت: حاکم موعتەسەم دەکوژرێت و ڕادەکێشرێت لەبەر ئەوەی دژی ڕژێمی نوێیە و لەلایەنگرانی پاشایەتییە! پێم وت: من ماڵ بە جێناهێڵم چونکە من کەسم ئەزێت نەداوە لە ژیانم و خزمەتی خەڵکم کردووە بەپێی توانام. پاش ئەوە هەوڵمدا پەیوەندی بکەم بە سەرۆکی دادگا بە تەلەفون بەردەستم نەکەوت و پەیوەندیم کرد بە بەڕێوەبەی پۆلیس و پێی وتم: ("هێزەکانی پۆلیس زۆر سەرقاڵن لەگەڵ ڕووداوەکان و (هێزی گەڕۆکی پۆلیسیش) لە کۆنترۆڵ دەرچووە و موتەسەریفیش سەرکردەی فیرقەی ئاگادارکردووە بەوە ومن ناتوانم هیچ پۆلیسێکت بۆ بنێرم بە داوای لێبوردنەوە"). خۆم دوو پۆلیسی یاوەرم لابوو، بەڵام ناردیانمەوە بۆ ماڵەکانیان بەهۆی بارووودۆخەکەوە و پاش چەند کاتژمێرێکی کەم، کاتێك (بنەماڵەی باخەوان) گوێبیستی هەڕەشەکەبوون، وەکو شێر ڕاپەڕین بۆ پارێزگاریکردنم و حاجی ڕەفیق، گەورەو دەم سپیان هات لەگەڵ هەندێك لە کورەکانی وبرازاکانی وپێی وتم: ("کاکە گەر بە تۆ بگەن دەبێت لە سەر لاشەی ئێمە بپەڕنەوە بە کردەوەش شورایەکیان دروستکرد لە پیاوی چەکداری ئازا لە دەوری ماڵم، شیاوی باسیشە پەیوەندیکردن بە هەموو جۆرەکان بڕابوو.

پاشەوەش هەواڵەکە گەیشتە براو خزمانی زەنگەنە و تاڵەبانی، هەر بۆیە دەیان کەس گەیشتنە ماڵم و لە سەرووی هەموویانەوە، کاك عەبدولکەریم ڕەشید ئاغا و هەڕەشەکەش بوو بە ڕاست و کەسی ئاماژەپێکراویش لەگەڵ ئاوەڵانی، هەوڵیاندا هێرش بکەنە سەر ماڵم و کاتێك گەشتن بە ئۆتۆمۆبیلەکانیان و بینیان ئەو هەموو خەڵکە لە خزمان و دۆستانم، ڕاستەوخۆ پاشەکشێیان کردوو ڕایانکرد، پێش ئێوارە توانیم پەیوەندی بکەم بە بارەگای فیرقەی دوو کە برا گەورەکەم، کاکم عەبدولقادر کە ئەو کات (١٤ / ٧/ ١٩٥٩) پلەی موقەدەم بوو، ئامری (هێڵی مواسەلاتی) فیرقە دوو بوو و یەکێك بوو لە (ئەفسەرانی روکنی فەرماندەی فیرقە)، بەداڵەی فیرقەی وەڵامیدامەوەو وتی: موقەدەم عەبدولقادر سەرقاڵە زۆرو لە (ژووری حەرەکات) ە لەگەڵ فەرماندە، پێم وت: دەمەوێت لەگەڵ یەکێك لە ئەفسەرەکان قسە بکەم، بۆی وەرگرتم بە سەرهاتەکەم بۆگێڕایەوە و وتی: هەر ئێستا موقەدەم عەبدولقادر ئاگادار ئەکەمەوە، ئەوەبو کاکم پەیوەندی پێمەوەکرد و بارودۆخەکەم بۆ باس کردو بەپەلە و لە هەمانکاتدا فەرمانی کرد بە (سریەی مودەرەعاتی یەك)، بە جوڵانەوە بە ئاراستەی ماڵم (کە ئەو کات لە گەڕەکی بەرتەکێ بوو)، پاش سێ چارەکە کاتژمێر، هێزەکە گەیشت و لە هەموو لایەکەوە ماڵەکەیان تەوقکرد و بارودۆخەکە لەو ناوە، هێور بۆوە وداوام کرد لە براو خزمانم کە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان چونکە بارودۆخ زۆر ناهەموار بوو، شەویش ئەفسەرانی فەرماندەیی فیرقەی دوو، سەردانی ماڵمیان کرد بۆ دڵنیایی و سەلامەتیم.

ئەو کەسە، هەوڵیدا باری خراپی کەرکوك، بقۆزێتەوە بۆ مەبەستە تایبەتەکانی و تۆڵەکردنەوە لە حکومەت لە ڕێگەی کوشتنم.

پاش کودەتاکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە دادگابووم، زەعیمی روکن عەبدولرەزاق مەحمود فەرماندەی فیرقەی دوو، پەیوەندی پێوەکردم کە دەمناسی لە ڕێگەی کاکم عەبدولقادر و پێی وتم: هێزەکانی سوپا ئەو کە سەیان دەستگیرکردووە کە هەوڵی کوشتنتیداوە، ئەو ئێستا لە (ئەنجومەنی عورفی عەسکەری) یە، داوات لێدەکەم بێی بۆ ئەنجومەن بۆ وتنی شایەتیکەت دژی، ئەوەبوو چووم بۆ بارەگای ئەنجومەن و لەوێ هەر یەك لە زەعیمی روکنی ئاسمانی، حەردان تکریتی (ساڵی ١٩٧١ لە کوەیت تیرۆرکرا بەپلانی سەدام و بەکر، نووسەر)، و موقەدەم روکنی ئاسمانی محەمەد جەسام جبوری-م بینی، هەروەها ئەو پیاوەم بینی کە هەوڵی دا بمکوژێ وەستاوە بە شێوەیەکی کەساس لە (قەفەسی تومەت) وداڕوخاوە بە تەواوەتی و کاتێك بینیمی، نەیتوانی بوەستێ و کەوتە سەرزەوی، وای پێشبینی دەکرد کەمن هەوڵدەدەم سزاکەی توندبکەم و ئیعدامبکرێت و کاتێك چوومە نێو هۆڵەکەوە، سەرۆکی ئەنجومەن، بەخێر هاتنی کردم و پێی وتم: تاوانباری ناوبراو ئیعدام دەکرێ و یەکێك لە هۆیەکانی ئەوەیە هەوڵدان بۆ کوشتنی دادوەرێك لە دەوڵەت و ئەو دانیناوە بەرانبەر ئەنجومەن، بە هەموو وردەکارییەکانی هەوڵەکانی بۆ تاوانەکەی.

لە هەمان چرکەدا، ئەو ئایەتە پیرۆزەم کەوتەوە بیر کە دەڵێت:(خذ العفو وامر بالعرف واعرض عن الجاهلین)،

سورەتی ئەعراف ئایەتی ١٩٩، بۆیە وتم بە سەرۆکی ئەنجومونەکە، من تەنازول دەکەم لە مافم و تکاتان لێدەکەم کە هەر ئێستا ئازادی کەن، سەرۆکی ئەنجومەنەکە سەری سورما لە داواکەم و پێیوتم: چۆن تەنازول دەکەی لە سەر داواکەت و ئەو کەسە هەوڵی کوشتنت و راکێشانتیداوە لە جادەکان، پێم وت: لە خەسڵەتەکانی پیاو، (لێخۆشبوون لە کاتی توانایی)، بۆیە پاش هەوڵێکی جدی، ئازادکراو پاش ئەوە لە یەکێك لە رۆژگارەکان، هاتە ماڵم و بینم بارودۆخی زۆرخراپە، بۆیە پەیوەندیمکرد بە سەرۆکی یەکێك لە فەرمانگەکان بۆ دامەزراندنی وەکو پاسەوان، هەر واشبوو، دامەزرا و بە بەردەوامی سەردانمی دەکرد لە ماڵەوەو زۆر سوپاس گوزارم بوو، منیش بە بەردەوام، یارمەتی و چاوم لێدەبوو هەتا وەکو رۆژی کۆچی دوایی لە ساڵی ١٩٦٧ دا.
ئەو پیاوە بە شێوەیەکی گشتی، دروستکراوی رۆشنبیری کۆمەڵایەتییە و نەخوێندەوارو هەژاربووە و یەکێك لە هۆکارەکانی هەڵەکانی، رۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییە سەرەتاییەکەیەتی و منیش وەکو دادوەرێکی بە ئەزموون، تەقدیری باروزروف، ژینگە هەڵەکەی دەکەم، بۆ مێژووش دەینوسم، چیرۆکی ئەو پیاوە پێش دەستگیرکردنی، مەرجەعە باڵاکانی دەوڵەت، پێیان زانی لە رێگەی کاکم عەبدولقادر".

* هەندێك لە وتەکانی حاکم موعتەسەم کە لەیاداشتەکانی نووسیویتی.

* دینداری لەوە دەچێت بووبێتە خۆراکێکی دەروونی بۆ مرۆڤ.

* کێ دەیەوێت باوەرەکانی خەڵك و کۆمەڵگە چاك بکات، دەبێت لە هەمان کاتدا، باری بژێوی و کۆمەڵایەتی و دەروونیان چاك بکات، چونکە باوەرەکان، دەرەنجامی ئەو باروزروفانە سەری هەڵداوە، نەك دەرەنجامی لۆجیك و بیرکردنەوەی ئەبستراکتی(موجەرەد).

* ئەو بنەمایانەی کە یاسای لە سەر بنیات دەنرێت، غەریزەکانی تاکە، چونکە ئارەزووی هاوسەرگیری، یاسای گرێبەست و هاوسەرگیری هێنایە کایەوە و ئارەزووی موڵکداری، یاساکانی عەقاری هێنایە ئاراوە هتد.."

*عەبدولقادر شێخ محەمەد خەلیفە، (١٩١٤- ٢٠٠٣)
لیوا روکن (١٩٣٨ - ١٩٧٤).

ساڵی ١٩١٤ لە گەرەکی بەرتەکێی شاری کەرکوك لەدایکبووە، کوری نۆبەرەی شێخ محەمەد خەلیفەیە، هەر لەو شارە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی لە سەرەتایی و ناوەندی ودواناوەندی تەواو کردووە، کاتێکیش باوکی گواسترایەوە بۆ لیوای سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٤ وەك (بەرێوەبەری گەنجینەکانی) ئەو شارە، چووە خولی مامۆستای سەرەتایی و تەواوی کردوو وەکو مامۆستا دامەزرا لە یەکێك لە قوتابخانەکانی سلێمانی و پاش ئەوە چووە (کۆلێژی سەربازی مەلەکی) کە تێیدا دەرچوو لە خولی (١٤) بەمینیدا لە ساڵی ١٩٣٨ بە سەرکەوتوویی و پلەی مولازمی پێبەخشرا لە سوپای عێراق بە (بریارێکی پاشایەتی)، ئەو خولەش(١٤)، هەمان خولی موشیر عەبدولسەلام محەمەد عارفە، سەرۆك کۆماری پێشووتری عێراق (١٩٦٣ - ١٩٦٦).

ساڵی ١٩٤١ بە شداری کردووە لە خولی ئەفسەرانی تازە پێگەیشتوو لە (قوتابخانەی تۆپخانە) لە لارکسل- ی بەریتانیا و لە ساڵی ١٩٤٢ چۆتە (کۆلێجی مافەکان) لە بەغداو بروانامەی لیسانسی وەرگرتووە.

هەر بەهۆی لێهاتووی و تواناکانییەوە، لە ساڵی ١٩٤٨ پاڵێورا بۆ پەیوەندیکردن بە (کۆلێژی ئەرکان) و توانی بە سەرکەووتویی تەواوی بکات لە ساڵی ١٩٥١ و پلەکەی بەرزکراوەتەوە و لە ساڵی ١٩٥٥ بەرزکراوەتەوە بۆ پلەی (رائید روکن) و گواستراوەتەوە بۆ (لیوای پاسەوانی پاشایەتی)، و پاش ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ بووە ئامری (هێڵی گواستنەوەی) فیرقەی دوو لە کەرکوك.

لە کاتی یاخیبوونی لیوای پێنج لە موسڵ، ئاداری ١٩٥٩ بە سەرکردایەتی عەقیدی روکن عەبدولوەهاب شەواف، گواسترایەوە لەگەڵ هەندێك لە ئەفسەرەکان، بۆ لیوای ناوبراو بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاسایش لە موسڵ و پاش کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ گواسترایەوە بۆ (بەرێوەبەرایەتی جوڵانەوە سەربازییەکان) لە (فەرمانگەی ئەرکانی گشتی) لە وەزارەتی بەرگری، لەساڵی ١٩٦٤ موشیری روکن، عەبدولسەلام عارف سەرۆك کۆماری پێشوتر، فەرمانیدا بە دامەزراندنی وەك (ئامری مەوقعی بەغدا) کە یەکێك بووە لە پۆستە سەربازییە هەستیارەکان و ئەو هێزەی کە لەژێر فەرمانی ئەودان، بەرپرسە لە ئاسایشی بەغدا و دەورووبەری وئەو پۆستەش نادرێ، مەگەر بۆ فەرماندە سەربازییە بە تواناکان نەبێت، سەرەرای هەموو ئەوانە و متمانەی تەواوو بێ سنووری فەماندەو بەرپرسانی عێرا قی ئەوکات، بە بەرێز عەبدولقادر، بەڵام بەهۆی کوردبوونییەوە، هیچ پۆستێکی سەربازی پێنەدراوە لەیەکە سەربازییەکانی باکووری بەغدا.

ساڵی ١٩٦٥ دامەزرا وەکو (بەرێوەبەری کاروباری گشتی) لە وەزارەتی بەرگری و پاش دووساڵ دامەزرا وەکو (بەرێوەبەری سنفی ئەندازەی میکانیکی کارەبایی) لە وەزارەتی بەرگری و لە ساڵی ١٩٧٢ بەرزکرایەوە بۆ پلەی لیواو وپاش دوو ساڵ خانەنشینکرا، پاش نزیکەی چل ساڵی خزمەت لە سوپاو هەر لە بەغدا مایەوە تا رۆژی کۆچکردنی لە ٢٠٠٣ و لە یاداشتەکانی باسی زۆر مەسەلەی تایبەتی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سەربازی خۆی کردووە.

* ژیانی خێزانی

هاوسەرگیری کردووە لەگەڵ خاتوو فەوزییە، کە کچی عەقیدی پۆلیس نورەدین عەبدولسەمەد جەراحە، کە کەسایەتییەکی کەرکوکییە و یەکێکە لە ئەفسەرە پۆلیسە ناسراوەکان لەسەر ئاستی عێراق و سێ کوری هەبووە (واتە ئەلجەراح) ئەوانیش گەیشتوونەتە پلەو پایەی بەرز لە سوپا و پۆلیس، کە بەرهەمی ئەو هاوسەرگیرییە لیوا عەبدولقادر، پێنج منداڵ بووە : شێرزاد کورە گەورەکەی (١٩٤٠ -) دکتۆرا لە فیزیا، لە هەفتاکانەوە لە بەریتانیا دەژی و لە ژمارە (٣٠) گۆڤاری

سلێمانیدا لە چاوپێکەوتنەکەی دکتۆر کەمال فوئادا، ئاماژەی بە ناوی کردووە، نەوزاد دکتۆری ڤێنتەرنەری، ئازاد.

*** دۆسییەکەی لە وەزارەتی بەرگری**

لە دۆسێی کەسی بەڕێز عەبدولقادر لە وەزارەتی بەرگری، چەندین برگەی تایبەت بەو هاتووە لە برگەی خوێندندا هاتووە: خوێندنی دواناوەندی، کۆلێژی سەربازی پاشایەتی، کۆلێژی ئەرکان، خولێك لە بەریتانیا، خولی تەعبینە لە ئیتالیا، لە برگەی زماندا هاتووە : کوردی، عەرەبی، تورکمانی، ئینگلیزی.

*** نیشان و ویسامەکان**

نیشانی فەیسەڵی دووەم، نیشانی خزمەتی نایاب، نیشانی فریاکەوتن، ویسامی رافیدەینی پلە پێنج و لە جۆری سەربازی، چەند جارێك تەکریم کراوە لەلایەن پاشاو بەرپرسە باڵاکانی تری عێراقەوە، لە وانە: دەرچوونی فەرمانی پاشایەتی (ئیرادە مەلەکیە) لەلایەن شا فەیسەڵی دووەم بە بەخشینی ویسامی رافیدەین، هەروەها نوری سەعید خزمەتی پێشینە (قیدەم) بۆ ماوەی (٦)مانگ، هەروەها تەکریم کراوە لەلایەن ئەحمەد موختار بابان کاتێك (سەرۆکی دیوانی پاشایەتی) بووە.

*** شایەتی عەبدولقادر خەلیفە، لە (دادگای مەهداوی) بۆ دۆسێی رووداوەکانی ئاداری ١٩٥٩**

ناوی لیوا عەبدولقادر چەند جارێك هاتووە لە کتێبی بە ناونیشان"مذكرات الطبقجلي وذكريات جاسم مخلص المحامي"کە لە بەغدا دەرچووە لە چاپی دووەمیدا ساڵی ١٩٨٦ ، وەك یەکێك لە ئەفسەرە شایەتەکان لە رووداوەکانی ئاداری ١٩٥٩ بۆ دادگاییکردنی ژمارەیەك لە فەرماندە سەربازییەکانی تۆمەتبار بە هەوڵی تێکدانی بارودۆخ و یاخیبوون لە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لە لاپەرە (٥٨٠) ی کتێبی ناوبراودا لە چوارچێوەی کۆنووسی بڵاوبووەوە لە کۆتایی کتێبەکەدا کە پێشکەشکراوە لەلایەن پارێزەر شاکر ماهیر، بریکاری تاوانبار زەعیمی روکنی خانەنشینکراو، ناظم تەبەقچەلی بۆ دادگای ناوبراو. ناوی شایەت موقەدەم عەبدولقادر محەمەد خەلیفە وەك شایەتی ژمارە (١١)ە دا هاتووە لە کۆنووسی ئاماژەپێکراو کە تێیدا نووسراوە"ئیفادەی کردووە بەوە، کە تاوانبار داوای کردووە لەوو ئەوانیتریش لە ئەفسەران، ئامرەکانی یەکەکان، بۆ پاراستنی گیانی خەڵك وماڵەکانیان و پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ دانیشتووان و بە جێبەجێکردنی پلانی ئاسایشی شار".

*** حەمە شکور شێخ حەمە عەلی شێخ ئەحمەد خەلیفە،**

ئەدیب و وەکیلی موتەسەریف و پارێزگار(١٩٣٢- ٢٠١٠).
شکور (حەمە شکور) کوڕی شێخ حەمە عەلی خەلیفە، ساڵی ١٩٣٢ هەر وەکو هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی، لە گەرەکی بەرتەکێی شاری کەرکوك هاتووەتە دنیاوە و ئاقانەی باوکی،(شێخ حەمە عەلی) بووە و هەروەکو کورد هەمیشە ناوی محەمەد یان حەمە دەکەنە پاڵ ناوەکان، ئەم و باوکیشی بەدەر نەبوونە لەو نەریتەو، هەر یەکەو حەمە یەکیان دراوەتە پاڵ و هەر بەو ناوە ناسراون، (حەمە شکور) و (حەمە عەلی).
خوێندنی سەرەتای و ناوەندی و بەشێك لە دوا ناوەندی لە سلێمانی بەهۆی وەزیفەی باوکییەوە، کە بەڕێوەبەری ئەوقاف بووە لەو شارە تەواو کردووە، کە باوکیشی دەگوازرێتەوە بۆ هەولێر، ئەویش دەروات بۆ ئەوێ و بەشەکەی تری دواناوەندی لەوێ تەواو دەکات، پاشان لە ساڵی ١٩٥٨ لە (کۆلێژی مافەکان) ی زانکۆی بەغدا وەردەگیرێت و بە سەرکەوتوی تەواوی دەکات و (لیسانسی مافەکان) وەردەگرێت و دەست دەکات بە کاری پارێزەی و ناوبانگێکی باش دەردەکات بەهۆی زیرەکی و خۆشویستنی پیشەکەی.
پاش تەواو کردنی کۆلێژ و لەرۆژگارە کۆتاییەکانی حوکمی عەبدولکەریم قاسم، وەك بەڕێوەبەری ناحیەی (ئەبوغرێبی) نزیك بەغدا دەستنیشان دەکرێت و لە ئەنجامی بە توانایی، دەکرێتە قایمقامی قەزای (موسەیەبی) نزیك بەغدا و لە پاشیدا و لە ساڵی ١٩٦٣، دەبێتە بەڕێوەبەری (کارگەکانی وەزارەتی ناوخۆ) و هەر لەمیانی ئەو وەزیفەیەیدا، دەنێردرێت بۆ خولێکی شەش مانگی لە وڵاتی یابان و پاش هاتنەوەی، دیسانەوە دەنێردرێت بۆ خولێکی تر لە بەریتانیا.
لە نێوان ساڵانی ١٩٦٥ - ١٩٦٨، دەبێتە یاریدەدەر و پاشان (وەکیلی موتەسەریفی لیوای بەغدا) و لە پاش کودەتاکەی ١٧/٧/١٩٦٨، دەگوازرێتەوە بۆ (وەزارەتی ناوخۆ) وەکو (بەڕێوەبەی گشتی ناوخۆ) دەست بە کاردەبێت و لەوێ دەمێنێتەوە تاوەکو ١٩٨٧ و ئینجا وەکو (وەکیلی پارێزگاری بابل) دەست بە کاردەبێت و لە ساڵی ١٩٩١ وە دەبێتە (وەکیلی پارێزگاری بەغدا) و زۆربەی کاتیش وەك لە یاداشتەکانی ئاماژەی بۆ کردووە، دەسەڵاتی(پارێزگاری بەغدا) ی دەبێت و تاکو رۆژی خانەنیشین کردنی (ناوەراستی نەوەدەکان) لە پاش (٤٠) ساڵ خزمەتی وەزیفی لەو پۆستەی دەمێنێتەوە.
پاشان وەکو پارێزەرێك و کەسێکی شارەزا لە چەندین کۆمەڵەی خزمەت گوزاری کاردەکات و لە پاش پرۆسەی ئازادی، دەگەرێتەوە کوردستان و یاداشتەکانی دەنووسێ و هەروەها وەك بەڕێوەبەری ئیداری، (بانکی خۆر هەڵاتی ناوین) یش، دەست بە کار دەبێت، کە بارەگای لە هەولێرە، تا رۆژی ٢٨ / ٥/ ٢٠١٠ لە تەمەنی (٧٨) ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی لە گۆرستانی بەرتەکێی کەرکوك ئەنێژرێت.

*** خاوەن پەیوەندییەکی بەرفراوان**

حەمە شکور، کەسێکی ناسراوو خاوەن پەیوەندییەکی بەرفراوان بووە لەگەڵ کەسایەتییە سیاسی و رووناکبیرو کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان و عێراق و هاورێیەتی و پەیوەندییەکی زۆر تایبەتی هەبووە لەگەڵ هەر یەك لە بەرێزان : لیوا عەبدولرەحمان موفتی بەڕێوەبەری تەجنیدی گشتی ئەوکاتی عێراق و فەریق کەماڵ موفتی سەرۆکی دادگای عەسکەری هەمیشەی لە بەغدای شەستەکانی سەدەی رابردوو و پاشان وەزیری پێشمەرگەی حکومەتی

هەرێمی کوردستان لە نەوەدەکانی سەدەی رابردو، باڵیۆز سروود محەمەد نەجیب، باڵیۆزی عێراق لە رۆمانیاو فاروقی مەلا مستەفا کە ناسیاوی لە نێوانیاندا هەیە و بنەماڵەی نەقیب لە بەغدا.

حەمە شکور بەپێی بەڵگەنامەکان و بەپێی ئەوانەی کە دەیناسن، نموونەی مرۆڤی خزمەتگوزارو لەخۆبردوو بووە ساڵانێکی زۆر لە بەغدا ژیاوەو ماڵەکەی لە (گەرەکی بەرموکی) ئەو شارە کراوە بووە بۆ هەموو ئەوانەی کە لە شارەکانی کوردستانەوە بە تایبەت، کەرکوک و سلێمانی روویان لێیکردووە بە مەبەستی هاوکاریکردنیان و کار ئاسانی بۆیان."

"کاتێك دەمرم، ئەوانە تەرمەکەم هەڵدەگرن، نەك پۆستەکەم".
چەندین وتە و ستایش دەرهەقی حەمە شکور وتراوە لە لایەن کەسایەتییە ناودارەکانی عێراقەوە، لەوانە موفتی و قازی بەغدا، (شێخ جەلال ئەلحەنەفی) کە وەسفی کردووە بە"جابرا لعثرات الکرام"و"معطیا لاقابضا، مقصودا لاقاصدا، مشکورا لاشاکرا"، هەر کەسێك لە دەرگای دابێت بە نائومێدی نەی گەڕاندووەتەوە، ئەو ناونیشانێك بووە بۆ دڵنیایی هەر کەسێك لە کێشەدا بوایە، چونکە ئەو هەم وەك کەسایەتی خۆی و هەم وەك هەژموونی، دەیتوانی کێشە چارەسەربکات و لەو کاتانەدا زۆر جار سەردانی گیراوە سیاسییەکانی دەکرد لە خزم و ناسیاوانی لە بەندیخانەکانی رژێم، هەر بۆیەش ئەوانەی دەیانناسی پێیان دەوت: کاکە تۆ بەم کردارەت، زەرەر دەگەیەنیتە پۆستەکەت، ئەو پێی دەوتن:"کاتێك دەمرم ئەوانە تەرمەکەم هەڵدەگرن نەك پۆستەکەم"، حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقیش چاك هەڵوێستی حەمە شکوریان دەزانی، بەڵام تواناکانی و دڵسۆزی لەوەزیفەکەیدا و خزمەتکردنی خەڵك بێ جیاوازی، گەیاندیانە پلە بەرزو هەستیارەکانی دەوڵەت".

ئەو جگە لە کوردی، چەندین زمانی تری بەرەوانی دەزانی وەك: عەرەبی و تورکمانی وئینگلیزی و لە بواری نووسین و شیعریش، دەستێکی باڵای هەبووە و بنەماڵەکەی بەنیازن شیعرەکانی کۆبکەنەوەو لەچاپیدەن.

*** ژیانی خێزانی حەمە شکور**

لە سەرەتای شەستەکاندا، خێزانی پێکهێناوە لەگەڵ ناسیاوێکی خۆیاندا(گەلاوێژ) و بەرهەمی ئەو هاوسەرگیرییەش، کچێك و دووکور بووە، رۆژ١٩٦٢، ئەحمەد ١٩٧١ ، عەلی ١٩٧٢ و هەرسێکیان لە هەرێمی کوردستاندا دەژین و فەرمانبەرن.

*** یاداشتەکانی حەمە شکور بۆ خۆهەڵکێشان و ئافەرینی نییە**

"بەناوی خوای گەورە و میهرەبان"
بەشی یەکەمی یاداشتەکانم دەنووسم بۆ ئەوە نییە خۆم هەڵبکێشم یان کەس پێم بڵێ (ئافەرین)، هەرچیم کردووە ئەرکی سەر شانی خۆم بووە کەس بەزۆر پێی نەکردووم. هەروەها نامەوێت ئەوانەی ئەی خوێننەوە وابزانن بۆیە ئەینووسم وەکو عەرەب ئەڵێت"وسیلة للوصول الی هدف مادي او معنوي"...
من ئێستا سوپاس بۆ خوا ئیحتیاجم بە هیچ شتێك نیە.. خانووی خۆم لە بەغداو سیارەی خۆم ومعاشی تقاعودیەکەم زۆر باشە (پلەی تایبەت).. ئەوەندەش ئیشی پارێزەریم بۆ دێت، هەندێکی دابەش ئەکەم بەسەر هاورێکانمدا.. بەڵام ئەگەر هاتوو بۆ خزمەتی کورد و کوردستان داوام لێکرا کە خزمەت بکەم بەبێ پاداشت و هیچ شتێك، ئامادەم چونکە ئەو زانیارییە، ئیداری و قانونییەی کەمن هەمە، لام وایە کەم کەس نیەتی..

کورتەکەی بۆ زانین:

١. (٤٢) ساڵ خزمەتی ئیداری و قانونی، پلە بە پلە لە پاریدەدەری تێبینەرانەوە تاگەیشتمە بەرزترین پلەی ئیداری، کەپێی ئەڵێن (پلەی تایبەت).
٢. بەکالۆریۆسی یاسا, زانکۆی بەغدا.
٣. تواناسازی بەرهەم هێنان، زانکۆی موستەنسریە.
٤. بازنەی نێو دەوڵەتی بۆ سەرکردە ئیدارییەکان، میسر, قاهیرە.
٥. پەیمانگای ئیداری وەزارەتی ناوخۆ.
٦. خولی ئیداری بۆ سەرکردە ئیدارییەکان, ناوخۆ.
٧. خولەکانی سەرکردە ئیدارییەکان، ئەلمانیا(٣)مانگ، یابان تۆکیۆ (٣) مانگ.
٨. ئیتلاعاتی ئیداری لە بولگاریا، تورکیا, سوید و چەند وڵاتێکی تر.
٩. دەورەی واتکن لە بەریتانیا: لەندەن، ولتر، ودرهام.
١٠. سەرۆکی یەکێتیی نیشتەجێبوون لە کۆماری عێراق، هەڵبژاردن.
١١. ئەندامی ئەنجومەنی یەکێتی گشتی بۆ هاریکاری لەعێراق، هەڵبژاردن.
١٢. بەرپرسی کۆمەڵەی سەندیکای پارێزەران بۆ نیشتەجێبوون، هەڵبژاردن.
١٣. ئەندامی دادگای کار بۆ چوار ساڵ".

*** نۆ مانگ وەکیلی پارێزگاری حیللە و بەغدا بێ تەسبیت**

بەبێ ئەوەی کەس پاڵپشتیم بکات، گەیشتمە ئەوەی زیاتر لە نۆ مانگ وەکیلی پارێزگاری حللە و بەغدا بووم، هیچ وەکیلێك لە مانگێك زیاتر نامێنێتەوە یان تەسبیت ئەبێت یان لای ئەدەن، بەڵام من ئەم کاتە زۆرە مامەوە و تەسبیت نەکرام چونکە زۆر هەوڵیاندا نەبووم بە بەعسی، هەموو برا کوردە فەرمانبەرەکانی ناوخۆ ئەوە ئەزانن و بۆ زیاتر دڵنیایی خۆشەویستەکانم ئەڵێم، پێش رووخانی سەدام بە چوار مانگ، ئیستمارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی نیشتەجیبوونی"محامین"نێردرا بۆ وەزارەتی ناوخۆ بە کیتابێکی رەسمی، نوسخەیەکی بۆ ئەمن و موخابەرات و جێگایانی تر، لە جێگای"الاتجاه السیاسی"بەرامبەر ناوەکەی من نووسراوە"موستەقل"لە سەندیکاو لای خۆشم نووسخەی هەیە".

*** کاتێك جێگری پارێزگای بەغدا بووم زیاتر لە پێنج ساڵ،**

کاتێك نائبی پارێزگای بەغدا بووم زیاتر لە پێنج ساڵ، ڕۆژێکی سەر لە بەیانی کات ژمێر (٨) بەڕێوەبەری گشتی دیوانی سەرۆکایەتی عێراق، کە ناوی عەدنان هومام بوو، هاتە ژوورەوە بەپێکەنینەوە وتی کاکە (ئەبو ڕۆژ) من ئەم بەیانییە لای تۆ نان ئەخۆم، وتم بەخێربێی، ئەو کاتە پارێزگای بەغدا، هیشام سەباح ئەلفەخری (١٩٤٠ - ٢٠٠٨)، بوو کە فەریق عەسکەری بوو لەگەڵ وەزیری ناوخۆ، کە محەمەد زمام عەبدولرەزاق بوو، زۆر ناکۆك و ڕقیان لەیەك بوو، ئەم (واتە هیشام) ئەوی بە پیاوێکی هیچ نەزان و بێکەڵك ئەزانی، چونکە (١٦) جار لە شەڕدا بریندار کرابوو، خۆی گەلێك لەو بە بەرزتر دائەنا، بۆیە هەمیشە ئیجازەی دوورو درێژی وەرئەگرتوو ئەچووەوە بۆ موسڵ چونکەماڵیان لەوێ بوو، ئیتر هەتا هەفتەیەك نە ئەگەڕایەوە، من کە نائیبی بووم، بەپێی قانون، سەلاحییەتی پارێزگام هەبوو، ئەو لە دەوام نەبوایە بۆ کاتێکی زۆر هەموو ئیش و کاری پارێزگا من ئەم برد بەڕێوە. کاتێك عەدنان هومام هات، ئەو لە موسڵ بوو پاش نان خواردنی بەیانی، هاتە پێشەوە بۆ لام وتی: کاکە من بە ئیشێك هاتووم بۆ لات، ئەوەش ئەوەیە تۆ لە ناو ئیدارییەکاندا یەکەم کەسیت بۆیە تۆیان کرد بە"رئیس لجنة تقییم المحافظات"یەعنی تۆ کە نائبی پارێزگای، ئەچیت ئیشی پارێزگاەکان تەقییم ئەکەیت، ئینجا وا مودەیەکی زۆرە هەر ئەنووسیت (و، م) مانای وەکیلی پارێزگا، ئیتر نۆبەی ئەوەیە (واوەکە) لادەیت و بنووسیت پارێزگا، خۆتیش ئەزانیت کە پارێزگا ئەبێت لە ئیجتماعاتی حزبیدا بەشدار بێت و هاوڕێ کوردەکانت، چواریان بوون بە پارێزگا و گەلێکیشیان وا"ئەمین عامن"بە دەرەجەی وەزیر، ئیتر نۆبەی تۆیە کە تەسبیت بیت چونکە لە (١٤٤) ئیزبارەی ئیداری و قانونی، تۆ هەڵبژێرایت بۆ نائب پارێزگای بەغدا، ئیتر نابێت بڵێیت نا و وائەم ئیستمارەیەم بۆت هێناوە و ئیمزای بکەو پڕی بکەرەوە هەتابییت بەلایەنگر لە حزبا و ئیتر ئەنووسیت،(الاتجاه السیاسی مستقل) چەند ڕۆژێکی تر مەرسومی جمهوریەکەت بۆ دێنم بۆ تەسبیتت".

وتم ماموستا زۆر سوپاست ئەکەم، بەڵام من ئەمەوێت شتێکت بۆ دەرخەم، ئەویش ئەوەیە، نامەوێت فێڵ لە خۆم و لە ئێوە بکەم بۆ پلە، من کوردم و حزبەکەش ناوی"حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیە"وشیعارەکەشی دیارە، ئینجا من کە کوردم چۆن ئەگونجێت لەگەڵ هەدەفی حزبا، ئەبێت ئینکاری قەومیەتی خۆم بکەم، خۆتان زۆر چاك ئەزانن ئەوانەی کە لە گەڵما ئیشیان کردووە و ئەوانەش کە ئیشیان لەگەڵ ئەکەم بە پاکی و بێ فروفێل ئیشم بردووە بەڕێوە، محافەزەی حللە ژمارەی تەقیمی (١٤) بوو، کە من چوم لە ساڵێکدا ژمارەکەی بووە (دوو) هەتا ئێستاش ئەنووسرێت (المحافظة الثانیة بابل)، مانای ئەوەیە بە دڵسۆزی ئیشم ئەکەم. ئیتر بە دڵ شکاوی هەستاو ڕۆیشت.

*** یاداشتەکانم لە منالییەوە،**

یەکەم مامۆستام، ناهیدە خانی شێخ سەلام بوو.

لە ساڵانی چلەکاندا لە (باخچەی) سلێمانی بووم، مامۆستامان، ناهیدە خانی شێخ سەلام بوو، سروودێکی فێرکردبووین بەیانیان لە (ڕیزدا) بەیەك دەنگ ئەمان وت :.

خەریتەی هەموو خاکی کوردستان
دایك بە دەرزی و دەزوو درومان
بێ ترس لە سەر، سەر بێشکەی منال
هەر بە کوردستان بێتە گرو گاڵ.
لە بێشکەی وایا چاو هەڵ ئەهێنێ
دڕۆیە هەستێ و تۆڵە بسێنێ.

*** قوتابخانەی گۆیژە و مامۆستا ئەبو بەکر**

پاشان باخچەمان تەواو کرد چووینە سەرەتایی لە قوتابخانەی گۆیژە دەوامامان دەکرد، مامۆستایەکمان هەبوو ناوی شێخ ئەبوبەکر بوو نازناوەکەی، هەوری بوو، زۆر کوردێکی دڵسۆز و پاك بوو، بەیانیانی پێنج شەممان بۆ بەرز کردنەوەی ئاڵا لە حەوشەکەدا ڕیز ئەبووین منی ئەهێنایە دەرەوە شیعرێکی بۆ ئەنووسیم ئەم خوێندەوە هەموو قوتابیان چەپڵەیان بۆلێ ئەدام، زۆر چاك لە بیرمە ڕۆژێك شیعرێکم خوێندەوە کە ئەڵێت...

کوانێ لانەی سەف دەری ڕۆستەم نەژادی خۆش لە قەب
چی بەسەر هات کەوکەبەی کوردانی بە ئەصڵ و نەسەب
حاڵی کورد ئێستا لە بەینی تورك و ئێران و عەرەب
بێ چووە شێرێکە کەو تووەتە داوی منداڵانەوە.

پاش دەرس گەڕام بە دوای برای گەورە و تێکۆشەرم مام جەلال کە دیم پێم وت کاکە گیان (کەوکەبە) مانای چییە..؟ فەرمووی: کەوکەبە ئەو شۆرە سوارە پێشمەرگانەن لە پێش لەشکرەوە ئەڕۆن، ئینجا یان چوار ئەسپ سوار، یان شەش، یان دوانزە ئەوانە پێش شەڕ هەڵمەت ئەبەنە سەر دوژمن.. ئەی دوانزە سوارەی مەریوانت نە بیستووە ؟..

*** بردنی نامەکان بۆ کاك عوسمان دانش**

بەم جۆرە ساڵ بە ساڵ هەر پەیوەندیم بە مامۆستای بەرزم، شێخ ئەبو بەکرەوە بوو، ڕۆژێك بانگی کردم وتی: حەمە شکور، ئەمانەتێکت ئەدەمێ بەیانی کە هاتیت بۆ قوتابخانە لە بەر دەرکی سەرا، عەرز وحاڵ چیەك هەیە هەندێك قەڵەوە دانیشتووە، ناوی کاك عوسمان دانشە، ڕۆژ باشی لێ بکەو پێی بڵێ: جەنابت کاك عوسمانیت، کەوتی بەڵێ، ئەم نامەیەی بدەرێ بزانە چیت پێ ئەڵێت.

بەیانی کاغەزەکەم برد، کاك عوسمان لەسەر کورسیەك دانیشتبوو، مێزێکی بچووکی لە بەردەمابوو، ڕۆژ باشم لێکرد و وتی، ڕۆژ باش ڕۆڵەی شیرینم، مامۆستا شێخ ئەبو بەکر تۆی ناردووە، وتم بەڵێ نامەکەم دایە دەستی و وتی: ڕۆڵە گیان بەیانی وەرەوە وەڵامەکەی وەربگرە، بەڵام کە هاتوو چۆ ئەکەیت و نامە ئەهێنیت، زۆر ئاگاداری خۆت بە کەس نەتبینێت، کە نامەکە دائەنێیت و وەڵامەکەی وەرئەگریت،

وتم ئەمرەکەی قوربان.
بۆ بەیانی چووم وەڵامەکەم وەرگرتوو. مامۆستا لە ژووری مامۆستایان دانیشتبوو، خۆم پیشان داو ڕۆییشتم، پاش تۆزێك هات و وتی ئافەرین کێ فێری کردیت، وتم: کاکە عوسمان، نامەکەی لێ وەرگرتم... ئیتر بەم جۆرە هەر چەند ڕۆژێك، نامەم ئەبردوو وەڵامم ئەهێنایەوە نەشم ئەزانی ئەم نامانە چین و بۆ چی وابە نهێنی ئەینێرن.

*** پەیوەندیتان ئەبێت لەگەڵ کاك کەمالی حاجی شەفیق**

کاتێکی زۆر بەم جۆرە بوو، ڕۆژێك مامۆستا شێخ ئەبو بەکر بانگی کردم کەسی لانەبوو وتی حەمە گیان پیرۆزبێت... سەرم سوڕما وتم مامۆستا چیم پیرۆزبێت ؟ وتی ئێستا بە تەواوی ئەندامیت، باپێت بڵێم ئێمە لەگەڵ حزبی هیوا و چەند ڕێکخراوێکی تردا یەکمان گرت بە ناوی (ژ، ك)... تۆیش لە گەڵمانا ئەبیت و پەیوەندیت بە شێخ سەعیدی شێخ عەبدولڕەحمان بۆسکانییەوە ئەبێت، ئەویش لە پۆلی سێی ناوەندییە خۆی هەفتەی جارێك ئەتان بینێت.
وادیاربوو گەلێك لە هاوڕێکانم بەشداربوون ئەوانیش: عەبدولی سۆران، حوسێنی مەلا حەکیم، فایەقی ڕەشید ئەفەندی، قالەی مەجید بەگ، کاوس قەفتان، گەلێکی کەش هەبوون پەیوەندییان لەگەڵ یەکێکی کە بوو.
بەم جۆرە نەخشەی کورد پەرستی لەدڵمانا چەسپی و هەفتەی جارێك بە ناوی دەرس خوێندنەوە کە شێخ سەعید(ماتماتیکمان) پێ دەڵێت، لە ماڵی یەکێکمان کۆ ئەبووینەوە.
گەیشتینە پۆلی یەکی ناوەندی. لە کۆبوونەوەیەکدا شێخ سەعید پێیی وتین: برایانی ئەزیزم وابەپشتی خوا، پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێکخرا ئێوەش ئەبن بەلایەنگر...
قالەی مەجید بەگ وتی : مامۆستا پارتی مانای چیە ؟
وتی پارتی بە هەمان زمان مانای حزبە، وردە وردە هەموو شتێکتان بۆ دەرئەکەوێت... پاش بەینێك، پرۆگرامی حزب بە چاپکراوی لە کتێبێکی بچووکی بەرگ سپی، بڵاوکرایەوە بەسەر ئەندامان و پاڵێوراوان و لایەنگراندا.
لە کۆبوونەوەیەکدا مامۆستا شیخ سەعید پێی وتین: لە هەفتەی داهاتوودا ئێوە پەیوەندیتان ئەبێت لەگەڵ کاك کەمالی حاجی شەفیق (کە ئێستا لە سلێمانی پارێزەرە)، ئەو کاتە پۆلی چواری دواناوەندی بوو. پەیوەندی پێوە کردین لەو کاتەدا لە ناوەندی و دواناوەندی، چاودێری پۆلەکان هەبوون و هەڵدەبژێردران، لە پۆلی یەکەوە هەتاکوو پۆلی پێنجەمی دواناوەندی، هەموو ساڵێك من هەڵدەبژێردرام بە چاودێر (موراقب).
ساڵی ١٩٥٢ لە سلێمانی دوو حزب هەبوون، یەکێکیان پارتی و ئەوی کەشیان تەحەڕوڕ (ڕزگاری)، لە زۆرترین خۆپیشاندان و مانگرتندا پێکەوە بووین هەمووشمان هاوڕێی یەکتربووین.
کاك کەمال لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە ماڵی خۆیان بوو کە ئەکەوتە پشت ئوتێلەکەی حەسیب ساڵح کە ئێستا پێی دەڵێن (سلێمانی پالاس)، وتی: وائێمە لەگەڵ حزبی تەحەڕوڕ (ڕزگاری) بڕیارماندا لیژنەیەك هەڵبژێرین لە ناوەندی و دواناوەندی بە ناوی"لیژنەی وتاردان و نواندن"هەر دوولا بەشداری تێدا بکەین، ئینجا ئاگاداری خۆتان بن کە سەرکەوتوو بن لەم لیژنەیەدا.
لە ڕۆژی دانراودا کە چووینە هۆڵی هەڵبژاردنەوە، مامۆستاکان ئەوانەی سەر پەرشتی پرۆسەی هەڵبژاردنەکەیان ئەکرد، زۆر پێیان ناخۆش بوو، بەڵام ئێمە یەك سەر، یەکە یەکە، ناوی خۆمان نووسی بۆ هەڵبژاردن، لەسەر تەختە نووسرا لەگەڵ ئەوانەی سەر بە ئێمە نەبوون.

**مامۆستا قادر دیلان دەوری هاملێتی وەرگرت**

هەڵبژاردن دەستی پێکرد و پاڵێوراوەکانی ئێمە کەژمارەمان (١٠) کەس بووین، هەموومان دەرچووین. ئینجا گەڕاین بە دوای چیرۆکێکا کە بگونجێت بیکرین و سوودی هەبێ، چیرۆکێکمان دۆزیەوە کەناوی"فی سبیل التاج"کە مستەفا لوتفی مەنفەلوتی لە فەرەنسییەوە کردبووی بە عەرەبی. ئەگەر چی ئەوانەی سەرپەرشتی چیرۆکەکەیان ئەکرد، زۆریان لێکردین کە چیرۆکەکە بەزمانی عەرەبی نمایش بکەین، وتمان ئێمە زمانی عەرەبیمان بێ هێزە هەر بە کوردی ئەیکەین، پاش گێرمە و کێشەیەکی زۆر، ڕازی بوون بە کوردی بکرێت، ئینجا مامۆستای بەرز و شاعیری بە ناوبانگ، ئەحمەد هەردی بە یارمەتی عومەری عارف، گۆڕیان بۆ کوردی بە شێوەی شانۆگەری لە ژێر ناوی"لەڕێی تاجی پاشایەتیدا"دوو سێ مانگ خەریکبووین، مامۆستا قادر دیلان دەوری هاملێتی وەرگرت. کچان نە ئەهاتنە سەر شانۆ بۆیە ناچار، کاك دارای تۆفیق ئەفەندی ڕازی بوو ڕۆڵی کچ ببینێت.
مامۆستا جەمال بەختیار وێنەکانی بۆ کێشاین، کاك عومەر عەزیز بەرگ درووی، پەردەکەی بۆ دروست کردین، مامۆستایەکی میسری کە پیاوێکی زۆر ڕووخۆش بوو ناوی (الفرید) بوو، ڕێکخستنی پەردە کرانەوە و پەردە داخستنی بۆ ڕێك هێناین... ئینجا شیعارێکی گەورەمان لە بەردەم شانۆکەوە هەڵواسی... (شانۆ قوتابخانەی گەلە).
ئێوارەی ڕۆژی ١٩٥٢/٣/٧، دەستکرا بە پێشکەشکردنی شانۆگەرییەکە، زۆر زۆر خەڵکی دەهاتن بە جۆرێك هەندێك لە تاقی پەنجەرەکان دائەنیشتن لە بەر بێ جێگایی ئەگەر چی هۆڵەکە زۆر زۆر گەورەش بوو.
زۆر چاك لە بیرمە کە دائیرەی ئەمنی ئەو کاتە کە پێیان ئەوت (التحقیقات الجنائیە)، کە بیستیان بەشەوان ئەبێت بە هوتاف کێشان و چەپڵە بازی وچیرۆکەکە خراوەتە شێوەیەکی سیاسییەوە، زۆریان پێ ناخۆش بوو، بەڵام چونکە بەرێك و پێکی ئیجازە وەرگیرابوو، نەیان ئەویست ڕایگرن، بۆیە بۆ بەیانی و بە مەبەستی گرفت دروستکردن، شەوێك دوو باوەڕ پێکراووی خۆیان نارد بە بێ بلیت هاتنە هۆڵەکەوە بۆ ئەوەی ڕاپۆرت بنووسن و ئیشەکەمان لێ تێك بدەن، کاتێك ئەوەمان زانی، کاك دکتۆر کەمال فوئاد بەیارمەتی هاوڕێکانمانەوە، بە پاڵ دەری کردنە دەرەوە... لیژنەکە وەکو لە لاپەرەی (١٦) گۆڤاری سلێمانی ژمارە (٣٠) ساڵی ٢٠٠٣ وێنەکەی بڵاوکراوەتەوە لە ٣/٢٨/ ١٩٥٢ گیراوە (لە گەڵ ئەم بابەتەدا

نمایش کراوە، نووسەر)، ئەوانەی وەستاون لە ڕاستەوە بۆ چەپ: کاوس قەفتان (د.کاوس قەفتان)، فوئاد مەجید، عبدوللا ئەحمەد جۆلا، فازڵ فەرەج، کەمال عەبدولکەریم فوئاد(د.کەمال فوئاد). ئەوانەی دانیشتوون لەڕاستەوە بۆ چەپ: حەمە شکور خەلیفە، جەمال ڕەمزی، محەمەد ئەحمەد، عومەر ئەحمەد ئەمەلی.

بۆ بەیانی بەڕێوەبەری دواناوەندی ئەو کاتە، موسا عەبدولسەمەد، کە خەڵکی هەولێر بوو، کوردێکی دڵسۆز بوو، ناردی بە شوێنمانا و وتی: بۆچی خۆتان تووشی ئازاردان دەکەن، وابە هەر جۆرێك بوو ئیجازەتان بۆ وەرگیرا، ئیتر بۆچی دوێنی ئەو دوو کەسەی لەلایەن (تەحقیقاتەوە) هاتوون، بەپاڵە پەستۆ دەرتان کردوونەتە دەرەوەی هۆڵەکە، کاك دکتۆر کەمال فوئاد وتی: مامۆستا هەردووکیان سەرخۆش بوون بە زۆر دەرگای هۆڵەکەیان کردبۆوەو هاتبوونە ژوورەوە..بۆچی شار بێ ساحێبە ؟ مامۆستا موساش دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: باشە واز ناهێنن تاکو خۆتان تووشی گێرمەسەری ئەکەن، فەرموون وانادوویانە بە دواتانا بڕۆن بۆ (تەحقیقات)، کە چووین یەکێکی ڕەشی لچ ئەستوور دانیشتبوو، دوانی کەشی لە گەڵابوو وتی: دەفتەرەکانتان بێنن، دیاربوو هەندێ (بەیانیان) دۆزی بووەوە کە بەدەست نووسرابوو ئەیان ویست لە گەڵ دەست خەتەکانی ئێمەدا بەراوردیان بکەن بەڵکوو شتێکمان لەسەر بدۆزنەوە.. لە پاشان شانۆ گەرییەکە ڕاگیرا.

*** مامۆستا برایم ئەحمەد وتی: کوا حەمە شوکر خەلیفە ؟**

ڕۆژێك لە گردبوونەوەیەکدا لە ماڵی عەبدولی سۆران بووین، کاك کەمالی حاجی شەفیق کە بەرپرسمان بوو پێی وتین: بەیانی سەر لە ئێوارە خۆپیشاندانێکی زۆر زۆر گەورە ئەکرێت هەموو دانیشتووانی شاری سلێمانی تێیدا بەشدار ئەبن، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە ئەکرێت، کەداوا بکرێت لە کاربەدەستان ئەو ئەفسەرە کوردانەی لەگەڵ سەرۆك بارزانی پێشمەرگەبوون و لە ئێران گیران و درانەوە دەست عێراق، لەسێدارە نەدرێن، لە کاتی دانراوا، هەموو شاری سلێمانی بە گەنج و پیر و ژن و پیاوەوە، کەوتنە خۆپیشاندان ڕووبەڕووی ماڵی موتەسەڕیف.

خوالێخۆشبوو مامۆستا برایم ئەحمەد پێشەنگی خۆپیشاندانەکەی ئەکرد، گەیشتینە بەر ماڵی موتەسەڕیف، کە ئەوکات شێخ حەسەن تاڵەبانی بوو، پۆلیس دەرگاکانی داخستبوو، سالح چاووش هاتەپێشەوە بۆلای مامۆستا برایم ئەحمەد و پێی وت: گەورەم دەستووپێت ماچ دەکەم ڕێگای ئەوە مەدە دەرگا بشکێنن و خوێن بڕژێ، مامۆستا برایم وتی: کوا حەمە شکور خەلیفە بابێت، ئەو خزمی موتەسەڕیف شێخ حەسەنە، هەڵی ببڕن لە دیوارەکەی پشتەوە بچێت نووسراوەکە (کە هەزاران ئیمزای پێوە بوو) بدات بە موتەسەڕیف.

لە دیواری پشتەوە هەڵیان بڕیم، خۆم فڕێ دایە ناو باخەکەوە چونکە دیوارەکە بەرزبوو زۆر ئازارم گەیشت، بەڵام هیچ جێگەیەکم نەشکا، وردە وردە چووم بۆ بەر هەیوانەکە، ڕوانیم شێخ حەسەن لە سەر ئەرزی لێواری هەیوانەکە دانیشتووە، سەری هەڵبڕی و وتی ئەوە لە کوێ وە هاتیت، کوت و پڕ نووسراوەکەم دایە دەستی خوێندیەوە، وتی: قوڕم بە سەر چی بکەم، من چیم دەسەڵاتە ؟، پێشم کەوت و دەرگاکان کرانەوە، مامۆستا برایم ئەحمەد و پیاوە گەورەکانی سلێمانی کە لەپێش خۆپیشاندانەکەوە بوون هاتنە پێشەوەو، شێخ حەسەن وتی: برا ئازیزەکانم منیش وەکو ئێوە جەرگم سووتاوە و ئاگری تێ بەربووە، بەڵام چیم پێ ئەکرێت ؟ لە نیوە شەوەوە ئەو تەلەفۆنەم بەرنەداوە لەگەڵ بەغدا قسە دەکەم، پیاوە دڵسۆزەکانی کورد لە بەغدا لە بەر دەرگای (بیلات) ڕاوەستاون بۆ گۆڕینی حوکمی ئیعدامیان، بەڵام بە داخەوە ئەڵێم: وا چواریان لێ ئیعدام کراوەو وا لاشەی سیانیان کە مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی و عەقید عەزیزە بەرەو سلێمانی هاتوون و شەهید خێروڵاش براوەتەوە بۆ هەولێر، ئەوانەی کەشیان حوکمەکانیان دەگۆڕن (نەقیب حەمە ئەمین دەربەند فەقەری و هاوڕێکانی)، ئیتر بە جارێك بوو بە شیوەن و گریان و هەموو بە جارێك بەرەو ڕووی قلیاسان کەوتینەڕێ، هەر بەڕێگاوە بووین، بوو بە ئێوارە لە دوورەوە تەرمی شەهیدان دەرکەوت، هاوارو گریان و هوتاف کێشان ئەگەیشتە ئاسمانی بەرز، تەرمەکانیان ڕاوەستان، مامۆستا فایەق بێکەس هاتە پێشەوەو دەستی خستە سەر تەرمەکان و وتی:

ڕۆژی گریان و ماتەمە
عالەم دڵی پڕ لە غەمە
ڕووی ئاسمان هەور و تەمە
بۆ جوانە مەرگانی وەتەن
وەتەن دەروونی لەت لەتە
گیراوی داوی میحنەتە
خەوو خۆراکی نەگبەتە
بۆ جوانە مەرگانی وەتەن
ئەوا شەهیدانی وەتەن
بە گشت تکاتان لێ ئەکەن
ئێمە شۆخێ بووین شۆخ و شەنگ
وابووین بە قووربانی وەتەن
خۆشە کە لەڕێگای وەتەن
ملیشمان بەپەتاکەن
ئەی لە مەزیاتر چی ئەکەن
لە جوانە مەرگانی وەتەن
ئەی بێ چووە شێرانی وەتەن
ژنێن ئێوە شیوەن مەکەن
بەجارێ گشت لە چەپڵە دەن
بۆ جوانە مەرگانی وەتەن
بلێن ئێوە قارەمانن
خاوەنی ناوو نیشانن
شەهیدی ڕێی کوردستانن
ئەی جوانە مەرگانی وەتەن

لەم کاتەدا مامۆستا عەبدولواحید کە مامۆستای سروود بوو، شیعرەکەی ئەنووسیەوە، دەست و برد، ئاوازێکی زۆر

غەمگینی بۆ ڕێکخست بە سروودێکی گریانەوە لە پێش تەرمەکانا ڕۆیشتین، تا گەیشتینە گردی سەیوان، فانۆس و لۆکس و چرای زۆر، ئەو ناوەی رووناک کردبووەوە.
تەرمەکان داگیران لە لێواری گۆڕەکان دانران، گەورە و بچووک ئەگریان، هەندێک ئەیان کێشا بە سەری خۆیانا، مامۆستا برایم ئەحمەد هاتە پێشەوەو وتی:
کوردی بێ کەس بەسیە هەستە
تێ پەڕی هەنگاوی خەو
ڕۆژی ئازادی ببینە
بانەمێنێ سامی شەو
خوێن بڕێژە لەش بنێژە
قەت مەچێژە تامی خەو
چونکە قوربانی ئەوێ
هەڵ هاتنی ڕووی مانگی نەو"

* حەمە شوکر، تۆ شاعیری ئەزانم هاوڕێی حەمەی برامی
ئینجا وتارێکی زۆر بە هێزی (بەبێ نووسینەوە) دەست پێکرد، بەڕاستی جەرگی هەمووانی هێنایە لەرزە، بە جارێک بوو بە چەپلە لێدان و هاوارو گریان هەتاکوو ئاسمانی هێنایە گریان، تنوک تنوک باران ئەباری، پاشان هەندێ وتاری دیکەش خوێندرایەوە و گەڕاینەوە، بۆ بەیانی ماتەمینێکی گەورەیان بۆ گێڕا زیاتر لە سێ ڕۆژ، پاش چەند ڕۆژێک ئەوانەی لە حوکمی ئیعدام گۆڕدرابوون بە (هەتا مردن) کە شەهیدی بەرز، کاک نوری ئەحمەد تەها لەگەڵیان بوو، هێنرایە حەپسخانەی سلێمانی، کە ئەکەوتە سەرووی جادەی خەستەخانەی گشتی، ڕێگەی ئەوەیان دابوو دوو هەفتە جارێک چاوپێکەوتنیان بکرێت، ئیتر ئێمەش ئەچووین بۆ لای بەم شێوەیە بوو، دەست و پێی لە زنجیری گەورەو زنجیرێکی قورسیش لە ملێوە هاتبۆوە خوارەوە بۆ ژێر هەردوو پێی، تۆپێکی ئاسنی گەورەی پێوە بوو بە جۆرێک زۆر بە قورسی ئەی توانی بجووڵێتەوە، کە دائەنیشتین زۆر بەڕووی خۆش پێی ئەوتین: ڕۆڵەکانم، براکانم ئەمە نیشانەی ئازادکردنی کوردستانە، لەم کاتەدا کە شیعرم ئەنووسی پێم وت:

هەزاری وەک تۆ ئازار ئەچێژێ
پێشمەرگەی کوردم خوێنی ئەڕژێ
دەرگای سەربەستی ناکرێتەوە
ئاڵای کوردستان ناشەکێتەوە

زۆر زۆری پێخۆش بوو، وتی حەمە شوکر، تۆ شاعیری ئەزانم هاوڕێی حەمەی برامی، هەموو جارێک بە یەکەوە شیعرتان ئەنووسی، ئەگەر ئەتوانی بۆمی بنووسەوە لای منالەکان دایبنێ، چونکە ئەیان دەهێشت قەڵەم و کاغەز بەرینە ژوورەوە.

* عومەر سدیق شاوەیس کە زۆر هاوڕێم بوو، لە کەس نەئەترسا لە خۆپیشاندانا.
ڕۆژێک لە کۆبوونەوەیەکدا، کاک کەمالی شەفیق کە لێپرسراومان بوو ووتی:"واتێوە بوون بە (پاڵێوراو)، مژدە بێت و پیرۆزباییتان لێ ئەکەم، ئینجا لە هەفتەی دواییدا من چونکە لە پۆلی پێنجەمی دواناوەندی دەرچووم ئەچم بۆ (کولیەی حقوق)، جەمالی برام (دکتۆر جەمال) ئەبێت بە لێپرسراوتان"، زۆرمان پێخۆش بوو یەکمان ماچکردوو بەخۆشی کۆبوونەوەکە دوایی هات.
بۆ هەفتەی دوایی، کاک جەمال وەری گرتین، ئەم بەپێچەوانەی کاک کەمال بوو، کاک کەمال هەمیشە پێی ئەوتین:"بە هیمەتی ئێش بکەن، خۆتان دوور خەنەوە لەشەڕوو ناکۆکی"، بەڵام کاک جەمال ئەیووت:"ئێمە لەسەر هەقین ئەگەر بەخۆشی کارمان بە سەرنەچوو ئەبێت بەزۆر بیکەین".
بەم جۆرە تێکۆشان پەرەی سەند و ڕۆژ بە ڕۆژ بە هێز و لایەنگر زیاتر ئەبوون، لە کۆبوونەوەدا کاک جەمال وتی: وا هەر یەکێک لە ئێوە چەند لایەنگرێکی بۆ دائەنرێت، ئێوەش واهەموو شتێک فێربوون لە ڕووی ڕێکخستنەوە، بەمنی وت: حەمە شکور تۆ ئەم برایانەت لە گەڵن، (نەریمانی جەلال بەگ، کەریمی مەلا مارف، فایەق ئەحمەد، مستەفای مەلا مارف)، هاوڕێکانی کەش، هەر یەکەی چەند کەسێکیان درا بە دەس، کاک جەمال وتی :"خۆتان پەیوەندییان پێوەبکەن ئاگاداریش کراون".
پاش بەینێک کاک جەمال پێی وتین:"وامن بەجێتان ئەهێڵم، سلێمانی مەجید بەگ وەرتان ئەگرێت"، بەم جۆرە لە تێکۆشاندابووین، ڕۆژێک عومەر سدیق شاوەیس کە زۆر هاوڕێم بوو، لە کەس نەئەترسا لە خۆپیشاندانا، پەلاماری پۆلیسەکانی ئەدا، گەلێک جار بەلێدانی داری پۆلیس زامدار بوو بە زۆر حەپس ئەکرا. پێی وتم:"حەمە شکور، (کاکە نوریم) پێی وتم: کە پێت بڵێم، وا لێپرسراومان بوو بە کاک نوری میرزا غەفوور، منیش هاتمە ڕێکخراوەکەی ئێوەوە".
کاک نوری میرزا غەفور خزمم بوو، بەهۆی مارەکردنی، ئاجیە خانی موفتی کە خزمین، پەیوەندیمان پێوەکرد، زۆر تێکۆشەر بوو بە هەموو لایەکدا بۆ پەرە سەندنی حزب هەوڵی ئەدا، خۆی و براکانی، کاک عەزیز و کاک قادر، هەموو خزمەکانی پارتی بوون، پەیوەندییەکی زۆری لەگەڵ عەقید عەتا حاجی کاکە حەمە هەبوو، کە ئەویش پەیوەندی بە ئەفسەرە کوردە پارتیە کانەوە، کە بەهۆی کاکمەوە، هەندێکیانم دەناسی، کاکم، عەبدولقادر خەلیفە و کاک نوری مەلا مارف و کاک محەمەد بیتۆشی، گەلێکی کەش، ئەم ئەفسەرانە، کاتی خۆشی لە حزبی هیوابوون.
کاک نوری لە کۆبوونەوەکاندا کە فەرمانی ئەداینێ، لە کۆبوونەوەی دواییدا، یەک یەک پرسیاری لێئەکردین، چیتانکرد تێکۆشان بۆ ڕزگاری کوردستان، بۆ چەند کەس باستان کردووەو چەند کەستان هێناوەتە ڕیزی پارتییەوە ؟.

*** عەرەبانەکەی عەلی فایز**

ئێوارەیەك لە بەر دەرگای ماڵی خۆمان کە لە سابوونکەران بوو، ماڵی ئێمە و ماڵی خوالێخۆشبوو، قازی شێخ ئەحمدی خاڵ ئاخرماڵ بوو، تەماشام کرد عەرەبانەکەی عەلی فایز لە بەردەرگامان وەستاو کاك نوری خۆی و سلێمانی مەجید بەگ، هاتنە خوارەوە، وتی: حەمە شکور دەرگا بکەرەوە، کە دەرگام کردەوە، سندوقێکی تەنەکەی گەورەیان داگرت و هێنایانە ژوورەوە بۆ باخەکەی پشتەوە کە زۆر گەورەبوو چاڵێکیان هەڵکەند (من خاکە نازم بۆ هێنان)، سندووقەکەیان خستە ئەم چاڵەوە و دایان پۆشی، پێی وتم: "کورە ئاگادار بە کەس ئەمە نەزانێت".

پاش مانگێک باوکی خێزانەکەی کاکم، (لیوا عەبدولقادر کە دەکاتە برای حاکم موعتەسم: نووسەر)، کە ناوی، نورەدین عەبدولسەمەد جەراح بوو"وەکیلی بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك"بوو"بەرپرسی دائیرەی التحقیقات الجنائیة"ش بوو، ئەوەش"دائیرەی ئەمنی مەنتیقەی شیمالی"بوو، ئەم پیاوە، ئەچێتە ماڵی مامم (واتە شێخ محەمەد باوکی حاکم موعتەسەم، نووسەر)، لە کەرکوك و بە مامم ئەڵێت:"خێرا یەکێك بنێرن بۆ سلێمانی، حەمە شکور لەگەڵ چەند کەسێکدا ناویان لە بەغداوە هاتووە سبەی کات ژمێر (دە) من لێرەوە لیژنەیەك ئەنێرم ماڵیان ئەپشکنن و تەحقیقاتیان لەگەڵ ئەکەن، زوو فریاکەون".

مامم دەست و برد، دەنێرێت بە شوێن حاجی ئەحمەدی پورزای دایکم کە ئەو کاتە (سەیارەی هەبوو) لەگەڵ حاجی سەعیدی پورزام بۆیان باس ئەکات، هەر بەو شەوە ئەیان نێرێت بۆ سلێمانی، سەر لە بەیانی هێشتا نانی بەیانیمان نەخواردبوو، لە دەرگادرا، کە دەرگامان کردەوە، حاجی ئەحمەد و حاجی سەعید هەردووکیان هاتنە ژوورەوە زۆر بە پەشۆکاوی، باوکم ئەو کات لە هەولێر بوو، دایکم چوو بە پیریانەوە و وتی: چیە خێرە بەم بەیانییە، حاجی سەعید وتی:"حەمە شکور درۆو دەلەسەمان لەگەڵ مەکە، هەرچیت کە پەیوەندی بە سیاسەتەوەیە، بماندەرێ بە گورجی بیسوتێنین چونکە ماڵەکە ئەپشکنن و ناوت لە بەغداوە هاتووە"، وتم وەڵا هەتا نەم بەن بۆ ماڵی کاك نوری میرزا غەفور بە سەیارەکەی خۆتان، هیچتان پێ ناڵێم، حاجی ئەحمەد وتي: وەرە لە گەڵمان بابڕۆین.

چوین بۆ ماڵی کاك نوری میرزا غەفور کە لە دەرگام دا، ناجیە خان دەرگای کردەوە وتی: ئەوە چیە بەم بەیانییە، وتم دادە گیان خێرا کاك نوری بانگ بکە، وتی بەخوا نوستووە، ئیتر خۆم چوومە ژوورەوە بە پەلە خەبەرم کردەوە و هەموو شتێکم بۆ باس کردو وتم سەعات (دە) لیژنەیەك لە تەحقیقاتەوە دێن ماڵمان ئەپشکنن، ئیتر بەپەلە خۆیشی نەگۆڕی لە گەڵمانا هات و کە چووینە ماڵەوە، بەپەلە چاڵەکەی هەڵدایەوە سندووقەکەی دەرهێنا وتی: کاکە گیان بم بە بۆلای ماڵی حەمەی ئەورەحمان ئاغا، کە لە پیاوە دەوڵەمەندەکان بوو خانوویەکی زۆر گەورەی هەبوو، پیاوەکانی لەبەر دەرگا دانیشتبوون، کاك نوری ڕۆژ باشی لێکردن لەپاشا وتی: سەردار بانگ بکەن هەندێك ئیشمان لە گەڵیدا هەیە، چوونکە خانووەکە زۆر گەورەبوو سەردار هەندێك دووا کەوت، کاك نوری هەر ئەهاتوو چوو، کاك سەردار هاتە دەرەوە، کاك نوری بۆی باسکرد، وتی ئێوە وردە وردە برۆن، من بە سەیارەکەی خۆمان دێم بە دواتانا، ڕۆیشتین، سەیارەیەکی فۆردی تازەیان هەبوو هات بە دوامانا لە نزیك مزگەوتی حاجی ئیحسان، کەوتە پێشان لە کۆڵانێکدا وەستاین سندووقەکەیان داگرت وتیان ئێوە برۆن، ئەمهێشت هیچ بسووتێنن ئەوەی هەم بوو لە سەیارەکەی حاجی ئەحمەد شاردمانەوە، ئەوان ڕۆیشتنەوە بۆ کەرکوك منیش چووم بۆ قوتابخانە.

سەعات (٩) بەرێوەبەرکە، وەك پێشتر ئاماژەم پێیدا، موسا عەبدولسەمەد، کە کوردێکی دڵسۆز و خەڵکی هەولێر و زاوای مامۆستا عەونی یوسف بوو، یەکێك بوو لە ئەندامە پێشکەوتووەکانی هەولێر، ناردی بە شوێنما، کە چوومە ژوورەکەی وتی: کورە بۆرەحەت دانانیشی، وا لە تەحقیقات داوایان کردووی، وتم ئامادەم، پاش هەندێك هاتن بە شوێنما لە پاسێك گەلێك لە هاوڕێکانی خۆمیان لەگەڵ بوو لە پارتی و لە تەحەڕور.

*** قازی شێخ ئەحمەدی خاڵ بوو بە کەفیلم**

چووینە گەرەکی خۆمان، لە ڕێگاوە موختار چاوەڕێی ئەکردین، لەگەڵ خۆیان هێنایان، چووینە ژوورەوە دەستیان کرد بە ماڵ پشکنین، یەکێکیان هەر ئەگەڕاو دەی وت: (مامعقولە) گەلێك گەڕان هیچیان نەدۆزیەوە، بردمانیان بۆلای بەرێوەبەری پۆلیسی سلێمانی، هەندێك قسەی پێوتین، ئینجا ئەوەی لە کەرکوکەوە هاتبوو لەگەڵ بەرێوەبەری پۆلیسی کەرکوك و مودیری تەحقیقات، تەلەفۆنی کرد وادیار بوو پێی وتبوو ئەوانەی کە هیچیان لە ماڵیان نەدۆزیوەتەوە کەفیلێکیان لێ بسێنن و لە (٢٤) سەعاتا سلێمانی بەجێ بهێڵن و بەبێ ڕەزامەندی بوونی ئێمەش نەگەڕێنەوە سلێمانی، وادیار بوو کە هاوڕێکانم پێیانزانی بوو، چونکە کەس هیچ لە ماڵیان نەدۆزرابوەوە، بۆیە لە هەموومان کە فیلیان وەرگرت، قازی شێخ ئەحمەدی خاڵ بوو بە کە فیلم، هەر ئەو ڕۆژە چووم بۆ کەرکوك بۆ ڕۆژی دواتر کاکم (لیوا عەبدولقادر برای حاکم موعتەسەم، نووسەر) چوو بۆ سلێمانی (شەهادەی گواستنەوەی بۆ هێنام بۆ کەرکوك.

*** بەرێوەبەری دواناوەندی کەرکوك، حوسێن سەعید بوو ئەویش خزمم بوو**

بەرێوەبەری دواناوەندی کەرکوك، حوسێن سەعید بوو ئەویش خزمم بوو دەوامم کرد، هاوڕێکانم لەوێ، کاك عیرفانی شێخ جەمیل و کاك نوری برای ئەمانیش تاڵەبانین و ماڵیان بەرامبەر ماڵی باپیرمە لە گەرەکی بەرتەکێ، من پەیوەندیم لەگەڵ هەڤاڵێکدا کە ناوی حەمید باتاس بوو، لە کۆڵانێکدا وەکو مەکتەبەیەکی بە کرێ گرتبوو، دەفتەرو قەڵەمی ئەفرۆشت چونکە گەلێ قوتابخانەی کور و کچ لەو کۆڵانە هەبوو، من لە کەرکوك لە ماڵی کاکم عەبدولقادر خەلیفە بووم

کە"ئامری هەندەسەی ئالی کارەبایی"بوو لە فیرقەی دووی کەرکوك، ماڵە کەشیان هەر لە مەعەسکەر بوو نزیك شەریکەی نەوت، بەیانیان بە سەیارە ئەی ناردم، ئێوارانیش ئەهاتن بە دواما بۆ ماڵەوە.

ڕۆژێك کاك حەمید باتاس گیرا زۆر شت لە مەکتەبەکەیدا کەوتە ژێر دەستیان بەهۆی هەڵاڵانەوە خەبەرم بۆ هات کەراکەم، بە کاکم وت بەرەحمەت بێت، زۆری پێخۆش بوو کە لە ڕیزی پارتیام، دەست و برد عەسکەرێکی لابوو (مراسل) کە ناوی سەید عەزیز بوو کورە عەشایەر بوو کاکم پێی وت: حەمە شوکر بەرە بۆ (گوێن) بۆ ماڵی باوکم (کە ئەو کاتە مودیر بوو لە گوێن)، ئیتر هەر ئەو ڕۆژە گەیشتمە گوێر، نزیکەی سێ مانگ لەوێ بووم، تاقی کردنەوەی سەری ساڵ نزیك بوەوە منیش پۆلی سێم، کاکم هەموو شتێکی بۆ جێبەجێکردم و هاتمە کەرکوك، هیچ نازانم و هیچم نەخوێندووە، پێی گوتم تۆ هەقت بە سەر هیچ نەبێت دەفتەری هاوڕێکانت وەرگرە بە شەوو بە ڕۆژ بخوێنە ئەوی تر لە سەر منە.

بە هەر جۆرێك بوو هەندێك خۆم ئامادەکرد و چوومە تاقیکردنەوە، ناجیح بووم، ئینجا ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، گەرامەوە سلێمانی، پۆلی چواری ئەدەبی، لەم کاتەدا کاك حەمە عەلی شەریف بوو بە لێپرسراوم، کاك حەمە عەلی زۆر تێکۆشەربوو لە هەموو کارێکدا ئاگادارمان بوو، کاك نەوزاد و ئازادی جەمیل سائیب لە ڕێکخراوەکە لە گەڵماندا بوو، لە پاشان کاك سەرداری میرزا عەبدولرەحمان و سەرداری حەمەی ئەحمەد ئاغا ئەوانیش هاتنە ڕیزی ئێمەوە، پۆلی چوارمان تەواو کرد بۆ پێنج، ئەم ساڵ ئەبێت خۆمان زۆر هیلاك بکەین کە ناجیح بین، لە یەکەم ڕۆژەوە دەستمان کرد بەخوێندنی باش، گەلێك جار کاك حەمە عەلی شەریف، مامۆستاکانی دواناوەندی (کوردەکان) بانگ ئەکرد کەوانەمان پێبلێن.

*** ئەختەر خانی خێزانی کاکە ڕەشۆڵ، گوللەیەك بەر سنگی کەوت و شەهید بوو**

ئەو ساڵە خۆپیشاندانی زۆر ئەکرا لە سلێمانی، لەیەکێك لە خۆپیشاندانەکاندا، ئەختەر خانی خێزانی کاکە ڕەشۆڵ، گوللەیەك بەر سەرسنگی کەوت و شەهید بوو. عەبدولی خەیات لە تەنیشتمەوە ئەویش گوللەیەك بەرشانی کەوت، ئیتر من و کەمالی غەفور لە گەڵ فایەقی ڕەشید ئەفەندی بە کۆڵ هەڵمان گرت بەپەلە نەزیفەکەی خوێنی زۆر زۆر بوو، ڕامان کرد بۆ جێگایەکی نزیك، ئەویش گەراجەکەی فەرەج ئەفەندی بوو کە ئەکەوتە بەرامبەر چاپخانەی (حەمە ڕەق) نزیك دائیرەی ئەوقاف، بە هەرچی جۆرێك بوو خۆمان گەیاندە ئەو گەراجە چوونکە هەموو لەشمان خوێن بوو وایان ئەزانی ئێمەش زامدارین، کە گەیشتینە ئەوێ، پۆلیسیش لە دوورەوە هەر بەدوامانا بوون، چووینە ژوورێکی بچووکی تاریکەوە کە لە قووژبنی گەراجەکە بوو، پۆلیسەکانیش هاتن لە بەر دەرگا و سەر دیوارەکان وەستان ئەیانزانی ئێمە لەوێن. دیواری ژوورەکە کە بەخشتی گڵ بوو، تاقێکی تێدابوو کونێکی تیابوو گوێمان لێبوو لەو دیوەوە خەریکی ڕووخاندنی ئەو تاقەن وامان زانی پۆلیسن، کاتێك تەماشامانکرد، کچانی دواناوەندی سلێمانی کە لەو دیوەوە بوو ئەوانن، زانیویانە کە ئێمە لەوێن چونکە لە خۆپیشاندانەکەدا لە گەڵماندا بوون.

بە هەرچی جۆرێك بوو دیواری تاقەکە ڕووخا، تەماشامان کرد، شوکریە خانی، خوشکی کەمال و گیلاس خانی بەهادین ئەفەندی کە هەردووکیان ئێستا ماون، لەگەڵ گەلێك کچی تردا تاقەکەیان ڕووخان، ئینجا هاتینە دەرەوە بۆ پشت ماڵی حەپسە خانی نەقیب چونکە ماڵی دکتۆر فارس لەوێ بوو، دکتور فارس موزەمید بوو پارتی بوو، هەموو جارێك دوای خۆپیشاندان، ئەگەر بریندار بوایە ئەو تیماری ئەکرد چونکە ئەگەر بچوایە بۆ نەخۆشخانە یەك سەر دەستگیر ئەکران.

کە چووینە ژوورەوە لە گەنجینەیەکدا لە سەر ئاگر، ئاوی گەرم کردبوو لەو لایشەوە قاپێکی سپی نیکل لە سەر چرایەك بوو بە ئسپرتۆ ئەسوتا گەلێك دەرزی پزیشکی تێدابوو ئەکولا، لە ناوتاقێکیشدا، گەلێك دەرمانی دانابوو هەندێك لە هاوڕێکانمان کە سەرشکاوو برینداربوون تەداوی ئەکردن کە چووینە ژوورەوە، برینەکەی عەبدولی چاوپێکەوت وتی: کاکە ئەمە پێویستی بە دکتۆرە، بیبەن بۆ ماڵی دکتۆر عەبدولرەحمان.

ئینجا بەچی ئەبرێت، ئەبێت سەیارەی بۆ بهێنین چونکە لە عەرەبانەدا دەرئەکەوێت، سەیارە لە سلێمانی زۆر کەم بوو، کەمالی غەفوور وتی: من ئەڕۆم سەیارەکەی باوکم دێنم، سەیارەکەش فۆرد بوو هی زەمانی ئینگلیزبوو، بە (هاندڵ) ئیشی ئەکرد، کەمال چوو سەیارەکەی هێنا بردمان بۆ ماڵی دکتۆر عەبدولرەحمان، کە چاوی پێکەوت وتی: بە پەلە بیبەن بۆ پۆلیس خانە لە دەرەوە ڕایگرن، (قالە سووری مفەوەز) سەر بە خۆمانە لەوێیە، تێی بگەیێنن بابڵێت لە سەر دارتوو کەوتووەتە خوارەوە شانی برینداربووە واخۆیشم ئەچم بۆ نەخۆشخانەکە، چوین قالە سوور لەوێ بوو، گەلێك جار ئیشی وەهای کردبوو دەست و برد، نووسراوێکی بۆ نووسین بۆ خەستەخانە، گەیاندمانە خەستەخانە هەر کەس گەڕایەوە ماڵی خۆی.

لەم کاتەدا باوکم بوو بە مودیری ئەوقافی هەولێر، لە وێ لە گەڕەکی تەیراوا لە نزیك مزگەوتی حاجی مەحمود عەلاف، خانوویەکی گەورەی گرتبوو، ماڵمان برد بۆ هەولێر ساڵی ١٩٥٧ شەهادەی گواستنەوەیان بۆ کردم بۆ دواناوەندی هەولێر، چووم بۆ لای کاکە حەمە عەلی شەریف وتی: تۆ بڕۆ لەوێ پەیوەندیت پێوە ئەکەن... هاتینە هەولێر دراوسێکانمان لای دەستە چەپ، کاك عەنتەر ناوی پیرداود بوو، بەڵام هەندە قەڵەوو بەهێز بوو، پێیان ئەوت عەنتەر، لای چەپیشمانەوە ماڵی کاك ئەحمەد نەجار بوو.

*** لە هەولێر باوکم زۆر نزیك بوو لە مامۆستا ڕەشادی موفتی**

لە هەولێر باوکم زۆر نزیك بوو لە مامۆستای خۆشەویست، کاك ڕەشادی موفتی، هەروەها لە کەسوکاری کاك محەمەد صائبی نەقشبەندی کە ئێستا ئەندامی ئەنجومەنی دادوەرانە لە بەغداد، گەلێك پێیان خۆش بوو کە ماڵمان برد بۆ هەولێر،

هەفتەی چەند جارێك ئێمە بەماڵ و منالەوە ئەچووینە ماڵیان، ئەوانیش ئەهاتنە ماڵمان. مامۆستا رەشاد ئەفەندی هەمیشە لەگەڵ باوکمدا بەیەکەوە بوون، گەلێك رۆژانی هەینیش باوکم ئەچوو بۆ خانەقا، لەوێ شێخ یوسفی مامی محەمەد سائیب، لە جێگای باوکی لەو دیوەخانە دائەنیشت.
باوکم لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ دواناوەندی کە تازە دروست کرابوو، ئێستا شوێنی ئەنجومەنی وەزیرانە، مودیرەکەمان مامۆستا عوسمان قۆجە قەساب، لە ئەشراف شاری هەولێر زۆر تێگەیشتوو ناسراوبوو، هەر ئەو رۆژە فەرمووی بادەوام بکات.
پاش چەند رۆژێك هاورێکانی خۆم ناسی، ئەوانەش کە زۆر نزیکبوون لێمەوە، محەمەد سائیب نەقشبەندی، شێخ کاکەرەش نەقشبەندی کە ئێستا سەرۆکی سەندیکای پارێزەرانی هەرێمی کوردستانە، کاك شەمسەدین موفتی، کاك نەجمەدین موفتی، شەهید مەئمون دەباغ، محەمەدی خدری پاشای دزەیی.

*** کاك موحسین دزەیی داوایکرد لیژنەیەك، پێکبێت بۆ پارە کۆکردنەوە بۆ لێقەوماوانی سلێمانی**

بەم جۆرە ناسرام و لەهەموو خۆپیشاندانێك و ئاهەنگی نیشتمانی خۆم ئەبووم بەعریفی ئاهەنگەکە و لەپێش خۆپیشاندانەکانیشدا ئەرۆیشتم و شیعرم ئەوت، لەم کاتەدا لافاوە گەورەکەی شاری سلێمانی روویدا لەهەموو لایەکەوە کەوتنە کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ لێقەماوانی شاری سلێمانی، کاك موحسین دزەیی کە ئێستا راوێژکارە لە سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان، ئەو کاتە پارێزەر بوو نووسینگەکەی بەرانبەر نادی موەزەفین بوو، داوای لە موتەسەریفیەت کرد، کە رێگای بدەن لیژنەیەك پێکبێت بۆ پارە کۆکردنەوە بۆ لێقەوماوانی سلێمانی، رێگادرا، لیژنەکە پێکهات بە سەرۆکایەتی کاك موحسین، رۆژی تایبەتی دانا و هەموو دەوڵەمەند و کاربەدەستانی هەولێر بانگکران و لە مەکتەبەی ئیدارەی محەلی کە ئەکەوتە ژێر قەڵا، کۆبوونەوە دەستی پێکرد.
پێش ئەوە کاك موحسین داوای لێکردم کە عەریفی کۆبوونەوەکەبم و شیعرێکی بە سۆزیش بنووسم، بەرامبەر بە میوانەکان وەستام و هەندێك باسی لافاوەکەی سلێمانیم کرد ئینجا شیعرەکەم خوێندەوە کە گەیشتمە ئەوەی ئەڵێم: هەی رۆ رۆڵە رۆ کوردستانم رۆ، شاری شیرین و جێی شێرانم رۆ، خوالێخۆشبوو خدری پاشای دزەیی لە پشتەوە بوو دەستیکرد بە گریان، ئیتر پارەیەکی زۆر کۆکرایەوە پێنووس و کاغەزم بە دەستەوەبوو ناوەکانم ئەخوێندەوە ئەو پارەیەی پێشکەشیان ئەکرد ئەم نووسی، پارە هەموو برا بۆ مەکتەبی کاك موحسین هەموو وەسڵی وەرگرتنی پارەیان بۆ ئەکرا، پاش چەند رۆژێك کاك موحسین ناردی بە دواما وتی: ئەگەر چی پارەکە زۆر باشە، بەلام ئەمەوێت لە هەموو لایەك زیاتر بێت، وتم گەورەم من دەستێکی باڵام هەیە لە وتاردان و شانۆگەریدا، لە ساڵی ١٩٥٢ لە شاری سلێمانی لەگەڵ هەڤاڵەکانما هەڵبژێرام و چیرۆکێکی شانۆگەریمان کرد، ئینجا ئەگەر ئەفەرمیت، ئەگەرێم بەزوو ترین کات، چیرۆکێکی عەرەبی ئەدۆزمەوە کە بگونجێت هەندێك دەستکاری بکرێت خۆم ئەیگۆرم بۆ کوردی و خۆم دەوری گەورە وەرئەگرم و خۆیشم دەری دێنم و لە سەر شانۆی دواناوەندی هەولێر لەژێر دروشمی:"شانۆ قوتابخانەی گەلە"، لێرەدا بە تیرێك دوو نیشان ئەشکێنین، یەکێکیان ئەوەیە کە هەتا ئێستا لە سەر ئەو شانۆ گەورەیە بەزمانی کوردی تەمسیل نەکراوە، ئەوی کەشیان، پارەیەکی باش کۆئەکەینەوە، هەروەها ئەتوانم چیرۆکەکە وەها بگۆرم بۆ کوردی وەدەست کارییەکی باشی بکەم، کە بگونجێ لەگەڵ تێکۆشانی کورد و کوردستان، زۆری پێخۆش بوو فەرمووی دەی کاکە بتبینم.

*** چوومە مەکتەبەکەی محەمەد رەسوڵ و چیرۆکی شانۆگەری شەهرەزادم پەسەند کرد**

هەر ئەو رۆژە چوومە مەکتەبەکەی محەمەد رەسوڵ گەلێك گەرام چیرۆکی شانۆگەری شەهرەزادم پەسەند کردو هێنام و دەست و برد کەوتمە گۆرینی بۆ کوردی لە رێکخراوەکەی خۆمدا هەڤاڵێکم لەگەڵ بووناوی کاك جەوهەر بوو، بەراستی جەوهەربوو، کوردێکی تێکۆشەرو خۆشنووسیش بوو، بانگم کرد یەك سەر ئەمگۆری بۆ کوردی، ئەویش بە خەتە جوانەکەی خۆی ئەی نووسی، گەلێك دەستکاریم کرد، بە هەفتەیەك تەواوم کرد، بردم بۆ کاك موحسین زۆر پەسەندی کرد و داوای لە موتەسەریفیەت کرد، کە رێگابدەن بەو چیرۆکە لەسەر شانۆی دواناوەندی هەولێر بکرێت.
پاش چەند رۆژێك لیژنەیەکیان پێك هێنا بە سەرۆکایەتی فوئاد ئەفەندی کە مەعاونی مودیری مەعارفی هەولێر بوو پاش (٣) رۆژ لە سەریان نووسی بەعەرەبی:"نوافق علی اجراء مسرحیة شهرزاد علی مسرح ثانویة اربیل دون زیادة او تحریف"ئیتر کەوتمە رێکخستن و دابەشکردنی ئەدوار بە سەر هەڤاڵان و رێکخستنی: شانۆ، جلو بەرگ، رووناکی، کەوالیس، مۆسیقا، سروودی نەتەوەیی، هەڵپەرکێ، لێرەدا تووشی کێشەیەك بووم، ئەویش کێ دەوری شەهرزاد وەرگرێت ؟ واخۆم دەوری مەلیك شەهرەیارم وەرگرت ؟ ئەی لە کوێ کچێك بدۆزمەوە دەوری شەهرەزاد وەربگرێت زۆر زەحمەتە ؟.
ژنان و کچانی شاری هەولێر ئەو عەیامە، هەموو بە پەچەو عەباوە دێنە دەرێ، چ کچێك ئەوێرێت ئەو دەورە وەرگرێت و بێتە سەر شانۆ ؟ کەس نیە! بە هەڤاڵانم وت: ئێمە ساڵی ١٩٥٢ لە سەر شانۆی دواناوەندی سلێمانی ئاهەنگی تەمسیلی"ڤی سبیل التاج"بە کوردی پێشاندرا دەوری کچ، دارای تۆفیق ئەفەندی وەریگرت کە دەوری ئۆفلیابوو، ئینجا با یەکێك بدۆزینەوە بۆ ئەم دەورە، کورێکی زۆر جوان کە ناوی کەمال حەمە ئەمین لە رێکخراو لەگەڵ خۆم بوو، پێم وت: بۆ ئەم دەورە وتی: براگیان من ئامادەم بۆ کورد و کوردستان ژیانی خۆم پێشکەش بکەم، بەلام ئەبێت کە سوکارم رازی بن، بۆ بەیانی هاتەوە وتی: باوکم و براکانم ئەڵێن: ئێمە ژیانی خۆشمان پێشکەش ئەکەین بۆ کوردستان.

*** مامۆستای ڕەسم فوئاد ئەفەندی**

دەورەکان دابەشکرا هەر کەسێك دەوری خۆی نووسی و کەوتینە تاقیکردنەوە وپرۆڤەکردن خۆیشم تەمسیلیەکەم دەرئەهێنا، لێرەدا مامۆستای ڕەسم کە ناوی فوئاد ئەفەندی بوو، هات بۆلام و وتی: کاکە حەمە من کە هەردەستت کرد بە ڕێکخستنی ئەم شانۆگەرییە ویستم یارمەتیت بدەم، بەڵام ئەو مودەریسەی کە لە بەغداوە ناردوویانە سیخوڕی تەحقیقات بوو ڕاپۆرتی لە سەرمان ئەنووسی، بۆیە نەم ئەوێرا لێتان نزیك ببمەوە، واشکور ئەقل بوو ئێستا ئەتوانم پێت بڵێم ئەم خاڵانەی خوارەوە کە زۆر زۆر پارەی ئەوێت لە سەر من بەبێ هیچ شتێك:

یەکەم: جلوبەرگی تەمسیل زۆر پارەی ئەوێت ئینجا من لە مەخزەن، جلو بەرگی تەمسیلم هەیە کە بەعەرەبی کرابوو بە تەواوی ئەگونجێت لەگەڵ شەهرەزاد، خوشکەکانم مەکینەی خەیاتیان هەیە، ئەیبەمەماڵەوە هەمووی چاك ئەکەم ئەوەی هەندێك دەستکاری بووێت جێبەجێی ئەکەین، هەموو جلەکانیش ئوتوو ئەکەین و بۆت ئەهێنمەوە، بێ ئەوەی فلسێك سەرف کەین.

دووەم: من دەرچووی (مەعهەدی فنونم)، فەرعی ڕەسم دەستێکی باڵام هەیە لە مکیاج، ئەوەش لە سەرمن.

سێیەم: گەلێك قوماشی سپی و ڕەنگاو ڕەنگم هەیە بەکار نەهاتوون، هەروەها هەموو جۆرە بۆیاغێك، کاك جەوهەر خەتاتە ئەتوانێت هەرچی پێویستە بۆ شیعارات بی نووسێ.

بەراستی کارێکی زۆر دڵخۆش بوو زۆر باری سووککردین، ئێوارە کە چووم بۆلای کاك موحسین بۆم گێڕایەوە، گەلێك دڵخۆش بوو هەموو شتێك ئامادەکرا ئینجا کە وتینە چاپکردنی (بیتاقە)، چووم بۆلای مامۆستای ئەمر خوالێخۆشبوو، گیو موکریانی کە چاپخانەی هەبوو لەژێر قەڵا بەرامبەر دائیرەی ئەوقاف، داوام لێکرد کە کە (٢٥) جلدی بیتاقەم بۆ چاپ بکات بەپێی ئەو نووسینەی کاك موحسین نووسیبووی وتی: کاکە حەمە خۆ من هیچتان لێناسێنم بۆ خزمەتی کوردە، بەڵام (٢٥) جلد بەش ناکات وتم: لام وایە هەر ئەوەندە ئەفرۆشرێت، بۆی چاپکردم بە دوو نووسخە، یەکێکی بۆ فرۆشتن،ئەوی کەشیان ئێواران ئەبران بۆلای کاك موحسین بەپێی ئەوە پارەمان دائەنا.

*** من خوشکم مامۆستای دواناوەندی کچانە**

یەکێك لە هەڤاڵەکان وتی: کاکە حەمە، من خوشکم مامۆستای دواناوەندی کچانە، ئەڵێت بیتاقەم بۆبێنن من بۆتانی ئەفرۆشم، ئافەرین خوشکە قوتابیانی کچانی هەولێر، هەر ئەو ڕۆژە دوو دەفتەر تەواو بوو، داوای دەفتەری زیاتریان کرد، بۆمان ناردن دابەشیان کرد بەسەر قوتابخانەکاندا، بەسێ ڕۆژ بیتاقە تەواو بوو چوومەوە لای مامۆستا گیو هەر لە دوورەوە وتی: ها کاکە حەمە بیتاقەی زیاترت ئەوێ ؟ وتم بەڵێ، وتی خۆم ئەمزانی بۆیە کلیشەکەم تێك نەداو پەنجا دەفتەری بۆ چاپکردین ئینجا بەتەواوی بەشی کرد.

ڕۆژی دانراو، مامۆستا موحسین بیتاقەی تایبەتی بۆ موتەسەریف و سەرۆکی دائیرەکان نارد، سێ ڕیزی پێشەوە لە هۆڵەکە بۆ ئەوان تەرخان کرابوون، ئیتر هۆڵەکە پڕبوو جێگا نەما هەندێك کەس لە سەر تاقی پەنجەرەکان دائەنیشتن، کاك موحسین وتارێکی خوێندەوە پەردە کرایەوە بە سرووودی"دەمی ڕاپەڕینە"بوو بە چەپڵە لێدان و هوتاف کێشان، سەرۆکی لیژنەی ڕێگەدانی شانۆگەرییەکە هەستایە سەرپێ و بەعەرەبی هاواری کرد: "انا لا اتحمل المسؤولية"، قاعەکەی بە جێهێشت و ڕایکردە دەرەوە.

دەست کرا بە پیشاندانی تەمسیلییەکە، زۆر بە جوان و هەموو لایەك پەسەندیان کرد هەفتەیەکی بۆ دانرابوو، بەڵام زۆرتر دەوامی کرد، داخستنی پەردەی تەواوبوون وکردنەوەی بە سرووودی :

تا دەس لە مل هیوا نەکەم، شەرتە نەنیشم قەد بە تاڵ
بۆلاوی تازەی قەومی کورد، ببمە نمونەی بێ میسال
هەوڵ و کۆششم لازمە، بۆخزمەتی هاومیللەتم
ڕوحێ لە ڕێگای میللەتا نەی بەخشم، ئەی نێمە چاڵ

بەم شێوەیە کۆتایی بە شانۆگەرییەکە هێنرا و پارەیەکی زۆر باش کۆکرایەوە و کاك موحسین لەگەڵ هەندێك پارێزەری تردا پارەکەیان برد بۆ سلێمانی.

کەوتینە خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەی سەری ساڵ، تاقیکرنەوەمان دا ناجیح بووین و چووین بۆ بەغدا، من و کاکەڕەش و محەمەد سائیب و شەهید مەئمون دەباغ و محەمەدی خدری پاشای دزەیی لە کۆلێجی حقوق وەرگیراین.

کە دەس کرا بەدەوام، بەرپرسمان کاك بابەکر پشدەری بوو، یەکەم کۆبوونەوەمان لە یانەی سەرکەوتن"نادي الارتقاء الكوردي"کە ئەکەوتە پشت"مەعهەد فنون جەمیلە"، کۆڵانەکەی بەرامبەر"بیلاتی مەلەکی"بوو کە دواتر بوو بە"مەجلیسی سیادە"کە چووین بۆ ئەوەێ، گەلێك لە هەڤاڵانی کەیشم چاو پێکەوت وەك: حەمید کاکە زیاد کە بەرپرسیان بوو، هەروەها خوشکە کوزیدە قەفتان.

* کە چوومە ژوورەوە، شەهید شەهاب نوری و مامۆستا زەبیحی وحەبیب فەیلی کەمال محێدین دانیشتبوون.

ڕێکخراوەکەی ئێمە وەك پێشتر ئاماژەم بە ناوی ئەندامانی و بەرپرسەکەیدا، پاش کۆبوونەوە، کارکردن بە سەرماندا دابەش کرا، منیان برد بۆ"شەقامی موتەنەبی"لە کۆڵانێکی تەسکا شوقەیەك گیرابوو لە قاتی دووەم بارەگای پارتی لەوێ بوو، کە چوومە ژوورەوە، شەهید شەهاب نوری و مامۆستا زەبیحی کە پێمان ئەوت"عولەما"وحەبیب فەیلی کەمال محێدین کە ئێستا بەپرسی پەیوەندییەکانی یەکێتیە لە بەغدا دانیشتبوون، بەخێر هاتنیان کردم، ئیتر هەر هاتوو چۆکردن و نووسراو هێنان و نووسراو بردن بوو، پاش هەندێك مەلا عەبدوڵڵا دوکەڵی"مەلا ماتۆڕ"هاتە بەردەمم (یەکمان ئەناسی) وتی: کاکە فەرموو وەرە لە گەڵما، هەر لە سەر ئەو جادەیە نزیك بە جادەی ڕەشید، لە قاتی دووەما شوقەیەکی گەورە هەبوو، ئەوە نووسینگەی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو، کە چوومە سەرەوە ئەی ناسیم لە سلێمانییەوە وتی: بەخێر بێت، دانیشتم چایان بۆ هێنام و ئینجا وتی: حەمە شکور تۆ لە سلێمانی کاری تابیعەت ئەکرد بۆ حزب

ئێستاش لێرە لە بەیانییەوە بەرپرسی تابیعەی، کە لە کولیە دەرچویت وەرە بۆ بارەگا هەرچی پێویست بوو بە تابیعەو ڕۆنیۆ تەبعی بکە، وتم: ئەمر ئەکەی گەورەم.

کەوتینە ئیشکردن، تابیعەکە زۆر کۆن بوو، ڕۆڵەکانی هەمووی کون کون بوو، ڕزی بوو کە"ستێت سلم"تەبع ئەکرد و ئەم خستە سەر ڕۆنیۆ، مەرەکەبەکەی لێئەهاتە دەرەوە وجوان نەئەخوێنرایەوە چەند جارێك داوام کرد بیگۆڕن بێ سوود بوو، ڕۆژێك کە تەبعم ئەکرد، دەست وپلم هەمووی ڕەش بوو، هاتن بە شوێنما وتیان بەپەلە وەرە مامۆستا برایم داوات ئەکات، کە چووم، ناهیدە خانی شێخ سەلام لای دانیشتبوو، فەرمووی:"حەمە شکور وا ڕزگارت بوو لەو تابیعە کۆنە و بڕیارماندا مەتبەعەیەکی گەورە بکڕین، هەندێك گرانە ئێمەیش ئەو پارەیەمان نییە، بۆیە تۆ لەگەڵ خووشکە (ناهی خان) لە بەیانییەوە دوای نیوەڕوان ئەچن بە ماڵە کوردە پاکەکانی بەغدا ئەگەڕێن و پارە کۆ ئەکەنەوە بۆکرینی مەتبەعە".

ڕۆژی دوای هاتم (ناهی خان) چاوەڕێی ئەکردم، کەوتینە گەڕان دنیا هاوین بوو زۆر گەرم بوو ناهی خانیش قەڵەو بوو، بەپێ یان عەرەبانە ئەڕۆیشتین، هەموو لەشی ئارەقەی لێ ئەتکا، پاش هەفتەیەك پارەیەکی زۆر کەممان کۆکردەوە، زۆرمان پێناخۆش بوو، ڕۆژێك کوردێکی دڵسۆز کە داوای لێ کردین هەتا مردن ناوی لای کەس نەبەین، وتی:"نەك وابزانن ئەترسم، من لە کەس ناترسم و نەترساوم، بەڵام خزمەتی قەومی خۆم ئەکەم نامەوێت کەس پێم بڵێت ئافەرین، هەروەها بەبرای خۆشەویستم کاکە برایمیش بڵێن، ئەمە بینی خۆمان بێت"، مەتبەعە کڕدرا و ئیتر کەوتینە ئیسراحەتەوە.

*** من لە نزیك برای تیکۆشەر و خۆشەویستم مام جەلال وەستابووم نزیك ئاوەکە بوو هێنامانە دواوە**

ڕۆژێکی هەینی سەر لە بەیانییەکەی لە چاپخانەبووم، هاتن بەدوامدا وتیان کۆبوونەوەمان هەیە، کە چوین بۆ جێگای کۆبوونەوەکە، مامۆستا برایم ئەحمەد هات و وتی:"خوشك و برایانی بەڕێز موژدە بێت موژدەبێت، وا سەرۆك بارزانی بەخۆی و هەموو برا بارزانییەکانەوە ئەگەڕێنەوە بۆ عێراق لە بەسرە دائەبەزن، ئینجا وائێمە جێگایان بۆ ئامادە دەکەین و ڕێکی ئەخەین کە بچین بە پیریانەوە ئێوەش بکەونە خۆتان"، ئیتر دەستکرا بە هوتاف کێشان و چەپڵە لێدان.

لە بەغدا ئەو کاتە باشترین ئوتێل، (ئوتێلی سەمیر ئەمیس)، بوو کە ئەکەوێتە کۆتایی شەقامی ڕەشید، ئەو ئوتێلەی بۆ حیجز کرا، ئیتر هەرچی پێیکرا بەرەو بەسرە ڕۆیشت، ئێمەیش بە قیتار ڕۆیشتین، کاتێك باخیرەکە گەیشت، بووبە ڕۆژی حەشر، سەرۆك لە قەراغی باخیرەکە وەستاو دەستی بەرز کردبۆوە، هەندێك هوتافیان ئەکێشا هەندێك ئەگریان هەندێك هاواریان ئەکرد بۆ کوردو کوردستان، ژنان هەڵهەلەیان لێ ئەدا، بەراستی تائەو ڕۆژەی ئەمرم، ئەو دیمەنانەم لە بیرناچێ، من لە نزیك برای تیکۆشەر و خۆشەویستم مام جەلال وەستابووم نزیك ئاوەکە بوو هێنامانە دواوە، سەرۆك بارزانی و وەفدەکەی هاورێی، بران پێم وایە بۆ (فندق شط العرب)، ئێمەیش بە قیتار گەڕاینەوە بەغدا.

هەموو لە گۆڕەپانە گەورەکەی بەرامبەر ئوتێلەکە وەستاین، سەرۆك گەیشتە بەغدا، ئەوەندە سەرۆك عەشایەر لە کوردو عەرەب و وەزیرە کۆنەکان و دڵسۆزان لە گەڵیابوون، ئەو ئوتێلە بەشی نەکرد، ئوتێلێکی کەشی بەرامبەر بوو ناوی"فندق حەکیم"بوو ئەویش گیرا هەر بەشی نەکرد، زۆر کەس لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە ئەوەستا، نەی ئەتوانی بگات بە سەرۆك.

مامۆستا برایم ئەحمەد لەگەڵ مامۆستا حەبیب محەمەدی کەریم فەیلی و چەند کەسێکی تر چوون بۆ لای عەبدولکەریم قاسم پێی وتن: خۆتان بگەڕێن کام جێگای حکومی بە تاڵتان دەست کەوت بیگرن، پاش گەڕان، خانووەکەی نوری سەعید کە بەرامبەر ئیزگەی بەغدا بوو لە ساڵحیە لە سەر ڕووباری دیجلە، زۆر گەورە و ڕێکوپێك بوو باخێکی گەورەشی لە بەردەمابوو جێگای هەزاران کەسی تیائەبوەوە، ئەو جێگایە تەرخان کرا بۆ سەرۆك بارزانی و بارزانییەکان بەراستی جێگایەکی چاك بوو، هۆڵەکە پڕ فەرش کرا هەموو جۆرە، کورسی و قەنەفە دانرا سەماوەرێکی زەردی ڕووسی زۆر گەورەیان هێنابوو، نیو بەرمیل ئاوی ئەگرت چایەکەیان ئەخستە قوماشێکی تەنکەوە ئەیان بەست و ئەخرایە ناو سەماوەرە کەوە، شەوو ڕۆژ چای ئەگێردرا بە سەر میوانەکاندا نیوەڕوانیش مەنجەڵی گەورەی خواردن دروست ئەکرا.

لە هەموو لایەکی عێراقەوە میوان ئەهاتن، لێرەدا کاربەدەستانی پارتی لە ناوەوەو دەرەوەی عێراقەوە گردبیونەوە، هەموو ڕۆژێك لە کۆبونەوەدابوون، هاتنە سەر هەڵبژاردنی سەرۆك و مەکتەب و لیژنەکان. خواڵیخۆشبوو بارزانی پێی وتن:"برایانی بەڕێز، ئەگەر ئەتانەوێت قیادەیەکی (قوتری) پێك بێت، ئەبێت نوێنەری هەموو لیواکان کۆببنەوە بۆ هەڵبژاردن، ئەگەر قیادەی (قەومیشتان) ئەوێت، دەبێت جواب بنێرن بۆ کوردانی ئێران و تورکیا و سوریا، لەم جێگایانە ڕێکخراومان هەیە ئەوانیش نوێنەری خۆیان بنێرن پاشان دەست بکرێت بە هەڵبژاردنی سەرۆك و فەرمووی: من وام لا باشە کە (قیادەکە قەومی) بێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا ئەبێت بنووسن بۆ ئەو جێگایانە کە نوێنەری خۆیان بنێرن، ئەمەش بە سووك و ئاسان ناکرێت چونکە ئەوانە بە نهێنی دێن و نامە بۆ ناردنی بانگکردنیان، هەندێك ئەرکی ئەوێت، کێ بە نهێنی ئەڕوات و ئەوانە بەبێ فیزە، بە نهێنی ئەبێ بێن؟ کێ ئەیان هێنێت و لە کوێ دایان ئەنێن ؟.

*** سەرۆکەکانیان، میوانی سەرۆك بارزانی بوون**

چونکە من لە ژوورەوە نەبووم، لام وایە هەڤاڵی تێکۆشەر مام جەلال، وتووبووی من شارەزایی ئەو جێگایانەم و ئامادەم هەموو شتێك جێبەجێبکەم، ئینجا نامە نێردرا و ئەو برایانە گەیشتنە بەغدا بە سەرۆکایەتی دکتۆر موراد و عەقید عەزیز و هەندێکی تریش بە جۆرێکی ڕێکوپێك، بە سەرماڵە دڵسۆزەکانی کوردی بەغدا دابەشکران و سەرۆکەکانیان، میوانی سەرۆك بارزانی بوون، ئامادەکاری کرا بۆ ڕۆژی

هەڵبژاردن هەموو كۆبوونەوە و پاش خوێندنەوەی وتاری سیاسی و ڕێكخستن لەلایەن هەندێك لە ئامادەبووانەوە، ڕاگەیەنرا ئەوەی ئەیەوێت خۆی بۆ هەڵبژاردن بپاڵێوێ یان یەكێك ئەیەوێت یەكێك بپاڵێوێت بۆ ئەم هەڵبژاردنە، فەرموو بابێتە بەرمایكرۆفۆنەكە.

سەرۆك بارزانی دەستوبرد هاتە بەر مایكرۆفۆنەكە، بەخێر هاتنی هەموو لایەكی كرد لە پاشان فەرمووی بەڕاستی ڕۆژێكی مێژوویییە، دەمێكە چاوەڕێی ئەم ڕۆژە پیرۆزە بووین كە نوێنەران لە هەموو كوردستانی گەورەدا وا كۆبینەوە.

هەندێك باسی تێكۆشانی كوردی كرد لە هەموو جێیەكی كوردستان كە بە هەزاران لە سێدارەدران و هەزاران شەهید بوون، پاشان وتی: برایانی بەڕێز، خۆم و باوك باپیرم هەر خزمەتكاری كوردبووین و گیانی خۆمان بەخت كردووە بۆ سەركەوتنی كوردستان. من پێشمەرگەیەكی كوردم خۆم تەرشیح ناكەم بۆ سەرۆكایەتی پارتی و ڕازی نابم هیچ كەسیش تەرشیحم بكات، لەم كاتەدا مامۆستا برایم ئەحمەد مایكرۆفۆنەكەی لە سەرۆك وەرگرت و فەرمووی خوشك و برایانی خۆشەویست، سەرۆك بارزانی ناتوانێت بڵێت خۆم تەرشیح ناكەم، نامەوێت كەس تەرشیحم بكات، سەرۆك بارزانی موڵكی خۆی نییە، ئەو نیشانەی بەرزی هەموو كوردێكە لە كوردستاندا، بەڕێزان وامن سەرۆك بارزانی تەرشیح دەكەم هەر كەسێكی دیكەش ئەیەوێت خۆی تەرشیح بكات، وامەیدان كراوەیە، لەم كاتەدا برای شیرینم، شێخ كاكەڕەش نەقشبەندی لە تەنیشتمەوە وەستابوو بە دەنگێكی بەرز هاواری كرد: بارزانی بارزانی بارزانی، ئیتر بەیەك دەنگ هاوارو هوتاف كێشرا: بارزانی بارزانی.

*** دكتۆر موراد هاتە بەر مایكرۆفۆنەكە**

لەپاش هەندێك، دكتۆر موراد هاتە بەر مایكرۆفۆنكەو وتی: خوشك و برایانی بەڕێز، بە ناوی خۆم و ئەو برایانەی لە پارچەكانی ترەوە لەگەڵما هاتوون، پیرۆزبایی لە سەرۆكی قارەمان، مەلا مستەفا بارزانی ئەكەم و هەتاكو پێنج دەقیقە ئەگەر كەس خۆی تەرشیح نەكرد یان تەرشیح نەكرا، وابەیەك دەنگ بارزانی ئەبێت بە سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان و هوتاف و هاوار بەردەوام بوو: بارزانی بارزانی، كاتەكە تەواو بوو، كەس نزیك مایكرۆفۆنەكە نەبوو، پاشان عەقید عەزیز هاواری كرد، لێت پیرۆز بێت دروشمی ڕێگای ڕزگاری كوردستان، لێت پیرۆز بێت كە هەموو لە كوردستاندا دوات كەوتووین بۆ ڕزگاری كردنی كورد و كوردستان و ئەم شیعرەشی خوێندەوە:

چۆن نەناڵێ دڵ بە حاڵی میللەتی مەحرومی كورد
چۆن نەگریی چاو بەخوێن بۆ تاڵعی شوومی كورد
سینە چۆن لەت لەت نەكەم بۆ عنصری مەحكومی كورد
لانەوازو بێ كەس و مەزڵومن ئێستا قەومی كورد
گابەدەس توركەوە ئاخ بەدەست ئێرانەوە

پاشان وتی:"ئەمە شیعری یەكێكە لە شاعیرە گەورەكانی كورد و وا دردەكەوێت كە سەدەهای ساڵە، هەر كورد ژێر چەپۆكی داگیركەران بووە، ئیتر سەرۆكی بەڕێز هەڤاڵی گەورەمان بارزانی، هەموو دوات ئەكەوین تاسەركەوتن".

*** عەبدولكەریم قاسم  هەمیشە ئەم جۆرە جێگایانە بەبێ چاودێری بەجێ ناهێڵێت،**

پاش ئەوە جێگا نەبوو كەس بگاتە سەرۆك بە مەبەستی پیرۆزبایی، بۆیە مامۆستا برایم ئەحمەد هەموومانی ڕیزكرد یەكە یەكە ئەچووینە خزمەت سەرۆك بارزانی، لێرەدا ئەبێت كۆنگرە ببەسترێت. ئەم كۆنگرەیە لە كوێ بگیرێت؟ گەلێك كەس لە لێپرسراوەكان بە نهێنی هاتوون.

خوالێخۆشبوو كاكە زیاد، چووە خزمەت سەرۆك بارزانی و فەرمووی:"سەرۆكی هێژا من ماڵم لە (وەزیرییە) خانووەكەم زۆر زۆر گەورەیە، سەردابێكم هەیەو زۆرپاكەو جێگای زیاتر لە پەنجا كەسی تێدا ئەبێت، باكۆنگرە لەوێ بگیرێت و هەموو پێداویستییەكیش ئامادە ئەكەم"، هەموو لایان پەسەند بوو.

ئێمەیان نارد بۆ ئامادەكردنی جێگاكە، عەقید محەمەد ئەمین دەربەند فەقەری لە پێشمانەوە بوو وتی:"برایان ئێستا ئەچین بۆ (وەزیرییە) كە جێگای دەوڵەمەند و بازرگانە گەورەكانی بەغداو و كاربەدەستان و وەزیرەكانی كۆن و نوێ عێراقە و هەمیشە چاوی ئەمن و ئیستخباراتی بە سەرەوەیە و زەعیم عەبدولكەریم قاسم، ئەم جۆرە جێگایانە بەبێ چاودێری بەجێ ناهێڵێت، ئینجا ئەم هەموو خەڵك و سەیارەیە كە دێنە بەرئەم ماڵە، هەروا ناشارێتەوە، بۆیە من وای بە چاك ئەزانم كە لە گەڕەكەكەدا بڵاوی بكەینەوە، كە قاڵەی كاكە زیاد ژن دێنێت ئەمانەش بەهۆی ئەوەوە كۆئەبنەوە !".

گەیشتینە ماڵی كاكە زیاد لە وەزیرییە، خوالێخۆشبوو كاكە زیاد لەگەڵ عەبدولقادر و كاك حەمیدی كوڕی و هەندێك كەسی دیكەش، وەستابوون هەروەها دكتۆرە پیرۆز، كە ئێستا ئەندامی پەرلەمانە و كچی كاكە زیادە، كە ئەو كات منداڵ بوو، لەگەڵیان وەستابوو، عەقید محەمەد بە كاكە زیادی وت:"ئێمە وامان داناوە كە لە گەڕەكەكە بڵاوبكرێتەوە، ژن بۆ كاكە عەبدولقادر ئەهێنین بۆیە ئەم كۆبوونەوەیە گەورەیە سازكراوە"، فەرمووی زۆرباشە هەر لە ئێستاوە بڵاوی ئەكەینەوە، ئیتر دەستكرا بەڕێكخستن و هەندێكیش لە باخە گەورەكەدا هەڵئەپەڕین، بەڕاستی هەموو دراوسێكان و دانیشتووی ئەو گەڕەكە، بڕوایان وابوو كە ژن بۆ كاكە قادر دێنن !.

لە ڕۆژی دانراودا، كاتژمێر نۆی بەیانی، لە سەردابەكە دەست كرا بە بەستنی كۆنگرە، ئێمە لە دەرەوە بووین ئاگامان لە گفتوگۆی كۆنگرەكە نەبوو.

*** مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا وتی: حەمە شكور وانییە، بەڵام باوابێ؟**

سەعات (١١) شەو تەواو بوو، خاڵەكانی كۆنگرە هەڵگیرا بۆلای سەرۆك بارزانی، ئینجا دەبێت بڕیارەكانی كۆنگرە بنێرین بۆ مەكتەبی سیاسی، ئەم كەسانە دانران كە بڕیارەكان بەرن بۆ مەكتەبی سیاسی كە شوێنەكەی لە جادەی موتەنەبی بوو: حەمە شكور خەلیفە، حەمید كاوانی، مەحمود كاوانی، محەمەد ئەمین دەربەند فەقەری، مەلا

عەبدوڵڵای دووکەڵی، کە پێیان ئەوت مەلا ماتۆڕ، چووینە بەر بارەگاکە بڕیار درا من و مەلا عەبدوڵڵا بڕیارەکان بەرین، کاتێك کە چووینە سەرەوە، مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا لەگەڵ شەهید شەهاب (دەبێت خوالێخۆشبوو کاك حەمە شکور مەخسەدی شەهید خاڵە شیهاب بێت، نووسەر) و هەندێك هەڤاڵان، دانیشتبوون مامۆستا هەمزە وتی: ها خێرە بەم شەوە درەنگە؟ مەلا عەبدوڵڵا وتی هاتووین بارەگا بشۆین! مامۆستا هەمزە زۆر دڵگیربوو وتی: مەلا عەبدوڵڵا بۆچی ئێمە پیسین؟ دەستوبرد وتم: مامۆستای بەرزو تێکۆشەر: ئێوە مامۆستای ئێمەن، ئێوە ئێمەتان فێری کوردایەتی و نیشتمان پەرستی کردو ئێوە ژیانی خۆتان تەرخان کردووە بۆ کوردو کوردستان، ئەوەی کاك عەبدوڵڵا وتی بۆ ئەوەیە، بەیانی سەرۆك بارزانی سەردانی ئەم بارەگایە ئەکات، ئێمەیان ناردووە کە بڕیارەکانی کۆنگرەتان بدەینێ و ئەگەر ڕێگامان بدەن دەست ئەکەین بەڕێکخستن و پاککردنەوەی؟ مامۆستا هەمزە فەرمووی: حەمە شکور وانییە، بەڵام باوابێ؟ بڕیارەکانی کۆنگرەی وەرگرت و بۆ مێژوو ئەیلێم، ماچی کردو خستییە سەرسەری و پاشان ڕووی کردە مەلا عەبدوڵڵا و وتی: مامۆستا ئەتوانیت بەیانی بێت و بارەگا بشۆین. بەم جۆرە گەراینەوە، ئیتر دەستکرا بە جێبەجێکردنی خاڵەکان و دابەشکردنی ئیش و کار.

ئەمە بەشی یەکەمە، ئەگەر نەمردم بەپشتی خوا بەشەکانی تریش ئەنووسم".

(دیارە کاك حەمە شکور هەر بەشی یەکەمی نووسیوەو مەرگ بواری نووسینی بەشەکانی تری نەداوە، نووسەر).

***هەڵگورد حاکم موعتەسەم شێخ محەمەد خەلیفە( ١٩٥٨- ).**

لە گەڕەکی (ئیمام قاسم)ی شاری کەرکوك لە ٢٨/ ٩/ ١٩٥٨ هاتووەتە دنیاوە و خوێندنی سەرەتایی لە خوێندنگەی ئیمام قاسم و هەردوو خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی لە زێوەر لە گەڕەکی ئەڵماس (خانزاد)ی هەمان شار تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٧٨ لە کۆلێجی پۆلیس لە بەغدا وەردەگیرێت (خولی ٣٠) و ماوەی مانگێك دەوام دەکات، بەڵام واز لە کۆلێژی ناوبرا دەهێنی بەهۆی فشارەکانی ڕژێمەوە بۆ ناچارکردنی بۆ پابەندبوون بە بەعسەوە.

پاش ئەوە و لە هەمان ساڵ، سەفەر دەکات بۆ بەریتانیا بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندنی باڵا لەسەر خەرجی خۆی و لە ساڵی ٧٩ لە (کۆلێژی سینلاك) کە ناوچەیەکە، کەوتووەتە باشووری لەندەنی پایتەخت، بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزی وەرگیرا و لە ساڵی(٨٠) پاش تەواوکردنی ئەو کۆرسەی زمان، لە (کۆلێژی بارنزلی) تەکنەلۆجی لە ناوچەی بارنزلی کە کەوتووەتە شارۆچکەی یورکشایر لە باکووری لەندەن، کە لە ئەنجامیدا کۆلێژی ناوبراوی تەواو کرد و بڕوانامەی (gce) لە (ماتریالی ئەندازەی مەدەنی) وەرگرت لە ساڵی ١٩٨٤.

* شەهید شوانی تەنسیق، بە سەیارەکەی خۆی دەریکردم لە هەمان ساڵدا، دەگەڕێتەوە بۆ عێراق بەهۆی فشارەکانی دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم لەسەر خێزانەکەی بە تایبەت باوکی، کە لەو سەردەمەدا یەکێك بووە لە کۆنترین دادوەرەکانی عێراق سەبارەت بەوە کاك هەڵگورد دەڵێت:

لە ٢٢/٤/ ١٩٨٤ دوای گەڕانەوەم لە بەریتانیا، حکومەت دەیزانی کە لە (کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان) کارم دەکرد، دائیرەی ئەمن بڕیاری گرتنی بۆ دەرکردم، بۆیە خۆم حەشاردا تا شەهید شوانی تەنسیق، بە سەیارەکەی خۆی دەری کردم بۆ ناوچە ڕزگار کراوەکان و منی دایە دەست کاك وەستا سابیر، ئەویش بردمی بۆ گوندی (ئۆمەر بەگ) کە دەواجنێکمان هەبوو لەوێ مامەوە زۆر هاوکاری پێشمەرگەکانی(تیپی٢١) و(تیپی٢٥)ی خاڵخاڵانم دەکرد و بەڕێزان: کاك سیروان کویخا نەجم و وەستا سابیر و کاك عەبدوڵڵا سیاسی و کاك سەربەست ناسراو بە (سەربەستە درێژ)، بە بەردەوامی سەردانیان دەکردم و بە هەموو جۆرێك هاوکاریانم دەکرد و چەندین جار، سوپاسنامەم بۆکرا لەلایەن شەهید مەلا ئاراس و خوالێخۆشبوو سابیر ڕەسوڵ سەرتیپی ٢١ی کەرکوك.

پاش ئەوەی نزیکەی دوو ساڵ لە سنووری ناوچە ئازادکراوەکانی ناحیەی شوان، وەك هێزی پشتگیری و هاوکاری پێشمەرگەکانی ئەو سنوورە دەمێنێتەوە، ڕۆژی ١٩٨٦/٣/٢٦ دەکەوێتە کەمینی مەفرەزە تایبەتەکانی ڕژێمەوە و لە ئەنجامیدا، بە برینداری دەستگیر دەکرێت و ڕەوانەی دادگای تایبەت دەکرێت کە بڕیاری لە (سێدارەدانی هەتا مردن بە گوولە)ی بۆ دەردەکات، لە بەرامبەر ئەم بڕیارەشدا، بنەماڵەکەی هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دەکەن بۆ ڕزگارکردنی تاقە کوڕە گەنجەکەیان لە مردن. ئەوە بوو لە ئەنجامی ئەوەدا، بڕیاری لە سێدارەدان گۆڕدرا بۆ زیندانی هەتایی و نزیکەی دووساڵ بە سەر دەبات و بە بڕیاری لێبوردنی گشتی ئەو کاتی ڕژێمی عێراق لە ئەیلولی ١٩٨٨، ئازاد دەکرێت.

*** پەیپەرەکانی حەمە شکور**

سەبارەت بەم باسە وەك پێشتر ئاماژەم بۆ کردووە، کاك حەمە شکور لەو چەند پەیپەرەی تایبەت بە کاك هەڵگورد و سەرو بەندی گرتنی نووسیوێتی:

بۆ برازای شیرینم کاکە هڵگورد، دەمێك بوو ئەم ویست موزەکەراتی ژیانی خۆم بە چەند فەسڵێك بنووسم، بەڵام چاوەڕێی ئەوە بووم کە بە جۆرێکی باش هەڵی بگریت و لە دەست نەچێت، ڕۆژێك یادی تۆ هاتە بیرم کە دڵنیام هیچ شتێك لای تۆ ون نابێت، ئینجا چونکە یەکە یەکە ڕووداوەکانی ژیانی خۆم ئەنووسم، باڕووداوێك بنووسم بەرامبەر تۆی خۆشەویست، کاتێك پێشمەرگە بوویت لە ناوچەی شوان بە نامەردانە لە نیوە شەوێکدا دوژمنی خوێن ڕێژ، دەستگیری کردیت، پاش ئازاردانێکی زۆر کە دانت بە هیچ نهێنییەکدا نەنا، هەواڵەی خوێن ڕێژەکانیان کردیت، کاتێکی زۆر بوو ئاگام لێت برابوو، شەوێك کاکم، باوکت، سەعات (١٢)ی شەو تەلەفۆنی بۆ کردم و ئەگریا وتی: حەمە شکور وا هەڵگورد حوکم دراوەو ئیعدامی ئەکەن لە محاویلی

حیلله، ئەو شەوە خەو لە چاوم نەکەوت، چی بکەم؟ چیم پێ ئەکرێت؟ چیم دەسەلاتە؟ ئەبێ چۆن هەروەها واز لە هەلگورد بێنم بدرێتە بەر گوولله‌ی ناپاك، نەخێر ئەبێت بە هەر جۆرێك بێت ببینم، بۆ بەیانی نانم پێ نەخورا، پوورت گەلاوێژ، وتی: دیارە شتێك رووی داوە بۆیە تێکچوویت، خۆم پێ نەگیرا دەستم کرد بە گریان، وتم کاکم ئەلێت هەلگورد ئیعدام ئەکەن، ئیتر هەموویان دەستیان کردە گریان.

*** چی بکەم ؟ چی بلێم ؟ چۆن هەلگورد ببینم !**

سەیارەم بۆ هات چووم بۆسەر ئیشم، کاتێك گەیشتمە جێگاکەم، راستەوخۆ بە مودیری مەکتەبەکەم وت: خێرا عەمید هەیسەم ئامر مەوقعی محاویل وەرگرە، کە بۆی وەرگرتم، پاش چاکو چۆنی پێم وت: ئەمەوێت بێم بۆلاتان وتی بەسەرچاو بێیت، رووەو محاویل کەوتمە رێ، هەر بیرم لەوە ئەکردەوە، چی بکەم؟ چی بلێم؟ چۆن هەلگورد ببینم!، کە گەیشتمە مەوقعەکە، بە شۆفێرەکەم وت: برۆ بۆ بەردەم دائیرەی بەلەدییە، کە چووین لە دوورەوە سەیارەکەیان دی هەموو هاتنە دەرەوە، بە مودیری بەلەدیەکەم وت: دانابەزم تەجاوزی (مەوقع) لەسەر ئەرزی بەلەدییە؟ کەچی وتی: گەورەم خۆت نازانیت لە وەزارەتەوە لیژنەیەکیان پێك هێناوە بە سەرۆکایەتی جەنابت، دوێنێ لە وەزارەت بووم، نوسخەیەکم وەرگرت، وتم برۆ بۆم بێنە، بۆی هێنام، ئینجا چووم بۆ مەوقع، عەمید هەیسەم لە تارمەکە وەستابوو چاوەرێی ئەکردم، گەلێك بەخێر هاتنی کردم، کە چوومە ژوورەکەی کە لە قاتی سەرەوە بوو چەند ئەفسەرێکی ئامادەکردبوو هاتن بە پیرمەوە، دانیشتم پاش هەندێك کیتابەکەم دایە دەستی، وتی: بەخوا کە تەلەفۆنت کرد زانیم بۆ ئەم ئیشەیە، خۆت ئەزانیت من کە تەجاوزم کردووەتە سەر زەوی بەلەدییە بۆ مالی خۆم نییە، بەلکوو قاعەم دروست کردووە بۆ سەربازەکان بەبلوك و سەقفەکەیشی چینکۆیە، هەر ئەبێت خۆت بۆم جێبەجێ بکەیت، تاقەتی ئەوەم نییە بەم تەمەنە بدرێم بە (مجلیس تەحقیقی)، هیچ وەلامم نەدایەوە، پاشان وتی: خۆت ئەزانیت عەسکەر سەعات (دە) نانی بەیانی ئەخوات، ئەبێت لەگەلمانا نان بخۆیت، وتم جارێك هەر خۆت وەرە لەگەلما بابرۆین قاعەکانم نیشاندە، هات لەگەلما بەپێی رۆیشتین، لە رێگا پێم وت: ئیشێکم هەیە پێت ئەلێم، بەلام ئەمەوێت تەنها خۆم و خۆت بیزانین، وتی: ئەمر ئەکەیت، وتم: برازاکەم کە ناوی هەلگوردە، لای ئێوە تەحقیقیان لە گەلکراوە، ئەزانم حوکمەکەی چییە و ئەتوانم ببینم؟ بەبزە خەنەیەکەوە باوەشی پێیاکردم وماچی کردم وتی: مزگێنی ئەوەی پێت ئەلێم ئەوەیە، ئەم مەسەلەی تەجاوزەمان بۆ جێبەجێ بکەیت، چونکە بە ئەمری من کراوە، وتم دە پێم بلێ مزگێنی چی؟ وتی: هەموویان عەفوو کران و ئەیان نێرینەوە بۆ وەحدەکانیان، ئیتر نازانم لە خۆشیا چیبکەم وتی: فەرموو بابرۆین نان بخۆین. ئینجا بۆت دێنم، وتم بەخوا تانەیبینم نان ناخۆم.

*** تۆیان بۆ هێنام چیم دی !**

وەرەقەیەکی دەرهێنا لە سەری نووسی، نەقیبێکی لاوەستابوو وەرەقەکەی دایە دەستی ئەویش رۆیشت، پاش هەندێك تۆیان بۆ هێنام چیم دی! پرچی سەرت، دەموو چاوتی داپۆشیبوو، ریش و سمێلت درێژ بووبوو، کەلوپەلەکەت، بەلەشتەوە نووسابوو لە چلك و ئارەقدا، کە چاوم پێ کەوتیت، باوەشم لێدایت، تۆیش دەستت ماچکردم، پاشان عەمید هەیسەم ئەفسەرێکی لەگەل ناردیت، پاش هەندێك هاتیتەوە، جوان تەراش کرابوویت و خۆت شۆری بوو جلی زۆر خاوێنت لە بەردابوو سەلامت کرد، ئامر پێی وتی دانیشە، پاش تۆزێك وتی: برۆ پاش چەند رۆژێك ئەینێرمەوە بۆ کەرکوك، پێشی وتی جگەرە ئەکێشیت؟ وتت نەخێر، وتم بەلێ جگەرە ئەکێشێت، بەلام لە شەرمی من وائەلێت، ناردی گلۆزێك جگەرەی سۆمەری بۆ هێنایت ئینجا پێی وتم: پاش دووڕۆژی دیکە، ئەیاننێرینەوە بۆ کەرکوك بۆ وەحدەکانیان و بۆ ئەوەی کە زۆر لە حەپسخانەی کەرکوك نەمێننەوە، پێویستە هەندێك هەولی بۆ بدەن لە کەرکوك کە لە جێگایەکی نزیك دای بنێن، وتم هەموو کەسووکارم لە کەرکوکە، باوکی حاکمە، بەلام لە ترسی ئێوە، کێ ئەتوانێت لێی نزیك بێتەوە؟ دەستی کرد بە پێکەنین، وتی هەروەکو من لە تۆ ئەترسێم، ئەبێت تەجاوزەکەم بۆ جێبەجێبکەیت، پاش نان خواردنی بەیانی، گەرامەوە شوێنی خۆم و خەبەریشم بە هەمووان گەیاند و پاش مودەتێك رزگارت بوو، لام وایە لە زەمبوور دایان نایت".

*** پریشکی را پەرین**

لەگەل گەیشتنی پریشکی راپەرینی بەهاری ١٩٩١ بۆ کەرکوك، کاك هەلگورد بەشدارییەکی کارا دەکات و ژمارەیەك لە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، سەردانی مالیان دەکەن و پاش شکستی راپەرینیش، بۆ ماوەیەکی زۆر بە ئیختیفایی لە کەرکوك دەمێنێتەوە و پاشان بۆ ماوەیەك هەتاکو پرۆسەی ئازادی، کاری ئازاد دەکات و لەگەل دەستپێکردنی پرۆسەی ئازادی عێراقیش، رۆلێکی کارا دەبینێت وەك کادرێکی(ی ن ك)ی ناسراوو شارەزا لە بواری پەیوەندییە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان و لێکگەیشتن لەگەل نەتەوەو پێکهاتەکانی شاری کەرکوك و هەتاکو ئێستاش ئەو کاروانە پڕ بەخششەی بەردوامە.

دیارە کاك هەلگورد وەك نووسەرو رووناکبیریش، چەندین وتارو لێکۆلینەوەی هەمە جۆری لە سالانی رابردوودا نووسیوەتەوە کە زۆربەیان تایبەتن بە مێژووی عێراق و شاری کەرکوك.

*** خەباتی سیاسی و فەرهەنگی لەگەل خوێندکارانی کورد لە ئینگلتەرا.**

سەبارەت بە خەباتی سیاسی و فەرهەنگی لەگەل خوێندکارانی کورد لە ئینگلتەرا لە کۆتایی هەفتاکان و سەرەتاکانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو کاك هەلگورد دەلێت:

"نووسینگەی AKSA)) کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان، لە ئەوروپا سەر بە یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کە یەکێك بووم لە ئەندامەکانی، ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو بۆ پشتگیری لە خەباتی گەلەکەمان دژی ڕژێمی بەعسی لەناوچوو کە لەو کاتەدا ئەو نووسینگەیە، لەلایەن کاك هۆمەری شێخ مووس ئەندامی مەکتەبی سیاسی(ی ن ك)ەوە سەرپەرشتی دەکرا و پاشان لەلایەن کاك عومەر دەبابەوە سەرپەرشتی دەکرا هەروەها مامۆستای نەمر برایم ئەحمەد، بە بەردەوام ڕێنمایی دەکردین و یەکێك بوو لە مەرجەعە گرنگەکانی کارو خەباتمان".

لێرەشدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەم کە دکتۆر بەرهەم ئەحمەد ساڵح، لەو کاتەدا یەکێك بوو لە ئەندامە دیارەکانی ئەو نووسینگەیە و داینەمۆی بووە بەهۆی ئەو لێوەشاوەییەی کە هەر لە سەرەتاکانی ژیانیدا لێی دەرکەوتووە، هەروەها ڕۆڵی بەرێزان: شێرزاد عەبدولقادر خەلیفە و سەرتیپ قادر ئاغا و سەرهەنگ قادر ئاغا و هتد... هەروەها کە سایەتییە ناسراوە سیاسی و زانستی و ئەدەبییەکانی تاراوگە وەك و مامۆستایان: تۆفیق وەهبی بەگ و محەمەد ڕەسوڵ هاوار سەردانیان دەکرد، ئەمە جگە لەوەی لە بۆنەکاندا لەگەڵ خێزانە کوردەکانی لەندەن کۆدەبووینەوە بۆ باسکردنی بارودۆخەکە و پاڵپشتی شۆڕشی نوێ و کۆکردنەوەی کۆمەك بۆ ئەو مەبەستەو ڕێکخستنی چەندین خۆپیشاندان بە هەماهەنگی لەگەڵ فیدراسیۆنە خوێندکارییە بیانییەکان لە لەندن دژی سیاسەتە شۆڤینییەکانی ڕژێم.

* یارمەتی دارایی و پزیشکی و کەلوپەل، بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

هەروەها لە چالاکییەکانی تر، هەڵسانی نووسینگەکە بە ناردنی یارمەتی دارایی و پزیشکی و کەلوپەل بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان بۆ درێژەپێدانی خەبات و ئاسانکاری بۆ خوێندکارە کوردەکان لە ئەوروپا لە ڕێگەی دۆزینەوەی زەمالات و مینحەی خوێندن بۆیان و لە ساڵی ١٩٨٢ گەورەترین خۆپیشاندانمان ڕێکخست لەگەڵ ڕێکخراوە بیانییەکاندا دژی ڕژێمی فاشی لە بەردەم باڵیۆزخانەی عێراق لە لەندەن بۆ ئیدانەکردنی سیاسەتەکانی ئەو ڕژێمە شیکردنەوەی بارودۆخی گەلی کوردستان بۆ خوێندکارە بیانییەکان و ئاگادار کردنەوەی (ڕێکخراوی ئەمنێستی نێودەولەتی) لە ڕێگەی ڕاپۆرت و بەڵگەنامە، لەسەر تاوانەکانی ڕژێم دەرهەق گەلی کوردستان و AKSA)) ئەلقەی بە یەك گەیشتنی، سەرکردایەتی و هەندێ پارتە بەریتانییەکان بوو، ئەوانەی پشتگیری دۆزی گەلەکەمانیان دەکرد بە تایبەتی (پارتی کرێکاران)".

بۆ زیندوو ڕاگرتنی کەلتوور و کەلەپووری کوردەواری لەوێ، پێشانگای هەمە جۆرمان ڕێکدەخست بۆ وێنە و هونەری شێوەکاری و نمایشکردنی دەستنووس و بەڵگەنامەکانی سەلماندنی کوردستانییەتی کەرکوك و ناوچەکانی ترو وێنەی شوێنەوارەکانی کوردستان".

بواری ڕاگەیاندنیش بایەخێکی گەورەی پێدەدرا لە نووسینگەکەمان و ڕۆژنامەیەکی مانگانەمان دەردەکرد ناومان نابوو (باڵیۆزی کوردستانی) جگە لە هەزارەها چاپکراوی جۆراوجۆر و بەلاغەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و بڵاوکراوەی تایبەت بە هۆشیارکردنەوە و پەردە هەڵماڵین لەسەر تاوانەکانی بەعس، بە کورتی، بارەگای کۆمەڵەی خوێندکاران لەو دەمەدا، وەك و باڵیۆزخانەیەك و پاڵپشتییەك وابوو بۆ گەلەکەمان لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات.

* گۆڤاری "چریکەی کوردستان".

هەروەها کاك هەڵگورد دەڵێت: "خوالێخۆشبووان، نووسەری گەورەی کوردو وەزیری پێشووی عێراق، تۆفیق وەهبی بەگ و مامۆستای گەورەی گەلەکەمان برایم ئەحمەد و شاعیری گەورە، محەمەد ڕەسوڵ هاوار و چەند نووسەرێکی تر، گۆڤارێکی وەرزیان دەرئەکرد بەناوی (چریکەی کوردستان) کە گۆڤارێکی گشتی وپڕ زانست بوو، چونکە ئەو کەڵە نووسەرانە بەشداربوون لە دەرکردنی، من خۆم چەندین جار، لە کۆڕو بۆنەکاندا، ئەم کەڵە نووسەرانەم ئەدی و دائەنیشتم لەگەڵیان بە تایبەتی مامۆستا برایم ئەحمەد کە هاوڕێی دێرینی باوکم بوو، چونکە لە کۆلێژ پێکەوە بوون و هەتاکو ئێستاش، ئەم چەند پارچە هۆنراوەیەی مامۆستام لە بیرە کە کاتی خۆی لە گۆڤاری (چریکەی کوردستان) دا بڵاوبووەوە و بەداخەوە هیچ نووسخەیەکی ئەو گۆڤارەم لە بەردەست نییە و هۆنراوەکەش بەم جۆرەیە:

سەدام کوردستان موڵکی تۆ نییە
نەهی ئەتاتۆرك نەخومەینی یە
مەلای لابەلا کوردی خستە داو
ئینگلیزیش ئێوەی لێکردین بە پیاو".

لە ساڵی ١٩٨٤ دا کاتێك تۆفیق وەهبی بەگ، کۆچی دوایی کرد، ئەم چەند پارچە هۆنراوەیە بەو بۆنەیەوە لە گۆڤارەکەدا بڵاوکرایەوە :

لاشەی هاتەوە بۆ سلێمانی
لە شاری لەندەن بەدەرچوو گیانی
دانەری وشەی ڕەسەنی کوردی
تۆفیق وەهبی بوو ئەی گەل بەووردی
ڕای سپاردبوو کۆچم کرد کاتێ
تەرمم بەرنەوە بۆ خۆ وڵاتێ
بم نێژن لەناو شاخ و دارستان
ئەوێم لاخۆشترە ببێ بە گۆڕستان
دەیبەین دەی نێژین لە پیرەمەگروون
پیری زمان زەرد ئاخ لە دەست گەردوون".

ئەم چەند پارچە هۆنراوەیەش کە تایبەت بوو بە چالاکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لە گۆڤارەکەدا بڵاوبووەوە:

هەزار تۆپ و کلاشنکۆف
نادەم بە شاخی پڕ لە لۆف
چونکە پشت و پەنای کوردە
ملی دوژمنی تیا ووردە

بە زمانی عەرەبیش و بۆ هەمان مەبەست، لە گۆڤارەکەدا، ئەم پارچە هۆنراوەیە بلاوبووەوە:
لن أهاب القنابل العنقودية
فأنا اليوم قد وعيت القضية
موقفي موقف الرجال
واني كوردي من امة كوردية
وكوردستان لها الخلود
وبالروح افدي جبالها السندسية
ومن العار ان تبقى كوردستان
تحت اقدام طغمة بعثية".

* حەزی شۆڕشگێری

سەبارەت بە حەز و حەماسەتەکانی لەو قۆناغەدا کاك هەڵگورد دەڵێت:
لە کاتی لاوێتیم، زۆر بە جۆش و پڕ حەماست و موتەتەریف بووم، حەزم لە ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان ئەکرد کە دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەران خەباتیان دەکرد، لەوانەی کە زۆر خولیایان بووم، (شۆڕشگێڕانی ڤیتکۆنگ) لە ڤێتنام، ڕێکخراوی (بادر ماینهۆف)ی ئەڵمانی، (ئالا سوورەکان)ی یابانی".

* ئاهەنگەکەی د. شڤان

لە ڕۆژەکانی مانگی یەکی ساڵی ١٩٨٢، کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات (لەندەن)، ئاهەنگێکی زۆر گەورەی ڕێکخست لە یەکێ لە هۆڵە گەورەکانی لەندەن، کە ناوی (ئەلبیرت هۆل) بوو لەو ئاهەنگەدا بۆ یەکەمجار، چاووم بە زۆر کەسایەتی کەوت و گۆرانی بێژی گەورە، شڤان پەروەر، کەوتە گۆرانی وتن بەسەر شۆڕش و پێشمەرگەدا و هەمووانی هێنایە جۆش و حەماسەت، لەو کەسایەتیانەی کە ئامادەی ئاهەنگەکە بوون، مامۆستا برایم ئەحمەد، کاك عومەر مستەفا دەبابە، دکتۆر شەفیق قەزاز، عامر عەبدوڵلا ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عێراق، عیزەدین قۆجە، لیوا ڕوکنی فرۆکەوان، عەساف جەریان، برازای سالح جەبری سەرۆك وەزیرانی سەردەمی پاشایەتی کەنەیارێکی سەرسەختی بەعس و دۆستی کورد بوو، هەروەها دەیان ئەفسەری تری گەورەی عێراق، کە نەیاری ڕژێم بوون لە هەموو تەوژمە سیاسییەکان لەوێ بوون، کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە و زۆربەیان لە داخ و غەریبیدا سەریان نایەوە و کەس باسیان ناکات".

چەمی زەنگنە، کەرکوك، ١٧ی ئابی ساڵی ١٩٣٩، چەند کەسێك لە خزمانی زەنگنە بەجلوبەرگی ڕەسەنی کوردەوارییەوە لە وێنەکەدا دەردەکەون، لە چەپەوە: مام سادقی باخەوان، وەهاب مل خڕ، عەبدولقادر محەمەد خەلیفە، تاهیر کوڕی مامی حاکم موعتەسەم و عەبدولقادر خەلیفە، باخەوان.

شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد خەلیفە، قایمقامی ناوەندی قەزای کەرکوك (١٩٤٠ – ١٩٤٤).

شێخ حەمە عەلی بەرنوێژی کۆمەڵێك نوێژکەر لە فەرمانبەران و زانایان و کەسایەتی لیوای هەولێر دەکات، دەشتی هەولێر، بەرواری ٢٣ی نیسانی ساڵی ١٩٥٤

وێنەیەکی دەگمەنی مێژووی لە بەرواری ١٩/١١/ ١٩٤٥ لەبەردەم سەرای سلێمانی گیراوە، تێیدا شێخ حەمە عەلی خەلیفە، بەڕێوەبەری ئەوقافی سلێمانی، یەکەم لای چەپەوە (جل و سدارە لەبەرە ڕەشەکە) دەرکەوتووە لەگەڵ کۆمەڵێکی تر لە کەسایەتییەکانی سلێمانی لەنێویاندا، شێخ مەحمودی حەفید.

شێخ حەمە عەلی لەگەڵ کوڕە تاقانەکەی (حەمە شکور)
ساڵی ١٩٤٩

لە ڕاستەوە: حاکم موعتەسەم، شێرزاد عەبدولقادر، نەوزاد عەبدولقادر، شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد خەلیفە، ساڵی ١٩٥٦ کەرکوك، گەڕەکی بەرتەکێ، باخچەی ماڵی بنەماڵەی حاکم موعتەسەم

لە ڕاستەوە، ڕاوەستاوەکان: خەلیل ئاغا، عەبدولقادر ئەسعەد بەڕێوەبەری مەعاریفی لیوای کەرکوك، سابیر عومەر حاجی ئەحمەد ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، حاکم موعتەسەم، شێخ ئەحمەد باتاسی، کەسایەتی کۆمەڵایەتی ئەرسەلان عەلی خالیدی.
دانیشتووان: عادل خەلیل ئاغا، فەرەیدون محەمەد خەلیفە و چەند میوانێك لە ناوچەکانی تری کوردستان.

الامور الذاتية

متصرفية لواء كركـــــوك

كتابكم المرقم ٣٦٠٠ والمؤرخ ١٢/١٢/٩٥٤
لما كان الحاكم السيد معتصم محمد خليفة الذي انيطت خدماته الى بلديـــة كركوك قد عين حاكما في محاكم العراق المدنية فهو والحالة هذه يملك السلطة الجزائية من الدرجة الثانية ويملك ممارستها دون حاجة لتخويله اياها من قبلنا وذلك عملا بأحكام المادة ٧٦ من قانون ذيل قانون اصول المحاكمات الجزائية رقم ٤٦ لسنة ١٩٣١ وعليه فله النظر بالقرار في كافة الدعاوى الناشئة عن تطبيق قوانين البلدية والانظمة الصادرة بموجبها والقوانين الصحية والانظمـــة الصادرة بموجبها وكذلك المخالفات الخاصة بها.

[illegible]
وزير العدليـــة

نسخة الى –
وزارة الداخلية – كتابكم المرقم ١٩٢٨٤ والمؤرخ ٢٠/١٢/٩٥٤
رئاسة محكمة استئناف كركوك
المحكمة الكبرى في كركـــوك

بەلگەنامەیەکی دەگمەنی ساڵی ١٩٥٤ تایبەت بە حاکم موعتەسەم کە لە بەغداوە ڕەوانەی موتەسەڕیفییەتی لیوای کەرکوك کراوە

ئەفسەرانی لیوای پاسەوانی پاشایەتی، کۆشکی ڕیحاب، بەغدا، ساڵی ١٩٥٥، لە ڕاستەوە: موقەدەمی ڕوکن عەبدولقادر محەمەد خەلیفە، موقەدەمی ڕوکن عەبدولجەبار سەبع ئەلعەبوسی، موقەدەمی ڕوکن عەبدولمونعیم حەمید

عەبدولقادر خەلیفە لەگەڵ ژمارەیەك لە ناسیاوانی لە ناوچەی زەنگنەی لە گەشتێکی ڕاودا، نزیك کەرکوك، ساڵی ١٩٣٩.

بارەگای وەزارتی بەرگری، ساڵی ١٩٦٤، لە ڕاستەوە عەقیدی ڕوکن عەبدولقادر خەلیفە ئامری مەوقعی بەغدا، لیوای ڕوکن زاهید محەمەد ساڵح فەرماندەی فیرقەی یەکەم، موقەدەمی ڕوکن محەمەد مەجید سکرتێری وەزیری بەرگری

لیژنەی"وتاردان و نواندن"لەڕاستەوە بۆ چەپ: د.کاوس قەفتان، فوئاد مەجید فەرەج، عەبدوڵڵا ئەحمەد جۆڵا، فازڵ فەرەج ئیسماعیل، کەمال عەبدولکەریم فوئاد(د.کەمال فوئاد).
ئەوانەی دانیشتوون لەڕاستەوە بۆ چەپ: حەمە شوکر خەلیفە، جەمال ڕەمزی، محەمەد ئەحمەد، عومەر ئەحمەد

کۆتایی سییەکانی سەدەی ڕابردوو، دەوروبەری کەرکوك، لە ڕاستەوە: ئەو منداڵەی، کە سڵاوی کردووە حەمە شکور خەلیفەیە، شێخ حەمە عەلی، لیوا عەبدولقادر، حاکم موعتەسەم، لیوا مستەفا عەلی کەرکوکی، کەسایەتی و مولکدار محەمەد نوری ئەمین، نەناسراوە

هۆڵی خولد لە بەغدا ساڵی ۱۹٦۷، حەمە شکور وەکیلی موتەسەڕیفی بەغدا لەنێوان دوو ئەفسەری پۆلیسدا.

کەرکوك، پردێ، ۱۹٥۱/۳/۹ ، تیپی تۆپی پێی سلێمانی
لە وێنەکەشدا، (حەمە شکور) سێیەمی دانیشتووان لە ڕاستەوە، ئالەتی کەمان دەژەنێ

بەغدا، ساڵی ١٩٦٥، وەزارەتی ناوخۆ، لەڕاستەوە: حەمە شکور وەکیلی موتەسەڕیفی بەغدا، ڕەشید موسڵیح وەزیری ناوخۆی عێراق، تاریق سەعید فەهمی موتەسەڕیفی بەغدا

هاوینەهەواری سەرچنار، ساڵی ١٩٥١، حەمە شکور، سێیەم لە ڕاستەوە، لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوپۆلەکانی ئەندامانی تیپی "وتاردان و نواندن".

*** پێگەی کەرکوک لە شاجوانی عێراقدا:-**

لەنێوان سالانی (١٩٤٧-٢٠١٥) بەناوی جۆراوجۆر و لە شێواز و کاتی جیاواز جیاوازدا، هەڵبژاردنی شاجوانی عێراق هەڵبژێردراوە، هەر یەکەی لە بارێکی دیار و نادیاردا، ڕۆڵی

ڕینیە دنکۆر، شاجوانی عێراق بۆ ساڵی ١٩٤٧

خۆیان هەبووە بۆ لەبەرچاوخستنی هەڵبژاردنی شاجواندا.
لەنێوان شاجوانی عێراقدا لە پارێزگاکانی عێراقیشدا ناوە ناوە شاجوانی ناوچەکان هەڵبژێردراوە کە هەر یەکەی دەرهاویشتەی بارودۆخی تایبەتی خۆیانن بۆ هەڵبژاردن، یان لە بارو ئاهەنگێکی دیاریکراودا دەست بۆ هەڵبژاردنی شاجوانیش براوە، یان بایەخی خۆی پێدراوە بۆ بەسەربردنی کاتی خۆش و دیاریکراو.
لە جیهانیشدا کە گەلێك جار ئاهەنگی شاجوانی سازکراوە عێراق و کوردستانیش بەشدارییان کردووە و کە ڕوویداوە سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە.
ئەوەی سەرنج دەدرێت کە هەڵبژاردنی شاجوانی عێراق لە ماوەی مێژووی هەڵبژاردنیدا بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و بەرنامەرێژ نەبوو، تا بەشێوەیەك ڕۆڵی خۆی ببینێت بۆیە هەر کاتێك بارودۆخەکە لەبار بووایە کار بۆ هەڵبژاردنی شاجوانی کراوە.
لە ساڵی ١٩٤٧دا (ڕینیە دنکۆر) وەکو شاجوانی بەغدا هەڵبژێردرا، کە ئەم ئاهەنگە لەلایەن بازرگانی دەولەمەندی جوولەکە (نەعیم دەنکۆر) ڕێکخراو بوو کە خاوەنی کارگەی (کۆکا کۆلا) بوو لە بەغدا، بەڵام ئەمە یەکەم شاجوانە بەناوی بەغداوە بووە نەوەکو عێراق.
لە ساڵی ١٩٧٢دا عێراق بەشداری شاجوانی نێو دەوڵەتی کرد لە (بۆیرتۆ ڕیکۆ) کە بە نوێنەری (وەجدان بورهانەددین سلێمان) کە ساڵێ پێشتر لوبنانی (جۆرجینا ڕەزق) خەڵاتی بردبۆوە، کە لەنێو (٦١) ئافرەتی عەرەبی تەنها ئافرەت بوو

شاجوانی عێراق بۆ ساڵی ١٩٦٣

بەشداری کردبوو، بەڵام دووریان خستەوە و (کیری وێلز)ی ئوسترالی خەڵاتەکەی بردەوە و بە ئەنجام نەگەیشت، بەڵام یانە کۆمەڵایەتییە جۆر بەجۆرەکان لەنێوان ساڵانی (١٩٧٢-٢٠١٣) گەلێك ئاهەنگی شاجوانی لە دەرەوە ڕێکخراوە لە ئوردن و کینیا و تورکیا، بەڵام لەنێو عێراقدا کاری بۆ نەکراوە.
لە ساڵی ١٩٧٤ لە بارێکی تایبەتیدا (سیلینا کۆهین) بە شاجوانی عێراق هەڵبژێردراوە، لە ساڵی ١٩٥٠ (کامیلا بارك) بە شاجوانی عێراق هەڵبژێردراوە.
لە ساڵی ٢٠١٥دا لە بەغدا هەڵبژاردنی شاجوانی هەڵبژێردرا کە (شەیما قاسم) کە خەڵکی کەرکوك بوو خەڵاتی شاجوانی بەدەستهێنا.
شەیما قاسم لە پێشبرکێیەکدا کە نۆ کچ بەشدارییان تێدا کرد بە شاجوانی عێراق بۆ ساڵی ٢٠١٦ هەڵبژێردرا کە پێشبرکێکە لە (١٠)ی ئەیلوولی (٢٠١٥) ڕاگەیەندرا، کە ئەمە یەکەم شاجوانییە لە ساڵی (١٩٧٢)ەوە کە لە بەغدا لەلایەن پێشبرکێی شاجوانی نێودەوڵەتییەوە دانی پێدادەنرێت کچە شاجوانەکەش خوێندکاری بەشی کارگێری و ئابووری زانکۆی کەرکووکە.
ئەوەی جێگەی باسە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە کەرکوك هەڵبژاردن کراوە بۆ شاجوان و سەماکردن، کە هەریەکە لە سەلوا مارگریت و شارلت سەرکیس بە باشترین شاجوان و سەماکەر دەرچوونە.

سیلڤیا کۆهین، شاجوانی عێراق بۆ ساڵی ١٩٧٤

ڕینیه دنکۆر، شاجوانی عێراق بۆ ساڵی ١٩٤٧

*** شیشانەکانی گەرمیان و کەرکوك:-**

پاش دوو سەدە، هەر لە ساڵی ١٨٦٣ی زایینی، بەهۆی رووسەکانەوە ئاوارەی کوردستان بوونە و بەشێکیان لە پارچەکانی تری عێراقیش نیشتەجێ بوون.
لە سنووری شارۆچکەی شارەبانی سەر بە پارێزگای دیالە، کە خاکی بەستنەوەی نێوان هەرێمی کوردستان و عێراقە، پارچە زەوییەك بەر لە ٢٠٠ ساڵ بووە گوندێکی تایبەت بە شیشانییەکان و تێیدا حەسانەوە تەنانەت لە سەردەمی رژێمی بەعسیشدا ژیانی ئاسایی خۆیان هەبوو، ناوی ئەو گوندەش گوندی (حەمیدییە) بوو، کە بەناوی سوڵتانی عوسمانییەوە ناونراوە، بەڵام لەدوایدا کردیانە گوندی شیشان.
بەپێی سەرچاوەکان ئەمانە لە ناوچەیەکدا ژیاون کە قەوقازی پێوتراوە لەو نێوەندەدا لەسەروبەندی شەڕی نێوان رووسیای قەیسەری و عوسمانییەکان لەلایەك لە ساڵی ١٨٦٣دا ئەو کات فەرەنسا و ئینگلیزەکانیش هاوکاری عوسمانییەکان بوون، شەڕی سەخت قەوما لەو نێوەندەدا رووسیای قەیسەری بە هۆکاری ئەوەی ئەمانە موسڵمانن، ئەمانەی بە هاوکاری عوسمانییەکان لە قەڵەم داوە، زۆربەیان لە شوێنی خۆیان دەرکردووە بۆیە زۆربەیان هەڵهاتوون بۆ لوبنان و سوریا و ئەردەن و وڵاتانی ئەوروپی هەندێکیشیان کە ژمارەیان ٤٤ ماڵبات بووە، روویانکردووەتە عێراق و لە سنووری شارۆچکەی شارەبان نیشتەجێ بوونە.
پێشتر تەنها بەزمانی ئەنگوشی قسەیان کردووە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات زمانەکەیان لەبیرچووەتەوە و ئێستا بە زمانی عەرەبی شێوەزاری دیالە و بەغدا قسە دەکەن.
لەکاتی خۆیدا پاش دەرکردنیان لەلایەن رووسیاوە بۆ ماوەیەك لە تورکیا ماونەتەوە، دواتر لە رێگەی فیشخابوور و موسڵەوە هاتوونەتە عێراقەوە.
دوای ماوەیەك بەشێك لە خێزانەکان چوونەتە حەویجە گوندێکیان ئاوەدانکردووەتەوە، بەڵام بەهۆی شەڕی داعشەوە ئەو گوندە تەخت بووە لەگەڵ زەویدا و خەڵکەکەی ئاوارە بوونە.
دوای سێ ساڵ لە رووخاندنی سەدام، لەلایەن هێزە توندرەوەکانەوە هێرش کراوەتە سەریان و ماڵ و مزگەوتەکانیان سووتێنرا، بۆیە چیتر توانای مانەوەیان نەماوە لە گوندە و پەرتەوازەی (کەلار) بوونە، لەنێو کەرکووکیش بەشێکی زۆری ئەم خێزانانە نیشتەجێ بوونە.

* سەرچاوە:-
- رۆژنامەی باس ٣٦٧، ٢٣ی کانوونی دووەم ٢٠١٨، جووتیار کەلاری.

*** چوارشەمبەر سووری - چوارشەممە سووری لە کەرکووك:-**

بۆنەیەکە لە بیروباوەڕە کۆنە ئارییاییەکانەوە ماوەتەوە لە دواییني چوارشەممەی بەر لە نەورۆزی بۆژژمێری هەتاوی ئەنجام دەدرێت، خەڵکەکە بەدڵخۆشی و جلی ئاڵ و واڵاوە بۆ سەیران چوونەتە دەوروبەری شار و ئاگریان کردووەتەوە و بازیان بەسەریدا داوە و بە ئاگرەکەیان وتووە: (سووریی تۆ بۆنی.. زەردەیی تۆ بۆنی!).
مامۆستا شاکر سابیر زابت دەڵێ: لەم بۆنەیەدا کەرکووکییەکان بۆ سەیران چوونەتە دەرەوەی شار بۆلای چوارباغ و مار یوسف و مەلا عەبدوڵڵا و سۆنەگۆلی و تسن و ئەو شوێنانە پڕ دەبوون لە خەڵك.
ئەوەی جێگەی باسە تا سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوو، ئەم ئاهەنگ و مەراسیمانە بەردەوام بوو، بەڵام لەگەڵ سەر هەڵدانی چڕی پرۆسەی تەعریب و دروستکردنی مۆڵگەی سەربازی خەڵکەکە لەو جۆرە ئاهەنگانە لە دەوروبەری کەرکووك دوور کەوتنەوە و شوێنەکان بوونە جێگەی سەربازی قەدەغە کراو.

* سەرچاوە:-
- ئەحمەد تاقانە، لەسەر سایتی فەیسبووك.

*** كەركوكی ساڵی ۱۹۳۲ و سوجادەكەی پێغەمبەری ئیسلام!**
**فریبا ستارك**
**وەرگێڕانی: سەربەرست كەركوكی**

ئەم كتێبەی كە بە ناونیشانی ( لەودیوی ئاوفورات)ەوەیە، كتێبێكی رۆژنامەنووسی گەشتیار (فریبا ستارك)ە.
Freya Stark : Beyond Euphrates, Century Publication Co Ltd ,1983
لە شاری لەندەن لە ۱۹۸۳ چاپكراوەتەوە. شایانی باسە یەكەم چاپی ئەم كتێبە لە سالی ۱۹۵۱ لەلایەن دەزگای چاپی (جۆن موڕای) كەوتبووە بازارەوە. كتێبەكە كە ۳٤۱ لاپەڕەیە، قەوارەكەی (۲۱،۵۰ سم بە ۱۳،۰۰ سم ) ە.
مسز ستارك، جگە لەم كتێبەی، چەندین كتێبی تری پەیامنێری و گەشتیاری بەم ناونیشانانەی خوارەوەی بلاوكردۆتەوە:
ئەم كتێبەی نوسەر، كە پێكهاتووە لە كۆی هەموو ئەو نامانەی لە ساڵانی ۱۹۲۸ەوە تا ۱۹۳۳ لە رۆژهەڵاتی ناوەراست و شوێنی ترەوە نوسیوویەتی و ناردوویەتی بۆ خزم و كەسوكارو ئاشنایانی خۆی، پێكهاتووە لەم بەشانەی خوارەوە:
- یەكەم گەشت ۱۹۲۸
- كەنەدا ۱۹۲۸-۱۹۲۹
- بەرەو بەغداد ۱۹۲۹
- لە ئێرانەوە ۱۹۲۹ - ۱۹۳۰
- رۆژنامەنووسیی لە بەغداوە ۱۹۳۲
- دوایین هەواڵی بەغداد ۱۹۳۳.

لە دێر زەمانەوە وەكو عادەتی رۆژنامەنووسی بەریتانی ، زۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە گەورەكان، هەفتانە یا مانگانە ریڤیو و پێداچوونەوەو كورتە شیكاریی كتێبی تازەی جۆراوجۆر پێشكەش دەكەن. لەو ساڵەی كە دووەم چاپی ئەم كتێبە كەوتە بازارەوە، زۆربەی رۆژنامە ناودارەكان شرۆڤەیان لەسەری پێشكەش بە خوێندەوارانی خۆیان كرد. رۆژنامەی (ئۆبزێرڤەر) بەم تایتڵەوە ناساندنی كتێبەكە پێشكەشكردبوو:( لەو دیوی ئاوفورات، ئەو كتێبەیە كە لە پاش خوێندنەوەیدا هەستی سوپاسگوزاری و سەرسوڕمانت بۆ بەجێدەهێڵێت). هەروەها هەفتەنامەی (صەندەی تایمز) بە خەتی درشت نوسیبووی كە :( پەسنی خەڵكان و وەسفی سروشت و ژیاری عیراق و ئیران لەم كتێبەدا، بە تێگەیشتنێكی سروشتیانەی بێ رتوش، ژیرانە هەڵسەنگێنراون) .
خاتوو ستاركی نوسەر، جگە لەوەی لەناو نوسەرانی ئینگلیزدا، یەكێ بووە لە خەڵكانی سەركەوتووی بواری نووسینی گەشتیاری، پەیامنێر و نوسەریش بووە لە رۆژنامە و گۆڤارە بە ناوبانگەكانی ئەو ساڵانەی بەریتانیا، وەكو:
The Cornhill, The Times, Spectator, Illustrated London News ......
هەروەها هەڵگری چەندین خەڵاتی نووسینی بەریتانی و جیهانی بووە.

*** كەركوك ۸ ئادار ۱۹۳۲ :**
ئێرە شارێكی بچووك و دڵگیرە، قەڵایەكی كۆنی لە ناوەڕاستە، كە بەندە بە پردێكی چەندین تاق و دەروازەوە. قەڵاكە؛ تەپۆڵكەیەكە بە چەندین بازاڕی پڕ هەرج و مەرج گۆڕێچەدراوە. ئەم بازارانە پڕن لە ئال و والایی جل و بەرگی كوردی و شەروالی دەڵبی توركی. لە دوورەوەش لە سێ لاوە شارەكە بە زنجیرە شاخ و گردەوە دەور دراوەو پڕە لە روانگەی سەوز و كێڵگەی تازە چەكەرەكردوو.
ئەم بەیانییە هەڵستام چووم بۆ تەماشای مزگەوت و كلیسەكان و شوێنی سوجادەی پێغەمبەر. لە پێشا تەلەفۆنم بۆ مەلا عەبدلقادر كرد؛ مەبەستم ئەو كەسەیە كە مستەر كوك دەربارەی نامەی بۆ نوسیبووم. ئەو بەرێزە بەرێوەبەری ئەوقافە. مرۆڤێكی زۆر خۆشرەفتارە. جەنابیان، پیرە نۆكەرێكی توركی عەمامە بەسەری لەگەڵمدا نارد، كە رێنماییم بكات بەرەو مزگەوتی گەورە، ئەو مزگەوتەی كە لەسەر قەڵایە. مزگەوتەكە لە سووچێكی بێ دەنگ و هێمن لە نێوان كوچەو ماڵاندایە. بە حەوشەیەكی پڕ لە دار پرتەقاڵی ناو ئینجانەی گەورە گەورە دەوردراوە. لەو لاوە مەیدانێكی رێكی هەیە لەگەڵ قەبرێكی زۆر رازاوە كە لە قەفەزێكی ئاسنیندایە. دەرگای دەرەوەی مزگەوتەكە، دەرگایەكی نزمە كە بە گەچكاری سوواخدراوە.

**وەكو دەڵێن**
لە مزگەوتەكەدا زۆر مەرمەری ساڤ موسڵی هەیە. كە لە داپۆشین و رازاندنەوەی دیوارەكاندا بەكارهێنراون. ناوەوەی مزگەوتەكە بە شێوازی كۆنە كۆشكی ئاشوورییان، بە پایە و دینگەی قۆقزی كەوانەیی، بە بەرزی ۷ فووت راگیراوە. لەو مزگەوتەدا مەزارگەی (نەبی حەنێن، عەزرا و دانیاڵ پێغەمبەر) هەیە. جوولەكەكان، لە جەژنی دانیاڵ پێغەمبەردا سەردانی ئەم مەزارە دەكەن. بەڵام مەسیحیەكان نایەن بۆ سەردانی ئەم مەزارە. كۆنە مزگەوتەكە، وەكو دەڵێن لە رابردوودا كلیسە بووە، مەزاری دانیاڵ پێغەمبەر بە قوماشێكی سەوزی بە رەنگی بێجی نەخشێنراو، داپۆشراوە. گۆڕی (حەنێن) لە پای مینبەرەكەدا جێگەیەكی باشتری دراوەتێ و بە گەجكاری سپی لەسەر رەنگی شین نەخشێنراوە.
كلیسەی ئاشورییەكان (مەبەستی كلدانەكانە) ، زۆر نزیكە، بینایەكی درێژكۆڵەیەو لە سەر ستوون (دینگە)ی نزمی بە سەوزی كاڵ بۆیەكراو، دروستكراوە. بەشی پێشەوەی بیناكە بۆ پیاوانەو پشتەوەشی بۆ ژنانە. شێوە پێپلكانەیەكی تێدایە بەرەو سەرخانێكی تایبەت بە كچان. لەم شارە دوو سەد خێزانی مەسیحی و نزیكەی هەمان ژمارەش خێزانی جوولەكە هەیە. هەندێ خێزانی (عەلی ئیلاهی) لە گوندەكانی دەوروبەری شار هەن و گروپێكی بچووكی ٤۰ نەفەریش كە سەر بە ئاینزای یەزیدین لەم شارەدا دەژین.
شوێنی خانووی سوجادەكەی موحەممەد، لە بەری ئەو بەری قەڵاكەیە. ئێمە بە سواری عەرەبانەی ئەسپ بە ناو بازارەكانەوە بۆی چووین، كە لە خوارو دەوروبەری قەڵاكەدان.

ئەو خانووانەی لە ڕۆخ و لە قەد قەڵادا دروستکراون، تەپۆلکەی قەڵاکەیان بەرزتر نمودکردووە. شێوەی هەڵۆیەك یا کۆلارەیەکی زەبەلاح ڕووەو ئاسمانی شین لە قورنەیەکی دیواری حەوشەی کڵێسەکەدا دەبینرێت.

*** شەقامەکەشی درێژەی هەبوو:**

بازارەکان شوێنی زۆر دڵگیرن، لە دوکانێکی بچووکدا کە پڕ لە ئینجانەو گۆزەو شەربەی سپی، خاکی و شین و سەوزە، لاوێك بە دیار دوکانەکەوە دانیشتووە و خەریکی قورئان خوێندن بوو. بە هێمنی و بەبێ ئەوەی سەرنجی ئەو رابکێشم، فۆتۆیەکم لێگرت. جیرانەکانی دوکاندارەکە ئەم کارەی منیان زۆر بەلاوە پێ خۆش بوو. بازارەکە لە شوێنی کۆتایی هات کە مەیدانی ژمارەیەك کاروانسەرا بوو. شەقامەکەشی درێژەی هەبوو تا دەگەیشتە دوو ڕێچکەی خۆڵاوی کە بە شوێنێکی پیس و پۆخڵ بەرەو خوار دەبوونەوە. ڕێچکەیەکی ناوەراستیش هەبوو، ئێمە ئەو ڕێچکەیەمان گرتە بەرو تا گەیشتین بە شوێنێکی فراوان و کراوەو .... قەبرستانێك، کە دروست لە قەڵایەکی دێرین دەچێت و لەگەڵ کۆمەڵێ خانووی بچووك بچووك. لەوێدا لە پشت پەرژینێکی کراوەدا، دەوردراو بە درەختی پرتەقاڵ و داری کالیپتۆس، قوللەی هێلانەیەکی لەقلەق و لە پشتی ئەوانەشدا تانکییەکی ئاو کە بە پایەی چیمەنتۆیی دەوری گیرابوو. ئەوێ خانووی سوجادەکە بوو.

*** سوجادەکە لەناو ئەو سەندوقەکەدایە :-**

شێخەکەی، پیرە موسڵمانێکی چاك بوو، دەموچاوێکی بچووك و ڕیشێکی قەڵەمکراوی هەبوو. عەمامەیەکی لەسەرنابوو. دیمەنێکی جوان و لەتیفی هەبوو. دانیشتبوو، لەسەر مێزە بچووکەکەی بەردەمی خەریکی نووسینی نامە بوو. دیاربوو کە بە داواکردنی تەماشاکردنی سوجادەکە قەڵس بوو. چونکە هەفتەیەك یا دوو هەفتە لەمەوپێش مستەر (هیچکۆك) هاتبوو پیشانی دابوو، لە حاڵەتێکدا ئەو سوجادەیە دەبێت تەنیا لە جەژناندا پیشانی جەماوەری بینەر بدرێت. هەرچۆنێ بێت شێخ ماڵئاوا نەرمی نواندو بردمی بۆ ژوورەکە؛ ژوورێکی زۆر سادە بوو، ئەرزێکی ڕووتەن لە ژێر قوبەیەکی شین باو. چەند سوجادەیەکی بچووك بچووك ڕاخرابوون. مێزێکیش هەبوو لە تەنیشت ئەو چەکمەچە دیوارییەی کە یادگارییە پیرۆزەکەی تێدا دانرابوو. دەرگاکانی چەکمەچەکە تەختەی ئاوێنەبەند بوون. چەکمەچەکە بە قفڵێکی سەوزی ئاسنین کلۆم درابوو. کاتێ دوو دەرگاکەی دەکرێنەوە، مرۆڤ سەندوقێکی سووری مس تێگیراو دەبینێت. سەندوقەکە بە لیفەیەکەوە پێچراو و بەستراوەتەوە. سوجادەکە لەناو ئەو سەندوقەکەدایە، لە دەرەوەیدا بە بازەی سپی و لەناوەوەشی بە ئاورێشمی سپی پێچراوەتەوە، ئەوجا لەناو پارچە ئاورێشمێکی تۆختر و پاشانیش لەناو ڕووبەرێکی زیوین، سوجادە پیرۆزەکە شاردراوەتەوە. سوجادەیەکی کۆن، بە مووی حوشتر دروستکراو، کە بە دوو هێڵی تۆختری مووی مەڕ دەورتێگیراوبوو. سوجادەکە ئەوەندە کۆن بوو کە لە شوێنی لۆچەکانی بواردبووی و کونکون ببوو.

*** هیچ شتێکی تر نییە:**

موحەمەدی پێغەمبەر، ئەم سوجادەیەی داوە بە ئەبوبەکری خەلیفە، فامیلی ئەبوبەکریش هەتاکو (عەباسییەکان) هاتنە سەر حوکم، ئەو سوجادەیەیان لە دیمەشق گل دابۆوە، پاشان نەوەکانی ئەبوبەکر لە سیستان و لە شیراز بڵاوبوونەتەوە. ئەو سوجادەیەش – یا بەشێك لەو سوجادەیە بردراوە بۆ شیراز. لەوێوە هێناویانە بۆ کەرکوك و لەم شوێنە قایمکراوە؛ ئەمە ئەو سوجادە گرانبەهایەیە.

هیچ شتێکی تر نییە کە بگوترێت سەبارەت بە کاڵاو شتی بەجێماوی پێغەمبەری ئیسلام، جگە لە ئاڵایەك و سەعاتێك کە لە ئەستەنبوڵدا هەڵگیراون.

شێخە پیرەکە گوایە لە نەوەی ئەبوبەکرە، پشتێنی خەلیفەو کڵاوێکی بچووکیش کە هی نەوەیەکی تری خەلیفەیە، لە ژێر سوجادەکە هەڵگیراوە.

شێخە پیرەکەو کابرای ڕێنماییکارم، لە کاتی کردنەوەی سوجادە پیرۆزەکەو شتەکان، داخستن و گێڕاندنەوەیان ، لە ژێر لێوەوە هەر خەریکی خوێندنی ئایاتی قورئانی بوون. ئەوان قبوولیان نەکرد کە هیچ پارەو پاداشتێك وەربگرن، بەڵام کە من ناوی مستەر (کۆك) م هانی، بینیم زیاتر و زۆرتر نەرم و نیانیان لە گەڵمدا نواند، بەخۆشییەوە ماڵئاواییمان کردو ئیتر ڕۆیشتین. پێی ناچێت هیچ تۆریستێ، شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بەم سوجادەیە بزانێت و بیەوێت بیبینێت.

لە نزیکی ئەو شوێنە پیرۆزەدا، کلیسەیەکی دیانەکان لە شوینێکی دێرینی سەر تەپۆلکەیەك دروستکراوە. لەو شوێنەدا لە دێر زەمانێکدا جارێك دیانەکان قەتڵوعام (جینۆساید. س،ك) کراون؛ شوێنەکە پێی دەگوترێت (تەهماسیاب) بەڵام ئەوان دەڵێن لەوێ هیچ شتێك نییە لەو کڵێسایە زیاتر، بۆیە من نەچوومە سەردانی.

دوێنێ دیمەنێکی زۆر دڵشام بینی؛ خۆشی بینینی بیرەنەوت: لەوێدا زۆربەی نەوتە خاوەکە بە فیرۆ دەسوتێت. دوو بۆری نەوتی لێیە کە دەبێت ڕۆژانە ٥٠ هەزار بەرمیل نەوتی خاوی بەرهەمهێنراوی پێیدا بڕوات. نێڵەی ئاگر لە دوو لوولەوە بەرەو ئاسمان بە توندی هەڵدەکشێن و بە تەن شاڵاوی هوروژمی گڕ بەرز دەکەنەوە. مرۆڤ لە دووریی ٣٠٠ یاردەشەوە هەست بە گەرمیەکی تاقەتفەرسا دەکات. نێڵەی گڕەکە نزیکەی ١٥٠ بۆ ٢٠٠ فووت بەرز هەڵدەکشێ. گڕەکە بە پرتاوی ڕەنگێکی زەردی تۆخەوە بەرزدەبووەوە. لەلایەکەوە، لوولەی تەلخ و تۆخی دوکەڵ کە زۆر بەرز دەبووەوە، یەکسەرە لە ئاگرەکە جوێ دەبووەوە. لەلایەکی ترەوە وەکو شیری تازە، یا وەکو بەفری هەرەسی تازە، نەرم و چەور شەپۆلی دەدا. بەڵێ ئەو ئاگرە بە شاڵاوە کە بە چینێك لوولە دوکەڵ پێچراوبوو، لە دارستانێکی بێگەڵاو بێ گەردی بناری شاخێ دەچوو. تاوناتاو سێبەری زەبەلاحی دوکەڵی ڕەش، ڕووناکی گڕەکەیان دەشاردەوەو، هەمە ڕەنگییەکی وەك دوو سێبەری دروستکردبوو؛ سێبەری شاڵاوی بەرزی شەپۆلی ئاگر ، دژ بە سێبەرێکی تەلخی ڕەنگ شین کە بە

چواردەوری شالاوی ئاگرەکەوە بوو. ڕووناکییەکی تۆخیش لەناو گۆلاوە نەوتەکەی سەر زەوی پای ئەو بیرە نەوتەی ئاگرەکەی لێهەڵدەستا، دەبزوا و شەپۆلی دەدا.

**گێلکەکانیان دەکوژێت و لەناوی دەبات:-**

لەناو ئەو دەشتە چۆڵ و ئارامەدا، دیمەنێکی زۆر شرینتر دەبینرا؛ بە تایبەتی کە ڕووناکی ئاگرەکە دەگەیشتە لای تەپۆلکە دوورەکان و خەلکەکە لەوێ جووتیان دەکرد و ئێسترەکانی خۆیان دەگەیاندە نزیکترین شوێنی شیاو، ئا لەو حەلانەدا، ئاگرەکە وەکو پەردەیەکی فراوان لە پشتیانەوە بەرز دەبۆوە. لێ ئەوان دەیانگوو کە ئەم گەرمییەی زەوی هەموو کێلگەکانیان دەکوژێت و لەناوی دەبات.

ئەم هەموو نەوت سووتاندن و گاز بە فیرۆدانە، تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی هێزی پالەپەستۆی گازی بیرە نەوتەکانە. بە گشتی ئێستا لێرەدا ٣٦ بیرە نەوت ئامادەن و بەلام تا تەواوکردنی بۆرییەکانی هێلی حەیفا، سەرمۆرکراون. دوو بۆرییەکان ڕووەو (حەدیسە)ی سەر ئاوی فورات دەکشێن و لەوێوە بەسەر چوار بۆری دابەشدەکرێن؛ دووانی بەرەو ئەسکەندەرونەو دووانەکەی تریشی بەرەو حەیفا، کارمەندان بە تەمان کە لە ماوەی ١٨ مانگدا پرۆژەکە تەواوبکرێت. ئێستا نزیکەی هەزار مرۆڤ بە هەموو هیلاکییەکەوە لێرەدا کاردەکەن.

دوێنێ، سەرلەبەیانیم لەناو بازاردا بەسەربرد، تەماشای ئاسنگەرەکانم دەکرد، کە بە شێوازی دێرینە، میتالەکانی خۆیان بە ئاگر سوور دەکردو دەیان کوتا و شێوەی پێوویستیان دەدایێ. لە بازارەکەدا، کلاوێکی ڕازاوەم بینی بە ناوی (تەپەی سەر) لە بە زیو و دوگمەی شین و شتی وردەی ئاوێزان ڕازابۆوە. شتێکی کوردی بوو، بەلام لە بازاردا لەسەری کەسم نەبینی.

ژنان لێرە شەروالی دەلب لەبەر دەکەن؛ کە لە گۆزینگەوە تەسك و کۆدەبێتەوە. پیاوانیش شەروالی تورکی لەبەر و مشکی لەسەر دەکەن. کوردەکان لە سەرووی هەموو جلەکانییانەوە خۆیان لە فەروی مەر پێچاوەتەوە، بۆیە لەسەر جادەکان پان و پۆڕ دیارن لە بازارەکاندا زۆر شت دەست ناکەون، شتومەکی باش لە دەرەوەی ناوچەکەوە دێنن. بەلام بازارەکان، ڕەنگین و دلگیرن و سەرنجی بینەر ڕادەکێشن: سوجادەکان (قالی - س.ك) لە سلێمانی و هەولێرەوە دەهێنرێن. پێلاو لە (مەندەلی) یەوە. لەوە دەچێت لە کەرکوك هیچ بەرهەم نەهێنرێت لە شەربەو گۆزەو کاشی سەوز زیاتر. لە تەختایی ئەوبەری پردەکەدا، قوتابخانەیەك، باغچەی مندالان و سەرای حکومەت، باغچەیەکی گشتی (زۆر باغچەیەکی جوان و نوێ) هەیە. هەروەها ژمارەیەك مۆلگەی سەربازیی لێیە، کە یەکێکیان کراوەتە خەزینەی ئازووقە، حالیحازر لەوێدا دوو هەزار سەرباز هەیە.

*** بە گشتی درەختی وەرزین**

یەکێ لە خۆشییەکانی ئەم شارە، ئەوەیە کە لێرەو لەوێدا بەسەر سەربانەکانا چلی دارو درەخت و دارخوارما شۆربۆتەوە. بەلام درەختەکانی ئێرە بە گشتی درەختی وەرزین و گەلاکانیان لە پایزدا دەچنە خەزانەوە. لێرە لەسەر ئاسیاوەکان (ئاشەکان - س.ك) سەکۆی بەرزو کاتیی دروستکراون، لە کاتێکا گەنم و دانەوێلە دەخرێنە ناو مەکینەی ئاسیاوەوە، چاودێری ئاسیاوەکە لەسەری دادەنیشێت.

مزگەوتەکان لەبەردو قوڕ دروستکراون، پەنجەرەکانیان زۆر بچووك و کونکونن. دەرگای مالەکان بە زۆریی بە نەخشی بچووك بچووکی هەلکەندراو، ڕازێنراون. بەلام لەم شارەدا هیچ پەنجەرەیەکی نەخشێنراوم بەدی نەکرد، وەکو ئەوانەی لە بەغدا هەن.

مرۆڤ کە بە قالدرمە (پێپیلکانە - س.ك) بۆ قەلاکە سەردەکەوێت، هەلبەتە لە هەر دوو لای ڕێگەی سەرەکی قەلاکە، پێپیلکانە هەیە، هەست دەکات کە ئەم قەلا قشتیلەیە، وەکو مەلبەندی سەرەکی ناوچەکە وایە.

**٩ ئادار ١٩٣٢ :**

دوێنێ چووین بۆ تەماشای کارو کردەی لێدانی بیرێکی تری نەوت؛ بیرەکە لە دەشتایەکی پشت گوندێکی بچووکی خانووی بە قوڕو گل دروستکراوبوو، کە لە نموونەی ئەو گوندە کەونارە هەزار سالیانە دەچێت.ئەو بیرانەی خەریکیانن، بە بورجی ئاسنینی شێوازی بورجی ئیڤیل سەریان گیراوە. لە سەرتۆپی ئەم بورجە بەکرەیەکی زل هەیە؛ ئەو بەکرەیە شەفتی گەورەی ٨٠ فووتی ڕاگرتووە. دەمی کونکردن (دریل) ی گەورەیەو بە بورغی بە خواری شەفتەکەوە لکێنراوە. بۆ تەماشاکردن، ئەم بەشە هەژێنترین بەشی کاری بیرە نەوت هەلکەندنە. درێلەکە تەنیا ٧٠٠ فووت ئەرزی هەلدڕیووە و گەیشتۆتە ئاستی نەوتەکە. قوولترین بیرە نەوت لەم ناوچەیەدا دەگاتە ئاستی ٣٠٠٠ فووت، بەلام لە شوێنەکانی تری جیهان بیرەکان تا دەگەنە ئاستی نەوت دەبێت ١٣ هەزار فووت هەلبکەندرێن.

لەوە ناچێت جێی باوەرکردن بێت هەموو مەکینەیەك ئەو هێزەی هەبێت کە بتوانێت ئەو شەفتە هەرە قورسە سەرولێژ بجولێنێتەوە. خواری شەفتەکە، شفرە یا درێلی کونکردنە، شفرەکە دوو دەمی هەیە کە لە ستیل دروستکراون. بەردەوام دەخولێنەوە خاکەکە هەلدەکەنن و بەرەو قوولایی خاکەکە ڕۆدەچن. شفرەکە بەردەوام بە ئاوی قوڕاوی ئاورشێن نەکرێت تا یارمەتی دەمەکان بدات لە ئاسانکاریی برین و هەلکەندن و دامالینی بەردەکان. شەفتەکە پەیتا پەیتا پەمپ ئاسا هەلئەکشێت و دائەکشێت بۆ ئەوەی خاك و خۆلە دامالراوەکە فرێ بداتە دەرەوەی بیرە نەوتەکە.

پاش چەند سەعاتێکی کونکردن، دەمە تیژەکانی شفرەکە کول ببوون، پێویستیان بە گۆڕین دەکرد. ئێمە زۆر بەختەوەر بووین کە دروست لەو کاتەدا گەیشتینە سەر کۆتایی کارەکە. چوار کرێکاری کورد لەلای شەفتەکەوە وەستابوون، دووانی

تریش سەرکەوتنە سەر بورجە ٨٠ فووتییەکە. پسپۆرە ئەمریکییەکە نزیک بووەوەو تەرازووی مەکینەکەی گۆری بۆ ئەوەی شەفتەکە هەڵکشێتە سەرەوە. ئەو پیاوە؛ پیاوێکی بە هێزو ژیر دیاربوو. پێی گووتم کە ئەو هەر لە شێوەی گۆرانی دەنگی درێلەکەو دەنگی مەکینەکەوە دەزانێت کە دەمی شفرەی ناو خاکەکە چ جۆرە خاکێك هەڵدەقەنێت. شفرە بریقەدارەکە، بە دەرکەوت و لەو کاتەدا کرێکارێکی کورد بۆ داماڵینی قورەکەی بەردەوام ئاوی پێدا دەکرد. شفرەکە بە قورسی دەخولایەوەو هاتە خوارەوە. کوردەکان زۆر قیت و قۆز و ئازاو بەهێز دیاربوون: کاتێ شەفتە ٨٠ فووتییەکە لە بەرزیدا بوو، ئەوان ئازایانە بە دوو بەندی گەورەی ئاسنین، لە شوێنی دیاریکراویدا بەستیانەوە؛ مەکینەکەیان بە گشتی خوارکردو شوێنی بورغییە گەورەکانیان شلکردەوە. کوردەکان خواررووی شەفتە درێژەکەیان بە قولاپی ئاسنین راگرت و کۆنترۆلیان کردو بەرەو لایەك سووراندیانەوە. ئەو مەکینەیەی شەفتەکەی لە سەردابوو، بەردرا و هێنرایە خوارەوە تا دووەم بەشی درێژایی شەفتەکە گرێ بدرێت، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە شەفتی یەکەم – ٨٠ فووتییەکە – هەر وەکو قامیشێ خوارکرابۆوە. ئەو کرێکارانە بە هیچ شێوەیەك گوێیان نە دەدا بە مەترسی سەر بورجە ئاسنینەکە، هەر هەموو جەربەزە کارو ئەرکەکانیان بە پەلە بە کارئەندازەیی تەواوکرد. ئەو کوردانە نزیکەی سێ ساڵە لەم ئیشەدان و کارەکانیان زۆر پێخۆشە. لەگەڵ هەموو دژوارییەکی کاری مامڵەکردن لەگەڵ ئەو ئاسنە قورسانە، بەڵام هەردەم دەم بە خەندەو پێکەنینن.

مەکینەکە وا دروستکراوە کە بە هەڵم کاربکات؛ ئەو هەڵمەش شەش مەکینەی گەورەی ئاوکولاندن بەرهەمی دەهێنێت. لەو کاتانەدا کە نەوت لەژێر فشارێکی زۆرەوە دەردەکەوت و سەریهەڵدەدا، لەسەر ئەرزەکەدا گرێکی زۆر سپی دەپرژاند؛ گرێك کە مرۆڤ پێی نەدەکرا زۆر دیقەتی بدات. نەوت و ئاو لەسەر زەوییەکەدا ئاوێتە ببوون، لەگەڵ ئاگرە مەزنەکەدا ، بە جوانی پاڵەپەستۆی هەڵم لە ژێر دوکەڵی رەشدا دەبینرا. کاتێکی زۆرتر لەوێ مامەوە، سەرەتای هێڵی بورییە نەوتیەکانم بینی، بۆرییە ئاسنییەکان و لە تەنیشتیەوە دارتەلی تەلەفۆن، یەکراست رووەو دەشتایی بۆ دەرەوەی ناوچەکە درێژکرابوونەوە. ئەمە سەرکەوتنی عەقڵ و مێشکە بەسەر رووبەری سروشت و چۆڵەوانیدا، کە دیمەنی ئەو وایەرو دارتەل و بۆرییانە دروستیان کردووە و لە دوورەوە لەناو تراوێلکە (سەراب) و خۆڵدا وونبوون، ئەگەر ئەم کارانە لە رۆژانی زووتردا بکرانایە، شاعیران و پەیکەرتاشان پێی شاگەشکە دەبوون و ئاهەنگیان بۆ دەگێرا، لەوانەبوو بێ سێ و دوو وەکو سەمبولی هێزو توانای مرۆڤایەتی تەماشا بکرانایە. لە پاش ئەو هەموو خۆشییە، بۆ چای خواردنەوە چووین بۆ لای خێزانی جیۆلۆجیستەکە. لە سەربانی ئەوانەوە تەماشای دیمەنەکانی دەوروبەرمانکرد. ئێرە شارێکی خۆشە؛ تەپۆلکەکەی وەکو قەڵایەك چووەتە ئاسمانەوە. کۆمەڵێ باغچەی فراوانی دارزەیتون لێرەو لەوێدا و لەناو خانووەکانی دەوروبەری شارەکەدا هەن.

دیمەنی هەموو ئەو زنجیرە چیایانەی لە هەموو لایەکەوە ، لە دوورەوە بە رەنگێکی شین باوەوە دیاران، جوان و شیرینە. ئەم شەو من بەرەو ناسریە، ئێرە بەجێدەهێڵم.

* سەرچاوە:–
– رۆژنامەی کوردستانی، ژمارەکانی ٧٤٢٢، ٧٤٢٣، ٧٤٢٤.

*** كۆتری نامەبەر (زاجل):-**

هەر لەگەڵ ئاشنابوونی مرۆڤ لەگەڵ كشتوكاڵدا، هۆگری گەلێك ئاژەڵ و پەلەوەر و باڵندە بووە، كە بەشێكیان رۆڵێكی گەورەیان بینی لە ژیانی مرۆڤایەتی و تا ئەم سەردەمەی ئێستامان هاورێ و هاوگونجاوی یەكترین.

كۆتر یەكێكە لەو باڵندانەی هەر لە سەردەمانی زووەوە رۆڵێكی ئابووری و كۆمەلایەتی و سەربازی باڵای بینیوە و سەركەوتنی بۆ ژیانی مرۆڤایەتی بەدەستبهێنێ بەتایبەتی كۆتری (زاجل) یان نامەبەر هەر لە سەردەمانی ٢٤ی پێش زایینەوە، هاورێ و بەشداری سەرەكی كار ئاسانی هەموو پێگەكانی ژیان بوونەتەوە و سەركەوتنیان بەسەر دوژمندا تۆمار كردووە كە گەلێك نموونە و شایستەی بەرچاویان لە رووداوە مێژووییەكان تۆمار كراوە.

كۆتری زاجل یەكێكە لە جۆرە دەگمەنەكانی كۆتر و تایبەتمەندی خۆی هەیە لە رووی پەر و باڵ و رەنگ و جۆرەوە جیاوازی خۆی هەیە، خوێندنەوەی هەموو پێكهاتەكانی هەڵگری جۆرەها لێكۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنە بۆ ئەوەی بگەینە سەرچاوەیەكی زانستی دروست دەربارەی.

كۆتری (زاجل) یەكێكە لەو باڵندانەی كە تایبەتمەندی خۆشەویستی خۆی هەیە بۆ شوێن و ژینگەكەی و ئاشنای ئەو شوێنەی لێی گەشەی كردووە زوو ئاشنای دەبێت بەتایبەتی جۆری رەسەنەكانیان، دالدەی هەمان ئاو و هەوا دەبن، لە هەمان كاتدا باوەش و سۆز بۆ بێچووەكانی دەكاتەوە هەرچەندە توانای فرین و كاروبارەكانی خۆیان بن.

ئەگەر بەشێوەیەكی گشتی سەیر بكرێت جیاوازییەكی ئەوتۆی نییە لەگەڵ جۆری كۆترەكاندا، بەڵام ئەگەر هەڵسەنگاندن و تایبەتی جۆرەكانی بەراورد بكەن هاوگونجاوی بەش و جۆری تایبەت بەخۆیەتی.

كۆتری (زاجل) جۆر و رەنگی جۆراوجۆری هەیە وەكو هەموو كۆترەكانی تر كە هەڵگری جۆرەها رەنگن سپی و رەش و سوور و خۆڵەمێشی و شین و خاڵی رەش و جۆراوجۆر لەسەر باڵ و كلك و لەشیدا ئەگەر سەیری پێیەكانی كۆتری زاجل بكەین ئەبینین كە بێ بەشە لە پەر كە وەكو كۆترەكانی تر نییە و پێیەكانی كورتە و بەهێز و رێكوپێكە و پەنجەكانی پەری نییە و كلكی كورتە و راست و هاوگونجاوە كە درێژ ترە لە باڵەكانی بەپێوانەی ئەو رەشییەی كە لە كۆتایی كلكەكەیەوە هەیەتی.

ئەگەر لە تەنیشتەوە سەیری كۆتری زاجل بكەی بەشێوەیەكی چەماوەیە لە كۆتایی سەریەوە تا خوارووی دەندووكی، بەشێوەیەكی راوەستاو و راست سەربەرز دەوەستێت و سینگی دەردەپەرێنێت و لاملەكانی كورتن كە هاوگونجاوییەك هەیە لەنێوان لامل و شانەكانیدا، لە هەمان كاتدا دەندووكی راست و رەنگی رەشە و لاچەناگەكانی هاوتەریبن بە ئاسانی لە هەردوو لادا دەكرێنەوە، رەنگی چاوەكانی سوورە یان زەیتییە بە كەوانەیەكی سپی.

زۆر بوون و زاوزێی كۆتری زاجل لە رێگای هێلكەوە دەبێت، كاتێكی دیاریكراو نییە بۆ زۆربوونی لە ماوەی ساڵەكەدا، بەڵام هەموو مێیەكی كۆتری زاجل دوو هێلكەی رەنگی سپی دەكات و بۆ ماوەی هەژدە رۆژ لەسەر هێلكەكانی كر دەكەوێت و لەدوای هەڵهاتنی لەنێوان نێر و مێیەدا خزمەتیان دەكەن و پارێزگارییان لێدەكەن، هەروەها پێویستە بۆ ماوەیەكی دیاریكراو نێر و مێیەكە لە یەكتری دووربگرن بۆ ئەوەی هەست بە ئارامی و خۆئامادەكردن بێت بۆ قۆناغێكی تر لە زاووزێ.

لەدوای هەڵهاتنی پێویستە راهێنانی پێبكرێت و ئامادە بكرێت لەسەر فرین لەنێوان (٢٠ كیلۆمەتر بۆ ٤٠كیلۆمەتر یان ٦٠ كیلۆمەتر)، ئەویش دەوەستێتەوە سەر ئاستی توانای بەهێزی باڵەكانی.

كۆتری زاجلیش وەكو هەموو كۆترەكانی تر پێویستی بە خواردن هەیە كە زیاتر خواردنەكانی بریتییە لە نیسك و جۆ و گەنم و نانی كوتراو و گەنمەشامی و برنج و بەردی جیری كە بۆ بەدەستكەوتنی خوێ بۆ لەشی زۆر پێویستە كە تامێكی تایبەتی داوەتە گۆشتەكەی بۆ خواردن.

خەڵكێكی زۆر كار دەكەن لە بەخێوكردنی كۆتری زاجلدا، كە هەندێكیان وەكو پیشەیەكی ماددی بۆ بژێوی ژیانیان بەكاری دەهێنن، هەندێكی تریش وەكو ئارەزوویەكی رۆژانە خۆیانی پێوە قاڵ دەكەن، ئەوەی جێگەی سەرنجە، لەگەڵێك شوێن یانەی تایبەتی دەربارەی كۆتری زاجل كراوەتەوە، كە هەموو ساڵێك پێشبركێ دەكرێت لەنێوان ئەندامەكانی بۆ دەستكەوتنی خەڵات، هەروەكو ئەوەی لە كەركوكیش یانەیەك هەیە بەناونیشانی (نادی السلام للحمام الزاجل) هەر لە ساڵی (٢٠١٥)ەوە دەستبەكارو چالاكییەكانی كردووە.

یانەیەكی تریش بەناوی (نجوم كركوك للحمام الزاجل) بەسەرپەرشتی (عیماد شۆراوی) كراوەتەوە و لەسەر شێوازێكی زانستی و مۆدێرن بایەخ بە بەخێوكردنی كۆتری زاجل دەدات و نزیكەی (١٨٦) كۆترەوانی هەیە.

* کۆتربازی لە کەرکوك:-

* یانەی ( السلام ) بۆ کۆتربازی:-
نادي السلام للحمام الزجل

ئەم یانەیە لە ساڵی ٢٠١٥ لە کەرکوك دامەزراوە بۆ کۆتربازی کە بایەخ بە بەخێوکردنی کۆتری زاجل دەدەن و کۆتربازی دەکەن، کە نزیکەی ٧٠ ئەندامی بەشداربوویان هەیە و چەند جارێك بەشداری پێشبڕکێیان کردووە و خەڵاتی یەکەم تا دەیەمیان بردووەتەوە.
ئەندامەکانی ئەم یانەیە بەشداری پێشبڕکێیان کردووە لە دووری ١٠٠ کیلۆمەتر و ٧٠٠ کیلۆمەتر کە لە ناوچەی (سەرحە) لە دووزەوە دەست پێدەکات تا (فاو) لە پارێزگای بەسرە ئەندامە بەشدارە چالاکەکانیان بریتییە لە :-
١- فەرەیدوون عومەر
٢- سەباح محەمەد
٣- حەمید
٤- فەهمی فەرهاد
٥- سەمەد محەمەد

* یانەی ( نجوم کرکوك للحمام الزاجل ) مرکز العام:-

ئەم یانەیە لە ساڵی ٢٠١٧ لە کەرکوك دامەزراوە لەسەر دەستی عیماد شۆڕاوی کە لە ئێستادا ١٧٦ ئەندامی هەیە و بارەگایان لە گەڕەکی (ساحة الطیران)ە و لە ئەمساڵدا ٢٠١٨ بۆ یەکەم جار بەشداری پێشبڕکێی کۆتری زاجل (کۆتری نامەبەر) دەکەن لەنێوان کەرکووك و فاودا.

*** گەنجە قژ لوولەکانی کەرکوك:-**

ئەم دەستەواژانە بۆ ماوەی دوو ساڵ دەچێت، لەنێو کەرکوکدا ناوبانگیان هەیە و ناوە ناوە باس و خواسیان هاتووە و دێتە ناوانە و کردەوەکانیان بە خراپ باس کراوە.
ئەم گەنجانە قژەکانیان لوول دەکەن و نامۆیانە خۆیان دەردەخەن بە لەبەرکردنی جلوبەرگی سەیر و هەڵگرتنی چەك و چەقۆی جۆراوجۆر، کە زیاتر لە شەواندا بە دەرکەوتوونە و سەرانەیان لە خەڵکی وەرگرتووە و بە زۆرەملێ پارە و پێویستی لە خەڵك دەستێنن.
گەلێك هۆکاری جۆراوجۆر هەیە کە ئەم گەنجە قژ لوولانە دەستیان هەیە لەسەر هەڵدانیان کە خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:-
١- بەهۆی نەبوونی کار و کارکردن ئەمانە بەرەڵڵا لە بازار دەسوورێنەوە و بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بژێوی ژیانیان بەدەست بهێنن.
٢- پشت و پاڵپشتی کردن لەگەڵ هەندێك لە بەرپرسەکان ڕۆڵی سەرەکیان هەیە بۆ سەر خستنی کارەکانیان کە بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان بە کاری دەهێنن بۆ بەدەست کەوتنی بەرژەوەندی خۆیان
٣- ئاسان کاری ساغکردنەوەی کاڵاکانیان لە شارەکانی چەمچەماڵ و کەلار ڕۆڵی سەرەکی هەیە بۆ سەرکەوتنی کارەکانیان.
٤- بێ هێزی دەزگا ئەمنییەکانی کەرکوك و دەستگیرنەکردنیان ڕۆڵی هەیە لەسەرخستنی کارەکانیان. ئەو کارانەی کە گەنجە قژ لوولەکان لە کەرکوك کردوویانە جۆربەجۆرە لەوانە:-
١- دزینی ئۆتۆمبێلی مۆدیل بەرزەکان و ساغکردنەوەیان لە بازارەکانی کوردستان و ئێران.
٢- دانە سەر ماڵان و دزیکردن.
٣- ڕفاندنی منداڵ و کەسانی دەوڵەمەند بۆ بەدەستهێنانی پارە.
٤- دزیکردن لە مۆڵ و بازارە گشتییەکان بۆ بەدەستهێنانی پارە.
٥- کاری ملهوڕی و بەزۆربردنی شتومەك بەڕۆژی نێوەڕۆ لە دووکاندارەکان وەکو سەرانە و کەڵەگایی.
ئەوەی جێگەی سەرنجە پاش ئەوەی کۆمەڵێك کاری جۆراوجۆر دەکەن، بەڵام بەشێکیان بەڕووداوی جۆراوجۆر لەناو دەچن بە کوشتن، سەرنگوم بوون، بەڕووداوی هاتووچۆ، دەستگیرکردنی کاتی، هۆکاری بەرنامە داڕێژراو بۆ کوشتنیان وەکو ئەوەی بەسەر (مەرە گەڕ) و (ڕێبەدا) هێنایان.
ناوە ناوە دەنگۆی ئەوە بڵاو دەبووە و کە ژمارەیەکی زۆریان لێگیرا، دوای ئەوەی پێکهاتەکان سکاڵایان دژیان بەرز دەکردەوە، بەڵام دوای ماوەیەك وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن و دەست دەکەن، بەکارەکانیان.
بۆ بەراوردکاری دەتوانین بڵێین کە هاوتەریبی گەنجە قژ لوولەکان و شەقاوەکانی کەرکوك وەکو یەکن بەڵام تەنها چەند جیاوازییەکیان هەیە:-
١- شەقاوەکانی جاران بە بازووی خۆیان شەڕیان کردووە و تەنها چەقۆ و کەرەستەی سادەیان لەدەستدا بووە، بەڵام قژ لوولەکان جۆرەها چەك بەکار دەهێنن.
٢- شەقاوەکانی جاران شەڕیان لەگەڵ کار بەدەستەکاندا بوو، بەڵام قژلوولەکان بەرژەوەندی کەسانی بەرپرس دەپارێزن.
٣- شەقاوەکان هەردەم یارمەتی لێقەماوانیان داوە و لە زاڵم و ستەمکار پاراستوویانە.
٤- زمانی مامەڵەکردنیان جیاواز بووە لە هەموو ڕوویەکەوە کە زمانی شەقاوە بە حەکیمانە هەڵسوکەوتیان دەکرد، بەڵام قژلوولەکان هەڵەشەن لە کارەکانیان.
دەرکەوتنی گەنجە قژلوولەکان لە شاری کەرکوك لە کاتی هێرشەکانی داعش بۆ سەر شارەکە، کە ئەمەش واخۆیان نیشاندەدا کە خۆبەخشن، بەڵام لە ڕاستیدا بەدوای چەك و تاڵانەوە بوونە، بۆیە لەم ڕێگایەدا بەشێکیان کوژراون یان بەشێك لە ئەندامەکانی گیانیان لەدەستداوە.
پێش ١٦ی تشرینی یەکەمی، هەرێمی کوردستان و ئاسایش کەرکوك هەستا بەگرتنی ژمارەیەکی زۆری قژلوولەکانی کەرکوك بە تۆمەتی تاوان و کاری نابەجێ لە کەرکوك کە تاکو ئێستا نزیکەی (٥٠-٦٠) کەسیان بێ سەروو شوێن و هیچ چارەنووسیان دیار نییە کە لەوانەیە بەشێکیان لەناو درابێتن.
لەدوای ١٦ی تشرینی یەکەمەوە، ناوە.. ناوە دەردەکەون و هەوڵی تاڵانکاری دەدەن، بەڵام بەشێوەیەك بەرچاو نییە و خۆیان تێکەڵی گەلێك لایەن دەکەن بۆ بەدەستکەوتنی بەرژەوەندییەکانیان.

*** گەنجە ڕیشۆڵەکانی کەرکوك:-**

ئەم ناو هێنانە لەدوای ١٦ی ئۆکتۆبەری٢٠١٧ەوە سەری هەڵداوە کە جێگای گەنجە قژ لوولەکانی گرتووەتەوە، کە هەمان دەوری قژلوولەکان دەبینن لە ئازاردان و ڕاوەدوونانی خەڵکی نێو کەرکوك.
ناوەکەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە جلوبەرگی ڕەشیان لە بەردایە و زۆربەیان گەنجی لە هەژدە ساڵ بەسەرەوەن و لەڕووی فیکری و ئاستی تێگەیشتنەوە زۆر نزم و لە هێزە سەربازییەکان خۆیان ئاخنیوە.
ئەمانە لە شەواندا و تەنانەت بەڕۆژی ڕووناکیش کاری جۆراوجۆر دەکەن و دەستی دزییان هەیە و بە ڕێگای چەکەوە کارەکانیان جێبەجێ دەکەن.

*** ئەحمەد قارداشی پاڵەوان:-**

لە بنەڕەتدا خەڵکی کەرکوك بووە و لەوێ لەدایکبووە، دوای ماوەیەك لە هەرزەکاری چووەتە بەغداو لەوێ نیشتەجێ بووە لە ساڵی ١٨٧٠، ئافرەتێکی بەغدایی هێناوەو لەوێ نیشتەجێ بووە و سێ کوڕی هەبووە بە ناوەکانی شەهاب، مەحمود، عەباس.
ئەم کەسایەتییە بەناوبانگ بووە بە شەقاوەیی و بەتوانای و ئازایەتی و یارمەتیدانی هەژار و لێقەوماو و بێوەژن و کەسانی نامۆ و زوڵم لێکراو لە ناوچەکە و دەروبەری لە گەڕەك و دەڤەرەکەی.
لە ماوەی ژیانیدا گەلێك ڕووداو و شتی سەیری لێ دەگێڕنەوە کە خۆی و کۆمەڵەکەی بەسەریاندا هاتووە، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە هاوینێکی گەرمدا، دەداتە سەر ماڵی بازرگانێکی جوولەکە لە بەغدا، لە شەودا، بازرگانە جوولەکەکە خۆی و خێزانەکەی لەسەربانی ماڵەکەی لە خەوێکی قووڵدا بوونە، بەڵام لە تەك شوێنی خەوتنەکەیدا بینی کە دەفرییەکی گەورە دانراوە کە برنج و بامیەی کوڵاوی تێدایە و سەری داپۆشراوە، بۆیە هەست بە برسێتی دەکات و تا بۆی دەکرێت لێی دەخوات و پاشان ئاوێکی سازگار دەکات بەسەریدا، لەدواییدا لەسەربانەکە دێتە خوارەوە، دەبینێت کۆمەڵەکەی کەلووپەلەکانیان کۆ کردووەتەوە و چاوەڕێی ئەون بۆ گواستنەوەی کەلووپەلەکان.
دەڵێت پێویستە هەموو کەلوپەلەکان لە جێگای خۆیان دابنێنەوە، کەس شت نەبات، چونکە من نان و ئاوی ئەم ماڵەم خواردووە و نان و خۆ لە بەینماندا هەیە، هەر کەسێك دەست بەرێت بۆ شتێك بەم خەنجەرە دەیکوژم.

* **پێگەی ئافرەت لە بواری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسی و رێکخراوەیی لە کەرکوك:**

کەرکوك بەو پێگەیەی کە هەیبووە لە رابردوو و ئێستادا، چ لەسەر ئاستی کوردستان یان عێراق توانیویەتی ئەو رۆڵە بگێڕێت کە ئافرەت لە دەڤەرەکانی تر هەیبووە و هەردەم چالاکی خۆی ئەندام داوە بەپێی ئەو توانست و برستەی هەیبووە یان رێگەی پێدراوە لە چالاکییەکانیدا رۆڵ ببینێت بەو ئاستەی بتوانێت نوێنەری خۆی بێت و تایبەتمەندی ئافرەتیزمی تێدا رەنگ بداتەوە.

لە ماوەی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانی لە کەرکوك، هیچ چالاکییەکی ئافرەتان بەرچاو ناکەوێت و هەروەها دەوڵەتەکە رێگای بەهیچ جۆرە چالاکییەك نەداوە و بیروباوەرە ئایینییەکە رێگر بووە کە ئافرەت رۆڵی گەورەی خۆی ببینێت.

لە ئەستەمبول هەندێك رێکخراوی ئافرەتان گەشەیان کردووە بەڵام چالاکییەکانیان پەلی نەهاویشتووە بۆ دەڤەر و ناوچەکانی دەورووبەر و ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩١٩دا لە ئەستەنبول کۆمەڵەی (پێشخستنی ژنانی کورد) لەلایەن هاوسەری هەندێ لە پیاوانی سیاسی و ناوداری کوردەوە دامەزراوە، کە هیچ ئەندامێکی خەڵکی کەرکوکی تێدا نەبووە.

لە ساڵی ١٩٢٠دا لە سەردەمی شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ لە کفری، رۆڵی ئافرەتێك دەگێڕنەوە کە وەك تاقە سواری ئافرەتی چەکدار لەگەڵ جەنگاوەرەکاندا لە دژی ئینگلیز شەری کردووە، ئەو خانمە ناوی (نەعیمە مستەفا) بووە و هەر سەر بە هۆزی (دەلۆ) بووە، بۆیە نازناوی (نێر)یان بەو ژنە داوە و لەناو خەڵکدا بە (نەعە نێر) ناسراوە.

هەروەها (کوێخا نێرگز کچی کوێخا سمایل مەحموودی میرزە) ئافرەتێکی ئازاو چاونەترسی سەردەمی عوسمانییەکان بووە، کاتێك کە براکانی (حەسەن) و (فەتاح) دەکوژرێن، ژن بۆ مێردەکەی دەهێنێ و سەری خۆی بە گوێزان دەتاشێ و جلوبەرگی پیاوانە دەکاتە بەری و هەوڵی تۆڵەکردنەوەی براکەی دەدات و قارەمانانە تۆڵەی خۆی لە عوسمانییەکان دەکاتەوە کە چۆن گوندی (گوڵمکەوە)یان وێران کردووە و براکانیان کوشتووە ئەم ئافرەتە لە ساڵی (١٨٩٠) لە تەمەن (٥٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

* **کۆمەڵی ئافرەتانی شۆرشگێری کوردستان:-**

کۆمەڵێك ژن لە ژنانی کەرکوك، ئەوانەی کە پەیوەندیان کرد بە مێرد و کورەکانیان کە چووبوونە پاڵ شۆرشەوە، لەگەڵ ژنێکی کورد دانیشتن کە ناوی (باجی ئەجێ) بوو، کورە تاقانەکەی شەهید بووبوو، چوون بە دەنگی ئەو ژنەوە بۆ خۆرێکخستنیان لە کۆمەڵەیەکدا کە مشووری باری گوزەرانیان بخوات و یارمەتی شۆرشگێرانیش بدەن، لە مانگی ئابی (١٩٤٥)دا رێکخستنیان دامەزراند بەناوی (کۆمەڵی ئافرەتانی شۆرشگێری کوردستان) بوون بە چەند بەشێك وەك بەرگدروو و کرێکار و جوتیار و بە چەند گوژمە پارەیەك بەشدارییان لە سەندوقی یارمەتی نەدار و دەستکورتەکاندا کرد، جگە لەو شتانەی شۆرشگێران پێویستیان پێیانە، ناوی ئەو ژنانە دیار نییە کە رێکخراوەکەیان دامەزراندووە، بەڵام ناوی (ئەجێ خان) کە دایکی شەهیدێك بوو هاتووە.

* **لوتفییەی مەلا سدیقی نازەنینی:-**

- ساڵی ١٩٢٢ لەدایکبووە، یەکێکە لە مامۆستاو لێهاتووەکانی کەرکوك.
- لوتفیە خان کچی یەکەمی مەلا سدیقە و لە زەهوەخانە، کە ئەویش کچی مام حوسێنە وماڵیان لە گەرەکی (بەفری قەندی) بووە.
- لوتفیە خان خوێندنی هەرسێ قۆناغی لە شارەکانی کۆیە، کەرکوك و سلێمانی تەواو کردووە، پاشان لە بەغدا، (دار المعلمین العالی) بەشی زیندەوەرزانی و رووەکی تەواو کردووە.
- لە ساڵانی (١٩٥٤) بەدواوە لە کەرکوك نیشتەجێ دەبێت سەرەتا وەکو مامۆستا، پاشان وەکو یاریدەدەری بەرێوەبەری

قوتابخانەی ئامادەیی کەرکوکی کچان تێدا دەمێنێتەوە کە بەڕێوەبەرەکەی مامۆستایەکی تورکمان دەبێت بەناوی (وەفیقە)، پاش شۆرشی ١٤ی تەمووز، خۆی دەبێت بە بەرێوەبەر، باوکیشی چەند ساڵان لەو شارەدا سەرۆکی دادگای کەرکوک بووە و خەڵك زۆر ڕێزیان گرتووە.

– لە ساڵی (١٩٦٣)دا لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەت بەندکراوە، لەوانە مامۆستا (سەنیە جەباری) بەڕێوەبەری ئامادەیی ئیمام قاسم، ئەم ژنانە لە گرتووخانەدا وورەی پیاوە زیندانیکراوەکانیان بەرز کردووەتەوە و داوایان لێکردوون کە ناوی هیچ کەسێك نەهێنن و دان بە ڕاستییەکاندا نەنێن.

– ئەم خانمە لەگەڵ (ناهیدە شێخ سەلام)دا بۆ حیزبی (ڕێی ڕاست) کاری کردووە، بەشداریشی لە نووسینەوەی گۆڤارێکیان کردووە بەناوی (تروسکە) لەسەر ئەمەش تووشی هەندێ گرفت بووە.

– لوتفیە خان ئافرەت و مامۆستایەکی کوردپەروەر بوو تا سەر ئێسقان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مەیلێکی زۆری بۆ (چەپ) هەبوو، تەنانەت لەم بارەوە دۆستایەتییەکی بەهێزیشی لەگەڵ (فاتیح رەسول) هەبوو، کە هەردووکیان پێشووتر لە کۆیە یەکدییان ناسیووە.

– لوتفیە خان دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ هەندێ لە ڕۆشنبیران هەبووە بە نموونە لەگەڵ (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) نامە گۆڕینەوەی هەبووە، ئەو نامانەش هەمووی دەربارەی مێژوو و ئەدەب و ئەو شتانە بووە، هەر هەموویشیان تا کۆچی دوایی لای لوتفیە خان پارێزرا بوون.

– دەرکەوت لە گەلاوێژی (١٩٣٩–١٩٤٩)دا کۆمەڵێ بابەتی بڵاوکردووەتەوە، لەوانە پارچە هۆنراوەیەکی بەناونیشانی (گوڵ) بە واژۆی (محەمەد ئەرجومەند نازەنینی) هەروەها پارچە پەخشانێکی لە کۆیە بەناونیشانی (هیوا) ناردووە و بە واژۆی کچە کوردێك (ل.ن) بڵاوکردووەتەوە، پارچە پەخشان و شیعرێکیشی بە ناونیشانەکانی (بانگێ لە کانی دڵەوە) و (لای لایە)وە لە سلێمانییەوە ناردووە و هەر لەم گۆڤارەدا بڵاوکراوەتەوە.

– لوتفیە خان لەگەڵ دایك و خوشکێکی لە کەرکوك دەژیا، دلێری برای بە قسەی خۆی هەموو جار سەردانی دەکردن، ئەوە بوو لەو کاتەدا کە دەچێتە قوتابخانە دیواری قوتابخانەی بەسەردا دەرووخێ و کۆچی دوایی دەکات.

– لە ٢٤ی شوباتی ١٩٧٧دا لە گۆڕستانی شێخ محێدین لە کەرکوك نێژراوە.

*** دامەزراندنی کۆمەڵەی مافی ئافرەتان:-**

– لە ساڵی ١٩٥٢دا ڕێکخراوێکی ژنان دروست بووە، کە بەشێك بووە لە حیزبی شیوعی عێراق.

– لە ساڵی ١٩٥٢ دا لەژێر ناوی (کۆمەڵەی ماف ئافرەتانی حیزبی شیوعی عێراق بوون، لە شارەکانی کوردستاندا کارو و چالاکییان ئەنجام داوە، ڕێکخراوەکە بە عەرەبی ناوەکەی (رابطة المراة العراقیة) بووە، کە لە ١٠ی ئاداری ١٩٥٢ دامەزراوە.

یەکەمین سەرۆکی ڕێکخراوەکەشی (د. نەزیهە دلیمی) بووە، کە لە حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسمدا یەکەمین وەزیری ژن بووە لە مێژووی عێراقدا، لقە کوردستانییەکەی ئەم ڕێکخراوە ناوی (کۆمەڵەی ئافرەتانی کوردستان – عێراق) بووە و هاوتەریب کاریان کردووە بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی ئافرەتان و بەهێزکردنەوەی پێگەی ژن لەناو کۆمەڵدا، یەکەمین گۆڤاری ژنان لە سلێمانی ساڵی ١٩٥٢ لەلایەن ئافرەتانی شیوعییەوە بەناوی (ئافرەتی ئازاد) بە زمانی کوردی دەرچووە.

ئەم ڕێکخراوەش چالاکی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی و سیاسی بە ئەنجام گەیاندووە لە کوردستانیشدا لە هەموو شارەکاندا

لقی هەبووە و ئافرەتانی شیوعی چالاکییان لەژێر ناوی ئەو ڕێکخراوەدا کردووە، دواتریش لە جیابوونەوەیدا لەگەڵ بەشە عێراقییەکە و بوونی بە حیزبی شیوعی کوردستان، ڕێکخراوەکەش ناوی بوو بە (کۆمەڵەی ئافرەتانی کوردستان). هەر بۆیە (عالیە عەبدولکەریم مودەریس) لە یاداشتەکانیدا دەربارەی لقەکەی کەرکوکی حیزبی شیوعی ئافرەتان بەم شێوە چالاکییەکانی دەخاتە ڕوو:–

"... هەر لەو ماوەیەدا پێوەندیم بە کۆمەڵەی ماف ئافرەتان لقی کەرکوکیشەوە پەیدا کرد و ئاگادار بووم و ئیتر ئەمانیش لە هەموو دەنگوباسی کۆمەڵە ئاگاداریان ئەکردم.

بەم جۆرە دەتوانم بڵێم ناچار کردنمان بۆ گواستنەوە لە سلێمانییەوە بۆ کەرکوك بەپێچەوانەی خواست و ئارەزووی

دوژمنی لێدەرچوو زۆر بۆ ئێمە سوودبەخش بوو، چونكە ژمارەیەكی زۆر لە ئافرەتانی ئەم شارە بە وریاییەوە ئارەزوومەندی هاتنە ناو كۆمەڵەی نهێنی داكۆكی لە مافی ئافرەتان بوون چونكە من باوەڕی زۆرم بەوان هەبوو و ئەوانیش هەروا باوەڕیان بەمن هەبوو، ئەو بەرنامە كارەی لە كۆمەڵی سەرەكیی داكۆكی كردن لە مافی ئافرەتانەوە لە بەغداوە ئەهات بۆ لقی كەركوك بەمنیش ئەگەیشت و منیش لای خۆمەوە دەمگەیاندە بەشێك لە ئەندامانی لقی كەركوك كە پێوەندیان بەمنەوە هەبوو و من كۆمەڵ كۆمەڵ دابەشم كردبوون.

یەكێك لەو كچە ئەندامە سەرەكییانەی لقی كەركوك كە یەكەمجار پێوەندی بە منەوە كرد، فەهیمە خانی كچی حاكم عەبدولرەحمان سەعید بوو لەگەڵ كچێكی تریش كە ناوی جەمیلە خانی یامولكی بوو هەردووكیان ماڵیان لە كەركوك بوو. جەمیلە خان خێزانی یەكێك بوو لە شێخە بەرزنجەییەكان، پێوەندی كردنی ئەو دووانە بە منەوە یەكەمیشن پێوەندی بوو لە ئاستی سەرەوە بە منەوە كرا.

دوای ئەوانیش لە بەغداوە پێوەندییان پێوە كردم و لە هەموو شتێكی پێوەندیدار بە كۆمەڵەوە ئاگاداریان دەكردم، ئیتر ئێمەیش لەسەر ئەو رێوە شوێنە بەرێوە دەرۆیشتین لەناو كۆمەڵەكەماندا كە لە بەغداوە بۆیان دادەنایین.

هەروەها بەپێی ئەوەی لە یاداشتەكانیدا هاتووە ئەوەی خستووەتە روو كە چالاكییان لە گەڕەكەكانی شۆریجە، تەپەی مەلا عەبدوڵڵا، پیریادی، ئیمام قاسم، قەڵا، ئازادی، رەحیماوا، قۆرییە بڵاوكردووەتەوە " یەكێك لەو كچە كوردانەوە كەركوك كە هاورێم بوو بەدڵ و بە گیان لەگەڵما بوو كچێ بوو بەناوی (رووناك)، كچی شێخ عەبدولرەحمانی مەلای مزگەوتی (نەبی دانیال) بوو لە گەڕەكی (قەڵا)، هەردووكمان كچە مەلا بووین، زووزوو سەرمان لە یەكتری دەدا.

" دوای رێگادانی بە ئاشكرا كاركردن و بە یاسا بوونی كۆمەڵەكەمان (كۆمەڵەی داكۆكی كردن لە مافەكانی ئافرەتان)، ئافرەتێك بە ناوی (عەمیدە)وە هات بۆ كەركوك بۆ سەرپەرشتی كردنی خەباتی كۆمەڵەكەمان.

پاش شۆڕشی (١٩٥٨) زۆر لە ئافرەتان هاتنە ناو ریزەكانی كۆمەڵی ئافرەتانەوە و بە تایبەتی لە ئافرەتە مامۆستاكان و لە قوتابیان، یەكێك لەو ئافرەتانە (سەنییە جەباری) خوشكی شەهید (فاتیح جەباری) بوو، هەروەها كافییە ئیبراهیم، لوتفیە عەبدولواحید، پەخشان عەبدولواحید و گەلێكی تر.

بۆ كۆنگرەی یەكەمی (كۆمەڵەی داكۆكی كردن لە مافەكانی ئافرەتانی عێراق) لە بەغدا هەر یەكە لە سەنییە جەباری، كافیە ئیبراهیم، لوتفیە عەبدولواحید، ساجیدە جاوید، جەمیلە یامولكی، فەهیمە عەبدولرەحان سەعید، سەبرییە عەبدوڵڵا و گەلێكی تر بەشدارییان كرد.

پاش كۆنگرەی یەكەم، كاروباری كۆمەڵی ئافرەتانمان لە گەڕەكەكانی كەركوكدا داناو رێكخست و بەرێوەبەرانی باش بۆ لیژنەكانی هەر گەڕەكێك هەڵبژێردرا بۆیە خۆ ئامادەكردن بۆ بەستنی كۆنگرەی دووەم ئامادەكرا، زۆر لە سەرۆك لیژنەكانی شاری كەركوكیش تێدا بەشداربوون و لەدوای كۆنگرە سەردانی هەریەكە لە (قادر كەرەم، قەشقە، كفری، زەرداو)، مان كرد و چالاكی و رێنماییەكانی كۆنگرەی دووەم خستە روو.

* یەكێتی ئافرەتانی كوردستان:-

رێكخراوێكی سەر بە پارتی دیموكراتی كوردستان بوو، یەكێتی ئافرەتانی كوردستان هەموو ساڵێك لە ١١ی كانوونی یەكەمی ١٩٥٢ یادی دامەزراندنی رێكخراوەكەی دەكاتەوە.

بڕیاردانی دروستكردنی ئەو رێكخراوە دیموكراتییانەی وەك یەكێتی قوتابیان، لاوانی دیموكراتی و ئافرەتان لە كۆنگرەی سێیەمی پارتی دیموكراتی كوردستاندا بووە، ئەمەش واتای ئەوەیە لە ساڵی (١٩٥٣)دا بووە، بەڵام دەشێ كۆبوونەوەیەكی سەرەتایی بۆ گەشەكردنی بابەتەكە لە ١١ی كانوونی یەكەمی ١٩٥٢ لە شاری سلێمانی كرابێت و پێشنیاری دروستكردنی رێكخراوێك درابێتە سەركردایەتی تا لە كۆنگرەدا تاوتوێ بكرێت و بڕیاری لەسەر بدرێت.

لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٣-١٩٦٣) لەژێر ناوی یەكێتی ئافرەتانی كوردستان چالاكی ئەنجام دراوە، بەڵام مۆڵەتی فەرمی وەرنەگرتووە و كۆنگرەشی نەبەستووە، لە ساڵی (١٩٦٣)دا یەكەمین كۆنگرە دەبەستێت. كەواتا دەبێت وای دابنێین كە یەكەمین كۆنگرەی یەكێتی ئافرەتانی كوردستان لە سەردەمی خەباتی نهێنی لە ساڵی ١٩٦٣ ئەنجام درابێت، كۆنگرەكەش لە شێوەی كۆبوونەوەیەكی ئاسایی بووە.

لە ساڵی ١٩٦٣ ئەندامە چالاكەكانی كەركوك بریتی بووە لە: سوعاد شێخ سدیق، مەلیحە قارەمان، سەمیرە عەلی سەروەت، سەعدیە هەمەوەندی لە كەركوكیش بێجگە لەم ئافرەتانە، ئافرەتێكی مامۆستا و شاعیر و لێهاتوو هەبوو بەناو (لوتفیە مەلا سدیق ئازەنینی) كە رۆڵێكی ئازایانەی گێراوە لە بزووتنەوەی شۆرشگێری كوردیدا و تەنانەت لە ساڵی ١٩٦٣دا دەستگیر كراوە و لە زینداندیش بەند كراوە، بەڵام بەپێی بەڵگەكانی لەوانەیە سەر بە رێكخراوەكانی حیزبی شیوعی عێراق بووبێت، چونكە پێشتر چالاكی رێكخراوەیی هەبووە لە كەركوكدا.

* یەكێتی ژنانی كوردستان:-

رێكخراوەیكی ژنانەی سەر بە یەكێتی نیشتمانی كوردستانە، لە سەرەتادا بە شێوەیەكی نهێنی و لە شاری سەقز لە ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩ دامەزراو خاتوو (كافیە سلێمان) بووە بە سكرتێری رێكخراوەكە، لە دامەزراندنی رێكخراوەكەدا، پەخشان جەلال، درەخشان جەلال حەفید زادە، بەهیە مەعرووف و هەندێ ژنی دیكە بەشداربوون، كە ئەمانە پێشتر لە دامەزراندنی یەكێتی ئافرەتانی كوردستانیشدا بەشداربوون، ئەم رێكخراوە دوای ١٤ساڵ لە دامەزراندنی حیزبەكە دروست بوو.

گۆڤاری تەوار كە ژمارە (١-٢)ی لە شاری سەقز دەرچوو، بوو بە زمانحاڵی ئەو رێكخراوە.

یەكێتی ژنانی كوردستان، لە ساڵی دامەزرادنیدا یەك كۆنگرەی بەستووە و بارەگای سەرەكییان لە سلێمانی بووە و لە شارەكانی تری كوردستانیش لقیان هەبووە، هەر

لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە، لقی کەرکوك کراوەتەوە چالاکی جۆراوجۆری خۆی هەبووە.

*** ژیانەوەی کورد و چالاکییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئافرەت (١٩٩٢-١٩٩٤)**

لە ساڵی (١٩٩١)ەوە کەشێکی نیمچە ئازاد دروست بوو بەهۆی نەمانی دەسەڵاتی بەعس، لە بەشێکی باشووری کوردستان، پانتایەك بۆ خەباتی کۆمەڵی سیڤلیش دروست بوو، کە پێشتر و لە سایەی رژێمی دیکتاتۆری بەعسدا ئەو جۆرە خەباتە مەدەنییە قەدەغە و ئاستەم بوو، کە دەشکرا بە نرخی گیان تەواو دەبوو، یان بە مەحکوم بوون بە ساڵانێکی زۆری ئەشکەنجە و زیندان تەواو دەبوون.

رێکخراوی کۆمەڵی مەدەنی و سەنتەر و سەندیکاکان دروست بوون یان ئەوانەی کە پێشتر دروست بوون و خەباتی نهێنییان دەکرد، گەشەیان کرد و ئیتر بە ئاشکرا چالاکییەکانیان ئەنجام دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا، لە سەرەتادا دەیان ژن و هێدی.. هێدی سەدان ئافرەت هاتنە مەیدان و کاری رێکخراوەکانیان برە و پێدا، بەڵام لە رووی جەماوەرییەوە دوو رێکخراوی سەر بە دوو حیزبی سەرەکی زۆرترین ئەندام و باشترین ئیمکانیاتیان لەبەردەستدا بوون، ئەوانیش یەکێتی ئافرەتانی کوردستان و یەکێتی ژنانی کوردستان بوون.

لەسەرەتاوە لەدوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان تەنها دوو ئافرەت دانرابوو، بەڵام لە کاتی ماوە درێژکردنەوەکەیدا کە بەهۆی شەری براکوژییەوە تا ٢٠٠٥ خولی یەکەم درێژەی کێشا، دوو ئافرەتی تر دانرا، واتا لە ماوەی خولەکەدا کە (١٣) ساڵی خایاند، لە فراکسیۆنی پارتی چوار ئافرەت بەشدار بوون کە ئەم خانمانە بوون: شەفیقە فەقێ عەبدوڵڵا حەسەن، فەوزییە عیزەدین رەشید، حەلیمە حوسێن محەمەد، زوهرە حاجی تەها رەسوڵ.

لە لیستی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەرەتا سێ و دواتر دووی تر زیاد کرا، کە ئەم خانمانا بوون:- گەلاوێژ عەبدولجەبار جەباری، هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، ئەهلە محەمەد عەبدوڵڵا، نەسرین مستەفا مەزهەر، پەریخا مەحموود شەوقی (شەمام شەوقی) هەروەها لە خولی یەکەمی پەرلەماندا لیژنەیەك بەناوی لیژنەی پاراستنی مافەکانی ئافرەت دانرا.

لە ماوەی شەری برا کوژیدا ئافرەتانی کوردستان رۆڵێکی ئاشتیخوازانەیان گێرا، ژنانی رۆشنبیر و کەسایەتی بێلایەن و ئەندام و لایەنگرانی رێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان و کۆمەڵی مەدەنی دەیان نامەی نارەزاییان دژی شەری براکوژی ئاراستەی سەرۆکی حیزبەکان کرد، داخوازی شەر وەستانیان دەکرد، کە ئافرەتانی نیشتەجێی وڵاتانی ئەورووپاشی تێدا هەبوو.

لە دوایشدا لە کابینەکانی تر ئافرەت رۆڵێکی کاریگەری بینی لە پەرلەمان و حکومەت و وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان

*** رۆڵی ئافرەتانی کەرکوك لە چالاکییە رێکخراوەیی و کۆمەڵایەتییەکاندا:-**

لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە لە ساڵی ٢٠٠٣دا، گەلێك رێکخراوی ئافرەتان لە کەرکوك سەریان هەڵدان کە بەشێکیان هەر لە سەردەمانێکی زووەوە چالاکییان هەبوو، بەڵام هەندێکیان هەندێکیان لەدوای ئازادی عێراقەوە چالاکییان دەستی پێکردووە:-

١- دەزگای رۆژ بۆ پێگەیاندنی ئافرەت و داکۆکی کردن لە مافەکانی.

٢- (جمعیة نساء ترکمان العراق) لقی کەرکوك.

٣- بنکەی (پەنا) بۆ لەناوبردنی توند و تیژی دژی ئافرەت. بنکەی (پەنا) یەکێکە لەو سەنتەرە چالاکانەی کە لەسەر ئاستی هەموو عێراقدا چالاکی خۆی هەبووە و پەناگەیەکی زۆر گەورە بوو بۆ پاراستنی ئافرەت لە کوشتن و چارەسەرکردنی کێشەکانی، کە هەر لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە توانی ئەو رۆڵە ببینێت کە بتوانێت ئافرەت بە پەنای خۆی دابنێت بۆ چارەسەری کێشەکانی.

٤- إتحاد نساء بیت النهرین.

٥- منظمة أطیاف السنویة

٦- منظمة فینوس للمراة والطفل

٧- مؤسسة الحنان الواقي للإغاثة وتنمیة الطفل والمراة

٨- منظمة الزاب لتطویر المراة

٩- جمعیة الهدی لنساء العراق

١٠- منظمة (ژیان) لنساء الأنفال

١١- رێکخراوی لیلۆس

١٢- رێکخراوی سازان

١٣- رێکخراوی بەژین

١٤- رێکخراوی دلۆڤان

١٥- سەنتەری کەرکوك بۆ خانمی پیشەدار

*** ناوی ئەو ئافرەتانەی چالاکییان هەیە لە بوارە جۆراوجۆرەکان:-**

ئاوێزان نوری حەکیم
ئاواز سەلیم عەبدوڵڵا
ئیبتسام عەبدوڵڵا
ئەرخەوان محەمەد عوبێد
ئەسما غالی جەبر
ئەسیل مالك حاچەم
ئاشتی فەلەکەدین کاکەیی
ئەڤین شێخی
ئالا مازن ئەدهەم
ئیلهام شاکیر بیرەقدار
ئەمەل سینان سەعید
ئامینە مەحموود
ئایدن عەبدولقادر
ئایە سەردار
ئەیسەر عەبدولوەهاب
ئامینە خان سەردار
ئەیسەر چەرداغلو

ئەسین
ئیشان محەمەد ساڵح
ئیشان ڕەشید حەمید
ئیهان عاشق
ئیمان کەمال سەمین
ئیمان عیزەدین (ئەیمەن)
ئیمان سەلیم
ئاسۆس نەجیب عەبدوڵڵا
ئالا تاڵەبانی
ئەمیرە بیت شموئیل
پاکیزە ئەمین خاکی
پاکیزە سلێمان سدیق
پاکیزە ڕەفیق حیلمی
پیرۆز حەسەن کەنووش
بامبوق کەرکوکی
پەخشان کەریم حەسەن
بوشرا محەمەد زەکی
برتان عەبدولقادر
پەروین مەحموود حەمەد
بەسیرە ئەکبەر
بەهار تەها بەیاتی
بەهیجە شوانی
بێخاڵ خالید
بەرزانە
بەیان سەلمان
تارا خەلیل عەبدوڵلا
تەبارەك غەسان
تابان گەرمیانی
تانیا گلی
چۆپی فەتاح
چنار نامیق
چنوور نامیق
جوان ئاسیح
جۆزفین گۆرگیس
خەدیجە میرزا مەحموود
خالیدە تۆفیق
خالیدە محەمەد عەبدوڵڵا
خالیدە عەبدوڵلا
خلود عەبدولڕەزاق عوبێد
حەبێ خان
درەخشان محەمەد
دڵپاك تاهیر دەروێش
دەمەت بەهجەت حەیدەر
دیدار عابدین ئەمین
دێرین عەبدولجەبار حەمید
دریڤان عەبدولقادر
ڕائیدە ڕەشد تۆفیق
ڕابیعە مەحموود قادر

ڕاویە ئەلشاعیر
ڕەغەد سەدام
ڕەفیق ئەلحافز
ڕووبار نەوزاد
ڕووناك شوانی
ڕەمزیە حەبیب
ڕووناك محەمەد مستەفا
زارا عەبدوڵلا حەمید
زەینەب حوسێن ئەحمەد
زەینەب گۆزەچی
زەینەب دووزلاوی
ژیان عەزیز ئەحمەد
زەماوەند حەسەن قادر
سوداد عەبدولکەریم بەیاتی
سەنا جاسم
سەمیرە ساڵح عەلی
سائیرە فەرەج
سارە سەباح قادر
سازان جەوهەر غەریب
سامیە ئەلئەترەش
سامیە شاکیر داغستانی
سروە حوسێن سلێمان
سوعاد حەسەن عەبد
سەلما مەردان
سەلیمە ئەحمەد (کرکوك قیزی)
د. سەلوا جەرجیس
سەمیرە ئیبراهیم خەیات
سەمیرە ئەحمەد ڕەشید
سەمیرە حوسێن جاف
سەمیرە محەمەد حوسێن کاکەیی
سەمیرە محەمەد ترکەڵانی
سەمیرە مەحموود محەمەد
سوهاد تاڵەبانی
سوهام محەمەد عومەر
سوها یونس سەلمان
سوهەیلە شەمسەدین
سوهەیلە ئیبراهیم
سۆزان مامە
د. سەوسەن بەیاتی
سەوسەن مەجید
سەوسەن محەمەد بەکر
سۆلاف ساڵەیی
سۆمەر نەسرەت مەردان
سەیران شوانی
سیلدا هورمزی
سیما شوانی
سینا ساحر
سوها ئەنوەر قادر

سەبیحە ئەحمەد
سەبیحە خەلیل زەکی
سەفیە قەساب
شەزا عەسکەر نەجەف
شەکیبە وەنداوی
شەنگوڵ حوسێن قادر
شنۆ ئەحمەد غەفوور
شنۆ داودی
شەونم عەزیز بەرزنجی
شەهناز خانم
شنە نەجات عەبدوڵڵا
عایدە ئەلروبەیعی
عەلیە ناسیح بازرگان
عالیە محەمەد ئەمین
فاتیمە ئەلعوبێدی
فاتیمە بیرەقدار
فائیزە بازرگان
فاتن ئەلعێبی
فەرەح عەدنان
فیردۆس عوسمان
فریال عیزەت
فریال محەمەد ئەلمودەڕیس
فەیحا زەینولعابدین
فیفان مەتی
فاتیمە خانی قەرەچێواری
فەتحیە خان
فەرحە ئیبراهیم – دایکی جەمال
قازانجی قیزی
قەدریە زیائی
گوڵزار ئیبلا
گەلاوێژ جەباری
گوڵشن مەردان
گوڵشان بەیانی
گۆڵشان محەمەد
گولەر حەبیب سیامەنسووری
گولەر قۆریالی
گولەر نازم
گوڵشان شەکرچی
گێلاس موعتەسەم
گوڵاڵە نووری
گوڵسەر کەرکوکی
کنار عەباس عەسکەر
کەوسەر جەبار
کوردستان محەمەد سەعید
کوتەر محەمەد ڕەشید
کۆچەر ئەبو بەکر
لاوە زەنگەنە
لەیلا شەکرچی

لەیلا عەبدوڵڵا
لەیلا محەمەد نەورۆز
لەیلا مەردان
د. لەیلا جەلیل عەباس
مەدیحە ئەحمەد جەمیل
مەدیحە هەمەوەندی
مەدیحە سابیر سۆفی
مریەم یەعقوب یوسف
مژدە مەحموود جاف
مونا ئەلعوبێدی
مونا تۆما
منەوەر مەلا حەسوون
مەهاباد قەرەداغی
میدیا ساڵەیی
مەیسون عەباس مستەفا
مەیسون محەمەد کەرکوکی
مەیسون مستەفا
مەلاحەت محەمەد ساڵح
مریەم خان
نەعیمە مستەفا – نەعە نێر
نەسرین شاکەلی
نەرمین عەلی محەمەد ئەمین
ناهیدە تاڵەبانی
نازدار ئەحمەد
نێرگز قادر
نادیە جۆرانی
نادیە سەباح
ناز فەلەکەدین کاکەیی
ناهیدە ڕەفیق حیلمی
نەجات ڕەفیق حیلمی
نەجیبە سابیر
نەدا عەسکەر ئەحمەد
نەدیمە محەمەد هورمزی
نەرمین ئەلموفتی
نەرمین تاهیر بابا
نەسرین حوسێن
نەسرین مەحموود حەمەد
نەعمات کەرکوکی
نەغەم ئیبراهیم
نیهایەت نورەدین
نەهزە عەلی ئەحمەد
نەوال محەمەد بەهرام
نورسەل مەحموود نووری
نورهان یوسف
نوریە زەینەڵ
هاجەر عەلی ڕەزا
هەبە تەلاڵ حوسێن
هەیام نەجم

هێرۆ کوردە
هەیفا زەنگەنە
وەردە ئەلسەواف
وەفا جاسم
وەفا عەبدولخالق
وەلا جوامێر
وەهیبە یاسین

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١- ئافرەتیزم (مێژووی تێکۆشان بۆ مافی یەکسان لە باشووری کوردستان ١٩١٨-٢٠١٨)، مەهاباد قەرەداغی، چاپخانەی (شەهاب) ٢٠١٨.
٢- بەشێك لە بیرەوەرییەکانی ژیانم هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە، عالیە عەبدولکەریم مودەڕیس، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠١٣
٣- نساء في ذاكرة كركوك (الأدبية - الإعلامية- الفنية)، د. عەبدولکەریم خەلیفە حەسەن، لە بڵاوکراوەکانی (رؤى للطباعة والنشر)، ٢٠١٨

* حیسابگرەو حیسابگرەکانی کەرکوك:-

(حیساب - گر) لە وشەیەك و پاشگرێك بەکارهاتووە، حیساب بە مانای ژماردن یان پێوانە بەکاردێت لەگەڵ بوونی پاشگرێك بە مانای ئەوانەی کە شارەزان لە پێوانە و حیسابی کەژەکان و سروشت و ژینگە.

لە ڕابردوودا زۆر جۆرە حیساب و حیسابگر لە کوردستان و هەرێمەکە هەبوونە، جار هەر یەکە و بەشێوەیەك بە ناوێك هەڵدەدرێ، لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم ئەم جۆرە حیسابانە باوبوونە:-

١- حیسابی عارەب
٢- حیسابی سنە
٣- حیسابی گڵەزەردە
٤- حیسابی گەرمیان
٥- حیسابی کەلی خان
٦- حیسابی گراو
٧- حیسابی هێران
٨- حیسابی کەوە
٩- حیسابی مەحموود پاشای هەمەوەند
١٠- حیسابی تورکمان
١١- حیسابی یاقوباغای هەولێر
١٢- حیسابی مەلا هیدایەتی هەولێر
١٣- حیسابی کێڵە شین
١٤- حیسابی ڕۆم
١٥- حیسابی سێ مانگی کوردی
١٦- حیسابی دەروێش قالەی تاڵەبانی
١٧- حیسابی فەرحان لەك
١٨- حیسابی حەمە کوردەی کۆپە قڕان
١٩- حیسابی حەمە دەبۆتی ماستاوە
٢٠- حیسابی خۆرهەڵاتی
٢١- حیسابی سەعات
٢٢- حیسابی نەورۆز
٢٣- حیسابی بورج
٢٤- حیسابی هەمزە ئاغای بەحرکە
٢٥- حیسابی عەنتەر
٢٦- حیسابی حەوێزی شاخە پیسکە
٢٧- حیسابی دەوری دانم

زۆر حیسابگر هەیە، بەڵام ناویان گوم بووە، چونکە لەم سەردەمەدا حیساب و حیسابگر باوی نەماوە، ئادەمیزادی ئەم سەردەمە بە شتی دیکەوە خەریکن.

بێگومان ئەم کارە لەسەر زانینی حیسابگران و کتێبە کۆنەکان، لەسەر تاقیکردنەوە و چاودێریکردنی ساڵی و کەژەکانی ساڵ، هەر حیسابێك هەیە لەسەر ئەم چەند شتانە دامەزراوە و قسەیان لێکردووە و تاقیکراوەتەوە ڕاست دەرچووە.

* حیسابگری ناودارەکانی کەرکوك و دەوروبەری:-

١- دەورێش قالەی تاڵەبانی لە گوندی (یەنیجە) دانیشتووە،

لە دەوری (١٩٥٠)ی زایینی لە ژیاندا بووە، حیسابگرێکی زۆر چاك بووە.
لە ساڵی ١٩٥٢ی زایینی باران کەم بووە، خەڵك مەترسی نەبوونی دەغڵوودانی پەیداکرد، تاکو سەرەتای بەهار ئەوەتە دەغڵ سەردەر هێنابوو، دەروێش قالە دەیگوت بە حیسابی من ئەمساڵ ئەوپایی دەغڵ ئاو دەیبا، بەڵام شوێنی بڵندایی دەغڵی باش دەبێ، شێخ حەسیبی تاڵەبانی کە خاوەن دێ بوو، پیاوێکی گەورە بوو، گوتی:- قالەی کەرانباوگاو دەغڵودان نەبووە، چ باران نەباریوە، (ئەمە بەهارە، تازە دەغل لقی دەرهێناوە، تۆش وا دەڵێی لە کینگی خۆت و حیسابت بەم).
دەورێش قالەش گوتی:- (یا شێخ با گرەو بکەین لەسەر دەستی شێخی گەورەی باوکت)
شێخ فەیزوڵڵا یەنیجە ئەگەر قسەی من بوو تۆ تفەنگێکی ئینگلیزیم بدەرێ، ئەگەر قسەی من نەبوو کچێکم هەیە بۆخۆت بیدە بە شوو ئەختەکەی بخۆ.
جا گرەویان کرد لەسەر دەستی شێخ فەیزوڵڵا، هەندەی پێ نەچوو بارانێك باری، لافاو لە بەغدا هەستا، زۆر حەسارەی دا، پردی خاسەی کەرکوك ئاوبردی، چەند ماڵی وێرانکرد و راپێچا، نیوەی چەمچەماڵ ئاوبردی، ئەوەی عەردی نزمایی بوو ئاو هەڵیقەتاند و دەغڵەکەی برد، ئەوەش بەرزی بوو دەغڵەکەی زۆر باش بوو، بارانەکە کاتی نوێژی عەسر بوو دنیا سوور هەڵگەرا و تاریکی کرد، نزیکەی ٢٥ دەقیقەی خایاند.
٢- فەتاحە لور هەبووە، لە گوندی پەنجا عەلی دادەنیشت، لە دەورووبەری ساڵی ١٩٥٠ی زایینی لە ژیاندا بووە، حیسابگرێکی باش بوو.
٣- حاجی محەمەد عەلی:
لە گوندی دۆڵەبەکرە دانیشتووە، لە دەورووبەری ساڵی ١٩٧٠ی زایینی لە ژیاندا بووە، لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا، حیسابگرێکی زۆر چاك بووە، زۆر شتی سەیری دەزانی لە بابەت ساڵ و حیساب و شتی پڕ سوود.
٤- مەلا سدیقی کەریم عەبدولڕەحمان زێویە( ١٩٢٥-٢٠٠٢):-
کەسایەتییەکی بەناوبانگ بووە و ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە کشتوکاڵ و وەرز و کەشەکان و کاتی باران و لافاو و هەور و بەفر و جۆرەها زانیاری گرنگ کە خەڵکی زێویە دەربارەی دەگێڕنە.
٥- ساڵح بندیلك:-
لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی پێشوو لە ناحیەی قادر کەرەم ژیاوە، پیاوێکی سادە بوو بە زۆری خەریکی ڕاوی تەیر و تەواڵ و ماسی بوو، شارەزاییەکی چاکی هەبوو لە شوێن پێ هەڵگرتن و گەڕانی بەدوایدا بەجۆرێکی وریا حیسابی بۆ شوێن پیی خەڵکی هەڵدەگرت شارەزا بوو.
٦- قوربانی حیسابگر - کوێخا قوربانی حیسابگر:-
ساڵی ١٩٠٥ی زایینی لە کەرکوك لە گوندی دەلەسی بچووك لە داقووق لەدایکبووە.
مرۆڤێکی وریا و بیرتیژ و زانایەکی حیسابگر بوو واتا ڕۆژژمێر بوو، زۆربەی کاکەییەکان ساڵ و ڕۆژی لەدایکبوونیانی دیاری دەکرد و حیسابەکەی تەواو دەردەچوو، هەندێك جار دەستنیشانی ڕووداوێکی دەکرد کە ئەو ساڵە ڕوودەکات، بۆ جووتیارەکانیش حیسابی تۆ و دەغڵ و دانی دەکرد .دەیزانی فلانە ڕۆژ فلانە باڵندە ڕوودەکاتە دەڤەرەکەیان، ساڵی ١٩٦٢ کۆچیی دوایی کردووە.

* سەرچاوە:-

١- ساڵنامە و ئاوێنەی کوردەواری، مەلا محەمەدی عەلیاوەیی، بەرگی یەکەم، ٢٠١٩، لاپەڕە (٢٦٠-٢٦٩)
٢- ئەرشیفی (مستەفا زەنگەنە).
٣- ئەرشیفی عەبدولڕەحمان سدیق.

*** مێژووی جوولەکە لە خورماتوو**

**سامان ئەحمەد**

**لەلایەن دانیشتووانەوە بەناوی قەڵای (گاورین) بە مانای قەڵای جوولەکان لەسەر چیای خورماتوو، کە دەڕوانێتە سەر ڕووباری ئاوەسپی کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هووری میتانی و ئاشووری و بابلییەکان.**

**زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە یەکەم بوونی جوولەکە لەسەر زەوی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شەشی پێش هاتنی مەسیح**
**بەڵام بوونیان لە شارۆچکەی خورماتوو، هاوپەیوەستە بە بینادنانی قەڵا مێژووییەکەیان بەناوبانگ و بەرچاو بووە**

**هاوپەیوەستی خۆشەویستی لەنێوان جوولەکە و موسلمانەکان هەبووە لەم شارۆچکەیە، هیچ جیاوازی لەنێوانیاندا نەبوو هەرچەندە لە ڕووی ئایینەوە جیابوو، زۆربەی خانووەکانیان بڵاوبووەوە لە ناوچەی دەورووبەری قائیمقامی کۆن و گەڕەکی جوولەکەکان لەنزیك بازاڕی ئاسنگەران بوون لە چەقی شارەکە.**
**دەستەیەکی بەرهەمهێن بوون لە بواری پیشەسازی و پارە و هونەر بوونیان جۆرێك لە هاوسەنگی کۆمەڵایەتی دروست**

کردبوو، چونکە ئەم شارە فرە رەنگ بووە هەرچەندە هەندێك جار توند و تیژی ئایینی و نەتەوەیی ویستوویەتی هەڵیبتەکێنێت.

بەزمانی دایکیان کە زمانی عیبرییە قسەیان کردووە، لەپاڵ زمانی کوردی و عەرەبی و تورکمانی و ئەو زمانانەی کە زاڵ بووە لە ناوچەکە، زۆربەیان شارەزا بوونە لە کاروو باری بازرگانی و ئابووریی، سەرەتاکانیان بە کشتوکاڵ و رەنگکردنی خوورییەوە بەناوبانگ بوونە رۆڵێکی باڵایان لە قوماش و زێرەنگەریدا هەبووە، بریان بە ئابووری داوە لە ناوچەکە و گوندەکانی دەورووبەریان لە رێگەی بازرگانی سەربەسەر (مقایضة) بۆ کرینی بەرووبوومی کشتوکاڵ و ئاژەڵی. یەکێك لەسەرمایەدارە بەناوبانگەکانیان (عەبد

میران) بووە کە موڵك و ماڵێکی زۆری زەوی هەبوو تەنانەت ئێستاش ئەو زەوییانە بەناوی (ئەلیاس)ەوە بەناوبانگە، کە قەیسەرییەکی دروستکردبوو بەناوی (قەیسەری ئەلیاس). لە کاتی خۆیدا گۆڕستانێکی تایبەتیان هەبوو، کە لە ئێستادا

شوێنەواری نەماوە کە شوێنی ئێستای قوتابخانەی (شعلە) ی سەرەتایی و بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی خورماتووە.

شوێنێکی تایبەتیان هەبوو بۆ خواپەرستی و سرووتە ئایینییەکانیان لە رۆژانی شەممە لەنزیك رووبارەکە بوو لە گەرەکی (چقالا) کە پێی وتراوە (کنست - تەوراتگە).

کۆمەڵێك کەسایەتی بەناوبانگیان هەبووە لە شارۆچکەکەدا، تا رۆیشتنیان بۆ ئیسرائیل وەکو: دانیال، نیسان، ئیسحاق، لاحوم، عەبدکۆهیل، موشی ئەفەندی، کە مامۆستا بوو لە گوندی (هەفتەغار)، یاهو قەساب، کورحیون، عەبد ساڵح، سەهیۆن، ساڵح داود، موراد شائوول، نەجە، کچل، خەڵەف ئاڵتونچی، دەلال باروخ، موشی، میزە بۆیاغچی، کۆهین عەبد، عەبد سایسون، ئەلیاهۆ و گەلێکی تر.

*** مەسیحییەکانی قەڵا لە نێوان بەرداشی دین و نەتەوەدان:-**

محەمەد سەردار

مەسیحییەکانی کەرکوک پێکهاتەیەکی گرنگی شارەکەن، بەشێك لەو مەسیحییانە بە تورکمانی دەدوێن و تەنها خۆیان بە مەسیحی دەزانن، نەك تورکمان، هەندێك هێزی سیاسیی تورکمانیش ئەوان بە تورکمان لە قەڵەم دەدەن، بۆیە مەسحییە تورکمانەکان، لەو نێوانەدا ماون کە تەنها ژمارەیان ٥٠ خێزان دەبێت.
بەهۆی کۆچکردنی بەردەوامەوە ژمارەی مەسیحییەکان لە کەمبوونەوەدایە، بە گوێرەی ئامارە نارەسمییەکانیش، لە ئێستادا نزیکەی ٥٠ خێزانی مەسیحی لە کەرکوك هەن کە بە زمانی تورکمانی قسە دەکەن.
بەشێك لەو مەسیحییانەی شاری کەرکوك کە بە زمانی تورکی قسە دەکەن، رەتی دەکەنەوە ئەوان تورکمان بن و دەڵێن: "لە رەچەڵەکدا کلدانین و بە هۆی سەپاندنی سیاسەتی بە تورککردن لە لایەن دەوڵەتی عوسمانیی ئەو کاتەوە بە زمانی تورکمانی قسە دەکەین".
لویس بەهجەت، تەمەنی ٧٣ ساڵە و یەکێکە لەو مەسیحییە کەرکوکییانەی بە زمانی تورکمانی قسە دەکات، لە ساڵی ١٩٤٦ لە قەڵای کەرکوك لە دایك بووە و تاکو سەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردوو لەوێ ژیاوە، ئەو بە "ئاژانس"ی وت: "لە سەرەتادا بەشێکی زۆری دانیشتوانی کەرکوك مەسیحی بوون، دواتر دەوڵەتی عوسمانی هات و بارودۆخەکە گۆردرا و بۆ ئەوەی لەوان تێبگەین دەستمان کرد بە قسەکردن بە زمانی تورکی و تەنانەت نوێژکردن و مەراسیمە ئایینییەکانیشمان بە زمانی تورکی و کلدانی بوون".
رەیان لویس، کە تەمەنی ٤٦ ساڵە و کوڕی لویس بەهجەتە، دەڵێت: "هەندێك لە زمانی کلدانی دەزانم ئەم نەوەیەی ئێستاشمان زۆربەیان زمانی کلدانی نازانن، ئەوەش هەرەشەیە بۆ سەر داهاتوومان".
بە پێی زانیارییەکانی "ئاژانس"، لە ئێستادا نزیکەی ١٠ کلێسا لە کەرکوکدا هەن و ٣ کلێسایان کلدانین، بەشێکی زۆری ئەو مەسیحییانەی بە تورکی قسە دەکەن بە مەبەستی جێبەجێکردنی مەراسیمە ئایینییەکانیان سەردانی کلێسای (قلب القدس)ی کەرکوك دەکەن.
لە سنووری پارێزگای کەرکوك زیاتر لە هەزار خێزانی مەسیحی هەیە، زۆرترینیان سەر بە مەزهەبی کلدانین و ژمارەیان زیاتر لە ٣٠٠ خێزان دەبێت.
قەشە قەیس مومتاز، پیاوێکی ئایینیی مەسیحییە و دەڵێت: "بەکارهێنانی وشەی گاورەکانی قەڵا (کە تورکمانەکان بە کاری دەهێنن) سوکایەتییە بۆ ئەوان، لە بنەرەتدا ئەوان مەسیحین و لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بە زۆرەملێ زمانی تورکییان بەسەردا سەپێندراوە و چەندین نەوە گەورە بوون دوورکەوتوونەوە لە قسەکردن بە زمانی ئارامی."
بەرەی تورکمانی ئەو مەسیحییانە بە تورکمان دەزانن و دەڵێن: "چەندین کتێب لەسەر مێژووی ئەوان هەیە کە چەند سەدەیەك پێش هاتنی دەوڵەتی عوسمانی بۆ عێراق ئەوان لە کەرکوك ژیاون."
محەمەد سەمعان، وتەبێژی بەرەی تورکمانی لە کەرکوك بە "ئاژانس"ی وت:"بەشێکی زۆری ئەو مەسیحییانەی بە تورکمانی قسە دەکەن بە رەچەڵك تورکن، چونکە هاوسەری هۆلاکۆ کە کەسێکی تورکی-مەسیحی بووە، داوای لە هۆلاکۆ کرد هۆزەکەی لە ناوچەیەکی نزیکی عێراق نیشتەجێ بکرێن، بۆیە ئەوانیش لەسەر کەرکوك نیشتەجێ بوون".
"بەشێکی دیکەی مەسیحییەکانی کەرکوك بە رەچەڵەك لە نەوەی ئاشوورییەکانن و بەهۆی پێکەوەژیانیان لەگەڵ تورکمانەکان فێری زمانی تورکی بوون"، سەمعان وای وت.
ئەو مەسیحییانە بە رەچەڵەك تورکن و لە ساڵی ١٢٨٥ی زایینی لەگەڵ هێرشی مەنگۆلییەکان بۆ سەر بەغدا و دواتریش کەرکوك بە سەرکردایەتیی هۆلاکۆ، بەشێکی زۆری ئەو مەسیحییە تورکمانانە لە ناوەراستی ئاسیاوە هاتنە کەرکوك و لە سەر قەڵا نیشتەجێ بوون، چونکە هاوسەری هۆلاکو سەر بە ئایینی مەسیحی بووە، لەم ساڵانەی دواییشدا لە لایەن مسوڵمانەکانی قەڵاوە پێیان دەوترا "گاورەکانی قەڵا."
بە پێی بەدواداچوونێکی "ئاژانس"، بەشێکی زۆری "مەسیحییە تورکمانەکانی"ئەو سەردەمە کەسانی دەوڵەمەند و خاوەن پایە بوون و مەسحییەکانی دیکە وەك کارگوزار کاریان لایان کردووە، هەروەها کۆمەڵەیەکی داخراو بوون و تاکو ئێستاش ژن و ژنخوازییان لەگەڵ مەسیحییەکانی دیکەشدا سنووردارە.
سمکۆ بەهرۆز، نووسەر و مێژوونووس دەڵێت: "بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧ی عێراق، قەڵای کەرکوك بەسەر گەرەکی مسوڵمانەکان و گەرەکی مەسیحییەکان دابەش ببوو، ئەو گەرەکەی کە مەسیحیی لێ نیشتەجێ بوو، تورکمان بوون."
"لە رووی کەلەپوور و ژیان و هەڵسوکەوتەوە هەڵگری کەلەپوور و دابونەریتی ئایینی مەسیحی بوون و جلوبەرگی مۆدێرنی ئەوکاتیان پۆشیوە و جلوبەرگی تورکمانییان لەبەر نەدەکرد، لە سەردەمانێکیشدا سەر بە مەزهەبی نەستووری بوونە و دواتر بوون بە کلدانی"، (سمکۆ بەهرۆز وا دەڵێت).

* سەرچاوە:-
- رۆژنامەی ئاژانس.

# پێرست

## * پێرست کەلتوورو شارستانییەت لە دەڤەری کەرکوك:-

زانیاریمان دەربارەی باری ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی (بەردەبەڵکە)و (کەریم شایەر)و (پاڵە گەورە)و (چەرموو)و (مەتارە) زۆر کەمەو تەنها بریتیە لە هێڵێکی باریکی زانیاری بۆ بەدەستهێنانی باسەکەمان، چونکە ئەو شارستانیاتانە ژیانایان بریتی بووە لە کۆچەرایەتی و ژیانی ڕاوو گەڕان بە دوای خۆراکدا.. زیاتر ژیانی تاکرەویتی باو بووە لەو ناوچانەدا. (لە ناوچەی (بەردەبەڵکە)دا مرۆڤی (نیاندەرتاڵ) ژیاوە، گوزەرانی لەسەر ئەوە بووە کە ڕاوی کردووە یان کۆیکردووتەوە، لە خواردن لەدوای خۆی ئەو کەرەستانەی بە جێهێشتووە کە بەکاری هێناوە لە بەرگری لەخۆی لەکاتی هێرش یان ڕاوکردندا، کە پێک هاتووە لە (نێرک)ی بەردە ئەستێی پتەو نەبوو، زۆری لەسەر شێوەی نارێک کە سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە، سەردەمی بەردینی کۆن بەو شێوەیە کە بەناوبانگ بووە بە (ئەشولی) مێژووەکەی دادەنرێت بەزیاتر لە سەد هەزار ساڵا، توانای لەشی دیاری کراو بووە، ژینگەکەی زۆر ناخۆش بووە، کە یارمەتی داوە بۆ گەشە بوونی توانای پیشە هونەرییەکانی بۆ دروست کردنی ئەو کەرەستە بەردینانەی کە بتوانێت بە هۆی ئەوەوە خواردنەکەی بەدەست بهێنێتو زۆری کاتی بەم کارانە بباتە سەرو ئابوورییەکی هەڵەشەیی هەبووە، کەسەکانی ئەو سەردەمە لەسەری ژیاون ڕۆژ بەرۆژ.. کە مرۆڤ ژیاوە لە بەربەرکانی بۆمانەوە تا ماوەیەکی زۆر بەتایبەتی لەگەڵا (فیل)و (کەرکەدەن) لەبەردەبەڵکەدا.

دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2023